## ناوەرۆک

# تەفسیری سوورەی ئالی عیمران

هۆی ناو بردنی ئەو سوورە مبارەک و پیرۆزە بە «ئالی عیمران» دەبێ ئەوە بێ: کە دەو سوورەیەدا باسێ لە ئەولادانی عیمران وەک حەزرەتی مووسا و هاروون بن دەکرێ و کراوە، هەندێکیش دەڵێن: هۆی ناو بردنی ئەو سوورە بەو ناوە ئەوەیە کە بابی حەزرەتی مریەمە، عیمران بووە.

ئەو سوورەیە بە پێی دابەزینی لە پلەی ۸۹دایە واتە هەشتا و نۆهەمین سوورەیە، بەڵام لە سەر ئەساسی تەرتیب و تەنزیمی قورئان لە پلەی سێدایە واتە سێهەمین سوورەی قورئانە دابەزیوە یانی پاش سوورەی ئەنفال، پێش سوورەی ئەحزاب نازڵ کراوە.

ئەو سوورەیە بە پێی ڕیوایەتی سەعیدی کوڕی مضور دە تەوڕاتێدا ناوی «طیّبة». دە حەدیسی صحیح و مسلمدا نەقڵ کراوە کە ناوەکانی سوورەی بەقەرە و ئالی عیمران دە تەوڕاتێدا «زهراوین» هاتووە واتە دە ڕۆژی قیامەتدا بۆ ئەو کەسانەی کە ئەو دوو سوورەتانە زۆر دەخوێننەوە دەبنە دوو نوور لە سەر و دەوروبەری وان. هەندێک کوتوویانە: ئەو سوورەی ئالی عیمرانە ناوی «امان»ە چونکە هەر کەس شەوانە ئەو سوورەیە وەخوێنێ تا بەیانی، لە بەڵاکانی نهێنی و ئاشکرا بەدوور دەبێ.

هەر وا هەندێک کوتوویانە ئەو سوورەی ئالی عیمرانەیان بەو ناوانەش ناو بردوون، وەک: «کنز، معینه، مجادله، سورة الاستغفار». بەو هۆیانە: کێشە و مجادلە دەگەڵ مەسیحیان دەو سوورەیەدا چاو دەکرێ. وە هەروا ڕێگای ئیستیغفار و تۆبەی زۆر تێدا هەیە و خوێندنی ئەو سوورەیە دە کاتی بەڵا و سەختیدا ئاسانی و حەسانەوە و مەحفووز بوون دێنێ.

دەگێڕنەوە کە کابرایەک لە شاری بەغدادا پیاوێک دەکوژێ. خاوەن کوژراو واتە خاوەنی خوێنەکە دەبێتە واریسی کوژراو دەخەفتێ بکوژ وەبینێ و بیگرێ و بیکوژێتەوە لە باتی کوژراوەکەی خۆی. بکوژ (قاتڵ) لە ترسان خۆ دەگەیێنێتە جەنگەڵ و لێڕەوارێک کە ناوی

«مجنة» دەبێ. یانی ئەو جەنگەڵە وا مەنشوور بوو هەر کەس چووبا ناوی، نەجاتبوونی مەحاڵ بوو، یا دڕندە دەیخوارد یا ماران پێوەیان دەدا و دەمرد. ئەو کابرا قاتڵە مەرگ و مردنی ناو جەنگەڵەکەی پێ خۆشتر بوو لەوەی بیگرن و قیساسی بکەن. ئەوەش دەزانێ واریسەکانی کوژراو غیرەت ناکەن بێنە ناو ئەو جەنگەڵە و ئەوی بگرن.

گۆیا وەک دەڵێن لە قەراخی ئەو دارستانە دوو زانای مەسیحی (ڕاهیب) دەبن. کاتێ ئەو قاتڵە دەگرێ و دەچێتە قەراخی ئەو دارستانە چاوی دەکەن ئەو دوو ڕاهبە چاوەڕوانی ئەوەی دەکەن کە ئەو نەفەرە چۆناوچۆن دەکەوێتە بەر پەلامار و هێرشی دڕندەکانی ئەو دارستانە. بەڵام کاتێ چاو دەکەن لە نزیکەوە ئەو نەفەرە ئەو سوورەی ئالی عیمران دەخوێنێ و مار و جنۆکە و حەیوانی دیکە دەورەی دەدەن و هیچ زەرەر و ئازارێکیشی نادەن. سەرەنجام ئەو نەفەرە بە سڵامەتی هەم لە دەس واریسانی کوژراوەکە نەجاتی دەبێ هەم لە مار و جنۆکە و حەیوانە دڕندەکانی ئەو دارستانەی کە ئەو پەنای بۆ بردبوو. ڕاهیبەکان دەچنە لای و پرسیاری لێ دەکەن: ئەتۆ کێی و چت بە سەر هاتووە؟ چۆن توانیوتە واریدی ئەو دارستانە بی؟ ئەو نەفەرەش بەسەرهاتی خۆی و پەنا بردنی بۆ ئەو دارستانە ـ بێ کەم و زیاد ـ بۆ ئەو دوو ڕاهیبە بەیان دەکا. دەشڵێ چەن کاتە دە ناو ئەو دارستانە پڕ لە حەیواناتی دڕندە کە ماومەوە بە سڵامەتی، هۆیەکەی خوێندنەوەی ئەو سوورە مبارەکەی ئالی عیمرانە بووە. ئەوانیش کوتیان: دا بۆمان وەخوێنە/ کاتێ بۆیان دەخوێنێ، ڕاهیبەکان دادەمێنن و ئاوڕ دەدەنەوە سەر تەوڕات تەماشا دەکەن دە تەوڕاتێدا ئەو سوورەی ئالی عیمرانە بە ناوی سوورەی «طیبة» هەیە و ناو براوە، هەر کەسێ بیخوێنێ لە ئازار و بەڵای سەر زەوی بەدوور دەبێ. بۆ بەقا و باوەڕی بڕوانن لە تەفسیری قرطبی، ج ۴ـ۳.

**ڕێز و پیرۆزی سوورەکانی بەقەرە و ئالی عیمران**

گۆیا پێغەمبەر فەرموویەتی: حافیزان و قاریانی ئەو دوو سووڕانە ڕۆژی قیامەت بە هۆی سایەبانی ئەو دوو سووڕانە لە گەرما و ئازار و ئێشی مەیدانی مەحشەر بەدوورن. (ترمذی و سنن، کتێبی فضایل القرآن، باب ۵، ش ۲۸۸۳).

لە سەر مبارەکی و پیرۆزی سوورەی ئالی عیمران گوفتەی حەدیس زۆرن، ئەمن بەوەندەم کیفایەت کرد بەڵام کێ خوازیاری ئەوەیە زیاتر بزانێ بڕوانێ لە مسلم و صحیح بخاری.

سوورەی ئالی عیمران دوو شتی بەرز و بەرچاوی دە ئامێزی خۆیدا نیشان دەدا:

١. یەکەتــی و بــێ هاوتــایی خــودا، هەر لە ئــایەتی هەوەڵەوە تــا ئــایەتی ٨٠، دە دەوری وەحدانیەتی خودادا چەرخان دەدا.

٢. لە ئــایەتی ٨١ەوە لە دەوری پێغەمبەرایەتــی پێغەمــبەران و جیهــاد و ئینفــاق و چەنــد مەسائیلی بەرچاوی ئایین هەڵدەسووڕێ.

ئەگەر هەستیارانە بڕواندرێ لە سوورەکانی بەقەرە و ئالی عیمران، ئەو دوو شتە ئەساسـیانە هەست دەکرێن:

١. بەرهەمی تەورات و لاساریی یەهوودیان و ئیسباتی پاکی ئایینی ئیسلام دە ناو سوورەی بەقەرەدا بە ڕوونی چاو دەکرێ.

٢. دە ناو سوورەی ئالی عیمراندا بەرهەمی ئینجیـل، گـوازتنەوەی پێغەمبەرایەتـی لە بەنـی ئیسرائیلدا بۆ بەنی ئیسماعیل واتە حەزرەتی محمد المصطفیﷺ چاو دەکـرێ. (تفسـیر المقـام المحمود، ج ١، ص ٤٣٢)

دەمانهەوێ بزانین سوورەی ئالی عیمران دەگەڵ سـوورەی بەقەرە چ ڕابیتەیەکیـان پـێکەوە هەیە؟

دیارە بە پێی بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی ئەو دوو سـوورەتانە تـێکەڵاوی و ڕابیتەیـان دەگەڵ یەک لە زۆر جیهەت و بابەتی جیاجیادا هەیە، تا ئەو جێگـایەی دەس بـدا و بتـوانین بە کـورتی ئیشارە وەلای شوێنە جیاجیاکانیان دەکەین:

١. سوورەی بەقەرە لە جێگای بورهان و دەلیلێکی بەهێز خۆ دەنوێنێ لە سەر ئەو کەسانەی حاشایانە لە ئایین و دینی بەحەقی ئیسلام.

ئەمما سوورەی ئالی عیمران گومانڕەوێنە لە سەر ئەو کەسانەی گومانیـان هەیە دە ئـایینی ئیسلامدا. بە کوردی دە سوورەی بەقەرەدا بەڵگە لە سەر یەکتایی خودا و ئیسباتی پێغەمبەرایەتی و زیندوو بوونەوەی ڕۆژی مەحشەر و تەسدیقی قورئان و بوونی بەڵا وڕانـانی دەلیـل لە سـەر ڕزگاری و نەجات دە ڕۆژی خۆیدا خۆیان بە ڕوونی نیشان دا. بەڵام دە سوورەی ئالی عیمراندا گومانی ئەو کەسانەی کە لە سەر بـێ هاوتـایی خـودا و پێغەمبەرایەتـی پێغەمـبەران و زینـدوو بوونەوەی مردوودان هەبوو لا دەبرا و وڵامیان دەدراوە.

٢. دە سوورەی بەقەرەدا بەیانی کەسایەتی هەوەڵین کەسـێک کـرا کە حەزرەتـی ئـادەمە، بە پێی ئیشارەی ئایەتی ٣٠ بەقەرە: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ واتە ئەی

پێغەمبەر (محمدﷺ) بیخەرە یادی خۆت، ئەو کاتەی کە خودا ڕووی دە فرشتە کرد وفەرمووی: ئەمن لە سەر زەوی دادەنێم و دادەمەزرێنم جێنشینێک (خەلیفە)؛ واتە قەومێک کە ئادەمە، یانی چین لە دوای چین دانهێنمە سەر زەوی. (ابن کثیر).

«قرطبی» ئەو ئایەتەی کردۆتە دەلیل لە سەر لزوومی خەلیفە و ئیمام لە سەر زەوی تا کوو کاروباری کۆمەڵایەتی لە نەزم دەن و جێبەجێی کەن. ئەوە بۆیە هەندێک سوورن لە سەر بوونی ئیمام. «ابن‌کثیر»یش فەرموویەتی ئەو ئیمامە دەبێ مرۆ بێ. ئەگەر نەزەری قرطبی و ابن‌کثیر پێکابێ، دەبێ لە بابەت بۆچوونی فرشتەکان کە فەرموویانە ئەو خەلیفەیە فاسد و خوێنرێژن، چۆن هەڵوێست بگیردرێ؟ ئەورۆ ئەگەر سەیری سەر زەوی بە وردی بکرێ، دەگەڵ ڕابردووش ڕووبەڕوو بکرێ ئەوزاع، لەوانەیە باوەڕ بکرێ نەزەری قرطبی چونکە دەستەڵاتداران کە خەلیفەن و یا .... لە خوێنڕژتن و فەسادکاری هیچی دیکەیان بۆ بەرەی ئینسانی دابین نەکردووە. ئەمما دە سوورەی ئالی عیمراندا بەیانی بەرەی ئادەم کراوە بە پێی ئیشارەی ئایەتی ٦ی ئالی عیمران:

> **هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاء ﴿٦﴾** ئالی عیمران
> **هەر خوداشە چۆنی بوێ لە ناو منداڵدانەکاندا نەخشە و شکڵتان دەکێشێ.**

بە کوردی و بە کورتی، دە سوورەی بەقەرەدا سەرەتای سازانی خودی ئادەم باس کراوە، ئەمما دە سوورەی ئالی عیمراندا سەرەتای سازانی بەرەی ئادەم باس کراوە.

٣. ڕابیتەی بەقەرە و ئالی عیمران

دە سوورەی ئالی عیمراندا بەیانی هەندێک لەو بابەتانە کراوە کە دە ناو سوورەی بەقەرەدا بە کورتی ئاماژەیان وەلا کراوە، وەک بەسەرهاتی حەزرەتی عیسا. ئەمما دە سوورەی ئالی عیمراندا بە تەواوی بەیانی عیسا و بەسەرهاتی کراوە.

٤. دە ناو سوورەی بەقەرەدا بە تەواوی چۆنیەتی دروست کردنی ئینسان باس کراوە و بەیان کراوە بە پێی ئیشارەی ئایەتی ٢١ی بەقەرە:

> **يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ ﴿٢١﴾** بقره
> **ئەی ئینسان! بەندایەتی بۆ ئەو پەروەردگارەتان بکەن کە ئێوە و ئەوانەشی لە پێش ئێوەدا بوون بەدی هێنا.**

بەڵام دە سوورەی ئالی عیمراندا چۆنیەتی سازانی شکڵ و سیمای ئینسانی دە ناو منداڵدانی دایکیدا بەیان و باس کردووە. بە کورتی بڵێین دە بەقەرەدا خەلقی ئینسان باس کراوە و دە ئالی عیمراندا سازانی شکڵ و دیمەنی باس کراوە.

٥. دە سوورەی بەقەرەدا باس لە خەلقی کەسێکی بێ دای و باب کراوە وەک ئادەم بێ، بەڵام دە ئالی عیمراندا باس لە خەلقی کەسێکی بێ باب کراوە وەک عیسا بێ.

٦. دە سوورەی بەقەرەدا بە زۆری ڕووی باس دە هۆزی یەهوود بوو لەو بارەوە کە قەومی یەهوود شتی زۆر ناڕەوایان دەدایە پاڵ حەزرەتی عیسا و دایکی، مریەمە. بەڵام دە سوورەی ئالی عیمراندا ڕووی باس بە زۆری دە «نصارا»کانە بەو دەلیلەی کە خودا پێی فەرموون: ئێوە بۆ پێو سەیرە دروست کردنی عیسا بەبێ باب؟ ئەدی بۆ ئاوڕ نادەنەوە و ناڕوانن لە خەلقی ئادەم بە بێ باب و دایک. ئەو شێوە دواندنە بە چاودا دانەوەی هەڵە و ئیشتیبای قەومی نەسارایە.

٧. دە سوورەی بەقەرەدا لە هەوەڵەوە باسی کەسانی «متّقی» واتە بەپارێز کرا، وەک (هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ) (٢ی بەقەرە)، هەر نەختێک دوای ئەوە خودا فەرمووی: (هُمُ الْمُفْلِحُونَ) (بەقەرە: ٥)؛ بەڵام سوورەی ئالی عیمران خودا دایکوژاند ئاخرەکەی بە هەمان دوو کەلیمە جوانانەی (تەقوا) و (مفلح)، وەک دە ئایەتی ٢٠٠ی ئالی عیمراندا چاو دەکرێ:

**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾** ئالی عیمران

**ئەی ئەوانەی بڕوا و ئیمانتان هێناوە! خۆڕاگر بن، بە سەر دوژمندا زاڵ بن بە هۆی ئەو خۆڕاگرییەتان، با مەتەرێز و سەنگەرتان قایم بێ بۆ پارازتنی سنوورەکان، خۆشتان بپارێزن لە نافەرمانی خودا، بەو هیوایە ڕزگار بن.**

٨. تێکەڵاوی و ڕەبتی ئەو دوو سوورانەی (بەقەرە و ئالی عیمران) بە یەکەوە ئەوەیە: دە بەقەرەدا کەسایەتی هەوەڵین بەشەری سەر زەوی باس کرا کە ئادەمە و بێ باب و دایی سازا و لە خاک بە شێوەیەکی عەجیب و غەریب، کە ئەو شێوە سازانە جێگەی ڕامان و دامان و سرنجێکی تەواوە و پڕ لە ڕاز و ڕمووز و ئەسرارە هەتا لێی وەکۆڵدرێ، ڕاز و سوڕی لێ دەردەکەوێ. وەک ئەوە: دەکرێ بکوترێ: خاک خاوەن حەیاتە، بۆیە هەچی دە ناوی خرێ، حەیاتی تێ دەخرێ. دە سوورەی ئالی عیمراندا بەسەرهاتی حەزرەتی عیسا بەیان کراوە کە بێ باب هێنراوەتە دی لە حەزرەتی مریەمە. هەر ئەوەشە خودای تەعالا میسالی پێ دێنێتەوە بە ئادەم، دە سوورەی ئالی

عیمراندا بە ئایەتی ٥٩:

**إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثِمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾** ئالی عیمران

**بێگومان نموونەی عیسا لای خودا وەکوو نموونەی ئادەمە، خودا گڵی ئادەمی لە گڵ دارشت پاشان پێی کوت ببە و بوو.**

٩. حەزرەتی ئادم کە دە سوورەی بەقەرەدا باسی لە سەر کراوە بنچینەی بەشەرە لە بەرەی ئەودا پێغەمبەران دێنە دەر بۆ سەر زەوی. دە سوورەی ئالی عیمراندا حەزرەتی عیسا کە ئاخرین پێغەمبەری پێش محمد المصطفیﷺیە دێتە سەر زەوی. لە سەر ئەو ئەساسە دەتوانین بڵێین ئادەم دەو جودا هەوەڵین پێغەمبەرە، عیساش ئاخرین.

١٠. دە سوورەی بەقەرەدا بە وەسیلەی ئایەتی ٢٤ هەڕەشەیەکی توند و تەواو لە کافر دەکرێ وەک دەفەرموێ:

**فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾** بقره

**خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە وا سووتەمەنیەکەی مرۆڤ و بەردە کە بۆ بێ باوەڕان ئامادە کراوە.**

١١. دە سوورەی بەقەرەدا بەسەرهاتی حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیل کراوە کە داوای کردووە لە خودا بۆ بەرەی ئینسان پێغەمبەرێک هەڵخا دە ئاخردا، بە وەسیلەی ئایەتی ١٢٩ی بەقەرە دەتواندرێ سەیری ئەو داوایە چاو کرێ:

**رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾** بقره

**ئەی پەروەردگارەکەمان، لە ناویاندا پێغەمبەرێک هەڵبژێرە و بنێرە با ئایەت و نیشانەکانت بخوێنێتەوە بە سەریاندا، فێری کتێب و حیکمەتیان بکا و دەروونیان پاک بکاتەوە، بەبێ گومان هەر ئەتۆی زاڵ و کاربەجێ.**

١٢. دە سوورەی ئالی عیمراندا ئەسەری قبووڵ بوون و هاتنەدی ئەو داوایە هاتۆتە دی و چاو دەکرێ، بە پێی ئیشارات و گوفتەی ئایەتی ١٦٤ی ئالی عیمران:

**لَقَدْ مَنَّ اللّهُ عَلَى الْمُؤمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ**

﴿وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِي ضَلالٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾ ئالی عیمران

**بێ گومان خودا ناز و نیعمەتەکانی خۆی دارشت بە سەر بڕواداراندا، کاتێک پێغەمبەرێکی نارد هەر لە خۆیان، تا بەڵگە و ئایەتەکانی خودا بە سەریاندا بخوێنێتەوە، دەروونیان پاک بکاتەوە و قورئان و کوتە و کردەوەی خۆیان فێر کات؛ بێ گومان ئەوان لە پێشدا لە گومڕایی ئاشکرادا بوون.**

١٣. سوورەی بەقەرە هەر لە سەرەتاوە ڕاستی و دروستکاری و ڕێنومایی‌کەری قورئانی نیشان دا و بەیانی کرد بە وەسیلەی ئایەتی ٢: ﴿ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾

سوورەی ئالی عیمرانیش هەر هەمان مەتڵەب و مەبەستی لە ئاخردا بە وەسیلەی ئایەتی ٢٠٠ نیشان دا. ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾

١٤. سوورەی بەقەرە بە دوو ئایەت داکوژاوە بە پێی حەدیسی پێغەمبەر هەر کەس دە شەودا ئەو دوو ئایە بخوێنێ لە بەڵایان بە دوور دەبێ. سوورەی ئالی عیمرانیش دە ئایەتی ١٩٠ و ١٩١دا ئیشاراتی رکووعی تێدایە بە پێی حەدیس هەر کەس بیانخوێنێ، وەک تەواوی شەو نەنووستبێ و سوننەتی کردبێ وایە. (روح المعانی، ج ٣، ل ٩٩-٩٨)

ئەو چاردە شتانەی کە ڕامانگەیاندن شتانێکن ڕابیتەی دوو سوورەی بەقەرە و ئالی عیمران نیشان دەدەن. دیارە ئەگەر بە وردی سەیری هەر دوو سوورە بکرێ، تێکەڵاوییان زۆر لێ چاو دەکرێ و هەر ئەوەندە نین کە ڕاگەیێندران.

**هۆی دابەزینی سوورەی ئالی عیمران**

وەک مێژوونووسەکانی ئیسلام دەگێڕنەوە تاقمێکی شەست کەسی لە کەسایەتییەکانی نەجران کە لەو شەست کەسانە چاردەیان لە هەرە زانا و مەزن و ناودارەکانیان بوون، و هەر وا لەو چاردە مەزنە ناودارانەشیان، ئەمیرێک و وەزیرێک و قەشەیەکیان لێ هەڵبژارتن کە لە بابەت ئایینی حەزرەتی عیسا لەو سێ کەسانەیان ئاگادارتر و شارەزاتر نەبوو، ئەوانە دەیانهەوێ بێنە مەدینە بۆ خزمەت حەزرەتی ڕەسووڵ لە بابەتی حەزرەتی عیسا بدوێن دەگەڵ پێغەمبەر، ناوی ئەو سێ کەسە هەڵبژاردەیان کە لە بابەت عیسا و ئایینی عیسا دەستی باڵایان هەبوو ئەوانەن:

١. عاقب کە ئەمیر و خاوەن بیروڕای تەواو بوو کە بێ نەزەر و ڕای ئەو گەلی نەجران هیچ کارێکیان نەدەکرد، ناوی مەشهووریشی **عەبدولمەسیح** بوو.

٢. **سەیید** کە ناوی ئەیهەم (**اَیْهَم**) بوو، وەزیرێکی خاوەن پلە و مەقامی بەرز و قسە ڕەوا

بوو.

۳. **ابو حارثه بن علقمه،** ئۆسقۆف واتە عالم و زانا و ئاگـادار لە ئـایینی ئاسـمانیدا خـاوەن مەدرەسە و دەرس‌بێژی ئاینی عیسا، ئینجیل‌بێژ و ئینجیل‌زان و ناوداری وڵاتی خۆیان. تەنـانەت شای ئەو سەردەمی ڕۆمیٚ تەکیەگـا و بارەگـا و عیبادەت‌خـانەی بـۆ دروسـت کردبـوو. ڕێـز و ڕێزداری ئەو وڵاتی داگیر کردبوو.

جا ئەو تیپە بەو تیپ و دەبدەبەیەوە بۆ باس و جەدەل لە سەر عیسا کە بە خودایان دەزانـی، هاتن بۆ مەدینە بۆ خزمەت پێغەمـبەر، ئەوان خوێنـدەواری شـارەزا بە سـەر ئـایین و ڕابـردووی پێغەمبەرانـی دەوران بە خەیـاڵی خۆیـان پێغەمـبەریش نەخوێنـدەوار و بیٚ‌ئاگـا بە خەیاڵیـان، ڕاستەوڕاست کاتی نوێژی عەسر بوو هاتن واریدی مزگەوتـی پێغەمـبەر بـوون لە مەدیـنە. زۆر کۆک و پۆشتە و لیباس زۆرشیک و خاوێن و بەرچاو و شایانەیان دە بەردا بـوو، جـبە و عەبـا و چەفتە و عەگالە و بە کوردی وەک هێندێک لە مێزەر بەسەرانی خاوەن عەبا و جوببە و ڕیشداری ناو خاڵی شەرم و سامیان لیٚ دەکریٚ تا دەکەونە قسـە و بـاس، ئەو کـات دەردەکەویٚ وەک ئەو کەسانەی ئایەتی ۴ سوورەی منافقون ئاماژەی وەلا فەرموون:

**وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ وَإِن يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿۴﴾** منافقون

**کاتیٚ بیان‌بینیت قەبارەی دیمەن و ڕواڵەتیان، سەرسامت دەکات، ئەگەر وە قسـەش کەوتـن و گویٚ لە قسەیان دەگریت، هەر دەڵێی داری نـاو کولـۆر و هەڵپەسـێردراون. وا دەزانـن هەمـوو داخوڕینێک هەر بە سەر واندایە، هەر ئەوانن دوژمن، جا کەوایە ئەتۆ خۆتیان لیٚ بپارێزە، خودا بیانکوژیٚ چۆن وەردەچەرخێنرێنەوە؟!**

بە هەر حاڵ، دەو کاتەدا کە واریدی ناو مزگەوتی حەزرەی ڕەسووڵ بوون پێغەمبەر دەگەڵ یارانی (اصحاب) دە جەماعەتدا بوون. ئەوان نوێژی خۆیان ڕاگرت تا کاتی خۆی دادیٚ. کـاتیٚ پێغەمبەر لە نوێژ بوونەوە ڕوویان تیٚ کردن و بە دابی خۆیـان بەخێرهاتنیـان لـیٚ کـردن و پێیـان کوتن بۆ نوێژو دەگەڵ ئێمە دانەبەست؟ ئەوانیش کوتیان ئێستیٚ کـاتی نـوێژی ئـێمە نەهـاتووە. ئەدێرەدا پێغەمبەر تێگەیی و هەندێکیش لە یـاران کە ئەوانە هێشـتا نەبـوونە موسـوڵمان، ڕەنـگە مەسیحی بن. کاتیٚ وەختی نوێژی خۆیان هات هەستان نوێژیٚ بکەن خۆیان ڕێک‌وپێک کر بـۆ نوێژ کردن. یاران ویستیان نەهێڵن بەڵام پێغەمبەر زوو دە فریا کەوت فەرمووی لێیان گەڕێـن بـا

نوێژی خۆیان بکەن. نوێژیان کرد و لیێ بوونەوە. ئەوجار داوایان کرد لە حەزرەت ئێمە هاتووین دەگەڵت لە بابەت عیسا و ئایینی ئەودا قسە و باس بکەین و بدوێین. حەزرەتی ڕەسووڵ فەرمووی زۆر بەجێیە و باشە، فەرموون. لەڕێوە ئەو سێ نەفەرە هەڵبژێراوەیان واتە (عاقب، ئەیهەم و ئەبوحاریسەی ئیبنی عەلقەمە) هاتن نێزیکتر لە پێغەمبەر لەوانی دی، دەستیان کرد بە قسان، بەبێ ناو بردنی خودا. ئەدەو ساتەدا پێغەمبەر فەرمووی: ناوی خودا بێنن و موسوڵمان بن، جا دەس بکەن بە باس، ئەوانیش کوتیان ئێمە پێش ئیسلامی تۆ ئیسلام بووین. حەزرەتی ڕەسووڵ حەکیمانە فەرمووی پێیان، ئەو ئیسلامبوونەتان خودا لێ قبووڵ ناکا، چونکە ئێوە عیسا بە کوڕی خودا دەزانن و گۆشتی بەرازی دەخۆن و عیبادەتیش بۆ سەلیب دەکەن، جا لە بەر ئەو کار و ئاکارە ناڕەوایانەتان خودا ئایینتانی قبووڵ نییە و نایکا، کەوابێ ئیسلام نین. ئەوجار ئەوان هاتنە جواب و کوتیان: جا ئێمە ئەگەر هاتووین بۆ باس لە سەر ئەوەی ئیشارەت وەلا کرد، هاتووین بزانین ئەتۆ و ئاینی تۆ چۆنی سابت دەکەن کە عیسای بێ باب کوڕی خودا نییە؟ ئەگەر کوڕی خودا نییە، ئەدی بابی عیسا کێیە و لە کوێیە؟

حەزرەتی ڕەسووڵ فەرمووی پێیان، دڵ و گوێم دەنێ و ئەقڵیش وەگەڕ خەن و ڕێش بە ویژدان و ئینساف مەگرن تا بۆتان باس بکەم. ئەوانیش کوتیان فەرموو باسی بکە. ئەوە ئەو هەموو کەسەی وان و یارانی پێغەمبەریش لەوێن و بە سەر باس و ئەوزاع و جەریاندا تەماشاچین و دەڕوانن.

پێغەمبەر فەرمووی: ئایا بە ئەقڵ و بیری ئێوە دەکرێ کوڕ وەک بابی نەبێ و نەچێ، دە نەوعیەتدا، دە لەشدا، دە سیستم و شکڵ و قەوارەدا؟ واتە: دەبێ وەک یەک بن دە جنسیەتدا، دە شکڵدا، دە لەشدا؟ کوتیان بەڵێ: دەبێ وەک دەفەرمووی دەبێ وا بێ. دووبارە پێغەمبەر فەرمووی: ئایا پێتان وایە خودا دەبێ بمرێ؟ کوتیان نا. پێغەمبەر فەرمووی ئەگەر خودا بمرێ بۆ خودا نابێ. پاشان پێغەمبەر فەرمووی: عیسا دەمرێ، جا چۆن دەبێ خودا بێ و یا کوڕی خودا بێ؟ کوتیان بەڵێ ڕاستە، عیسا دەمرێ و خوداش نابێ بمرێ. پاشان پێغەمبەر فەرمووی خودا ڕزقی هەموو گیانلەبەرێک دەدا و ئاگاداریشیانە. ئایا مەگەر عیسا دەتوانێ ڕزقی خۆشی بدا؟ کوتیان بەڵێ خودا ڕازقی هەموو گیانلەبەرێکە و ئی عیساشە. پاشان پێغەمبەر فەرمووی: خودا نە دەخوا و نە دەخەوێ، بەڵام عیسا دەشخوات و دەشخەوێ. پاشان پێغەمبەر فەرمووی عیسا لە ناو زگی مریەمەی دایکیدا پێکهاتووە و سەر و سامان و شکڵی دراوەتێ. کوتیان بەڵێ وایە.

ئەوجار حەزرەتی ڕەسووڵ ڕووی تێ کردن میهرەبانانە فەرمووی جـا ئەگەر ئەوانەی ئەمـن کوتمن ئێوەش تەسدیقو کردن و ڕاست دەکەن، ئەدی جا چۆن باوەڕتـان وایە کە عیسـا کـوڕی خودایە؟ یا بۆ خودا دەبێ؟ دە حاڵێکدا دەشخوا و دەنوێ و پیر دەبێ و دەشمرێ! ئەوانیش واتە وەفدی نەجران چەند چرکەیەک بێدەنگ و جواب دامان. دەو ماوە بێـدەنگییەی وانـدا خـودای تەعالا بە وەسیلەی جبرەئیل سووڕەی ئالی عیمرانی تا هەشتا ئایەتی لێ نازڵ کرد و ڕایگەیاند بە پێغەمـبەری، پێغەمـبەریش مـۆڵەتی دان بیـر وەکەن، جـا پاشـان وڵامـی دەنەوە. پـاش مـاوە و مۆڵەتەکەیان بەیاناتی پێغەمبەریان بە ڕاست وەرگرت و ئی خۆیان بە نادروسـت. ئەمـما ئامـادە نەبوون موسوڵمان بن دەو کات و ساتەدا، کوتیان سـەرانە دەدەیـن. بـۆ زێـدە زانـین بـڕوانن لە تەفسیری کەبیر و روح المعانی، ج ٧/ ١٦٥ ، ج ٣/ ١٠٢.

دیارە وەک لە بیرمان مابێ دە سووڕەی بەقەرەدا بە درێژی لە سەر ئەو پیتانەی کە لە هەوەڵی هەندێک لە سووڕەکاندا هەن بە ناوی (حروفی مقطعه)، دواین بەڵام دیارە وەک دەڵێن و باسـی کراوە لە لایەن مامۆستای خودالێخۆشبوو «خاڵ»، یەکێک لە میسـریانی قورئـانزان بە نـاوی ڕەشاد خەلیفەی میسری، پاش خەریکبوونێکی زۆر توانیویەتی شتێکی تازە و نوێ لە سەر ئەو پیتانە وەدۆزێ تاقی کردۆتەوە دروست هـاتۆتە دەرێ. ئەمەش وەک شـتێکی بـاش بە ڕەوامـان نەزانی باز دەین بە سەریدا.

بیست و نۆ سووڕە لە قورئانی پیرۆزدا سەرەتایان بەو پیتانە داگیرساون. جا پیتەکان یـا یەک یا دوو پیتن، یا سێ یا چوار یا پێنج.

یەک پیتەکان وەک سووڕەکانی «ص، ق، ن»؛ دووپیتەکـان وەک «طه، طـس، یـس، حـم» (غافر، فصلت، زخرف، دخان، جاثیه، احقاف) ئەو سووڕەتانە دوو پیتـین. سـێ پیتەکـان وەک سووڕەکانی (بقره، ال عمران، عنکبوت، روم، سجده، لقـمان، یـونس، هـود، یوسـف، رعـد، ابراهیم، حجر، طسم، شعرا و قصص). ئەوانەی بە چوار پیت دەس پێ دەکـرێن، سـووڕەکانی (المر: رعد، المص: اعراف)ن. ئەوانەی بە پێنج پیت دەس پێ دەکرێن سووڕەکانی (کهیعص و حم، عسق)ن.

دیارە ئەوەندە سووڕانە دوای (بسم الله الرحمن الرحیم) بەو پیتانە دادەگیرسێن. قورئـانیش کە موعجیزەیەکی ئەبەدییە وا نییە بکوترێ هەر ئەوەندەیە کە تا ئەوڕۆ زاندراوە. یا بڵێـین زانینـی قورئان دە یەک دەوردا تەواو دەبێ، بەڵکە قورئان بە بەژن و باڵای هەموو دەور و زەمانی دنیـا و

ئاخرەت گیراوە، بەشی هەمانی تێدا، دە هەر دەورێکدا لێی وەکۆڵدرێ بەشی لێ دەردەکەوێ و چاو دەکرێ.

جا لە سەر ئەو ئەساسە جەنابی ڕەشاد خەلیفەی میسری حەولی داوە بزانێ ئەو پیتانە بێجگە لەو مانایەی کە تا ئەوڕۆ لێیان زاندراوە، مانا و ڕازی دیکەیان تێدایە؟ ئینجا ئەویش بەو مانا و بەراوەردە تازەیە گەیشتووە.

بە قەولی ناوبراو (ڕەشاد خەلیفەی میسری)، هەمیشە ئەو پیتانەی لە سەرەتای سوورەکانن، پیتی یەکەم لە پیتی دووهەم زیاتر هاتووە دە سوورەکەدا و پیتی دوو لە پیتی سێ و سێ لە چوار و چوار لە پێنج زیاتر دە سوورەکاندا هاتوون. بۆ نموونە سەیر کە:

| **الف لام میم** | **بقره** | **آل عمران** | **عنکبوت** | **روم** |
|---|---|---|---|---|
| **ئەلف** | ٤٥٩٢ | ٢٥٧٨ | ٧٨٤ | ٥٤٧ |
| **لام** | ٣٢٠٤ | ١٨٨٥ | ٥٥٤ | ٣٩٦ |
| **میم** | ٢١٩٥ | ١٢٥١ | ٣٤٤ | ٣١٨ |

ئەو شکڵ و دیمەنە دەڵێ: ئەو پیتانەی لە سەر سوورەکان نیشان دراون و ئا وا لە نەزم دراون لە سەر ئەساسی موعجیزەی قورئان و ئیسبات و تەبرەئەی قورئان لە دەسکردی ئینسان نیشان دەدا، پیتی هەوەڵ لە (الم)دا (الف)ی زیاتر دە سوورەکەدا هاتووە و (ل) لە (م) زیاتر هاتووە. هەر وا بەو شێوە تا زانست و زانیاری بڕواتە پێش ئیعجازی قورئانیش دەردەکەوێ و دێتە پێش، دەبێ بە باوەڕێکی پتەو و خالیس بکوترێ: هەر خودا بۆ پەرستن دەبێ. تەنیایی هەر شایان بەوە، نەک عیسا کوڕی خودایە، وەک گاورەکان دەڵێن، نە عوزەیر کوڕی خودایە، وەک جوولەکەکان دەڵێن. کەسێک شەریک بۆ خودا دانێ، زوڵم لە ئەقڵ و هەست و شعوور دەکا.

## دەسپێکی تەفسیری سوورەی ئالی عیمران

بِسمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ
**بە ناوی خودای خاوەن ڕەحم و بەزە.**

الم ﴿١﴾ اللَّهُ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ﴿٢﴾ ئالی عیمران
**الم (١) خودا ئەو خودایەیە کە هیچ خودایەک نییە ئەو نەبێ، کەسیش شایانی پەرستن نییە ئەو نەبێ. زیندوویەکی هەمیشـە ڕاوەسـتاوە و بەردەوام بە زاتـی خـۆی بـێ پـاڵدانەوە بە غەیـری خۆی؛ دابینکەر و هەڵسووڕێنەری بوونەوەرە.**

هەرچەند ئەو ئایەتە دووەی ئالی عیمران بەشـێکە لە ئـایەتی ٢٥٥ی بەقەرە، وەک دووپـاتە بێ، بەڵام دەبێ ئەوە بڵێین دێرەدا بۆ دەمکوت کردنی ئەوانەی دەڵێن خودا خـاوەن کـوڕە، وەک گورزێک بوەشێندرێ، بەو دوو سیفەتە بەرزانەی (حيّ و قيّوم) واتە زاتـی قەدیـم و بـێ هەوەڵ ناکرێ شتی خاوەن هەوەڵ و ئاخری وەپاڵ درێ.

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وە سەر ئایەتی ٢ی ئالی عیمران

واژەی (حيّ) واتە خاوەنی حەیات و بوون، بەڵام کـام حەیـات و بـوونە؟ واتە حەیـات و بوونێکی بێ هەوەڵ، زانا بە هەرچی هەیە و دەبێ و دەڕوا، تەوانـا بە سـەر هەچـی وازی بێنـێ، گیاندەر و حەیاتدەریشـە بەوانەی کە خـاوەن حەیـاتن. گیـان و حەیاتسـتێنەوەیە لە هەرچـی خاوەن هەست و حەیاتە. بە کوردی هەچی حەیاتە لەوڕا حەیاتە و هەچی حەیـاتە دەگەڕێـتەوە پاڵ حەیاتی کوللی کە خودایە و ئەو حەیاتەی خـودای حەی، نە قەت مانـدوو دەبـێ، نە قەت بێواز دەبێ، نە قەت سست و شل و تەمبەڵ دەبێ، نە نیازی بە خواردن و خـواردنەوە دەبـێ، نە دەخەوێ و نە وێژینگان دەدا، خاوەن بیستنە، خاوەن دیتنە. ئەو حەییە بەو هەموو سیفاتە بەرز و هەمیشەیانەوە خاوەنی (قیوم)ە، واتە بەردەوام ڕاوەستاو بە خۆیەوە، بـێ وەسـیلە، بـێ واسـیتە، پارێزەر و چاوەدێر و ئاگادار بە سـەر هەچـی هەیە و دەبـێ و دەڕوا، لە نەزمـدەر و دابیـنکەری هەموو بوونەوەرە.

ئایەتی (لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ) دیـارە ئەوە لە دەم دانـی گـاور و تەرسـایەکانە کە دەیـانکوت عیسـا

خودایە، یا کوڕی خودایە، دەبێ ئەویش عیبادەتی بۆ بکرێ. جا بۆیە خودا فەرمووی کەس شایانی پەرستن نییە، بەغەیرەز خودا، هەر وا خودای تەعالا بۆ قایموقۆڵ کردن و ڕازانەوەی ئەو ئایەتە ئەو سیفەتە بەرز و پڕ لە ڕازانەی (الحيّ القيّوم)ی هێنا. (حيّ) واتە حەیاتێکی پڕ لە هەست و زانست و دەرک. (قيّوم) واتە ڕاوەستاو بە زاتی خۆی.

هەندێک لە زانایان کوتوویانە (حيّ) یانی نەمر و هەمیشە زیندوو، (قيّوم) یانی بێ هاوتا و بێوێنە.

**تیوتیوە:**

خودای تەعالا بە پێی سیفەتی (حيّ) واتە حەیاتبەخش و گیاندەر بە هەرچی بیهەوێ، و بە پێی سیفەتی (قيّوم) واتە ڕاوەستاو و بەردەوام و چاوەدێری بوونەوەر بە ئیرادە و ویستی خۆی، بە کوردی و بە کورتی هەچی بوونە، لەوڕا بوونە و هەچی حەیاتە لەوڕا حەیاتە. جا لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ هەچی هەیە، کڕنۆشی بۆ بەرێ و بیپەرەستێ.

ئەوجار هەچی ئەقڵ و هەست و شعوورە پڕ بە یەقین و باوەڕەوە هاوار دەکەن: خودایەکی ئەوانەی سیفەتی دایمی بن واتە (حيّ و قيّوم)، سیفەتی زاتی بن بۆ پەرستن دەبێ و بۆ تەنیایی وبێنیازی دەبێ، تاوانێکی گەورەیە کە غەیرەز ئەو کەسێکی دی بە خودا بزاندرێ. دێرەدایە بۆمان دەردەکەوێ و سابت دەبێ کە هەوەڵی سوورەی ئالی عیمران بۆیە بە ئایەتی تەوحید ڕازاوەتەوە وەک (اللَّهُ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ) تاکوو لەڕێوە ڕەد بێ لە سەر مەسیحیان کە لە بابەت خوداناسین بوونە سێ دەستە:

١. دەستەیەکیان دەڵێن عیسا خودایە،

٢. دەستەیەکیان دەڵێن عیسا سێهەمین خودایە (عیسا و مریەمە و خودا)

٣. دەستەیەکیان دەڵێن عیسا کوڕی خودایە.

جا بۆیە بۆ ڕەد کردنەوەی ئەو ئەقیدە و باوەڕە بەتاڵەی مەسیحیان هەشتا و چەند ئایەتی قورئان بە دوای یەکدا دابەزیون.

ئەوجار دەچینە خزمەت ئایەتی ٣ کە لە بابەت دابەزینی قورئان و تەئید کردنی بە تەورات و ئینجیل دەدوێ و باس دەکا، تێماندەگەیێنێ کە قورئان حەقە و یەهوود و مەسیح بێخود ئینکاری قورئان دەکەن، چونکە کتێبەکەی خۆیان تەسدیقیان کردووە کە قورئان حەقە و کەلامی خودایە.

نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ التَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ ﴿٣﴾ ئالی عیمران
**خودا ئەو خودایەیە کە قورئانی بە هەق و ڕاستی بۆ دابەزاندووی، کە ئەو قورئانە تەئیدکراوی کتێبەکانی پێش خۆیەتی، «هەر ئەو خودایەی کە قورئانی ناردۆتە خوارەوە» تەورات و ئینجیلیشی ناردۆتە خوارەوە.**

**تێڕوانین و ئاوڕ وەسەر دانەوەیەکی هەستیارانە وە سەر ئایەتی ۳:**

خودای تەعالا دەفەرموێ: ئەی محەممەدﷺ قورئانی ڕاستیم بەڕاستی بۆ ناردی کە ئەو قورئانە خاوەن باوەڕە بەو کتێب و نامانەی کە لە پێش خۆیدا هاتوون بۆ سەر پێغەمبەرانی پێش تۆ. واتە دەبێ بڵێین و باوەڕیشمان بێ کە ئەوەی دەو قورئانەدایە ڕێکی ئەو نامانەن کە لە پێشا واتە دە پێش قورئاندا هاتوون بۆ پێغەمبەرانی پێشوو. بەڵام پێش دەسکاری کردنیان.

ئەگەر یەکێک هات و پرسیاری کرد و کوتی: دەبێ ڕاز دەوەیدا چ بێ کە بۆ کیتاب کە قورئانە (نزّل و تنزیل) دەکار کراوە بەڵام بۆ تەورات و ئینجیل (انـزل) بە کابر بـراوە؟ دەبێ لە وەڵامی ئەو پرسیارە زانستییەدا بکوترێ: (تنزیل) بۆ (تکثیـر)ە، واتە زۆر، یانی قورئان دەستە دەستە و چین لە دوای چین بە پێی نیاز دابەزیوە، بۆیە مانای زۆر دەبەخشێ؛ بەڵام تەورات و ئینجیل یەک دەفعە هەمووی دابەزی. کەوایە بۆیە بۆ تەورات و ئینجیل (انزال) تایبەت کرا، قورئانیش چونکە چین چین دە ماوەی ۲۳ ساڵاندا دابەزی، بۆیە لەفزی (تەنزیل) دەکار دەکرێ.

پێویستە دێرەدا ئەوە بزاندرێ کە خودای تەعالا قورئانی بە دوو سیفەتی ۱. حقّ ۲. مصدّق ناودێر کرد: حقّ واتە لە بابەت ڕاگەیاندنی کارەسات و بەسەرهاتی ئۆمەتانی ڕابردوو ڕاستە و حەقە و لە بابەت وعدە و وەعیددا حەققە و ڕاستە، وە هەروا حەقیش بە مانای (فصل) هاتووە واتە حەق وەک ئایەتی ۱۳ «طارق» ئاماژەی وەلا کردووە: ﴿إِنَّهُ لَقَوْلٌ فَصْلٌ﴾ بە تەئکید ئەو قورئانە جیاکەرەوەی حەق و باتڵە، قەولێکی ڕاست و بێ درۆیە.

مصدّق: تەسدیقکەری کتێبەکانی پێش خۆیەتی. یا دەڵێن: خودا ڕاست قورئانیش ڕاست.

دڵ دەیهەوێ بزانێ ئەو دوو لەفزی تەورات و ئینجیل چن؟ لۆغەتزانان کوتوویانە: هەر دوو لۆغەت عەجەمین، تەورات عیبری و ئینجیل سریانییە. ئەگەر دەشتهەوێ بە درێژی بزانی ئەو دوو لۆغەتانە عەرەبین لە چ بابێکن، یا عەجەمین بێ باب، بڕۆ تماشای تەفسیری کەبیری ئیمام فەخری ڕازی یا «تبیین الفرقان» بکە.

یەکێک دێ دەپرسێ و دەڵێ: هۆی ئەوەی چییە زیاد لە کێتبەکانی ئاسمانی، تەنیا تەورات

و ئینجیل دێرەدا ناو براون؟ وڵام بە پێی فەرموودەی زانایان ئاوا دراوەتەوە:

ئەو دوو کتێبانەی تەورات و ئینجیل لە قورئـان دەبـێ لە هەچـی کتێبەکـان و وەرەقەکـانی (صحف) ئاسمانین بەربڵاوتر و جامعترن دەگەڵ قورئان مناسەبە و ڕابیتە و تێکەڵاوییان زیاترە، جگە لەوەش دەورانـی تەورات و ئینجیـل دەگەڵ دەورانـی قورئـان بە سـەر یەکەوەن، چـونکە ئینجیل کە بۆ حەزرەتی عیسا دابەزیوە، کەمە دەورانێک پێش حەزرەتی محمد المصطفیﷺ بووە واتە بڵێین شەش قەڕن نێوانیان بووە. عیسا ئاخرین پێغەمـبەری «اولـوالعزم»ی پـێش پێغەمـبەر محەممەدﷺ بووە. وەهەروا تەورات هەرچەند بە نیسبەتی ئینجیل لە ئیسلام دوورترە، ئەمـما بەو هۆیە کە تەوراتی حەزرەتی مووسا لە پاش مووسا مەعموول و مەشموولی تەواوی پێغەمـبەران بووە لە ئێمەی ئیسلامی خاوەن قورئان نزیکترە. (تفسیر تبیین القرآن، ج ٥، ص ٣٦)

**پوختەیەک**

**(نـزّل)** واتە چـین چـین و دەم بە دەم دەگەڵ ئەوزاعـی دەوران وەک ٢٣ سـاڵی دەورانـی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی محمد المصطفیﷺ بێت.

**(انزل)** واتە یەکپارچەی یەککەڕەت دابەزیوە. جا لە سەر ئەو بەراوەرد و ئەساسـە ﴿نَـزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ﴾ واتە هاتنە خوارەوەی قورئان؛ ﴿أَنزَلَ التَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ﴾ واتە هـاتنە خـوارەوەی تەورات و ئینجیل.

﴿بِالْحَقِّ﴾ یانی خودا بە حەقـی ئەو قورئـانە حەقەی دابەزانـدە سـەر تـۆ، لە هـیچ دەور و زەمانێکدا لە حەق ناکەوێ، هەر کەسیش دەسـتی تێ گـرێ لە حەق نـاکەوێ، دەگەڵ عـالەمی هەستی واتە بوونەوەر بە حەق دەدوێ و دەجووڵێتەوە، پارێزەری مافی هەموو خاوەن مافانە.

﴿مُصَدِّقاً﴾ واتە ئەو قانوون و شتانەی کە دە کتێبەکانی پێش خۆیدان تەئیـد و تەسـدیقیان دەکات، نیشانەکانیشیان هاتنی محمد المصطفی و دابەزینی ئیسلام بە یاسایەوە.

تەورات کەلیمەیەکی عیبرییە بە واتای شەریعەت. پێنج نوقتەی لە خۆ گرتـووە: ١. سـفری تەکوین ٢. سفری خروج ٣. سفری لاویین ۴. سفری عەدەد ٥. تثنیة اشتراع.

ئەوانە واتە: بوونەوەر، هاتنە دنیـا؛ چـوونە دەر لە دنیـا؛ ژمـارە و حیسـاب، یاسـای دنیـا و قیامەت.

یەهوودییەکان دەڵێن مووسا تەوراتی نووسـیوەتەوە، نەسـاراکان دەڵـێن: تەورات دەورانـی

کــۆن و تــازە نیشــان دەدا و خــاوەن داســتان و چیرۆکەکــانی پێغەمــبەران و مێــژووی بەنــی ئیسرائیلەکانی پێش حەزرەتی عیسایە.

ئینجیل کەلیمەیەکی یۆنانییە بە مانای مزگێنی و یا فێر کردنی تازە هاتووە، واتە فێـر بـوونی ئادابی دەورانی تازە. بە کوردی فێر بوونی دینی عیسای مەسیح.

قەڕنێک یا دوو قەڕن پاش وەفاتی حەزرەتی عیسا خائینانی ئایینی ئاسمانی بە چوار شـێوە ئینجیلیان دایە دەرێ و نووسـییانەوە لە ڕووی ئەسـڵی ئینجیلـی ئاسـمانی. یـانی هەر کەس بە قــازانجی خــۆی دەســتی تــێوەردا هەچــی زانییــان لە بــابەت قورئــان و پێغەمــبەر محمــد المصطفیدایە دەریانهێنا و ونیان کرد لە عالەم، هیچ بەڵگەیەکـی ئەوەش کە ئـاوا نووسـیویانە کام کەسەیە لە دەسدا نییە. ئەو چوار ئینجیلە نـووسراوانەش ئەوانەن کە نـاوی نووسەرەکەشـی دیار نییە. ئینجیل ناوی چوار کتێبی نووسراون لە لایەن: ١. مەتا ٢. مەرقەس ٣. لۆقا ٤. یوحەننا لە ژیانی عیسادا. پاش مەسـیح بە مـاوەیەکی زۆر نـووسراون تـا سـەدەی چـوارەمی مەسـیحا دەرنەخراون، چونکە بە عیسا بە دەس جوو ڕۆمیانەوە دەربەدەر کرابوون، کاتێ پادشای وەخـت (قسطنطین) بوو بە گاور خەڵک لە ترس ڕزگار بوون ئەو کتێبانەیان دەرخستن بە ناوی ئینجیـل قبووڵیان کردن، ئەو تەوڕات و ئینجیلەی ئێستا هەن، خودا نەیناردوون. ئەوانی خودا نـاردوونی لە ناو براون. (خاڵ).

بە کوردی، زۆردارانی دەوران لە سەر ئارەزووی خۆیان تەورات و ئینجیلیان گۆڕیون.

دە عورفی قورئاندا تەورات واتە ئەو کتێبەی کە نازڵ کراوەتە سەر مووسا، ئینجیـل واتە ئەو کتێبەی نازڵ کراوەتە سەر عیسا کە مژدەی هاتنی محمد المصطفی و شەریعەتی بەحەقی ئەوی تێدایە. (تفسیر منیر)

دڵ دەیهەوێ بزانێ دابەزینی تەورات و ئینجیل کەنگێن؟ دەبێ بۆ زانینـی ئەو داخـوازییەی دڵ بچینە خزمەت ئایەتی ٤:

**مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ الْفُرْقَانَ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِآيَاتِ اللّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَاللّهُ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ ﴿٤﴾** ئالی عیمران

(ئەو ئایەتە ئاراستەی پێغەمبەرﷺ کراوە)، واتە خودا قورئانی بۆ تۆ ناردۆتە خوارەوە کە حەقە و گومانی تێدا نییە ... ئەو قورئـانە کە بـاوەڕی هەیە بەو کتێبـانەی پێشـتر بـۆ پێغەمبەرانـی دی نێـردراونەتە خـوارەوە. هەروا لەوە پـێش تەورات و ئینجیلیشـی نـاردۆتە خـوارەوە، بـۆ ئەوەی

هیدایەت بن بۆ خەڵکی، بەڵام ئەو دوو کتێبە خاخام و قەشەکان لە سەردەمەکانی پێشـوودا کەم و زیادیان تێدا ئەنجام داون و دەسـتکارییان کـردوون، ئەوەی تـا ئێسـتا لە بەردەسـتانیدایە، ئەو کتێبانە نین کە خودا ناردوونیە خوارەوە.

﴿وَأَنزَلَ الْفُرْقَانَ﴾ «فرقان» ئەو شتەیە کە چاک و خراپ لێک جیـا دەکـاتەوە. هەنـدێک لە تەفسیرزانەکان دەڵێن مەبەست لە «فرقان» هۆش و بیر و ئەقڵە کە خودا داویەتی بە ئادەمیزاد، بۆ ئەوەی بزانێ بە چاکی ژیانی خۆی بباتە سەر. هەندێکیش دەڵێن مەبەست لە «فرقـان» قورئـانە. جێی سرنجە هەر بەخششێکی خودا کە زۆر بەسوود بێـت بـۆ ئینسـان، خـودا بە دەسـتەواژەی (أنزلنا)ی ناردۆتە خوارەوە و باسی دەکات.

**إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِآيَاتِ اللّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَاللّهُ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ ﴿٤﴾** ئالی عیمران
**بێ گومان ئەوەی بە کتێبەکانی خودا کافر بوون لە ڕۆژی دواییدا دوچاری سزای قورس دەبـن، خودا بە سەر هەموو شتێکدا زاڵە و بەتوانایە، تۆڵەسێنەوەیە.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە سەر و سیمای ئایەتی ٤:**

سیفەتی «عزیز» واتە زاڵ بە سەر هەرچی بیهەوێ و هیچ شـت نەتـوانێ بە سـەر ئەودا زاڵ بێ. «ذو انتقام» واتە فاعیلی عەزاب کەس نەتوانێ بەرگریکەری بێ. «عزیـز» سـیفەتی زاتیـیە، «انتقام» سیفەتی فیعلییە. (طبری، ج ١٦٥/٣)

دەبێ بە تەئکید ئینسانی خاوەن باوەڕ و ئیمان ئەو باوەڕەی بێ کە ئامانج و هەدەفی واقیعی لە دابەزینی تەواوی ئایینی ئاسـمانی و ئەحکامەکانیـان لە هەمـوو دەور و زەمانـدا ڕێنومـایی و شارەزایی ئینسان بۆ سەعادەت و بەختەوەری هەر دوو وەرزەکانی دنیا و قیـامەتە، جـا لە سـەر ئەو ئەساسە ڕاستییە ئایینەکانی ئاسمانی لە ئەسڵی ئامانج و ئەهدافی خۆیاندا جیاوازییان نیـیە، بەڵکە یەک ئامانجن کە خوداناسـییە لە سـەر ئەساسـی تەقـوا. بەڵام ئەوەی کە هەنـدێک جـار قورئان ناوی بە کتێب دەبرێ و دە هەندێک شوێنیشدا بە «فرقان»، ئەوە ئیشـارەیە وەلای ئەو ڕاز و مەبەسـتە کە ئەگەر ئەو حـوکم و دەسـتووراتەی وەحیـی باریتەعـالا دەیـهەوێ بە ئینسـانی ڕاگەیێنێ لە بابەت کتێبەوە بێ، ئەوە ناوی «قرآن» دەوێدا بە کتێب ناو دەبا؛ بەڵام ئەگەر بێتو ئەو حوکم و دەستووراتەی وەحیـی باریتەعـالا دەیـهەوێ بە ئینسـانی ڕاگەیێنـێ لە بـارەی جـودا کردنەوەی حەق لە باتڵ بێ، یا فەرقی چاک و خراپ بێ، وە هەروا هاوێری پـاک و پـیس بـێ، ئەوە دەو جێگا و شوێنانەدا ناوی قورئان بە «فرقان» دەبا.

دیارە دڵ و باوەڕ دەبێ لەو بارەوە شکی نەبێ و نەکەوێتە وەسوەسە و دوودڵییەوە، چونکە ئەگەر مەیدان بدرێ بە ئەقڵ و هەست و شعوور، ئەو ڕێگە ڕاست و پان و بەرینە چاو دەکا کە خودا غەرەزی دەگەڵ مەخلووقی خۆی نییە، تاکوو ڕێگای خراپی وەبەر بنێ و پێغەمبەرانیش کە لە نەسلی ئینسانن غەرەزیان دەگەڵ ئینسان نییە تاکوو درۆیان بۆ هەڵبەستن، ئیفتیخار و شانازی وان دەوەیدایە ئینسان تابیعی ڕێی ڕاست و دروست بێ و دەگەڵ یەک حاواوە و ئەهل و سەهل بێ؛ هەر وەک فەرماندەیەک دەیهەوێ تەواوی ئەو سەربازانەی کە لە ژێر دەستووراتی ئەودان، ڕێکوپێک و بەنەزم و نیزام بن و یاسازان و یاساپارێز بن، پێغەمبەرانیش هەر ئا وان. هەر کەس بڵێ وا نییە و بە پێچەوانەی ئەو یاسایە وەجووڵێ و هەڵوێست بگرێ، ئەوە پێی دەکوترێ «لجوج» واتە لەج واتە چەپڕەو و لاسار و خوار و خێچپەرست و مونکیری حەق و ڕاستی، وەک کافر و منافق و فاسق و تاغووت و جبت و مترفین.

**پوختەی مەبەست: چاوەی قورئان**

غەم و خۆشی و ڕەنج و ڕاحەتی و سەعادەت و شەقاوەتی ئینسان سەرچاوە لە چاوەی فکر و بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی هەڵسوکەوتی ئینسان دەگرێ. بەو دەلیلە کەسانێکی کە چاوەی دڵ و دەروونیان لە نووری ئیمان و باوەڕی بە خودا خاڵی بێ، هەر ئەندازە دنیا و سامانی دنیاشیان هەبێ، چاوەی دڵیان تەنگ و وێرانە، تروسکایی ویژدان و کەرامەتی لێ چاو ناکرێ، چونکە سەعادەت و شەقاوەت دوو جۆرن: یا ڕۆحین، یا لەشین؛ سەعادەتی ڕۆحی لە سەعادەتی کۆمەڵدا سەرچاوە دەگرێ و لەوێڕایە، چونکە ڕۆح دەگەڵ ئەرواحی کۆمەڵ یەک بەشن، یەک لەشن، خۆشی و ناخۆشییان وێکڕایە و پێکەوەیە؛ ئەگەر بەشێکیان کەوتە ناڕەحەتی، بە تێکڕا ناڕەحەتن؛ دیارە خۆشیشیان هەر وا.

سەعادەتی لەشی لە لەززەتی دنیای سامان و کەیف و هەوا و ئیشتیا و ئارەزووەوە سەرچاوە دەگرێ، دەخڵی بە سەر ڕۆح و مەعنەوییەتەوە نییە، لە ئاداب و ئەدەبی ئینسان بەرییە. ئەو ئینسانە بە ناچاری دەبێ بۆ پارازتنی ئەو سەعادەت و خۆشییە لەشە، هێزی زۆرداری و تەجاوزکاری دەکار کا و وەگەڕ خا، ئەگەر تێیدا سەر کەوێ، ئەوە ماڵی قیامەتی خۆی و دنیای هاوچەشنانی خۆی وێران کرد بۆ پشوویەک لەزەت و خۆشی دنیا، ئەگەر تێیدا سەر نەکەوت ئەوە ماڵی هەر دوو دنیای خۆی وێران کرد چونکە نیەتی پیس و گڵاو بوو.

قورئان ئەو جۆرە ژیان و بوونانەی سەعادەتی لەشی بە «متاع قلیل» ناو دەبا. چونکە هەر

جۆرە جـووڵانەوەیەکی ئینسـان ئەگەر بە زەرەری هـاواڵان و هاونەوعـانی خـۆی بـێ، قورئـان مەحکوومی دەکا، واتە خودا. ئەمما هەر جۆرە جووڵانەوەیەک کە بۆ سەعادەت و بەختـەوەری ئینسان و گیانان وەگەڕ کەوێ، قورئان پەسەندی دەکا، چـونکە ئەو جـۆرە جـووڵانەوانە گەڕی خودا و گەڕی ئینسانانی خودان، زۆردار بۆ کوێ دەچێ؟ بەرەو کوێ؟

**تیو تیوە:**

دە ئایەتی ٢دا بە ڕوونی کوترا خودا خاوەنی دوو سیفەتی «حيّ» و «قيّوم»ە، دیارە ئەو دوو سیفەتەی خودای تەعالا ئەوە دەڵێن کە خودای تەعالا دەبێ بە سـەر تەواوی قـازانج و زەرەر و کاروباری مەخلووقاتی خەبەردار و بەتوانا بێ، چونکە بەڕێوە بردن و سەرەوبەر کردنی بوونەوەر بە زانست و قودرەت نەبێ، نابێ و ناکرێ؛ واتە دەبێ بە نیاز و کەیفیەتی ژیانی تەواویان زانا بێ و بشتواندرێ لە هەموو باران و بواران نیازیان جێبەجێ بکرێ.

ئەو شێوە ئیدارە کردنەش لە دەس خودادا نەبێ، نابێ، چـونکە هەر ئەوە خـاوەنی ئەو دوو سیفەتەیە «حيّ و قيّوم»؛ جا بۆ ئیسباتی ئەو داوایە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٥:

**إِنَّ اللّهَ لاَ يَخْفَىَ عَلَيْهِ شَيْءٌ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ ﴿٥﴾** ئالی عیمران

**بێ گومان خودا لای شاراوە نییە، هیچ بوونەوەر و شتێک، نە لە زەوی و نە لە ئاسمان.**

**تێڕوانین و ئاوڕ وەسەر دانەوە وەسەر ئایەتی ٥:**

ئاسمان و زەوی دوو شتی بەرابەر و ڕوو بە یەکن، زەوی تەنیا بەو ئەرزە ناکوترێ کە ئێمەی لە سەرین، بەڵکە هەرچی لە ژێرای ئاسماندا بێ پێی دەکـوترێ زەوی. وە هەر وا ئاسـمانیش بە تەواوی ئەوە دەکوترێ کە لە سەرووی زەویدایە تا نیهایەت؛ جا ئە دێرەدایە کە دەبێ باوەڕن بـێ بەوەی زانستی خودای تەعالا هەچی لە زەوی و ئاسماندا بێ، دەورەی داوە دە خۆیدا بە هـۆی سیفەتی «قيّوم»یەتی. (روح المعانی، ج ١٠٥/٣)

دەکرێ بکوترێ ئەو ئایەتە باوەڕی گاورەکانی نەجران دەباتەوە پاش و بەتاڵی دەکـاتەوە کە پێیان وا بوو عیسا خودایە و غەیبزانیشە، چونکە ئەو کەسـەی ئاگـاداری ئاسـمان و زەویـیە و خەبەرداری خشەی مار و مێروویە، هەر خودای بێهاوتایە، نە حەزرەتی عیسا؛ چونکە عیسـای ئینسان، ئەوەی خودا بە هۆی وەحی خەبەرداری نەکا نایزانێ و ئاگادار نییە.

ئەو کەسانەی عیسایان بە خودا دەزانی هۆیەکەی ئەوە بوو کە دەیانگوت عیسـا نهێنـیزانە

چونکە بە عالەمی دەکوت: ئەتۆ ئەوشۆ ئەو چێشتەت خواردووە، وە هەر وا بە یەکێکی دەکوت ئەوڕۆ ئەتۆ ئەو کارەت کردووە؛ بێ ئەوەی کەس پێی بڵێ. و هەر وا لەو لایەشەوە کە عیسا مردووی زیندوو دەکردنەوە، کوێر چاوی دەکردنەوە، و هەر وا لە قوڕ و گڵ تەیری دروست دەکردن، کە ئەو کارانە لە دەستی غەیری عیسای نەدەهاتن و دەیانکوت عیسا خودایە، ئەگەر خودا نەبا، وەک مە ئینسان با، نەیدەتوانی ئەو کارانە بکا.

جا خودای تەعالا بۆ وەی بە دەلیل پێیان بسەلمێنێ کە عیسا خودا نییە و ئەقڵیش قبوولی ناکا، هات فەرمووی: خودا دەبێ خاوەنی ئەو سیفەتە بەرزە بێ (حیّ) واتە هەمیشە زیندوو و گیانبەخش و حەیاتبەخش بە زەوی، وە هەروا خودا دەبێ خاوەنی ئەو سیفەتە بێ (قیّوم) واتە ڕاوەستاو بە زاتی خۆی، دەیجا هەچی ئەقڵە ئەوە دەسەلمێنێ و باوەڕی پێ دەکا کە عیسا نە ئەو «حیّ»ەیە کە سیفەتی خودایە، واتە هەمیشە زیندوو بێ، نە ئەو «قیّوم»ەیە کە سیفەتی خودایە واتە ڕاوەستاو بە زاتی خۆی، جگە لەوانەش ئاگاداری پێغەمبەران بە نهێنی، لە ڕووی وەحیە، نەک سەربەخۆ.

دێرەدا باسی حەزرەتی عیسا هاتە گۆڕێ کە هەندێک لە ئینسان باوەڕیان وا بوو خودایە، ئەوەی دڵ دەیهەوێ بزانێ دێرەدا ئەوەیە: خودای تەعالا دە ئایەتی ١٧١ی نیساءدا دەفەرموێ:

> **إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللّه وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ ﴿١٧١﴾** نساء
> **بێگومان مەسیح عیسای کوڕی مریەم بێجگە لە نێردراو و وشەی خودا هیچێکی تر نییە، نێردرا بۆ مریەم و گیانێکی بەخشراوە لە لای خوداوە.**

دڵ دەیهەوێ بزانێ مەسیح یانی چی؟ وەهەروا دەشیهەوێ بزانێ «کلمة» یانی چی؟ بۆ چیش ڕاستەوخۆ بە عیسا کوترا «روح منه»، واتە ڕوحوڵڵا؟ خۆ هەچی گیانی دە بەردایە، ڕوحی خودای دە بەردایە، دەتواندرێ «ڕوح الله»ی پێ بکوترێ.

وەڵام: مەسیح چەند هۆیەکی هەیە کە دراوەتە پاڵ عیسا، بۆ نموونە عیسا نەخۆش و کوێر و کەچەڵ و گولی بە وەسیلەی موعجیزە چاک دەکردەوە، واتە دەستی بە سەردا دێنان چاک دەبوونەوە، بۆیە پێیان کوتووە مەسیح. لەفزی مەسیح ١١ جار دە قورئانی پیرۆزدا هاتووە و بە کار براوە.

«کلمة» یان «کلمة الله» یانی خودای تەعالا عیسای بە «کلمة الله» ناودێر کردووە واتە بە کەلیمەی «کُنْ» چونکە خولقانی حەزرەتی عیسای، خودا لە نیزامی پێکهێنانی وەلەد کە بریتییە

لە ئاوی «منی» واتە تۆو، لە «كُنْ» خاریج كرد، یانی لە بەشێكی كە ئاوی مەنییە، بەدەر بێ ئاو بە ئەمری «كُنْ» هێنایە دی، جا لە سەر ئەو ئەساسە بە حەزرەتی عیسا دەكوترێ «كلمة الله». یا دەڵێن «كلمات» واتە بەیانات و كوتن وەسیلەی هیدایەتن، عیساش وەسیلەی هیدایەتە، خۆ دیارە «كلمه»ش لە «كلمات»ە، خودا بۆیە بە عیسای ئەو لەقەبە (كلمة الله) دا.

«روح الله» خودای تەعالا لە بەر ڕێز و حورمەت و ئیكرام لە عیسا ڕوحی دایە پاڵ خودا فەرمووی «عیسای روح الله»، دەنا هەچی ڕوحە لە خوداوەیە، ئەو ڕوح وەپاڵ دانەش وەک ئەوە وایە «بیت الله» «ناقة الله».

وەک دەردەكەوێت و بە ئیسبات گەیشتووە ئایەتی ٥ ئیشارە وەلای بەرفراوانی و كەماڵی علیم و زانستی خودای تەعالایە كە بە هەرچی بوون و نەبوونە ڕادەگا، ئە دێرەدا ئەوەشمان دێتە زەین و دەست، كە خودا وێڕای ئەو عیلم و زانستە دەبێ هێز و توانای سەرە و بەرە كردنی تەواوی بوون و نەبوونیشی هەبێ، ئەگینا ناتەواو دەبێ! پەنا بە خودا! جا بۆ ئیسباتی كەماڵی هێز و توانای خودا لە سەر كائینات و بوونەوەر دەچینە خزمەت ئایەتی ٦ كە دەوێدا بۆمان دەردەكەوێ قودرەت و تەوانایی خودا:

**هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاءُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٦﴾** ئالی عیمران

**هەر خودایە چۆنی بیهەوێ لە نێو منداڵدانەكاندا شكڵ و نەخشتان دەكێشێ، بێجگە لەو هیچ خودایە نییە، هەر ئەوە زاڵ و كاربەجێ.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانین لە سیمای ئایەتی ٦:**

ئەوە یەقینە و بێ‌گومانە سەرە و بەرەی دنیا و ئیدارە كردنی لە هەموو بارەكانی ژیان و حاوانەوە و نەخش و نیگار و كەیفیەتی سیما و ڕوخسار و هەستیان لە ژێر ئیرادە و مەشییەتی خودادایە، سوورەت و شێوە و بیچمی ئینسان بەشێكە لەو ئیرادەیەی خودا. دیارە كاروباری باری‌تەعالا تەواوی لە سەر حیساب و ژمارەیە، جا بۆیە دەبێ بكوترێ بە غەیرەز ئەو خودایەی وا بەهێز و بە زانست، هیچ خودایەک نییە بتوانێ ئاوا بە نەزم و نیزام كائینات ئیدارە بكات.

خودای بێ‌هاوتا هەر كارێكی بیهەوێ بیكا پێش ئەوەی ئەنجامی بدا و بەڕێوەی بەرێ، لە سەر و بنی ئاگادارە بۆیە لە بەڕێوە بردنی بیهەوێ هەرشتێكی پێكی‌بێنێ دەتوانێ و نەهۆمێ ناهێنێ. جا بۆیە دەبێ بكوترێ ئەو كەسانەی ئینكاری ئایاتی خودا دەكەن، ئەوە ئینكاری حەق

دەکەن و هیچ حاڵی نین زۆر ژێراتر لەوەن بتوانن لە سەر پێی خۆیان ڕاوەستن و ئیدیعای ئەوە بکەن کە بەڵێ ڕێگای ڕاست دەقۆزینەوە و دەرکی دەکەین.

ئەوە کە ئینسان ئینکاری ئایاتی خودا دەکا هۆیەکەی ئەوەیە خودای تەعالا لە سەر ئەساسی حیکمەتی خۆی سەربەخۆیی و ئیزنی داوەتە ئینسان کە بۆخۆی چارەنووسی خۆی هەڵبژێرێ، تاکوو مەیدانی تاقیکردنەوەی ئاواڵە بێ و بەرهەڵستی نەبێ لە تاقیکردنەوەدا. هەچی بیهەوێ بۆخۆی هەڵیبژێرێ، دیارە ئەو ئینسانەش ئەو ئامراز و وەسیلەی ئەقڵ و هەست و شعوورەی خودا پێی داوە بۆ دەرکی حەق و باتڵ، دە جێی خۆیدا دەکاریان ناکا، بەڵکە چاوەی دووربینی و حەقناسی دە دنیاپەرستی دەکا و دەشیهەوێ بشگا بە قۆناغی سەعادەتی ئاخرەتیش، بێخەبەر لەوەی دنیا پلەکانی سەرکەوتنە بۆ پلەکانی کەماڵ نەک پلەکانی خۆ پێ هەڵاوەسین.

خودای تەعالا کە دەفەرموێ ﴿يُصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحَامِ﴾ واتە چۆنی بیهەوێ خودا ئاوای شکڵ دەکێشێ دە ناو منداڵدانی دایکیدا، واتە دەو شوێنەیدا کە پێی دەکوترێ منداڵدان (ڕەحەم)، واتە شوێنی ڕەحم و بەزە لەوێدا ڕەحمی دایک و باب بۆ ڕۆڵەکەیان دادەخزێتە ناو ئەو منداڵدانە و تێکەڵاوی ئەو دوو ئاوی دایک و بابە دەبێ کە بێچوولەکەی لێ دەگوورێ و ساز دەبێ. سەیری ئایەتی ٢ی سوورەی ئینسان پێویستە دێرەدا:

**إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ ﴿٢﴾** انسان
**بێگومان ئێمە مرۆڤمان لە نوتفەیەکی تێکەڵ دروست کردووە بۆ ئەوەی تاقی بکەینەوە.**

ئەو جەماعەتە نەجرانیانەی هاتبوونە خزمەت پێغەمبەر لە بابەت حەزرەتی عیساوە دەیانکوت: «کلمة الله و روح منه» واتە عیسا کوڕی خودایە؛ پێغەمبەر فەرمووی وا مەڵێن، بەڵکوو بڵێن: ڕەسووڵی خودایە. وەفدی نەجران واتە «نەساراکان» دە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر و قورئاندا گومانیان هەبوو، باوەڕیان پێ نەدەکردن، لایان وا بوو عیسا لە سێ لایان لایەکە: یا خودایە، یا کوڕی خودایە، یا یەکێکە لە «قنومن ثلاثة»: عیسا و مریەمە و خودا. خودای تەعالا بۆ ڕەواندنی ئەو تەمومژە گوێرە لە سەر دڵیان، هات ئایەتی ٧ی دابەزاند. ئەگەر بە وردی هەڵسەنگێندرێ بە ڕوونی ئەقڵ دەزانی عیسا ئینسانە و خودا نییە:

**هُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُّحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاء الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاء تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ**

تَأْوِيلَهُ إِلاَّ اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُواْ الأَلْبَابِ ﴿٧﴾ ئالی عیمران

خودا ئەو خودایەیە کە قورئانی بۆ ناردوویە خوارەوە، هێندێکیان ئایەتی ڕوون و ئاشکران مەبەستەکانیان ڕاستەوخۆ دەزاندرێن هیچ ڕێگای ئەولاولایان وەخۆ نەگرتووە، جا ئەو ئایەتە ڕووناکانە ئەسڵ و سەرچاوەی ئایەتەکانی دیکەن. هێندێکیشیان ئایاتێکن مەبەستەکانیان ڕوون نین، چونکە ئەولاولا هەڵدەگرن، ئەوانە دەبێ بە پێی ئایەتە مەحکەماتەکان مەبەست و مانایان لێ بدرێتەوە، لە بەر ئەوەی بە ئایەتە مەحکەماتەکان دەکوترێ «امّ الکتاب» واتە دایکی ئایەتەکان. دەبێ هەموو ئایەتەکان ئەگەر ئەولاولاش هەڵگرن هەر بچنەوە ژێر دامێنی ڕووناکی دایکیان واتە ئایەتە مەحکەماتەکان. جا ئەوانەی لە حەقدانیان لە دڵایە دەکەونە شوێن ئەوانەی ڕاڤە هەڵدەگرن بۆوەی فیتنە بسازێنن، دەگەڵ ئەوەی ڕاستییەکەش هەر خودا دەزانێ. زاناکانیش: ئێمە ئیمانمان پێ هێنان، هەموویان لە لای خوداوە هاتوون، پەند ناگرێ جگە زانا نەبێ.

دەچینە لای مامۆستای خاڵ کە چەند نموونەیەکی ڕێکوپێک و دڵگری لەو بارەوە نیشان داون، فەرموویەتی: بۆ نموونە خودا لە ئایەتێکا دەفەرموێ:

لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ انعام

چاوەکان خودا نابینن، ئەو چاوان دەبینێ، زۆر وردبین و ئاگادارە.

بە کوردی: لە دنیادا هیچ چاوێک خودا چاو ناکا، بەڵام خودا هەچی چاوە، چاوی دەکا و دەیبینێ.

لە ئایەتێکی دیکەدا خودا هەر لە سەر ئەو بابەتە دەدوێ و دەفەرموێ:

وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ قیامة

زۆر ڕوخسا لەو ڕۆژەدا ڕاستەوخۆ تەماشای خودای خۆی دەکات.

ئەو دوو ئایەتە موتەشابیهن، چونکە بە دیمەن دژی یەکن، دەبێ لە بەر ڕووناکایی ئایەتێکی مەحکەم مەبەستیان لێ بدرێتەوە. ئەو ئایەتە مەحکەمەش وەک ئایەتی ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ واتە خودا هیچ میسلێکی نییە، وەک هیچ ناچێ، بەو پێیە مانای ئایەتی ١٠٣ی ئەنعام دەبێ ئاوا تەعبیر بکرێ: چاو دەوری خودا نادا. ئایەتەکانی ٢٢ و ٢٣ی قیامەتیش ئاوا تەعبیر بکرێن: چاو

دەڕوانێتە خودا بێ ئەوەی بتوانێ دەوری بدات، تاکوو تەماشا کـردنەکەی وەک تەماشـا کردنـی شتی قەبارەدار نەبێ. جا لە سەر ئەو ئەساسـە دەبـێ هەچـی ئـایەتی موتەشـابیهاتە لە قورئانـا، ببرێنەوە بەر ڕووناکی ئایەتی مەحکەمات. (تەفسیری خاڵ)

بە کوردی ئایاتی موتەشابیهە، ئایاتێکن کە بە دیمەن مەبەستێک بگەیەنن کە شـایانی پـلە و پایەی خودا نەبن و ڕێ نەکەون دەگەڵ ئەو ئایەتە موحکەمـانەی کە خـودا بە پـاک ڕادەگـرن و دووری دەخەنەوە لە کەموکووڕی. ئەوجار موسوڵمان یـا بـاوەڕی پـێ هەیە بە جۆرێـک کە دژ نەبێ دەگەڵ پاکیی خـودا. وەک ئـایەتی ﴿ثُـمَّ اسْـتَوَى عَلَى الْعَـرْشِ﴾ کە پێشـینیان فەرموویـانە مەبەست لە «استوی» و لە «عرش» ئاشکرایە، بەڵام چۆنیەتییەکەی هەر خودا بۆخۆی دەیزانێ.

ئەوانەی کە دە دڵیاندا خوار و خێچی و گومـان هەیە لە فەرمـوودەی خـودادا، وە لە ڕێـی ڕاست لا دەدەن، وەیا بێ باوەڕن وەک گاورەکانی نەجران و هەموو بێبڕوایەک، ئەوە وەشـوێن ئەو ئایەتانە دەکەون کە موتەشابیهاتن، بۆیەش وا دەکەن بۆ تێکدانی بیر و باوەڕی موسـوڵمانان کە گۆیا ئەو ئایەتانە دژی یەکن، وەیا ناپاکن. وەدوای ئەو ئایەتانە دەکەون بۆ تەئویل کردنیـان بە ڕەنگێک کە ڕێکی ڕێباز (مذهب)ێکی خوار و خێچی دروسـتکراو بـۆ پـارچە پـارچە کردنـی موسوڵمانان، وەک قادیانییەکان کە دەڵێن مزگێنی دانی عیسا دە ئـایەتی ﴿مُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ ﴿٦﴾ صف﴾ بە حەزرەتی محەمەد نییە بەڵکوو بە ئەحمەد قادیانییە.

وە کەسیش بە ڕاستی تەئویلی ئایاتی موتەشابیهـ نازانێ، خودا نەبێ کە ناردوویەتە خوارەوە بۆیە خودا بۆخۆی تەئویلی کردووە بە ئایەتی موحکەمات و فەرموویەتی ﴿هُنَّ أُمُّ الْكِتَاب ﴾ وە هەر وەک خودا خۆی تەئویلی ئایاتی موتەشـابە دەزانـێ، ئیجـازەی داوە بە زانایـان، ئەوانـیش بیزانن کە فەرموویەتی ﴿وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ﴾ واتە ئەوانەی لە زانینا دامەزراون دەتوانن بیـزانن بە هۆی بردنەوەی ئایەتی موتەشـابە بـۆ لای ڕووناکـایی ئـایەتی موحکەمـات کە سـەرچاوەی موتەشابیهاتن. ئەو زانایانەش کە تەعبیری موتەشـابیهات دەزانـن دەشـڵێن، ئـێمە بـاوەڕیمان بە موتەشابیهات هەیە، بەو دەلیلە ئایەتەکانی موحکەمات و موتەشـابیهات هەمـوو لە خـوداوەن، دیارە خاوەن هەست و بیرەکان نەبن ئیدی مانا و تەعبیراتی ئایاتی موتەشابیهات نازانن چـونکە قورئان نازانن.

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ۷:**

دیارە بە ڕوونی لە بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی ئایەتەکانی قورئان ئەوەمان بۆ دەرکەوتـووە کە قورئان بە دوو سیفەتەکانی (انزال و تنزيل) هاتووە و دێ، بە پـێچەوانەی کتێـبە ئاسـمانییەکانی دی کە ئەوان هەر تەنیا بە سیفەتی (انزال) هاتوون و چاو کراون.

(انزال) واتە قورئان لە «لوح المحفوظ»ەوە تا ئاسـمانی دنیـا کە شـوێن و مەرکەزی «بیـت العزة» واتە «بيت المعمور» دابەزیوە. (تنزيل) واتە قورئان لە «بیت العـزة»ەوە تـا سـەر زەوی دە ماوەی ٢٣ ساڵدا تەواوی دابەزیوە. بە پێـی هەڵسـەنگاندن و بەراوردی ئەو ئـایەتە پیـرۆزە (واتە ئایەتی ٧) ئەوە دەردەکەوێ و سابت دەبـێ کە سـەرلەبەری ئایەتەکـانی قورئـان دوو بەش بـن: بەشێکیان «محکمات» و بەشێکیان «متشابهات». بە ئاوڕدانەوە لای ئایەتی ٢٣ «زمر» وا هەست پێ دەکرێ کە سەراسەری ئایەتی قورئان «متشابە» بن ئەوەش ئایەتەکە:

**اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابا مُّتَشَابِهًا مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكرِ اللَّهِ ذَلِك هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَنْ يَشَاء وَمَن يُضْلِلْ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾** زمر

خـودا جـوانترین کـوتەی نـاردووەتە خـوارەوە، کتێبـێکە کە وا هەمـووی لە یەک دەچـێ کە مەبەستەکانیشی دووپات دەبنەوە. ئا ئەو کەسانەی کە لە پەروەردگاری خۆیان دەترسن لە بەر ئەو کتێبە تەزوو بە لەشیاندا دێ، پاشان دڵ و جەستەیان بە یادی خودا ئۆقرە دەگرێ. ئە ئەوەیە شارەزایی خودا و ڕێنوێنی. خودا ویستی لە سەر هەر کەسێ بێ، شارەزای ئەو ڕێگایەی دەکـا، کەسێکیش هەل بڕەخسـێنێ و بیـداتە دەس خـوا بـۆ گـومڕایی، خـوداش گـومڕای دەکـا، هـیچ ڕابەرێک و ڕێ پیشاندەرێکی نییە و نابێ.

وە هەر وا بە پێی ئیشارەی ئایەتی ١ی سوورەی هود و ئایەتی ١ی سـوورەی یـۆنس دەبـێ تەواوی ئایەتی قورئان «محکمات» بن، ئەوەش ئایەتەکان:

**الَر كِتَاب أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ﴿١﴾** هود

ئەلفلامڕا. قورئـان کتێبـێکە کە ئایەتەکـانی پـتەو کـراونەتەوە، پاشـان لە لایەن کـاربەجێ و لێزانەوە بە درێژی ڕوون کراونەتەوە.

**الر تِلْك آيَاتُ الْكِتَاب الْحَكِيمِ ﴿١﴾** یونس

ئەلفلامڕا. ئەوە ئایەتی کتێبێکی کاربەجێیە.

بە پێی ئیشاڕاتی ئەو دوو ئایەتانەی سووڕەی هـود و یـۆنس دەبـێ تەواوی ئایـاتی قورئـان «محکمات» بن و بە پێی ئایەتی ٢٣ سووڕەی «زمر» دەبێ تەواوی ئایاتی قورئـان «متشـابهات» بن.

بە پێی ئایەتی ٧ی ئالی عیمران دەبێ تەواوی ئایاتی قورئان دوو بەش بـن: «محکـمات» و «متشابهات». بێ گومانیش دەبێ بین کە ئەو ئیشارات و نەزەرانە سەربەخۆ نـین و ڕانەنـدراون، ناشکرێ واش بن چونکە دژایەتی ڕوو دەدا، ناشکرێ واش نەبن چونکە ئیسـتیدلال بە ئـایەتن. کەوابێ چارە دۆزینەوە ڕێگای چارەیە کە ئەویش دۆزینەوەی ڕێگا دروستەکەیە.

**کۆبوونەوە و یەک‌گرتن و تەتبیقی دروست و سەحیحی ئایەتەکانی قورئان**

ئایاتی قورئان وەک ئایەتەکـانی «محکـمات» و «متشـابهات» کە ئێسـتێ جـێگەی باسـی ئێمەن، خاوەنی دوو ڕەویەن واتە ئیستیلاحی و لۆغەوی. هەر وەک هەموو شت ئەو دوو واژەی بۆ دەکار دەهێندرێ. جا لە سەر ئەو یاسا و ئەساسە دەبێ بکوترێ ئایـاتی قورئـان ئیسـتیلاحەن دوو بەشن: متشابە و محکم. بەڵام لە بابەت لۆغەتەوە تەواوی ئایاتی قورئان مەحکەمـاتن، بەو واتایە تەواوی بە مەحکەمات و موتەشابەهاتەوە کەلامـی حەقـی خـودان بە مانـای سـەحیح و دروسـتەوە بە ئەلفـاز و لۆغـاتی فەسـیح و سـەحیحەوە بە خـاوەنی بەلاغەوە، کە دە پـایە و پلەیەکدان هیچ کەس توانایی گەیشتنی بەو پایە و پلەیە نییە و نابێ. وە هەروا ئەو ئایەتـانە کە دە پلەی مەحکەماتدان. حەقـیقەت و ڕاسـتییەک دادەنـێن و نیشـان دەدەن کە ڕێگـای تەئـویلات ناهێڵنەوە بۆ کەس واتە ڕێ نامێنێ لە مانای وی بەولاوە مانایەکی دیـکە بکـوترێ و بە خەیاڵـدا بێ.

ئەمــما لە بــابەت ئەو نەزەرەوە کە بۆچــوونی وا داوەتە دەرێ کە ئایــاتی قورئــان هەمــوو «متشابهات»ن بە پێی ئاماژەی ئایەتی ٢٣ «زمر» ئەوە لەو بـارەوە جـانبی لـۆغەوی «متشـابە» دە نەزەر دەگیردرێ واتە بەو مانایە: هەر ئایەتێک دەگەڵ ئـایەتی دی لە بـابەتی جـوانی ئیترتیبـات دەگەڵ یەک بن، لە بابەتی مانا و ئەلفـاز و فەسـاحەت و بەلاغەت موتەشـابیهی یەکـن و وەک یەکن.

واتە هەندێک لە ئایەتەکانی قورئان تەسدیق و تەئیـدی هەنـدێکیان دەکەن. بە کـوردی و بە کورتی، قورئان لە بابەت لۆغەتەوە تەواوی موحکەماتن و لە بابەت مانا و مەبەستەوە هەنـدێک موحکەماتن و هەندێک موتەشـابەهاتن. بەڵام لە بـابەت ئیرتیبـات و وەک یەکـی و ئیعجـازەوە

هەمووی موتەشابەهاتن. (تفسیر کبیر، ج ٧/ ١٧٩)

**جیاوازی نێوان «محکمات» و «متشابهات»**

ئیبنیعەباس دەفەرموێ: ئایاتی مەحکەمات لە قورئاندا ئەو بەشە ئایەتانەن کە ماناکانیان بە ئەندازەیەک ڕوون و ئاشکرایە هیچ نیازێکی بە مانای دی و تەئویلات نییە و لەو بەشە ئایەتەدا نەسخ نایەتە ڕوو. ئایاتی موتەشابەهاتیش لە قورئاندا بەو ئایەتانە دەگوترێ کە مانا و مەبەستیان بۆ هەموو کەس ڕوون و ئاشکرا نییە، بۆ نموونە ئایەتی ٥ لە سوورەی «طه»:

**الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى ﴿٥﴾** طه
**ئەو خودای خاوەن بەزە لە سەر تەختی دەستەڵاتی بەبێ چەند و چون دامەزرا.**

دێرەدا نازاندرێ خودا چۆناوچۆن دامەزرا لە سەر تەختی؟ تەختی خودا چۆنە و چییە؟ چونکە ئەدێرەدا شوێن و جێ و مەکان بۆ خودای بێ مەکان دێتە گۆڕێ کە لە خودا ناوەشێتەوە.

وە هەروا دووبارە وەک ئایەتی ١٠ لە سوورەی فەتح:

**يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ﴿١٠﴾** فتح
**دەستی خودا لە سەرووی دەستەکانی ئەوانە.**

دیارە شتێک دەدرێتە پاڵ خوا کە لە خودا ناوەشێتەوە، وەک دەست بێ، بەڵێ دەستێک کە بە مانای هێز و توانا بێ هەیە بۆ خودا، ئەمما ئەو دەستەی کە ئێمەی پێ ئاشناین لە خودا بەدوورە.

جا ئەو جۆرە ئایەتانە کە پێیان دەکوترێ «متشابه» چونکە مانا و مەبەستیان ڕوون نییە بۆ هەموو کەس دەبێ بە هۆی ئایەتی «محکمات» ڕوون کرێن و تەئویل کرێن.

«علامه اصم» دەفەرموێ: ئایاتی مەحکەمات دە قورئاندا ئایاتێکن کە مانا و مەبەستیان ڕوون و ئاشکران، بۆ نموونە، خودا لە مەڕ دروست بوونی ئینسان لە ناو تۆلی دایکیدا خەبەر دەدا و ڕادەگەیێنێ، بە وەسیلەی ئایەتی ١٤ لە سوورەی «مؤمنون»:

**ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ ﴿١٤﴾** مؤمنون
**ئەوسا تۆوەکەمان کرد بە خوێنی مەیبو، خوێنە مەییوەکەمان کرد بە پارە گۆشتێک، تیکە**

**گۆشتەکەشیان کردە چەندین ئێسقان، بەرگێکی گۆشتینیشیان کرد بە بەر ئەو ئێسقانانەشدا، ئەوجار شکڵ و شێوەیەکی دیکەمان پێ دا، کەواتە هەر گەورەیی و بڵیندی و بەرزی شایانی خودایە، کە جوانترین و چاکترینی دروستکەرانە.**

ئەدێرەدا مانا و مەبەست هەندە ڕوونە کەس تێیدا حاسیە نابێ.

یا وەک ئایەتی ٣٠ لە سووڕەی «انبیاء»:

**أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾** انبياء

**ئایا ئەوانەی بێ باوەڕن ورد نابنەوە کە بەڕاستی ئاسمانەکان و ئەو زەوییە پێکەوە چەسپابوون جیامان کردنەوە؟ هەموو گیانلەبەرێکمان لە ئاو دروست کردووە (واتە هەموو شت)، دەیجا بۆ ئیمان ناهێنن بە چاو پێکەوتنی ئەو حەقیقەتە؟**

مانای ئەو ئایەتە ئەوەندە ڕوونە کەسێ لێی دە ئیشکال ناکەوێ لە مانا و مەبەستی.

هەر نموونەی ئایەتی مەحکەمات کە ماناکەی هێندە ڕوونە ڕێ نادا بە مانای دیکە بێتە پاڵی، وەک مانای ئایەتی ٢٢ی بەقەرە:

**الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً وَالسَّمَاء بِنَاء وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَّكُمْ**

**خوداتان ئەو خودایەیە زەوی بۆ ڕاخستن و ئاسمانی بۆ هەڵداون، هەروا لەو ئاسمانەوە ئاوی بۆ هەڵڕشتوونە خوارێ کە بە هۆی ئەو ئاوەشەوە ڕزق و ڕۆزی و میوەی جۆراوجۆری بۆ بەرهەم هێناون.**

ئێستا هەرچەند خەریک بی، ناتوانی مانایەک غەیری ئەو مانا ڕوونەی هەیەتی، مانایەکی دیکە بۆ ئەو ئایەتە وەدۆزری، چونکە لەو مانایە زیادتر وەخۆ ناگرێ.

ئەمما ئایاتی موتەشابەهات ئەوەیە کە بۆ زانین و تێگەیشتن لە مانا و مەبەستی ئەو هەڵسووڕانێکی بیر و بۆچوون و ڕا وەگەڕ بخرێ.

هەندێک لە زانایان کوتوویانە هەچی بە تیشکی ئەقڵ و زانست چاو کرێ لە مەحکەماتە، هەرچی نەکەوێتە ژێر ڕووناکایی ئەقڵ و عیلم و زانین، ئەوە لە موتەشابەهاتە، واتە فکر و بەراورد ڕاستەوخۆ بۆ دەرکی مانا و مەبەستی ئایەتەکانی موتەشابەهات کارساز نین. (تفسیر

کبیر، ج ٧ / ١٨٢-١٨٣)

لەولاولایـان دەنگـی ئەوەی دێ کە ئایـاتی «متشـابهات» دەبـێ «ام الکتـاب» بـن نە «محکمات»، بەڵام ئەو دەنگ و هەرایانە گوێ وەریـاندەگرێ بەڵام ئەقـڵ و دڵ وەریاننـاگرن، بەو دەلیلانە: ئامانج و مەبەست لە دابەزینی قورئان بۆ سەر ئینسـان ڕێنـوێنی و شـارەزا کردنـی ئینسانە بۆ ڕێگای ڕاست و دروست و سـەعادەتی هەر دوو وەرزی دنیـا و ئـاخرەت، ئەوەی دە قورئانیشدا زامنی هەڵگرتنی ئەو ئامانجەیە ئەو ئایەتانەن کە مانایان ڕوون و ئاشکران بۆ هەمـوو کەس و لە کەس سـەرداپۆشراو نـین، جـا خـۆ دیـارە ئەوەش هەر دە شـەئنی ئایەتەکـانی مەحکەماتدان، چونکە ئایاتی موتەشابەهات پێچراوەن و هەموو کەس ناتوانێ ڕاستەوخۆ مانا و ئامانجی لێ گیر خا و دەرک کا.

دڵ و ئەقڵ ئەوەیان بۆ سابت بووە کە قورئان بۆ ڕێنوما و شـارەزایی ئینسـانە بە گشـتی، دە دیارە ئەو ڕێنوێنییەش دەبێ وا بێ هەموو ئینسان بتوانێ لێی حاڵی بێ، چ دانا و ژیر و وریـا، چ گێل و نەزان و پەتیارە، واتە هەچی تەکلیف هەڵگرێ دەبێ بتوانێ لە قورئـانیش دەرس و بەهـرە وەرگرێ. جا بە پێی ئەو یاسا و نیزامە، ئایاتی موتەشـابەهات کە پێچـراوە و خـاوەن ڕمـووزاتن هەموو کەس نـاتوانێ لێیـان حـاڵی بـێ، نەدەبـا هاتبـان دە قورئانـدا؛ ئێسـتێ کە هـاتوون و بە ئاشـکرایی ناویـان بـراوە دە قورئانـدا، خـاڵی لە حـیکمەت و ڕاز نیـیە، دەبـێ تێکۆشـان و لێکۆڵینەوەیان لە سەر بکرێ تاکوو هەدەف و ئامانج و مەبەستی هـاتنی ئایـاتی موتەشـابەهات دەدۆزرێتەوە و دڵیش قەناعەتی پێ پەیدا دەکا.

دەبێ بڵێین هاتنی ئایاتی موتەشابەهات ئەگەرچی دەرک و زانینی مانایان ئاسانیشنین بەڵام هاتن و دابەزینیان زۆر ئەساسی و پڕ بایەخن بە پێی ڕا و نەزەری زانایان؛ چەنـد نمـوونەیەک لە قازانجی هاتنیان نیشان دەدەین:

١. زانایان و ژیر و بەبیران بۆ وەی مەیدان هەبێ بۆ بەکاربردنی ئەسپی بەپێز و بەزیبکی هۆش و بیر، پێویستە ئایەتی موتەشابەهات کە تێکۆشان و هەڵسـووڕانی دەوێ دۆزیـنەوەی مانـا و مەبەستیان، ببن تاکوو لە سۆنگەی زەحمەتکێشانی دۆزینەوەی مانایـان ئەجـر و پاداشـی زۆر بە نەسیبی ژیر و بەبیرەکان ببـێ، و هەر وا ئەو زانستەشـیان بە ئەسـتێوری نەمێنێـتەوە، جگە لەوەش هۆش و بیر وەگەڕ خستن دە ڕێگای دۆزینەوەی حەق و ڕاستیدا عیبادەتێکی گەورەیە، خاوەنی پاداشی گەورەشە.

٢. ئەگەرهاتبا و تەواوی ئایەتەکانی قورئان مەحکەمات بـان، واتە بە ئاسـانی مانایـان زانـدرابا، یەک ڕێگا سابت دەبوو، دە حاڵێکـدا تەبـع و زەوق و سرشـتی ئینسـان لێـک جیـاوازن لە بابەتی دەرک و زانست و هۆشەوە، هەنگاو هەڵێنانیان دە یەک بازگەدا دەبێتە هۆی ئیشکاڵ و پەرێشـانی و تـێکەڵ کـوتەی زەیـن و بیـر، ئەوەش ئیشـکالێکی چـارە نەکـراوی لـێ دەکەوێتەوە، چونکە دەبـێ مەیـدانی تونـدڕۆیان بەرفـراوانتر بـێ لە مەیـدانی وەسـتەک و سستڕۆیان، تاکوو خۆ تێک نەکوتن؛ لە سەر ئەو ئەساسە مەیدانی ئایاتی موتەشـابەهات بۆ تیژبیران و توندڕۆیانە و مەیدانی ئایاتی مەحکەمات بۆ کەمهۆش و کەمبیرانە.

٣. دەبێ بە پێی بەراورد و هەڵسەنگاندنی بابەتەکانی مەسائیلی دینی و عیلمی بەتایبەت قورئـان کە کەماڵی ئینسانیان تێـدا چانـدراوە و نێـژراوە، هەمـوو ئینسـانەکان دەسـبار و هاوکـار و هاویاری یەکتر بن واتە هەر کەس بە ئەندازەی توانایی دەرک و فەهمی دەستەپارەی خـۆی بێنێ بیخاتە سەر مەشقەڵی ئاگری پڕ شـۆق و نـووری هیـدایەت، بـۆ وەی هەمـوو کەس بتوانێ لە بەر ڕووناکایی و گەرمای ئەودا وەحەسێ و وەحاوێ، جـا لە سـەر ئەو ئەساسـە ئەگەر هەموو ئایاتی قورئان مەحکەمات بان، دەستەیەک لە ئینسـانە ژیـر و بەبیرەکـان بـێ دەستەپارە دەبوون، بەو هۆیە ژیر و بەبیرەکان لە هەوراز و حاسیە و بڵێنـدەکانڕا دەسـتەپارە بەرهەم دێـنن، لە دەشـت و گۆڕایەکـان نانیشـن وەک مەلـی بەرزەفـڕ وان. و هەروا ئەگەر ئایاتی قورئان هەمووی موتەشـابەهات بـان، دیسـان زەیـن و بیـر کـۆڵ و کورتەکـان بـێ دەستەپارە دەبوون، چونکە نەیاندەتوانی خۆ بگەیەننە لووتکە بەرزەکـانی موتەشـابەهات و لەوێـوە دەسـتەپارە دەسـت خەن و بیهێـنن. جـا بەو پێـیە و بەو نیـزامە بـۆ وەی هەمـوو ئینسانەکان لە سەر ئەساسی ئیحتیاجی و نیاز بە یەکتر هاویار و دەستباری یەکتر بن، دەبێ قورئانێک کە چاوەی حەیاتی ئینسانە، چاوەی کەماڵاتی ئینسانە، چاوەی کەماڵاتی ژیـانە، شوێنی کۆبوونەوەی هەموو ئینسانەکا بێ، چ کەمهۆش و کەمبیر، چ زۆر بەهۆش و بەبیر، جا بۆیە دەبێ ئایەکانی قورئان کە قووتی ئەقڵ و زانست و هەسـت و شـعووری ئینسـانن، مەحکەماتیش بن بۆ هۆشنزمەکان، و موتەشابەهاتیش بن بۆ بیر بەرزەکان، ئەودەم هەموو ئینسان دەبنە دەسبار و هاوکاری یەک، هەر یەک لە بەر خۆیەوە. (تفسیر کبیر، ج ۱۸۴/۷)

**مشتمڕی زانایانی ئایینی و قورئانی لە سەر ئایاتی موتەشابەهات بوونەتە دوو دەستە:**

١. دەستەیەکیان باوەڕیان وایە موتەشابەهات دەبێ حەواڵەبە خودا بکرێ و لە ڕاستیڕا دەبێ

ئینسان بێدەنگ بێ و زاری خۆی گرێ دا و دەبێ ئینسان ئەوەش بزانێ کە قورئان دەریایەکی پڕ لە جەواهیرات لە توانای هەموو مەلەوان و غەوواساندا نییە دۆزینەوەی ئەو هەموو جەواهێراتە، تەنیا ئینسان دەتوانێ بەشی نیازی تەکلیفاتی ئیمان و باوەڕی لێ وەدەس بێنێ.

٢. دەستەیەکیشیان نەزەریان وا بۆ دەچێ کە بەشێ لە ئایەتەکانی دەبێ تەئویل کرێن تا ئەو جێگایەی مانا و مەبەستی واقعی دێتە دەست، ئەو تەئویلاتەش لە شەئن و توانای کەسانێکدایە کە ژیر و بەبیر و ڕۆچوو لە زانستی کەشفیاتدان (راسخون). حەزرەتی شافیعیش نەزەری هەر ئاوایە.

دە دەورانی سەلەفیەکاندا ئەوە باو بوو کەسێک کەندەوە و کۆژەوەی لە سەر ئایاتی موتەشابەهات بکردایە، بە خراپیان ناو دەبرد و تەحویلی دەسەڵاتی کاتیان دەدا بۆ زەجر و لۆمە و سزا، وەک ئێستێ کەسێک لەمەڕ تەوحید زۆر وەکۆڵێ، ناوی ناحەزی وەدوا دەخەن و دەستەڵات پەیسەری دەگرێ.

وا دەگێڕنەوە گۆیا لە دەورانی حەزرەتی عومەردا کابرایەک بە ناوی «جیغ بن عیسل یمنی» لە شاری مەدینەی مونەووەرە لە ئایەتەکانی موتەشابەهات زۆری دەکۆڵیەوە بۆ نموونە: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ ﴿٥﴾ طه﴾ یان ﴿يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ﴿١٠﴾ فتح﴾ زۆری کەندەوە و کۆژەوە لە سەر دەکردن، دەگەیشتە هەر کەسێکی، پرسیاری لێ دەکرد ڕاجع بە مانا و مەبەستی ئەو ئایەتانە، تاکوو سەرەنجام خەبەری ئەو جەریانە و ئەو کەسە بە حەزرەتی عومەر گەیی. حەزرەت ناردی بە شوێنیدا هێنایە لای خۆی، لێی پرسی لە بابەت جەریانەکە، کابرا عەرزی ئەمیری کرد بەڵێ وەک بۆیان بەیان کردووی وایە. حەزرەتی عومەر فەرمووی مەگەر مانایان نازانی؟ عەزری کرد بەڵێ، وەک خەڵکیان دەزانم، بەڵام دڵم دانامەزرێ و ئۆقرە ناگرێ، خەیاڵات و بیر وبۆچوونی دی لە ناو دڵمدا هەڵدەقولێن. حەزرەتی عومەر فەرمووی: دا مانای ئەو ئایەتە بکە، تاکوو بزانم چۆنی بۆ دەچی؟ ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ ﴿٧﴾ آل عمران﴾؟ ئەو نەفەرە بە دروستی مانای کرد. حەزرەتی عومەر فەرمووی وەشوێن وەسوەسە و خەیاڵاتی شەیتانی مەکەوە تاکوو تووشی کەنداڵ و چاڵان نەبی. عەرزی حەزرەتی عومەری کرد دوعایەم بۆ بکە بە دڵم بوێرم. ئەوە بوو هەم حەزرەت دوعای بۆ کرد هەم بۆ خۆشی ئەقڵ و هیممەتی وەگەڕ خست دەسبەرداری ئەو جۆرە خەیاڵانە بوو. (تفسیر قرطبی ج ٤/ ١٥-١٤ * روح المعانی ج ١١٨/٣)

دڵ دەیهەوێ بزانێ جوملەی ﴿وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ﴾ دەگەڕێتەوە بەرەو پێش خۆی، یا ناگەڕێتەوە و سەربەخۆیە؟ بە پێی بۆچوونی قورئان دوو نەزەر لەو بارەوە دەرچوون:

١. هێندێکیان نەزەریان لە سەر ئەوەیە گەڕانەوەی بۆ سەر (الاّ اللّه) ناڕەوایە چونکە جوملەی ﴿وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلاَّ اللَّهُ﴾ بۆخۆی تەواوە و نیازێکی بە هیچ نییە؛ لەسەر ئەو مانایە واوی سەر جوملەی ﴿وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ﴾ واوی ئیبتیدایە، جا بە پێی ئەو نەزەرە ئایاتی موتەشابەهات بەغەیرەز خودا کەس نایانزانێ. ئەو نەزەرەش نەزەری ئیبنی عەباس و عایشە و حەسەن بەسری و مالکی ئیبنی ئەنەس و کەسائی و فەرراء و هی دیکەیە و ئەبوعەلی جەبائیش پەسەندیەتی.

٢. دەستەی دووهەم نەزەریان وایە کە جوملەی (الاّ اللّه) ناتەواوە و نیازی بە جوملەی ﴿وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ﴾ هەیە چونکە بەوی تەواو دەبێ، جا لە سەر بڕیاری ئەو نەزەرە مانای جوملەکانی ﴿وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلاَّ اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ﴾ ئاوای لێ بە سەر دێ: ئایاتی موتەشابەهات هەم خودا دەیزانێ هەم ئەوانەی ڕاسخن دە زانستدا. واتا ڕۆچوون دە زانستدا. گۆیا ئەو نەزەرەش لە لایەن ئیبنی عەباس و موجاهید و ڕەبیع ئیبنی ئەنەس قبووڵ کراوە. (تفسیر کبیر)

### (راسخون فی العلم) کێن؟

زانایان زۆریان ڕا و بۆچوون لە سەر (راسخون فی العلم) دەربڕیوە، ئاماژە بە هەندێکیان لازم دێتە بەرچاو، بۆیە ئێمەش خۆمانی لێ نابوێرین.

١. «ابن ابی حاتم» لە ڕێی «عبدالله بن یزید ازدی» و ئەویش لە «انس بن مالک»ەوە ئەویش لە پێغەمبەڕا نەقڵ دەکا کە گۆیا پرسیار کراوە لە پێغەمبەر لە بابەت (ڕاسخون فی العلم)، پێغەمبەریش فەرموویەتی: کەسێک لە گوفتاریدا ڕاست بێ، و وەفا بە عەهد بکا و بە سوێندی، و ئاگاداری ڕزق و ڕۆزی خۆی بکا، حەرامی تێکەڵ نەبێ، ئەوە ئەو کەسە (راسخ فی العلم)ە.

٢. دەستەیەکیش نەزەریان وایە (راسخون فی العلم) کەسانێکن کە بە دەلیل و بورهان ئیسباتی بکەن کە خودا بە تەواوی بوونەوەر ئاگادار و زانایە، و یەقینیشی بێ بە دەلیل کە قورئان کەلامی خودایە و ئەو قورئانەش بێ هەڵە و پەڵە و بێ کەم و کووڕییە.

٣. هەندێکیش دەڵێن (راسخون فی العلم) کەسانێکن کە دەگەڵ عیلم و زانستی بە زاهیری

بە هۆی پاکی دەروونی هێزی دەرکی نهێنی ببێ.

٤. هەندێکیش نەزەریـان وایە: ئەو کەسـە (راسـخ فـی العلـم)ە کە دیـن نەدا بە دنیـا، واتە تەرجیحی دین بدا بە سەر دنیادا.

٥. دەستەیەکیش نەزەریان وایە (راسخ فی العلم) کەسانێکن بتوانن مانای ئایاتی قورئانێ یا حەدیسی پێغەمبەر یا قەولی عالمی قەولبێژ، حەکیمانە و ژیرانە، چۆنی وایە و دڵگرە تەحـویلی دڵ و دەروون و هەست و ئەقڵی خەڵک بدن.

بە هەر حاڵ نەزەر لە سەر (راسخون فی العلم) زۆرن ئەمما ئەوەندەم بە کافی زانـی، بـۆیە وەدوای نەکەوتم.

ئیبنـی عەبـاس فەرمـوودەیەکی هەیە دەمـهەوێ قـووتی نەدەم، ئەویـش ئەوەیە: تەفسـیری قورئان وەک چوار وەجهین وا دیاری دەدەن:

١. تەفسیرێکیان دەبێ وا بێ زۆربەی عالەم مانای بزانێ.

٢. تەفسیرێکیان ئاوایە کە هەر عەرەبەکان بە زمانی خۆیان دەزانن چییان کوتووە.

٣. تەفسیرێکیان وایە زانایان و ژیران دەیزانن.

٤. تەفسیری مانای هەندێک لە ئایەتان چاک وایە حەواڵە بە خودا بکرێ.

مەبەست لە تەفسیر دێرەدا مانای ئایەتەکانە.

دیارە وەک ئاشـکرا و ڕوونە ئینسـان بە پرسـیار و نەسرەوتـوویە هەرچـی چـاوی کـا لێـی دەکۆڵێتەوە تاکوو لێی بە قەناعەت دەگـا و ئەگەر مانـای ڕاستیشـی نەزانـی بۆخـۆی مانـایەکی بەشی دامرکانی دڵی خۆی بۆ دادەتاشێ. جا بە هۆی ئەو بزۆزییەی ئینسان، بەدوور نییە لە سەر تەعبیراتی ئایەتی موتەشابە بخلیسکێ و بخزێ، کەوایە پێویستە لە سـەر ئەو کەسـانەی دەم بـۆ ئایاتی موتەشابە درێژ دەکەن و دەبەن، پێش هەڵسەنگاندن و مانا لێدانەوەی ئایەتەکان، ڕێـگەی پاڕانەوە دەسنیشان کا و وەدۆزێ بەرەو دەرگای خودا بە وەسیلەی ئایەتی ٨ی ئالی عیمران تا لە سەربەخۆیی و سەرەڕۆیی بەدوور بێ. ئەوەش ئایەتەکە:

رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنك رَحْمَةً إِنَّك أَنتَ الْوَهَّابُ

پەروەردگارا! دڵمان ئاوەژوو مەکەوە پاش ئەوەی شارەزات کـردین، لە خەزێـنەی ڕەحمەتـی خـۆت بەشمان بدە، بەڕاستی هەر تەنیا ئەتۆی دەسکراوە و بەخشندە و میهرەبان.

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارنە وەلای ئایەتی ٨:**

گۆیا دایکی موسوڵمانان حەزرەتی عایشە فەرموویەتی بە زۆری پێغەمبەری خـودا محمـد المصطفیﷺ دەپاڕایەوە و لە قاپی خودای خاوەن ڕەحـم و دەیفەرمـوو: «یـا مُقَلِّـبَ القُلـوبِ وَ الأبصارِ ثَبِّتْ قَلبي عَلَى دينِكَ» واتە ئەی ئەو خودایەی کە چەنها دڵ وەردەگێڕیت لە بـارێکەوە بۆ بارێکی دی، دڵی من ڕاوەستاو کە لە سەر دینی خۆت.

لە سەرەتای ئایەتەکە واتە ﴿رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا﴾ هەسـتی حەزفـی «یقولـون» دەکـا، یـانی «یقولون رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا» واتە ئەو کەسانەی تەسلیمی حەقن و ڕاسخن دە زانستدا نزا و دوعا دەکەن و دەڵێن ئەی پەروەردگارمان! پاش ئەوەی شارەزای ڕێی ڕاستت کردووین ڕێ نەدەی ئەو دڵی بزۆز و سرک و تۆڕ خۆ ئاوەژوو کاتەوە بەرەو ڕێگای خوار و خێچ و باتڵ. ئەو هاوار و داد و دۆعا و نزایە ئەوەمـان پـێ دەڵـێ: خـودایە دەتـوانێ دڵان لە سـەر ڕێـی ڕاسـت وەبەسـتێ و وەهێڵێ، هەر خوداشـە دەتـوانێ مەیـدانی داتـێ خـۆ ئـاوەژوو کـاتەوە، چـونکە ئەو حەدیسـە زاندراوە: «إنَّ القُلوبَ بَينَ أَصبَعَينِ مِن أصابِعِ الـرَّحمانِ يُقَلِّبُهـا كَيـفَ يَشـاءُ» واتە دڵان لە ژێـر دەستی خودادان خودا چۆنی بیهەوێ ئەولاولایان پێ دەکا.

بە کوردی و بە کـورتی: ئەو دوو قـامکەی قـودرەتی خـودا ئـاوایە، دڵ لە نێـوان چـاکە و خراپەدایە، هیدایەتی خـودا بـۆ کـام لایەی بـیهەوێ دەتـوانێ ببـا، هەر ئەوەشـە کە پێغەمـبەر فەرموویەتی: «يا مُقَلِّبَ القُلوبِ وَ الأبصارِ ثَبِّتْ قَلبي عَلَى دينِكَ» واتە ئەی هەڵسووڕێنەری دڵ و چاوان، دڵم لە سەر دینی خۆت بەردەوام و ڕاوەستاو کە.

جوملەی ﴿بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً﴾ ئاماژەیە وەلای چی و چمان پێ دەڵێ؟

یانی خودای تەعالا لە هەوەڵەوە هەموو حەیـات و گیانێـک بە هـۆی هەسـت و شـعوور شارەزا دەکا بۆ خۆ حاواندنەوە و خۆ ئیدارە کردن لە سەر ڕێی ڕاسـت و بەخـتەوەری. بەڵام کە هات و گەیشتە قۆناعی تەماع و لەزەت و خۆشی دنیا و لاقی دە ڕکێفی ئەسپی هەوا و ئـارەزوو و هەوەسی دنیا نا و کەوتە سەر ڕێگای ملبەملە و خۆ ڕەپێش دان و سەرەڕۆیی دنیا، دەکەوێـتە خلیسک و خزین، بۆ لای لادان و تلاسابوون لە ڕێگەی ڕاستەی سرشت و ئەزەلیەی خودا پێی داوین. جا ئە دێرەدایە دەبێ لە بەر خودا وەپاڕێ و بڵـێ ﴿وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَـةً﴾ یـانی ئەی پەروەردگارم، ئەو دڵ و دەروونەی کە لە هەوەڵەوە بە پاکی و نوورانی و هەستی ڕێگای ڕاسـت دابوو تمێ، بە پاکوخـاوێنی وەیهـێڵە و بەردەوام لە سـەر ڕێگـای حەق و بە ڕەحمەتـی خـۆت وەیحاوێنە و وەیلاوێنە، بەو نیعمەتانە:

١. نووری ئیمان و تەوحید و حەقناسی بایسێ دە ناو دڵدا
٢. نووری تاعەت و فەرمانبەری دە هەموو ئەندامانی لەشمدا جێگیر کەی
٣. بە ئاسانی باری ژیانم بڕواتە سەر، واتە پێشێ
٤. کاتی خۆی مەرگی بە ئاسان بخەیتە سەرم
٥. مزڵی ناو گۆڕم ڕووناک بێ نەک تاریک و بەسام
٦. ڕۆژی قیامەت حیسابم ئاسان بێ و ڕووخۆش بە دەگەڵم.

جوملەی ﴿مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً﴾ ئاماژەیە وەلای ئەوە: بەندەی خودا دەڵێ ئەوەی ئەمن داوای دەکەم لە تۆ، بە لای منەوە بە نیسبەتی من زرۆ گەورەیە، بەڵام دە بەرابەر کەرەمی تۆی دەریای کەرەم و ڕەحم کەمە، چونکە هەچی کەرەم و ڕەحم و عەتایە، لە تۆڕایە.

ئایەتی ٩ هەر دەچێتەوە پاڵ ئایەتی ٨، هەر یەکی پاڕانەوە و نزای شتێکن، دوعای ئایەتی ٨ ڕوو بە دنیایە کە لە دنیادا ناحەز و بەدئەخلاق نەبم، دوعای ئایەتی ٩ ئاماژە وەلای ئەوەیە: خودایە باوەڕمان هەیە بە ڕۆژی حەشر و حیساب واتە غافڵ نین لە ڕۆژی حیساب، ئەتۆ لە سەر باوەڕن وەهێڵە و حیسابن دەگەڵ بکە.

دەچینە خزمەت ئایەتی ٩ کە پاشاوی دوعا و نزای «راسخون فی العلم»ە:

**رَبَّنَا إِنَّكَ جَامِعُ النَّاسِ لِيَوْمٍ لاَّ رَيْبَ فِيهِ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُخْلِفُ الْمِيعَادَ ﴿٩﴾** ئالی عیمران
**ئەی پەروەردگارمان! بەڕاستی ئەتۆ کۆکەرەوەی هەموو خەڵکی، لە ڕۆژێکدا کە هاتنی هیچ گومانی تێدا نییە، چونکە ئەوە یەقینە خودا وەعدەی خۆی دەباتە سەرێ و بە پێچەوانەی وەعدی عەمەل ناکا.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ئایەتی ٩:**

لە بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی ئەو دوو ئایەتە پیرۆزانەی ٨ و ٩ی ئالی عیمران هەست بە پێنج سیفەتی (راسخون فی العلم) دەکرێ. سیفەتەکان ئەوانەن:

١. راسخون بە پێی زانست و باوەڕیان ئەمر و حوکمی باریتەعالا لە مەحکەمات بێ یا موتەشابەهات، بەبێ دوودڵی و دڵەڕاوکێ و دڕدۆنگی قبوولیانە.

٢. دەنا قوڵایە دڵیان دوو باڵی بەهێزی ئیمان و باوەڕی کە بریتین لە خەوف و ڕەجا، هەیە بە پتەوی و بە تێروتەسەلی. دیارە نزای ﴿رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا﴾ نیشانەیە لە سەر

بوونی ئەو دوو سیفەتە (خەوف و ڕەجا)، یانی ﴿رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا﴾ نیشانەی خەوفە ﴿وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنك رَحْمَةً﴾ نیشانەی ڕەجایە.

٤. دە هەموو کاتاندا خوازیاری ڕەحمەتی خودان ئەوانەی (ڕاسخون فی العلم)ن.

٥. بە هەڵستانەوە دە ڕۆژی خۆیدا باوەڕی تەواویان هەیە، هەر وەک دەپاڕانەوەیاندا ئاماژەی وەلا دەکەن دەڵێن ﴿رَبَّنَا إِنَّك جَامِعُ النَّاسِ لِيَوْمٍ لاَّ رَيْبَ فِيهِ﴾ و هەروا بە زات و سیفات خودایان باوەڕە بە دەلیلی ئەوەی کە دەڵێن ﴿إِنَّك لاَ تُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾ ئەو شێوە پاڕانەوە و نزایە گۆشەیەک نیشان دەدا لە باوەڕ و ئیعتیقاد.

ئەو خاوەن باوەڕانەی کە دەڵێن ﴿إِنَّك جَامِعُ النَّاسِ لِيَوْمٍ لاَّ رَيْبَ فِيهِ﴾ خودای تەعالا لێیان وەردەگرێ و تەسدیقیان دەکا بەو دەلیل و بورهانە کە دەفەرموێ ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾ واتە بە تەئکید خودا بە پێچەوانەی وەعدی عەمەل ناکا. هەر وەک دووبارە لە ئاخری سوورەی ئالی عیمراندا لە زاری موئمینانەوە دەفەرموێ:

**رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَى رُسُلِكَ وَلاَ تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لاَ تُخْلِفُ الْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾** ئالی عیمران
**ئەی پەروەردگاری ئێمە! ئەو وەعدانەی کە بە وەسیلەی پێغەمبەرەکانەوە بە مەت داون بۆمان بێنە جێ لە ڕۆژی پەسڵانیشدا سەرشۆڕمان مەکە. ئەتۆ هەرگیز بەڵێنی ناشکێنی.**

ڕازێکی جوان و خۆشبۆن و خۆشتام لە نێوان ئەو دوو ئایەتی ٩ و ١٩٤ی ئالی عیمراندا هەیە بە ڕەوام نەزانی بە سەریدا باز دەم و قووتی دەم. ڕازەکەش ئەوەیە:

دە ئایەتی ٩دا خودا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾ بەڵام دە ئایەتی ١٩٤دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكَ لاَ تُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾. دە ئایەتی ٩دا ناوی «الله» نیشان دراوە، دە ئایەتی ١٩٤دا «ک» (کافی خطاب). دیارە خودا زاناترە بە هەرچی شتە. بەڵام دێرەدا بە پێی ڕاوێژی بەراوەرد دەبێ ڕازی ئەو جیاوازییە ئەوە بێ:

ئایەتی ٩ دە مەقامی هەیبەتدا خۆی نیشان داوە واتە خودای خاوەن هێز و هەیبەت بۆ ستاندنی تۆڵەی مەزلوومان لە زاڵمان لازمیەتی حەشر و حیساب بێنێتە گۆڕێ ڕۆژێک لە ڕۆژان، بەو پێیە شایانە دەو مەقامەدا یادی خودا بە ئیسمی ئەعزەم بکرێ کە «الله»یە.

بەڵام ئایەتی ١٩٤ دە مەقامی داوا و پاڕانەوەدایە کە عەبد دەڵێ: خودایە بە فەزڵ و ڕەحمەتی خۆت لە تاوانمان ببوورە و بە ڕەحمەتی خۆتن بەهرەمەند کە. لە سەر ئەو ئەساسە ئەو مەقامە

مەقامی هەیبەت نییە و پێویست ناکا یادی خودا بە ئیسمی «الله» بکرێ بەڵکە بە «انک» شایانە.

دەبێ ئەوە بزاندرێ کاتێ خودای حەکیم ڕوانی بە چاوی ڕەحم و عەداڵەتـی لە پـاڕانەوە و نزای خاوەن باوەڕان و حاڵی بێباوەڕانی سەرەڕۆ و تەجاوەزکارانی کافران، هات ئەو حیکمەتی جوانی خۆی ڕانێ و نیشانی ئینسانی دا، کە شێوەی دابەزینی قورئانی پیرۆزی ئاوایە: کە لە هەر شوێن و مەقامێک وەعدە و مزگێنی خۆشی هاتە کایە و نیشان درێ، هەڕەشە و ترسی عەزاب بە شوێنیدا دێ و دادەبەزێ. جا بە پێی ئەو نیزامە جـوانە، دەبـێ بچیـنە خـزمەت ئەو سـێ ئـایەتە پیرۆزانەی ١٠ و ١١ و ١٢ی ئالی عیمران کە لە بابەت حاڵی ئەو کافر و بێبـاوەڕانە کە دە دنیـادا بە کەیف و ئارەزووی خۆیان ژیانیان بردۆتە سەر و بە ماڵ و سـەروەت و دەسـتەڵات و حەولاد خۆیان باداوە و خوڕیون.

إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلاَ أَوْلاَدُهُم مِّنَ اللّهِ شَيْئًا وَأُولَـئِكَ هُمْ وَقُودُ النَّارِ ﴿١٠﴾ كَدَأْبِ آلِ فِرْعَوْنَ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا فَأَخَذَهُمُ اللّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَاللّهُ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿١١﴾ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَى جَهَنَّمَ وَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴿١٢﴾ ئالی عیمران

لە ڕاستیدا ئەو کەسـانەی کە بـێ بـڕوان، مـاڵ و سـامان و ئەولادیـان نـاتوانن بە هـیچ شـێوەیەک ڕزگاریان بکا لە سزای خودا لە بـابەت ئاکـار و کاریـان، هەر ئەوانەن دەسـتەچیلە و سـووتەمەنی ئاگری دۆزەخ (١٠) ئەوانەش وەک هۆزی فیرعەون و پێشینانی ئەوان وان، کە ئایات و بەڵگەکانی ئێمەیان بە درۆ دەزانی، جا بە هۆی گوناهەکانیان خودا غەزەبی لێ گرتن، دیارە خودا تۆڵەسـتێنێکی تونـدوتیژە (١١) ئەی پێغەمـبەر بڵـێ بەوانەی بێبـاوەڕن، بەو زووانە تێدەشـکێندرێن و کـۆش دەکرێنەوە و بەرەو دۆزەخ ڕەپێچەک دەدرێن، کە ناخۆشترین شوێنی لێ ژیان و حاوانەوەیە (١٢)

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر سێ ئایەتی ١٠، ١١، ١٢:**

وەک دیـارە بـێئیمان و بێباوەڕەکـان بە مـاڵ و سـەروەت و سـامان و ئەولاد شـانازی و خۆهەڵکێشانیان نیشان دەدا، هەروەک ئێسـتێش ئەو دابە عەوامە بـاوە لە نـاو خەڵکـی نەفامـدا ئەمما بێخەبەر لەو ئایەتە پیـرۆزەی ١٠ی ئـالی عیمـران، ئەوانە شـوێنکەوتووی دارودەسـتەی فیرعەونن.

دەگێڕنەوە کە هۆی دابەزینی ئایەتی ١٠ ئەوەیە: کـاتێ وەفـدی نەجـران لە بـابەت عیسـا و ئایینی مەسیح هاتوونە خزمەت پێغەمبەری و کەوتوونە باسەوە، یەکێـک لەوان (ابـا حـارثە بـن

علقمه) کە دەزانێ قسەکانی پێغەمبەر زۆر دڵگرن و زانایانەن، کەس توانای ڕەدکردنەوەیان نییە، بە براکەی خۆی کە دەگەڵی بوو لەو سەفەرەدا کوتی: یەقینم وایە ئەو پێغەمبەرە پێغەمبەری حەقە و قسەکانیشی حەقن، ئەمما ئەمن ئەگەر ئەو باوەڕەم ئاشکرا کەم، ئەو سامان و ماڵ و سەروەتەی کە لە مێژینەیە لە لایەن دەستەڵاتەوە دەمدرێتێ و ئەو پایە و مەقامەی هەمە لە دەس دەچن، جا بۆیە ناوێرم بیڵێم، بە داخەوە ئێستێش ئەو شێوە ئاکارانە زۆرن و چاو دەکرێن. (روح المعانی، ج ٣/ ١٢٤ * تفسیر کبیر، ج ٧ / ١٩٨)

و هەروا دەگێڕنەوە گۆیا ئیبنی عەبباس لە مەڕ دابەزینی ئایەتی ١٢ ئالی عیمران فەرموویەتی: لە پاش بەزین و شکانی قورەیشییەکان بە دەستی هێزی لەشکری ئیسلام لە هەرای بەدردا، یەهوودەکانی «بنی قینقاع» لە دەوری یەک کۆ بوونەوە لە بابەتی ئایینی ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام و تەنانەت لە بارەی خۆیان لە ڕاست ئەو شۆڕش و حەرەکەت و جووڵانەوەیەی ئایینی ئاسمانی هەڵگیرساندوە ئاڵوگۆڕی بیروڕایان کرد، لەو بارەوە کە دەبێ ئێمە هەڵوێستمان چۆن بێ. دەو بیروڕا و هەڵوێستەیاندا بوون بە دوو دەستە:

١. دەستەیەکیان هاتنە سەر ئەو باوەڕە و ڕایانگەیاند کە سەرکەوتنی ئەو پێغەمبەرە بەو شێوەی کە دەڕواتە پێشێ، حەتمییە و بێ‌گومانە، بەو دەلیلانە هەچی دەیڵێ دوور لە ئەقڵ نییە و ئەرزشی بۆ ئینسان دادەنێ بە گشتی لە سەر هەر ئایینێک بێ، و لە شەڕیشدا سەرەڕۆ و تەجاوزکار نییە، هەر ئەو شێوە ئاکار و ڕەفتارەشی بوو کە توانی هێزی قورەیشییەکان تێک‌شکێنێ، کە گەورەترین و بەهێزترین هێز بوون لەو ڕۆژەدا. جا لە سەر ئەو باوەڕە ئەو دەستە هەڵوێستیان ئاوا گرت: هەچی زووترە ئیمانێ بەو پێغەمبەرە بێنین و تەسلیمی بین بە هەموو ئومێد و باوەڕەوە، تا بتوانین خۆمان حەکیمانە و ئاقڵانە لە شەڕ و هەرا و ماڵوێرانی و کوشت و کوشتار و دەربەدەری دەربەرین و نەجات دەین و هەروا لە ڕۆژی ئاخرەتیشدا خۆشبەخت بین و ڕووسیا نەبین.

٢. دەستەی دووهەم هەڵوێستیان بە لایەکی دیدا گرت چونکە زۆرتر بوون لە دەستەی هەوەڵ. نەیانتوانی بچنە ژێر ئەو باوەڕە ڕاستی و دوو ڕستەی ئەوان، دەیانکوت ئێمە بە قەتعی پێغەمبەری خۆمان کە مووسایە وەلا نانێین تاکوو بچین تەسلیمی پێغەمبەرێکی دیکە بین ـ وەک محمد المصطفی بێت ـ چونکە پێغەمبەری مەش خاوەنی کتێب و مەزەب و ئایینی سەربەخۆیە، خۆ قورەیشییەکان ئەگەر شکستیان خواردووە، هۆیەکەی ئەوە بووە جگە لەوەی

کە تەجرەبەی شەڕیان نەبووە و نەیانزانیوە، خـاوەن پێغەمـبەر و کتێـب و مەزەبـیش نەبـوون تـا بتوانن بە هیممەت وەرگرتن لە پێغەمبەریان خۆڕاگرن و نەشکێن، ئێمە تەجـرەبەی شەڕیشـمان هەیە و پێغەمبەر و کتێبیشمان هەیە. ئەو بۆچوون و نەزەرە ناپـاکە شـەیتانییە فریـودان و خۆیـان تووشی تەڵەی بێئیمانی کرد.

خودای تەعالا ئەو ئایەتە پیرۆزە (١٢)ی لە دژی نەزەری وان دابەزاند.

هەندێکیش پێیان وایە هـۆی دابەزینـی ئەو ئـایەتە (١٢)یە، جـگە لەوەی ڕووی دە تەواوی کافرانە، مزگێنیشە بە پێغەمبەر و یارانی کە هەچی هێزی کافرانە لە ڕاست هێز و ئیرادەی ئیسلام شکست خواردوویە و شکست دەخـوا، ئەو شـکانەیان سـزای دنیایـانە، سـزای ئاخیرەتیشـیان ئاگری دۆزەخە.

دڵ دەیهەوێ بزانێ ڕازی ئەوەی کە خودای تەعالا دە ئایەتی ١٠دا بـۆچی مـاڵ و ئەولادی هێنانە گۆڕێ کە دە ڕۆژی ئاخرەتدا هیچ دەردێک چارە ناکەن؟

دەبێ بە پێی ڕاوێژ و هەڵسەنگاندنی بابەتەکانی دنیا و ئاخرەت ڕازی لەنـاوبردنی (امـوال و اولاد) دە ئایەتی ١٠دا ئەوە بێ: ئینسان دە دنیـادا دە بەرابەر تەنـگوچەڵەمە و گرفتاریـدا بە دوو شت ڕادەسێ بۆ چارەیان، ئەو دوو شتەش ماڵ و ئەولادن. چونکە هێزی ماڵ و سامان و ئەولاد چارەسازن لە ڕاست گیر و گرفتی دنیادا، واتە لە هەوەڵەوە بۆ چارە کردنـی گرفتارییەکـانی دنیـا دەسی بۆ ماڵ و سامان دەبا ئەگەر بە سەروەت و سامان دەڕۆستی گرفتاری نەهـات و باشـاری نەکرد، هێزی ئینسانی و ئەولاد و خزموکەسی دەخاتە گەڕ. جا خودای تەعالا هات بە وەسیلەی ئایەتی ١٠ ئالی عیمران ئینسـانی تێگەیێنـێ کە ئەو دوو وەسـیلانە دە ڕۆژی حیسـابی ئاخرەتـدا بێئەرزشن و بێفایدەنە. بگـرە زەرەریشـیان هەبـێ دە ڕۆژی قیامەتـدا. بە مەرجـێ لە دنیـادا دە ڕێگای چاکدا دەکار نەکرێن. بۆ تەئکیدی ئەو داوایە ئاوڕێک وەسەر ئایەتی ٨٨ و ٨٩ی «شعراء» دەدەین:

**يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾** شعراء

**لەو ڕۆژەدا هیچ سامان و خزم و خوێش قازانج ناگەیێنێت، کەسێک نەبێت کە بە دڵێکی ساغ و سەلیمەوە بچێتە خزمەتی خودا.**

چونکە ماڵ و منداڵ و خزم و قەوم و خێش زینەتی دنیـایەن، وەئـیللا بـۆ ڕۆژی ئـاخرەت عەمەل، عەمەل، عەمەل، بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٤٦ی کەهف:

الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴿٤٦﴾ کهف

دارایی و منداڵ زینەتی ئەو دنیایەن ئەو چاکانەی دەمێننەوە، ئەوان چاکترین و باشترین هیوا و هومێدن (بۆ ڕۆژی قیامەت)، لە لای پەروەردگارت.

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم بە پێی ئەساسی حیکمەت و عەداڵەت ئینسانی جار دەگەڵ جار لە سەر هەڵە و ئیشتیباهەکانیان وەخەبەر دێنێ و تێیاندەسرەوێنێ، وەک ئەدێرەدا هەڕەشەی ئەوە لە ئینسان دەکا کە ماڵ و دارایی و ئەولاد و خزم و قەوم و دەست وپێوەند بۆ وەی نابن شایی ڕۆژی قیامەتت پێ بن.

دیارە وەک بۆمان دەرکەوت دە ئایەتەکانی ١٠ و ١١ و ١٢دا هۆزی یەهوود و بێباوەڕانی عەرەب کە ئینکاری ئایینی بەحەقی ئیسلامیان کرد بە هۆی ئەو فکر و خەیاڵە بێئەساسە: کە سەرکەوتنی هێزی ئیسلام بە سەر بێباوەڕاندا لە هەرای بەدردا هۆی بێتەجرەبەیی قوڕەیشییەکان بوو و دەنا ناکرێ هێزی وا کەم بتوانێ بە سەر هێزی وا زۆردا سەرکەوێ، بەڵام بێتەجرەبەیی و بێئاگایی لە فێڵ و فووتی شەڕ شکستی بە دوودا دێ. ئەمما ئەو خەیاڵاتە بێئەساسەی بێباوەڕان نەبوو بە هۆی شکانی بێباوەڕان بە تەواوی، بەڵکە ئیرادەی خودا و نەسرەتی وای هێناوەتە پێش کە ئەو هێزە کەمەی موسوڵمانان سەرکەوێ بە سەر هێزی زۆری بێباوەڕاندا.

جا بۆ تەئیدی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٣:

قَدْ كَانَ لَكُمْ آيَةٌ فِي فِئَتَيْنِ الْتَقَتَا فِئَةٌ تُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَأُخْرَى كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ الْعَيْنِ وَاللّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِ مَن يَشَاء إِنَّ فِي ذَلِكَ لَعِبْرَةً لَّأُوْلِي الأَبْصَارِ ﴿١٣﴾ ئالی عیمران

بەبێ گومان لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو دوو دەستەدا نیشانەیەکی ئاشکرایە بۆ ئێوە، دەستەیەکیان دەجەنگێن لە ڕێی خودادا، ئەوی دیکەیان بێ بڕوان بوو، بە ئاشکرا موسوڵمانەکانیان بە دوو ئەوەندەی خۆیان دەبینی، خودا بە یارمەتیدانی خۆی پشتگیری ئەو کەسە دەکات کە دەیەوێت، بێگومان لەو کارەساتەدا پەند وەرگرتنێکی زۆر هەیە بۆ ئەوانەی کە خاوەن دڵێکی ڕووناکن.

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێهەڵڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٣:**

ئەگەر بە ئینسافەوە سەیری جەرەیان و کارەساتی هەرا و شەڕی بەدر بکرێ و بەرجەوەندانە

هەڵسەنگێندرێ، بەڵگە و نیشانەی زۆر بەرچاو و گەورە لە سەر بەتوانی و گەورەیی و قودرەتی خودا چاو دەکرێن، وەک لە ڕاست یەک هاتنی دوو هێز و دوو دەستەی دوژمن، دەستەیەکیان موسوڵمانانی خاوەن ئیرادە لە ئیمان و باوەڕ و هیوای سەرکەوتن و پیرۆزی، بەڵام لە باری نیزامی و نەفەراتدا کەم (٣١٣ نەفەر)؛ دەستەیەکیشیان کافرە بێباوەڕەکانی قورەیش کە دە هێزی نیزامیدا زۆر و چەند بەرابەری موسوڵمانەکان و زۆر تەیار بوون، قورەیشییەکان ١٠٠٠ نەفەر بوون و لەشکری خاوەن باوەڕەکان ٣١٣ نەفەر، جا لە سەر ئەو حاڵەتە ئیرادە و هێزی موسوڵمانەکان ئەو هێزە زۆرە بێباوەڕانە تێکدەشکێنێ. جا ئەو کارەساتە موعجیزەئاسایە دەبێتە بەڵگە لە سەر حیکمەت و قودرەتی خودای خاوەن ڕەحم و بەزە دەگەڵ خاسان و پاکان.

دەگەڵم بن گۆشەیەک لەو کارەساتە بێوێنەی شەڕی بەدر باس بکەم.

**کورتەیەک لە شەڕی بەدر**

بە پێی نەزەری ڕاویان غەزای بەدر هەوەڵین شەڕ و تێکهەڵچوونی موسوڵمانان بووە دەگەڵ کافرانی قورەیش، دیارە ئەو هێزە ٣١٣ کەسەی موسوڵمانان بە تەمای شەڕێ نەبوون، تەنیا ویستیان ئەوە بووە کە زەربەیەکی دارایی لە کافران بدەن، جا بەو هیوایە دێن ئەو ٣١٣ نەفەرە بە هەشت شمشێر بە دەست و دوو یا سێ نەفەر تیر و کەوان بە دەست، باقیەکانی نێزە و دار و تێڵا و تەور و چەقۆ، ٧٠ وشتریشیان پێ دەبێ کە بە نۆرە سواریان بن و دوو ئەسپیشیان پێ دەبێ.

لەو لایەشەوە کافرەکان بە سەرکردایەتی ئەبوسوفیان دەیانهەوێ کاروانیان لە شامێڕا بەرەو مەککە وەگەڕێ، ئەو موسوڵمانانەش بەو هێزە کەمەی خۆیان دەیانهەوێ ڕێگایان لێ بگرن و نەهێڵن بەو ڕێگایەدا هاتوچۆ بکەن.

کاتێ ئەبوجەهل خەبەردار دەبێ کە ئەوە موسوڵمانان دەیانهەوێ ڕێ بگرن لە کاروانیان، بۆ بەرگری و نەجاتی کاروان و کوشتن و یەخسیر کردنی بەرەی موسوڵمانان جاڕ دەکێشێ لە شاری مەککەدا و جەریان بە عالەم ڕادەگەیێنێ کە محەممەد دەیهەوێ ڕێگای ژیان لە عالەمی مەککە بگرێ. عالەمی مەککە بەو جاڕ و هاوارە ئیحساساتیان وەکوڵ دێ و کۆ دەبنەوە. هەزار نەفەر کە نۆسەد و پەنجا نەفەریان سیلاح بە دەست ئامادەی خۆنیشاندانن. پەنجا نەفەریشیان خەدەمە و پشتیوان، بە گوڕ و تینەوە لە شاری مەککە دەردەکەون، بەرەو ئەو لەشکرە ٣١٣ نەفەرەی موسوڵمانان دەکەونە ڕێ.

کاتێ موسوڵمانان لەو لەشکرە خەبەردار دەبنەوە، لێک وەکۆ دەبن بۆ ڕاوێژ کردن لەو بارەوە دەگەڵ پێغەمبەرﷺ. نەتیجە و بەرهەمی ڕاوێژ و ڕاوێژکاری تەواویان بە ئیرادە و هیوایەکی تەواو و پتەو بۆ بەرەو پیرەوە چوونی ئەو شەڕە خۆ نیشان دەدەن بێ ئەوەی لە یەکێکیان تـرس و دڵەڕاوکێ چاو بکرێ و دەرکەوێ.

دەو شەڕ و بەرەنگار بوونەوەشدا حەزرەتی ڕەسووڵ بۆخۆی سـەرکردایەتی و فەرمانـدەیی وەئەستۆ دەگرێ و حەزرەتی عەلـیش ئـاڵاهەڵگری موهـاجران وەئەسـتۆ دەگـرێ و حەزرەتـی سەعد کوڕی عیبادەش ئاڵاهەڵگری ئەنسارییەکان وەئەستۆ دەگرێ.

سەرئەنجام ئەو دوو لەشکرە لە ڕۆژی ١٣ مانگی ڕەمەزانـدا لە سـەرچاوەی بەدر دەگەن بە یەک و بەرەنگاری یەک دەبن، دەو کاتەدا حەزرەتی ڕەسـووڵ دەفەرمـوێ: «قَـد أُخْرِجَـتْ مَكَّـةُ إِلَيْكُم أ فَلاذَ اكْبادها»: واتە مەککە پارچەیەکی لە جەرگی خـۆی بـۆ ئێـوە نـاردووە. بە زاهیـری دەبایە ئەو لەشکرە هەزار نەفەرەیەی کافران بە فەرمانـدەیی ئەبوسـوفیان سـەرکەوتنی بە دەسـت هێنابا بە سەر لەشکرێکی ٣١٣ نەفەری بە فەرماندەی پێغەمبەری، ئەمـما دەبـێ هەمـوو ئەقـڵ و شعوور و هەستێک ئەوە بزانێ ئیرادە و ئیمان و باوەڕی سەرکەوتن بە دەس دێنێ دە هەموو شەڕ و هەرا و بەزماندا، نەک زۆری نەفەرات و چەک و سیلاح. جا بۆیە ئەو بێباوەڕ و کافرانەی بێ ئیرادە هێز و ورە و غیرەتی شەڕیان نەبوو، دە بەرابەر هێـز و ئیـرادە و غیرەتـی یـارانی بەحەقـی ڕەسووڵی بەحەق، هیمداد و هیدایەتی باریتەعالا تـین و گـوڕی دا بە لەشـکری ئیسـلام، ئەو هەزار نەفەرەی لە بەر چاویان گێڕا بە شتێکی کەمی دەستەوستان و تێکیـان شـکاندن وپەرت و پەرێشان بێر و بەوێدا. سەرەنجام ١٤ نەفەر لە لەشکری ئیسلام پلەی شەهادەتیان بە نەسیب بوو کە شەشیان لە موهاجران بوون هەشتیان لە ئەنسارییەکان. لە لەشکری کافرەکـانی قوڕەیشـیش ٧٠ نەفەر کوژران دوو فەرماندە و ڕەئیسی هێز و سەریان تێدا بوو: ئەبوجەهل و ئومەییە.

ئەوە کورتەیەک بوو لە کارەساتی غەزای بەدر کە پڕ لە دەرسە بۆ خاوەن هەستان.

لە سەر ئەساسی لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی ئایەتەکـانی ١٠ هەتـا ١٣ دەتـوانین بڵێـین ئەو ئایەتانە سێ شتی ئەساسی و ئەسڵ و بەئەرزشیان فێری ئێمەی ئینسـان کـرد. ئەو سـێ شـتەش بریتین لەوانە:

١. دە دۆزەخ هاویشـتنی کـافران بە حەتمـی بـێ ئەوەی مـاڵ و سـەروەت و ئەولاد و خزموکەس بتوانن بە هاوارەوە بێن یان چییان لە دەس بێ.

٢. دارڕژانی عەزاب بۆ سەر ئەو کەسانەی کە ئینکاری ئایاتی قورئان دەکەن و دەسبەرداری لاساری نابن و ناگەڕێنەوە، لە لایەن خودای خاوەن عەدڵ و داد سوننەی تەسبیت شودەی خودای تەعالایە. دیارە لە سەر ئەو یاسایە بۆ وەبەرکەوتنی شالاوی عەزابی دۆزەخ جیاوازی نییە لە نێوان کافرانی قورەیش و ئالی فیرعەون و قەوم و هۆزە سەرکەشەکانی لووت و عاد و سەموود و ... وەکوو ئایەتی ١ و ١٢ی ئالی عیمران ئاماژەی وەلا کردووە:

**كَدَأْبِ آلِ فِرْعَوْنَ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا فَأَخَذَهُمُ اللّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَاللّهُ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿١١﴾ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَى جَهَنَّمَ وَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴿١٢﴾** ئالی عیمران

**ئەوانیش وەک هۆزی فیرعەون و پێشینیانی ئەوان وان، کە ئایەت و بەڵگەکانی مەیان بە درۆ دەزانی (١١) بە هۆی گوناحەکانیانەوە خودا دانی بەر غەزەبی خۆی، دیارە خودا تۆڵەستێنێکی توندوتیژە.**

٣. یاریدەدان و بە هاوار و وەفریاکەوتنی خودا لە سەر ئەساسی ئیرادە و حیکمەتی خۆیەتی. دیارە ئەوەش ئەمرێکی سوننەتییە بۆ خودا پاداشی ئەوانەی چاک و پاک و خاسن لە ڕاست ئیتاعە و فەرمانبەری، بێ ئەجر و پاداش نابن چونکە ئەوانە پاڵیان داوەتەوە بە ئیرادە و حیکمەتی باری، خۆ دیارە کەسێکیش پاڵ وەخودا دا، خودا دەئامێزی ڕەحمەتی دەگرێ، هەر وەک ئایەتی ٢٤٩ی بەقەرە ئاماژەی وەلا کردووە:

**كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللّهِ وَاللّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴿٢٤٩﴾** بقره

**زۆر دەستەی کەم زاڵ بووە بە سەر دەستەیەکی زۆردا بە ویستی خودا، خودا دەگەڵ خۆڕاگرانە.**

ئەو ئایەتی ١٣ لە دوو ڕێگاوە شاهیدی لە سەر پێغەمبەرایەتی حەزرەتی محەمەدﷺ دەدا، ئەوەش دوو ڕێگاکەن:

١. سەرکەوتنی ٣١٣ نەفەر لە یارانی خاوەنی باوەڕ و پێغەمبەر، بە سەر ١٠٠٠ کەس لە بێباوەڕانی وەک ئەبوجەهل و ئەبوسوفیاندا وا پڕ چەک و کەرەسەی شەڕ بوون، بە زاهیری خیلافی عادەت و یاسای شەڕ و شۆڕە. جا ئەوە ئاماژەیە وەلای هیمدادی نهێنی خودا، جا بە هەر شێوەیەک بێ واتە بە هۆی فرشتە نادیارەکان بێ یان بە هۆی غیرەت دە ناو دڵ خستنی یارانی ئیسلام بێ، نیشانی پشتیوانی خودا لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرە.

۲. خودای تەعالا پێش ئەوەی لەشکری ئیسلام بەرەنگاری کاروانی تیجارەتی قوڕەیشیان و لەشکری هەزار نەفەری قوڕەیشیان بێ و شەڕ دەست پێبکا، هیوای سەرکەوتنی پێغەمبەر و یارانی و تێکشکانی قوڕەیشیانی داڕشتبوو ئاماژەی وەلا کردبوو دڵ و باوڕەی پێغەمبەری بە تەواوی هەست بەو سەرکەوتنە کردبوو، جا ئەو خەبەرداریەی پێغەمبەری لە مەڕ پیرۆزی لە شەڕی ئاوا حەستەم نیشانەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرە.

دە ئایەتەکانی ۱۰ و ۱۱ و ... باس لە ڕووڕەشی و ڕۆژی ڕەشی ئەو کەسانە کرا کە بە سەروەت و مەقام و ئەولاد خیرەسەر و یاغی دەبن و ئاوڕ وەلای حەق و عەدالەت نادەنەوە. ئەوجار دڵ و هەست و شعوور دەیانهەوێ بزانن ئایا مەگەر ئینسان نازانێ و ئەقڵی بەوەی ناشکێ کە ماڵی دنیا و خزم و کەس ڕۆژی نەفسی نەفسی سوود نادەن و ناتوانن دە فریا و هاواری کەس کەون؟!

بۆ وڵامی ئەو پرسیارە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ۱۴ی ئالی عیمران. جا لەوێدا ورد بڕوانین و بەرجەوەند بین تاکوو بتوانین هۆی غرووری ئینسانی بە ماڵ و دارایی و خزم و کەس و پۆست و مەقام و حەولاد وەدۆزین:

زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاء وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاللّهُ عِندَهُ حُسْنُ الْمَآبِ ﴿١٤﴾ ئالی عیمران

ڕازێنراوەتەوە بۆ ئینسان خۆشەویستیی ئارەزووی ژن و منداڵ، سامان و ماڵی کەڵەکەکراو، لە ئاڵتوون و زێو و ئەسپی ڕەسەن و دیاریکراو، هەروەها لە چوارپێ و ئاژەڵ، دەغڵ و دان و کشتوکاڵ، ئەوانە گشت کاڵای ژیانی ئەم دنیایەیە، سەرەنجامی چوانیش تەنیا لە لای خودایە.

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر سیما و ناوەرۆکی ئایەتی ۱۴:**

ئارەزووی نەفسانی کە ڕازاوەتەوە بۆ ئینسانی، تەجرەبەی کەڕامەتی ئینسانە تاکوو دەرکەوێ کە هێزی کەرامەت و تەقوا دەتوانێ خۆڕاگری کا لە بەرابەر هێزی نەفسانی کە بەهێزترین چەکی شەیتانە بۆ تێکشکاندنی هێزی تەقوا و کەڕامەتی ئینسانی.

دڵ دەیهەوێ بزانێ ڕازێنەرەوەی خۆشەویستی هەوا و هەوەس و شەهەوات بۆ ئینسانی کێیە؟ ئایا خودایە؟ یا شەیتانە؟

دەبێ بۆ وڵامی ئەو پرسیارە ڕوو بکەینە لای ئەهلی ئەقاید وەک ئەهلی سوننەت و

جەماعەت و ئەهلی قورئانزان، وەک زانایانی ئەشعەری و پەیڕەوانیان و زانایانی موعتەزیلە.

١. ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە سەر ئەو باوەڕەن کە سازدەر و پێکهێنەر و وەدیهێنەری هەموو شت ـ چ خێر و چ شەڕ ـ خودایە، واتە شەڕ و خێر خودا دایناون و بە ئینسانیشی زاناندووە ئەوە شەڕە و پاداشی عەزابە، ئەوەش خێرە و پاداشی چاکەیە، یانی خودا شەڕ بە کەس ناکا و سازشی دا، وە هەروا خێریش بە کەس ناکا و پاداشی داتێ؛ بەڵکە ئەقڵ و ئیختیاری داوەتە ئینسان و ڕێگاشی پێ نیشان داوە، جا کام لا هەڵگرێ مەنعی ناکا و دەستی وەبەر دەستی نانێ. ئەدێرەدایە خوداناسی و خودانەناسی، کەوایە ڕازێنەرەوەی «حبّ شهوات» شەیتانە و پێکهێنەری شەڕیش نەفسی ئینسانە. یانی ڕاستە پێکهێنەر واتە خالق خودایە، بەڵام عەمەلکەر و ئەنجامدەرەکەی ئینسانە و بۆ فریوی ئینسانیش لە بەر چاو شیرینکەر نەفس و هەوای شەیتانییە، شەهەوات واتە داوخوازییەکانی نەفس. (تفسیر کبیر، ج ٧/ ٢٠٨ * روح المعانی ج ٣/ ١٣٢ * قرطبی ج ٢٨/٤)

دڵ دەڵێ دەبێ ڕازی خۆشەویستی دنیا لە ناو دەروونی ئینسانیدا چ بێ؟ خودا پێکیهێناوە؟ دەگەڵ ئەوەی خودای تەعالا لە زۆر ئایەتاندا زەمی دنیاپەرستانی کردووە و ئینسانی بە خۆ پارازتن لە شەڕی دنیا ئاگادار کردوە و هەروەها پێغەمبەریش فەرموویەتی: «حُبُّ الدُّنيا رَأْسُ كُلِّ خَطيئَةٍ» (واتە خۆشویستنی دنیا سەرچاوەی هەموو خەتا و تاوانەکانی دنیایە)، بە پێی ئەو فەرموودانە دەبا خودا خۆشەویستیی دنیا گەرای نەناژتبایە لە ناو دەروونی ئینسانندا. ئەوەش یەقینە شەئن و عەداڵەتی خودا تەڵە و داو بۆ ئینسانی ناکرێ دانێ لە دنیادا، جا لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ حەول بدرێ ڕازی خۆشەویستی دنیا لە دەروونی ئینسانندا وەدۆزرێ کە هۆیەکەی چییە؟

خاوەن ئیمان چ بزانێ و چ نەزانێ، دەبێ ئەوەی باوەڕ بێ کە حیکمەت و ڕازی باریتەعالا دە هەموو بوونەوەرێکدا هەیە و یەقینە، جا وا هەیە گۆشەیەک لەو ڕاز و حیکمەتە دە ئینسان دەگەیێندرێ و وا هەیە بە سەرپۆشی دەمێنێتەوە.

جا لە سەر ئەو یاسا و ئەساسە لەو ئایەتەدا خۆشەویستی و ئارەزووی ئینسان دە بەرابەر ئەو شتانەی ناویان براوە، وەک ژن و ئەولاد و زێڕ و زمبەر و حەیوانات و زەوی و مەزرا، تەواو ڕاز و نیاز و شتانێکن کە وەک کۆڵەکەی خانووی ژیانی ئینسانن واتە ئینسان بێ ئەوانە ناتوانێ ژیان بکا و بیباتە سەر، دەکرێ دێرەدا گۆشەیەک لەو ڕاز و حیکمەتە نیشان بدەین:

١. ئەگەر بە وردی سرنج بدەین و بابەتەکان هەڵسەنگێنین ئەو حەقیقەتە چاو دەکەین کە نیزامی داڕژتنی عالەم لە سەر ئەخلاقیات و معاشەرەت و ژیان دامەزراوە و دابەستراوە، تاکوو بە هۆی ئەو عیشق و عەلاقەوە خۆشەویستیەی دنیا تا کەندەڵانی مەرگ دنیا بڕواتە پێش و بخولێتەوە و هەروا تاکوو ڕەوڕەوەی زاد و وەلەد و تۆرەمە و نەسل و تێکەڵاوی و هاوکاری و دەستەوایی ژیانی پڕ لە خۆشی کۆمەڵایەتی بڕوا بەرەو پێش و دنیا لە خول و گەڕدا بێ. ئەو «حبّ شهواته» هەوێنە دەبێ ببێ.

ئەوە یەقین و بێگومانە ئەو کارخانە گەورەی دنیا بە بێ ئاوی «حبّ شهوات» واتە ژن و ئەولاد و سامان و دارایی ناگەڕێ و خول نادا، یانی ژن ئەگەر نەبێ، قەتاری ئینسانی تا منزڵ و ئاخرین قۆناغی دنیا چۆن دەتوانێ بپێوێ؟ ئەگەر ئاژەڵ نەبێ و زەوی نەبێ و زەراعەت نەبێ، ئاشی ژیان چۆن دەگەڕێ؟ کە وایە دەبێ بیسەلمێنێ ژن و ئەولاد و زێڕ و زەمبەر و زەوی و زەراعەت کە سەرچاوەی «حبّ شهوات»ن، هەوێنی ژیانن و دەبێ ببن. نەبوونیان نەبوونی نیزامی دنیایە، چونکە پایەی ڕاوەستانی نیزامی عالەم لە سەر «حبّ شهوات» دامەزراوە. جا ئەو «حبّ شهوات» لە سەر فەساد بڕوا و یا لە سەر ڕێگای ڕاست و دروست بڕوا بەرگری لێ ناکا خودا، تا ڕۆژی پاداش، ئەو کات هەر بە گوێرەی کردار پاداش دەدرێتەوە.

بە کورتی و بە کوردی خودای تەعالا دڵی دروست کردووە و بە ئەشق و ئەوین دایڕشتووە و دایماشتووە و دایشوشتووە. جا وا هەیە ئەو مەلی ئەشق و ئەوینبازە لە دەوری گوڵ و گوڵزار و باغچەی ژن و منداڵ و سامان و زینەتی دنیا هەڵدەخولێ و چەرخان دەدا تا دەسووتێ و دەکەوێ. یا لە دەوری شیلە و میوەی مەزەداری ڕۆژی ئاخرەت دەگازێنێ و خولان دەدا. ئەگەر بە وردی لە ناو دەروون و سیمای ئایەتی ٧ی سووڕەی کەهف بڕوانین تێدەگەین زینەتی بۆ چییە. ئەوەش ئایەتەکە:

**إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾** کهف

**بەڕاستی ئەوەی کە لە سەر زەویدایە کردوومانە بە هۆی ڕازاندنەوەی زەوی تا تاقییان بکەینەوە کامیان کار و کردەوەی جوان ئەنجام دەدەن.**

هەندێک لە زانایان لەو باوەڕەدان ڕازێنەر خودایە واتە خودا خۆشەویستیی ژن و منداڵ و سامانی دادۆشیوەتە ناو سرشتی ئینسان تاکوو بتوانێ دە پاڵ ئەو خۆشەویستییە خۆشەویستی کە نیزیکە لە خودا وەدۆزێ و وەقۆزێ، و نەکا وەک کافران بیر وەکا کە لە دنیا خۆشەویستتر نییە و

خۆشەویستی ئاخیرەت هەر هاوار و هەرای فریوە؛ بەڵام خاوەنی تەفسیری «المیـزان» بـاوەڕی وایە ڕازێنەرەوەی «حبّ شهوات» شەیتانە، چونکە شەیتان دەیهەوێ بە هۆی دیقەدیقە و دنەدانی ئینسان بە وەسیلەی ئارەزوو و هەوەسی ژنان و سامانی دنیا لە خشـتەی بەرێ و لایـدا لە ڕێـی ڕاست. بۆ ئەو مەبەستە دەچینە خزمەتی ئایەتی ۴۸ لە سوورەی ئەنفال:

**وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ ﴿۴۸﴾** انفال
**یادی ئەو کاتەش بکەوە کە شەیتان کردەوەکانیانی لە بەر چاوان ڕازاندەوە.**

دێرەدا وا بیر نەکرێتەوە کە ئایینی ئیسلام دژی ئەو شـتانەیە کە سرشـتی لە سـەر ڕازاوەتەوە وەک خۆشەویستی دنیا بێ، بەڵکە دژی زێدەڕۆیی و سەرەڕۆییە، چونکە دین و ئایین بۆ دنیایەن بەرهەمیان بۆ ئاخرەتە، ئایین دژی دنیا نییە و چونکە خودا دنیای بێهوودە وەدینەهێنـاوە. ئـایین مخالفی ئەوەیە نەزانی خۆ ئیدارە کەی و خۆت بفرۆشی بە دنیـا و بەشـی ئـاخرەت بە خـۆتەوە نەهێڵی. بۆ باوەڕی دەچینە خزمەت ئایەتی ۳۲ لە سوورەی ئەعراف:

**قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللّٰهِ الَّتِيَ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالْطَّيِّبَاتِ مِنَ الـرِّزْقِ قُـلْ هِي لِلَّذِيـنَ آمَنُـواْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِك نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿۳۲﴾** اعراف
**بڵێ ئەو زێڕ و زەمبەر و خشڵ و خاڵانە و جوانیانە و ئەو خواردن و ڕزق و ڕۆزییـە خاوێنـانەی کە خودا بۆ بەندەکانی بەدیهێناوە، کێ قەدەغە و یاسـاغ و حەرامـی کـردووە؟ بڵـێ ئەوانە لەم ژیـانی دنیایەدا بۆ ئەو کەسانەن ئیمانیان هێناوە و ئەوانەی بێئیمانیشن، بەڵام لە ڕۆژی ئاخرەتدا تایبەتە بـۆ بڕواداران، بەو شێوەیە نیشانەکان شی دەکەینەوە بۆ ئەوانەی کە دەزانن.**

دڵ لە سەر نەزەری ئەهلی سوننەت و جەمـاعەت ئیشـکال هەسـت پـێ دەکـا کە دەڵـێن: جوانیدەر و ڕازێنەرەوەی دنیا خودایە، خۆشەویستی و «حبّ شهوات» هەر لەوڕایە. کەچی لەو لایەشەوە خودا بە وەسیلەی ئایەتی ۳۸ لە سوورەی عەنکەبـووت ئەو نەزەرە هەڵدەوەشـێنێتەوە. بڕوانە لە سیمای ئایەتەکە:

**وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَكَانُوا مُسْتَبْصِرِينَ ﴿۳۸﴾** عنکبوت
**شەیتان کردەوەکانی بۆ ڕازاندنەوە لە ڕاستەڕێ بەرگری کردن، لە حاڵێکیشدا بەرچاو ڕوون بوون.**

دەبێ چۆن وڵامی ئەو ئیشکالە وەدرێ و دڵیش پێـی دامەزرێ و دامرکـێ؟ لەو بـارەوە بـۆ ئیقناعی دڵ و پەسەندی ئەقڵیش دەبێ ئیشارە بە دوو بابەت بکرێ:

١. دروست کـردن و ڕازانـدنەوەی شـت دە ئەساسـدا شـتێکە، ٢. خۆشەویسـتی و وەدوا کەوتن و پەرستنی ئەو شتە جوان و ڕازاوەش شتێکی دیکەیە، دەبێ لە سەر ئەو ئەساسـە بڵێـین بەڵێ، خودا دنیای ڕازاندۆتەوە و جوانی کردووە، چونکە ئەو وەدیهێنەری هەموو شتێکە، ئەمـما وەدوا کەوتن و پەرستن و خۆشەویستی ئەو شتە لە ڕێگای ناڕەوا و ناپەسەندەوە کاری شەیتانە.

زانایان لە بابەت «حبّ شهوات» واتە هەوەسپەرەستی و دنیـا خۆشەویسـتییەوە شـتێکیان کوتووە بۆوەی دەبێ بخرێتە تیشکی ئەقڵ و هەڵسەنگێندرێ. شتەکەش ئەوەیە: ئینسان بە گشتی و موسوڵمانان بەتایبەتی لە سەر ئەساسی سرشتی مەیلی بـۆ لای شـتانی قەدەغەکـراو دەچـێ، ئەمما لە ناو توێتوێی دڵ و ویژدانی پێ ناڕەزایە جا ئەو شتەی کە ئینسان خۆشـی دەوێ، و بەو خۆشەویستییەش ڕازییە ویژدانە، چونکە سەر وەخێر و بەرەو خێرە، ئەوە پێی دەکوترێ عیشق و خێرخـوازی تەواو. هەر وەک خـودای تەعـالا لە مەڕ حەزرەتـی سـولەیمانﷺ فەرمـوودەیەکی ڕاگەیاندووە لە ئایەتی ٣٢ سوویە «ص» ئاماژەی وەلا فەرمووە:

**فَقَالَ إِنِّي أَحْبَبْتُ حُبَّ الْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّي حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِالْحِجَابِ ﴿٣٢﴾ ص**

**ئەوجار سولەیمان کوتی بەڕاستی من ئەو ئەسپانەم زۆر خۆش دەوێ هەر لە بەر یادی خـودایە، سەر سەیری دەکردن هەتا لە چاو ون بوون. (یانی دەمهەوێ دۆستی خێر بم)**

ئینجا ئەگەر ئەو خۆشەویستییە لە سەر ئەساسی شەڕ بێ، ئەوە دیـارە لە بـن پەڕەی دڵـدا و توێتوێی ویژدان و هەستی نـاڕەزایەتی لـێ هەسـت دەکـرێ و دیـارە لە پەشـیمان بوونەوەیـدا دەکاتی خۆیدا، وەک هەست بەو بابەتە دەکرێ دە ئایەتی ١٤ی ئالی عیمرانـدا: ﴿زُيِّـنَ لِلنَّـاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ ...﴾

ئەوکـات ئەو ئینسـانی خـاوەنی «حـبّ شـهوات» دەبێـتە ئینسـانێکی دنیاپەرسـت و ئیشتیالەوەڕێن و مێرگ و مێرگ‌خوازی ئیشتیا لەوەڕێ بە تەواوی خۆش دەوێ و باوەڕیشی وایە کـاری چـاکە ئەو هەوەسـبازی و ئارەزووپەرسـتییەی، جـا مەگەر خـودا لەو زەل و زۆنـگەی هەڵیکێشێتەوە دەنا تازە تا دەکرێ دەویدا دەمێنێتەوە.

بە کوردی و بە کورتی، خۆشەویستی ژن و منداڵ و زێڕ و زەمبەری دنیـا و ئـاژەڵ و زەوی، ئاینی ئاسمانی بە گونـاح و تـاوانی دانەنـاوە بە مەرجێـک ئەو خۆشەویسـتییە نەگـاتە قۆنـاغی پەرستن و قیامەت پێ فرۆشتنی دین و کەرامەت لە سەر دانـان. بـۆ تەئیـدی ئەو مەبەسـتە واتە خۆشەویستی زینەتی بە توان نەژمێردراوە دەچینە خزمەت ئایەتی ٣٢ لە سووڕەی ئەعراف، بۆی

ئاوڕ دەوە دوایە پێویست ناکا وەردی دەینەوە.

دەبێ ئەو ڕاستییە بکوترێ و نەشاردرێتەوە کە سەروەت و سامانی دنیا و ژن و ئەولاد بۆ تاقیکردنەوەی ئینسانن تاکوو وەدەرکەوێ کە کێیە دەتوانێ هەموو شتانە وەگەڕ خا و دەکار کا بۆ وەدەستهێنانی زینەتی ڕۆژی ئاخرەت، ئینجا بۆ وەی باش تێبگەین کە زینەتی دنیا بۆ تاقیکردنەوەی ئینسانە هەدەف نییە بۆ ئینسان، دەچینە خزمەت ئایەتی ٧ لە سوورەی کەهف:

**إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ کهف**
**بەڕاستی ئەوەی کە لە سەر زەویدایە، کردوومانە بە هۆی ڕازاندنەوەی زەوی تا تاقییان بکەینەوە کامیان کار و کردەوەی جوان ئەنجام دەدەن.**

پاش تێگەیشتن لە لەزەتی دنیا واتە «حبّ الشهوات» و تەئکیدیش لە سەر ئەوەی «حسن المآب» هەیە و لە کن خودایە، دووبارە خودای خاوەن بەزە و ڕەحم دەگەڵ ئینسانی، دەیهەوێ بۆ ئینسانی سەرەڕۆ و لاسار دووپاتی کاتەوە کە نیعمەت و سامانی دنیا وەک ژن و منداڵ و زێڕ و زەمبەر زۆر لەوەی نیزیکن وەک ئەسپی تۆڕ هەڵتدێرن، بەڵام ئەنعامی ئاخرەت هیچ زەرەرێکی لێ هەست ناکرێ و تەنانەت هیچ بۆنێکی زەرەریشی لێ ناکرێ. جا بۆیە دەبێ ئەوەی خوازیاری ڕۆژی ئاخرەتە، بە ئەنعام و زینەتەکانی دنیا تێکۆشن زینەتی ئاخرەت بکڕن و وەدەسی بێنن. بۆ ڕاستی ئەو مەبەست و مەتڵەبە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٥ لە ئالی عیمران:

**قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ ﴿١٥﴾ ئالی عیمران**
**بڵێ: ئایا هەواڵێکی چاتر لە هەموو ئەوانەو بدەمێ؟ لە لای پەروەردگارتانەوە بۆ ئەوانەی پارێزکارن: باغاتێکیان بۆ دانراوە چەندەها ڕووباریان بە ناودا تێدەپەڕێت هەتا هەتایە تێدا دەبن، هاوجووت و هاوسەرانی پاکوخاوێن و ڕەزامەندیش لە لای خوداوە، خوداش سەبارەت بە بەندەکانی دانایە و وردبینە.**

**ئاوڕ دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە سەر ئایەتی ١٥:**

خودای تەعالا نیعمەتەکانی دنیایەی بۆ ئینسان بەیان کرد، و هەر وا خۆشەویستی ئەو نیعمەتانەی دە ناو دڵیدا ڕاخست، پاشان پێشی ڕاگەیاند ئەوانە زینەتی ژینی دنیان بۆ ڕۆژی حیساب نایەنە حیساب بە چاکە مەگەر بە چاکەیان بەریە سەرێ، زینەت و خۆشی بێ بڕانەوە لە

لای خودایە، بە پێی ئیشاراتی ئایەتی ١٧ لە سوورەی ئەعلا: ﴿وَٱلْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ﴾ (دەگەڵ ئەوەی ڕۆژی دوایی باشترە و بەردەوامترە).

ئایەتی ١٥ ئەگەر بە وردی سەیر کرێ و هەڵسەنگێندرێ دوو پاداشی زۆر گەورەی لێ هەست دەکرێ بە ڕوونی:

١. پاداشی جسمانی کە بریتییە لە بری بەهەشت و ژنانی جوان و پاک و دڵگر

٢. پاداشی ڕوحانی کە عیبادەتە کە ڕەزایەتی خودایە و لەوەش گەورەتر نیعمەت و پاداش نییە کە خودات لێ ڕازی بێ. بۆ ئیسباتی ئەو ئیدیعایەش دەسەو داوێنی ئایەتی ٧٣ لە سووڕەی تەوبە دەبین:

وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٧٣﴾ توبە

**خودا بەڵێنی باغاتێکی وای داوە، بە پیاو و ژنانی موسوڵمان، کە چەندین چۆماوی لە ژێر دارەکانیدا دەڕوا و ڕەوانە، هەتا هەتاش لە ناو ئەو باغانەدا دەمێننەوە، هەروا بەڵێنی خانووی پاکوخاوێنی پێ داون، لە ناو ئەو باغ و باغانە بێبڕانەوەدا، ڕەزامەندی و خۆشنوودی خوداش لە سەرووی هەموو شتە و گرینگترە، ئا ئەوەیە بەختەوەری گەورە و فراوان.**

ئەو هەموو وەعدە و بەڵێنیانەی خودای ڕاست و دروست لە هەموو لاوە بە ئینسانی داوە دەگەڵ ئەو هەموو سەرپێچی و لاساریەی ئینسان، ئیشارەیە وەلای ئەوەی کە بێ گومان تێڕوانینی ئینسان بە زۆری ئانی و ساتی و کاتییە واتە ئینسانی ناحاڵی بەراوەردی ئەوەی ناکا لەزەت و خۆشی دنیا دەبڕێتەوە و دوایی پێ دێ، ئەمما لەزەت و خۆشی ئاخرەت بێبڕانەوەیە، ناشڕوانێتە قورئان کە هەمیشە یاریدەدەر و وشیارکەرەوەی ئینسانە بۆ وەی ئەقڵ وەگەڕ خا و ڕووی نوور و تیشکی ئەقڵی دە فەنای دنیا و بەقای ئاخرەت کا، کە بزانێ بەقا چاکترە یا فەنا؟

دەبێ بەرجەوەندی ئەوە بین ئایەتی ١٥ بەیانکەر و شیکەرەوەی «حسن المآب»ە، واتە تێماندەگەیێنێ کە لەزەت و خۆشی بێبڕانەوە لە لای خودایە.

دڵ دەیهەوێ بزانێ بۆچی خودای تەعالا پاش بەیانی بەهەشت و باخات و ئاوی، باسی «ازواج مطهرة»ی هێنایە گۆڕێ؟ بێگومان هەست بە ڕازێک دەکرێ، دەبێ ئەقڵ و بیر و شعوور ڕاوی لێ دابەخشن و وەیدۆزین.

دڵ دەڵێ بە پێی هەڵسەنگاندن و ڕاوێژی ئایەتی ٢٥ی بەقەرە، دەبێ ڕازەکە ئەوە بێ:

نیعمەت و لەزەت و خۆشی هەر ئەندازە زۆر و گەورە بێ، بەبێ نیعمەتی ژن ناتەواوە چونکە تێکەڵاوی ڕازان دەگەڵ ژن هەچی ڕاز و لەزەتە پاراو دەکا و تەواو دەکا و لەشی دادەدۆشێ و «مودّت» و «رحمت» وەجۆش دێ بە ژن. سەیری ئایەتی ٢٥ی بەقەرە با بکەین:

**وَبَشِّرِ الَّذِين آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقاً قَالُواْ هَـذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ وَأُتُواْ بِهِ مُتَشَابِهاً وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٥﴾** بقره

**مزگێنی بدەن بەو کەسانەی ئیمان و بڕوایان هێناوە و کار و کردەوەی چاکیشیان بەجێ هێناوە! باخاتێکیان بۆ ساز کراوە کە وا چەندین چۆم و ڕووباریان لە ژێر دار و درەختەکانیانەوە دەڕوا و ڕەوانە، دە هەموو کات و ساتاندا میوە لەو باخانەدا دەبێتە ڕزق و ڕۆزییان، دەڵێن ئەو میوەجات و ڕزق و ڕۆزییە، هەر هەمان ڕزق و ڕۆزییە کە لە پێشدا لە دنیادا دەماندرایە. هەر لە ئەو چەشنەیان بۆ هێندراوەتەوە، لە ناو ئەو باخ و باخاتەدا، ژنانی پاکیشیان هەیە، و هەتا هەتاش هەر دەوێدا دەمێننەوە.**

(مطهرة) واتە پاک لە حەیز و نیفاس کە تێی ناکەون، جگە لەوەش جوانە بەو ڕادەیە کە دڵ و ئارەزوو بە دایم ئیشتیایان دەکا و قەتیان لێ وەڕەز نابێ، کەلام پڕ لە ناز و ئارەزوو لە لایەن خوداشەوە تێر و تەواو و ڕازی.

دڵ دەیهەوێ ئەو پرسیارە بکا: سەراپای خۆشی و لەزەتی ژینی دنیا بۆ بەقای خۆت و تۆرەمە و بەرەی نەسلە، خۆ دیارە بە پێی خەبەرێکی کە ئایینی ئاسمانی داوێتە ئینسان، ڕۆژی ئاخرەت کە خانووی بەقایە هیچ نیازێکی بە نەسل و بەرە نییە، ئەگەر ورد بڕۆینە پێشێ دەگەین بەوە کە ئینسان بوونەوەرێکی دوو جۆرە دە ناو خۆیدا، واتە مادی و مەعنەوی؛ ئەی لەش و ڕۆح ئەو دووانەش دەگەڵ یەک بێ ئیرتیباتن. ئە ئەوە ئەگەر بە تەرازووی ئەقڵ هەڵسەنگێندرێ و وەزن کرێ، ئیشکال و گرێ هەست پێ دەکرێ، ئەویش ئەوەیە: دەبێ لە قیامەتدا لەزەتی لەشی نەبێ، بەڵکە هەر دەبێ لەزەتی ڕوحی هەبێ، کە وایە حۆری و ژن و میوە و خواردن و خواردنەوە، کە لەزەتی مادەن، بۆچییەتی وا خودا تەعریفیان دەکا؟

بۆ وڵامی ئەو ئیشکالە دەبێ بڵێین: ئینسان دە ئادابی قورئاندا یەک بوونەوەرە، ئەوەی بۆ بەشی لەش لازم و پێویستە، بۆ بەشی ڕۆحیش لازم و پێویستە و نیازی بەشی لەشیش پێشەنگی بەشی نیازی ڕوحیەتی. جا لە سەر ئەو ئەساسە، واتە ئینسان دەخوا و دەخواتەوە لەزەتی ژن و

منداڵ دەچێژێ و دەخوازێ، پێیان شاد و خۆشحاڵ دەبێ، جا کاتێ ئەوەی حاڵەتی دنیای فانی بێ، ئەگەر هات و خودا گوێزتیەوە لە دنیای نەمان بۆ دنیای هەرمان، جا دەیخاتە ناو ناز و نیعمەتەوە یان دەیخاتە ناو دەرد و میحنەتەوە. ئەو ئینسانەی لێ ناستێندرێتەوە. چ بووە لە دنیا هەر هەمانە لە ئاخرەتدا دەخوا و دەخواتەوە، لەزەت دەکا و دەبا بەڵام بەو تەفاوەتە ئی دنیایەی دەڕوا و دەبڕێتەوە، ئی ئاخرەتی ناڕوا و نابڕێتەوە.

بە کورتی و بە کوردی، ئینسانی ئاخرەت هەمان ئینسانی دنیایە، لە دنیادا بۆ ژین و خۆشی نیازی بە چی بووبێ، لە ئاخیرەتیشدا بۆ ژین و خۆشی نیازی بە ژن و لەزەت و خۆشی و خواردن هەیە، تەنیا فەرقیان ئەوەیە ئی دنیا فەنای بە سەردا دێ، ئی ئاخرەت فەنای بە سەردا نایە. دیارە تا ئینسان ئەو فەرقە دەرک دەکا و دەیکاتە هەوێنی دڵ و باوەڕی و هیوا و هومێدی، ڕۆژی ڕوونی زۆری پێ دەوێ.

کاتی ئەوەی هاتووە بچینە ئەو دەروەی باسی ئەوانەی تێدا کە خاوەنی سیفەتی پارێزگارین وەک ئایەتی ١٦ بێ لە ئالی عیمران:

> **الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ﴿١٦﴾** ئالی عیمران
> **ئەو کەسانەی کە دەڵێن ئەی پەروەردگارمان! بەبێ گومان ئێمە ئیمانمان هێنا، کەواتە تۆش تاوانەکانمان ببەخشە و لە سزای ئاگر بمانپارێزە.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ١٦:**

ئەو ئایەتە و ئایەتی ١٧ش ئاماژە وەلای شەش سیفەتی بەرز و بەرچاوی پارێزگاران دەکا، خۆپارێز ئەگەر دەڵێ (ربّنا) شاهیدییە و هاوارە لە لای پەروەرەندەی بۆ ئیسباتی عەبدایەتی، ئەو هاوار و شاهیدیەشی بۆ وەیە تاکوو خودا ڕەحمی بە حاڵی بکا و هەچی نیازیەتی بەجێی بێنێ.

پرسیارێک دێ دەرک بە هەست و ئەقڵ دەگرێ دێرەدا: پارێزگار کە دەڵێ ﴿رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا﴾ ئایا مەگەر پاش ئەوەی خودا ئینسانی خستە ژێر چارشێوی غوفران (واتە عەفو و بەخشین)، عەزابی ئاوری دۆزەخ دەمێنێ بۆ ئینسانی وا داوای پارازتن و دوور خستنەوە لە ئاگری دۆزەخ دەکا و دەڵێ ﴿وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾؟ بەو پێیە دەبێ پاش بەخشینی خوداش ترسی ئاوری دۆزەخ ببێ؛ ئەگەر ئا وا بێ، ئەو ئیشکالە دێتە ڕوو: بەخشینی خودا جێگەی باوەڕی تەواو نەبێ، خۆ ئەوەش لە شەئنی خودا بەدوورە.

وڵام:

ئێمەی ئینسانی خاوەن ئیمان دەبێ باوەڕیمان وابێ بەریبوونمان لە ئاوری دۆزەخ وابەستە بە فەزل و ڕەحمێکی تایبەتی خودایە، یانی ئیمانی بە خودا و ئیتاعەت لە خودا، خوداری قەرزدار ناکا تاکوو داوای قەرزی لێ بکرێ و خوداش بیداتەوە و لە باتان بیخاتە ناو بەهەشت و لە ئاوری دۆزەخی بپارێزێ. بەو دەلیلە ئیمان و ئیتاعە لە خودا نیعمەتانێکن خودای تەعالا لە سەر ئەساسی حیکمەتی خۆی دەیداتە عەبدی خۆی. ئینسان ڕاستەوخۆ خاوەنی هیچ حەق و بەهایەک نییە لە سەر خودا و خاوەنی هیچ شتێک نییە، مەگەر ئەو وەعد و قەولانەی خودا ڕاستەوخۆ بە پێی بەزە و حیکمەت بە عەبدی خۆی داوە، وەک ئەوەی کە خودا بە عەبدی خۆی فەرمووە ئەگەر ئەتۆ ئیمانێ بێنی و ئیتاعەم بکەی، ئەمنیش پاداشی چاکت دەدەمێ لە ڕۆژی قیامەتا؛ خۆ دیارە پاداشی چاکی ڕۆژی قیامەتیشن دوور بوون لە عەزابی دۆزەخە.

دیارە خودای تەعالا دەفەرموێ ئەوانەی دەڵێن پەروەرەندەی مە! ئێمە ئەوە ئیمانمان پێ هێنای، و ئەوجار داوای بەخشینی گوناهەمان هەیە لە تۆ کە بمانبەخشی، ئەو شێوە ڕەفتارە نیشانەیە و هاوارە وەلای ئەوەی پاش ئیمان و ئیتاعە لە خودا، ڕەوایە لە خودا پاڕانەوە بۆ بەخشینی تاوان، چونکە ئەودەم ئینسان شایانی ڕەحم و بەزەیە لە لایەن خوداوە.

ئەقڵ و ئیمان لە سەر ئەو باوەڕەن کە خودا چاکەکاران بە سزای خراپەکاران گرفتار ناکا، ئەمما ئەگەر خراپەکاران ببەخشێ و تووشی سزایان نەکا، لە ڕەحم و عەداڵەتی بەدوور نییە و بە ناڕەوا نایەتە ژمار. بەڵام ئەگەر چاکەکاران عەزاب بدا ئەقڵ دەڵێ لە بەرابەر شەئنی خودای خاوەن عەدڵ بە ناڕەوا دێتە بەرچاو. ئەگەر بە تەرازووی ئەقڵ ئایەتی ١١٨ی مائیدە وەزن کرێ باوەڕ دەکرێ بەوەی: خودا تاوان ببوورێ بەدوور لە خودایەتی نازاندرێ، و ئەگەر عەزابیشی دا، هەر وا ناڕەوا نازاندرێ، چونکە مافی تاوانبارە عەزاب. با سەیری ئایەتەکە بکەین.

> **إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾** مائدة
> **خودایە! ئەگەر ئەتۆ سزا و ئازاریان پێ بدەی (ئەو تاوانبارانە؛ ناڕەوا نییە) چونکە لە ڕاستیدا بەندەی خۆتن (و تاوانیشیان کردووە) ئەگەر لێشیان خۆش بی و بیانبووری، ئەوە هیچ گومانی تێدا نییە، چونکە هەر ئەتۆی زاڵ و کاربەجێ.**

دێرەدا واتە دەو ئایەتە ١٦یەدا ئەوە بە ئینسان ڕاگەیێندرا کە خۆ هەڵاوەسین بە لکی داری تەقوا دەست دەگەیێنێتە میوەجات و نیعمەتی بەهەشتێ، هەر وەک بازدان بە سەر مەتاعی دنیا

خۆ گەیاندنە بە مەتاعی بێبڕانەوەی قیامەت.

ئەوجار دڵ دەیهەوێ بە تەواوی ئاشنا و شارەزا بێ بە سەر سیفاتی «متقیان» واتە پارێزگاراندا. جا بۆ بەراوردی نیازی دڵ دەچینە خزمەت ئایەتی ١٧ی ئالی عیمران:

الصَّابِرِينَ وَالصَّادِقِينَ وَالْقَانِتِينَ وَالْمُنفِقِينَ وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالأَسْحَارِ ﴿١٧﴾ ئالی عیمران

**ئەو خۆ وەخۆگرانە و ڕاستبێژ و فەرمانبەرانە، ئەو ماڵ و سامان بەخشەر و خوازیاری لێخۆشبووانەی بەرە بەیانانە، ئەوانەن دەڵێن بە ڕاستی ئەی پەروەرندەن! ئێمە ئیمانمان هێنا پێت.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە بۆ سەر ئایەتی ١٧:**

خودای تەعالا بۆ ئەو کەسانەی کە بەڕاستی دەڵێن خودایە ئێمە ئەوە ئیمانمان پێ هێنای و بە عەمەل سابتیشی دەکەین، پێنج سیفەتی بەرز و بەوەجیان لێ هەڵدەدا و ناودێر دەکا. واتە لە سایەی ئەو ئیمان و باوەڕیەی دەبنە خاوەنی ئەو سیفەتە باشانە:

١. سیفەتی هەوەڵیان ئەوەیە: لە حاند بەڵا و دەرد و ڕەنجێکی دێتە سەریان، خۆڕاگرن و خۆ وەخۆ دەگرن لە ژێر ئێش و ئۆفی تاقیکردنەوەی خودادا ڕادەوەستن و خۆڕاگرن.

٢. سیفەتی دووهەمیان «ڕاست»ن لە قەول و قەرار و بەڵێناندا. واتە لە درۆ بەدوورن.

٣. سیفەتی سێهەمیان «سابت» و بەردەوام و خۆپارێز و خۆڕاگرن.

٤. سیفەتی چوارەمیان بە بەخشش دەگەڵ خاوەن نیازان و نەفسی خۆی و خزمانی و هەروا بە پەرۆش و بەبەزە دەگەڵ ئاوماڵ و دەر و جیران.

٥. سیفەتی پێنجەمیان دە بەرەبەیانان دەرگای خودا دەگرن و داوا و پاڕانەوەی بەخشین و بوردنی گوناە و تاوانیان دەکەن. چونکە دە بەرەبەیاناندا دوعا زووتر وەردەگیرێ لە لای خودا، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو شتانە: شەوی تاریک دەڕوا و ڕۆژی ڕووناک دێ، هەموو دڵانی خاوەن هەست بە سەفا و ڕووناکایی دەکەن و هەستی خوداناسی دە بەرەبەیاناندا بە زۆری دەگەڕێ بۆ میوانی دڵانی بەهەست و زیندوو.

بۆ ڕێزداری و ئەرزشی بەرەبەیانان لە لای خودا ئەوەندە بەسە کە خودا بە کاتی سەحەر سوێند دەخوا و دەڵێ: ﴿وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾ ﴿١٨﴾ تکویر.

دەبێ ئێمەی ئینسان ئەوە بسەلمێنین و شاهیدی لە سەر بدەین کە خودای خاوەن حیکمەت

و حەکیم بە هۆی بوونەوەر و نیشانەکانی قورئان خۆی و هێز و کار جوانی و کارزانی خۆی نیشان داوە. ئەوانەی سەرپاک گێڕاون بە شاهید لە سەر تاقی و بێهاوتایی خۆی، ئەوانەی ئینکاری بوونی خودا دەکەن هیچ لە هیچ نازانن و جەهلن و دوژمن بە ئەقڵ و هەست و شعوورن و دڵ نەخۆش و ئەقڵ پێ نەماون.

ئەقڵ لە هەڵسەنگاندن و بەراوردی ئایەتانی ڕابردوو واتە پێش ئایەتی ١٧ و ١٨ بەو یەقینە گەیی کە خودا بێهاوتایە دە پەرستندا و دە عیبادەتدا، جگە لە سیفەتەکانی خەلاقیەت و ڕبووبیەتدا، و هیچ بوونەوەرێک لە خودا بێنیاز نییە و ناشتوانێ ببێ و ئەوەی بە خەیاڵی پووچی دەتوانێ ئینسانی لە خودا بێنیاز کا و عالەمیش خۆی بۆ لا دەکوتێ، ژین و لەزەت و خۆشی دنیایە، ئەویش لە ژێر یاسای وەدەسهێنانی سەرمایەی ئاخرەتێ. ئەئەوە کە بەشێکە لە خەیاڵی پووچی زۆربەی ئینسانان، چونکە ڕوون و ئاشکرایە کە ناکرێ ژینی دنیا بە ماڵ و سامان و لەزەتەوە بکرێنە وەسیلەی سەرمایەی ئاخرەت، بێهەوێنی تەقوا، ئەوەی ئینسان بە گشتی بۆی هەڵوەدایە ژینی خۆشی و کەیف و نەهەنگە بۆ خاوەن باوەڕ و بێباوەڕ لە دنیادا، جا ئەو خۆشیەشی ئەگەر بە پێی نیزامی یاساکانی ئاسمانی نەبێ، نایدرێتێ لە دنیای ئاخرەتدا وەک کافر و بێباوەڕ لێی بەری و بێبەشن. بۆ تێگەیشتن و وەدەسهێنانی بەرهەمی ئەو باس و بابەتە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٨ی ئالی عیمران:

**شَهِدَ اللّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُواْ الْعِلْمِ قَآئِمَاً بِالْقِسْطِ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١٨﴾** ئالی عیمران

**ئەو خودایە کە دادگەرە، فریشتەکان، زاناکانیش شایەتی دەدەن کە هیچ کەس بێجگە لە خودا شایستەی خودایی نییە، و هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نییە بێجگە لە ئەو، هەر ئەو زاڵ و کاربەجێیە.**

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و هەڵسەنگاندنێکی هەستیارانەی ئایەتی ١٨:

ئەقڵ و هەست و شعوور دێرەدا هەست بە شتێکی دەکەن کە دەگەڵ عورف و عادەتی شەرع و عیلم و ئەدەب دژایەتی هەیە. شتەکەش ئەوەیە: داوای یەکەتی و بێهاوتایی خودا ـ خودا خۆیەتی، جا چۆن دەکرێ خودای موددەعی شاهیدیش بێ لە سەر یەکتایی و یەکەتی خۆی؟ ئەو دووە لە یاسای عورف و عادەتی شەرعە! دەبێ لەو بارەوە چۆن دڵ و ئەقڵ قانیع کەین و وڵامێکی پەسەند و ڕەوایان دەینەوە؟!

ئەوەی دەتوانێ وڵامێکی ڕەوا و باوەڕ پێکراو بێ، دوو شتن:

١. دیارە لە خودا چاتر و ڕاستتر لە شـەهادەتدا نیـیە و نـابێ، چـونکە خـودای تەعـالا ئەو کائینات و بوونەوەرە خاوەن نەزم و نیزام و جۆراوجۆرەی کە لە نەبوونڕا هێناوەتە دنیای بـوون و دە بەر یەکی ناوە ـ بێ‌هەڵە و پەڵە ـ ئەوە سـەراپا هـاوارە و شـاهیدییە لە سـەر وەحـدانییەت و کارجوانی و کارسازی خودا، دەلیل و بورهان و شـاهید لە سـەر بێ‌هاوتـایی و یەکەتەی خـودا لەوە گەورەتر و قانیع‌کونەندەتر نییە و نابێ ڕێگای ئینکاری بـۆ کەس نەهێشـتۆتەوە. مەگەر بـۆ گەوج و جەهل و نەزان. هەر کەس و هەر هەست و هەر شعوورێک بەرجەوەند و ڕامـانێکی بکـاتە وردیلەترین دانەوێڵە و گیا و تەرز و دیمەنی بوونەوەر جـگە لە شـاهیدی دان لە ڕبـووبییەت و تەنیایی و خەلاقییەتی خودا کڕنۆش دەباتە بەر عەزەمەتی خودا. جا لە سەر ئەو ئەساس و یاسـا بەوەجە شاهید لە سـەر وەحـدانیەتی خـودا هەر لەوڕایە و لەو جـوانە، بـۆ ئیسـباتی ئەو داوایە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٩ لە سوورەی ئەنعام:

قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكبَرُ شَهَادةً قُلِ اللّه شَهِيدٌ بِيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللّه آلِهَةً أُخْرَى قُل لاَّ أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَـهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿١٩﴾ انعام

**بڵێ: ئەرێ شاهیدی کێ لە هەموو شاهیدییەک گەورەترە؟ بڵێ: هەر خـودایە شـاهیدە لە نێـوان من و ئێوەدا. ئەو قورئانەشم بە نیگـا بـۆ نێـردراوە، تـاکوو بە هـۆی ئەو قورئـانەوە ئێـوە و ئەو کەسانەی کە ئەو قورئانەیان پێ‌دەگا، داچڵەکێنم و ڕاچڵەکێـنم. ئایـا ئێـوە بە جەختـی شـاهیدی دەدەن، کە دەگەڵ خودادا خودایانی دی هەبێ؟! بڵێ: لە ڕاستیدا خودا خودایەکی تاک و تەنیایە و من بێ‌گومان دوور و بەریم لەو شتانەی ئێوە بە هاواڵ دایدەنێن.**

٢. شتی دووهەم کە دەتوانێ دڵ دامرکێنێ و وڵام بێ بۆ دڵ، ئەوەیە: خودا بوونێکی ئەزەلی و ئەبەدییە، و بە غەیرەز خودا هەچی بوونە دە ئەزەلدا نەبوونە و نییە، خـۆ ئەوەش ڕاسـتە شـتی نەبوو وەک غائیب و نهێنییە، و شتی بوون وەک حازرە، کە وایە ڕەوایە بکوترێ: هەچی غەیـری خودایە، غایبە و نهێنییە، بە شاهیدی دانی خودا لە سەر شـت ئەو شـتە دەبێـتە شـاهید لە سـەر بوونی خودا، لە سەر ئەو ئەساسە خودا شاهیدە لە سەر کەون و کائینات هەر وەک ئەو کەون و کائیناتە شاهیدن لە سەر بوونی خودای بەتەنێ. جا بۆیە بۆ ئیسباتی ئەو حەقـیقەت و واقیعـیەتە خودا فەرمووی: ﴿شَهِدَ اللّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ﴾ واتە خودا شاهیدی داوە کە مەعبـوودی بەحەق

بێ لەو نییە.

دیارە خودای تەعالا خودایەتی و تاقانەیی و ڕبووبیەتی خۆی بە هـۆی نیشـانە و بەڵـگەی ڕوون و ئاشکرای عالەمی زاهیر و نهێنی بە تەواوی گیـانلەبەران ڕاگەیانـد و فرشـتەکانیش ئەو ڕاستییەیان بە پێغەمبەران ڕاگەیاندووە و پێغەمبەرانیش لە سەر ئەساسی زانست و هەستی تەواو بە سفارشاتی فرشتەکان شەهادەتیان داوە و بە عالەمیان ڕاگەیاندووە.

و هەر وا خاوەنانی زانست و شعوور و دەرکی تەواو ئەو شاهیدیان بە پێی دەلیل و بەڵـگە و بورهانی داوە، دەبێ دەستەی عالمان ئەو تایبەتمەندییە گەورەیە کە پلە بەرزییە بۆیان، ئەرزشی بـزانن و لە دەسـتی نەدەن. یەکێـک لە زانایـانی بەرز خـۆی بەوە هەڵکێشـاوە کە ئەوەی خـودا شـاهیدی لە سـەر داوە ڕێـی بە مـیش داوە شـاهیدی لە سـەر بـدەم و شاهیدییەکەشـی لـێ وەرگرتووم. ئە ئەوە ئەمانەتێکە لە لای من وەک لە دنیادا خودا بە شاهیدی وەرگرتـووم لە سـەر بێشەریکی خۆی لە ڕۆژی ئاخرەتیشدا پاداشی ئەو شاهیدیەم پێ دەداتەوە بەسمە.

دەبێ دێـرەدا ئەوە بـزانین (أُوْلى الْعِلْـمِ) واتە (أُوْلُـواْ الْعِلْـمِ)ی نـاو ئـایەتەکە بـۆ کەسـانێک دەکوترێ کە بە دەلیل و بەڵگە و یەقین و تواو وەحدانیەتی خودایان بـۆ دەرکەوتبـێ، هەر وەدوا کەوتن نەبێ، چونکە شەهادەتی بەڕاستی دەبـێ لە سـەر ئەساسـی بەڵـگە بـێ، بـۆیە پێغەمـبەر فەرموویەتی: «إِذا عَلِمْتَ مِثْلَ الشَّمسِ فَاشْـهَد» واتە: کـاتێ وەک ڕۆژ لێـت عەیـان بـوو، جـا شاهیدی لە سەر بدە.

جوملەی (قَآئِمَاً بِالْقِسْطِ): زانایانی عیلمی نەحو زۆریان بێـنە و بەرە پـێ کـردووە، ئەمـما بەشی زۆری قورئانزانەکان (مفسّران) کردوویانەتە سیفەتی مەنفی، واتە (لاَ إِلَـهَ قَآئِمَاً بِالْقِسْـطِ إِلاَّ هُوَ) واتە هیچ خودایە نییە ڕاوەستاو بە عەداڵەت بێجگە لە خودای بێهاوتا نەبێ.

هەشن هەندێک لە زانایان کوتوویانە: ئەو جوملەیە حاڵە لە «مؤمنانی خاوەن عیلم»، یـانی «اولوا العلم» دەبێ لە دانی شاهیدییەکەیدا «قائما بالقسط» بێ. واش هەیە گەلی جمهوور دێنە سەر ئەو باوەڕەی کە حاڵ بێ لە «شهد الله».

دڵ دەیهەوێ بە تەواوی بزانێ ئەو ئایەتە پیرۆزە (ئایەتی ١٨) دەگەڵ ئایەتەکـانی ڕابـردووی ئەو سوورەتە چ موناسەبەتێکیان هەیە؟

ئەوەی دڵ و ئەقڵ و هەست، هەستی پێ دەکەن تـێکەڵاوی ئەو ئـایەتە دەگەڵ ئایەتەکـانی پێش خۆی دەبێ ئەوە بێ:

١. سوورەی ئالی عیمران لە سەرەتاوە بە باسی تەوحیدی خودا داگیرسا، هەروا دەو ئایەتە ١٨دا بە شێوەیەکی تایبەتی دەست پێکراوە، واتە یەکتایی خودا دێرەدا بە شاهیدی لە سەر دانی خودا و فرشتە و زانایان و پسپۆڕانی شارەزا تەئید کراوە.

٢. دە ئایەتی ١٥دا خودای تەعالا باس و پێهەڵاکوتنی «متقیان» (پارێزکاران)ی وا بەیان کرد کە خاوەنی پاداش و جەزای بەهەشتی پڕ لە خۆشی و چۆماو و دار و باغاتە، ئەمما دێرەدا (ئایەتی ١٨) هۆی سەنا و پێهەڵکوتنی خاوەن باوەڕانی بە تەقوا بەیان دەکا و دەفەرموێ: شاهیدی و ئیقرار بە یەکتایی خودا تەسلیم بوون و ئیتاعەت لە دەستووراتی باریتەعالایە، یانی دەبێ ئاوا باوەڕ کەین کە سەنا و پێهەڵکوتنی خاوەن باوەڕان وابەستە بە بەرەکەتی خودا بە یەکناسین و ئیتاعەیە، نەک لە بەر سیما و بەژن و باڵای خودی موئمینان. و هەر وا ئەوەش بسەلمێنین و باوەڕ کەین کە تەقوا و عەمەل دەبێ لە سەر ئەساس و بنچینەی یەکتاپەرەستی بێ.



وەک دەڵێن هۆی دابەزینی ئەو ئایەتە (ئایەتی ١٨) دەبێ ئەوە بێ، لە ئیمام «بغوی»دایە: دوو نەفەر لە عالمانی گەورەی یەهوود لە ئەهلی شام شارەزا لە تەورات و ئینجیل پێش ئەوەی خەبەری زهووری پێغەمبەر بزانن، دێنە شاری مەدینە، کاتێ واریدی شاری مەدینە دەبن ڕوو دە یەک دەکەن و دەڵێن بە یەک: لە سیمای جوانی ئەو شارە ئەو هەستەمان بە دڵدا دێ کە ئەو شارە وەک ئەو شارە دێتە بەر دڵمان کە پێغەمبەری ئاخر زەمانی لێ دێتە سەر زەوی و لێی لە دایک دەبێ. بە پێی ئەو نیشانانەی کە لە تەوراتدا چاومان پێ کەوتووە.

کاتێ ئەو دوو عالمە دەگەڕێن دە ناو شاردا دەگەن بە خزمەت پێغەمبەرﷺ کە سرنج دەدەنە حەزرەت سیمای مبارەکی لێی دەردەکەوێ کە ئەوە هەمان کەسەیە کە تەورات بەیانی سیفەتەکانی دەکا. ئەو دوو عالمە یەهوودییە لێی دەپرسن: ئەتۆ محەممەدی؟ پێغەمبەر دەفەرموێ: بەڵێ. دووبارە لێی دەپرسن: ئەتۆ ئەحمەدی؟ پێغەمبەر دەفەرموێ: بەڵێ؛ ئەمن محەممەد و ئەحمەدم. دووبارە ئەو دوو عالمە یەهودییە پێی دەڵێن: ئێمە پرسیارێکمان لە تۆ هەیە؛ ئەگەر وڵامێکی قانیع و ڕەوامان دەیەوە، ئیمانت پێ دێنین. پێغەمبەر فەرمووی: پرسیارەکەو بڵێن. ئەوانیش کوتیان: ئایا لە کتێبەکانیدا کە خودای تەعالا ناردوونی بۆ سەر زەوی، لە تەواوی ئەو شاهیدیانەی تییاندا بەیان کراون، کامە شاهیدیەیان لە هەمان گەورەتر و بەوەجترە؟ هەر دەستەولەجێ کە ئەو دوو عالمە یەهوودییە پرسیارەکەیان تەواو کرد،

پێش‌قەرەوڵــی وەحــی خــۆی نیشــان دا و حەزرەتــی ڕەســووڵ ئەو دوو ئــایەتی ١٨ و ١٩ی خوێنــدنەوە. لەوەیــڕایە کە پێغەمــبەر فەرمــوویەتی: دە «لــوح المحفــوظ»دا و دە تەواوی کتێــبە ئاسمانییەکاندا هــاتووە کە ئــایەتی تەوحیــد هەمــان ئــایەتی ١٨یە کە خــودا و فرشــتە و خــاوەن زانستەکان شاهیدیان لە سەر داوە. ئەو دوو عالمە زۆر بە ڕاشکاوی پــاش بینینــی ئەو جەریــانە ئێمانێ دێنن. (تفسیر بغوی، ج ١/ ٢٨٥؛ تفسیر قرطبی، ج ٤١/٤-٤٠)

لە سەر گەورایەتی و ڕێز و ڕێزداری ئەو ئــایەتە (١٨)یە ڕیــوایەت زۆر هەن. ئامــاژە وەلای هەندێکیان دەکەین بۆ نموونە «علامه ابن کثیــر» فەرمــوویەتی: دە مەسـنەدی ئـیمام ئەحــمەددا هــاتووە گۆیــا پێغەمــبەر لە ڕۆژی عارەفاتــدا ئەو ئــایەتەی خوێنــدۆتەوە و لە ئاخرەکەشــیدا فەرموویەتی: «وَ إِنّـا عَلَـی ذٰلِـکَ مِـنَ الشّـاهِدینَ یـا رَبِّ» واتە ئەمــن لە ســەر ئەو ڕاســتیەی لە شاهیدانم خودایە. و هەروا دووبارە لە «ابن کثیر»ەوە ئەویــش لە ئـیمام «اعمــش»ەوە شــارەزای حەدیسی «امام اعظم»، گۆیا پێغەمبەر فەرموویەتی: خوێنەری ئەو ئایەتە ڕۆژی قیــامەت بانــگ دەکرێ لە لایەن خوداوە و خودا دەفەرموێ: ئەوە بەندەی منە کە شــاهیدی لە ســەر مــن داوە و وەفای بە عەهدی خۆی کردووە و شایانی بەهەشتە. (تفسیر ابن کثیر، ج١/ ٣٥٤)

و هەروا «سید آلوسی» بە نەقڵ لە دەیلەمی ئەویش لە ئەبوئەیووب ئەنســاری دەڵــێ: گۆیــا پێغەمبەر فەرموویەتی: کاتی نازڵ بوونی ئەو ئایەتانەی (الحمد لله ربّ العالمین)، (آیة الکرسی) و ئایەتی (شهد الله) و (قل اللهمّ مالک الملک) تا (بغیر حســاب) آل عمــران (٢٧)، هاواریــان کردە باریتەعالا و کوتیان یا ڕەببەنا ئەتۆ ئێمەت ناردووە بۆ لای گەلێک کە فەرمانی تــۆ بەڕێــوە نــابەن. گۆیــا خــودای تەعــالا فەرمــوویەتی ســوێند بە بەرزایەتــی خــۆم، هەرکەس لە پــاش بەجێ‌هێنانی نوێژەکان ئەو ئایەتانە وەخوێنێ، جێی پــێ دەدەم لە بەهەشــتا و بە چــاوی بەرزەوە هەمیشە لێی دەڕوانم. (تفسیر روح المعانی، ج٣/١٤١؛ تفسیر قرطبی، ج ٤٢/٤)

هەروەک لە هەڵســەنگاندنی ئــایەتی ﴿لاَ إِلَـــهَ إِلاَّ هُـوَ الْعَزِيـزُ الْحَكـيمُ﴾ڕا خــودا بە جێــی گەیاندووە و تەئکیدی ئەوەی کە خــودا یەکە و خــاوەن توانــایە و غــاڵبە و دەســتەڵاتی بە ســەر هەرچی بیهەوێ بیکا هەیە. دیارە ئەو یەکەتی و عەزیز و حەکیمی خۆی بە عەبــدانی ڕاگەیانــد، لە ژێر ســێبەری ئــاینی ئاســمانی کە خــۆی وەک بنچیــنەی ئەساســی خوداناســی بە عەبــدانی ڕاگەیاندووە بە وەســیلەی پێغەمــبەران. جــا دڵ دەیــهەوێ ئەو ئــایینەی کە لە ســەرەتای بــوونی

ئینسانی، تا ئەو ڕۆژەی ڕادەبرێ بەرەو قیامەت، بیزانێ و بیناسێ. ئەو ئایینەش بێ‌گومـان دەبـێ ئایینێک بێ ناوی ئیسلام بێ، واتە تەسلیم بە ئەمری باری و شوێن کەوتنی پێغەمـبەران. جـا بـۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٩ی ئالی عیمران:

**إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ وَمَا اخْتَلَفَ الَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَـاب إِلاَّ مِـن بَعْـدِ مَـا جَـاءهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ وَمَن يَكْفُرْ بِآيَاتِ اللّهِ فَإِنَّ اللّهِ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴿١٩﴾** ئالی عیمران

**هیچ گومانی تێدا نییە ئایینی پەسەندکراوی لای خودا تەنیا ئایینی ئیسـلامە، ئەوانەی کتێبیـان پێ دراوە، دووبەرەکی و کێشە هەیە لە نێوانیان، کاتێک نەبێت کە زانییـان ڕاسـتەقینە و هەق کامەیە، هۆی کێشەکەشیان بەخیلی و دڵپیسییان بوو، کەسێک ئایەتەکانی خـودا بشـارێتەوە و ئینکاریان بکا، بێ‌گومان خودا ژمێریارێکی خێرایە.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ١٩:**

دەبێ ئەوە باوەڕ کەین و بیسەلمێنین کە ئایین واتە دیـن لە لای خـودا یەکە، دەستووریشـی داوە بە عەبدانی خـۆی شـوێن ئەو دیـنە کەون و لێـی لانەدەن و هەر کتێبێکـی نـاردبێتیە سـەر ئەنبیایان لە بابەت ئەو دینە بووە و هەچی ئایات و موعجیزەیەک کە هاتبێت و ڕووی دابـێ هەر لە بابەت ئەو دینە بووە. ئەو دینە تەنیایەش ئایینی ئیسلامە. واتە تەسلیم بوون و ئیتاعە لە ئەمر و فەرمانی خودای تەنیا. ئەهل و خاوەن کتێبەکانی ئاسمانی ئەگەر دووبەرەکی و ناکۆکییـان هەیە لەو بارەوە، ناشی لە لاوازی و نەزانی هەڵگرانی وەحی ئاسمانی نییە، بەڵکە ناشی لە سەرەڕۆیی و نەزانی و خۆ بەزلزانییە، ئەوەش لە پاش تێگەیشتن و زانینی حەقەوەیە، جـا بـۆیە خـودا هەر لەڕێوە دەفەرموێ: کەسێک ئینکاری ئایاتی خودا بکا لە ڕێی سەرەڕۆیی و کەڵەوەکێشی، ئەوە بە تاوانبار دەژمێردرێ. خوداش بە حیسابی دەگا. دین واتە سزا و جەزا، هەر بۆیە پێشی دەکـوترێ ئیتاعە چونکە هۆی جەزایە.

بۆوەی بتوانین بە باشی لە لەفزی دین تێبگەین و حاڵی بین، دەبێ مانای ئەو چوار کەلیمانە بزانین کە لە قورئاندا بە ناوی دین هێندراون. کەلیمەکان: ئیسلام، دیـن، مـیللەت، شـەریعەت. دیارە ئەو چوار واژانە دە ئادابی شەرعدا لێک نیزیکن و هاومانان. بەڵام لە بابەت لۆغەتەوە هەر یەکەی خاوەنی مانای سەربەخۆیە:

١. دین: دە ئادابی لۆغەتدا واتە باو، ڕێ و ڕەوش

٢. ئیسلام: واتە تەسلیم بوون و مل پێ‌دان و وەرگرتن و قبووڵ کردن

٣. میللەت: واتە یاسا و دەستوور
٤. شەریعەت: واتە یاسا و دەستووری ئەمر بە چاکە و بەرگری لە خراپە.

ئەگەر بە وردی سەیری ئەو مانایانە بکرێ و هەڵسەنگێندرێ، یەک مانا و مەتڵەبێک دەدەنە دەست کە ئەو مەتڵەبەش ڕێ و ڕەوشی ئایینی ئیسلامە. مەسەلەن: ئیسلام لەو بارەوە کە بریتییە لە یاسای خوداناسی و شوێن کەوتنی یاسای خودا و ئیتاعە کردنی پێغەمبەران، ئەوە پێی دەکوترێ «دین».و هەروا ئیسلام لەو بارەوە کە خاوەنی یاسای ئاسمانییە کە وەحیی قورئانە، ئەوە پێی دەکوترێ «میللەت». ئیسلام لەو بارەوە کە خاوەنی یاسای ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپەیە، ئەوە پێی دەکوترێ «شەریعەت».

جا لە سەر ئەو ئەساس و بەراوردە وردە تەواوی ئەو ناوانەی «دین، میللەت، ئیسلام، شەریعەت»، دە واقیعدا کە هەر یەکەی بە ڕێگایەکدا دە حەرەکەتدان بەرەو یەک ناوە و یەک هەدەفن، ئەویش ئیسلامە. بە کوردی و بە کورتی، «ئۆمەت» واتە گەلێک کە خاوەنی یەک یاسا و یەک داب و باو بن. ئۆمەتی ئیسلام واتە خاوەنی یەک شەریعەت و یاسای ئاسمانی بن، تەفاوەتێکی باریک چاو پێ دەکرێ لە نێوان دین و شەریعەتدا، ئەویش ئەوەیە: شەریعەت بۆ لق‌وپۆپ و گەڵای داری دین ناو دەبرێ؛ ئەمما «دین و میللەت و ئیسلام» بە ئەساس و ڕیشەی ئیسلام ناو دەبرێ، یانی دەتواندرێ بکوترێ شەریعەت واتە عیلمی قورئانی کە ئەساس و بنچینەی ئایینی خودایە، وەک لە ئیشاراتی ئایەتی ١٥٣ی ئەنعامدا هەستی پێ دەکرێ:

**وَأَنَّ هَـٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ﴿١٥٣﴾** انعام
**ئەو ڕێگایە کە ئەمن بۆم دیاری کردوون و پێم ناساندوون ڕێگای ڕاستی منە. شوێنی کەون و ئیتاعەی بکەن.**

**تیوتیوە:**

ئەو ئایین و دینەی کە خودای بێ‌هاوتا لە هەوەڵ تا ئاخر بۆ ئینسانی دەسنیشان کردووە، دینی ئیسلامە؛ غەیری ئەو دینە دینی دی قبووڵ نییە و دەشبێ ئەوە بزاندرێ بە چاکی کە ئایینەکانی دیکە وەک ئایینەکانی یەهوود و مەسیح و ... ئەگەرچی لە ئاکار و ڕەوشدا تەفاوەتیان هەیە دەگەڵ ئایینی ئیسلام، ئەمما دە واقیعدا دە جەوهەری دیندا کە بریتییە لە تەوحید و تەسلیم بوون بە خودا، هەر یەکن بەبێ جیاوازی. هەر وەک لە ئایەتی ٨٥ی ئالی عیمراندا ئاماژەی وەلا

کراوە:

وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ئالی عیمران

**کەسێک غەیرەز شەریعەتی ئیسلام، شەریعەتێکی دیکە قبووڵ کا، لێی وەرناگیرێ و لە ئاخرەتدا ئەو کەسە ڕەنجبەخەسارە.**

ئایا دەکرێ بە ئایینەکانی بەر لە ئایینی ئیسلام بکوترێ ئیسلام؟

بەڵێ؛ بۆ وڵامی ئەو پرسیارە دەبێ ڕوو بکرێتە ڕاو و بۆچوونی زانایانی ئایینی:

زانایانی ئایینی لەو بارەوە بوونە دوو دەستە:

١. دەستەیەکیان پێیان وایە ئایینەکانی پێش ئایینی ئیسلام پێیان ناکوترێ ئیسلام و بە وەشوێنکەوتووانیان ناکوترێ «مسلم» (موسوڵمان). چونکە هەر ئایینەی دە دەورانی خۆیدا بە ناوی تایبەتی خۆی ناو دەبرێ. مەسەلەن وەک ئایینی یەهوود و نەسرانی، پێیان دەکوترێ یەهوودیەت و نەسرانیەت. بەو پێیە ئیسلام تایبەتی ئایینی حەزرەتی محەممەدە و موسوڵمانیش تایبەتی ئۆمەتی محەممەدە. زانای پایەبەرز شێخی سیوتیش هەر ئاوای نەزەر داوە.

٢. دەستەیەکی دیکە لە زانایان ڕا و بۆچوونیان وایە: بە هەموو ئایینەکان ـ چ ئیسلام چ ئەی پێش ئیسلام ـ دەکوترێ ئیسلام و بە وەشوێنکەوتووانیان دەکوترێ «موسوڵمان». ناڕەوا نییە و نابێ، بەڵام ئاداب و عورفی دەوران وای بە سەر یاسا هێناوە کە وشەی ئیسلام بۆ دینەکانی پێش ئیسلام شۆرەت پەیدا نەکا و ناو نەبرێ، بەڵکە کراوەتە تاجی سەری ئۆمەتی محەممەدﷺ و لەقەبی ئۆمەتی خاوەن دینی پێش ئیسلام بە ناوی یەهوود کە لە ڕیشەی هیدایەتە، ناو براوە، یا نەسارا کە لە «نصرة»ە، ناو براوە، واتە یاریدەدان.

### پوختەی مەبەست لە دین و ئایین

دین دە ئادابی عەرەبدا واتە جەزا و ئیتاعە و وەشوێنکەوتن کە بەشێکە لە ناوەرۆکی دین، بۆوەیە کە ئەو ئیتاعە و شوێنکەوتنە سەبەبی جەزان. ئەمما ئیسلام دە ئادابی فەرهەنگی عەرەبدا سێ مەتڵەبی لێ هەست دەکرێ:

١. تەسلیم بوون و شوێن کەوتن بە ڕواڵەت، هەر وەک لە هەڵسەنگاندنی ئایەتی ٩٤ی سووڕەی نیساء هەست بەو مەتڵەبە دەکرێ:

**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلاَمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا ﴿٩٤﴾** نساء
**ئەی ئەوانەی بڕوا و ئیمانتان هێناوە! کاتێک ڕۆیشتن بۆ جیهاد لە ڕێی خودادا، هەموو شتێک ڕوون کەنەوە، بەو کەسەی کە سڵاوتان لێ دەکات مەڵێن موسوڵمان.**

بە کوردی لە مانای ئەو ئایەتە وا هەست پێ دەکرێ کەسێک کوتی ئیسلامم و شوێن ئیسلام کەوت بە زاهیری، پێی مەڵێن موسوڵمان.

٢. بەشی دووهەمی وشەی ئیسلام ئەوەیە: «مَن أَسلَمَ أَيْ دَخَلَ في السِّلْمِ»: واتە کەسێک کوتی موسوڵمانم، ئیتر موسوڵمانە.

٣. بەشی سێهەم لە ئیسلام ئەوەیە کە «ابن انباری» فەرموویەتی: مانای «مسلم» واتە شوێنکەوتووی ئەمری باری دە عەبدایەتیدا. کەوابێ دەبێ بکوترێ مانای ئیسلام واتە ئیخلاس دە دیندا و باوەڕی بە خودا. ئەمما دە عورف و ئادابی شەرعدا ئیسلام هەمان ئیمانە؛ بە دوو دەلیل: یەکێک لەو دەلیلانە ئەوەیە، ئایەتی ﴿إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ﴾ وا دەخوازێ کە دینی پەسەند لە لای خودا بەغەیرەز ئیسلام نابێ. کەوابێ ئەگەر ئیمان غەیرەز ئیسلام بێ، پەسەندی لای خودا نابێ، خۆ یەقینیشە ئیمان پەسەندی لای خودایە، کەوابێ ئەوە کە ئیمان غەیری ئیسلام بێ، باتڵە.

دووبارە دەلیلی دووهەم لە سەر ئەوەی کە ئیسلام هەمان ئیمانە، ئایەتی ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ﴾(٨٥: آل عمران). واتە کەسێک بێ لە دینی ئیسلام دینێکی دیکە هەڵبژێرێت بە هیچ شێوەیەک لێی قبووڵ ناکرێت.

بەو پێیە ئەگەر ئیمان غەیرەز ئیسلام بێ، وا دەگەیێنێ کە ئیمان پەسەندی لای خودا نەبێ، جا خۆ دیارە ئیمان پەسەندی لای خودایە، کەوایە دەبێ باوەڕن بەوەی بێ کە ئیسلام واتە ئیمان.

ئەگەر هات و یەکێک بە گژماندا هات و کوتی: لە سەر ئەساسی ئایەتی ١٤ی سوورەتی حوجورات ئیسلام غەیری ئیمانە، چۆن بەرگری لە خۆ بکەین؟ پاش ئایەتەکە گوێ دەگرین بۆ وڵامەکە:

**قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا ﴿١٤﴾** حجرات
ئەو عەرەبە کۆچەری و خێڵەکیانە کوتیان ئیمانمان هێناوە؛ پێیان بڵێ: ئیمان و بڕواتان نەهێناوە،

**بەڵکوو بڵێن ملکەچ بووین (واتە موسوڵمان).**

ئێرە پێمان دەڵێ ئیمان و ئیسلام لێک جیاوازن، کەچی باوەڕیشمان وا دامەزراوە بە هۆی ئایەتەکانی پێشوو کە ئیسلام و ئیمان لکی یەک دارن، بەری یەک باخن، دەبێ چۆن وڵام بدرێتەوە و قانعیش بین؟

وڵام:

ئیسلام وەکی کوتمان و واشە دە واقیعدا، بریتییە لە ئیقرار و لە ئیتاعە بە زاهیری، جا خۆ دیارە وەک دەبینین و ئاشکرایە دووڕوو و کافر بە زاهیری لە ترسی شمشێر و مەسڵەحەتی کاریان، هەم ئیقرار دەکەن بە دین و هەم ئیتاعە دەکەن. دەیجا ئەوە ئیسلامی بە زاهیری هاتە جێ دەگەڵ ئیمان، بە پێی تەئیدی ئایەتی ٢٢١ی بەقەرە:

**وَلاَ تَنكِحُواْ الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ ﴿٢٢١﴾ بقره**

**ژنی موشریک مارە مەکەن تاکوو ئیمان نەیەنن.**

بەو پێیە ئیمانێکی کە دەبێ باوەڕی پێ بکرێ و پێی بکوترێ ئیمان، هەمان ئەو ئیقرار و ئیتاعە زاهیرییەیە، جا لە سەر ئەو ئەساس و بەراوردە ئیسلام و ئیمان حوکم بە زاهیری دەکرێ و خاوەن ئیعتیبارە، ئەگەرچی منافق (دووڕوو) و کافر دە ناو ماڵی دڵیدا بێئیمانە.

جا بە پێی ئەو هەڵسەنگاندنە مانای ئایەتی ١٤ی حوجرات ئاوای لێ بەسەر دێ: «لَم تُسلِموا في القَلبِ وَ الْباطِنِ، وَلٰكِن قُولوا أَسْلَمْنا في الظّاهِرِ»: واتە دە دڵدا تەسلیمی ئیمان نەبوون، بەڵام با بڵێن تەسلیم بووین بە زاهیری.

لە سەر ئەساسی سرنجدان و بەرجەوەندی و هەڵسەنگاندنی ئایەتی ﴿إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّٰهِ الإِسْلاَمُ﴾ دوو شت هەست پێ دەکرێن بە ڕوونی و حاشار دانیان ناڕەوایە. دوو شتەکەش ئەوانەن:

١. وشەی «دین» عامە، واتە هەموو دینەکانی ئاسمانی لە خۆ دەگرێ چونکە بە پێی یاسای ئادابی عیلمی نەحو، وشەی عام دەبەرگری عامە، کەوابێ ڕستەی (إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّٰهِ) واتە ئایینی پەسندی لای خودا، جا هەر دینێک بێ و بە هەر ناوێک بێ، لە لایەن خوداوە بێ. بە کوردی و بە کورتی: بە تەواو شەرع و ئایینەکانی ڕابردوو دەکوترێ «دین».

٢. هەر ئایین و دینێک لە کات و دەورانی خۆیدا جێی باوەڕ و بەقا بووە و هەر ئەو دینە لە

ڕوانگەی ئادابی لۆغەتییەوە و لە ڕوانگەی ماناوە ئیسلامی پێ کوتراوە. لە سەر ئەو ئەساس و دابە، پاش دابەزینی دینێکی دیکە بە سەر ئەو دینەدا ئەو دینە وشەی ئیسلامی لێ دارناوە و ئەو دینە تازەیە دابەزیوە بە شێوەی دین و ئیسلام وەرگیراوە. ئەو شێوە داب و باوە بەردەوام بووە تا ئەو دەورانەی دینی حەزرەتی محمد المصطفی دواهێنەری پێغەمبەرانﷺ دابەزیوە و هاتۆتە ڕوو بە عینوانی ئاخرین و بەرفراوانترین دینی خودا، ئەوکات یاسا و دابی هەموو ئایینەکانی پێش خۆی کاڵ کردنەوە و ناوی تایبەتی خۆی (ئیسلام)ی پێ بەخشرا لە سەرتاسەری دنیادا و هەرکەس بە پێی یاسا و ئادابی ئەو دینە هەڵسوکەوتی با، بە موسوڵمان و ئیسلام ناوی دەبرا و لە غەیرەز یاسای ئەو دینە ئیسلامە یاسا و دابی ئایینی دیکە ئیعتیباری لای خودا نەبووە و نییە، وەک لە ئیشاراتی ئایەتی ١٠٥ی کەهفدا هەستی پێ دەکرێ:

**فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا ﴿١٠٥﴾ کهف**

**کردەوەکانی بێباوەڕان بە نیشانەکانی خودا و بە دیدار و مولاقاتی خودا پووچ و بێبایەخ هەن لە ڕۆژی پەسڵانیشدا هیچ ئەرزش و وەزنێکیان بۆ دانانێین.**

**پوختەی مەبەست لە ئایەتی ١٩:**

خودا بانگەواز دەکا بە وەسیلەی ئەو ئایەتە لە ئینسان ئایینی پەسندی لای من ئایینی ئیسلامە و غەیری ئەو، لای من بێئیعتیبارە و تەواو پێغەمبەران لە سەر ئەو ئایینە بوون ـ بێجیاوازی ـ و ناکۆکی و جیاوازی کە ڕووی دا لە دینی خودادا لە لایەن پێغەمبەرانەوە نەبووە، بەڵکە لە لایەن هەواداران و شوێنکەوتووان بووە کە لە ڕووی ماڵبەملە و حەسوودی و کینەگەرییەوەیە، هەر وەک ئەوە ئاشکرایە و حاشای لێ ناکرێ: ناکۆکی ئەهلی کتێب لە پێغەمبەرایەتی محمدالمصطفیدا لە بەر ئەوە نەبووە لە حەق حاڵی نەبووبن و بێگانە لە حەق و ڕاستی، بەڵکە چاکیان دەزانی حەق کامەیە، ئەمما حەسادەت و دنیاپەرەستی، دووری خستنەوە لە حەقیقەت.

لە سەر ئەو ئەساسە بە پێی ئاماژەی ئایەتەکە دووبەرەکیی ئەوانەی نامەی تەورات و ئینجیلیان بۆ هاتبوو، وەنەبێ لە بەر بێئاگاییان بووبێ، بەڵکە پاش زانینی ڕاستی بووە؛ واتە بە تەواوی سیفەتەکانی پێغەمبەریان دە تەورات و ئینجیلدا خوێندبوە و لێی حاڵی بووبوون و بە دڵ باوەڕیان پێ کردبوو، ئەمما واش نەچوونە ژێر باری ڕاستی، لە ڕووی حەسادەت و ستەم و

لەخۆبایی‌بوون و دنیاپەرستییانەوە. دەیـانکوت مـحەمەد نەوەی ئیسـحاق نیـیە و بەڵـکە نەوەی ئیسماعیلە، بۆ شوێن‌کەوتن نابێ.

ئەگەر دێرەدا سەرنج بدرێ بە وردی ئەو هەستە دەکـرێ: ئەوانە باوەڕیـان بە ئـایەتی خـودا نەبووە، نەک بە وەحدانیەتی خودا، چونکە حاشای لێ ناکرێ کە ئەهلی کتێب خودایان قبووڵە، هەر بۆیەشە بێڕاوەستان ڕەپەوڕوو خودا دە ئایەتەکەدا هەڕەشەی ئەوەیان لـێ دەکـا: کەسـێ بە ئایاتی خودا مونکیر بـێ، لە ڕووی حەسـادەت و کیـنەوە، خـودا دەیکێشـێتە پـای حیسـاب بە زوویی.



خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم دەیهەوێ ئادابی دەمەقاڵێ و بەحـس فێـری پێغەمـبەر بکات کە چۆناوچۆن دەگەڵ بێبـاوەڕان بـدوێ و بـاس دامەزرێنـێ. بـۆیە ئـایەتی ٢٠ی ئـالی عیمران نازڵ دەکا و دایدەبەزێنێ بۆ پێغەمبەر.

ئەوەش ئایەتەکە:

**فَإنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلّهِ وَمَنِ اتَّبَعَنِ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ وَالأُمِّيِّينَ أَأَسْلَمْتُمْ فَإِنْ أَسْلَمُواْ فَقَدِ اهْتَدَواْ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ وَاللّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ ﴿٢٠﴾** ئالی عیمران

**ئەگەر کێشـە و ململانێیـان دەگەڵ کـردی، بڵـێ: مـن و شـوێن‌کەوتووانم خۆمـان بە خـودا سپاردووە؛ بڵێ بەوانەی کە کتێبیـان پـێ دراوە، هەر بەوانەی نەخوێندەواریشـن: ئایـا ئیمانتـان هێناوە؟ ئەگەر هات و موسوڵمان بوون ئەوە بەڕاستی شارەزان، ئەگەر هات و پشـتیان هەڵکرد، ئەتۆ تەنیا ڕاگەیاندنت لە سەرە، خودا بە چاکی ئاگای لە بەندەکانە.**

**بەراورد و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە سیما و ناوەرۆکی ئایەتی ٢٠:**

هەڵدەگرێ خاوەن کتێبەکـان بـاس بـکەن لە بـابەت ئـایین و خـودا و پێغەمـبەر، ئەتـۆ لە بەرابەریاندا بڵێ: ئەمن تەسلیمی خـودا و فەرمانەکـانی خـودام، کەسـێکیش بـاوەڕی بە مـنە و شوێنی من کەوتووە، ئەویش خۆی تەسلیمی خودا کردووە، ئێمە ئەهلـی یـاغی و لاسـار نـین، ئەگەر هـات و ئەوانـیش کوتیـان ئـێمەش ئەهلـی یـاغی و لاسـار و سـەرەڕۆ نـین، ئەگەر ئیختلافیشـمان هەیە، لە ڕووی عەمـد و سـتەمەوە نیـیە، بەڵـکە لە ڕێـی دۆزیـنەوەی حەق و وەدەس‌هێنانی ڕێی ڕاستی ئەقڵ و شعوورن ئاوای کردووە کە سەری کێشاوەتە ئیخـتلاف، دەنـا تەسلیمی خودای بەرز و بڵێندین. هەر وەک ئەتۆ ئەی محەمەدﷺ! ئەقڵت ئاوای پـێ شـکاوە و

تەسلیمی خودا بووی، ئەمەش ئاوان ئەقڵ پێ شکاوە و تەسلیمی خودا بووین. واتە ئەقڵی تۆ ئاوای بڕ کردووە کە گرتووتە بەر، ئەقڵی مەش ئاوای تێچووە و گرتوومانەتە بەر، هەر دووکیشمان تەسلیمی خوداین، لە وڵامیاندا بێڵ: ئێمە تەسلیمی خودا و حەقین، ئێوە ئەهلی کتێب و بێ کتێب واتە بێسەواد ئەگەر ڕاست دەکەن تەسلیمی خودان، وەک دەڵێن، دە بەرابەر ڕاستی و حەقی ڕوون و ئاشکرا تەسلیم بن و لاساری مەکەن، ئەوددەم شاهیدی دەدرێ لە سەر ڕاستیتان و دروستکاریتان. و ئەگەر قبووڵی کوتەی تۆیان نەکرد و یاغیگەرانە لاساری و سەرپێچییان گرتە بەر، ئەوددەم ئەتۆ ئەرکی خۆت کە پێ ڕاگەیاندنە بەجێهێناوە، ئەوانیش حەواڵە بە من کە، خودا ئاگاداری دەروونی بەندەکانی خۆیەتی.

بە کورتی و بە کوردی، ئەی محەمەد! پاش ئەوەی پێت کوتن: ئەمن دەمەقاڵێتان دەگەڵ ناکەم، خۆم و ڕووی خۆم بە خودا سپارد، و هەروا ئەوانەی شوێن من کەوتوون، ئەوانیش خۆیان سپارد بە خودا، و هەروەها بڵێ ئەی محەمەد! بەوانەی کە هاوبەش پەیدا دەکەن ـ وەک عەرەبە نەخوێندەوارەکان ـ ئایا تێگەیشتن موسوڵمان بوون؟ وەک من کە تەسلیم و موسوڵمانم، جا ئەگەر موسوڵمان بوون و ئیتاعەی خودایان کرد، ئەوە ڕێی دۆزیوەتەوە و بە مەبەست گەیشتوون، دەنا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، ئەوە ئەتۆ هیچ گوناه و خەیانەتێکت ناخرێتە پاڵ، چونکە ئەوەی لە سەر تۆ پێویست بوو پێت سپێردرابوو، کە ڕاگەیاندن بوو، بەجێت هێنا، خوداش بینایە بە بەندەکانی خۆی، لە ڕوو وەرگێڕان تۆڵە ستاندن هەیە ئەگەر خودا بیهەوێ.

**ئاوڕدانەوەیەک**

وەک لە ئایەتی پێشوودا بۆمان دەرکەوت و بە ڕوونی هەستی پێ کرا، ئەهلی کتێب پێش پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر و ئاشکرا بوونی ئایینی ئیسلام بە هۆی ڕوانین لە تەورات و ئینجیل ئیسلام پێغەمبەرایەتی محەمەدیان قبووڵ بوو، هیچ گۆنە ئیختلافێکیان لەو بارەوە نەبوو دەگەڵ یەک، بەڵکە ئیختلاف پاش زاهیر بوون و دابەزینی ئایینی ئیسلام و ئاشکرابوونی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر هاتە ڕوو و دەستی پێ کرد، دەگەڵ ئەوەی بە دڵ ڕاستی و حەقیقەت و واقعیەتی ئایینی ئیسلامیان دەزانی و بۆیان ڕوون بوو، بەڵام تەموژە گوێرەی حەسادەت و لاساری ڕێ نەدا چاوی دڵ حەق چاو کا و خۆی تەسلیم کا.

**دۆزین و پشکنینی ئایەتەکان:**

(حاجّوک) جەمعی (حاجّ)ە، واتە دەلیل ڕازانەوە و بەحس بە دەلیل. (أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلّه) واتە ڕووم دا بە خودا دە ئادابی لۆغاتی عەرەبیدا، ئەمما دێرەدا دە وشەی (وَجْهِيَ لِلّه)دا زاتی پاکی خودا دە نەزەر دەگرین بەوە دە ئادابی عەرەبیدا وا هەیە دە وشەی (وجه)دا خودی ئینسان دە نەزەر دەگیردرێ، یان ئەگەر بکوترێ (وجه فلان)، واتە زاتی فڵان، جا بەو پێیە (وجه الله) واتە زاتی خودا، چونکە خودای تەعالا بەرییە لە ئەندام و ئەعزا. ئەگەر هات و ئەو پرسیارەش کرا: بۆچی وشەی (وجه) بە کار برا دێرەدا؟ دەبێ لە وڵامدا بکوترێ لە ئەندامەدا (وجه) واتە ڕوو، بەرتەری هەیە بە سەر باقی ئەندامەکاندا. جا بەو پێیە دەبێ لە مانای (أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلّه)دا بکوترێ: بە تەواوی وجوودم خۆم بە خودای سپارد.

و هەروا دە ئادابی عەرەبیدا (وجه) بە واتای قەست و نیەتیش هاتووە، مەسەلەن (کان هنا وجه الرجل) واتە قەستی مرۆ ئێرە بووە. ئەودەم مانای ئایەتی (أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلّه) واتە ئەمن قەست و باوەڕ و نیەتی خۆم بە خودای مەزن سپارد. هەر وەک ئەو بابەتە لە ناو دەروونی ئایەتی ١٣١ی بەقەرەدا هەست پێ دەکرێ:

**إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٣١﴾** بقره
**کاتێ پەروەردگاری پێی کوت: تەسلیم و ملکەچ بە، دەستەبەجێ کوتی: وا ملکەچی پەروەردگاری جیهانیانم.**

جوملەی (فَإِنْ أَسْلَمُواْ فَقَدِ اهْتَدَواْ) دڵخۆشیدانەوەی پێغەمبەری لێ چاو دەکرێ بە تەواوی، یانی لە موسوڵمان نەبوونی ئەوانە دڵ پەرێشان مەبە، چونکە ئەوەی ئەرکی خۆت بوو کە ڕاگەیاندنە، ئەنجامت داوە، ئیتر ئەوی دی حەواڵە بە خودایە.

**تیوتیوە:**

لە سیمای ئایەتی ٢٠ و هەڵسەنگاندن و ڕاوێژیڕا دوو شت واتە دوو ئامانج و مەبەستی بەرچاو هەست پێدەکرێن:

١. دەبێ ئەهلی ئیمان لە دمەقاڵێ خۆ بپارێزن، چونکە بەرهەمی دەمەقاڵێ لێک تۆران و دڵئێشانە، هەر وەک بە ئاوڕدانەوە وەسەر ژیانی حەزرەتی ڕەسووڵﷺ پێش دابەزینی ئەو ئایەتە چەند جاران بۆ ئیسباتی پێغەمبەرایەتی خۆی و حەقانیەتی ئایینی ئیسلام بە شێوەی جۆراوجۆر دەگەڵ بێباوەڕان کەوتە باس و دەمەقاڵێ. حەزرەتی ڕەسووڵ دەستەودامێنی ئایاتی قورئان و

موعجیزە دەبـوو وێسـتا باوەڕیـان پـێ نەدەکـرد بێبـاوەڕان، مەسـەلەن وەک مـوعجیزەی دار؛ موعجیزەی دار ئەوەیە: گۆیا ڕۆژێک ئەهلی مەککە زۆر ئەزیەت و ئازاری حەزرەتـی ڕەسـووڵ دەدەن و ناڕەحەتی دەکەن و ڕوخسـاری مبـارەکی خوێنـاوی دەکەن، لە تـاوان خـۆ دەگەیێنێـتە پەنایەک و ئارام دەگرێ. لەو کاتە تاڵەدا حەزرەتی جبرەئیل بە ئەمری باریتەعالا دێتە لای و پێی دەڵێ: بۆ موعجیزەی ئەو گەلە لە بەرچاوی وان بانگی ئەو دارە بەرزە بـکە بێـتە لات؛ حەزرەت بانگی دارەکە دەکات و دار بە هەموو نەزم و نیزامی پێبەخشراوی دێتە لای حەزرەتی ڕەسـووڵ لە بەرچاوی وان؛ پاشان هەر حەزرەتی جبرەئیل پێـی دەفەرمـوێ: پێـی بڵـێ بچێـتەوە شـوێنی خۆی؛ دووبارە حەزرەتی ڕەسووڵ دەستووری پـێ دەدا کە بە شـێوەی تەواو دەچێـتەوە شـوێنی خۆی، بێ ئەوەی لە نەزم دەرچێ. واش بێباوەڕان تەسلیمی حەق نەبـوون، و هەر وا بـۆ بەقـا پێکردنی بە پێغەمبەر گورگ بانگ دەکاتە لای خـۆی و دەیـدوێنێ و تەسـدیقی دەکـا، کەچـی بێبـاوەڕانی دڵڕەش بە هـۆی حەسـوودی مـل هەر نـادەن، ئەو مـوعجیزانە هەر بـۆ وەن کە پێغەمبەر خۆی لە دەمەقاڵی دوور وەخا، کەچی دەجەلچی دەجەل هەر دەکەن.

و هەروا پێغەمـبەر بـێجگە لەو مـوعجیزانە، مـوعجیزەی زۆری دیکەشـی بـۆ بێبـاوەڕان دەنواند، مەسەلەن: تەرسایەکان دەیانکوت عیسا خودایە، پێغەمبەریش بـۆ ئەوەی لەو ئەقیـدە و خەیاڵە بێبنەمـایە لاچـن و لادەن، دەیفەرمـوو: خـودای بێهاوتـا (الحـيّ القیّـوم)ە، عیسـا نە (حیّ)ە، نە (قیّوم)، و هەر وا بۆ ئیسباتی پێغەمبەراتیی خـۆی بەوان ئـایەتی ١٧٦ی بەقەرەی بـۆ دەخوێندنەوە:

**ذَلِك بِأَنَّ اللّه نَزَّلَ الْكِتَاب بِالْحَقِّ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُواْ فِي الْكِتَاب لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ**

**ئەو سـزایەش هـۆیەکەی ئەوەیە کە خـودا کتێبـی بە هەق و ڕاسـتی دابەزانـدووە، بێگومـان ئەوانەی وا سەبارەت بە کتێبی خودا لە کێشە و دووبەرەکیدان، زۆر لە هەق و ڕاستی دوورن.**

و هەر وا موعجیزەیەکی بەرچاوتر لە بەرچـاوی ئەو گەلە وەک کارەسـاتی هەرای بەدر، کە ئایەتی ١٣ی ئالی عیمران بە ئاشکرایی بانگەوازی دەکا و دەفەرموێ:

**قَدْ كَانَ لَكُمْ آيَةٌ فِي فِئَتَيْنِ الْتَقَتَا فِئَةٌ تُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللّه وَأُخْرَى كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ الْعَيْنِ وَاللّه يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِ مَن يَشَاء إِنَّ فِي ذَلِك لَعِبْرَةً لَّأُوْلِي الأَبْصَارِ**

**بەبـێ گومـان لە ڕووبەڕوو بـوونەوەی ئەو دوو دەسـتەیەدا نیشـانەیەکی ئاشـکرایە بـۆ ئێـوە،**

**دەستەیەکیان دەجەنگێن بۆ خودا و لە ڕێی خودادا، ئەوی دیشیان بێبڕوا. بە ئاشکرا موسوڵمانەکانیان بە دوو ئەوەندەی خۆیان چاو دەکەن، خودا بە یارمەتیدانی خۆی پشتگیری ئەو کەسە دەکات کە دەیەوێت، بێگومان لەو کارەساتەدا پەند وەرگرتنێکی زۆر هەیە، بۆ ئەوانەی کە خاوەن هەست و دڵێکی ڕووناکن.**

پاش ئەو هەموو موعجیزانە پێغەمبەر بۆ ڕەد و پووچەڵ کردنەوەی کوتە و باوەڕی ئەو کەسانەیان کە دەیانکوت «خودا هاوتای هەیە، وەلەدی هەیە، ژنی هەیە»، ئایەتی ﴿شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ﴾ نارد، واتە: شاهیدی داوە خودا کە هیچ خودایەک نییە مەگەر خۆی نەبێ، بێهاوتا و بێژن و منداڵە؛ کەچی بێباوەڕان بە هۆی ڕەشبوونی دڵیان دە ژەنگی حەسادەت و یاغیگەریدا دوور نەدەکەوتنەوە لە باوەڕی کەسیفی خۆیان.

تەواو ئەو بەیاناتەی پێغەمبەر کاری نەکرد لە سەر بێباوەڕان، هاوارە وەلای ئەوەی: هەر کەس هەوێنی حەقی لە ناو دڵدا نەبێ و فرچکی بە منداڵی بەحەق نەگرتبێ، هەزاران موعجیزە و نیشانە و بەڵگەی حەقی نیشان دە و بۆی بڵێ، نایەتە سەر ڕێ و ڕێگای جەدەل و خواری بەرنادا، کەوایە نابێ وێی هەڵڕووسکێی و دەگەڵی تێکەوی.

ئەوە بوو ناوەرۆکی ئایەتی ٢٠ی بەقەرە. بۆ زێدە زانین ڕوو بکە لە تەفسیری کەبیر، باسی هەمان ئایەت.

٢. دووهەم شت لەو دوو شتانەی کە لە سیمای ئایەتی ٢٠ هەستی پێ دەکرێ ئەوەیە: خودای تەعالا فەرموویەتی (أَسْلَمْتُ وَجْـهِيَ لِلّه) واتە خۆم تەسلیم بە خودا کرد و خۆم بەو سپارد، بەو کەلامە پیرۆزە واز لە دمەقاڵی بهێندرێ، چونکە ئەو گەلە بێباوەڕانە ئیقرار بە بوونی خودا و شایان بوونی پەرستنی دەکەن، ئەمما لەو لایەوە کە جوولەکە داوای هاوتای خودا و جسمیەتی خودا دەکەن وەک گاورەکان کە دەڵێن عیسا خودایە و موشریک عیبادەت بۆ بتان دەکەن بە ناوی هاوتای خودا، ئەوە فریوخواردووی هەوا و هەوەس و نەزانین. ئەگینا دەزانن خودا حەقە و شایانی پەرستنە، جا بۆیە خودای تەعالا وەحی دەکا بۆ پێغەمبەر کە بانگەوازی ئەهلی کتێب بە وەسیلەی ئایەتی ٦٤ی ئالی عیمران بکە کە هەمووتان کۆوە بن لە سەر ڕێباز و یاسا و وتەیەک کە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا یەکسانە:

**قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَاب تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّه وَلاَ نُشْرِك بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّه فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ**

**ئەی پێغەمبەر بڵێ: ئەی ئەوانەی کە خاوەن کتێبن! وەرن با لە سەر ئەو وتە کۆ ببینەوە، کە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا یەکسانە: بەندایەتی بۆ کەس نەکەین بێجگە لە خودا، هیچ شتێکیش نەکەین بە شەریک و هاواڵی؛ هەندێکمان هەندێکی ترمان لە جێی خودا بە پەروەردگار دانەنێین، ئینجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، بڵێن: ئێوە بە شایەت بن کە وا ئێمە موسوڵمانین.**

بە کوردی و بە کورتی، لەو ئایەتە ئەوە هەست پێدەکرێ کە گۆیا خودای مەزن دەفەرموێ بە پێغەمبەر: «فإن نازَعوكَ يا محمّدُ في هذِهِ التَّفاصيل فَقُلْ أنا مُستَمسكٌ بِطَريقَةِ إبراهيم» واتە: ئەی محەممەدﷺ! ئەگەر ئەوانە دەگەڵ تۆ لەو بارەوە دەمەقاڵێیان کرد، بڵێ: ئەمن خۆم سپارد بە خودا. وەک حەزرەتی ئیبراهیم و بە شوێن ئەودا، خۆ دیارە ئێوەش باوەڕتان هەیە بەوەی ڕێگای حەزرەتی ئیبراهیم ڕاست و دروست و ڕەوانە، لە هەر گومان دوور و بەرییە، ئەو شێوە باسەی پێغەمبەر پەیڕەوییە لە ئایەتی ١٢٥ی نەحل:

**وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴿١٢٥﴾**
**بە جوانترین شێوە لەگەڵیاندا بدوێ.**

جگە لەوانەش، ئەو بێباوەڕانەی دڵ و بەرچاو تاریکی هیچ نەزان درۆیە دەکەن کە دەڵێن ئێمە باوەڕمان بە حەزرەتی ئیبراهیمە و ڕێگای ئەومان قبووڵە، بە دەلیل دیارە درۆیە دەکەن: حەزرەتی ئیبراهیم فەرموویەتی: بەندەگی ناکەم بۆ یەکێ نەبیسێ و نەبینێ و هیچ قازانج و زەرەریشی لە دەس نەیە؛ وەک ئایەتی ٤٢ی سوورەی مەریەم لە زمانی حەزرەتی ئیبراهیمەوە ئیشارەی وەلا فەرمووە:

**إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنك شَيْئًا ﴿٤٢﴾**
**بیخەوە یادت ئەو کاتەی ئیبراهیم کوتی بە بابی: ئەی بابە! بۆ شتێک دەپەرەستی کە نە دەبیسێ و نە دەشبینێ؟ نە بێنیازیشت دەکا لە هیچ شتێک!؟**

کەوایە دەبێ بکوترێ بەو درۆزن و بێباوەڕانە ئێوە چۆن دەتوانن بڵێن: شوێنکەوتووی ئیبراهیمین و لەو لایەشەوە حەزرەتی عیسایەکی کە لە نهێنیدا نە دەبیسێ و نە دەشبینێ و نە هیچ کارێکیشی بێ ئیزنی خودا لە دەس دێ، بە خودای دەزانن و بەندەگیشی بۆ دەکەن؟

دە بڕوانن لە ئەمری خودا و وڵامی ئیبراهیم، ئەو بێباوەڕانی درۆزن و حەسوود کە ئایەتی ١٣١ی بەقەرەی لە سەر دابەزیوە:

إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٣١﴾
**(وەبیر خۆ بێنەوە) ئەو کاتەی پەروەدرگاری ئیبراهیم کوتی پێی: ملکەچ بە، (واتە تەسلیمی خودا بە)، دەستەولەجێ ئیبراهیم کوتی: وا ملکەچی پەروەردگاری جیهانیانم.**

واتە لە هەموو بوار و بارێکەوە خۆم بەوی سپارد، بەڵکە لەوە بەرز و بەرچاوتر نابێ بۆ قانع بوون و شوێن‌کەوتنی و ئیتاعەت لە خودا و دوور کەوتنەوە لە پەرستنی غەیری خودا.

**سەرقەپاغی مەبەست:**

ئایەتی ٢٠ی ئالی عیمران ڕووی دە هەموو موخالیفەکانی پێغەمبەرە، وەک جوولەکەکان و گاورەکان و درۆزن و بێباوەڕەکان و بت‌پەرستەکان و تەنانەت ئی هەموو دەور و زەمانێک دەگرێتەوە؛ کە بە زمان دەڵێن شوێن‌کەوتووی ئایینی ئیسلامین، بەڵام دە ئاکار و کردار و گوفتاریان لە سەرووی گاور و جوولەکە و بت‌پەرستانن، سەر دەبڕن و نامووس دەدڕن بە ناوی ئیسلام، و ئاڵای بەرزی ئیسلامیش هەڵدەدەن بۆ فریوی عالەم. جا پەنا بە خودا!

خودا کە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أَسْلَمُواْ فَقَدِ اهْتَدَواْ﴾ واتە ئەگەر موسوڵمان بوون، ئیتر ئەوە بەڕاستی شارەزان؛ یان ئەگەر دەفەرموێ: ﴿وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ﴾ واتە ئەگەر هات و پشتیان هەڵکرد ئەتۆ تەنیا ڕاگەیاندنت لە سەرە؛ ئەو کەلام و بەیاناتە ڕەوانە ئەوەمان پێ دەڵێ کە خودا دڵداری پێغەمبەر دەداتەوە کە تۆ ئەرکی خۆت بەجێ هێناوە، ئەوانەی ڕووشت لێ وەردەگێڕن ڕۆژی خۆی ڕووبەڕوومان دەبنەوە و بە سزای ئاکاری خۆیان دەگەن. بۆ زێدە زانین بڕوانە «تفسیر کبیر» هەمان ئایەتی ٢٠.

دەبێ ئەوە بزاندرێ: پاش ئەوەی خودای تەعالا بەیانی حاڵ و ئەحواڵی ئەو کەسانەی ڕووی لێ وەردەگێڕن بە ئایەتی ﴿وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ﴾ ڕاگەیاند هەر بەوەندە دەسبەرداری چۆنیەتی ئاکار و ڕەفتاریان نابێ بەڵکە بە تەواوی ئاکار و کردەوەیان بە دنیای ئینسان دەناسێنێ، بە وەسیلەی ئایەتی ٢١ی ئالی عیمران، بەتایبەتی سێ سیفەتی دزێوی تایبەتیان دەست نیشان دەکا و ڕادەگەیێنێ، وا دەردەکەوێ هەر لە کۆنەوە کەسان و باب و باپیرەشیان هەر ئاوا بەد و ناحەز و پیس ڕەفتار بوون، بەو هۆیەوە کە پێغەمبەرانی خودایان دەکوشتن بە ناحەق و ئەوانەیان دەکوشتن کە ئەمریان بە چاکە دەکرد، ئامانجیان تەنیا فەسادکاری بووە، بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢١:

**إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللّٰهِ وَيَقْتُلُونَ النَّبِيِّينَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَيَقْتُلُونَ الَّذِينَ يَأْمُرُونَ بِالْقِسْطِ مِنَ النَّاسِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢١﴾**

**بێگومان ئەو کەسانەی بێباوەڕن بە ئایەتەکانی خودا و بە ناڕەوا پێغەمبەرەکان دەکوژن و ئەو خەڵکانەش دەکوژن کە فەرمان بە دادگەری دەدەن، موژدەی سزایەکی دەردناکیان بدەرێ.**

**تێڕوانین و ئاوڕ وەسەر دانەوەیەکی ورد و هەستیارانە وەسەر سیما و ناوەرۆکی ئایەتی ٢١:**

بەڕاستی ئەوانەی بێباوەڕن بە ئایەتەکانی خودا کە قورئانە، بگرە لە جوولەکە و گاور و هاوبەش پەیداکەران کە باو و دەستووریان هەر کوشتنی پێغەمبەرانە بە ناڕەوا، وەک کوشتنی حەزرەتی زەکەریا و یەحیا و هەروا کوشتنی ئەو کەسانەی کە فەرمان دەدەن بە داد و ڕاستەڕێیی، ئەوانە مژدەیان بدەیە بە سزای سەخت و گران و بەژان، ئەوانەش ئەوانەن کە ئایەتی ٢٢ دەیانناسێنێ و دەفەرموێ: کردەوەکانیان پووچ و بەتاڵن و نابوودن لەو دنیایە و لە دنیای ئاخرەتیشدا و هیچ یاریدەدەرێکیش بۆ ئەوانە نییە.

وا دەردەکەوێ و هەست پێ دەکرێ کە (یکفرون) و (یقتلون) دوو سیفەتی دایمی ئەوانە بن، واتە یەهوود دە تەکزیبی ئایاتی قورئان لە ڕووی یاغیگەری و لاساری و هەر وا کوشتنی پێغەمبەران و دادگەرانی بە حەق، پیشەیەکی ئەخلاقی و ئاکارێکی بێویژدانییان بێ، وەک مێژووی ژیانیان وا نیشان دەدا کە یەهوود هەر لە سەرەتای ژیانیانەوە ئاکاریان پڕ لە فەساد و جینایەت بووبێ.

ئایەتی ﴿فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾هاوارێکە ڕەپ و ڕوو بۆ عەزاب و دەرد و ڕەنجیان، و تەنیا موژدەی عەزابی ئاخیرەتیش نییە، بەڵکە ئی دنیاشە، بە دەلیلی ئایەتی ٢٢ کە دەفەرموێ: ﴿فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ﴾

و هەروا دە ئایەتی ٢١دا هەست بە دوو نوکتەی بەرچاو و سەرنجڕاکێش دەکرێ. دوو نوکتەکانیش ئەوانەن:

١. عەداڵەت و دادگەری بە ئەندازەیەک دە ئیسلامدا بەڕێز و بەرزە و مایەی بۆ دانـدراوە و ڕێزی لێ گیراوە کە تەنانەت کوشتنی ڕاگەیێنەرانی عەداڵەت و داد لە ڕیزی کوشتنی پێغەمبەراندا هاتۆتە ژمار و ڕیزی ئەوانەی تەکزیبی قورئان دەکەن.

٢. بەکارهێنانی وشەی «مزگێنی واتە تبشیر» بە عەزاب، دە حاڵێکدا کە مزگێنی بۆ خۆشی و سەعادەتە، نیشانەی ئەوپەڕی ئیستیهزایە بە کافران.

### ئاوڕ دانەوەیەک وەسەر جوملەی ﴿ وَيَقْتُلُونَ النَّبِيِّينَ بِغَيْرِ حَقٍّ ﴾

لە بەراورد و هەڵسەنگاندنی ئەو ئایەتە چەند بابەتی ئەساسی هەست پێ دەکرێ:

١. حەسەن بەسری نەزەری وایە ناوبردنی (بغیر الحق) بۆ موبالەغەیە، بەو شەرتە تێی (یقتلون) تەشدید بێ واتە پێغەمبەرانیان زۆر کوشتووە وەیا بە سەختیان کوشتوون بێتاوان.

٢. لە ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح نەقڵ کراوە کە فەرموویەتی: جارێکی لە پێغەمبەرم پرسیار کرد و کوتم ئەی پێغەمبەری خودا! ڕۆژی دادگای حیسابی ئەعمال سەختترین دەرد و عەزاب وەبەر کێ دەکەوێ؟ پێغەمبەریش لە وڵامدا فەرمووی: بەژانترین عەزاب دە ڕۆژی حیسابدا بۆ ئەو کەسانەیە کە پێغەمبەران بکوژن و هەروا ئەو کەسانەش کە ڕێبازی پێغەمبەران دەگرن وەک ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بێ. حەزرەتی ڕەسووڵ دەستەولەجێش ئەو ئایەتی ٢١ی خوێندەوە. پاش خوێندنەوەی ئەو ئایەتە ڕووی دە ئەبوعوبەیدە کرد و فەرمووی: کوڕانی ئیسرائیل لە هەوەڵ ڕۆژی ژیانیاندا ٤٣ پێغەمبەریان دە کاتژمێرێکدا کوشت. پاش ئەو فەرموودەی پێغەمبەر ١١٢ نەفەر لە نەفەراتی بەنی ئیسرائیل هەستان و ڕە حەوا کەوتن و کوتیان: ئەوانەی کە بە دەستی کوڕانی ئیسرائیل کوژراون لەو کەسانە بوون کە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپەیان دەکرد، کە بە یەک ڕۆژ هەموویان کوشتن ئەو ٤٣ کەسە. بێگومان ئەو ئایەتە دەرحەق بەو کەسانە دابەزیوە و هەروا تاقمێکی دیکەشیان حەزرەتی یەحیای کوڕی زەکەریایان کوشت کە پێیان وا بوو حەزرەتی عیسایە. جا بە پێی ئەو ڕیوایەتە سابت دەبێ و بووە کە ئەوانەن پێغەمبەرانیان کوشتوون.

و هەر وا دە ئایەتی ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ﴾دا ئەو هەستە دەکرێ کە «یکفرون» بۆ داهاتوویە، وەک شتێکی پێشمان پێ دەگرێ و دەڵێ: خۆ ئەو ئایەتە هەڕەشەیە لەو کەسانەی کە لە دەورانی پێغەمبەر محەمەددا ژیاون نەک بۆ کەسانی پێش پێغەمبەر. جا خۆ ئەوەش ڕوونە کە کوشتنی پێغەمبەران و پیاوانی ئامیر بە چاکە و ناهی لە خراپە نەکوژراون لە دەورانی پێغەمبەردا. جا خۆ ئایەتەکەش ڕاستە و شایانی باوەڕە، کە وایە دەبێ چۆنی بەراورد کەین ئەو ئایەتە تاکوو تووشی کەند و کۆسپ نەبین؟!

بێگومان ئەو ڕەخنە ڕەوایە، دەشبێ بە دوو شێوە وڵامی دەینەوە:

١. یەکێک لەو دوو شێوانە ئەوەیە: ئەو ئاکارە ناحەزە واتە کوشتنی پێغەمبەران و پیاوچاکان شوێن و ڕەفتاری ڕابردووانی ئەو گەلە بووە واتە باب و باپیران و کەسانیان، ئێستاش کە وەپاڵ

ئەو کەسانەی دەورانی پێغەمبەر دەدرێ لە سەر ئەو ئەساسەیە کە تاوانی ڕابردووان نەدرێتە پاڵ ئەوان چونکە بەو شێوە کارەساتەی پێشینیان ڕازین و شانازی پێوە دەکەن، وەک ئەوە دەچێ کوڕ ئەگەر بە کردەوەی بابی ڕازی بێ، ئەوە ئاکاری بابیشی وەپاڵی دەدرێ.

۲. شێوەی دووهەم ئەوەیە وەک مێژووی ئیسلام تێی ڕادیوە ئەو گەلی بێباوەڕ دایمە دە حەولی ئەوەیدا بوون پێغەمبەر بکوژن، زۆر دەخەفتان کە بۆیان هەڵکەوێ و لە ناوی بەرن تاکوو بتوانن هاواری ئایینی ئیسلام خەفە کەن، بەڵام خودای تەعالا ڕێگای پێ نەدان و لەو شەڕ و حیلە و فیتنەیەی پێغەمبەر و ئایینی ئیسلام پاراست، جا لە بەر ئەوەی ئەو گەلە بێ باوەڕە ئارەزوو و ئاوات و باوەڕی دە دڵدا کوشتنی پێغەمبەر و لەناوچوونی ئیسلام بوو، ناڕەوا نییە ناوی **کوفر**یان لە سەر بندرێ، وەک ئەو کەلامە عەرەبییە «النّارُ مُحرِقَةٌ وَ السُّمُّ قاتِلٌ» واتە سرشتی ئاور سووتاندنە و سرشتی سەم کوشتنە، بەو پێیە دەتواندرێ بەوانە بکوترێ هەستی ناپاکیان پێغەمبەر کوشتنە.

دڵ ئەو پرسیارەی بۆ دێتە پێشێ: ئایا لە بەیانی ئەو دوو کەلیمانەی «بغیر الحق» دە ئایەتی ﴿وَيَقْتُلُونَ النَّبِيِّينَ بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ چ بەهرە و فایدەیەکی هەیە، چونکە ڕوون و ئاشکرایە و حاشا هەڵنەگرە کوشتنی پێغەمبەران ناڕەوا و ناحەققە، بڵێین یا نەڵێین، کەوابێ دەبێ لێی وەکۆڵین ڕازی ناو بردنی «بغیر الحق» دەو ئایەتەدا چییە؟ بۆ دیتنەوەی ئەو ڕاز و سوڕە زۆر لێر و لەوێ گەڕاین و بێر و بەوێدا هەڵپڕژاین لەوە زیاتر نەهاتە بەرچاومان: ئاماژە وەلای گوناهی زۆر گەورە بێ ناوبردنی «بغیر الحق» و دەشکرێ بکوترێ: ئەو بێباوەڕانە نیەتیان لەو زوڵمە گەورەیەدا واتە کوشتنی پێغەمبەران ڕێگای عەداڵەتیان گرتبێتە بەر، جا خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم بۆ پووچەڵ کردنەوەی نیەت و قەستی وان، جوملەی «بغیر الحق» بە ئایەتەکەوە نابێ تاکوو هەموو دنیا تێبگا لە نیەتی پیسەی ئەوانە، کە بەڵێ کوشتنی ڕێبەرانی بەحەقی ئینسان ناحەقتر لە ناحەققە واتە لە سەرووی هەموو ناحەقێکە. بۆ زێدە زانین سەیری «تفسیر کبیر» کەن لە باسی ئەو ئایەتەدا.



دووبارە دڵ هەست بەو ئیشکالە دەکا دە ئایەتی «و یقتلون النبي» کە «الف و لام»ی سەر «نبیین» بۆ عموم بێ، تووشی بە ڕەوا دەبین چونکە ئەوانە هەموو پێغەمبەریان نەکوشتن و تەنانەت نیوەی هەمووشیان نەکوشتوون، ڕەنگە دوو سێیەکیان کوشتبن. دەبێ بۆ ڕەد و وڵامی

ئەو ئیشکالە ڕوو دە کویێ کەین؟ ناتوانین بۆ چارە سەری ئەو ئیشکالە لەو ڕێیە زیاتر بگرینە بەر: ئەو «الف و لام»ە بۆ ئەوەی دە دەڵماندا دەبێ نەک بۆ «ئیستغراق» واتە عموم. یا دەبێ بڵێین: «مَن قَتَلَ نَفساً بِغَیرِ نَفسٍ فَکَأَنَّما قَتَلَ النّاسَ جَمیعاً».

دووبارە لە ئایەتی ﴿وَيَقْتُلُونَ الَّذِينَ يَأْمُرُونَ بِالْقِسْطِ مِنَ النَّاسِ﴾ ئەو ئیشکالە بەرۆکمان دەگرێ: هێندێک لە قارییەکان کەلیمەی «یقتلون»یان بە «یقاتلون» خوێندۆتەوە، جا لە سەر خوێندنەوەی ئەو قاریانە (حمزە) دەبێ ئەو پێغەمبەرانە دە شەڕدا کوژرابن نەک بەبێ شەڕ کوشتبیانن. چونکە کەلیمەی «یقاتلون» بۆ موشارەکەتە، ئەودەم تاوان وەک تاوانی «بغیر الحق» نابێ.

وڵام بۆ ئەو ئیشکالە دەبێ ئاوا بدرێتەوە: لە هەوەڵەوە پێغەمبەرەکان بەبێ شەڕ دەکوژران، پاشان کە دوژمنانیان دەهاتن بۆ کوشتنیان دەستیان دانەنواندووە بەڵکە بەرەنگاریان بوونەوە و کوژراون.

و هەروا ئەو ئایەتە ئەگەر بە وردی لێی ورد بینەوە بەتایبەت لە جوملەی ﴿وَيَقْتُلُونَ الَّذِينَ يَأْمُرُونَ بِالْقِسْطِ مِنَ النَّاسِ﴾ واتە ئەو کەسانەی دەکوژن ئەوانەی بە چاکە ئەمر دەکەن و نەهی لە خراپە دەکەن، بەشیان عەزابی پڕ ئێش و ژانە، ئەوەمان پێ دەڵێ: ئەوانەی دەستوور بە چاکە دەدەن و بەرگری لە خەراپە دەکەن و ئەمری پێ دەدەن پلە و پایەیان دە پلە و پایەی پێغەمبەراندایە؛ وەک حەسەنی بەسری ئاماژەی وەلا فەرموو و هەروا یەکێکیش لە یارانی پێغەمبەر لە حزووری پێغەمبەری بڵیند دەبێ و دەڵێ: کامە جیهاد و تێکۆشانە بەڕێزترە لە لای خودا؟ حەزرەتی ڕەسووڵ لە وڵامیدا فەرمووی: «أَفضَلُ الْجِهادِ کَلِمَةُ حَقٍّ عِندَ سُلطانٍ جائِرٍ» واتە بەرز و بەڕێزتر جیهاد قسەی حەقە لە کن پادشای خاوەن زۆر. ئەو گوفتارە بەجێ و ڕەوایە ئەوەمان تێدەگەیێنێ کە گەورەترین جیهاد لە سەر دین و حەق کردنەوە و هەڵدانە بەتایبەت لە حزووری زاڵمان، چونکە ئەو شێوە ڕەفتارە شێوەی ڕەفتاری پێغەمبەرانە جا لە سەر ئەو ئەساسە ڕەوایە بکوترێ پلە و پایەی کەسانی حەقبێژ و ڕاستوێژ دە خەتی پلە و پایەی پێغەمبەراندایە.

بە کوردی و بە کورتی: ترساندنی پێغەمبەر و چاکەکوژان بە عەزاب و دەرد و ڕەنجی قیامەت جێنشینی موژدەی چاکەکارانە بە نیعمەتی ڕۆژی قیامەت وەک ئایەتی ٢٥ی بەقەرە ئاماژەی وەلا فەرمووە:

وَبَشِّرِ الَّذِين آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ

**مزگێنی بدەن بەو کەسانەی بڕوا و ئیمانیان هێناوە و کارە چاکەکانیان ئەنجام داوە، بە باغاتێک کە لە ژێریاندا چۆم و ڕووبار دەڕوا.**

**تیوتیوەی سیمای ئایەتی ۲۱ی ئالی عیمران:**

ڕیوایەت کـراوە لە لایەن بەیهەقیـیەوە لە نـاو کتێبـی «شـعب الایـمان» ئەویـش لە ئیبنـی عەباسەوە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: سەختترین و بەژانترین عەزاب بۆ کەسانێکە کە پێغەمبەری کوشتبن یا بە دەستی پێغەمبەرێ کوژرابێ. لە سەر ئەساسـی ئەو ڕیـوایەتە وا دەردەکەوێ کە لە نێو ئۆمەتی دەورانـی پێغەمـبەر بە ئـێش و ژان و ئـۆفترین عەزاب وەبەر ئـۆبەی ئیبنـی خەلەف دەکەوێ چونکە ئەو بە هـۆی برینـی شمشـێری حەزرەتـی ڕەسـووڵ گیـانی لە دەس دا. پـاش عەزابـی ئەو، عەزابـی ئەبـوجەهلە، پـاش ئەو دوو کەسـانە بـۆو کەسـانەی عەزابـی بەژان کە عولەمایانی ڕاست و بەحەق دەکوژن.

زانایانی ئایینی ئەو ئایەتە دەکەن بە دەلیل و بەڵگە لە سەر ئەوەی ئەمر بە چـاکە و نەهـی لە خراپە هەر وەک لە سەر ئۆمەتی ئیسلام بە فەڕز گەڕاوە، لە سەر ئۆمەتانی پێش ئیسـلامیش هەر واجب بووە. چونکە لە ئەساسدا ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە هەدەف و ئامـانجی ڕیسـالەتی پێغەمـبەرانە، جـا خـۆی ئەوەش ڕوون و ئاشـکرایە کە ئەساسـی ئۆمەتـایەتی ئەوەیە کە شـوێن کەوتووانی پێغەمبەران ئادابی وان کە ئەمر بە چاکەیە و نەهی لە خراپەیە، وەخۆ بگرن.

حەدیسی مورسەلە لە حەسەن بەسری نەقڵ کراوە کە پێغەمـبەرﷺ فەرمـوویەتی: «مَـن أَمَـرَ بِالْمَعروفِ وَ نَهَیٰ عَنِ الْمُنْکَرِ فَهوَ خَلیفَةُ اللـهِ تَعـالیٰ وَ خَلیفَـةُ رَسـولِهِ وَ خَلیفَـةُ کِتابِـهِ»، واتە: ئەمرکەر بە چاکە و نەهیکەر لە خراپە هەم خەلیفەی خودایە و هەم خەلیفەی پێغەمبەرەکەیەتـی و هەم خەلیفەی کتێبی خودایە. (روح المعانی، ج ۴/ ۳۲۶؛ تفسیر کبیر، ج ۱۷۹/۸)

دەبێ ئەوەش بزاندرێ: ئەو ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە یەک شێوە نییە بەڵکە شـێوەهای جۆراوجۆری هەیە، وەک وێژەرانی دینی دەرسبێژانی دینـی بەتـایبەتی دەرسبێـژان بە تەواوی. شارەزاکەرانی ڕێگای حەق، نووسەرانی دینی بەتایبەتی و گشتی و هەروا ... ئەوانە هەموویـان لە مەقامی خەلیفەتولڵاهی و خەلافەتی ڕەسوولەڵڵادا قەراریان گرتووە.

گۆیا لە پێغەمـبەر پرسـیار کـراوە: کـێ لە هەمـوو کەس زیـاتر نـزیکە لە مەقـامی خـودا؟ پێغەمبەرﷺ لە وڵامدا فەرموویەتی ئەو کەسەی خاوەنی ئەو سێ سیفەتە بێ: ۱. ئەمر بە چـاکە و نەهی لە خراپە ۲. پەرهیزگار ۳. خاوەن بەزە و ڕەحم.

گۆیا پێغەمبەر فەرموویەتی: ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە لە سێ ڕێگاوەیە: ١. بە دەست ٢. بە زمان ٣. بە دەروون و دڵ. نەقلە لە موسلم لە سەحیحەوە لە ئەبووسەعیدەوە. ج ١ ٧٥ ژ ٤٩.

سەیر کە و وەریگرە:

١. ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپەی بەشی دەست، ئەرکی شاهان و حاکمان و ئەمیرانی ئیسلامە کە بە توانان بۆ بەڕێوە بردنی ئەو حوکمە

٢. بەشی زمانیش وەزیفە و ئەرکی زانایانی ئایینییە واتە عولەما.

٣. بەشی دڵ و دەروون ئەرک و وەزیفەی هەموو خاوەن دڵێکە.

گۆیا یەکێک لە پێغەمبەری پرسیار کرد: «أَيُّ الْجِهادِ أَفضَلُ؟» واتە کامە جیهادە بەرزترە؟ پێغەمبەرﷺ لە وڵامیدا فەرمووی: « أَفضَلُ الْجِهادِ كَلِمَةُ حَقٍّ عِندَ سُلطانٍ جائِرٍ» (تبيين الفرقان، ج٣/٥٥٨)

**پوختەی مەبەست:**

پایە و ئەساسی ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە لێک هەڵاوێر و جوداکەرەوەی ئیماندار و مونافقە، بە پێی ئایەتەکانی ٦٧ی تەوبە، ٧١ی تەوبە، دەگەڵمان بن تاکوو بەیانی ئەو دوو ئایەتە دەکەم:

**الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ بَعْضُهُم مِّن بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ نَسُواْ اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٦٧﴾ توبة**

**پیاو و ژنە دووڕوویەکان هەروەک وان، فەرمان دەدەن بە نالەباری و خراپە، دەبن بە تەگەرە لە ڕێگای چاکەدا، دەستیشیان دەقووچێنن لە ڕاست بەخشش و پیاوەتی، خوداشیان لە بیری خۆیان بردبۆوە و خوداش ئەوانی وە پاش گوێ دا، دە واقیعدا هەر ئەو دووڕوویانەن لە ڕێی حەق دەرچوون.**

**وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَـئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ توبة**

**پیاوان و ژنانی خاوەن ئیمان هەندێکیان سەرپەرشت وپاڵپشتی هەندێکیانن، فەرمان بە چاکە**

**دەدەن و بەرگری لە خراپە دەکەن، نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن، گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەری خوداشن، ئەوانە بێ گومان خودا ڕەحمیان پێ دەکا، بێ گومان خودا زاڵ و کاربەجێیە.**

دیارە حاشای لێ ناکرێ کە ئەو دوو ئایەتە بەڵگەن لە سەر ئەوەی: ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە، ئەوپەڕی ئەخلاق و سیفاتی بەرزی خاوەن ئیمانانن.

**سێ سیفەتی ناحەزی یەهوودییەکان دە ئایەتی ٢٢دا:**

١. بە درۆ دانانی ئایاتی قورئان

٢. کوشتنی پێغەمبەران بە ناحەق

٣. کوشتنی شوێنکەوتووانی پێغەمبەران.

بۆوەی زۆر لە مەبەست دوو نەکەوین دەچینە خزمەت ئایەتەکانی ٢٢ و ٢٣ی ئالی عیمران:

**أُولَـئِكَ الَّذِينَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ ﴿٢٢﴾**

**ئەوانە ئەو کەسانەن کە لە دنیا و لە پاشەڕۆژدا کردەوەکانیان پووچەڵ دەبێ و لە لایەن هیچ کەسیشەوە یارمەتی و پشتگیری ناکرێن.**

ئەو ئایەتە نیشاندەری حاڵی پێغەمبەرکوژان و ئەوانەن کە ئایاتی خودا بە درۆ دەزانن دە دنیا و ئاخرەتدا.

ئەوجار خودای تەعالا بە وەسیلەی ئایەتی ٢٣ هۆی سەرپێچی و حەسوودی و ئینکاری یەهوود بەیان دەکا و ڕایدەگەیێنێ:

**أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوْتُواْ نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَى كِتَابِ اللّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾**

**ئایا سەرت لەو کەسانە سووڕ نامێنێ بەشێکیان لە کتێبی خودا پێدراوە، بانگ دەکرێن بۆ کتێبی خودا هەتاکوو لە نێوانیاندا بڕیار بدا، لە پاشان دەستەیەک لەوان پشت هەڵدەکەن؛ ئەوانە هەر پیشەیان ڕوو وەرگێڕانە.**

**ئاوڕ دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر سیما و ناوەرۆکی ئایەتی ٢٣:**

تێکەڵاویی ئەو دوو ئایەتی ٢٢ و ٢٣ پێکەوە: خودای تەعالا بە وەسیلەی ئایەتی ٢٢ پێغەمبەری لە دوژمنایەتی یەهوود و نەسارا ئاگادار کردەوە، و لە ئایەتی ٢٣دا پێغەمبەری لە

نیهایەتی حەسادەت و کینە و دوژمنیی یەهوود ئاگادار دەکاتەوە.

هۆی دابەزینی ئایەتی ۲۳ چەند شتێکی تایبەتی پێوە دیارە، بۆ بەیانی ئەو چەند شتە تایبەتانە دەگەڵمان بن:

۱. یەکێک لەو شتانەی کە گۆیا هۆی دابەزینی ئەو ئایەتی ۲۳ی ئالی عیمرانە، دەبێ ئەوە بێ لە لایەن هەندێک لە قورئانزانان لە سەر ئەساسی ڕیوایەتی ئیبنی عەباسەوە: گۆیا ژن و پیاوێکی ناودار و مەقبووڵی خاوەن ڕەگەز و نەسەبێکی بەرز و بەڕێزی یەهوود تووشی زینا دەبن دەگەڵ یەک و دیارە جەزا و سزای ئەو سەردەمی بە پێی حوکمی تەورات ڕەجم واتە سەنگەسار و سەنگباران بووە، وەک یاسای ئیسلام، دەگەڵ ئەو فەرقەیان: ڕەجمی تەورات بۆ ژندار و بێژن هەر یەکە، کە سەنگبارانە، ەبڵام دە یاسای ئیسلامدا بۆ ژنداران حوکمەمە ڕەجمە نەک بۆ بێژن. کاتێ خەبەری ئەو کارە ناڕەوایە پەرە دەستێنێ و بڵاو دەبێتەوە دە ناو عالەمدا. ئەو پیاو و ژنە و تایفەکانیان بۆ بەرگری لە ئابڕوو چوونیان دەکەونە حەولی چارەسازی کە چۆن چارەی کەن؟ جا لە بەر ئەوەی کارەکەیان سەر وە مەزەب و ئایینە، خۆ داوێنە لای ئایینزانانی ئەو سەردەمی بۆ چارەی کاریان، وەک ئێستێش هەر ئاوا چاو دەکرێ بۆ چاری کاری ئایینی پانا دەبرێتە بەر شەرعزانان و لە ئایین حاڵییان.

عالمەکانی یەهوودی یاسازان کە خەبەردار دەکرێن بۆ چارەی کار و داپۆشینی قەباحەت و خەفەکردن و پووش بە سەر کردنی ئەو دەنگۆیە، دەگەڵ یەک کۆ دەبەستن و بڕیار دەدەن بەم شێوەیە: چونکە ئەو ژن و پیاوە لە ناوداران و ماقووڵانی هۆزی ئەو سەردەمن ئەگەر ڕەجم بکرێن ئابڕووی ئەو هۆزە دەچێ لە ناو عالەمدا، کەوایە دەبێ چاوپۆشی لە ڕەجمیان بکرێ. ئەوە بەرهەمی کۆبوونەوەکەیان بوو، بەڵام لەو لایەشەوە دەیانزانی بەبێ نەزەردانی پێغەمبەر ئەو کارەیان بۆ ناچێتە سەر، ناچارن پێغەمبەر خەبەردار کەن لەو بارەوە. جا لە سەر ئەو ئەساس و باوەڕە هاتنە خزمەت حەزرەتی ڕەسووڵ و واقیعەکەیان بە تەواوی و تێروتەسەلی بە قازانجی خۆیان بۆ پێغەمبەر بەیان کرد. پێغەمبەریش لە وڵامیاندا فەرمووی: جا زۆر چاکە، ئەمن چونکە ئێوە یەهوودن و کتێبیشتان تەوراتە بە حوکمی تەورات کارەکەتان چارەسەر دەکەین. خۆ ئەوەش دەزانن حوکمی زینای ئا وا ژن و پیاوی ژندار و مێردار ڕەجمە. یەهوودییەکانیش هاتن ئینکاری ئەو حوکمەیان کرد و کوتیان: دە یاسای کتێبی ئێمەی یەهوود حوکم ئاوایە: ئەو ژن و پیاوە بە ڕووڕەشی بەرەو پشت سواری وڵاغی کرێن و دە ناو شاردا بیانگێڕن تاکوو هەموو

عالەم چاویان کەن، ئابڕووی دنیایان بچێ. ئەدەوەیدا عەبدوڵڵا کوڕی سەلام ئیمانی جۆشا و ڕەحەوا کەوت و فەرمووی: عولەمایانی یەهوود درۆیە دەکەن کە دەڵێن حوکمی تەورات ئاوایە. ئەمن تەوراتێ دەزانم و چاکیش دەزانم، حوکمی ئەوانە بە پێی یاسای تەورات ڕەجمە و لە ڕەجم زیاتر نییە. ئەدێرەدا حەزرەتی ڕەسووڵ دەستووری دا کە بۆ ڕوون بوونەوەی کار تەورات بێنن و لە بەرچاوی هەموویان زەینێ دەنێ و تەماشای کەن. بەو پێیە عەبدوڵڵا کوڕی صوریا کە چاوێکیشی کوێر بوو زاناترینی هەمان بوو لە تەوراتدا، تەوراتی هێنا و دەستی کرد بە خوێندنەوەی و دەگەڵکوو گەیشتە ئایەتی زیناکاران، دەستی خستە سەر ئایەتەکە و داپۆشی و چەند ئایەت لەولاترەوەی خوێندەوە. حەزرەتی ڕەسووڵیش چونکە تەورات واتە زمانی عیبرانی ئاشنا نەبوو، هەستی بە فێڵەکە نەکرد. بەڵام عەبدوڵڵا کوڕی سەلام کە تەورات‌زان بوو فەورەن هەستی بە هەموو لایەک کرد و ڕەحەوا کەوت و هاواری کرد و کوتی: یا پێغەمبەر! ئەو کابرایە ئایەتی زینای خستە ژێر دەست و شاردیەوە و ئاشکرای نەکرد. حەزرەتی ڕەسووڵ فەرمووی ئەتۆ وەیخوێنە! عەبدوڵڵا کوڕی سەلام ئایەتەکەی خوێندەوە لە بەرچاوی ئەهلی مەجلیسەکە. ئەوکات هەموویان تێگەیین لە تەورات و لە فێڵی وان و لە حوکمی زینا کە ڕەجمە. جا پێغەمبەر دەستووری ڕەجمی دان و ڕەجمیان کردن و یەهوودییەکان بە دڵ ناڕەحەتی مانەوە. هۆی نازڵبوونی ئەو ئایەتە ئەوە بووە. (تبيين الفرقان ج٥، هەمان ئایەت)

٢. دووهەمین هۆی دابەزینی ئایەتی ٢٣ی ئالی عیمران ئەوەیە:

عەبدوڵڵا کوڕی عەباس فەرموویەتی: ڕۆژێ پێغەمبەر دەگەڵ چەند نەفەر لە لایانی دەچێتە قوتابخانەی جوولەکەکان، لەسەر ئەساسی داب و باوی ئەخلاقی مبارەکی خۆی بانگیان دەکا و شارەزای ڕێی ڕاستیان دەکا. ئەوانیش لە وڵامی پێغەمبەردا پێی دەڵێن ئەتۆ بۆخۆت لە سەر کام دین و ئایینی؟! پێغەمبەریش دەفەرموێ: ئەمن لە سەر ئایینی ئیبراهیمم. یەهوودییەکانیش دەڵێن: جا خۆ ئیبراهیم یەهوودی بووە، ئەگەر ئەتۆ بە واقیعی لە سەر دینی ئیبراهیمی، ئێمەش لە سەر دینی ئیبراهیمین، دەیجا دینی تۆ و دینی مە هەر یەکێکە. بۆ قبووڵی ناکەی ئایینی ئێمەی یەهوود!؟ پێغەمبەر لە وڵامیاندا دەفەرموێ: ئەوەی ئێوە دەیڵێن ئەگەر ڕاستە و پێتان وایە ئیبراهیم یەهوودی بووە، دە بڕۆن تەورات بێنن تا تەماشای کەین و یەهوودییەتی ئیبراهیم وەدۆزین دەوێدا و سابتی کەین. ئەودەم حەقوو دەکەوێتە دەست و کەس ڕێگای حاشای بۆ نامێنێتەوە. ئەمما ئەوان چونکە دەیانزانی ئیبراهیم یەهوودی نەبووە لەو دەستوورەی

پێغەمبەر سەرپێچییان کرد و ئینکاریان کرد. دووبارە پێغەمبەر بۆ ئیسباتی قسەی خۆی و بە سبووت گەیاندنی درۆی وان فەرمووی: ئیبراهیم و سحوفی کتێبی ئەو نزیکەی هەزار ساڵ پێش مووسای پێغەمبەر و تەوراتی کتێبی ئەو بووە. ئێوە بە چ بەڵگە و دەلیلێک دەڵێن ئیبراهیم یەهوودی بووە؟ یەهوودییەکان ئەوجار شەرمەزار دەبن و بێ وڵام دادەمێنن. لە سەر ئەو ئەساسە بۆ تەسکینی دڵی پێغەمبەر و هەر وا بەڵگەش لە سەر یەهوودی نەبوونی ئیبراهیم ئایەتی ٦٧ی ئالی عیمران سەیر کە:

**مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلاَ نَصْرَانِيًّا وَلَكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ**

**ئیبراهیم نە جوولەکە بووە و نە گاور. بەڵکە موسوڵمان و حەقپەرست بووە، لە هاوەڵدانەرانیش نەبووە.**

٣. سێهەمین هۆی دابەزینی ئایەتی ٢٣ی ئالی عیمران گۆیا ئەوەیە لە لایەن هەندێک لە قورئانزانان: نیشانەی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی محەمەدﷺ دە ناو تەوراتدا بەیان کرابوو و هەبوو، هەر بۆیەش بوو پێغەمبەر لە کاتی دەعوەتی یەهوودییەکان بۆ لای ئایینی ئیسلام، پێی کوتن قەزاوەت و حوکمی ئێمە و ئێوە **تەوراتە،** چونکە دە تەوراتدا باسی من و پێغەمبەرایەتیی من دیاری کراوە و حاشا هەڵنەگرە، و هەروا دەستوور بە ئێوەش دراوە لە تەوراتدا کە ئیمان بە ئاخرین پێغەمبەر کە محەمەدە، بێنن. جا ئێوە ئەگەر ڕاستن لە باوەڕتان و ئیمانتان بە تەورات، واجبە لە سەرتان بێنە سەر خەتی ئیسلام، بۆ ئیقناع بوون و باوەڕتان بڕۆن تەورات بێنن تاکوو بە ئاشکرایی حەقتان لێ دەرکەوێ. دووبارە یەهوودییەکان قانیع نەبوون لە بەر حەسادەت و جەهالەتیان ئینکاریان کرد و ئیمانیان نەهێنا. (تفسیر قرطبی، ج ۵/۴)

هەر سێ هۆ بۆ وەی دەبێ دروست بن و باوەڕیان پێ بکرێ بەڵام هۆی هەوەڵیان دڵگرتر دێتە بەر چاوان.



## سووکە ئاوڕێک بە سیلەی چاوی دڵ وەلای ڕازی ڕازاوەی ناو ئایەتی ۲۳ی ئالی عیمران

وا دیارە خودای خاوەن حیکمەت ئەو ئایەتە بۆ شاهیدی ل ەسەر لاساری ئەو گەلی بێباوەڕی یەهوود دێنێتەوە تاکوو بە دنیایان بناسێنێ کە ئەو ئەهلە کتێبانە (یەهوود) وەک بۆخۆیان دەیڵێن ئاوا تەسلیمی فەرمانی خودا نەبوون، بەو دەلیلە ئەوانە کاتێ لە لایەن پێغەمبەرەوە دەعوەت کران کە هەر بە کتێبی خۆیان کە تەوراتە، ڕازی بن و مل بدەن و قەزاوەت

بکرێ، هەستان ئینکاریان کرد و بە ئاشکرایی دەرچوون لە ژێر ئەو قەزاوەتە بە هۆی غـوروور و کینە و حەسادەتیان. ئەوەش بە خاتری بیر و باوەڕێکی بێ بنەما و خەیاڵاتێکی پووچ وەک ئەوە دەیانکوت: ﴿لَن تَمَسَّنَا النَّـارُ إِلاَّ أَيَّامًـا مَّعْـدُودَاتٍ﴾ واتە ئەوانە وایـان خەیـاڵە ئـاوری دۆزەخ کارمان تێناکا مەگەر چەند ڕۆژێکی ژمێردراو.

ئەو خەیاڵەشیان بێ بەڵگە و دەلیل تەنیا جاهیلانە تەوهینیان بە مەقامی خودا دەکرد و جێی سرنجە و دڵ بەرەو خۆی ڕادەکێشێ: خودا کە بۆخۆی دەفەرمـوێ: ئەوانەی کە بەهرەیەکیـان لە کتێبی ئاسمانی وەک تەورات بێ، بە دەست هێناوە، یانی ئەوانە ئەوەنـدەی لە تەوراتـدا زەرەری بۆ نیازی چەپەڵیان نییە وەریانگرتووە، جا ئەو هەڵس‌وکەوتەیان خودا ئاشـکرا دەکـا تـاکوو هەم دنیا و هەم ئەوان تێـبگەن کە ئەسـڵی تەورات و ئینجلیـان لە نـاو بـردووە. ئەوەی بە قازانجیـان زانیوە هێشتوویانەتەوە، ئەوی دیکەیان لە ناو بردووە، بە کورتی کتێبی تەوراتی خودایان لە ناودا نەماوە، ئەوەی لە ناویاندا ماوە، گۆڕاوەکەیە.

و هەروا لە بەراورد و هەڵسەنگاندنی ئەو کەلامە پیـرۆزە ﴿لَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوْتُـواْ نَصِـيبًا مِّـنَ الْكِتَابِ﴾ ئەو هەستە بە دڵدا دێ کە سەراپای گەلی یەهوود بەشێکیان لە تەورات وەرگرتووە و بە نەسیبی خۆیان کردووە، کەچـی دە واقیعیشـدا بە وەسـیلەی ئـایەتی ١١٣ ئـالی عیمـران ئەو هەستە ڕەوایە ڕەد دەبێتەوە، جا کەوایە دەبـێ بکـوترێ، ئەو هەسـتە واتە هەمـوو یەهـوودی ئەو سەردەمی بە تەواوی بەشێکیان لە تەورات بە نسیبی خۆ کردووە و قبووڵیانە، ئەوە ئیشارە وەلای زەم و لۆمەی وانە، چونکە ١١٣ نیشان دەدا کە هەموو یەهوود لابەلا و لاسار نەبـوون. سـەیری ئایەتەکە با بکەین تاکوو ڕاستییەکەی وەدۆزین:

**لَيْسُواْ سَوَاءً مِّنْ أَهْلِ الْكِتَاب أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُـونَ آيَـاتِ اللّه آنَـاء اللَّيْـلِ وَهُـمْ يَسْـجُدُونَ ﴿١١٣﴾** ئالی عیمران

**ئەوانە هەمـوو وەک یەک نـین، هەنـدێ لە ئەهلـی کیتـاب هەن تـاقمێکی ڕێک‌وپێـک و دامەزراون، لە نیوەشەودا ئایەتەکانی خودا دەخوێننەوە و سوژدە دەبەن.**

ئایا ئێمە دەبێ چۆن باوەڕ کەین کە مەبەست لە ﴿أُوْتُواْ نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ﴾ قورئان نیـیە و غەیری قورئانە؟ بەو دەلیلە دەبێ بزانین کە مەبەست لە کیتاب لێرەدا غەیـری قورئـانە کە تەوراتە چونکە کیتاب دراوەتە پاڵ کافران کە جوولەکە و گاورەکانن. هەر بۆیەشـە حەواڵەی کتێـب بـۆ

سەر یەهوودی و گاورەکان ڕەوایە کە خۆیان بە تەورات ئیقراریان کردووە و کوتوویانە: تەورات حەقە و ڕەوانەکـراوی خـودایە. جـگە لەوانەش حـوکمی ئـایەتی ٢٣ دەرحەق بە جـوولەکە و گاورەکانە چـونکە ئەوانـن پێغەمبەرایەتیـی محمـد المصـطفایان قبـووڵ نیـیە کە دە تەورات و ئینجیلدا هاتووە و بەیان کراوە. کە دەبایە قبووڵیان بایە چـونکە دە کتێبەکەیانـدا باسـی کـراوە و تەئیید کراوە. جا لە سەر ئەو ئەساسە مەبەست لە کتیاب غەیری قورئانە. (تەفسیر کبیـر، هەمـان ئایە). دەبێ ئەوەش حاشار نەدەین ئەو یەهوودیـانەی کە بەشـێکیان لە تەورات بە نەسـیبی خـۆ کـردووە و بەشـێکیان پاشـقول داوە عالمەکانیـان بـوون واتە زانـا و خوێنـدەوارەکان، چـونکە نەخوێندەوارەکان زانا نەبوون بە هیچ لە تەورات، ئەوە نەبێ کە عالمەکان پێیـان کوتـوون، وەک هەموو دەورانێک زانا بەرپرسە، نەک نەزان.

ئەمما مەبەست لە کتیاب ﴿ يُدْعَوْنَ إِلَى كِتَابِ اللَّهِ ﴾ دوو نەزەر وە خۆ دەگرێ:

١. یەکیان لە سەر قەولی ئیبنی عەباس و حەسەن بەسری، قورئـانە؛ ئەگەر بشـکوترێ جـا چۆن کتێبێکی کە بـاوەڕ و ئیمانیـان پـێ نەبـێ، بـۆ لای دەعـوەت دەکـرێن؟ دەبـێ لە وڵامـدا بگوترێ: یەهوودییەکانی دەورانی پێغەمبەر پاش دەلیل و بەڵگە نیشاندانیان لە سەر حەقـانیەتی قورئان و پێغەمبەر بۆ لای باوەڕی بە قورئان بانگ کراون.

٢. نەزەری دووهەم کە زۆربەی قورئانزانەکان پێیـان ڕەوایە ئەوەیە کە مەبەسـت بە کیتـاب دەوێشدا هەر تەوراتە بەو بەڵگە و دەلیلانە: هۆی دابەزینی ئایەتەکە ئاماژە وەلای ئەوەی دەکا کە ئەو قەومە بۆ لای تەورات دەعوەت کراون کە کتێبی خۆیان و ئاوڕی وەسەر دەن و قبووڵی کەن بە حەکەم، کەچی خۆی لێ لا دەدەن. جگە لەوەش خودا لە سەرپێچی وان لە تەورات ئیزهاری تەعەجوب دەکا چونکە بە قەولی خۆیان باوەڕیان پێیە و باوەڕ بە ڕاستییەی دەکەن.

مانای «لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ» دەبێ چۆن تەعبیر کرێ تاکوو دوور بین لە ڕەخنە و هەڵە؟ ڕەنـگە ئەگەر ئاوا مانا بکرێ تووشی گیر و گرفت نەیەیـن تـاکوو کتێبـی تەورات لە نێوانیانـدا حـوکم بدات و بکات. دیارە قەزاوەت دان بە کتێب دەبێ لە ڕێگای مەجازی مەشووهر بێ، بەو جۆرە: کە کەلیمەی «لـیحکم» بە بینـای مەفعـوول وەخوێنـدرێ، خـاوەنێ کتێبـی کەششـاف دەڵـێ: جوملەی «لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ» ئەوەی لێ هەست دەکرێ کە دووبەرەکی لە نێو خۆیانـدایە. نەک لە نێوان وان و پێغەمبەردا. (کشاف، ج١/ ٢٤٩-٢٤٨). ئەو هەستەش لە جوملەی «وَهُم مُّعْرِضُونَ»ڕا سەرچاوە دەگرێ.

**تیوتیوە**

سەرسووڕمان و تەعەجوب دێرەدایە: ئەوان بۆ خاتری داپۆشینی قەباحەتی پیاوماقووڵی زیناکەریان پشت دە حوکمی قەزاوەتی تەوڕاتی کتێبیان دەکەن وقبووڵی ناکەن. و هەروا پێغەمبەری کە لەو بارەوە بە دادوەر دادەنێن و ئەویش هەر لە سەر ئەساسی تەورات حوکمی ڕەجم دەردەکا، پشت دەویش دەکەن و خۆ لەویش لادەدەن.

زانای پایەبەرز «ابن کثیر» ئایەتەکەی ڕوو پێ بە یەهوود و نەسارای دەکا واتە: هەر دوو یەهوود و نەسارا کە ئیدیعای قبووڵی تەوراتیان هەیە، سەرپێچییان لە حوکمەکەش کرد.

خودا کە دەفەرموێ «فَرِيقٌ مِّنْهُمْ» واتە تاقمێک لەوان، ئەوە ئیشارە وەلای ئەو ڕاستییەیە کە هەندێک لە یەهوودییان ڕوو دە حەق بوون وەک عەبدوڵڵا کوڕی سەلام. بەو دەلیلەی کە خودا دەفەرموێ لە بابەت گەلی مووساوە: لە ئالەتی ١٥٩ی ئەعرافدا:

**وَمِن قَوْمِ مُوسَى أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ**

**هەندێ لە هۆزەکەی مووسا گەلێکن کە خەڵکی ڕێنوێنی دەکەن بۆ ڕێگای ڕاست، هەر بە هەق و ڕاستەقینەش داوەری دەکەن.**

دڵ دەیهەوێ بزانێ ڕوو وەرگێڕانی یەهوودی و نەسارا لە قورئان و بانگێشتنی پێغەمبەر ئایا هەر لە بەر حەسادەت و جەهل و نەزانییانەوەیە؟ یان هیوا و ئومێدێکی دیکەشیان هەیە بێجگە لە لاساری و سەرەڕۆیی؟ جا بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە پڕ لە هەستە دەبێ ڕوو بکەینە ئایەتی ٢٤ی ئالی عیمران:

**ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلاَّ أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾**

**ئەوەش یەهوودی کە ڕوو لە حەق وەردەگێڕن، هۆیەکەی هەر ئەوەیە کە دەڵێن چەند ڕۆژێکی کەم نەبێ ئاگر دە لەشمان بەر نابێت، ئەگەر تاوان و خەتاشمان هەبێ، ئەو درۆیەشیان بوو بە هۆی لەخۆباییبوونیان لەناو ئایینەکەیاندا.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوەیەکی ئایەتی ٢٤**

ئەو ڕوو وەرگێڕانەی یەهوودییەکان لە یاسای تەورات هۆیەکەی ئەوە بوو کە ئەوان

دەیانکوت و وایان خەیاڵ دەکرد کە ئاگری دۆزەخ دە لەشمان بەر نابێ و نامانسووتێنێ، بێجگە لە چەند ڕۆژێکی ژمێردراو. کە ئەو چەند ڕۆژەش ئەو چل ڕۆژەیە کە جوولەکەکان لە کاتێ کە مووسا چوو بۆ ملاقاتی خودا لە کێوی توور، ئەوانیش ڕوویان کردە گوێرەکە پەرستن، و جگە لەوەش جوولەکە چونکە خۆیان بە نەوەی حەزرەتی یەعقووب دەزانن، بە لایانەوە وایە کە ئەوەندەیان بەسە بۆ ڕزگار بوونیان لە عەزاب و ئێش و ئازاری ڕۆژی قیامەت. جا لە بەر ئەوە بە هەڵە چوون کە لە هەڕەشە و گوڕەشەی ئایین و پێغەمبەر و ئایاتی قورئان ناترسن و بێباکن، ڕوو دەکەنە هەموو تاوانێک و ناپرینگێنەوە. دیارە ئەو یاخیبوونە و نەپرینگانەوەی جوولەکەکان لە تاوان و خەتا لە پێشیشدا هەر بووە و تاکوو سەری کێشایە ناو گاورانیش. هەر وەک ئەوڕۆ لە دنیای ئیسلامیشدا زۆر هەن لە موسوڵمانانی ساو و کاڵ و بێئاگا، لایان وایە هەر گوناهێکی بیکەن سبەینێ بە تکای شێخ و مەلا و سەید و پیاوچاکان و یا ئیسقات و تەهلیلە و زیارەت کردنی دار و بەرد ڕزگاریان دەبێ و بۆیان نایەتە ژمار و حیساب. جا ئەی هەست و شعوور و ئەقڵ کە ئێوەن ئامراز و وەسیلەی دەرکی حەق، ئەگەر ئەوانە وا بن وەک جوولەکە و موسوڵمانی کاڵ گرتوو یانەتە بەر، ئەدی ئەو دنیایە و ئەو پێغەمبەرانە و ئەو کتێبە ئاسمانییانە بۆ هاتوونە گۆڕ؟ و ئەو هەڕەشانەی کە بە هۆی ئەو ئایەتە قورسانە لە قورئانا بۆ ڕەوانە کراون و دابەزیون؟ کەوایە دەرگای تاوان و گوناه دەبێ هەمووی داخرابێ لە بەرەی ئینسان؟ و ئایەتی:

**فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ ﴿٨﴾ زلزلة**
**هەر کەسێک بە قەد هەرە وردیلەیەک چاکە بکا دەیبینێتەوە، و هەر کەسێک بە قەد هەرە وردیلەیەک خراپە بکا، دەیبینێتەوە.**

جا هەر کەس لە سەر ئەساسی ئەو ئایەتە نەجووڵێتەوە لە ڕۆژی خۆیدا بە یاخی دەژمێردرێ چونکە خۆی فریو داوە و دوای کڵاوی خوار کەوتووە و درۆی بە زاری خودا و قورئان و پێغەمبەرەوە کردوە. وەکوو خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم لە سووڕەی ئالی عیمران ئایەتی ۲۴دا فەرموویەتی: ﴿وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾ واتە ئەو درۆیەش کە هەڵیانبەست، بوو بە هۆی لەخۆباییبوونیان لە ناو ئایینەکەیاندا.

و هەروا دیارە ئەو جوولەکانە فریویان خواردووە بە خەیاڵ و قسەی پڕوپووچ وەک ئاماژە وەلای قسەی پڕوپووچی جوولەکەکان دەکا خودا بە وەسیلەی ئایەتی ۱۸ی مائیدە:

**وَقَالَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى نَحْنُ أَبْنَاء اللّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ يَغْفِرُ لِمَن يَشَاء وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاء وَلِلّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ**

**یەهوود و نەسارا کوتیان: ئێمە کوڕان و دۆستانی خودیان، ئەی محەمەد! بڵێ پێیان: ئەدی ئەگەر وایە، بۆ بە هۆی گوناحەکانتانەوە سزاتان دەدا؟ نەخێر، وا نییە (وەک ئێوە دەیڵێن)، بەڵکوو ئێوەش هەر مرۆڤێکن لەوانەی خودا دروستی کردوون، خۆش دەبێ لەو کەسەی بیهەوێ، و سزای ئەوەش دەدا کە خۆی وازی لە سەر بێ، ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەوی و نێوانیاندایە، مڵکی خودایە، گەڕانەوەش هەر تەنیا بەرەو لای ئەوە.**

بێ گومان خەیاڵ و بیر ئەگەر لە سەر ئەساسی ئەقڵ و شعوور و هەستی پاک نەبێ، لاڕێت دەکا وەکوو ئەو جوولەکە و نەسارایانەی باسن کردن کە یەهوودییەکان **عوزەیر**یان بە کوڕی خودا دەزانی، نەساراکانیش **عیسا**یان بە کوڕی خودا دەزانی.

درۆی جوولەکەکان بۆ زۆریان ببوە ئەقیدە و باوەڕ، هەر وەک درۆ ئەگەر زۆر هات و چوو و زارەوزاری پێ کرا، وردەوردە بۆ زۆربەی عالەم دەبێتە ئەقیدە و باوەڕ، هەروەک ئێستێ ئێمە گرفتاری درۆی ڕابردوانین لە هەندێک بابەت و مەسائیلدا، هەرچەند حەول و تێکۆشان دەدرێ چارەسەر ناکرێ و ماریجەی نایە چونکە بۆتە ئەقیدە و باوەڕ، شتیش ئەگەر گەڕا بە ئەقیدە و باوەڕ، تازە ڕێگا چارەی نامێنێ.

بە هەر حاڵ کاتێ بە سبووت گەیی کە بێباوەڕەکانی یەهوود و نەسارا لە سەر نیەت و باوڕەی پووچیان وەلا ناکەون، خودای تەعالا دەیانداتە بەر شاڵاو و هێرشی هەڕەشەی عەزاب. هەر وەک دە ئایەتی ٢٥ی ئالی عیمراندا ئیشارەی وەلا کراوە:

**فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَاهُمْ لِيَوْمٍ لاَّ رَيْبَ فِيهِ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ** ﴿٢٥﴾ ئالی عیمران

**دەبێ حاڵیان چۆن بێت کاتێک تێکڕا کۆیان دەکەینەوە، بۆ ئەو ڕۆژەی کە هیچ گومان دە هاتنیدا نییە، هەر کەس کارێکی کردبێت، پاداش یا سزای دە مستی دەندرێت، بە هیچ جۆرێک ستەمیشیان لێ ناکرێت.**

## ئاوڕ وەسەر دانەوەیەک وەسەر ئایەتی ٢٥

دڵ دەڵێ ئەو کاتەی کە وەخڕیان دەکەنەوە بۆ لێپرسینەوەیان لە بابەت ئاکار و کردار و

باوەڕیان، دەبێ حاڵیان چۆن بێ؟ کە دیارە گومانیش دە هاتنی ئەو ڕۆژەدا نییە و گومان دەوەشدا نییە پاداشی هەموو کەس بە گوێرەی کردەوە و نیەت و باوەڕەی دەدرێتەوە، و هیچ چەشنە ستەمێک لە هیچ کەس ناکرێ.

دیارە وەک ئاشکرا و ڕوونە ئەو ئایەتە هەڕەشەیەکی توند و سەختە لە سەر ئەهلی کیتاب وەک جوولەکە و گاورەکان بن، چونکە خودای تەعالا جگە لەوەی لە سەر تەواوی ئیهانەتەکانیان و باوەڕی پووچیان مۆری باتڵیان لێ دەدا، دەشفەرموێ پێیان: ئەگەر لە قبووڵ کردنی حەق سەر وەلا دەدەن و خۆ بادەدەن، ئەدی دەو ڕۆژە سەخت و گرانەی کە دە ڕێدایە و دێ بەرەو پیرتان، چ دەکەن و چۆن وڵام دەدەنەوە لە دیوانی خودادا؟ خۆشی بێگومانە جەزای هەچی ئەعمالە دەدرێتەوە بە گوێرەی کردار و نیەت و باوەڕ!

ئەگەر هات و کابرایەکی نەحوزان پەیدا بوو و بەرۆکی گرتی کوتی: «یوم» زەرفی «جمعناهم»ە، دیارە بۆ وشەی زەرفیش پیتی «ف» دەکار دەکرێ نە پیتی «ل»، کەوایە بۆ نەکوتراوە «فی یَومٍ»، کوتراوە: «لِیَومٍ»؟!

جا بۆ ڕزگاری لە دەس ئەو ڕەخنە نەحوییەی نەحوزانەکان، دەبێ ئاوا بگوترێ: ئەگەرچی لام، بە زۆری دە مەقامی تەعلیل و تەمەلوکدا بە کار دێندرێ، بەڵام واش هەیە جاروبار دە مەقامی زەرفیشدا دە کار دەکرێ، وەک ئەو ئایەتە ﴿لِيَوْمٍ لاَّ رَيْبَ فِيهِ﴾. «جمعناهم» بە مەجاز لە موحاسەبەی ڕۆژی حیساب بێ، جا لە سەر ئەو باوەڕە ئەگەر پیتی «ف» هاتبایە، جەمعی نەدەگەیاند بەڵکە هەر زەرفیەتی دەگەیاند، ئەمما پێش «لام» بۆ بەروبوو و مجازاتی ڕۆژی قیامەت دەس دەدا و شارەزامان دەکا، ئەودەم مانای ئایەتی «فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَاهُمْ لحسابِ يَوْمٍ» (تفسیر کبیر، ج٧/ ٢٣٤).

دە جوملەی «لا ریب فیه»دا هەست بەو ئیشکالە دەکرێ: نەفی گشتی لە «ریب»ە، واتە لە شک لە مەڕ داهاتنی ڕۆژی قیامەت، دە حاڵێکدا زۆر لە کافرانی بێباوەڕ لایان وایە هاتنی ئەو ڕۆژە دە شکدایە، ئەودەم ئەو خەیاڵەی کافران دەگەڵ ئەو نەفیە گشتییە یەکتر ناگرنەوە، چار بۆ چارەی ئەو ڕەخنەیە دەبێ چ بێ؟

چارە ئەوەیە: دەبێ ئاوای بۆ بچین: ئەو جوملەیەی «لا ریب فیە» دوو نەفیە، یەک نەفی شکە لە زات و نەفسی شت، دووهەم، نەفی شکە لە موتەعەللەقاتی شت، واتە ئەجزای شتەکە. جا لەسەر ئەو شێوە تەعبیراتە دەبێ بکوترێ: دێرەدا نەفی لە «ریب» واتە لە شک بە حیسابی

زات و نەفسی ڕۆژی قیامەتە، یانی هاتنی ڕۆژی قیامەت بێ شک و گومانە و بە حەتمی دێ، ئەمما ئەوە کە بێباوەڕە کافرەکان شکیان دە هاتنیدا هەیە، قسوور لە خۆیانەوەیە نە لە واقیعیەتی کار. بە کوردی شک دە هاتنی ڕۆژی قیامەتدا نییە، شک و گومانی کافران ناتوانێ ئە واقیعیەتەی لە خەتی خۆی لادا. (بڕوانە کتێبی بحر المحیط، ج٢/ ٤١٨)

جوملەی ﴿وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ﴾ واتە هەچی نەفسە بە سەواب و سزای کردەوەی خۆی دەگا. ﴿وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ﴾ واتە زوڵم لە کەس ناکرێ، کێ خاوەنی سەواب بێ لێی کەم ناکرێ، و کێ شایانی عەزاب بێ، لێی زیاد ناکرێ.

تا ئێرە دوان و باس کردن لە حاڵی پێغەمبەر بوو دەگەڵ بێباوەڕانی موشریک و خاوەن کتێبەکان، بێباوەڕەکان دەیانکوت چۆن دەبێ پێغەمبەر خواردەمەنی بخوا و بە ناو بازاڕدا بگەڕێ بۆ شت کڕین؟ هەر وەک ئایەتی ٧ی فورقان ئاماژەی وەلا کردووە:

**وَقَالُوا مَالِ هَذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ لَوْلَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُ نَذِيرًا**

**کوتیشیان: ئا ئەوە چۆن پێغەمبەرێکە خواردن دەخوا و بە ناو بازاڕیشدا دەگەڕێ؟ ئەی بۆچی فرشتەیەک نەنێردراوە بۆ لای، هەتاکوو لەگەڵ ئەودا ترسی وەبەرنێ،**

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم دڵخۆشی پێغەمبەر دەداتەوە دە بەرابەر هەڵوێست و قسەی ناڕەوای ئەو بێبڕوا لاسارانە، پێی دەفەرموێ ڕوو بکە دە خودا و پارێزگار بە و بە هیوا بە دینەکەت سەر دەکەوێ.

دەگێڕنەوە لە عەبدوڵڵا کوڕی عەباس و ئەنەسی کوڕی مالیک کاتێکی پێغەمبەر مەکەی گرت، مزگێنی دا بە یارانی کە بەو زووانە خاکی فارس و ڕۆمیش دەگرین، جوولەکەکان کە ئەو قسەیان بیست کوتیان شتی وا قەت نابێ چونکە وڵاتی فارس لە کوێ و ئەوانە لە کوێ! محەمەدی ڕووت و ڕەجاڵ و بێ چەک، وا دیارە محەمەد بە مەککە و مەدینە تێر ناخوا بۆیە چاوی کردۆتە خاک و وڵاتی فارسیش. جا لە سەر ئەو ئەساسە ئەو ئایەتی ٢٦ی ئالی عیمران دادەبەزێ و هیوا و هومێد دەداتە پێغەمبەر و هەسی بێباوەڕان دەداتەوە و لە دەمیان دەدا.

**قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاءُ وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾** ئالی عیمران

**ئەی محەمەد! بڵێ: خودایە، ئەی خاوەن و فەرمانڕەوای هەموو بوونەوەرێک، هەر کەس کە خۆت کەیفت لێ بێ و ئیرادە بکەی، دەستەڵات دەخەیتە دەستی، هەر کەسیش ئیرادەی نەکەی و ویستت لێی نەبێت دەستەڵاتی لێ دەستێنی. ئەوەی بتەوێ بەڕێز و بەهێزی دەکەی، ئەوەش کە نەتهەوێ و ئیرادەت لە سەر نەبێ، خوار و زەلیلی دەکەی. خێر و بێر هەر دە واز و ئیرادەی تۆدایە، بێ گومان ئەتۆ بە سەر هەرچی بتهەوێ بەتوانا و زاڵی.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٦:**

ئەی محەمەد! بڵێ: ئەی ڕانەر و دانەری گشت بوونەوەر، بێ ئەوەی هاوبەشت ببێ و نیازت بە غەیرێ لە کار و باردا، یا غەیرێک بتوانێ دەستت وەبەر دەست نێ و بەرگریت کا، دابەخشی سەروەت و سامان و دارایی و عیزەت و شەوکەت بە هەر کەسێک کە بتهەوێ و ئیرادەی کەی، و هەروا دادەڕنی لە شەئن و شەوکەتی هەر کەس کە بتهەوێ، سەرۆکایەتی و عیزەت و سامان و دەستەڵات و دارایی، وا هەیە بۆ نانێکی موحتاج دەکەی خانەدانێ، و دەیکەیە خاوەن سفرە و نان گاوانێ، لە دنیا و ویندا کێت واز لێ بێ و ئیرادەی بکەی، سەربەرز و بەڕێزی دەکەی و کێشت واز لێ بێ و بتهەوێ، بێنرخ و زەلیل و نابوود و ناحەزی دەکەی، ئەوانش کە دەکەی خاڵی لە حیکمەت و هۆ نین بەڵکە هەمووی لە سەر ئەساسی حیکمەت و هۆن، ئەگەرچی لە مەی ئینسانیش هەموو هۆیەکان دیار نین، دیارە ڕوونە کە چاکە هەمووی هەر لە تۆڕایە و بە دەس تۆیە، و بە سەر هەچی هەیە، زاڵ و بەتوانای، کێ تووشی چاکە و چاکەکاری بێ و ڕووی دە خێر و بێران بێ، ئەوەی لە سەر ئەساسی دەستوور و فەرمانی تۆیە، خودا چی کردبێتە هۆ و هەوێنی ئەو چاکەکارانەت فرچک بەوی گرتووە، جا بۆیە دەبێ باوەڕمان وابێ: ئەو چاکە دەسکەوتنە و ئەو ڕێ چاکە گرتنە لە خوداوەیە، بەڵام ئەگەر هات و خوارەو خوار ڕۆیشت و جووڵایەوە، ئەوە تووشی چاکە نابێ، ئەو تووش نەبوونەی لە خۆیەوە، هەر وەک خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم لە ئایەتی ٧٩ی سوورەی نیساءدا بە ڕوونی فەرموویەتی:

**مَّا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ وَأَرْسَلْنَاكَ لِلنَّاسِ رَسُولاً وَكَفَى بِاللّهِ شَهِيدًا**

**هەر چاکەیەکت تووش دەبێ لە لای خوداوەیە، هەر خراپەیەکت تووش دەبێ، ئەوە لە خودی خۆتەوەیە (چون خودا کاری خراپ ناکا)، ئێمەش تۆمان (ئەی پێغەمبەر) بە نامەوە نارد بۆ لای**

**عالەم، خودات بەسە بۆ شاهیدی.**

**سووکە ئاوڕێک وە دواوە:**

زۆر وەدوور ناکەوین هەر لە شەڕی دووهەمی عالەمەوە دەست پێدەکەین، لەوێڕا تا ئەوڕۆ با بە وردی زەین دەینێ و بڕوانین تا ئەو ڕاستییە چاو کەین و دەرسی لێ وەرگرین.

گۆڕان و خولی زۆری دەوران چەندەی حاکم و دەستەڵاتدار و شای دەربەدەر کرد و خستیە ناو زبڵدانی مێژوو و چەندەی بێ ناو و نیشان و لات هێنا داینا لە جێوبانی وان، چەندەی ژێردەست و ژێر چەپۆکەی ڕەسەر خستن و گەیاندنیە پایە و پلەی بەرز، و چەندەی خاوەنی پلە و پایەی هێنانە خوارەوە، چەند خانەدان و خاوەن قەسر و تالار بنەبڕ بوون و تێک ڕووخان، چەند شوێنی ئاوەدانمان دین و وێران و چۆل، چەند چۆڵ و بیابانن دی بوون بە ئاوەدانی! ئای بۆ زانا و دانا دەرس وەرگرێ لەو ئایەتەی ۱۴۰ی ئالی عیمران:

**إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُ وَتِلْكَ الأيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاء وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ الظَّالِمِينَ ﴿١٤٠﴾** ئالی عیمران

**ئەگەر زامار بوون و تووشی ئازار هاتن، بێگومان ئەو هۆزەش تووشی ئەو نموونە ئازارانە بوون، ئەو ڕۆژانەش (واتە ڕۆژانی ئازار و ئێش و بێدەستەڵاتی، یا ڕۆژانی دەستەڵات و خۆشی) لە نێوان خەڵکاندا دەساودەسی پێ دەکەین، تا خودا ڕوونی کاتەوە کێ لە باوەڕەکەیدا پتەو و ڕاستە، لە ناو ئێوەشدا چەندین شاهید هەڵبژێرێت، خوداش ستەمکارەکانی خۆش ناوێت.**

**تێهەڵڕوانین و لێ ورد بوونەوەیەکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئەو ئایەتە پیرۆزە:**

وا هەست پێ دەکرێ لە ئایەتی پێشدا واتە ئایەتی ۱۳۹ موسوڵمانەکان تا ئەندازەیەک تووشی ئەو دڵەڕاوکە بووبنن کە هاوبەش پەیداکەرەکان لەوان زیاتر و قایمتر و بەهێزتر بن، ئەو هەستەش بووبێتە هۆی سستی و لاوازی ئیرادە و غەم و ڕامان. جا خودای یاری یارانی و یاریدەدەری پاکان دەیهەوێ ئەو تەم و غەم و هەمە لە دەروونی پاکیان ڕاماڵ دا و بتارێنێ، بە هۆی دابەزینی ئەو ئایەتە. ئێستا کە بەراوەردی خاڵی ئەو دوو شەڕکەرانەی شەڕی ئوحود دەکرێ لە نێوان موسوڵمانان و هاوبەش پەیداکەران، بە ڕوونی چاو دەکرێ کە موشریکەکان نە زۆرترن نە بەهێزتر، ئەو زەرەرەی بە موسوڵمانان گەیی بە وانیش گەیی، کەوایە بەهێزتری بێباوەڕانی هاوبەش پەیداکەر لە هیچ لایەکەوە چاو ناکرێ. دەبێ لەوەڕا ئەو باوەڕەمان ببێ کە

دابی خودا ئەوەیە: بەسەرهاتی تاڵ و شیرین کە دێن بە سەرماندا دەشـڕۆن، دەبـێ دەرسـی لـێ وەرگرین لەو سوننەتەی خودا و هەروا دەبێ ئەوەش وەرگرین و باوەڕی پێ بکەین ئەگەر تـاڵی و تەنگانە ڕوو نەدەن و نەیەنە کایە، ئـازا و خـاوەن ئیـرادە لە بێئیـرادە و نائـازا جـودا نـابێتەوە. بڕوانین لە شکست و بەزین دە وەهلەی هەوەڵدا لە شـەڕی ئوحـوددا، ئامـاژە وەلای ئەوە بـوو نامیزانی و بێنەزمی لە شەڕدا دەبێتە هۆی شکست و بەزین، ئەوە دەبێ دەرس بێ بۆ هەمیشە، تا جارێکی دیکە تووش نەیەتەوە ئەو شکستە، خـۆ دیـارە سـەرکەوتنی موشریکەکـان ئـی ئەوەی نەبوو کە ئەوان دۆستی خودا بوون چونکە ستەمکاری خۆش نابێ، بەڵکە ئـی زانسـت و فێڵـی شەڕ زانین بـوو، و سـەرکەوتنی موسـوڵمانانیش لە ئـاخردا ئـی خوداناسـی و حەقپەرسـتی و ئیرادەی بەهێز بوو. بۆ زێدە زانین بڕوانە: تفسیر المیزان، هەمان ئایە.

دڵ دەیهەوێ بزانێ: چۆنیەتی و تێکەڵاوی ئەو ئایەتی ٢٦ی ئالی عیمران دەگەڵ ئایەتەکانی پێش خۆی چۆنە و چیـیە؟ ئـێمەش بـۆوەی دڵ بـێ وڵام نەمێنێـتەوە هـاتین بە چـاو و دڵێکـی هەستیارانە دووبارە و چەند بارە ئاوڕن وە سەر ئایەتەکانی پێش خۆی داوە، وەک ئایەتەکانی ١٨ تا ٢١. بە هۆی حەول و تێکۆشانێکی ورد بەو ئاکامە گەیشتین کە ئایەتی ٢٦ دەگەڵ ئایەتەکـانی پێش خۆی لە سێ ڕێگاوە دەتوانن پێکەوە تێکەڵاوییان ببێ:

١. ئایەتی ٢٠ی ئالی عیمـران بـۆ دەمکـوت کردنـی ئەو کـافر و بێبـاوەڕانە دابەزی کە دە ڕووی پێغەمبەردا ملبەملە و کێشەیان دەکرد، خـودا دەسـتووری دا بە پێغەمـبەری کە پێغەمـبەر بفەرموێ ئەمن تەسلیمی خودام و ئیتاعە لە خودا دەکەم.

٢. خودای تەعالا ئایەتی ١٩ی ئالی عیمرانیلە بابەت تەوحید و پێغەمبەرایەتـی پێغەمـبەر و ئیسباتی ئایاتی خودا نازڵ کرد تاکوو قسەی کافرانی بێباوەڕ بەتـاڵ بێـتەوە. جـا بـۆیە خـودای تەعالا دە موقابل ئەو ملبەملە و کێشە و ئینکاری کافران دەعوەتی پێغەمبەر بۆ دوعـا و مەدح و سەنای زاتی پاکی خۆی دەکا، واتە کاتێ کافر ویسـتیان بە قسـەی بێبنەمـا و بـێقیمەت بەرەو ناڕەحەتیت بەرن، ڕوو دە خودا کە.

٣. وەک لە ڕابردوودا ئیعتیقاد و باوەڕی نەساراکان بەیان کـرا لەو بـابەتەوە کە دەیـانکوت: عیسا خودایە، یا کوڕی خودایە، یا سێهەمین خودایە؛ بەو پێیە دەبێ خاوەنی بەشـێک لە مڵکـی دنیا بێ و دەستەڵاتی بە سەر دنیادا هەبێ، جا خودای تەعالا بە دابەزاندنی ئایەتی ٢٦ خەیـاڵ و باوەڕ و کوتەی ئەوانە ڕەد دەکاتەوە و دەباتەوە پاش، بەوەی کە دەفەرموێ: «اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ»

واتە ئەی پەروەردگار هەر ئەتۆی خاوەنی بەحەقی ملّکی دنیـا، یـا خـاوەنی ملّکـی عیـزەت و زیللەت، مان و نەمان، هەر ئەتۆی؛ عیساش بوونەوەرێکە لە ژێر دەستەڵاتی تۆدا.

جگە لەوبابەتانەی کوتمان، بە پێی ڕا و بۆچوونی قورئانزانان دابەزینی ئـایەتی ۲۶ی ئـالی عیمران خاوەنی چەند هۆی تایبەتە:

۱. ئیبنی عەباس و ئەنەس کوڕی مالک بۆچوونیان وایە: کاتێ پێغەمبەر مەککەی مبارەکی گرت بە مزگێنی بە ئۆمەتی وەعدە دا کە هەر وەک خودای مەزن بە کەرەمی خۆی سـەرکەوتنی مەککەی مبارەکی بە نەسیب کردن لە داهاتوویەکی نزیکدا سەرکەوتنتان بە سەر دەستەڵاتدارانی فارس و ڕۆمیش بە نەسیب دەکا و دەتانکاتە خـاوەن ملّـک و وڵاتـی ئەو نـاودارانە، جـا کـاتێ بێباوەڕانی منافق ئەو کەلامە مزگێنییەی پێغەمبەریان بە گوێ گەیی، تێک هەڵگلان و واق مـان و کوتیان ئەو قسە زۆر دوور لە ڕاستییە، کە پێغەمـبەر بتـوانێ ڕۆژێـک لە ڕۆژان ببێـتە خـاوەنی ملّکی فارس و ڕۆم، چونکە ئەوانە خاوەنی دەسـتەڵاتێکی زۆر بەهێـز و بەتوانـان، زاڵبـوون بە سەریاندا زۆر بەدوور دەزاندرێ و دێتە بەر چاو لە لایەن پێغەمبەرێک ئاوا کەم هێز و کەم سامان و کەم چەکی شەڕ، جا لە سەر ئەو خەیاڵە کـاڵ و بێبنەمـایەی بێبـاوەڕانی کـافر و منـافق ئەو ئایەتە (۲۶ی ئالی عیمران) دابەزی بۆ سەر پێغەمبەر و ئاشکرای کرد وفەرمـووی: دەسـتەڵات و هێـز لە خـودایە و لە دەس ئەودایە، و هەر وا دەبـێ ئەوە بزانـدرێ: سـەردارانی ڕۆم و فـارس بۆخۆیان ئەو ملّک و مـاڵ و وڵاتانەیـان بە خـۆ نەداوە، بەڵـکە لە لایەن خـوداوە بەوان دراوە و هەروا خودا دەشتوانێ لە دەستیان دەربێنێتەوە. (روح المعانی، ج ۳/ ۱۴۹، تفسیر کبیر، ج ۸/ ۴؛ تفسیر قرطبی، ج ۵۳/۴)

۲. هۆیەکی دیکەش لە بابەت دابەزینی ئایەتی ۲۶ی ئالی عیمران دەبێ ئەوە بێ: گۆیا وەک دەڵێن لە پاش شەڕی ئوحود کافەرکان هاتن دژی موسوڵمانان دەستە و دایرەیەکی زۆریان پێک هێنابوو بۆ وەی بتوانن دەورەی شاری مەدینە بـدەن و هێـرش بـکەنە سـەر و بیگـرن و دەنگـی ئیسلام و پێغەمبەر خەفە کەن دەو شارەدا و قارەبڕی کەن. کـاتێ پێغەمـبەر هەسـتی بەو هەسـتە گڵاوەی وان کرد، بۆ بەرگری لە بەجێهاتنی ئەو ئارەزوویەی خاو و پووچی بێبـاوەڕان هـات دەگەڵ یـارانی خـۆی کەوتە ڕا و تەگبیـر و بەرجەوەنـدی کە ئـێمە دەبـێ چ بکەیـن دە بەرابەر هەڵوێستی ئەو دوژمنانە!؟ هەر یەک لە یاران و پێغەمـبەر نەزەری خۆیـان خسـتە ڕوو، و هەروا سەلمانی فارسی بەتایبەتی ئەو نەزەرە ڕەوایەی دا و فەرمووی: دەبێ دەوراندەوری شاری مەدینە

خەندەکی لێ دریٚ، تاکوو دوژمن لە کاتی هێرش کردن بۆ سەر شار نەتوانیٚ واریدی نێو شار بیٚ و ماڵ و منداڵ و ژن وپیران بترسێنیٚ و شپرزەیان کا. حەزرەتی ڕەسووڵیش نەزەری سەلمانی پەسند کرد و فەرمووی زۆر بەجێیە. یاران لە نێو شاردا وەمێنن و دەوراندەوری مەدینەش خەندەک لیٚ بدەن، لە لای شومالی ڕۆژهەڵاتەوە لە تەڕەف ڕۆژئاواوە، دوژمن ئەگەر بیویستایە هێرش کاتە سەر شار، لەوێوە دەیتوانی؛ جا لەو لایەوە واتە لە لای ڕۆژئاوای میل بە ڕۆژهەڵاتەوە دەستووری خەندەک لێدان درا، لایەکانی دیکە لە بەر کێو و سەختی ڕێگای هێرش بۆ کردن، دەسی نەدەدا، لێیان بۆیە پێغەمبەر و یارانی ئەمین بوون لەو لایانەوە. ئەو خەندەکەش گۆیا سیٚ هەتا چوار میتر پان بوو، بڵیندایی ٢ میتر تا ٣ میتر بوو، درێژاییەکەشی نزیکەی هەشت تا دە کیلۆمیتر دەهات. حەزرەتی ڕەسووڵ لە سەر ئەساسی بەراوردی خۆی بە هەر دە نەفەران چل گەزی پیٚ سپاردن بۆ هەڵکەندن، و دە ئەندازەی شەش یا حەوت ڕۆژ یارانی پێغەمبەر ئەو خەندەکە بەو چۆنیەتیەی باس کرا بەجیٚ هێندرا و هەڵکەندرا.

### چاوکردنی کارەساتێکی موعجیزەئاسا

لە کاتی لێدانی ئەو خەندەکەدا گۆیا یاران دەگەنە بەردێک زۆر سەخت کە ناتوانن دەرەقەتی بێن و بەرگری لە کاریان دەکا، ئەو کارەساتەی بەرگر لە کاریان بە پێغەمبەر ڕادەگەیێنن، پێغەمبەریش بۆخۆی هەڵدەستیٚ بە پەیسەری ئەو خەبەرە؛ ئەگەر تەماشا دەکا و لێی خورد دەبێتەوە هەست بە ڕازێک و سوڕێک دەکا لە بەردە سەختەکەدا. لە خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم یاری دەخوازیٚ بۆ زاڵ بوون بە سەر ئەو بەردەدا کە وەک تەلەسمێک دێتە پێش کاریان. داوای کوتکێک دەکا بۆی بێنن، کە بۆی دێنن، بە دوو دەستی مبارەکی و هێز و تینی نهێنی و ئاشکرای دایدەگەڕێتیٚ چەند کوتکان لیٚ دەدا و تەڵەسمێکی گەورەی لیٚ هەڵدەکا، ئەو تەڵەسمە بڵێسە و نوورێکی گرشەداری لیٚ هەڵدەستیٚ. یارانی دەوروبەری بە ئاشکرایی چاوی دەکەن. ئەدەوەیدا پێغەمبەر بە یارانی دەفەرمویٚ: لە ناو بڵێسە و شوعلەی ئەو بریسکەیەدا قەسر و قوسوور و کاخەکانی فارس و عەجەمم دی و چاوم کردن، کەڕەتی دووهەم کە پێغەمبەر دایگەڕایەوە، دووبارە بڵێسە و بریسکەیەکی گرشەداری دیکەی لیٚ ڕەحەوا کەوت و پێغەمبەر فەرمووی: ئەو کەڕەتەش لە ناو ئەو نوورەدا قەسر و کاخی ڕۆمیەکانم دی، هەروا بۆ جاری سێهەم کە دایدەگرێتەوە بە کوتکان، دووبارە بریسکە و بڵێسە و شەبەقێکی گرشەدارتری لیٚ بڵیند بوو، دووبارە پێغەمبەر فەرمووی: لە ناو ئەو شەبەقەدا ئەو کەڕەتەی

قەسرەکانی سەنعا و یەمەنم دیتن. پاش تەواو شکاندنی ئەو بەردە پێغەمبەر فەرمووی: ئەو سێ نوور وبریسکەی ئەو بەردە، ئەوە ئیلهامی دڵم دەکەن کە فەتح و سەرکەوتنی ئەو وڵاتانە بە دەستی ئێوەی ئیسلام دەبێ و دێتە جێ.

بێ گومانە کارەساتی ئەو بەردە موعجیزەئاسا بوو، ئاماژە بوو وەلای پیرۆزی بە سەر وڵاتانی فارس و ڕۆمدا، بەڵام کاتێ دووڕوو و بێباوەڕەکان ئەو واقیعەیان بیست، بە ئیهانەت و مەسخەرەوە کوتیان ئیسلام و هەوادارانی وا ترسەنۆکن کە لە ترسان ئەوەتا خەندەکی لە دەورەی شاری مەدینە دەدەن، چۆن ئەو خەیاڵاتانە دەکەن و ئارەزووی فەتحی شام و ڕۆم و یەمەن دەخەنە نێو مێشک و دڵیانەوە. ئەوە خەیاڵاتە یان هەر خەیاڵە و پێی ناگەن. جا خودای پشتیوانی پێغەمبەران و ڕاستان و پاکانی ڕێگای حەق دێ بە دابەزینی ئەو دوو ئایەتی ٢٦ و ٢٧ی ئالی عیمران خودا دەفەرموێ: دان و وەرگرتنەوە، عیزەت و زیللەت بە دەست خودایە، ئەوە خودایە موسوڵمانان لە ژێر ئاڵای ئیسلام بە ڕێبەری پێغەمبەری ئیسلام یاریدە دەدا و پیرۆزیان دەکا بە سەر ئەو وڵاتانەدا. (ڕوح المعانی، ج ٣/ ١٥٠؛ بحر المحیط، ج ٢/ ٤١٨؛ اسباب النزول واحدی: ٥٤).



لە هەڵسەنگاندن و بەراوردی جوملەی «مالک الملک» دڵ هەست بە گرێ و پەرچێک دەکا کە لابردنی ئەو پەرچە پێویستە. پەرچەکەش ئەوەیە: «ملک» بریتییە لە قودرەت و توانایی، دە دیارە «مالک»یش هەر هەمان قودرەتە و تواناییە بەو پێیە مانای «مالک الملک» واتە توانا لە سەر توانا، قودرەت لە سەر قودرەت، ئەو بەراوەرد و هەڵسەنگاندنە ئەوەمان پێ دەڵێ: غەیرەز خودا ئەوەی دە توانایدایە، توانای تەواو نییە، بەو دەلیلە هێز و توانای ئینسان و باقی گیانلەبەر لە خوداوەیە، و قودرەتی مالک بە سەر مڵک و ماڵی لە خوداڕایە، جا بۆیە خاوەنی «کشاف»، فەرموویەتی: «مالک الملک» بەیانی قودرەت و سەربەخۆیی کامڵی خودایە، و چەند بابەتی دیکەش دەگەیێنێ، وەک ئەوانە: مەبەست لە «ملک مالک الملک» مەقامی نوبووەت و ڕیسالەتە، هەر وەک لە ئایەتی ٥٤ی نیساءدا ئاماژەی وە لا کراوە:

> **فَقَدْ آتَيْنَآ آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَاب وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكا عَظِيمًا**
> **بەڕاستی و بێ گومانی ئێمە کتێب و پێغەمبەرایەتی و دەستەڵاتێکی گەورەمان بە تۆرەمەی ئیبراهیم بەخشی.**

جا خۆ ئەوە ڕوون و ئاشکرایە مەقامی پێغەمبەرایەتی لە ژووررای هەمو مەقامەکانی ملْک و سامان و پادشاییە، بەو دەلیلە پێغەمبەران لە ڕووناکایی و ڕێبەری دڵ و دەروون وهەستەی نهێنی ئینسانین، ئەمما حاکمان و خاوەن دەسەڵاتان و ڕێبەر و بەڕێوەبەری زاهیری جامیعە و گەلن، لە سەر ئەو ئەساسە تێز و پێزی پێغەمبەران بە نهێنی و بە زاهیری گەل دەحاوێنێتەوە و دەیحاملێنیێ. بەڵام ئەمیران و حاکمان و خاوەن دەسەڵاتان، ڕەواجیان دە زاهیری گەلدایە. بێگومان حەیاتی ئەو ئایەتە (٢٦ی ئالی عیمران) زەربەیەکی کاریگەر دەدا لە ڕوحی ناپاکی ناپاکانی کافرانی بێباوەڕ کە بە خەیاڵی پووچی خۆیان دەیانکوت: زۆر دوورە لە ڕاستی خودای مەزن پێغەمبەر لە بەشەر هەڵخا، هەر وەک ئەو قسەی بێباوەڕان ئاماژەی وەلا کراوە دە ئایەتی ٩٤ی ئیسراءدا:

**وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَن يُؤْمِنُواْ إِذْ جَاءهُمُ الْهُدَى إِلاَّ أَن قَالُواْ أَبَعَثَ اللّهُ بَشَرًا رَّسُولاً**
**هیچ شتێک بەرگری نەکرد لە خەڵکی بۆ ئیمان هێنان، کاتێ هیدایەت و ڕێنوێنییان بۆ هات بێجگە لەوەی کوتیان: ئایا خودا مرۆڤی بە پێغەمبەر ناردووە؟**

یا دەڵێن وەک ئایەتی ٩ی ئەنعام قسەکەیان بەرەو پاش دەباتەوە کە دەڵێن: چۆن پێغەمبەر لە ئینسان هەڵدەکەوێ؟!

**وَلَوْ جَعَلْنَاهُ مَلَكاً لَّجَعَلْنَاهُ رَجُلاً وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ**
**ئەگەر ئەویشمان بکردایەت بە فرشتەیەک شێوەی مرۆڤێکمان پێ بدایە، بێگومان هەر لێمان دەشێواندن، هەر وەکوو خۆیان لە خۆیانیان شێواندبوو.**

ئەو دوو ئایەتی ٩٤ی ئیسراء و ٩ی ئەنعام هەر دوو پووچەڵ کەرەوەی کوتە و خەیاڵی پووچ و باتڵی کافر و بێباوەڕەکانە، کە دەیانکوت جا چۆن پێغەمبەر لە مرۆڤ هەڵدەکەوێ.

هەندێکی دیکە لەو کافرە بێباوەڕانە ددانیان بەوەدا هێاوە کە پێغەمبەر لە ئینسان دەبێ و هەڵدەکەوێ. بەڵام ئەو پلە و پایە و مەقامە لە محەمەدی فەقیر و سەغیر ناوەشێتەوە و نایەتەوە، هەر وەک ئایەتی ٣١ی زوخروف ئیشارە وەلای ئەو نەزەرە ناڕەوایەیان دەکات:

**وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ هَذَا الْقُرْآنُ عَلَى رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ**
**(کافرە بێباوەڕەکان) کوتیان: بۆچی ئەو قورئانە بۆ پیاوێکی بەرز و مەزن و جێدار لەو دوو شارانەدا نەهاتە خوارەوە و دانەبەزی؟**

جوولەکەکان دەیانکوت پێغەمبەران لە پێشینەکەیان و بابانی ئێمەڕا بوون و هاتوون، هۆزی قوڕەیش قەت خاوەنی ئەو مەقامە ڕیسالەت و پێغەمبەرایەتیە نەبوون، کەوایە چۆن مەقامی پێغەمبەرایەتی شایانی محەمەد دەبێ؟!

تەواوی ئەو کوتانەی کافران لەمەڕ پێغەمبەرایەتی محەمەد هۆی حەسادەت و کینە بوو، هەر وەک خودای حەکیم و زانا بە دەروونی هەموو دڵ و دەروونان دە ئایەتی ۵۴ی نیساءدا ئاماژەی وەلای حەسادەتیان دەکات:

**أَمْ يَحْسُدُونَ النَّاسَ عَلَى مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ فَقَدْ آتَيْنَآ آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكًا عَظِيمًا**

**نەخێر، هەر بەخیلی دەبەن بە خەڵک لە سەر ئەو خێر و بێرەی خودا کە (لە بارەگای) ڕەحمی خۆیەوە پێی بەخشیون، بێگومان ئێمە کتێب و پێغەمبەرایەتی و دەسەڵاتێکی گەورەمان بە تۆرەمەی ئیبراهیم بەخشی.**

ئەوە شتێکی حاشا هەڵنەگرە کە جوولەکەکان بە هۆی چەکوچۆڵ و زۆری ئەفرادیان نیازی دەستەڵات و توانایان دەکرد بە سەر پێغەمبەردا، هەر ئەو ئیدیعایەی وان بوو کە خودای تەعالا لە ئایەتی ۱۲ی ئالی عیمرانی دابەزاند و تێی سرەواندن و هەسی دانەوە:

**قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَى جَهَنَّمَ وَبِئْسَ الْمِهَادُ**

**(ئەی پێغەمبەر)! بڵێ بەوانەی بێباوەڕن: بەو زووانە تێدەشکێنرێن کۆش دەکرێنەوە بەرەو دۆزەخ دەبرێن، کە ناخۆشترین جێگای حاوانەیەوە.**

ئەو ئایەتانەی ۹۴ی ئیسراء و ۹ی ئەنعام و ۳۱ی زوخروف و ۵۴ی نیساء و ۱۲ی ئالی عیمران سەراپایان هاوارن لەوەی کە ئینسان هەر ئەوەندە ژەنگ و چڵکی حەسادەت و خۆ بە زۆر زانی کەوتە سەر سینە و دڵی تازە بە هیچ ئاوێک پاک نابێتەوە و حەقیش نابیسێ و نایەتە سەر خەت و ڕێگای دروست. جا دەبێ بزاندرێ و بە دڵ وەربگیردرێ کە خودای تەعالا بە جوملەی «مالک الملک» ئەقیدە و خەیاڵاتی بێباوەڕان پووچەڵ دەکاتەوە و ئیسباتی ئەو پووچەڵیەش ڕادەگەیێنێ بە ئایەتی ﴿تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاءُ وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاءُ﴾ واتە (بڵێ ئەی خودایە، ئەی خاوەن و فەرمانڕەوای هەموو شتێک) هەر کەس کە ئەتۆ خۆت کەیفت لێ بێ و بتهەوێ، دەستەڵات دەدەیتە دەستی، و هەر کەسیش ویستت لێی نەبێت، دەستەڵاتی لێ

دەستێنیەوە.

هەندێک لە قورئانزانان لە سەر ئایەتی ﴿تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاء وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاء﴾ هەست بەو شتە دەکەن: دانی دەستەڵات و سەروەری و داڕنینی دەستەڵات و سەروەری لە لایەن خوداوە بۆ ئینسان لە ڕێگای ئیختیاری ئینسانەوە نییە، واتە بکوترێ: ئیختیاری ئینسانی دە کاردا هەیە، وا نییە؛ بەڵکە ئەو دان و نەدانە لە سەر ئەساسی لێهاتوویی و شایستەگییە، بە کوردی و بە کورتی: دەستەڵات دەدرێ بە یەکێک کە پێی بچارێ و ژیرانە دەکاری کا لە جێی خۆیدا، لە کەسێک وەردەگیرێتەوە کە نەتوانێ دە جێی خۆیدا دەکاری کا و دەعەمەلی بێنێ. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٢٤ی بەقەرە:

> **لاَ يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ**
> **پەیمانی من ناگاتە لای ستەمکاران.**

یانی ستەمکار و ناشی و نەزان خودا هیدایەتیان نادا. بەڵام خودا ئینسانی ئاقڵ و ژیر و لێزان و خاوەنی ئینساف و داد یاریدە دەدات. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٤٧ی بەقەرە:

> **إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ**
> **خودا خۆی لە سەر ئیرادە و ویستی، ئەوەی هەڵبژاردووە و کردوویەتی بە فەرماندە، زانینێکی بەرفراوان و وزە و توانای جەستە و لەشی پێ بەخشیوە.**

ئەو ئایەتە هاوار دەکا و دەڵێ: هەر جۆر خودا بیهەوێ و ئیرادە بکا، هەر ئەو دەبێ، چونکە هەر خودا دەزانێ کێ شانی هەڵدەگرێ ببێتە شا و خاوەن زانست و لەکارزان، و کێ شانی هەڵناگرێ ببێتە سەردار و خاوەن دەستەڵات. بە کوردی و بە کورتی: ئەو بابەتە دەبێ حەواڵە بە ئیرادە و قەزای خودا بکرێ.

«حکیم الشعراء ابوالعلاء المعری» هەر وا ئەو بابەتەی حەواڵە بە قەزای خودا کردووە:

لَـو كـانَ بِالحيَـلِ الغَنـى الوَجَـدتني ... بِأَجَـلِّ أَسـبابِ السَّـماءِ تَعَلُّقـي

لٰكِـنَّ مَـن رُزِقَ الحِجـا حُـرِمَ الْغِنَـى ... ضِـدّانِ مُفتَرِقـانِ أَيَّ تَفَـرُّقِ

وَ مِـنَ الـدَّليلِ عَلَـى الْقَضـاءِ وَ كَوْنِـهِ ... بُـؤسُ اللَّبيـبِ وَ طيـبُ عَـيشِ الأَحمَـقِ

واتە:

١. ئەگەر سامان و توانایی بە حیلە و لێزانی بایە، ئەمن بە بەرزتر لووتکە دەگەیشتم بە هۆی هێز و لێزانی.

٢. بەڵام هەر کەس ئەقڵ و زانستی درایە، لە سەروەت و سامان بێبەش کرایە، چونکە ئەو دووانە پێکەوە نابن.

٣. دەلیلیش ڕوونە، کە قەزایە و قەدەرە، زۆر دانا و لێـزان تەنگ‌دەسـتە، زۆر نەدان و نەزان خۆشگوزەران و سەربەستە.



دڵ دەیهەوێ بزانێ مانای «بِيَدِكَ الْخَيْرُ» چۆنە و مەبەست چییە؟

دەبێ بکوترێ مەبەستی خودا دێرەدا قودرەت و توانایییە واتە «بِقُدرَتِکَ نَجعَلُ کُلَّ الْبَرَکـاتِ وَ الْخَیراتِ» یانی هەچی خێر و بێرە لە ژێر ئیرادە و کەیفی خـودادایە. جـوملەی «إِنَّـكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ» واتە خودایا! ئەتۆ زاڵی بە سەر هەموو شتدا.

دڵ ئەو هەستەی پێدا دێ کە ئایـا ئەو ئـاڵوگۆڕە دەبـێ هەر لە دەسـتەڵات و سـەروەت و سامان و پلە و پایەدا بێ؟ یا لە کائیناتیشدا دێتە ڕوو؟

بۆ وڵامەکەی دەبێ ڕوو دە دەرگای خودای تەعالا کەین چونکە نەزان لە دەرگـای خـودادا بە زانایی دەگا «وَ وَجَدَکَ ضَالاً فَهَدَی».

دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٧ی ئالی عیمران بۆ وەی تێبگەین ئاڵوگۆڕ دە کائیناتیشدا لە سەر ئیرادەی خودا هەیە:

**تُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَتَرْزُقُ مَن تَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢٧﴾** ئالی عیمران

**خودایە! ئەتۆی شەو دەکەی بە ناو ڕۆژدا و ڕۆژیش دەکەی بە نـاو شـەودا، زینـدوو لە مـردوو دەردەکێشی و مردووش لە زینـدوو دەردێنـی، ڕزق و ڕۆزیـش دەدەی بە هەر کەس کەیفت لە سەر بێ، بەبێ ژمار.**

### تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٧

خودایە تۆی شەو دەخەیتە جێی ڕۆژ، واتە تاریکایی دادەکێشیە ناو ڕووناکـایی، بەو جـۆرە کە ڕووناکایی دەتارێنی و تاریکایی بە سـەردا دێنـی. واش هەیە هەنـدێ کـات بەشـێ لە شـەو دەپچڕی و دەیخەیتە سەر ڕۆژ، بەو هۆیە شەوگار کورتی دێنـێ، ڕۆژگـار درێژتـر دەبـێ؛ واش

هەیە شەو ڕادەماڵی و ڕۆژ دەخەیتە جێگای، واتە تاریکایی دەتارێنی و ڕووناکایی دادەبەزێنـی، دەو کاتەشدا وا هەیە بەشێ لە ڕووناکایی ڕۆژ وەردەگریەوە و دەیخەیتە سەر تاریکایی شەو، بەو هۆیە ڕۆژگار لە کورتی دەدەن و شەوگار درێژ دەبـن، ڕاز و سـوڕی ئەو ئـاڵوگۆڕ و کـورت و درێژییە، ئـاوا هەسـت پـێ دەکـرێ: نەزم و نیـزام ڕاوەسـتان و وەبەر هـاتن و لێحەسـانەوە و لێحاوانەوەی عالەمی هەستی هۆیەکەی ئەو ئاڵوگۆڕە بێ.

دڵ بە هۆی بەرجەوەندی و هەڵسـەنگاندنی ئـایەتەکە ئەو هەسـتەش دەکـا بە ڕوونـی: ئەو ئاڵوگۆڕە ئەساسیە و خاوەن حیکمەت و بەرهەمی حەیاتی وە نەبـێ هەر لە شـەو و ڕۆژدا بێـتە جێ و سەری پێ بگرێ، بەڵکە لە بابەت ژین و ژیانیشـەوە هەر دەبـێ هەبـێ و هەشـە، تـاکوو دنیای ژین بە ڕەوانی و دروستی و ئاسانی بێتە گەڕ و وەگەڕ کەوێ. وەک ئایەتی ﴿تُخْرِجُ الْـحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الْمَيَّتَ مِنَ الْحَيِّ﴾ ئاماژەی وەلا دەکا و دەفەرموێ: خودای خاوەن توانا دێنێتە دەر زیندوو لە مردوو، یانی بگرە لە ئینسان و هەچی گیانلەبەرە، و هەچی گژ و گیـا و گـوڵ و دار و دەوەن و دانەوێڵەیە، پەیدا دەبن لەو خاکە مردووە، واتە ئینسان و گیانلەبەران لە تۆوی نێر و مێ، ئەو تۆوەش لە خاکە، دیارە خاکی بێگیان هیچ ژیانی تێدا نییە و مردوویە، و هەر وا گـژ و گیا و دار و دەوەن و دانەوێڵەش، لە تۆوی خۆیان پەیدا دەبن و پێکدێن کە تۆویش دیارە هەر لەو خاکە مردوویەدا وەدی دێ.

و هەروا ئەو خودای خاوەن حیکەمت و حەکیم و بەتوانا وەک دەتوانی زینـدوو لە مـردوو دەرهێنێ، دەشتوانێ مردوو لە زیندووش دەرهێنێ، ئەو بابەتە واتە دەرهێنانی مردوو لە زیندوو یا بە پێچەوانە، بیروڕا و بۆچـوونی زانایـانی زۆر لە سـەرە، کە هەر یەکەی بە جۆرێکیـان بەراوەرد کردووە. جا ئێمە دێرەدا تا ئەو جێگایەی زانستن پێی بشکێ، نموونەیان لێ دێنینەوە. موسوڵمان لە کافر دێتە دەر، وەک حەزرەتی ئیبراهیم لە ئازەر؛ یا کافر لە موئمین، وەک کەنعان لە نووح. یا دەڵێن پاک لە ناپاک و هەر وا بە پێچەوانەش؛ یا دەڵێن مریشک و زۆر لە مەل و باڵندە لە هێلکە وەدی دێن و هەروا بە پێچەوانە هێلکە لە باڵنـدە دێـتە دەرێ، یـا دەڵـێن گـوڵەگەنم لە دانەوێـڵە خاریج دەبێ و هەروا بە پێچەوانەش؛ یا دەکرێ و دەشتوانین بڵێـین: مەبەسـت دێـرەدا کـوفر و ئیمانە؛ یانی مەبەستمان لە ئیمان زیندوو بـێ و مەبەسـتمان لە کـوفریش مـردوو بـێ، لە سـەر ئەساسی هەڵسەنگاندنی ئایەتی ١٢٢ی ئەنعام: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ﴾ واتە ئەوەی مردبـوو زیندوومان کردەوە؛ یانی مەبەست دێرەدا ئەوەیە کافر بـوو واتە مردبـوو، گیانمـان خسـتە بەر و

دامانیێ، واتە ئیمانمان دایە؛ بە کوردی مردبو وە گیانمان هێنا. دیارە گیاوگۆڵ هێنانە دەر و شین کردنەوەی لە زەوی، بە ناوی زیندوو کردنەوەی ناو دەبرێ، چونکە پێش ئەوە بڕوێندرێ و شین بێتەوە، بە مردوو ناوی دەبرا، لە سەر ئەساس و ئاماژەی ئایەتی ۱۹ی ڕۆم:

**يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَيُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَكَذَلِكَ تُخْرَجُونَ**

**زیندوو لە مردوو دەردێنێ و مردووش لە زیندوو دەردێنێ، زەویش پاش مردنی زیندوو دەکاتەوە. ئا بەو شێوەیەش ئێوە دەهێنرێنە دەرێ**

یا دەڵێین بۆ ئەو بابەتە دەڕوانینە ئایەتی ۹ سوورەی فاطر:

**وَاللَّهُ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَاهُ إِلَى بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا كَذَلِكَ النُّشُورُ**

**خوداش هەر ئەو خودایەیە کە ئەو بایانە هەڵدەکا و ئینجا هەور دەهەژێنێ، بەرەو سەرزەوییەکی مردوو بەڕێی دەکەین، جا ئەو سەرزەوییەی پێ زیندوو دەکەینەوە پاش مردنی، زیندووکردنەوەش هەر وایە.**

یا نموونەی ڕوونتر دەخەینە ڕوو، وەک ئایەتی ۲۸ی بەقەرە:

**كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتاً فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ**

**جا چۆن باوەڕ ناکەن بە خودا؟ بێ گیان بوون و گیان و ڕۆحی دەپاڵ خستن، ئینجا دەتانمرێنێ و جا زیندووشتان دەکاتەوە، پاشانیش هەر بۆ لای ئەو دەبرێنەوە!**

بە کوردی و بە کورتی: هەچی نەفعی نەبێ مردوویە، نە کافر بەهرەی مەعنەوی هەیە و نە خاکی مردوو، و هەروا لە خاکی بێ‌گیان هەزاران گیانلەبەر دەردێنێ و لە گیانلەبەر هەزاران بێ‌گیان دەخاتە دەر. وەک مووی سەر و لەش و نینۆکی قامکەکانی دەست و لاق، باقی ئەو شتانەش لە بەدەن دێنە دەرێ.

دە جوملەی ﴿وَتَرْزُقُ مَن تَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ ئەو هەستە دەکرێ: خودا هەرچی سامان و داراییە مڵکی خۆیەتی، بیداتە هەر کەس، کەس حەق و مافی ئەوەی نییە بڵێ نابێ بیدرێتێ، یا خودایە بۆچیت داوەتێ؟ چونکە خودا ماڵی خۆی داوەتێ، ماڵی کەسی نەداوەتێ. و هەروا لە بەر ئەوەی خودای تەعالا وشەی «ترزق»ی بە کار بردووە، ئەو هەستە دەکرێ کە ئەو ڕزق دانە

لە ڕێگای فەزڵ و بەرەکەتی خودا بێ، نەک لە ڕێگای بەندەگی و عیبادەتی عەبد بێ.

**تیوتیوە:**

دە ئایەتی ٢٦دا ئاماژە وەلای دوو ئاکاری خودا کرا:

١. دان و نەدان واتە دان و لێوەرگرتنەوە، وەک ئەوە:

**تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاءُ وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاءُ**

**هەر کەس کە خۆت بتهوێ دەستەڵاتی دەدەیتە دەستی و هەر کەسیش وازت لێبێ دەستەڵاتی لێ دادەڕنی.**

٢. کێت واز لێ بێ و بتهەوێ بەڕێز و بەهێزی دەکەیت، کێش نەتهەوێ، زەلیل و بێڕێزی دەکەی.

دە ئایەتی ٢٧دا ئیشارە وەلای کاری گەورە و بەرچاوی خودای تەعالا کراوە:

١. ڕۆ بردنی شەو و ڕۆژ دە یەکدا، کە مەبەست لەو ڕۆبردنە دە پاڵ یەک کورت و درێژی شەو و ڕۆژە بە درێژایی ساڵ، یا بڵێین شەو بوونەوە و ڕۆژ بوونەوە بە شێوەی وردە وردە و هێدی هێدی، کە ئەو شێوەیەش چاوەی بەرەکەت و بەرهەم و قازانجی زۆرە لە سەر ئەساسی نەزم و نیزامەوە.

٢. عەمەلی دووهەمی خودای تەعالا کە دەو ئایەتەدا (٢٧)دا چاو دەکرێ ئەوەیە: دەرهێنانی مردوو لە زیندوو و دەرهێنانی زیندوو لە مردوو. کە ئەو عەمەلەش یەکێکە لە بادراو و پێچراوەترین ڕووداوی عالەمی هەستی. دەشکرێ بەو لایەشدا نەزەر بدرێ: ڕۆژ نیشانەی بیناییە، شەو نیشانەی نابیناییە، جا بەو پێیە دەشتواندرێ بکوترێ: جا کەوایە مان و نەمانیش دەگەڵ کوفر و ئیمان یەک دەگرنەوە.

گۆیا لەو بارەوە سەلمانی فارسی کە یەکێکە لە زاناکانی دەوران فەرمویەتی: پێغەمبەر فەرموویەتی: لە سەر مانای ئایەتی ٢٧ خودا موئمین لە پشتی کافر دەردێنێ و هەروا کافریش لە پشتی موئمین دەردێنێ. جا خۆ ئەگەر نەختێک بەرجەوەندی لە خۆ نیشان بدرێ، یاسای میراتگری هەڵدەوەشێ، بەو دەلیلە: کافر لە موئمین میرات نابا. ئەمما بۆ وەی بتواندرێ بە ڕەوانی و بێگرێوگۆڵ لە ژێر یاسای واقیعی ژیان حاوانەوە و حەسانەوەدا بین بێ و وەجووڵێین، دەبێ بڵێین و باوەڕیشی کەین ڕاز و ڕمووزاتی حیکمەتی خودای خاوەن حیکمەت

لە دەوری حاوانەوە و حەسانەوەی گیانلەبەران بەتـایبەت بەرەی ئینسـان دە چەرخ و خولـدایە هەمیشە بە جۆرێکی وا کە ئینسان تێی بڕ ناکا و سەری لێ دەرناکا.

لە ئایەتی ﴿تُولِجُ اللَّيْلَ فِي الْنَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ﴾ واتە خودا ڕۆ دەبا شـەو دە ڕۆژدا و هەروا ڕۆژیش دە شەو، هەستێکی باریک دەکرێ، هەستەکەش ئەوەیە: دەبێ بەو پێیە کە شـەو پێش دەکەوێ لە ڕۆچووندا، ئەسڵتر بێ و پێشکەوتووتر بێ لە ڕۆژ، ڕۆژیش تـابیعی شـەو بـێ. جا لە سـەر ئەو ئەساسـە مانـگ لە شـەودا دادەگیرسـێ و دەسـت پێـدەکا، هەر ئەو یاسایەشـە وادارمان دەکا کە هەندێک لە عیبادەتەکانمان لە مانگدا دادەگیرسێن، وەک ڕۆژووی ڕەمەزان کە پێی دەکوترێ: مانگی ڕەمەزان؛ یا ئیعتیکـاف لە شـەودا دادەگیرسـێ. بە کـوردی و بە کـورتی: پێش‌کەوتنی شەو لە سەر ڕۆژ دە ئایەتەکەدا ئەو بابەتانەی لێرا هەست پێ دەکرێن.

ئەو ئـایەتە ٢٦ و ٢٧ە ئەو دەرسەشـمان پـێ دەڵـێ: واتە پـاش ئەوەی خـودا پێغەمـبەر و موسوڵمانانی ئاگادار کردنەوە کە دەبێ هەر لە بەر خودا وەپاڕێن و ئیقراریش بـکەن بە توانـایی خودا بە سەر هەموو شتدا، واتە هەموو شت بوون و نەبوونی بە دەسـت خـودایە، دارا و نەدار، عیززەت و زیللەت، ڕێزداری و بێ‌ڕێزی، جا لە سەر ئەو ئەساس و ڕوانگەیە بە ئینسانیش دەڵێ: کەوایە نابێ بۆ چارەی نیاز پەنا لە غەیری خودا بۆ کەس بەری، چونکە تێم‌گەیاندی هەموو شت لە دەستی خودادایە. بۆ ڕاستیی ئەو مەبەستە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٢٨ی ئالی عیمران:

**لاَّ يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاء مِن دُوْنِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللّهِ فِي شَيْءٍ إِلاَّ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَاةً وَيُحَذِّرُكُمُ اللّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللّهِ الْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾** ئالی عیمران

**نابێ خاوەن بڕوا، بێ‌باوەڕان لە باتی بڕواداران بـکەن بە سەرپەرشـت و خۆشەویسـتی خۆیـان، هەر کەس ئەو کارە بکا، هیچ جۆرە پەیوەندییەکی دەگەڵ خودادا نامێنێ. مەگەر بۆ خۆپاراستن و پارێزگاری لە شەڕی وان، خودا دەتانترسێنێ لە ئاکامی نافەرمـانی خـۆی، گەڕانەوەش تەنیـا هەر بۆ لای خودایە.**

### ئاوڕ دانەوە و تێڕوانین لە سیما و ناوەرۆکی ئایەتە پیرۆزی ٢٨:

بە پێی ئیمان و باوەڕی ڕاستین بە یاسای ئیسلام کە قورئانە، کەرامەت و هەسـتی ویـژدانە، نابێ کەسانی خاوەن ئیمان واز بێنن لە خاوەن ئیمان و خاوەن باوەڕان، پاڵ وە بێ‌باوەڕان وەدەن و دۆستایەتییان دەگەڵ پێک بێنن و دامەزرێنن، و قازانج و بەهرەی بێ‌باوەڕان بەرزتر بنرخێنن بە سـەر بەهـرە و قـازانجی موسـوڵمانان. هەر کەسـێک بە هەر ناوێـک دە هەر پۆسـت و پـلە و

پایەیەکدا بێ و دە هەر لیباسێکدا ئاوا بکات: واتە پشت دە هاوکاری و دۆستایەتی موسوڵمان کا و ڕوو دە بێباوەڕان کات، بۆ هەر ئامانجێکی دنیایی، ئەو کەسە هیچ بەشێکی بە سەر خوداوە نامێنێ، وەک خودا فەرموویەتی ﴿فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ﴾ واتە ئەو کەسە بەشی بە سەر خوداوە نامێنێ و پەیوەستی دەگەڵ خودا پچڕاوە.

هەروا دووبار خودای تەعالا لە سەر ئەو بابەتە، واتە دۆستایەتی و پاڵدانەوەی موسوڵمانان بە بێباوەڕان بە خودا و قورئان و ڕەسووڵ زۆر بە ڕوونی و ڕاشکاوی دواوە و ئینسانی تێگەیاندووە بە وەسیلەی ئایەتی ٢٢ی سوورەی موجادەلە:

**لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءهُمْ أَوْ أَبْنَاءهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُوْلَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُوْلَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ**

هیچ هۆزێک دەس ناکەوێ کە بڕوایان بە خودا و ڕۆژی ئاخرەت هەبێ و لە هەمان کات و حاڵەتدا ئەو کەسانەیان خۆش بوێ کە دەگەڵ خودا و پێغەمبەرەکەی خودادا دوژمنایەتی بکەن (واتە باوەڕی پێ نەکەن) هەچەن ئەو بێباوەڕانە برا و باب و کوڕ و هۆز و بەرەیان بن، (ئەوانەی پشت بە خودا دەبەستن و پشت دە دوژمنانی خودا دەکەن) کەسانێکن کە خودا ئیمانی دە ناو دڵ و دەروونیاندا ناژتووە و دامەزراندووە، بە یاریدەدان لە لایەن خۆیەوە، دەشیانخاتە ناو باغ و باغاتێکەوە کە ڕووباری لە ژێر داروبارەکانیەوە ڕەوانە و دەڕوا، هەتا هەتایەش لەوێدان، خودا لەوان ڕازی بووە و ئەوانیش لە خودا ڕازی بوون، ئەوانە حزب و دەستەی خودان، ئاگادارین بێگومان هەر دەستەی خوداش بەختەوەرن.

ئەو ئایەتە بیخە بەر تیشکی نووری ئیمان و ویژدان و کەرامەتی ئینسانی، جا پاشان دەست دە فانۆس و بگرێ لە خاوەن باوەڕانی ڕاستین لە دنیای ئەوڕۆدا. بۆ باوەڕی دڵ دە بە ئایەتی ٥١ی مائیدە، ئینسافانە قەزاوەت کە:

**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاء بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ**

ئەی ئەوانەی بڕوا و ئیمانتان هێناوە، جووولەکە و گاور مەکەن بە سەرپەرشت و دۆست و خۆشەویستی خۆتان، هەندێکیان یار و یاوەر و خۆشەویستی یەکترن، جا هەر کەسێ لە ئێوەی

**خاوەن ئیمان بیانکا بە سەرپەرشت و دۆستی خـۆی، بێ‌گومـان ئەو کەسـە لەوانە و بێ‌گومـان خودا ڕێنوێنی گرۆی ستەمکاران ناکا.**

سەیر کە، یەهوود و نەسـارا ئەهلـی کتێبیشـن، خـودا ئـاوای هەڕەشـە کـردووە و لە سـەر تێکەڵاوییان، ئەدی ئەگەر دەگەڵ ئەهلی بێ کتێب تێکەڵاو بن، دەبێ هەڕەشەکە چۆن بێ؟

دە جـوملەی ﴿إِلاَّ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَـاةً﴾ واتە دۆسـتایەتی و تـێکەڵاوی دەگەڵ بێ‌بـاوەڕان ئەگەر بۆ خۆپاراستن بێ لە شـەڕیان، یـا بەهـەرەیەک وەدەس خەن لە ئایینیـان یـا لە زانـین و لە سفەت و لە پیشەدا، ئەوە مەباحە. بە کـوردی و بە کـورتی: دەبـێ لە دوژمنـی دیـن و باوەڕتـان ئەمین و خاترجەم نەبن.

**سووکە ئاوڕدانەوەیەکی هەستیارانە:**

خودای حەکیم دەو ئایەتە ۲۸دا دەرس و ڕێنوێنییەکی سیاسی کۆمەڵایەتی نیشـانی ئینسـان دەدا کە نابێ بە هیچ دەلیل و هۆ غەیری خۆتان جڵەوی کاروبارتان بدەنە دەسـتی بێ‌بـاوەڕان و کافران و نابێ ڕێگای دەخالەتیان بدرێتێ بۆ لای کاروبارتان و نابێ بە قسەی چەور و شیرین و زمان‌لووسیان فریو بخورێ، چونکە کوفر کـارێکی بـۆ دیـن کەم خەتەرتـرە، لە هەڵوێسـتی ئەو کەسەی دە لیباسی دینیدا خۆی لێ دە کەمین ناوی و دەخەفتێ لە هەل کە بۆی بڕەخسێ.

لە سەر دابەزینی ئایەتی ۲۸ چەند هۆیەک هەن وپـاش گوێ‌دانیـان بە ڕەوا نازانـدرێ، جـا بۆیە بە پێویست زاندرا کە لە بابەت هاتنە خواری ئەو ئایەتە، دەستەکوتەیەک بکرێ:

۱. لە کوڕی عەباسەوە کە فەرموویەتی: ئەو ئایەتە لە بارەی سێ نەفەر لە یەهوودییەکـانەوە بە ناوەکانی «حجاج بن عمر»، «کهمس بن ابی الحقیق» و «قـیس بـن زیـد» دابەزیـوە، کە ئەو سێ کەسانە لە نهێنیدا خەریکی فریوی سێ نەفەر بوون لە یارانی ئیسلام بە ناوەکـانی «عبـدالله بن جبیر» «سعید بن خشیمه» و «رفاعه بن منذر» بەو کارە ناڕەوایە هەست پێدەکەن و دەزانن، بە زوویی خۆ دەگەیێننە لای ئەو سێ نەفەرە ئەنساریانە. پێیان دەڵێن ئێمە هەسـتن بەوەی کـردووە کە ئەو یەهوودیانە دەیانهەوێ ئێوە بە تەفرە بەرن و فریوتان دەن و لە ئیسلام پەشیمانتان کەنەوە؛ ئەمما ئەوان حاشایان کرد و زۆریان ئەرزش بۆ قسەی ئەو سێ نەفەرە ئەسحابە دانەنا و بە کاری خۆیان واتە تێکەڵاوی دەگەڵ یەهوودیان هەر ئیدامە پێ دا و وازیان لێ نەهێنان، سـەرەنجام تـا ئەو ئایەتە (۲۸ی ئالی عیمران) دابەزی.

۲. یەکێک لە ڕاویان بە ناوی «مقاتل» فەرموویەتی: هۆی دابەزینی ئەو ئایەتە ئەوە بـووە کە

گۆیا «حاطب بن ابی بلتعه» و ئی دیش کە دەگەڵ کافرەکانی قورەیش بە شێوەی خۆشەویستی و دۆستایەتی کە دە پێش ئیسلامبووندا هەیانبوو تێکەڵاوییان دامەزرا و بەردەوام هەبوو بە سەر زارەکی و خاڵی لە هەستی پاک و پڕ سەفای دڵی، چونکە موسوڵمان لەسەر ئەساسی ئایەتی ٢٢ی موجادەلە ناتوانێ و ڕێی پێ نەدراوە کە دەگەڵ بێباوەڕانی دژ بە خودا و ڕەسووڵی خودا، دۆستایەتی بەرقەرار کا، جا گۆیا هۆی دابەزینی ئەو ئایەتە (٢٨) ئەوە بووە کە خودای تەعالا تێکەڵاوی موسوڵمانی دەگەڵ کافران قەدەغە کردووە.

٣. یەکی دیکەش بە ناوی «کلبی» دەڵێ دابەزینی ئەو ئایەتە لەبابەت دووڕوویەکانی وەک «عبدالله بن ابی» و هاواڵانی ئەو دابەزیوە، نەک لە بابەت یەهوودییان، بەو دەلیلە: عبدالله بن ابی دەگەڵ دەستەیەک لە مونافقان بەمەنزووری بشێوی و دووبەرەکی و ئاژاوە نانەوە لە ناو یارانی پێغەمبەردا هەر خەریکی بیروڕا و تەگبیر بوو دەگەڵ هاودەستانی، بەو شێوەیە لە لایەکەوە خۆی بە دۆست و یار و یاوەری موسوڵمانان دەنواند و لە لایەکی دیکەشەوە دەگەڵ یەهوودی و موشریکەکان خەریکی فیتنەگێڕی و خەبەر بردن بە درۆ بێر و بەوێدا بوون بەو هیوایە کە ڕۆژێک بتوانن گورزێک لە باڵای ئایینی ئیسلام و محەمەد بدەن.

٤. یەکی دیکەش بە ناوی «ضحاک» بە نەقڵ لە «ابن عباس»ەوە دەڵێ: دابەزینی ئەو ئایەتی ٢٨ی ئالی عیمران دە بارەی یەکێک لە سەحابی ئەنساری بە ناوی «عبادة بن صامت» بووە. گۆیا ئەو دەگەڵ چەند نەفەر لە کافرانی یەهوود هاوپەیمان بون لە دەورانی جاهیلیەتدا و کاتێ کە پێغەمبەر بۆ خەزای ئەحزاب دەیهەوێ خۆ ئامادە بکا، ئەو کافرە هاوپەیمانانەی «عبادة بن صامت» دێنە لای و پێی دەڵێن: ئێمە خەبەرێکی وامان زانیوە کە پێغەمبەر خەریکە خۆ ساز کا بۆ شەڕی ئەحزاب، جا ئەگەر پێغەمبەر ڕازی بێ و ئیجازە بدا ئێمە پێنسەد نەفەر حازرین دەگەڵتان بێین و هاوکاریتان بکەین. «عبادة بن صامت» ئەو جەریانە بە حەزرەتی ڕەسووڵ ڕادەگەیەنێ. حەزرەتی پێغەمبەریش لە وڵامی ئەو پێشنهادەدا ڕادەمێنێ و دادەمێنێ کە ئایا چ بڵێ؟! خودای تەعالا بۆ تەسکینی دڵی پێغەمبەر ئایەتی ٢٨ی ئالی عیمران کە ئیشارەیە وەلای ڕەدی هاوکاری وان دادەبەزێنێتە سەر حەزرەتی ڕەسووڵ. (روح المعانی، ج١٥٩/٣ * تفسیر کبیر، ج١١/٨)

ئەو چوار ڕووداوانە دەگونجێن بۆ وەی هۆی دابەزینی ئەو ئایەتی ٢٨ە بن، جا لە سەر ئەو بۆچوونە دەبێیەی زانایان و قورئانناسان فەرموویانە هەر کامێک لەو چوار ڕیوایەتە بکرێتە هۆی

نازڵبوونی ئەو ئایەتە، ئیشکال نایەتە پێشێ.

دە جـوملەی ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَـيْسَ مِـنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ﴾دا ئەو هەسـتە دەکـرێ: واتە هەر خاوەن باوەڕێک لە جێی موسوڵمانان و خاوەن باوەڕان، بێباوەڕانی کـافر بە دۆسـت بگـرێ و ڕاز و نیازی پێ بسپێرێ و دە ئیختیاری نێ، ئەو موئمینە خاوەن باوەڕە لە دۆستایەتی خودا بەهرە نابا و چی بە نسیب نابێ. لە سەر ئەو بەراوەردە ئایەتەکە ئاوا تەعبیر دەکرێ: «فَلَيسَ مِـن وِلايَـةِ اللهِ في شَيَءٍ، فَلَيسَ مِن دينِ اللهِ في شَيَءٍ» یانی لە ئایینی خودادا هـیچ بەهـرەیەک بە نەسـیبی نابێ.

جوملەی «إِلاَّ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَاةً» یانی مەگەر یەکسەرە لە تێکەڵاوییان خۆ بپارێزێ.

لە سەر تەقیە واتە خۆ پارازتن چەند مەسەلەیەک هەیە و هەست دەکرێن:

۱. خۆپارازتن (تقية) سازشکاری، خۆ حاواندنەوە.

نەقڵ کراوە لە حەسەنی بەسری: گۆیا «مسـيلمة کـذاب» دوو نەفەران لە یـارانی پێغەمـبەر دەگرێ و دەیهەوێ عەزابیان دا ڕوویـان تێـدەکا و پێیـان دەڵـێ: ئایـا ئێـوە شـاهیدی دەدەن کە محەمەد پێغەمبەری خودایە؟ لە وڵامدا دوو جاران لە سەر یەک کوتیان: بەڵێ، بەڵێ. پاشان پێی کوتن: ئایا شـایەدیش دەدەن کە ئەمنـیش ڕەسـووڵی خـودام؟ یەکیـان کـوتی: بەڵـێ؛ ئەدێـرەدا موسەیلەمەی کەززاب کەوتە سەر ئەو خەیاڵەی بە شەهادەتی ئەو نەفەرە کە ئەو ڕەسووڵی بەنی حەنـیفەیە و محەمەدیـش ڕەسـووڵی قـوڕەیش، بەڵام نەفەری دووهەم کە شـەهادەتی لەسـەر پێغەمبەرایەتی محەمەدﷺ دا و سێ جـاران کـوتی: بەڵـێ، بەڵـێ، بەڵـێ؛ مـحەمەد پێغەمـبەری خودایە؛ ئەمما ئەتۆ نا؛ ئەمن ئینکارت دەکەم؛ ئەتۆ نە ڕەسووڵی خودای و نە وەلـی خـودای؛ لە سەر ئەو بێ تەقیەیەی، بە دەستی موسەیلەمەی کەززاب کوژرا، بەڵام ئەوەی هەوەڵ واتە ئەوەی کوتی ئەتۆش پێغەمبەری، لە سەر ئەو سازشکاریەی ئازاد کرا. کـاتێ ئەو جەریـانە بە پێغەمـبەر گەیی، پێغەمبەر فەرمووی: ئەوەی کوژرا لە سەر ڕاستی و باوەڕی ڕاستینی، بە پلەی شەهادەت گەیی و سەربەرزی برد و سـەربەرز بـێ. ئەوەی ئـازاد کـرا و سازشـکاری نوانـدووە بە تەمـای بەخشینی خودا، جا ئەی خودا ببەخشێ یا نەیبەخشێ، دەبێ بۆ وەی بزاندرێ ئایا ئەو نەفەرە لە بەزە و بەخشینی خودا نزیکە یا لە قەهـر و غەزەبـێ! بچیـنە خـزمەت ئـایەتی ۱۰۶ی سـوورەی نەحل:

مَن كَفَرَ بِاللَّهِ مِن بَعْدِ إِيمَانِـهِ إِلاَّ مَـنْ أُكْـرِهَ وَقَلْبُـهُ مُطْمَـئِنٌّ بِالإِيمَـانِ وَلَـكِن مَّـن شَرَحَ

**بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ اللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ**
**هەر کەس لە بڕوا بە خودا پاشگەز بێتەوە، لە پاش ئیمان و بڕواکەی (ئەوە ڕق و عەزابی خودای لە سەرە)، جگە لەوەی زۆری لێ دەکرێ لە کاتێکدا دڵی لە سەر بڕوا و ئیمان دامەزراوە، بەڵام هەر کەس دڵ و دەروونی بۆ کوفر و بێبڕوایی ئاوەڵا بێ، ئەوانە غەزەبی خودایان لە سەرە و سزایەکی گەورەشیان بۆ دیاری کراوە.**

لە هەڵسەنگاندن و بەراوەردی تەواوی ئەو ئایەتە ئەوە هەست پێ دەکرێ: کاری ئەو نەفەرە سازشکارە واتە «تەقیەباز» حەواڵە بە نیەت و هەستی دەروونیەتی، کە ئەو نیەت و هەستە دەروونییەش هەر خودا دەیزانێ.

پێویستە نەختێک تەقیەی هەڵگێڕ و وەرگێڕ کەین:

١. سازشکاری واتە تەقیە، کاتێ دەبێ کە ئینسان لە نێو هۆزی کافردا بێ و لە گیان و نامووس و ماڵی بترسێ و هەستی لەناوچوونیان بکا، ئەوکات بۆی هەیە بە زمانی چەور و شیرین و سازشکارانە خۆ لەو خەتەرە دەرباز بکا.

٢. سازشکاری دەبێ تەنیا بە خۆتەوە هەڵاوەسرێ، واتە زەرەری بۆ غەیر نەبێ، وەک سازشکاری لە سەر قەتڵ و زینا و داگیر کردنی ماڵ و شاهیدی بە درۆ، ئەوانە ناڕەوان و پەسەندی دین نین.

٣. سازشکاری بۆ پارازتنی گیان ڕەوایە، نەک بۆ پارازتنی ماڵ و سامان. شافعی: ئەگەرچی ئەو نەزەرە بە پێچەوانەی ئەو فەرموودە پیرۆزەی پێغەمبەرە «حُرْمَةُ مالِ الْمُسلِمِ كَحُرْمَةِ دَمِهِ؛ مَن قُتِلَ دونَ مالِهِ فَهوَ شَهيدٌ»، ئەو دوو فەرموودە پیرۆزانە ئەوەمان پێ دەڵێن: بۆ پارازتنی ماڵ و سامانیش سازشکاری واتە تەقیە ڕەوا بێ.

٤. لە شێخ حەسەنی بەسرییەوە: بۆ موسوڵمانان تا ڕۆژی قیامەت تەقیە دروستە.

هەروا لە یەکێک لە زانایانی ئیسلام ڕیوایەت کراوە بە ناوی «مجاهد» ئەو فەرموویەتی: سازشکاری دەگەڵ کافران لە سەرەتای پەیدابوونی دینی ئیسلام دروست بوو چونکە ئیسلام دەستەڵاتی لاواز و بێهێز بوو، ئەمما پاش ئەوەی ئایینی ئیسلام هێز و دەستەڵاتی گرت، ئەو سازشکارییە بە ناوی تەقیە بە ڕەوا نەزاندرا.

ئایەتی ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ﴾ لە سەر قەولی «ابومسلم بحر اصفهانی» ئاوایە: خودا ئێوە لە خۆی دەترسێنێ، بۆوەی نەتوانن گوناهان بکەن، تاکوو شایانی عەزاب بن. واتا لە ترسی

خودا گوناهان نەکەن تاکوو تووشی عەزابی خودا نەبن. بە کوردی: خودا ئەتۆ لەو نەفسە دوور دەکا کە تاوان بکا، جا بۆیە خودا لە ئاخری ئایەتەکەدا دەفەرمـوێ: ﴿وَإِلَى اللّٰهِ الْمَصِيرُ﴾ واتە خودا لە عەزابی خۆی بۆ کاتی گەڕانەوەتان بـۆ دیـوانی ئەو دەترسێنێ. (تفسیر کبیر، باسی هەمان ئایەتی ٢٨).

ئەگەر سرنج بگرین و ئایەتی ٢٨ هەڵسەنگێنین ئەوەمان بە ڕوونی و ئاشکرایی دێتە دەست کە خودا لە دۆستایەتی و تێکەڵاوی بێبڕوایان مەنـع دەکـا و وەدوورن دەخـا و هەر وا ئەو دوو ئایەتی ٢٩ و ٣٠ش هەر دەستووراتی ئایەتی ٢٨ وەرد دەداتەوە بە شێوەیەکی جیا؛ دەنا دە ڕاستیدا هەر هەمان مەبەست دەنوێنێ. بۆ ڕاستی ئەو داوایە دەچینە خزمەت ئایەتەکانی ٢٩ و ٣٠ بە نەزم و دەستوور و نۆرە:

**قُلْ إِن تُخْفُواْ مَا فِي صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ اللّهُ وَيَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ**

**بڵـێ ئەوەی لە نـاو دڵ و دەروونتانـدا دەیشـارنەوە، ئەوانەش وا دەریدەبـڕن خـودا دەیزانـێ، ئاگادارە لەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، خودا بە سەر هەموو شتێکدا بەتوانایە.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوەیەکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٢٩:**

بڵێ ئەی محەمەدﷺ: ئەی خاوەنی ئیمان! ئەگەر ئەوەی لە بابەت دۆستایەتی بێباوەڕان دە ناو دڵتاندایە، بیشارنەوە یا ئاشکرای کەن، خودای زانا دەیزانێ و هەر وا جگە لەوەی لە هەسـتی ناو دەروون ئاگادارە، ئەوەی لە ناو توێتوێی ئاسمانەکان و زەویدا هەیە ئاگاداریانە و دەیانزانێ، کەوایە دەبێ پڕ بە باوەڕەوە بڵێین: خودا بەتوانایە بە سەر هەموو شتێکدا و پاداشیشی بە گـوێرەی کردار دەداتەوە. جا لە سەر ئەو ئەساسە خاوەن باوەڕ نابێ بێئەمری بکا دەگەڵ خـودا، چـونکە ئەگەر بیکا، خودا ئاگادارە بە پێی ئەعمال تووشی عەزابی خودای بێباک دەبێ.

ئەو ئایەتە تەواوکەری کوتەی ئایەتی پێش خۆیەتی، چونکە دیارە دە ئـایەتی ٢٨دا خـودای تەعالا خاوەن باوەڕانی لە دۆستایەتی و تێکەڵاوی کافران مەنع کرد و دە ئـایەتی ٢٩شـدا خـودا ڕایدەگەیێنێ کە خاوەن ئیمان نابێ دە ناوماڵی دڵ و دەرووندا دۆستایەتی بێباوەڕانی کافر جێ کاتەوە، پێی وابێ خودا پێ نازانێ؛ چونکە خودای حەکیم هەچی ئاشکرا و شاراوە بێ دەیەزانێ و پێی ئاگادارە. ئایەتی (مَا فِي صُدُورِكُمْ) واتە ئەوەی شاراوەی ناو دڵە خودا لێی ئاگادارە.

دڵ دەڵێ: لە سەر ئەساس و ئادابی عیلمی نەحو، دە ئایەتی ﴿إِن تُخْفُواْ مَـا فِي صُـدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ اللَّهُ﴾ ئیشکالێک هەست پێ دەکرێ، ئیشـکالەکەش ئەوەیە: جـوملەی «ان تخفـوا ...» شەرتە و جەزای دەوێ کە «یعلمه الله»یە، جەزای شەرتیش پاش شەرتەکە دەبێ بێ. جا لە سەر ئەو ئەساسە زانستی خـودا بە شـاراوەی نـاو دڵ دەبـێ حـادس بـێ واتە پەیـدابوو. یـانی خەیاڵات و گومان دەبێ واریدی ناو دڵ بێ، جا پاشان زانستی خودا (علم الله) ڕوو بدا و بێـتە ڕوو، ئەوەش لەمەڕ خودا محاڵە کە خودا زانستی پێش هەموو شت نەبێ، واتە تا شت ڕوو نەدا زانستی خودا سەر نەگرێ، دەبێ بۆ خۆ ڕزگار کردن لەو ئیشکالە چۆن ئایەتەکە بەراوەرد کەین؟

وڵام و چارەسـەری: «حـدوث» واتە پەیـدا بـوون دە زانسـتی خـودادا نیـیە بەو جـۆرە کە بکوترێ: شت تا نەبێ، عیلمی خوداش نابێ، چونکە خودا زانا بە بوون و نەبوونە، و بە هەوەڵ و ئاخری هەموو شتە، کەوایە دەبێ بکوترێ دەو ئـایەتەدا پـێش ئەوەی شـت واریـدی دڵ بـێ، خودا زانایە بە وارید بوون و نەبوونی؛ ئەگەر یەکێـک بێـت و بڵـێ: جـا خـۆ دڵ خـانەخوێ و پەناگای بیر و خەیاڵاتە، نەک سینە؛ بۆچی خودا دە ئـایەتەکەدا فەرمـووی (مـافی صـدورکم)، نەیفەرموو (ما في قلوبکم)؟ لە جوابدا دەبێ بکوترێ: دڵ دە نـاو مـاڵی سـینەدایە، دەتـوانێ لە هەندێک شوێن لە جێگـای دڵ دانیشـێ، وەک لە ئـایەتی ٥ی سـوورەی ناسـدا ئەو شـتە هەیە: ﴿الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ﴾ واتە بیروڕا، دەخاتە ناو دەروونی خەڵکیـیەوە، (وەسوەسـە )، واتە دڵ دەمێنێ بە خەیاڵاتی شەیتانی.

هەروەها وەک لە ئایەتی ٤٦ی سوورەی حەجدا دەڵێ:

**أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُـونَ بِهَـا أَوْ آذَانٌ يَسْـمَعُونَ بِهَـا فَإِنَّهَـا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ**

**ئایە بە سەر زەویـیەدا نەگەڕاون تـاکوو ببـنە خـاوەنی دڵێـک کە پێـی تێبگەن، ببنە خـاوەنی گوێیەکیش پێی ببیستن، بێ گومان چاوەکان کوێر نـابن، بەڵام ئەو دڵانە کـوێر دەبـن کە وان لە ناو سینەکاندا.**

ئەوە دەرکەوت کە دەو ئایەتەشدا سینە لە باتی دڵ ناو براوە.

دڵ لە بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی ئەو ئایەتی ٢٩یە ئەو هەستە دەکا: ئەگەر ئایەتەکە هەڕەشە بێ لە سەر ئینسان بەو جۆرە: هەچی بە دڵدا بێت و ڕابرێ، خودا پێی ئاگایە و دێـنە حیسـاب و

ژمار ڕۆژی خۆی، بێ‌گومان وەک داوای لە توانا بەدەر دەچێ، چونکە هیچ کەس ناتوانێ پێش بەو شتانە بگرێ کە خۆ ڕۆدێڵنە نـاو ژووری دڵەوە، خـۆ ئەوەش بەشـێکە لە ئـیمان و بـاوەڕ کە خودا لە توانا بەو لاوە داوا ناکا لە ئینسان، جا دەبێ بـۆ چـارەی ئەو ئیشـکالە چـۆن ئەو ئـایەتە بەراوەرد کەین و هەڵیسەنگێنین؟ دەبێ بڵێین بەو کەسانەی کە خوازیاری جوابی ئەو ئیشکالەن، ڕوو بکەنە تەعبیری ئایەتی ۲۸۴ی بەقەرە کە دەوێدا هەمان ئەو ئیشـکالە خـرایە ڕوو و وڵامـمان داوەتەوە. بۆ زێدە زانین بڕوانە «تفسیر کبیر»، هەمان ئایەتی ۲۸۴ی بەقەرە.

**تیوتیوە:**

ئەو ئـایەتە ڕووی تـایبەتی دەو کەسـانەیە کە بە کەڵـک وەرگـرتن لە ئەمـری «تەقـیە» واتە سازشکاری و لە ژێر دامێنی ئەودا دەگەڵ کافرانی بێ‌باوەڕ تـێکەڵاوی پێـک دێـنن و بەرقەراری دەکەن، جا خودا بۆ پووچەڵ کردنەوەی خەیاڵی خاویان و لەقاودان ئەوەی لە بن پەڕەی دڵیانـدا شـاردوویانەتەوە دەفەرمـوێ: ئەی پێغەمـبەر بڵـێ بەو بێ‌بـاوەڕانە، خـودا بەو شـتانەی دە نـاو دڵوودایە چ ئاشکرای کەن چ وەیشـارن، پێـی زانـایە و ئاگـادارە، چـونکە ئەوەی دە ئاسـمان و توێ‌توێیەکانی زەویدایە خودا پێیان ئاگایە و بەتوانایە لە سەر هێنان و بردنیان.

**تەقیە**

وا هەست پێدەکرێ لە سیمای ئایەتی ۲۸ تەقیە دە کاتی خۆیدا شەرع موخـالیفی نەبـێ، لە بەر پارازتنی گیان و ماڵ و ئابڕوو و حەیا لە شەڕی دوژمنـان، جـا لە سـەر ئەو بـاوەڕە پێویسـتە نەختێک وەکۆڵدرێ لە تەقیە.

تەقیە بە گوێرەی چۆنیەتی دوژمن دەبێ دوو جۆر بێ: دوژمن یا دوژمنی دینییە، یا دوژمنی ماڵ و سامانە؛ واتە ئامانجی ماڵ و دارایی و سەروەرییە بە سەر موسوڵمانان. بەشی هەوەڵ واتە دوژمنی دینی ئەگەر بەرەنگارت بوو، ئە دەوەیدا ئەرکی موسوڵمان ئەوەیە هەر کـات و زەمـانێ موسوڵمان لە هەر کوێ بێ کە نەیتوانی بە ڕاشکاوی و ئاشکرایی دین و ئایینی خۆی بەیان کا و ڕایگەیێنێ لە ترسی دوژمنانی دینی، ئەوە ئەرکە لە سـەری لەو شـوێنە بـڕوا و نەمێنـێ و بچێـتە شوێنێکی کە بە ڕاشکاوی بتوانێ دینی خۆی ئاشکرا کـا، ئەمـما ئەگەر هـات و ئەو ئینسـانە لە موسوڵمانی لاواز و بێ‌هێز بـوو، لەبەر منـداڵان و دەس‌کـورتی، یـان ژن بـوو نەیتـوانی، یـان نەخۆش بوو نەیتوانی، ئەوە ئەگەر وەشمێنێ لەو وڵاتە، بە تاوانبار نایەتە ژمـار. بـۆ ئەو ڕاسـتییە

دەچینە خزمەت ئایەتەکانی ٩٧ تا ٩٩ی سوورەی نیساء:

إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلآئِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُواْ فِيمَ كُنْتُمْ قَالُواْ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالْوَاْ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَا فَأُوْلَـئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلاَّ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاء وَالْوِلْدَانِ لاَ يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلاَ يَهْتَدُونَ سَبِيلاً ﴿٩٨﴾ فَأُوْلَـئِكَ عَسَى اللّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ وَكَانَ اللّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾

**بێ گومان ئەو کەسانەی سەبارەت بە خۆیان ستەمکار بوون، کە فرشتەکان بۆ گیان کێشان دەچنە لایان، پێیان دەڵێن: ئێوە لە چ بارودۆخێکدا بوون و هەڵوێستتان چ بوو؟ دەڵێن: ئێمە لە سەرزەویدا چەوسێنراوە و زەبوون کرابووین. دەڵێن ئەی زەوی خودا پان و بەرین نەبوو، کۆچی تێدا بکەن؟ کەواتە ئەوانە جێگایان دۆزەخە، کە خراپترین جێگا و مەئوایە. (٩٧) جگە لەو چەوسێنراوە و لاوازکراوانە، لە پیاو و ژن و منداڵان، کە توانایی هیچ چارەسەر کردنێکیان نییە و هیچ ڕێگایەکیش شک نابەن (٩٨) کەواتە ئا ئەوانەیان هیوایە خودا لێیان خۆش بێت و بیانبەخشێ، لە ڕاستیدا خودا چاوپۆشیکەر و لێبوردە و دڵۆڤانە (٩٩)**

جا لە سەر ئەو ئەساسە سازشکاری و حاوانەوەی موسوڵمانان بە زاهیری دەگەڵ کافران ڕێی پێ دراوە لە لایەن دینی ئیسلامەوە. دەنا ئەگەر موسوڵمان خۆ ڕێک نەخا و خۆ نەحاوێنێتەوە دەگەڵ بێباوەڕان، بە دەردی ئەو دوو ئەسحابانە دەچن کە بە دەستی موسەیلەمەی کەززاب چوون. نەختێک بگەڕێوە بۆ دواوە دەزانی چۆن بووە.

٢. ئەوەش بەشی دوو لە تەقیە: دەبینی موسوڵمانێک دەگەڵ غەیرە موسوڵمانێک دە ماڵ و سەروەت و داراییدا وەک یەک وان، واتە هەردووکیان ماڵپەرستن و بە یەکەوە دۆستایەتییان هەیە بە گەرمی؛ و ناموسوڵمانەکە بە تەمای ماڵی موسوڵمانەکەیە؛ ئایا ئەو موسوڵمانە پێویستە لە سەری تەرکی دۆستایەتی ئەو ناموسوڵمانە بکا و لەو وڵاتەش بڕوا؟ بەڵێ دەبێ بڵێین: مشتومڕ و ڕا و بۆچوونی زانایانی ئایینی لەو بارەوە زۆرە و هەیە: هەندێکیان دەڵێن: واجبە ئەو موسوڵمانە جگە لە تەرکی دۆستایەتی ئەو ناموسوڵمانە، دەشبێ لەو شوێنە بڕوا و نەمێنێ. بەو دەلیلە: ئەو ناموسوڵمانە بە تەمای ماڵی ئەو موسوڵمانە بۆتە دۆستی، و هەروا موسوڵمانەکەش بۆ پارازتنی ماڵەکەی دەگەڵی بۆتە دۆست؛ خۆ دیارە ئایینی ئیسلامیش پارازتنی ماڵی دنیاشی بە ئەرک داناوە لە سەر خاوەن ماڵ، بەڵکە نابێ کەڵین بدرێ بە بێهوودە ماڵ و سامانت بە فیڕۆ بڕوا، جا بەو پێیە وەک پارازتنی گیان پێویستە، پارازتنی ماڵیش پێویستە، بە پێی کوتەی ئەحمەد

و ئەسحابی سونەن لە ئیبنی ماجە و ئیبنی حەیان: لە سەر ئەو ئەساسە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: «مَن قُتِلَ دونَ مالِهِ فَهوَ شَهيدٌ» واتە کێ لە سەر دیفاع و پارازتنی ماڵ و دارایی بکوژرێ شەهیدە. دەیجا دیارە ئەو فەرموودە بەنرخ و پیرۆزە ئەوەمان پێ دەڵێ: پارازتنی دارایی، ئەرکە؛ جا بۆیە دەبێ ئەو موسوڵمانە تەرکی دۆستایەتی ئەو ناموسوڵمانە بکا و دووریش کەوێتەوە لەوێ.

هەندێکیش لە زانایانی ئایینی کوتوویانە: ڕۆیشتن دێرەدا ڕەوا نییە، چونکە هۆیەکەی دەبێتە پارازتنی بەهرەی دنیایی.

هەندێکیش دەڵێن: حاوانەوە و سازش و دۆستایەتی ئەگەر دژایەتی دەگەڵ پایەی دین نەبێ و زیانی بۆ گەل و کۆمەڵ نەبێ، بە ناڕەوا نەزانراوە و نایەتە ژمارە.

هەندێکی دیش کوتوویانە هەچی دەبێ با ببێ ئەمما نیەت پاک بێ، واتە دە نیەتدا نەگۆڕێی.

ئەمما بۆ دامرکاندنی کولّی دڵ و پاڵپشتی قایم و دوور خستەنەوەی دڵ لە دڵەڕاوکە و دوودڵی دەچینە خزمەت ئایەتی ٨ و ٩ی سوورەی مومتەحینە:

**لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾**

**خودا ڕێتان لێ ناگرێ سەبارەت بەو کەسانەی کە لە سەر دین شەڕیان دەگەڵتان نەکردووە و لە وڵات و زێدی خۆیان دەریان نەکردوون، چاکەیان دەگەڵ بکەن و دادگەرییان دەگەڵ بنوێنن. بێگومان خودا دادگەرەکانی خۆش دەوێ.**

**إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَىٰ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٩﴾**

**بێگومان خودا تەنیا سەبارەت بەوانە ڕێتان نادا دۆستایەتییان دەگەڵ بکەن کە لە سەر دین شەڕیان لەگەڵتان کردووە و لە وڵات و زێدی خۆتان وەدەریان ناون و بۆ دەرکردنتان پشتگیری یەکتریان کردووە، هەر کەسێکی دۆستایەتییان لەگەڵدا بکا، ئەوانە ستەمکارن.**

ئەو دوو ئایەتە ڕێنومایی و شارەزای بە تێروتەسەلی دەدا بە هەموو ئەقڵ و شعوور لە بابەت دۆستایەتی و تێکەڵاوی موسوڵمان دەگەڵ ناموسوڵمان، خودا ڕێگای تەقیە و بازدان بێر و

بەوێدای بڕیوە.

**بۆ ئاگاداری:**

ئەوە مومکینە و لە عەقڵ دوور نییە کە خودای حەکیم و خاوەن سەبر لە سەر گوناە و تاوان دامانەگەڕێتێ دەستەولەجێ، بەڵکە مۆڵەتمان داتێ، ئەمما ئەو مۆڵەتدانە نابێ بکرێتە هۆی سەرەڕۆیی و فریو و خۆ لەدەستدان و خۆ ونکردن، چونکە دەبێ ئەوە بکرێتە هەوێنی دڵ و کەلی ئیمان ڕۆژی قیامەت دادێ کە هەر ئەوێش مەیدانی تۆڵە و سزا و حیسابە، و خوداش هەچی بەری داری کردەوە و ئاکارە، نیشانمان دەدا و دەرخواردمان دەدا، جا بۆ ئەو ڕاستییە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٣٠ی ئالی عیمران:

**يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوَءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ أَمَدًا بَعِيدًا وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ وَاللَّهُ رَؤُوفٌ بِالْعِبَادِ**

**لەو ڕۆژەدا هەر کەسێک هەرچی کردووە لە خێر و شەڕ، چاکە و خراپە، ئامادەیە، حەزی لێیە خۆزگە لە نێوان ئەو و ئەو کارانەیدا مەودایەکی زۆر ببوایە، خودا دەتانترسێنێ لە جەزرەبەی خۆی، خوداش سەبارەت بە بەندەکانی دلۆڤانە.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر سیما و ناوەندی ئایەتی ٣٠:**

ئەو ڕۆژەی کە ڕۆژی حیسابی پاداش و تۆڵەیە، هەر کەسێک کاری باش یا خراپ لە نامەی ئەعمالیدا بێ، بە مۆر و تەواوەوە وە ئەستۆی دەخرێتەوە، واتە چاکی کردبێ، بەهرەکەی دەست دەکەوێ، خراپی کردبێ، تۆڵەکەی دەچێژێ. یانی بە چاو پێکەوتنی چاکەکانی کەیفی خۆش دەبێ و دەگەشێتەوە و بە چاو پێکەوتنی خراپەکانی خەفەت دایدەگرێ و تێک دەچێ، ئارەزوو دەکا و دەخوازێ، دەڵێ: خۆزگایەک و لە ناوەندی ئەو ئاکارە خراپانەم بەو ئەندازەیە دوور و درێژی ببوایە کە هەرگیز چاوم بەو کردارانەم نەکەوتبایە.

دیارە ئەو ئایەتە پیرۆزە ئیشارەی ڕوون و ئاشکرایە کە خودا عەبدی خۆی بە هۆی سزا و تۆڵەی تاوانیان دەترسێنێ، واتە تۆڵە وەبەر ئینسان دەنێ، بۆ خاتری ئەوەی کە ئینسان لە خراپەکاری وەگەڕێ و بپرینگێتەوە، ئەو ئاگاداریەی خودا دەیدا بە عەبدی، ئاماژەیە وەلای ئەوەی کە خودا دەگەڵ بەندەکانی میهرەبانە و نایهەوێ عەبد تووشی عەزاب بێ.

دێرەدا خودای تەعالا کردەوەکانی ئینسانی ئیشارە وەلا دەکا و دە ئینسانان دەگەیێنێ، پێش

ئەوەی ڕۆژی حیساب دابێ و هیچ جۆرە تاوان و کردارێکیش لە چاک و لە خراپ ون نابێ و لە ناو ناچێ، بەو دەلیلە کە وشەی «خیر و سوء»ی ناو ئـایەتەکە. کە بە نـامەعلوومی واتە «نکـرە» هاتوون نیشـانەی عمـوومیەت و گشـتی دەگەیێنـێ، بە کـوردی و بە کـورتی: ئینسـان هەچـی کردبێتی دەخرێتەوە ڕووی.

دڵ دەیهەوێ ئاوڕێکی نەحوییانە وەسەر وشەی «یـوم» وەدا تـاکوو بـۆی دەرکەوێ سـڕ و ڕازی نەسبەی «یوم»ی چییە؟

زانایانی عیلمی نەحویش چەند ڕێگایەکیان لێ ڕەچاو کردووە، بۆ نموونە:

«ابن انباری» کە یەکێکە لە زانا و شارەزاکانی یاسای نەحـو، فەرمـوویەتی: «یـوم» لە سـەر ئایەتی ٣٠ هەڵاوەسراوە بە «مصیر»ی نهێنی؛ ئەودەم ئاوا دەکـوترێ (وَ الـی اللـهِ الْمصـیرُ یَـومَ تَجِدُ) واتە وەلای خودا دەگەڕێتەوە ئەو ڕۆژەی کە هەچی نەفسە بە کردەوەی خۆی ئاشنا دەبـێ و پێی دەگا.

یا دەکوترێ: جوملەی (وَیُحَذِّرُکمُ اللّهُ نَفْسَـهُ) عـامله دە «یـوم»دا، ئەودەم ئـاوا دەکـوترێ: (وَیُحَذِّرُکمُ اللّهُ نَفْسَهُ فی ذلک الیوم).

یا دەکوترێ: عامل دە «یوم»دا (وَاللّهُ عَلَی کلِّ شَیْءٍ قَدِیرٌ)ە، ئەودەم ئاوا تەعبیر دەکرێ: أَي قَدیرٌ في ذلک الیومِ الذي تَجِدُ کلُّ نفسْ ما عَمِلَت مِن خَیرٍ الخ).

یا دەڵێن: عامل دە «یوم»دا «تَوَدَّ»یە، ئەودەم ئاوا دەکوترێ: (تَوَدُّ کُلُّ نَفـسٍ کَـذا و کَـذا في ذلِکَ الیومِ) واتە دەو ڕۆژەدا دەحوبێنێ هەچی دوور بێ لە تاوان دەو ڕۆژەدا.

یا دەشکرێ بکوترێ: «یوم» مەنسووبە واتە فەتحداره بە هۆی فیعلێکی نادیار؛ ئەودەم ئـاوا دەکوترێ (و اذکر یَوْمَ تَجِدُ کلُّ نَفْـسٍ) واتە بـیخەرە یـادت ئەو ڕۆژەی کە هەچـی بە کـردەوەی خۆی دەگا.

بۆ ئیسباتی ئەوەی کە هەچی نەفسە بە وەرەقەی نـامەی ئەعمالـی دەگـا و ئاشـنا دەکـرێ، دەچینە خزمەت ئایەتی ٢٩ی جاسیە:

**هَذَا كِتَابُنَا يَنطِقُ عَلَيْكم بِالْحَقِّ إِنَّا كنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كنْتُمْ تَعْمَلُونَ**

**ئەوە کتێبەکەی ئێمەیە کە بە ڕاستی لە سەرتان دەدوێ، بەبێ گومان ئێمە ئەوەی کە دەتـانکرد هەر وەک خۆی، بێ کەم و زیادمان نووسییەوە.**

دڵ دەبێ بە یەقینی ئەوەی باوەڕ و ئیمان بێ کە خودا ئینسانی خۆش دەوێ، بەو دەلـیلە کە

خودا بۆخۆی ئینسانی ئاگادار دەکاتەوە کە تۆبە بکا لە تاوان و وەگەڕێ، مۆڵەتی دەدا خـودا کە خۆی حازر کا بۆ تۆبە و گەڕانەوەی لای کاری چاک، تاکوو بـۆ ڕۆژی قیـامەت بە ڕووسـیایی نەیەتە دیوانی خودا، بۆیە خودا دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ رَؤُوفٌ بِالْعِبَادِ﴾ واتە خودا میهرەبـانە لەگەڵ بەندەکان.

دەبێ ئەوە بسەلمێنین خودا پایە بە پایە ڕێنوێنی بەندەکانی دەکا دە کاتی خۆیدا، وەک ئەوە: بە هۆی ئایەتی ٢٦ی ئالی عیمران گەورەیی و دەستەڵاتی خۆی نیشانی عەبـد دا و تێیگەیانـد و هەروا لە پاشان بە هۆی ئایەتی ٢٨ی ئـالی عیمـران خـاوەن بـاوەڕی ئاگـادار کـردەوە لە سـەر ئەوەی: دۆستایەتی و تێکەڵاوی بێباوەڕان نەکا، چـونکە بێبـاوەڕ لە فریـودان و خلیسـکانیان غافڵ نین، پاش ئەو ڕێنوماییە و ئاگادارییەی خودا بۆ موسوڵمانان، ئەوجار خودا ئەوەی فێـری موسوڵمان دەکا کە چۆن بکا باوەڕی پێ دەکرێ کە خودای خۆش دەوێ و ئیتاعەی دەکا؛ دەبێ ئیتاعەی پێغەمبەر بکا و بە قسەی بکا؛ جا ئەوجار بۆ باوەڕ پێکردن دەبـێ، کە خـودای خـۆش دەوێ و خوداش بێگومان دەبوورێ لە تاوانی ئەو کەسانە، کە ئاوا پێغەمبەر ئیتـاعە دەکەن. بـۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٣١ی ئالی عیمران:

**قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾**
**ئالی عیمران**
**ئەی محەمەد، بڵێ بەو عـالەمە: ئەگەر ئێـوە خوداتـان خـۆش دەوێ دوای مـن بـکەون، تـاکوو خوداش ئێوەی خۆش بوێ، چاوپۆشی لە تاوانەکانتـان بکـات، خـودا دە زاتـی خۆیـدا گەلێـک لێبوردە و دلۆڤانە.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر سیما و ناوەرۆکی ئایەتی ٣١:**

خودای تەعالا بۆ ڕێنوێنی موسوڵمان و ڕاسـتی ئەوەی دەیڵـێ، بە پێغەمـبەری دەڵـێ: بەو بەندانە بڵێ: ئەگەر ئێوە بەڕاستی خوداتان خۆش دەوێ و دۆسـتی ئەون، وەدوای مـن کەون و پەیڕەویم لێ بکەن تاکوو خوداش خۆشی بنوێن و بە دۆستی خۆتان لێ بڕوانێ و لە تاوانیشتان بڕوانێ، دیارە خودا ببوور و مێهرەبانە.

خودای تەعالا بەندەی خۆی بانگ دەکا لە بابەت ئایینەوە خـاس و خـالیس بـێ و خـۆ بە دوور بگرێ لە موشریکایەتی، بەو دەلـیلە ئەو ئـایەتە ئەو بانگـاوازە دەکـا لە ئینسـانی: چـونکە ئیخلاس ناکرێ کامڵ بێ لە دیندا، تاکوو بە تەواوی نەکەویە سەر ڕێگای خودا خۆشەویستی و

ئیتاعەی ئایەتەکەش هەر ئەوەمان پێ دەڵێ.

ئینسان دەبێ خۆی فریـو نەدا، بەم جـۆرە وا بیـر بکـاتەوە کە خـودا خۆشەویسـتی هەر بە کوتەیە، بەڵکە دەیەوێ خودا خۆشەویستی لە سەر ئەساسـێک بـێ کە خـودا بە شـایانی خـۆی بزانێ و پەسەندی کا. ئەویش ئەوایە: کە دەبـێ ئەو خۆشەویسـتییە لە سـەر ئەساسـی ئـیمان و باوەڕی بەو دینە بێ کە سـەراپای پێغەمـبەران پێـوە هەڵوێسـتاون و ڕاگەیێـنەری ئەو بـوون هەر ئەوەشە هۆ کە خودا بەڕاست و ڕەوانی فەرموویەتی: کێ دەیهەوێ دۆستی خودا بێ و خـودای خۆش بوێ، ئەی محەمەد پێی بڵێ: با ئەو شـەرع و ئـایینەی ئەتـۆ پێـی دەڵێـی و ڕایـدەگەیێنی ئیتاعەی بکا و شوێنی کەوێ، ئەو زەمان باوەڕی پێ دەکـرێ کە ڕاسـت دەکـا خـودای خـۆش دەوێ و خوداش ئەوی خۆش دەوێ و لە تاوانی دەبووری.

گۆیا ئیمام زەحاک لە ئیبنی عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێک حەزرەتـی ڕەسـوول دەچێـتە ناومـاڵی مەکـکەی مەبـارەک، دەو کـاتەدا پێغەمـبەر چـاو دەکـا موشریکەکـان ئەوە خەریکـی دامەزراندنی بتانن لە دەوروبەری ماڵی کەعبە و دەیـانهەوێ خـۆراک و هـێلکەی وشـترمورغی ڕۆبێڵنە ناو گەرووی بتەکان و سەژدەشیان بۆ دەبەن. حەزرەتـی ڕەسـوولیش ڕوویـان تێـدەکا و پێیان دەڵێ: «یا مَعشَرَ الْقُرَیشِ لقد خالَفتم ملـة أبـیکم ابـراهیم و اسـماعیل و لقـد کانـا علـی الاسـلام» واتە ئەی گەلـی قـوڕەیش بـزانن ئێـوە دەگەڵ ئـۆمەتی بـاب و باپیرتـان، ئیبراهـیم و ئیسماعیل، مخالەفەتو کرد چونکە ئەوان لە سەر ئایینی یەکتاپەرەستی و ئیسلام بوون. ئەوانـیش لە وەڵامی پێغەمبەردا گوتیان: «یا محمد إنّما هذه حبّاً للهِ تعالی لتقربنا الی الله سبحانه زلفـی» واتە: ئەی محەمەد ئێمە ئەو بتانە ڕاستەوخۆ بە خاتری خۆشەویستی خودایـان دەیانپەرەسـتین، تاکوو ئێمە لە خودا نیزیک وەخا.

جا ئەدێرەدایە هۆی دابەزینی ئەو ئایەتە پیرۆزانەی ٣١ و ٣٢ی ئالی عیمران.

و هەروا دووبارە هۆی دابەزینی ئەو ئایەتـانە ئـیمام ئەبوسـاڵح ئـاوا دەفەرمـوێ: گۆیـا ئەو ئایەتانە دە بەرابەر قسە و داوای یەهوودیانی نەفام و لاسـاردا دابەزیـون کە دەیـانکوت: ﴿نَحْـنُ أَبْنَاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ ﴿١٨﴾ مائدە﴾ واتە ئێمە کوڕان و خۆشەویستانی خوداین.

دیارە کاتێ حەزرەتی ڕەسوول ئەو ئایەتەی بۆ خوێندنەوە، واش ئینکاریان کرد.

هەروا لە بابەت دابەزینی ئایەتی ٣١ ئیمام مـحەمەد ئیبنـی ئیسـحاق کە لە مـحەمەد ئیبنـی جەعـفەری کـوڕی زوبەیـریڕا نەقـڵ دەکـا فەرمـوویەتی: دابەزینـی ئەو ئـایەتە هـۆیەکەی

مەسیحیەکانی نەجران بوون کە دەیانکوت ئێمە لە بەر گەورایەتی و دۆستایەتی خودا حەزرەتی عیسا مەسیحی هەم بە گەورە دادەنێین هەم دەیپەرەستین. جا خـودای تەعـالا بە وەسـیلەی ئەو ئایەتە هەڵوێست و ئامانجەکەیان ڕەد کردەوە.

و هەروا هەندێک لە قورئانزانەکان نەزەریان وایە هۆی دابەزینی ئـایەتی ٣٢ ئەوەیە: کـاتێ ئایەتی ٣١ دابەزی، عەبدوڵڵا ئیبنـی ئـوبەی دوژمنـترین دوژمنـی مـحەمەد و ئـایینی ئیسـلام بە هاواڵەکانی خۆی کوت لە ڕێی فیتنە و ئاژاوەنـانەوە: مـحەمەد ئیتـاعە لە خـۆی وەک ئیتـاعە لە خودا هێنایە ژمار و حیساب، بـۆ وەی خەڵـک وەک مەسـیحییەکان چـۆن عیسـای بە دۆسـت دەزانن و دەیپەرەستن، ئەوانیش ئاوا ئەوی بە دۆست بزانن و بیپەرەستن. (روح المعانی، ١٧٣/٣)



دە جوملەی ﴿قُلْ إِن كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي﴾دا دڵ هەست بە شتێکی لابـراو و شـاراوە دەکا، ئەویش ئەوەیە: «قل یا محمد لمن یدعی حـب الـله مـن امّتـک، ان کنـتم تحبـون الـله، فاتّبعونی» واتە ئەی محەمەد بڵـێ، ئەگەر بەڕاسـتی دە داوای خۆتـدا ڕاسـتی، لە دەسـتووراتی خودای تەعالادا لە بابەت ئیجرای ئەحکام و ئەمر و نەهیدا، ئیتاعەی من بکە.

ئەوجار دەبێ ئەوە بزاندرێ مەبەست لە خۆشەویستی خودای بێهاوتا خۆشەویستی زاتـی نییە، چونکە خودای بێوێنە ژووراتر لەوەیە ئینسان بتوانێ خۆشەویستی زاتی دەگەڵ پێک بێنێ. بەڵکە پێویستە ئینسان لەو خۆشەویستییەدا ئاوا بیر بکاتەوە کە ئیتاعە و فەرمـانبەری خـودا بکـا، جا بۆ گەیشتن بە قۆناغی ئیتاعەیی لە خودا دەبێ خۆ بگەیێندرێتە پلەی دۆستایەتی پێغەمبەران، دەنا ناکرێ بەو مەبەست و هەدەفە کە خۆشەویستی خودایە بگەی. ئەودەم هاوار و داوای خودا خۆشەویستی دەبێتە هاواری بە درۆ.

**تیوتیوە:**

ئەگەر دەتهەوێ خودات یاریکار و دۆست بێ، وەشـوێن دیـن و شـەریعەتێکی بـکەوە کە پێغەمبەر ڕایگەیاندووە، دەنا بە زمان هاوار کەیە خودا و ڕەسوولی خودا دە ئەعمال و کرداریشدا وەشوێن بێباوەڕان و دوژمنانی دین و ئەخـلاق کەوی، ئەوە ڕەنـج بەخەسـار دێـیە حیسـاب و ژمار. بۆ تەئید و ڕاستی ئەو ئیدیعایە دەچینە خزمەت ئایەتی ٣٢:

**قُلْ أَطِيعُواْ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْكافِرِينَ**

**ئەی مـحەمەد، بڵـێ بەو عـالەمە: هەر لە خـودا و پێغەمـبەر پەیـڕەوی بـکەن، ئەگەر پشـتیان**

**هەڵکرد، بێگومان خودا کافر و بێبڕوایانی خۆش ناوێت.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٣٢:**

ئەی محەمەد بڵێ بە هەموو ئینسانێکی خاوەن بـاوەڕ، ئیتـاعەی خـودا و ڕەسـووڵی خـودا بکەن، بە خالیسی و کرداری جوان و چاکیش بکەن و ڕەواجی پێ بدەن. ئینجا ئەگەر هاتو پاش ئەو پێڕاگەیاندنەی تۆ، ڕوویان وەرگێڕا لە ئیتاعەتی خودا و پێغەمبەر و خۆیان گەیاندە دەرووی بێباوەڕی، بێگومان خودا ئاگادارە پێیان و بێبڕوایانیشی خۆش ناوێ.

ئەو ئایەتە ئەوە دە ئینسان دەگەیێنێ کە ئیتاعە لە پێغەمبەر واتە چی؟ یانی دەبـێ ئینسـان بە ڕاستی و خالیسی ئەوە بزانێ کە ڕێگای پێغەمبەر بەجوز کۆمەڵێک یاسای ئەمـر و نەهـی نـین، ئیتاعە لە پێغەمبەریش ئەوەیە کە ڕاستەوڕاست دە خەتی ئەودا هەنگاوان باوێی و بە دەسـتووری ئەو عەمەل بکرێ. خۆ ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە و حاشا هەڵنەگرە: ئیتاعەی خودا و ڕەسـووڵی خودا هەر یەک ڕێگان و زیاتر لە یەک ڕێگا و جودا لە یەک نـین، واتە کـێ ئیتـاعە لە فەرمـانی ڕەسووڵ بکا ئەوە ئیتاعە لە خودایە، و کێش ئیتاعە لە ڕەسـووڵی خـودا نەکـا، مانـای ئەوەیە کە باوەڕی بە خودا نییە و خۆشەویستی دەگەڵ خودا نییە. ئەوەی بیڵێ لەو بارەوە درۆیە.

دڵ دەیـهەوێ بە باشـی تێبگـا لە خۆشەویسـتی خـودا، چـونکە خۆشەویسـتی ئەسـەر و ئاسارێکی سرشتییە، خۆ دیـارە ئاسـاری سرشـتیش نـاکرێ و نـاگونجێ حەواڵەی زاتـی پـاکی خودای تەعالا کرێ، جا لە سەر ئەو ئەساسەیە زانایان لە بارەی خۆشەویستی هەر کەسـەیان بە پێی دەرک و هەستی خۆی جۆرێکی نەزەر داوە.

مەسەلەن: بە کۆ زانایـانی «اشـاعره» و «مـا تریـدی» کە زانایـانی مـوتەکەللیمانن ئاوایـان کوتووە: «ان المحبة نوع من الارادة و هی لا تتعلق حقیقة الا بالمعانی و المنـافع لا بالـذات» واتە خۆشەویستی جۆرێکە لە ئیرادە کە بە مانا و قازانجی ئەو شتە خۆ هەڵداوەسـێ نە بە زاتـی شـتەکە. لە سـەر ئەو تەعبیـر و بەراوردە خۆشەویسـتی نێـوان ئینسـان و خـودا دەبـێ ئـاوا هەڵسەنگێندرێ: ئینسان خۆشی و حەسانەوە و قازانج و بەهـرەی حەیـات و ژینـی لە خـوداوە دەس دەکەوێ و ئیرادە و یەقینی لە مەڕ خودا بۆ پەیدا دەبـێ، و هەر وا خـوداش لە بـابەت ئەو هەڵوێست و ئیرادە پاکەی ئینسان، ئیرادەی خێر و خۆشی و حەسانەوە بۆ ئەو ئینسانە دابین دەکا و بەجێ دێنێ. ئەوە نەزەر و بۆچوونی عولەمای ئەهلی مـوتەکەللیمە، بە کـوردی و بە کـورتی، «ارادة العبـد اختصاصـه تعـالی بالعبـادة» واتە خۆشەویسـتی ئینسـان لە مەڕ خـودا تەنیـا

خوداپەرستنە.

عورەفای ئەهلی سوننەت وەک ئیمامی غەزالی فەرموویانە: «الحب عباره عن میل الطبع الی الشیئ الملذ» واتە خۆشەویستی ئارەزووی دڵە بۆ لای شتی لەزەتبەخش. کاتێ خۆشەویستی توند و پڕاوپڕ بوو ئەوە پێی دەکوترێ: عشق. «بغض» کە دژی خۆشەویستییە واتە «البغض نفرة الطبع عن المؤلم» واتە بوغز بریتییە لە هەڵاتنی سرشت لە شتی دەردهێنەر. (روح المعانی، ١٧٢/٣-١٧١)

نیشانەکانی خۆشەویستی خودا:

١. ئالوودە و تێکەڵاوی سونەتەکانی پێغەمبەر و دووری لە عالەمی نائەهل.

٢. زۆر بیر و بەراوەرد لە ئاسارەکان و حیکمەتی باریتەعالا

٣. ڕازی بە قەزار و قەدەری خودا و سەبر و خۆڕاگری لە سەر دەرد و بەڵا

٤. دڵ خۆش نەکردن بە سامانی دنیا

٥. ترس لە خودا و بێباکی و بێمنەتی لە غەیری خودا

بێگومان کەسێک خاوەنی ئەو سیفەتانە بێ دەتواندرێ پێی بکوترێ خۆشەویستی خودایە.

**بۆ ئاگاداری:**

عەبدوڵڵا کوڕی ئوبەی سەختترین دوژمنی محەمەد و ئیسلام لە دابەزینی ئایەتی ٣١ی ئالی عیمراندا ئەو شایعەی داگیرساند کە محەمەد ئیتاعەی خۆی وەک ئیتاعەت لە خودا دانا و ڕایگەیاند، وەک تەرسایەکانی خۆ نیشان دا، واتە تەرسایەکان لایان وا بوو لە خۆشەویستی و نزیکی عیسا خۆشەویستی و نزیکی لە خودایان دەس دەکەوێ، جا خودای تەالا بە دابەزاندنی ئایەتی ٣٢ کە ماناکەی ئاوایە: بڵێ ئەی محەمەد: ئەی موسوڵمانان ئیتاعەی خودا بکەن و ئیتاعەی پێغەمبەری ئەو بکەن، یانی ئیتاعە لە محەمەدیشی گێڕا بە واجب، نەوەک تەرسایەکان کە دەڵێن عیسا خودایە، یا کوڕی خودایە.

هەست و شعوور لە بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی ئایەتەکانی ٣١ و ٣٢ی ئالی عیمران ئەو مەبەستەی هاتە دەست و لێی بە یەقین گەیی، چونکە خودای تەعالا خۆشەویستی خۆی بە ئیتاعە و شوێن کەوتنی ڕەسوولانی هێنایە حیساب، پلە و پایەی رەسوولانی بە تەواوی وە سەرووی هەموو پلە و پایەیەکی ئینسانی خست، و لەو لایەشەوە یەهوودی و نەساراکانی

هەس دانەوە و دمکوتی کـردن بەوەی کە دەیـانکوت: ئـێمە ئەولادانـی ئیبراهـیم و ئیسـحاق و یەعقـووبین بـاکمان لە ڕۆژی قیـامەت نیـیە چـونکە دۆسـتی خـوداین، خـودا فەرمـووی: خۆشەویسـتی مـن، خۆشەویسـتی و ئیتـاعەت لە ڕەسـوولانە، نە خزمـایەتی و ڕەگەزی و تێکەڵاوی.

لە حەزرەتـی عەباسـەوە ئـاوا نەقـڵ کـراوە: تاقمێـک لە یەهوودیـان لە کـن موسـوڵمانان شانازییان بەوەی دەکرد کە ئێمە ئەولادانـی ئیبراهـیم و ئیسـحاق و یەعقـووبین، بەو پێـیە ئـێمە لەوەی موسوڵمان لە پێشترین و دینیشمان ئەسڵتر و بەرزترە لە دینی ئێوە، چـونکە زۆر لە پـێش ئێوەدا خودا ناسیبووین. و هەروا هەندێکیشیان ئـێمە دەگەڵ ئەو عیسـایەی دۆسـتین کە کـوڕی خودایە. ئەمما خودای تەعالا بۆ بەتاڵ کردنەوە و بەرپەرچ دانەوەی قسە و فکر و خەیاڵاتیان بە هۆی دابەزاندنی ئایەتەکانی ٣٣ و ٣٤ و ... ئەوەی تێگەیاندن خۆ وەپاڵ پێغەمبەر دان کافی نیـیە بۆ نزیکی لە خودا و خوداناسی. ئێوەی یەهوود و نەسارا کە خۆتان داوەتە پاڵ خودا و دەشڵێن عیسـا کـوڕی خـودایە، تـاوانە و دوور لە ڕاسـتییە، چـونکە خـودا لە ڕەگەز و نەسـلی ئینسـان بەدوورە، عیسای ئینسان چۆن دەکرێ خودا بێ. (روح المعانی، ج ١٧٤/٣)

بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٣٣ی ئالی عیمران:

**إِنَّ اللَّه اصْطَفَى آدَمَ وَنُوحًا وَآلَ إِبْرَاهِيمَ وَآلَ عِمْرَانَ عَلَى الْعَالَمِينَ**

**بێگومان خودا ئادەم و نووح و بنەماڵەی ئیبراهیم و عیمرانی هەڵبژاردووە و ڕێـزداری کـردوون بە سەر عالەمی جیهاندا.**

**ئاوردانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٣٣ی ئالی عیمران:**

دەبێ ئاوا ئەو جێگەیە مانـا کەیـن و بـۆی بچـین کە خـودا دەفەرمـوێ: ئـادەم و نـووح و بنەماڵەی ئیبراهیم و عیمرانم هەڵبژاردن بە سەر هەموو عالەمی جیهاندا، واتە عالەمی دەورانـی خۆیان، و هەروا ئەو هەڵبژاردنەش واتە دەبابیەت و چیـنەدا، یـانی ئـادەم بـابی یەکەمـی بەرەی ئینسانە، پاش ئەو نووح بابی دووهەمی ئینسانە، چونکە دە دەورادنی حەزرەتی نووحدا لە سـەر ئەساسی خراپی ئینسانی ئەو کاتی تۆفانێکی زۆر گورە هەستا و بەشی زۆری وڵاتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی داگرت بە جۆرێکی وا ئینسانی دەو ناوچەدا نەهێشت، ئەو کەسـانە نەبـن کە دەگەڵ حەزرەتی نووح سواری کەشتی بوون. پاشان وەچەی ئەوانە و نـووح بە وڵات وەربـوونەوە، وا

دێتە ڕوو کە لەوێڕا بتپەرەستی داکەوت و پەرەی ستاند و پاش تێپەڕبوونێکی زۆر لە دەوران خودا ئیبراهیمی هەڵبژارد بە پێشەوا و ڕێبەرێکی بە زیبک و زاکوون و لێزان و بنیاتنەری ماڵە خودا بە ناوی کەعبە، پێغەمبەری زۆریشی لێ پاشەکەوت کرد، وەک ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و یۆسف و براکانی و مووسا و هاروون و داوود و سولەیمان و گەلێکی دی؛ مەبەستیش لە عیمرانی دووهەم بابی مریەمە و خانەوادەکەیەتی کە مەریەمە و عیسان؛ لە نێوانی عیمرانی بابی مووسا و عیمرانی بابی حەزرەتی مەریەمە بگرە زیاتر لە هەزار و هەشتسەد ساڵ دەبا و دەخایەنێ. ئالی عیمران بەشێکن لە بنەماڵەی ئیبراهیم. دیارە لە بەر ڕێز و حورمەتی مەریەمە و عیسای کوڕی، خودای تەعالا بەتایبەتی ناوی بردن دە ئایەتی ۳۳دا فەرمووی: ﴿وَآلَ إِبْرَاهِيمَ وَآلَ عِمْرَانَ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾ واتە بنەماڵەی ئیبراهیم و بنەماڵەی عیمرانی بابی مریەمەی هەڵبژارد بە سەر عالەمی دنیادا.

جا لە پاشان وەک دەردەکەوێ و ئاشکرایە دەر و دەروازەی پێغەمبەرایەتی پێوە دەدرێ و دادەخرێ بە هاتنی حەزرەتی محەمەدەلمستەفای نەوەی حەزرەتی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم. سڵاوی خودایان لە سەر بێ.

هەر وەک ڕوون و ئاشکرایە و حاشا هەڵگر نییە بە پێی سوننەتی ئیلاهی ئادابی هیدایەتی ئینسان لە تەواوی دەوراندا بە وەسیلەی هەڵبژێراوانی خودا بووە بە ناوی پێغەمبەران، و ئەوەش دەبێ بزاندرێ کە مەبەست لە عیمران دێرەدا بابی حەزرەتی مەریەمەیە نەک بابی حەزرەتی مووسا کە نزیک بە دووهەزار ساڵیان نێوانە. یانی ئالی عیمران بریتییە لە حەزرەتی مەریەمە و عیسا و ژنی عیمران. دەشکرێ ئەو ئایەتە ۳۳یە بکرێتە بەڵگە لە سەر بێگوناهی ئەنبیایانی خودا چونکە خودا گونەهباران هەڵنابژێرێ بۆ ڕێبەر.

مەبەستیش لە ئالی ئیبراهیم تۆرەمەوە و بەرەی پاکی حەزرەتی ئیسماعیلە بە دەلیلی ئایەتی ۵۴ی سووڕەی نیساء:

> **فَقَدْ آتَيْنَآ آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكًا عَظِيمًا**
> **بێگومان ئێمە کتێب و پێغەمبەرایەتی و دەسەڵاتێکی گەورەمان بە تۆرەمەی ئیبراهیم بەخشی**

لە بەرجەوەندی و هەڵسەنگاندنی ئایەتی ۳۳ کە خودای تەعالا بەرەی ئادەمی هەڵدەبژێرێ بە سەر عالەمدا چەند شتی بەرچاو هەست پێ دەکرێ، وەک:

١. عالەم بەو پێیە دەبێ دوو بەرە بێ، بەرەی بێتەکلیف و بەرەی خاوەن تەکلیف. بەرەی بێتەکلیف و گیانلەبەریش هەیە وەک حەیوانات و پاتاڵ، بەرەی نەباتات و جیماداتی هەیە بێ گیان و تەکلیف.

بەرەی خاوەن تەکلیفیش وەک ئەو چوار بەرەیە: ئینسان، فریشتە، پەری، شەیاتین. ئەو چوار بەرەیە خاوەنی تەکلیفن، هەر یەکەی لە بابەتێکەوە، ئەوەش دیارە کە بەرەی خاوەن تەکلیف ڕێزدارترە لە بەرەی بێتەکلیف.

٢. ڕەگەزی ئەو چوار بەرەش، واتە فرشتە، ئینسان، جن و شەیاتین، هەر یەکەی لە شتێکن.

وەک ئەوە گۆیا فرشتەکان لە «با»ن، بە پێی نەزەری زانایان و ئەقڵکاریان بەو دەلیلە کە فرشتە لەمەڕ بەڕێوەبردن و ئەنجامدانی کاروباری پێسپێردراویان وەک با دەڕۆن و دەفڕن. دووبارە کە بەتوانان بۆ هەڵگرتنی عەرشی خودا دەبێ هەر با بن چونکە بەهێزترین شتە بۆ هەڵگرتنی شتی سەخت و سەنگین. هەر ئەوەشە پێیان دەکوترێ «ڕوحانی». هەرچەند هەندێک هەن دەڵێن فرشتە لە نوورن واتە ڕەگەزیان نوورە، جا لە سەر ئەو دوو نەزەرانە دەتواندرێ بکوترێ ئەرواحی فرشتە لە نوورە. بیچم و لەشی لە بایە، ئەوانە نیشتەجێی عالەمی سەماواتن.

٣. شەیاتین کە بەرەی کافرن و ئیبلیسیش کە ڕەئیس و سەرۆکیانە، ئەوانە ڕەگەزیان دەبێ لە ئاور بێ، لە سەر ئەساسی ئایەتی ١٢ سوورەی ئەعراف کە خودا نەقل لە ئیبلیس دەکا و دەفەرموێ:

**قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلاَّ تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَاْ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ**

**خودا بە شەیتان (ئیبلیس)ی کوت: لەو کاتەدا کە فەرمانم پێ دای کێ ڕێگای لێ گرتی کە کڕنۆش نەبەی؟ ئیبلیس کوتی: ئەمن چاترم، ئەتۆ منت لە ئاگر بەدی هێناوە و ئەوت لە قوڕ دروست کردووە.**

دیارە شەیاتین کافرن و ئیبلیس کە ڕەئیس و ڕێبەریانە کافرێکی بە ئاشکرایە بە دەلیلی ئایەتی ٧٤ی سوورەی «ص»:

**إِلَّا إِبْلِيسَ اسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنْ الْكَافِرِينَ**

**بێجگە لە شەیتان، خۆی بە زل زانی و چووە ڕیزی کافر و بێبڕواکان.**

ئەو ئایەتە بە ئاشکرایی هاوار دەکا کە ئیبلیس کافرە و شک لە کافرەتیدا نییە. دیارە

شەیتانەکانی دیکەی غەیری ئیبلیسیش هەر کافرن بە دەلیلی ئایەتی ١٢١ی ئەنعام:

**وَلاَ تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ**

**لەو شتانە مەخۆن کە ناوی خودایان لە سەر نەهێندراوە، بێ‌گومان خواردنی ئەوانە دەرچوون لە سنوور و فەرمانە، مێینە شەیتانەکان بە جەخت هەندێ شت ڕادەگەیەنن بە دۆستەکانیان، بۆ ئەوەی کێشە و تەفرەقەتان لەگەڵ بکەن، ئەگەر ئێوە بە گوێیان بکەن، بێ‌گومان دەبنە هاوەڵدانەر بۆ خودا.**

ئەو ئایەتە ئیسباتی ئەوە دەکا کە شەیاتینیش هەر کافرن و داب و خۆشیان دوشمنییەتی بەرەی ئینسانە، بە پێی ئیشاراتی ئایەتی ٥٠ی کەهف:

**وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِي وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلًا**

**یادی ئەو کاتەی بکەوە کە کوتمان بە فرشتەکان، کڕنۆش بەرنە بەر ئادەم؛ سەرئەنجام کڕنۆشیان برد بێجگە لە شەیتان، بە ڕەگەزلە جنۆکە بوو سەرپێچی کرد لە فەرمانی پەروەردگاری. ئایا ئیتر ئێوە خۆی و نەوەکانی لەباتی من دەکەن بە دۆست و خۆشەویست؟ کەچی ئەوان دوژمنتانن چەند بریتییەکی خراپە بۆ ستەمکاران.**

دووبارە بۆ ئیسباتی ئەوەی کە شەیاتین دوژمنی بەرەی ئینسانن، سەیری ئایەتی ١١٢ی سوورەتی ئەنعام بکە:

**وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نِبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الإِنسِ وَالْجِن ...**

**هەر بەو شێوە بۆ هەر یەک لە پێغەمبەران، دوژمنێکمان لە شەیاتینە مرۆڤ و جنۆکەکان دانا.**

کەوایە دەبێ بکوترێ: شەیتانی ڕەگەز ئاور خوو و سروشتی تایبەتی دوژمنی ئینسانی ڕەگەز خاکییە.

کەوایە بە پێی ئەو دوو ئایەتی ١٢ی سوورەی ئەعراف و ٢٧ی حیجر، شەیاتین و جنۆکە لە ئاگرن. ئەوەش ئایەتەکان بە تەرتیب:

**خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾ اعراف**

**ئیبلیس دەڵێ ئەمنت لە ئاور دروست کردووە، ئادەمیشت لە قوڕ.**

**وَالْجَآنَّ خَلَقْنَاهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ السَّمُومِ ﴿٢٧﴾ حجر**
**لە پێشدا جنۆکەمان لە ئاگرێکی سووتێنەر و بێدووکەڵ دروست کرد.**

ئەگەر لە بیرمان بێ دە پێشدا بە پێی ئایەتی قورئان کوتمان شەیاتین و جنۆکە هەر دوو دوژمنی بەرەی ئینسانن و شەیاتینی کافریشن بە تێکڕایی، بەڵام بەرەی جنۆکە کەوا دیارە بە پێی ئیشاراتی قورئان ئایەتی ١٤ی سووڕەی جن نە هەموو کافرن نە هەموو موسوڵمان، بەڵکە هەندێکیان کافرن و هەندێکیان موسوڵمان. ئەوەش ئایەتی ١٤ی جن، سەیری کە بە وردی:

**وَأَنَّا مِنَّا الْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا الْقَاسِطُونَ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُوْلَئِكَ تَحَرَّوْا رَشَدًا**
**بەڕاستی ئێمەش هەندێکیمان موسوڵمانین، هەندێکیشمان ستەمکار و لەڕێلادەر، ئەو کەسانەی کە موسوڵمان بوون هەر ئەوان گەڕان بە شوێن شارەزاییدا.**

کاتێ ئەوە زاندرا کە فرشتە لە با و نوورە، جن و شەیتان لە ئاگرن، ئینسانیش لە خاکە، بە پێی ئایەتی ٥٩ی ئالی عیمران، و لە ئادەمڕا دامەزراوە بە فەرموودەی ئایەتی ١ی سووڕەی نیساء، سەیر کە بە تەرتیب لە ئایەتەکان:

**إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثِمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ آل عمران**
**بێگومان نموونەی عیسا لای خودا وەکوو نموونەی ئادەمە، خودا گەڵاڵەی ئادەمی لە گڵ داڕشت پاشان پێی کوت: دادەی ببە، دەسبەجێ بوو.**

**يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾** نساء
**ئەی خەڵکینە! لە پەروەردگارتان بترسێن، ئەو پەروەردگارەی کە ئێوەی لە تاکە کەسێک بەدی هێنا بە ناوی ئادەم؛ هاوجووتەکەشی وەک حەوا بێ، هەر لەو جەستە بەدی هێنا، لەو دووانەش زۆر ژن و پیاوی بڵاو کردەوە.**

کاتی ئەوەمان زانی کە ئینسان لە خاکە، پێویستە ئەوەش بزانین کە زانایان بە کۆدەنگی نەزەریان ئاوا داوە کە بەرەی ئینسانی ئەگەرچی لە خاکە، ڕێزدارترە لە بەرەی جنۆکە و شەیاتین

دەگەڵ ئەوەی ڕەگەز ئاورن.

ئەمما لەو بارەوە ئایا ئینسان ڕێزدارترە یا فریشتە، دوو بەرەکی هەیە، بەڵام ئەوانەی کە نەزەریان وایە بەرەی ئینسان لە فرشتە ڕێزدارترە، دەلیلیان ئایەتی ٣٣یە کە (اصْطَفَى...عَلَى الْعَالَمِينَ)ە، فرشتە بەشێک لە عالەمینە؛ ئەمما لە سەر ئەو نەزەرە تووشی ئەو ئیشکالە دەبین کە دە ئایەتی ٤٧ی بەقەرەدا هاتووە کە خودا لە وەسفی بەنی ئیسرائیلدا فەرموویەتی: ﴿وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾؛ چونکە لە لایەکی کوتراوە بەرەی ئینسان ڕێزدارترە لە گشت عالەم، لێرەشدا کوتراوە بەنی ئیسرائیل ڕێزدارترن لە گشت عالەم، ئەو دوو قسەیە ناکۆکن پێکەوە. بۆ ڕزگاری لەو ناکۆکییە دەبێ ئاوا بکوترێ: ڕێزداری ئادەم و نووح و ئالی عیمران و ئیبراهیم و هۆزی بەنی ئیسرائیلیش هەر لەو عالەمی دەوری خۆیان ڕێزدارترن، بەڵام ڕێزداری ئینسان ئەگەر بتوانێ خۆ لە دەس نەفس و هەوا و غرووری ڕزگار کا، پلە و مەقامی لە فرشتە لە سەرترە چونکە ئەو نەفس و هەوای نییە.

هەندێکیش لە زانایانی قورئان ئاوایان بەراورد کردووە مانای ئەو ئایەتە ٣٣یە واتە مەبەست لە مانای ﴿إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى﴾ یانی دین و ئایینی ئادەم و نووح، خودا هەڵبژارد بە سەر دینی عالەمی دیدا، یا دەڵێن خودای تەعالا ئادەم و نووح و ئیبراهیم و ئالی عیمرانی لە ئاکار و ئەخلاق و سیفاتی ناحەز وەدوور خستن و خاوێنی ڕاگرتن. دیارە ئەو نەزەرە لە قورئان واتە ئایەتی ١٢٤ی ئەنعام نزیکترە:

> **اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ**
> **خودای تەعالا بۆخۆی چاکتر دەزانێ پەیامی خۆی لە کوێ دانێ.**

ئەو ئایەتە ئاماژە وەلای ئەویە کە پێغەمبەران سەلامی خودایان لە سەر بێ، بە نیسبەتی هێز و تێزی جسمانی و ڕوحانی جودا لە غەیری خۆیانن و وەک غەیری خۆیان ناچن، بۆ نموونە حەزرەتی محەمەدەلمستەفا بە نیسبەتی هێزی بینایی چاوان لە ژوورای هەموو هاوچەشنانی خۆی بووە، بە پێی ناوەرۆکی ئەو کەلامە زێڕینەیەی: «زُوِيَت لِيَ الأَرضُ فَأُرِيتُ مَشارِقَها و مَغارِبَها» واتە زەوی بۆ من خۆی خڕ کردەوە و کۆوە بوو، لە بەر دوو چاوانم چاوم کرد ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئەو.

و هەروا سەیری کە ئەو کەلامە ڕەسووڵ: «أَقيموا صُفوفَكُم و تَراصُّوا فَإِنّي أَراكُم مِن وَراءِ

ظَهري» واتە: ڕیز و سەفی خۆتان وەڕازێنن، بە نەزم و نیزام پێکەوە، ئەمن ئێوە لە پشتە سەرمەوە چاو دەکەم.

ئەو دوو کەلامە بە ڕوونـی دەردەخەن کە هێـزی جسـمانی پێغەمـبەر فەرقـی هەیە، دەگەڵ غەیری خۆی، کەوابێ هەڵبژاردنی ئەدێرەدایە.

یا نموونەی فەرق و جیاوازی پێغەمبەران لە ئەجـزای لەشـدا وەک حەزرەتـی ئیبراهـیم کە خودا بەیانی دەکا بە وەسیلەی ئایەتی ۷۵ی سوورەی ئەنعام کە خودا ئەو هێـزەی دا بە چـاوانی کە ئاسمانەکان و زەوییەکان هەڵسەنگێنێ و وەزن کا:

**وَكَذَلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ ﴿۷۵﴾**
**هەر بەو شێوە، دەسـتەڵاتی بەرفراوانـی ئاسـمانەکان و زەویـمان خسـتە پـێش چـاوی ئیبراهـیم، هەتاکوو بچێتە ڕیزی دڵنیاکانەوە.**

ئەو ئایەتە پیرۆزەی ۷۵ی ئەنعـام ئەوەمـان پـێ دەڵـێ کە خـودای تەعـالا دوو چاوەکـانی حەزرەتی ئیبراهیمی ئەوەندە وە هێز خستوون لە بینیندا، تەواوی کائیناتی سەر و بن خستۆتە ژێر بینایی خۆی، جا لە سەر ئەو ئەساسە دەتوانین بڵێین خودا ئیبراهیمی هەڵبـژارد بە سـەر غەیـری خۆیدا لە بابەت دەرکەوە؛ ئالی عیمرانیش هەر ئا وا.

یا ئەوەتانێ دەڵێن هێزی بۆنکردنی حەزرەتی یەعقووب ژوورای هێزی بۆنی عـالەم بـووە، بەو دەلیلە کاتێ حەزرەتی یۆسـف دەسـتووری دا بە براکـانی کە کراسـی ئەو بـۆ بـابی بەرن لە کەنعان و بە سەر دەموچاویدا دەن تاکوو شیفای چاوەکانی بێ، دە دیارە کاتێ براکـانی یۆسـف واتە کوڕەکانی حەزرەتی یەعقووب لە شاری میسرێ دەرکەوتن بەرەو کەنعان هاتن بە کـراس و بارە گەنمەوە، یەعقووبی پێغەمبەر لە کەنعانەوە فەرمووی بۆنی یۆسفم لە بـن لووتیـدا دێ، بـۆ ڕاستی ئەو قسەیە دەچینە خزمەت ئایەتی ۹۴ی یۆسف:

**وَلَمَّا فَصَلَتِ الْعِيرُ قَالَ أَبُوهُمْ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ لَوْلاَ أَن تُفَنِّدُونِ ﴿۹۴﴾**
**هەر کاروانەکە کەوتە ڕێ (لە شاری میسرەوە) باوکیان (لە کەنعانەوە) کوتی: گەر بە بێئەقڵم نەزانن، بێگومان بۆنی یۆسف دەکەم.**

ئەگەر ئەو ئایەتە ورد هەڵسەنگێندرێ کە حەزرەتی یەعقـووب لە دووری چەنـد ڕۆژە ڕێـی بۆنی کوڕی بکا، پاش چەند ساڵ لێـک هەڵبـڕان، قەبـووڵ دەکـرێ ئەو بـۆنکردنە جۆرێـک لە

موعجیزەیە، جا بەو پێیە دەبێ بڵێین: هەڵبژاردنی پێغەمبەران بە سەر عالەمدا لە بابەتی لەش و ڕۆح و دەرک و هەست و شعوورەوەیە، واتە بە کورتی: روحیەی پاکی پێغەمبەران ڕووت لە هەوا و وەسوەسە و گومانە و لە لەشی هەوا و هەوەس بەرین.

بە کوردی و بە کورتی، ئەگەر بکوترێ مانای ﴿إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَىٰ آدَمَ وَنُوحًا ...﴾ واتە خودا ئادەمی لە عالەمی ژێرای هەڵبژارد، ئەوە دەچێتە سەر قەولی ئەو کەسانە کە کوتوویانە: فرشتە بەرزترە لە بەرەی ئینسان؛ ئەگەر ماناشی ئاوا لێدرێتەوە کە هەڵبژاردنی ئادەم بە سەر عالەمی ژوورادایە، ئەوە قەولی ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە بەرەی ئینسان لە بەرەی فریشتەش ڕێزدارترە.

### پوختەی مەبەست و تیوتیوەی ئایەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَىٰ آدَمَ وَنُوحًا ...﴾

وەک چاو دەکرێ و دیارە، هەڵبژاردنەکان دەبنە چوار کەس: ١. ئادەم ٢. نووح ٣. ئالی ئیبراهیم ٤. ئالی عیمران.

دیارە بنچینەی بەرەی ئینسان لە هەوەڵەوە لە حەزرەتی ئادەمڕا داکەوت و لە پاش حەزرەتی ئادەم لە حەزرەتی نووحدا دادەگیرسێتەوە چونکە بەرەی ئادەم بە هۆی تۆفانی حەزرەتی نووح لە ناو چوو و بڕاوە، لە پاشان هاتنەوەی ئینسان بۆ سەر زەوی لە حەزرەتی نووح داگیرساوە، هەر وەک لە ئایەتی ٧٧ی «صافات»دا ئەوە دەزاندرێ کە هەر بەرەی نووح دەمێنێتەوە لە سەر زەوی: ﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمُ الْبَاقِينَ﴾ واتە هەر تەنیا بەرە و نەوەی ئەومان هێشتەوە.

دیارە بە پێی نەزمی ئایەتەکە لە پاش نووح باسی حەزرەتی ئیبراهیم دادەگیرسێ، ئەگەرچی لە نێوان حەزرەتی نووح و حەزرەتی ئیبراهیم پێغەمبەرانی زۆر دێنە گۆڕێ، وەک هوود، ساڵح و ... بەو هۆیەوە کە یەهوود و نەسارا خۆیان دەدەنە پاڵ نەسەبی حەزرەتی ئیبراهیم، چونکە دە ئەساسی ئاییندا ئیبراهیمی خەلیل هەر لە سەر داب و باو و دەستووراتی نووح و ئادەم دیاری دەدا و بووە، جا بۆیە ئەهلی کتێب وای بۆ دەچن کە ئەوانە لە نەسلی حەزرەتی ئیبراهیمن، و هەروا حەزرەتی محەمەدەلمستەفاش لە بەرەی ئیبراهیمە. بەو پێیە تەواوی پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل لە نەسل و ئەولادی وانن. (روح المعانی، ج ٣/ ١٧٤).

### ئامانج و مەبەست لە هەڵبژاردنی ئادەم و نووح و ئالی ئیبراهیم و ئالی عیمران:

زانایانی قورئان ڕا و بۆچوونی جۆراوجۆریان لەو بارەوە ڕاناوە، بۆ نموونە هەندێک لە قورئانزانەکان نەزەریان وایە کە هەڵبژاردنی ئادەم بە سەر عالەمدا لە بابەت دروستکردنەوەیە،

یانی خودا پێش خەلقی بەرەی ئینسان حەزرەتی ئادەمی دروست کرد بە دەستی قودرەتی خۆی، بێ دایک و باب، لە قوڕ، پاشان ناوی هەموو شتێکی فێر کرد و دەستووری دا بە فرشتە کڕنۆش و سوژدەی بەرنێ و لە ناو ئارامگەیەکی وێنە بە هەستی دایمەزراند.

هەڵبژاردنی حەزرەتی نووح پاش ئادەم لەو بارەوەیە کە نووح هەوەڵین پێغەمبەرێکە کە دە ئایینی ئەودا دەستووراتی حورمەتی کچ و خوشک و پوور هاتنە گۆڕێ و دامەزرا. هەروا بوو بە «ابو البشر ثانی»، واتە دووهەمین بابی بەرەی ئینسان، و هەوەڵین کەسێکە دە بەرابەر بەدئەخلاقی ئینسان و ئۆمەتیدا تاقەتی نەهێنا خۆڕاگری هات دوعای لێ کردن خودا لە سەر ڕووی زەوی ئەو قەومە بشواتەوە. ئەوە خودای تەعالا نزای نووحی وەرگرت و خەڵکی ئەو سەردەمی غەرقی ئاوێ کردن.

هەڵبژاردنی ئالی ئیبراهیم لە پاش حەزرەتی نووح هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئامانج و مەبەستە کە لە نەسلی ئیبراهیم کاروانی پێغەمبەران و کتێبکانی ئاسمانی بە شێوەیەکی بەر بەرین بە ناوی یاسای ئاسمانی دابەزین، و هەروا ئاخرین پێغەمبەری دنیاش لەو نەسل و بەرەیەدا دێتە وجوودەوە.

هەڵبژاردنی ئالی عیمران پاش ئالی ئیبرایم بەو خاتر و مەبەستە دێتە ڕوو کە وەک موعجیزە حەزرەتی مەریەمە لە دەس شەیتانی نەجات درا و پارێزرا و حەزرەتی عیساش بێ باب وەک پێغەمبەرێکی پیرۆز و بێوێنە لێ بە وەلەد هات و بە شێوەی موعجیزە ئەو عیسا پێغەمبەرە دە لانکەیدا دەستی کرد بە قسە کردن، ڕەوانتر لە ئینسانی گەورە و ژیر.

دەبێ ئەوە قبووڵ کەین ئەو هەڵبژاردنانەی پشتی سەری یەک لەو نەسل و بەرانە پڕ لە ڕاز و سوڕ و حیکمەتن، ئەوەندەی کوتراوە دێرەدا گۆشەیەکی باریکە، دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەو ئینتیخاب و هەڵبژرادنە لە ڕووی نیزامی پایە و پلەی کەسایەتی ئەو بەرە و نەسلانەیە، نەک لە بابەت ئاینی و دینی بەرفراوان و عالەمیتریە، چونکە ئایینی محەمەد واتە قورئان کە ئەساسنامەی ئاینی محەمەدییە لە سەراپای ئایینەکانی پێش خۆی ڕێزدارترە و بەرفراوانترە. (تفسیر مقام محمود، ج ۶۴۲/۱).

دڵ دەیهەوێ ئەو پرسیارە بکا کە نەختێک هەستی پێی ئالۆز بووە، پرسیارەکەش ئەوەیە: بۆ دە حەزرەتی ئادەم و نووحدا «آل» نەهاتووە؛ بەڵام دە ئیبراهیم و عیمراندا «آل» هاتووە؟ واتە کوتراوە «آل ابراهیم و آل عمران»؟

بۆ وڵامدانەوەی ئەو پرسیارە بەهێزە زۆر وێر و وەوی هەڵڕووسکام و هەڵپڕژام هیچی وام گیر نەهات بیر و هەستی بزۆزمی پێ دابین بێ. تەنیا شتێکی کە خۆمم پێ قانیع کردووە ئەوەیە کە دە دەورانی حەزرەتی ئادەم و نووحدا فێرکردن و بارهێنان و ڕاهێنان تەنیا ئادەم و نووح بۆ خانەدانی خۆیان بووە و بەشێک لە خزم و کەسیان، ئەمما دە دەورانی ئیبراهیم و عیمراندا تەبلیغات و ڕاگەیاندن و بارهێنان بگرە لە ئیبراهیم و عیمران و ئەولادان و جێگرەکانیان بەولاتریشەوە هەر دەبوو ئازاد بوو.

ئیمامی مقاتل کە یەکێکە لە زانایان، نەزەری وایە ئالی ئیبراهیم تەنیا ئەولادەکانی حەزرەتی ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووبن، چونکە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل هەموویان لە نەسلی ئەو دووانەن (ئیسماعیل و ئیسحاق)، پێغەمبەری ئاخر زەمانیش واتە محەمەدﷺ هەر لە نەسلی ئیسماعیلە، پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل لە نەسلی ئیسحاقن. و هەروا لە ئیبنی عەباسەوە نەقڵە کە ئالی ئیبراهیم بریتییە لەو کەسانە کە لە سەر ئایینی ئیبراهیم بوون وەک ئالی محەمەدﷺ. (روح المعانی، ج ۳/ ۱۷۴)

ئەوجار دەبێ بزاندرێ مەبەست لە ئالی عیمران کامە عیمرانە؟ چونکە عیمران دوون: یەکیان بابی حەزرەتی مووسایە، ئەوی دیکەیان بابی حەزرەتی مەریەمەیە کە بە بابی حەزرەتی مریەم دەکوترێ «عمران بن ماثان»، کە لە ئەولادانی حەزرەتی سولەیمانی کوڕی حەزرەتی داود پێغەمبەرە.

عیمرانی بابی حەزرەتی مووسا دەگەڵ عیمرانی بابی حەزرەتی مریەمە نزیکەی ۱۸۰۰ ساڵ نێوانیان هەیە، زانایانی قورئان لەو باوەڕەدان بە زۆری کە مەبەست لە عیمرانی ئایەتی ۳۳ی ئالی عیمران، بابی حەزرەتی مەریەمەیە نەک عیمرانی بابی مووسا؛ لە سەر ئەو بەراوەردە، مەبەست دێرەدا عمران بن ماثان بابی مریەمەیە نەک عمرانی بن یصهر بابی حەزرەتی مووسا. دەلیلیش ئەوەیە کە دە باسەکەدا هەر باسی حەزرەتی عیسا و مەریەمەیە، باسی حەزرەتی مووسا هەر دەنگی نییە:

**إِذْ قَالَتِ امْرَأَةُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ آل عمران**

**یادی ئەو کاتەی بکەوە کە ژنەکەی عمران کوتی: ئەی پەروەردگارم، ئەوەی کە لە زگمدایە، ئەمن نەزر و پێشکەشی تۆم کرد (تا ئازاد بێ بۆ خزمەتی بەیتولموقەدەس).**

دیارە ئەو ژنی عیمرانە، «حسنة» دایکی حەزرەتی مەریەمە بووە. (روح المعانی، ج ۳/ ۱۷۵)
دایکی حەزرەتی عیسا (مەریەمە) دەگەڵ دایکی حەزرەتی یەحیا خوشک بوون واتە حەزرەتی زەکەریا بابی یەحیا خوشکی حەزرەتی مەریەمەی ژن بووە. (روح المعانی، ج ۳/ ۱۷۷)

دەبێ بزاندرێ کە حەزرەتی ئادەم بە بنچینە و باوکی یەکەمی بەرەی ئینسانە، پاشان حەزرەتی نووح هەڵدەبژێردرێ بە بابی دووهەمی بەرەی ئینسان، بەو هۆیە بەرەی ئادەم بە تۆفانی دەورانی نووح نەما بەتایبەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، ئەو چەند کەسە نەبن کە دەگەڵ حەزرەتی نووح سواری کەشتییەکە بوون. ئەوەی پاشەکەوت بوونەوە لە پاشی تۆفان، وەچە و نەوەی نووح بوون، جا لەوێرا بتپەرەستی سەری هەڵدا و دامەزرا و بوو بە باو. خودای تەعالا بۆ بەرگری لەو باوە گڵاوە بتپەرستییە حەزرەتی ئیبراهیمی هەڵبژارد و هێنایە ڕوو، پێغەمبەری زۆریشی لێ دەکەوێتەوە و ئالی عیمرانیش کە هەر بەشێکن لە ئالی ئیبراهیم بەڵام لە بەر ڕێز و قەداسەتی مریەمە و عیسا خودا بەتایبەتی ناویان دەبا، پاشان دەرگای پێغەمبەریەتی بە محەمەدەلمستەفاﷺ ئاخر زەمان دادەخرێ، سڵاوی خودا لە سەر گشت پێغەمبەران بێ، ئەوجار خانەوادەی ئیبراهیم و عیمران کە نەوە و وەچەی یەکن هەندێکیان لە هەندێکیان وەدی دێن، بەو شێوەیە: ئیسماعیل و ئیسحاق و کوڕەکانیان لە ئیبراهیم دەبن و ئیبراهیم لە نووح و نووحیش لە ئادەم، ئە بەو جۆرە هەڵدەڕژێنە سەر زەوی. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ۳۴ی ئالی عیمران:

**ذُرِّيَّةً بَعْضُهَا مِن بَعْضٍ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾** ئالی عیمران
**ئەوانە هەر یەک بەرەچەن، هەندێکیان لە هەندێکیانن، خوداش بیسەر و زانایە.**

**ئاوڕ دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ۳۴:**

بەرەی ئیبراهیم و بەرەی عیمران وەچەیەک بوون هەندێکیان لە هەندێکیان کەوتوونەتەوە. دەکرێ بکوترێ مانای ﴿ذُرِّيَّةً بَعْضُهَا مِن بَعْضٍ﴾ واتە هەندێکیان وەک هەندێکیانن دە تەوحیددا، دە ئیتاعەتدا، دە ئیخلاسدا، وەک ئایەتی ۶۷ی تەوبە لەمەڕ مونافقاندا کە دەفەرموێ: ﴿الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ بَعْضُهُم مِّن بَعْضٍ...﴾ واتە پیاو و ژنە دووڕووەکان هەر وەک یەک وان، فەرمان دەدەن بە نالەباری و خراپە. واتە ئەوانە شەریکی یەکن دە خراپە کردندا. ئەو تۆرەمە و

وەچانەی ئیبراهیم و عیمران دە چاکە کردن و ئیتاعە لە خـوددا شـەریکن بـۆ ئیرشـادی جـامعە وەک یەک وان.

دەشکرێ ئەو ئایەتە بۆ ڕەدی قسەی جوولەکەکـان بـێ کە دەیـانکوت: ئـێمە لە ئەولادانـی ئیبراهیم و عیمرانین، تەرسایەکانیش دەیـانکوت عیسـا کـوڕی خـودایە؛ ئەگەرچـی زاناکانیـان دەیانزانی قسەی ئەوانە بەتاڵە، بەڵام لە بەر دڵ پێخۆشی نەزانەکان دەنگیان نەدەکرد.

و هەروا دووبارە دەتوانین بڵێین دابەزینی ئەو ئایەتە پووچەڵکردنەوەی قسەی هەنـدێک لە نەزانانی مادەگەرایانە کە دەڵێن لە هەوەڵەوە ئینسـان مەیمـوون بـووە وردەوردە بە پێـی سرشـت هاتۆتە سەر شکڵی ئینسـان. جـا خـودای تەعـالا بـۆ پـووچەڵ کـردنەوەی بیـر و خەیـاڵی ئەو ناحاڵییانە فەرمووی بەرە و وەچەی ئەو ئیبراهیم و عیمرانە ئینسانانە هەر لە یەکـن و یەک بەرەن، یەک ڕەگەزن و لە ئادەمن.

ئەگەرچی دەستەیەک لە زانایان کوتوویانە مەبەست لەو ئایەتەدا ئەوەیە ئەوانە هەموویان دە نیەت و باوەڕ و عەمەل و ئیخلاسدا هەر یەکن و جودا نین.

وەک لە بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی ئەقیدە و باوەڕی هەندێک لە نەسارەکان دێـتە ڕوو و بەر چاومان، عیسا بە کوڕی خودا دەزانن، یا بە خودای دەزانـن؛ جـا خـودای تەعـالا لە سـەر ئەو ئەساسە کە ئادەمیزادی لە سەر هەڵەکانیان ئاگادار کردۆتەوە و بە وەخت و کات هاتووە، دێرەدا ئاگادارییان دەداتێ کە عیسا نە کوڕی خودایە و نە خودایە، بەڵـکە کـوڕی مەریەمەیە و لەویەوە وەلەد بووە و مەریەمەش کچی عیمرانی حنەی کچی ناقوذایە. جا ئەگەر عیسا کوڕی خـودا یـا خودا با، چۆن دەکرا ئەو بەرە دایک و بابە هەبان؟

دەبێ بە تەئکید ئینسان لە سەر ئەو باوەڕە بێ کە خودا نە لە کەس بە وەلەد بووە، نە کەسـی لێ بە وەلەد دەبێ. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٣٥ی ئالی عیمران:

**إِذْ قَالَتِ امْرَأَةُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٣٥﴾**

یادی ئەو کاتە وەکە کە خێزانی عیمران (حنّة) کوتی ئەی پەروەردگارم! ئەوەی کە دە زگمدایە، ئەمن نەزر و پێشکەشی تۆم کرد تا ئازاد بـێ بـۆ خزمەتـی بەیتولمـوقەدەس، کەوایە تـۆش لـێم وەرگرە و قەبووڵی کە، چونکە بەڕاستی هەر تۆی بیسەر و زانا.

**تێڕوانین و ئاوڕ دانەوەیەکی هەستیارانە وەسەر مەبەستی ئایەتی ٣٥:**

کاتێ ژنی عیمران پاڕایەوە لە خودا و کوتی: ئەی پەروەردگارم! بەڕاستی ئەوەی دە زگـمایە نەزرم کرد بۆ خزمەتی ماڵە تۆ کە بەیتولموقەدەسە، دیارە دڵ و ئەقـڵ ئەوە دەسـەلمێنێ و بـاوەڕ دەکەن کە ژنی عیمران واتە حنّة بە تەمای ئەوەی بووە کە ئەوەی دە زگیدایە کوڕە و کوڕ دەبـێ. بەو دەلیلە هەر کوڕ دەبێ و دەکرا بە خزمەتکاری خانەی خودا؛ جا لە سەر ئەو هیوا و ئەساسـە دایکی مریەمە واتە حنّة کوتی : خودایە ئەو نەزرەم لێ قبووڵ کە کە کردوومە، دیارە لـێم یەقیـنە کە ئەتۆ بیسەری بە پـاڕانەوەی نـیەت و هەسـتەی دەروونـم دەزانـی کە ئەمـن ڕەزامەنـدی تـۆم مەبەستە لەو نەزرەمدا.

دەو نەزرەدایە کە ئاوا ڕاشکاوانە و ڕاستەوخۆ ژنی عیمران واتە دایکی مـریەمە دەیـکە و لە خۆی نیشان دەدا، ئیشارەی تەواوە وەلای ئەوەی بابی مریەمەی واتە مێردی حنّـة نەمـابێ، دەنـا ئاوای نەدەتوانی ژنی عیمران واتە دایکی مەریەمەی ئەو نەزرە بێ ڕەزایەتی مێردی بیکا.

مەبەستی دایکی مەریەمەش لە ئازادی مەریەمە واتە لە بەندی ویلایەتـی خـۆی ئـازاد بـێ بکەوێتە ژێر ویلایەتی خودا، واتە مەریەمە دەبێ تەنیا خوداپەرست بێ، و تـا بـاڵق دەبـێ دەبـێ خزمەتگوزاری ماڵە خودا بێ (بیت المقدس)، و هیچ بەهرەیەکـی شەخسـی لـێ وەرنەگیـرێ، بەڵام پاش ئەوەی کە باڵق بوو، خاوەن ئیختیار و سەربەخۆ بێ، هەر بە خزمەتکاری ماڵە خـودا وەمێنێ و یا شوێن ئارەزووی خۆی بکەوێ.

دڵ دەکەوێتە سەر ئەو هەست و باوەڕە بە پێی نەزمـی ئـایەتەکە کە دەفەرمـوێ: (مُحَـرَّرًا) و نافەرموێ (مُحَرَّرةً) دایکی مەریەمە لە ڕووی ئیلهاماتی ڕوحی، هەستی ئاوا بـووە خـودا کـوڕی خستۆتە نێو زگی و کوڕی دەداتێ. بەڵام کاتێ زگی دانا و دیتی ئەوە کچە و کوڕ نییە، هەسـتی دەروونی گورج وەخۆ کەوت و کەوتە چارەسازی کاری خۆی کە ئەو بە باوەڕی خـۆی کـوڕی نەزر کردووە، ئەوە کچە چۆن دەبێ ئەو نەزرە؟؟ ڕاستەوخۆ بێ ڕامان و تێمان وەسـتان ئەو دوو شتەی لە خودا داوا کردن:

١. ئەو نەزرەی لێ وەرگرێ کە مەریەمەیە.

٢. لە بن پەنای ڕەحمەتی خۆیدا مریەمە و ئەولادی مەریەمە ئاگاداری بکا.

**پوختەیەک لە ژنی عیمران:**

مەبەست لە عیمرانی ئێرە بابی حەزرەتی مەریەمەیە و دایکی مەریەمەش حنّة کچی نـاقوذا بووە. ئەو نەزەرە لە ئیسحاقی کوڕی بەشیرەوەڕایە، ئەویش لە ئیبنی عەباسەوەی نەقـڵ کـردووە.

(روح المعانی، ج ٣/ ١٧٣)

گۆیا بە قەولی هەندێکیان عیمران و حنّة کوڕێکیان بە ناوی هاروون بووە، هەر بۆیەشە لە قورئاندا لە سوورەی مریەم ئایەتی ٢٨ دەفەرموێ: ﴿يَا أُخْتَ هَارُونَ﴾ و حەزرەتی مەریەمەش خوشکێکی بە ناوی «ایشاع» بووە کە حەزرەتی زەکەریا کردوویەتە بە ژنی خۆی، حەزرەتی یەحیا لەو بەوەلەد بووە کە بە پێی نەزەری شەیخەین کە دە واقیعەی میعراجدا هاتووە، حەزرەتی عیسا و یەحیا بە پوورزای یەکتر باس کراون.

وەک لە زاری مێژووناسانڕا دەبیسرێ حنّة ژنی عیمران بێ حەولاد دەبێ پێش حەزرەتی مەریەمە، حنّة ڕۆژێ باڵندەیەک لە سەحرا و چۆڵگەیەک دەبینێ، پۆلە جوچکەیەکی بە دوودا دێن هەموو جارێ ئاوڕیان وەسەر دەدا و جاروبارەش شتیان بۆ ڕاو دەکا و دەیاندانێ و بۆخۆی نایخوا و جاروبارەش وەبن باڵی خۆیان دەدا و ماوەیەک لە سەریان هەڵدەکورشمێ. بە دیتنی ئەو کارەساتە حنّة دادەمێنێ و ڕادەمێنێ و دەکەوێتە نێو بیری بیر و خەم و تەمەوە، هاوارێکی بەسۆز دەکا لە خودای تەعالا و دەڵێ ئەی پەروەردگاری کائینات و بوونەوەر، ئاوڕی بەزە و ڕەحمەت داوەتەوە بۆ سەر پەلەوەر و باڵندەکانیش کردووتنە خاوەن نەسل و بەرە، بەڵام ئەمن بێبەشم، ئەمنیش لێم دەوێی حەولادێکم دەیەی، قەرار بێ بیکەمە خزمەتگوزاری ماڵە تۆ، خوداش نزایەکەی لێ قبووڵ و گیرا دەکا، دوعاکەش ئەوە بوو کە خودا بۆ پێغەمبەری بەیان دەکا و دەفەرموێ: ﴿إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (٣٥) آل عمران﴾ (روح المعانی، ج٣/ ١٧٧)

دیارە دەبێ ئەوە بزاندرێ: دە شەرعی ئەو زەمانیدا نەزرکردنی ئەولاد بۆ خزمەتی دین و ئایینی ئاسمانی زۆر ڕەواج و ڕەوا بوو.



کاتی ئەوەی هاتووە ئاوڕ بدەینەوە سەر ئەو کاتەی کە حنّةی ژنی عیمران زگەکەی دادەنێ و تەماشا دکا ئافرەتە و کوڕ نییە، دە نەزرەکەشیدا بە خەیاڵی خۆی کوڕە، بۆیەی نەزری خزمەتگوزاری ماڵە خودای کردووە کە بەیتولموقەدەسە، با بزانین دایکی مەریەمە چ هەڵوێستێک دەگرێ، ئەو جارە بۆ ڕوون بوونەوەی ئەو کارەسات و جەریانە دەچینە خزمەت ئایەتی ٣٦ی ئالی عیمران:

فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَى وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى

وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وإِنِّي أُعِيذُهَا بِك وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾ ئالی عیمران

**کاتێک (حنة) منداڵەکەی بوو کوتی: ئەی پەروەردگارم، خۆ کچ بوو، خودا لەو چاتر دەزانێ کە کچی بووە، دیارە کوڕیش وەک کچ نییە بۆ خزمەتگوزاری، ئەمن وا ناوم نا مەریەم، بەبێ گومان خۆی و نەوەکانی دەخەمە پەنای تۆ لە دەس شەیتانی دەرکراو لە ڕەحمەتی خودا.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر دەروونی ئایەتی ٣٦:**

دایکی مریەمە کاتێ زگەکەی دانا و دیتی مێیە و نێر نییە، تاسا و کوتی: بە داخ و سۆزەوە خودایە ئەوەی بوومە مێینەیە و ئاواتەکەم نەهاتە جێ کە نەزری خانەی تۆم کردبوو، چونکە بە پێی باو و دابی ناوخۆ مێینە نابێ و ناتوانێ ببێتە خزمەتگوزار و مجەوری خانەی خودا، لەبەر دە حەیز کەوتن و ... دیارە هەر وەک ئەقڵ و هەست و شعوور ئەوە دەسەلمێنن: خودا نیەت وەردەگرێ هەر جۆر بێ لە کاروبار و قەول و قەرار و نەزردا، لەسەر ئەو ئەساسە دەستەولەجێ خودا بۆ داماڵدانی تەمی خەم و پەژارەی دایکی مەریەمە، دەفەرموێ و ئیشارە دەکا وەلای ڕێز و ڕێزداری ئەو مێینە و وەریدەگرێ و دەڵێ: خودا زاناترە بەوەی کە ژنی عیمران بوویەتی، واتە کچێکی پاکی پاکە، بەرز و ڕێزدار و لە کوڕ گەلێ بەرزترە بۆ ئەو خزمەتە، چون لە دەروون و هەستێکی خالیسانەڕا دراوە و بەخشراوە، و ئەو نێرینەیەی کە تۆ داوات کردووە و نەزرت کردووە، وەک ئەو کچۆڵە نییە و نابێ کە تۆ بووتە.



دڵ دەیهەوێ بزانێ ئەو دوو جوملانەی ﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ﴾، ﴿وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى﴾ ئایاتی دایکی مەریەمن کە حنّەیە، یا خاسەتەن فەرموودەی خودان و دڵخۆشدانەوە و وەلابردنی پەژارە و داخ و حەسرەت و حوزنی دایکی مەریەمەن؟

دیارە هەندێک لە قورئانزانان کوتوویانە هەر دوو جوملەکان ئی دایکی مەریەمەن، ئەمما تاقمێک دەڵێن ئەو دوو جوملانە فەرموودەی خودای تەعالان، بە چەند بەڵگە:

یەک لە بەڵگەکان ئەوەیە: ئەگەر ئەو جوملانە ئی حنەی دایکی مەریەمە بانە، دەبا کوترابا: (وَلَيْسَ الأُنثَى كالذَّكر) وەک لە ئادابی کوردیدا دەکوترێ: کچ نابێ بە کوڕ؛ چونکە دە دابی کوردیدا هەرگیز ناکوترێ: کوڕ نابێ بە کچ. دە دیارە ئێرە کە جۆرێکی زۆر قووڵ گرینگە هەرگیزاو هەرگیز ناکرێ بکوترێ دێرەدا نەبێ کوڕ نابێ بە کچ چونکە فەساحەت و بەلاغەتی قورئان لە ژوورای هەچی فەساحەت و بەلاغەتە، جا لە سەر ئەو ئەساسەیە ئەو جوملەیە ئی

خودایە کە فەرموویەتی: ﴿وَلَيْسَ الذَّكرُ كالأُنثَى﴾ واتە نێر نابێ بە مێ. یانی بۆ خزمەتی خانەی خودا کوڕ لە پێشترە لە کچ، بەغەیرەز دەو نەزەرەدا نەبێ، کوڕ ناگاتە پلەی کچ، بەو دەلیلە: خودا دەیهەوێ وەک موعجیزەئاسایەک لەو کچە پێغەمبەرێکی مورسەل بێ باب بخولقێنێ. خۆ ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە ئەگەر ئەو زگەی دایکی مەریەمە کوڕ بایە، نەدەکرا لە زگی ئەو کوڕە پێغەمبەرێک بێ باب بە وەلەد بایە، دیارە دایکی مەریەمە ئاگاداری ئەو جەریانە نەبووە بۆیە داخی چاشتووە لە سەر ئەوەی کە زگەکەی کچ بووە و کوڕ نەبووە.

لە سەر ئەو بەراوەرد و هەڵسەنگاندنە مانای ﴿وَلَيْسَ الذَّكرُ كالأُنثَى﴾ واتە (وَلَيْسَ الذَّكرُ الذي طلبته كالأُنثَى التي أعطيناها) واتە ئەو نێرینەی ئەو داوای دەکرد وەک ئەو مێینەی ئەمن داومەتێ نابێ. یا دەڵێن: (وَلَيْسَ الذَّكرُ الذي هو مطلوبها كالأُنثَى التي اعطيناها) واتە نێرینەیەک کە مەبەستی حنّة دایکی مەریەمە بووە، وەک ئەو مێینەی کە ئێمە داومانە پێی نابێ، بەو دەلیلە هەڵدەکەوێ کە زۆر کچ ببێ لە کوڕ چاتر، ئەو کچەش کە مەریەمەیە لەو کچانەیە کە لە کوڕ چاترە.

و هەروا جوملەی ﴿وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ﴾ دەگەڕێتەوە سەر ﴿إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَى﴾ بەو پێیە دەبێ قەولی حنّة دایکی مەریەمە بێ. باقی جوملەکانی ﴿وإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ واتە ئەمن دایکی مەریەمە کە وا ناوم نا مەریەم، بەبێ گومان خۆی و نەوەکانی دەخەمە پەنای تۆ لە دەس شەیتانی دەرکراو.

بە پێی بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی ئایەتی ٣٦ دەکەوینە سەر ئەو باوەڕە کە دوعا و پاڕانەوەی حنّة دایکی مەریەمە، لەمەڕ ئاگاداری و پارازتنی ڕۆڵەکەی لە گەزەندی شەیتانی پاش دانانی زگەکەی بووە، یانی لە پاشبوونی مەریەمەی ئافرەت بووە، ئەو دوعا و پاڕانەوەیە ئەگەرچی لە هەندێک ڕیوایەت و قەولاندا ئیشارە وەلای ئەوەی کراوە کە لە پێش دانانی زگەکەیدا حنّة بۆ ڕۆڵەکەی نەزەرکراوی پاڕاوەتەوە لە خودا، ئەو دوو نەزەرە ڕوون کردنەوەی ئەوەی دەوێ: کامیان ڕاستە و ڕەوایە و دڵگرە؟

وڵام دەبێ ئاوا بێ: دایکی مەریەمە پێش ئەوە زگەکەی دانێ، بۆی پاڕاوەتەوە کە خودا ئەو زگە نەزرکراوەی بەجێی خۆی بگەیێنێ بە سلامەتی، و لە کاتی بەوەلەد بوونیشیدا هەر وا کە ئاوای دی کار بە پێچەوانەی چاوەڕوانی ڕووی دا، پتر بە سۆزتر پاڕاوە لە بەر خودا هەم لێی قەبووڵ کا هەم بیپارێزێ، لە ژێر پەنای ڕەحمەتی خۆیدا. دیارە بە پێی فەرموودەی پێغەمبەری

لەمەڕ لەدایـکبوونی ئەولاد کە شـەیتان چـۆنی دەڕوانێتـێ، دەبـێ دایـک زۆر بە سـۆزەوە بـۆ وەلەدەکەی وەپاڕێ، جا لە سەر ئەو ئەساسە دایکی مەریەمە حەقی خۆی بـووە کە بـۆ مەریەمە وەپاڕێ، ئەوەش حەدیسەکەی پێغەمبەر، سەیری کە: (ما مِن مَولودٍ یُولَـدُ إلاّ وَ الشَّـیطانُ یَمسُّـهُ حینَ یُولَدُ فَیَستَهِلَّ مَن مَسَّهُ صارخاً إلاّ مَریَمَ وَ ابْنَها؛ «بخاری ابـوهریرة») واتە هـیچ وەلەدێـک بەوەلەد نابێ ئیللا کە دەبـێ شـەیتان دەسـتێکی پێـدا دەمـاڵێ کە بەو هـۆیەوە دەگـری، مەگەر مەریەمە و ڕۆڵەکەی کە عیسایە، کە لە دەس پێدا ماڵینی شەیتانی بەدوور بوون ئەو دووانە.

و هەروا لە ابن‌عباسەوە کە گۆیا پێغەمبەر فەرموویەتی: (کُـلُّ وَلَـدِ آدَمَ یَنـالُ مِنـهُ الشَّـیطانُ یَطعَنُهُ حینَ یَقَعُ بِالأَرضِ بِأَصبُعِهِ وَ لِهٰذا یَسْتَهِلُّ إلاّ ما کانَ مِن مریمَ و ابْنِها فَإنَّهُ لَمْ یَصِلُ إبلـیسُ إلَیْهِما) واتە هەر ڕۆڵەیەک کە لە بەنی‌ئادەم دەبـێ، کـاتێ لە تـۆلی دایکـی دێ دەکەوێـتە سـەر زەوی، شەیتان قامکی دەگەیێنێتێ و تێی دەسرەوێنێ، بەو هۆیەوە ئەو منداڵە دەکەوێتە گریان، بە غەیرەز ئەو دوو منداڵانە، واتە مریەمە و ڕۆڵەکەی کە عیسایە، کە ئەو دووانە لە گەزەندی شەیتان وەدوور خراون.

دڵ دێرەدا ئەو سوئالەی بۆ دێتە پێش، دەبـێ هـۆی ئەوەی چ بـێ کە حەزرەتـی مەریەمە و ئەولادەکەی ئەو تایبەتمەندییەی پێ دراوە و باسی کرا و دوعای بـۆ کـرا کە خـودا لە گەزەنـدی شەیتان بیپارێزێ؟ خۆ کاروانی پێغەمبەران بەتـایبەتی محمـد المصـطفی لە گەزەنـدی شـەیتان پارێزراون!

دەبێ وڵامەکەی هەر ئەوە بێ: دیـارە بێ‌گومـانە ئەوە کە پێغەمـبەران لە گەزەنـدی شـەیتان وەدوور خراون، مەریەمە و عیسای جودا نین لە خێڵی پێغەمبەران، ئەمما هـۆی تایبەتمەنـدییان بەو پارازتنە دەبێ ئەوە بێ کە دایکی مەریەمەی نزاکەی وەرگیراوە لە لای خـودا و نەشـیدەزانی ئەو جەریاناتی وەعدەی خودا لە مەڕ پـارازتنی پێغەمـبەران، تـا دنیـا بزانـێ: نـزای دایکـان بـۆ ڕۆڵەکانیان گیرایە.

بـا ئەو کـوتەی خـاوەنی روح المعـانی کە لە عەلـلامە جەلالەدیـن سـیوتی‌ڕا هێنـاویەتی حاشاری نەدەین کە لەمەڕ پارازتنی حەزرەتی محمد المصـطفی فەرمـوویەتی: گۆیـا عەکـرەمە دەڵێ: (لَمّا وُلِدَ النَّبیُّ[ص] أَشْرَقَتِ الأَرضُ نوراً، فَقالَ إبلیسُ: لَقَد والیلـه ولـدٌ یُفسِـدُ عَلَیْنـا أمرَنـا فَقالَت لَهُ جُنودُهُ: لَو ذَهَبْتَ إلَیْهِ فَجاءَهُ فَرَکَضَهُ جبریـلُ فَوَقَـعَ بعـدن؛ «روح المعـانی، ١٨٤/٣»)

واتە: کاتێ پێغەمبەر بە وەلەد بوو، زەوی ڕووناک و نوورانی داگیرسا، شـەیتان کـوتی: ئەوشـۆ

کوڕێک بە وەلەد هات بەرهەڵستی ئامانجەمانمان دەبێ، لەشکری شەیتان بە شـەیتانیان کـوت: ئەگەر خۆت گەیاندبایە لە کارت دەخست؛ شـەیتان ویسـتی خـۆی بگەیێنێتـێ، بەڵام دەسـتی قودرەتی خودا (جبریل) دای لە دم و سینەی تووڕی دایە چۆڵ و بیابانان.

ئەو ڕیوایەتە ئەوە دەڵێ کە شەیتان ناتوانێ زەفەر بە پاکان و خاسانی خـودا بەرێ. سـەیری ئایەتی ٤٢ حجر بکە: ﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلاَّ مَنِ اتَّبَعَـكَ مِـنَ الْغَـاوِينَ﴾ واتە: بەڕاستی ئەتۆ شەیتان، دەستەڵات و توانات نییە بە سەر بەندەگانی مندا؛ واتە خاسان و پاکـان؛ جگە لەوانەی شوێن تۆ کەوتوون کە گومڕا و سەرلێشێواون.

**سووکە ئاوڕێک:**

یەکێک لە ئاداب و ڕەسمی عیبادەتی شەرعی پێغەمبەرانی ڕابردوو ئەوە بـوو کە یەکێـک لە ئەولادانی خۆیان نەزری خزمەتگوزاری مـاڵە خـودا کەن و هـیچ کاروبـارێکی دنیـایی نەخەنە ئەستۆی و پێی نەسپێرن. دایکی حەزرەتی مەریەمە لە سەر ئەو ئەساسە منداڵی زگی خۆی واتە مەریەمە، نەزری ئەو خزمەتەی کرد؛ ئەمما کـاتێ دایکـی مەریەمە زا و مەریەمەی بە دنیـا هـات بەرەو پیری ئەنجامدانی نەزرەکەی هات و مەریەمەی دە ئـامێزی مبـارەکی گـرت و بەرەو مـاڵە خودا (بیت المقدس) هات و هێنای. کاتێ هاتە لای عابدان و خزمەتکارانی بەیتولموقەددەس، حەزرەتی زەکەریاش کە یەکێک بوو لە خزمەتکـارانی ئەو جێیە، دایکـی مەریەمەی ڕووی تـێ کردن و گوتی: ئەمن ئەو منداڵەم بە خاتری خودا نەزری خزمەتکردنی ئەو ماڵە کـردووە، لەوە بە دوا ناتوانم لە لای خۆم وەیهێڵم چونکە ئی ئێرەیە و ئی من نییە؛ ئەمن ئەوە بە ئێوەی دەسپێرم. لەو لایەشـــەوە عیمرانـــی مێـــردی دایکـــی مەریەمە، کە ئـــیمام و چاوســـووری خـــانەی بەیتولموقەددەس بوو نەمابوو، بەڵکە مەریەمە هەر دە زگی دایکیدا بوو کە ئەو مردبوو، دەنا ئەو بۆ سەرپەرستی لە هەموو کەس لە پێشتر بوو چونکە بابی مەریەمە بوو، دیارە تەواوی عابدان و کاربەدەستانی بەیتولموقەددەس حازری ئەوەی بوون وەخـۆی گـرن و ئاگـاداری بـکەن، بەڵام دایکی بۆ دڵحەسانەوەی چاوەڕوانی ئی چاتر و ئەمینتر بۆ حاڵی کچەکەی دەکرد، دەو کاتەشدا حەزرەتی زەکەریا کە مێردی خوشکی بـوو کە دەبێـتە پـووری مەریەمەی، لەوێ بـوو، ئەویـش خوازیـاری وەرگرتنـی مەریەمە بـوو کە لە هەمـانیش بـابەتتر بـوو لە بەر ئیحتیـات دەیویسـت خۆڕاگری کا و نەڵێ بیدەنە من، ئەمن بۆ ئەو کارە شایانترم؛ خۆی وەخۆ نەتوانی بگرێ و زەوت کا، درکاندی و کوتی: خێزانی من پووریەتی و زۆر لە دایکی چاتر ئاگاداری لێ دەکا، بمـدەنێ

دەیـبەمەوە مـاڵی خـۆم، ئەگەرچـی دایکـی مەریەمەی ئەوەی زۆر پـێ خـۆش بـوو کە هەر چاوەڕوانی ئەوەش بوو، بەڵام ئەو عالەمی دەوروبەریـان هاواریـان لـێ پەیـدا بـوو کە ئەمەش خوازیارین سەربەخۆ ناتـدەینێ، بەبـێ قورعەکەشـی؛ دیـارە ئەوجـار هەموویـان بە کـۆدەنگی دەنگیان دا بۆ قورعەکەشی، ئەوجـا دڵـی سـەراپای خوازیـارانی مەریەمە هـاتنە جووڵەجـووڵ بەتایبەت ئـی دایکـی کە ئایـا قـورعە بە نـاوی کـێ دەردەکەوێ و کـێ بەرەنـدە دەبـێ دێـرەدا. سەرەنجام عەداڵەتی خودا و نیزام و تەرتیبی ڕێکوپێکی جوانی خودا خۆی نواند و مەریەمەی دا بە زەکەریای مێردی پووری، هەم دڵی دایکی دامرکاند هەم دڵی زەکەریا و پووری، هەم واش هاتە گۆڕێ کـار کەسـی خـۆی بە مەغمـوون نەزانـی، هەمـوو شـتێکیان حەواڵەی نەسـیب و چارەنووس کرد.

هەندێک دەڵێن زەکەریا دایەنی بۆ گـرت بـۆ بەخێـو کردنـی، هەنـدێکیش دەڵـێن پـووری وەریگرت و نیازشی بە شیر خواردن نەبوو، بە ئاو و خۆراکی عادی تا خڕەکە و قوونەنشین بوو مەریەمە ژیـا؛ پاشـان حەزرەتـی زەکەریـا لە یەکێـک لە حوجرەکـانی بەیتولمـوقەدەس داینـا و ئاگاداری دەکرد، تا کاتی جەم و خۆراکدانی بەجێی دەهێشت، دەرگـای لـێ دادەخسـت و لە کاتی جەمدانی کە زەکەریا دەهاتە لای دەیدی خۆراکی وای لە لا بوو وەک ئەوەی نەدەچوو کە زەکەریا بۆی دەبرد، پرسیاری لێ کرد لە مەریەمە ئەو خواردەمەنییەت لە کوێڕات بۆ دێ؟ ئەویش توانی زەکەریای حاڵی کا لە خەزانەی غەیبەوە دێ.

ئەو کارەساتە و ئەو بەسەرهاتە چمان پێ دەڵێ؟ ئەوەمان پـێ دەڵـێ: کـێ بـۆ خـودا بـێ، خوداش چەند بارتەقای بۆ دەبێ، کێ هەنگاوێک بۆ لای خودا باوێ، خودا چەند بەرابەری بـۆ لا داوێ.

حەزرەتـی زەکەریـا لە بـابەت سەرپەرسـتی و ئاگـاداری حەزرەتـی مـریەم، چەنـد شـتی عەجـایەب و سەرسـووڕهێنەری چـاو کـردن لەمەڕ ڕەحـم و توانـایی خـودا، جـا لە سـەر ئەو چاوکردن و جووڵانەوەی بەزەی، هەستی لە سۆزی هاتە جـۆش و جـووڵانەوە، هـاواری کـردە خودا و کوتی: ئەولادێکی چاک و پاک و لێوەشاوەی پێ عەتا کە لە خەزانەی بەزەت کەم نابێ، بێگومان ئەتۆ زۆر بیسەری، بۆ ڕاستی سەیری ئایەتی ٣٧ و ٣٨ی ئالی عیمران کە بە وردی:

**فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كلَّمَا دَخَـلَ عَلَيْهَـا زَكَرِيَّـا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقاً قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَك هَـذَا قَالَـتْ هُـوَ مِـنْ عِنـدِ اللّه إنَّ اللّه**

يَرْزُقُ مَن يَشَاء بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾ هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاء ﴿٣٨﴾ ئالی عیمران

**لە ئاكامدا خودای زۆر بە جوانی لێی وەرگرت و زر بە جوانیشی پەروەردە كرد، زەكەریای كردە كەفیلی، هەر كاتێ زەكەریا دەچووە لای لە مێحرابەكەدا، دەیدی كە وا خواردەمەنی و ڕزق و ڕۆزی لا دانراوە. زەكەریا دەیكوت یا مەریەمە ئەوەت لە كوێ بوو؟ ئەویش دەیكوت ئەوە لە لای خوداوە هاتووە، بێگومان خودا ڕۆزی دەدا بە هەر كەسێ كە بیهەوێ، بەبێ ژمارە (٣٧) لەوێدا بوو زەكەریا پاڕایەوە لە پەروەردگاری و كوتی: ئەی پەروەردگارم، لە لایەن خۆتەوە منداڵێكی پاك و خاوێنم پێ ببەخشە، چونكە هەر تۆی بیسەری نزا.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێكی هەستیارانە لە سەر سیما و ناوەرۆكی دوو ئایەتی ٣٧و ٣٨:**

خودای مەریەم، مەریەمەی وەرگرت لە دایكی بە وەرگرتنێكی جوان و ڕازیش بوو خودا بەوەی كە مەریەمە ئازاد بێ بۆ خوداپەرستی و خزمەتی خانەی خودا كە بەیتولموقەدەسە، و هەروا خودا ڕواندی بە ڕواندنێكی جوان، یانی خودای تەعالا پەروەردەی كرد بە پەروەردەیەكی پاك و خاوێن و جوان، چ لە ڕووی جەستە و چ لە بابەت ئەخلاق و گیانەوە.

مەریەمە لەبەر ئەوەی بابی مردبوو، دەبا كەسێك هەبێ وەك باب وە خۆی گرێ و چاوەدێری بكا، هەر ئەوەشبوو هۆ خودا دای بە زەكەریای مێردی پووری كە وەك باب و دایكی خۆی چاوەدێرییان دەكرد (وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا) واتە زەكەریا دەستەبەر بوو بۆ بەخێوكردنی مەریەم و چاوەدێری كردنی.

حەزرەتی زەكەریا لە پێناو ئەو خزمەتە گەورە پڕ بایخە، خودا هانی دا بۆوەی داوا لە خودا بكا بۆ ئاوەدان بوونەوەی وەجاخی دۆلیلی بداتێ با پیریش بێ، بۆ خۆی و خێزانی، ئەوە بوو كە داوای كرد و خوداش داییە.

لێرەدا ئەوە هەست دەكرێ دوو دۆعای حنّة دایكی مەریەمە وەرگیران لە لایەن خوداوە، بە هۆی ئەوەی كە دایكی مەریەمە بە كوڵ و سۆز و نیەتێكی پاكەوە خۆی هاویشتە لای خودا. دوو دوعاكان ئەوە بوون: ١. خودا مەریەمەی بۆ خزمەتی بەیتولموقەدەس لێ وەرگرت، ٢. خودا ڕوحیەی وا داڕشت پاك و بەتین و گوڕ بۆ تاراندنی هەوا و وەسوەسەی شەیتانی، كە شەیتان نەیتوانی لە هیچ بارێكەوە زەفەری پێ بەرێ. هەر وەك ئاماژە وەلای ئەو ڕاستییە دەكا ئایەتی ٤٢ی هەمان سوورەی ئالی عیمران، كە نەختێك لەوە بە دوا بە خزمەتی دەگەین.

**ئاوڕێک وەسەر پیتی «ب» لە سەر وشەی «بقبول» لە ڕوانگەی یاسای عیلمی نەحو:**

۱. بە پێی نەزەری هەندێک لە زانایانی عیلمی نەحو، ئەو «ب»یە بۆ ئیستیعانەیە واتە داوای یارمەتی، یانی خودای تەعالا ئەو داوایەی قەبووڵ کرد بە قەبووڵکردنێکی جوان.

۲. هەندێکش دەڵێن ئەو پیتە بێیە بۆ ملابەسەیە، یانی خودا بەو کچە نەزرکـراوە ڕازی بـوو، ڕازی بوونێکی وا کە لە باتی یەک کوڕی نەزرکراوی وەرگـرت و قبـووڵ کـرد، واتە هەر دەڵێـی یەک کوڕە، ئینجا ئەو جۆرە قبووڵە قبووڵێکی جوان و ڕەوایە.

۳. هەندێکیش دەڵێن: ئەو «ب»یە زیادە، واتە ئەگەر لاشچێ مانای جوملەکە ناگۆڕێ.

۴. هەندێکیش دەڵێن ئەو «ب»یە بۆ دەگەڵبوونە (مصاحبە)، یانی قبووڵی کرد خودا دەگەڵ قبووڵێکی جوان

بەڵام پەسەند و ڕەواتر لەو نەزەرانە نەزەری هەوەڵە.

لە ابن‌عباسەوە نەقڵ کراوە یانی ئەڵـڵا تەعـالا مەریەمەی وەرگـرت بە شـێوەیەکی جـوانی تەربیەت دا و ڕامی کرد و حاملاندی، دەو حاڵەتە منداڵیەیدا.

هەر لە ابن‌عباسەوە: کە خودا حەزرەتی مەریەمەی لە بابەت سیما و قەد و بـاڵا پەروەردەی کرد بە پێچەوانەی داب و عـادەتی غەیـری خـۆی، واتە یەک ڕۆژەی دوو ڕۆژە و یەک مـانگەی دوو مانگە و یەک ساڵەی دوو ساڵە دەڕۆیشتە پێش.

کاتێ زەکەریا لە بابەت خواردەمەنییەکی بۆ دەهات پرسیاری لێ کرد ئەو خواردەمەنییەت لە کوێرا بۆ دێت؛ ئاوا بە سازکراوی؟ حەزرەتی مەریەمە لە وڵامی زەکەریادا دەیفەرمـوو: ﴿قَالَـتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللّهِ﴾ واتە لای خوداوە (جاء من الجنّـة). گۆیـا بەوەی زکەریـا دەیزانـی خـۆراکی بەهەشتە بۆی دێ. ئەو خۆراکە خاسیەتی خۆراکی بەهەشتی بـوو واتە مەریەمە پێـی نـاڕەحەت نەدەبوو هەچەنـدی خواردبـای و نەشدەسـەر قەزای حـاجەت واتە نیـازی بە قەزای حـاجەت نەدەبوو، گۆیا ئەو جۆرە خواردن و خواردنوەوەیە و قسە کردنی مەریەمە دە تەمەنی یەک ساڵیدا بووە.

زانایان لە هەڵسەنگاندنی ئەو بەسەرهاتە پڕ لە ڕاز و ڕەمزە، کەوتنە سەر بابەت و بـڕوایە کە ئەساسی خەلافەت و جێنشینی لێهاتووییە و شـایانە نەک نەسـەب و بەرە و تیـرە و هـۆزایەتی، مەسەلەن بەرە و نەسل و هـۆز ئەگەر ڕۆڵەی نەسـەبیان هەیە، ڕۆڵەی مەعنەویشـیان هەیە، خـۆ ئەوەش ئاشکرایە کە ڕۆڵەی مەعنەوی شایانتر و ڕێزدارترە لە ڕۆڵەی نەسـەبی لە لایەن دیـدگای

بەرزی ئایین و شەرعی خودا. چونکە ئایین دەڵێ خەلیفە و نایب و وەلی دەبێ لە زانایان و خاوەن کەسایەتی هەڵبژێردرێ نەک بە پێی نەسەب.

هەڵبژاردنی پێغەمبەران لە سەر ئەساسی لێهاتوویی و شایستەگی بووە نەک نەسەب؛ (تفسیر تبینن الفرقان، ج ٥/ باسی هەمان ئایەتی ٣٧ و ٣٨)

با ئەوەندەیش بۆ گەشەی زانست بێ: منداڵانێکی کە بە ساوایی و دە لانکەدا وە قسە هاتوون دەبێ ١١ بووبن بە پێی فەرموودەی ئیمامی سیوتی: محمد المصطفی، یەحیا، عیسا، ئیبراهیم خەلیل، مەریەمە، جریح، شاهیدی یۆسف، منداڵێکی اصحاب الاخدود، منداڵێک لە سەر جاریە، منداڵێک لە دەورەی فیرعەوندا، منداڵێک لە دەورەی حەزرەتی محمد المصطفیدا. (روح المعانی، ج ٣/ ١٨٧)

ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە سەر ئەساسی ئەو بەسەرهاتەی حەزرەتی مەریەمە کۆدەنگن لە سەر ئەوەی کەرامەتی ئەولیا واتە نیزیکانی خودا هەیە و ڕاستە و دەشبێ بکوترێ: کەرامەت بەشێکە لە موعجیزە، بەڵام ئینکاری کەرامەت کافربوونی لە دوا نییە بەڵکە فاسقبوونی تێدایە، هەنە هەندێک دەو بەسەرهاتەی حەزرەتی مەریەمەدا هەچی وەک کەرامەت ڕووی داوە ەب ئی مەریەمەی نازانن بەڵکە دەیدەنە پاڵ حەزرەتی زەکەریا. (روح المعانی، ج ٣/ ١٨٧؛ تفسیر کبیر، ج ٨ / ٣٣-٣٢)

ئەمما ئەهلی سوننەت بۆ بەرپەرچدانەوەی نەزەری ئەو هەندانە دەڵێن: زەکەریا لەو بەسەرهات و کارەساتەی مەریەمە کەوتە تێمان و دامان و حەیران، ئەگەر لەوڕا بان ئەو کارانە چۆن لێیان وە عەجایب دەما، چونکە بە عەجايبەوە لە مەریەمەی پرسی: ئەو خواردەمەنییەت لە کوێڕا بۆ دێ؟! حەزرەتی مەریەمەش لە وڵامدا کوتی: لە لایەن خوداوە دێ. جا ئەگەر کەراماتی خۆی با زەکەریا چۆن نەیدەزانی لە کوێڕا دێ ئەو خۆراکە؟ جا لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ بکوترێ کەرامەتی حەزرەتی مەریەمە بوون ئەو جەریانە.

ئایەتی ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ﴾ ئاماژە و هاواری تەواوە لە سەر ڕاستی و حەقانیەتی کەراماتی ئەولیا؛ چونکە عولەمایانی جمهوور بە کۆدەنگی دەڵێن حەزرەتی مەریەمە وەلی بووە نەک نەبی. (روح المعانی، ج٣/ ١٨٧)

**سووکە ئاوڕێک وەلای وشەکانی (من لدنک؛ ذريّة، طيّبة) لە بابەت یاسا و ئادابی عیلمەوە**

وشەی (لدن) کە دە ئایەتی ١٠ سوورەی کەهفیشدا هاتووە، ئەمما دێرەدا واتە ٣٨ی ئالی

عیمران مەبەست ئەوەیە خودا ئەولادێکم دەیە ئەو ئەولادەش بە پێی وشەی (ذريّة) چ نێر بێ چ مێ، دەبێ و دەیگرێتەوە؛ چ یەک بێ چ زیاتر بێ؛ وشەی (ذرّيّة) شامیلی دەبێ و دێ.

جا ئە دێرەدا ئەوەی بە ئیشکال بۆ مە دێتە پێش و سەر هەڵدەدا ئەوەیە: بە پێی عادەت و باو ئەولاد سەربەخۆ بێ وەسیلە و ئەسباب و ئامرازی تایبەتی خۆی وەک نیزیک و سەرجێیی ژن بە لەزەت و ئاوی خۆی نەبێ نابێ دە دیارە زەکەریا و خێزانی لەو ئەسبابانە وەدوور کەوتبوون، ئەوە دەبێ بڵێین: زەکەریا کە خۆی ئاوا ناسیوە و ئاشنا بەو داب و باوەش بووە، دەو دوعا و پاڕانەوەدا مەبەستی چ بووە؟ دەبێ لە وڵامدا بکوترێ: زەکەریا لەو نزایەدا ئەوەی دە نیەتدا بووە: ئەی پەروەردگاری من، دەمهەوێ لە تۆ نەڕوانی لە ئەسباب و عادەتی مندال دان، بڕوانی لە ڕەحم و کەرەم و خالقیەتی خۆت ڕۆڵەیەکم دەیەی.

وشەی (طيبة)ش ئەگەرچی بۆ مێ دابەزیوە بە زاهیر بۆ (ذريّة)، ئەمما وشەی نێر و مێ وا هەیە سواری لەفز دەبن، وا هەیە سواری مەعنا دەبن، ئەو یاسایەش دە ئەسماء ئەجناس بە کار دەبرێ چونکە ئەسماء ئەجناس عامە بۆ هەرچی بڵی دەبێ. ئە بۆ ئەسماء ئەعلام نابێ چونکە ئەسماء ئەعلام ناو و نیشانی دیاری کراوە هەر ئەو بێ، دەنابێ بۆ لەفزی نێر مێ بکوترێ و یا بە پێچەوانە. (تفسر كبير، هەمان ئایەت).

**تیوتیوە:**

لە ئایەتی ٣٦ڕا تا ئایەتی ٣٨ خودای تەعالا بەسەرهاتی حەزرەتی مەریەمەی لە نەزریڕا تا دەگاتە سەرپەرستی حەزرەتی زەکەریا، بەیان فەرموو. حەزرەتی زەکەریا مێردی پووری حەزرەتی مەریەمە بوو، گۆیا ئەو پوورەی ناوی «ایشاع» بووە. حەزرەتی زەکەریا زۆر پیر و بەساڵاچوو بوو، ئەولادیشی نەبوو، هۆی ئەوەی کە دەو تەمەنەدا داوای ئەولادی کرد لە خودا بە چاو کردنی کارەساتی مەریەمەی دڵی پڕ لە ئیمانی هەستا و هەستی بە بەزە و قودرەت و توانایی خودا کە دەتوانێ بەبێ وەسیلە و ئامراز هەچی وازی لێ بێ و بیهەوێ بیکا و پێکی بێنێ. جا بەو هۆیە ئەو ناهومێدیەی کە لە بابەت منداڵیدا هەیبوو لە بەر پیری و لە کارکەوتوویی لە ناو دەروونی پڕ لە سۆز و ئیمانی لاچوو و ڕەوی هەستا لە حوجرەی تەیایی خۆیدا پڕ بە سۆز و کوڵەوە لە خودا پاڕاوە بۆ منداڵێک وەک خودا بە وەسیلەی ئایەتەکانی ٢ تا ٨ و ٩ی سوورەی مەریەم ئەو ڕاستییە بەیان دەکا و بە ئینسانی ڕادەگەیێنێ، بۆ وەی ئینسان دەرسی لێ وەرگرێ و بزانێ کێ بە پاکی و بە چاکی پەنا بەرێتە بەر خودا، خودا پەنای دەدا. ئەوەش ئایەتەکان:

ذِكْرُ رَحْمَةِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا ﴿٢﴾ إِذْ نَادَى رَبَّهُ نِدَاءً خَفِيًّا ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْبًا وَلَمْ أَكُن بِدُعَائِكَ رَبِّ شَقِيًّا ﴿٤﴾ وَإِنِّي خِفْتُ الْمَوَالِيَ مِن وَرَائِي وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا فَهَبْ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ﴿٥﴾ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ آلِ يَعْقُوبَ وَاجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا ﴿٦﴾ يَا زَكَرِيَّا إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ اسْمُهُ يَحْيَى لَمْ نَجْعَل لَّهُ مِن قَبْلُ سَمِيًّا ﴿٧﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ الْكِبَرِ عِتِيًّا ﴿٨﴾ قَالَ كَذَلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْئًا ﴿٩﴾

ئەوە یادی بەزەی پەروەردگارتە، سەبارەت بە بەندەکەی خۆی زەکەریـا (٢) ئەو کـاتەی کە بە دەنگێکی نـزم و نەرم، بـانگی لە پەروەردگـاری کـرد (٣) کـوتی ئەی پەروەردگـارم، بەڕاسـتی ئێسکم لاواز و نەرم بووە لە پیریشدا، سەرم بریسکەی سـپیی دەداتەوە، پەروەردگـارم هەرگیـز لە لێپاڕانەوەت ناهومێد نەبووم و ناشبم (٤) بەڕاستی من لە پاش خۆشم نیگەرانی خزمەکـانی خـۆمم، ژنەکەشـم، نەزۆکە و منـداڵی نـابێ، کەواتە هەر لە لایەنـی خـۆتەوە جێنشـینێکم پـێ ببەخشە. (٥) تاکوو میراتبەری من و بنەماڵەکەی یاقووبیش بێت، پەروەردگـارم، وای بێـنە دی خۆت پەسەندی کەی (٦) ئەی زەکەریا ئێمە مزگێنی منداڵێکت پێ دەدەین یەحیای ناوە، پێشتر کەسمان بەو ناوە نەکردووە (٧) زەکەریا کوتی: ئەی پەروەردگارم ئەمن چۆن منـداڵم دەبـێ؟ دە کاتێکدا ژنەکەم نەزۆکە و خۆشم لە پیریدا پەکم کەوتووە! (٨) خودا کوتی: ئیتر هەر وا دەبێ، پەروەردگارت دەفەرموێ: ئەوە لە لای من ئاسانە، بەڕاستی لە پێشیشـدا تـۆم دروسـت کـرد و هەر هیچ نەبووی، (واتە لە نەبووندا تۆم خوڵقاند) ئەوەش ئاوا بێ ئەسباب دەخوڵقێنم (٩)

ئەو ئایەتە پێمان دەڵێن خودا هەچی بیهەوێ دەتوانێ بیکا، خودا نیازی بە ئەسباب نییە.

دڵ زۆر تامەزرۆ و خوازیاری ئەوەیە بزانـێ ئایـا خـودای خـاوەن کەرەم و بەزە، ئەو نـزا و داوایە لە زەکەریا قبووڵ دەکا و لێی وەردەگرێ یان وەریناگرێ؟ بۆ تێگەیشتن و زانیاری دەچیـنە خزمەت ئایەتی ٣٩ی ئالی عیمران:

فَنَادَتْهُ الْمَلآئِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ أَنَّ اللّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَـى مُصَدِّقًا بِكَلِمَـةٍ مِّنَ اللّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿٣٩﴾ ئالی عیمران

لە کاتێکدا کە زەکەریا ڕاوەستابوو و نوێژی دەکرد لە مێحرابدا، فرشـتەکان بانگیـان لـێ کـرد، بێگومان خودا موژدەی کوڕێکـت پـێ دەدا کە یەحیـایە، بـاوەڕپێکراوی وشـەی خـودایە (کە عیسایە) سەروەر و خۆپارێزەر و پێغەمبەرێکە لە چاکان.

**تێڕوانین و ئاوڕدانەوەیەکی هەستیارانە وەسەر سیما و ناوەرۆکی ئایەتی ٣٩ی ئالی عیمران:**

ئەوجار پاش پاڕانەوە و نزای زەکەریا لە دیوانی خودا، خودا بە وەسیلەی فرشتە زەکەریـای بانگ دەکا و حاڵی دەکا دە کاتێکدا کە زەکەریـا لە نـاو ژووری حـوجرەی حەزرەتـی مەریەمەدا وێستابوو، دەپاڕاوە لە بەر خودا، فرشتەکان کوتیـان بە زەکەریـا: کە خـودا مزگێنیـت دەداتـێ بە کــوڕێکی کە ناویشــی یەحیــایە، هەر ئەو یەحیــایەش کــوڕێکی وایە بە پێغەمبەرایەتــی عیســا بڕواهێنەرە یانی یەکەم کەسە بڕوا دێنێ بەو عیسایەی کە بە ئەمری (کن فیکون) لە دایک دەبـێ، هەر ئەو عیسایە (سیّد) واتە پێشەوای ڕێگای خودایە، (حصور)ە، واتە بەرگری نەفسی خۆیەتی و دەیگێڕێتەوە لە سەرەڕۆیی و بێشـەرعی، (نبیّـا مـن الصـالحین) واتە عیسـا پێغەمـبەرێکە لە پێغەمبەرەکانی پاک و چاک کرداران.

کاتێ حەزرەتی زەکەریا ئەو موژدە خۆشەی پێ دەگا، دەزانێ و بـاوەڕ دەکـا ئەمـری خـودا ڕاستە و جێی باوەڕە، ئەمما نازانێ زەکەریای ئاوا پیر و لەکارکەوتوو، ژن هەر پیـر و منداڵـدانی هەڵقرچاو چۆناوچۆن منداڵی دەبێ، وەک حەزرەتی ئیبراهیم کە فەرمـووی خـودایە گیـانلەبەر بڕوان چۆناوچۆن وەگیان دێنیەوە؟ خودا پێی کوت بۆ باوەڕ ناکەی بتوانم؟ ئیبراهـیم فەرمـووی ئەمما بۆ ئارامی و دامرکانی دڵم! زەکەریاش پرسیارەکەی بۆ ئارامی دڵیەتی. خوداش پێی دەڵێ: ﴿كَذَلِكَ اللّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ﴾ (٤٠) ئالی عیمـران) واتە وایە؛ وەک دەڵێـی زەکەریـا، بەڵام خـودا هەچی ئیرادە و حەز کا دەیکا، ناڕوانێتە ئەسباب و وەسیلە، پاشان دیـارە دڵـی بـزۆزی زەکەریـا وەک ئینسان زەوت نابێ و داناسەکنێ، دووبارە داوای نیشانەی ئەو مـزگێنییە خۆشـەی دەکـا لە خودا، خوداش نیشانەی نیشان دەدات، جا بۆ ڕاستی مەبەست و مەتڵەب پاش نەختێکی دیـکە دەچینە خـزمەت ئایەتەکـانی ٤٠ و ٤١ کە هەم وەڵامـی زەکەریـان هەم نیشـانەی کـوڕ پێدانـی زەکەریایە.

دیارە پاڕانەوەی زەکەریا وەرگیرا و قەبووڵ کرا لە لایەن خـوداوە بە وەسـیلەی فرشـتە تێـی گەیێندرا. ئەمما لە ڕوانگەی عیلمی نەحو، هەست بە ئیشکالێک دەکرێ، وەک ئەوە: «ملائکـة» جەمعە، و ئەو فرشتەی مزگێنیشان دەدا حەزرەتی جبریلە، فەردە؛ ئەوە دەبێ چ بڵێـین لە بـابەت ئەو ئیشکالە؟ دەبێ ئاوا بکوترێ: ئەو جەمعە یا لە بەر شان و شکۆی جبرەئیلە، و یـا هەر لە بەر شان و شکۆی جبرەئیل هەیئەتێکی لە خزمەتدا بوون لە کاتی موژدەدانەکەدا.

گۆیا هەندێک لە زانایان بە قەولی ابـن منـذور و ابـن مـردویە بە نەقـڵ لە ابـن مسـعودەوە

(فَنَادَتْهُ الْمَلآئِكَةُ) بە وشەی نێر خوێندراوەتەوە، لە بەر خـۆ بە دوور گـرتن لە مانـای ئـایەتی ٢٧ی سوورەی نەجم، واتە ئەوانەی بێباوەڕن بە ڕۆژی ئاخرەت، فرشتە بە مێ ناو دەبەن. سەیر کە ئایەتەکە:

> **إِنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ لَيُسَمُّونَ الْمَلَائِكَةَ تَسْمِيَةَ الْأُنثَىٰ**
> **بێگومان ئەوانەی کە بڕوایان بە پاشەڕۆژ نییە، ناوی مێینە لە فریشتەکان دەنێن.**

واتە بە حیسابە ناڕەواکەی وان مێ کوتنی فرشتە کـاری بێبـاوەڕانە، (فَنَادَتْـهُ الْمَلآئِكَـةُ) قەولی جمهوورە. (روح المعانی، ج ٣/ ١٩٣؛ تفسیر قرطبی، ج ٤/ ٧٤)

با ئەوەش ساغ بێتەوە: ئایا خودا ئەو کوڕەی زەکەریای ناو نا یەحیا؟ یا دای و بـابی؟ وڵام: ئەگەر جوملەی ﴿أَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَـىٰ﴾ ئاوا تەعبیر کەین بڵێـین: ئەو جـوملەیە دە ئەساسـدا (بأَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ ) بووە واتە پیتی بێی هەبووە و لابـراوە، ئەوە سـابت دەبـێ کە خـودای تەعـالا ناوی ناوە یەحیا؛ ابن‌عباسیش فەرموویەتی: ناودار کردنی ئەو کوڕە بە یەحیـا، دەگەڕێـتەوە لای نەجات‌دانی دایکی لە نەزۆکی وە لای نەسل و زان؛ واتە دەبێ بگوترێ: (لِأَنَّ اللهَ أَحیا بِهِ عَقـرَ أُمِّهِ). قتادة فەرموویەتی: (لِأَنَّ اللهَ أَحیا قَلبَهُ بِالإیمانِ)، واتە خودای تەعالا دڵ و دەروونـی ئەو کوڕەی زیندوو ڕاگرتووە بە نووری ئیمان.

هەندێکی دیش ئاوایان بەراورد کردووە کە ئەو نێو لێنانە لە تەرەف خوداوە دەگەڕێـتەوە بـۆ ئێرە کە خودای زانیویەتی ئەو کوڕە شەهید دەکرێ، خۆ شـەهیدی ڕێگـای ڕاسـتیش سـابیتە کە نامرێ و هەمیشە زیندوویە، لە سەر ئەساسی ئایەتی ١٦٩ی ئالی عیمران:

> **وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ**
> **وا مەزانن هەرگیز ئەو کەسانەی لە ڕێگای خودادا دەکوژرێن مردوون، بەڵکـوو زینـدوون و لە لای پەروەردگاریانەوە ڕزق و ڕۆژییان دەدرێتێ.**

ئەوەشیان بۆ کوتوون: (لِأَنَّ اللهَ يَحيَـی بِـهِ النـاسَ بِالهُـدَیٰ) واتـە خـودا بە وەسـیلەی ئەو شەهیدە عالەم بە هیداەت دەگەیێنێ و زیندوو دەکاتەوە. (روح المعانی، ١٩٤/٣؛ قرطبی، ٧٥/٤)

مانای ﴿مُصَـدِّقًا بِكَلِمَـةٍ مِّـنَ اللَّهِ﴾ واتە تەسـدیق‌کەری کەلیمەتـوڵڵایە (عیسـا)، ئەوە بە هەوەڵـین سـیفەتی مبـارەکی حەزرەتـی یەحیـا دەژمێـردرێ کە دە زگـی دایکیـدا تەسـدیقی

پێغەمبەرایەتی حەزرەتی عیسای کردووە (طبری، ٢٥٣/٣). بە نەقڵ لە ابن‌عباسەوە (کلمة اللە) حەزرەتی عیسایە، و هەوەڵین کەسێک کە ئیمانی پێ هێنا یەحیا بوو؛ کلمةاللەشیان بۆیە پێ کوتووە چونکە بە بێ وەسیلە و ئەسبابی بوون بە منداڵ، واتە تێکەڵاوی ئاوی نێر و مێ، بەڵکە هەر بە ئەمری (کن) بوو. نەقڵە لە مسند امام احمد ئەویش لە مجاهیدەوە کاتێ حەزرەتی مەریەمە ئاوس دەبێ، دایکی حەزرەتی یەحیاش هەروا حامیلە دەبێ بە یەحیا؛ گۆیا شەش مانگ لە پێش مەریەمەدا حامیلە دەبێ، زۆربەی زانایانی ئاینیی لە سەر ئەو باوەڕەن کە هەر یەک لە عیسا و لە یەحیا یەکتریان لە مەڕ پێغەمبەرایەتی هەر دە زگی دایکێدا تەسدیق کردووە.

دەمانهەوێ بزانین حەزرەتی یەحیایان بۆ شەهید کرد؟

گۆیا دەڵێن هیرۆدۆس کابرایەکی مەجووسی بووە، خوشکی خۆی کردبوو بە ژنی خۆی. حەزرەتی یەحیاش لە سەر ئەو کارەی لۆمە و مەنع و بەربەرەکانی دەکرد. دە حاڵێکدا کە بە مەقامی پێغەمبەرایەتی گەیشتبوو، ئەوە پێش هەرای چوونی عیسا بۆ ئاسمان بوو. هیرۆدۆس یەحیای شەهید دەکا. (روح المعانی، ١٩٦/٣)

خودای تەعالا دەو ئایەتە ٣٩دا پێنج سیفەتی بەرز و ڕێزدار بۆ یەحیا ناو دەبا:

١. تەسدیق‌کەری عیسا واتە کلمة اللە

٢. سیّد واتە سەردار دە عیلمی پێغەمبەرایەتیدا

٣. حصور واتە خۆ وەخۆ گر و دوور لە ژنان

٤. نبيّ: واتە پێغەمبەر

٥. صالح واتە لە پاکان و خاسان و بێ‌گوناهان. (روح المعانی، ١٩٧/٣)

زیاد لەوەی کە مەقامی پێغەمبەرایەتی هەبوو بۆ ناویشی بە صالح و معصوم دەرچوو؟! دەبێ بکوترێ: ساڵح سیفەتێکی عامە واتە لە هەر بارێکەوە یەحیا تەواو بووە.

حەزرەتی یەحیا لە زۆر بابەتانەوە وەک حەزرەتی عیسا دەبوو دەچوو مەسەلەن دە تەمەنی کاڵی منداڵیدا پلەی پێغەمبەرایەتی بەرکەوت، ناوی یەحیایەتی، زۆر سەنا و یادی خودا، لەدایکبوونی، مەرگی، حەشری، لە بەر زۆر یادی خودا کردنی لە مەر هەوش ویشکاوی هاتبوو.

یەحیا دە چوار سوورەی ئالی عیمران، ئەنعام، مەریەم، ئەنبیادا ناو براوە. بە پێی

فەرموودەی تەفسیری مونیر، خێزانی حەزرەتی زەکەریا کە نـاوی «الیصـابات» دەبـێ لە هەمـان دەوراندا بە یەحیا ئاوس دەبێ کە حەزرەتی مەریەمە بە عیسا ئاوس دەبێ. کاتێ یەحیا لە دایـک دەبێ و پێدەگا دە دەستووراتی شەریعەتی حەزرەتی مووسـادا خوازیـاری فتـوا و دەسـتوورات دەبێ. هیـرۆدۆس کە یەکێـک لە حـاکمانی فەلەسـتین دەبـێ بـرازای خـۆی بە نـاوی هیرۆدیـا دەخوازێ و دەیکاتە ژنی خۆی، حەزرەتی یەحیا کە دەیزانـی لە ئـاینی حەقـی باریـدا ئەو کـارە حەرام و ناڕەوایە، بەربەرەکانی و بەرهەڵستی دەست پێکرد. ئەوانیش هەر وەک دەسـتەڵاتدارانی زەمان کە حەقی دەخەنە ژێر پێی هەوا و هەوەسیان، چارەیان ئـاوا بە چـارە زانـی کە حەزرەتـی یەحیا لە ناو بەرن. هاتن بە حیلە و فێڵ یەحیایان لە ناو برد تا ئەو دەنگە کە برازا بە مامی ناشـێ لەناو بەرن و ون بێ. حەزرەتی یەحیا پێش تەمەنی ٣٠ساڵی بە پلەی پێغەمبەرایەتی گەیشت. بە پێی ئیشاراتی ئایەتی ١٢ی سووڕەی مەریەم:

**يَا يَحْيَى خُذِ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيًّا**
**ئەی یەحیا!** ئەو کتێبە بەوپەڕی توندوتۆڵی و ئەرزشـەوە بگـرە؛ هەر لە کـاتی کـاڵی و لاوی و شلکیدا تێگەیشتن و کارامەیی و کاربەجێییمان پێ بەخشی.

کاتی ئەوەی هاتووە کە بچیـنە خـزمەت ئایەتەکـانی ٤٠ و ٤١ی ئـالی عیمـران کە جـوابی خودان بۆ حەزرەتی زەکەریا لە بابەت منداڵ پێدانی:

**قَالَ رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَقَدْ بَلَغَنِيَ الْكِبَرُ وَامْرَأَتِي عَاقِرٌ قَالَ كَذَلِكَ اللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ ﴿٤٠﴾ قَالَ رَبِّ اجْعَلْ لِي آيَةً قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَاذْكُرْ رَبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ ﴿٤١﴾**
زەکەریا کوتی: ئەی پەروەردگارم، ئەمن لە کوێ منداڵم دەبێ! پیرم و ژنەکەشـم نەزۆکە و هەرگیـز زگ ناکا!؟ خودا فەرمووی پێی: کارێکی خودا بیهەوێ بیکا ئەنجـامی دەدا و دەیکـا؛ بـێ ئەسـبابی ناتوانێ پێشی پێ بگرێ (٤٠) زەکەریا کوتی: ئەی پەروەردگـارم، نیشـانەیەکم بـۆ دانـێ، خـوداش فەرمووی: بەڵگە و نیشانەی تۆ ئەوەیە سێ ڕۆژان دەگەڵ خەڵک بە ئاماژە نەبێ، مەدووی و قسـە نەکەیت؛ یادی خوداشت زۆر بکە و سەنای بکە، ئێوارە و بەیانانیش سەنای بکە (٤١)

**تێڕوانین و ئاوڕدانەوەیەکی هەستیارانە وەسەر سیما و ناوەرۆکی ئایەتەکانی ٤٠ و ٤١:**

دەبێ ئەوە باوەڕ کەین کە حەزرەتی زەکەریا دوور لەوەی بووە نیگەران و دە شـکدا بـووبێ لە قودرەت و توانایی خودا بە سەر هەچی بیهەوێ، بەڵام نەیدەزانی خودا چۆنـاوچۆن لە ژن و

پیری لەکارکەوتوو و بێهێز و بێتین و ئەسبابی منداڵبوون، منداڵ دروست دەکا؟ جا لە سەر ئەو بیر و خەیاڵ و بەراوەردەیە زەکەریا ڕوو دە دیوانی خودا دەکا و دەڵێ: ئەی پەروەردگارم، ئەمن چۆنم کوڕ دەبێ دەو حاڵەتەدا کە پیریم لێ میوانێکی وایە تازە ناڕوا و یەخەم بەرنادا! خۆ ئەوەش یەقینمە کە پیری وەرزێکە لە تەمەندا هەموو وەسیلە و ئەسبابی بوون و چاندن و ڕواندن لە کار دەخا و بە تاڵانی دەبا. و لەو لایەشەوە زەکەریا دەیزانی و باوەڕی بە خودا وا بوو چۆنی ئادەم لە نەبوو و بێ باب و دایک لە خاک وەدی هێنا بێ ئەسباب، ئاواش دەتوانێ کوڕ بدا بێ ئەسباب.

جا لەو دەریا خەیاڵاوییە پڕ شەپۆل و گێژاوەدا هەر گێژی دەدا زەکەریا بۆیە ئەو پرسیارە سەرچاوەی دڵی دڕی و قەڵاشتی و سەری کرد لە ڕووی خودادا، خودای خاوەن حیکمەت و حەکیمیش هەر ئاوا حەکیمانە بە نەرم و میهرەبانی پێی فەرموو: بەڵێ، ئەوەی وەک هەست و تەم سەرچاوەی بیر و خەیاڵی داگیر کردووی، وایە وەک هەستی پێ دەکەی و دەیڵێی، بەڵام (اللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ) واتە خوا هەچی وازی لێ بێ و بیهەوێ بیکا، دەیکا و لە دەستی دێ؛ ئەسباب و ئامراز و وەسیلە هەمیشە دە هەموو ئان و کات و زەماندا بۆ خودا دەگەڵ ئەو شتانەن دەیانکا. ئەوجار زەکەریا دڵ و بیری ئۆقرە دەگرێ و ئاوری خەیاڵی دادەمرکێ و تێکەڵی بەزەی خودا دەبێ؛ دەکەوێتە ئەولایە کە بزانێ کەی خێزانی پیری زگی پڕ دەبێ و مزگێنی بداتێ، ڕوو دە خودا دەکا و دەڵێ: ئەی پەروەردگارم نیشانەیەکم بدەیە تاکوو بە هۆی ئەو نیشانەیە ئاگادار بم لە هەوەڵەوە بە سەر زگپڕی ژنەکەمدا؛ خودای خاوەن عیلم و زانست و ئاگادار بە سەر هەستی دڵاندا دەزانێ زەکەریا دڵبزۆزە و ناحەسێتەوە تاکوو بە پلەی علم اليقين وەک عين اليقين نەگا، بە نەرمی و میهرەبانی پێی دەڵێ: ﴿قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّيَ آيَةً قَالَ آيَتُكَ أَلاَّ تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ إِلاَّ رَمْزًا﴾ واتە خودا فەرمووی: زەکەریا نیشانەکەت ئەوەیە کە ناتوانی بدوێی دەگەڵ خەڵک سێ شەو و ڕۆژان، مەگەر بە ئیشارەی دەست یا سەر یا چاو یا بە نووسین؛ کەوایە ئەی زەکەریا زۆر یادی خودات بکە و سەنای بکە لەو سێ شەو و ڕۆژەدا بەتایبەتی ئێواران و بەرەبەیانان.

ئەو بەسەرهاتە چ بە ئینسان دەڵێ و چ فێر دەکا؟ بە ئینسان دەڵێ هەچی دەکرێ و دەبێ، خاوەنی شەرت و شرووتە و نەزم و نیزامە، سەربەخۆ نییە و تەسادوفی و بە هەڵکەوت نییە، خوداش وەک هیچ ناچێ بۆ پێکهێنانی هەچی بیهەوێ، (کن فیکون)ی دەوێ، ئینسان بێ پاڵدانەوەت بە خودا بەرەو پشت هەڵدێراوێ.



لە هەڵسەنگاندن و بەراوەردێکی هەستیارانە لە ناوەرۆکی ئایەتی ٤٠ لە بابەت پێداگرتنی زەکەریا لە سەر ئەولاد هەستێکی دوور و درێژ لە بابەت ئەولادەوە دڵ دادەگرێ و دادەپۆشێ، بۆ نموونە دەبێ پێغەمبەر لە سەر ژن هێنان کە ئەساسی وەلەدە، ئەمر و دەستووری هەبێ وەک ئەوە فەرموویەتی (النكاح من سنّتي) ابن ماحه لە دایکی موسوڵمانان حەزرەتی عایشەی باسی نیکاح ش ١٨٤٦: (مَن أَحَبَّ فِطرَتي فَلَستنَّ بِسُنَّتي، و من سنَّتي النِّكاحُ) واتە کێ ڕەوشتی منی خۆش دەوێ، با سوننەتی من بکاتە سوننەتی خۆی. و بەو جۆرەش هاتووە ئەو حەدیسە: (فَمَن رَغِبَ عَن سُنَّتي فَلَيسَ مِنَّي): واتە هەر کەس بتوانێ ئەو سوننەتەی من بەجێ بێنێ و نەیهێنێ و ڕووی لێ وەرگێڕێ، ئەو لە سەر ڕێبازی من نییە. بوخاری لە ئەنەسەوە باسی تەرغیبی نیکاح، ش ٥٠٦٣. بۆ پشتڕاست کردنەوە و پشتیوانی ئەو بابەتە چاک وایە بچینە خزمەت ئایەتی ٣٨ی سوورەی ڕەعد:

**وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِّن قَبْلِك وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً وَمَا كانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّه لِكلِّ أَجَلٍ كِتَاب**

**بەڕاستی هەر لە پێش تۆدا پێغەمبەرانێکمان هەنارد، ژن و منداڵمان پێ بەخشین، هیچ پێغەمبەرێک بۆی نییە بتوانێ بێ ویستی خودا نیشانە و مۆجزەیەک بێنێ و بنوێنێ، بۆ هەموو کات و ساتێکی دیاری کراویش دەستووراتێک هەیە تێیدا بنووسرێ.**

ئەو ئایەتە ئەوەمان پێ دەڵێ: تەواوی پێغەمبەران خاوەنی ژن و منداڵ بوون، جا مەگەر بە هەڵکەوت وەک حەزرەتی یەحیا و عیسا؛ کەوایە لە سەر ئەو ئەساسە پاکە وا چاکە ئەگەر مانیعی ئایینی ڕێگا نەگرێ ژن دەبێ بهێندرێ بۆ منداڵ و ژیان و حەسانەوە؛ نەک هەر بۆ لەزەت وەک سیغە؛ لە بابەت ژن هێنان ئەو کەلامە ڕێزدارەی پێغەمبەر خێر و بەرەکەتی لێ دەبارێ: (تَزَوَّجوا الود و دالولود فإن مكاثر بكم الأمم يوم القيامة) واتە ژنانی میهرەبان و خاوەن زگ (زگان بکا) بێنن، چونکە بە سەبەب زۆری ئێوە شانازی دەکەم لە قیامەتا.



دە ئایەتی ٣٩دا وشەی (محراب) هات، دڵ دەیهەوێ بزانێ ئایا ئەو میحرابە هەمان ئەو میحرابەیە کە بە دابی ئێستێ لە مزگەوتاندا دیاری دەکرێن و ساز دەکرێن؛ یا مەبەستێکی دیکەیە؟ چونکە بە پێی ڕابردوو گۆیا لە سەرەتای ئیسلامدا تا ئاخری دەورانی خەلافەتی ڕاشدە

مزگەوت میحرابیان نەبووە، چونکە لە سەر بوونی میحراب لە مزگەوتانـدا نەزەری جۆراوجـۆر بووە لە سەرەتای ئیسلامەوە، چونکە بە پێی کوتەی هەندێک لە ئیمامـانی مزگەوتەکـان نـوێژ دە میحرابدا ڕەوا نییە بەڵکە کەراهەتی هەیە؛ ئەو نەزەرە لە حەزرەتی عەلی و ئیبراهیمی نەخەعـیڕا نەقڵ کراوە. (روح المعانی، ج ١/ ١٩٤) گۆیا لە پێغەمبەرەوە نەقڵە کە: (لا يزالُ أُمّتي بِخَيرٍ ما لَـهُ يَتخذوا في مساجدِهِم مذابح كَمَذابِحِ النَّصارىٰ) واتە بەردەوام ئۆمەتم لە سـەر خێـرە ئەوە کە لە مزگەوتیاندا وەک نەساراکان میحراب ساز ناکەن. واتە (اتّقوا هذه المذابح) واتە خۆ بپـارێزن لە میحراب‌سازی.

عەللامە سیوتی نـامیلکەیەکی لەو بـارەوە هەیە بە نـاوی (اعـلام الأديـب بحـدوث بدعـة المحاريب) بە نەقڵ لە ئالۆسی (روح المعانی ج ١٦/ ٥١٦) لە ژێر ئایەتی ١١ی سوورەی مەریەم دەوێدا شیخ سیوتی فەرموویەتی: پەرەسـتاندنی میحـراب و داهـاتنی لە دەورانـی سـولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیکدا سـەری گرتـووە واتە بە دەسـتووری ئەو، تەنـانەت میحرابـی مزگەوتـی پێغەمبەرﷺ ئەو دایناوە. جا لە سەر ئەساسی ئەو ڕیوایەتانە هەندێک لە پیاوماقووڵانی سـەرەتای ئیسلام میحرابیان لە مزگەوتانـدا بە بیـدعەت زانیـوە، تـا دەورانـی تـابعین واتە دواکەوتـووانی ئەسحاب، ئەوان ئەو ئیختیلافەیان ئاوا ڕاسـت کـردۆتەوە بە کـۆی دەنـگ فەرموویـانە دروسـتە میحراب ببـێ لە مزگەوتـدا لە سـەر ئەساسـی بـاوەڕی بەو فەرمـوودەیەی پێغەمـبەر: (مـا رَأَى الْمُسلِمونَ حَسَناً فَهوَ عِندَ اللهِ حَسَنٌ و ما رآهُ سَيِّئاً فَهوَ عِندَ اللهِ سَيِّئٌ) (کتێبی معرفـة الصـحابة، ج ٣/ ٧٨) واتە هەچی موسوڵمانان بە جوانی بزانن لە لای خوداش بە جوان دەردەچێ.

با زۆر دوور نەکەوینەوە لە ئایەتی ١١ی مەریەم تاکوو مەبەست ون نەبێ.

**فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ مِنَ الْمِحْرَابِ فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا بُكْرَةً وَعَشِيًّا**

**ئینجا لە پەرسـتگاکە هـاتە دەرەوە بـۆ لای هـۆزەکەی، بە ئامـاژە تێـی گەیانـدن کە بەیانیـان و ئێواران پەسن و تەسبیحاتی خودا بکەن.**

بە پێی ئیشاراتی ئەو ئـایەتە پیـرۆزە میحـراب واتە شـوێنی خوداپەرەسـتی و نـزا، نەک ئەو میحرابەی لە مزگەوتاندا ئەوڕۆ ساز دەکرێن.



زانای پایەبەرز ئالۆسی ئاوای نەزەر داوە لە بابەت داوا کردنی حەزرەتی زەکەریا ئی کـوڕی لە خودا، چونکە زەکەریا ڕێنوما و شارەزاچی عالەم بوو،هەستی پاکی ئەو خوازیاری ئەوە بـوو

خودا نەسل و خەلافەتی ئەو دانەکوژێنێ، تاکوو گەل بۆ هیدایەت و ڕێنومایی بێ مورشید نەمێننەوە لە لایەن خانەدانی وان، هەر لە سەر ئەو نیەت و ئەساسە بوو ڕووی دە بارەگای خودا کرد و کوتی: ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً﴾ ئەی پەروەردگارم لە لایەن خۆتەوە منداڵێکی خاوێنم پێ ببەخشە. (روح المعانی، ٣/ ٢٠٢)

بەرجەوەند بین تا ئێرە خودای تەعالا بە هۆی ئایەتی ٣٥ بەسەرهاتی خێزانی عیمرانی کرد بە تێر و تەسەلی ئینسانی لەوەی تێگەیاند هەچی حەز بکا دەیکا، وەک ئەو مێردی دایکی مەریەمەی مراند، مەریەمەی دە زگی دایکیدا گووراند و سازی کرد، دڵی دایکیشی وەهەست هێنا و هانی دا تاکوو نەزری خزمەتگوزاری ماڵی خودای بکا، ئەو نەزرە بە کچ دەرچێ و وەک کوڕیش قبووڵی بکا، پاش ئەو بێنە و بەرە، عیسا پێغەمبەری مورسەلی بێ باب لەو مریەمە کچە پاکە بەوەلەد بێنێ، ئەوجار بۆ ڕێنوێنی ئینسانی لە سەر خوداناسی دێ بەسەرهاتی حەزرەتی مەریەمە بە تێر و تەسەلی بەیان دەکا، بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٤٢ی ئالی عیمران:

**وَإِذْ قَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاء الْعَالَمِينَ**

**(یادی ئەو کاتەش وەکە کە) فرشتەکان کوتیان ئەی مەریەم! بێ‌گومان خودا تۆی هەڵبژاردووە و پاک و خاوێنی کردوویەوە و بە سەر ژنانی دنیادا پلەی بەرز کردوویەوە.**

**ئاوڕدانەوە و تێوەڕامانێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٤٢:**

کاتێ کە فرشتە واتە حەزرەتی جبریل کوتی ئەی مەریەمەی کچی عیمران! خودا تۆی هەڵبژارد، بێ‌گومان بۆ خزمەتی بەیتولموقەدەس و پاکیشی کردیەوە لە هەموو خوو و ڕەوشتی ناشیرین و ناپەسەند، و هەروا بە ڕێز و ڕێزداراەوە هەڵیبژاردی بە سەر ژنانی دنیای خۆتدا، و هەروا هەڵیبژاردی بۆ دایکێتی پێغەمبەرێکی بەرز و ناودار وەک حەزرەتی عیسا بێ، بێ باب، واتە بێ ئەوەی پیاوێ بێتە لای حەزرەتی مەریەمە، کەوایە لە سایەی ئەو ئێکرامە بێ‌وێنەیە شایانە بکوترێ بە مەریەمەی خاوەن شکۆ شایانیشیەتی: ئەی مەریەمە ئیتاعەی پەروەردگارت هەر جۆر کە شایانی ئیتاعە بیکە، و هەر وا سژدە و رکووع بەرە بۆ پەروەردگارت، وێڕای ئەوانەی سژدە و ڕکووع دەبەن، واتە نوێژ بکە دەگەڵ نوێژکەران.

بێ‌گومان (ذلک) ئایەتی ٤٤ واتە داستان و بەسەرهاتی زەکەریا و یەحیا و مەریەمە، لەو دەنگ و باسە داپۆشراوانەن، لە تۆ و ئۆمەتت ئەی محەمەدﷺ.

دەکرێ بکوترێ دەو ئایەتەدا بە پوختی و تێر و تەسەلی لە بابەت پلە و پایە وڕێزداری حەزرەتی مەریەمە باس کراوە، ئەو ئایەتە بە ڕوونی قبوولْ بوونی دوعای دایکی مەریەمەی نیشان داوە، بۆ نموونە دایکی مەریەمەی کە کاتێ مەریەمەی بوو دیتی مێیە ڕووی دە خودا کرد و کوتی ﴿وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾ آل عمران﴾ واتە خودایە مەریەمە و نەوەکانی دەخەمە پەنای تۆ لە دەس شەیتانی دەرکراو. و هەروا جوملەی ﴿يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ ﴿٤٢﴾ آل عمران﴾ جبریل کوتی ئەی مەریەمە بێ‌گومان خودا تۆی هەڵبژارد؛ ئەو ئایەتە ئەوەمان پێ دەڵێ کە خودای تەعالا دوعای دایکی مەریەمەی قبوولْ کرد کە مەریەمەی بۆ عیبادەت وەرگرت.

و هەروا جوملەی ﴿وَطَهَّرَكِ﴾ ئیشارەی ڕوون و ڕەوانە وەلای پێ‌بەخشینی مەقامی پاک و خاوێنی بە مەریەمە. و هەروا دووریی مەریەمە لە شەیتان. و هەروا هەڵبژاردنی مەریەمە بە سەر ژنانی دنیا، ئیشارەیە وەلای ڕێزداری شان و شکۆی مەریەمە بە هۆی بوونی حەزرەتی عیسا لەو.

ڕەنگە بکوترێ ئەو سیفەتە بەرزانەی ناویان برا لە بابەت مەریەمەوە، بە غەیرەز بوونی عیسا، لە غەیری مەریەمەشدا بێنە جێ و بەدوور نییە؛ ئەمما بوونی ڕۆڵەیەکی وەک عیسای پێغەمبەری مورسەل بێ باب دە مەریەمەدا نابێ و نابێ و نەبووە، ئەوە نیشانەی بەرز و بەڕێزی مەریەمەیە.

**سووکە ئاوڕدانەوەیەک وەسەر سیمای ﴿وَإِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ﴾**

دیارە مەلائیکە جەمعە، ئەوەی مزگێنیدەر و وەحی‌هێنیشە وا ڕاگەیێندراوە کە حەزرەتی جبریل بێ، کەوایە دەبێ چۆن تەعبیر کرێ جوملەی ﴿وَإِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ﴾ کە تووشی ئیشکال نەبین؟

وڵام: دەبێ بە دوو ڕێگادا بۆ مەتڵەبی واقیعی ئەو ئایەتە بچین کە تووشی گرێ و گۆڵ نەبین. یەکێک لەو دوو ڕێگاکان ئەوەیە: مەبەست لە فرشتە دێرەدا حەزرەتی جبریلە و هاتنیشی بە جەمع بە خاتری ڕێز و ڕێزداری مەقامی جبرەئیلە؛ یا دەڵێین جەمعێم لە فرشتە و جبریل هاتنە لای حەزرەتی مەریەمە بۆ ئیحترام و ئیکرام بەڵام خەبەر پێدەرەکەی تەنیا حەزرەتی جبرەئیل بووە. (تفسیر کبیر، ج ۸/ ۳۷-۳۶؛ روح المعانی، ۲۰۴/۳)

پرسیارێک دێرەدا میوانی دڵ دەبێ، ئەویش ئەوەیە: ئایا مزگێنیە بە مریەمە ڕووەوڕوو و ڕاستەوخۆ بووە یا لە پشتی پەردەوە بووە؟

هەندێک وەک ابن اسحاق ڕایگەیاندووە حەزرەتی مەریەمە لە تەمەنی باڵقبووندا بووە لە حوجرەی بەیتولموقەدەسدا حەزرەتی جبریل ڕاستەوخۆ لە سەر شکڵی ئینسان بە زمانی ئەو مژدەی داوەتێ. (خاوەنی ڕوح المعانی بە نەقڵ لە ابن جریرەوە، قصص القرآن، ج ۴/ ۱۹)

گۆیا کەسێکی دی لە بەنی ئیسرائیل کوڕێکی خۆی بە ناوی یۆسف نەزری خزمەتگوزاری بەیتولموقەدەس دەکا. ئەو کوڕە تەمەنی لە حەزرەتی مەریەمە کەمتر دەبێ. بەشێک لە بەیتولموقەدەس بۆ پاک و خاوێنی وەبەر ئەو کەوتبوو و بەشەکەی دیکەش وەبەر حەزرەتی مەریەمە کەوبوو. وا هەڵدەکەوێ ڕۆژێکی حەزرەتی مەریەمە و ئەو کوڕە (یۆسف) بۆ ئاوهێنانێ لەمەڕ نەزافەتی بەیتولموقەدەس دەچنە دەرەوەی بەیتولموقەدەس. دەو کات و ساتەدا حەزرەتی جبرەئیل خۆی نیشانەی حەزرەتی مەریەمە دەدا و مزگێنی دەداتێ کە خودا ئەتۆی پاک خوڵقاندووە و بە سەر ژنانی دنیشادا هەڵیبژاردووی بۆ ڕێزداری کردووی. دەو کاتەدا حەزرەتی زەکەریا بە پێی عادەتی ئاگاداری لە حەزرەتی مەریەمە، لە دوور و نزیکی مەریەمە بە سەر ئەو جەریاناتە ئاگادار دەبێ. دەفەرموێ: ها بۆ مەریەمەی کچی عیمران پلە و پایە دابەزی. لە سەر ئەو ئەساسە وا دەردەکەوێ جبریل ڕاستەوخۆ ڕووەوڕوو دەگەڵ مەریەمە دوابێ و مزگێنی دابێتێ.

هەندێکیش نەزەر و بۆچوونیان وایە: ئەو مزگێنییە بە شێوەی ئیلهام لە پشت پەردەوە دراوە بە حەزرەتی مەریەمە. نەزەری هەوەڵیش پەسەندە چونکە کوتراوە و بیندراوە کە فرشتە بۆ لای غەیرە پێغەمبەرانیش چوون و خۆیان لێ ئاشکرا کردوون. (روح المعانی، ۳/ ۲۰۵-۲۰۴؛ تفسیر کبیر، ج ۸/ ۴۵) هەروەک گۆیا لە خەزای بەدر زۆر لە یارانی پێغەمبەر حەزرەتی جبریل و میکائیل و فرشتەی دیکەشیان چاو کردوون و دیویانن.

دووبارە دڵی بزۆز و بەپرسیار لە سەر واژەی ﴿وَطَهَّرَكِ﴾ دەکەوێتە ئەو خەیاڵ و بیرە کە ئەو پاکییە لە کام بارەوە بووە؟ ئەخلاقییە؟ ئەندامییە؟ ڕوحییە؟ بۆ وڵامەکەی دەکرێ بە پێی بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی ئایاتی مەربووت بە حەزرەتی مەریەمە بڵێین: پاکی مەریەمە لە هەموو لایەکەوەیە: وەک پاکی لە بابەت گوناه و تاوان، پاکی لە بابەت تووشبوونی مرۆ و پەری وەک حۆریانی بەهەشتی؛ ﴿لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَانٌّ ﴿٥٦﴾ رحمن﴾ وەک پاکی لە بابەت خوێنی حەیز و نیفاس؛ وەک پاکی لەبابەت ئەخلاقەوە، وەک پاکی لەبابەت درۆیانەوە، وەک پاکی لە پێوەنووسانی بوختان و تۆمەت لە سەر بەوەلەد بوونی حەزرەتی عیسا؛ ئەوانە هەمووی

نموونەی پاکی مەریەمەن؛ وەک خودای تەعالا پاراستی لە تۆمەت و ئیفتیرا. (تفسیر کبیر، ج ٨ هەمان ئایەت)

هەڵبژاردنی مەریەمە بە سەر ژنانی دنیادا دوو نەزەری لە سەرە:

١. هەندێک کوتوویانە کە مەریەمە لە هەچی ژنی دنیایە بگرە لە ئادەمڕا تا تەواوبوونی دنیـا هیچ ژنێک مەقام و پایەی لە ڕێزداریدا ناگاتە مەریەمە، چونکە خودا پێی فەرمووە (اصْطَفَاكِ) و عیساشی لێ بەوەلەد بووە، بێ باب.

٢. هەندێکیش کوتوویانە هەر لە ژنانی دەوری خۆی ڕێزدارتر بووە؛ بە نەقڵ لە ابن‌عباسەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە. گۆیا پێغەمبەر فەرموویەتی: (أَربَعُ نِسوَةٍ ساداتُ عالَمِهِنَّ) واتە چوار ژن پلەی شەئنیان لە سەرەوەی عـالەمی خۆیـانن. ئەو چـوار ژنەش: مەریەمەی دایکـی حەزرەتـی عیسا؛ ئاسیەی کچی مزاحم؛ خەدیجەی کچـی خـوەیلەد حەرەمـی پێغەمـبەر، فـاتمەی کچـی پێغەمبەر. لە هەمانیش زاناتر لە دەستووراتی ئاییندا حەزرەتی فـاتمە بـووە. (تفسـیر طـبری، ٣/ ٢٦٢) حارث ابن اسامە لە مەسنەدی خۆیدا بە سەنەدی سەحیح فەرموویەتی: (مَریمُ خَیرُ نِسـاءِ عالَمِها) واتە مەریەمە چاترین ژنی عالەمی ژنانە.

**تیوتیوە:**

فرشتە مزگێنییـان دا بە مەریەمە بەو شـێوەیە: خـودا ئەتـۆی وەک نێرێـک قبـووڵ کـرد بـۆ خزمەتی بەیتولموقەدەس. و هەروا خودا ئەتۆی گێـڕا بە خوداپەرسـت، بەشـەرەف، بە خـاوەن کەرامەت، بە پاک، بەدوور لە وەسوەسەی شەیتانی، بەدوور لە ئەخلاقی پیس و ڕەزیل و قەبیح، ئەوانە سیفاتی مەعنەوین واتە نهێنی. و هەروا خـودا ڕێـزداری کـردی و هەڵبـژاردی بە پـاک و خاوێن و دوور لە حەیز و نیفاس، و بە منداڵ بوونی بێ مێـرد و نزیکـی، و ڕێـزداری کـردی بە سەر ژنانی دەورانی خۆتدا. بە کورتی، دوور لە عەیب و ناتەواوی زاهیـری و نهێنـی؛ خـودا دە قورئاندا ناوی دەبا «صدیقة». ﴿وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ ﴿٧٥﴾ مائده﴾ دایکی عیسا ڕاسـت بـوو. ﴿وَمَـرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَاتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِ وَكَانَتْ مِنَ الْقَانِتِينَ ﴿١٢﴾ تحريم﴾ مەریەمی کچی عیمرانیش، ئەو مەریەمەش کەوا داوێنـی خـۆی پاراسـت لەو ڕوح و گیانەی کە وا لە لای خۆماندا بوو فوومان پێدا کرد، وتە و کتێبەکـانی پەروەردگـاری خۆی بە ڕاست زانی، لە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرەکانیش بوو.

ئەو ئایەتە شاهیدە لە سەر بەرز و ڕێزداری و پاکی حەزرەتی مەریەمە.



ئەو بەسەرهاتەی باس کرا لە بابەت زەکەریا و یەحیا و مەریەمە بۆ حەزرەتی محمد المصطفی پێغەمبەری ئاخر زەمان، هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی: محەمەد کە پێغەمبەری ئاخرە و پاش ئەو پێغەمبەر نایەن، دەبێ ئەو خەبەرداری ئەوزاعی بەسەرهاتەکانی ڕابردووی پێش خۆی ببێ، دیارە ئەو بەسەرهاتانە ون و نادیارن لە پێغەمبەر و ئۆمەتەکەی چونکە ئەوان نەبوون تاکوو دیبایان؛ دیارە خودای تەعالا بە سروش بۆی دەنێرێ. بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتەکانی ۴۳ و ۴۴ تاکوو باشتر تێبگەین لە سەر ئەو ڕووداوانە:

**يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ذَلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٤﴾**

**دادەی مەریەمە! تۆش بەردەوام و بێ پسانەوە بەندایەتی پەروەردگارت ئەنجام بدە، سژدە و کڕنۆش دەگەڵ کڕنۆشبەران ببە. (٤٣) ئا ئەوە لە هەواڵە نادیارەکانە، کە سرووشی دەکەین بۆ تۆ، ئەو کاتە تۆ لایان نەبووی کە قەڵەمەکانیان فڕێ دەدا، تاکوو دەرکەوێ و بزانن کامیان داشداری مریەم بن! لەو کاتەشدا کە کێشەیان هەبوو تۆ لە لایان نەبووی.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە سیما و دەروونی ئایەتەکانی ۴۳ و ۴۴:**

مزگێنیدەر بە حەزرەتی مەریەمە دەڵێ: ئەی مەریەمەی کچی عیمران، فەرمانبەری پەروەردگارت بە، و هەروا سوژدە و ڕکووعیش بەرە دەگەڵ ئەوانەی سەژدە و ڕکووع دەبەن بۆ خودا، واتە دەگەڵ نوێژکەران نوێژان بکە.

وشەی (ذلک) واتە ئەو بەسەرهاتەی زەکەریا و یەحیا و مەریەمەی کچی عیمران کە باسی لێوەکرا شتێکی سەرداپۆشراو و نادیار بوو لە پێغەمبەر و ئۆمەتی پێغەمبەر؛ یانی کاتی ڕووداوی ئەو بە سەرهاتانە نە ئەتۆ هەبووی نە ئۆمەتی تۆ تاکوو بیانبینن؛ جا بۆوەی بیزانن و بشبێتە بەڵگە لە سەر پێغەمبەرایەتیت، بە سرووش بۆت دەنێرین و هەروا ئەتۆ لە کن وان خۆ نەبووی ئەو کاتەی کە قەڵەمی پێ نووسینی خۆیان دەهاویشتە ناو دەریاوە تا دەرکەوێ ئاخۆ کامیان بۆ چاوەدێری و بەخێوکردنی مەریەمە ناوی دەردەکەوێ و سەر دەکەوێ، دەگەڵئەوەی دەمەقاڵێیان دەکرد گشتیان لە خوێندەوار و نەخوێندەوار، بۆوەی ببنە سەرپەرشتی مەریەمە، سەرەنجام پێکنەهاتن تاکوو کار کەوتە قورعەکەشی، وا دەردەکەوێ کێشەکەیان لە بەر ئەوەی بووبێ بابی

مەریەمە (عمران) هەم سەرۆکی خوێندەوارەکان بوو و هەم پیاوی چاک، دەیانویست خزمەتی کچەکەی بکەن و پاداشی بابی بدەنەوە.

**بۆ ئاگاداری:**

بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی سیمای ئایەتەکە ئەوەی لێ هەست دەکرێ: ئەو کێشە و مل‌بەملەی سەرپەرستیی حەزرەتی مەریەمەی ئەهلی کتێب هێنایانە گۆڕێ، واتە حەزرەتی مریەم کاتێ دەبێ دایکی دەیهێنێتە عیبادەتگا (بەیتولموقەدەس) ڕوو دەکاتە گەورە گەورەکانی بەنی ئیسرائیل و دەڵێ: ئەمن ئەو منداڵەم نەزری خانەی خودا (بەیتولموقەدەس) کردووە، سەرپەرستی ئەو وەئەستۆ بگرن. دیارە بەو هۆیەی کە مەریەمە لە بنەماڵەیەکی ناودارو گەورە هاتبووە دنیاوە، هەموو ئەوانەی لەوێ بوون دەیانەویست سەرپەرستییەکەی بۆ خۆی بێ، جا بۆیە ئەو کێشەیان دامەزراند و کار کەوتە قورعەکەشی بۆ بەرگری لە کێشە و هەرا. هەر کەسەی ناوی خۆی لە دارێکی نووسی و دە ئاوێیان هاویشت، هەچی ڕەسەر ئاو کەوت و قوم نەبوو ئەوە دەبێتە بەرەندە و مەریەمە بۆ وی دەبێ.

حەزرەتی زەکەریا بە دوو هۆ شایانتر بوو، بۆ سەرپەرستی مەریەمە؛ یەک پێغەمبەر بوو، دوو مێردی پووریشی بوو. بەو پێیە و ئەساسە دەبێ کاتێ ئینسان گرێیەکی هاتە پێش دەگەڵ کۆمەڵە کەسانێک لەو بابەتەوە بۆ بەرگری لە ناکۆکی، دەتوانێ پەنا بەرێتە بەر دابی قورعەکەشی و کەڵکی لێ وەرگرێ. لە یاسای شەرعی ئایینیشدا یاسای قورعەکەشی هەیە، بەڵام ناکرێ بۆ هەموو سەرکەوتنێک کەڵکی لێ وەرگرن. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ لای دەستەڵات ئەگەر هات و لایدا لە حەق، یاسا نابینێ و مل پێ نادا.

**ئاوڕێک وەسەر اقلام.**

چەند بەرداشتێک هەڵدەگرێ: بۆ نموونە، هەندێک لە زانایان ئاوای بۆ چوون کە اقلام ئەو قەڵەمانەیان بوون کە تەوراتیان دەگەڵ کتێبی دی پێ نووسیوەتەوە. هەندێکیش لە زانایان کوتوویانە وەکازی دەستیان بووە.

ابومسلم نەزەری ئاوایە: هۆز و گەلی دەوران هەر کەس بۆ بەشی خۆی ناوی خۆی لە شتێک نووسیوە و حەوای داوە، بە هیوای قبووڵ بوون، بەو شتەی کە حەوایان داوەتە نێو ئاو کوتوویانە: بەشی. زەین کە ئایەتی ۱۴۱ی صافات:

**فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنْ الْمُدْحَضِينَ**

**ئەوجار بەشداری کرد لە پشک خستندا، لە ڕیزی ئەوانە بوو کە بەر پشک کەوتن.**

بە پێی ئیشاراتی ئەو ئایەتە پیرۆزە وا دەردەکەوێ کە هەر لە کۆنەوە پشک و بەش بووە بۆ بەرگری و دامرکاندنی ئاوری کێشە. بەو بەشە دەکوترێ اقلام.

پرسیارێک: لە ئایەتی ٤٣دا بە بەڕێوە بردنی سێ شت بە حەزرەتی مەریەمە لە لایەن خوداوە دەستوور دراوە، ئەو سێ شتەش ئەوانەن: ﴿يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي...وَاسْجُدِي وَارْكَعِي...﴾؛ ڕاز و هۆی تایبەتمەندی ئەو سێ شتە چییە؟

بە پێی بەراورد و هەڵسەنگاندنی ئایەتەکە دەبێ بکوترێ ئەوەی پەروەردگار بە هۆی ئەو سێ شتانە ئەمری پێ دەکا و دەستووری پێ دەدا شتێکە کە مانای هەر سێ شتەکان لە خۆ دەگرێ؛ ئەویش کە عیبارەتە لە: قنوت: خوداپەرەستی و خۆ پاراستن لە بێ ئەمری باری تەعالا. ئەوەش دەکوترێ کاتێ (اقنتي) بریتی بێ لە گشت عیبادەت و بەندەگی پەروەردگار، ئەمر بە سەژدە و ڕکووعی پێویست ناکا، بۆچی هاتوون؟ دەبێ بۆ وڵامی ئەو گرێیەش بکوترێ (خاص بعد العام)ە، واتە بە عموومی کوترا دەستوورەکە پاشان ئەو دوو سیفەتە ڕێزدارترن و ڕێزیان بۆ داندرا.

هەر وا دووبارە ئەو گرێیەش دێتە ڕوو: ڕکووع دەبێ پێش سەژدە بێ دە عیبادەتدا؛ کەچی دەو ئایەتەدا سەژدە لە پێش ڕکووعەوە هاتووە، دەبێ هۆیەکەی چ بێ؟ دەبێ بکوترێ دێرەدا: پیتی «و» بۆ تەرتیب نەهاتووە بەڵکە بۆ پێکەوەبوونەوە، واتە (اشتراک)، یانی مەبەست دێرەدا نوێژە، نە بەیانی نەزمی سەژدە و ڕکووع جگە لەوانەش سەژدە حەیاتی نوێژە، مەغزی نوێژە، ڕاوەستان و قیام و خوێندنەوە (قرأت) رکوع ئەندامی لەشی ئەو حەیاتەن. مەبەست دە سەژدەشدا نوێژە.

هەندێک لە زانایان کوتوویانە: نوێژی هەندێ لە پێغەمبەران بێ ڕکووع بووە، هەر بە حەزرەتی مەریەمە دەستووری ڕکووع دراوە بە وەسیلەی ئەو ئایەتە.

هەندێ لە زانایان دەڵێن جاخۆ لە ئایینی بەنی ئیسرائیلدا ڕکووع نەبووە؛ ئایا دەبێ ڕازی ئەوە چ بێ دێرەدا واتە لە باسی مەریەمەدا هاتووە؟ دەبێ لە وڵامدا بکوترێ مەبەست لە سەژدەدا نوێژە و مەبەست لە (وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ)شدا واتە نوێژ دەگەڵ جەماعەت، یانی دەستوور بە حەزرەتی مەریەمە دراوە دە بەیتولموقەدەسدا پێکەوە دەگەڵ خەڵکەکە نوێژ بخوێنە، با لەوانیش

دوور بی، واتە یەک جێ نەبی. (تەفسیر کبیر، ج ٨/ ٤٧-٤٦؛ روح المعانی، ٢٠٨/٣)

دڵ دەڵێ لەوانەیە حەزرەتی مەریەمە نەبی بـووبێ بەو دەلـیلەش وا دەڵـێ: چـونکە فرشـتە بەتایبەت حەزرەتی جبرئیل دەگەڵی دواوە؛ ئەوە نیشانەی پێغەمبەرایەتی نییە؟

زانای پایەبەرز (علامە تقی الدین سبکی) قبووڵی کردووە کەوایە؛ ئەمما هەندێ لە زانایـان کوتوویانە: ژنانی وەک حەوا و ئاسیە و سارا و مەریەمە نەبی بـوون چـونکە جبرەئیـل فرشـتەی پـایەبەرز هـاتۆتە کنیـان. بەڵام جمهـوور واتە بە کـۆدەنگی زانایـانی لێکـۆڵەرەوە کوتوویـانە و باوەڕیشیان وایە نەبی لە ژناندا نییە و هەڵناکەوێ، بە دەلیلی ئایەتی ١٠٩ی سوورەی یۆسف:

> **وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلاَّ رِجَالاً نُّوحِي إِلَيْهِم**
> **لە پێش تۆدا (ئەی محەمەد) هیچ کەسێکمان نەنـاردووە بـێجگە لە پیـاوانێ کە سرووشـمان بـۆ کردوون.**

کەوایە دەبێ نەزەری جمهوور قبووڵ کەین و بشڵێین کە هاتنی فرشتە بـۆ لای ئەو ژنـانە بە شێوەی کەرامەت بووە. (تبیین الفرقان، ج ٥/ ٥٠٤)

کاتێ خودای خاوەن حـیکمەت و حەکـیم ئەحـواڵ و چـۆنیەتی حەزرەتـی مەریەمەی لە هەوەڵ تا ئاخر بۆ ئینسان بەیان کرد و تێی گەیانـد بە وەسـیلەی سرووش، ئەوجـار دڵـی پـڕ لە هەست و بزۆز دەیهەوێ بزانێ هۆی ڕێز و بەرز و مەزنایەتی ئەو مەریەمەی ناودارە کە عیسـایە، ئەو عیسایە کێیە و چییە؟ جا لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٤٥ی ئالی عیمران کە باس لە عیسای پێغەمبەر دەکا:

> **إِذْ قَالَتِ الْمَلآئِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾** ئالی عیمران
> **(یادێ لەو کاتەش وەکە) کە فرشتەکان کوتیان ئەی مەریەم: بێگومان خودا مزگێنیت دەداتـێ بە وشـەیەک لای خـۆیەوە کە ناویشـی مەسـیح عیسـای کـوڕی مەریەمە، بەڕێـز و بەشـان و شکۆیە، چ لەم دنیا و چ لەو دنیا، لە نێزیکانی خوداشە.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ناوەرۆکی ئایەتی ٤٥:**

کاتێ فرشتە کوتی ئەی مەریەمە خودا مژدەت دەداتێ، بێگومان بە عیسـایەک کە دەبـێ لە دایک، بە وشەی (کـن) وەک دە ئـایەتی ٥٩دا ئامـاژە وەلای چـۆنیەتی لەدایـکبوونی عیسـا و

چۆنیەتی خودی خۆشی دەکا، خـودای دانەر و ڕانەر: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثِمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ بێ‌گومان نموونەی عیسا لای خودا وەکوو نموونەی ئـادەمە، خودا گەڵاڵەی ئادەمی لە گڵ داڕشت پاشان پێی کوت: ئادەی ببە، دەسبەجێ بوو.

دەبێ بکوترێ دابڕینی وشـەی (کـن) بە سـەر عیسـادا هـۆیەکەی دەگەڕێـتەوە بـۆ ئەوە کە حەزرەتی عیسا وەک بەنیئادەمی لە دایک نەبووە، بەو شێوەیە کە لە باب و دایکێک ببێ، بەڵکە حەزرەتی عیسا لە دایکی بەبێ باب بـووە بە هـۆی وشـەی (کـن)، دیـارە بێ‌گومـانە کە (کـن) کەلیمەیە، هەر ئەوەشە کە عیسا ناو براوە بە (كلمة).

با بڕواندرێ لەوەی کە بەرە و هیدایەت مل نـادا، خـوداش ڕێـی ئەو مـل پـێ‌نەدانەی لـێ ناگرێ وەک کافر، مەسەلەن ئادەم کە بەبێ دایـک و بـاب هـاتۆتە سـەر دنیـا، پێشـی نـاکوترێ (کوڕی خودا) کەچی عیسا لە دایک بووە و هەشیەتی، لەبەر ئەوەی کە بێ باب بووە پێی دەڵێن کوڕی خودا؛ ئەوە نیشانەی تێ‌نەگەیشتنە.

ئینجا بۆ پووچەڵکردنەوەی فکر و بۆچوونی ئەو کافارنەی کە دەڵێن عیسا کوڕی خـودایە، خودا دەفەرموێ: ناوی عیسای کوڕی مەریەمە و نازنـاوی ئەو مەسـیحە، ئەو نازنـاوە مەسـیحە زاراوەیەک و وشەیەکی عیبرییە، واتە بەردەوام لە سەر خوداپەرەستی.

حەزرەتی عیسـا بەرز و بەڕێـزە لە هەر دوو دنیـادا و خـاوەنی پـلەی بەرزە و لە نیزیکـانی بارەگای خودایە و هەر وا بە ساوایی دە ناو بێشکەدا بۆ ڕامـاڵدانی تـۆمەت لە دایکـی ئـازیزی وەقسە دێ و قسە دەکا، وەک بە گەورەیی لە تەمەنی تەکلیفدا قسە دەکا و هەروا بە پێی مزگێنی بن‌پەردە لە پیاوچاکانی دنیایە.

دەو ئایەتە پیرۆزەی ٤٥ی ئالی عیمراندا هەست بە چەند شت دەکـرێ، زانینیـان پێویسـتە، دەبێ خۆی لێ نەبوێردرێ.

١. حەزرەتی مەریەمە دەنگی ئەو فرشتانەی مژدە پێدەری دەبیستن، ئەگەرچی بە پێی ئایەتی ١٧ی سووڕەی مەریەم وا هەست پێ دەکرێ کە دەیدیتن، تەماشا کە:

> **فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا**
> **ئینجا پەردەیەکی کێشا لە نێوان خۆی و ئەواندا، ئینجا ئێمەش ڕوحی خۆمان (جبرەئیل) نارد بـۆ لای، لە شکڵ و شێوەی ئینسانێکی ڕێک‌وپێکدا خۆی نیشانی دا.**

دیارە دەبێ بکوترێ مەریەمە دیونی جا پەردەی کێشاوە لە مابەینی خـۆی و ئەوانـدا، جـگە

لەوەش کە لە سەر دیمەنی مرۆڤێکی ڕێک‌وپێک خۆی داوە نیشانی. ئەو هەموو بەڵگەی دیتنن.

٢. دە ئایەتی ١٩ی مەریەمەدا حەزرەتی جبرەئیل مژدەی دەداتە مریەمە کەچی دێرەدا بە پێی «ملائکە» دەبێ پۆلێک لە فرشتە بن ئەو مزگێنییە بدەن، ئەمما بۆ بەرگری لە ڕەخنە دەبێ بکوترێ ئەو پۆلە فرشتە لە ژێر ئەمر و فەرمانی جبرەئیلدا بوون:

> **قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَامًا زَكِيًّا ﴿١٩﴾** مریم
> **جبریل کوتی بێ‌گومان ئەمن ناردراوی پەروەردگارتم، تا منداڵێکی پاکت پێ ببەخشم.**

٣. عیسا بە ئەمری خودا دەستی بە سەر نەخۆشی سەخت و بێ‌چارەدا دەکێشا لە سەر ئیزنی خودا شیفای دەهات، بۆیە ناوی بە مەسیح براوە، لە ڕابردووشدا ئەو بابەتە باس کراوە.

لەو بارەوە کە بە حەزرەتی عیسا (کلمة) کوتراوە دەکرێ بڵێین کەلیمە هەرچەند دە لۆغەتدا واتە لەفز، کە لە سەر مانا شارەزایی دەدا، بەڵام دە ئادابی قورئاندا بریتییە لە بری شتێک کە بە هۆی ئەو شتە ویست و ئیرادەی خودا نیشان دەدرێ؛ بۆ نموونە کەلیماتی سرووش، مەبەستی خودا نیشان دەدا و دەنوێنێ، جا لە سەر ئەو بەراوەرد و بۆچوونە دەکرێ بکوترێ عیسا بە هەمان شێوە نیشانەیە لە سەر ئیرادە و حیکمەتی خودا، و هەروا نیشانیشان دەدا، و یا وەک لە پێشدا کوتمان لێرەشدا دووبارە بڵێین چونکە خودای تەعالا لە مزگێنی‌دانی بەدی‌هاتنی عیسا بە دایکی بە «کلمة» ناوی هێنا بە وەسیلەی ئایەتی ٤٥، بۆیە ناوی کەلیمەیە. یا ئەوەتا هەر لە بابەت ناوبردنی بە کەلیمە دەڵێن: کەلیمە واتە مەخلووق، بوونەوەر؛ دە دیارە عیساش بوونەوەرێکە؛ بۆ ئەو ڕاستییە کە «کلمة» واتە مەخلووق، دەچینە خزمەت ئایەتی ١٠٩ی کەهف:

> **قُل لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا**
> **بڵێ ئەگەر هەموو دەریاکان مەرەکەف بوایەن بۆ وتە و فەرموودەکانی پەروەردگارم، دەریا دەبڕێتەوە پێش ئەوەی فەرموودەکانی پەروەردگارم کۆتایی بێت، هەرچەندە ئەوەندەی دیش بۆ یارمەتی‌دانیان بهێنن.**

دیارە وشەی «کلمات» ئەدێرەدا بە مانای «مخلوقات»ە، واتە بوونەوەر.

**نەختە ئاوڕدانەوەیەک وەلای ئەوەی بە جرجال (واتە دەججال)یش هەر دەکوترێ مەسیح**

مەسیح بە حەزرەتی عیساش دراوە بە عینوانی لەقەب یانی عیسای مەسیح و دەججالی مەسیح، هەر دوو لا هاتوون؛ دەبێ چۆن خۆ دەرباز کەین لەو خلیسکە، چونکە ناکرێ لەقەبی پێغەمبەری وا بەرز بدرێ بە دەججالی فیتنە و ئاژاوەگێڕ.

پێشەکی دەبێ ئەوە بزاندرێ کە مەسیح ئیسمی موشتەققە یا جامیدە؛ واتە لە هیچ کوێوە دەرنەهێندراوە!؟ کاتێ ئەوە زاندرا دەتوانین بە پێی مانا و ڕەگەزی چۆناوچۆن دراوە بە دەججال و بە عیسا.

۱. لە لایەن ابوعبید و لیثەوە ئەو نەزەرە لە مەسیح دراوە، واتە دە ئەسڵدا بە عیبری «مشیحا» بووە و عەرەبان هاتوون کردوویانەتە لەفزی «مسیح»، ئەویان کردۆتە «عیسی»، ئەسڵی عیساش «یشوع» بووە، هەر وەک «موسی» ئەسڵەکەی «موشا» بووە بە عیبری. لە سەر ئەو ئەساسە «مسیح» موشتەق نەبووە.

۲. هەندێکیش لە زانایان کوتوویانە موشتەققە، ئەوکات دەبێ بەڵگە نیشان بدرێ لە سەر ئیشتیقاقەکەی. ابن عباس کوتوویەتی عیسا بە مەسیح ناو براوە چونکە دەستی بە هەر نەخۆشێکی گران و سەختداماڵیبا نەخۆشیەکەی لادەچوو، و هەروا ئەحمەد کوڕی یەحیای شیبانی کوتوویەتی بە عیسایان مەسیحیش کوتووە چونکە زەوی زۆر بە توندی دەبڕی و دەپێوا، حەتا دەکرێ بکوترێ لە جیاتی مەسیح بێ توند مسّیح بە توندی.

وەیا دەکوترێ مەسیح چونکە دەستی بە سەر منداڵانی هەتیودا دەماڵی، مەسیح بە مانای «ماسح» وەک «فیصل» بە مانای «فاصل»، «رحیم» بە مانای «راحم» یا «علیم» بە مانای «عالم».

چەند شتێ لەو بارەوە، وەک ئەوە کە لە دایک بوو و هەڵسووڕا بە ڕۆنی پاک و مبارەک هێنرایە دی لە لایەن فرشتانەوە، یا جبریل دە کاتی لەدایکبوونی شاباڵی مبارەکی پێدا ماڵی تاکوو لە گەزەندی شەیتان بەدوور بێ.

ئەوانەی باسمان لێوە کردن لەمەڕ وشەی «مەسیح» هۆ بوون کە کراوەتە لەقەبی حەزرەتی عیسا، ئەوجار دەگەڕێین بە دوای عیللەتی ئەوەی بۆچی دراوە بە «دەججال»، ئەو وشە مبارەکە؟ لە وڵامدا دەکوترێ مانای مەسیح ئەودەم بۆ دەججال ئاوای هەڵناسەنگێنین بەڵکە ئەوکات دەڵێین بۆیە بە دەججال دەکوترێ مەسیح چونکە چاوێکی کوێرە و وێک کەوتۆتەوە (= ممسوح) و هەروا فیتنەی دەجاڵیش وڵات زوو دادەتەقێنێ و دەپێوێ، جا بۆیە بە دەجاڵ

دەکوترێ (قد دَجَلَ الدَّجّالُ إذا فَعَلَ ذلک)واتە زەوی پیاو بڕی بەشی زۆری وڵات داگرت. واتە حەقی بە ناحەق داپۆشی.

بە کورتی کاتێ مەسیح درا بە عیسا بە واتای مبارەک و پاک ناو دەبرێ، کاتێ درا بە دەجاڵ بە واتای کوێر و حەق داپۆشەر ناو دەبرێ.

ئەوە دەبێ بکوترێ ئەو دەکارکردنی لەفزی مەسیح جارێک بۆ حەزرەتی عیسای مبارەک و جارێک بۆ دەجاڵی نامبارەک ئاوایە هەر جارەی بە پێی ناونراوەکە مانای لێ دەگری.

مەنسووری حەللاج فەرمووی (انا الحق)، نەجاتی بوو
فیرعەونیش کوتی (انا الحق)، تێکەوت و ڕۆچوو
شێر و شیر وەک یەک دەنووسرێن، لێک هەڵواردنیان بە پێی بەڵگە و حاڵ و مەقامە.



بۆ ئاگاداری بە سەر چۆنیەتی حەزرەتی عیسا پێویستە بچینە خزمەت ئایەتەکانی ۴۶ تا ۵۰، سەیر کە بە نەزمەوە:

**وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً وَمِنَ الصَّالِحِينَ ﴿۴۶﴾**

**بە منداڵی لە ناو لانکەدا بە گەورەییش دەگەڵ خەڵکدا قسە دەکا و لە چاکەکارانیشە.**

**قَالَتْ رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ قَالَ كَذَلِكِ اللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ إِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿۴۷﴾**

**مەریەمە کوتی: ئەی پەروەردگارم، ئەمن چۆن منداڵم دەبێ!؟ تاکوو ئێستێ هیچ کەسێک توخنم نەکەوتووە؟ کوتی: کاری خودا وایە، هەچی بیهەوێ بەدی دێنێ، کە بڕیاری هەر شتێکی دا هەر ئەوەندە کوتی ببە، خێرا دەبێ.**

**وَيُعَلِّمُهُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ ﴿۴۸﴾**

**فێری کتێب و کاربەجێیی و تەورات و ئینجیلی دەکات.**

**وَرَسُولاً إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ أَنِّي أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِ اللّهِ وَأُبْرِئُ الأكْمَهَ والأَبْرَصَ وَأُحْيِـي الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللّهِ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿۴۹﴾**

**بە پێغەمبەریش دەینێرین بۆ لای نەوەکانی یەعقووب، بێگومان ئەمن بەڵگەیەکم بۆ هێناون لە لای پەروەردگارتانەوە، ئەمن لە قوڕ شتێکتان بۆ دروست دەکەم لە سەر شێوەی پەلەوەر، جا**

**لە پاشان فووی پێدا دەکەم لە سەر ویستی خودا دەبێتە باڵندە، کوێری زگماک و بەڵەک چاک دەکەمەوە، مردووش زیندوو دەکەمەوە بە ویستی خودا، ئاگادارتان دەکەمەوە لەوەی دەیخۆن، لەوەش لە خانووەکانتاندا هەڵیدەگرن، بێ گومان ئا لەمەدا بۆ ئێوە بەڵگە و نیشانەی تێدایە ئەگەر ئێوە بڕوادارن.**

**وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ وَجِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾**

**عیسا دەڵێ بڕواهێنەریشم بەو تەوڕاتەی کە لە بەر دەسمایە، هەتاکوو هەندێ لەو شتانەش کە لە سەرتان حەرام کرابوو حەڵاڵی کەم، ئەمن لای پەروەردگارتانەوە نیشانەیەکیشم بۆ هێناون، کە واتە لە خودا بترسن و گوێدێری فەرمانم بن.**

## سەیری مانای ڕیزە ئایەتەکانی ٤٦ تا ٥٠ بە بەربڵاوی تاکوو بە بەرفرەوانی تێبگەی و حاڵی بی:

دیارە بە فەرمـوودەی ئـایەتی ٤٦ حەزرەتـی عیسـا هەر بە منـداڵی دە نـاو بێشـکەدا بـۆ شاهیدیدانی پاکیی دایکی نازەنینی خـۆی حەزرەتـی مەریەمە وەقسـە دێ دەگەڵ عـالەم، هەر وەک چۆن بە گەورەیی دە تەمەنی تەواو سی ساڵەییدا یا ژووراتر دەتوانێ بدوێ دەگەڵ خەڵک، ئاواش بە منداڵی دێتە قسە و دوان. ئەو شێوە دوانە دەو حاڵەتە ساوایییەدا هـاوارە وەلای ئەوە کە حەزرەتی عیسا لە پیاوچاک و پاک و خاسانی خودایە دە دنیای خۆیدا. کاتێ حەزرەتی مەریەمە ئەو مزگێنییە خۆشە دەبیێت لەو فرشتە باوەڕپێکراوانە لە خۆشـی و شـادیدا ڕۆدەچـێ و دەڵـێ: ئەی پەروەردگارم، ئەمن چۆناوچۆنم کوڕ دەبێ دە کات و سات و حاڵێکدا کە هیچ ئینسـانێکی نێرینە وێم نەکەوتووە دەگەڵ ئەوەی بە پێی باو و عادەت ژن بە بێ مێرد منـداڵی نـابێ و تـۆلپڕ نابێ جا مەگەر بە موعجیزە. جا ئە دێرەدایە حەزرەتی جبرەئیل بە ئەمر و ئیزنی باریتەعالا دێـتە جواب و دەڵێ: وەک دەڵێی یا مەریەمە وایە و ڕاست ئەوە نیزامی نێر و مێـی دنیـایە، بەڵام ئـی خودای ببە و بوونە (کن فیکون)، واتە خودای بەتوانـا هەچـی حەز کـا و بـیهەوێ سـازی کـا، دەیکا و دەتوانێ و هیچ نیازێکیشی بە کەرەسە و وەسایل نییە، هەر بە ئەمری (کن فیکون)ە.

و هەروا خـودای مەزن ئەو عیسـایە فێـری کتێبەکـانی ئاسـمانی دەکـات وەک تەورات و ئینجیل بن، جگە لە فێربوونی ئەوانەش فێری ڕاز و ڕەمز و ئەسرارەکانی شەریعەتیشی دەکات.

پرسیارێک لێرەدا دێتە پێش، ئەویش ئەوەیە: بەچـی بزانـدرێ کە مەبەسـت لە کیتـابی نـاو

ئایەتەکەی ٤٨ تەورات و ئینجیلە؟ دەبێ بە یاسای عیلمی نەحو بزانـدرێ کە وشـەی تەورات و ئینجیلی دوای کیتاب، عەتفەبەیانی کیتابن، بەو پێیە دەبێ بکوترێ خودا حەزرەتی عیسـا فێـری تەوراتی دەکا لە بابەت خوێندنەوە و فێری ئینجیلی دەکا بە هۆی سرووش، چونکە پەروەردگـار ئینجیل بۆ عیسا دەنێرێ بە ناوی سرووش، وەک تەورات بۆ حەزرەتی مووسا دەنێرێ.

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم عیسا دەنێـرێ بە پـلە و پـایەی پێغەمبەرایەتـی بـۆ لای نەوەکانی ئیسرائیل، جا ئەوجار پاش ئەو مـزگێنییە پیـرۆز و مبـارەکە کە بە حەزرەتـی مەریەمە، عیسا دە زگی مەریەمەدا دروست دەکا و دەیسازێنێ بەو سیفاتانەی کە باسـی لـێ کـردن خـودا دەیپێچێتەوە و بەرەبەرە ئامـادەی دەکـا و گەورەی دەکـا تـا دەیهێنێـتە دەرێ لە سـکی دایکیـدا، دەیگەیێنێتە تەمەنی دەرک و هەست و شعوور، تەوراتی خوێند وفێری بوو ڕازی شەریعەتیشـی دەرک کرد و فێری بوو، و لە تەمەنی شایاندا (٣٠ساڵی) بوو بە پێغەمبەر و ئینجلـی بە سرووش بۆ دابەزی. پاش سێ ساڵ پێغەمبەرایەتی بە گەلەکەی ڕاگەیاند و کـوتی: بەڕاسـتی و دروسـتی ئەمـن نیشـانەیەکم لە پەروەردگارتـانەوە بـۆ هێنـاون، کە ئەو نیشـانەیە شـاهیدی دەدا لە سـەر پێغەمبەرایەتی من، دیارە گەلەکەی داوای نیشانەکان دەکەن، عیساش نیشانەکانیان بۆ بەیان دەکا و دەفەرموێ:

١. عیسا دەفەرموێ: ئەمن دروست دەکەم لە قوڕ بۆتان شتێک لە وێنەی باڵندە و فووی پێدا دەکەم و دەیدەمێنم و وەگیان دێ و دەبێتە باڵندەیەکی زیندوو و دەفڕێ بە ئەمری باری.

٢. عیسا دەفەرموێ: کوێری زگماک و نەخۆشی بەڵەک چاک دەکەمەوە بە ئیزنی باری.

٣. عیسا فەرمووی: مردوو وەژیان دێنمەوە بە ئەمری باری.

٤. عیسا فەرمووی: دەزانـم و خەبەردارتـان دەکەمەوە لە سـەر ئەو شـتانەی کە وا دەیـکەنە ئازووخە و زەخیرە لە نێو ماڵتاندا بۆ دواڕۆژ.

٥. عیسا فەرمووی: ئاگادارم و ئاگاداریشتان دەکەمەوە لە سەر ئەوەی دەیخۆن لە ماڵتاندا.

پاش ئەوەی حەزرەتی عیسا بۆ ئیسباتی پێغەمبەرایەتی خۆی ئەو شـتانەی ڕوو بە گەلەکەی ڕاگەیاند و پێی کوتن، کە بەڕاستی ئەو پێنج شتە موعجیزانەی عیسـا نوانـدنی و بەیـانی کـردن بەڵگەی بەهێز و پێزن لە سـەر پێغەمبەرایەتـی عیسـا، ئەی گەلـی ئیسرـائیل بـاوەڕی بەو شـتانە حاشاهەڵنەگرە و شایانە، ئەگەر باوەڕو هەبێ و لە خۆ نەگۆڕن.

هەر حەزرەتی عیسا بـۆ بـاوەڕی گەلەکەی پێیـان دەڵـێ: ئەمـن هـاتووم بە بـڕواهێنەر بەو

تەوراتەی خۆتان کەوا لە بەردەستمدایە و سرووشی مووسا پێغەمبەرتانە واتە ئەوە بزانن کە ئەمن ئایین و دینەکەم ناسخی تەورات نییە بەڵکە دینی مـن ئەوەیە کە بـاوەڕی بە تەوراتە و لە سـەری دەڕوا و کاری پێ دەکات تا خودا تا خودا دەستوور دەدا، چەند شتێک نەبن کە تا ئێستێ خـودا لە سـەر ئەساسی حیکمەتی خۆی بە هۆی یـاغیگەری و زۆرداری جوولەکەکـان لێـی قەدەغە کـردوون بەڵام پەروەردگار ئێستا بە دابەزینی ئینجیل ئەو شتە قەدەغەکراوانەی بۆ حەڵاڵ کـردوونەوە، ئەو شتانەش وەک گۆشتی ماسی و وشتر و چەوری و بەزی ئاژەڵ و کارکردنی شەممانە نەبـێ، ئەو شتانەی کە لە جوولەکە قەدەغە کراون قورئان پێی ناتیقە بە هۆی لاساری و ستەمکاری خۆیـان بووە جوولەکەکان، وەک ئایەتی ۱۶۰ی نیساء ئیقراری پێ دەکا:

**فَبِظُلْمٍ مِّنَ الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ اللّهِ كَثِيرًا**
**کەواتە بە هۆی ستەمکاری کە لە لایەن یەهوودییەکانەوە کرا ئەو شتە پـاک و خاوێنـانەی کە بۆیان حەڵاڵ کرابوو، لێیان حەرام کردن، بە هۆی زۆر کۆسب دروست کـردنیش، لە سـەر ڕێ و ڕێبازی خودادا.**

بە کورتی، تەسدیقی تەورات لە لایەن حەزرەتی عیساوە ل ەسەر ئەو ئەساسەیە کە ئەسڵ و ئەساسی ئەو بەرقەرار و پتەو بن، و لە بابەت حەڵاڵ کردنەوەی هەندێک لەو شتە حەرام کراوانە دەبێ بکوترێ کە گەلی بەنی ئیسرائیل بە هۆی لاساری و سـەرەڕۆییان و بەردەوامییـان لە سـەر تاوان هەندێک لە تەعام و نیعمەتە خاوێنەکانیان کاتێ لە سەر قەدەغە کـراون وەک هەنـدێک لە باڵندە و ماسی و گۆشتی وشتر و چەوری حەیوانات و هەروا کارکردن دە ڕۆژەکانی شەممەدا.

جوملەی ﴿وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّـوْرَاةِ﴾ واتە تەسـدیق و تەئیـدکەری تەوراتـێکە کە پێش من هاتووە واتە پێش ئەوەی ئەمن بێم، یانی ئەمن کتێبێکم بۆ هێناون (ئینجیل) پاککەرەوە و لابەری تەورات نییە و بە پێچەوانەی ئەو نییە دە ئەحکامـدا؛ مەگەر ئەو شـتانەی کە بە هـۆی سەرەڕۆیی گەلی یەهوود لێیان قەدەغە کراون، ئەوانیش وەگێڕێ بە حەڵاڵ.

ئەو ئینجیلەی کە پێغەمبەر عیسا هێنـاویەتی دەگەڵ تەورات هەر یەکـن دە ئەساسـدا، واتە تەوحید، مەعاد، بەرزی ئەخلاق، هەر وەک حەزرەتی عیسا فەرموویەتی: ئەمن نەهاتووم تاکوو بنچینەی شەریعەتی تەورات هەڵوەشێنم، بەڵکە هاتووم شەریعەت وەڕازێنم و بە پلەی کەمـاڵی بگەیێنم، دیارە ئەگەر بەرجەوەندی ئەو پەیامەی عیسا بین و ئاوڕی وردی وەسەر دەین، ئەوەمان پێ دەڵێ کە ڕیسالەتی حەزرەتی عیسا و تەواوی پێغەمبەران، ئەمر بە تەقوا و ئیتاعەت لە خودایە

و ئیقرار بە تەوحیدە واتە تەوحید دە ئەلوهیەتدا، تەوحید دە ڕبووبیەتدا، و ئیقرار بە عوبوودیەت و خوزووع بۆ خودا. ئەو پەیامە دە ئینجیلدا هەیە: ئەمن بۆ لای بابی خۆم و بابی ئێوە و خودای خۆم و خودای ئێوە دەڕۆم؛ باب واتە سەید و سەروەر دە عورف و ئادابدا، وەک فەرمووی (أبي و أبيكم) واتە بابی من و بابی ئێوە واتە ئەو بابەی کە شایانی کوڕ بوون نییە.



سووکە ئاوڕێک وەسەر ئەو موعجیزانەی کە حەزرەتی عیسای پێ ڕەوانە کراوە بۆ لای گەلی بەنی ئیسرائیل و هۆ و تەئیدی ڕیسالەتیەتی، سەیر کەن:

١. لە گڵ و قوڕ بە وێنەی باڵندە لە سەر ئیزنی خودا مەلێک دروست دەکا و دەیدەمێنێ، وەگیان دێ و دەفڕێ، ئەو گەلەی کە ئەو داوایان لە حەزرەتی کردووە چاوی دەکەن، وەک دەڵێن ئەو مەلەش چەکچەکیلە بووە.

٢. کوێری زگماک بە ئەمری باریتەعالا چاک دەکا و وە بینینی دەخا.

٣. گول و دوزام بە ئەمری خودا چاک دەکاتەوە.

٤. مردوو لە ناو گۆڕ دەردێنێ و وەگیانی دێنێ.

ئەو مردوویەش وەک دەڵێن یا «عازر» بووە ناوی، یا کوڕی پیرێژنێک بووە و یا «سام»ی کوڕی حەزرەتی نووح بووە.

لە سەر ئەو ئەساسە وا دەردەکەوێ هەر پێغەمبەرەی خودا جۆرە موعجیزەیەکی تایبەتی دەورانی خۆی داوەتێ کە بابەت بووە بۆ گەلی ئەودەمی، مەسەلەن دە دەورانی حەزرەتی مووسادا سیحر و جادوو زۆر باو بووە، خودای تەعالا بۆ ئیسباتی پێغەمبەرایەتی ئەو، ئیبتالی سیحری داوەتێ. دە دەورانی حەزرەتی عیسادا تەبابەت زۆر باو بووە، خودای تەعالا بۆ ئیسباتی پێغەمبەرایەتی ئەو، تەبابەتی بێ ئامراز و وەسیلە لە سەر ئەساسی موعجیزەی داوەتێ، وەک باسمان کرد.

لە دەورانی حەزرەتی محەممەددا خودای تەعالا فەساحەت و بەلاغەت و بەیاناتی ژووراتر لە سیحری پێ بەخشیوە، چونکە قورئانی بەلیغ و فەسیح کتێبێکە سەراسەر دنیای بەشەر کۆوە بن ناتوانن دوو جوملان وەک قورئان بڵێن هەر بەو پیتانەش کە قورئانی پێ هۆندراوەتەوە، گۆیا فەسیحان و بەلیغانی عەرەب توانیویانە ئاساری شێعر و ئەدەبیاتی خۆیان لە ئاسمان قایم کەن لە سەر ئەو حاڵەتەش نەیانتوانیوە خۆ بگەیێننە فەساحەتی قورئان و وەک ئەو بڵێن.



دڵ دەڵێ خەبەردانی ئەستێرەناسان لەمەڕ ئەوزاع و ئەحواڵی ئوموورات نهێنی دەگەڵ خەبەردانی پێغەمبەران لە بابەت نهێنییەکان دەبێ فەرقیان تا کوێ بێ و چ بێ؟

وڵام:

خەبەردانی پێغەمبەران بە پێی ئاگادارییەکە کە خودا دەیانداتێ، و هەر وا بەبێ پەنا بردن بۆ وەسیلە و ئامرازێکی دیکە، خەبەر لەو نهێنییانە دەدەن کە خودا ئیجازەیان پێ دەدا، ئەمما ئەستێرەناسان لە سەر ئەساسی عیلم و زانست و بەراوەرد و فەننی تایبەتەوەیە.

نموونەیەک لەو کارەسات و موعجیزانەی کە حەزرەتی عیسا بۆ ئیسباتی پێغەمبەرایەتی خۆی نیشانی قەومەکەی دەدا:

دیارە وەک قورئان شاهیدە، قەومی لاسار و سەرەڕۆ و خۆپەسەندی یەهوود هەر وا بە ئاسانی و سادە و ساکار ڕامی پێغەمبەر نابن و نایەنە سەر ڕێ، بەڵکە پێغەمبەران کە ڕازاوە بە عیلم و حیکمەت هێزی نهێنی خودان توانیویانە بە وەسیلەی موعجیزاتی ئاشکرا و دوور لە تاقەتی ئینسانی بیانهێننە ڕدا و دەستەمۆیان کەن. مەسەلەن عیسا کە پێغەمبەرێکی خاوەن ئۆمەت و کتێب بوو (اولو العزم و مورسەل)، خودا بە حیکمەت و عیلم و ئامادەی کردبوو بۆ وڵامدانەوە و بەراوەردی نیازەکانی گەلی یەهوود، لە سەر ئەو ئەساسە کە گەل داوای لێ دەکەن باڵندەیەکیان بۆ دروست کا لە پێش چاویان هەڵفڕێ. باڵندەیەکی وا کە دە ئەخلاق و سیستم و لەشدا جودا لە باڵندان بێ، واتە خاوەنی حەیز بێ و خاوەنی مەمک بێ و پێشەوە بدا و شیریش بدا و هێلکە نەکا و جاروبارەش وەک ئینسان پێ بکەنێ، باڵ و پەڕیشی نەبێ وەک باڵ و پەڕی مەلان، هەڵیشفڕێ، نە بە ڕۆژی ڕوونیش بتوانێ بفڕێ، نە بە شەو واتە شت ببینێ و سەرەدەرێ دەرکا یانی دە دوو کاتدا نەبێ نەتوانێ، ئەو دوو کاتەش یەک کاتژمێر دوای ڕۆژ ئاوابوون و هەر وا یەک ساعەت پاش تلووعی فەجر واتە پێش ڕووناکایی تەواو، وەک دەڵێن و کوتراویشە ئەو پەڕندەیە چەکچەکیلەیە.

حەزرەتی عیساش لە سەر ئیزن و ئەمر و ئیرادەی خودا بۆ وڵامی قەومەکەی و ئیسباتی ئیدیعای پێغەمبەرایەتی موو بە موو بێ کەم و زیاد دێنێ لە قوڕ لە بەر چاویان ئەو باڵندەیە ساز دەکا و گیانی تێدا دەدەمێنێ و بە ئەمری خودا هەڵیدەفڕێنێ، بە پێی کوتەی عەللامە ابن‌جریر ئەو کارە کە دەکا عیسا گەلی ناوی دەبەن بە ئوستاد. ئەو کارەساتە بڵاو دەبێتەوە دە ناو عالەمدا (تفسیر طبری، ٢٧۴/٣)

عەللامە وەهەب بن مەبەی فەرموویەتی: حەزرەتی عیسا هەزاران نەخۆشی لاعیلاج بە شەرتی ئیمان و باوەڕی بە هۆی موعجیزە و ئیزنی خودا شیفای پێ دەدا، و هەروا کەسانێکی کە بە هۆی سەختی دەرد و نەخۆشییەکەی نەیتوانیبا بچێتە لای عیسا، حەزرەتی عیسا بۆخۆی دەچوو بۆ لای و دەستی مبارەکی پێدا دەماڵی و چا دەبوو و شیفای دەهات (طبری، ۳/ ۲۷۷)

بە زۆری حەزرەتی عیسا دە کاتی خۆیدا ئەو دوعایەی دەخوێندەوە: (اللّهُمّ أنتَ إلهُ مَن في السّماءِ و إلهُ مَن في الارضِ لا إلهَ فيهما غيرُکَ، و أنتَ جبّارُ مَن في السماء و جَبّارُ مَن في الارضِ لا جَبّارَ فيهما غيرُکَ، و أنتَ مَلِکُ مَن في السّماءِ و مَلِکُ مَن في الارضِ لا مَلِکَ فيهما غيرُکَ، قُدرَتُکَ کَقدرَتِکَ في السّماء و سُلطانُکَ فی الارضِ کسُلطانِکَ في السماء، أَسأَلُکَ بِاسْمِکَ الکريم و وجهکَ المُنيرِ و ملککَ القديم إنَّکَ على کُلِّ شَيءٍ قَديرٌ)

عەللامە وەهەب بن منبە فەرموویەتی: ئەو دوعایەم تەجرەبە کردووە لە سەر شێت و ترس کاری کردووە جێبەجێ. (روح المعانی، ۲۲۴/۳)

کاتێ عیسا ویستوویەتی مردوو وەگیان بێنێ دوو رکعات نوێژی بەجێ هێناوە، دە ڕکاعەتی ئەوەڵدا سوورەی «تبارک الذي» خوێندووە و دە ڕکاعەتی دوودا سوورەی «سجدە»ی خوێندووە. پاش لەخۆبوونەوە لە نوێژەکە ئەو سیفەتەی خودای سەنا پێ کردوون: یا قدیم، یا خفي، یا دائم، یا فرد، یا وتر، یا احد، یا صمد» شیفا هاتۆتە جێ. (روح المعانی، ۲۲۴/۳)

محی السنة علامە بغوی لە ابنعباسەوە نەقڵ دەکا زیندوو کردنەوەی چوار نەفەر لە لایەن حەزرەتی عیسا کە مەنشوورن ئەوانەن: عازر، ابن العجوز، ابنة العاشر، سامی کوڕی نووح. دانە دانەی ئەوانە شێوەی وەگیان هێنانیان ئەگەر باس کەم زۆر ماندوو بوون هەڵدەگرێ بۆ یاران، بۆیە واز دێنم لە باسیان، ئەگەر وازیشت لێیە ئاوڕ وەسەر تەفسیرەکانی بەغەوی (۳۱۴/۱ - ۳۰۳ روح المعانی ۲۲۵/۳) وەدە.



نەقڵ لە عەللامە ابن جریر لە ابن ابی حاتم ئەوانیش لە ڕەبیع نەقڵ دەکەن کە گۆیا دە ئایینی حەزرەتی مووسادا لە بابەت هەندێک لە ئەحکامات توند و سەختی هەبووە ئەمما دە ئایینی حەزرەتی عیسادا ئەو سەختی و توندییە وەلا بران، مەسەلەن دە ئایینی حەزرەتی مووسادا گۆشتی وشتر و پیوەکەی قەدەغە کرابوو لە خواردن، بەڵام دە ئایینی حەزرەتی عیسادا ئەو قەدەغەیە وەلابرا و خواردنیان وەحەڵاڵ گەڕان (تفسیر طبری، ۲۸۰/۳)

واتە تا هاتنی شەریعەتی ئـایینی محمـد المصـطفیﷺ ئەو تونـد و شـلە لە نێـوان ئەو دوو شەریعەتانە بە بەردەوامی هەبوون، ئەمما بە زهووری ئـایینی مـحەمەدی، بە وەسـیلەی ئـایەتی ١٤٣ی سوورەی بەقەرە هەندێک لە فرووعاتی یاسای ئینجیل سـڕانەوە و وەلا خـران. واتـا هەر وەک ئینجیل هەندێک لە لق و پۆپی تەوڕاتی هەڵپەرتاوتن قورئـانیش هەنـدێک لە لـق و پـۆپی ئینجیلی هەڵپەرتاوت، حاڵەتێکی میانەڕۆی بە خۆوە گرت. ئەوەش ئایەتەکە:

**وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ**
**هەر بەو شێوەش ئێوەم کردووە بە گەلێکی میانەڕەو، تاکوو ئێوە ببنە شایەت لە سەر خەڵک و پێغەمبەریش ببێتە شایەت لە سەر ئێوە.**

پاش هەڵکێشانی عیسا بۆ ئاسمانەکان مەسیحییەکان زیادەڕەوییان کـرد هـاتن ئەوانەی بـاو بوون لە کاتی عیسادا، کە عیسا لە ناویاندا نەما ئەو باوەیان وەلا نا، مەسـەلەن کـاتی عیسـا بـۆ عیبادەت ڕوو دەکـرایە بەیتولمـوقەدەس، ئەوان ڕوویـان دەکـردە ڕۆژهەڵات، و هەروا دە کـاتی حەزرەتی عیسادا خەتەنە باو بوو ئەوان کە عیسا وەلاچوو لایانبرد، ڕۆژی شەممە ڕێزدار بوو لە ئایینی مووسادا و عیساش بەو پێیە ڕێـزی بـۆ دادەنـا، ئەوان هـاتن کردیـانە یەکشـەممە، بەراز حەرام بوو، ئەوان هاتن بە ڕەوایان دانا، بە کـوردی بە وازی خۆیـان هەچـی کەیفیـان لـێ بـوو بۆخۆیان حەڵاڵ کرد. (روح المعانی، ج ٢٢٨/٣-٢٢٧)

ئایەتی ٥١ چ بەیان دەکا لە زاری حەزرەتی عیسا و بۆ مەش چ دەرسێکە و چ هاوارێکە؟

ئەو هاوارەیە: خەڵک بە هۆی بوونی عیسا بە شێوەی جودا لە بوونـدا واتە بـێ بـاب، و بە هۆی موعجیزاتی عەجایب، وایان خەیاڵ دەکرد کە عیسـا خـودایە، ئەدێـرەدا حەزرەتـی عیسـا هەستی بەو حاڵەتەی خەڵک کرد و ویستی ئەو تەم و خەیاڵە باتڵە لە ناو بەرێ و بیرەوێنێ. جـا هەر وەک دە ئایەتی ٤٩دا لە بـابەت وەگیـان هێنـانی تەیـران بە ئیزنـی خـودا فەرمـوویە، هەروا دێرەشدا واتە ئایەتی ٥١ هەمان تەئید و ئاماژە ڕەچاو دەکا و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ﴾ بە پێچەوانەی ئینجیلی ئاوەژوو کراوەکە کە بە خودایان کوتووە باب، عیسـا ئەدێـرەدا فەرمـووی (رب) ئەو ئەدەبیـاتەی حەزرەتـی عیسـا نیهـایەتی بەربەرەکـانی ئەو کەسـانەیە کە دەیـانهەوێ خودایەت بۆ عیسا قایل بن.

**إِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ هَـذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾**

**بەبێ گومان خودا پەروەردگاری مـن و پەروەردگـاری ئێـوەیە، کەواتە بەنـدایەتی هەر بـۆ ئەو بکەن، ئەوەیە ڕێگای ڕاست و دروست.**

## ئاوڕدانەوە وەسەر سیمای ئایەتی پیرۆزی ٥١

دیـارە حەزرەتـی عیسـا بە پێـی ئـادابی وەزیـفەکەی هەر هەمـوو پێغەمبەرێـک حەول و تێکۆشانی تەواوی بەکارهێنا و وەگەڕی خست بـۆوەی قەومەکەی ئیمانـی پـێ بێـنن و خەتـی ڕاستی خوداپەرەستی بگرنە بەر، ئەمـما سـەرەڕای ئەو هەمـوو ڕەنـج و مەیـنەتەی عیسـا و ئەو هەموو دەعوەتەی ئەو بەشێکی کەم نەبێ ئیمانیان نەهێنا، سەرەنجام کەوتـنە خەیـاڵی کوشـتنی حەزرەتی عیسا، حەزرەتی عیساش هەستی بە خەیاڵی ناپاکی ئەوان کرد و بـۆ پـارازتنی گیـانی خۆی و دایکی کە دیارە گیانیش شیرینە، خۆی دەبوارد لێر و لەوێ لە شوێنی تایبەت و خەتەر و مەترسیدار نەکا بیکوژن. وا هات شەوێک یارانی ڕاستی خۆی (حواریون) کە گۆیا دوازدە کەس بوون نهێنیانە وەکۆ کردن، کە یەکێکیان بە ناوی «یهوذا» هەسـتی ناپـاکی لە ڕاسـت عیسـا لـێ دەکرا، عیسا ویستی ئاگادارییەک بدا تا بزانێ عیسا ئاگارە لە ناپاکان، فەرمووی ئەمن وا هەست پێ دەکەم لەو دوازدە نەفەرانەو یەکێکتان بێ بڕوایە بە من، وەک فەرمووی: ﴿فَلَمَّا أَحَسَّ عِيسَى مِنْهُمُ الْكُفْرَ قَالَ﴾ جا بەو هۆیە حەزرەتی عیسا هەم بۆ تێگەیشتنی ناپاک هەم بۆ ساغبوونەوەی پاکانی ڕاست، ڕووی تێ کردن و فەرمووی: کێ یارمەتیدەری منە بۆ دەعـوەتی عـالەم بـۆ لای خودا؟ لە وڵامدا پاکان وڕاستان (حواریون) واتە خاوەن باوەڕەکان بە ڕاشـکاوی کوتیـان: ئـێمە یارمەتیدەری دینی خوداین، چونکە بڕوای ڕاستن بە خودا هێناوە و ئەتۆش یا عیسا، شاهید بە لە سەر ئەوەی کە ئێمە لە دڵەوەڕا سەرمان لە پێناو دینی خودا دانـاوە و دادەنێـین. ئەمـما خـودای خاوەن حیکمەت و حەکیم فێڵ وفوتی خائینان پووچەڵ دەکاتەوە. جا بـۆ ڕاسـتی ئەو مەتـڵەبە دەچینە خزمەت ئایەتی ٥٢ی ئالی عیمران:

**فَلَمَّا أَحَسَّ عِيسَى مِنْهُمُ الْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللّهِ آمَنَّا بِاللّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾** ئالی عیمران

**کاتێ عیسا لە لایەن گەلەکەیەوە هەستی بە بێ بڕوایی کـرد کـوتی: کـێ یارمەتیـدەرمە بەرەو خودا؟ یارە حەوارییەکانی کوتیان ئێمە یارمەتیدەری خوداین، ئیمانمـان بە خـودا هێنـاوە، تـۆش شاهیدیمان بۆ بدە کەوا ئێمە گەردنکەچ و فەرمانبەرین.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر سیما و ناوەرۆکی ئایەتی پیرۆزی ٥٢:**

کاتێ حەزرەتی عیسا هەستی بە خەیاڵی ناپاکی کرد لەواندا و تێگەیی کە بێبڕوایان تێدایە گەلەکەی هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە بیانـدوێنێ بەو عیبـارەتە: کـێ یارمەتیـدەرمە بـۆ دەعـوەتی خەڵک وەلای خودا؟ ئەو بانگەوازەشی بۆ وەی بوو تا کوو ڕوون و ئاشکرا بـێ کـێ بەڕاسـتی دەگەڵە و خاوەن بڕوایە و کێیە بۆنی بێبـاوەڕی لـێ دێ؟ جـا لە سـەر داوای حەزرەتـی عیسـا دەستەولەجێ یارانی بەڕاستی خۆی (حواریون) کوتیان ئێمە یاریدەدەری دینی خوداین چـونکە باوەڕمان بە خودا هەیە و هێناومانە، و ئەتۆش ئەی عیسـا شـاهید بە لەسـەر ئەو قەولەمـان و لە سەر ئەوەش کە ئێمە سەر و ماڵمان دەخەینە پێناو ئایینی خوداوە و دە ڕێی ئەویشدا دایدەنێین.

و لەو لایەشەوە گەلی یەهوود بە پێی موژدەیەکی کە دەکاتی خۆیـدا حەزرەتـی مووسـا لە بارەی هاتنی حەزرەتی عیسا پێی دابوون چاوەڕوانی و ئینتیزاری هاتنی عیسایان دەکـرد، کـاتێ عیسا هات و زهوری کرد و بەهرە و مەنـافیعی دنیـای سـەرانیان کەوتە خەتەر، تەنیـا بەشـێکی کەمیان نەبێ لە دەوری حەزرەتی عیسا کۆ نەبوونەوە، جا ئەدێرەدا بوو کە حەزرەتی عیسا پـاش هێنانەوەی دەلیل و بەڵگەی کافی لە سەر ئیدیعای خوداپەرەستی و بە تەنیاناسی، نیشانەی کوفر و بێباوەڕی بەشێک لە قەومی یەهوودی هەست پێکرد بە ڕوونی، بە تەواوی هەستی خامۆشی و کـوژانەوەی تیشـک و شـۆقی چـرای بانگـاواز و دەعـوەتی بە حەقـی خـۆی کـرد. هـۆی دەعوەتەکەی کە فەرمووی کێیە یارمەتیدەری مـن بـێ لە سـەر دینـی خـودا، ئەو هەسـتە بـوو. ڕاپەڕاند بۆ حیفز و بەقای دەعوەتی بەحەقـی خـۆی کە دەبـێ ڕێگـا چـارەیەکی ڕێکوپێـک و درست ڕەچاو کا تاکوو پاکان و خاسانی دینی خۆی بناسێ، ئەوە بـوو نەقشـەکەی و ڕاسـتیش هاتە دەر کە حواریون بە ڕاشـکاوی وڵامـی حەزرەتـی عیسـایان بە حەق داوە کوتیـان ئـێمەین خەاوەنی باوەڕ و فیداکاری دینی خوداین. تۆش شاهید بە لە سەرمان.

ڕازێکی باریک دێرەدا و لە وڵامی حەواریون کە ڕووبەڕووی حەزرەتی عیسا کوتیـان ئـێمە باوەڕمان بە خودایە ولە سەر دینی خوداین، نەیانکوت باوەڕمان بە تۆیە و لە سـەر دینـی تـۆین، ئەو وڵامە دەڕوانێتە ئەو جێگایە: کە ئەوان هەستی ئەوەیان کردبوو لە داهاتوودا دار و دەستەیەک دێنە ڕوو دەڵێن: عیسا خودایە، سەرەڕای ئەوەش ئەنساروڵڵا دەڵێن: ئێمە بە هەچی وەحیـت بـۆ کردووە و نازڵ بۆتە سەرت باوەڕن پێیەتی و ئیمانن پـێ هێنـاوە و ڕیسـالەتی تۆمـان قبـووڵە لە هەموو بارێکەوە. ئەوە ئاماژەی ئایەتی ٥٣ی عیمرانە و تەئکید ئیمانیانە. دە حاڵێکدا دە ئینجیلـدا

ئیشارە وەلای خەیانەت و خلیسکانی هەندێک لەوان کراوە.

دڵ دەیهەوێ بزانێ حەواری لە چ بـاب و بنـاغەیەکە؟ ئەمەش لە سـەر ئەساسـی لـۆغەت دەڵێین: حەواریون جەمعی حەوارییە لە بابی تحویرە، واتە سپی حواریات، واتە ژنانی جوان، و هەروا حوور هەر لەو بابەیە، واتە جوان و خۆش ڕوو و سیما، حەواریـون واتە ئەو کەسانەشـن کە حەزرەتی عیسایان ملاقات کردبێ. (قرطبی، ۹۸/۴)

وەک ئەسـحابی پێغەمـبەر بە مانـا یاریـدەریش هـاتوون، پێغەمـبەر فەرمـوویەتی لە مەڕ حەزرەتی زوبەیر: (إنّ لِکُلِّ نَبيٍّ حوارياً و إنّ حواريَّ الزبير بن العوام) (بخاری، بابی ۱۳ مناقب الزبير بن العوام ش ۳۷۱۹)

**ئاوڕێک وەسەر حەواریون و بەسەرهاتیان پاش چوونی عیسا بۆ ئاسمان:**

گۆیا حەواریون دوازدە کەس بوون عالەمی دیکە دەعوەت کراوی وان بـوون، دیـارە وەک کوتوویانە و دەڵێن مێژوونووسان پاش چوونی عیسا بۆ ئاسمان یەهـوود کەوتـوونە گیـانی ئەو حەواریانەی کە لە ژێر دەستیاندا بوون ئازار و ڕەنج و عەزابی زۆریان داون. ئەوزەمانی پادشای یەهوودیان لە خۆیان بووە بە ناوی داود بن نۆزا لە شام. ئەمما لە ژێر دەستەڵاتی دەوڵەتی ڕۆمدا بوو، شای یەهوودیان ڕەعیەتـی دەوڵەتـی ڕۆم بـوو و دە واقیعـدا ئەو هەمـوو ئـازار و ڕەنـج و مەینەتەی کە لە دەورانی حکوومەتی داودی بەنـی نـۆزا بە سـەر حەزرەتـی عیسـادا دەهـات لە سۆنگەی دەستەڵاتداری یەهوودی ژێر چەپۆکەی ڕۆمدا بـووە هەر وەک دەزانـین و زانراویشـە سوننەتی خـودای بـۆ هەر دەوران و ئەوزاعێکـی کە بـیهەوێ بیگـۆڕێ پێشـوازێک و هەلێـک دەڕەخسێنێ، جا لە سەر ئەو یاسا دروست و ڕەوانە هەندێک لە عالەمی وەخـت نەهێنیـانە هەم زهوور و عیسا هەم موعجیزاتی بێوێنەی هەم هەڵسوکەوتی زاڵم و زۆردارانەی یەهوود دەگەڵ عیسا و هەوادارانی، بە شای ڕۆمیان ڕاگەیاند، شای ئەوکـاتی ڕۆمـیش نـاوی «طبـاریس» بـوو دڵنەرم و دژ بە ئازاردانی بێدەستەڵاتان بوو، بە بیستن و ئاگـاداری ئەو جەریـانە، نـاڕەحەت و گـرژ دامـا و کـوتی ئەگەر بمزانییـایە ئینسـانێکی ئـاوا لە وڵاتمـدا هەیە هەرگیـز نەمدەهێشـت زرۆداران ئەزیەت و ئازاریـان دەن، هەر وا بە فەوری نـوێنەرێکی پـاک و ئەمینـی خـۆی بەرەو وڵاتی شام بۆ نەجاتی یارانی عیسا و حەواریان و بۆ هاتنیان بۆ لای شا وەڕێ خست، تاکوو لە زاری یارانی عیسا کارەسات و جەریان ببیستێ.و جا کـاتێ شـا لە زاری حەواریـون مـاجەرای بیست و یەقینیشی پەیدا کرد، دڵی ڕاسا بۆ نەسرانیەت و ڕێز بۆ ئەو دارەی دانا کە عیسـایان پـێ

هەڵاوەسیوە بە ناوی داری «طیب» کەوتە سەر ئەو باوەڕەش کە عیسا بووە لە دار دراوە، پاشان بۆ سزای یەهوودیان هێرشێکی بەربڵاو و بێڕەحمانەی بەرەو یەهوود دەست پێکرد و نابوودی کردن و پرژ و بڵاوی کردن بێر و بەوێدا. شا پێشەنگی زهووری نەسرانیەت بۆ وڵات.

وە لە پاش ئەو شایە واتە «شا طباریس» شایەکی دیکە بە ناوی «طیطوس» هاتە سەر کار چل ساڵ لە بۆ ئاسمان چوونی عیسا ڕادەبرا، هێرش کرایە سەر بەیتولموقەدەس وڵات وێران کرد و خەڵک گیرا و کوژرا بێر و بەوێدا دیسان پەرتەوازە کرا، ئەو دوو تایفەی «بنی قریظه» و «بنی نضیر» دوو تایفەی یەهوود لە وڵاتی شام ئەودەمە بوو هەڵاتن بەرەو وڵاتی حیجاز کە ئێستێ وا لە وڵاتی مەدینە نیشتەجێن. (روح المعانی، ٢٣٦/٣؛ تفسیر کبیر، ٧٠/٨)

بە پێی فەرموودەی ئایەتی ٥٢ حەواریون دەعوەتی حەزرەتی عیسایان بە چاکی و بەڵێ وەڵام داوە و ئیزهاری ئامادەگی و یارمەتی تەواویان داوە بە تێکڕایی و بە دڵەوە کوتیان: ئەو پەروەردگارمان ئێمە بڕوامان هێنا بە کتێبەکە ئینجیلە و ناردوویەتە سەر عیسا، و هەروا پەیڕەویش دەکەین لە ڕەوانەکراوت کە عیسایە، خودا و بماننووسە دەگەڵ ئەو کەسانەی کە شاهیدن لە سەر تاق و تەنیایی و پەروەردگاریت و هەروا شاهیدن لە سەر ڕاست و دروستی پێغەمبەران و ناردراوانت لە ناو هەموو نەتەوەکانی دنیا.

ئەوجار بۆ ڕاستی ئەو بابەت و مەتڵەبە دەچینە خزمەت ئایەتی ٥٣ی ئالی عیمران:

> رَبَّنَا آمَنَّا بِمَا أَنزَلَتْ وَاتَّبَعْنَا الرَّسُولَ فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ ﴿٥٣﴾ ئالی عیمران
> **ئەی پەروەردگاری ئێمە! بڕوامان هێناوە بەوەی تۆ ناردووتە خوارەوە، و هەروا کەوتووینە شوێن پێغەمبەریش کەواتە تۆش دەگەڵ شاهیدیدەرانمان بنووسە.**

## ئاوڕ وەسەر دانەوەیەک و تێڕوانینێکی ئایەتی ٥٣

ڕا و بۆچوونی هەندێک لە قورئانزانان ئاوا نیشان دەدا کە مەبەست لە شاهیدان حەزرەتی محەمەد و ئۆمەتەکەیەتی، لە سەر ئەو ئەساسە ئەو ڕایە دەردەبڕن کە گۆیا وەک قورئان ئاماژەی وەلا کردووە لە ئایەتی ١٤٣ی بەقەرەدا، ئۆمەتی ئاخر زەمان کە ئۆمەتی محمد المصطفایە دە ڕۆژی قیامەتدا شاهیدی دەدەن بۆ ئەو پێغەمبەرانە کە ئۆمەتەکانیان لە دنیادا ئینکاری و بەربەرەکانییان کردوون، و هەروا حەزرەتی محەمەدیش لە سەر ڕاستی شاهیدییەکەیان شاهیدی دەدا، بەو پێیە مانای ئایەتەکە ئاوای لێ بەسەر دێ: پەروەردگارا، ئێمە لە شاهیدانێک بژمێرە کە

لە سەر دەعوەت و ئیرشادی پێغەمبەران شاهیدی دەدەن. عەکرەمە لە ابن‌عباسەوە ئەو تەعبیراتەی پەسەند کردووە. (روح المعانی، ۱۵۷/۳، و هەروا تفسیر ابن حاتم، ۱۵۷/۲ ش ۳۶۲۷)

ئەمما ابوطالع لە ابن‌عباسەوە ئاوا نەقڵ دەکا: شاهدین تەواوی موئمینانی دەورانی پێشوون واتە سابقون، مقربون، و هەروا هەندێکیش نەزەریان وایە لە سەر شاهدی پێغەمبەرانن بەو دەلیلە هەر پێغەمبەرێک لە سەر ئۆمەتی خۆی شاهیدی دەدا، مقاتل کە یەکێکە لە قورئانزانان نەزەری وایە شاهدین ڕاستانن، ئەودەم مانای ئایەتەکە ئاوا تەعبیر دەکرێ: پەروەردگارا ئێمە لە ڕاستان بنووسە؛ ئەمما پەسندترین نەزەر، نەزەری عەکرەمەیە کە لە ابن‌عباسەوە نەقڵ دەکا واتە مەبەست لە شاهدین حەزرەتی محەمەد و ئۆمەتەکەیەتی. (روح المعانی، ج ۲۳۵/۳-۲۳۴)

کاتی ئەوەی هاتووە ئایەتی ۱۴۳ بەقەرە کە بابەت بوو لە سەر شاهیدیەکە بخەینە ڕوو:

**وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا** ﴿۱۴۳﴾ بقرة

**هەر ئەبەو شێوەش ئێوەم کردووە بە گەلێکی میانەڕەو بۆ ئەوە کە ئێوە ببنە شاهید لە سەر خەڵک و پێغەمبەریش ببێتە شاهید لە سەر ئێوە.**

ئەو ئایەتە هانمان دەدا و پێمان دەڵێ: ئەو حەواریانە داوا لە خودا دەکەن کە لە زومرەی پێغەمبەر محەمەدﷺ و ئۆمەتەکەیدا بمان‌نووسن.

و هەروا دەتوانین بڵێین مەبەستی حواریون لەو پەیامە مبارەک و پڕ بایخەدا واتە ئایەتی ۵۳ بەیان و نومایشی نیەتی پاکیانە لە بارەگای زاتی پاکی خودای بێ‌هاوتا دەیخەنە ڕوو کە دەڵێن: پەروەردگارا بەوەی کە ناردووتە خوار ئیمانمان هێناوە، دیارە ئیمان دەگەڵ عەمەل بە دەستوورات و ئەمری باری و شوێن‌کەوتنی نوێنەرانی، کەماڵی ئیمان نیشان دەدا؛ هەر بۆیە حەواری کوتوویانە: ئێمە سەرەڕای ئیمان بە نێردراوەکەت شوێن پێغەمبەرەکەش کە عیسایە دەکەوین، ئەوەیە هۆی داوامان کە لە ڕیزی شاهیدانی ڕاست و دروستمان بنووسن.

دیارە ئەو گەلە بە پێی ئیشارەی ئایەتی ۵۲ کە فەرموویان (آمنّا باللّه) ئیمانیان بە خودا هێناوە، جا بۆیە دووبارە دەڵێن ئیمانمان بەوەش هێناوە کە ڕەوانەکراوی تۆیە کە عیسایە و ئیتاعەش دەکەین. جا لە سەر ئەو حاڵەتە ڕاست و ڕەوانەیان شایانی شەئنیانە کە بڵێن خودایە بماننووسە دەگەڵ شاهیدان و بەحەق و ڕاست کە محەمەدﷺ و ئۆمەتیەتی. چونکە ئەوانە

(محەمەدﷺ و ئۆمەتی) تایبەتن بـا شـاهیدی ڕوون و ڕاسـت لە سـەر ئەساسـی ئـایەتی ١٤٣ی بەقەرە.

جـگە لەوەش بە پێـی کـوتەی ابن‌عبـاس ﴿فَاكْتُبْنَـا مَـعَ الشَّـاهِدِينَ﴾ واتە پەروەردگـارا بماننووسە لە ڕیزی پێغەمبەران، چونکە بە پێی فەرموودەی ئایەتی ٦ی ئەعراف هەر پێغەمبەرێک شاهیدە لە سەر کردەوەی ئۆمەتی خۆی.

**فَلَنَسْأَلَنَّ الَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْأَلَنَّ الْمُرْسَلِينَ**

**بێ‌گومان ئەوسا پرسیار دەکەین لەو کەسانەی پێغەمبەریان بۆ نێردراوە، بێ‌گومان پرسـیاریش دەکەین لە نێردراوەکانیش کە پێغەمبەرەکانن.**



کاتی ئەوەی هاتووە سەرێک هەڵێنین لەو فێڵ و فوتەی بێ‌باوەڕان دایانڕشت بـۆ کوشـتنی حەزرەتی عیسا و خودای خاوەن حیکمەتیش پووچەڵی کردەوە و ڕووی پێ دە خۆ کـردن و دە چاڵی هاویشتن واتە ئەو چاڵەی بۆ عیسایان هەڵکەندبوو.

کورتەی کارەسـات: فێـڵ‌دارێژەران دێـنە لای شـای وەخـت کە کـافر دەبـێ ئەویـش، بـۆ بەدگۆیی حەزرەتی عیسا، دەڵێن ئەی شای وڵات! کابرایەک سەری هەڵداوە لە وڵاتت خەڵـک دەخەڵەتێنێ و گومڕایان دەکا و لە ئیتاعە و فەرمانبەری تۆ وەلایان دەخا و دووریـان دەخـاتەوە. ئەو درۆ و دەلەسانە دەکەنە بناخەی تووڕەبوونی شا بۆ کوشتنی حەزرەتی عیسا. شاش بە هۆی ئەو درۆیانە دڵی پڕ بوو لە ڕق و تـووڕەیی لە عیسـا، نـاردی بە شـوێنیدا کە بیگـرن و بیهێـنن و ئازاری دەن و لە داری دەن، کاتێ مەئموورانی شا هـاتن دەورەی ماڵیـان دا بە خەیـاڵی خۆیـان بیگرن، وا دیارە یەکیان گرت پێیان وا بوو عیسایە، بەڵام خودای تەوانا دەستەولەجێ یەکێـک کە لە ناو ماڵەکەدا بوو بێ‌برواش بوو دیـاری دەدا ڕوخسـار و دیمەنـی عیسـا هاویشـتە سـەری و عیسای بە لایەکی دی ڕفاند و نەجاتی دا بۆ ئاسمانی برد، ئەو کابرایەشـیان لە بـاتی عیسـا و لە جێگای عیسا لە دار دا و کوشتیان.

ئەوە کورتەیەک بوو لە مەکـر و فێڵـی بێ‌بـاوەڕانی یەهـوود، دەرسـە بـۆ ئینسـان کە چـاڵ هەڵکەندن بۆ غەیر بۆ خۆ دەکەویەتێ. جا بۆ ئیسباتی ئەو مەبەستە دەچینە خزمەت ئایەتی ٥٤ی ئالی عیمران:

**وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ ﴿٥٤﴾** ئالی عیمران

**ئەوان فێڵی خۆیان کرد، و خـوداش پیلانەکـانی پـووچەڵ کـردنەوە و هەڵیوەشـاند. دیـارە خـودا چاکترین پیلان پووچەڵکەرەوەیە.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوەیەکی ئایەتی پیرۆزی ٥٤:**

دیارە جوولەکەکان کەوتنە فڕ و فێڵ بۆ کوشتن و لەناوبردنی حەزرەتـی عیـاس، سـەبارەت بەو پایەمە بەحەق و ڕاستییەی کە بە ناوی پێغەمبەرایەتی ڕایدەگەیاند و خودای بانی سەریش لە سەر ئەساسی حیکمەتی خۆی کەوتە پـووچەڵکردنەوەی فـڕ و فێڵیـان و پاداشـی ئەو مەکـر و فێڵەیانی دانەوە، بەو شێوەیە جوولەکەکان چەند نەفەری باوەڕ پێکراوی خۆیان نارد بۆ یاریکاری و هاوڕێیی یەهووذا بۆ لە داو خستن و کوشتنی حەزرەتی عیسا، لەو کاتەشدا حەزرەتـی عیسـا خەریکی نوێژکردن بوو لە باخچەیەکا کە بە تەنیشتی هۆدەکەی خۆیدا بوو کە یارانی حەزرەتـی عیسا واتە حەواریون دەوێدا خەوتبوون. حەزرەتی عیسا کە هەستی بەو جەریـانە دە نـوێژەکەدا کرد ڕاستەوخۆ چووە ئەو هۆدەی کە یارانی خۆی لێ نوستبوون. ئەو هۆدەش دەلاقەیەکی تێـدا بوو، حەزرەتـی عیسـا لەو دەلاقەوە دەرچـوو. کـاتێ کە یەهـووزای خـوازاری ڕاو و کوشـتنی عیسای بوو چوە ناو ژوورەکە ڕوانی لە عیسا و نەیدی. هەر لەو ئان و کاتە پـڕ مەتـرس و پـڕ لە هەستەدا خودای بانی سەر شکڵ و ڕوخسار و دەنگـی حەزرەتعـی عیسـای کێشـا بە سـەر ئەو یەهووزایەی کە دەیویست عیسای بکوژێ. دەو کاتەدا یارانی عیسـا (حواریـون) کە خەبەریـان بۆوە یەهووزایان بە عیسا زانی، یەهـووزاش کە عیسـای نەدی هـاتە دەرەوە لە هـۆدەکە کـوتی: ئەرێ عیساو نەدی، عیسا لێرە نیـیە. فەرمانـدە و سـەرۆکی تیرۆرچیـانی عیسـا واتە نێردراوانـی یەهووزا کە چاوی بە یەهووزا کەوت کوتی ئەوەیە عیسا بیگرن و بیکوژن. هەچەنـدی یەهـووزا کوتی ئەمن یەهووزام و عیسا نیم، گوێیان نەدایە و کوشتیان. کوتیـان ئەگەر ئەتـۆ عیسـا نـی و یەهووزای، عیسا کوا؟! یەهووزاش کوتی: ئەی ئەگەر ئەمن عیسام، یەهووزا کوانێ؟ جا ئەوەیە ﴿وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ واتە خودا باشترین پاداشدەرەوەی فێڵبازانە.

ئەگەر بە چاوی حەقبین سەیری ئەو جەریانە، وەک جەریانی حەزرەتی محەمەدﷺ وایە کە لە شەوی کۆچیا بۆ مەدینە کە چیها شەمشێر بە دەست لە لاوانی قوڕەیش لە دەوری ماڵێـدا بـۆ کوشتنی وێستابوون، هەر لە ئێوارێوە تا بەیانی چاوەڕوانی هەل و دەرفەتی کوشتنی محەمەدیان دەکـرد کەچـی پێغەمـبەر لە نیوەشـەودا لە بەرچـاوی ئەو ڕەشـەکوژانە هـاتە دەر و بەرەو مـاڵە حەزرەتی ئەبووبەکر، لەوێوە ڕۆیین دوو بە دوو، نەیشـیانزانی؛ کە قورئـان نـاتیقە بەو حـاڵەتە و

دەفەرموێ:

**وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ**

**(یادی ئەو کاتەش بکەوە) کە ئەوانەی کەوا بێبڕوان پیلانیان لە دژت دەگێڕا تاکوو داتمرکێنن بە کۆت و زنجیر پابەند کردن، یا بتکوژن یا دەرتکەن، ئەوان پیلان دەگێڕن و خوداش نەخشە و پیلان دەکێشێ، خودا چاکترین نەخشەکێشە.**

مەکر دە زاراوەدا بە واتای تێکۆشان بۆ شەڕ و ئاژاوە و فەسادکاری دە ژێر پەردەی ڕەش و تاریکدا. عەرەب کە دەڵێن «مکر اللیل» واتە شەوەزەنگ و تاریکی بڵاو کردەوە. «امکر» واتە تاریک بوو، داری پڕ لک و گەڵا و پێچ پێچ پێی دەکوترێ «ممکور» و هەر بە ژنی پڕ لە بەند و باو دەکوترێ «امرأة ممکورة» واتە ژنێکی مەکراوی. (روح المعانی، ٢٣٦/٣؛ تفسیر کبیر، ٦٩/٨)

**فەرق لە نێوان مەکر و حیلە:**

حیلە بۆ بەیانی ئیشێکی سەخت و گران بێ قەستی زەرەر دەکار دەکرێ. ئەمما مەکر تەنیا بۆ زەرەر بە کار دەبرێ.

دڵ ڕادەچەنێ و دادەمێنێ لەوە کە سیفەتی مەکر وەپاڵ خودا دەدەرێ. دڵ دەناو داماویدا دەمێنێتەوە تا بە وڵامێکی حەکیمانە قانع دەکرێ. بۆ وڵام ڕوو دەکەینە تەفسیری «تبیین الفرقان، ج ٥ لاپەڕەی ٥٢٩» دەوێدا ئاوا وڵام دراوەتەوە:

ئەو مەکرەی دووهەمی ئایەتەکە کە دەدرێتە پاڵ خودا، بەڵکە بە مانای تەدبیری ڕێکوپێکە کە بە هۆی ئەو تەدبیرە ڕێکوپێکە مەکری ئەوەڵ کە بە مانای فێڵ و فووتە بە گژ خودی مەکربازەکاندا دەکرێتەوە. هەر وەک لە ئایەتی ١٤٢ی نیساءدا ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ﴾ «خدع» کە وەپاڵ خودا دەدرێ بە مانای فێڵ نییە بەڵکە بە گژدا کردنی فێڵی فێڵبازانە بە فێڵبازەکان. عەللامە عضد و عەللامە ابهریش ئەو بۆچوونەیان هەیە.

هەرچەند ئیمام فەخری ڕازی بەوەی ڕازییە وەپاڵدانی مەکر وەلای خودا لەو شوێنانەدا، چونکە ئەو ئاوای تەعبیر لە مەکر داوەتەوە: «ایصال المکروه الی الغیر علی وجه یخفی فیه» واتە بەگژدا کردنی بەڵا و زەرەر بە کەسێک کە ئەو کەسە بێخەبەر لەوە بێ. یا دەڵێ: مەکر بە واتای «تدبیر محکم» هاتووە، وەپاڵدانی تەدبیری موحکەم وەلای خودا بێ گرێوگۆڵ و

ئیشکالە.

بە کورتی و بە کوردی، زانایان دژی ئەوەی نین وەپاڵدانی ئەو واژانەی مەکر و خودعە وەلای خودا مانای (وَاللُّه خَيْرُ الْمَاكِرِينَ =وَاللُّه خَيْرُ الْـمدبرِينَ) ئەگەر ئاوا مانا نەکرێن ڕەوا نییە وەپاڵدانیان وەلای خودا. (تبیین الفرقان، ج ۵)

ئیمام فەخری ڕازی ئەو بۆچوونەشی لە سەر وەپاڵدانی مەکر وەلای خودا ڕاناوە: مەکر کە بریتییە لە حیلە داڕژتن بۆ ئیجادی شەڕ، ئەوە بە نیسبەتیخ ودا محاڵە چونکە خودا شەڕ بە عەبد نافرۆشێ، کەوایە دەبێ بکوترێ: مەکر لە بابەت خوداوە لە موتەشابیهاتە، واتە لە سەر ئەسڵی مانای خۆی دەبێ لابرێ، بخرێتە سەر مانایەک کە بتواندرێ وەپاڵ خودا بدرێ وەک ئەوە: خودا سزای مەکری مەکر داناوە لە سەر ئەساسی ئاماژەی ئایەتی ۴۰ی شووڕا: ﴿وَجَـزَاء سَـيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا﴾ واتە تۆڵەی خراپە هەر خراپەیەکە وەک خۆی؛ یانی هەڵسوکەوتی خودا دەگەڵ فێڵبازان وەک فێڵ دیاری دەدا بۆیە بە فێڵ ناو دەبرێ. دەنا دە ڕاستیدا تەدبیر قایم و قۆڵ و ڕێکوپێکە خودا دەینوێنێ دە بەرابەر حیلەگەر و فێڵبازاندا.

دەبێ ئەوە قبووڵ کرێ و بسەلمێندرێ کە ئەوانەی جاڕچی و بانگەوازچی ئاسایش و سەعادەتی جامیعەن واتە گەل، دەبێ لە سەر مافی ژیانی دابین کرێ و وەحەسێ وەک پێغەمبەران و پەیڕەوانیان، هەمیشە بە هۆی ئەو هاوارە ڕەوا و بەحەقەی کەوتوونە بەر پەلامار و هێرشی وەحشیانەی زۆرداری (تاغووت و جبت و مترفینان) و بێباوەڕ و دوژمنانی خودا و ئینسان؛ لە ژێر ئازار و ئەزیەت و ڕەشەکوژی و ئاوارەیی و بەند و ئیعدام و دەربەدەریدان بە هۆی داد و ناڵەی مەزڵوومان ئاسمان و زەوی وەئامان هاتووە، دەبێ ڕۆژی قیامەت کەی بە هاوار بگا؟! ئەمما حیکمەت و قەزای باریتەعالا وەک ئەوەی دەچێ کە خێر و بەرەکەت و حەسانەوە لە نێو وڵات و گەل و کۆمەڵ بار کا و نەمێنێ، دووکەڵ و چڕەچەمانی باڕووت و مووشەک و ناپاڵمی بێئابڕووان بەری ئاسمانی ساف و ساوی ڕەحم و بەزەی داپۆشێ وەک ئەوڕۆی وڵاتی سووریە و ئێراق و یەمەن و ... کە ئارامگە و جێڕاوگەی پێغەمبەران و پاکان و چاکان بووە. جا ئەو خودای حەکیم بۆ ڕاماڵدان و ڕانانی ئەو کوێرەمژە و تەمتوومانە نارەوایە پیاوانی بەجەرگ و هەڵکەوتووی ناو گەلان ڕاپەڕێنێ و هەستێنێ بە دەنگی بەرزی پڕ لە دادگەری و شێرانەی گەل وەخەبەر بێنێ و لە خۆی کۆ وەکا، بێباکانە بەرەنگاری تەجاوزکاران وەبێ. دیارە هەر بزووتنەوەیەک نیازی بە یارانی ڕاست و باوەفا هەیە، تاکوو

بتوانێ دە کاتی سەختی و سەخڵەتی و تەنگانەدا خۆ وەگیرسێنێ و خۆ نەدۆڕێنێ. دیارە هیچ هاوارێک بێ دژ و بەرهەڵست نابێ هەر وەک هیچ ڕێبەرێک بێ دوژمن نابێ. جا لە سەر ئەو ئەساسەیە قەرن دەگەڵ قەرن و دەور دەگەڵ دەور خودا پێغەمبەر و ڕێبەری هێناون و ناردوونیە ناو عالەم. جا لە سەر ئەو یاسا ئەساسییە ڕازدارەی پەروەردگار حەزرەتی عیسا سەر هەڵدەدا.



دەنگۆ هەیە لە سەر حەزرەتی عیسا کە نەمردووە و دووبارە لە ئاخری دنیادا سەر هەڵدەداتەوە، چ بە ناوی پێغەمبەر چ بە ناوی ئۆمەتێک لە ئۆمەتی محمد المصطفی، ئەگەرچی قورئان ناتیقە بەوەی پاش پێغەمبەری ئاخر زەمان کە محەممەدە، پێغەمبەر نایەن چونکە خاتەمی پێغەمبەرانە ئەو.

با بۆ ئەو بابەتە سەرێک لە دنیای ئەقڵ و زانست و مێژووی یەهوود و نەسارا و لۆغەتزانانی عەرەب هەڵێنین، ئەوە ڕوون و ئاشکرایە کە تەواوی لۆغاتی زمانی عەرەب شاهیدییان داوە لە سەر ئەوەی کە کاتێ ئینسان هەجەلی ژیانی تەواو بوو ڕوحی خوداپێداوی لێ وەرگیراوە، کەلیمەی «وەفات»ی لە سەر دەندرێ و پێی دەکوترێ وەفاتی کرد و مرد؛ و هەروا بە دەلیلی ئایەتی ۴۲ی سوورەی «زمر» دە کاتی خەوتن و نوستنیشدا کە مەرگی چکۆلەیە بە «وەفات»ی ناو دەبرێ.

**اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ**

**خودا گیانەکان دەکێشێت لە کات و ساتی مردنیاندا، گیانی ئەوانەش بە ڕواڵەت دەکێشێ کە نەمردوون وێستا، بەڵکە دە خەودان، ئەوجار گیانی ئەوانەیان وەردەگرێ کە هەجەلی هاتووە و بڕیاری مردنی لە سەر دراوە، ئەوانی تریان ڕەها دەکا، تاکوو کاتی دیاریکراو، بەڕاستی ئا لەو کارەدا بەڵگەی زۆر هەن بۆ ئەو گەل و هۆزانەی ڕادەمێنن.**

«حافظ ابن تیمە»: دە لۆغەتی عەرەبدا «توفّی» واتە «قبض روح»، وەرگرتنەوەی ڕۆح.

«شیخ الهند»: «متوفیک» ئایەتی ۵۵ ئالی عیمران بە مانای قەبزی ڕۆح تەعبیری کردۆتەوە.

دە تەفسیری «در منشور»دا حەرزەتی ابن‌عباس ئاوای فەرمووە: (انّی متوفّیک و رافعک) دەبێ پاش و پێش بکرێ، واتە (رافعک) پێش (متوفیک) کەوێ چونکە (متوفیک) بۆ ئاخر زەمانە (ج ۳۶/۳). ئەودەم تەعبیری ئایەتەکە ئاوای لێ بە سەر دێ: ئەی عیسا بۆ لای خۆمت

بەرز دەکەمەوە، دە ئاخری دنیاشدا بە مەرگی ئاساییت ڕۆح دەکێشم.

ئەگەر بە وردی سەیری ئەو تەعبیراتانەبکرێ، هەست بەوە دەکرێ خودا وەک باقی پێغەمبەران عیساشی تووشی هیجرەت کردووە لە سەر زەوی بۆ ئاسمان، هەر وەک حەزرەتی ئیبرایمی لە عێراق بۆ شام هیجرەت پێ کرد، مووسای لە میسر- بۆ لای شام بەڕێ کرد، حەزرەتی محەمەدی بۆ مەدینە هیجرەت پێ کرد، عیساشی لە سەر زەوی بۆ ئاسمان هیجرەت پێ کرد، واتە تەواوی پێغەمبەرانی بە دەس قەوم و هۆزی ناحالّی و بێباوەڕ تووشی ئەزیەت و ئازار و هەڵاتن کردووە، یا قەومەکانی بێ سەروشوێن کردوون وەک قەومەکانی عاد و ثمود و لوت و صالح و ... ئەمما ئەو پرسیارە دێتە پێشێ دەو کارەساتەی هیجرەتەدا: بۆ حەزرەتی عیسا هیجرەتی بۆ ئاسمان پێ کرد زیادە لە پێغەمبەران؟! بۆ وڵامەکەی دەبێ ئاوا بکوترێ: هاتنە دنیای عیسای وەک هاتنەی دنیای ئینسانی عادی ناچێ، بەڵکە خودا بۆخۆی دەفەرموێ: وەک حەزرەتی ئادەمم عیسا دروست کرد، واتە ئادم بێ دای و باب، عیساش بێ باب؛ بەو پێیە دەبێ عیسا مردنیشی لە سەر ئەساسێکی عەجیب و غەریب بێ، وەک مردنی بەنیئادەم نەچێ، ئەگەر ڕۆیی تا قیامەت هەڵنەستێتەوە بەڵکە دەبێ بە پێی حیکمەتی پەروەردگار پاش هەزاران ساڵ دووبارە بێتەوە سەر زەوی و ماوەیەک وەمێنێ و جا پاشان وەک عالەم تووشی مەرگی تەبیعی بکرێ.

جگە لەوەش ئایەتی ﴿إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ﴾ بە ئاشکرایی هاوار دەکا وەلای خودا نەبوونی عیسا بەو دەلیلە وەپاڵدانی وەفات وەلای عیسا دەیسەلمێنێ کە عیسا ئینسانە و سەرەنجامی مەرگ و نەمانە.

با لەو بارەوە سەر هەڵێنین لە ئیمام فەخری ڕازی لە تەفسیرەکەی ج ۲ لاپەڕەی ۴۸۱ تاکوو بزانین ڕا و بۆچوونی چۆنە و دەڵێ چی؟

ئەو دەڵێ: پاش و پێش کردنی ئایەتی ﴿إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ﴾ بۆ ئاوڕدانەوە وەلای داهاتوویە: ئاخر زەمان؛ ئەگەر بشبێ، ئەوجار ئەگەر بەرجەوەندی و وردبوونەوە دەگەڵ ئایەتەکە دەکار کرێ، بە ڕوونی ئەو هەستە دەکرێ کە ئەی عیسا تۆمان بۆ لای خۆمان بەرز کردەوە دەیجا ئەو بەرز کردنەوە ڕوح نییە بە تەنیا چونکە عیسا واتە لەش و ڕوح، کەوایە عیسای ڕوح و لەش بەرز کراوەتەوە وەلای خودا، و هەروا دەشکرێ مانای ئەو بەرز کردنەوەی کە لە واژەی (رفع) وەردەگیرێ بە مانای پلە و پایە و مەقام و شەئن بێ، هەر وەک لە ئایەتی ۱۱ی سوورەی

مجادلە و ١٦٥ی ئەنعامدا (رفع) بە مانای مەقام و پایە تەعبیر کراوە:

**يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ ﴿١١﴾ مجادلة**
**خودا چەندین پلە و پایەی ئەو کەسانە بەرز دەکاتەوە لە ئێوە کە بڕوا و ئیمانیان هێناوە و ئەو کەسانەش کە زانیارییان پێ بەخشراوە.**

**وَهُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلاَئِفَ الأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ ﴿١٦٥﴾ انعام**
**خودا هەر بۆخۆیەتی ئێوەی کردووە بە جێنشین لە زەویدا، هەندێکتانی بەرز کردۆتەوە بە سەر هەندێکی دیدا، لە پلە وپایەدا.**

ئەوجار ئاوای بۆ بچین و بڵێین (رفع) بە مانای بەرزی دە شەئن و مەقامدایە، ئەوە بە مەجاز دەبێ، دەیجا لادان لە مانای واقعی وەلای مانای مەجاز بێ دەلیل دەمێنێتەوە دێرەدا واتە چ زەروورەت و پێویستێک ناچارمان دەکا بۆ لای ئەو مەجازە؟ چونکە کاتێ کەلیمەی (ألِيّ) دەکوترێ بەرگری لە خەتی مەجازی دەکرێ بەبێ دەلیل دەمێنێتەوە بۆو بازدانە لە ڕاستی بۆ لای مەجازی، جگە لەوانەش بە ئایەتی ١٥٧ی نیساء کوشتنی حەزرەتی عیسا ڕەد دەکرێتەوە، مانی و نەجاتی لە کوشتن بە یەقین دەگا؛ ئەوەش ئایەتەکە:

**وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلاَّ اتِّبَاعَ الظَّنِّ وَمَا قَتَلوهُ يَقِينًا**
**بە هۆی ئەو قسەشیانەوە کە ئێمە عیسای کوڕی مریەمەی خودامان کوشت، نەخێر نە کوشتیان و نە هەڵیانواسی، بەڵکوو لێیان گۆڕدرا و سەریان لێ تێک درا، بێ‌گومان ئەو کەسانەی کە سەبارەت بە عیسا تووشی ناکۆکی هاتن هیچ گومانیان تێدا نییە دەربارەی ئەو لە گوماندان، سەبارەت بەو هیچ زانیارییەکیشیان نییە بێجگە لە دواکەوتنی گومان، هیچ گومانی تێدا نییە کە نەیانکوشتووە.**

**تیوتیوەیەک لە بابەت بۆچوونی یەهوود و نەسارا و موسوڵمان لەمەڕ مان و نەمانی حەزرەتی عیسا:**

١. لە سەراسەری مێژووی بەسەرهاتی حەزرەتی عیسادا هۆزی یەهوود بۆچوونیان ئاوایە: کە حەزرەتی عیسا لە دار دراوە و کوژراوە، دە حاڵێکدا قورئان ناتیقە بە وەسیلەی ئایەتی ١٥٧ی

نیساء کە حەزرەتی عیسا لە دار نەدراوە و نەکوژراوە و هەروا بە وەسیلەی ئایەتی ٥٢ی ئالی عیمران قسەی یەهوود ڕەد کراوەتەوە لە بابەت کوشتن و لەدار دانی عیسا، بەڵکە لە خۆیان لە باتی عیسا بە هەڵە یەکیان کوشتووە.

٢. نەسارا دەڵێن چی و بۆچوونیان چۆنە لەو بارەوە؟ ئەوان ئاوای بۆ چوون کە عیسا لە دار دراوە و کوژراوە ئەمما وەگیان هاتۆتەوە و بەرەو ئاسمان بەرز کراوەتەوە.

٣. موسوڵمانەکان بە پێی ئایین و کتێبە ئاسمانییەکەیان کە قورئانە بۆچوونیان چۆنە لە بابەت عیساوە؟ ئایەتەکانی بابەت کە ئەساسنامەی ئایینی ئیسلامن بە ڕاشکاوی ئیقرار بەوە دەکەن کە حەزرەتی عیسا هەر بە زیندوویی خودای تەعالا لە دەس یەهوودیانی نەجات دا و بەرزی کردەوە بۆ لای خۆی بۆ ئاسمانەکان، تا کاتی خۆی لەوێ دەمێنێتەوە پاشان گۆیا بۆ ناو یەهوود دەگەڕێتەوە، ئەوە باوەڕی گەل و ئۆمەتی ئیسلامێکە کە پەیڕەوی قورئانە. حافظ ابن حجر دە تلخیص‌دا لاپەڕەی ٣١٩ بە درێژی ئەو باسە ئاوا دەخاتە ڕوو.

حافظ ابن کثیر دە تەفسیری ئایەتی ٦١ی سوورەی زخرفدا دەڵێ: (إِنَّهُ لَعِلْمٌ لِلسَّاعَةِ) دەلیل و بەڵگەیە لە سەر دووبارە دابەزینەوەی عیسا بۆ سەر زەوی لە ئاخر زەمانـدا بۆ ناو هۆزی یەهوود. ئەگەرچی زۆربەی موفەسیرەکانی دیکە دەڵێن: ئەو ئایەتە دەگەڵ حەزرەتی محمد المصطفایەتی، «ه»یی «أنّه» بۆ محمد المصطفی دەگەڕێتەوە نەک بۆ عیسا.

کاتی ئەوەی هاتووە بۆ ئیسباتی ئەو بابەت و مەبەستانەی باسمان لێ کردن بچینە خزمەت ئایەتی ٥٥ی ئالی عیمران:

**إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ الَّذِينَ اتَّبَعُوكَ فَوْقَ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ**

**یادی ئەو کاتەش بکەوە کە خودا فەرمووی ئەی عیسا ئەمن تۆ دەبەمەوە بەرزت دەکەمەوە بۆ لای خۆم، پاکت دەکەمەوە لە پیسی ئەو کەسانەی کە بێباوەڕن، شوێن کەوتووانت بە هێز و گوڕ بەرز دەکەمەوە، بە سەر ئەو بێبڕوایانەدا، هەتاکوو ڕۆژی دوایی، پاشان گەڕانەوەتان هەر بۆ لای منە، لە ئەنجامدا بڕیار دەدەم لە بابەت ئەو شتانە کەوا لە سەری کێشە و هەراتان بوو.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی پیرۆزی ٥٥:**

خودای حەکیم پاداشی فڕ و فێڵەکەی دانەوە و خستنیە هەڵە و ئیشتباهات دە کاتێکدا کە بە پێغەمبەرەکەی خۆی کوت خودا: ئەی عیسا ئەمن گیانت دەکێشم لەو کاتەیدا کە دامناوە و دیاریم کردووە بۆ گیانکێشانت، و لە پاش مردنت گیانی پاکت بۆ لای خۆم بەرز دەکەمەوە، ئەوە ئەو مزگێنییە دەداتە عیسا کە لە کوشتنی جوولەکەکان نەترسێ، و هەر وا خودا بە عیسا دەفەرموێ: پاککەرەوە و ڕزگارکەری تۆم لە ئێش و ئازار و ئەزیەتی ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون بە تۆ، و هەروا دووبارە خودای مەزن ئەو مزگێنییەش دەداتە عیسا و دەفەرموێ ئەی عیسا هەواداران و پەیڕەوانی تۆم بەرز کردۆتەوە بە سەر بێبڕواياندا، یانی ئەوانەی کە تۆی عیسا بە بەندەی خودا و بە پێغەمبەری خودا دەزانن، بەرزم کردوونەتەوە بە سەر ئەوانەی کە تۆی عیسا بە کوڕی خودا یا بە خودا دەزانن، و ئەو بەرز کردنەوەی پەیڕەوانت بە سەر بێباوەڕاندا تا ڕۆژی قیامەتە دوایی پێ دێ، ئەو بەرز بوونەوەش بەرز بوونەوەی گیانییە واتە ئەوانەی لە سەر ئاکار و ڕەفتار و ڕەوشت و خوو و ئادابی دینی تۆ بێ، گەلێ بەرز و بەڕێزترن لەوانەی کە بێبڕوان بە تۆ. سەرەنجام بۆ لای منە، گەڕانەوەی هەموو لایەکتان، واتە عیسا و پەیڕەوانی و بێبڕوایان، پاشان بە پێی یاسای خودایەتیم حوکم دەکەم لە ناویانا، بەڕاستی ئی ئەو شتانەی کەوا کێشەیان لە سەرە.

زانایانی قورئان لە سەر لەفزی (متوفی) تا هەشت جۆرە نەزەریان دەربڕیوە و ڕاناوە، هەموو نیشانەی ئەوەیە کە لوغاتی عەرەبی هەڵدەگرێ بۆ چوونی زۆر:

١. ابن ابی حاتم ئەویش لە قەتادەوە نەقڵ دەکا ئەو ئایەتە بۆ مانای ڕاستی دەبێ پاش و پێش کرێ واتە (رافعک) پاشان (متوفیک): (يَا عِيسَى إِنِّي رَافِعُكَ ومُتَوَفِّيكَ) تفسیر ابن ابی حاتم، ١٥٨/٢

٢. (إِنِّي مُتَوَفِّيكَ) واتە (مستوفی اجلک و مقیک حتف انفک لا اسلط علیک من یقتلک) واتە خودا بە حەزرەتی عیسا ئاگاداری دەدە کە خودا ئەجەلی ئەو تەواو دەکا و مەرگی تەبیعی تۆ کامڵ دەکا نەک کافران و بێباوەڕان بتوانن گیان لە تۆ بستێنن.

٣. مانای (إِنِّي مُتَوَفِّيكَ) واتە (انّی قابضک و متوفی شخصک من الارض) واتە من گیانی تۆ بە تەواوی وەردەگرم و شەخسی تۆش لە سەر ئەرز خڕ دەکەمەوە بەرەو ئاسمان.

٤. جەنابی ڕەبیع کە یەکێکە لە قورئانزانان، نەزەری وایە (توفی) بە واتای مەرگ نییە،

بەڵکە بە مانای خەوە، واتە مەرگی چکۆلە.

٥. مانای وەفات دەو ئایەتەدا عەینی وەفات نییە بەڵکە بە مانای چەشنی وەفاتە، یانی خودای تەعالا بە عیسای فەرموو، وەک کەسانێکی کە دەمرن پاشان مردنیان خێر و شەڕیان لە سەر زەوی کۆتایی پێ دێ، هەر وا بەو شێوەیە بە بردنی تۆ بۆ ئاسمان ئاساری تۆ ئاوای کۆتایی پێ دێ لە سەر زەوی.

٦. واژەی (توفی) دەو ئایەتەدا بە مانا جەمعە یانی خودای تەعالا بە عیسا دەڵێ ئەمن ئەتۆ بە تەواوی ئاسارتەوە دەبەم بۆ ئاسمان، تاکوو کافران نەتوانن لە هیچ بارێکەوە زیان بە تۆ بگەیێنن.

٧. هەندێک دەڵێن مەبەست لە (توفی) واتە وەفاتی شەهوانییە، یانی خودا بە عیسا دەڵێ ئەمن بۆوەی بتوانی دەگەڵ عالەمی مەلەکووت وەحاوێی لە هێزی شەهوانیت بە تەواوی پاک دەکەمەوە، واتی نهێنی تۆ دەروونی تۆ لە خەیاڵاتی فاسد خاوێن دەکەمەوە.

٨. مانای (إِنِّي مُتَوَفِّيكَ) یانی (متوفی اعمالک اولا و آخرا و رافعک یوم القیامة الي) واتە ئەعمالی تۆ ئی پێش چوونت بۆ ئاسمان، ئی پاش دابەزینت دووبارە بۆ سەر زەوی، کۆ دەکەمەوە و ڕۆژی قیامەت ئەتۆ لە لای خۆم بەرز دەدێرم و بەرز ڕادەگرم.

وا دیارە ڕا و بۆچوونی دیکەش هەن لەو بارەوە، بەڵام بەرچاوترین ئەوانەن کە کوتمان. (روح المعانی، ٢٣٧/٣)

**وڵامی چەند پرسیارێکی بێباوەڕان لەو بارەوە:**

(بێباوەڕ دێرەدا واتە مونکیری ڕاستی)

١. دیارە وەک هەموومان دەزانین خودای تەعالا بە پێی ئیشاراتی ئایەتی ٨٧ی بەقەرە ﴿وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ...﴾ واتە بە هۆی جوبریل پشتمان گرت وبەهێزمان کرد، حەزرەتی عیسای لە هەر بارێکەوە هێز داوەتێ. ئەدی ئەگەر وایە و واشە، بۆچی کافران کە دە خەیاڵی کوشتنی عیسادا بوون خودای تەعالا جبرەئیلی دەستوور پێ نەداوە بە هاواریەوە بچێ و دوژمنانی لە بەین بەرێ؟

بەڵێ، خودا دەیتوانی وا بکا، بەڵام بۆیە وای نەکرد تاکوو موعجیزەی پێغەمبەران بە کەماڵ بگا.

٢. کاتێ خودا ئەو توانایەی بە حەزرەتی بەخشیبوو کە مردوو وەژیێنێ و گول و کەچەڵ

چاک وەکا، چۆن حەزرەتی عسا توانای ئەوەی نەبووە دە بەرابەر یەهوودیان دیفاع لە خۆ بکا؟

بەڵێ، دەیتوانی، ئەمما بۆیەی ڕێ نەدرایە دیفاع لە خۆ بکا لەو بارەوە تا موعجیزەکەی بە کەماڵ بگا.

۳. کاتێ خودای تەعالا عیسای لە دەس یەهوودیان ڕزگار کرد و نەجاتی دا، چ نیازێک هەبوو یەکی دیکە وەک عیسا وەڕازێنێ تاکوو یەهوودییەکان بە هەڵە بیکوژن؟

دەبێ دێرەدا بکوترێ: ڕاز و سڕی خودا بە خۆیەتی، و ئەوەش دەکوترێ: حەواریون کە تایبەتی عیسان دەگەڵی بوون لەو هۆدەدا کە نیازی کوشتنیان لێ کردبوو لەو بارەوە و بێگومان بوون کە عیسا دەوێدایە و نەیکەنە گومان، و ئەوانەی کە لە دەرەوە بوون چاوەڕوانی حاڵ و ئەحواڵی عیسا بوون داخوا سەرنویشتی بە کوێ دەگا! یەقین پەیدا کەن کە عیسا بە دەستەی یەهوودیان کوژرا، چونکە ئەگەر بە حەواریون کوترابا: عیسایان برد بۆ ئاسمان بە زەحمەت بوو باوەڕ بکەن، هەر بە شوێنیدا دەگەڕان، ئەمما بە کوشتنی هاوچەشنەکەی ئەو ئیحتیمالە لە خەیاڵی حەواریون چۆ دەرێ.

۴. بۆچی سەرپەرستی تیرۆرچییەکان بە شکڵی عیسا دەرهات و ئەو کوژرا؟

دەبێ بڵێین تاکوو ئەرشەدی تاوانچی و خیانەتکار بە سزای ئەعمالی خۆی بگا.

۵. دووبارە تاکوو ئەو سەرپەرستە بە دەستی گەلی خۆی بکوژرێ و ڕیسوا کرێ ئەگەر بێتوو سەرنج بدەیە مێژووی ژیانی خائینان، هەر بە دەست ئەو گەلەی کوژراون کە خەیانەتی پێ کردوون.

ئایەتی ۵۵ی ئالی عیمران ئەوەی لێ هەست دەکرێ کە خودای تەعالا بە مژدەی بەرچاو عیسا ئاگادار دەکا، سەیر کە ئەو مژدانە عەلەیهی یەهوودییان.

۱. جوملەی ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ﴾ی ۱۵۷ی سوورەی نیساء نیشان دەدا کە عیسا بە دەستی یەهوود نەکوژراوە و ناکوژرێ.

۲. جوملەی ﴿رَافِعُكَ إِلَيَّ﴾ نیشان دەدا کە عیسا زیندووە و نەکوژراوە.

۳. جوملەی ﴿وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ نیشان دەدا کە عیسا لە تۆهمەتی کافران وەدوور خرا.

۴. جوملەی ﴿وَجَاعِلُ الَّذِينَ اتَّبَعُوكَ﴾ نیشان دەدا کە تا قیامەت حەواریون بە سەر یەهوودا پیرۆزە.

٥. جوملەی ﴿إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ﴾ ئەوە نیشـان دەدا کە دادگـای عیسـا و یەهوودیان دەکرێ لە لای خودا ڕۆژی دوایی.

**لە بابەت ئایەتی ﴿ وَجَاعِلُ الَّذِينَ اتَّبَعُوكَ فَوْقَ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ﴾**

دوو بۆچوون هەیە، ضحاك و محمد ابن آیان کە هەر دوو لە قورئانزانانەکانن بۆچوونیان وایە: تابعین و حەواریـون نەک هەمـوو مەسـیحی، هەنـدێکیش بۆچوونیـان وایە: تـابعین واتە محمد المصطفى و ئۆمەتی. ئەو بەرزییەش لە دەلیـل و بەڵـگە و بورهانـدایە، یـانی دەلائیلـی حەقانیەتی قورئان و محەمەد و ڕیسالەتی، بە سەر مونکیران و موخالیفاندا سەرکەوتوویی هەیە.

دەبـێ ئەوە بزانـدرێ و باوەڕیشـی کـرێ کە خـودای تەعـالا دەفەرمـوێ دە ئـایەتی ٥٥دا گەڕانەوەی هەمووتان بۆ لای منە، ئەوە ئیسباتی ئەوەیە کە لە نێوانتانـدا داوەری و دادگـایی ئەو کێشە و دووبەرەکییەشتان دەکەم تا بۆتان بە یەقینی دەرکەوێ کامتان ڕاستن لە باوەڕ و ئیمانـدا؟ کامتان ناڕاستن؟ جا بۆ تەئیدی ئەو مەبەستە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٥٦ی ئالی عیمران:

> **فَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُواْ فَأُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ ﴿٥٦﴾**
> **جـا ئەو کەسـانەی بێبـڕوان سـزای تونـدیان لە دنیـا و پەسـڵاندا دەدەم، هـیچ جـۆرە یارمەتیدەرێکیشیان نییە.** ئالی عیمران

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە سیما و ناوەندی ئایەتی پیرۆزی ٥٦**

واتە ئەوانەی لە جوولەکە و لە گاور بێبـڕوا بـوون بەو یاسـا و دەسـتووراتەی کە لە لایەن حەزرەتی عیساوە پێیان ڕادەگەیی، سزایان دەدەم بە سزایەکی سەخت و گران، هەم لە دنیادا هەم لە ڕۆژی ئاخرەتدا، و هیچ کەسێکیش نییە بتوانێ کە بە هانایـانەوە بـێ و یارمەتییـان بـدا. بەڵام ئەوانەی کە خاوەن ئیمانن و بڕوایان بە پێغەمبەرایەتیی تۆی عیسا هێنـاوە و دەگەڵ ئەو ئـیمان و باوەڕیش بە پێی باوەڕەکەیان کردەوەی باش و ڕەوا و پەسندیان بەجێ هێنـاوە، خـودای دادگەر پـاداش و بەهـای ئەو کـرداره پاکانەیـان بـێ کەم و کـووڕی دەداتەوە، وەک لە ئـایەتی ٥٧دا فەرموویەتی، و چـونکە ئایەتەکـانی ٥٧ و ٥٦ و ٥٨ بە یەکەوە چەسـپاون لە بـابەت و مەبەسـتدا دەچینە خزمەت ئایەتی ٥٧ و ٥٨ تا مەتڵەب بە ڕوونی بێتە بەر چاو:

> **وَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ الظَّالِمِينَ ﴿٥٧﴾**

بەڵام ئەوانەیان کە وا بڕوا و ئیمانیان هێناوە و کار و کردە چاکەکانیان ئەنجام داوە خودا پاداشی تەواویان دەداتەوە، خودا ستەمکارەکانی خۆش ناوێت. ئالی عیمران

ذَلِكَ نَتْلُوهُ عَلَيْكَ مِنَ الآيَاتِ وَالذِّكْرِ الْحَكِيمِ ﴿٥٨﴾ ئالی عیمران

ئەوە ئەو شتانەیە کە دەیخوێنینەوە بە سەرتا، لە بەڵگە و نیشانە و قورئانی پتەو و کاربەجێ.

## تێهەڵڕوانینی ورد لە مەبەستەکانی ئەو ئایەتە پیرۆزانە:

ئەو بەسەرهات و چیرۆکانەی پێغەمبەران لە باسەکانی حەزرەتی عیسا و دایکی ئازیزیشی مەریەمە و دایکی ئەویش (حەننە) کە ژنی حەزرەتی زەکەریا بووە، و هەروا یەحیای کوڕی زەکەریا و هەروا باسی جوولەکەکانی بەنی ئیسرائیل و حەواریونی حەزرەتی عیسا، لە سەر زمانی حەزرەتی جبرەئیل بۆت باس دەکەین و دەخوێنینەوە و هەروا لەو نیشانانەی کە بەڵگەن لە سەر پێغەمبەرایەتی تۆ ـ ئەی محەمەد ﷺ ـ کە بە سرووش بۆت هاتووە، دەنا ئەگەر خودا ئەوانەت لێ حاڵی نەکا، نەخوێندەوارێکی وەک تۆ لە کوێ دەزانێ کارەسات و بەسەرهاتی ڕابردووان، کە لە ئایەتی قورئانی پڕ لە حیکمەت ئەو ئایەتانەن کە دەبێ دەرسیان لێ وەرگیرێ و سەرچاوەی دەرسی عیبرەتن نیشان دراون، و هەروا تا ئۆمەتت بەهرەی لێ وەرگرن، و هەروا بشبێتە بەڵگە لە سەر ئەو وەفدەی نەجران کە لە لای یەمەنی ژوورووەوە هاتن بۆ دەمەقاڵێ دەگەڵتانا لە بابەت عیساوە.

## تیوتیوەیەکی ڕوخساری ئایەتی ٥٦:

بەرهەمی بەرزی شوێنکەوتووانی عیسا بە سەر کافران و هەروا گەڕانەوەی هەمان بۆ لای پەروەردگار، دەبێ ئەوە بێ کە کافران دە دنیادا دوچاری سزای بێئامانن وەک ژێردەستی گەلانی کە بە دایم دانکێشنە ژێر ئازار و ئێش و ڕەنج و لە ئاخرەتیشدا عەزاب دیارە قورس و گرانە لە سەریان، بێ ئەوەی نەجاتدەرێکیان هەبێ. جا بەو پێیە دەبێ بڵێین مەبەست لە تەفەوقی ئایەتی ٥٥ بەرتەری دەستەڵات و هێزە نەک دەلیل و بورهان، و هەروا کافر ئەو بەڵا و عەزابەی دێتە سەری و بەرۆکی دەگرێ لە دنیادا بە ئازمایش و تاقیکردنەوە ناژمێردرێ، وەک بەرەی موسوڵمان.

حەسەنی بەسری فەرموویەتی دەرد و بەڵای سەر کافر بە عەزاب دەژمێردرێ نەک بە ئازمایش، بەڵام دەرد و بەڵای موسوڵمان بۆ ئازمایشە، ئەگەر لە سەری خۆ وەخۆ گرێ دەبێتە

خاوەنی ئەجر و پاداش.

با ئەوەش نەخرێتە پشت گوێ کە بە پێی ئاماژەی ئایەتەکانی ٦١ی سوورەی نەحل و ١٧ی سوورەی غافر دەبێ عەزابی دنیا نەبێ، بەڵکە تۆڵە و سزا و عەزاب هەڵگیرێ بۆ ڕۆژی ئاخرەت، کەچی ئایەتی ٥٦ ئیسباتی عەزابی دنیا دەکا، جا سەیری ئایەتەکان بکە:

**وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴿٦١﴾** نحل

**ئەگەر خودا خەڵکی لە بەر ستەمکارییان سزا بدا ئێستە زیندەوەری لە سەر ئەو زەویەدا نەهێشتبوو، بەڵام وەدوایان دەخا بۆ کاتی دیاریکراو.**

مانای ئەو ئایەتە، مانای ئایەتی ٥٦ی عیمران ڕەد دەکاتەوە.

و هەروا ئایەتی ١٧ی سوورەی غافر سەیر کە ئەویش دژی ئایەتی ٥٦ی عیمرانە:

**الْيَوْمَ تُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ لَا ظُلْمَ الْيَوْمَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿١٧﴾** غافر

**ئەوڕۆ هەموو کەس بە گوێرەی ئەوەی کە ئەنجامی داوە، پاداشی پێ دەدرێتەوە، لەو ڕۆژەدا هیچ ستەمێک نییە، بێگومان خودا زۆر زوو بە حیساب ڕادەگا.**

بۆ وڵامی ئەو ئیشکالە دەبێ بکوترێ: ئایەتی ٥٦ی عیمران کە ئیشارە وەلای عەزابی کافران دەکا دە دنیادا، تایبەتییە و خاسە، ئایەتەکانی ٦١ی نەحل و ١٧ی غافر عامن، واتە گشتین؛ دەشتواندرێ بکوترێ عەزابی کافران دە دنیادا ئەوە بە خاوەن ئیمان ئاوڕی بەخێریان وەسەر نادەن، هاواڵەتیشیان و تێکەڵاوییان لە باری عەقایدیان لە ئەهلی ئیسلام قەدەغە کراوە بە پێی ئاماژەی ئایەتی ٢٢ی سوورەی موجادلە:

**لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءهُمْ أَوْ أَبْنَاءهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُوْلَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ ... ﴿٢٢﴾** مجادله

**هیچ هۆزێک دەس ناکەوێ کە بڕوایان بە خودا و دواڕۆژ ببێ و لە هەمان کاتدا ئەو کەسانەیان خۆش بوێ کە دەگەڵ خودا و پێغەمبەرەکەیدا دوژمنایەتی بکەن، هەرچەند ئەوانە باب و کوڕ، یا برا و هۆز و بەرەیان بن، ئەوانە خودا بڕوا و ئیمانی دە دڵ و دەروونیاندا جێگیر کردووە ...**

بە کورتی، عەزابێک کە بە ئاگری دۆزەخ بێ هەڵگیراوە بۆ ڕۆژی ئاخرەت و عەزابێک کە بە چەشتنی دەرد و بەڵا و ڕەنج و ئازاری دڵ و دەروون بێ، ئەوە دەشکرێ دە دنیاشدا بێ؛ دیارە

دەبێ ئەو باوەڕەن هەبێ کە خودای بانی سەر هەچی دەیفەرموێ خاڵی لە حیکمەت نییە، ئەمما وا هەیە ئەو حیکمەتە دێتە بەر جاسووسی هەستی ئینسان، واش هەیە نایەت؛ و هەچی نەشزاندرا نابێ پێی بکوترێ ڕەوا و دروست نییە.

هەر لە سیمای ئایەتی ۵۷ی عیمران ئەو هەستە دەکرێ کە خودای مەزن وەسفی ئیمانی بە عەمەلی ساڵح و چاک و پاک کرد، دەبێ عەمەلی ساڵح جودا لە ئیمان بێ واتە ئەجزایەکی ئەو نەبێ. ئێمەی موسوڵمانیش ئاوامان سەلیقە پێ شکاوە بە هۆی بەرجەوەندی لە ئایەتەکانی بابەتی ئیمان لە قورئان، کە عەمەلی ساڵح و چاک و پاک هەوێنی ئیمانن و بەشێکن لە ئەو؛ جا کەوایە دەبێ چۆن تەعبیر لە ئیمان و عەمەلی ساڵحی ناو ئایەتەکە وەدرێ، تاکوو تووشی کەند و کۆسپی ئەقیدەیی نەبین. لە سەر نەزەر و بۆچوونی زانایانی قورئان ئیمان و عەمەل لۆغەتەن لێک جیاوازن، دەنا دە واقیعدا باڵا و بەژنی ئیمان و عەمەل وەک سەر و بن وایە، واتە نە سەر بێ بن دەبێ، نە بن بێ سەر دەبێ؛ یانی ئیمانی بێ عەمەل بێمایەیە و عەمەلی بێئیمان لە ڕاست ئیمان بێبنەمایە.

ئایەتی ۵۸ وشەی (ذلک) ئاماژەیە وەلای بەسەرهات و کارەساتەکانی عیسا و زەکەریا و غەیر. دە ئادابی یاسای عیلمی نەحودا (ذلک) دەبێتە موبتەدا، (نتلو من الآيات) دەبێتە خەبەر و دواخەبەر. دەشکرێ بکوترێ (ذلک) واتە (الذي)، (نتلو) سیلەی بێ، و (من الآيات) خەبەری بێ.

هەندێکیش لە قورئانزانەکان لە سەر ئەو بۆچوون و باوەڕەن کە (ذلک) بە تەواوی بۆ بەسەرهات و کارەساتی حەزرەتی عیسا دەگەڕێتەوە، ئەودەم مانای ئاوای لێ دێ: ئەی محەمەد تەواوی بەسەرهات و کارەساتی عیسا بۆ تۆ بەیان دەکەم تاکوو نیشانە بێ. ئەو زانست و بەیاناتەی دەیدەمە تۆ لە سەر ئیسباتی پێغەمبەرایەتیی تۆ. مەسەلەن شەش‌سەد حەوت‌سەد ساڵ پێش زهووری محەمەد، کارەساتی بوونی عیسا و چوونی بۆ ئاسمان و یا کوشتنی، بە کوتەی یەهوودیان ڕووی داوە، پێغەمبەرێکی نەخوێندەواری ناشارەزا لە مێژووی ڕابردووان بتوانێ موو بە موو بێ هەڵە و پەڵە بەسەرهاتی وا عەجیب بەیان بکا، کە سەرچاوەی ئەو زانستانەشی هەر خودا بێ، بۆ دەبێ باوەڕەی پێ نەکرێ؟! نەخێر، بۆ وەی نابێ باوەڕەی پێ نەکرێ؛ بەڵکە دەبێ ئەوە بسەلمێندرێ کەسێکی کە خودا ئاگاداری داتێ وەبگیرێ و قبووڵ بکرێ، بەڵام نەزانی و جەهل بە داخەوە دەرکی بە هەر کەس گرت ناهێڵێ هیچ هەست و شعوورێک ڕوو دە ماڵی

دڵی کا.

جوملەی ﴿وَالذِّكْرِ الْحَكِيمِ﴾ دوو نەزەری زانایانی لە سەرە:

۱. نەزەرێکیان پێی وایە مەبەست دەو جوملەدا قورئانە، بەو دەلیلانە: قورئان پڕ لە حیکمەتە، ناویشی حەکیمە؛ هەر وەک ئایەتی ۱ سوورەی هوود نیشان دەدا و دەفەرموێ:

> **الَر كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ**
> **ئەلف‌لام‌ڕا؛ کتێبێکە کە ئایەتەکانی پتەو کراونەتەوە پاشان لە لایەن کاربەجێ و لێزانەوە بە درێژی ڕوون کراونەتەوە.**

۲. نەزەری دوو کە بۆچوونی هەندێک لە قورئانزانانە: دەڵێن مەبەست لە «ذکر الحکیم» «لوح المحفوظ»ە، کە دیارە سەراسەری کتێبە وەحیەکان لەوێڕانە هاتنیان، خوداش زاناترە لە هەچی زانایە.

خودای تەعالا بۆ ئیسباتی پێغەمبەرایەتی محەمەدﷺ بە گەلی مەسیح و یەهوود لە بابەت حەزرەتی مەسیحەوە ڕوونتر و ڕەوانتری ئاگادار و خەبەردار دەکا لەمەڕ چۆنیەتی سازان و ئاکارەکانی، بە شێوەیەکی عەجایب و سەرسووڕهێنەر کە تازە مونکیران نەتوانن دەلیل لە سەر سەرپێچی خۆیان ڕانێن و بنوێنن، جا بۆ ئەو مەبەست و مەتڵەبە بەرچاوە دەچینە خزمەت ئایەتی ۵۹ ئالی عیمران:

> **إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثِمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾** ئالی عیمران
> **بێ‌گومان نموونەی عیسا لای خودا وەکوو نموونەی ئادەمە، خودا گەڵاڵەی ئادەمی لە گڵ داڕشت پاشان پێی کوت ئادەی ببە، دەس‌بەجێ بوو.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێهەڵڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی پیرۆزی ۵۹**

بەڕاستی چۆنیەتی بوونی عیسا و حاڵی ئەو لە لای خودا، وەک حاڵی ئادەم وایە، کە هەموو دنیا بێ حاشایە لێی، ئیقرار دەکەن و دەزانن کە بەبێ باب و دایک هاتۆتە دی، واتە بێ نێر و مێ لە یەک جووت‌بوون، ڕەپ و ڕوو ڕاستەوخۆ لە خاک بە ئەمری باری هاتووە. پاش ڕاستە و پاستە و ڕوخسار کێشانی لە خاک خودا فەرمووی ببە و بوو و کەسیش جورئەت ناکا پێی بڵێ کوڕی خودا؛ بەڵکە پێی دەکوترێ دەس‌پەروەردەی خودا؛ جا کەوایە یەکێک بێ دای و باب بووبێ، ڕەوا نییە پێی بکوترێ خودا یا کوڕی خودا، چۆن ڕەوایە و ئەقڵ قبووڵیەتی بە یەکێ

بکوترێ کوڕی خودا یا خودا کە بەبێ باب لە دایکی پاکی نازداری بووبێ؟! کـام خـودایە، ئەو خودایە کە بە ئیقراری هەموو عالەمی دنیا ئادەمی بێ باب و دایی ساز کرد و هێنایە ڕوو، دەبـێ ئیقرار بەوەش بکرێ بە باوەڕەوە، عیساش هەر خودای ئادەم بەبێ بابی هێنـایە ڕوو؛ ئەگەر ئـاوا بیر نەکرێتەوە وەکی کوتمان، دەبێ بکوترێ ئادەم خودایە، بۆ خودا ئەو نیزیکترە چونکە بێ باب و دایکە؛ ئادەم خودا لەشی لە قوڕ داڕشت و ڕوخساری کێشا پاشان پێی کـوت بـبە بە ئـادەمی خاوەن گیان و هەست و شـعوور، ئەویـش دەس‌بەجـێ بـوو. دێـرەدا دڵ هەڵـبەزەیەک دەکـا، هەڵبەزەکە ئەوەیە: خودا چۆن بە لەشی ئادەمی قوڕینی بێ هەست و گیان دەڵێ ببە؟! خـۆ ئەو لەشە هیچ نابیسێ؟ ئەمەش دەڵێین ئی چۆن بە کارگی کەفی خاک خودا دەڵێ دا بـبە و بتـۆقە! ئەویش دەبێ و دەتۆقێ! جا کەوایە دەبێ بکوترێ خودا نیـازی بە هـیچ وەسـیلە و ئـامراز نیـیە لەمەڕ ئەمر و دەستووراتەکانی، و دەشبێ باوەڕ کەین کە ئەوەی خودا بە سرووش بە مـحەمەدی ڕاگەیاند لە بابەت بوونی عیسا و مریەم، ڕاست و دروستە، نەک ئەو خەیاڵە پووچ و بـاتڵەی کە گاورەکان لە سەری سوور بـوونەوە و دەڵـێن عیسـا خـودایە، یـا کـوڕی خـودایە، و یـا ئەوەی جوولەکەکان بە خەیاڵ دەڵێن عیسا ـ نەعوزوبیللا ـ لە یۆسفی نەجارە. ئێوە ئەی خاوەن باوەڕان! لە گوماندااران مەبن. لە ئایەتی پێشوودا ڕووناکەکە عیسای کوڕی مەریەمە، بە پاکی و لە داوێنی پاکی مەریەمە هاتۆتە دونیا و کوڕی خوداش نییە.

**سووکە ئاوڕدانەوەیەک:**

دەتوانین خودابوونی عیسا بە دوو دەلیل ڕەد کەینەوە:

١. عیساش وەک ئادەم هەر لەخاک سـازاوە، جـا خـۆ ئەوەش حاشـا هەڵنەگـرە کەسـێک خوڵقابێ بۆ خودا نابێ بەڵکە دەبێ بەندەی خالقی بێ.

٢. خەڵقی عیسا لە خەڵقی ئادەم لە سەرووتر نییە و عەجایبتر نییە، بەڵکە ژێراترە. ئادەم بـۆ خودابوون نیزیکترە چونکە ئادەم بێ باب و دایـی هـاتۆتە بـوونەوە، بەڵام عیسـا هەر بـێ بـاب هاتووە و دایکی هەیە، جا کەسێک لە دایک بووبێ زۆر دوورە لەوەی بۆ خودا بێ.

سیمای ﴿خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ﴾ ئەوەی لێ دەتکێ و هەست دەکرێ کە ئـادەم ڕاسـتە و پاسـتە کرا لە هەوەڵەوە، بۆ گیان دەبەرهاویشتن. جوملەی ﴿قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ ئیشـارەی تەواوە وەلای گیان دەبەر کردن. دیارە ئەوەش بنچینەی بـاوەڕی ئەهلـی ئـیمانە: خـودای حەکـیم بـۆ پێک‌هێنانی شت هیچ نیازی بە ئەسباب و ئامراز نییە، ئەوەی نیازی بە ئەسباب و پلەپلەی شـت

هەیە یاسای ئافەرینشی دنیایە.

دڵ دەکەوێتە ئەو خەیاڵە واژەی (ثمّ) کە دە یاسای عیلمدا بۆ وەئاخر کەوتنە، دەبێ نێوانی ڕاستە و پاستەی ئادەم، تا گیان دە پاڵ خرانی چەند زەمانێکی خایاندبێ؟ لە هەوەڵەوە دەبێ بکوترێ ئەوە دە عیلمی خودادایە و زانینیشی لزوومێکی شەرعی نییە، ئەمما تەفسیری تەبەری تێیدا کوتراوە و دەڵێ ٤٠ساڵی خایاندووە، جا ئەو لە کوێی هێناوە ئەو قسەیە نازانم.

هۆی دابەزینی ئایەتی ٥٩ دڵ دەیهەوێ بزانێ جا بۆوەی دڵ بە دڵشکاوی نەگەڕێتەوە حەول دەدەین وڵامی بدرێتەوە. قورئانزانەکان بە دوو جۆریان هۆی دابەزینی ئایەتی ٥٩ خستۆتە ڕوو.

١. جۆری هەوەڵ ئاوای بۆ چوون: گۆیا هەیئەتێکی نەجرانی بە ناوی وەفدی نەجران لە بابەت حەزرەتی عیساوە کە ئایا چییە و کێیە هاتنە خزمەت حەزرەتی ڕەسووڵ و پێیان کوت وامان بە گوێ گەیوە کە تۆ ئیهانە بە شەخسیەت و مەقامی عیسا دەکەی بەو جۆرەی کە پێی دەڵێی عیسا بەندەی خودایە و خەڵقاوی دەستی ئەوە! دیارە ئێمەش ئەو قسەی تۆمان لە ڕاست عیسایەکی کە پێمان وایە خودایە یا کوڕی خودایە، بە ئیهانەیەکی زۆر گەورە دەزانین؛ حەزرەتی محەمەد ئارام و لەسەرەخۆ ڕووی تێ کردن و فەرمووی: بەڵێ ئەمن عیسا بە بەندەی خودا و ڕەسووڵی خودا دەناسم و دەزانم و کوڕی حەزرەتی مەریەمەی داوێن پاکە کە لە لایەن خوداوە بە هەدیە پێی بەخشراوە، ئێوەش کە پێتان وایە خودایە یا کوڕی خودایە دەلیل و بەڵگە نیشان دەن. وەفدی نەجران لە ڕاست نیشاندانی بەڵگە لە سە رئیدیعایان کۆڵەوار و داماو بوون بە ناچاری ڕوویان کردە یەک و کوتیان: ئەتۆ پێغەمبەرێکی ئاوەها و چەشنی عیسامان بۆ بێنە؟ واتە کوڕێک بێ باب بێتە ڕوو کوڕی خودا نەبێ! ئەدی ئەگەر کوڕی خودا نەبێ، کوڕی کێ دەبێ؟ جا ئەدێرەدایە دابەزینی ئایەتی ٥٩ بۆ سەر حەزرەتی ڕەسووڵ.

٢. جۆری دووهەم لە سەر دابەزینی ئایەتی ٥٩: خاوەنی ڕوح المعانی بە حەواڵەی ئیمامی بەیهەقی دە کتێبی «الدلیل»دا کە لە لایەن «سلمی بن عبد یسوع» ئەویش لە باپیریەوە نەقڵی کردووە کە گۆیا پێغەمبەر نامەیەکی بۆ هۆزی نەسارای نەجران دەنووسێ و بۆی دەنێرێ بەو شێوەیە:

بسم الله ابراهیم و اسحاق و یعقوب، من محمد رسول الله إلَی أُسقُفِ نَجران و أَهل نَجران

إِن أَسلَمْتُم فَإِنِيّ أحمَدُ اللهَ إِلَيْكُم إِله ابراهيم و اسحاق و يعقوب، أما بَعدُ فإِنيّ أدعوكم الى عبادةِ اللهِ من عبادة العباد و أدعوكم الى ولاية الله من ولاية العباد فإِنْ أَبيتم فَالْجَزيَةُ فإِنْ أبيتم فَقَد آذَنتكم بِحَربٍ، والسلام.

کاتێ ئۆسقۆفی ئەعزەمی نەجران نامەی حەزرەتی ڕەسووڵی خوێندەوە تێک هەڵگلا و ناڕەحەت بوو، حاکمی ئەوسەردەمی نەجرانیش کە شرحبیل بن ولاعە بوو کێشایە ناو ڕووداوەکە و لە دووی نارد و نامەکەی دایە و داوای چارەی لێ کرد. واتە چۆن وڵامی ئەو نامەی بدرێتەوە! حاکم شرحبیل بن وداعە کە زۆر پیتۆڵ و تێکەوتوو بوو کوتی: ئێوە هیچ دەزانن کە خودای تەعالا کاتی خۆی وەعدەی بە حەزرەتی ئیبراهیم داوە کە لە بەرە و تۆرەمەی ئەولادی ئیسماعیل پێغەمبەرێک هەڵدەخەم! جا دەبێ ئەو وەعدە بەراورد کرێ. هەڵدەگرێ ئەو نەفەرەی ئەو نامەی ناردووە هەمان کەسە وەعدەدراوەکە بێ. ئەمما لەمەڕ پێغەمبەرایەتی هیچ نازانم تا زیاتر قسەی لێ بکەم و یاریدەتان دەم.

ئۆسقۆف زانایانی نەجرانی بانگ کردن یەک بە یەک داوای چارەی لێ کردن. ئەوانیش هەر وەک حاکمیان وەڵام داوە. سەرەنجام نەزەریان هاتە سەر ئەو بارە کە ئۆسقۆف و شرحبیل و عەبدوڵڵا کوڕی حاکم و حیاری کوڕی قنص و هەروا چەند نەفەری دیکەی لێزان بەرەو مەدینە بێن بۆ باس دەگەڵ خودی پێغەمبەر لەو بارەوە کە ئایا عیسا خودایە یا کوڕی خوایە یا بەندەی خودایە و پێغەمبەرە!

بە کورتی و بە کوردی، ئەو وەفدەی نەجران لە ئیدیعای خۆیاندا کە عیسا خودایە یا کوڕی خودا، تێشکان و بێ دەلیل مانەوە. حەزرەتی ڕەسووڵ لە سەر ئەساسی یاسای پێغەمبەرایەتی کە چاوەڕوانی لە خودایە بۆ چارەی گیر و گرفت و داوخوازان، ڕۆژی ئەوەڵ وەخراندنی تا ڕۆژی دوایە خودا بۆ چارەی کێشەی نێوانیان ئەو ئایەتی ٥٩ بۆ سەر محەمەد دابەزاند تا دەگاتە (فَنَجعلَ لَعنَتَ اللهِ عَلَى الكاذِبينَ).

وەفدی نەجران نەچوونە ژێر باری حوکمی ئایەتەکە بێ دەلیل کەوتنە سەر خەتی جەهالەت. ئەوجار پێغەمبەر فەرمووی: ئەمن لە لا یەن خوداوە ئەمرم کراوەتێ ئەگەر ئێوە داوای بەحەق و خاوەن بەڵگە و دەلیل لە من قبووڵ نەکەن، دەگەڵتان موباهەلە واتە ڕووبەڕوو بوونەوە بکەم بە لەعن و نەفرین. وەفدی نەجران زانییان کار کەوتە سەختی مۆڵەتیان خواست تاکوو لە دەوروبەری مەدینە تایفەی بەنی قریظە و بەنی نضیر و بنی قینقاع کە لەوێن

خەبەرداریان کەن کە پێغەمبەر قەستی ڕووبەڕوو بوونەوەی هەیە (واتە مباهلە) دەگەڵمان ئەگەر داوای قبووڵ نەکەین. ئەوانیش بە ئۆسقۆف و زانا مەسیحییەکان و هەندێ لە کارزانەکان گەیشتە ئەو باوەڕە ئەگەر محەمەد بە گژماندا بێ تێدەشکێین، چونکە یەک لەوان بە ناوی عاقب کە هەمان تێبینتر بوو کوتی ئەی هۆزی نەسارا قەسەم بە خودا! محەمەد پێغەمبەری مورسەلە، لەبابەت حەزرەتی عیسا هەچی بیڵێ ڕاستە، چارەی کارتان ئەوەیە کە یا داوای قبووڵ کەن، یا بڕۆن لە لای لاچن. جگە لەوەش زاناکانی بەنی نضیر و بەنی قریظە خاترجەمییان دانێ کە محەمەد هەمان ئەو کەسەیە کە دە تەوڕاتدا باسی کراوە و وەسفی کراوە. سەرەنجام وەفدی نەجران کەوتنە ژێر کاریگەری ئەو قسانەی هاواڵەکانیان بەڵام نەکەوتنە سەر ڕێی هیدایەت، هاتنەوە خزمەت حەزرەتی ڕەسووڵ ملیان دانەواند بۆ سەرانە دان (جزیە).

وای بۆ ئەو ڕۆژەی جەهل و خۆپەرەستی سواری کۆڵت بێ، بە خودا و پێغەمبەریش لە کۆڵت دانابەزێ و نایەتە خوار. بۆ زانینی ڕاز و سوڕی ئەو شتە دەبێ حەواڵە بە حیکمەتی خودا بکرێ.

ئەوە بوو هۆی دابەزینی ئایەتی ٥٩. (تفسیر کبیر و تبیین الفرقان)

دڵی بزۆز و نەسرەوتوو دانامەزرێ و داناسەکنێ، لە بەراورد و هەڵسەنگاندنی ئایەتەکانی تایبەت بە خەڵقی ئادەم کە خودا بە شێوەی جۆراوجۆر ئیشارە وەلای خوڵقانی ئادەم دەکا، دەکەوێتە پرسیار و داوخوازی ئەوەیە بزانێ کە بۆ خوڵقانی ئادەم هەر جارەی بە شێوەیەک ناو دەبرێ، مەسەلەن دە ئایەتی ٥٩دا سازانی لە «تراب»، واتە خاکی ویشک؛ دە ئایەتی ٥٤ی فورقاندا لە «ئاو»، دە ئایەتی ١٢ موئمینون لە «سلالە و طین» واتا قوڕ و خالسی قوڕ، دە ئایەتی ١٤ الرحمندا لە سواڵەت «صلصال کالفخار» و دە ئایەتی ١١ صافاتدا لە «طین لازب» واتە قوڕی چەسپەندە وەک هەویر. سەرەڕای ئەوانەش وا هەست پێ دەکرێ یا سازانی ئادەم لە تاڵووکەڕا بێ و یا ڕوح دەپاڵخرانی بە تاڵووکە بووبێ، بە پێچەوانەی ئایەتی ٤ی سوورەی بەلەد ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي كَبَدٍ﴾ «کبد» بە پێی تەفسیرزانان واتە پلە بە پلە، حاڵەتێکی پێچیدە.

لە وڵامی دڵی بزۆز و بەپرسیاردا دەبێ بکوترێ: جۆراوجۆری لەفزەکانی ئەو ئایەتانە واتە ئیختلافیان دەڕواننە خوڵقانی پلەپلەی ئادەم وەک ئەوە: عزرائیل خاک دێنێ، هەوا باران دێنێ، خاک تەڕ دەبێ و دەبێتە قوڕ، پاشان ئاو ویشکی دەکاتەوە، پاشان ئەو قوڕە وەک هەویر هەڵدێ

و دەچەسپێ، پاشان وەک لەتکە سواڵەتی لێ دێ، هەر بەو شێوەیە تا دەگاتە کاتی ڕۆح تێدەماندنی. بە هەموو شێوەیەک ئەو خاکە خۆش دەکرێ وەک هەویری کە دەکاتە نان لێهاتن، جا لە سەر ئەو یاسایە دەتوانین بڵێین ئیختلافی لەفزەکان کارێ ناکەنە سەر خوڵقانی کە لە خاکە، بەڵکە قۆناغ و پلەکانی سازانی ئادەم نیشان دەدەن. سەیر کە لە ئایەتی ۱۲ تا ئایەتی ۱۶ی موئمنون ئینسان چەند قۆناغی بە سەردادێ تا دێتە دەر لە تۆلی دایکیدا.

هەندێک لە زانایان وەک فرّاء و زجاج فەرموویانە ئایەتی ۶۰ کە دەفەرموێ ﴿الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ یانی (الّذی أنبأناك من قصة عیسی حقّ) واتە خودا دەفەرموێ ئەوەی لە بابەت عیسا بە تۆم ڕاگەیاند حەق و ڕاستە.

کاتی ئەوەی هاتووە بچینە خزمەت ئایەتەکەی ۶۰ی ئالی عیمران:

**الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلاَ تَكُن مِّن الْمُمْتَرِينَ ﴿٦٠﴾** ئالی عیمران
**قسەی ڕاستەقینە هەر لە لایەن پەروەردگارتەوە، کەوایە هەرگیز لە شکداران مەبە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی پیرۆزی ۶۰:**

لە سەر ئەساسی عیلمی تەرکیبی ئەو جوملەیە ﴿الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ دوو ئیحتیمالی هەیە:

۱. «الحق» موبتەدا بێ و «من ربک» خەبەر بێ؛ ئەودەم تەعبیرەکەی ئاوای لێ دێ: «الحق ثابت موجود من ربّک».

۲. یا دەڵێن: «الحق» بە تەنیا بۆخۆی خەبەری موبتەدایەکی وەلانراوە کە «هو»یە، ئەودەم تەعبیرەکەی ئاوا دەبێ: حەق هەمان حەقە کە وێنەی حەزرەتی عیسا وێنەی حەزرەتی ئادەمە؛ قسەی ئەوانەی کە دەڵێن عیسا کوڕی خودایە، یا خودایە، بێ بنەما و باتڵە.

ئەوەش بزانین باشە کە خودا ڕووی قسەی دە پێغەمبەرە، ئەمما مەبەستی ئۆمەتیەتی چونکە پێغەمبەر لە شک بەرییە، ئەوەی دە شک دەکەوێ لە بارەی عیساوە، دەبێ ئۆمەتەکەی بێ. یا دەڵێن: خودا بۆ هێز و تین دان بە یەقینیاتی پێغەمبەر لە بابەت عیسا و خۆشی دڵی ئەو پێی دەڵێ: باوەڕ و یەقینت ڕاستە نەچی گوماناوی بکەی. (روح المعانی، ۲۴۷/۳)

دەشکرێ ئەو بارەشی لێ بگرین: حەق چونکە بە مانای بوونە و واقیعەتە، خۆ ئەوەش یەقینە، بوون واتە هەیە، دە زاتی خۆیدا. ئەمما باتڵ دە زاتی خۆیدا واتە نەبوون و بێئەساس، عەدەم؛ جا خۆ ئەوەش یەقینە عەدەم بێگانە لە زاتی خودایە، ئەمما بوون ئاشنا دەگەڵ زاتی

خودایە، جا لە سەر ئەو ئەساسە ڕەوایە: ﴿الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾

ئەوەی ڕەواتر و شایانترە لە تەعبیراتی خطاب خودا ئایا مـحەمەدە یـا ئـۆمەتە؟ ئـۆمەتە بەو دەلیلە ئایەتی ١ی سوورەی تەڵاق ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ...﴾ مەبەستی خودا لە نەبیـدا خەبەرداری ئۆمەتیەتی لە لایەن نەبییەوە. دێرەشدا خودا ئەوەی مەبەسـتە: پێغەمـبەر بە ئـۆمەتی بڵێ لە بابەت عیساوە دە شکدا مەبن لەوەی پێغەمبەرە و بەندەی خودایە.

دەبــێ ئەوە بزانــدرێ سـەرەڕۆیی و فەسـادکاری گـاور و یەهوودیەکـان هەروا بە ئاسـانی دەس‌بەرداری خەیاڵی باتڵی خۆیان نابن، هەچەند خودای بانی سەر بەڵگە و دەلیلی زۆر پتەوی لە سەر خەیاڵی باتڵ و پووچیـانی ڕانـا و هێنـایەوە، بەڵام هـیچ سـوودێکیان لـێ وەرنەگـرت. سەرەنجام بەو بەستە بەڵگە تیژ و قاتیعە مۆری دانا لە سەر خەیـاڵی پووچیـان: نەبـوونی دای و باب بۆ ئینسانی وەک ئادەم، ناتوانێ و لێی لازم نایە ئەو ئینسانە خودا بێ؛ یا کوڕی خـودا بـێ؛ هەروەک پێویست ناکا ئینسانی بێ باب وەک عیسا کە دایکی هەیە، کوڕی خودا بێ؛ خودا زۆر بەرز و باڵاترە لەو فکر و خەیاڵانە. با سەیر کرێ سازدانی ئادەم لە خاک هیچ سـەیر و دوور لە ئەقڵ نییە، وەک دار و دەوەن و میوەجات، هەر وا خەڵقـی عیسـا لە خـوێنی ڕەحەمـی دایکـی (مەریەمە)، ئەگەر ئینساف هەبێ، شتێکی دوور نییە لە لایەن خوداوە.

جا بە پێی ئەو سەنەد و دەلـیلە بەرزانە و بەردەوامـی گـاور و جـوولەکە لەسـەر ئەقیـدە و باوەڕی خۆیان، خودا خەبەردارە دووبارە ئەوانە دە گژ پێغەمبەر و ئایینڕا دەچنەوە و هەدا نادەن. خودا دەیهەوێ پێغەمبەر ئاگادار وەکا لە سەر ئەوەی ئەگەر هـات و کێشـەتان هەڵایسـاندەوە و دەگەڵت کەوتنە دەمەقاڵێ، ئاوا بڵێ پێیان، ئایەتی ٦١ی عیمران:

فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِن بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ فَقُلْ تَعَـالَوْاْ نَـدْعُ أَبْنَاءَنَـا وَأَبْنَـاءَكُمْ وَنِسَـاءَنَا وَنِسَاءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَةَ اللّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ ﴿٦١﴾ ئالی عیمران

**ئەوجار هەر کەس لەو بـارەوە دەمە دەمەی لەگەڵ کـردی پـاش ئەوەی کە هەق و ڕاسـتیت بـۆ ڕوون بۆوە، بڵێ: وەرن با منداڵانی ئێمە و منداڵانی ئێوە، ژنەکانی ئێمە و ژنەکانی ئێوە، خۆمان و ئێوەش بانگەشە کەین، پاشان دەس کەین بە نـزا و پـاڕانەوە، جـا لەحنەتـی خـودا بنێـرین بـۆ ئەوانەی وا درۆزنن.**

**تێڕوانین و ئاوڕدانەوەیەکی هەستیارانە بۆ سەر ناوەرۆک وسیمای ئایەتی ٦١:**

دیارە خودای تەعالا پێغەمبەری تێگەیاند و متمانەی پێ دا کە عیسا بەنـدەیە و پێغەمـبەرە و

لە مەریەمە بە وەلەد بووە، نە خـودایە و نە کـوڕی خـودایە، وەک گـاور و جوولەکەکـان وایـان خەیاڵ کردووە. جا ئەوجار هەر کەس جورئەتی دا بە خۆی لەو بارەوە دەمەقاڵەی دەگەڵ کردی و ملی بۆ دەلیل ڕانەکێشا، خۆڕاگری کرد و سوور بۆوە لە سەر ئەوەی کە عیسـا یـا خـودایە یـا کوڕی خودایە، ئەودەم بڵێ بە وەفدی نەجرانی و گاورەکانی یەمەن کە سەرۆکیان عاقبی کـوڕی حادثە بوو: دەیجا وەرن با بانگ بکەینە کوڕەکانمـان و کوڕەکانتـان و ژنەکانمـان و ژنەکانتـان، خۆمان و خۆتان؛ و هەر کەس بۆ خۆی و دەست و پێوەندی خۆی، ئامادە بێ و بێ. پاشـان بە تێکڕایی لە خودا دەپاڕێینەوە تووک و دوعا و نەفرەت لە درۆزنان دەکەین. واتە ئێمە داوای پاکی مەریەمەی عیسا دەکەین و هەروا لەعنەتیش لە خـودا داوا دەکەیـن بـۆ درۆزنـان. جـا ئەگەر بە ڕاستیتانە عیسا بە خـودا دەزانـن یـا بە کـوڕی خـودای دەزانـن، فەرمـوون لەعـنەت بەڕێ کەن ئێوەش. ئێستا ئێمەش بە ماڵ و منداڵەوە ئامادەین لە هەر شوێنێک کە پیرۆزە و جێی وەرگرتن و گیرابوونی نزا و پاڕانەوەیە کۆوە بن و لەعنەت لە درۆزن بکەین.

جا کاتێ ئەو ئایەتە دابەزی، پێغەمبەرﷺ داوای وەفدی نەجرانی کرد و پێی کـوتن: ئـێمە بە دەلیـل و بورهـانەوە دەچەسـپێین لەمەڕ بەنـدەیی عیسـا و پێغەمبەرایەتـی ئەو، ئێوشـە هەر شێلگیرانەتر دەڕۆن لە سەر خەیاڵی باتڵی خۆتان، جـا کەوایە بـا بکەویـنە مبـاهلە دەگەڵ یەک، واتە لەعنەت لە درۆزن بکەین، تاکوو ڕاست و درۆ لە یەک دەرکەون. وا دیارە چونکە لە خۆیان خاترجەم نەبوون کە ڕاستن و دەلیلیان پـێ نەبـوو لە سـەر ئیـدیعایان، نەیـانوێرا خـۆ لە قەرەی مباهلە بدەن، کەوتنە چارەی نەجات لە دەس پێغەمبەر ئایا تەسلیم بن و موسوڵمان؟ یا مباهلە و تێشـکان!؟ یـا سـەردانەوان و دانیشـتن؟! سـەرانەیان هەڵبـژارد کە بیـدەن بە نیزامـی ئیسـلامی ئەوسەردەمی.

لە بابەت ئادابی عیلمەوە ضەمیری «فیە» بۆ حەزرەتی عیسا ئاوڕ دەداتەوە یا بـۆ کەلـیمەی «حق»ی ئایەتی ٦٠؟ دەبێ بکوترێ بۆ عیسا بگەڕێـتەوە لە یاسـا نـزیکترە، چـونکە مەبەسـت لە عیلمی «مـا جـاءک مـن العلـم»دا ئینسـانانێکن کە بـوونی حەزرەتـی عیسـا سـابت دەکەن، و جوملەی «فقل تعالوا» یانی ئەگەر ملیان بە دەلیل نەدا و لاسارییان گـرتە بەر، ئەوجـار بـۆ لای مباهلەیان ڕاکێشە، واتە بڵێن خودایە هەر لایەکمان لە سەر حەقین سەر کەوێ، لایەکەی دیـکە بن کەوێ.

«نبتهل» لە «ابتهال»ە، واتە دە لۆغەتی عەرەبدا بە واتای داد و هاوار و نزا کردنە لە هەر دوو

لاوە، چونکە مباهلە لە خێڵی بابی مفاعەلەیە واتە بۆ مشارەکەیە. (روح المعانی، ۲۴۸/۳)

دڵی بزۆز و نەسرەوتوو لە سەر جوملەی ﴿نَدْعُ أَبْنَاءنَا وَأَبْنَاءكُمْ﴾ ئایەتی ٦١ نەختێک هەڵوێستە دەگرێ و دەکەوێتە خەیاڵی ئەوەی: ئایا دەبێ بۆ باسی کچان نەکرابێ؟! مەگەر کچیش حەولاد نییە وەک کوڕ؟ وەیا دەبێ مەبەست لە «ابناء» کچیش بێ؟ مەسەلەن کابرایەک دێ بمرێ و وەسیەت دەکا و دەڵێ: ڕۆڵە ئەگەر ئەمن مردم ئەوەندە ماڵ بدەن بە ئەولادانم؛ مەگەر دێرەدا ئەولادانە کچیش ناگرێتەوە؟

دەچینە ناو هەرای زانایانی شەرع لەو بارەوە؛ چەند نەفەرێکیان ئاوای بۆ چوون: دە وەسیەتی ئاوادا کچ وەبەر نایەن بەڵکە تەنیا کوڕ و کوڕی کوڕ وەبەر دێن، بەڵام دەو یاسایەدا ئەولادی حەزرەتی ڕەسووڵ هەڵاواردراوە واتە کچی حەزرەتی ڕەسووڵ بڵێین فاتمە لە ڕیزی کوڕاندا و وەبەر «ابناء» دەکەوێ لە سەر ئەساسی فەرموودەی حەزرەتی ڕەسووڵ: هەموو نەسەبێک ڕۆژی قیامەت دەپچڕێتەوە بەغەیرەز نەسەبی من واتە کوڕ و کچی من. (بیهقی لە سنن کبری، ۲۰۵/۱؛ مستدرک، ۱۴۲/۳ حەدیسەکە لە باب الانساب: «کلّها منقطعةٌ یوم القیامة إلّا نسبه» ش ۱۳٦۷۸ ـ ۱۳٦۸۱)

ئەو یاسای مەبەست لە «ابناء» کچیش دەگەڵیەتی تایبەتی پێغەمبەرە، لەو شێعرە عەرەبیەشدا هەر وا هەست پێ دەکرێ ئەولادی مێ نایەتە ژێر ئەولادی نێر. ئەوەش شێعرەکە:

بنونا بنو أبناءنا، بناتنا　　　بنوهن أبناء الرجال الا باعد

بوونی نامۆیی عەرەبان دێ لە ڕاست کچانرا، پەنا بە خودا بۆ ئەو لای!

دە جوملەی (ثم نبتهل)دا دووبارە دڵ ناسرەوێ و خۆ ڕادەپسکێنێ بۆ وەی بزانێ خودا بۆ ئەمری بە مباهەلە دا دێرەدا؟ مباهەلە چییە؟ خۆ دڵیش تا وڵامی نەدرێتەوە لاق ناگوێزێتەوە بۆ پلەی دیکە بەڵکە دەبێ وڵامی وەدرێ و دامەزرێ جا ئەوجار بۆ شوێنی دی دەچێ. کەوابێ بۆ وڵامی دڵ دەبێ بڵێین مباهەلە واتە تووک و نزا و دوعا بەو شێوەیە: یا ڕەببەنا ئەگەر ئەمن ڕاستم لە داوامدا سەر کەوم، تەرەفم وەبەر لەعنەتت کەوێ و نابوود بێ.

کاتی ئەوەی هاتووە بۆ باوەڕی و خاترجەم کردنی بێباوەڕان و بەرەی ئینسان بە تەواوی لە سەر ئەوەی عیسا کوڕی مەریەمە و عەبدە و پێغەمبەرە و بێ بابیشە، بچینە خزمەت ئایەتی ٦٢ی ئالی عیمران و ئەوەی نەساراش دەیڵێن درۆ و پووچن:

> **إِنَّ هَـٰذَا لَهُوَ الْقَصَصُ الْحَقُّ وَمَا مِنْ إِلَـٰهٍ إِلاَّ اللَّهُ وَإِنَّ اللَّهَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٦٢﴾**
> **بێ گومان ئەوە چیرۆک و داستانی ڕاستە، بێجگە لە خوداش هیچ پەرستراوێک ڕاستەقینە نییە، هیچ گومانیشی تێدا نییە خودا زانا و کاربەجێیە.** ئالی عیمران

### ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێوەڕامانێکی هەستیارانە وەسەر ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ٦٢:

ئەوەی کە کوترا لە بابەت حەزرەتی عیسادا، کە لە حەزرەتی مەریەمی پاکە و بێ باب، عەبدی خودایە و پێغەمبەریشە، داستانێکی ڕاست و دروست و ڕەوانە، عیساش نە خودایە و نە کوڕی خودایە، وەک گاورەکان دەڵێن؛ و نە زۆڵیشە، وەک جوولەکەکان دەڵێن؛ و بڕواشمان هەیە کە هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نییە مەگەر خودای تاق و تەنیا نەبێ، کە بەڕاستی خودا دەستەڵاتداری دروست کرداره.

سەرەڕای ئەو هەموو بەڵگە و دەلیلانە لە سەر بەندەگی و پێغەمبەرایەتی عیسای، ئەگەر هات و ڕوویان وەرگێڕا و باوەڕیان بە تاق و تەنیایی خودا نەهێنا و هەر وا بۆ موباهەلەش ملیان نەدا و ڕازی نەبوون، دیارە ئەو لاسارییە توندە بۆ لە خشتە بردنی خەڵکی ساوایە کە ئەوەش دیارە لە خودا ون نابێ، چون خودا ئاگاداری ناپاک و ناڕاستانە، بۆ ئیسباتی ئەو ئیدیعایە دەچینە خزمەت ئایەتی ٦٣ی ئالی عیمران:

> **فَإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِالْمُفْسِدِينَ ﴿٦٣﴾** ئالی عیمران
> **ئەگەر هات و پشتیان هەڵکرد خودا خراپەکاران چاک دەناسێت.**

### ئاوڕدانەوەیەکی هەستیارانە وەسەر سیمای ئایەتی پیرۆزی ٦٣

جوملەی ﴿ فَإِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِالْمُفْسِدِينَ ﴾ بە ڕوونی ئەوە نیشان دەدا کە لاسار و سەرەڕۆ ئەگەر دەڕۆست هاتنیان وە زەحمەت کەوت بۆ ئینسان، لە دەس خودا قوتاریان نابێ و نایە، چونکە خودا زانایە بە خراپەکاران و بەتواناشە بە سەر هەرچی بیهەوێ، هەر وەها لە ئایەتی ١٢ی سوورەی جن ئەو مەبەستە لە زاری پەریدا بیسراوە کە قوتار بوون لە دەس خودا نابێ، نە لە سەر زەوی، نە لەولای:

> **وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن نُّعجِزَ اللَّهَ فِي الْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُ هَرَبًا**
> **(پەری دەڵێن): بێ گومان ئێمە دەمانزانی هەرگیز لەو سەرزەوییەدا بە سەر خودادا زاڵ نابین (و بە هەڵاتنیش بێر و بەوێدا) لە بەردەستی دەرناچین و قوتار نابین.**



سەرەنجام پاش باسی داستان و بەسەرهاتی حەزرەتی عیسا و یەکلایی بوونەوەی بێباوەڕان لە سەر لاساری و مل‌نەدان بە حەق، خودا دەستوور دەدا بە پێغەمبەر کە جوولەکە و گاورەکان بانگ بکە بە تێکڕایی بۆ پەرستنی خودا بە تەنیا، جا بۆ ئەو مەبەستە دەچینە خزمەت ئایەتی ٦٤ی ئالی عیمران:

**قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾** ئالی عیمران

**بڵێ ئەی ئەوانەی خاوەن کتێبن! وەرن با لە سەر ئەو کوتە کۆ بینەوە کە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا یەکسانە: بەندایەتی بۆ کەس نەکەین بێجگە لە خودا، هیچ شتێکیش نەکەین بە شەریک و هاوتا و هاواڵی. هەندێکمان هەندێکی ترمان لە جێی خودا بە پەروەردگار دانەنێین، ئینجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد بڵێن: ئێوە بە شاهید بن کە وا ئێمە موسوڵمانین.**

**ئاوڕ دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ٦٤:**

دوای باس کردنی چیرۆکی حەزرەتی عیسا و هەر وا ئەو شتانەی کە دژ بە خودان و ناکرێ و ناتوانن دەگەڵ خودا کۆوە بن، ئەوجار بۆ بەڕاستی خودا بەبێ شەریک ناسین هەرای جوولەکە و گاور دەکا خودای خاوەن ڕەحم و بەزە بەو شێوە: بە وەسیلەی پێغەمبەرەکەی ڕایدەسپێرێتێ کە بڵێ: ئەی خاوەن نامەکانی گاور و جوولەکە! دە وەرن ڕووتان بکەنە یەک یاسای ئەساسی کە خودا بە یەک‌ناسی و پەرستییە، کە ئەو یاسایەش گاور و جوولەکەی تێدا یەکسانن، ئەو یاسا و بەرنامەش ئەوەیە: خودا بە یەک بزانین و هەر ئەو بپەرەستین، و کەسیش نەکەین بە هاوتا و هاوبەشی، نە بت، نە ئەستێرە، نە فرشتە، نە ئاگر، نە شتی دی؛ و هەروا هەندێکمان هەندێکی ترمان بە پەروەردگار نەزانین، یانی وەک جوولەکە نەکەین عوزەیر بە کوڕی خودا بزانین، یا وەک گاور عیسا بە کوڕی خودا بزانین؛ خوداناسین بە بێ هاوتا. قورئانە پێمان دەڵێ و ئەقڵیشە وەری دەگرێ، تەورات و ئینجیلیش دە کاتی خۆیدا هەر ئاوایان فەرمووە، پێش ئەوەی دەسکاری کرێن، هەر وەک تەورات و ئینجیل و قورئان هاواریان لە عالەمە بۆ بە یەکتا ناسینی خودا، هەموو ڕەوانە کراوەکانی لای خوداش واتە پێغەمبەران، هەر ئەوەیان ڕاگەیاندووە هەر بۆ وەش ڕەوانە کراون، سەیری ئایەتی ٢٥ی سوورەی ئەنبیا کە:

**وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ**
**لە پێش تۆدا ئێمە هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە مەگین سرووشمان بۆ کردووە کە هیچ پەرستراوێک نییە بێجگە لە من، کەواتە من بپەرستن!**

ئینجا ئەگەر هەر ماریجەیان نەکرا، بەڵکە هاوەبش و واسیتەیان لە بەینی خۆیان و خودا پەیدا کرد، بڵێن: ئێوە بە شاهید بن کە ئێمە موسوڵمانین، و غەیرەز خوداش ناپەرەستین.

دەبیندرێ کە ئەو نوقتەی موشتەرەکەی قورئان دە نێویاندا دایڕشت کاریگەری لێ دیاری دەدا بۆ چارەسەری کێشە، چونکە ئەو ئیشتراکە بەغەیرەز تەوحید چی دی لێ هەست ناکرێ. دیارە تەوحیدی عەمەلی واتە تەرکی پەرستنی غەیری خودا، چونکە جوملەی ﴿وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا﴾ یانی ئەوە کە نیزامی هەستی یەکە، دەبێ خاوەن و ڕاگر و دانەریشی یەک بێ، و هەروا جوملەی ﴿وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا﴾ ئەوە ئاشکرا دەکا کە ئینسان بەو هەیە کە لە یەک چاوەی واقعی سەرچاوە دەگرێ، لە یەک گەوهەر و جەوهەرن، ڕەوا نییە بەرتەری لە یەک بگرن دە ڕەگەزدا؛ دەبێ ئەرباب هەر خودای واحد بێ.

دڵ دەڵێ (اقنوم ثلاثة) یانی چی؟ واتە زاتی قەدیم. تەرسایەکان بە کۆ دەنگیان دەیانکوت لە نێوانی باب و کوڕ و ڕوح القدوس واتە عیسای خودا و یا کوڕی خودا و جبریل عیسامان خودایە، بەو پێیە باوەڕیان وا بوو سێ زاتی سەربەخۆ هەن موشریکن. بۆ زێدە زانین بڕوانە تەفسیر کبیر، هەمان ئایەتی ٦٤.

وەک دەزانین جوولەکەکان دەیانکوت ئیبراهیم لە سەر دینی مەیە، و لەولایەشەوە گاورەکان دەیانکوت ئیبراهیم لە سەر دینی مەیە، دەگەڵ ئەوەی وێستا تەورات و ئینجیل نازڵ نەبوون، تا کوو بە هۆی تەورات و ئینجیل بناسرێ ئیبراهیم کامە لایە یا هیچ لایەکیان نییە. چونکە دەورانێکی زۆر دوور پاش ئیبراهیم تەورات و ئینجیل دابەزیون، جا چۆنیان زانیوە جوولەکە و تەرسا کە ئیبراهیم یەکێک لەوانە بووە، جا خودای تەعالا بۆ وەدرۆ خستنەوەیان ئاوڕ دەداتەوە وەلای بە چاودا دانەوەی درۆیانیان، ئایەتی ٦٥ی ئالی عیمران شاهیدە لەسەر ئەو بابەتە:

**يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِي إِبْرَاهِيمَ وَمَا أُنزِلَتِ التَّورَاةُ وَالإنجِيلُ إِلاَّ مِن بَعْدِهِ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ ﴿٦٥﴾** ئالی عیمران

**ئەی ئەهلی کتێب، بۆ سەبارەت بە ئیبراهیم کێشەتانە؟ لە حاڵێکدا تەورات و ئینجیل نەنێردراوەتە خوارەوە دوای ئەو نەبێ، بۆچی ئەقڵ و شعوور ناخەنە کار؟!**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی ورد وەلای ناوەرۆک و سیمای ئایەتی پیرۆزی ۶۵:**

خودا ڕوویان تێدەکا و دەفەرموێ: ئەی خاوەن نامەکانی ئاسمانی، بێ دەلیل و بەڵگە بۆچی لە سەر یەهوودی بوون و گاور بوونی ئیبراهیم دەگەڵ یەک دەمەقاڵێ دەکەن، هەر کام لە ئێوە ئیبراهیم پاڵ دەدەن بە دینی خۆتانەوە!؟ دەگەڵ ئەوەی تەورات و ئینجیل وێستا دانەبەزیون تاکوو ئێوە بزانن ئیبراهیم لە کام لایە، چونکە زۆر پاشی ئیبراهیم ئەو کتێبانە دادەبەزن، بە پێی کوتەی مێژناسان حەوتسەد ساڵ دوای ئیبراهیم تەورات بۆ مووسا دادەبەزێ، و هەزار و حەوتسەد ساڵ دوایە ئینجیل بۆ عیسا دادەبەزێ. ئێوە چۆن دەتوانن ئەو قەزاوەتە سەربەخۆ بیخەنە ناو گۆی عالەم؟! ئایا مەگەر ئەقڵ و شعوورتان نییە؟! قسەی بێ بەڵگە و دەلیل بە پووچ دەگەڕێتەوە لای خاوەنی و بە سەریدا دەدرێتەوە.

دەبێ لەو بارەوە بکوترێ قورئان ئاگاداری داوە کە ئیبراهیم پاک و موسوڵمانە بە وەسیلەی ئایەتی ۶۷ی ئالی عیمران:

**مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلاَ نَصْرَانِيًّا وَلَكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ**
**ئیبراهیم نە جوولەکە بوو نە گاور، بەڵکە هەقخواز و موسوڵمان بوو، و لە موشریکانیش نەبوو.**

دەی دیارە یەهووی بوون و نەسرانی بوونی ئیبراهیم دە تەورات و ئیجیلدا دەسنیشان نەکراوە و باسی لێ نەکراوە.

بە کورتی و بە کوردی، هەرکام لە ئەهلی کتێب واتە یەهوودی و نەسرانی داواکار بوون کە ئیبراهیم لە سەر دینی وان بووە، جا لە سەر ئەو ئیدیعایە دەگەڵ پێغەمبەریان باس دادەمەزراند و کێشەیان دەکرد، خودای خاوەن حیکمەتیش خەیاڵات و نیەتی ناپاکی وانی ڕادەگەیاند بەو شێوەیە: ئەو ئیبراهیمە نە لە پاش مووسا هاتووە تاکوو پێی بکوترێ یەهوودی، نە لە پاش عیسا هاتووە تا پێی بکوترێ مەسیحی؛ بەڵکە ئەو ئیبراهیمە باپیرە هەرە گەورەی بەنی ئیسرائیل و زۆر پێش ئەوان بووە، و پاک و حەقخواز و موسوڵمان بووە.

ابن‌اسحاق و ابن‌جریر لە ابن‌عباسەوە نەقڵ دەکەن و دەڵێن: ڕۆژێک تاقمێک لە نەساراکانی نەجران و تاقمێک لە ئیحبارییەکانی یەهوود دێنە خزمەت پێغەمبەر و پێی دەڵێن:

گۆیا ئەتۆ ئۆمەتی ئیبراهیمی، دەحاڵێکـدا ئـێمە ئـۆمەتی ئیبراهیمـین؛ نەک ئەتـۆ؛ گۆیـا هەر لە هەمان جەلەسەدا خودای تەعالا ئەو ئایەتی ٦٥ی ئـالی عیمـران بـۆ سـەر پێغەمـبەر دابەزانـد. (تفسیر طبری، ٣/٣٠٣)

دیارە بە ساڵەهای ساڵ شەریعەتی مووسا و عیسا لە پاش شـەریعەتی حەزرەتـی ئیبراهـیم بووە، جا چۆن دەگونجێ ئەوە کە ئیبراهیم تابعی ئایینی یەکێک لە مووسا یا عیسا بووبێ، کە دە دەورانی واندا هەر نەبووە. جا لە سەر ئەو داوا بێ بنەمایـانە، خـودا پێیـان دەفەرمـوێ: ﴿أَفَـلاَ تَعْقِلُونَ﴾

بە پێی ئیدیعای مێژووزانان نێوانی دەورانـی ئیبراهـیم دەگەڵ دەورانـی مووسـا ٥٦٥ سـاڵ بووە، تەنانەت هەندێک کوتوویانە ٧٠٠ ساڵ یان ١٠٠٠ ساڵ. نێـوانی مووسـا و عیسـاش گۆیـا ١٩٢٥ ساڵ بووە و هەتا هەندێک لایان وایە ٢٠٠٠ ساڵ بووە. (روح المعانی، ٣/٢٥٦)

وا دیارە خودای بانی سەر دەسبەرداری لۆمە و سەرکۆنەی یەهوود و نەسارایان نابێ، پێیان دەڵێ ئەگەر قسە و باسی لە بابەت تەورات و ئینجیل دەکەن بە هەر حاڵ شـتێکی لـێ دەزانـن، بەڵام ئەوەی هەر هیچی لێ نازانن وەک ئیبراهـیم بـێ، کە لە دەوری ئێـوەدا نەبـووە، بـۆچی لە بارەیەوە دەدوێن وقسەی لێ دەکەن؟ بۆوەی کە بە چاکی و تەواوی لە بابەتی تێبگەین، دەچیـنە خزمەت ئایەتی ٦٦ی ئالی عیمران:

**هَاأَنتُمْ هَؤُلاء حَاجَجْتُمْ فِيمَا لَكم بِهِ عِلمٌ فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيْسَ لَكم بِهِ عِلْـمٌ وَاللَّه يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾** ئالی عیمران

**ئاگـادار بـن، ئێـوە هەر ئـائەوانە بـوون کە دەربـارەی ئەو شـتەی کە لێتـان دەزانـی کێشـە و دەمەقاڵێتان کرد؟ ئەی بـۆچی سـەبارەت بەو شـتەی کە هیچـی لـێ نـازانن کێشـە و دەمەقـاڵە دەکەن؟ خودا دەزانێ ئێوە هیچی لێ نازانن.**

**ئاوڕ دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٦٦ی ئالی عیمران:**

ئاگادار بن ئێوە ئەی ئەوانەی دەمەقاڵێتان کرد لەوەی کە ئێـوە شـتێکتان لـێ دەزانـی، وەک باسی عیسا بێ، بە هەر حـاڵ زۆر جـێگەی لـۆمە بـا نەبـن، بەڵام سـەیر ئەوەیە کە هەنـدێکتان شووتان لێ هەڵبڕیوە لە تەوهین و ئیفتیرادا، کوتتان: عیسا خودایە، تەنانەت بەوەش دانەوەستان هەندێکتان لە سنوور چوونە دەرێ، کوتتان عیسا زۆڵە، و تەنانەت ئەو زانینەی کە لەمەڕ عیسادا

بووتان نەپیاراستن لەو ئیهانە گەورەیەی داتانە پاڵ عیسا، جا بۆچی دەمەقاڵێ دەکەن لە شتێکا کە هەر هیچی لێ نازانن، واتە دەڵێن ئیبراهیم لە سەر دینی جوولەکە بووە، یا گاور؟! بێ‌گومان خودا دەزانێ کە ئیبراهیم لە سەر دینی هیچ لایەکتان نەبووە، دیارە ئێوە نازانن. بۆ ئیسباتی ئەو مەبەستە دەچینە خزمەت ئایەتی ٦٧ی ئالی عیمران:

**مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلاَ نَصْرَانِيًّا وَلَكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾** ئالی عیمران

**ئیبراهیم نە جوولەکە بووە نە گاور، بەڵکوو هەق‌خواز و موسوڵمان بووە و لە شەریک‌دانەرانیش نەبووە.**

**تێڕوانین و ئاوڕ دانەوە وەلای ناوەرۆک و سیمای ئایەتی پیرۆزی ٦٧:**

دەبێ ئەوە بزاندرێ بە یەقینی، ئیبراهیم پێغەمبەری حەق‌خواز و حەق و ڕاست بووە، نە جوولەکە بووە نە گاور، وەک یەهوود و گاورەکان دەڵێن، بەڵکوو تەسلیمی خودا بووە بە تەواوی شەریک‌دانەریش نەبووە بۆ خودا.

بە ڕوون و بە ڕەوانی بە وەسیلەی ئەو ئایەتە عەقیدە و بڕوای یەهوود و نەساراکان لە بابەت حەزرەتی ئیبراهیم کە ئایینی خۆیان وەپاڵ دەدەن ڕەد دەکاتەوە، بەتایبەتی کە دەفەرموێ ﴿وَلَكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا﴾ واتە لە هەر چی ئایینی باتڵە، ڕووی لادا بۆ لای دینی حەق. بە پێچەوانەی یەهوود و نەسارا کە ڕوویان لە هەچی دینی حەقە وەرگێڕا بۆ لای باتڵ.

ئەو ئایەتە وەک پلارێک درا بە بنان‌گوێی موشریکانی یەهوود و نەسارا بەو هۆیە کە عیسا و عوزەیریان بە خودا داناوە، دروست هەر ئاوا داشی بە بنان‌گوێی قورەیشیەکانی مەککە و ئەو عەرەبانەی کە بڕوایان وەک وان بوون: بتیان دەپەرست و دەشیانکوت ئێمە لە سەر دینی ئیبراهیمین، بە کورتی عەرەبە قورەیشیەکان و یەهوود و نەسارا شەریک‌دانەر بوون بۆ خودا، بەڵام ئیبراهیم پاک و بەری لەو ئاکارانە و حەزرەتی محەمەدﷺ تەنیا تەسلیمی خودا بوو. بۆیە نزیکتر کەسە لە حەزرەتی ئیبراهیم، هەروەک لە ئایەتی ٦٨ی ئالی عیمران ئەو هەستە چاو دەکرێ. بۆ ئیسباتی ئەو ئیدیعایە واتە محەمەدﷺ و ئۆمەتەکەی نزیکتر کەسن لە حەزرەتی ئیبراهیم، دەچینە خزمەت ئایەتی ٦٨ی ئالی عیمران تاکوو بەبێ دڕدۆنگی قبووڵ بکرێ ئەو ئیدیعایە:

إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِإِبْرَاهِيمَ لَلَّذِينَ اتَّبَعُوهُ وَهَـذَا النَّبِيُّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَاللّهُ وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾
ئالی عیمران
بێگومان نـزیکترین کەس لە ئیبراهـیم ئەو کەسـانە بـوون کە وا شـوێنی کەوتبـوون و ئـا ئەو پێغەمـبەرە و ئەو کەسانەشـن کە وا بـڕوا و ئیمانیـان هێنـابوو، دیـارە خـودا سەرپەرسـتی ئیماندارەکانە.

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٦٨:**

بە پێـی ئیشـاراتی ئەو ئـایەتە پیـرۆزە، ئەو هەسـتە بە تەواوی دەکـرێ کە خـودای تەعـالا لایەنگران و نزیکترانی حەزرەتی ئیبرهایمی دەس‌نیشان کردن بە دوو تاقم:

١ـ دەستەیەکیان ئەوانەی کە دە کاتی خۆیدا شوێن ئیبراهیم کەوتوون و باوەڕیان پێ بووە.

٢ـ دەسـتەی دووهەمیـان محمـد المصـطفی و ئـۆمەتی واتە موئمینـان، ئـایەتەکە پاشـان دەفەرموێ: خودا یاریدەدەری موئمینانە. جوملەی ﴿وَاللّهُ وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە خـودای تەعـالا یاریدەدەر و ئیرادەدەر و عیزەت‌دەری خاوەن باوەڕانە.

بەسەرهاتێک کە پڕ لە ڕاز و دەرس و حیکمەتی خـودایە، ئەو دەورانـی کە موسـوڵمانان بە هۆی کەمی و تازە ئیسلام‌بوونیان لە شاری مەککە لە ژێـر تـانە و لـۆمە و ئـازاری بێبـاوەڕان و کافرانی مەککە کەوتبوونە ناڕەحەتی و سەخڵەتییەکی زۆر لە سەر ئیجازەی پێغەمبەر بـۆ وڵاتـی حەبەشە کۆچیان کرد، پادشای ئەوسەردەمی حەبەشە پیاوێک بوو بە نـاوی اصـحمە نجاسـی، مەسیحی مەزهەب و ئاقڵ و بەویژدان و بەئینساف بوو. ئەو موسوڵمانە کۆچەریانەی زۆر بە ڕێز و حورمەتەوە پەنا دان، ژمارەی ئەو کۆچەریانەش بە پێـی کـوتەی مێژووناسـان ٧٠ یـا ٨٠ نەفەر بوون. لە ناودارەکانی وان حەزرەتی عوسمان، حەزرەتی حەمزە، عوسـمانی کـوڕی مظعـون و جەعفەری کـوڕی ئەبوتالـب دیاریـان دەدا. دیـارە کافرەکـانی مەکـکە بە ڕۆیشـتنی ئەو تـاقمە موسوڵمانە بۆ حەبەشە ترسان و سامیان ڕێ‌نیشت، کە تازە ناتوانین وەک پێشوو دەس‌درێژییـان بۆ لا بکەین و لەوانەشە محەمەدﷺ بە هۆی ئەوانە پەرە بستێنێ و هێز بگـرێ و ڕیشـە داکـوتێ. کەوتنە سەر ئەو خەیاڵە بە هەر فێڵ و تەڵەکەیەک بێ ئەوانە وەگێڕدرێنەوە بۆ مەککە. بە پێـی ئەو خەیاڵە کاڵە بەتاڵە عەمر کوڕی عاص کە زۆر تێبین و وریا بوو، هەروەها عەمارەی کوڕی محیط ناردیانن بۆ لای پادشای حەبەشە، نەجاشی کە دڵی بستێنن و ئەوانەیان لێ وەرگرنەوە، ئەو دوو نەفەرە ناودارانە دەگەڵ تاقمێکی دی بە بەرتیل و دیاری بەرچاو هاتن بـۆ وڵاتـی حەبەشـە لای

پادشا. کاتێ ئەو وەفدە گەیشتنە لای پادشا ویستیان دڵی شا ئاوەژوو کەنەوە لە خزمەت بەوانە، لەڕێوە بە شایان کوت: ئەو موسوڵمانانەی کە هاتوونە لای تۆ، پێغەمبەر و دینی تۆیان قەبووڵ نییە، هەتا قسەی زۆر ناڕەواش لە بابەت ئایین و پێغەمبەرتان هەڵدەبەستن هەچی لە جانتای دەروونی پیسیاندا بوو بۆ پاشایان هەڵڕشت، بەڵام شا ئینسانێکی وردبین و ئارام و تێبین بوو، پێی کوتن: ئێستا هەر وا بە ئاسانی بە ڕەوای نازانم بە قسەی ئێوەیان دەگەڵ بکەم، بانگیان دەکەم ڕووبەڕووتان دەکەمەوە تاکوو دەرکەوێ کوێ گوفتاری ئێوە لە بابەت وان ڕاستە! کافرەکان بەو ڕووبەڕوویە ملیان دا. شا ئەو چوار نەفەرە ناودارەی وانی بانگ کرد واتە حەزرەتی عوسمان، حەزرەتی حەمزە، حەزرەتی جەعفەر، حەزرەتی عوسمان کوڕی مظعون. زانا و ڕاهیب و ئینجیل‌زانەکانی مەسیحی بانگ کردن تاکوو ئاگاداری قسەیان بن لە بابەت مەسیح و مەسیحیەتەوە و ئینجیل. موسوڵەمانەکان حەزرەتی جەعفەر کوڕی ئەبوتالبیان بە نوماینەدەی خۆیان دانا، پاشان شا نەجاشی ڕووی دە عەمر کوڕی عاص کرد و کوتی: هەچی لە بابەت دینی تازەی ئەوانە لەمەڕ عیسا و کتێب و مەزەبی ئەوانە دەیزانی بەیانی کە؛ عەمر کوڕی عاص هەچی زانی کوتی، پاشان نەجاشی ڕووی دە موسوڵمانەکان کرد و کوتی: ئایە ئەو پێغەمبەرەی ئێوە کە دەعوەت بۆ ئایینی ئیسلام دەکا چوو پێ دەڵێ؟ کتێبی هەیە؟ ئەمرو بە چی پێ دەکا، نەهیو لە چی لێ دەکا؟! حەزرەتی جەعفەر کوتی پێغەمبەر هیچ لە خۆیڕا ناڵێ، هەچی خودا پێی نەڵێ نایڵێ، ئەمر بە چاکە دەکا و نەهی لە خراپە دەکا. لە بت‌پەرستی نەهی دەکا و لە شەریک‌دانان بۆ خودا نەهی دەکا، دەستووری کۆمەک بە هەتیوان دەدا، بەندەگی تەنیا بۆ خودا دەکا. دووبارە شا نەجاشی کوتی: ئایا ئەو کتێبەی لە ئاسمانڕا بۆی دابەزیوە هیچی لێ دەزانن؟ حەزرەتی جەعفەر کوتی: بەڵێ، لە هەوەڵەوە سوورەی ڕوم و عەنکەبووت و بەشێک لەسوورەی کەهف و پاشان بە دەنگێکی دڵڕفێن سوورەی مەریەم و پاشان سوورەی مائیدەی لە ئایەتی ٨١ تا ٨٣ خوێندەوە، کاتێ گەیشتە ئایەتی ٨٣ شا نەجاشی و دەوروبەری چاویان بە مۆلەق فرمێسکی تێ وەستا و ڕشتیانە خوار. ئەوەش ئایەتەکە:

**وَإِذَا سَمِعُواْ مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَى أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ الْحَقِّ يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ ﴿٨٣﴾** مائده

**کاتێ گوێیان لەوە بوو کە بۆ ئەو پێغەمبەرە نێردرابووە خوارەوە دەبینی چاوەکانیان فرمێسک دەڕێژێ، چونکە هەندێ لە حەق‌ڕاستییان بۆ دەرکەوت. دەڵێن ئەی پەروەردگارمان! وا ئێمە**

**ئیمانمان هێنا، کە واتە ئەتۆش لەگەڵ شاهیدەکاندا بماننووسە.**

هەندێک لە مێژووزانەکان دەڵێن لە بابەت ئەو داستانە، کاتێ حەزرەتی جەعفەری کوڕی ئەبوتالب گەیشتە داستانی حەزرەتی مەریەم و عیسا لە قورئان خوێندنەوەیدا، گەیشتە ئەو جێگایەی کە خودای تەعالا لە زمان حەزرەتی عیساوە فەرمووێ:

**قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ مريم**
**واتە عیسای منداڵەکە کوتی: ئەمن بەندەی خودام، خودا کتێبی پێ داوم و کردووشمی بە پێغەمبەر.**

عەمر کوڕی عاص خۆی ڕانەگرت و کوتی: سوێند بە خودا ئەوانە تەوهین بە عیسا دەکەن. شا نەجاشی ئەوجار ڕووی کردە جەعفەر و کوتی: پێغەمبەر و دینی لە بابەت عیسا چۆن دەدوێن؟ جەعفەر لە وڵامدا کوتی: عیسا بەندەی خودایە و ڕەسووڵی خودایە، ڕوح کەلیمەی خودایە کە بە حەزرەتی مەریەم دراوە، نەوەک کوڕی خودایە. ئەجار نەجاشی ڕووبەڕووی هەموو زانا و قەشەکان و وەفدی هاتوو کوتی: سوێند بە خودا عیسا پێغەمبەر ئەوەی جەعفەر دەڵێ کە قورئانە، دەگەڵ ئەوەی دە تەورات و ئینجیلدا لە بارەی عیسا کوتراوە هەر دوو یەکن، هیچ تەفاوەتیان نییە. جا ئەوجار عەمر کوڕی عاص و عەمارەی کوڕی محیط تێشکان. نەجاشی بە موسڵمانەکانی مزگێنی مانەوەی دانێ و عەمر و هاوڕاکانی جواب کردن کوتی بە دیارییەکانتانەوە بەرەو شوێنی خۆتان وەگەڕێن.

پاشان نەجاشی حەزرەتی حەعفەری کوڕی ئەبوتالبی بانگ کرد تا بەشێکی دیکەی لە قورئان بۆ وەخوێنێ، ئەوجار جەعفەر زۆرتر لە جاری هەوەڵ بە دەنگێکی دڵڕفێن سووڕەتی تەها و مریەمی خوێندەوە. لە سووڕەی مەریەم کە گەیشتە ئایەتی ١٥، شا نەجاشی بە تەواوی کەوتە ژێر حاڵەتێکی بەرچاو بەرەو ئایینی ئیسلامی خۆی نواند و ئیسلام بوو.

**وَسَلَامٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا ﴿١٥﴾ مريم**
**سڵاو و درووودی لە سەر بێ ڕۆژێ کە لە دایک بوو، ڕۆژێ کە دەمرێ و لەو ڕۆژەشدا کە بە زیندوویی لە گۆڕدا هەڵدەستێندرێتەوە.**

یەک ڕاستی!

ڕێز و حورمەتی پێغەمبەران بە خاتری نەژاد و هۆز و نەسەبیان نەبووە و نابێ، بە هۆی

ڕەوانەکراوی لای خودایانە، جا بۆیە پێغەمبەر و ئۆمەتی کە نزیکترین کەسن لە حەزرەتی ئیبراهیم بە هۆی ئایینی ئیبراهیمە نەک نەژاد و نەسەبی.

دەچینە سەر باسی خاوەن نامەکان کە بەو هەموو لۆمە و تانە و تەشەرەی وەسەر و گوێلاکیان دەکەوێ دانامەزرێن و خەجاڵەتی ناکێشن، واش لە سەر ئەو حاڵەتەیانڕا خەریکی ئەوەن، ئەوانەی کە تازە ئیمانیان هێناوە بە پێغەمبەری وەریانگێڕن و لە ئیمانیان ئاوەژوو کەنەوە. جا بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستیە دەچینە خزمەت ئایەتی ٦٩ی ئالی عیمران:

**وَدَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يُضِلُّونَكُمْ وَمَا يُضِلُّونَ إِلاَّ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٦٩﴾**

**ئالی عیمران**

**هەندێک لە خاوەن نامەکان حەزیان لێ بوو گومڕاتان بکەن، بەڵام ناتوانن هیچ گومڕا کەن بەغەیرەز خۆیان، کەچی هەستیش پێ ناکەن.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی پیرۆزی ٦٩:**

ئارەزوو دەکەن و دەیانهەوێ دەستەیەک لە خاوەن کتێبەکان کە گومڕاتان کەن ئەی موسوڵمانان، بە فڕ و فێڵ و چاو و ڕاو، بەڵام بێگومان ناتوانن بەغەیری خۆیان کەس گومڕا کەن، چونکە ئەوانە بە هۆی تەفرەبردنی موسوڵمان وەسەر بیر کردنەوە لە قورئان و یاساکانی ئایینی ئیسلام ناپەرژێن. ئەوەشیان نیشانەی بێشعوورییانە. سەیر کەن لەو یاسا جوانە: هەر کەس چاڵ بۆ خەڵک هەڵکەنێ، بۆخۆی تێدەکەوێ، وەک ئەو بێباوەڕانە.

بێگومان دەبێ ئەوە بزاندرێ و باوەڕیش بکرێ کە نیەت و ئاکاری خاوەن نامەکانی ئاسمانی، واتە جوولەکە و گاور و تەرسایەکان سەرپێچی لە حەقە و ڕوو وەرگێڕان لە دەلیل و بورهانە، ئەگەر بە وردی سەرنج بدرێتە ئەو ئایەتە، بە تەواوی ئەوەی کوتمان باوەڕ دەکرێ، سەیر کەن: ئەوانە دەڵێن، بەڵێ محەممەد ئیقرار بە مووسا و عیسا دەکا، کەچی بۆخۆشی ئیدیعای پێغەمبەرایەتی دەکا، و هەروا دەشڵێن: بەڵێ، مووسا کوتوویەتی یاسای تەورات بۆ هەمیشە هەیە و ناگۆڕێ، کەچی محەممەد دەڵێ ئەحکامی شەریعەتی مووسا لادەچێ؛ ئەوە ئەو ئیدیعایەیان بۆ ئەوەیە تازە موسوڵمانەکان بخەڵەتێنن و ئاوەژوویان کەنەوە، وەئیللا ئەوە دەزانن کە محەممەد دەڵێ مووسا و عیسا هەن و ئەحکامیان حەقن بۆ کات و دەورانی خۆی. جا بۆ ئیسباتی ئەو داوایە دەبێ بە وردی سەیری ناوەرۆکی ئایەتی ١٠٩ی سوورەتی بەقەرە بکرێ:

وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّاراً حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ فَاعْفُواْ وَاصْفَحُواْ حَتَّى يَأْتِيَ اللّهُ بِأَمْرِهِ إِنَّ اللّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٩﴾ بقرة

**زۆربەی ئەوانەی کە ئەهلی کتێبن لە پاش ئەوەش کە ڕاستییان بۆ دەرکەوتووە هەر لە بەر حەسوودی خۆیان، حەز دەکەن پاش ئیمان و باوەڕی هێنان بەرەو کوفر و بێباوەڕی بتانگێڕنەوە، بەڵام ئێوە ببوورن و چاوپۆشی بکەن، تاکوو خودا فەرمان و بەرنامەی خۆیتان بۆ دەنێرێت، بێ گومان خودا بە سەر هەموو شتێکدا زاڵە.**

دەبێ لە باری ئادابی عیلمی نەحو ئەوەش بزاندرێ کە «من»ی ناو ئایەتەکە دەبێ بۆ بەعز بێ، واتە بۆ هەندێ لە ئەهلی کیتاب بێ، دەنا هێرش دەکرێتە سەرمان بەوەی کە هەندێک لە ئەهلی کتێب ئیمانیان هێناوە، خودا بە باشی ناو بردوون وەک لە ئایەتی ١١٣ ئالی عیمران ئیشارە وەلای ئەو بابەتە کراوە:

لَيْسُواْ سَوَاءً مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللّهِ آنَاء اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ آل عمران

**ئەوانە هەموو وەک یەک نین، هەندێ لە ئەهلی کتێب هەن تاقمێکی ڕێکوپێک و دامەزراون، لە نیوەشەودا ئایەتەکانی خودا دەخوێننەوە و سوژدەی دەبەن.**

دە جوملەی ئایەتەکەدا کە خودا فەرموویەتی ﴿لَوْ يُضِلُّونَكُمْ﴾ نەیفەرمووە (أن يُضِلُّونَكُمْ) واتە بە پیتی «لو» دامەزراوە نەک بە «ان» ئاماژەیە وەلای ئەوە کە «لو» بۆ تەمەننایە، بە کوردی ئەوانە ئارەزوو و ئاواتیان ئەوە بوو کە لە ئیمان هێنانتان ئاوەژوو ببنەوە. دیارە ئارەزووی وا بێئەساس ناچێتە سەر.

دە جوملەی ﴿وَمَا يُضِلُّونَ إِلاَّ أَنفُسَهُمْ﴾ ئەو هەستە بە ڕوونی خۆ دەنوێنێ کە خۆیان بەرەو پشت دەو چاڵە دەکەون کە هەڵیانکەندووە بۆ موسوڵمانان. واتە ئەو بێئیمانانە دە حەولی ئەوەدان و دەیانهەوێ ئێوەی خاوەن ئیمان ئاوەژوو و پاشگەز کەنەوە لە ئیمان هێنان، کەچی جگە لەوەی ئەو ئارەزوویەیان نایەتە جێ، بۆخۆشیان بەرەو پشت دەکەونە چاڵی نەدامەتی، واتە ئەقڵ و هەست و شعووری خۆیان لە ناسینی هیدایەت و ڕاستە ڕێگا وەدوور دەخەنەوە و هەر وا چونکە لە فریو هەڵخەڵەتاندنی موسوڵمانان بە مراد ناگەن بە خەجاڵەتی و سەرشۆڕی

دەگەڕێنەوە. جا بۆیە خودای تەعالا ئەو گورزەشیان بە ئەستۆیاندا دەدا و دەفەرموێ ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ﴾.

بۆ وەی بە باشی دەبێ هەست و شعووری یەهوود و گاورەکان و هەوادارانیان بگەین دەچینە خزمەت ئایەتی ٧٠ی سوورەی ئالی عیمران:

> يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٧٠﴾ ئالی عیمران
> **ئەی خاوەنی کتێب، بۆچی ئینکاری ئایەتەکانی خودا دەکەن؟ لە هەمان کاتیشدا خۆتان شاهیدی دەدەن کە ئایاتی خودا ڕاستن!**

**ئاوڕ وەسەردانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ناوەڕۆکی ئایەتی پیرۆزی ٧٠**

ئەی ئەهلی تەورات و ئینجیل، بۆچی باوەڕ ناکەن و هەر دە بێباوەڕیدا ڕۆدەچن لە بابەت ئەو ئایەتانەی کە مزگێنی دەدەن بە هاتنی حەزرەتی محمد المصطفی و دەشزانن و شاهیدیش دەدەن کە ڕاستە و بێگومانە سەداقەتی، ئایەتەکانی تەورات و ئینجیل.

بۆ تێگەیشتن و ئیتمامی حوججەت دەچینە خزمەت ئایەتی ٧١ی ئالی عیمران جا پاشان بە تەواوی لە سەریان دەدوێین:

> يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٧١﴾ ئالی عیمران
> **ئەی ئەهلی کتێب، ئەرێ بۆچی حەق بە ناحەق دادەپۆشن! هەر خۆشتان ئەوە دەزانن (کە حەق ناڕواتە ژێر ناحەق و داناپۆشرێ)**

**ئاوڕدانەوە وەسەر سیمای ئایەتی پیرۆزی ٧١**

ئەی خاوەن نامەکان، بۆ بە ئارەزووی خۆتان ڕاست و دروست دەگۆڕن لە جێگای ئەو حەقە، درۆ و بەتاڵ و ناحەقی دێنن بە بەرابەریەوە دادەنێن!؟ و بە درۆ و دەلەسەی بێبنەمای خۆتان ڕاست دادەپۆشن و ون دەکەن! دەگەڵ ئەوەی ئێوە خۆشتان دەزانن کە ئەوە ڕاستە و ونی دەکەن؛ واتە ون کردنەکەتان لە ڕووی عەمدە، نەک لە ڕووی هەڵە و نەزانییەوە.

دەبێ ئەوە بزاندرێ کە جوولەکە و گاورەکان دوو جۆرە حیلەیان دە کار دەکرد:

١. دە دڵدا دەیانزانی کە محەممەد حەقە و پێغەمبەری خودایە، ئەمما بۆ فریوی خەڵک ئاشکرایان نەکرد و ئیمانیان پێ نەدێنا، هەر وەک خودای تەعالا بە وەسیلەی ئایەتی ٧٠ ئەو حیلە و فێڵەیانی ئاشکرا و بەیان فەرموو،

۲. حیله وفێڵی دووهەمیان ئەوه بوو: ده حەولی ئەوەدا بوون بە دایمه، دڕدۆنگی و دوودڵی و گومان ده دەروونی خاوەن باوەڕان بخزێنن و ڕاستی و دروستی حەقیان لێ حاشار دەن، خودای تەعالاش بە وەسیلەی ئایەتی ۷۱ لێی لە هەرا دان، بە کوردی و بە کورتی، لە ئایەتی ۷۰ ئەوە هەست دەکرێ کە خەریکی گومڕا کردنی خەڵک بوون، و لە ئایەتی ۷۱دا ئەوە هەست دەکرێ بۆخۆیان خۆیان گومڕا دەکەن.

دەبێ ئەوەش بزاندرێ کەسێک بیهەوێ حەق بە ناحەق داپۆشێ و وەیشارێ، دوو جۆرە حاڵەتان بە سەر خۆدا دێنێ، لە هەوەڵەوە گومان و دوودڵی دادەچێنێتە ناو دەروونی خەڵکەوە، دەلیل و بەڵگەی حەق دەشارێتەوە کە لە سەر حەق دەدوێن. دەلیلی غەڵەت و پەڵەت ڕادەنێ کە ڕێ ونکەرن بۆ لای حەق. واتە بە ڕواڵەت (لا اله الا الله، محمد رسول الله) نیشان دەدا و بەرزی دەکاتەوە بە دەستی منداڵانی بێ‌گوناه، بەڵام دە بنیدا بە لێشاو خوێنی بەحەق دەڕێژێ.

ئەگەر جوملەکانی ﴿لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ بە تەرازووی ئەقڵ و هەست و شعوور و ئینساف وەزن کرێن و هەڵسەنگێندرێن، درۆزن و ڕاست لێک دەردەکەون.

ورد بڕوانە و سەیر کە لە جوملەی ﴿لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ﴾ خودا دەفەرموێ بە ئەهلی کتێب:

۱. ئەرێ بۆچی هەق بە ناهەق دادەپۆشن؟ ئەوان بێ‌باوەڕانە هاتن ئەوەی دە تەورات و ئینجیلدا کە لە بابەت قورئان و پێغەمبەردا بەتایبەتی باسیان لێ دەکرد، دەریانهێنان و وەلایاننان، ئەوەی بابەتی خۆیان بوون لە جێگایان دانان تاکوو خەڵک ناحەق بە حەق دانێ، بشڵێن تەورات و ئینجیل وایان فەرمووە.

۲. یا بە زاهیر و بە زمان بە ڕاستی ئایینی ئیسلام ئیقرار دەکەن، بەڵام لێر و لەوێ منافقانە لە کن هەوادارانیان بە پێچەوانە دەدوێن.

۳. یا دەڵێن مەبەست لە ﴿تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ﴾ ئەوەیە: یەهوود بە حەزرەتی مووسای باوەڕی هەیە، بەڵام بە حەزرەتی عیسا و محمد المصطفی باوەڕی نییە، و هەر وا نەسارا بە حەزرەتی عیسای باوەڕی هەیە بەڵام بە حەزرەتی محەمەدی نییە.

۴. یا دەڵێن ئەهلی کتێب واتە یەهوود و نەسارا ئەو حەقانیەتەی لە بابەت حەزرەتی محەمەد دە ناو تەورات و ئینجیلدا هەیە و بە دڵ دەشزانن ڕاستە و دروستن دەیشارنەوە و

دەیدڕێنن. ئەوەی مەبەستی خۆیانە لە جێگای دادەنێن و ئەگەر موسـولْمانەکان لێیـان دەپرسـن ئەوەتا خودا لە قورئاندا باسی ئەوەی دەکا کە باسی پێغەمبەرایەتـی دە تەورات و ئینجیلـدا ئـاوا هاتووە، لە وڵامدا دەڵێن، نەخێر؛ باسێک لە محەمەد و لە دینی ئەو دە کتێبی ئـێمەدا نەهـاتووە. (روح المعانی، ٢٦٢/٣؛ ئەو بەیاناتە لە ئەبوعەلی سینا و ئەبوموسلیم وەرگیراوە)

جوملەی ﴿وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ﴾ یانی ئەو بەڵگە و دەلیلانەی کە شاهیدن لە سـەر قورئـان و محەمەد، حاشاریان دەدەن و بە درۆی خۆتان دایاندەپۆشن، وەک گۆڕینی تەورات و ئینجیـل. ئەوە نەزەری حەسەن بەسری و ابن‌زیدە.

یا ئەوەتا ئەوانە دەیانکوت محەمەد ئیقرار بە پێغەمبەرایەتی مووسا دەکـا، کە ئەو ئیقـرارەش هاوارە وەلای ئەوەی ئەحکامی تەورات هەر دەمێنێ و ناشۆڕێتەوە، کەچـی مـحەمەد و قورئـان دەڵێن: نەخێر قانوونی تەورات شۆراوەیە.

دە جوملەی ﴿وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾دا ئەگەر وریایانە سرنجـی درێتـێ، ئەو هەسـتە دەکـرێ کە ئینکاری و لاساری و سەرپێچی یەهوود و نەسارا لە ڕووی حەسـوودی و عەمـدەوەیە، نەک لە ڕووی هەڵە و نەزانییەوە، چـونکە ﴿وَأَنـتُمۡ تَعۡلَمُـونَ﴾ واتە دەگەڵ ئەوەی دەشـزانن کە قورئـان حەقە و محەمەد حەقە، کەچی ئیتاعەشی ناکەن؛ دەشتواندرێ مانـای ﴿وَأَنـتُمۡ تَعۡلَمُـونَ﴾ ئـاوا بکرێ: دەگەڵ ئەوەی دەشزانن سزا و عەزابی کاری ئاوا بەراوەژوو سەخت و گرانە، واتا حاشار دان و شاردنەوەی حەق سزای گەورە و گرانە.

وا دیارە خودای تەعالا دەسبەرداری خائینان و درۆزنان نابێ، وەک ئەوە هەر مەکر و حـیلە و نەقشەیەکی یەهوود بیهەوێ دە بەرابەر موسوڵمانان پیادەی کا، خودای تەعـالا لێیـان لە هەرا دەدا و ئاشکرای دەکا. بۆ ئەو مەبەستە دەچینە خزمەت ئایەتی ٧٢ی ئالی عیمران تـاکوو جـوان تێبگەین لە فەسادکاری گەلی یەهوود.

**وَقَالَت طَّآئِفَةٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ءَامِنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجۡهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكۡفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٧٢﴾** ئالی عیمران

**هەندێ لە خاوەن کتێبەکان کوتیـان: سـەر لەبەیانیـان ئـیمان بێـنن بەوەی هـاتۆتە خـوارەوە بـۆ ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، لە ئێواراندا پەشیمان ببنەوە بەڵکە ئەوانیش پەشیمان ببنەوە.**

**ئاوڕ دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ٧٢:**

تاقمێک لە زانا و خوێندەوارەکانی جوولەکەی خەیبەر کە دە دوازدە نەفەرێـک دەبـوون لە خاوەن نامەکان هەندێکیان بە هەندێکیان دەکوت با لە سەرەبەیانان بە دیمەن و بە ڕواڵەت ئیمان بێنین بەو قورئانەی کە بۆ ئەو موسوڵمانانەی باوەڕیان پێیە دابەزیوە، پاشـان بە پەلە و سـەربەخۆ هەر وەک لە سەرەوەی خۆیان دەستوورمان پێ درابێ، وەرگەڕێین لە دوا ڕۆژا و پەشیمان بینەوە و بڵێین: ئێمە خاوەنی کتێبی ئاسمانین وەک تەورات و ئنیجیل بن، لێشیان شارەزا و بەڵەدیـن و تێشیان گەیشتووین و ناڵێین ئەو قورئانەی کە ئێوە باسی لێوە دەکەن کەلامی خودایە و دابەزیوە؛ بەڵکە هەڵبەستراوە بە زار خوداوە دەنا مافی بەسەر خوداوە نییە، بۆیە یەهوود ئەو قسە بەتـاڵەش دەڵێ وای خەیاڵە و بەتەمایە ئەوانەی کە وا موسوڵمان بـوون بە هـۆی ئەوە پاشەکشـەی وان لە حەق، ئەوانیش پەشیمان ببنەوە و تەنانەت بە هەوادارانیان دەڵێن نەچن ئەسراری تەوراتیـان بـۆ باس کەن، وەک مزگێنـی دانـی بە پێغەمبەریـان مـحەمەد بـێ، چـونکە ئەگەر ئەوە بـزانن تـازە وەرنــاگەڕێنەوە لە موســوڵمان بــوونی خۆیــان. هەر وەک خــودای تەعــالا لە ئــایەتی ۷۳دا ڕایدەگەیێنێ کە ئەو بێباوەڕانە هەرگیز نایەنە بواری باوەڕ و ئیمان مەگەر شوێن یەکی کەون کە لە سەر شوێنی وان بن، وەک جوولەکە و گاور.

لە سەر ئەو ئەساسە کە خودای تەعالا لە بابەت ئەو کافرانە ڕایگەیانـد لە هەوەڵەوە، واتە لە ئایەتی ۷۱دا ئەوانە حەق بە ناحەق دادەپۆشن و ونی دەکەن، و هەروا بە دووی ئەو ئایەتەدا خودا ڕایدەگەیێنێ کە ئەوانە حـیلە وفێڵـی دیـکە دادەنـێن وەک گومـان هاویشـتن دە نـاو دڵـی تـازە موسوڵمانانـدا بە پێی ئیشاراتی ئایەتی ۷۲. ئەو ڕاگەیاندنانەی خودا بە دووی یەکـدا دەبـێ لێـی ورد بینەوە کە پڕن لە ئەسرار و ڕاز و سوڕ ڕاجع بە یەهوود و گـاورانی بێبـاوەڕ. هەنـدێک لەو ڕازانە باس دەکەین چونکە بۆ باس دەبن:

١. جوولەکە و گاورەکان بۆ وەی بتوانن دڵ و دەروونی تازە موسوڵمانان بـێ هێـز و لاواز کەن، لە باوەڕی، هەندێک لە ئەحکامەکانی نازڵبووی سـەر مـحەمەد حـیلەگەرانە ئیقـرار پـێ دەکەن پاشان بە پێی هەل و فرسەت خۆ وەدوور دەخەنەوە، دەیـانهەوێ بەو ئیقـرار و پاشـگەز بوونەوەیان بەرگری لە هەستی حەسوودیان بکەن دە ناو دڵ و دەروونی خەڵک.

٢. بە پێی هەست پێکردن لە ناوەرۆکی ئایەتی ۷۲ پیاوماقووڵەکانی جوولەکە و گاورەکـان هەندێکیان بە هەندێکیان دەڵێن ئێوە لە کاتی ملاقاتی موسوڵمانان جۆرێک بدوێن لە لای یارانی خۆشتان بە پێچەوانە بدێون، بەڵام وا نەکەن موسوڵمانەکان هەسـت بەو دووڕوویيەتـان بـکەن،

بەڵکە بتواندرێ بەو فێڵە پەرتەوازەیی بکەوێتە ناو دەروونی موسوڵمانان. سەیر کە ئایەتی ژێرەوە تاکوو حاڵی بی:

**إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ آمَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ازْدَادُواْ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ اللّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلاَ لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلاً ﴿١٣٧﴾** نساء

**لە ڕاستیدا ئەوانەی ئیمان دێنن پاشان پاشگەز دەبنەوە ئینجا ئیمان دێننەوە دیسان پاشگەز دەبنەوە، پاشانیش لە بێبڕواییدا زیاتر ڕۆدەچن، بێگومان خودا بە هیچ جۆرێک نایانبەخشێت هیچ کاتێکیش شارەزای هیچ ڕێگایەکی ڕاستیان ناکا.**

هەر بە دووی ئەو ئایەتەدا خودا دەفەرموێ:

**بَشِّرِ الْمُنَافِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾** نساء

**مژدە بدە بە دووڕوویان، بێگومان سزای دەردناکیان بۆ دانراوە.**

ئەوە ئەو کارەی وان ئاوایە وەک خودا دەیفەرموێ لە ئایەتی ١٦ی بەقەرەدا:

**وَإِذَا لَقُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ قَالُواْ آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُواْ إِنَّا مَعَكْمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِؤُونَ ﴿١٤﴾** بقره

**کاتێ گەیشتبان بەوانەی کە ئیمانیان هێناوە دەیانکوت ئیمانمان هێنا، بەڵام کاتێک لەگەڵ شەیتانەکانیاندا بە تەنیا کۆ دەبوونەوە، پێیان دەکوتن لە ڕاستیدا ئێمە هەر دەگەڵ ئێوەداین، ئەوە تیتاڵمان دەکرد.**

لە ابن‌عباسەوە: مەبەست لە (وجه النهار) ئەو نوێژە بەیانەیە کە حەزرەتی ڕەسووڵ هاتە مەدینە کردی ڕوو بە بەیتولموقەدەس، چونکە وێستا ئەمری ڕوو بە کەعبەی پێ نەکرابوو، جوولەکەکان بە ڕوو دە بەیتولموقەدەس کردنی خۆشحاڵ بوون خەیاڵیان وا کرد محەمەد دەگەڵ وانە، بۆیە نوێژەکەی ڕوو بە بەیتولموقەدەس کرد.

ئەمما کاتێ خودای تەعالا ڕوو بە بەیتولحەرام دەستووری پێ دا واتە کەعبە، دەو کاتەشدا کاتی نوێژی نیوەڕۆ بوو، بۆ نوێژەکە ڕووی دە کەعبەی کرد. ئەدێرەدا هەرا دامەزرا، واتە کعب کوڕی اشرف و غەیری ئەویش کوتیان: ﴿آمِنُواْ بِالَّذِيَ أُنزِلَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَجْهَ النَّهَارِ﴾ یانی ئیمانێ بێنن بەو ڕووگەیە کە نوێژی بەیانی ڕووی تێکرد (بیت المقدس) کە ئەو حەقە و دروستە، بەاڵم کافر ئینکاری نشان دا بەو ڕووگەی نوێژی نیوەڕۆ ڕووی تێکرا. بە کورتی: کاتێ

خودا دەستووری ڕوو دە کەعبە کردنی بە پێغەمبەر دا و پێغەمبەریش ڕووی تێکرد یەهوودییەکان حاڵیان شێوا و تێک چوون، پێکیان کوت: با ئەو ڕاوەی دامەزرێنین، لە هەوەڵ ڕۆژ ڕو بە کەعبە نوێژ دەخوێنین، پاشان بە پێی هەل ڕووی لێ وەردەگێڕین لە ئاخری ڕۆژدا ڕوو دەکەینەوە بەیتولموقەدەسی خۆمان. بەڵکە موسوڵمانەکان وا خەیاڵ کەن و بڵێن ها ئەهلی کتێب واتە یەهوودییەکان زۆر زانان و خاوەن زانستن، ڕووگەی هەوەڵیان پێ نادروستە بۆیە بایان دا وەلای ڕووگەکەی بەیتولموقەدەس، ئەگەر ڕووگەی کەعبەیان پێ دروست و ڕەوا با، ڕوویان لێ وەرنەدەگێڕا. ئەوە بوو بۆچوونی ابن‌عباس لە سەر ئایەتی (وجە النهار). (تفسیر کبیر، هەمان ئایەت)

دووبارە دەتوانین ئاوڕێکی دیکە وەدەین بۆ سەر بێ‌باوەڕی و بێ‌شعووری جوولەکە کە ناڕوانن لە حەق و ڕاستی، بەڵکە هەر دەڕوانن لە خۆشەویستی و سەرکەوتنی دنیایی، بۆ نموونە دەڵێن هەر قسەیەکی کە لە مووسا و تەوراتەوە نەبێ، باوەڕی پێ مەکەن و قبوولی مەکەن، واتە هەر حوکمێک لە ئەحکامات ئەگەر بە پێچەوانەی حوکمی تەورات بێ، یانی حوکمی تەورات بگۆڕێ، تەسدیقی نابێ بکرێ. جا بۆ ئیسباتی ئەو مەتڵەب و مەبەستە دەچینە خزمەت ئایەتی ۷۳ی ئالی عیمران تاکوو بە باشی تێبگەین:

> **وَلاَ تُؤْمِنُواْ إِلاَّ لِمَن تَبِعَ دِينَكُمْ قُلْ إِنَّ الْهُدَى هُدَى اللّهِ أَن يُؤْتَى أَحَدٌ مِّثْلَ مَا أُوتِيتُمْ أَوْ يُحَآجُّوكُمْ عِندَ رَبِّكُمْ قُلْ إِنَّ الْفَضْلَ بِيَدِ اللّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاء وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٧٣﴾**
> ئالی‌عیمران
> **باوەڕیشتان بە کەس نەبێت جگە ئەوانەی لە سەر ئایینەکەی خۆتانن، بڵێ: بەڕاستی ڕێنوێنی تەنیا ڕێنوێنی خودایە، نەکا نموونەی ئەوەی کە بە ئێوە دراوە بە یەکێکی تر بدرێت یا لە لای پەروەردگارتان بە بەڵگە لە سەرتان؛ بڵێ: بەخشش بە دەست خودایە، دەیدا بەوەی کەیفی لێ بێ، خودا بەرفراوان کار و زانایە.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ۷۳:**

جوولەکەکان دەڵێن بە هەوادارانی خۆیان، باوەڕتان نەبێ و دڵنیا مەبن بە کەس، مەگەر بەو کەسانەی کە لە شوێن دینی ئێوەن، واتە ئەو دینەی کە لە تەوراتڕایە، دیارە ئەو شێوە ئاکار و ڕەفتارانەی جوولەکەکان تەنیا بۆ چەواشە کردنی موسوڵمانانە. ئێستاش ئەو شێوە ئاکاران ەلە سیفەتی منافقاندا زۆرە و هەیە، کە هەر قسە و ئاقیدەی خۆیان پێڕەوایە و پەسندە، ئاوڕ وەلای

حەق نادەنەوە. تەرازوو و ڕبەی خۆیـان پـێ حەقە، بەڵام بـێخەبەر لە میهـر و کەرەمـی خـودا دەگەڵ ڕاستان، فێڵ و حیلەی حیلەبازان ئاشکرا دەکا و بە پێغەمـبەر و موسـوڵمانان دەڵـێ: ئەو شێوە ئاکارە پیسە سەر ناکەوێ و سەر ناگرێ و ناشتوانن دڵی موسوڵمانان کرمۆڵ کەن و هاڵۆز کەن.

ئەو ڕاپۆرتەی خـودا بە پێغەمـبەر لە نهێنـی و غەیـبەوەیە، دەنـا پێغەمـبەر خەبەرداری دڵـی جوولەکە نییە، ئەو ەپێی دەکوترێ موعجیزە.

دوای ئەوەی کە خودای تەعـالا فێڵـی جوولەکەکـانی دەرخسـت و پـووچەڵ کـردەوە بـۆ ئاگاداری موسوڵمانان و پێغەمبەر ئایەت دادەبەزێنێـتە سـەر پێغەمـبەر و دەفەرمـوێ: بڵـێ ئەی محەمەد لە لایەن منەوە بەو جوولەکانەی کە ئەو حیلەیان وەڕێ خسـت، هیـدایەت و ڕێنـوێنی هەر ڕێنوێنی خودایە، کە یاسای ئیسلامە، یانی لەمەولا واتە پـاش تێـپەڕ بـوونی دەوری ئـایینی عیسا دەور دەبێتە دەوری ئایینی مـحەمەد کە ئیسـلامە، هەر کەس دەسـی بە ئـایینی ئیسـلامەوە نەگرێ ڕزگاری بە خۆوە نـابینێ. دووبـارە خـودای تەعـالا دەسـتوور دەدا بە پێغەمـبەر کە بەو جوولەکانە بڵێ: ئەوە ئەو حیلە و فێڵووکانە بۆیە دەکار دەکەن لە خۆتـان بە قـار دێ و گـرانە لە سەر دڵتان، وەک ئەوەی دراوە پێتان لە کتێب و پێغەمبەرایەتی، بشدرێ بە یەکی دی، یا ترسـتان هەیە لەوەی کە موسوڵمانەکان هەر بەو نـامەی کە لە لایەن خـوداوە دراوە پێتـان وەک تەوڕات بێ، بتانبەزێنن و بۆڕتان بدەن، واتە بڵێن موسوڵمانەکان دا تەوڕات بێنن تا تەماشـای کەیـن بـۆ وەی ئەوەی ئێوە پاشقولتان داوە و شاردووتانەتەوە لە مژدە دان بە هـاتنی مـحەمەد دەرکەوێ و وەدرۆ خرێتەوە و بە ڕووڕەشی هەر دوو دنیا بێنە دەر.

بە هەر حاڵ ئینسان دەبێ فێڵی لە سرشتی خۆی نەکا، باش ئەوە بزانێ کە هەر جۆر بڕوا بە ڕێدا خودا ئاوای دەناسێنێ بە دنیای عالەم و ئینسان، فێڵ دەکرێ بکرێ لە غەیری خودا بەڵام لە خودا ناکرێ چونکە هەرچی هەیە و نییە لە ژێر چاوەدێری ئەودایە.

لە کۆتایی ئایەتەکەدا خودای تەعالا لە سەر ئەساسی حیکمەتـی خـۆی بەو دوو بەسـتە و ڕستە پیرۆزانە بە وەسیلەی پێغەمبەر ئینسان دەدوێنێ و ئاگادار دەکاتەوە، ئەوەش بەستەکان:

١. بڵێ ئەی محەمەد بەڕاستی پێغەمبەرایەتی بەهرەیەکە لە خوداڕایە، ئەویش خـودا بە هەر کەس بیهەوێ و ئیرادە و حەز بکا دەیداتێ، خودا خۆی بێ دواییە و بەربـڵاوە و زانـا بە هەمـوو شتێکە.

٢. کێی بوێ بە ڕەحمەت و کەرەمی خۆی خاسی دەکا، خودا خۆی خاوەنی فەزڵی گەورەیە بۆ ئەوانەی بڕوایان پێیەتی.

بە کوردی و بە کورتی، بەخشش و کەرەمی خودا هێندە بەرفراوانە هەچی پەروەردەی خۆیەتی ئیماندار و بێئیمان، ئینسان و حەیوان، هەمووی تێدا جێی دەبێتەوە و بە هەرچی لایق و قابلە ئاگایە و بە هەچی ئینسان شانی هەڵدەگرێ زانایە، خاوەن و مالکی هەموو بوونەوەرە، کێ شایان بە چی بێ دەیداتێ، وەک پلە و مەقامی پێغەمبەرایەتی، یا ڕێبەری، ئێمەی ئینسان ئەگەر تێی ناچین دە ڕاز و سوڕەکانی، مافی ئەوەشمان نییە بڵێین بۆچی وایە.

**يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَن يَشَاء وَاللّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾** ئالی عیمران

**خێر و بێری خۆی تەرخان دەکات بۆ هەر کەسێک خۆی بیەوێت، خودا خاوەن بەخششێکی زۆر گەورەیە.**

خودای تەعالا دە ئایەتەکانی ڕابردوودا ئەو حاڵەتە حەسوودیەی یەهوودانی بەیان کرد، کە کاتێ دیتیان ئایینی ئیسلام ڕۆژ دەگەڵ ڕۆژی زیاتر پەرە دەستێنێ و خۆ ڕۆ دێڵێتە ناو دەروونی عالەمەوە، حەسوودیان پێ برد و داویان بۆ دانان و فێڵیان وەبەر نان، خوداش لێی لە هەرا دان و بەرەو پاشی هەس دانەوە، ئەوجارەش یەهوود کە دەیانهەوێ خەیانەت دە ماڵ و سامانی دنیادا بە کار بەرن بۆوەی بە چاکی لە فێڵی ئەوجارەی یەهوودیان حاڵی بین و تێی بگەین دەچینە خزمەت ئایەتی ٧٥ی ئالی عیمران:

**وَمِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لاَّ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ إِلاَّ مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَآئِمًا ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ لَيْسَ عَلَيْنَا فِي الأُمِّيِّينَ سَبِيلٌ وَيَقُولُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾** ئالی عیمران

**هەندێ لە ئەهلی کتێب هەن ئەگەر خەزنەیەکت پێ سپارد و لە لایان دابنێیت دەتدەنەوە، بەڵام کەس واشیان هەیە ئەگەر دینارێکیان لە لا دانێیت ناتدەنەوە، مەگەر بەردەوام بە سەریانەوە بی و داوایان لێ بکەی، ئەمەش هەر لە بەر ئەوەیە کە دەیانکوت سەبارەت بەوانەی کە ئەهلی کتێب نین، هیچ تاوان و گوناحێکمان لە سەر نییە، لە کاتێکدا کە درۆ بە زار خوداوە دەکەن خۆیشیان دەزانن درۆیە.**

**ئاوڕ دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ٧٥:**

ئی وا هەیە لە خاوەن نامەکان ئەگەر بێتو سامان و داراییەکی زۆری بە ئەمانەت پێ بسپێری و لە لای دانێی، دەتداتەوە و هیچ دەس‌درێژییەکی وەلا ناکـات بە تەواوی دەتـداتەوە، چـونکە هەستی ئەوە دەکا کە ئەو ماڵە ئەمانەتە لە لای داندراوە، خۆ خەیـانەت بە ئەمـانەتیش دە ئـایینی ئیسلامدا بە ڕەوا دانەندراوە. هەر وەک دەڵـێن: عەبـدوڵڵا کـوڕی سـەلام کە کـابرایەک بـوو لە قورەیشـیان، زێڕێکـی زۆری لە لا دانـدرابوو بە ئەمـانەت، دایەوە بە خـاوەنەکەی، دە حاڵێکـدا وێسـتا موسـوڵمان نەببـوو. ئەئەوە ئامـاژەیە وەلای ئەوە ویـژدان و کەرامەت کە لە سـەرووی باوەڕیشەوەیە و باوەڕی بێ‌ویژدان و کەرامەت بێ بەر و سەمەرە.

هەر لە خاوەن نامە ئی وا هەیە لە بەر بێ‌ویژدانی و کەرامەتی، دینارێکیشـی لە لا دانێـی و پێی بسپێری، وەک گەزۆ و مازوو دەیخوا و نایداتەوە و حاشای لێ دەکا، جا مەگەر زۆری لـێ بکردرێ و لە سەری دامەزرێـی وەک دارکـون‌کەرە هەر بیکـوتی تـا لێـی وەردەگـریەوە، دەبـێ بشکوترێ: ئەو ناپاکی و خەیانەتە بە ماڵی ئەمانەت هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لای بێ‌باوەڕییـان بە ئایینی ئیسلام و ئەحکاماتی ئایینی و ئەخلاقی، کە دەشـیانکوت: خـواردنی مـاڵ و سـامانی عەرەبانی ئۆمی بە تاوان نایەتە ئەژمار، واتە ئەوانەی نەخوێندەوارن و هیچ نازانن هەچـی لێیـان بکرێ جگە لەوەی بە تاوان ناژمێردرێ، ناڕەواش نییە. هەر وەک ئەوڕۆ لە ناو هەندێک نەتەوەی ناحاڵی و ناحەز وا باوە سـەر و مـاڵی هەنـدێک لە نەتەوەی نـاودار کە هەیە، ڕەوایە و حەڵاڵە، دیارە جوولەکە و جوولەکە ئاکار ڕێز و حورمەت بۆ یەکی دادەنێن کە دەبێ جوو بێ و لە خۆیان بێ. بە هەر حاڵ خودای بانی سەر ئاگاداری دەروونی هەر خاوەن دەروونـێکە، ئەوانەی وا درۆ بە زاری خودا و تەوراتەوە هەڵدەبەستن، وەک خودا دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ واتە دەڵێن ماڵی غەیری جوولەکەیان بۆ حەڵاڵە، ئەوانەی وا دەڵێن باش دەزانـن درۆ دەکەن، تەورات قسەی وای تێدا نییە. خودا بە وەسیلەی ئایەتی ٧٦ وەدرۆیان دەخـاتەوە. کـاتی خۆی ئایەتەکە دەخەینە ڕوو ئینشائەڵڵا.

دەبێ ئەوە بزاندرێ کە ئەو ئایەتی ٧٥ی ئالی عیمرانە ئەوەمان تێـدەگەیێنێ کە یەهـوود دوو بەشن، بەشێکیان ئەهلی ئەمانەتن، و بەشێکیان ئەهلی خەیانەتن. ئەمانەتدارەکان ئەوانەن کە پێ بەراوەرد و لێکۆڵینەوە گەیشتن بە حەق و ئیمانیان هێنا، بەشێکیشـیان کە هەر لە سـەر مەرامـی خۆیان مانەوە بە خەیانەت بە ئەمانەت و کوشتنی غەیـرە هـاودینی خۆیـان و مـاڵ و سـامان بە حەڵاڵ زانین ئاکار و ڕەفتار بوو هەر وەک لە ئایەتی ١١٣ ئالی عیمران دووبارە وەک ئـایەتی ٧٥

ئەو مەبەستە ئاماژەی وەلا کراوە:

**لَيْسُواْ سَوَاءً مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللّهِ آنَاء اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ**

**ئەوانە هەمـوو وەک یەک نـین، هەنـدێک لە ئەهلـی کتێـب هەن تـاقمێکی ڕێکوپێـک و دامەزراون، لە نیوەشەودا ئایەتەکانی خودا دەخوێننەوە و سوژدە دەبەن.**

**مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿١١٠﴾** آل عمران

**هەندێکیان خاوەن بڕوان، زۆربەشیان سنووربەزێن و تاوانبارن.**

ئەوەش با بزانین کە تەرسایەکان ئەهلی ئەمانەت بوون، جوولەکەکان ئەهلی خەیانەت.

لە ابن‌عباسەوە:

کـابرایەک بە نـاوی عەبـدوڵڵە کـوڕی سـەلام کـابرایەک هەزار و چەندسـەد دینـارێکی بە ئەمانەت لە لا دادەنێ. دەگەڵ ئەوەی عەبدوڵڵا کوڕی سەلام دەو کات و زەمانەشدا موسوڵمان نابێ، کاتێ خاوەن دینارەکە دێتەوە لای عەبدوڵڵا و پێی دەڵێ هاتووم بۆ ئەمانەتەکەم پـووڵەکەم کە لام دانابووی وەختی خۆی؛ عەبدوڵڵاش لە وڵامیدا دەڵێ بەڵێ پووڵ و ماڵی تۆ ها وەلامەوە و هەیە، فەرموو ئەوەش ئەمانەتەکەت. کابرا تەحویلی لێ وەردەرگێ و ڕووی تێـدەکا و دەڵـێ: ئەمن وام بیستووە هەندێک لە یەهوودییان ماڵی غەیرە یەهوودی دەخۆن بە حەڵاڵی و نایدەنەوە، ئەگەر دەستیان کەوێ، چ ئەمانەت بێ لە لایەن و چ بە لایەکی دی دەستیان کەوێ؛ ئەوە چـۆنە ئەتۆ ئەو ماڵەت بە تەواوی داوە بە من و داگیرت نەکرد؟! عەبدوڵڵاش لە وڵامدا دەڵـێ لە هـیچ دین و ئایینێکدا بە ڕەوا نەزانـدراوە مـاڵی عـالەم خەیـانەتی پـێ بکـرێ و بخـورێ، ئەوانەی وا دەیخۆن ئاینیان دەستووری پێ نەداون بەڵکە ئەخلاق و ڕەفتاری سەربەخۆیانە ئەو کارەیـان پـێ دەکا. گۆیا ئەو عەبدوڵڵا کوڕی سەلام کە یەهوودی دەبێ کاتێ حەزرەتی ڕەسووڵ دێتە مەدینە، لەوێ موسوڵمان دەبێ و ئیمانێ دێنێ. لە هەوەڵەوە ناوی «الحصين» بووە، پێغەمبەر ناوی نـاوە عەبدوڵڵا لە کاتی ئیسلامبوونیدا، و هەتا دەڵێن ئایەتی ﴿شَهِدَ شَاهِدٌ مِّن بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ و هەروا ئایەتی ﴿وَمَنْ عِندَهُ عِلْمُ الْكِتَابِ﴾ لەو ڕابیتەدا دابەزیون.

بەڵام کابرایەک بە ناوی «فخاص بن عازوراء» دینارێکی بە ئەمانەت لە لا دادەنێ یەکێـک، لێی دەخوا و نایداتەوە. کابرای خاوەنی کە بۆی دێ پێی دەڵـێ: دینـارە ئەمـانەتەکەی کە لە لام دانابووی بۆی هاتووم، دەکرێ وێم دەیەوە؟ فخاص پێی دەڵێ: بۆ نەتزانیـوە ئـێمە مـاڵی غەیـرە

جوولەکە بە حەڵاڵ دەزانین بیخۆین، ئێستاش دینارەکەم خواردووە و ناتدەمەوە. کابرای خاوەن دینار دەڵێ: ئایا دینەکەی ئێوە دەستووری ئەو کارەی پێ داون؟ یا هەر سەربەخۆ وا دەکەن!؟ دەڵێ بەڵێ دە تەوراتدا وا نووسراوە. کابراش پێی دەڵێ: بێ گومان ئەو کتێبە تەوراتە ئی خودا نییە کە وای تێدا نووسرابێ، بێ گومان گۆڕیوتانە. ئەو ئایەتە لەو ڕابیتەدا دابەزیوە (تفسیر کبیر، هەمان ئایەت)

یەکێک دێ پرسیار دەکا و دەڵێ: دەلیلی جوولەکە بۆ خواردنی ماڵی عالەمی غەیرە جوولەکە بە حەڵاڵی چییە؟ لە وەڵامدا دەبێ بکوترێ بێ لەوەی کە بێشعوورن دەستیان گرتوە بەو ئایەتەی کە خودا لێیان دەگێڕێتەوە و دەڵێن: ﴿نَحْنُ أَبْنَاء اللّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ ﴿١٨﴾ مائدە﴾ واتە یەهوود و نەساراش کوتیان ئێمە کوڕان و دۆستانی خوداین، کەوایە ماڵی بەندەگانمان بخۆین حەڵاڵە و هیچ تاوانێکی تێدا چاو ناکرێ. دیارە جوولەکەکان ئەو فتوایەشیان ڕووی پێ ناکەنە هەموو موخالیفێکی خۆیان بەڵکە هەر دەگەڵ ئەو کەسانەیانە کە ئیمانیان بە محمد المصطفى هێناوە، ئەوان بە خەیاڵی پووچەڵ و باتڵی خۆیان ئەوانەی ئیمانیان بە پێغەمبەر هێناوە، پێیان کافر و مورتەدن و خۆیان پێ حەق و موئمینە، جا لە سەر ئەو خەیاڵە دەستیان بە ئایەتی ١٤١ی نیساء گرتووە و دەستیان کردووە بە ماڵ خواردنی خەڵک، ئەوەش ئایەتەکە: ﴿وَلَن يَجْعَلَ اللّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً﴾ واتە خودا هیچ ڕێگایەک نادا بە کافران کە بە زیان و دژی موسوڵمانان بێ. بە کورتی، خۆیان بە موسوڵمان دەزانن و موسوڵمانەکان بە کافر دەزانن و ماڵیشیان بە حەڵاڵ، جا لە سەر ئەو خەیاڵە باتڵە دەڕۆن و دەس‌درێژی دەکەن بۆ ماڵ و سامانی ئەوانەی ئیمانیان بە پێغەمبەر هێناوە.

«امّيّين» کێن وا دە ئایەتی ٧٥دا ناو براون؟ «امّيّ» پاڵ دراوە وە لای دایک، هەر ئەوەیە هۆ کە بە پێغەمبەر دەکوترێ «ئۆممی». چونکە ئەوەی تازە لە دایک دەبێ ناتوانێ شت بنووسێ، بەو پێیە کەسێک نەتوانێ بنووسێ پێی دەکوترێ «امّيّ» لە سەر ئەسڵی خۆی کە لە دایک‌بوونە ماوەتەوە. دەکوترێ کە پێغەمبەر دەکوترێ «امّيّ» واتە وەلەدی مەککە، کە مەککە ناوی «امّ القرى»یە.

جوملەی ئایەتی ﴿وَيَقُولُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ واتە ئەو جوولەکانەی کە دەیانکوت خەیانەت بە پێی حوکمی تەورات دەگەڵ دژانی جوولەکە ڕەوایە، بۆخۆیان دەیانزانی درۆیە و درۆش دەکەن، جا دیارە کێ بزانێ لە سەر زانین و زانست درۆ بکا جورم و سزای

گەورەترە لە نەزان، وای لە سزای زانایان.

بۆ ئیبتاڵ و بێئەساسیی خەیاڵ و باوەڕی جوولەکەکان لە سەر خواردنی ماڵی ئەمانەت غەیری ئی خۆیان دەچینە خزمەت ئایەتی ۷۶ی ئالی عیمران:

بَلَى مَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ وَاتَّقَى فَإِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ ﴿٧٦﴾ ئالی عیمران
وا نییە هەرگیز بەڵکوو هەر کەس بەڵێنی خۆی بێنێتە دی و پارێزکار بێت بەڕاستی خودا پارێزکارانی خۆش دەوێت.

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەلای ئایەتی ۷۶ی ئالی عیمران:**

خودای تەعالا دەیهەوێ قسەی جوولەکەکان بەرێتەوە دوا، بە وەسیلەی حەزرەتی جبرەئیل ئایەتی ۷۶ نازڵ دەکاتە سەر پێغەمبەر و دەفەرموێ: وا نییە وەکوو جوولەکەکان دەڵێن، بەڵکوو هەر کەسێک قرانێکی هەر کەسێکی لە لا بێ و بکەوێتە لای و نەیداتەوە، جگە لەوەی قەرزداری دەبێ، تاوانیشی دەکەوێتە ئەستۆی. بەڵام ئەوەی ڕزگاری ببێ لە ڕۆژی دواییدا، ئەوە کەسێکە ئەو پەیمانەی کە بەستوویەتی دەگەڵ ئایینی ئیسلام بەجێی هێناوە و بردوویەتە سەرێ و پارێزگاری لێ کردووە. چونکە خودا بەڕاستی دۆستی پارێزکارانە.

جوملەی ﴿فَإِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ﴾ هاوارە وەلای ئەوەی کە خودای تەعالا بە وەسیلەی نیدای ئاسمانی، تەوراتبێ، ئینجیل بێ، یا قورئان بێ، ئینسانی ئاگادار دەکا و خەبەری دەداتێ کە ئەمن دەگەڵ ئینسانم شەرت بەستووە ئەگەر وەفا بە عەهدی خۆی بکا و بەتەقوا بێ، خوداش هیدایەتی دەدا و خۆشی دەوێ، ئەگەر بێتو وەفا بە عەهدی خۆی نەکا و پەرهیزکار نەبێ، دەکەوێتە بەر تووڕەیی و غەزەبی خودا.

دڵ دەیهەوێ بزانێ ئەو "عەهد"ەی دە ناو ئایەتەکەدا ناوی براوە، دەگەڵ "وەعدە"ی فەرقیان چییە؟ جا بە پێی کوتەی لۆغەتناسان دەبێ بکوترێ ئەگەر بێتوو قەرارداد لە نێوان دوو کەساندا پێک بێ، ئەوە ئەو قەرارادە ناوی دەبرێ بە عەهد، ئەگەر قەرارداد هەر لە یەک لاوە سەر بگرێ، ئەوە بەو قەرارادە دەکوترێ «وەعدە». لە سەر ئەو ئەساسە عەهد بەهێزتر و قایمترە لە وەعدە، چونکە عەهد لە دوو لاوەیە، وەعدە لە یەک لاوەیە.

پێویستە بزاندرێ کە ئایەتی ۷۶ دەگەڵ ئایەتی ۷۷ تا کوێ تێکەڵاوییان هەیە پێکەوە؟ بۆ وڵامی ئەو پرسیارە دەبێ بەراوەرد و هەڵسەنگاندنێکی مانای ئایەتەکانی ۷۵ و ۷۶ی عیمران بە

وردی بکرێ، ئەوکات تێدەگەی دە خەیانەتەکانی جوولەکە لەمەڕ دەس‌درێژی بۆ ماڵی ئەوانەی لە خۆیان نیە. خۆ ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە خەیانەت بە ئەمانەت و ماڵی خەڵک بەبێ سوێند و درۆ ناکرێ و ناچێتە سەرێ، جا دەبێ بکوترێ خودای تەعالا بۆ ئاگاداری عەبدانی، ئاگاداری بە هەڕەشە بدا بەو کەسانە کە بە درۆ و سوێند ماڵی خەڵک دەخۆن و داگیری دەکەن، لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ بکوترێ هۆی دابەزینی ئایەتی ۷۷ هەڕەشەیە لە خەیانەتکارانی درۆزن، هەروەک ئایەتەکانی ۷۵ و ۷٦ ئاماژە وەلای خەیانەتی جوولەکەیان لێ فەهم دەکرێ. جا بۆ تێگەیشتن لە تۆڵە و سزای خەیانەتکاران و زۆرداران دەچینە خزمەت ئایەتی ۷۷ی ئالی عیمران:

إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً أُولَـئِكَ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللّهُ وَلاَ يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٧﴾ ئالی عیمران

**هیچ گومانی تێدا نییە ئەو کەسانەی پەیمانی خودا و سوێندەکانیان بە نرخێکی کەم دەفرۆشن، ئا ئەوانە لە پاشەڕۆژدا بێ‌بەشن، خوداش لە ڕۆژی پەسڵاندا نایاندوێنێ و سەیریان ناکا و پاک و تەمیز و خاوێنیان ناکاتەوە، سزایەکی پڕ ئێش و بەژانیانیشیان هەیە.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ناوەرۆکی ئایەتی پیرۆزی ۷۷:**

خودا دەفەرموێ ئەوانەی کە دەیگۆڕنەوە ئەو پەیمانەی کە دەگەڵ خودایان بەستووە لەمەڕ بابەت و باسەکانی سیفاتی پێغەمبەر و ناو و نیشانەکانی کە دە تەورات و ئینجیلدا باس کراون، بە نرخێ لە ماڵی دنیا هەچەند زۆریش بێ، ئەو کەسانە بێ‌بەشن لە ڕۆژی قیامەتا لە هەچی پاداشی خودای و ڕەحم و ئاوڕ وەسەر دانەوەیەک، و هەر وا هیچ بەشێکیان لە بەهرە و کەرەمی خودا نابێ، ڕۆژی ئاخر کە ڕۆژێکی تاڵ و سەخت و گران و هەرکەس هەرکەسییە، و حەتا خودا دەگەڵیشیان نایەتە دوان و لێشیان ناڕوانێ بە چاوی میهرەبانی، و هەر لە تاوانیشیان نابوورێ، جگە لەوانەش خودا سزای تاڵ و بەژانیشیان دەخاتە سەر.

**تیوتیوە:**

چەند سزایەکی بەرچاو چاوەڕوانی ئەو کەسانەیە:

١. لە نیعمەتە بەرفراوان و بێ‌بڕانەوەکانی دنیای بێ‌پسانەوە بێ‌بەشن،

٢. لە ملاقات دەگەڵ خودا کە ئەوپەڕی خۆشییە بۆ موسوڵمانان، بێ‌بەشن،

٣. خودا ئاوڕ وەسەر گوناهباران دەداتەوە بەڵام ئەوانە لێی بێ‌بەشن،

٤. لەوانەیە خودا لە تاوانبارانی موسوڵمان ببووریّ، بەڵام لەوانە نابووریّ،
٥. سزای زۆر سەخت و گرانیشیان بەرەنگار دەبیّ و ....

**هۆی دابەزین:**

گۆیا اشعث بن قیس و کابرایەک لە سەر کێشەی پارچە زەوییەک دێنە خزمەت حەزرەتی ڕەسووڵ، پێغەمبەر بەو کابرایەی دەگەڵ اشعث بن قیس بوو فەرمووی پێی شاهید و بەڵگە و دەلیل ڕانیّ لە سەر داوات. کابرا لە وڵامدا کوتی ئەی ڕەسووڵی خودا ئەمن هیچ شاهید و بەڵگەم نییە، هەر خودا دەزانیّ کە ئی منە ئەو پارچە زەوییە. ئەوجار پێغەمبەر ڕووی کردە اشعث و فەرمووی ئەوە دیارە ئەو کابرایە شاهید و بەڵگەی نییە، دەمێنێتەوە سوێند؛ ئەویش دەکەوێتە سەر تۆ؛ جا ئەوجار اشعث سوێندی خوارد، سوێندەکەشی بە درۆ خوارد، خودای تەعالا ئەو ئایەتەی بە وەسیلەی جبرەئیل نازڵ کردە سەر پێغەمبەر. حەزرەتی ڕەسووڵ لەو بارەوە زۆری لۆمە کردە سەر اشعث بن قیس و پارچە زەوییەکەی لیّ وەرگرتەوە و دایەوە بە کابرا و پاشان اشعث بن قیس ئیقراری بە درۆی خۆی کرد. ئەوە قەولی ابن‌جریحە. (تفسیر کبیر، باسی هەمان ئایەت)

گۆیا دەستەیەک لە جوولەکە فاسیدەکان و خراپەکاران کە دوژمنی سەرسەختی ئایینی ئیسلام و پێغەمبەر بوون دادەنیشن لە قەراغی شاری مەدینە خەریکی دەسکاری کردنی تەوڕاتیّ دەبوون، واتە باسی سیفاتی پێغەمبەریان لیّ دەردێنا و دەیانگۆڕی بە شێوەیەکی وا هەستی پیّ نەکریّ و تەنانەت کاتیّ کە دەگەیشتنە ئەو شوێنانەی لە تەوڕاتێدا کە گۆڕابوون، بە لەون و شێوەیەکی وا دەیانخوێندەوە و زمانیان بۆ با دەدا و دەسووڕاند، کە هەست بەوەی نەکرابا گۆڕاوە ئەو شوێنە.

خودای تەعالا بۆ وەی ڕاستی و حەق ون نەبیّ و درۆزن و خەیانەتکاریش ئاشکرا بن و نەتوانن خۆ حاشار دەن، هات بە وەسیلەی ئایەتی ٧٨ی ئالی عیمران ئاگاداری دا بە پێغەمبەر و عالەمی ئیسلام بەو ئاکار و دابە ناشیرین و ناحەزەی جوولەکان. ئەوەش ئایەتەکە، سەیری کە:

وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُونَ أَلْسِنَتَهُم بِالْكِتَابِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ الْكِتَابِ وَمَا هُوَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٨﴾ ئالی عیمران

**لە ناو ئەوانەشدا دەستە و تاقمێک هەن زمانیان بۆ کتێب خوار دەکەن تاکوو ئێوەش وا حاڵی بن و بزانن، ئەوەش هەر لەو کتێبەیە، کەچی ئەوە لەو کتێبە نییە، دەشڵێن: ئەوە لەلایەن خوداوەیە، دەگەڵ ئەوەی هیچی لە لایەن خوداوە نییە، بەڵکە درۆ بە زاۆر خوداوە دەکەن خۆشیان دەزانن درۆیە.**

**ئاوڕ دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ٧٨:**

دیارە وەک دەبینین لە ئەهلی کتێب تاقمێک هەن کە لە ڕووی درۆ و ناڕاستییەوە زمانی خۆیان پێچ دەدەن لە کاتی خوێندنەوەی کتێبەکەیان کە تەوراتە یا ... بۆ وەی خەڵک وا تێگەیێنن ئەوەی دەیخوێننەوە لە ئایەتەکانی تەوراتن بێ کەم و زیاد، بەڵام خودا وە درۆیان دەخاتەوە و دەفەرموێ: ئەوەی زمانی بۆ پێچ دەدەن و لە ژێر لێوەوە دەیخوێننەوە هیچ لە تەورات نییە و ناچێ؛ دەشڵێن: ئەوە وەحیە لە خوداوەیە، ئەمما درۆ دەکەن سروش نییە و لە خوداوە نییە، بەڵکە درۆ بە زار خوداوە هەڵدەبەستن و دەشزانن کە درۆیە دەکەن بە دم خوداوە.

لە ابن‌عباسەوە:

ئەوانە لە ئەهلی کتێب بوون کە درۆیان بە زار خوداوە هەڵدەبەست و دەیانکوت: دەستەیەک یەهوودی هەبوون کە هاتنە لای کعب بن اشرف، دوشمنترین دوشمنی پێغەمبەر بوون و تەوراتیان گۆڕیبوو، ئەوسافی پێغەمبەریان لێ دەرهێنابوو پاشان تایفەی بەنی قریظە ئەو تەوراتە گۆڕاوە دەست لێدراوەیان لێ وەرگرتن، دەگەڵ تەوراتێکی دیکە کە لایان بوو ڕووبەڕوویان کردن تێکیان خستن تا نەسڕێنەوە. (کشاف، ج ٢٣١/١)

هەندێک لە زانایانی تەورات واتە لە یارانی کعب بن اشرف وەک مالک بن حیف و حیّ بن اخطب و ... کاتێ تەماشای تەوڕاتەکە دەکەن و دەیخوێننەوە زمانیان لە ڕاست ڕاست و نەگۆڕاوەکان ڕاست و ڕەوان دەڕوا بەڵام لە حاند ئایەتە گۆڕاوەکان زمانیان پێچ دەخوا و دەگۆڕێ، دەگەڵ کەم وزیادیش، دستەولەجێ هەست بە گۆڕانی دەکەن، دەزانن ئەو دەستە یەهوودییانە درۆ بە زار خوداوە دەکەن، هەر لەو جێگایە دوو درۆی زەلامیان بە ڕوودا دەدرێتەوە:

١. گۆڕینی تەوڕات و ئینجیل دانانی نووسراوەی خۆیان لە جێی گۆڕاوەکان

٢. درۆ وەپاڵدانی خودا و ئیفترا بە خودای پاک و بێ‌هاوتا.

**سەیرێک لە نەزانی و بێباوەڕی جوولەکە و گاورەکانی خوێندەوارە نەجرانییەکان**

کـاتێ هـاتنە خـزمەت پێغەمـبەر، پێغەمـبەر داوای ئـیمان هێنـانی لـێ کـردن یەکێـک لە نەجرانییەکان کوتی بە پێغەمبەر لە جوابی داوای پێغەمبەر بۆ ئیمان هێنـان، کـوتی ئەو نەفەرە بە پێغەمبەر: ئەتۆ دەتهەوێ وەک گاورەکانی عیسا دەپەرەستن ئەمەش ئەتۆ بپەرەستین؟! پێغەمـبەر فەرمووی: نەخێر، ئەمن هەرگیز داوا لە عەبدی خودا نـاکەم غەیـری خـودا بپەرەسـتن! جـا بـۆ ئیسباتی ئەو ئیدیعایە دەچینە خزمەت ئایەتی ۷۹ی ئالی عیمران:

**مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ اللَّهُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُواْ عِبَادًا لِّي مِن دُونِ اللَّهِ وَلَكِن كُونُواْ رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴿٧٩﴾** ئالی عیمران

**بۆ هیچ مرۆڤێک ڕەوا نییە کە وا خودا کتێب و دەستەڵات و پێغەمبەری بدا، پاشان بە خەڵک بڵێ: ئادەی لە باتی خودا، بەندایەتی بۆ من بکەن؛ بەڵکوو دەبێ بڵێ: ئێوە خودایی بن و بەندەی خودا بن، بە هۆی ئەو کتێبەوە کە وا ئێوە بە دەرس بە خەڵکی دەڵێن و خۆشتان دەیخوێننەوە.**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر سیمای ئایەتی پیرۆزی ۷۹**

هیچ ئادەمیزادێک کە خودا ڕەوانەی کردبـێ، بە نـاوی پێغەمـبەر و نـامە و کتێبـی دابێتـێ، ناتوانێ و نایکا و ناڵێ بە عـالەم، بـبن بە بەنـدەی مـن و ئەمـن بە خـودا بـزانن، ڕووی دە لای خودای بەحەق و بێهاوتا مەکەن؛ بەڵکە بە تەئکید ئەو خـاوەن نـامە و کتێـبە ڕەوانەکـراوە واتە پێغەمبەر، بە خەڵک دەڵێ: خودای بێهاوتا و بەحەق بپەرەستن و زانایـانە خەڵـک بەرەو خـودا بانگ بکەن و شـارەزایان کەن و پیـان بـدەنە خوێنـدن و تـاکوو خەڵـک بە وەسـیلەی دەرس و خوێندن خودای بناسێ، دیارە خودا دەستوور بە کەس نادا کە فرشتە و پێغەمبەر لە جیاتی خودا بپەرەستن، ئایا خودا دەستوورتان پـێ دەدا پێغەمـبەران و فرشـتە بپەرەسـتن؟ دوای ئەوەی کە بە خودای تاق و تەنیا بڕواتان هێناوە!؟ بەو ئایەتە خودای تەعالا لە دەمی ئەو مەسـیحیانەی دا کە حەزرەتی عیسا بە خودا دەزانن، و هەروا دای لە دەمـی ئەو جوولەکـانەی کە عـوزەیر بە خـودا دەزانن و دەیپەرەستن.

دیارە مەبەست لە (لبشر) پێغەمبەرانن، چونکە کتێـب و پێغەمبەرایەتـی و حـیکمەت بەوان دراوە، ئەو پلە وپایەیە لایق بە شەئنی ئەوانە، وا نییە کە بڵێن بە عالەم ئەمە بە خودا بزانن لە باتی

خـــودا چـــونکە ئەوان دوورن لە خەیـــانەت، ئەو کەســـانەی کە ئەو بـــێئەدەبیەی دەدەنە پـــاڵ پێغەمبەران، گاور و جوولەکەی بێشعوور و بێهەستن.

مەبەست لە (حکم)ی نێو ئایەتەکە، کە خودا دەفەرموێ (و الحکم) یاسای شــەرعە کە ئەو یاسا شەرعە دەستوورات و نەزم و نیزامی کاروباری کۆمەڵایەتی سەر پــێ دەگــرێ و بە عــالەم ڕادەگەیێندرێ.

مەبەست لە بە (كُونُواْ رَبَّانِيِّينَ)ی نێو ئایەتەکە: ئێوە ببن بە زانا و ئاگــادار و پــارێزەر بــن لە سەر ئەحکام و ئیتاعەی خودا.



دەچینە خزمەت ئایەتی ٨٠ی ئالی عیمران:

وَلاَ يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُواْ الْمَلاَئِكَةَ وَالنِّبِيِّيْنَ أَرْبَابًا أَيَأْمُرُكُم بِالْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨٠﴾ ئالی عیمران

**هەرگیز فەرمانتان پێ نادات کە فرشتە و پێغەمبەران بـکەن بە خـودا، ئایـا فەرمانتـان پـێ دەدا بێبڕوان بن پاش ئەوەی کە موسوڵمان بوون؟!**

**ئاوڕ وەسەر دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر ئایەتی ٨٠ی ئالی عیمران:**

خودای خاوەن ڕەحم و عەداڵەت بە شایانی زاتی خۆی نازانێ کە بە عەبدی بڵـێ: ســەژدە بۆ پێغەمبەران یا بۆ فرشتە بەرن، چونکە ئەوانە مەخلووقن، دیارە تـا خـودای خـالق هەبـێ، بـۆ مەخلووق کڕنۆش ڕەوا نییە، دیارە خودا دوای ئەوەی کە ئینسان بڕوای بە خودای بێهاوتا هێنا، فەرمانی پێ نادا بەو خاوەن بڕوایە کە ئیمان بە فرشــتە یـا بە پێغەمـبەر بێنـێ، خـودای بێهاوتـا پەیمانی لە گشت پێغەمبەران وەرگرتووە کە بە هەچی پێغەمبەرن و ڕەوانە کراون بڕوایان پێ بێنن بە خۆیـان و بە کتێبەکانیـان، و هاوکـاری و یارمەتییـان بـدەن و بـکەن؛ ئەوانـیش ئەو عەهـد و پەیـمانەی خودایـان قبـووڵ کـردووە. دیـارە ئەو پەیـمانە پەیمانێکـی زۆر گەورەیە کە خـودا لە پێغەمبەرانی وەرگرتووە، واتە وەک خودا فەرموویەتی: ئەی پێغەمـبەران، هەرچـیم دا بە ئێـوە لە نامەکانی ئاسمانی و پێغەمبەرایەتی، و کردمنە پێغەمبەر واتە بە باوەڕکەر بەو شتانەی وەک کتێب و حیکمەت، دەشبێ باوەڕوو ببێ بە ئەو شتانەی لە منەوەڕان و لە منەوە سەرچاوە دەگـرن. جـا دەبێ تێکۆشن بە توندی خەڵک بڕوا بێنن بە خودا و کەلامەکانی و ڕاسپاردەکانی.

ئەوە ئاماژەیەک بـوو بە یەک یاسـای ئەساسـی، واتە دەبـێ پێغەمـبەران و ئۆمەتـانی دینـی

باوەڕیـان ببـێ بە تەواوی بە پێغەمـبەران و کتێبەکـانی پـێش خۆیـان و ڕێـز دانـێن بـۆ یاسـا و ئەحکامەکانیان. چونکە هەر وەک وەعدە ستێندراوە لە پێغەمبەران کە دەبێ باسـی پێغەمبەرانـێ کە دێن بە دوایاندا ببرێ بە چاکی و هەروا بە ئۆمەتانی ڕاگەیێنن کە دەبـێ باوەڕیـان پـێ بێـنن، بێ گومان ئەو شێوە دەستووراتە ئیشارەیە وەلای ئەوەی ئاینی ئاسمانی هەمووی یەکە و ئامانج و هەدەفی پێغەمبەرانیش هەمووی هەر یەکە، کە خودا بە یەک ناسین و تەقوایە.

لە سەر «ر» (و لا یأمركم) مشتومڕی قورئانزانان هەیە، بەو جۆرە:

عاصم و حمزة و ابن عامر نەزەریان وایە کە «ر»ی (یأمركم) دەبێ سەری ببێ واتە بکوترێ: (يَأْمُرَكُمْ) بەڵام قورئانزانانی دیکە هەن نەزەریان وایە دەبێ بۆری ببێ واتە بکوترێ (يَأْمُرُكُمْ).

جا ئەوانەی نەزەریان لەس ەر ئەوەیە کە دەبێ سەری هەبێ، دەلیلیان ئەوەیە: جـوملەی (و لا یأمركم) دەگەڕێتەوە سەر (ثم یقول للناس) ئایەتی ۷۹، ئەودەم پیتی «لا» دەبـێ بە زیـاد بێـتە کایە دە لەفزدا و ئایەتەکەش ئاوای لێ بە سەر دێ:

مَا كانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ اللُّه الْكِتَابَ وَالْحُكمَ وَالنُّبُوَّةَ **أَنْ** يَقُولَ لِلنَّاسِ كونُـواْ عِبَـادًا لِّي مِـن دُونِ اللّهِ وَ**يَأْمُرَكم** أن تَتَّخِذوا الْمَلائِكَةَ وَ النَّبيّينَ أَرباباً.

پوختەی ماناکەشی: پێغەمبەر دەبێ قوڕەیشییەکان لە پەرستنی فرشتە نەهی کـردبن و هەروا جوولەکە و گاورەکـانیش لە پەرسـتنی عیسـا و عـوزەیر مەنـع کـردبن، ئەوانـیش دە موقابیلـدا کوتبێتیان بە پێغەمبەر: وا دیارە ئەتۆ داوامان لێ دەکەی بت پەرەستین، وەک گاور و جـوولەکە، کە عوزەیر و عیسایان دەپەرەست، پێغەمبەریش دە جوابیاندا دەفەرمـوێ: جـا چـۆن ڕەوایە و بە ڕەوا دەزاندرێ کەسێک خودا بیکاتە پێغەمبەر و پاشان ئەویـش بە عەبـدانی خـودا بڵـێ: ئەمـن بپەرستن، ئەوە ناڕەوایە و دوورە لە شەئنی کەسێکی ببێتە پێغەمبەر.

ئەمما ئەو قورئانزانـانەی کە نەزەریـان لە سـەر ڕەفـعەی «ر»ی (یـأمركم)ە، نەزەریـان وایە جوملەی (و لا یأمركم) سەربەخۆیە و نـاگەڕێتەوە دوایە بـۆ سـەر هـیچ جـوملەیەک، ماناشـی هەمان ڕاستە مانایە کە کوتمان.

یەکێـک دێ دەپرسـێ و دەڵـێ: بـۆچی دە نـاو ئـایەکەدا واتە ۸۰، هەر نـاوی فرشـتەکان و پێغەمبەران بردرا؟ دەبێ لە وڵامیدا بکوترێ چونکە ئەهلـی کیتـاب واتە یەهـوود و نەسـارا هەر فرشتە و پێغەمبەری وەک عیسا و عوزەیریان دەپەرستن.

جوملەی ﴿بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ بە قەولی خاوەنی کەششاف دەلیـل و بەڵـگەیە لە سـەر

ئەوەی کە پێغەمبەر ڕووی تێیانە و دەگەڵیان دەدوێ، موسوڵمان بوون.

**پوختەیەک لە ناوەرۆکی ئایەتەکانی ٧٩ و ٨٠ بە کورتی:**

دیارە ئەوە ئاشکرایە کە مەبەست لە (لبشر) ئایەتی ٧٩ پێغەمبەرانن و کەسی دی نییە، کەچی لەباتی ئەوەی کە دەبا بە گوێرەی مەبەستەکە (لنبيّ) هاتبایە نەک (لبشر) چونکە هیچ گومانێک لە (لبشر)دا نەدەما ئاخۆ خودا کێی مەبەستە؟! بەڵکە بە ڕاشکاوی دەزانـدرا کە خودا پێغەمبەرانی ڕەوانە کردوون بە کتێب و حیکمەتەوە، کەسی دی نا؛ ئێستا کە خودای تەعالا فەرموویەتی ﴿مَا كَانَ لِبَشَرٍ﴾ دە ئایەتەکەدا بێ سوڕ نییە؛ سوڕەکەش لەوانەیە ئەو چەند ئیشاراتانە بن:

١. بێ گوناهی پێغەمبەران، بە پێی یاسای عیلمی نەحو کە ئەوەی یاسایە: هەر کات لەفزی «ما» کەوتە سەر لەفزی «کان»، دوایەکەشی ئیسمی نەکەرە واتە نادیار بوو بە سیفەت قەراری گرت، بێ مەبەستەکەی نەفی گشتی دەگەیێنێ، واتە هیچ پێغەمبەرێک نییە ئیللا کە هەیە بێ گوناهە.

٢. لەفزی (لِبَشَرٍ) دە ناو ئایەتەکەدا هاوارە وەلای ئەوەی کە کەماڵی بەشەرییەت دە شەئنی پێغەمبەراندا دیارە و ئاشکرایە.

٣. هاتنی (لِبَشَرٍ) ئاماژەیە وەلای ئەوەی کە (يا عبدي و يا امّتي) دەو مەقامانەدا ڕەوا نییە چونکە (يا عبدي و يا امّتي) بۆ کەسێک دەبێ تایبەتی بێ دە بەندەگی و تەقوادا، بەڵام (عبيد) بە ڕەوا زاندراوە هاتنی و کوتنی دە مەقامی وادا لە سەر ئەساسی حەدیسی (لا يقولنّ أحدكم عبدي و امّتي كُلُّكُم عَبيدُ اللهِ و كلُّ النّساءِ إماءُ الله؛ مسلم و صحيح له ابوهريرەوە).

لە پێشدا ئاماژەیەکمان وەلای ئەوەی کرد کە خودای تەعالا پەیمانی لە هەموو پێغەمبەرەکان وەرگرتووە کە هەرچەند پێغەمبەرێک ڕەوانە کرا کە دەبێ باوەڕی بە پێغەمبەرەکانی پێشوو ببێ بە خۆیان و بە نامەیان، پێغەمبەرەکانیش سەریان لەو فەرمانەی لانەداوە بەڵکە قبووڵیان کردووە، جا بۆ ئەو مەبەستە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٨١ی ئالی عیمران:

وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِي قَالُوا أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ ﴿٨١﴾ ئالی عیمران

**یادێک لەو کاتە بکەوە کە خودا بە جەخت بەڵێنی ستاند لە هەموو پێغەمبەرەکان کە کاتێک کتێب و حیکمەتم بۆ ناردن، پاشان پێغەمبەرێکی دی هات بۆ لاتان، سەلمێنەری ئەو شتانەیە کە لە لای ئێوەیە، ئەوە دەبێ بڕوای پێ بکەن، زۆر بە توندیش یارمەتی یەک بدەن، خودا فەرمووی: ئایا ئێوە دەرتانبڕی و ددانتان نا بەو پەیمان؟! بەڵێن و پەیمانی منتان وەرگرتووە؟ کوتیان: بەڵێ، ددانمان پێدا هێنا. خودا فەرمووی کەوایە هەموو شاهید بن؛ ئەوا منیش یەکێکم لە شاهیدەکان.**

### ئاوڕ دانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە سیما و ناوەرۆکی ئایەتی ۸۱:

کاتێ کە خودا پەیمانی لە پێغەمبەران ساند، کە گەلانی ئەو پێغەمبەرانە واتە ئۆمەتانیان لە قبووڵ کردنی ئەو پەیمانەدا دەبێ وەک پێغەمبەرەکان وا بن، چونکە ئەو پەیمانە پەیمانێکی زۆر گەورە و بەجێیە، لە هەموو پێغەمبەران وەرگیراوە، وەک خودا ئاماژەی وەلا دەکا و دەفەرموێ: هەرچیم دا بە ئێوە، لە وەحی ئاسمانی و بەرزیی پێغەمبەرایەتی، پاشان ڕەوانەکراوێکتان بۆ بەڕێ کرا لە لایەن منەوە، ئەو ڕەوانەکراوە تەسدیقی دەکا ئەو شتانەی کە بە لای ئێوەوەیە، وەک کتێب و حیکمەت بێ، بە کورتی: هەر پێغەمبەرێک هاتە نێوتان، پێغەمبەری پێش خۆی قبووڵە بە کتێب و حیکمەتەوە، یانی یاسای هەر پێغەمبەرێک حەقە بۆ دەورانی خۆی، دەبێ ئەوە باوەڕ بکرێ و ئیقراری پێ بکرێ.

ابن جریری طبری هەڵسەنگاندن و بەراوەردی لە سەر ئایەتی ۸۱ ئاوایە:

اذکروا یا اهلَ الکِتابِ اِذْ أَخَذَ اللهُ میقاقَ النَّبیّینَ... طبری، ۳۲۸/۳

و هەروا عەللامە زجاج فەرموویەتی لە بابەت تەعبیر و هەڵسەنگاندنی ئەو ئایەتە:

وَ اذْکُروا یا محمد في القرآنِ، إذ أَخَذَ اللهُ میثاقَ النَّبیّینَ ...

یانی ڕا و بۆچوونی ابن جریری طبری لە بابەت مانای ئەو ئایەتە ئەوەیە: وە بیر خۆ خەنەوە ئەی خاوەن نامەکانی ئاسمانی، ئەو کاتەی کە خودای تەعالا پەیمانی لە پێغەمبەران وەرگرت.

ڕا و بۆچوونی عەللامە زجاجیش ئاوایە: بیر خۆت خەوە یا محەمەد! بە وەسیلەی قورئان، ئەو کاتەی کە خودای بێهاوتا پەیمانی ستاند.

زانایانی عیلمی نەحو کە پێیان وایە (لما) لە مەڕ ئەعرابە و کۆسپێکی گران و بەربڵاوە لە قورئاندا. ڕا و بۆچوونی جۆراوجۆریان لە سەر نیشان داون، هەندێک لە سەر نەزەرەکانیان دەدوێین بە پێی ئادابی یاسای عیلمی نەحو:

١. نەزەری جمهوور واتە زۆربەی زانایانی نەحو: (لما) دەبێ بە فەتحەی لام بێ و میمی خەفیف (لَمَا)، ئەودەم «ما» دەبێتە مای مەوسوولە و دوایەکەشی دەبێتە سیلە بۆ «ما»یەکە؛ جوملەی (لتؤمننّ به) دەبێتە خەبەری، ئەوکات تەعبیری ئایەتەکە ئاوای لێ بە سەر دێ: للّذي أتيتكم مِن كتب و حكمة، ثمّ جاءكم رسولٌ مصدّق لما معكم لتؤمننّ به. دیارە «ما» موبتەدایە و ئەو زەمیرەی «ه» کە لەلایەن سیلەکەوەیە و بۆ لای «ما» دەگەڕێتەوە لادەبرێ و نامێنێتەوە. تەعبیرەکەشی دەبێتە «لما اتيتكموه».

٢. هەندێکیش نەزەریان ئاوایە وەک حەمزە: «بێ» دەبێ «لِما» بێ، واتە بە کەسرەی «ل» وەخوێندرێ.

٣. هەندێکیش نەزەریان ئاوایە: «ما» مانای شەرتی لە خۆ گرتووە و بوون و نەبوونی «لام»ی سەر «لما» یەکسانە؛ واتە ببێ و نەبێ، زەرەر بە مانا ناگا. بە پێی نەزەری عەللامە زجاج سیبویە و مازنی لە سەر ئەو بۆچوونە «ما» دە قۆناغی نەسبدایە بۆ «أتيت» مەفعوولی دووهەمیش بۆ «أتيت» دەبێتە «كم». ئیعرابی جوملەی «جاءكم» بە هۆی ئاوڕدانەوەی وەلای «أتيتكم» دەبێتە جەزمە واتە سکوون؛ جەزاشی ئەودەم دەبێتە «لتؤمننّ به» (تفسير كبير، ١٢٥/٨)

با ئەوەش پاش‌قول نەدرێ «لِمَا» بە کەسرەی لام، لامەکە بۆ تەعلیل دەبێ، ئەودەم دەبێ بکوترێ وەرگرتنی پەیمان لە پێغەمبەران هۆیەکەی ئەوەیە کە کتێب و حیکمەت و پێغەمبەرایەتییان دراوەتێ، جا بۆ خاتری ئەو نیعمەتە دەبێ ئەوان تەئیید و تەسدیقی تەواو ئەنبیایان بکەن. (تفسير كبير، ١٢٦/٨)

ئەمما (لَمَّا) بە تەشدید دوو جۆرە بەراورد لە خۆ دەگرێ:

١. دە ئەسڵدا (لِمَنْ) بووبێ بۆ کەسێ میم پێکەوە دە کەلیمەیەکدا کۆ نەبنەوە دەبێ یەکیان لابرێ (لَمَّا) وەمێنێ. (كشاف، ٣٧/٢)

**پوختەی مەبەست لەو پەیماننامەی خودا وەردەگرێ لە پێغەمبەران:**

ئەو پەیمانەی خودای لە ئینسان دەبێ سێ بن:

١. خودا پەیمانی لە بەرەی بەشەر وەرگرتووە کە دەبێ باوەڕی بە ڕەبی بێ‌هاوتا هەبێ، هەر وەک ئایەتی ١٧٢ی ئەعراف ئاماژەی وەلا کردووە: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ﴾ واتە ئایا ئەمن پەروەردگاری ئێوە نیم؟! کوتیان بەڵێ، ئەتۆ ناکرێ پەروەردگاری ئێمە نەبی!

٢. خودای تەعالا لە زانایانی ئەهلی کتێب واتە پێغەمبەران و جێنشینان و زانایانی ئایینی بە

گشتی پەیمانی لێ وەرگرتوون کە حەق نەشارنەوە و قووتی نەدەن؛ بەڵکە ڕاست و ڕەوان و بێباکانە بۆ عالەمی بەیان کەن. وەک ئایەتی ١٨٧ی ئالی عیمران ئاماژەی وەلا کردووە:

**وَإِذَ أَخَذَ اللّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلاَ تَكْتُمُونَهُ فَنَبَذُوهُ وَرَاء ظُهُورِهِمْ وَاشْتَرَوْاْ بِهِ ثَمَناً قَلِيلاً فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ**

**یادێک لەو کاتە وەکە کە خودا دەگەڵ ئەو کەسانەی کە کتێبیان پێ درابوو پەیمانی بەست کە بێگومان پێویستە جوان ئەو کتێبە ڕوون کەنەوە بۆ خەڵکی و نەیشارنەوە، کەچی ئەو پەیمانەی خودایان خستە پاش گوێ و بە نرخێ کەم گۆڕییانەوە، کەواتە مامڵەیەکی زۆر ناحەز و دزێو دەکەن.**

٣. پەیمانی سێ کە خودای تەعالا لە ئینسانی وەرگرتووە واتە پێغەمبەران مەبەست و مانای ئایەتی ٨١ی ئالی عیمرانە کە بە پوخت و پاراوی لە سەری دواوین.

**تیوتیوە:**

حەزرەتی عەلی و ابن‌عباس ڕەزای خودایان لێ بێ فەرموویانە: مانای ئەو پەیمانە کە خودا وەریگرتووە ئاوا دێتە بەر چاو و دڵ: ئەو پەیمانە خودای تەعالا لە تەواوی پێغەمبەرانی وەرگرتووە، کە تەسدیقی پێغەمبەرایەتی محمد المصطفی بکەن و یاریدەی بدەن، لە هەر دەور و زەمانێکدا بن، ئەگەر وا هاتە ڕوو لە دەوری محەمەددا بوون، باوەڕی پێ بێنن و وەزیفەکەی خۆو وەلانێن، دەستووراتی ئەو بگرنە بەر و یاریدەی بدەن، و هەروەها هەر یەک لە پێغەمبەران ئۆمەتی خۆی بۆ تەسدیق و یاریدەی ئەو محەمەدە شارەزا و ئاگاداری و هان بدا، زۆربەی زانایان لە سەر ئەو نەزەرە هەن و ئایەتەکەش حەواڵەی ئەو بۆچوونە دەکەن. (روح المعانی، ٢٧٥/٣)

دڵ لە سەر جوملەی ﴿قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي قَالُواْ أَقْرَرْنَا﴾ (واتە ئایەتی ٨١ی عیمران) *خودا ڕوو بەو عالەمە دەفەرموێ: ئایا ئێوە ئیقرارو پێ کرد بەو پەیمانە و* **ددانو** *پێدا هێنا؟ بەڵێن و پەیمانی منتان وەرگرتووە؟ ئەوانیش کوتیان بەڵێ،* **ددانمان** *پێدا هێنا*، هەست بە شتێک دەکا، شتەکەش لە سەر ئایەتی ٨٢ڕا وەک خەتەرێکی گەورە هەست دەکرێ و سەرچاوە دەگرێ. شتەکەش دەبێ ئەوە بێ: کێ لادا لەو پەیمانە لە ئایینی ڕەحمەت وەلا دەکەوێ، جا سەیر کە ئایەتەکەی ٨٢ی عیمران:

**فَمَن تَوَلَّى بَعْدَ ذَلِكَ فَأُولَـئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٨٢﴾** ئالی عیمران
**جا هەر کەسێک لە پاش ئەو (پەیمانە) پشتی هەڵکرد، ئەوانەن لادەر و لاڕێ لە ئایین.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە وەسەر سیما و ناوەرۆکی ئایەتی ٨٢:**

ئەوەی ڕووی لەو پەیمانە وەرگێڕا، پاش ئەوەی کە قبوولی ئەو پەیمانەی کردووە ئەوە کەسانێکی بەدکار و بەدڕەفتار و بێباوەڕن بە دەستووراتی ئایینی. بە کورتی و بە کوردی، ئەگەر بێتو کەسێک بەو هەموو دار و لەلەی لە سەر ئیمان و باوەڕی بە خودا و ڕەسووڵ و هەروا بەو هەموو نیشان و بەڵگانەی کە لە کتێبەکانی پێشوودا نیشان دران ملی بادا و ڕووی وەرگێڕا، ئەوە بێگومانە فاسقە و لە دین بەدەرە.

بۆوەی بتوانین باشتر لە مەبەست تێبگەین پێویستە بچینە خزمەت ئایەتی ٨٣ی ئالی عیمران:

**أَفَغَيْرَ دِينِ اللّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾** ئالی عیمران
**ئایا جگە لە دینی خودا دینێکی دیکە هەڵدەبژێرن؟! لە کاتێکدا ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، بە ڕازی یا بە ناڕازی ملکەچی فەرمانی ئەون! سەرەنجامیش بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.**

**ئاوڕ دانەوە و تێڕوانین لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ٨٣:**

پاش ئەوەی کە خودای تەعالا ئەوەی تێگەیاندن دینی خودا هەموو لە ئەساسدا یەکە و جیاوازی نییە لە ناویانا، نە لە تاق و تەنیایی خودادا نە لە زیندووبوونەوە و سوئال و پرسیاری ئاخرەتدا، نە لە وەسفی بەهەشت و دۆزەخا، و پێغەمبەران هەموو یەکسانن لە باوەڕی بەوانە، تەماشا لە سەر ئەو بەڵگە و دەلیلانە، باوەڕ ناکەن بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام، وەشوێن دینی غەیری خودا دەکەون ئەو بێباوەڕانە، جا بۆیە پێیان دەکوترێ: ئایا وەدوای دینی غەیری خودا دەکەون؟ دەگەڵ ئەوەی هەچی لە ئاسمان و زەویدایە هەر هەمووی ملکەچی خودا دەکەن و دە فەرمانی خودادان ـ بیانهەوێ و نەیانهەوێ ـ؟! واتە بێ ئیختیار ملکەچی خودان، بێ ئەوەی کەسێ بتوانێ یاسا و نیزامی خودا بگۆڕێ، سەراپای بوونەوەر لە ژێر ئیرادە و قەزای خودادا سەر دە ڕێدا، با بە دڵیش نەیهەوێ، بە تێکڕایی کائینات بە هەرچی هەیە دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا و بەردەستی ئەو پرسیارە دەکرێ لە ئاکار و کرداریان، ئەودەم لە بارەگا

و دادگای خودادا مل بۆ کویێ با دەدەن؟! هیچ پەنا و پەسیو نـامێنێ، و هـیچ تکـا و تکاکـار و بەرتیل نامێنێ.

دەو ئایەتەدا باس لە سەر ئایینی ئیسـلامە، بانگێشـتنی ئەهلـی کتێـب خـاوەنی ئایینەکـانی ڕابردوو بۆ لای ئەو ئایینە پیرۆزە دەکرێ، پرسیار دەکرێ لە ئەهلی کتێب و بـاقی هۆزەکـان، بـۆ مەگەر ئایینی خودا بە غەیرەز تەسلیم بوون دە بەرابەر یاسای باریتەعالا شتێکی دیـکە هەیە!؟ نەخێر، بەڵکە دەبێ ئایینی ئاسمانی کە یاسایەکە دە خزمەتی ئینسان و مەسڵەحەتی بەشـەردایە، تەسلیمی بی، کەوایە ئەو بێباوەڕانەی یەهوود و گاور و تەرسایانە کە غەیری ئایینی ئیسـلامیان قبووڵە و ئیسلامیان ناوێ، نیشانەی خۆ لادانیانە لە سیراتی موستەقیم واتە ڕێی ڕاست، ڕامێنە و سرنج بگرە لەوەی کە خودای تەعالا دەفەرموێ: هەچی لە ئاسمانەکان و زەویدانە، موسوڵمانن واتە تەسلیمی خودا و یاسای خودان هەچی دە ئاسمان و زەویدان: ﴿وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا﴾ واتە هەرچی دە ئاسمان و زەویدان تەسلیمی خودا و یاسای خودان، وایە بە خۆشی و وا هەیە بە ناخۆشی. یانی نیزامی دەستووراتی باری دە ناو عـالەمی بوونـدا بە دوو شێوە دەبیندرێ و سەردەگرێ:

١. دەستووراتی بوون لە سەر ئەساسی یاسـای سرشـت و یـا سـەرووی سرشـت بە سـەر تەواوی بوونەوەردا دەستەڵاتداری و حوکم دەدا و دەکا، ملبادان و سەرپێچی لەو یاسا سرشتە، بە قیمەتی نابوودی و نەمان تەواو دەبێ. نموونە ڕۆژ تەسـلیمی نیزامـی ئەزەلە چـونکە بە پێـی ئەرکـی پێسـپێردراو دەبەر یەک نـراوی ئەزەلـی وەگەڕ خـراوە، کە پێـی دەکـوترێ تەسـلیمی تەکوینی، لادانی ڕۆژ لەو یاسایە سەر دەکێشێتە نابوودی و نەمانی نیزامی کائینات.

٢. یاسـا و دەسـتووراتی تەشریعـی، واتە نەزم و نیزامـی بـاری لەمەڕ حـاوانەوە و ژیـانی ئینسانی، کە بە شێوەی ئەرک و یاسـای خـودا دامەزراوە، دەبـێ تەسـلیمی بـین، بەڵام وا هەیە دەستەیەک لە سەرڕۆ و بێئەدەبان ڕووی لێ وەردەگێڕن بە ناوی کافر دێنە دەر و خۆ دەنـوێنن، واش هەیە دەستەیەک وەریدەگرن و ئیتاعەی دەکەن بە ناوی موسوڵمان دێنە دەر و خۆ دەنوێنن.

ئەمما دەگەڵ ئەو دەستەی کە لاڕێ دەڕۆن و سەر لە فەرمانی خودا لادەدەن و دەچنە دەرێ لە ژێر فەرمانی خودا، دە بەرابەر یاسای تەکوینی خودادا هەر تەسلیمن جەبرەن، بەڵام لە کـاتی بێ دەرد و بەڵا و سەختی وەشوێن یاسای خودا ناکەون لە بابەت دەستووراتی ئایینییەوە، ئەمما لە کاتی سەختی و تاڵی و بەڵادا ئیجبارەن تەسلیمی خودا دەبن.

ئایەتی ﴿وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ بە واتای هەچی لە ئاسمان و زەوی و هەوادایە ملْکی خودایە و بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە. هاوار و بانگاوازی بەگوڕ و تینە بۆ ئەوەی لە ئایینی خودا دەبێ لانەدرێ، هەچی لادا بێگومانە نەفام و نەزان و کەرە، وەک بێباوەڕان، چونکە کێ بزانێ نەجاتبوونی لە دەست کێ نییە و نابێ بۆ هەر کوێ بچێ لە ئاخردا هەر دەهێندرێتەوە لای ئەو، دەبێ هەر لە هەوەڵەوە خۆ بخاتە پەنای ئەو، ئەگینا بە کەر و نەفام و نەزانی خۆی پێوە دەبێ، وەک بێباوەڕان.

دڵ دەیهەوێ بزانێ ئەوەی «هەچی لە ئەرز و ئاسماندایە فەرمانبەرداری خودان» یانی چی؟

پاش هەڵسەنگاندن و بەراوردی ورد و زۆر دەردەکەوێ لێم کە (اسلم)ی ناو ئایەتەکە بە واتای ئیسلام دێتە ڕوو یانی ئایا غەیری دینی خودا کە ئیسلامە داوا دەکەن و قبووڵ دەکەن؟ دەگەڵ ئەوەی هەچی لە ئاسمان و زەویدایە تەسلیمی خودان! واتە فەرمانبەردار و ڕاوەستاوی خودان! جا لە سەر ئەو تەعبیرە مانای ﴿وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ یانی هەرچی لە ئەرز و ئاسماندا هەیە تەسلیمی خودان، خۆش یا ناخۆش؛ ئا ئەوە دوو شت لە خۆ دەگرێ:

١. لە هەوەڵەوە دەبێ ئەوە بزاندرێ کە ئیسلام واتە ئیتاعە و فەرمانبەرداری و تەسلیم، پاش ئەوەی کە لەمەڕ ئیسلام ئاوا چوویە پێش کە بە مانای تەسلیمە، تەسلیمبوونی ئەوانەی کە وا لە ئاسمانەکان و زەویدان، ئەوەی لێ هەست دەکرێ: هەچی هەیە بە غەیرەز خودای پاک و بێهاوتا هۆی بوونیان خودی زاتیانە، واتە بە زاتی خۆیان بوونیان ڕاوەستاوە، خۆ ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە (ممکن بالذات) واتە بوون بە هۆی زاتەوە ناتوانێ ببێ تا ئەو زاتە نەبێ، و هەروا ناشکرێ نەبێ (عدم)، تا زاتی نەچێتە قۆناغی عەدەم، لە سەر ئەو یاسا و ئەساسە هەچی غەیری خودایە، فەرمانبەر و ڕاوەستاو بە زاتی پاکی خودایە، لە هەر تک لاوە هەم لە لای بوونەوە، هەم لە لای نەبوونەوە، ئەئەوە ئاخرین قۆناغی ئیتاعەیە، ئەدێرەدا دەردەکەوێ (وَلَهُ أَسْلَمَ) پاوانی خودایە، بە واتای ئەوە کە هەچی لە ئاسمان و زەویدانە تەنیا و تەنیا تەسلیمی خودانە، خۆش یا ناخۆش، چونکە «واجب الوجود» هەر دەبێ یەک بێ، هەچی دێ و دەبێ، بە ئەمری ئەو دەبێ، ئەگەر ئەویش نەبێ، هیچ نابێ؛ جا ئەدێرەدایە کە خودای تەعالا لە چەند شوێندا ئیشارەی وەلا دەکا بە وەسیلەی ئایەتەکانی ١٥ی سوورەتی ڕەعد، ٤٤ی سوورەتی ئەسرا ....

وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلالُهُم بِالْغُدُوِّ وَالآصَالِ ﴿١٥﴾ رعد

**ئەوەی وا لە ئاسمانەکان و زەویدایە، بە ڕەزامەندی یا بە ناڕەزایەتی سێبەرەکانیشیان بەیانی و ئێواران بۆ خودا کڕنۆش دەبەن و ملکەچن.**

ئەو ئایەتە پێمان دەڵێ هەچی هەیە لە هەر کوێ هەیە، ئی خودایە و دە فەرمانی ئەودایە.

**تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤٤﴾** اسرى
**هەر حەوت توێتوێی ئاسمانەکان و زەوی و بە هەمــوو ئەوانەی وا هەن لە ناویانــدا، پــاک و خاوێنی خودا و بێعەیبی ئەو دەردەبڕن، هیچ شتێک نییە یاد و سپاس و پەسنی خـودا نەکـات، بەڵام ئێوە لە زیکر و سپاسەکانیان تێناگەن، بەڕاستی خودا نەرم و هێدی و ببوورە.**

ئەو ئایەتە ئەوەمان پێ دەڵێ کە هەچی دێ و دەبێ لەوڕایە و ببوورە و لەسەرەخۆشـە، هەر ئەوەندەی پێویستە داویە بە ئینسانی، لەوی بەولاوە ڕێی نەداوە بزاندرێ.

٢. لە جوملەی ﴿وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ ئەوە هەست دەکرێ و بە تەئکیـد بـاوەڕیش دەکـرێ کە هەچـی خـودا بـیهەوێ و حەز کـا دەبـێ و کەسیش توانای بەرگری نییە. جا پێی خۆش بێ ئینسـان یـا پێـی نـاخۆش بـێ، مـل بـۆ خـودا ڕادەکێشێ. موسوڵمانی چاک و پاک و ڕاست هەچی سەر وە دین بـێ، مـلکەچی بـۆ دەکـا و دەیـهەوێ، ئەگەر خـۆش بـێ و بە ئـارەزووی بـێ ئەوە بـابەتی سرشـت و هەسـتیەتی، وەک لەشساغی و سامانداری و دەستەڵاتداری، ئەگەر شتەکە ناخۆش بێ دەگەڵ ئارەزوو نەیەتەوە، وەک پیری و زەلیلی و فەقیری، ئەوە دیسان لە سەری خۆڕاگرە و بە ئومێد و هیوا دەبێ، چونکە لە خوداوەی دەزانێ موسوڵمان، ئەمما بێباوەڕ و کافر شتێک کە بابەت نەبێ بۆیـان دەیـدزن و دەیبوغزن چونکە باوەڕیان بە قەزای خودا نییە، بە کورتی موسوڵمان هەچی لە لای خوداوە بێ، خۆش یا ناخۆش، پێی ڕازین، بەڵام بێباوەڕ ئەوەی لە لای خـوداوە بـێ و ویسـتی ئەو نەبـێ، خۆشی ناوێ و نایهەوێ، هەر وەک لە ئیشارەی ئایەتی ٨٥ی غافر ئەوە دەردەکەوێ:

**فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا سُنَّتَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْكَافِرُونَ**
**کە توند و تیژی و جەزرەبەی ئێمەیان دی، ئیتر بڕواکەیان هیچ سوودی پێ نەدان باو و نەریتی خودا بووە لە نێوان بەندەکانیدا لەوەیدایە بێبڕوایان زەرەر دەکەن.**

ئەگەرچی ئەوەش یەقینە و بە سبووت گەیوە کە هەچـی بـوونەوەرە بە خـودایەتی خـودای باوەڕە و دەزانن پەروەرەندەیە بە پێی ئیشاراتی ئایەتی ٦١ی عەنکەبووت:

**وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ**
**ئەگەر پرسیاریشیان لێ کەی، کێ ئاسمانەکان و ئەو زەویەی دروست کردووە!؟ کـێ مانـگ و ڕۆژی ڕام کردووە؟ بە بێ گومان دەڵێن خودا، کەواتە لە ڕاستەقینە لادەدرێن!؟**

ئەمما ئەگەر ئەو ئیقرارە دەکەن ئی ویست و هەستی دڵیان نییە گەلی بێباوەڕ، ئەگەرچـی پەیمانی ڕۆژی ئەزەل ئەوە سابت دەکا وەعدە و ئیتاعەی خودا لە لایەن نەسـلی ئینسـان دراوە، وەک ئایەتی ١٧٢ی ئەعراف نیشانی دەدا:

**وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى شَهِدْنَا أَن تَقُولُواْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ**
**ئەو کاتەش وەبیر بێنەوە کە پەروەردگارت هەموو وەچە و نەوەکان کە لە پشت ئادەمیزاددا بوو ئامادەی کرد، کردنیشی بە شاهید بە سەر خۆیانەوە، کـوتی: ئایـا مـن پەروەردگـاری ئێـوە نـیم! کوتیان هەرگیز ئەتۆ نـابێ پەروەردگـاری ئـێمە نەبیـت! ئەمەش هەر لە بەر ئەوە بـوو نەکـا لە ڕۆژی پەسڵاندا بڵێن: بێ گومان ئێمە لەمە بێئاگا بووین.**

**ئاوڕێک بە وردی وەسەر ناوەرۆکی ئایەتی ١٧٢ی ئەعراف:**

وەیادی خۆت بێنەوە کە خودای تەعالا لە سرشـتی ئینسـانی عەهـد و پەیمانـی سـتاند کە باوەڕم پێ بکەن کە پەروەرەندەی وانم، وەک دەڵێن خودای تەعالا کـاتێ ئـادەمی سـازد کـرد و دەبەر یەکی نا، دەستی قودرەتی بە پشتی ئادەمدا هێنا بەرە و وەچەی ئادەم هەچی بوو وەدەرنـا، ڕووی تێکردن و پەیمانی لە سەراپایان ساند لە سەر ئەوەی پەروەرەندەی وانم و خالقی وانم، ئا بەو شێوەیە (أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ) هەموویان تێکڕا کوتیان بەڵێ؛ یانی سرشتی ئینسانی لە سەر خـودا بە یەکزانی هاتۆتە ڕوو، و لە سەر خۆشیان ئەو شاهیدیان داوە، ئەو شـاهیدە و ئەو پەیـمانەش هۆیەکەی ئەوەیە نەکا ڕۆژی قیامەت بڵێن ئێمە بێخەبەر لەوەی بـووین، یـانی ڕۆژی حیسـابێ نەکا بڵێن ئێمە لەو پەیمانە کە باوەڕییە بە خودای بێهاوتا بێخەبەرین.

ڕا و بۆچـوونی زانایـان لە سـەر نـاوەرۆکی ئـایەتی ١٧٢ی ئەعـراف هەیە و زۆرە، ئەوەش

نیشــانەی ئەوەیە نەزەر لە ســەر ئەو پەیمانــی ڕۆژی ئەلەســت واتە ئەزەل دەگەڵ بەرەی ئینســان هاڵۆزە، ئەقڵ هەچی بۆی دەچــێ بە پــارێزەوەیە چــونکە یەقینــی لە ســەر پەیــمانەکە هەیە بەڵام نازانێ شــێوە و چــۆنیەتی پەیــمانەکە چــۆنە؟ واتە دەگەڵ ئەقــڵە، دەگەڵ سرشــتە، بە وەســیلەی پێغەمبەران و کتێبە ئاسمانییەکانە یا ڕاستەوخۆ دەگەڵ ڕوحی ئینسانە؟!

بە هەر حاڵ دەچینە لای زانایانی قورئــان و ئەهلــی نەزەر و خاوەنــانی ئەقــڵ و شــعوور و هەستی بەتین، کە کوتوویانە خودای تەعالا وەچە و بەرەی ئینسانی لە پشــت و بەرۆکــی دای و بابیان لە سەر ئەساسی نطفە و مضغە سەرەو بەرەی پێ کردووە و دایمەزراندووە دە ناو ڕەحەمی دایکاندا، پاشان لە سەر بیچمی تایبەتی ئینسانی بە تەواوی نەخش و نیگاری پێک هێنــاوە، جــا ئەو شکڵ و نەخش و نیگــارە دەو کارگــایە گۆشــتینەدا واتە نــاو ڕەحەمــی دایکــان بەو هەمــوو ئاڵوگۆڕەی کە بە سەری هێندراوە دەتوانێ شاهید بێ هەم لە ســەر بــوونی خــۆی هەم لە ســەر سازکەر و ســازدەری خــۆی کە خــودای بێهاوتــایە کە بەبــێ ئــامراز و کەرەســە و وەســیلە ئەو بوونەوەرە عەزیمە بێوێنەیە دەو جێگا تەنگ و تاریکەدا پێــک بێنــێ. ئەو کارەســاتە شــاهیدە لە سەر بوونی خودا و شاهیدە لەسەر ڕەبێ بێهاوەتا و ئیقرارە بە ڕەبی خۆی بۆیە کوتوویانە (بلیٰ) ئەگەر ئەو قالووبەلایە بە زمان نییە، بەڵکە هەر بوونەکەی بەو شێوەیە شــاهید و ئیقــرارە لە ســەر خالق و ڕەبی. دیارە لە قورئاندا ئەو نموونە هەیە کە شت بە زمان نیــیە بەڵــکە بە حــاڵ و حەواڵە وەک لە ئایەتی ١١ سووڕەی فصلّتدا هەست دەکرێ. ورد بڕوانە لێی:

> **ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ اِئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ**
> **ئەوجار ڕووی کردە ئاسمان کە تاریکایی و دووکەڵ بوو، جا کوتی بە ئاسمان و زەوی ڕازیــن یــا ناڕازین، ئادەی وەرن؛ کوتیان ئاوا هاتین بە ملکەچی و گوێڕایەڵییەوە.**

خۆ ئەوە یەقینە کە ئەو پێکوتنە و ئەو وڵامەی ئاســمان و زەوی بە زمــان نەبــوون بەڵــکە بە حاڵ و حەواڵ بووە.

یا وەک ئایەتی ٨٣ یاسین ئاماژەی وەلا دەکا: ﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾

**تیوتیوە:**

کاتێ کە خودا لە پشتی بەرەی ئادەم وەچە و مەچە و بەرەی ئینســانی ســاز دا و گێڕانــی بە

شاهید لە سەر خۆیان کە ئایا من خودای وە نیم؟ کوتیان بەڵێ خودامانی؛ نەکـا ڕۆژی قیـامەت بڵێن ئێمە لەو قەول و قەرارە بێ‌ئاگاین؛ ئەو گوفتارە بەو شـێوەیە ئامـاژەی تەواوە وەلای ئەوەی کە دە ناو قووڵایی ڕۆحی ئینسان ئیمان و باوەڕی بە یەکتایی خـودا و پەروەرەنـدەی ئەو هەیە و ناژراوە، ئەوەش دەگەڕێتەوە لای ئەوەی کە ڕوحەن و سرشتەن ئینسان خودا بە یەکتـا دەزانـێ و دەناسێ.

و هەروا ئەو سـوئال و جـوابەی خـودا و ڕحـی بەرەی ئینسـان کە بە وەسـیلەی ﴿أَلَسْـتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى شَهِدْنَا﴾ سـەری گرتـووە بە زمـانی حـاڵ و قـاڵ نیـیە، بەڵـکە بە زمـانی (کـن فیکون)ە، واتە ببە و بوویە؛ ئەوەش پێی دەکوترێ زمـانی ئـافەرینش؛ یـانی خـودا دە هەسـتەی ڕوحی بەشەریدا ناشتوویەتی و چاندوویەتی ئەو هێزەی کە قبووڵی یەکەتی خـودا و خـالقیەتی خودا دەکا و بکا. یانی ئینسان هەر ئەندازە لاسار و سەرەڕۆ و یاغی و خۆبەزۆرزان بێ، دەزانـێ مالکی خۆی نییە چونکە ئەگەر توانای ئینسان مالکی خۆی با دەبوو بشـتوانێ مـردن و نەمـانی خۆی پێش بگرتایە، جا ئەدێرەدایە ئینسان دە کاتی خۆیدا پاش ماندوو بوون و خۆ لێـر و لەوێ دان و شل‌وکوت بوون دەزانێ ناتوانێ بە نیازی کافی و وافـی خـۆی بگـا، نیـازی بە هێزێکـی مالک و مدبّر و پێکهێنەری نیازەکانی هەیە، کە ئەویش خودای بەتوانا و کارسازە.

دێرەدا فایدە و ڕازی ئەو پەیمانی (أَلَسْـتَ بِـرَبِّكُمْ) دەردەکەوێ، کە ڕازەکەی ئەوەیە: بەرەی ئینسان ڕۆژی خۆی نەڵێ و نەتوانێ بڵێ لە بابەت یەکتایی خودا و توانایی خودا بێ‌ئاگام بووم، بێ‌ئاگاش بێ‌تاوان و بێ‌تەکلیفە.



ئەوجار پاش ئەوەی کە خودای تەعالا پەیمانی لە هەموو پێغەمبەرەکـان وەرگـرت کە بـڕوا بێنن بە پێغەمبەرانی دێن لە دواتان، و هەروا دروستیش نییە بۆ خاوەن نامەکـان بێ‌بـڕوا بـن بەو پێغەمبەرانەی دێن لە دوای پێغەمـبەری وان، ئەوجـار دەسـتوور دەدا بە پێغەمـبەری ئیسـلام کە بۆخۆی و ئۆمەتەکەی باوەڕیان ببێ بە هەچی پێغەمبەری پێش خۆی بووە، بۆ شـاهیدی لەسـەر بڕیار و بابەتەکە دەچینە خزەمت ئایەتی ٨٤ی ئالی عیمران:

**قُلْ آمَنَّا بِاللّهِ وَمَا أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَالنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ﴿٨٤﴾** ئالی عیمران

**بڵێ: وا ئیمانم هێنا بە خودا و بەوەش کە هاتۆتە خوارەوە بۆمان، بەوەش هاتۆتە خوارەوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و یەعقووب و بەرە و بەرەچەی، باوەڕیشمان هەیە بەوەی کە لە لایەن پەروەردگاریانەوە بۆ مووسا و عیسا و هەموو پێغەمبەرەکانی بەخشیوە، هەرگیز جیاوازی ناخەینە نێوان هیچیان، ئێمە هەر ملکەچ و گوێڕایەڵی ئەوین.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ٨٤:**

بڵێ ئەی محەمەدﷺ بۆخۆم و بە شوێنکەوتووانمەوە بڕوامان هێنا بە خودایەکی ئەزەلی و ئەبەدی و بێشەریک و هاوتا لە سیفات و زاتدا، و هەروا بڕوامان هێنا بەو قورئانە وەحیەی کە لە لایەن خوداوە نێردراوەتە سەر زەوی بە سەر ئینسانی و هەروا بڕواشمان هێنا بەوەی کە لە ئاسمانەوە دابەزیوەتە سەر ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووبی کوڕی ئیسحاق و کوڕەزا و نەوەکانی، و هەروا بڕوامان هێنا بەوەی کە دابەزیوەتە سەر مووسا کە تەوڕاتە، و هەروا بڕوامان هێنا بەوەی هاتووە بۆ عیسا کە ئینجیلە، و هەروا ئیمانمان هێنا بەوەی کە دابەزیوەتە سەر پێغەمبەرەکانی وەک شیث، ئیدریس، داود، سولەیمان، ئەیووب و شوعەیب و هەروا ئەوانەی کە خودا دە قورئاندا ناودێری نەکردوون، کە خاوەن نامەن لە لایەن خوداوە. و جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ کامێک لە پێغەمبەراندا، و بڕوامان بە هەمان هەیە کە حەق بوون دەستووراتیان دە کاتی خۆیاندا، نەک وەک جوولەکە و گاورەکان بە هەندێکیان بڕوا دێنن و بە هەندێکیان بڕوا ناهێنن، و ئێمە بۆ خودای واحید گەردنکەچین بۆ بەجێهێنانی ئەمر و نەهی خودا.

**چەند پرسیارێکی نەحوی لە سەر تەرتیب و نیزامی جومەلاتی ئایەتەکە** دێنە پێش، نیازیان بە جواب دەبێ، نابێ بە سەریاندا باز درێ و قووت درێن، بەڵکە پێویستە حەولێکیان لە دوو بدرێ.

پرسیارەکان:

١. پرسیار دەکرێ: دە ناو ئایەتەکەدا بۆچی زەمیری «نا» کە جەمعە، دە ناو کەلیمەی «آمنّا» بە کار براوە لە باتی ئەوەی کەلیمەی «قل» فەردە، دەبایە «آمنت» هاتبایە؟ ئێستا کە ئەو تەرتیبە ئاوا هاتووە بێ سوڕ و ڕاز نییە و دەشبێ بۆ دۆزینەوەی ئەو سوڕ و ڕازە تێکۆشین و بە سەریدا بازێ نەدەین. جا بە پێی ڕاوێژ و بەراوەردی ئایەتەکە و مەبەستی نیهایی ئایەتەکە دەبێ سوڕ و ڕازی ئەو تەرتیبە ئەوە بێ: پێغەمبەر کە دەو ڕاگەیاندنەدا واتە باوەڕەی بە خودا و (ما انزل)، دەبێ

لە لایەن خۆی و موسوڵمانانەوە بدوێ و قسە بکا بە تەنیا، کەوایە تەرەفی وەحی تەنیا پێغەمبەرە، ئۆمەت شەریک نییە، جا بۆیە خودا فەرمانی بە «قل» دا بە پێغەمبەر کە ئەو بڵێ: «آمنّـا»، کە ئەو فەردە بەڵام دە «آمنا»دا کە وشـەی «نـا» جەمـعە، ئەوە بـاری ئـیمانە بە وەحـدانیەتی خـودا هەم پێغەمبەر هەم ئۆمەت تێیدا شەریکن کەوایە بۆیە «نا» بە جەمع هاتووە.

یا دەتوانین بڵێین لەبەر ڕێزگرتن و ڕێزلێنان لە پێغەمبەری خودا لە باتی «آمنـت» «آمنّـا»ی لە قەولی پێغەمبەرڕا هێناوە کە دێرەدا ئۆمەتیش دەپاڵ خزیوە.

لە جوملەی (قُلْ آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ عَلَيْنَا)دا ئەو هەستە دەکـرێ کە ئاگـاداری بە یەهـوود و نەسارایە، ددان بنێن بە ڕاستی پێغەمبەر و پێغەمبەرایەتی ئەودا.

٢. ئەو پرسـیارەش دێـتە ڕوو کە بـۆچی (قـل) کە فەردە و هێنـدراوە، بەڵام بە دووی ئەودا (آمنّا)ی جەمع هاتووە و (آمنت) نەهاتووە؟ دیارە ئەو جیاوازییە و ئەو شێوە تەرتیبە بـێ سـوڕ و ڕاز نییە، زۆر پێویست و ئەساسییە پەیسەری ئەو ڕاز و سوڕە بگیـردرێ و پـاش‌قول نەدرێ. ئەو سوڕ و ڕازەش دەبێ ئاوا بەراوەرد بکرێ: خودای تەعالا هەر دەگەڵ پێغەمبەر دەدوێ بە وەحی، دەگەڵ کەسی دی نادوێ کەوایە لەبابەت ڕوو تێکـردن بە وەحـی هەر پێغەمـبەرە و کەسـی دی شەریک نییە، جا بۆیە خودا واژەی (قل) کە بۆ فەردە، دەکاری هێناوە. بەڵام دە باوەڕ پێبوون و ئیقرار بە تەنیایی خودا پێغەمبەر و ئۆمەت شەریکن جا بۆیە خودای تەعالا لە زاری پێغەمبەرەوە (آمنا)ی دەکار هێناوە.

٣. ئەو پرسیارەش ڕووبەڕوومان دێ و لێمان لانادا و ناشتوانین لە بەری هەڵێین: بـۆچی دە ئـایەتی ١٣٦ی بەقەرەدا (مـا أُنـزِلَ إِلَيْنـا) دەکـار کـراوە و دە ئـایەتی ٨٤ی ئـالی عیمرانـدا (مـا أُنزِلَ عَلَيْنا) بەکار براوە؟ دیارە ئەو شێوە تەرتیبەش بێ ڕاز و خاڵی لە سوڕ نییە! جا خۆ پێویسـتە ئەو ڕاز و سوڕەش نەخرێتە پاش گوێ، دیارە بە پێی هەڵسەنگاندنی ناوەرۆکی ئایەتەکان سوڕ و ڕازەکان ئاوا دێنە بەر چاو: دابەزینی قورئان هەم ئەوەڵـی هەیە، هەم ئـاخری هەیە، هەوەڵەکەی بەرەکەت و ڕەحمەتە، ئاخرەکەشی شەئنی پێغەمبەرە، دیارە بەشی هەوڵەی دابەزینـی ئـایەت کە ڕەحمەت و بەرەکەتە، بەرزە لە سەرووی هەموو بەرزاییەکە (اعلا)، ئەوە دەبێ کەلیمەی ئەعلای بۆ دەکار کرێ کە (علی)یە، چونکە لە (علی) بـابەتە بـۆ مەقـامی بەرز و بڵنـد، بەشـی ئـاخری ئایەکەش کە شەئنی پێغەمبەرانە، بۆ نیهایەتی مەبەست و غـایەش (إلـی) بەکـار دەبـرێ، کەوایە ڕەوایە لەفزی (إلی) دەکار کرێ، جا لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ بکوترێ لەفزی (علی) دە مەقامی

ئایەتی ١٣٦ی بەقەرەدا کۆ بۆ (اعلی) بابەتە، دەبێ دەکار کرێ، و لەفزی (إلى)ش کە بۆ ئینهـای غایەتە، بابەتە لە سەر ئایەتی ٨٤ی ئالی عیمران دەکار کرێ کە شەئنی ئینسانە (ڕەسوولان).

٤. ئەو پرسیارەش خۆی دەخزێنێتە پاڵ دڵـمانەوە کە بـۆچی ئـیمان و بـاوەڕی بە خـودا لە پێشەوەی ئیمان و باوەڕی بە قورئانە دەناو ئایەتەکەدا؟ و هەروا ئیمان و باوەڕی بە قورئـانیش لە پێشەوەی ئیمان و باوەڕییە بە کتێبەکانی دیکەی ئاسـمانی؟ دەحاڵێکـدا کە کتێبەکـانی دیـکەی ئاسمانی دە پێش قورئاندا دابەزیون و بوون!

دەبێ بکوترێ ئەو ماستەش بێ موو نییە! واتە ئەو تەرتیبەش خاڵی لە سوڕ و ڕاز نییە؛ دەبێ حەول و تێکۆشان وەگەڕ خرێن تاکوو ئەو ڕاز و سوڕەش وەدۆزرێن. جا بە پێی هەڵس‌وکەوت و حەول و تەقەلا ئەو ڕاز و سـوڕانەش ئـاوا هەسـت پـێ کـردوون: جـارێ لە هەوەڵەوە ئەوە سەلمێندراوە کە ئیمان بە خودا سەرچاوەیە و ئەساسی ئیمانە، دەبێ لە هەر بارێکەوە لە پێشـەوە بـێ، بەڵام پـێش کەوتنـی بـاوڕەی بە قورئـان کە لە پێشـەوەی بـاوەڕی بە کتێبەکـانی دیـکەی ئاسمانییە، لە تەرتیبی ئـایەتی ٨٤دا دەبـێ لە بەر ئەوەی بـێ کە ئەو ئـایەتە لە وەسـفی ئـیمان و باوەڕی موسوڵمانانە، ئیمان و باوەڕی موسوڵمانانیش ئەساسەکەی قورئانە کە جامعترین کتێبـی ئاســمانییە و دەسـکاری‌نەکراوە، شـایان و ڕەوای پێش‌کەوتـنە، چـونکە بە جـامعترین کتێـب دەژمێردرێ لە بابەتی دەسکاری‌نەکردن و مەبەست و مەتڵەبدا. (بـۆ زێـدە زانـین تفسـیر کبیـر، هەمان ئایەت)

(اسباط) جەمعی (سبط)ە، بە پێی یاسای فەرهەنگی عەرەب بە زۆری بۆ ئەولادانـی نێـرینە دەکار دەکرێ، بەڵام لەمەڕ ئەولادانی پێغەمـبەر بـۆ مێیـانیش بەکـار بـراوە، وەک ئەوە کە کـوترا (سبط رسول الله) واتە کچ و کوڕ، بۆ حەزرەتی حەسەن و حوسێن، کچەکانیش وەک حەزرەتی فاتمە و ڕوقەییە و ئوممەکولسوم دەکار کـراوە بـێ ئیشـکالە. اسـباطی قورئـان واتە ئەولادانـی حەزرەتی ئیسحاق و یەعقووب. (تبیین الفرقان، ٣٢٨/٣)

پرسیارێک خۆ دەخزێنێتە ناو دڵەوە، وەک ئەوە: کتێبی صحف بۆ سەر حەزرەتـی ئیبراهـیم دابەزیوە سابتە و یەقینە، بەڵام بۆ سەر حەزرەتی ئیسماعل و ئیسحاق و یەعقـووب ئەوە سـابت نییە کە صحف بۆ سەریان دابەزیبێ، بەڵکە ئەوانە هەر ڕاگەیێنەری صحف بـوون، جـا لە سـەر ئەو ئەساسە عەتفی ئەوانە واتە گەڕانەوەی ئەو پێغەمبەرانە بۆ سەر حەزرەتی ئیبراهـیم لە بـابەت نازڵبوونی کتێب بۆ سەریان چییە؟

وڵام:

(ما انزل) دوو جۆرە: حەقیقی و مەجازی؛ صحفی حەزرەتی ئیبراهیم بە حەقیقەت و ڕاستی بۆ سەر ئەوانە دابەزیوە، بەڵام نەوە و وەچەی ئەوانە کە وەشوێن وان کەوتوون و ئەحکامات و دەستووراتێکی کە لە صحفیان وەرگرتووە بە پوختی دەکاریان هێناوە لە سەری سابیت بوون، ئە لەو بارەوە دەتوانین بڵێین بۆ سەر وانیش دابەزیوە، جا با واسیتە و مەجازیش بێ.

ئەو پرسیارەش خۆ نیشان دەدا و خۆ دەنوێنێ: ئایا ڕاز و سوڕی ئەوەی چییە لەبارەی حەزرەتی ئیبراهیم (ما انزل) بە کار براوە دە ئایەتەکەدا، بەڵام لە بابەت حەزرەتی مووسا و عیسا کتێب بە کار براوە، وەک ئەوە (وَمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ)؟!

وڵام بۆ ئەو ڕاز و سوڕە کە دە تەرتیبی ئایەتی ٨٤ی ئالی عیمراندا چاو دەکرێن، لەبابەت (ما انزل) لەمەڕ ئیبراهیم و (ما اوتي) لەمەڕ مووسا و عیسا کە دەکار کراون، دەبێ ئەوە بێ: ئەو صحفی کە نازڵ کراوەتە سەر حەزرەتی ئیبراهیم، بە سووڕەتی نووسراوە نەبووە، بەڵکە حەزرەتی ئیبراهیم پاش دابەزینەکەی بە شێوەی وەحی، بۆخۆی نووسیویەتەوە، کەوابێ دەبێ ئەوە قبووڵ کرێ صحف وەک کتێبێکی نووسراوە دانەبەزیوەتە سەر ئیبراهیم، بەڵکە بە شێوەی وەحی دابەزیوەتە سەر ئیبراهیم. بەڵام تەوڕات و ئینجیل کە لە ئاسمانەکاندا نووسراونەوە جا پاشان وەک هەیکەلێک بۆ حەزرەتی مووسا و عیسا نازڵ کراون، جا بەو پێیە دەبێ بکوترێ تەوڕات و ئینجیل نووسراوەیی نازڵ کراونەتە سەر مووسا و عیسا، بەڵکە وەحی کراونە لایان بۆیە دە ئایەتەکەدا ئەلفازی (ما اوتي) بە کار براوە.

پرسیارێ دەکرێ لەوەی کە ئایا ڕاز و سوڕی ئەوەی کە ناوی مووسا و عیسا بەتایبەتی دە ناو ئایەتەکەدا براون چییە؟ دە حاڵێکدا فەهمی ئەو دوو پێغەمبەرە لە ناو اسباطدا دەکرێ و دێنە جێ؟

بۆ وڵامی ئەو پرسیارە دەبێ بکوترێ ئەو دوو پێغەمبەرە بۆخۆیان اولوالعزمن، واتە خاوەن ئۆمەتن و ئاین و ئەحکامی سەربەخۆیان هەیە، سەر بە دینی پێغەمبەری پێش خۆیان نین، جگە لەوەش پێغەمبەرەکانی پاش مووسا و عیسا تابعی تەورات و ئینجیلن، مەگەر بەشێکی کەم کە تابعی کتێبی زەبوورن، جا بۆ ڕێز و حورمەتی تەورات و ئینجیل ناوی خاوەنەکانیان کە مووسا و عیسایە دە ئایەتەکەدا براون و باس کراون، ئەوەش دەتواندرێ بکوترێ: چونکە باری کێشە و

بەزمەکە دەگەڵ یەهوود و نەسارایە، جا بۆ لابردنی وەهم و خەیاڵی هەست کراو ناوی مووسا و عیسا بە تایبەتی دەبێ ببرێ و بێنە گۆڕێ.

دڵ وەک ئەوەی دەچێ لە جوملەی ﴿لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ﴾ دڕۆدنگی نیشان دا لەو بارەوە، نابێ جیاوازی لە ناو پێغەمبەراندا بێنە گۆڕێ، دە حاڵێکدا هەندێکیان خاوەن ئۆمەتن و خاوەن ئایین و کتێبی سەربەخۆن و هەندێکیشیان تابعی دین و دەستووراتی پێغەمبەری پێش خۆیانن، ئەوە بۆخۆی جیاوازییە، کەوایە دەبێ بۆوەی کەند و کۆسپ و ئیشکال ڕێت پێ نەگرن بڵێین: پێغەمبەران دە ئەسڵ و ئەساس و بنچینەدا کە باوەڕییە بە تەنایی و بێهاوتایی خودا بێجیاوازن، بەڵم دە فرووعاتدا واتە ئەحکاماتدا فەرقیان هەیە.

دووبارە دڵ ڕادەمێنێ و دادەمێنێ لە سەر «ە»ی «لە»ی ئایەتی ﴿وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾؛ ئایا بۆ "خودا" دەگەڕێتەوە یا بۆ "پێغەمبەران"؟ جا بۆوەی دڵ لە دامان و ڕامان ڕەها کرێ دەبێ وڵام بدرێتەوە. وڵامەکەشی ئاوایە: هەندێک لە قورئانزانان نەزەریان وایە کە بۆ لای خودا دەچێتەوە، ماناکەشی ئاوا دەکرێ ئەودەم: ئێمە تەسلیمی خوداین و قبووڵمانە بە خودا؛ و ئەویش پێغەمبەرانی ڕەوانەی ناو ئێمەی ئینسان کردوون بۆ شارەزایی.

هەندێکی دیش هەن کە نەزەریان ئاوا داوە: بۆ پێغەمبەران دەگەڕێتەوە لە سەر ئەو ئەساسە: کە پێغەمبەران لە ناو دەروونی دوو ئایەتی (ما انزل) و (ما اوتي)دا فەهم دەکرێ و هەیە، خۆ دیارە پێغەمبەریش مذکّرن، جا لە سەر ئەو نەزەرە وا دەردەکەوێ کە زەمیری «لە»ی بۆیە مذکّرە ئەودەم مانای ئایەتەکە ئاوا تەماشا دەکرێ: ئێمە بە تەواوی شەئنی پێغەمبەرانمان قبووڵە کە ئەمرۆ نەهی خودان و تەسلیمیانین.

**پاشەدۆ:**

لە هەڵسەنگاندن و لەکەودانی ئەو ئایەتە پیرۆزەدا ئەوە هەست پێ دەکرێ: سەرەتای مبارەک و پیرۆزی، بە تاجی نوورینی ئیمان و بڕوا ڕازاوەتەوە کە ئەساسی خوداناسییە ئیمان و بڕوا، کەسێک ژیانی لە سەر ئەو پنج و مۆرە دانەمەزرێ، وەک دار و دەوەنی بێڕیشەیە ویشک وبێبەرە و هیچە. ئاخری ئایەتەکەش بە تەسلیم و ملکەچی دە بەرابەر ئەمر و نەهی خودادا ڕازاوە و دامەزراوە، ئەوەش پێ دەکوترێ بە دوو نووری ئیمان و باوەڕی، واتە هەر کەس کە تەسلیم و گەردنکەچی فەرمانی نەبێ، ئیمان و باوەڕیەکەی وەک داری بێبەر و بەرگە و هیچە، چونکە بە تەئکید دەبێ ئەوە بسەلمێندرێ: تەسلیم و ملکەچی دەستووراتی خودا لە سەر

ئەساسی ئیمان و بڕوا بەروبووی هەموو خوداناسییەکە، خودا بە کاروانی پێغەمبەراندا ناردوویەتە ناو عالەم، ئایەتی ۸۵ی ئالی عیمران ئەوەی لێ دەدرەوشێتەوە:

**وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٨٥﴾** ئالی عیمران
**کەسێک لە دینی ئیسلام بەولاوە دینێکی دیکە هەڵبژێرێت بێ گومان بە هیچ شێوەیەک لێی وەرناگیرێت، ئەو کەسەش لە ڕۆژی پەسڵاندا لە زەرەرمەندەکانە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ۸۵**

هەرکەسێک شوێن غەیری ئایینی ئیسلام کەوێ لێی قبووڵ ناکرێ لە لایەن خودا و ئەو شوێن‌کەوتووە بە هۆی ئەوە لە دەستووری خودا لایداوە و دەستی لە دینی ئیسلام کێشاوەتەوە، لە ڕۆژی ئاخرەتدا لە ڕیزی زەرەرمەندان دێتە ژمار.

هۆی زیانکاریەکەی: ئایینی ئیسلام ئایینێکە هەچی نیازی بەواقیعی ئینسانە بە شەرتێ ئینسانیەت بپارێزێ دابین دەکا، ئەو ڕاستیەش لە سەرەوەی نەژاد و زمان و نەتەوەیە، جا بۆیە هەر کەس خاوەن هەست و شعوور بێ، پارێزەر و نیگەهبانی ناموسی بەشەر بێ و ئەو دینە قبووڵ نەکا و لێی لادا، ئەو کەسە لە بەروبووی داری سەعادەت و خۆشبەختی دنیا و ئاخرەت بێ‌بەش دەکەوێتەوە. جا بۆیە ڕەنج‌بەخەسارە، تا نەشچێتە بازاڕی حیساب، دەرناکەوێ چ خەیانەتێکی بە خۆی کردووە.

ئەگەر بە ئارامی هەست ڕاگرین، ئایەتەکە هەڵسەنگێنین ئەوەمان دێتە دەستی کە ئیمان هەمان ئیسلامە، بەو دەلیلە ئەگەر ئیمان غەیری ئیسلام بوایە لازم دەهات ئیمان قبووڵ نەبایە بەو دەلیلە خودای تەالا لە هێنانی ئایەتی ۸۵ی عیمران دەگەڵ هێنانی ئایەتی ۱۴ی حوجورات ﴿قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا﴾ ئەوە دەردەکەوێ بە ڕواڵەت ئیمان و ئیسلام جیاواز بن، بەڵام ئەگەر هەست بدرێتێ یەکەتی ئەو دووانە دێتە ڕوو چونکە ئایەتی ۸۵ی عیمران باری شەرعی لە خۆ گرتووە و ئایەتی ۱۴ی حوجورات باری لوغەوی لە خۆ گرتووە. دەنا دە واقیعدا ئیمان و ئیسلام بە پێی هەڵسەنگاندنی ئایەتی ۸۵ هەر یەکن. (تفسیر کبیر، هەمان ئایەتی ۸۵)

**پاشەدۆ:**

ئەو ئایەتە ۸۵ە هاوارە وەلای ئەوەی کە ئایینی ئیسلام بۆ هەتا دنیا دەبڕێتەوە دەتوانێ ببێ و

بەکار بێ و هەچـی نیازەکـانی ئینسـانە لە چوارچێـوەی پـارازتنی مـافی خـاوەنی بقـۆزێتەوە و جێبەجێی بکا، ئەگەر ڕاستە و ڕاست پێی بچـاردرێ، و هەرچـی ئـایینە دەسـڕێتەوە بەو ئـایینە ئیسلامە، و هەروا بانگاوازە بۆ وەی محەمەد خاتمە بۆ پێغەمـبەران واتە بەو هـۆیە کە بەرنـامەی دینەکەی عامە، پێویست ناکا کە پێغەمبەری دیکە دوای ئەو بێ و دینێکی دیـکە بێنـێ. چـونکە ئایینی ئیسلام لە هەر بارێکەوە سەیری بکرێ، کەم و کووڕی بۆ هیچ کەس و هیچ دەورێک لێ چاو ناکرێ، جا مەگەر تەماشاچی خێل بێ، یا چاوی لە بەر هەڵنەیەت.

**شتێکی بەرچاو و سەرسووڕهێنەر:**

دەگێڕنەوە کە گۆیا لە خاوەن کتێبەکانی جوولەکە و گاور چەند کەسێک کە ناوی حەزرەتی محەمەدیان بە نیشانەوە بۆ دەخوێندرێتەوە لە تەورات و ئینجیلدا ئیمانی پێ دێـنن، و شـاهیدی لەسەر پێغەمبەرایەتی دەدەن، بەڵام کاتێ حەزرەتی محەمد دێت و زهووڕێ دەکـات و قورئـانی بۆ دادەبەزێ، گەرماوگەرم هەر لە سەر قەراری پێش چاوپێکەوتنیان دەمێننەوە ئەمما کە سـەیری دەکەن عەرەبە و ئیسرائیلی نییە، پەشیمان دەبنەوە و دەڵێن: دەبـێ پێغەمـبەر لە نەوەی ئیسرـائیل بێ، ئێستا کە ئەو محەمەدە لە عەرەبانە قبـووڵمان نیـیە بە پێغەمـبەر. هەر پـاش مـاوەیەکی کەم لەوەش پەشیمان دەبنەوە و دەیـانهەوێ قبـووڵی کەن و ئیمانـی پـێ بێـنن، نـامە دەنووسـن بـۆ کەسانیان لە مەدینە کە موسوڵمان ببینەوە تۆبەمان لێ قبووڵ دەکرێ؟!

دیارە کە لە پێغەمبەرایەتی محەمەدﷺ پەشیمان دەبـنەوە لە بەر حەسـوودیانە، نەک لە ڕووی لێکۆڵینەوە و بەرجەوەندی، جا هەر ئەو حەسادەتەشیان هۆ بوو کە ئایەتەکانی وەسف و باسـی محەمەدیان لە تەورات و ئینجیلدا دەرهێنابوو شتی دیکەی ویستی خۆیان لە جێگا دانابوو.

لە بابەتی ئەو مەبەست و مەتڵەبە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٨٦ی عیمران:

**كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْمًا كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَانِهِمْ وَشَهِدُواْ أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ وَجَاءهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ**

**جا چۆن خودا هۆزێک ڕێنـوێنی و هیـدایەت دەکـات پـاش ئـیمان و بـاوەڕی هێنـان، لە ئـیمان و باوەڕیان پاشگەز بـووبنەوە؟! شاهیدیشـیان دابـێ کە ئەو پێغەمـبەرە ڕاسـتە و هەقە، بەڵـگە و نیشانەی زۆریشیان بۆ هاتبێ! خودا هەرگیز ڕێنوێنی هۆزی ستەمکار ناکات.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ٨٦**

جا چۆن خودا ڕێنومایی کەسانێک دەکا کە بێباوەڕ بـووبن پـاش بڕواهێنـان و شـاهیدی دانیان لە سەر ئەوەی کە حەزرەتی محەممەد ڕەوانەکراوێکی ڕاسـت و دروسـتی لای خـودایە بە پێی بەڵگە و نیشانەکانی لە قورئان و موعجیزاتی دی هاتوون و دابەزیون! دیارە خودای تەعـالا بە پێی حیکمەتی خۆی ڕێنوێنی ستەمکاران ناکا، چونکە ستەمکاران ڕێنوێنی خودای ناوێ، جا سزای ئەو جۆرە کەسانە نەفرینـی خـودا و فرشـتەی خـودایە، واتە لە ڕەحمـی خـودا بەریـن و بەدوورن، دە کاتی خۆیدا ئەو سزا سەختەیان دادەڕژێتە سـەر، هەروەک خـودای بـانی سـەر لە ئایەتی ٨٧ی ئالی عیمران ئاماژەی وەلا کردووە:

**أُولَـٰئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ اللّٰهِ وَالْمَلَآئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾** ئالی عیمران
**سزای ئەوانە ئەوەیە کە لەعنەتی خودا و فرشتە و خەڵکیان بە تێکڕا لەسەرە.**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ٨٧

ئەو کەسانەی تەجاوز و دەس‌درێژی دەکەن بە ستەمکار ناویان دەبـرێ و دەدرێ، سـزایان لە دیوانی بەحەقی خودای تەعالا ئەوەیە کە لەعنەتی خودا و فرشتە و عالەمیان دادەڕژێتە سەر، واتە هیچ کەس ددانی بەخێریان پێداناهێنێ، و بە تەواوی دەکەونە بەر هێرش و شاڵاوی غەزەبی خودا، کەسیش ناتوانێ بە هاواریانەوە بێ، و لە ژێر عەزابی خودادا گیر دەخۆن و دەمێنـنەوە بە یەکجاری، نە مۆڵەت دەدرێن نە سـووک دەبـێ عەزاب لە سـەریان، ئەمـما ئەگەر بێتـوو پـێش ئەوەی بمرن و لە تواناییاندا مابێ دەس‌درێژی بۆ مافی خاوەن مافان بـکەن و لە ترسـی خـودا و ڕۆژی حیساب وەپرینگێن و تۆبە بـکەن دوای ئەو هەمـوو خراپەکاریـانەی کردوویـانن، خـودا ببوورە و میهرەبانە دەربارەی بەندەگانی خۆی.

## پاشەدۆی ئایەتەکانی ٨٦ و ٨٧:

ئەوانەی مورتەدن، واتە پاش‌گەز بوونەوە لە ئایینی بەحەقی خودا، بە هۆی لاساری و کیـنە و حەسـادەتی دەروونیـان، لە ڕەحمەتـی خـودای بێهاوتـا کە هیـدایەت و ڕێنومـایە بەریـن و بێبەشن، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پـاش ئاشـکرابوونی حەق و دەلیـل و بەڵـگەی توندوتۆڵ، مل بـادەدەن و شـانان دەسـووڕێنن بێـر و بەوێـدا، خـۆ دەخەنە زەلکـاوی کـوفر و سـتەمکاری، دەکەونە بەر داب و ڕێوڕەسـمی سـوننەتی خـودا کە زاڵـم ڕێگـای هیـدایەت و شارەزایی لە خۆ بەستووە و خوداش دەرگای لە سەر پێـوە داوە، چـونکە بۆخـۆی قفڵـی درگـا

داخستنی داوەتە دەستی خودا.

و هەروەهـا ئەو سـتەمکارانە کـارێکی وایـان ئەنجـام داوە کە بـۆتە هـۆی ئـازاردان و داڕووشاندنی شەئن و کەرامەتی هەچی ئینسان و فرشتە و گیانلەبەرە، و پێشێل کردنی نیزامـی خوداشی دەگەڵـدایە، جـا بـۆیە ددانـی بەخێـر هـاتی بـۆ ئەوانە نەمـاوە بەڵـکە لە هەمـوو لاوە هجوومی لەعنەت و نەفرین دەکرێتە سەریان.

دڵ ئەو پرسیارەی بۆ دێتە پێش، مەگەر خودا لە ئەندازەی تـاوان زیـاتر سـزا دەخـاتە سـەر بەندەی تاوانکەر؟ دەبێ لە وڵامدا بکوترێ نەخێر؛ ئەمما ئەوە سەودایە، بەنـدە دێ ڕەحـمەت و بەهەشت لە خودا دەکڕێ بە گیان و بە ماڵ، ئەو سەودایە یەکسەرەیە بۆ هەمیشە واتە ڕەحمەت و بەهەشت دەکاتە مڵکی خۆی بەندەکە؛ دەیجا ئەو بەندەی کە عەزابی دۆزەخ دەکڕێ بـۆ خـۆی، ئەو عەزابە دەبێتە مڵکی ئەو خڕیدارە بۆ هەتـا هەتـایە، جـا مەگەر پـێش ئەوەی لە بەرەگە بشـتە دەرێ پەشیمان بێتەوە لەو مـامڵەیە، بە تـۆبە؛ ئەوە دەکـرێ عەزابـی لە مڵکـایەتی خـاریج بـێ، هەروەک لە ئیشاراتی ئایەتی ٨٨ئالی عیمراندا چاو دەکرێ ئەو بابەتە:

**خَالِدِينَ فِيهَا لاَ يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلاَ هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾** ئالی عیمران

**لەو نەفرینەدا دەمێننەوە و سووک نابێ لە سەریان و مۆڵەتیش نادرێن.**

**إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ مِن بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُواْ فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٨٩﴾** ئالی عیمران

**مەگەر ئەوانەی تەوبەیان کردبێ دوای ئەوەی کە پشتیان هەڵکـرد لە ڕێـی ڕاسـت و کـردەوەی چاکیان کردبێ، بەڕاستی خودا ببوور و میهرەبانە بە ندەگانی خۆی.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ٨٨ و ٨٩

ئەوانەی کە لە پـاش بەهەڵەچـوون لە سـەر ئەساسـی هەڵسـەنگاندن و بەراوەردی تەواو دەگەڕێنەوە سـەر شـەقامی دروسـت و ڕاسـت، کـردەوەی چـاک و پـاک دەگـرنە بەر، خـودا دەیانبەخشێ لە هەڵەی پێشوویان دەبوورێ، چـونکە خـودا بە ڕاسـتی لێخۆشـبوو و ببـوور و میهرەبانە دەگەڵ بەندەی خۆی.

بە پێی ئایەتی ٨٨ عەزابی کافران دە ڕۆژی قیامەتدا سەنگ و سووکی وەخۆ ناگرێ، ئەمـما لەولایەوە ئەگەر ورد بیـنەوە لە هەنـدێک بـابەت و مەتـڵەب کە لە حەدیسـان وەرگیـراون، بە پێچەوانەی ئایەتەکە چاو دەکرێن و دێتە ڕوو، وەک ئەوانە:

گۆیا بە قەولی صحیح بخاری، حەزرەتی عەباس دە خەودا چاوی بە ئەبولەهەب دەکەوێ و دەڵێ ئەبولەهەب دە ڕۆژانی دووشەمبەدا عەزاب نەختێک سووک دەبێ لە سەرم بەو هۆیە کە **شوییەم** ئازاد کرد لە دنیادا تاکوو مەمکی بدا بە حەزرەتی ڕەسوولەڵڵا، و هەروا ئەبوتالب دە صحیحی بخاریدا و موسلیمدا ئەو مەتڵەبەی تێدا هاتووە کە ئەو قسەی عەباسی تەئید دەکا (تبیین الفرقان، ج ٢٣/٣)

بۆ وڵامی ئەو دوو حەدیسە و بێ سەنگ و سووکی ئەو ئایەتە ٨٨ ئاوا وڵام دەدرێتەوە:

١. بەشێکیان ئەوەیە سەنگ و سووکی لە جەور و جەفادا سووکە ئەنعام و بەخشینێک دەگەیتێ و دەخوازێ،

٢. بەشێکیشیان ئەوەیە کە پەلە و ئەندازەی عەزاب نەختێک دادەکشێ و بێتە خوارتر لە پلە و پایەی خۆی.

جا لە سەر ئەو ئەساس و یاسایە عەزابی بەدایمی کافر دە ڕۆژی قیامەتدا قەتع نابێ و فاسیلەی تێناکەوێ ئەمما دەکرێ ئەو عەزابە بە دایمە و هەمیشەیە لە سەختی و شیددەتی خۆی بە هۆی ئەو کارە چاکانەی کە لە دنیادا کردوونی هێواش و ئارامتر وەبێ.

بە کورتی و بە کوردی، سەنگ و سووکی عەزابی کافران لە کەیفیەتدا دەبێ و دە کەمیەتدا نابێ، ڕەحمەت لە چاتر زانان. (تبیین الفرقان، ١٠٤/٦)

**پاشەدۆ:**

﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ مِن بَعْدِ ذَلِكَ﴾ واتە (من الارتداد) یانی لە مورتەددی وەگەڕێن، دەبێ ئەوەش باش بزانین جوملەی (و اصلحوا) ئیشارە دەکا وەلای ئەوەی تۆبەی بێ بەکاربردنی عەمەلی ساڵح و پاک و چاک، ناچێتە جێ بۆیە خودای تەعالا پاشکۆی تۆبەی عەمەلی ساڵحی وێ هەڵاوەسیوە، یانی دەبێ لە ناو دەروون و باوەڕی خۆیدا پاک و چاک بێ و لە ڕاست دەستوورات و بەندەگی خوداشدا دروست و ڕاست بێ، ئەگەرچی خودا بۆخۆی ئاگاداری دڵ و دەروونە، واتە دڵ و دەروون چۆن بێ خودا ئاگای لێیە.

جوملەی ﴿فَإِنَّ اللهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە خودا لە دنیادا داپۆشەری گوناه و تاوانە و لە ئاخرەتدا ببوور و بەخشندەی گوناه و تاوانە. بۆ ئیسباتی ئەو ئیدیعایە دەچینە خزمەت ئایەتی ٣٨ی سوورەی ئەنفال:

قُل لِلَّذِينَ كَفَرُواْ إِن يَنتَهُواْ يُغَفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ وَإِنْ يَعُودُواْ فَقَدْ مَضَتْ سُنَّةُ الأَوَّلِينِ
بڵێ بەوانەی بێ بڕوان: ئەگەر واز بێنن لەوەی کە ڕابردووە و چاوپۆشییان لێ دەکرێت، ئەگەریش دەس پێبکەنەوە بێگومان یاسای پێشینیان تێپەڕیوە (دیارە چییە و چی بووە).

دڵ دەڵێ تا ئێرە خودا باسی ئەوانەی بۆ کردین کە بێباوەڕن، سزاشی لەعنەت بۆ دیاری کردن. مەگەر تەوبە بکەن و کردەوەی چاک و پاک لە جێی دابنێن.

دووبارە دڵ دەیهەوێ بزانێ حاڵوباڵی ئەوانەی کە بێباوەڕن و موسوڵمان دەبنەوە و پاش موسوڵمان بوونەوەش دووبارە کافر و بێبڕوا دەبنەوە ئایا ئەوانە دەبێ چۆن بکەون لەو سەری؟ دەبێ چۆنیەتی ئەوانە ئایا چۆن دەبێ و چۆن نابێ لە خودا داوا بکرێ، چونکە ئەوە بەندەی خودایە و بە سەر یاسای خودادا بازبازێن دەکا، خوداش دەزانێ چی لێ دەکا! جا کەوایە بۆ وڵامی دڵی بەپرسیار دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٩٠ی عیمران:

إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَانِهِمْ ثُمَّ ازْدَادُواْ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُولَـئِكَ هُمُ الضَّآلُّونَ ﴿٩٠﴾ ئالی عیمران
ئەوانەی لە پاش بڕوا هێنانیان بێ بڕوا بوونەوە و پاشان بێبڕواییەکەیان زیاتر کردووە ئەوانە هەرگیز تۆبەیان لێ وەرناگیرێت، هەر ئەوانەن ڕێ لێونبووان.

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ٩٠**

بە تەئکید ئەوانەی لە هەوەڵەوە بێباوەڕ بوون، پاشان دێن موسوڵمان دەبن، ئەوجار پاش ئەو موسوڵمان بوونەیان دێن دەبنە غەیرە موسوڵمان، واتە بێباوەڕ و کافر دەبنەوە، بە هەر هۆیەک بێ، ئەو پاش گەز بوونەوەیان لە ئیسلام، ئەوانە موسوڵمان بوونەوەی جاری پێشوویان و تەوبە لە تاوانیان لێ قبووڵ ناکرێ چونکە ل ەسەر بێباوەڕیانیان هاتوونە سەر باوەڕ و ئیمان لە سەر بنچینەیەکی پتەو و قایم و قوڵ و نیەت نەبووە و دانەمەزراوە کاریان، هەر بۆیەشە دووبارە بایان داوەتەوە سەر بێباوەڕی، کەوایە تەوبەی پێشوویان کە دەبا لە تاوانی بێباوەڕی پاک وەبان، قبووڵ نابێ، هەر وەک تۆبەیان نەکردبێ ئاوایە، جا بۆیە خودای تەعالا لەو بارەوە فەرموویەتی دەرحەقی ئەو جۆرە کەسانە: ﴿وَأُولَـئِكَ هُمُ الضَّآلُّونَ﴾ واتە ئەو جۆرە کەسانەی کە درێژەیان هەیە لە سەر بێباوەڕی، گومڕان.

دەکرێ بکوترێ ئەو دوو ئایەتانەی ٩٠-٩١ هاوارە وەلای ئەوەی کە کافرانی کینەدووز و

حەسدوود و یاغی و سەرەڕۆ، تۆبە بکەن و یـا نەکەن وەبەر هیـدایەتی خـودا نـاکەون، چـونکە ئەقڵ و هەست و شعووری حەقدۆزینەوەیان لە دەس داوە، ئەوا سزایان بۆخۆیان تاپۆ کردووە.

ئەوجار دڵ دادەمێنێ و ڕادەمێنێ لە بابەت ئیشاراتی ئەو دوو ئایەتانەی ٩٠-٩١ ئایەتی ٢٥ی سوورەی شوورا کە دەفەرموێ:

**وَهُوَ الَّذِي يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَعْفُو عَنِ السَّيِّئَاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ**

**هەر خودایە پەشیمانی لە بەندەکانی وەردەگرێ و چاوپۆشـیش لە گونـاح و تاوانەکـان دەکـات، ئەوەشی دەیکەن پێی دەزانێ.**

بە پێی مانای ئەو ئایەتە خودا دەبێ ڕێ لە عەبدی نەگرێ بۆ گەڕانەوەی وەلای خـودا، جـا ئەو بەندەیەی دەگەڕێتەوە وەلای خودا کـافر بـێ و یـا موسـوڵمان، ناحـاڵی و تاوانبـار بـێ یـا موسوڵمانی تەواو، نە کافری تەواو بێ، چونکە لە هیچ حاڵی نییە و نـازانێ، هەر دەزانــێ وەدوا کەوێ، وەک شتێکی نابەڵەد و قوشـقی هەر بە دەم خشـەوە دەڕوا، جـا ئەو کەسـانە هەر کـات هەسـت و شـعووریان گەیشـتە قۆنـاغی دەرک و زانسـت بگەڕێـنەوە لای خـودا، خـودا لە ڕابردوویەکی کە بە نەزانی تێپەڕی کردووە دەبوورێ، چونکە ئـیمان و بـاوەڕی تـاکوو تیشـکی ئەقڵ و زانستی لێ نەدا، ناگاتە بەرهەم پێی دەکوترێ فەریکە دیـن و بـاوەڕ، دینـی بـێ ئەقـڵ و شعوور، خاو و فەریکیش بە عەمەل نایە.

**پوختەیەک لە ئەحواڵی کافر و مورتەد**

لە ڕوانگەی دنیا و قیامەت لە سەر ئەساسی ئایاتی قورئان:

پاش هەڵسەنگاندن و لەکەودانی ئایەتەکانی لە مەڕ تەوبەی ئینسان گەیشتینە ئەو قۆنـاغەی کە تێیدا چاو دەکرێ: کافر و مورتەد دەبێ سێ قۆڵ بن:

١. دەبێ ئەو کەسەی کە تا وێستا کافرانەی ڕابوردووە و نەشیزانیوە کام ڕێگایە حەقە، ئێستێ بە پێی بەراوەرد و هەڵسەنگاندن دەرکی خوار و خێچ و ڕاست دەکـا، خالیسـانە و پاکـانە لانــی ئیسلامەتی هەڵدەگرێ، بێ گومان خودا ڕابردووی دەبەخشێ وەک خاوەن بـاوەڕێکی عەزیـز و تەمیز وەریدەگرێ.

٢. ئەوانەی کە خالیسانە و پاکانە تۆبە ناکەن و ناگەڕێنەوە لای خودا، بەڵـکە هەر لە ڕووی عادەت و عورفی نەزانان بازبازێنی تۆبە دەکەن ئاکـار و ئاسـاری تـۆبە لە خـۆ نیشـان نـادەن و

نابینۆینن، هەر بە ڕواڵەت تۆبەکارن، دە ئاکار و ڕەفتار و کردار هەر وەک خۆن، ئەو تـۆبەی وان قبووڵ ناکریٚ لە لایەن خوداوە.

٣. ئەو کەسانەش کە تا دێن و پاڵ وە مردن دەدەن و ئەسبابی تاوان و گوناه لە دەس دەدەن جا دەزانن دۆڕاون بە پەلە بیٚ ئەسبابی شەڕ و شۆڕ دەڵێن تەسلیمین، نابەخشرـێن و بە تۆبەکـار وەرناگیرێن و هیچ بەرتیل و شەفاعەتکاریان لیٚ قبووڵ ناکریٚ.

بۆ هەندێک لەو مەبەستانە ئایاتی بەرز و پیرۆزی قورئان ڕادەنێین:

إِنَّمَا التَّوْبَةُ عَلَى اللّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السُّوَءَ بِجَهَالَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُولَـئِكَ يَتُوبُ اللّهُ عَلَيْهِمْ وَكَانَ اللّهُ عَلِيماً حَكِيماً ﴿١٧﴾ نیساء

خودای بیٚوێنە دە ئایەتی پێشوودا فەرمووی زۆر دڵی خۆش بوو خاوەن بەزەییە، ئینجا لەو ئایەتە پیرۆزەشدا باسی ئەوە دەکات کە تەوبە لە کیٚ وەردەگیرێت؟ دەفەرمویٚت:

**بیٚگومان ئەو تەوبەیەی کە خـودا بە کەرەمـی خـۆی بڕیـاری داوە وەریبگرێـت، تەوبەی ئەو کەسانەیە کە بە گێلی و نەزانی و تێنەگەیشـتنەوە گونـاه ئەنجـام دەدەن و خـراپە دەکەن، بەڵام زۆری پیٚناچیٚ پەشیمان دەبنەوە و تۆبە دەکەن و ناگەڕێنەوە سەر تاوانەکـان. هەنـدێک هەن لە ڕاستی نەفس و هەوایان لاواز و بیٚهێزن، بۆیە خلیسکیٚ دەبەن و دەکەونەتیٚ.**

وَلَيْسَتِ التَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ حَتَّى إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ الآنَ وَلاَ الَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ أُولَـئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٨﴾ نیساء

**تەوبە کردن بۆ ئەو کەسانە نییە کە هەمیشە هەر خەریکی گوناهن و ئەوەی خودا پێی ناخۆشە دەیکات، ئەوان ئەوەیان کردووە دەیکەن تا کاتێک مردن دەستەو یەخەیـان دەبێـت لەگەڵیانـدا، ئەو کاتە دەڵـێن: تـۆبە! ئەو تـۆبەیە تـۆبەی ڕاسـتی نـیە، واتە تەوبەیەک نیـیە لە خـراپە پێـی وەپرینگێن. چونکە بەردەوامبوونیان لە سەر گوناه و تاوان وای لیٚ کردوون کە تازە لیٚلادانیان بۆ ناکریٚ، ئەو جۆرە کەسانە تەوبەی ڕاستەقینەیان لە دەس نایە تازە کە بتوانن وا لە خۆ بـکەن خودا لێیان ببووریٚ و خۆش بیٚ.**

ئێسـتا ورد بـڕوانە و سرنـج بگـرە لە زۆربەی کاربەدەسـت و بەرپرسـانی وڵاتـانی بە نـاو ئیسلامی دەست و چنگیان وا ڕۆبردۆتە ماڵ و سامان و هەناوی بێچاران و بیٚنەوایان، و مافیان بە شێوەیەکی وا بیٚئینسافانە پێشێل کردوون خۆیان پیٚ هەڵناکشێتەوە لەو ڕۆچوونە. تـازە ئەوانە تا گورگ و هەڵۆی مەرگ دایاننەیەنیٚ، دەسبەرداری ئەو ئاکارە نابن، ئەوانە تۆبەیانە لە تەوبەیە،

دەڵێن چی ڕۆژی خۆی؟!

**إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُ مَعَهُ لِيَفْتَدُواْ بِهِ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٣٦﴾** مائدە

**بێگومان ئەو کەسانەی بێباوەڕ بوون بە خودا و بە پێغەمبەری خودا و یاغی بوون ئەگەر ئەوەی لە زەویدایە لە مڵک و سامان و ئەوەندەی دیش بیانەوێت خۆیانی پێ بکڕنەوە لە سزای ڕۆژی قیامەت، ناتوانن و هەرگیز لێیان وەرناگیرێت و دەفریایان ناکەوێت، بەڵکە ڕەپێچەک دەدرێن بۆ ئاگری دۆزەخ.**

ئەو ئایەتە و چەندین ئایەتی دیکەش لە سەر بابەتی تەوبە هەن، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین و بیسەلمێنین لە قسەی خودا ڕاستتر قسە نابێ و نین، خودا هەموو شتی بە نەزم داناوە و کات و ساتیشی بۆ هەموو شت دیاری کردووە، جا لە سەر ئەو ئەساسە تەوبە کات و ساتی دیاریکراوی هەیە و خودا سنووری دیاری کردووە، تەوبە دەبێ لە شت بکرێ کە بتوانی ئەو شتە بکەی؛ واتە تۆبە لە زینا کاتێ ڕەوایە بتواندرێ زینا بکەی، و هەروا تۆبەی کوشتن کاتێ ڕەوایە کە بتواندرێ کوشتن بکەی. تۆبەی کوێری لە نەزەر ناڕەوایە، کاتێ لە کار بوون و نەتوانین هەر پەشیمانە چی لە دەس دێ؟ تۆبەیەکی کە بە مانای نەگەڕانەوەیە بۆ ئەنجامی کار لە دەس نەیە ناڕەوایە.

**پاشەدۆ:**

تەوبە دەبێ لە سەر ئەساسی ئیختیار بێ، زۆردار و تەجاوەزگەر و ستەمکار تا دەستانی نەبەستن و دە زنجیری نەکەی ناگەڕێتەوە، بەڵام کاتێ دەستی بەستران و خرایە ژێر کۆت و زنجیر، تەوبەی کە دەکا لە ترسانی دەکا و بێئیختیارە، دەنا نایکا؛ جا بۆیە تەوبەی تۆبەکاران کاتێ ڕەوایە کە تۆبەی دە ئیختیاردا بێ.

تەوبە کە پەشیمان بوونەوەیە لە خەتا و تاوان، یا بڵێین خۆ خاوێن کردنەوە و غوسڵی گوناهانە، ئەگەر لە سەر بناخەی بیر و باوەڕ و لێکدانەوە نەبێ، لەوانەیە ئەو تەوبەیە بەهێز نەبێ و بە پشوو بایەکی هەوا و هەوەس بشکێ و بە لادا بکەوێ، جا بۆیە خودای تەعالا فەرموویەتی: تۆبە لە لێواری مەرگدا قبووڵ ناکرێ و هەروا لە جێگای خۆشیدا، واتە ڕۆژی قیامەت ئەگەر هەمو دنیای پڕ بێ لە زێڕ و زێو بیدا لە پێناو تۆبەی دنیای تەکلیفی وێستا لێی

قبووڵ ناکرێ. دیارە لە ڕۆژی قیامەتدا ماڵ و سامان و زێڕ و زیو نییە تا بدرێ بە فیدیە لە بری، ئەوە کە خودا وا دەفەرموێ مەبەست ئەوەیە: تۆبە لە خەتا بۆ دنیایە و کاتی تەکلیفە، دەنا کە کاتی حیسابە و بەرهەمی ئەعمال تۆبە جێی لەوێ نابێتەوە، بۆ تەئکیدی ئەو مەبەستە دەچینە خزمەت ئایەتی ٩١ی ئالی عیمران:

إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم مِّلْءُ الأرْضِ ذَهَبًا وَلَوِ افْتَدَى بِهِ أُولَـئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ ﴿٩١﴾ ئالی عیمران

ئەوانەی وا بێبڕوا بوون و بەو بێبڕواییە مردوون، واتە هەر لە سەر بێباوەڕی خۆیان ماونەوە، ئەگەر هەر کامیان پڕ بەو دنیایە زێڕ بدا بە هیچ جۆر لێی وەرناگیرێت، بۆ ئەوانە سزایەکی پڕ ژان هەیە، هیچ پشتیوان و یارمەتیدەریان نییە.

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ٩١:**

بەڕاستی ئەو کەسانەی کە بەبێ ئیمان و باوەڕی دەمرن، تازە پاش مردن فدیەیان لێ قبووڵ ناکرێ و وەرناگیرێ، ئەگەر بارستایە دنیایە زێڕ و زیو بدەن لە دنیادا یا لە قیامەتدا؛ سزاشیان سەخت و بەژانە و کەسیش ناتوانێ بە هاواریانەوە بێ و یارمەتییان بدا.

دووبارە بۆ بیراز کردنەوەی زەینی کۆڵ دەڵێین: کافر بە پێی ئیشاراتی ئایات دەبێ سێ قۆڵ بن:

١. قۆڵێکیان ئەوانە لە سەر ئەساسی بەراوەرد و بەرجەوەندییان تەوبەیەکی دروست و ڕەوا و ڕەوان دەکەن، خوداش لێیان قبووڵ دەکات وەک دە ئایەتی ٨٩ی ئالی عیمراندا فەرمووی: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ مِن بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُواْ﴾ ماناکەی سەیر کە لە ئایەتی ٨٩دا.

٢. قۆڵی دووهەم ئەوانەن کە تەوبەی بێ ناوەرۆک و عادەتی و بێ عەمەل دەکەن، خودا لێیان قەبووڵ ناکا و وەرناگرێ، وەک خودا لە ئایەتی ٩٠دا ئاماژەی وەلا فەرمووە ﴿لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ﴾ بۆ ماناکەی سەیری ئایەتی ٩٠ کە.

٣. قۆڵی سێهەم لە کافران ئەوانەن کە تا دەمرن تەوبە ناکەن، واتە بە کافری دەمرن. ئەوانە تۆبەش بکەن خودا لێیان وەرناگرێ چونکە بە کافری مردن وەک ئایەتی ٩١ ئیشارەتی وەلا دەکا و دەفەرموێ: ﴿فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم﴾ سەیری مانای کە لە جێی خۆیدا.

**سەیری چەند ئادابێکی عیلمی نەحو** بکرێ لە تەرکیباتەکەیدا ناڕەوا نابێ وەک ئەوە:

١. دڵ ئەو پرسیارە دەكا: بۆ دە «لَّن تُقْبَلَ» ئایەتی ٩٠دا بێ حەرفی «ف» بەڕێوە چوو كار؟ بۆ دە ئایەتی ٩١دا «ف» بە كار برا و كوترا «فَلَن يُقْبَلَ»؟

وڵام بە گوێرەی دابی نەحو: ئایەتی ٩١ خاوەنی شـەرت و جەزایە دە واقیعـدا، ئەگەر بێتـو ئەو «ف»یەی لە سەر نەبێ، ئەو شەرت و جەزایە هەست پێ ناكرێ و نازاندرێ كەوایە بـۆ وەی بزاندرێ كە ئەو ئایەتە لە سەر ئەساسی شەرت و جەزا فێدار كراوە.

٢. قازانج و فایدەی «و»ی ﴿وَلَوِ افْتَدَى بِهِ﴾ چییە؟ دەبـێ لە وڵامـدا بكـوترێ ئەو «واوە» واوی عەتفە، تەعبیری ئایەتەكە ئاوایە: (لَو تَقَرَّبُ إلى اللهِ بِمِلئِ الأرضِ ذَهَباً لَم يَنفَعْهُ ذلِكَ مَـعَ كُفرِهِ) واتە ئەگەر تبهەوێ لە خودا نزیک كەوی، بارتەقای ئەرزت زێڕ پێ بێ، ناتوانی وە نزیـک كەوێ، ئەگەری باری كوفرت لێ بێ، ئەو زێڕ و زیوەت بە خۆڕاییە.

یا دەتواندرێ بكوترێ: ئەو واوە بۆ تەفسیلی پاش ئیجمالە واتە درێژە پێدانی شتی كورت. (تفسیر كبیر، باسی هەمان ئایەت)

خودای تەعالا بەندەی خۆی دە تاریكی و نەزانیدا ناهێڵێتەوە، بەڵكە پـلە بە پـلە ئاگـاداری دەداتێ، وەک ئەوە پاش تێگەیاندن و حاڵی كردنی لە تەوبە و باوەڕی و بێبـاوەڕی دەیـهەوێ ئاسار و نیشانەكانی بڕوای پتەو و بەڕاستی دە ئینسان بگەیێنـێ، تـاكوو هەچـی بەیـانی زوو لە خەوێ هەستا نەڵێ ئەمنم خاوەنی ئیمان و بـڕوا، دەبـێ لە مـحەک بـدرێ ئەو كەسـەی داوای مرۆیی دەكا، بۆ ئەو مەبەستە دەچینە خزمەت ئـایەتی ٩٢ی ئـالی عیمـران لەوێ ئەگەر ئەقـڵ و هەست بە تەفرە نەبەین تێدەگەین كێیە ڕاست دەكا و چاكە؟!

**لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ ﴿٩٢﴾** ئالی عیمران
**بە چاكەی تەواو ناگەن تاكوو لەو ماڵ و سـامانەی وا خۆشـتان دەوێـت بەخشـش نەكەن، هەر شتێک ببەخشن، بێگومان خودا ئاگای لێیە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێكی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ٩٢:**

تاكوو لە ڕێی خودادا بەختی نەكەن بەشـێ لەو سـامان و دارایـیەی كە لە ڕێـی حەڵاڵەوە وەدەستو هێناوە و خۆشتان دەوێ، ناگەن بە پلەی چاكە و دەسـتو ناگـا بە پەلـی قـایم و قـۆڵی داری ئیمان و هەرچی لە ڕێی خوداشدا خەرجی كەن خودا پێی دەزانێ و زانـایە و پاداشـتان بە پێی نیەتی دڵتان دەداتەوە.

بە کوردی، هەرچی بۆ خودا بێ، خودا پاداشی دەداتەوە و هەرچی بۆ ئەو نەبێ، بە چاوتاندا دەداتەوە. جا هەر چۆن دەڕۆن بە ڕێدا بڕۆن!

ئینسان کاتێ دەگاتە قۆناخی کەماڵی ئیمان و باوەڕ، و ساتێ دەگاتە پلەی مرۆڤایەتی و ئیخلاس دە عەمەلدا، کە بە خاتری زاتی پاکی خودا لەو شتانەی نەفس و هەوا عاشقیانە و دەیهەوێن، واز بێنێ و لادا لێیان، ئەو ئایەتە بە ئاشکرایی هاوار دەکا و دەڵێ: گەورەترین و قایمترین سەنگەری چاک و چاکە بەخشینی سامان و ماڵە بە خاتری خودا؛ لە بابەتی ئیخلاس و نائیخلاسی عەمەل خودا ئاگادار و زانایە.

دەو ئایەتەدا بە ڕوونی ئەوە هەست دەکرێ کە خودای تەعالا بەخشینی ماڵ و سامان لە سەر ئەساسی ئیمان و باوەڕ نەبێ وەک کافران نایەتە حیساب و نەفع نادا دە ڕۆژی حیسابدا (قیامەت)، بەڵام خاوەنی ئیمان و باوەڕ بە پێی وەعدەی خودا هەر چاکەیەکی بیکا بۆی دەژمێردرێ ڕۆژی ئاخیرەت، دەتواندرێ ئایەتی ٥ی سوورەی ئینسان بکرێتە بەڵگەی ئەو مەبەستە:

> **إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا**
>
> **خاوەن ئیمانەکان لە پیاڵە شەڕابێک دەخۆنەوە تێکەڵاو لە کافوورە.**

جگە لەوەش بە ئاشکرایی ئایەتەکانی ۲۲ تا ۲٦ سوورەی مطففین بە ڕوونی زەمزەمەی ئەوەیانە چاکان و پاکانی خاوەن باوەڕ و ئیمان دە کەیف و خۆشی و خواردن و خواردنەوەی خۆشدان، سەیر کە:

> **إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ﴿۲۲﴾ عَلَى الْأَرَائِكِ يَنظُرُونَ ﴿۲۳﴾ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ ﴿۲۴﴾ يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ﴿۲۵﴾ خِتَامُهُ مِسْكٌ وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ ﴿۲۶﴾**
>
> **بەڕاستی چاکەکان لە خۆشی و ناز و نیعمەتدان (۲۲) لە سەر تەختەکانەوە دەڕوانن (۲۳) لە ڕوخساریانەوە گەشە و نەشە بەدی دەکرێ (٢٤) شەڕابی بێخەوش و مۆرکراویان پێ دەدرێ (۲٥) ئاخر قومی بۆنی میسک دەدا، ئەدی با کێبەرکێ کەران لە پێناوی ئەوەدا پێشبڕکێ بکەن (٢٦)**

بێ گومان ئەو ئایەتانە تەئیدی ئەوە دەکەن کە خاوەن باوەڕان و ئیمان ئەوەیان بۆ ڕازاوەتەوە

لە پێناو چاک و پاکیەی کە لە دنیادا لە خۆیان نشان داوە.

خودای مەزن ئەو چاکانەشی دەسنیشان کردن بەوانەی بۆ خودای بەخشینی ماڵ و سامان دەکەن لەو ماڵ و سامان و داراییەی کە زۆریان لە بەر دڵانە و خۆشیان دەوێن.

جوملەی (حتّى تنفقوا) ئەوەمان پێ دەڵێ: ئینسان ناگاتە پلە و قۆناخێکی چاک و چاکان تا ئەوەی لە بەر دڵانیەتی، بۆ خودای لە دڵی خۆی نەکاتەوە، واتە نەیبەخشێ دە ڕێگای ئەودا. ئەدێرەدا ئەو پرسیارە بەرۆکمان دەگرێ کەوابێ ئەوەی عیبادەت دەکا و تەقوا دەکا دەبێ نەگاتە پلەی بەرز، دەگەڵ ئەوەی ئەهلی تەقوا وەعدەی پلەی بەرزی دراوەتێ؟

وڵامی ئەو پرسیارە: ئینسان ناکرێ ئەوەی زۆری دڵ پێوەیەتی، لە دڵی خۆی داڕنێ، مەگەر لەوەی خۆشەویستتری دەس کەوێ بە داڕنینی ئەو؛ جا لە سەر ئەو سرشتەی ئینسان ناکرێ ئینسان ئەو دنیایەی تێیدایە و تێیدا دەژی و خۆشی دەوێ و دڵی لێ بەرنابێ، بیبەخشێ مەگەر لێی یەقین بێ کە لە دنیای خۆشەویستتر و لەبەردڵانتری وەدەس دەکەوێ بەو دنیاپێدانە؛ ئەوەش واتە لە دنیا بە چاتر زانین کە قیامەتە بۆ کەسێک دەس دەدا کە بە بوونی خودای تەعالا و ئاخرەت وا ئیقرار بکا و یەقین پەیدا کا وەک بە چاو ڕۆژ و شەو چاو دەکا.

بۆ ئەو مەتڵەبە دەچینەوە ماڵی دڵ، ئەگەر باوەڕ و ئیمان کڵی دڵ بن، ئەوە هەر بە چاوی لەش ڕەش و سپی لێک دەکەیەوە، بە چاوی دڵیش ئاوا حەق و ناحەق لێک دەکەنەوە، ئەوجار بە چاوە نوورانییەکانی هەست و شعوور و ئەقڵ، چون دنیا دەبینی ئاواش ئاخرەت دەبینی و ددان بە خالقیەتی خودای بێهاوتادا دێنێ وەک ڕازاوەیی دنیا چاو دەکا، باوەڕی ئەوەش دەکەی کە ئەو خالیقەی کە ڕازێنەرەوەی دنیایە دەشتوانێ ڕازێنەرەوەی ئاخیرەتیش بێ.

**دیمەنێک لە سەلەفی ساڵح:**

سەلەفی ساڵح شتێکیان کە زۆر خۆش دەویست و لە بەر دڵانیان دەبوو، نەزری خودایان دەکرد و بۆ خودایان دادەنا، بۆ نموونە دەگێڕنەوە کاتێ ئایەتی ٩٢ دابەزی بۆ پێغەمبەر و ڕایگەیاند بۆ عالەم، ئەبوطلحەی انصاری کە یەکێک لە پیاوانی چاک و پاک بوو لە حزووری پێغەمبەردا عەرزی کرد کە ئەمن باغێکی زۆر باشم هەیە لە نزیکی مزگەوتی نەبی بە ناوی باخی «بیرحاء»، ئەو باغە نزیکەی ٦٠٠ یا ٧٠٠ دار خورمای دەبێ و زۆریشم لە بەر دڵانە و خۆشم دەوێ، کە پێغەمبەر زۆر جاران بۆ عیبادەت تەسبیحاتی خودا دەچووە ناو ئەو باغە چونکە ئاو و هەوای ساف و پاکی هەبوو. جا دەمهەوێ ئەو خۆشەویستەم (باغی بیرحاء)، بە شاهیدی تۆ

بیدەمە خودا و بیکەمە سەدەقە، ئەتۆش ئەی پێغەمبەر دابەشی کە بە سەر بێنەوایاندا.

پێغەمبەر لە وڵامیدا فەرمووی: (بَخْ بَخْ ذاکَ مالٌ رابِحٌ و إنيّ أَرَی أنْ تَجعَلَها في الأَقـرَبين) واتە خۆشە بە حاڵی تۆ کە ئەو ماڵە بەنرخەی دەبەخشـی، ئەمـن وای بە چـاک دەزانـم بیـدەیە خزمانت. سەودایەکی زۆر بەقازانجە چونکە دوو شتی بەنرخیان تێدا چاو دەکرێ: ١. سـەدەقە، ٢. بەکارهێنانی سیلەی ڕەحم کە دەیدەیە خزمانت.

جا لە سەر ئەو ئەساسـە ابـوطلحەی انصـاری ئەو بـاغەی لە نێـوان خزمـان و ئامۆزایـانی بێنەوایدا بەش کرد. (نەقل لە بخاری صحیح لە بابی زەکاتدا لە حەزرەتی انس بن مالک بە پێـی ڕیوایەتی مسلم و ابوداود، دەبەینی سابت و ابی بن کعبدا دابەش کرا).

نموونەی دیکە زۆر هەن لەو بارەوە، وەک زید بن حـادث ئەسـبی چـاکی خـۆی بە نـاوی «سبل» کە تایبەتی ڕۆژی هەرا و غەزا بوو، بەخشی بە اسـامەی کـوڕی خۆیـدا بە دەسـتووری پێغەمبەر. هەروا عەبدوڵڵا کوڕی عـومەر جـوانترین کەنیـزی خـۆی بە نـاوی کەنیـزەی ڕۆمـی «مەرجانە» ئازاد کرد. (روح المعانی، ٢٩٣/٣) و هەروا عـومەری فـاڕووق کەنیـزی خـۆی کە لە ئەسیرانی جلەولا وەبەری کەوتبوو بە کڕین، بە وەسیلەی ابوموسـی اشـعری، بە دابەزینـی ئەو ئایەتە (لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ) ئازادی کرد (طبری، ٣٤٦/٣).

بە هەر حاڵ دڵی پڕ ئەوین و هیوای ڕۆژی ئاخرەت و خودا دۆستی دێتە جۆش و خـرۆش و کـوڵین هەم خۆشەویسـتی خـۆی دەبەخشـێ لە پێناویـدا هەم خـۆی، هـیچ سـەیر و جێـی سەرسووڕمان نییە لە کن ئاشقانی سەر و ماڵ دانان.



پێش دابەزینی تەورات بۆ حەزرەتی مووسا هەچی تەعامـات بـووبێ، بـۆ بەنیئیسـرائیل گۆیا حەڵاڵ بووە، هەندێک لەو خواردەمەنیانە نەبێ کە حەزرەتی یەعقووب بە پێی بەهانەیەکی تایبەتی لە سەر خۆی حەرام کردبوون وەک گۆشتی وشتر و شیر، هـۆزی یەهـوود بە عینـوانی ڕەخنە لە ئـایینی ئسـلام و گیـردان بە پێغەمـبەری دەیـانکوت بە حەزرەتـی ڕەسـووڵ: ئەتـۆ کە ئیدیعای شوێنکەوتن لە دینی حەزرەتی ئیبراهیم دەکەی، ئەدی چۆن گۆشتی وشتر و شیرێکی کە لە ئـایینی ئیبراهیمـدا حەرام بـووە، ئەتـۆ بە حەڵاڵـی دەزانـی و دەیخـۆی؟ ئەو کـارەت بە پێچەوانەی ئیدیعاتە.

حەزرەتـی ڕەسـووڵ بـۆ وەڵامـی ئەو ئیـدیعایەی یەهوودیـان ئـاوا دێـتە جـواب: ئەو

حەرامبوونەی گۆشتی وشتر و شیر هەر تایبەتی حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب بووە. ئەو گۆشتە وشتر و شیەری ئێوە بە عینوانی ڕەخنە دەیهێننە ڕوو و دەڵێن حەرام بووە لە ئایینی ئیبراهیمدا، ئەتۆ چۆنی دەخۆی بە حەلاڵ! وا نییە وەک ئێوە دەڵێن و خەیاڵتان کردووە، بەڵکە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب حەڵاڵ بووە، بەغەیرەز حەزرەتی یەعقووب کە لە سەر خودای خۆی بە هۆی عوزرێکی تایبەتی حەرامی کردبوو. ئەو دابە حورمەتە لە نێوان ئەولادانی ئەو هەر ماوە لە سەر ئەساسی عورف و عادەت نەک لە سەر ئەساسی ئەحکامی ئایین.

دیارە وەک زاندراوە و دەزانین هۆزی یەهوود تەسلیمی ئەو وڵامەی پێغەمبەر نەبوون و هەدایان نەدا لە ڕەخنەبازی خۆیان، تا کار گەیشتە ئەو جێگایە حەزرەتی ڕەسووڵ دەستووری دا کە تەوڕات بێنن لێی بڕوانن بزانن تاکوو دەرکەوێ ئایا ئایەتێک هەیە دە تەوراتدا لە سەر حەرامی گۆشتی وشتر و شیر لە سەر حەزرەتی ئیبراهیم! ئەگەر هەبوو ئێوە ڕاست دەکەن، ئەگەر نەبوو ئێوە درۆ و تەوهین دەکەن بە ئایینی ئیبراهیم. دیارە ئەوان نەیانتوانی تەورات بێنن چونکە دەیانزانی لە تەوراتدا ئایەتی وا نییە گۆشتی وشتر و شیری لە سەر حەزرەتی ئیبراهیم بە حەرام دانابێ.

جا بۆ تەئیدی ئەو باسە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٩٣ی ئالی عیمران:

**كُلُّ الطَّعَامِ كَانَ حِـلاًّ لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ إِلاَّ مَا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَى نَفْسِهِ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ التَّوْرَاةُ قُلْ فَأْتُواْ بِالتَّوْرَاةِ فَاتْلُوهَا إِن كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴿٩٣﴾** ئالی عیمران

**هەموو خواردەمەنییەکانی کاتی خۆی پێش ئەوەی تەورات بێتە خوارێ، بۆ بەنیئیسرائیل حەڵاڵ بوو جگە لەوەی ئیسرائیل لە خۆی حەرام کرد، بڵێ: ئەگەر وا نییە و ئێوە ڕاست دەکەن، ئادەی تەورات بێنن و وەیخوێنن!**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ٩٣:**

هەموو خواردنێکی پاک و خاوێن بۆ نەوەکانی ئیسرائیل واتە حەزرەتی یەعقووب حەڵاڵ بووە، مەگەر ئەوەی کە ئیسرائیل لە سەر خۆی حەرام کردبێ، وەک گۆشت و شیری وشتر؛ پێش هاتنی تەورات؛ کەوایە بڵێ ئەی محەمەد: ئێوە ئەگەر ڕاست دەکەن و بەقاو بە قسەی خۆتانە، ئەی یەهوودییەکان، تەورات بێنن بیخوێننەوە و ورد بەراوەردی کەن: داخۆ ئایەتێکی وای دەس دەکەوێ تێدا ئاماژە بکات بە حەرامی خواردەمەنی پاک و دابەزیبێتە سەر

یەعقووب!؟ (نەقڵ لە ئیمامی واحدی)

گۆیا پێغەمبەر بە جوولەکەکانی کوت ئەمن لە سەر ئایینی ئیبراهیمم، جوولەکەکانیش کوتیان دەیجا کە لە سەر میللەتی ئیبراهیمی، بۆ گۆشتی وشتر و شیری وشتر دەخۆی؟ پێغەمبەر ئیسرائیل (یەعقووب)یش تووشی نەخۆش «عرق النساء» بوو پزیشکان گۆشت و شیری حوشتریان لێ قەدەغە کردبوو. جا یەعقووب پاش چابوونەوەشی لەو نەخۆشییە گۆشت و شیری حوشتری هەر نەخواردەوە. دەنا لە سەر ئەساسی ئایینەکەی هیچ خواردنێکی پاک لە نەوەی ئیسرائیل حەرام نەبووە.

دەبێ ئەوە بزاندرێ کە ئایەتەکانی پێش ئایەتی ٩٣ ئاماژە وەلای نیشانانێک دەکەن کە شاهیدن لە سەر پێغەمبەرایەتی حەزرەتی محەمەد بە پێی دەستوورات و ئوموووراتێکی کە دەکەونە سەر شانی ئەهلی کتێب، بەڵام ئایەتی ٩٣ جوابە لە سەر ئیدیعای قەومی یەهوود کە دەڵێن بۆچی حەزرەتی محەمەد دەڵێ لە سەر ئایینی ئیبراهیمم و کەچی گۆشت و شیری حوشتری بە حەڵاڵ داناوە! دە حاڵێکدا کە حەرامە لە ئایینی ئیبراهیمدا! یەهوود لێخەی ئەو ئیدیعایە نەبوونەوە تاکوو حەزرەتی ڕەسووڵ پاشەکشەی پێ کردن و وازی پێ لێ هێنان بەو شێوەیە:

پێغەمبەر فەرمووی بڕۆن تەورات بێنن تەماشای کەن بزانن دەوێدا ئایەت هەیە لە سەر حورمەتی گۆشت و شیری وشتر؟ یەهوودیش لە بەر ئەوەی کە دەیانزانی دە تەوراتی مووسادا ئەو ئایەتە دەس ناکەوێ و نییە، نەیانتوانی تەورات بێنن و تەماشای کەن، وازیان لە ئیدیعایەکەیان هێنا و بە درۆزن دەرچوون.

ئەگەرچی قەدەغەبوونی گۆشت و شیری وشتر لە حەزرەتی یەعقووب دەستووری پزشکی بووە دەنا ئایینی نەبووە، ئەمما هەندێک بە پێی ئیشاراتی ئایەتی ١٦٠ی سوورەی نیساء کوتوویانە هۆی حەرامبوونی تەعامی حەڵاڵ لە یەهوود سزای یاغی و زۆرداری و کاری ناشیرینیان بووە.

**فَبِظُلْمٍ مِّنَ الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ اللّهِ كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾** نیساء

کەواتە بە هۆی ستەمێکەوە کە لە لایەن یەهوودییەکانەوە کرا ئەو شتە پاک و خاوێنانەی کە بۆیان حەڵاڵ کرابوون، لێیان حەرام و یاساغ کردن، بە هۆی زۆر کۆسپ دروست کردنیش، لە سەر ڕێ و ڕێبازی خودا.

دڵی بزۆز و بەپرسیار لە سەر ناوەرۆکی جوملەی ﴿كُلُّ الطَّعَامِ كَانَ حِـلاًّ لِّبَـنِي إِسْرَائِيـلَ﴾ هەست بەوەی دەکا کە تەعام بۆخۆی نێوە بۆ هەرچی دەخورێ و یا بە قەولی یارانی ابوحنیف، ناوی گەنمە؛ ئەو قەولەش کە لاوازە، و هەروا «الف و لامێکـی» تەعـامی پـێ ڕازاوەتەوە و بـۆ گشتە واتە عامە؟ لە سەر ئەو ئەساسەی کە دە ئایەتەکەدا لەفزی پاک و خاوێن دیاری نادا، دەبێ زۆر شت کە دە تەعاماتدا هەیە و دڵ نـایخوازێ حەڵاڵ بـووبێ بـۆ یەهـوود!؟ دە حاڵێکـدا کە هەچی خواردنی خاوێن و پاک نەبێ، خودا بە ڕەوای ئینسانی دانەناوە.

جا ئەدێرەدا دەچینە سەر قەولی خاوەنی کەششاف کە فەرموویەتی: بەڵـێ؛ (کـل الطعـام) واتە هەموو شتی خواردنی، نەک تەبیعەتی تایبەتی هەنـدێک لە ئینسـان کە دڵیـان بە شـتێک لە خواردەمەنی ناقۆزێتەوە. و هەر جگە لە قەولی خاوەنی کەششاف ئەگەر لەفـزی (کـل الطعـام) عوموم نەگەیێنێ، ئیستیسنای لـێ بەکـار نـابرێ و دروسـت نـابێ؛ ئەو ئیستیسـنایە نیشـانەی عوموومیەتی تەعامە؛ وەک ئایەتی ٢ و ٣ عصر:

> إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ ﴿٢﴾ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِـالْحَقِّ وَتَوَاصَـوْا بِالصَّبْرِ ﴿٣﴾
> **گشت مرۆ لە زەرەر و زیاندایە؛ جگە لەوانەی خاوەنی بڕوا و ئیمانن کردار چاک و پاکن.**

ئەو ئایەتە تەئکیدی ئایەتی (کل الطعام)ە تا ئیستیسنای (الاّ ما حـرّم) دەکـا، کەوایە یەقـین هەیە لە سەر عومومیەتی تەعام، پێغەمبەریش کە بەیانگەری ئایەتە فەرموویەتی: خۆراکی پاک و خاوێن، واتە هەرچی خواردەمەنی پاک و خـاوێنە لە خـواردن دێ، حەڵاڵە بـۆ بەنیئیســرائیل (تەفسیر کبیر، هەمان ئایەتی ٩٣)

بەر لە هەموو ئەوانەی کە هۆی بەرەو پـاش بـردنەوەی یەهـوودانە لەمەڕ ئیـدیعایان داوای تەورات هێنان بۆ ئیسباتی حەق لە لایەن پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار دەلیل و بەڵگەی قـاتیعن لە سەر ئیسباتی پێغەمبەرایەتی محەمەدﷺ چونکە خاڵی بـوونی تەورات لە ئـایەتی حەرام کردنـی گۆشـت و شـیر لە ئیبراهـیم نیشـانەی ئەوەیە پێغەمـبەر لە ئاسـمانەوە خەبەردار کـراوە، دەنـا نەخوێندەوار چۆن دەکرێ ئەوە بزانێ؛ ئەوە تەئکیدی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی محەمەدە.

**پاشەدۆ:**

ئەو ئایەتە (٩٣)یەی ئالی عیمران تۆمەتەکانی هۆزی یەهوود کە دەیدەن لە ئایینی ئیسلام لە

بابەت حەرام کردنی هەنـدێک لە خـواردەمەنی حەڵاڵ لە لایەن پێغەمـبەرەوە، وەک گۆشـت و شیری حوشتر، ڕەد دەکاتەوە؛ یەهوودییەکان دەیانەویست بە هۆی ئیهـانە واتە بە حەڵاڵ زانینـی خواردەمەنی حەرام (کە گۆشت و شیری حوشتر بێ) ئایینی ئیسلام دژی ئایینی ئیبراهیم نیشان بدەن، بەڵکە بتوانن برینێکی گەورە لە بەدەنی ئیسلامدا پەیدا کەن و زەبرێکـی کـاریگەر لە بەژن وبالای بدەن. دە حاڵێکدا دەیانزانی هەچی خۆراکی پاک و خاوێنە لە میللەتی حەلاڵە و حەلاڵ کراوە، ئیللا لە حەزرەتی یەعقووب نەبێ کە بە هۆی دەستووری پزشکی بەزێکی وەک گۆشت و شـیری حوشـتر لـێ قەدەغە کرابـوو، پـێش دابەزینـی تەورات بـۆ حەزرەتـی مووسـا و شوێن‌کەوتووانی حەزرەتی یەعقووبیش بە هۆی ڕێز و ڕێزداری لە یەعقووب لە خۆیـان قەدەغە کردبوو، لایان وابوو ئەوە حەرامێکی ئاینییە، بەڵام لاسـاری و شـێلگیری یەهـوود لە سـەر ئەو ڕەخنەیە کاری گەیاندە ئەو جێگایە کە حەزرەتی ڕەسووڵ لێیـان وەخـۆ کەوت و داوای هێنـانی تەوراتی لێ کردن کە کتێبی پێغەمبەری مووسای خۆیانە، تاکوو تەماشای کەن بۆیـان دەرکەوێ ڕاست و درۆی یەهوودیان، فەرمـووی لە تەورات بـڕوانن بـزانن ئـایەت هەیە لەو بـارەوە، واتە حورمەتی گۆشت وشیری وشـتر، یـا تێیـدا نیـیە! هـۆزی یەهـوود زانییـان وەدرۆ دەکەونەوە و دەخرێنەوە لە هێنانی تەورات خودارییان کـرد و نەیانهێنـا، بەڵـکە بە خەجـاڵەت و ڕووڕەشـی دەس‌بەردار بوون سەریان دانەواند.

گۆیا ابن‌عباس فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەر فەرمـووی تەورات بێـنن لێـی بـڕوانن تـاکوو دەرکەوێ ئایە ئایەتی وای تێدا هاتووە کە گۆشت و شیری حوشتری حەرام کردبێ یا تێیدا نییە! ئەدێرەدا گۆیا یەهوودییەکان کوتوویانە بە پێغەمبەری جا خۆ ئەتۆ تەورات نـازانی! چـۆن داوای دەکەی؟! پێغەمبەر دەفەرموێ لە وڵامیاندا: نەفەری وام لە لا هەیە وەک عەبدوڵلا کوڕی سەلام و عەبدوڵلا کوڕی عومەر زمانی عیبرانی بەڵەدن و دەیزانن، ئەوجار یەهوودییەکـان جورئەتیـان نەکرد زیاتری لە سەر بڕۆن و نەشیانهێنا، بەڵکە بە خەجاڵەتی دامان.



دیارە بە سبووت گەیی درۆ و تەوهین و ئیقراری هۆزی یەهوود ئەوجار دڵ دەیـهەوێ ئەوە بزانێ: ئایا سزای ئیهانەچییان چییە ڕۆژی خۆی؟! کەوایە بۆ وڵامی دڵ مرزەم بوونی دڵ دەچینە خزمەت ئایەتی ٩٤ی ئالی عیمران تاکوو تێبگەن لە سزای درۆهەڵبەستان:

فَمَنِ افْتَرَىَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ مِن بَعْدِ ذَلِكَ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٩٤﴾ ئالی عیمران

**جا پاش ئەوە ئەوانەی کە درۆ بە دەم خوداوە هەڵدەبەستن هەر ئەوانە ستەمکارن.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ٩٤:**

پێویستە خاوەن بڕوا ئەوەی باوەڕ بێ کە ئەوانەی بە هەوا و هەوەس و بێ‌دەلیل درۆیـان بە دەم خوداوە هەڵدەبەستن بە خاتر بەهرەیەکی دنیایی، پاش هەموو زانیـارییەک و ئاگـادارییەک، دەیاندرێتێ بە هۆی بەڵگە و دەلیل، ئەوانە جگە لەوەی ستەمکارن خەجاڵەتی ئەقڵ و هەست و شعووریشــن، واتە حەڵاڵ کردنــی حەرام و حەرام کردنــی حەڵاڵ کـاری خـودایە نەک کـاری عەبدان؛ جا بۆیە دەست‌تێوەردانی کار و سزای زۆر گەورە لە خۆی دەگـرێ، یەهـوود لە دوای ئەوەی کە ئاگادار کرانەوە کە هەموو خواردنێک بۆ ئیسرائیلییەکان حەڵاڵ بووە تەنیـا ئەوە نەبــێ کە حەزرەتی یەعقووب بە پێی دەستووری پزشک لە سـەر خـۆی حەرام کردبـوو، ئەوانەی ئەو درۆیە دەکەن و لە سەری بەردەوام بن ڕۆژێ بە ستەمکار دەژمێردرێن و وەبەر سزای ستەمکاران دەکەون. ئەوانە هەم زوڵمیان لە خۆیان کرد و خۆیان تووشی سزای خودا کرد، هەم زوڵمیان لە خەڵک کرد کە بە درۆ لە ڕێی ڕاستیان لادان.

گۆیا یەهوود ئیقرار دەکەن بەوەی کە حورمەتی ئەو خواردەمەنییە هەر لە زەمانی حەزرەتــی ئادەمڕایە زۆر پێش تەورات و مووسایە، و دە دەورانی ئیبراهیمیشدا هەر بەردەوام بووە. جا بۆیە خودای تەعالا ڕاستەوخۆ کوتە و خەیاڵەکەیانی بە درۆ و ئیفتیرا ناودار کرد و نـاوی بـرد، جـگە لەوەش هەڵدەگرێ کە بکوترێ ئەو ئایەتە ٩٤ ئایەتێکی سەربەخۆیە بۆ کـوللی کەسـە، واتە هەر کەس بە دەم خوداوە درۆ هەڵبەستێ لە ستەمکاران دەژمێردرێ و سـزای سـتەمکاران سـزایە، لە سەر ئەو ئیحتیمالەی هەموو یەهوودێک واتە هەوەڵ و ئاخر دەگرێتەوە.

لەفزی (افتری) دیارە بە پێی علمی سەرف، لە بابی (افتعال)ە، بە مانای ئیسـلاح هـاتووە و هەم بە مانای ئیفسادیش هـاتووە واتە هەر دوو مانـا لە خـۆ دەگـرێ، بەڵام بە زۆری دە مانـای فەساددا بە کار براوە؛ هەر ئەوەش هۆیە کە دە قورئانی پیرۆزدا بـۆ درۆ و شرک و سـتەم دە کـار کراوە، وهەروا بە مانای داپۆشینیش هـاتووە بەو دەلـیلە (فـریە) کە لە ئیفتیـرایە بە مانـای درۆیە کەسێکی درۆیان دەکا جلکی درۆیان دەبەر دەکا.

عەرەب دەڵێن (فری الادیم) واتە پێت دڕین و پچڕین، درۆزن واتە حەق دڕیـن. عەرەب بە درۆ دەڵێن «افتراء» بەو پێیە درۆزن بەبێ لێکۆڵینەوە و بەرجەوەندی ئەو قسە دادەدڕن و دروست دەکەن. دەکرێ بڵێین ئەو کەلیمەیە (افـتری) بە مانـای (اخـتراع و اخـتلاق) واتە دروسـت‌کراو

دووبەرەکی نانەوە، یانی بە ڕەوانتر: دروست کردن و وەدیهێنان هاتووە. (تفسیر کبیر، ١٥٠/٨)

بە کورتی و بە کوردی: لە سەر ئەساسی ئەو مانایانە کە لە لایەن درۆزنانەوە دەسازێن و هیچ ڕابردوویەکیان نییە پێی دەکوترێ (افتری)؛ الافتراء اختلاق الکذب: واتە درۆسازی.

جوملەی (من بعد ذلک) واتە پاش ئاشکرایی دەلیل لە سەر ئەوەی ئەو حورمەتە لە لایەن یەعقووبەوە بووە و لە پێش ئەودا حەرام نەبووە، ئەوجار (فأولئک هم الظالمون) واتە ئەوانە سزاواری سزای دۆزەخن.

پاش هەڵسەنگاندن و هەڵگێڕ و وەرگێڕی ئایەتەکانی بابەت بەو نەتیجە گەیشتین کە حەزرەتی محمد المصطفی ڕاستە و دروستە، ئەوجار هەر کەس ئەو بەڵگە و دەلیلە ڕوونانە چاو نەکا و کوێرانە هەستێ وەخۆ کەوێ و درۆ و ئیهانە بگرێتە بەر خۆ، ئەوە لە ئەندازە بە دەر زوڵمکەر و خەیانەتکارە بە ئەقڵ و شعووری خۆی و عالەم، زوڵم لە خۆی ئەوەیە کە ئەقڵ و هەست و شعوری سەر کوێر کردووە و لای داوە لە ڕێی ڕاست؛ زوڵمیش لە خەڵک ئەوەیە کە دڵی خەڵکی کرمێ کردووە بەو درۆیانە.

جا ئەوجار ویژدانی ڕازاوە بە ئەقڵ و هەستی خاوێن بۆی ڕەوایە ڕوو بکاتە ئەو هۆزە یەهوودە و ئەوانەی هەوای یەهوودیان دە سەریدایە، بڵێ پێیان: خودا ڕاستە لە گوفتار و کرداریدا، یا ناڕاستە؟! ئەگەر ڕاستە خودا ـ کە ڕاستیشە ـ بۆ وەشوێن ئەو ڕاستە ناکەون و یەهوودییەت ڕەها ناکەن و دەسبەرداری ئەو درۆیانە نابن؟! ئای عەجەب لەوانەی خیرەسەری و خۆبەزلزانی ملکی عەقڵ و لەشی داگرت، بە قسەی خوداش ناکەن وەک داروباری ویشک و خوار وان، تاکوو نەسووتێن بە ئاگر ڕاستەوە نابن، بۆ ئەو مەبەستە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ٩٥ی ئالی عیمران تاکوو لەوێ بە باشی تێبگەین لە مەتڵەب:

**قُلْ صَدَقَ اللَّهُ فَاتَّبِعُواْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٩٥﴾** ئالی عیمران

**بڵێ: خودا ڕاستی فەرمووە کە واتە شوێن ئایینی ئیبراهیمی حەقخواز بکەون، کە ئەو لە شەریک بڕیاردەرەکان نەبووە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ٩٥:**

ئەی محەمەدﷺ! ئەتۆ بڵێ بەوانە: خودای بێهاوتا ڕاستی فەرمووە، کە ئەوانە لە ئایینی پاکی ئیبراهیمدا نەبوون، کەواتە ئەوانە کە بە خەیاڵی پووچ و ناتەواویان دەڵێن بوون، بوختان و درۆیە، بەقای پێ مەکەن و دڵی خۆتانی لە سەر پەرێشان و هاڵۆز مەکەن و دوای ئایینی ئیبراهیم

بکەون و پاک و خاوێنە و خالیسە، چونکە ئیبراهیم لە هاوبەش پەیداکەران نییە، تەنیا و تەنیا خوداپەرەستە.

دڵ دەڵێ خودا کە دەستوور دەدا بە پێغەمبەر بڵێ: خودا ڕاست دەکا، هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە یەهوود دەیڵێن تۆمەتە و دە ئایینی حەزرەتی ئیبراهیمدا نەبووە و نییە؛ کەوایە لەو ئایینەی ئیبراهیم ئیتاعە بکەن کە خالیس و پاک و بەرییە لە هەموو خەتایەک دە هەموو کات و دەوراناندا سەر وەلای حەقە و حەق بووە دە دەستوورات بەرنامەی ئاییندا. خواردەمەنی پاک و خاوێن، حوکمی تەحریمی خاڵی لە دەلیل و بەڵگەنەوە، ئەوە کە عەرەبی موشریک خۆیان بە ئاییندارى ئیبراهیم دەزانن زۆر دوورە لە ڕاستی؛ چونکە ئایینی ئیبراهیم لە سەر یەکەتی واتە تەوحید دامەزراوە و قایم و قۆڵ و بەردەوامە هەمان ئەو نیزامە قورئانییەیە کە حەزرەتی محمد المصطفى خەڵکی بۆ لا دەعوەت دەکا و خۆشی بۆ لای ئەو دەعوەت کراوە. ئەو ئایینە قورئانیەی کە تێهەڵکشاوی ئایینی ئیبراهیمە، ڕاستییەکە هیچ خوار و خێچ و کەم و کووڕییەکی تێدا چاو ناکرێ حەتا بە چاوی خێل و ناحەزانیشڕا، هەر وەک خودا لە زمانی زەحمەتی محەمەدەوە دەفەرموێ لە سوورەی ئەنعامدا ئایەتی ١٦١:

**قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ**

**ئەی محەمەد بڵێ: بێ گومان پەروەردگارم شارەزا و ڕێنوێنی کردم بۆ ڕێگای ڕاست، ئایینێکی ڕاست و ڕەوان و پایەدار، دین و ئایینی ئیبراهیمی هەقخوازە، هەرگیز لە هاوەڵدانەرانیش نەبووە ئیبراهیم.**

ئایینی ئیبراهیم ئەو دینەیە کە خودای تەعالا ڕاستە و ڕێی دەستووری وەشوێن کەوتنی داوە بە پێغەمبەر، وەک لە ئایەتی ١٢٣ی نەحلدا چاو دەکرێ:

**ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ**

**پاشان سرووشمان بۆ کردی (ئەی محەمەد) کە شوێنکەوتووی ئایینەکەی ئیبراهیم بی کە هەقخوازە و لە موشریکانیش نەبووە.**

**پاشەدۆ:**

(قل صدق الله)

١. هەڵدەگرێ بکوترێ: بڵێ ئەی محەمەد، خودا ڕاست دەکا کە فەرمـوویەتی: ئەو جـۆرە خواردەمەنییە لە سەر بەنیئیسـرائیل و ئەولادەکانی حەرام بووە پاشان وەحەڵاڵ گەڕاوە.

٢. هەروەها هەڵدەگرێ بشکوترێ: بڵێ ئەی محەمەد: خودای تەعالا دە گـوفتەی خۆیـدا ڕاستە و ڕاستی فەرمووە کە گۆشت و شیری حوشتران لە بۆ ئیبراهیم حەڵاڵ بووە، بەڵام لە سەر کوڕانی ئیبراهیم وەحەرام گەڕاوە، بەو هۆیە کە خودای یەعقـووب لە بەر هـۆیەکی پزشـکی لە سەر خودی خۆی وەحەرام گێڕاوە، جا لە سەر ئەو ئەساسە فتوای حەزرەتی مـحەمەد ڕاسـتە و ڕەوایە لە سەر حەڵاڵ بوونی گۆشت و شیری وشتر، چونکە فتـواکەی متـابیقی فتـوای ئـایینی حەزرەتی ئیبراهیمە.

٣. هەروەهــا هەڵیشــدەگرێ کە بکــوترێ: بڵــێ ئەی مــحەمەد، ئەوە ڕاســتە خــودا کە فەرموویەتی: خواردەمەنی دیـکە لە سـەر بەنـی ئیسرـائیل حەڵاڵ بـووە، بەڵام ئەوە کە لە سـەر یەهوودییان وەحەرام گەڕاوە سـزای بەدئەخلاقـی و بەدڕەفتـاری و ناحەزییـانە. (تفسـیر کبیـر، هەمان ئایەت)

دووبارە دەنگی لۆمە و تانەی هۆزی یەهوودیان لە سەر پێغەمبەر دەبیسرێ لەو بـابەتەوە کە دەڵێن «بیت المقدس» ڕێزدارترە لە کەعبە بە چەنـد دەلیـل و بەڵـگە بـۆ ڕووگە و ڕوو تێکـردن، کەوایە بۆچی محەمەد ڕووی لێ وەرگێڕا بۆ لای کەعبە، بەڵگەی ڕێـزداری بەیتولمـوقەدەس لە سەر کەعبە ئەوانەن کە ئاشکران:

١. بەیتولموقەدەس لە پێش کەعبەدا سازاوە و ڕۆنراوە.

٢. گۆیا مەیدانی مەحشەریش دەبێ ڕۆژی خۆی،

٣. ڕووگەی هەموو پێغەمبەرەکانیش بووە،

جا لە سەر ئەو ئەساسە ئەگەر ڕوو لە مەقامی ئاوا خاوەن ڕێز و ڕێزدار لادرێ بۆ شوێنێکی دی بە ڕەوا نازاندرێ، جا لە سەر ئەو لۆمە و تانە و دەمدرێژییەی یەهوودیـان خـودای تەعـالا بە دمیاندا دەداتەوە و وەدرۆیان دەخاتەوە بە وەسیلەی ئایەتی ٩٦ی ئالی عیمران:

**إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ ﴿٩٦﴾** ئالی عیمران

**بێ گومان یەکەم خانوو کە بۆ خەڵکی دانرا هەر ئەوەیە کە لە شاری مەککەدایە، بە پیت و پێـز و پیرۆز و مایەی ڕێنوێنی جیهانیانە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ٩٦**

یەکەم هۆدە و ماڵ کە بۆ ئینسان داندرابێ، واتە بـۆ خوداپەرەسـتی لە لایەن خەڵـکەوە ئەو هۆدە و ماڵەیە کە لە بەککەیە، واتە مەککە؛ لە لایەنی پێغەمبەر ئیبراهیمەوە لە سەر فەرمانی خودا دروست کراوە و سازاوە بۆ بەڕێوە بردنی ڕوکن و ئەرکەکانی پێویسـتی حەج. و هەروا بـۆ وەی ببێتە قیبلەی خاوەن باوەڕانی ئیمان (موسوڵمانان) لە کاتەکانی حەج و پێنج فەرزەی نوێژەکانـدا لە ڕۆژدا و لە تەمەندا؛ واتە ئەوانەی کە دانـهەوێ حەج بەجـێ بێـنن لە سەرانسـەری دنیـادا لەو شوێنە پیرۆزەدا کۆ دەبنەوە، دیارە بە پێی فەرموودەی باریتەعـالا ئەو شـوێنە شـوێنێکی گەلـێ بەرز و پیرۆزە بۆ ڕێنمایی عالەم بۆ فێربوونی ئادابی جوان وپاکی ئایین، و یاد و بیر لە خالیقەتی خودا و توانایی خودا لە سەر وەکۆکردنەوەی ئینسان لە ڕۆژێکا، هەر وا خـوو گـرتن بە وەدوور کەوتنەوە لە گوناە و تاوان لە ترسی ئەو ڕۆژەی کە ئاوا خڕ دەکرێنەوە لە مەیدانی حەشر.

ئیشکالێک لە نەقڵێکی دێتە ڕوو کە گۆیا لە مسلم و بخاریدایە هەیە کە لە مەڕ بینای هەوەڵ خانووی سەر زەوی پرسیار لە پێغەمبەر کراوە، ئەویش فەرمویەتی هەوەڵ هۆدە بۆ خوداناسی لە سەر زەوی، حەزرەتی ڕەسووڵیش فەرمـوویەتی: مسـجد الحـرام؛ واتە مەکـکە پاشـان مسـجد الاقصی واتە بەیتولموقەدەس. چل ساڵیش نێوانی دروسـت کردنـی ئەو دوو بینـایە بـووە، جـا ئەدێرەدا ئیشکالەکە سەر هەڵدەدا: بەیتولمـوقەدەس لە لایەن حەزرەتـی داود و سـلێمانەوە بینـا نراون، مەککەش حەزرەتی ئیبراهیم؛ جا ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە و حاشا هەڵنەگرە کە نێـوانی ئەوانە واتە داود و سلێمان و ئیبراهیم، زۆر زۆر زیاتر لە چڵ ساڵە، خۆ ئەوەش بۆ حاشا نابێ کە فەرموودەی پێغەمبەر هەچی بیڵێ ڕاستە مادام ئی ئەو بـێ؛ جـا بـۆ وڵامـی ئەو ئیشـکالە دەبـێ حەکیمانە و زانایانە وڵام بدرێتەوە، ئەقڵ وەیقۆزێ و بە ڕەوای بزانێ.

وڵامی ئەو ئیشکالە بە دوو شێوە دەبێ:

١. حەزرەتـــی ئیبراهـــیم هەوەڵ جـــار کە بەیتـــولحەرامی دانـــاوە پـــاش چـــل ســـاڵ بەیتولموقەدسیش داناوە بەڵام حەزرەتی داود پێغەمبەر لە دەورانی خۆیدا ئەو شـێوە بینـایەی کە ئیبراهیم دایناوبوو بەر دڵی نەکەوت لە بابەت نیـزام و شـکڵەوە، هـات گـۆڕی بە شـێوەیەکی کە پەسەندی خۆی بوو، جا پاش وەفاتی حەزرەتی داود حەزرەتی سولەیمان کە هـاتە سـەر کـار، ڕوانی لە بیناکە دیتی کە هەندێک شوێنی لە بابەت نەزم و نیزامەوە ناتەواوە، تەواوی کردن.

٢. شێوەی وڵامی دوو ئەوەیە: دەکرێ و دەگونجێ یەکـێ لە پێغەمبەرانـی دەوران جـا هەر کێ بێ، دە ماوەی چل ساڵدا پاش بینای کەعبەتوڵڵا بە چڵ ساڵ بینای بەیتولموقەدەسـی پێـک

هێنابێ و سازی کردبێ، بە کورتی بینای بەیتولموقەدەس چل ساڵ پاش بینای کەعبە بە دەس یەکێ لە پێغەمبەرانی دەوران داندرابێ.

دڵ دەیهەوێ بزانێ ڕابیتە و مناسبەی ئەو دوو ئایەتی ٩٥ و ٩٦ دەگەڵ یەک چییە؟ ئەمەش پاش بەرجەوەندی و هەڵسەنگاندنی هەر دوو ئایەتەکە بەو بەرهەم و نەتیجە گەیشتن کە تێکەڵاوی و مناسبەی ئەو دوو ئایەتانە دەبێ ئەوە بێ:

١. ئایەتی ٩٥ وڵامدانەوەی یەهوودیانە، لە سەر ڕەخنە و لۆمەی پێغەمبەری لە بابەت بە حەڵاڵ زانینی گۆشت و شیری حوشتری.

٢. ئایەتی ٩٦ هەر وڵامدانەوەی یەهوودیانە لە سەر تانە و لۆمەی پێغەمبەر لە سەر گۆڕانی ڕووگە، واتە ڕوو لادان لە بەیتولموقەدەس وەلای بەیتولحەرام.

٣. جگە لەوانەش ئایەتی ٩٥ لەسەر فتوا و بڕیاری پێغەمبەر هەندێک لە ئەحکامی حەڵاڵی خواردەمەنی بۆ بەرەی بەنی ئیسرائیل سڕیەوە و لە ئەمری مەباحی لادان بۆ لای حەرام، بە پێی ئیشاراتی ئایاتی خودا؛ ئەلەوەشدا یەهوود تانە و لۆمەیان داڕژتە سەر پێغەمبەر.

٤. یەهوود و گاورەکان بە خەیاڵی خۆیان لە سەر ئایینی حەزرەتی ئیبراهیمن و بە لاف لێدانی ئەو خەیاڵەیان بە زۆری هێرشی تانە و لۆمەیان دەبردە سەر پێغەمبەری، وەک لە ئایەتی ٩٥دا ئەو شێوە ئاکارەی یەهوودیان هەستی پێ دەکرا؛ دە حاڵێکدا خودای ئاگاداری هەستی دەروون بە وەسیلەی ئایەتی ٩٦ ئەو خەیاڵەی یەهوودیانی پووچەڵ کردەوە و وەدرۆی خستەوە، بەو شێوەیە: لە ئایینی حەزرەتی ئیبراهیمدا حەج ڕەوایە و هەیە، کەچی یەهوود و تەرسا مخالیفی حەجن و حەجیان نییە.

٥. خودای تەعالا دە ئایەتی ٩٥دا وەشوێن کەوتنی ئایینی ئیبراهیمی دەستوور داوە و ئەمری پێ کردووە، چونکە پاکە و ڕاستە و ئیبراهیم لە موشریکان نییە، جگە لەوەش بەرزترین دروشم و شیعاری ئایینی ئیبراهیم حەجە کەچی یەهوود و تەرسا قبووڵیان نییە، دەگەڵ ئەوەی ئایەتی ٩٦ بە تەئکید ئەوە نیشان دەدا و دەنوێنێ کە حەج بەرزە و پڕ لە بەرەکەت و فەزڵە.

پاش تێگەیشتن لەو بارەوە واتە تێکەڵاوی ئایەتەکانی ٩٥ و ٩٦ زۆر پێویستە لە ناوەرۆک و مەبەستی ئەو ئایەتی ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ﴾ تێبگەین بە وردی وبزانین خودا مەبەستی لە جوملەی ئەووەڵ چیە و مەبەستیشی لە بەیت چییە؟

پێشەکی دەبێ ئەوە بزاندرێ کە ئەو ئایەتە ڕامانناکێشێ بەرەو ئەو مەبەستە کە ئەوە هەوەڵین

هۆدە بێ خودا لە سەر زەوی بینای نابێ، و هەروا هەوەڵەین هۆدە بێ کە خـودا لە ڕووی زەوی نیشانی داوە. دەبێ بکوترێ: ئەو ئایەتە ئەوەمان پێ دەڵێ کە بینای ئەو هۆدەیە هەوەڵین بینایە کە عالەمی سەر زەوی تێیدا شەریکن بۆ عیبادەت و خوداناسی، وەک هۆدەی دیکە تـاکە فەردی و تایبەتی شەخسی نییە بەڵکە ڕووگەی هەموو عیبادەتگەران و خوداناسانە. فەرموودەی حەزرەتی ڕەسووڵیش تەئیدی ئەو مەبەستەی دەکا: (لا تشتدُّ الرحـالُ الاّ الـی ثـلاث مسـاجد: المسـجد الحرام و المسجد الاقصی و مسجدُ هذا) یانی بار بار ناکرێن مەگین بـۆ چـوون بـۆ لای سـێ مزگەوت: مسجد الحرام، مسجد الاقصی و مسجد النبي. ئەو فەرموودەیە کافیە بۆ ئەو ڕاستییە کە کەعبە هەوەڵین هۆدەیە بۆ عالەم ساز کراوە.

دووبارە ئەو ئایەتە ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ﴾ دەکرێ بکوترێ: مەبەسـت لە هەوەڵبـوون مبارەکی ڕێنوێنی بۆ ئینسانە، هەر ئەو ئەرزشە کە زانای پایەبەرز «واحدی» دە کتێبی «البسط» بە پاڵدانە لە مجاهد نەقڵە کە گۆیا خودای تەعالا ئەو ماڵەی بینا ناوە پێش ئەوەی شـتێک لە سـەر زەوی بینا بنێ، و هەروا بە پێی ڕیوایەتێکی دیکە ئەو کەعبەیە ۲۰۰۰ ساڵ پێش ئەوەی خودا هیچ لە سەر زەوی بسازێنێ، ئەوی بینا ناوە و پایە و بناخەی لە ژێر حەوت تـوێی زەویـدا ڕۆچـووە، وەک لە محمد بن علی بن حسین بن علی بـن ابوطالـب ڕیـوایەت کـراوە لە بـابیرا ئەویـش لە پێغەمبەریوە نەقڵ دەکا کە پێغەمبەر فەرموویەتی: (انّ الله تعالی بَعَثَ ملائِکَتَهُ فَقالَ ابْنـوا لي في الارضِ بَیتاً علی مِثالِ الْبَیتِ الْمَعمورِ، و أَمَرَ اللهُ تَعالی مَن في الارضِ أن یَطوفوا بِهِ کَما یَطوفُ اهلُ السماءِ بِالْبَیتِ الْمَعمورِ و هذا کانَ قَبلُ خَلقِ آدم) واتە خودای تەعالا فرشتەکانی دەستوور پێ دا فەرمووی لە سەر زەوی بینایەکم بۆ بینا نـێن بە وێـنەی بەیتـی مەعمـور، خـودای تەعـالا بەوەی لە سەر زەوین دەستوور دا کە دەورەی ئەو ماڵە بدەن هەر وەک ئەهلـی ئاسـمان دەوری بەیتی مەعموور دەدەن، ئەو جەریانە پێش خەڵقی ئادەم بووە. (تفسیر کبیر، هەمان ئایەتی ۹۶)

هەروا بە پێی ڕیوایەت لە تەفسیری نووسەرانی قورئـان لە عبـدلله ابـن عمـر و مجاهـد و سدّيّ نەقڵ کراوە: هەوەڵین خانوویەکی کە لە ڕووی ئاوی دەوران خولڵقانی ئەرز و ئاسمان بینا نراوە هەمان کەعبە بووە، خودای تەعالا بە دووهەزار ساڵ پێش لە زەوی سـازاندوویەتی، گۆیـا خانەی کەعبە وەک کەفێکی سپی ڕەنـگ بـووە، زەوی لە ژێـر ئەو کەفەدا هـاتۆتە دی. قفّـال لە تەعبیری ئەوەدا دەڵێ: حبیب بن ثابت لە ابنعباسەوە نەقڵی کردووە کە گۆیا نووسراوەیەک لەو مەقامەدا دۆزراوەتەوە بەو جۆرە: (أنا الله ذو بَکَّةَ وَضَـعْتُها یَـومَ وَضَـعْتُ الشَّـمسَ و القمـرَ، و

حَرَّمْتُها يَوم وَضَعْتُ هٰذَينِ الْحَجَرَينِ و حَفِظْتُها بِسَبعَةِ أملاک حُنَفاء) واتە من خودام و خودای کەعبە، ئەو کەعبەیەم بینا ناوە ئەو ڕۆژەی کە ڕۆژ و مانگم دروست کردووە؛ و ئەو کەعبەم بە حەرەم داناوە ئەو ڕۆژەی کە ئەو دوو سەنگەم پێک هێناوە، ئەوانەشم بە وەسیلەی حەوت فرشتەی خاوەن ئەقیدە و ئیمان پارازتووە. (امام رازی، تفسیر کبیر، هەمان ئایەت)

گۆیا حەزرەتی ئادەم کە دابەزیوەتە سەر زەوی و کەسی بە دەوری خۆیەوە نەدیوە خۆف دایگرتووە و لە خودا پاڕاوەتەوە دەورەی ئاوەدان بێ، خوداش کەعبەی بۆ بینا ناوە تا بە دەوریدا تەواف و هەڵسووڕان سەر بگرێ و بێتە ڕوو، تا دەورانی حەزرەتی نووح ئاوا ماوەتەوە؛ بەڵام کاتێ تۆفانی نووح ئەو کەعبەیە بۆ ئاسمانی حەوتەم گوێزراوەتەوە و فرشتەکان لە نزیک ئەودا بە عیبادەت مەشغووڵن تا تۆفان تەواو بووە، پاشان خودای تەعالا جبریلی ناردە لای حەزرەتی ئیبراهیم تاکوو ئەو کەعبەیە لە سەر زەوی بینا نێتەوە بۆوەی ڕۆژێک لە ڕۆژان ببێتە ڕووگەی عالەم بە تێکڕایی بۆ نوێژ خوێنان چونکە نوێژ ئەرک و وەزیفە بووە لە هەموو ئایینەکانی ئاسمانیدا لە ئادەم تا خاتەم؛ جا خۆ ئەوەش ڕوونە نوێژ بێ ڕووگە نابێ، ئەرکایەتی نوێژ سابیتە بە وەسیلەی ئایەتی ٥٨ی سوورەی مەریەم:

**أُوْلَئِكَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ مِن ذُرِّيَّةِ آدَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْرَائِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَاجْتَبَيْنَا إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُ الرَّحْمَن خَرُّوا سُجَّدًا وَبُكِيًّا**

**ئەوانە ئەوکەسانەن کە خودا نیعمەتی خۆی ڕشتووە بە سەریاندا لەو پێغەمبەرانەی کە نەوەی ئادەم بوون هەروا لەوانەش کە لەگەڵ نووحدا سوارمان کردن، لە ڕەگەزی ئیبراهیم و ئیسماعیلیش، لەوانەش کە شارەزامان کردن و هەڵمانبژاردن، ئەمانە هەر کاتێ ئایەکانی خودای خاوەن بەزەییان بە سەردا دەخوێنرایەوە، ڕەپەو ڕوو کڕنۆشیان دەبرد و دەگریان.**

ئەو ئایەتە ئەوەمان پێ دەڵێ کە هەچی پێغەمبەرە سەژدەبەرە بۆ خودا، دە دیارە سەژدەبردن ڕووگەی دەوێ، کەوایە دەبێ بکوترێ ڕووگەی هەموو پێغەمبەرانی ڕابدووش هەر مەککە بووە، ڕووگەی دی نەبووە، ئەگەر بشبووبێ لە دەورانی شیث و ادریس و نوح شوێنی دیکە بۆ ڕووگە غەیری بەیت الحرام ئەو ئایەتەی ٩٦ی خودا بە باتڵ دەردەچوو. جا لە سەر ئەو ئەساسە واجبە بڵێین ڕووگەی تەواوی پێغەمبەرانی ڕابردوو هەر هەمان کەعبەی پیرۆز بووە.

کەعبە (ام القری)شیان پێ کوتووە چونکە ئەو کەعبەیە خاوەنی ڕێزی زیاترە، جگە لەوەش

ئەو ناوە (ام القرى) هاوارە وەلای ئەوەی هەر لە ڕۆژی بوونیدا ڕێـزی بە سـەر شـار و وڵاتـانی دیدا بـووە؛ دیـارە ئەو ڕیـوایەتەش هەیە کە ئەوەی لە ئەسـحاب و تـابعینڕا بە گـوێمان دەگـا، هەمووی نیشانەی ئەوەیە کە لە پێش دەورانی ئیبراهیمیشدا هەر بووە؛ وەک حەزرەتی ڕەسـووڵ فەرموویەتی: (اللّهُمَّ إنيّ حرّمتُ المدينَةَ كَما حَرَّمَ ابراهيمُ مَكَّةَ) واتە خـودایە ئەمـن مەدیـنەم بە حەرام دانا هەر وەک ئیبراهیم کەعبەی بە حەرام دانا.

دڵی بزۆز و بەپرسیار دەیهەوێ هۆی ڕێز و ڕێزداری کەعبە بزانێ، ئەمەش بۆوەی دڵ دڵـی نەشکێ و بێ وڵام نەبێ لەو بارەوە، بە چەند هۆیان ئیشارە دەکەین:

١. کەعبە دانەر و سـازکەرەکەی ئیبراهیمـی خەلـیلە، بەیتولموقەدەسـیش بینـانەری داود و سولەیمان بوون، ئەوەش بێگومانە کە حەزرەتـی ئیبراهـیم دە پـلە و پـایەدا لە داود و سـلێمان لەپێشترە، جا لەو ڕێیەوە کەعبەش لە بەیتولموقەدەس ڕێزدارترە.

٢. ڕێزداری کەعبە هۆیەکەی دەبێ ئەوە بێ مەقامی ئیبراهیمی ئەو بەردەیە کە ئیبراهیم لاقی لەسەر داناوە و لاقی بە ئەندازەی پێی ڕۆچووە لەو بەردە کە بۆی نەرم بووە لەو کاتەدا.

٣. وەک دەڵێن: باڵندە ناتوانن بە سەریدا بفـڕن، لە هەوادا کـاتێ دەگەنە ڕاسـتی سـەربانی کەعبە لادەدەن.

۴. حەیواناتی وەحشی کە لە نزیک ئەو بینایە کۆوە دەبن هیچیان ئارەزووی ئـازاری یەکـتر ناکەن، وەک بەبر و پڵینگ و شێر و ئاسک و مامز و مەڕ و بزن.

۵. کێ لەو کەعبەیەدا نیشـتەجێ بـێ، لە تـاڵان و دەربەدەری بەدوور دەبـێ، هۆیەکەشـی دەگەڕێتەوە بۆ دوعای حەزرەتی ئیبراهیم کە خودا بۆی بەجێ هێناوە:

**وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَـذَا الْبَلَدَ آمِنًا وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ الأَصْنَامَ ﴿٣٥﴾ ابراهيم**
**یادی ئەو کاتەش وەکە کە ئیبراهیم کوتی ئەی پەروەردگارم ئەو شارە بکە بە جێگـای ئەمـن و ئاسایش، خۆم و کوڕەکانیش بپارێزە لەوەی کە بەندایەتی بۆ ئەو بتانە بکەین.**

۶. بە ئەبابیل خاوەنی فیلی نابوود کرد کە قەستی وێران کردنی مەککەی کرد.

بەککە و مەکـکە هەر دوو هەر یەکـن، بەڵام بەکـکە سـعید بـن جبیـر نەزەری وایە گەلـی عالەمی تێدا کۆ دەبینەوە، هەندێکیش کوتوویانە گەردنی زۆرداران شۆڕ دەکاتەوە، زۆری دیـش هەیە لەمەڕ بەککة ئەگەر کەسێک خوازیاری زێدە زانینە لەو بـارەوە، بـڕوانێتە تەفسـیری کەبیـر، ج٧/٨ ئایەتی ٩٦ی ئالی عیمران.

خودای تەعالا ئەو هۆدەیەی ناو ناوە کەعبە بۆیە ڕێز و ڕێزدارە زیاد لە هەرچی هۆدەیە ﴿جَعَلَ اللُّه الْكعْبَةَ الْبَيْتَ الْحَرَامَ ﴿٩٧﴾ مائدە﴾ دیارە خودا ئەو ماڵەی بە ئازاد بینا ناوە واتە ماڵە هەموو خاوەن باوەڕانە و تایبەتی کەس نییە بە تەنیا؛ و هەروا خودا ناویشی ناوە بەیتەلحەرام ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى ﴿١﴾ اسراء﴾ ئەگەر یەک نەفەر پرسیار بکا و بڵێ: لە نێوان ئەو دوو گوفتانەدا (واتە ﴿أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ ﴿٩٦﴾ عمران﴾ و ﴿وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ ﴿٢٦﴾ حج﴾)دا دەڵێی چی؟ واتە لە لایەک خودا دەڵێ: بینام ناوە بۆ عالەم، لە لایەکیش دەڵێ: ماڵی من؛ دەبێ لە وڵامدا ئاوا بڵێین: لەڕێوە خودا ئەو ماڵەی وەلای نەفسی خۆی داوە پاشان داویتە عالەم؛ بۆوەی بیکەنە ڕووگە و پەنای وێدەن. بە کوردی و بە کورتی، ماڵ ماڵە منە بەڵام ئەمن کە بێنیازم لە هەرچی نیازە، داومەتە بەندەگان کە خاونی نیازن بۆ عیبادەت بیکەنە ڕووگە.

**تیوتیوە یا بڵێین پاشەدۆ:**

هۆی مبارەکی و هۆی ناوەکانی:

١. هۆی ئەوڵیەتی کەعبە بینایەتی، واتە هەوەڵ خانووی سەر زەوی لە بابەتی گشتی ئینسانی، کەعبەیە

٢. هۆی ئەوەڵیەتی کەعبە بەرەکەت و ڕێنوێنیەتی، واتە کەعبە هەوەڵین خانوی ئیرشاد و شارەزایی ئینسانە.

٣. هۆی ئەوەڵیەتی کەعبە بە ئیعتیباری زەمانە، واتە ئەو قەتعە زەویەی کە کەعبەی لە سەر بینا کراوە پێش ساز کردنی هەموو زەوییە.

٤. هۆی ئەوەڵیەتی کەعبە، لە ڕێی فرشتەوە واتە هەوەڵین هۆدەیەکی کە فرشتە بینایان ناوە کەعبەتوڵڵا بووە، پێش خەڵقی ئینسانیشە.

٥. هۆی ئەوەڵیەتی بەیتولحەرام، خەڵقی سەر ئاوی بووە؛ واتە هەوەڵین خانوویەکی کە لە ڕووی ئاو بینا نراوە کەعبە بووە، بە پێی ڕیوایات گۆیا ئەو کەعبەیە دووهەزار ساڵ پێش سازانی زەوی بینا نراوە، لە پلەی سەرووی عەرش و ژێرای ئاودا بووە. وەک لە ئایەتی ٧ی سوورەی هوودا دەردەکەوێ ﴿وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاء﴾ واتە تەختی دەستەڵاتی لە سەر ئاودا بوو. بە کورتی لە سەرەوەی کەعبە عەرش بوو لە ژێرەوەی ئاو.

٦. علاّمه حبیب بن ثابت لە ابن‌عباسەوە نەقڵ دەكا: كاتێ خودا ویستی زەوی كەعبە بینا نێ، بە حەوت فرشتەی دەستوور دا سەنگێك لە عەرشەوە بێنن لێی بنووسن (أنا الله ذو بَكَّةَ وَضَعْتُها يومَ وَضَعْتُ الشَّمسَ و القمرَ، و حَرَّمْتُها يوم وَضَعْتُ هٰذَينِ الْحَجَرَينِ و حَفِظْتُها بِسَبعَةِ أملاك حُنَفاء) واتە من خودام خودای كەعبە، بینام ناوە ئەو ڕۆژەی كە مانگ و ڕۆژم دروست كردن، و ئەوم بە حەرەم داناوە ئەو ڕۆژەی كە ئەو دوو بەردەم داناون، و ئەوانەشم بە وەسیلەی حەوت فرشتەی خاوەن ئیمان پارازتووە و پارێزگاریم كردوون.

بە كورتی و بە كوردی، بە پێی ئەو بەراوەردە هەوەڵین بەردێكی كە لە ژێر بناخەی كەعبە بە كار براوە، سەنگی بەیتوڵڵا بووە. (تفسیر كبیر، ج ١٥٣/٨)

**هۆی پیرۆزی و مبارەكی كەعبە:**

١. درەوشانەوەی نووری خودا
٢. دەسكاری و بینانەری فرشتەگانی خودا
٣. مەقامی حەزرەتی ئیبراهیم و زۆری دیش لەو بارەوە هەن.

بە پێی بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی ئایەتی ٩٦ و ٩٧ ئەوە دەردەكەوێ كە ئەو دوو ئایەتە نیازیان پێك هەیە وەك ئایەتی ٩٧ بەیاناتی ناوەرۆكی ٩٦ دەكا، جا لە سەر ئەو ئەساسە نیازمان هەیە بچینە خزمەت ئایەتی ٩٧ی ئالی عیمران تا بۆمان دەركەوێ تێكەڵاوی ئەو دوو ئایەتە:

**فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَّقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَن دَخَلَهُ كانَ آمِنًا وَلِلّٰه عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً وَمَن كفَرَ فَإِنَّ الله غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ ﴿٩٧﴾** ئالی عیمران

**چەند نیشانەی ئاشكرا و ڕوونی تێدایە، لەوانە جێگای وەستانی ئیبراهیمە، هەر كەسێ بڕواتە ناوی لە ئەماندایە، حەج و تەوافی ئەو ماڵە لە لای خوداوە لە سەر خەڵكی پێویست كراوە، ئەوانەیان توانای بڕینی ئەو ڕێگایانە هەیە، كەسێكیش بێ بڕوا و كافرە بەڕاستی خودا لە هەموو ئەو جیهانیانە بێ‌نیازە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێكی هەستیارانە لە ناوەرۆك و سیمای ئایەتی ٩٧**

ئەو هۆدەی لە ناو ئایەتی ٩٦دا خودا ئیشارەی وەلا كردووە زۆر لە ئاسار و نیشانەی بەرز و بەرچاویان لە بابەت تاق و تەنیایی لێ چاو دەكرێن كە هەر هەموویان هاوارن وەلای خودای بێ‌هاوتا و بەتوانا و زانا بە سەر هەست و خوستی كائینات، بۆ نموونە:

۱. بە پێی هەڵسەنگاندن و هەڵگێڕ و وەرگێڕی مێژووی لەمێژینەی کەعبەی مبارەک ئەوەم بۆ دەرکەوتووە هەر کەس بیهەوێ و ویستبێتی ئەو کەعبە پیرۆزە نابوود کا و تێکی دا، خودای خاوەنی کەعبە زۆر زووی بە سزای خۆی گەیاندووە، وەک خاوەنی فیل (ئەبرەهە)

۲. بەهۆی ڕێز و حورمەتی ئەو بەیتوڵڵایە، حەیوانی وەحشی و دڕندە ناتوانن ئەزیەت و ئازاری حەیواناتی ئەو هۆدەیە بدەن، هەر بە ئەمری باری ئارەزووی ئازاریان ناکەن.

۳. پەلەوەر کاتێ ڕووبەڕووی سەربانی ماڵە کەعبەی بۆوە لادەدا لە فڕین بە سەر سەربانی ئەو ماڵەیدا، دیارە هۆی ئەو لادانەش یا مبارەکی ئەو ماڵەیە یا دەگونجێ بڵێین ئەو ماڵە دە بیت المعموردا هەڵکشاوە بەڵام لە مەڕا دیاری ناکا.

۴. جگە لەوەی ئەمن و ئەمان لەو بەیتولحەرامەدا بەردەوامە و بەرقەرارە، واریسی کوژراو کاری بە بکوژ و واریسی بکوژ نەداوە لەو شوێنەدا، وردە بەردیشی بە ئەندازەیەک زۆرە دە ژمارە نایە بەو هۆیە دە هەموو ساڵێکدا زیارەتکەران بۆ ڕەجم بەردی زۆر لەو جێگایە دەکار دەکەن هەر یەکەی ۷ بەرد بۆ ڕەجم بە کار دەبەن.

۵. دوو نیشانەی گەورە کە هۆی بەرزی کەعبە نیشان دەدەن لەو جێگایەدا هەن: یەک وەحدەتەی خودا، صفا و مروە و ئاوی زەمزەم.

۶. بۆ نابوودی و وێرانی بەیتوڵڵا لە لایەن زۆرداران زۆری هێرش کراوەتە سەر، کەچی ئەو هەر وەک خۆیەتی و زۆردار بێ سەر وشوێن و نابوود بوونە.

کابرایەکی بەپرسیار دێ پرسیار دەکا و دەڵێ: دە ناو ئایەتەکەدا کەلیمەی (آیات) بە جەمع هاتووە، دە حاڵێکدا تەعبیرەکەی بە فەرد لێدراوەتەوە وەک «مقام ابراهیم» بێ؟ دیارە وەک دەزانین و واشە، قورئان بەرییە لە هەر چەشنە بێنەزمییەک، ئەوەش وەک بێنەزمی دێتە بەرچاو، کەوایە بۆ ڕەفعی ئەو ئیشکالە تەعبیراتە دەبێ چۆن هەڵوێست بگیردرێ؟ لە وڵامدا دەبێ ئاوا وەخۆ کەوین بۆوەی بێ ڕەخنەی ڕەخنەگران دەرباز بین:

«مقام ابراهیم» ئەگەرچی بۆخۆی فەردە، بەڵام شتی زۆری دە ئامێزی پیرۆز و مبارەکی گرتووە چونکە مەقامی ئیبراهیم موعجیزەیە، موعجیزەش دیارە دێرەدا نیشانەیە لە سەر بوونی خودای قادر و سانع و عالم و بەتوانا و خاوەن ئیرادەی سەربەخۆ گیاندەر و حەی و قەییووم، ئەوانە هەموو بەڵگەن لە سەر نیشانی خودا و قەداسەت و پاکی لە هەرچی شوبهە و گومانە، هەروەک نەختێک لەوە پێش کوتمان مەقامی ئیبراهیم فەردە بە ڕواڵەت، بەڵام لە ناوەرۆکدا

دەروونی شتی زۆری وەخۆ گرتووە، بە زۆر شت دێتە ژمار، بۆ نموونە ئایەتی ١٢٠ی نەحـل کە بەیانی وەسفی ئیبراهیم دەکا لەو شتانەیە کە مەقامی ئیبراهیم لە خۆیدا جێی پێ داوە:

**إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ الْمُشْرِكِينَ**

**ئیبراهیم لە هەموو ڕەوشت و کـردەوە و خوداناسـینێکدا پێشـەوایەکی تەواو بـووە، و خـۆی لە هەموو ڕەوشتێکی خراپ و کاری ناپەسەند لادەدا، هەمیشە حەزی لە چاکە کردن بـوو، و دوور بوو لەوەی شەریک و وێنە بۆ خودای تاک دابنێت.**

ئەو سەنگەی کە ئیبراهیم دە کاری دانان و بینای کەعبە لاقی لە سەر دادەنا، بە پێی بڵنـد و نەویایی کارەکە ئەویش نزم و بەرز دەبۆوە، ئەو سەنگە کە شوێنی لاقـی ئیبراهیمـی لـێ دادەنـا ئاماژە وەلای ئەوەی ئەو بەردە سفت و ڕەقە وەک هەویری لێ بەسەر دەهات، بە ئیزن و ئەمـری باری‌تەعالا تا قولاپی لاقی ڕۆدەچـوو لەو بەردە ڕەقە، ئەئەوە نیشـانەیەکە لە مەقـامی ئیبراهـیم، جگە لەوەش مانەوەی ئەو سەنگە بە مۆری و بە سەلامەتی و پارازتنی لە ڕزیـن و شـکاندنی بە درێژایی مێژووی کەعبە لە دەس دوژمنانی دین و ئایین یەکـێکە لە مـوعجیزات، چەنـد جـاارن بێ‌بـاوەڕانی وەک جـوولەکە و گـاور و موشریـک بێ‌خودایەکـان ویسـتوویانە لە نـاوی بەرن نەیانتوانیوە.

ئەگەر یەکێک بێ ئەو پرسیارە بکـا، بڵـێ: دە مێـژووی کەعـبەدا ئـایەتی ١٢٥ی بەقەرە لـێ دەردەکەوێ و هەست دەکرێ کە نائەمنی دەوێدا ببێ وەک ئیمام ئەبوحەنیفە ئەو ئایەتەی کردۆتە بەڵگە کە کەعبە مەقامی ئەمنە، بەڵام لێشی دەوەشـێتەوە وا نەبـێ، واتە نـائەمن بـێ بە خیلافـی واقیعی، دەشکرێ بڵێین ئەو ئایەتە ئەمنەکەی لە مەڕ قەتڵە واتە کوشتنی تێدا نییە ئەگینا ئەو کارە ناحەزانەی کە زەرەریان لە کوشـتن کەمـترە دەکـرێ ڕوو بـدا لە کەعـبەدا، کەوابـێ لە سـەر ئەو بەراوەردە دەتواندرێ بکوترێ ئەو ئایەتە ١٢٥ی بەقەرەی دەبێ چۆن تەعبیر کرێ و (أمنـا) چـۆن هەڵسەنگێندرێ کە ڕەخنەگران نەتوانن ڕەخنە بگرن؟!

وڵام:

**وَإِذْ جَعَلْنَا الْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْناً وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى وَعَهِدْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ ﴿١٢٥﴾** بقرة

**ئێمە کەعبەمان کردووە بە جێگەی داڵدە و دڵنیا بوون و گێڕاومانە بە جێگەی خوداپەرەسـتی و حەج کردن و فەرمانمان دا بە ئیبراهیم و ئیسماعیل کە بۆ تەواف کردن بە دەوریدا، ئەو جێگـایە**

**لە هەموو پیس و خراپەیەک پاک بکەنەوە، تا پاک و خاوێن بێت بۆ تەواف کردن و بۆ عیبادەت و بۆ ڕکووع و سەژدە بردن تیایدا.**

مەکەیە مثابە واتە جێی دڵنیا بوون (مقام ابراهیم) هەندێک دەڵێن: ئەو بەردەیە کە ئیبراهیم کاتێک کە دیواری کەعبەی بنیات دەنا لە سەری ڕادەوەستا، هەندێکیش دەڵێن مەبەست هەموو کەعبەیە.

دەبێ ئەوە بزاندرێ کاتێ دڵی پڕ لە ئیمان و باوەڕ بە دەستووراتی خودا و ڕەسووڵی خودا هەستی بە فەزڵ و ڕێزداری بەیتوڵڵا کرد ڕاسا بۆوەی بزانێ واجب بوونی چوون و زیارەتی ئەو بەیتوڵڵایە بە پێی چ شەرایت و شەرتێک دەبێ؟ جا بۆ تێگەیشتن و لێ حاڵیبوون لەو بارەوە دەبێ لە مانای ﴿مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً﴾ وەکۆڵین چونکە واجببوون دە ناو ڕوحی ئەو ئایەتەدا شاراوەتەوە، دەبێ وەدۆزرێ زانایانی قورئان لەو بارەوە نەزەری زۆریان ڕاناوە، بە پێی پێویست و شارەزایی نەزەرەکان ڕادەنێین.

١. حەجاج کە یەکێکە لە قورئانزانان فەرموویەتی: لەفزی (مَن مِن) بەدەلە لە بری (الناس) ئەودەم تەعبیری ئایەتەکە ئاوای لێ دێ: «وَ للّهِ عَلَی مَنِ اسْتَطاعَ مِنَ الناسِ حَجَّ البیتِ).

٢. ابن انباری کە قورئانزانە نەزەری وایە: «مَن» ڕەوایە لە جێی ڕەفعە بێ، تەعبیری ئایەتەکە ئەودەم ئاوا دەبێ: «مَنِ النّاسُ الذینَ عَلَیهِم لِلّهِ حجّ البیتِ هُمُ مَنِ استَطاعَ إِلَيْهِ سَبیلاً»

٣. زۆربەی قورئانزانەکان کۆن لە سەر ئەو نەزەرە کە «استطاعة» واتە تێشوو و وەسیلەی سواری چوونی حەج بە واجب دەگێڕێ لە سەر ئینسان، هەر وەک پۆلێک لە یارانی پێغەمبەر لە زار پێغەمبەرەوە نەقڵیان کردووە کە گۆیا فەرموویەتی: توانایی چوونە حەج وابەستە بە زار و ڕاحلەیە، واتە تێشوو و توانین بۆ ڕۆیشتن.

گۆیا قفّال لە جبیر و ئەویش لە ضحاک نەقڵیان کردووە: هەر کات یەکێ جوان و لەشساخ بێ با ماڵ و داراییشی نەبێ، حەجی لە سەرە، با کارگەری بکا بە ئەندازەی حەج کردن. بەڵام یەکێ لێی وەجواب هات و پێی کوت بە قەفال و هاوالانی: ئایا بۆ مەگەر خودا لە توانا بەولاوە تەکلیف دەکا بۆ وەی بە نۆکەری بچێتە بەیتەلحەرام؟ لە وڵامدا کوتیان ئەگەر کەسێک میراتێکی لە مەکە بێ با هیچیش نەبێ، ناچی!؟ کابرا کوتی: بەڵێ دەچێ؛ کەوابێ بەیتەلحەرام چاتر لە میرات دەبێ چێ.

دووبارە عەکرەمەش هەر نەزەری وایە بەو شەرتەی ئینسان لەشی ساخ بێ با وڵاخی

سواریش نەبێ، دەبێ بچێ؛ وەک ئەوەی دەچێ ئەو نەزەرانە ئەقڵی ئیمانی نەیقۆزێتەوە. (تفسیر امام رازی)

بەڵام هەندێک لە زانایان و لێحاڵییانی ڕازی ئیمان بە هەڵسەنگاندن و بەرجەوەندی لە ئایاتی قورئان نەزەریان وا داوە: واجب‌بوونی چوون بۆ بەیتولڵا بەو شەرتانە بەسراوەتەوە: لەش‌ساخی، بێ‌ترسی لە شەڕ و فیتنە، چ ئینسان، چ دڕندە؛ ترس نەبوونی خواردن و خواردنەوە، توانای ماڵ و سامان واتە زاد و ڕاحلە؛ قەرزان ڕەها کەی؛

بۆ ئەو مەبەستە دەبێ ورد لە شەرع بڕواندرێ.

ئایەتەکانی کە ئاماژە وەلای بارسووکی ئینسان دەکەن و قورسایی لادەبەن:

١. ئایەتی ١١ سوورەی غافر ﴿فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ﴾ ئایا دەرەتانێک هەیە بۆ دەرباز بوون؟

٢. سوورەی شوورا ئایەتی ٤٤: ﴿هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ﴾ ئایا ڕێگایەک بۆ پاشەکشە دەس دەکەوێ؟

٣. سوورەی تەوبە ئایەتی ٩١: ﴿مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ هیچ ڕێگایەک بۆ ڕەخنەگرتن و تاوانبار کردنی ئەو چاکەکارانەش نییە، خوداش دلۆڤان و ببوورە.

ئەو ئایەتانە هاوارن وەلای ئەوەی کە ڕێگای دەرفەت و دەرەتان بۆ ئینسان هەیە لە دنیادا، خودا ڕازی نییە بە بارگرانی ئینسانی بەڵکە بارسووکی خوازیارە بۆ ئینسان.

دڵ دەتوانێ چ هەستێک بکا لە مانای ئایەتی ﴿وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ﴾؟

دڵ ئەو هەستەی پێدا دێ لە هەڵسەنگاندنی ئەو ئایەتە: ئەو ئایەتە حوکمێکی سەربەخۆیە لە بابەت حەجەوە، و هەڕەشەیەکی گشتییە دەرحەق بەو کەسانە کە ئینکاری حەج دەکەن، جگە لەوەش دەتواندرێ بکوترێ: ئەو ئایەتە بە پێشەوەی خۆی پەیوەندی هەیە، جا ئەو کەسەی نەزەری وایە دەتوانێ بڵێ: کێ حاشای بێ لەو ماڵە کەعبەیە، و یا بە دژایەتی واجب‌بوونی حەج بوێستێ، خودا لێی بێ‌نیازە و باکی نییە؛ دەشبێ ئەو کەسە بۆ پاداش و سزای ئەو دژایەتییەی خۆ حازر کات، چونکە پێغەمبەر فەرموویەتی لەو بارەوە: «مَن ماتَ و لَم یَحِجَّ فَلْیَمُتْ إنْ شاءَ یَهودیّاً و إنْ شاءَ نَصرانیّاً» واتە کێ بمرێ و حەجی نەکردبێ، (بە شەرتێ گەیشتبێتە قۆناغی حەج) پێی بڵێ بەو کەسە وازت لێیە بە یەهوودی بمرە، وازت لێیە بە تەرسایی بمرە. یانی فڕی بە

سەر ئیسلامەوە نەماوە.

زۆر لە زانایانی ئایینی هەروا زەحـاکیش فەرموویـانە کـاتێ ئـایەتی حەج دابەزی بـۆ سـەر پێغەمـبەر، هەر پێـنج دەسـتە خـاوەن دینەکـانی بانـگ کـردن، واتە موسـوڵمانان، تەرسـایان، جوولەکەکان، مەجووسییەکان، سائیبان، موشریکان، فەرموی «إنّ اللـهَ کَتَـبَ عَلَـیْکُم الحَـجَّ فَحَجُّوا» واتە خودای تەعالا حەجی لە سەر واجب کردن.

بە کوردی، خودا دە ئـایەتەکەدا فەرمـوویەتی (و مـن کفـر) نەیفەرمـوو (و مـن لم یحـجّ) نیشانەی ئەوەیە کێ مونکیری حەج بێ و شەرایەتی حەج کردن کەوتبێتە سەری و نەیکا، سـزای سەختە، بۆ زیادە زانین بڕوانە لە تەفسیری کەبیر هەمان ئایەت.



ئەوجار پاش ئەوەی خودای تەعالا لە بـابەت هـاتنی محمـد المصـطفی چەنـد بەڵـگە و نیشانەی لە تەورات و ئینجیلدا نیشان دان، و هەروا جگە لەوەش وڵامی مونکیرانیشـی داوە، لە بابەت حەڵاڵ و حەرامی خواردەمەنی و ئاڵوگۆڕی ڕووگەی بەیتولحەرام و بەیتولموقەدەس و تانە لە سەر ڕوو کردن بە کەعبە دە کاتی عیبادەتدا، جـا ئەوجـار خـودای خـاوەن حـیکمەت و حەکیم دێ بە شێوەیەکی هێدی و نەرم دەعوەتی بێبـاوەڕانی ئەهلـی کتێـب دەکـا بـۆ ڕێگـای ڕاست و حەق کە قبووڵی ئایینی ئیسلامە و تەرکی کوفرە و دەس‌بەردار بوونی ئیهانە و درۆیانە، بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ٩٨ی ئالی عیمران:

**قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللّهِ وَاللّهُ شَهِيدٌ عَلَى مَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٨﴾** ئالی عیمران

**ئەی محەمەد، بڵێ: ئەی ئەهلی کتێب، بۆ بێباوەڕن بە ئایەتەکانی خودا! خودا شـاهیدە لە سـەر ئەو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن!**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ٩٨**

ئەی محەمەد بڵێ ئەی خاوەن نامە، بۆ بێبڕوایـی دەکەن بە نیشـانەکانی خـودا لە هەمـان کاتدا خودا ئاگارە لە سەر ئەوەی دەیکەن!؟

دیارە وەک لە سیمای ئایەتەکەدا هەست دەکرێ خـودای تەعـالا خـاوەن نامەکـان لـۆمە و سەرکۆنە دەکا و پێیان دەڵێ: بۆ خـۆ و کـافر دەکەن بە هـۆی ئینکـاری ئەو ئایەتـانەی کە لەمەڕ حەڵاڵی خواردەمەنی پێش دابەزینی تەورات دابەزیـون، یـا بە ڕووگە بـوونی بەیتـولحەرام واتە کەعبە دە یاسای ئیسلامدا، یا ئەو بەڵگە و نیشـانانەی پێغەمبەرایەتـی مـحەمەد کە دە تەورات و

ئینجیلدا هاتوون! دە حاڵێکدا خودا خۆی شاهیدە لە سەر ئەعمالتان و زانایە بە هەستی ناو دەروونتان.

دەبێ ئەوە بە باشی وەرگرین و بیزانین کە زۆربەی ئەهلی کتێب واتە زانایانی ئەو سەردەمی عالم و زانا بوون و بە زۆریش ئینکاری و نالەباری لەو زانایانەڕا سەرچاوەی گرتووە بەرابەر بە ئایینی ئیسلام، جا بۆیە خودای تەعالا سەری نووکی هەڕەشەکەی ڕەوانە کردووە کە فەرموویەتی (یا اهل الکتاب)، بە پێی ئەو بەراوەردە دەتواندرێ بکوترێ لە هەموو دەوراندا نالەباری و ئاژاوەگێڕی لە زانایاندا سەرچاوە دەگرێ و گرتوویەتی. بگرە ڕۆژی حیسابیش هەر ئەوان وەبەر بێن؛ دیارە زانایانی تەورات و ئینجیل و قورئان دەزانن چییان تێیدایە و خودا چ دەڵێ، نەزان و نەخوێندەوار کوا دەزانێ! ئەو هەر لە مەلای بیستووە حەڵاڵ و حەرام، جا کاتێ مەلا بۆخۆی نەپرینگێتەوە وا خەیاڵ دەکا مەلا کە لە کوتەی خۆیدا نادروستە، نە حەڵاڵ هەیە بە قسەی مەلا نە حەرام، جا پەنا بە خودا لە دەس مەلای ناپاک و نەزان.

نەزەری زانایان بە ئەهلی کیتاب جۆراوجۆرە: مەسەلەن حەسەن بەسری نەزەری وایە: مەبەست لە ئەهلی کتیاب زانایانی وانن واتە ئەو کەسانەن ئەهلی کیتاب کە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەریان بە دەلیل و بورهان بۆ سابت بووە، وەک لە ئایەتی ۹۹ی ئالی عیمراندا خودا پێیان دەفەرموێ: (أنتم الشهداء).

هەندێکیش نەزەریان ئاوا داوە کە مەبەست لە ئەهلی کیتاب زانایان نییە بە تەنیا، بەڵکە تەواوی ئەهلی کتێبە بەو دەلیلە هەموویان بە هۆی بەڵگە و نیشانانی زۆر و بەرچاو وەک زانایانیان لێ بە سەر هاتووە لە بابەت ڕاستی پێغەمبەرایەتی محەمەد، ئینکاری و سەرپێچییان لە ئیقرار بەو ڕۆژە ڕووناکە، ئی حەسادەت و خودسەرییانە. دەتواندرێ لە وڵامی ئەوەشدا کە خودا بۆچی ئەهلی کیتابی ناو بردووە لە ئایەتەکەدا، ڕاستەوخۆ نەیفەرمووە (یا کافر)، چونکە ئینکاری ئایەتەکانی تەورات و ئینجیل زاناکایان کردوویانە، و ئاڵوگۆڕی تەورات و ئینجیل لە زاناکانڕا سەری هەڵداوە، نەخوێندەوار نازانێ مانای ئایەتەکان بەڵکە زانا و خوێندەواران دەتوانن دەسکای مانای ئایەت بکەن.

جگە لەوەش مەبەست لە «آیات»ی «آیات الله» ئایەتەکە ئایاتێکە کە لە بابەت پێغەمبەرایەتی حەزرەتی محەمەد دابەزیون، و هەروا مەبەستیش لە (تکفرون) ئینکاری ئەو ئایەتانەیە کە لە سەر پێغەمبەرایەتی محەمەد دابەزیون، بۆیە خودای تەعالا دەفەرموێ پێیان

(وَاللُّه شَهِيدٌ عَلَى مَا تَعْمَلُونَ). ئەودەم حەرفی «و» بۆ حاڵ دەگونجێ، تەعبیری ئایەتەکەش ئاوای لێ بە سەر دێ: «لِمَ تكفُرُونَ بِآيَاتِ اللّهِ الّتي دلّتكم على صدق محمد» واتە بۆخۆتان کافر دەکەن بە ئینکاری ئایتانێک کە ڕێنوێنی و شارەزاتان دەکەن لە سەر ڕاستیی محەمەد.



وەک دیارە و دەزانین دە ئایەتی ٩٨دا کوفر و ئینکاری خودی یەهوودیان لە سەر ئەساسی لۆمە بەیان کرا، واتە پێیان کوترا لە لایەن خودا و پێغەمبەرەوە جا چۆن ئێوە ئینکار و کوفری ئەو ئایەتانە کە شاهیدن لە سەر ڕاستی و دروستی و پێغەمبەرایەتی محەمەد، دە حاڵێکدا کە خودا شاهیدە لە سەر نیەت و کردەوەتان، ئەوجار خودای تەعالا دووبارە ڕوویان تێدەکا دە ئەهلی کیتاب بە وەسیلەی ئایەتی ٩٩ و پێیان دەڵێ: بۆچی بەرگری دەکەن لەو کەسانەی کە ئیمانیان هێناوە دەتانەوێ وەیانگێڕن و ئاوەژوویان کەنەوە، دە حاڵێکدا کە ئێوە دەزانن ڕێگایان ڕاستە و خوداش غافڵ و بێخەبەر نییە لەوەی دەیکەن. بۆ ڕاستی ئەو مەبەستە دەچینە خزمەت ئایەتی ٩٩ی ئالی عیمران:

**قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللّهِ مَنْ آمَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنتُمْ شُهَدَاء وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٩﴾** ئالی عیمران

**بڵێ ئەی محەمەد: ئەی ئەهلی کتێب بۆ ئەو کەسانە لە ڕێگای خودا لادەدەن کە وا بڕوایان هێناوە؟ دەتانەوێ ئەو ڕێگایە بە لاڕێ پیشان بدەن، کەچی هەر بۆخۆشتان شاهیدن، لە سەر ڕاستی، خودا بێ ئاگا و غافڵ نییە لەو کارانەی دەیانکەن.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ٩٩

خودا بە شێوەی لۆمە دەپرسێ لە ئەهلی کتێب: بۆچی ئەو کەسانەی کە وا ئیمانیان بە خودا هێناوە دەتانەوێ پەشیمانیان کەنەوە و ڕێگایان لێ بگرن؟ و ئەگەر بۆ خودی خۆتان حازر نین حەق قبووڵ کەن بۆ بەردەوامی لە ڕێگرتن بۆ لای خودا و بە خوار و خێچ نیشاندانی ئەو دینە دە حەولدان خەڵک بە لاڕێدا بەرن دە حاڵێکدا کە دەبا ئێوە کەسانێک بان ئیتاعەکێشی پێغەمبەر بان چونکە دە پێشدا هاتنی ئەو دە کتێبەکانتان دیبوو و دیوتانە، ئەمما چۆن داوە بەر، بزانن خودای تەعالا لەوەی ئەنجامی دەدەن بێئاگا نییە.

ئەو ئایەتە تەوبیخ و لۆمەی دووهەمە لە لایەن خوداوە بۆ ئەهلی کتێب خودا کە دەفەرموێ بە پێغەمبەر بڵێ بە ئەهلی کتێب: ئەی نامەداران بۆچی ڕێ دەگرن لە خودا پەرەستی کەسانێک

کە بڕوایان هێنابێ و داوای لێ دەکەن کە با دەنەوە و بەرەو هەڵدێر و خواری بڕۆن دە حاڵێکـدا دەزانن ڕێگای ڕاستییان گرتۆتە بەر، ئەوە ڕاستە ئەو ئایەتە ڕووی بە زاهیری لە ئەهلی تەورات و ئینجیلە، بەڵام ڕووی دە تەواوی ئەهلی کتێب بە خیلاف نایەتە دەر، چونکە زۆر هەن بە ڕواڵەت ئەهلی قورئانن بەڵام دە ئەعمال و ئاکادار فڕی بە سەر دەستووراتی قورئانەوە نییە.

جوملەی (و انتم شهداء) چەند مانای لێ فەهم دەکرێ: سەیر کە لە ماناکان:

١. لە ابن عباسەوە: أنتم شـهداء تەعبیـرەکەی ئـاوای لـێ دا بە نەزەری هەنـدێکان: أن في التوراة انّ دين الله الذي لا يقبل غيره هو الاسلام» واتە ئێوە ئەی ئەهلی کیتاب شاهیدن لە سەر ئەوەی کە دە تەوراتدا هەیە دینێـک کە بە غەیـرەز ئەو دینـی دی وەرنـاگیرێ و قبـووڵ نـاکرێ، ئەویش دینی ئیسلامە.

٢. ئێوە ئەی ئەهلی کتێب بۆ خـۆو شـاهیدن لە سـەر زاهیـر بـوونی موعجیزاتێـک کە ئەو موعجیزاتە شارەزایی و ڕێنوێنی لە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی ڕەسووڵە.

٣. ئەی خاوەن نامەکان ئێوە بۆ خۆو شاهیدن لە سەر ئەوەی خەڵـک ئـاوەژوو کـردنەوە لە ڕێگای ڕاست بۆ ڕێگای خوار تاوان و خەتایە.

٤. ئەی خـاوەن کتێبەکـانی وەحـی ئاسـمانی، ئێـوە بۆخـۆو شـاهیدن و بـاش دەزانـن کە هاودینتان باوەڕیان پێتانە هەچی پێیان بڵـێن بە ڕاسـتیو لـێ وەردەگـرن کەچـی لە بـاتی ئەوەی ڕێگای چاکیان پێ بڵێن دەچن لە ڕێگای ڕاستیان لادەدەن.

٥. سەرەڕای هەموو ئەو ئاکارەتان هەچی دەیکەن و لە نیەتودایە خودا لێی ئاگایە، شەرم لە خودا ناکەن، وەک خودای بە زانا لە سەر کارتان نەزانن وایە!

ئەو ئـایەتە بێ‌گومـان هەڕەشـەیەکی سـەخت و گـرانە لە سـەر ئەو کەسـانە ئـاوا زانـان و ناشگەڕێنەوە، چونکە ئەوانە بە ئاشکرایی و ڕاشکاوی، ئینکاری پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر دەکەن، جگە لەوەش بە نهێنی فێڵ و فوت دەچێنن لەو بارەوە لە ناو دەروونی خەڵکدا.



پاش بەیانی سزای ئەو کەسانەی کە بۆخۆیان گومڕان و لە ڕاست ڕاستی خـۆ هەڵە دەکەن ئەوجار خودا دەیهەوێ سزای ئەو کەسـانە بەیـان کـا کە وە شـوێن ئەوانە دەکەون و ئیتاعەیـان دەکەن. پاش ئەوەی کە ئیمانیشیان هێناوە، کەچی درۆ و فڕ و فیشاڵیان فریوێ دەخۆن. جـا بـۆ ئەو مەبەستە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٠٠ی ئالی عیمران تاکو بە چاکی تێبگەین لە باسەکە:

**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوَاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقًا مِّنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ كَافِرِينَ ﴿١٠٠﴾** ئالی عیمران

**ئەی ئەوانەی بڕوا و ئیمانتان هێناوە! کە بکەونە شوێن هەندێ لەوانەی کە کتێبیان پێ دراوە، پاش ئەو باوەڕ هێنانەتان، دەتانگەڕێننەوە بەرەو بێبڕوایی، وەگەڕێن و لایان لێ دەن دەنا بە عەزابی سەختی گرفتار دەبن.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٠٠**

خودا دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بە خودا و قورئان و محەمەد، ئەگەر بێتوو ئێوە بێ دەلیل و بەڵگە وەشوێن قسە و فڕ و فیشاڵی کۆمەڵێک لە خاوەن نامەکان بکەون و لادەن لە ڕێی ڕاست و پاشەکشە بکەن لە باوەڕتان، پاش ئەوەی کە بڕواتان هێناوە و موسوڵمان بوون، ئەوانە بێگومان دەتاگێڕنەوە بۆ باوەڕی و بێئیمانی بۆ داڕژتنی شەڕ و هەرا و بەزم و فیتنە، دەچنە سەر دەقی پێشووی دەورانی نەزانیتان، ئەودەم نەحەسانەوە بۆ وە دەمێنێ نە بۆ ئینسانانی بێدەرەتان. خۆو لەو کارە ناڕەوایە بە دوور بگرن (دەنا هەم لە دنیادا ماڵوێران دەبن هەم لە ئاخرەتدا خەجاڵەت و ڕووسیا دێنە دەر).

ئەو ئایەتە ئاگادارییەکی پڕ هەڕەشەیە لە ئەساسی لوتف و میهرەبانی خودا دەگەڵ موسوڵمانان، چونکە لە سەرلێواری خەتەرە ها تێکەوێ، بۆیە خودا دەفەرموێ وەشوێن کوتە و فڕ و فیشاڵی ژەهراوی ئەو جۆرە خاوەن کتێبانە مەکەون، چونکە زۆر ناوەخرێنی درۆکانیان ئاشکرا دەبن و ئێوەش دووبارە پەشیمان دەبنەوە.

**پاشەدۆ:**

ئەو ئایەتە ئەوەمان پێ دەڵێ ئەگەر خاوەن ئیمانەکان لە حەسوودان و کینەدارانی ئەهلی کتێب نزیکی بکەن قسەیان لێ وەرگرن، دەکەونە دە زەلکاوی بێئیمانی، چونکە دەبێ ئەوە بزاندرێ ئەوانە ئارەزوومەندی ئەوەن موسوڵمان لە دین وەرگەڕێن و دە زەلکاوی کەون، کەوایە ئەو موسوڵمانێکی دەگەڵیان تێکەوێ دە داویان دەکەوێ. دەو سێ ئایەتانەی ٩٨، ٩٩ و ١٠٠ سوڕ و ڕازی ڕازاوە هەست پێ دەکرێن جا پێی هەڵسەنگاندنی ئایەتەکان دەبێ ڕازەکان ئەوانە بن:

١. خودای تەعالا بۆ لۆمە و تەوبیخی ئەهلی کتێب دەستووری دا بە پێغەمبەری کە ئەوان

لۆمە کا و پێیان بڵێ: ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَكْفُرُونَ...﴾ یا ﴿لِمَ تَصُدُّونَ...﴾. دیارە ئەو شێوە پێ ڕاگەیاندنە بەو وەسیلەیە بە بێباوەڕان ئیشارەیە وەلای ئەوەی کە خودای تەعالا دۆستی بێباوەڕ و خوار و خێچان نییە تاکوو ڕاستەوخۆ بۆخۆی دەگەڵیان بدوێ.

بەڵام بۆ ئاگاداری موسوڵمانی خاوەن باوەڕ، چونکە دۆستن دەگەڵ خودا و خودا خۆشی دەوێن، ڕاستەوخۆ ڕوویان تێدەکا و دەفەرموێ پێیان: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِن تُطِيعُواْ...﴾ واتە ئەی خاوەن باوەڕ و ئیمانەکان، ئەگەر وەشوێن ئەهلی کتێبی درۆزن کەون، دەکەونە زەلکاوی کوفر و بێباوەڕی!

جا دیارە ئەو شێوە دواندنەی خودا ئیشارەی وەلای بەرز و بەڕێزی پایەی موسوڵمان لە لایەن خودایە بۆیە خودا ڕاستەوخۆ ئاگاداریان دەداتێ. بۆ ئیمانداران نیازێک نییە تاکوو خودا بە پێغەمبەر بڵێ کە ئاوایان پێ بڵێ: بە بۆ ئەهلی کتیبابی ئاژاوەگێڕ نیازی ئەوە نییە خودا بۆخۆی ڕاستەوخۆ پێیان بڵێ بەڵکە بە وەسیلە پێیان ڕادەگەیێنێ.

وەک لە هەموو ئینسانێکڕا دیارە و ئاشکرایە خودای تەعالا لە بەندەی خۆی چ کافر و چ موسوڵمان غافڵ نییە لە هەموو ڕاستان ئاگاداریان دەداتێ و وشیاریان دەکاتەوە، بۆ دابینبوون لە سەر کاری ڕەوا و خوداپەسەندانە و دەسبەردار بوونی کاری ناڕەوا و بێئابڕووانە، جا لە سەر ئەو یاسایە دروستە بە وەسیلەی ئایەتی ١٠١ی ئالی عیمران ڕوو دەو کەسانە دەکا کە لە پاش ئەو هەموو بورهان و بەڵگە و دەلیلانەی کە بۆی دەخوێندرێتەوە، سەرپێچی دەکا و لادەدا لە ڕێی حەق و ڕەوا. بۆ ئیسباتی ئەو بابەتە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٠١ی ئالی عیمران:

**وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَى عَلَيْكُمْ آيَاتُ اللّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُ وَمَن يَعْتَصِم بِاللّهِ فَقَدْ هُدِيَ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾** ئالی عیمران

**ئایا چۆن بێبڕوا دەبن لە کاتێکدا کە ئایەتەکانی خودا دەخوێندرێتەوە بە سەرتاندا؟ لە هەمان کاتیشدا پێغەمبەرەکەشی وا لە ناودا، کەسێکیش پشت بە خودا بەستێ بێگومان ڕێگای ڕاستی پێ نیشان دراوە.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٠١

دوای ئەوەی کە ئایەت لە دوای ئایەت بۆتان ڕانێن لە سەر حەق بە دەلیل و بەڵگە و بورهان حەقو بۆ بەیان کەین، جا چۆن بێبڕوا دەبن بێ بەڵگە و دەلیل! پاش ئەوەی کە لێو

ڕوون و ئاشکرا بووە بە وەسیلەی ئەو پێغەمبەرە کە لە ناوتاندا هەیە، دیارە کێ پەیوەندی بە ئایینی خودا بکات بەڕاستی ڕێنومای کراوە بۆ ڕێگای ڕاست.

ئەو ئایەتە پیرۆزە ئەوە نیشان دەدا کە خودای تەعالا بە عەجایبەوە لە موسوڵمانان دەپرسێ: جا چۆن دەبێ و دەکرێ ئێوە پاش ئەوەی کە ئیمانتان هێناوە، کافریش دەبنەوە دە حاڵێکدا کە پەیتا پەیتا ئایاتی خوداتان بۆ دەخوێندرێتەوە بە وەسیلەی ئەو پێغەمبەرەی لە ناوتاندایە؟ بێگومان لە سەر ئەو حاڵەتەی کە بۆتان ڕەخساوە ئەگەر ڕاست ئەڕۆن، خوار و خێچانە وەرگەڕێن، تاوانبار و خەتاکار ئەسڵ بۆ خۆتانن و تووشی عەزابی سەخت و گران دەبن، جا لە سەر ئەو لاساریەی بێباوەڕان دەسبەردار نابن، خوداش دەسبەرداری ڕێنوێنییان نابێ و دووبارە پێیان دەڵێ: کێ دەس دە دامێنی خودا بگرێ شوێن دەستووری خودا بکەوێ لە وەسوەسەی شەیتان بەدوور دەبێ و دەکەوێتە سەر خەتی ڕاست و ڕەوا و قۆناغی تێگەیشتن.

ئەگەر بێتو وشیارانە ئایەتی ۱۰۱ هەڵسەنگێندرێ ئەو ڕاستییە بە ڕوونی دەردەکەوێ بۆمان کە ئەو ئایەتە بۆ تەعەجوبە، هەر وەک ساحەبی تەفسیری قرطبی ج ۴/ ۱۵۶ نەزەری وا داوە، ئەودەم مانای ئایەتەکە ئاوای لێ بە سەر دێ: جا چۆن کافر دەبن دە حاڵێکدا ئایەتی خودا ڕاستەوخۆ بە سەرتاندا دەخوێندرێتەوە بە وەسیلەی پێغەمبەرێکی ڕاست کە لە ناوتاندایە، و سەرەڕای ئەو هەموو فەزڵ و ڕێز و حورمەتەی خودای تەعالا نیشانی داوە، واش دەکەونە شوێن قسە و فڕ و فیشاڵی کافرانی بێباوەڕ.

دەبێ ئەوەش بزاندرێ و حاشار نەدرێ لەفزی (کیف) کە بۆ تەعەجوبە، تەعەجوبیش دە شەئنی کەسێدایە کە ناشارەزای هۆیەکە بێ واتە سەبەبی ئەو تەعەجوبە نەزانێ، جا بۆیە وەپاڵدانی (کیف) وەلای خودا ناڕەوایە، خۆ دیارە خودا دەفەرموێ (کیف) جا چۆن کافر دەبن، ئەئەوە ئیشکالە، دەبێ وڵامی بدرێتەوە.

دیارە بە پێی هەڵسەنگاندن و وەزنی مەبەستی ئایەتەکە مەنع و بەرگری توند و بەتین داوای خودایە، سەیر کەن: بەو عیلەتەی کە ئایەتەکانی خودا پشتی سەری یەک بە وەسیلەی پێغەمبەرێکی کە دە ناویاندایە پێیان ڕادەگەیێندرێ لەمەڕ ئیبتال و هەڵوەشانەوە وپووچەڵ کردنەوەی خەیاڵات و گومان و شوبهەیەکی هەیانە، هەر یەک لەو بەڵگە و دەلیلانە وەک سەد و پەرژینێکن لەمەڕ بەرگری ئەوان لە تووشبوونی کوفر و گومڕایان، جا هەمووی ئەو بەڵگە بابەتە بەرچاوانە هۆشدارین بۆ بەرگری لە کافر بوون و لاڕێیی وان چونکە تووشی کافر ببن تووشی

سزا و عەزابی سەخت دەبن. هەر ئەوەشـە هـۆیەکە خـودا پـاش ئەو هەڕەشـە تونـدە وەعـدەی خۆشی دڵپەسەند ڕادەگەیێنێ کە دەفەرموێ ﴿وَمَن يَعْتَصِم بِاللَّهِ فَقَدْ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ واتە کێ بە یاسای خوداوە دەس بگرێ، بێشک بۆ ڕێی ڕاست شارەزا کراوە، و کـێش دەسـتی پێوە نەگرێ، دەستی لە هیچ کوێ گیر نابێ.

جوملەی ﴿وَمَن يَعْتَصِم﴾ واتە هەر کەس دەس دە یاسای خودا وەرێنێ، یا پەنـا بگـرێ دە ژێر یاسای خودادا؛ بێگومان دەکەوێتە سەر ڕێگای ڕاست و دە نـاو ڕێـی ڕاسـتدا دامەزراوە بە شارەزاییەوە؛ واشیان کوتووە هەندێکیان وەک زانای پایەبەرز عاصم: اعتصـم بە واتـای «منـع» پەشتدانە بە ئایەتی ٣٢ی یۆسف:

**قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ الَّذِي لُمْتُنَّنِي فِيهِ وَلَقَدْ رَاوَدتُّهُ عَن نَّفْسِهِ فَاسْتَعْصَمَ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَا آمُرُهُ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ الصَّاغِرِينَ**

**(جا لەو ساتەدا ژنەکەی عەزیزی میسر "زولەیخا" فرسەتی هێنـا و بە میوانەکـانی کـوت: ئەوە ئەو کەسەیە کە ئێوە لە سەر خۆشویستنی، لۆمەتان کردووم، بەڵێ؛ من دڵم شـەیدایەتی داوام لێ کردووە تا وەکوو لەگەڵمدا جـووت بـێ، بەڵام ئەو خـۆی پاراسـت ("استصـعم" واتە دەگەڵ جووتبـوونم دووری گـرت و پەنـای گـرت) ئێسـتاش ئەگەر ئەوەی کە فەرمـانی پـێ دەکەم لەگەڵمدا نەیکات، دەبێت بخرێتە بەندیخانە، سزای بدرێت و نابوود کرێ.**

بە پێـی ئامـاژەی «فاستعصـم»ی ئەو ئـایەتە، مانـای «اعتصـم» واتـا خـۆی مەنـع کـرد لە جووتبوون دەگەڵی، بەڵکە پەنای بردە بەر خودا.

نەزەری زانای قورئان «قتادة» لە بابەت ئایەتی ١٠١ی ئالی عیمران ئاوایە: دوو شتی بەرچاو هەست پێ دەکرێن کە هۆی سەرەکی و دوورکەوتنەوەی ئەو خاوەن ئیمانانەیە لە کافر بوون: ١. تێز و پێز و هێزی ئایەتەکانی کە بۆیان دەخوێندراوە ٢. پاکی و ڕەوانی و دڵئـاواڵەیی حەزرەتـی پێغەمبەر محمد المصطفیﷺ، دەبێ ئەوەش بزاندرێ و پـاشقول نەدرێ کە پێغەمـبەر نەمـاو و ڕۆیی، ئەما قورئان ماوە و ناڕوا و هەر دەمێنێ، بۆ ئەو کەسانەی بیانهەوێ پەیڕەوی لێ بکەن.

ئەمما لە جوملەی ﴿فَقَدْ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ واتە بێشـک ئەوانەی دەسـتیان دە یاسای خودا گرتووە بۆ ڕێی ڕاست شارەزا کـراون؛ ئەو هەسـتە دێـتە بەر جاسووسـی ئەقـڵ و بیرەوە: کردەوەی ئینسان واتە فیعلی ئینسان مەخلووقی خودا بـێ، چـونکە زانایـان بۆچـوون و ڕایان وایە: دەست گرتن دە یاسای خودا هیدایەتە لە لایەن خوداوە، بەو دەلیلە کە دەس تێگرتن

دە یاسای خودا کاری بەندەیە، هیدایەت و ڕێنوێنیش کاری خودایە؛ جا لە سەر ئەساسی ئەو یاسایە بە سبووت دەگا کە دەس تێگرتن و خۆ پێ هەڵاوەسین لە لایەن ئینسانەوە سەر دەگرێ، دەبێ ئەوە بزاندرێ؛ بەڵام هیدایەت و ڕێنوێنی لە لایەن خوداوە سەر دەگرێ، ئەمما ئەگەر بێتو بەندە دەست تێبگرێ و خۆش هەڵاوەسێ بە یاسای خوداوە، هیدایەتیش لە لایەن خوداوە دە هاوارەوە نەهات، بە فەرزی مەحاڵ ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ لای حیکمەت و ڕاز و ئەسراری باریتەعالا، کە کێی بوێ هیدایەتی دەدا و کێشی نەوێ هیدایەتی نادا.

نەزەری خێڵی ئەشعەریش وایە: «یُضِلُّ مَن یَشَاء» و «تذلّ مَن تَشَاء» و «تعزّ مَن تَشَاء»ی ئایەتەکە: کێ ئەو بیهەوێ خاوەن عیزەتی دەکا، کێ ئەو بیهەوێ و وازی لێ بێ، زەلیلی دەکا؛ ئەمما خێڵی موعتەزلە نەزەریان لەو بارەوە ئاوایە: مەبەست و هیدایەتەی زێدە لوتفە لە سەر ئەساسی زێدە عیبادەت و ئیتاعەت؛ هەر وەک لە ئاماژەی ئایەتی ١٦ی سوورەی مائیدە وا دەردەکەوێ، سەیر کە:

**يَهْدِي بِهِ اللَّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلاَمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنِ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ وَيَهْدِيهِمْ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ**

**خودا بە هۆی ئەو کتێبەوە ئەو کەسانە شارەزا و ڕێنوێنی دەکات، بەرەو ڕێبازەکانی ئاشتی و ئاسایش، کە شوێن کەوتووی ڕەزامەندی خودان، بە فەرمانی خۆی لە تاریکایەکان ڕزگاریان دەکا و بەرەو ڕووناکایی دەیانبا، بەرەو ڕێگای ڕاستیش شارەزایان دەکا.**

ئەگەر بە وردی لەو ئایەتە سرنج بگیردرێ بە ئاشکرایی چاو دەکرێ، خواری و ڕاستی دە وازی خودادان. "قفال"یش ئەو نەزەرەی پەسەندە؛ هەچەن ئیمام فەخری ڕازی پێی وایە بە هەڵە چووە قەفال، کێ خوازیاری زێدە زانینە لەو بارەوە بچێتە خزمەت ئیمام ڕازی لە ماڵە ئەو ئایەتە.

نەزەر و ڕا و بۆچوون لە سەر "اعتصام" زۆر هەن بەتایبەت لە لایەن ئەهلی تەریقەتەوە، ئەمما ئەوەی ئەقڵ و هەست و شعوور دەیقۆزنەوە بە لای ڕاستیدا دەبێ ئەوە بێ: خۆت باوێ ئامێزی خودا و بەو بسپێرە نیاز و ویستت، باسی اعتصام بە دم فەنادا کە، ئەوجا دەگەیە مەقام و قۆناغی "فناء الفناء و نفي النفي" (نییە لای خودا نییە؛ نییە نییە) (بیان القرآن، ج ٤٣/٢ بەخش اعتصام، سلوک و عرفان)

**ئاوڕدانەوەیەک و شوکر و سپاسێک بۆ خودا**

دە ئایەتەکانی ٩٨ تا ١٠١ ئاگاداری و ڕێنوێنی موسوڵمانان لێکدا لێکدا کرا هەر جارەی بە شێوەیەک:

١. جارێکیان دەستوور بە خاوەن ئیمانان درا و وشیاری ئەوەی بن دە داوی ئەهلی کتێب نەکەون.

٢. جارێکیان ئاگاداری درا بە موسوڵمانان کافران پەرتەوازە نەخەنە نێوانتان،

٣. جارێکیان خودای تەعالا دەستووری پێ دان جا چۆن کافر دەبن، نەکەن خۆ تووشی داوی ئەوانە کەن؛

جا ئەوجار خودای خاوەن کەرەم بە شوێن ئەو ئاگادارییانەدا چەند دار و لەلەیەک لە سەر ئەساسی پەند و ئامۆژگاری ڕادەنێ بۆ موسوڵمانان بە وەسیلەی ئایەتەکانی ١٠٢ و ١٠٣ی ئالی عیمران، بەو جۆرە:

١. دە ئایەتی ١٠٢دا ئەمر دەکا بە موسوڵمانان بە پارێزگاری و تەسلیم و ئیتاعە بە خودا و ڕەسووڵی خودا. ئەو دەستوورە دە سۆنگەی ئەو ئایەتەی پێشوودایە کە خودا فەرمووی: دە داوی ئەهلی کتێب نەکەون، بەڵکە دەبێ پارێزگاریو ببێ.

٢. خودا دە ئایەتی ١٠٣دا دەستوور دەدا بە موسوڵمانان تێکۆشن تەنافی یەکپارچەگی و یەکەتی خۆتان ئەستوور و قایم و قۆڵ وەهێڵن و بیپارێزن، ئەو ئەمر و دەستوورەی خودا دە مقابل ئەو ئاگاداریەی پێشوودایە کە خودا پێی ڕاگەیاندن بە وەسیلەی وشیار بن کافر خەریکی پەرتەوازیتانن.

جگە لەوانەش خودا ئەوەشو پێ دەڵێ بە وەسیلەی ئایەتی ١٠٣ سپاسگوزاری نیعمەتەکانی خودا بکەن، وەک نەجاتی ئەنسارییەکان (ئەوس و خەزرەج) لە فریوی ئەهلی کتێب. وەک یەکەتی لە نێوان موسوڵمانان بەتایبەتی لە نێوان ئەوس و خەزرەجێکی کە نزیک بوو بە هۆی دەست تێوەردانی ئەهلی کتێب بە گیانی یەک وەربن وەک دەورانی جەهالەت و نەزانییان.

بەیاناتی ئایەتەکانی قورئان بە وەسیلەی پێغەمبەری پاک و ئەمین یەکی دیکە بوو لەو نیعمەتانەی خودا و هەروا بە هۆی پاک و پیرۆزی پێغەمبەر و ئایینی مبارەکی قبووڵی ئیسلام و قورئان گەلی خاوەن بڕواکان لە سەر لێواری دۆزەخ و ئیختیاری کوفر گەڕانەوە، بوونە یەک پارچە سەرباز و فیداکاری ئایینی ئیسلام و قورئان.

بۆ تەئیدی ئەو مەبەست و مەتڵەبەی باس کران دەچینە خزمەت ئایەتەکانی ١٠٢ و ١٠٣ی

ئالی عیمران:

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾

**ئەی ئەوانەی بڕوا و ئیمانتان هێناوە! بەو شێوەی کە شایانی شانی خودایە لێی بترسن، بە باوەڕدارییەوە نەبێ، نەمرن.**

وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ وَاذْكُرُواْ نِعْمَةَ اللّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاء فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنتُمْ عَلَىَ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠٣﴾

**دەس بگرن بە ئایین و بە بەرنامەی خوداوە بە تێکڕایی، هەرگیز پرژ و بڵاو مەبن، بیر لەو ناز و نیعمەتەی خوداش بکەنەوە کە ڕشتوویە بە سەرتاندا، لە کاتێکدا دژ بە یەک بوون؛ خودا هۆگری خستە نێوان دڵەکانتان، سەرەنجام بە هۆی ناز و نیعمەتی خوداوە بوون بە برا، ئێوە لە لێوار چاڵێک لە ئاگردا بوون، خوداش لێی ڕزگار کردن، ئا بەو شێوەیە خودا ئایەت و بەڵگەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەو هیوایەی شارەزا بن.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٠٢ و ١٠٣:**

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێنا و ڕاستیش دەکەن، لە خودا بترسێن لە خودا ترسانێکی ڕاست، واتە هیچ کات و سات لە خودا بێئاگا نەبن و کاروبارەکانی ئاخرەت وەپێش کاروبارەکانی دنیا بخەن، مەمرن هەر وا بە سووک و ساکاری، بەڵکە بمرن بۆ خودا و بژین بۆ خودا و ملکەچی خودا بن و دوا هەناسەتان بە بڕوا و ئیمانەوە بێ. وەرن هەمووتان بە پاکی و بە چاکی و بە ڕاستی دەس باوێنە ناو یاسا و بەرنامەکانی ئایینی پاک و ڕاستی خودا بە شێوەیەکی وا قایم و قۆڵانە و پتەو، بە هیچ لێک جیا مەبنەوە، نە بە هۆی زینەتی دنیا و فریوی جوانی دنیا و فڕ و فیشاڵی بێباوەڕان، نە بە خۆشەویستی ژن و منداڵ. وەبیر خۆشتان بێننەوە ئەو بەهرە و کەرەمانەی کە خودا پێی بەخشیون دە کات و سات و دەورانێکدا کە دوژمن یەکتریان گرتبوو لە سەر نابوود کردنتان و بە گژ یەکدا کردنتان؛ سا خودا هات بە ڕەحم و بەزەوە داپۆشین، و دڵی نەرم کردن لە سەر لێواری ئاگردانی ئاگر بوون کە تێبکەون، نەجاتی دان و ڕزگاری کردن لە تێکەوتن؛ دەبێ ئەو چاکەیەی خودا بە بادا نەدرێ، خودای خاوەن کەرەم نیشانەکانی خۆی ئاشکرا دەکا بۆتان بۆوەی بکەونە سەر ڕێگای ڕاست و ڕەوان. "و لاتفرّقوا" واتە بە هۆی ڕەگەز

و زمان و ڕەنگ و بەرگی عورف و باو لێک هەڵمەبڕێن و جیا مەبنەوە، چونکە هەمووتان لە ئادەمن، ئادەمیش لە خاکە، شانازی بە سەر یەکدا مەکەن، بە خوداناسی نەبێ، چونکە یەک ڕەگەزن، تەواوی جیاوازیتان لە زمان و ڕەنگ و چۆنیەتیتاندا لە بۆ ئاسایش و یەکتر ناسین و ئاشنایەتییە، ئەگینا هیچو لە هیچو ناکرێ نەجیبتر بن ئیللا بە هییمەتی خوداناسی نەبێ.

**چاوخشکەیەک:**

تەقوا واتە پارێزگاری لە دەستووراتی خودا و خۆ پارازتن لە تاوان، شایانی تەقوا، واتە بەندە لە هەر جۆرە گوناح و خەتا و تاوان بە پێی دەستەڵات خۆ بەدوور بگرێ، جا ئەو شێوە تەقوایە خاوەن باوەڕ دەبێ لە دوای شەقی بێ و بێ بابۆڵە بێ ناوی خۆی نەچێ وەگۆڕێ بە فێڵ بە بابۆڵە چەورەی نەفامان، دەبێ بە تەواوی ئەوە بزاندرێ کە ئیمان هێنان هەر ئەوە نییە بە زمان بکوترێ، بەڵکە دەبێ بە کردار و ئاکار بی تا دوا هەناسەی تەمەن، ئارەزوو خۆشەویستی دنیا لە خشتەت نەبا و تلاسات نەکا لە ڕێی ڕاست.

وا دەردەکەوێ و هەست پێدەکرێ کە ئایەتی ١٠٢ حوکمی فەرد بێ، بەڵام ئایەتی ١٠٣ ئەمر و حوکمی گشتی بێ، واتە خودای تەعالا ئەمر دەکا بە تەک تەکی کۆمەڵ کە دەس دە یاسای خودا گرن بە تێکڕایی و سوننەتەکانی پێغەمبەر بقۆزنەوە. جا لەو شێوە ئەمرەی باری ئەو هەستە دەکرێ بە تەواوی: کۆمەڵ بێ ڕێنوما و پێشەنگی زانا و دانا و بەزیبک و لێهاتوو دە گیر دەکەوێ و پەرێشان و پرژ و بڵاو دەبێ، هەموو دژ و نەتەوییەک دەتوانێ وەیقۆزێ و دەستەمۆی خۆی کا و دە زەلکاوی جەهل و نەزانیدا ڕۆدەچێ بۆ هەمیشە، جا ئەوەیە ڕاز و هۆی ئەوەی کە بۆ نەجاتی ئینسان لەو چارەڕەشییە خودا بانگی ئینسان دەکا کە دەس دە یاسای خودا وەرێنن و لێی وەدوور کەون و لێکتریش هەڵمەبڕێن، بەڵگە زۆرن لە سەر ئەوەی کە گەل و هۆز و نەتەوەی بێ ڕێبەر وەک حەیوانی ئاوەکی وایە، هەر کەس وازی لێ بێ، دەیکاتە ئی خۆی؛ گەلانی دووربووە لە پێغەمبەران و قورئان و کتێبەکانی دیکەی ئاسمانی دە جەهل و شەڕ و شۆر و فەساد و وەحشیگەریدا بە داتوڵاوی ماونەوە، وەک هۆزی عەرەبی وەحشی تا حەزرەتی ڕەسووڵیان نەگەیشتە ناو داماو و لێقەوماو بوون، پاش ڕێبەرایەتی قورئان و محەمەد دوژمنانی دوێنێ ببوونە برای ئەوڕۆ، ئەو مەتڵەبە دروست و ڕاستە دە ناوەرۆکی ئایەتی ١٠٣دا بە ئاشکرایی هەیە و هاوارمان دەکاتێ.

**پاشەدۆ**

خودای تەعالا لە ئایەتی ١٠٢ و ١٠٣دا موسوڵمانی بە ئەدای ئیتاعەت و تاعـات و خێـرات دەستوور دا، هەر وەک لە هەوەڵەوە بە پارێزگاری لە فەرمانی خودا موسـوڵمانانی بانـگ کـرد؛ (اتّقوا الله)، جاری دوایەش بە دەست گرتن بە یاسای خودا وەک فەرمووی (و اعتصموا بحبـل الله)، و جاری سێیەمیش بە یادئاوەری نیعمەتەکانی خـۆی دەسـتوور دا بە خـاوەن بـاوەڕان کە فەرمووی: (و اذکروا نعمـة اللـه علـیکم)؛ هـۆی ئەو یاسـا بە نەرمـش دەبـێ ئەوە بـێ: کـرد و کردەوەی ئینسانی یا لە ڕووی ترساندن بێ، یا لە سەر ئەساسی مەیل و ئارەزوو بێ، دیارە تـرس لە پێشەوەی مەیل و ڕەغبەتە، چونکە بەرگری لە زەرەر لە پێش ڕاکێشـانی نەفـع و بەرهەمە، جـا بەو پێیە دەبێ بکوترێ (اتَّقُواْ اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ) ئاماژە وەلای خۆف و ترسی خودایە، واتە لە ترسی عەزاب و غەزەبی خودا دەس بدە بە یاسای خودا (و حبل الله).

هەندێک لە قورئانزانان نەزەریان وایە ئەو ئـایەتە (١٠٢) (اتَّقُواْ اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ) بەو هـۆیە کە زۆر سەخت و گرانە جێبەجێ نابێ، لابراوە بە ئایەتی ١٦ی سووڕەی تەغابون ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَـا اسْتَطَعْتُمْ﴾ واتە بە پێی توانا ئیتاعەی خودا بکەن و دەستوورەکانی بپارێزن؛ هەرچەند معـاذ بـن جبل فەرموویەتی ئەو ئـایەتەی ١٠٢ی ئـالی عیمـران نەشـۆراوەتەوە بە ئـایەتی ١٦ی سـووڕەی تەغابون، بۆی بڕوانە لە تەفسیری کەبیر، هەمان ئایەت.

جوملەی ﴿وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ واتە مەبەست بەردەوامییە لە سـەر ئیسـلامەتی، یانی تا هەی، بەرقەرار و بەردەوام وەمێنە لە سەر ئایینی ئیسلام تاکوو نەمری بە بێدینـی بەڵـکە بمری بە ئیسلامی؛ جا لە سەر قەولی معاذ بن جبل و زۆربەی زانایانی قورئان (جمهور علـماء) ئەو ئایەتە (١٠٢) لە موکەماتانە ناکرێ نەسخ بێ.

دڵـی سرک و سـڵ و پـڕ لە هەسـت لە ئـایەتی ﴿وَلاَ تَمُـوتُنَّ إِلاَّ وَأَنـتُم مُّسْـلِمُونَ﴾دا هەڵدەبەزێتەوە و ڕادەچەنێ؛ لە بەر ئەوەی مـردن دە ئیختیـاری ئینسـاندا نیـیە و کـات و سـاتی دیاریکراوی خۆی کە هات چارە و ڕێگای ئیمان و باوەڕ ناهێڵێ و شپرزەی دەکا؛ دە حاڵێکـدا خودا ئەو دەسـتوورە دەدا بە ئینسـان دە حـاڵەتی مردنـدا لە کـوفر خـۆ بەدوور بگـرن بەڵـکە بە ئیمانەوە بمرن؛ ئینسانی پەشۆکاو و چڕژاو و شپرزە لە بەر دەستی داڵی مەرگ لە کـوێ هۆشـی کـوفر و ئیمانـی دەمێنـێ و دەتـوانێ ئیختیـار وەگەڕ خـا دە حاڵێکـدا هەمـوو هەسـتی لە گەڕ دەکەوێ!

وڵامی ڕەوا و ئەقڵپەزیر دێرەدا دەبێ چ بێ؟!

دەبێ دە وڵامدا ئەوە بکوترێ: هەرچەند زانایان «لا» نەهیان داوەتە پاڵ مەرگ، یانی نەمری بە کافری، بەڵکە بە ئـیمانەوە بمـرە، ئەوە دیـارە ئیختیـاری بە دمەوەیە و دەیگەیێنـێ بە ڕواڵەت، ئەمما مەبەستی بەڕاستی دێرەدا ئەمر و دەستووری خودا بۆ بەردەوامی و بەرقەرارییەکی پتوون و قایم و قۆڵە دە هەموو کات و ساتی دەستەڵات و ئەقڵ و هۆشی بە ئیختیار و سـەربەخۆیە، تـا کاتێ گورگی ئەجەل داودێتێ.



پاش دەستوور و فەرمانی خودا بە تەقوا و پارێزگاری، ئەوجار خودای تەعـالا دووهەمـین دەستوور و فەرمانی خۆی دەکار دەکا بۆ سەر ئینسانی بە وەسیلەی ئایەتی ١٠٣ی ئالی عیمران.

بە پێی هەڵسەنگاندن و بەرجەوەندی ئایەتی (وَلاَ تَفَرَّقُواْ) بە دوو شت هەست دەکەین:

١. لە هەڵگێڕ و وەرگێڕی سیما و نـاوەرۆکی ئـایەتەکەدا ئەوە بە دەسـت دێ کە مەبەسـتی خودای تەعالا دە (وَلاَ تَفَرَّقُواْ)دا ئەوەیە موسوڵمانان بە هۆی هـیچ شـتێک دووبەرەکـی دەگەڵ یەک پێک نەهێنن، چونکە حەق و ڕاسـتی هەر یەکـێکە، غەیـری ئەو یەکە درۆ و نەزانیـیە، هەر ئەوەشە هۆ کە خودای تەعالا دە ئایەتی ٣٢ی یۆنسدا فەرموویەتی:

**فَذَلِكُمُ اللّهُ رَبُّكُمُ الْحَقُّ فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلاَّ الضَّلاَلُ فَأَنَّى تُصْرَفُونَ**

**ئائەمەیە خودا و پەروەردگاری ڕاستەقینەی ئێوە، کە واتە پاش ڕاستەقینە چی دی هەیە بێجگە لە ڕێگە ون کردن! دەی ئیتر چۆن لە ڕاستەقینە لا دەدرێن بەرەو بەتاڵ!؟**

٢. هەڵدەگرێ خـودا کە مەبەسـتی لە (وَلاَ تَفَرَّقُـواْ)دا ئەو نەهـیە بـێ: واتە دوژمنـایەتی و دووبەرەکی پێک مەهێـنن چـونکە ئەوانە لە دەورانـی نەزانـی و لاسـاریدا دەگەڵ یەک شـەڕ و هەڵای دووبەرەکییان بەکار دەهێنا، جا ئێستا خودا داوایـان لـێ دەکـا ڕابـردوو ڕەچـاو نەکەنەوە دووبـارە، چـونکە دیتتـان کە بەرهەم و نەفعـی دووبەرەکـی و دوژمنایەتیتـان دەگەڵ یەک هەر ڕۆچوونە لە نێو زەلی شەڕ و شۆڕ و وڵاتوێران کردنتان.

٣. یا دەڵێن مەبەستی خودا لە (وَلاَ تَفَرَّقُواْ) ئەوەیە: دووری بکەن لە هەرچـی دەبێـتە هـۆی لەناوچوونی محەمەبەت و مەیل و دۆستایەتی.

لە ئایەتی ﴿وَاذْكُرُواْ نِعْمَةَ اللّهِ عَلَيْكُمْ﴾ وا هەست پێ دەکـرێ کە نیعمەتەکـانی خـودا لە سەر ئینسان یا دنیـایی دەبـن یـا قیـامەتی دەبـن؛ هەر وەک خـودا هەر دوو بەشـەکانی دە نـاو

ئایەتەکەدا دەس‌نیشان کردوون:

١. نیعمەتی دنیایی بۆ ئەو گەلە ئەوەیە کە لە هەوەڵەوە ئەوانە شیر و تیریان لێک دەسوون ها لێکدەن، پاشان خودا بە حیکمەت و کەرەمی خۆی دەگەڵیان، دڵی بۆ لای یەک بردن و تێکەڵاو و دەستەملانی یەکتری کردن وەک برایان، وەک تایفەی ئەوس و خەزرەج، کە فیتنەگێڕان و گێرەشێوێنەکان لێکیان وەنزیک خستبوون کە بە گژ یەکدا بێن و پێک وەربن؛ تاکوو پێغەمبەری پاک و ڕاست دە هاوارەوە هات و گەیشتە سەریان و بەرگری کرد لە بەگژداچوونی یەک و کردنی بە ئاشنای یەک بەوپەڕی خۆشەویستی دەگەڵ یەک؛ وەک وێنەی ئەو ئاشنایەتی و ڕێککەوتنە لە ئایەتی ٦٣ی ئەنفالدا، چاو دەکرێ:

**وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً مَّا أَلَّفَتْ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَـكِنَّ اللّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ إِنَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ**

**دڵەکانیشی ڕێک خستن ئەگەر ئەوەی لە سەر زەویدایە هەمووت بدایە، نەتدەتوانی دڵیان یەک بخەی، بەڵکە خودا ڕێکی خستن بە بێ‌گومان خودا زاڵ و کاربەجێیە.**

**پوختەی مەبەست:**

دەبێ ئەوە بزاندرێ و باوەڕیشی پێ بکرێ کە کێ ڕوو دە دنیایە کا و بیپەرەستێ دوژمنی بەشی زۆری ئەو شتانەیە کە خودا دروستی کردوون، جا بگرە لە ئینسانەوە تا حەیوان، بەڵام کێ ڕوو دە خودا کا واتە دە خزمەتی خەڵقی خودادا بێ، ناتوانێ دوژمنایەتی هیچ گیان‌لەبەرێک بکا، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئێرە: ئەو وەک خودا و بە چاوی خودا دەڕوانێتە مەخلووقی خودا، ئەدێرەدا شۆقی ڕووناکایی کوتەی عاریفان چاو دەکرێ: (إِنَّ العـارِفَ اِذا اَمَـرَ بِرِفـقٍ، و يكونُ ناصحاً بِعُنفٍ و يُغَيِّرُ فَهوَ مُستَبصِرٍ بِسِرِّ الله في الْقَدَرِ): واتە ئاشنا و زانا کاتێ ئەمر کا بە چاک ئەمر دەکا، ئەگەر نسحەت بکا بە قینەوەی ناکا، ئەگەر عەیب چاو کا، حەواڵە بە حیکمەت و ئەسراری خودا و قەزا و قەدەری دەکا.

**کاکڵەکەی:** کاتێ خودا نیعمەتی دنیای بەیان کرد کە ئاشنایەتی و یەکدڵی و سەفای ناو ماڵتان بوو، نیعمەتی ئاخرەتیشی بۆ بەیان کردن، کە نەجاتی دان لەوەی تێکەونە ناو چاڵی دۆزەخ لە ڕۆژی ئاخرەتدا.

**حبل الله:**

زانایانی قورئان "حبل الله"یان بە هەشت شت بەراوەرد کردووە:

١. قورئانی پیرۆز

٢. تاعەت و یاسا (لە ابن مسعود ابن عباسەوە، طبری، ۳۷۸/۳)

٣. ئیخلاس (طبری، ۳۷۹/۳)

٤. شوێنکەوتنی دەستووراتی خودا (حسن بصری و ابن ابی حاتم)

٥. ئیسلام (طبری، ۳۷۹/۳ ش ۷۵۷۲)

٦. وەعدەی پەیمانی خودا (طبری، ۳۷۸/۳)

٧. ڕێز لە پێغەمبەر و شوێنکەوتنی (هەموو تەفسیرەکانی ناوبراو لە بابەت حبل الله)

٨. ئال و بەیت.

**یادێک و ئاوڕێک وەسەر جەهالەتی عەرەب:**

پێش زاهیربوونی ئایینی ئیسلام، سێ فیتنە و شەڕی بێئامان ڕووی دا لە ناو عەرەبان:

١. شەڕی "بسوس" شەڕێکی ناودار و وێرانکەر بوو، "بسوس" وەک دەڵێن ناوی ژنێک بوو کە خاوەنی لەوەڕگەیەک بوو، وا هەڵدەکەوێ ڕۆژێکی حوشتری کابرایەکی دەچێتە ناو ئەو لەوەڕگەیە، ئەو ژنە کە پێ دەزانێ دەچێ ئەو حوشترە دەکوژێ؛ جا کاتێ خاوەنی حوشترە پێ دەزانێ بەو کارەساتە ناحەز و ناڕەوایە، بە پەلە و بە پڕتاو خۆ دەکوتێ بۆ لای ئەو ژنە کە قاتڵی حوشترەیەکە و ئانگژای دەبێ و مەمکانی دەبڕێ. جا ئەو دوو کارەساتە ناڕەوایەی ئەو ژن و ئەو پیاوە دەبێتە هۆی شەڕێکی درێژ و خوێناوی لە مابەینی دوو قەبیلەی "بنی بکر" و "بنی تغلب" کە سەرەنجام تەواوی هۆز و قەبیلەی عەرەب دادەگرێ تا پەنجا و یەک ساڵ درێژەی دەبێ.

٢. شەڕی دووهەم شەری "احس" دەبێ کە لە ئەسەری کێبڕکێی ئەسبسواریدا دەبێ و ڕوو دەدا؛ تا حەفتا و چەند ساڵ دەوامی دەبێ زیاتر لە هەزار کوشتە لە خۆ دەگرێ. (تفسیر المقام المحمود، ج ۴۹۶/۱). هەر لەو ساڵیشدا ئیسلام لە مەککە سەری هەڵدا کە بەرە بەرە خەڵک بەرەو دەنگی ئیسلام بۆ مەککە دەهاتن؛ بۆ نموونە یەک نەفەر بە ناوی "سوید بن حاست" ئەهلی مەدینە خۆی گەیاندە حەزرەتی ڕەسووڵ و ملاقاتی کرد ئینسانێکی حەقپەرست و حەقخواز بوو، دڵیشی لە گفتوگۆی پێغەمبەر پاراو بوو، بەو بۆنەوە وەعدی دا بە پێغەمبەر لە گەڕانەوەدا بۆ مەدینە خەڵک بۆ لای دینی ئەو دەعوەت بکا، بەڵام کاتێ گەڕاوە بۆ مەدینە، شەڕی "بعاث" ڕووی دا و تێدا چوو و کوژرا و نەگەیی بە ئاواتی خۆی.

هەر لە پاش ئەو دووهەمین کەسانی کە ملاقاتی حەزرەتی ڕەسووڵیان کرد "ایاس بن معاذ" و چەند نەفەری دیکەش بوون کە لە پاش ملاقات کردنی حەزرەتی ڕەسووڵ شیفتە و جەزبی پێغەمبەر دەبن و کاتێ دەگەڕێنەوە بۆ مەدینە، دەگەڵ تایفە و خزمانی خۆیان ڕاست و دروست باس دەکەو و قبووڵی دەکەن، بەڵام ئەو "ایاس بن معاذ" پێش ئەوەی پێغەمبەر هیجرەت بکا بۆ مەدینە، وەفات دەکا. هەروا بەرە بەرە خەڵکی مەدینە دێن بۆ مەککە و تێکەڵاوی ئیسلام دەبن (تفسیر تبیین الفرقان، ۱۸۴/۶)



دەبێ ئەوە بزانین کە خودای تەعالا دە ئایەتەکانی ڕابدروودا ئەهلی کتێبی بە دوو تاوان و عەیبانەوە ناودێر کردووە:

۱. یەکێک لەو دوو عەیبانە ئەوەیە کە ئەوانە بێباوەڕ بوون بە خودا و بە قورئان و بە پێغەمبەر. هەروەک ئایەتی ۹۸ی ئالی عیمران ئیشارەی وەلا دەکا.

۲. عەیبی دووهەمی ئەوانە ئەوە بووە کە هەمیشە دە حەولی ئەوەیدا بوون، خەڵکی ساوا و کاڵی موسوڵمان ئاوەژوو کەنەوە بەرەو کوفر و بێدینی، وەک لە ئیشارەتی ئایەتی ۹۹ی ئالی عیمران چاو دەکرێ؛ جا بۆ خۆپارازتنی موسوڵمانان لەو ئاکار و ڕەفتارە ناحەزانە خودا ڕوو لەو ئەهلە کتێبانە لادەدا و وەردەگێڕێ بەرەو خاوەن باوەڕان و دەیاندوێنێ بەو شێوەیە کە ئێوە ئەی ئیمانداران پارێزگاری لە یاسا و دەستووراتەکانی خودا بکەن چۆنی شایانی یاسای خودایە؛ بە وەسیلەی ئایەتی ۱۰۲ و ۱۰۳ ئالی عیمران، و هەروا تێبکۆشن عالەم بەرەو دین و تاعەت ڕاکێشن تاکوو ئیمانی ئاسمانی پەرە بستێنێ.

جا بۆ تەئکیدی ئەو مەبەستە ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۰۴ی ئالی عیمران:

**وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُولَـٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾**

**دەبا لە نێو ئێوەدا دەستەیەک هەستێ بانگەشە بکەن بەرەو خێر و فەرمانیش بدەن بە چاکە و ڕێگریش بکەن لە خراپە، هەر ئەوانەن ڕزگاربووان.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ۱۰۴

جا با لە ناوتان ببێ و هەڵکەوێ کۆمەڵێک کە بانگاواز بکەن بۆ چاکە کردن، دەکرێ دێرەدا ئەو مەبەستە بدەیە دڵ کە ئەو بانگاوازە ئەرکە لە سەر شان و ئەستۆی زانایان کە ئەوانن بە قۆناغ

و پلەی یەکەمی لێپرسراوی ئەو بانگاوازە دەکەن، پاشان هەموو ئینسانێکی خاوەن باوەڕ و ئیمان بەرپرسن بۆ ئەمر بە چاکە و ڕێگرتن لە خراپە، کێ ئاوا بێ و شان بداتە بەر ئەو ئەرکە گەورە، پلەی سەرکەوتن بەشیان دەبێ، بە کورتی هەر گەلێک هەڵەی یەک ڕاست کەنەوە و عەیبی یەک داپۆشن، قسە لە یەک وەرگرن، ئەوە لە ژیاندا سەربەرز و سەرکەوتوون.

ئایەتی ١٠٤ی ئالی عیمران ئەمر و دەستوورە لە لایەن خودای حەکیم و زانا بۆ سەر ئینسان تاکوو ئینسان بتوانێ بۆ ئاسایش و حەسانەوە و حاوانەوە ئەمر بە چاکە بکەن و بەرگری لە خراپە بکەن، چونکە ئەو شێوە ئەمر و دەستوورە بۆ تەک‌تەکی کۆمەڵ کە ئەمرێکی ئیجابییە وەک باڵاپۆشێک وایە بۆ پارازتنی گەل لە ناکۆکی و دووبەرەکی و فەساد و لەولایەشەوە پایە و ئەساسی یەکپارچەگی گەل دادەبەستێ و قایم دەکا کە تۆفان و زەلزەلەی هێرشی زۆرداران و خراپەکاران نەتوانێ جرزی پێ بەرێ و کەلێنی تێ خات. چونکە ئەو وەزیفە پیرۆززە (ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە) وەک دوو پایە دێتە ڕوو دە ناو کۆمەڵدا:

١. دەبێ تەک‌تەکی ئەفرادی کۆمەڵ ئەوە بە ئەرکێکی سەرەکی خۆی بزانێ و بیپارێزێ تاکوو ژیان و حەسانەوە و حاوانەوە و کەرامەت و مافی کۆمەڵ لە ئافات و فیتنەی فیتنەبازان بەدوور بێ و ئاژاوەگێڕان نەتوانن ڕەخنە بکەنە ناو خەڵک و تۆوی ئاژاوە بچێنن و ڕیشەی فەساد لە ناو دڵی پان و پۆڕی گەل بنێژن، واتە وەک واجبێکی زاتی هەر کەس لە بەرا خۆیەوە پاسەوانی لەو ئەرکە پیرۆزە بکا و بیپارێزێ.

٢. دووبارە کۆمەڵ بە گشتی وەک واجبێکی کیفایی بۆ بەرگری لە خراپە و ئاژاوە و فەساد دەبێ دەست بدەنە دەستی یەک و دڵ دەناو دڵ وەک سەد و سوپەرێک بوێستن دە بەرابەر هێرش و هەرەسی تەرەسان بۆوەی نەتوانن ڕووی لێزماو و سێڵاو دە وڵاتی گەل و کۆمەڵ بکەن بۆ وەی زەوی‌وزاری پێکەوە ژیان بخەنە بن لیتەی دەستەڵاتیان و وێرانی کەن. وەک وڵاتی سووریە و عێراق کە جێڕاوگەی پیاوانی پیرۆزی ئایینی بوون.

بە کوردی و بە کورتی، کێ بتوانێ ئەو ئەرکە پیرۆزەی بەختەوەری بە تێروتەسەلی و بە جوانی وەخۆ بگرێ و وەیقۆزێ، ئەوە بێ‌گومانە لە قۆزانی گەل و نیشتمان و ئیمانە، جگە لە هەموو ئەوانە دەتواندرێ پێی بکوترێ: جێ‌نشین و خەلیفەی خودا لە سەر زەوی، و جێ‌نشینی پێغەمبەر و قورئان لە ناو کۆمەڵ؛ چونکە ئەوەی دەتوانێ وەحدەت و یەکپارچەگی کۆمەڵ بپارێزێ و بیگەیێنێتە لووتکە و قۆناغی بەختەوەری، دەگەڵ یەک‌بوونە بە پاکی وبە ڕاستی، دە

دیـارە ئەمـر بە چـاکە و بەرگـری لە خـراپە بەری داری شۆخ‌وشـەنگی هـاودڵی و یەکیەتیـیە، سەرنویشتی کۆمەڵ بە یەکەوە بەستراوە، هەر وەک یەک نەفەری خـراپ دەتـوانێ سەرنویشـتی کۆمەڵ وەلەرز خا و بیلاژێنێ، هەر وایە یەک نەفەری چـاک و پـاک دەتـوانێ پـایە و ئەساسـی یەکپارچەکی کۆمەڵ قایم و ڕاوەستاو ڕاگرێ جا چ جای ئەوەی کە کـۆمەڵ هەمـووی هەسـتی چاکە بکەن، جگە لەوانە پێویستە و زەرووریە یاسـا و دار و لەلە بـۆ کـۆمەڵ ببـێ و بەسـەروەر دابندرێ ئەو یاسایە بۆوەی ئەفراد نەتوانن لە سنوور تێپەڕی کەن.

**دڵ خوازیاری ئەوەیە بزانێ وشەی (امة) بە مانای چییە؟**

زانا عەرەبەکـان واتە ئەوانەی کە بە لۆغـاتی عەرەبـی ئاشـنان و دەیـزانن، بە چەنـد مانـای جۆراوجۆریان دەکار کردووە هەر یەکەی لە سەر ئەساسی بەڵگەیەک، بۆ نموونە:

١. لە جێیەکدا بە واتای کۆمەڵێکیان ناو بـردووە کە قەسـتی کارێکیـان کـردووە: الجماعَـةُ اللَّتي تؤم بأمرٍ ما: واتە کۆمەڵێک کە قەستی کارێکی بکەن.

٢. لە جێیەکی بە مانای وەشوێن کەوتن و ئیتاعە لە پێغەمبەران

٣. لە جێیەکی بە مانای پێشەوا؛ بە پێی ئیشارەی ئایەتی ١٢٠ی نەحل: ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا﴾ واتە: بە ڕاست و دروستی کە ئیبراهیم پێشەوایەکی موتیع و فەرمانبەردار بوو.

۴. بە مانای دین میللەتیشـیان دەکـار کـردووە، وشـەی (امـّة) وەک ئـایەتی ٢٣ی زخـرف ئاماژەی وەلا فەرمووە: ﴿إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَىٰ أُمَّةٍ﴾ واتە کافران کوتیان ئـێمە بابەکانمـان شـوێن دەکەوین.

۵. بە مانای زەمان و کاتیش دەکار کراوە (امّة)، وەک ئایەتی ۴۵ی یۆسف ئیشـارەی وەلای ئەو مانایە لێ چاو دەکـرێ: ﴿وَقَالَ الَّذِي نَجَا مِنْهُمَا وَادَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ أَنَا أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِ فَأَرْسِلُونِ﴾ واتە: یەکێ لە دوو کەسەکەی ڕزگاری بوو و پاش ماوەیەک بیری هاتەوە کوتی بمنێـرن هەوڵـی تەعبیر و لێکدانەوەی ئەو خەونەتان بۆ دێنمەوە. (روح المعانی ج ٣٢٣/٣)

دووبارە دڵی بزۆز و بەپرسیار دەیهەوێ بزانێ کێ دەبێ جاڕچی و بانگاوازچی عالەم بێ بۆ لای چاکە؟ واتە ئەمر بە چاکە و بەرگری لە خراپە! دیارە هەر وەک ڕوون و ئاشکرایە ئەو ئایەتی ١٠۴ی ئالی عیمران دەعـوەت بـۆ لای خێـری دەسـتوور داوە لە لایەن خـوداوە، جـا ئەوجـار تەفتیش‌کەران و زانایانی بەهەست و وردبین نەزەریان وا داوە کە دەبێ دەعوەت‌گەر و جـاڕچی

خێر و خێرات و چاکە، زانا و ئاشنا و ئاقڵ و هێدی بێ لە بابەت ئەو شتانەی ڕایاندەگەیێنێ. ئەگینا نەزان و تووڕە زەرەری زیاترە لە دەعوەتەکەدا، سووکایەتی پێکردن لە ئەحکامات و دەستووراتی ئایینی لێ هەست دەکرێ.

دەبێ ئەوە بە چاکی بزاندرێ کە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە دە شەئنی کەسانی شیاو و زانا و ئاشنا بە ئەحواڵ و ئەوزاعی مەبەست و مەتڵەب بێ، دەنا سەربەخۆ لێدوان و نەزان و بێئاگا وەسەر دەپەڕێ، ئەو وەسەرپەڕینە گوێگر بە وەسەر پەڕین وەرناگرێ بەڵکە بە دین و ئایین و ئەحکامی وەردەگرێ، ئەوجار لە سەر ئەمر بە دەستوور چەند پلە و قۆناغمان هەیە، سەیر کە:

١. ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە، ئەوە نەزەری زاتییە؛ واجبە.

٢. ئەمر بە فەرایزی کیفایی، ئەوە فەرزی زاتی نییە؛ کیفایەیە.

٣. ئەمر بە واجب یا نەهی لە سەر تەرکی واجب، ئەوە واجبی بزانە؛ فەرزی عەین.

٤. ئەمر بە سوننەت یا نەهی لە سەر تەرکی سوننەت؛ ئەوە سوننەتە.

٥. ئەمر بە مباحات؛ ئەوە سوننەتە.

دڵ دەیهەوێ ئەو پرسیارە بکا: بۆ دە ناو ئایەتەکەدا وشەی «معروف و منکر» لە جیات واجبات و عصیان بە کار براون؟ دیارە معروف واتە واجبات؛ منکر واتە عصیان!

دەبێ بۆ وڵامی دڵ وەڵامێک وەدرێ کە دڵی بە پرسیار وەیقۆزێ و قبووڵی بێ. پێشەکی دەبێ بە دڵ بسپێردرێ و بزانێندرێ کە دەعوەت و بانگاواز دە کاروبار و ئومووراتێکدا دەبێ بە کار ببردرێ کە چاکی و خراپی ئەو کاروبار و ئومووراتە مەشهوور بن و ئیتفاقی تەواوی لە سەر بێ، وەک واجبی نوێژ و حەرامی ئارەق، وەک ڕۆژ و وزەکات لە واجبیدا یا وەک قەتڵ و زینا لە حەرامیا؛ نەک وەک ئوموری ئیجتیهادی کە دەستەیەک دەڵێن جۆرێک دەستەیەکی دی جۆرێکی تر دەڵێن، و مەسەلەی تەقلید و پاکی بێگوناهی پێغەمبەران و یا دەست هەڵنان دە دوای نوێژدا هەر وا.... خودای تەعالا بە ڕاگەیاندنی ئەوانە واتە ئەمری ئیجتیهادی ئەمر و دەستووری ڕانەداشتیوە و نەداوە، جا لە سەر ئەو ئەساسە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە مەعرووف و مەشهوورن و کۆی دەنگی گەلیان لە سەرە؛ واتە ئەمر بە چاکە و بەرگری لە خراپە تەوافوقی هەموو کەسی لە سەرە بۆیە ئەو دوو وشە پیرۆزانە (معروف و منکر) لە باتی واجبات و عصیان هاتوون و هێندراون.



کاتێ خودای تەعالا ئەمری کردە ئینسان بە "امة واحدة" ئاشنا بێ و خوو بگرێ ئەوە خۆی ئامـاژەیە وەلای ئەوەی لە پەرتەوازە و لێـک هەڵبـڕاوی خـۆ بە دوور بگـرن، دووبەرەکـی و تەفرەقەگەری خۆی لێ بپارێزن. جا بۆ ئیسباتی ئەو ئیدیعایە دەبێ بچینە خزمەت ئـایەتی ١٠٥ی ئالی عیمران:

**وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَاخْتَلَفُواْ مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُوْلَـئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾** ئالی عیمران

**هەرگیز وەک ئەوانە مەبـن، پچڕپچـڕ بـوون و تووشـی کێشـە هـاتن، لە پـاش ئەوەی بەڵـگە و نیشانە ڕووناکەکان گەیشتە لایان، ئا ئەوانەن سزایەکی گەورەیان هەیە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٠٥**

ئێوە ئەی گەلی خاوەن باوەڕ وەکـوو ئەوانە مەبـن کە لێـک جیـا بـوونەوە و ئـاژاوە کەوتە ناویان بە هۆی فریوی ئاژاوەگێڕان، پاش ئەوەی بەڵگە و نیشانەکانی ڕوون و ئاشـکرایان لە لای خوداوە بۆ هات؛ واتە دوای ئەوەی بە هۆی کارەسات یەکتریان گرت و بەڵام تامیان لێ نەکرد و نەیانچەشت چونکە بە دڵ و لە ڕووی زانستەوە یەکتریان قەبووڵ نەبـوو و یەکتریـان نەگرتبـوو، بۆیە کەوتنە یەکتر کوشتن، جا ئەوانە سزایەکی گەورە و گران و بەژانیان هەیە لە هەر دوو دنیادا، لە دنیادا سووک و مەهتووک، لە ئاخرەتدا ڕووڕەش و بێدەرەتان.

هەر وەک دەڕواندرێ لە سەرنویشتی بەژان و دەردی ئەوانەی ئـاژاوەگێڕ و پەرتەوازەچـین، لە خۆشی و خۆشبەختی دوو دنیا بەدوور و زەلیل و داماون، چونکە ئەوانە پاش ئەوەی بەڵگە و نیشانەکانی ڕوون و ئاشکرای خودایان پێ گەیی و ڕاستیشیان دەرک کرد و پەیان پـێ بـرد، جـا ئەوجار حەسوودانە و بەخیلانە و کینەتووزانە کەوتنە گیانی خەڵک و تێیان بەربوون و وەحدەت و برایەتییان لێ دزین و لە بەر یەکیان هەڵوەشاندن و بێر و بەوێدا پەرتەوازەیان پـێ کـردن. خـۆ دیاریشــە ئەوەی دەتــوانێ وەحــدەتی کــۆمەڵ لە بەر یەک بەرێ دووبەرەکیــیە و هەروا ئەوەی دەتوانێ سام و هەیبەتی کۆمەڵ و گەل تێک شکێنێ، کێشە و یەکتر قبووڵ نەکردنە، ئەوانەیان بە تەواوی بە سەر خەڵکدا سەپاند، جا لەوەیڕایە سزایان دەبێ عەزابی هەر دوو دنیا بێ.

(کالّذین)ی ئایەتەکە بە پێی نەزەری زۆربەی زانایانی یەهوود و نەسارا (قرطبی، ١٦٢/٤) و هەروا مەبەست لە (بیّنات)ی ئایەتەکە بەڵـگە و نیشـانەکانی ڕوون و ئاشـکرای خـودان

(تفسير روح المعانى ٣٢٧/٤)

ده حەیسی سنن ابـن مـاجەدا لە عەوفـی کـوڕی مـالکەوە وەرگیـراوە کە گۆیـا پێغەمـبەر فەرموویەتی: یەهوود بە ٧٠١ دەستە دابەش بوون، و تەنیا یەک بەشیان دەبێ ئەهلـی بەهەشـت بێ، دە ٧٠ بەشەکەی دیکەیان ئەهلی دۆزەخن. و هەروا هۆزی نەساراش ٧٠٢ دەستەن ئەوانیش لەو ٧٠٢ بەشەیان بەشێکیان دەبێ ئەهلی بەهەشت بـن دەنـا ٧٠١ بەشـیان ئەهلـی دۆزەخـن، و هەروا ئـۆمەتی ئیسـلامیش بە ٧٠٣ بەش بەش‌بەش بـوون، لەوانـیش هەر یەک بەشـیان ئەهلـی بەهەشتن دەنا ٧٠٢ بەشیان ئەهلی دۆزەخن.

گۆیا لە پێغەمبەر پرسیار لەو یەک بەشە بەهەشتییە کراوە کە کێن؟ پێغەمـبەریش لە وڵامـدا گۆیا فەرموویەتی ئەهلی جەماعەت و سـوننەتن، لەوانـیش ئەوانەن کە خـاوەنی دڵـی پـاکن و ڕاستن، نەک هەچی خۆی پێ هەڵاوەسێ.

ئیمام ئەحمەد لە ئەمیری معاویە نەقڵ دەکا: یەهوود و نەسارا کتێـب لە بارەیـانەوە دواوە و کوتوویەتی: لە ناو دینەکەیاندا ٧٠٢ میللەت هەیە، کە سـەراپایان ئەهلـی دۆزەخـن، جـا مەگەر یەکیان (مسند امام احمد، ١٣٠٢)

دڵ لە دووبەرەکی و ئیختیلافی ئەو چوار ئیمامانە دڕدۆنـگە کە بـۆ دەبـێ ئەو مل‌بەملەیـان ڕانابێ لە بەر نەفس و هەوا بووبێ یا لە بەر حەق‌دۆزینەوە بووبێ؟ پەنا بە خودایەکی یەکە و دوو نییە، تا هەرا ڕوو بدا؛ دەشبێ ئیختیلاف لە چوار ڕێگاوە سەرچاوە بگرێ:

١. عەقیدە و ئەساس

٢. ئەعمال و ئەخلاق

٣. فرووعی ئیجماعی و غەیرە ئیجماعی

٤. عەمەل دە فرووعی ئیجماعیدا

بێ ئەوە سەر دەکێشێتە زۆرەملـی و تەعەسـوب و خـاڵی لە ئینسـاف و ئیعتیـدال، وەکـی دیاریشە و دە شەرعی ئیسلامیشدا پەسەند نەکراوە ئەو سێ بەشەی هەوەڵ واتە کێشەی عەقیـدە و ئەعمال و ئەخلاق و فرووعی ئیجماعی. چونکە هەرسێکیان زۆرەملی و کەڵەوەکێشـی تێـدا بەکار دەبـرێ، وەک عولەمایـانی مـوعتەزلە و خەوارج و ئەشـعەری و ... شـەڕی هەوادارانـی حەنەفی و شافیعی و مالکی و ئەحمەدی ملیۆنها بێ‌تاوان دە بەر پێیاندا پان و پڵچ دەبنەوە، پەنا بە خودا کاتێ قورئان هەبێ و بە بەیان‌گەریشی پێغەمبەر هەبـێ، مەلا و ئاخونـد دەڵـێن چـی!؟

هەچی بیڵێن لە خۆوە دەستەکوتە بکەن ئیشارە دەبێ وەلای ئەوەی بە فەرمووودەی پێغەمبەر دڵمان پاراو نەبووە. ئەوەش دەبێتە بەزمی سێ تەڵاقە و بەرهەمەکەشی دەبێتە "جاش" کە تەوهینە بە قەداسەتی ئایینی پاک و بەعیزەتی ئیسلام.

**سووکە ئاورێک**

ئەو ئایەتی ١٠٥ شتانێکی لێ هەست دەکرێ بۆ وەپشت گوێدان نابن، بەڵکە زۆر بەکەڵکن دەبێ بخرێنە ڕوو:

١. هۆی حەسوودی پێ بردنی ئەو بێباوەڕانە بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر و سەحیح و دروستی ئایینی ئیسلام، ئەوە بوو کە بە ڕوون و ئاشکرایی خودای تەعالا دە تەورات و ئینجیلدا بەڵگە و نیشانەی لە سەر دروستی دینی ئیسلام و ڕاستی پێغەمبەرایەتی محەمەد ڕانابوو و نواندبوونی، دە حاڵێکدا فێڵبازان و حیلەگەرانی یەهوود و نەسارا دڕدۆنگی و شوبهەیان داخزاندبووە ناو ئایاتی سەریح و ڕەوانی خودای تەعالا بۆ شێواندن و پەرێشان کردنی خەیاڵ و بیر و ئەفکاری موسوڵمانان، جا هەر ئەوەش بووە هۆ گورجانە خودای تەعالا ئاگاداری و هۆشداری دا بە موسوڵمانان کە فریوی قسەی بێباوەڕان نەخۆن و دە داویان نەکەون.

٢. خودای تەعالا کە ئەمر بە چاکە و بەرگری لە خراپەی دەستوور دا بە موسوڵمانان، دە پاڵ ئەوەشدا بە توندی ئاماژەی بەوەش کرد: تاکوو جارچی و ئامیر نەتوانێ ئەو ئەمرە بە چاکی و بە ڕەوانی بە کار بەرێ، بێگومانە ناتوانێ دەستووری ئەمر بە چاکە و بەرگری لە خراپە بە کار بەرێ، واتە دەبێ توانای بەڕێوە بردنی ئەو کارەی هەبێ جا دەتوانێ کارەکە بکا.

٣. ناتواندرێ بەرگری لە ئاژاوە و تەفرەقە و ملبەملە بکرێ، تا نەفس و هەوا و سەرەڕۆیی سەرکوت و دمکوت نەکرێ.

٤. ئەگەر عەرەبێکی یاسازان هات و پرسیاری کرد: بۆچی دە ئایەتەکەدا لە جیاتی (جاءتْهم البیّنات) "جاءهم" هێندراوە و "نیشانەی تأنث" لابراوە؟! وڵامی دەبێ چۆن وەدرێ و قبووڵیشی کا!؟ دەبێ لە وڵامیدا بکوترێ: ڕەوایە و بە ڕەوایان زانیوە حەزفی نیشانەی تأنّث لە فیعلدا بەو مەرجە فیعلەکە پێش کەوتبێ لە جوملەکەدا.



دەتوانین بڵێین تا ئێرە خودای مەزن بەیانی حاڵی شەڕخوازانی ئەهلی کتێب و دووڕووەکان و بەیانی حاڵی خێرخوازانی موسوڵمانی بۆ کردین، ئەوجار بەرهەمی ئاکار و کردەوەیان هەر

دەخاتە ڕوو خودای تەعالا، بۆوەی ئینسان بتوانێ ئەگەر ویستی ڕاست بڕوانێ بزانێ ڕێی ڕاست کامەیە! جا بۆ بەرهەمی ئەو مەبەستە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ١٠٦ی ئالی عیمران، تاکوو بە باشی تێبگەین:

**يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ فَذُوقُواْ الْعَذَابَ بِمَا كُنْتُمْ تَكْفُرُونَ**

**لە ڕۆژێکدا کە هەندێ لە دەموچاوەکان سپی دەبن و هەندێ لە دەموچاوەکانیش ڕەش دەبن، جا دەوترێت بەوانەی ڕوویان ڕەش بووە: ئەرێ ئێوە لە پاش ئیمان هێنانتان بێباوەڕ بوونەوە!؟ دەی کە واتە، سزای ئەو بێباوەڕیەتان بچێژن.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٠٦

ڕۆژێک دێ کە ڕۆژی حیسابە، بەشێک لە بەندەکانی خودا بەو هۆیە کە لە خودا ترسابوون و مافی هەموو خاوەن مافێکیان پارازتووە، مرۆی بە ناموس و خاوەن کەرامەت بوون ڕوویان بە سپیایەتی و گەردن فرازی چاو دەکرێ، سەروەری هەر دوو دنیایان بە نەسیب دەبێ، و هەر وا بەشێکیش لە بەندەکانی خودا و لە خودا بێخەبەر کە وەشوێن نەفس و هەوا و ئارەزووی سەرکەش و خراپی خۆیان کەوتوون، هەچی وەبەریان هاتبێ وەبەریان داوە و لەو ماڵی بێچارە و هەتیوانیش بووبێ خۆیان لێ نەپارازتووە، ئەوانە بە ڕووڕەشی و خەجاڵەتباری چاو دەکرێن، پێشیان دەکوترێ لەو ڕۆژە سەخت و بەسامەی ڕۆژی حیسابێ، ئایا مەگەر ئێوە پاش ئەوەی کە بڕواو هێنابوو، دووبارە بە هۆی گوێدان و بە نەفس و هەوا بێبڕوا بوونەوە، و لە پاڵ ئەو بێباوەڕیەتان لە هیچ تاوان و خراپەکارییەکە خۆو لانەداوە، جا کەوایە دەیچێژن سزای ئەو بێباوەڕیەتان.

دیارە ئەوە بێگومانە کە ئەو ڕووگەشییە و ڕووڕەشییەی خودای تەعالا دەیخاتە ڕوو بۆ بەندەکانی، نیشانەی چۆن ژیانیە لە دنیادا، واتە کاتێ ئینسان لە سنووری مافی خۆیدا تەجاوەزی بۆ مافی غەیر نەکا، و هەروا پارێزگاری لە ماف و کەرامەتی ئینسان و حەیوان کرد، مافی فەرد و کۆمەڵی پاراست ئەوە ئەو کەسە دەبێ بە خۆشەویستی خودا و خەلقی خودا، دەشتوانێ ڕۆژی حیسابێ بە سەربەرزی و ڕووگەشی لە پای دادگا و دیوانی خودا سەف بگرێ و ڕاوەستێ، بەڵام ئەگەر نەفس لەوەڕێن و خزمەتگوزاری ئارەزوو بووبێ، ئەوە لە ڕۆژی حیسابدا سەرشۆڕ و ڕووگرژ و تاڵ و داماو دادەمێنێ؛ چونکە مافی هەچی خاوەن مافە دە

خزمەتی ئارەزووو و ویستی پەستی خۆی ناوە، سنووربەزێن و پەتپسێن و نامووسدڕێن بووە ئیش و کاری لە دنیادا؛ ئێستاش لێرە دەبێ لە پای سزای ئەو بێئەدەبیەی بوەستێ.

دڵ دەڵێ کێ وەک «من» ئاوڕێ وەسەر وڵاتی قورئان وەدا و ورد لێی ورد بێتەوە، هاوتا و وێنەی ئەو ئایەتی ۱۰۶ زۆر چاو کا دەتاسێ!؟ بۆ نموونە ورد سەیری ئایەتی ۶۰ی سوورەی "زمر" بکا پاشان هەر ئاوا بە سرنجەوە بڕوانێتە ئایەی ۲۶ی یۆنس و ئایەتی ۴۱ی سوورەی عەبەس و ۲۲ی قیامەت و ۴۱ی ڕەحمان، لە مانایان سرنج بگرێ و هەڵیانسەنگێنێ تاکوو بتوانێ هەر ئایەتەی کە تایبەت و بابەتی خۆی دە پاڵدا ئەوانیش بزانێ بۆوەی نەڵێ: جا بۆ ئەو هەموو ئایەتانە لە سەر مەتڵەب و مەبەستێک هێندراونەوە؟ سەیر کەن:

وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ تَرَى الَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى اللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿۶۰﴾ زمر

لە ڕۆژی قیامەتدا دەبینی ئەو کەسانەی کە درۆیان بۆ خودا هەڵبەست، ڕوویان ڕەش هەڵگەڕاوە، ئایا لە دۆزەخدا شوێن بۆ خۆبەزلزانەکان نییە؟!

وَلاَ يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلاَ ذِلَّةٌ ﴿۲۶﴾ یونس

ڕواڵەتیشیان هیچ جۆرە تەپوتۆز و زەبوونییەکی لێ نانیشێ.

وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ﴿۴۰﴾ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴿۴۱﴾ عبس

هەندێ ڕوخساریش لەو ڕۆژەدا تەپوتۆزیان لێ نیشتووە؛ ڕەشی و دووکەڵێکی تاریک دایپۆشیون.

وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿۲۲﴾ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿۲۳﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ ﴿۲۴﴾ قیامة

ڕوخسار و دیمەنێکی زۆر ئا لەو ڕۆژەدا گەشاوەن؛ سەیری خودایان دەکەن؛ زۆر ڕوخساریش لەو ڕۆژەدا گرژ و ترش و تاڵن.

يُعْرَفُ الْمُجْرِمُونَ بِسِيمَاهُمْ فَيُؤْخَذُ بِالنَّوَاصِي وَالْأَقْدَامِ ﴿۴۱﴾ رحمن

تاوانباران هەر بە ڕواڵەت و شێوەیاندا دەناسرێن، ئینجا بە قژی پێش سەر و لاقەکانیان دەگیرێن و ڕادەکێشرێن.

دیارە ئەو ئایەتانە هەموو زەمزەمەی ڕووڕەش و ڕووسپیان دەکەن، بەڵام هەر یەکەی بە ئاب و تاب و تایبەتی خۆیانەوە، تایبەتمەندێکانیان با حەواڵە بێ بۆ تامەزرۆیانی تایبەتی.

دووباره دڵ دەیهەوێ بزانێ ئایا مەبەست لە ڕەش و سپی و قتره و نفره و ئەو ئایەتانە چییە؟ ئایا دەبێ هەر ڕەش و سپی و گرژ و هەڵقرچاو مەبەست بێ؟ یا ئەوە مەجازن و شتێکی دیکە نیاز و مەبەستە؟

نەزەری قورئانزانەکان لەو بارەوە دوو شتن:

١. یەک لەو دوو شتانە ئەوەیە: سپی (بیاض) واتە شادی و خۆشی، ڕەشیش مەجازە بریتییە لە غەم و خەفەت و داخ و حەسرەت؛ لە سەر ئەو یاسا و ئەساسە، دەتواندرێ بکوترێ: ئەوەی خاوەنی تەکلیفە دوو بەشن: موسوڵمان و کافر، بەشی سێهەمین کە نێوان کوفر و ئیسلامە چاو ناکرێ و نییە، هەروەک بۆچوونی عولەمایانی موعتەزلە، ئاوا دەڵێن: خودای تەعالا ئەهلی قیامەت دەکاتە دوو بەش: بەشێکیان ڕووگەش و سپیڕوون، بەشێکیان ڕووڕەش و ڕووهەڵقرچاون، ڕووگەش و سپی موسوڵمانان، ڕووڕەش و ڕووگرژ کافرن.

**پوختەی مەبەست:**

ئینسان دە ڕۆژی قیامەتدا بە پێی ئاکار و کردار هەڵدەستێتەوە لە ڕەنگ و ڕوخسارياندا دەناسرێن و دەردەکەون کە خاوەن باوەڕ بوون لە دنیادا یا بێباوەڕ بوون! خاوەن باوەڕەکان ڕووگەش و ڕووخۆشن، زۆر بە ویقار و عیزەتەوە بەرەو ئارامگە و ئاسایشگایان ڕەوانە دەکرێن، ئەمما بێباوەڕان ڕووگرژ و ڕووهەڵقرچاون، بێ واز و بێ ناز بەرەو حەسرەتخانە و خەفەتخانەی خۆیان کە دۆزەخە ڕەوانە دەکرێن؛ ئەو ئەحواڵ و ئەوزاعە بۆوەی نابێ بە زۆر نەگیردرێ و پاش گوێ بدرێ، نیزیکە و دە ڕێدایە، بێگومان دەگاتێ.

دووباره دڵ دەیهەوێ ئەوە بزانێ کە ئەو حاڵەتە گەش و خۆشەی موسوڵمانان و ئەو حاڵەتە ترش و تاڵەی کافران دە چ کات و سات و حاڵەتدا دێتە ڕوو بۆ ئینسان؟ نەزەری زانایان زۆرە لەو بارەوە، هەر وەک دەستەکوتە دەچێ چونکە ئەگەر لە ئایەت و حەدیس وەلا کەوت کار سەر بەرەو دەستەکوتەی کوێرانە دەڕوا، ئێستاش لەو بارەوە ئەو نەزەرانە دراون:

١. گۆیا کاتێ لە قەبر هاتنە دەر ئەو حاڵەتە

٢. هەندێکیش دەڵێن: کاتی نامە وەرگرتنەوە لەمەڕ ئەعمال

٣. هەندێکیش کوتوویانە ڕوودانی ئەو حاڵەتە کاتی وەزنی ئەعمال و حیسابە

٤. هەندێکیش کوتوویانە ئەو کاتەیە ڕوودانی ئەو حاڵەتە کە دەکوترێ بە ئینسان هەر کەس وە شوێن مەعبوودی خۆی کەوێ واتە ئەوەی لە دنیادا پەرەستوویەتی.



دیارە بە پێی وەزن و هەڵسەنگاندنی ئایەتەکانی پێشوو ئەوەمان هەست پێ کرد و پێ گەیی کە ئەوانەی کە بە هۆی بێئیتاعەیی لە خودایان بە ڕووڕەشی هاتنە ڕوو، فرشتەکان کات و دەستوور پێدراو لێیان پرسیار دەکەن: ئایا مەگەر ئێوە بوون پاش ئیمان و باوەڕیتان بەرەو کوفر و بێئیمانی گەڕانەوە؟ دەیجا بە حەق حەق و مافی خۆتانە کە سزای ئەو بادانەوەتان بچێژن! کە تاوان لە مل بۆخۆتانن کەس پەتی تاوانی نەهاویشتۆتە ئەستۆو. جا ئەدێرەدایە چاوەڕوانی دڵ لە پاداشی ئەو کەسانەی کە وا بە بەردەوامی لە سەر ئیمان و باوەڕی خۆیان ماونەوە، جا بۆوەی بزانین و حاڵی بین لەو بارەوە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ١٠٧ی ئالی عیمران تاکوو بە باشی تێبگەین لە پاداشی ڕووگەشان:

**وَأَمَّا الَّذِينَ ابْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِي رَحْمَةِ اللَّهِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿١٠٧﴾**

**بەڵام ئەوانەی ڕوخساریان سپی بووە، لە ناو ڕەحم و میهرەبانی خودادان، هەتا هەتا لەوێدا دەمێننەوە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٠٧**

ئەوانە کە بە هۆی ئیمان و باوەڕی ڕاستەقینەیان لە ئیتاعە و فەرمانی خودادا بوون و لایاننەدا و غافڵ نەبوون لە ئیتاعەی خودا، ڕوخسار و دەم و چاویان لە سپیاییدا هەر شۆق دەدەن و گرشەیان دێ، لە ناو ڕەحم و بەزە و خۆشەویستی خودادا دەمێننەوە هەتا هەتایە، ئەمین و ئەمان و خاترجەم لە دوایی پێ هاتنی ئەو نیعمەت و ڕەحمەتە، بۆ هەمیشە دە ژیانێکی پڕ لە خۆشی و حەسانەوەییدان، دوور لە پیری و نەخۆشی و خەفەت.

دڵ بە پێی وەزن و هەڵسەنگاندنی ئەو ئایەتە پیرۆزەی ١٠٧ی ئالی عیمران چەند هەستێک دەکا و دەڵێ دەبێ مەبەست لەو "رحمت الله"دا چ بێ؟

ئەمەش بۆ وڵامەکەی دەچینە خزمەت عەبدوڵڵا کوڕی عەباس کە زانایە لە قورئاندا، بۆوەی بزانین لەو بارەوە دەڵێ چی و نەزەری چۆنە؟ ئەویش دەفەرموێ: ڕەحمەتی خودا زۆرە و بۆ هەموو ڕاستان هەر هەیە؛ ئەمما دێرەدا مەبەست لە "رحمة اللە" بەهەشتی بەرینە کە جێی لێحەسانەوەیە. ئەو هەستەش بە دڵدا دێ لێرەدا، واتە لەو "رحمة اللە"یەی کە بە بەهەشت تەعبیر کراوە کە بەندەی خودا هەرچەند ئیتاعە بکا بە زیادەوە، ناتوانێ بە ئیتمینانەوە بڵێ دەچمە بەهەشت هەتا ڕەحمەتی خودا دە هاواریەوە نەیە، واتە بە مەرجێ خودا هیدایەتی نەدا بۆ تاعەت

کردن، ناتوانیٚ ڕێگای ڕەحمەت وەدۆزیٚ؛ بەڵام ئەگەر ڕەحمەت دە هاواری کەویٚ و هاوکـار و هاویاری بیٚ، وا دەکا بەندەی خودا بە وەسیلەی ئیتاعە و عیبادەتی پاک و خاوێن خۆ بگەیێنێـتە پلەی شایانی ڕەحمەتی خودا.

و هەروا دڵ دێتە سەر ئەو پرسیارەش: ئایـا مـانەوەی ئەو عەبـدە چـاک و پـاکە دە نـاو ئەو ڕەحمەتەدا تا کەی دەمێنێتەوە بە خاترجەمی؟ دە دیارە وڵامی ئەو پرسیارە کاری ئەقڵ و هەسـت و شعوور نییە تا بتواندریٚ وەیقۆزیٚ بەڵکە دە عیلمی خودادایە؛ تا خوداش حەز نەکا بە زانینـی، نازاندریٚ، جا ئەوەیە کە خـودای تەعـالا هەچـی نیـازی ئینسـانی بـیٚ، بەیـانی فەرمـووە بـۆیە فەرمـوویەتی: (هـم فیهـا خالـدون)، ئەوانە بـۆ هەمیشـە دە نـاو ئەو ڕەحـمەتەدا کە بەهەشـتە دەمێننەوە.

دووبارە دڵی بزۆز و نەسرەوتوو ئەو پرسیارەی بۆ دێتە پێش: ئایا وەک خاوەن باوەڕ و ئیمان بۆ هەمیشە دە ناو بەهەشتدا دەمێننەوە، بیٚباوەڕەکانیش بۆ هەمیشە دە ناو دۆزەخـدا دەمێنـنەوە؟ ئەگەرچی خودای تەعالا بە دایم مـانەوەی کـافران دە دۆزەخـدا دە نـاو ئەو ئـایەتەدا وەک ئـی موسوڵمانانی ناو نەبردووە، ڕازی ناو بردنی موسوڵمانان بـۆ بەهەشـتی ئەبەدی و نـاو نەبردنـی کافران بۆ دۆزەخی ئەبەدی دێرەدا دەبیٚ چ بیٚ؟

وڵام بـۆ ئەو پرسـیارە دەبـیٚ ئەوە بـیٚ بە پێـی بۆچـوونی زانایـانی قورئـان: ئەو نـاودێرەی موسوڵمانان و ناودێر نەکردنی کافران، ئەو بۆ بەهەشت و ئەو بـۆ دۆزەخ دەو ئایەتـانەی ١٠٦ و ١٠٧دا ئاماژەیە وەلای ئەوەی کە لان و بەشـە ڕەحمەتـی خـودا بـۆ ئەهلـی ئـیمان بەربڵاوتـر و لەپێشترە دەبیٚ ناوی شوێنی دانەوەی پاداشیان ناو ببریٚ، بەڵام کاتیٚ خـودا نـاوی عەزابـی بـرد پاڵیشی پێوە دەا بە کرداری خاوەن عەزاب وەک دەفەرمویٚ: (فذوقوا العـذاب)، دە حاڵێکـدا کە خودا باسی ڕەحمەتی هێنایە گۆڕ پاڵی پیٚ بە نەفسی خۆی دەدا وەک فەرمووی دە ئایەتی ١٠٧دا (ففي رحمة الله) بەڵام کاتیٚ یادی عەزاب دەکا خودا فەرمـووی: (فَـذُوقُواْ الْعَـذَابَ بِمَـا كُنْـتُمْ تَكْفُرُونَ). بە کورتی و بە کوردی: عەزاب ڕووی پیٚ دە ئاکاری بەنـدەیە، ڕەحـمەت ڕووی دە زاتی خودایە، هەر ئەوەشە عارفـان دە پاڕانەوەیانـدا دەڵـێن: ئەی میهرەبـانترین میهرەبـان، ئـێمە هەڵماوێرە لە ڕێزی ڕەحمەت پێکراوانت، و لە ئیحسان و کەرەمی خۆت بیٚبەشمان مەکە.

**پاشەدۆ:**

لە زۆربەی شوێن دە قورئاندا بـۆ ئەهلـی بەهەشـت ئەبەدیـیەت نـاو بـراوە و لە هەنـدێک

شوێنیشدا ئەبەدییەتی بەهەشتی موسوڵمانان و ئەبەدییەتی کافران بۆ دۆزەخ ناودێر کراوە. ئەمما بۆ کافران وشەی هەمیشە (خلود) بۆ دۆزەخ دە دوو یا سێ ئایەتاندا نەبێ چاو نەکراوە، ئەو سێ ئایەتانەی کە بۆ کافران ناوی ئەبەدییەتیان دە ناو دۆزەخدا براون، بریتین لەو ئایەتانە:

١. سوورەی نیساء:

**إِلاَّ طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ﴿١٦٩﴾**

**جگە لە ڕێگای دۆزەخ کە هەتا هەتایە تێیدا دەبن.**

٢. سوورەی ئەحزاب:

**خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٦٥﴾**

**هەتا هەتایە تێیدا دەبن هیچ سەرپەرشت و یارمەتیدەرێکیشیان دەس ناکەوێ.**

٣. سوورەی جن:

**وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ﴿٢٣﴾**

**هەر کەسیش سەرپێچی لە فەرمانەکانی خودا و پێغەمبەرەکەی بکات، بەبێ گومان ئاگری دۆزەخ هی ئەوە هەتا هەتایە تێیدا دەبن.**

دیارە بە پێی ئیشاراتی فەرموودەی پێغەمبەریش ڕەحمەت لە پێش غەزەبەوە هاتووە ئەوەش بۆخۆی ئەوەمان پێ دەڵێ کە خودای تەعالا تا بکرێ غەزەب نانوێنێ چونکە غەزەب بەری قەهر و قینە و تۆڵەیە، خوداش لەوانە بۆ بەندەی بێهێز و لاواز و نەفام بەدوورە، بۆیەی فەرمووە: (وَ یَغْفِرُ ما دونَ ذٰلِکَ) حەدیسی پێغەمبەرﷺ: إنَّ رَحمَتي سَبَقَتْ غَضَبي.

ئەوەی لە بابەت یەکەتی و ئەمر بە چاکە و بەرگری لە خراپە لە لایەن خوداوە بە ئینسان ڕاگەیێندرێ، بەڵگە و نیشانەی تەواون لە سەر میهرەبانی خودا دەگەڵ بەندەکانی خۆی، کەس لە سەر ئەو لوتف و کەرەمەی خودا دەگەڵ عەبدی خۆی عەبد هەڵدەستێ سەربەخۆ، بێ بەڵگە و دەلیل خۆ لاسار دەکا بەرەو ڕووڕەشی خۆ دەباتە پێش و خۆ دەڕازێنێتەوە، گوێلەمستی بێباوەڕان دەبێ، دەگەڵ ئەوەی خودای تەعالا هیچ کات خوازیاری زوڵم نییە لە عەبدی خۆی و نایهەوێ زوڵم بەرۆکی ئینسان بگرێ، ئەوە بۆخۆیەتی بەندە خۆ لاسار دەکا بە هۆی بێباوەڕی بە کاروباری خودای مەزن. بۆ تەئیدی ئەو مەبەست و مەتڵەبە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٠٨ی ئالی عیمران:

**تِلْكَ آيَاتُ اللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ وَمَا اللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَالَمِينَ ﴿١٠٨﴾** ئالی عیمران
**ئەوانەی (کوتران) ئایات و نیشانەکانی خودان، بە ڕێک‌وپێکی و بە ڕاستی بە سەرتا دەیخوێنێتەوە، خوداش ویستی لە سەر ستەم‌کردن لە جیهانیان نییە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٠٨**

دیارە ئەی ئینسان ئەی پاکترین و چاکترین و ئەمین و بەپەرۆشترین ئینسان بۆ ئینسان ئەوان ئایەتانەی لە لایەنی خودا بە سەرتاندا خوێندرانەوە بۆوەی بوو ئینسان ئاگادارانە پەیڕەوی لە خودا بکا و شوێن ئەمر و فەرمانی خودا کەوێ، چونکە خودا نایهەوێ داوا لە ئینسانی نەزان و بێ‌ئاگا بکا کە وەشوێن ئەمر و دەستووری کەوێ؛ بەڵکە داوا و تەکلیفات لە ئەقڵ و زانستە، جا بۆیە خودای خاوەن عەدڵ و حیکمەت لە پێش هاویشتنە تەکلیف بۆ سەر ئینسانی بە ئەقڵ و هەست و شعوور و زانایەتی ئامادەی دەکا، جا پاشان بە پێی ئەو ئەقڵ و زانستە داوای خۆناسین و خوداناسینی لێ دەکا.

کابرایەکی نەحوزان دێ لەولاڕا پرسیار دەکا و دەڵێ: وشەی «تلک» بۆ دوورە «هذە» بۆ نزیکە؛ خۆ دیارە ئەو نیشانانەی خوێندراوە بە سەر ئینسانندا لە لایەن خوداوە زۆر نزیکن، بۆچی بە وشەی «تلک» ئاماژەیان وەلاکرا؟ بۆ بە وشەی «هذە» کە بۆ نزیکە ئاماژەیان وەلا نەکرا؟

بۆ وڵامی کابرای پرسیارکەر دەبێ بکوترێ: مەبەست بە «تلک» «هذە»یە واتە ئەو ئایەتانەی کە یادمان کردن، کە ئایاتی خودان؛ بەو پێیە دەکرێ «تلک» لە جێگای «هذە» دانیشێ چونکە ئەو ئایەتانەی باسمان کردن لە سەر بێ‌باوەڕان دایانە پاش گوێیان، هەر وەک دوور کەونەوە وایان لێ بە سەر هات، کەوایە دورن لە قبووڵ کردن، دەبێ «تلک»یان بۆ بکوترێ. جگە لەوەش خودای تەعالا وەعدەی داوە کتێبێک کە قورئانە ڕەوانەی کاتە سەر ئینسان، کە هەچی ئایەتەکانی وعدە دراون، کە بە حەق بۆ سەر ئێوە دابەزیون لە سەر ئەو ئەساسە دەکرێ بە وشەی «تلک» ئاماژەیان وەلا بکرێ هەر وەک لەو بارەوە دە سوورەی بەقەرەدا هاتووە و هەیە «ذلک الکتاب».

دە جوملەی (نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ)دا دڵ ڕادەمێنێ وەپاڵدانی ئەو «نتلوها»یە بۆ وەپاڵ خودایە؟ خۆ خودا ئەو ئایەتانەی بە سەر پێغەمبەردا نەخوێندۆتەوە، بەڵکە حەزرەتی جبرەئیل ئایەتەکانی قورئانی بە سەر پێغەمبەردا دەخوێندنەوە!

وڵام: وەپاڵدانی تلاوەت وەلای خودا، مەجازە؛ ئەمما نازڵ‌بونی قورئان وەلای خودا حەقە و وەلای جبرەئیل مەجازە.

کابرایەک دێ پرسیار دەکا و دەڵێ: دیارە وەک هەمووی ئێمە موسوڵمان دەبێ باوەڕمان وا بێ کە خودای تەعالا لە هیچ بارێکەوە زوڵم ئیرادە ناکا و نایەوێ کەس ستەم بکا، بەڵام ئەو پرسیارکەرە دەڵێ: ئەمن لەو عالەمەدا زوڵم چاو دەکەم، جا ئەگەر بێتو ئەو زوڵمە لە سەر ئیرادەی خودا نەبێ، دەبێ بە دژی ئیرادە و ویستی خودا بێ، جا لەوەڕا لازم دێ خودا کە وەجواب نایە ڕازی بێ بەو زوڵمە، وەیا ناتەوانە بۆ بەرەنگار بوونی؛ هەر دووش لە خودای بەدوورن.

دەبێ لە بۆ ڕامالْدانی ئەو تەم و خەیالْە بلێین: دابەزینی ئایەتی ١٠٩ی ئالی عیمران ڕامالْدەری ئەو خەیالْ و تەمەیە، یانی خودا بەتوانایە بەرگری زالْمان بکا یان وەیانگێڕێ لە زوڵم و زۆری، ئەمما کاتی خۆی وەعدەی داوە کە ئینسان ئیختیاری دەدەمێ بۆ هەر بارێک و لایەک (إمّا شاكرا و إمّا كفورا)، تاکوو دەرکەوێ چاک و پاکی، یا ناپاک و ناتەواوی، چونکە ئەگەر هاتبا و خودا تاوانباری دەستەولەجێ دەمکوت بکردایە و کافری داپاچیبا، موسوڵمانی خەڵات کردبا، بازاڕی ئازادی و سەربەخۆیی نەدەما و نەدەبا، ئەوەش جگە لە شایانی دنیای تەکلیف و عەمەل نییە؛ حیسابی ڕۆژی قیامەتیش بێجێ دەبوو، کەوایە دەبێ باوەڕمان وابێ و بشلێین: عەدالْەتی خودا لەوەدا بە ڕوونی چاو دەکرێ کە مەیدان دراوە بە خاوەن تەکلیف چۆن دەڕوا بڕوا، بە ئیختیاری خۆی، کەس بەرگری ناکا ئیللا ئیمان و ویژدان و کەڕامەتی نەبێ، ئەویش بە خۆن و هەڵاوەسراون بە حەڵقەی ئیمان و باوەڕی.

❊❊❊

ئەوجار کاتی ئەوەی هات بچینە خزمەت ئایەتی ١٠٩ی ئالی عیمران تاکوو بە باشی لە توانایی خودا بگەین:

**وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الأُمُورُ ﴿١٠٩﴾** ئالی عیمران

**ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویشدایە، مڵک و پاوانی خودایە؛ هەموو کاروبارێکیش هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٠٩

خودا ئەگەر حەز کا و ئیرادە کا، دەستەڵاتی ئەوەی هەیە ڕێ نەدا بەندەکانی بەرەو یاغیگەری و تەجاوەز و زوڵم و زۆری دەس درێژ کەن، چونکە خودا بەتوانایە بە سەر هەچی هەیە، بەو دەلیلە ئەوە لە ئاسمان و زەوییەکاندایە مڵکی خودان و لەوڕا هاتوونە بوونەوە و بۆ

لای ئەویش دەگەڕێنەوە. کەوایە دەبێ بکوترێ: ئاسمان و زەوی مڵکـی خـودان و دەسـتەڵاتی خودا بە سەریاندا ڕەوانە و ڕەوایە.

بە کورتی و بە کوردی، بە سـێ دەلیـل دەتـوانین بڵێـین خـودا لە زوڵـم و زۆری بەدوور و بەرییە:

١. زوڵم واتە دەستتێوەردان و تەجاوەز بە مڵک و ماڵ و مافی غەیر، جا خـۆ هەرچـی لە ئەرز و ئاسماناندایە مڵک و ماڵی خودایە، هەچی تێدا بەڕێوەبەرێ خودا ئی خۆیەتی و ڕەوایە.

٢. ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە و حاشای لێ ناکرێ: لە موحتاجیانڕا دەسدرێژی بە زۆر بـۆ مڵک و ماڵ و ئێر و ئەوێ دەکرێ؛ جا خۆ خودا بێنیازە و دەوڵەمەندی سەربەخۆیە و خـاوەنی هەچی بوونە، کەوابێ چ پێویستی بەوە هەیە ئەوەی داویەتە بەندەی خۆی، لێی وەسێنێ بە زۆر، چونکە بەندە ناتوانێ پێش بە ئیرادە و ویستی خودا بگرێ.

٣. ئەوجار ئەوە شتێکی حاشا هەڵنەگرە: زوڵم و زۆری و تەجـاوەز بە سـەر یەکـێ دەکـار دەکرێ کە ئەو یەکە بتوانێ بەربەرەکـانی لە خـۆ نیشـان بـدا و خـۆ وەدەس نەدا، دەگـژ تەرەف ڕاچێ، جا خۆ ئەوە یەقینە کەس بۆی نییە بتوانێ بەربەرەکانی خودا بکا و دە گژی ڕاچێ چونکە هەچی هەیە لە هەوەڵ بە ئاخریشەوە لە ژێر ئەمر و دەستووری خودادایە بوون و نەبوونی و هەر بۆ لای خوداشە گەڕانەوەی، کەوایە چۆن دەکرێ بڵێین: خودا دەسدرێژی بـۆ مڵـک و مـاڵ و سامانی غەیر دەکا؟

جا لە سەر ئەو سێ دەلیل و بورهانانە دەبێ ئەوەمان بـاوەڕ بـێ کە خـودا زوڵـم بە ڕەوای کەس نازانێ چونکە زوڵم دە شەئنی خودادا نییە. هەر وەک لە ئایەتی ١٠٨ی ئـالی عیمرانـدا بە ئاشکرایی فەرمووی: ﴿وَمَا اللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَالَمِينَ﴾ واتە هیچ زوڵمێک بۆ خەڵـک نـاخوازێ. بەڵکە ئەوە ئینسانە زوڵمخوازە، دەبێ بۆ سزاشی حازر بێ.

لە وڵامی پرسیاری ئەو کەسەی کە دەڵێ: لە مانای ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾دا ئەوە هەست پێ دەکرێ کە کـردەی ئینسـانیش ئـی خـودایە؛ واتە مەخلـووقی خـودایە، دەبـێ بکوترێ: وەپاڵدانی ئەڵڵا بەو «هـ»یە واتە ئیـزافەی ئەڵـڵا بە نیسـبەتی مڵکـایەتییە نەک ئیـزافەی ئەفعالە، یانی ئاسمانەکان و زەوی و هەچی وا دە ناویشیاندایە مڵکی خودان، نەوەکوو کـرداری ئینسانی؛ و هەروا ئەوە شمان دێتە دەست لەو ئـایەتی ﴿وَلِلَّهِ مَـا فِي السَّـمَاوَاتِ وَمَـا فِي الأَرْضِ﴾ سەرئاغازی کائینات هەر خودایە ئاخر پێهاتنی کائیناتیش هەر وەلای خـودایە، ئەو یاسـایەش

پێمان دەڵێ: بەڕێوەبردن و نەزمدانی کائینات لەمەڕ بوون و نەبوون و هەوەڵ و ئاخر هەر بە خودایە؛ و هەروا لە وەپاڵدانی گەڕانەوەی کائینات بۆ لای خودا با ئەو خەیاڵە نەکرێ کە شوێن بۆ خودا دێتە جێ؛ بەڵکە دەبێ ئاوا بەراوەرد بکرێ کە هەموو شت دەگەڕێتە بۆ لای قەزا و حوکم و ئەمری خودا؛ ئەو بەراوەردە لە ڕوخساری جوانی ئایەتی ٣ی سووڕەی حەدیددا هەست پێ دەکرێ:

**هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ**

**هەر ئەوە ئەووەڵ، هەر ئەوە ئاخر، هەر ئەویشە دیار و نادیار، هەر ئەویشە هەموو شت دەزانێ.**



لە هەڵسەنگاندن و وەزنکردنی ئایەتانی ڕابردوو بەرتەری و بەرزی ئۆمەتی ئیسلام بە هۆی ئەمر بە چاکە و بەرگری لە خراپە بە سبووت گەیی، و هەروا لە ئایەتەکانی ڕابردوو چۆنیەتی ئەحواڵی موسوڵمانان بە هۆی ڕووگەشی و ڕووسپیەتییان سابت بوو، و هەروا ڕووگرژی و چارەڕەشی بێباوەڕان بە هۆی بێئیتاعەییان لە خودا بە سبووت گەیی.و هەروا دووبارە خودا دە ئایەتەکانی پێشوودا هەندێک ئومووراتی دەسنیشان کردن بۆ خاوەن باوەڕان کە بەڕێوەی بەرن، وەک یەکەتی و یەکدڵی و تەقوا و پارێزگاری و لە هەندێک ئومووراتیشی مەنع کردن وەک دووبەرەکی و ئاژاوەنانەوە و تەفرەقە، بەڵام دووبارە خودای تەعالا بە پێی ئەرزش و گرینگی ئومووراتەکان دووپاتیان دەکاتەوە بە ئەرک و وەزیفەیەکی واجب حەواڵە بە ئەهلی خاوەن ئیمان و باوەڕیان دەکا، بە وەسیلەی ئایەتی ١١٠ی ئالی عیمران، جا بۆوەی بە باشی لە مەتڵەبەکە تێبگەین دەچینە خزمەت ئایەتەکە:

**كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿١١٠﴾** ئالی عیمران

**ئێوە چاترین گەلێکن کە بە قازانجی مرۆڤایەتی هێنراونەتە کایەوە، فەرمان بە چاکە دەدەن و بەرگریش لە خراپە دەکەن؛ باوەڕیشتان بە خودا هەیە، ئەگەر ئەهلی کتێب ئیمان و باوەڕیان بهێنایە، بێ گومان دەبوو بە مایەی خێر و بێر بۆیان، هەندێکیان خاوەنی بڕوان، زۆربەشیان سنووربەزێن و تاوانبارن.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١١٠**

ئێوەی خاوەن ئیمان و بڕوا چاکترین میللەتن کە لە لایەن خوداوە هاتوون و سەرتان هەڵداوە بۆ خزمەت بە ئایینی ئاسمانی لە سەر شارەزایی و ڕێنوێنی خەڵک، کە فەرمان دەدەن بە چاکە و بەرگریش دەکەن لە خراپە لە سەر ئەساسی ئیمان بە خودا، جا خۆ ئەگەر خاوەن نامەکان ئیمان و باوەڕیان هێنابایە، بێگومان باشتر بوو بۆیان لەوەی کە نەیانهێنا، لەواندا بڕوادار هەن و زۆربەشیان گوێڕایەڵی خودا نەبوون و پەیمانیان شکاند.

ئێوە بڕوادارانی هەر لە یەکەم ڕۆژی هاتنە خواری ئەو قورئانە و هەتا دنیا دەبڕێتەوە باشترین و چاکترینی ئەو میللەتانەن کە نامەی خودایان بۆ هاتووە، کە ڕەوانەکراوی لای خەڵکن بۆ ئیرشاد و ئامۆژگاری کردنیان، جا ئەوەش دەبێ بزاندرێ، هەر کەسێ لە هەر میللەتێ بێ، و لە هەر هۆز و تیرەیەک بێ، و لە هەر بنەماڵە و خێزانێک بێ، لە هەر زەمانێ بڕوای بە خودا و دوارۆژ بێ لە سەر ئەساس و یاسای قورئان بڕوا ئەوە باشترین کەسە و لە باشترین ئەو میللەتەیە کە خودا ناویان دێنێ بە چاک و بە باش، ئەوەی کە ئێوەی خاوەن ئیمان و باوەڕ کە بە چاکترین میللەت ناوتان دەرکردووە و دەرچوون، بۆ ئامۆژگاری خەڵک ئی ڕاست و دروستیتانە، بەڵام ئەوانەی کە بە پێچەوانەی قورئان دەجووڵێنەوە کەچی بە ناوی باشترین میللەت دەبنە مۆتەکە و لینگان بە سەر ملی میللەتاندا دێنن، و لە ژێر پەردە و یاسا و قورئان بە قەولی خۆیان دەیانچەوسێننەوە، ئەوانە گێل و نەزان و زگپەرستەکانی دەورانن، گەل بە تەفرە دەبەن و براکوژییان دە ناودا پەرە پێ دەدەن، جا پاش ئەوەی کە گەیشتن بە ئارەزووی چەپەڵی خۆیان، هۆیێک بۆ گەل دەکەن و بەرەڵایان دەکەن بە وڵاتاندا؛ بە سەرشۆڕی و ماڵوێرانی و بێئابڕوویی؛ بەڵام ئەو گەل و هۆزە پاکانەی کە کۆ دەبەستن لە سەر یاسا و بەرنامەی قورئان و پارێزگاری لە یاسای خودا و پارازتنی مافی گەلان، بۆ هەمیشە و هەر دوو دنیا سەربەرز و ئازا و ئازاد و حەساوەن لە لای خودا و گەلانی خوداناس. ئەوانە لە هەموو ڕاستان واتە خۆشی و ناخۆشی و تەنگانە و شادی، هەژاری و نەداری و ژێردەستیدا دە هاواری گەلدان و دەمکوتکەری ملهۆڕ و زۆردارانن، ئاڵای کەرامەت و بەرزی مرۆڤ لە سەر شانیان گەشاوە و ڕازاوەیە. و ئەوانەی لە قەپۆز و لمبۆزی مافخۆران دەدەن و تێکیان دەشکێنن و دە هاواری گەلی لەمافکراو و چەوساوەی کوڕکوژراو و خوێنڕژاو و ناموسبراو دەکەون، بەڕاستی ئەوانەن ئەمر بە چاک و بەرگری لە خراپە دەکەن.

**بۆ ئاگاداری:**

هیچ گەل و کۆمەڵێک ناتوانێ حەساوە و سەقام‌گیر بێ و خاوەنی مافی ڕەوای خۆی بێ، تا ئەمر بە چاکە و بەرگری لە خراپە نەکاتە ئەرک و وەزیفەیەکی سەر شان و ملی خۆی، بەو دەلیلە خودای تەبارەک و تەعالا دە ئایەتی ٩ و ٨ و ٩ی سووڕەی ڕەحماندا هەرا و بانگەوازیەتی لە ئینسان کە ئەو ئاسمانە بەرزە ڕاوەستاوە بە نەزم و نیزام، لە نەزم و نیزام نابێ لادرێ، هەڵکێش و داکێش ڕاوەستاوە بە عەداڵەت و دادگەری، هەموو کێشەکانتان بە داگەرانە بێ؛ ئەو بانگەوازەی خودا ئەوەمان پێ دەڵێ کە حەسانەوە و حاوانەوە و عیززەت و کەڕامەت و مافی خوداپێداوتان دەپارێزرێن، بە ئەمر بە چاکە و بەرگری لە خراپە، لە ژێر یاسای دار و لەلە. سرنج با بدرێ بەو ڕازەی کە دە تەرتیبی ئایەتەکەدا چاو دەکرێ: ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە لە سەر ئیمان بە خودا پێش کەوتووە، ئەئەوە ئاماژەیە وەلای بەرز و ڕێزی ئەو ئەرکە ڕێزدارە، کە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپەیە؛ جگە لەوەش خودا خۆی ئیشارەی وەلای ئەوەی فەرمووە، ئەگەر ئەهلی کتێب ئاوڕی وەسەر ئەو ئەحکامە ڕوون و بەنرخە دابا‌وە، قازانجی گەورەیان وەدەس دێنا. جگە لەوانەش ئەگەر بە وردی ئایەتی ١١٧ی سووڕەی هوود، سەیر کەین و زەین کەین ئەوەمان دەس دەکەوێ کە چاکەخوازان و چاکەکاران و پارێزەرانی دار و لەلە و نەزم و نیزام لە قەهر و وێرانی خودا بە دوورن:

**وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَى بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾ هود**
**پەروەردگاری تۆ شارگەلێکی کاول و وێران نەکردووە بە هۆی هیچ ستەمێکەوە، لە کات و ساتێدا کە دانیشتووانی چاکەخواز و چاکەکار بووبن.**

کابرایەک دێ ئەو پرسیارە دەکا و دەڵێ: (کنتم) ماضیە واتە ڕابردوو، ئەوە دەڵێ ئەو خەیرەترەی ئەو ئۆمەتەی ڕابردوو مەڕبووت بە دەورانی پێشوویە، ئێستێ ئۆمەت ئەو خەیریەتەی نەماوە؛ دەبێ لە وڵامدا چ وڵامێک بدرێتەوە؟ بۆوەی بتوانین ئایەتەکە خراپ تەعبیر نەکەینەوە، دەبێ بکوترێ دێرەدا (کان) ئەگەرچی بە ناتەواو داندراوە واتە تەنیابە ئیسم دەس‌بەردار نابێ، بەڵکە خەبەریشی دەوێ، کەوابێ دەڵێین «کان» لە بارەی زاتی خۆیەوە بۆ ڕابردوو دەکار دەکرێ واتە بەشی دەستێ و داهاتوو نامێنێ، بەڵام دەگەڵ ئەو حاڵەتەش وا هەڵدەکەوێ بۆ ئەزەلیەت واتە بۆ هەمیشەگی دەکار دەکرێ وەک ئەو ئایەتە:

**وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾** احزاب

**خودا هەمیشە بە هەموو شت زانایە.**

لە سەر چاتری ئۆمەتی ئیسلام واتە خەیریەتی ئۆمەتی ئیسلامی نەزەری زانایانی قورئـان لە بابەت ئەوەی ئایا ئەو چاتیەتە لە هەموو دەور و زەمانانە یا هەر لە زەمـانی ڕابـردوویە و زەمـانی ئێستێیە، زۆرە؛ بۆ نموونە هەندێک ئاوای بۆ چوون:

١. كُنتُم في علمِ اللهِ تعالى في الأزلِ خير أُمَّةٍ: واتە هەر لە ئەزەلدا مۆری چاتری لە نـامەی ئێوە دراوە، کە لە ئاخرزەمانیشدان و ئۆمەتی محەمەدیشن.

٢. هەندێکیش نەزەریان ئاوایە: كُنتُم في اللَّوحِ الْمَحفوظِ موصوفين بأَنَّكُم خَيـرُ أُمَّـةٍ: واتە ئەو سیفەتە خێریەتە لە ڕۆژی بەریدا (لوح المحفوظ) بۆ ئێوە سەبت و مۆر کراوە.

٣. هەندێکیش تەعبیـری ئـایەتەکە ئـاوا لێـدەدەنەوە: كُنـتُم في الأُمَـمِ الَّـذي كـانوا قَـبلَكُم مذكورينَ بأَنَّكم خيرُ أُمَّةٍ: واتە ناوبردنتان بە «خیر امة» ئـۆمەتی مـحەمەدی هەر لە هەوەڵەوەیە. وەک خودای تەعالا فەرموویەتی: ﴿أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَـاءُ بَيْـنَهُمْ﴾ واتە لە سـەر کـافران بە توندی بە سام و هەیبەتن و خاوەنی بەزە و سەفاشن دەگەڵ یەک.

۴. بەشێکیش ئاوای بۆ چوون: كُنتُ مُنذُ آمَنـتُم خيـر أُمَّـةٍ أُخرِجَـتْ لِلنّـاسِ؛ واتە هەر لەو زەمانەیدا کە ئیمانو بە خودا و ڕەسووڵ هێناوە میداڵی باشتریو دراوەتێ.

عەللامە زەحاک فەرموویەتی: دانـی ئەو بەرتەریە بە ئەسـحابی کیـرامە کە جـاڕچی دینـی ئیسلامن، خوداش عالەمی بۆ لای وان دەعوەت کردووە (نەقل لە طبری، ج ٣٩٠/٣).

ئەمما حەزرەتی ابن‌عباس دە ڕیوایەتێکدا فەرموویەتی: ئەو ناوە پیرۆزە (خیر امـة) تـایبەتی مهاجرانن کە دەگەڵ پێغەمبەری لە مەککەوە بەرەو مەدینە هاتوون. (طبري، ٣٨٩/٣) کە لە شـەڕ و هەرای بەدر و حودەیبیەدا دە خزمەت پێغەمبەردا بوون.

هەشن کوتوویانە مەبەست لە خیر امة ئەهل و بەیتە. (تفسیر ابن ابی حاتم، ٢٢١/٢)

وەک دەڵێن: محقیقان کوتوویانە: ئەو شۆرەت و لەقەبە پیرۆزە تایبەتی ئەسحابی کیرامە کە شاهدن لە سەر وەجی و ڕاگەیێنەری مانای وەحشین بە عالەم.



کاتی ئەوەی هاتووە بچینە خزمەت ئایەتی ١١١ی ئالی عیمران تاکوو بە ڕوونی تێبگەین لە ئەهلی کتێب: ئەوانی ئێمانێ دێـنن و دەس لە ئەزیەت و ئـازاری موسـوڵمانان هەڵـدەگرن؟ یـا ئیمانێ ناهێنن و وازیش لە ئازاری موسوڵمانان نـاهێنن؟ یـا ئیمانـێ نـاهێنن بە زۆری، ئـێش و

ئازاری بە تەواویش ناخەنە سەر موسوڵمانان؟ ئەوەش ئایەتەکە و ئەوەش ماناکەی:

**لَن يَضُرُّوكُمْ إِلاَّ أَذًى وَإِن يُقَاتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ الأَدُبَارَ ثُمَّ لاَ يُنصَرُونَ ﴿١١١﴾** ئالی عیمران
**ناتوانن زیانتـان پـێ بـدەن بـێجگە لە هەنـدێ ئـازاردان، ئەگەر لەگەڵتـان بە شـەڕ بـێن پشـت هەڵدەکەن و دەشکێن، پاشان یارمەتیش نادرێن.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١١١**

دیارە بە پێی وەعدەی خودا ئەهلی کتێب ئەگەر لە ئیمان هێنـان خـۆش وەدوور بگـرن لە ئەزیەت و ئازاریش خۆ بەدوور دەگرن ئەزیەتو ناکەن، مەگەر کەمێک و ئەگەر هاتوو شەڕیشیان دەگەڵ دابەستن و بەگژودا هاتن خاترجەم بن و مەترسن ناتانوێرنێ، پشتتان تێدەکەن و هەڵدەین و ئاوڕ نادەنەوە چونکە کەس یارمەتییان نادا و بە هاواریانەوە نایەن، و ئەوانەی کە وەعدەیان پێ دابوون و هیوایان پێ بوون، وازیان لێ دەهێنن.

دڵ هەست بەوەی دەکا ئەو ئایەتی ١١١ وەک مزگێنییەکی گەورە بدا خودا بە موسـوڵمانان وایە، چونکە بە ئاشکرایی هاوار دەکا ئەو ئایەتە موخالیفـان و دژانـی ئیسـلام هەرگیـز نـاوێرنە ئیسلام و دەرۆستیان نایەن و ناتوانن زیانیان پێ بگەیێـنن مەگەر کەمێـک لە کەلـێن و کـونەوە، چونکە بێباوەڕانی ئیسـلام ناوبەتـاڵ و پـووچەکن لە کـاتی شـەڕ و هەرادا لەرزۆک و لاواز و بێئیرادەن، هەمیشە چاویان لە پاشەوەیە بۆ هەڵاتن، پیرۆزی و فەتح و زەفەر مافی خاوەن ئیمان و ئیرادەیە؛ بێباوەڕ کەس بارەقەڵایان کە پێ ناڵێ هیچ، کەسیش یاریدەیان نادا چونکە سرشـت ماف نادا بە مخالیفی حەق و ڕاسـتی؛ سرشـت لە ڕاسـت ڕاسـتی دە ڕێـدا لە ڕاسـت خـوار و خێچیدا مل نادا بە ئازایەتی، بە کـوردی، نـاحەق نـاتەواوە و بێهێـزە، حەق و ڕاسـتییە بەورە و بەهێزە. دەبێ ئەوە بە باشی بزانین و وەرگرین: کە ئەو ئایەتە ١١١ ئالی عیمران موژدەی گەلێـک پێیە وەک ئەوانە بۆ موسوڵمانان:

١. موسوڵمان لە ئازار و زیانیان ئەمین و ئەمان بن

٢. ئەگەر بە گژ موسوڵماناندا بێن تێک دەشکێن

٣. پاش تێکشکانیان کەس ناتوانێ دە هاواریان وەبێ و ڕاستیان کاتەوە.

ئەو وەعدانە لە لایەن خوداوە جێی گومان نییە.



دیتمان کە جوولەکەکانی بەنی قریظە و بنی نضیر و بنی قینقاع لە خەیبەر کەوتنە شەڕەوە و

زۆر بە عەجایبی تێک شکان و خۆیـان پـێ نەگیرسـاوە چـونکە کەسـیان نەبـوو وەیـان گرێ و ڕاستیان وەکا، کە خۆیان گرتەوە لەو هەڵـدێرەی تووشـی بـوون، ئەو پەیـمانە بـوو کە بەسـتیان دەگەڵ خودا و ڕەسووڵی خودا کە ئەویش بریتی بوو لە سەرانەدان و جـزیەدان بە ئیسـلام دەنـا تازە کەوتبوونە کەندالّی نابوودی؛ جا ئێستێ بۆ تێگەیشـتنی تەواو لەو بـارەوە دەچیـنە خـزمەت ئایەتی ١١٢ ئالی عیمران:

**ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُواْ إِلاَّ بِحَبْلٍ مِّنْ اللّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ النَّاسِ وَبَآؤُوا بِغَضَبٍ مِّنَ اللّهِ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الْمَسْكَنَةُ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُواْ يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللّهِ وَيَقْتُلُونَ الأَنبِيَاء بِغَيْرِ حَقٍّ ذَلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ ﴿١١٢﴾** ئالی عیمران

**لە هەر شوێنێکدا دەکەون مۆری پەستی و ڕیسوایی بە ناوچاوانیانـدا کـوتراوە، کاتێـک نەبـێ خۆیان بدەنە پەنای خودا و پەنای خەڵکی خودا، گەڕاشنەوە بە ڕق و تووڕەیی خـوداوە، چـادری هەژاری هەڵدرا بە سەریانەوە، ئەوەش هۆیەکەی ئەوە بـوو ئـایەت و نیشـانەکانی خودایـان بە درۆ دەزانی و وەریان‌دەگرت، پێغەمبەرەکانیان بە ناڕەوا دەکوشت، ئەوەش هەر هۆی ئەوە بـوو نافەرمانییان کردبوو، و بەردەوام سنووربەزێن و پەرژین‌شکێن بوون.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١١٢**

سەیر کە جوولەکە لە هەر شوێن و دەرە و وڵاتێـک بـن بەشـیان هەر دامـاوی و زەلیلـی و ژێرچەپـۆکییە، و سەرشـۆڕ و ترسـەناکی بە بەژن و باڵایانــدا بـڕاوە، جـا مەگەر ئـاوڕدانەوە و بگەڕێنەوە باوەشی خودا و پەیمان و ئیمان بە ڕاستی و بە دڵ بڕوا بێنن، یا پەیمانـی سـەرانەدان ببەستن و بیـدەن دەگەڵ گەلـی ئیسـلام و بچـنە ژێـر چـاوەدێری یاسـای ئیسـلام، دیـارە ڕق و تووڕەیی خودا لە سەر جوولەکە پێویست کراوە و پێیانەوە چەسپاوە.

دەبـێ ئەوە بسـەلمێندرێ هـۆی مەترسـی هەژاری و دامـاوییەکی کە وەک تەم و مـژ سەرچاوەی دڵیانی گرتـووە قەت نـاڕەوێ لە سـەریان، ئـی ناپـاکی و دڵڕەشـییانە خـول‌دان و تل‌دانیان لە ناو زەلکاوی چارەڕەشیدا ئـی حەسـوودی و ڕقەبەرایەتییـانە دەگەڵ یاسـا و ئـایینی ئیسلام تا دەوڵەمەند و ساماندارتر بن ڕەزیلتر و هەژارترن و خۆشیان هەر وا دەزانن.

کوشتنی پێغەمبەرانیان کە بە ڕەوا دەزانی هۆیەکەی ئەوەیە چونکە ڕێبەری ئـایینی خودایـان دەکرد، جا ئەوەش بۆ نیەت و باوەڕە سزای زەلیلی هەر دوو دنیایە.

ئاوڕێـک لە ڕووی وەزن و هەڵسـەنگاندنی ئەو ئـایەتە ئەوە دەسـەلمێندرێ کە دەگەڵ

یەهوودیانەتی خودای تەعالا ئەوەش ڕوون و ئاشکرا بە هیچ چارەیەکیان نییە لە ژێر ئەو بارە سەخت و گرانەی کەوتۆتە ئەستۆیان، وەک زەلیلی و نەدامەتییان بێ، جا مەگەر بە خۆدا بێنەوە و هەڵوێستێکی چارەسەر بگرن ئەویش ئەوەیە یا خۆ باوێنە باوەشی خودا و ئایینی خودا قبووڵ کەن بە ڕاستی، یا سەرانە بدەن و لە ژێر یاسای ئیسلامدا خۆ وەحاوێنن، یا خۆ بە لایەکدا هەڵاوەسن تا بتوانن ماوەیەکی کەم ئەو ژیانە نامەردانەیان بەرنە سەر، ئەوانە دیارە کەوتوونە ژێر غەزەبی خودا و مۆری ڕووڕەشییان دراوە لە ناوچاوانیان بەو هۆیە کە زۆر بە جورئەتەوە ئیهانەیان بە ئایاتی خودا کردووە و ڕێبەرانی ئایینی پاکی خودایان بێ دەلیل سزا داوە و کوشتوویانن چونکە ئەوانە ئارەزوو و هەوا و هەوەسی خۆیان بە ڕێبەر زانیوە و ناسیویانن. دیارە کەسێکیش هەوا و هەوەسی ڕێبەر بێ، دەشبێ سزاشی هەر ئاوا بێچارەیی بێ.

**پوختەکاری:**

دیارە ئەوانە ئەگەر خۆ ناوێنە پەنای خودا، واتە ئیمانێ نەهێنن، سەر و ماڵیان حەڵاڵە لە ئیسلام؛ ئەمما ئەگەر خۆیان باوێنە ژێر پەنای ئیسلام، سەر و ماڵیان دە ئامانی ئیسلامدایە، وەک خودا دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ بِحَبْلٍ مِّنْ اللَّه﴾ واتە (إِلاَّ بِعهْدٍ مِّنْ اللّهِ و عصمته و إمام من الله و من المؤمنین) یانی سەر و ماڵیان دەگیردایە مەگەر پەیمان دەگەڵ خودا و خەڵقی خودا ببەستن؛ دەو حاڵەتەدا حوکمی حەڵاڵی سەر و ماڵیان لە سەر لادەچێ، کوشتن و تالان و ئەسیریان بە دەستی یارانی ئیسلام نامێنێ، ئیسلام کە جزیەیان دەخاتە سەر هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆوەی تاکوو پەستی و ڕەزیلی لە سەریان لانەچێ.

کابرایەک دێ لەولاڕا دەڵێ: عەتفی (حبل من الناس) بۆ سەر (حبل من الله) سەر دەکێشێتە ئەوەی حەبلی خودا دەگەڵ حبل الناس جیاواز لە یەک بن. پێویستە بزاندرێ حبل الله دەگەڵ حبل الناس چ فەرقیان هەیە؟

ئەمەش دەڵێین: بە پێی بەراوەرد و نەزەری زانایانی قورئان، مەبەست بە حبل الله ئایینی ئیسلامە، و مەبەست بە حبل الناس، پەیمان بەستنی سەرانەیە؛ دیارە ئەو نەزەرەشیان بەدوور زانیوە چونکە ئەگەر نەزەرێکی ڕەوا با دەبا بکوترایە (أو بحبل من الناس) واتە لە جیاتی «و»، «أو» هێندرابا. بە هەر حاڵ، بۆچوونی ئیمامی ڕازی لەو بارەوە کە ڕەنگە ڕەواتر بێ ئەوەیە: ئەمان و پەنابردن بۆ یاسای باری بۆ ذمی دوو بەش دیاری لە خۆ دەگرێ:

١. یەکیان ئەوەیە خودا بە ڕوون و ئاشکرایی ددانی پێدا هێناوە و نصّی لە سەرە کە جزیەیە،

٢. بەشی دووهەمیان ئەوەیە: خـودا حەواڵەی بە نەزەر و ڕەئـی موسـوڵمانان داوە، جـارێ زیاد، جارێ کەم، واتە بە پێی ئیجتیهادە.

جا لە سەر ئەو بەراوەردە دەبێ بکوترێ هەوەڵ حبل الله دووهەم حبل المؤمنين، خـوداش زاناترە بە مەبەست.

دووبـارە کـابرایەک دێ سـوئال دەکـا و دەڵـێ: ئەو زەلیلـیە و پەسـتییە بە نسـیبەتی ئەو جوولەکانەی پێش زاهیربوونی ئسلام بووە، و هەروا ئەو کەسانەی کە پێغەمبەرانیان کوشتوون بە ناحەق زۆر لە پێش دەورانی حەزرەتـی محمـد المصـطفٰیدا بـووە، کەوایە دەتوانـدرێ بکـوترێ عیللەتێک کە کوشتنی بە ناحەقی پێغەمبەران بووە، مەعلوولەکەی کە بریتی لە زیللەت و پەستی جوولەکەکان بووە، دەو زەمانیدا نەبووە، بەو پێـیە دەگەڵ حاڵەتێـک ڕووبەڕوو دەبـین کە غەیـرە یاساییە، ئەویش ئەوەیە: عیللەت کە کوشتنی پێغەمبەرانە هەبووە، ئەمما مەعلوول کە زیللەت و خوارییە دە کات و زەمانیـدا نەبـووە، چـونکە جـوولەکە ئەوزەمـانی دەسـتەڵاتدار بـوون، ئەوە ئیشکالە بەرۆکمان دەگرێ؛ چۆنی لە سەر خۆ وەلا بەین؟

دەبێ بچین داوا بکەیـن لە زانایـان لەو بـارەوە کە ڕزگارمـان کەن لە چنـگ ئەو ئیشـکالە. ئەوانیش دێن ئاوا ژیرانە نەجاتمان دەدەن و دەڵـێن: ئەو جوولەکـانەی ئێسـتێ و ئەوڕۆکە پێیـان دەکوترێ متأخّرين، ئەگەرچی پێغەمبەر کوشتن لەوان ڕووی نەداوە، ئەمما بە شانازییەوە ڕازیـن و ئیفتیخار بەو کارەی جوولەکەکانی ڕابـردووی ئەو سـەردەمی دەکەن کە ئەو کـارە ناحەزەیـان کردووە، کەوابێ دەبێ بکوترێ: پێشـینەکانیان دەگەڵ پاشـینەکانیان یەک تـوخم و نەژاد و یەک ئەقیدە و باوەڕن؛ چونکە پاشینەکان شانازییانە بە کاری پێشـینەکان. (امـام فخـر رازی، هەمـان ئایەتی ١١٢ی ئالی عیمران)

یەکێک دێ ئەو پرسیارە دەکا: خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم بۆچی دوو جار (ذلـک) دووپات کردۆتەوە دە ئایەتەکەدا؛ جارێکیان ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُواْ يَكْفُرُونَ﴾ جارێکی دیکەشـیان ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا﴾؟ ڕاز و سوڕی ئەو دووپاتەیە دەبێ چ بێ؟ چـونکە ناشـکرێ بکـوترێ: ئەو تیکرارە بۆ تەئکیدە؟ لە بەر ئەوەی تەئکید دەبێ لە تەئکید کردوو بەهێزتر و قەویتر بێ. جـا خـۆ دیارە و ئاشکرایە موئەکید کە عصیانە بێهێزتر و کەمترە لە موئەکەد کە کوفرە، کەوایە بە پێی یاسا تەئکیدی کوفر بە عصیان نایاساییە و نـاڕەوایە؟ دەبـێ بـۆ وڵامـی ئەو ئیشـکالە چـارە چ بـێ و وەدۆزرێ؟

دەبێ بچینە دەرکی زانایان بۆ وڵام و چارە؟ ئەوانیش ئاوایان بەراوەرد کردووە: هۆی زەلیلی و چارەڕەشییان کوفر و کوشتنی پێغەمبەران بووە، و هەروا هۆی کوفر و کوشتنی پێغەمبەرانیان عصیان و تاوانیان بووە، چونکە ئەوانە بە هۆی نافەرمانییان لە خودا و ڕەسووڵ ڕۆچوون و غەرق بوون لە زۆنگی تاریکایی چارەڕەشی و جار دەگەڵ جار تا خۆ بلەقێنن زیاتر ڕۆ دەچن لە تاریکایی و دوور دەکەونەوە لە ڕووناکایی؛ تا دەگەنە قۆناغی نائومێدی و دڵڕەشییەکی وا کە تازە ناتوانن چارەی خۆیان چارە کەن، وەک دە ئایەتی ۱۴ مطففیندا خودا ئاماژەیەک وەلای ئەو حاڵەتە دەکا:

**كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ**
**نەخێر، وا نییە وەک خەیاڵیان کردووە، بەڵکوو ئەوەی کە دەیانکرد توێژێ ژەنگی بە سەر دڵیاندا کێشاوە.**

جا لە سەر ئەو ئەساسە دەتواندرێ بکوترێ: ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا﴾ ئاماژەیە وەلای ئەوەی ئاماژە بە عیللەتی عیللەتە. دەشکرێ ئەو بارەشی لێ ڕەچاو کەین: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُواْ يَكْفُرُونَ﴾ پێشینەکانیان مەبەست بێ، بە ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا﴾ ئەوانە مەبەست بن کە لە دەورانی حەزرەتی ڕەسووڵدا بوون، ئەودەم تیکرار نایەتە ڕو، ئەوکات دەڵێین: خودای تەعالا سزای پێشینەکانی بەیان فەرمووە و داهاتووەکانیشیان چونکە لە پێشینەکانیان ئیتاعە کردووە و شوێنیان کەوتوون شایانی سزای وانن؛ تا بە ڕوونی دەرکەوێ ئەوەی خودا بە سەری هێناون، ئی بەدفەڕی و لاساری خۆیانە، نەک ئی بێعەداڵەتی خودا. بۆ زێدە زانین ئەگەر خوازیاری هەیە بڕوانێ لە تفسیر کبیر، امام فخر رازی، هەمان ئایەت.

**پاشەدۆ**

لە هەڵسەنگاندن و وەزن و کێشی ئەو ئایەتانەی ۱۱۰ و ۱۱۱ و ۱۱۲ هەست بەو ڕاستییە دەکرێ بە ڕوونی: بەرز و بەڕێز و خێرخواز و زاناکانی ئۆمەی ئیسلام کە لە سەر ئەمر بە چاکە و بەرگری لە خراپە بە ئەمری باری کۆدەنگن، دەکرێ پێیان بکوترێ ئەهلی ئیجماع؛ خۆ ئەوەش بە ڕاست وەرگیراوە کە کۆدەنگی عالەمی ئیسلام لە سەر شت لە لایەن ئەهلی سوننەت و جەماعەت، دەلیل و بورهانە، واتە یەکێکە ئیجماع؛ کە دەبێ باوەڕی پێ بکرێ و بە بەڵگەیەکی بەهێز بۆ چاکە و خراپە بێتە حیساب و ژمار. بەو دەلیلە خودای تەعالا لەمەڕ دەستەیەک لە

ئۆمەتی حەزرەتی مووسا لە قورئانی پیرۆزدا بە ڕوونی ئیشارەی وەلای ئەوەی فەرمووە کە ئەوان لە سەر حەقن و لە حەق دەدوێن و خەڵک ڕێنومایی دەکەن بۆ حەق؛ وە لە ئایەتی ١٥٩ ئەعرافدا بەیانی فەرمووە:

**وَمِن قَوْمِ مُوسَى أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ**
**هەندێ لە هۆزەکەی مووسا گەلێکن کە خەڵکی ڕێنوێنی دەکەن بۆ ڕێبازی ڕاست، هەر بە هەق و ڕاستەقینەش داوەری دەکەن.**

ئەو ئایەتە شاهیدی چاکی دەستەیەک لە ئۆمەتی مووسایە.

دە حاڵێکدا کە دە ئایەتی ١١٠دا ئۆمەتی حەزرەتی محەمەدﷺ بە چاکترین ئۆمەت ناسێنرا لە سەر ئەو ئەساسە دەتواندرێ بکوترێ: هەر کاتێ زانایانی عالەمی ئیسلام کۆدەنگ بوون لە سەر بابەتێک؟ ئەو بابەتە حەق و ڕاستە، هەر وەک پێغەمبەریش لە بارەی ئەو مەتڵەبەوە فەرموویەتی: «لا تَجْتَمِعُ أُمَّتي على ضَلالَةٍ» واتە: ئۆمەتی من لە سەر ناحەق و گومڕایی کۆ نابنەوە. (ابن ماجه، له سنن انس بن مالک، کتاب الفتن، باب ٨، السواد الأعظم، ش ٣٩٥٠)

با ئەوەندەش پاش‌قول نەدەین پێویستە بزاندرێ: ئیجماع دەبێ چوار بەش بێ:

١. ئیجماعی سەحابە لە سەر مانای نص: بەهێزترە لە بەشەکانی دی.

٢. ئیجماعی سەحابە بە نەزەری جۆراوجۆر واتە بێ‌دەنگی هەندێ و دەنگی هەندێ.

٣. ئیجماعی دەورەی تابعین، واتە شوێن‌کەوتووانی ڕەسووڵ و یارانی ئەو.

۴. ئیجماعی تابعینی تابعین واتە شوێن‌کەوتووانی شوێن‌کەوتووانی ئەسحابی ڕەسووڵ.

پاش ڕاگەیاندن و شەرحی حاڵی ئەو ئۆمەتانەی کە شۆرەتی خەیریەتیان پێ دراوە، بەیانی حاڵی ئەوانەش کرا کە لە ڕێی ڕاست و دروست لایان داوە، بێ دەلیل و بەڵگەی ئەو لادانە؛ بەغەیرەز شوێن‌کەوتنی هەوا و ئارەزووی دنیایی؛ ئەوجار دڵ دەیهەوێ بزانێ شەئن و حاڵی ئەو کەسانەی کە خۆیان هەڵاواردووە لەو بێ‌باوەڕانە و کەوتوونە سەر خەت و ڕێگەیەکی ڕاست و خوداپەسندانە، واتە ئیسلامیان قبووڵ کردووە و دەستوورات و حوکمەکانی ئیسلامیان پارازتووە، جا دیارە بۆ وڵامی دڵ و تەسکینی حاڵی ئەوە پێویستە پەنا ببرێتە بەر حوکمی ئایەتی ١١٣ ئالی عیمران:

**لَيْسُواْ سَوَاءً مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللّهِ آنَاء اللَّيْلِ وَهُمْ**

**يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾** ئالی عیمران
**ئەوانە هەموویان وەک یەک نین، بەڵکە هەندێ لە ئەهلی کتێب هەن گرووهێکی ڕێک‌وپێک و دامەزراون، لە نیوەشەودا ئایەتەکانی کەلامی خودا دەخوێننەوە و سوژدە دەبەن.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١١٣**

کاتێ بە پێی هیدایەتی خودا عەبدوڵڵا کوڕی سەلام و لایەنگرەکانی بوون بە ئیسلام و ئیمانیان هێنا، لە لایەن سەرۆکەکانی جوولەکەکان پێیان کوترا ئەوە بۆ لاتان دا لە باوەڕی خۆتان و چوونە سەر خەتی ئیسلام؟ زۆروو زەرەر کرد و خۆتان لە ناو هۆزی خۆتان بێ‌ئابڕوو و ئیعتیبار کرد! پاشان ئەو کارەساتە ئەو ئایەتە پیرۆزە لەو بارەوە هاتە خوار و دابەزی بۆ سەر پێغەمبەر، کە خاوەن نامەکانی ئاسمانی هەموویان وەک یەک و یەکسان نین، یانی دەستەیەک لەوان وەک دیارە شەوانە نیشانەکان و ئایەتەکانی خودا دەخوێننەوە و سوژدە بۆ خودا دەبەن وەک عەبدوڵڵا کوڕی سەلام و تاقمەکەی؛ دیارە ئەوانە بۆ ئیسباتی ئیمان و باوەڕیان و پارێزگاری لە یاسای ئیسلام شەونوێژ و قورئان دەخوێنن.

دەتوانین بڵێین: قورئانی شیفا و دەرمانی دڵانی نەخۆش و نەزان بۆ خاتری پارازتنی عەداڵەت و ڕێزی ڕێزدارانی لێ هاتووە، پاش لۆمە و سەرزەنشی بەشیددەتی هۆزی یەهوود، دەستەیەک هەر لە یەهوودان بە هۆی ئیمان و باوەڕی پتەویان بە یاسا و دەستووراتی ئایینی ئیسلام، سابت و بەدەوام مانەوە، و زۆر لێهاتووانە چۆنی شایانی دین و ئایینی ئیسلام بوو بەجێیان دێنا؛ جا خودای تەعالا بۆ ناساندنی ئەو تاقمە بەڕێز و ڕێزدارە بە دنیای بەشەر، هات ئایەتی ١١٣ی ئالی عیمرانی دابەزاند تاکوو ئەو کارە جوان و پیرۆزەی ئەوانە ون نەبێ و کەس پێی نەزانێ، و ئەوەش بزاندرێ کێ خۆ نیشان دا بۆ خوداناسی و حەق‌پەرەستی با لە شەوەزەنگی کوفری یەهوودانیشدا بێ، خودا دەینوێنێ و دەیناسێنێ بە دنیا.

**سووکە ئاوڕێک: ئایەتی ١١٣ ئایا دوو ڕستەن یا یەک جوملەی تەواو و تێر و تەسەلە؟**

١. ابوعبیده کە یەکێکە لە زانایانی قورئان دەڵێ: ئەو جوملەی (لیسوا سواء) بە جوملەی (من اهل الکتاب) بەستراوە و هەڵاوەسراوە، جا لە سەر ئەو بەراوەردەی ئەبوعەبدوڵڵا مانای ئایەتەکە ئاوا تەعبیر دەکرێ: ئەو تاقمەی سەر وە ئایین و دینی خودایە و لە عیبادەت بەڕێوەبردن سابت و بەردەوامن، بەرابەر نین دەگەڵ ئەو ئەهلە کیتابانەی خوار و خێچ و ناحاڵی.

۲. زۆربەی زانایـانیش باوەڕیـان ئـاوایە لەمەڕ ئەو ئـایەتە، کە یەک جـوملە و تێـر و تەواو پێداویستی بێر و بەویێ نییە، و جوملەی پـاش ئەویـش کە (مـن اهـل الکتـاب)ە، جـوملەیەکی سەربەخۆیە و بەیان‌گەری جوملەی (لیسوا سواء)ە، ئەودەم مانای ئـایەتەکە ئـاوای لـێ بە سـەر دێ: ئەهلی کتێب هەمووی بەرابەر نین و وەک یەک ناچن دە ئیمان و باوەڕیدا و دە ئەخـلاق و ڕەفتاردا، چونکە لەواندا هەیە بەردەوام دە عیبادەتدایە بۆ خودا و بە دەسـتووری هەڵس‌وکەوتـێ دەکا، ئی واشیان هەیە چۆنی لاسار و خـراپییە وەخـۆی دەگـرن و دەیـکەن. (تفسـیر کبیـر، ج ۱۹۹/۸ باسی ئەو ئایەتە)

دیارە لە ئەساس و یاسای عیلمی سەرفدا (آنـاء اللیـل) جەمعـی (إنـاء) بە واتـای کـات و زەمانە؛ زانای اخفش فەرموویەتی: واحیدەکەی «أَنْو»ە لە سەر وەزنی «جَزْو» دە تەعلیلدا هەمزە لە واو و یێڕا هاتووە. هەندێکیش کوتوویانە مەبەست بە آناء اللیل نوێژی شێوان و خەوتنانە؛ و هەروا پێویستە بە واوی (و هم یسجدون) واوی حاڵلّیە واتە حاڵی ئەوانە وایە دایم دە سـەژدەی نوێژدانە، چونکە بە تەنیا عیبادەت نییە. هەنـدێکیش هەن نەزەریـان مەبەسـت بە سـەژدە دێـرەدا تلاوەتی قورئانە. (طبری، ۴۰۱/۳)

عطاء کە یەکێکە لە زانایانی ئایینی، فەرموویەتی مەبەست بە (امة قائمة) ئەو چل نەفەرانەن کە ئەهلی کیتابن ڕوویـان دە ئیسـلام کـردووە و سـەریان بە ئیسـلام هێنـاوە، ۳۲ نەفەر لەوان لە ئەهلی حەبەشە بوون، و ۸ نەفەریشیان لە ئەهلی مەسیحییەکانی ڕۆم بوون، کاتێ ئایینی ئیسلام هاتە ناو عالەم و زاهیر بوو دەلیل و بەڵگەی ڕاستی خۆی نواند. ئەو قۆڵە لە ئەهلی کتێب لەوەڕا ئیمانیان بە پێغەمبەر هێنا و هاتنە سەر ڕێگای ڕاست.

خاوەنی تەفسیری مظهری ئەو جەریانەی نەقڵ کردووە. (تفسیر مظهری، ج ۲/ ۱۲۳-۱۲۲)

ئەوانە بە پێی ئیسبات لە ڕاست ئیتاعەی خودا زر بەتوانا و بەدەوام بوون و لە ترسی مەرگی لەناکاو لە دەس‌دانی هەل و کات لە ڕاست خێر و خێرات دایـم دە پێش‌بڕکێـدا بـوون. (تفسـیر کبیر، ۲۰۳/۸)



ئەوجار دەچینە خزمەت ئـایەتی (و هـم یسـجدون) کە مەبەسـت دەوێـدا بە چەنـد جـۆر وەرگیراوە:

۱. جۆرێکیان ئەوەیە: مەبەسـت بە «و هـم یسـجدون» تـلاوەت بـێ، واتە ئەوان دە کـاتی

سەژدەدا قورئانیان دەخوێندەوە لە سەر ئەساسی ترس و تەقوا.

۲. هەندێکیش ئاوای بۆ چوون کە مەبەست لە «و هم یسجدون» واتە ئەوانە جارجار سەژدەیان دەبرد، جاربەجار ڕادەوەستان و دوعا و پاڕانەوەیان بەکار دەهێنا.

۳. هەندێکیش نەزەریان ئاوا داوە کە مەبەست بە «و هم یسجدون» ئەوانە نوێژیان دەکرد و شەونوێژیشیان بە بەرەوە ئەنجام دەدا؛ سەژدەی ڕکووع و سەژدەی شوکریان دەبرد.

بە کوردی، زۆر زیاد دە عیبادەتدا دەمانەوە و خەریک دەبوون.

ئەو تاقمە لە ئەهلی کتێب کە خاوەنی ڕێز و بەرزین، بە هۆی ۸ سیفەتی پیرۆز و ڕێزدارن کە ئەو پلە و پایە گەورە و بەرچاوەیان بە نەسیبی خۆ کردووە و وەدەستیان هێناوە، ئەو ۸ سیفەتانەش کە مایە و هەوێنی عیززەتن سێیان دە ئایەتی ۱۱۳ی ئالی عیمراندا چاو دەکرێن، پێنجیشیان دە ئایەتی ۱۱۴ی ئالی عیمراندا چاو دەکرێن، زەین دەیە:

سێ سیفەتی بەرزی ئایەتی ۱۱۳:

۱. أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ

۲. يَتْلُونَ آيَاتِ اللّهِ آنَاء اللَّيْلِ

۳. وَهُمْ يَسْجُدُونَ

پێنج سیفەتی پیرۆز و ڕێزداری ئەهلی کیتاب کە خودا پێی بەخشیون دە ئایەتی ۱۱۴دا:

۱. يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ

۲. وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ

۳. وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ

۴. وَيُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ

۵. وَأُولَـئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ

ئەو پێنج سیفەتی ئایەتی ۱۱۴ی ئالی عیمران و ئەو سێ سیفەتەی ئایەتی ۱۱۳ی ئالی عیمران ئەگەر بە دڵێکی داڕێژراو لە ئیمان و عەداڵەت و ئینسافەوە سەیریان کرێ، و هەروا بە چاوێکی حەقبینانە ورد بوونەوەیان لە سەر بکرێ، بە تەواوی هەموو سیفەتەکانی ئایینی ئاسمانی دەواندا چاو دەکرێن؛ و هەرکێ ئیدیعای ئیمان بە خودا و قورئان و پێغەمبەر و فرشتە و ڕۆژی ئاخیرەتی هەبێ، دەبێ بەو سیفەتانە خۆ وەڕازێنێ و خۆ بنوێنێ. دەنا ناتوانێ قەباڵەی ئیمانی بەڕاستی بستێنێ و وەخۆی خا.

ئەوجار کاتی ئەوەی هاتووە بچینە خزمەت ئایەتی ١١٤ی ئالی عیمران تاکوو بە تەواوی لەو پێنج سیفەتانەش شارەزایی وەدەس بێنین:

**يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَأُوْلَـئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ ﴿١١٤﴾** ئالی عیمران

**ئەو ئەهلی کتێبانە بڕوایان بە خودا و ڕۆژی پەسڵان هەیە و فەرمان بە چاکە دەدەن و بەرگری لە خراپە دەکەن، لە ئەنجامدانی چاکەدا لەگەڵ یەک پێشبڕکێ دەکەن، ئائەوانەن کە لە چاکەکارانن.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١١٤**

لە سەر ئەساسی فەرموودەی ئایەت عەبدوڵڵا کوڕی سەلام و داروودەستەکەی بڕوایان بە خودا و ڕۆژی ئاخرەت هەیە وەک جوولەکەکانی دیکە نین لە باوەڕدا، چونکە ئەوانەی بێباوەڕن بڕوایان پووچە تەنیا هەر بڕوایان بە مووسایە؛ کە خیلافی ئایەتی قورئان بێبڕوایی بە هەندێک لە پێغەمبەران، بڕواش بە هێندێکیان. ئەوانی خاوەن باوەڕ فەرمان دەدەن بە چاکە و بەرگری دەکەن لە خراپە، و هەروا پەلە دەکەن بۆ چاکە کردن، ئەئەوانە لە چاکەکانن؛ واتە وەک ئەمر بە چاکە دەکەن، بۆخۆشیان چاکەکە دەکەن.

ئەدێرەدا ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەنگ و ڕوو ئاکاری خۆی دەنوێنێ و نیشان دەدا، ئاوا بەو شێوەیە: کە لە هیچ مەقامێکدا تەوجوه و ئاوڕ ناداتەوە سەر نەژاد و نەتەوە و تایفە و قەبیلە، بە تەنیا و تەنیا تەکیە دەکا و پاڵ وە عەقیدە و باوەڕ و ئەعمال دەکا، هەر ئەوەشە هۆی خراپە و چاکەی کەس ناداتە پاڵ نەتەوە و گەل بە گشتی، بەڵکە خراپە و چاکەی هەر کەسێک دەخاتە ئەستۆی ئەو کەسە. هەر وەک لە ناوەرۆکی ئایەتی ٦٩ی نیساءدا ئەو هەستە دەکرێ، کە مەقامی پاکان و چاکان و ساڵحان دەباتە ڕێزی مەقامی پێغەمبەران و شەهیدان؛ ئەوە نیهایەتی ڕێزە لە خاوەن چاکان و پاکان:

**وَمَن يُطِعِ اللّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَـئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَـئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾** نساء

**ئەوانەی فەرمانبەردار و ملکەچی خودا و پێغەمبەر بن، ئائەوانە وان لەگەڵ ئەو لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە خودا ناز و نیعمەتی خۆی ڕژاندووە بە سەریاندا، لە پێغەمبەرەکان و ڕاستگۆیان**

**و شەهیدان و چاکان و چاکەکاران، ئای ئەوانە چەندە هاواڵێکی چاکن.**

ئەو ئایەتە ئەوەمان پێ دەڵێ کە چاک و پاک و پەرهیزگار لە سەر ئەساسی ئیمان و باوەڕ بە خودا و ڕۆژی ئاخرەت، ئەو چاکیە و پاکیەی وەک فرشتە دە کـاتی سـەخت و تەنگـانەدا دەبـنە شاهید و یاریدەدەر و مزگێنیدەری بۆ ڕەحمەت و ڕەزایەتی خودا و بۆ بەهەشت دەگەڵ خێڵـی پێغەمبەران و ڕاستان و شەهیدان و ساڵحان، ئای لەو خۆشییە و پلە بەرزییە و ڕێزدارییە.

**تیوتیوە:**

خاوەنی ئەو سیفەتانە لە ڕێز و ڕیزی پاک و ساڵحانێکن کە خودای تەعـالا خۆشـی لێیـان دێ وڕازییە لێیان، بە دەلیلی ئەو سەنا و باسەی خودا لێیان دەکا بە وەسـیلەی قورئـان بە دنیـای ئینسانی ڕادەگەیێنێ، جگە لە قورئانیش ئەقڵی ئاقڵان ئەو سیفەتانە بەوپەڕی باشی دەقـۆزێتەوە، بەو دەلیل و بەڵگەیە کە خودا وەسفی پێغەمبەرانی خاوەن پلە بەرزەکانی بەو سیفەتانە کـردووە، وەک اسماعیل، ادریس، ذو الكفل و ... واتە خودا پاش باسی ئەوانە حالمیان دەکا لە چاکی و پاکی و ساڵحەتی پێغەمبەران، زەین بدە ئایەتی ۸۶ی سووڕەی ئەنبیاء:

**وَأَدْخَلْنَاهُمْ فِي رَحْمَتِنَا إِنَّهُم مِّنَ الصَّالِحِينَ**

**بەر بەزە و ڕەحمەتی خۆشمان خستن، بێ گومان ئەوانە لە چاکەکاران بوون.**

و هەروا بە نەقڵ لە حەزرەتی سولەیمان خودا دەفەرموێ لە ئایەتی ۱۹ نەملدا:

**فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ**

**بە دەم بزە و پێکەنینەوە بە قسەکەی (مێروولە) کوتی: ئەی پەروەردگـارم یـارمەتیم بـدە و وام بحاملێنە و ڕابێنە تا سوپاسی ئەو ناز و نیعمەتەی تۆ بکەم کە ڕشتووتە بە سەر من و دایکم و باوکما، یارمەتیشم بدە تا ئەو کارە چاکە ئەنجام بدەن تۆ پێـی ڕازیـت، بە بەزەی خۆشـت بمـخە ڕیزی بەندە چاکەکانت.**

ئەو ئایەتە ئەوەمان پێ دەڵـێ و فێرمـان دەکـا کە بە عیبـادەت و چـاکە نەنـازین بەو جـۆرە خودامان لە بیر بچێ بەڵکە دەبێ دەگەڵ چـاکە و چاکەکـاریش هـاوار بکەیـنە خـودا و بڵێـین: بمانخە بەر بەزە و ڕەحمەتی خۆت.

دڵ دەیهەوێ بە ڕوونی و بە تەواوی حاڵ و ئەحواڵی ئەو ئەهلە کتێبانەی وا ئیمان دێنن و دووبارە با دەدەنەوە بزانێ لە بابەتی سزا و تۆڵە لەوانە خودا چۆن دەدوێ، وەک دەبینین و هەستی پێ دەکرێ. ئەوە لە لایەن خودا ئەمری پێ کراوە کە هەر کارێکی لە خێر دەیکەن دەبێ نرخ و ئەرزشی ئەو کارە بجێ بێندرێ و شوکرانە و پێزانینی لە سەر دەربڕێ، دە حاڵێکدا دەبیندرێ بە ڕوونی تاقمێک لەو ئەهلە نامانە پەشیمان بوونە، ئەوە دەسەلمێنێ کە ئیمان هێنانەکە لە ڕووی دەرک و زانست و شعوورەوە نییە، بەڵکە عادەت و چاولێکەرییە، دەنا هەر ئیمان و باوەڕییەک کە لە سەر ئەساسی بەراوەرد و هەڵسەنگاندن بێ، تازە بادانەوەی لێ وەخۆ ناگرێ، وەک ئایەتی ۱۱۵ی ئالی عیمران ئاماژە بەو مەتڵەبە دەکا و دەڵێ هەر خاوەن زانست و شعوورێک موسوڵمان بێ و ئیمان بێنێ دوو جار و حەتا یەک جاریش ناسپاسی ناکا و ئاوەژوو نابێتەوە، و تازە ڕووی لە ئیسلام وەرناگێڕێ. جا بۆ ئیسباتی ڕاستی و دروستی ئەو مەتڵەبە دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۱۵ی ئالی عیمران:

**وَمَا يَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوْهُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ ﴿۱۱۵﴾** ئالی عیمران

**هەر کارێکی چاکە بکەن لە پاداشی بێبەش ناکرێن، خوداش ئاگای لە چینی پارێزگارانە.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ۱۱۵

دیارە کاتێ عەبدوڵڵا کوڕی سەلام و وەشوێنکەوتووانی واتە دار و دەستەکەی بڕوایان هێنا، هێرشی حەسوودی ڕاماڵی دا دڵی جوولەکەکان دانیە بەر خۆ و خستنیە ناو لێزماو و زەلکاوی جەهلی هاتن دەستیان بە تانە و تەوس و پلاری عەبدوڵڵا کوڕی سەلام و تاقمەکەیان کرد و پێیان کوتن: ئێوە بۆ موسوڵمان بوون زۆرتان زەرەر کردووە دەو ئیسلامبوونەتاندا، چونکە هەم لە ناو خەڵکەکەدا بێئیعتیبار دەبن، هەم تازە کەس وەخۆو ناگرێ؛ جا خودای خاوەن عیلم و زانست بۆ خەجاڵەتکردنەوەی ئەوانە و پووچەڵکردنەوەی بیر و خەیاڵەکەیان هات بە ئایەتی ۱۱۵ی ئالی عیمران وڵامی دانەوە و دمکوتی کردن.

بە کورتی، ئەو ئایەتە وەک موژدەیەک دەچێ بۆ چاکەکاران و پەرهیزگاران، و هەروا وەک هەڕەشەیەک دەچێ بۆ خەتاکاران. واتە بێ گومان بەڵگەیە یەقینی بەرهەم و نەتیجەی هەر ئەعمالێک دەدرێ و دەگا بە خاوەن عەمەل، و خوداش هەست و خوستی چاکەکاران و خراپەکاران ئاگادارە؛ پارێزگاران با کەمیش بن دە ناو یەهوودییەکان و کەم بێنە بەرچاو، بەڵام

خودا کەسی لێ ون نابێ.

ئـایەتی ﴿وَاللّهُ عَلِـيمٌ بِـالْمُتَّقِينَ﴾ ئەوەی لـێ هەسـت دەکـرێ کە خـودا جەزای ئەعـمال دەداتەوە بێ گومان، هیچ کردەوەیەکی چاک بێ جەزا و پـاداش نـابێ لە لای خـودا، هەر وەک هیچ کردەوەیەکی خراپ و ناڕەوا بێ سزا نابێ مەگەر خودا بیبەخشێ، ئەویـش کە حـق النـاس نەبێ. واتە تەنیا مافی خودا بێ و مافی کەسی دی تێدا نەبێ.

وشەی (الله) یانی خودا لە پاداش دانەوە و سـزا دان عـاجز و ناتوانـا نـیـە و بێنیازیشـە و بەخیلیش نییە، وشەی (علیم) ئەوەمان پێ دەڵێ خـودا زانـایە و بینـایە بە هەچـی هەیە و دێ و دەبێ و دەڕوا ئاگایە؛ جوملەی (عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ) ئەوە بۆخۆی موژدەیە بە خۆپارێزان، هەڕەشەشە لە خۆنەبوێران و نەپارێزان. وشەی (خیر) بریتییە لە چی؟ زانایان دەڵـێن لە موسـوڵمان بـوون و ئیتاعە لە پێغەمبەر ئەنجامدان و بەڕێوەبردنی دەسـتووراتی ئیسـلامی؛ هەنـدێکیش دەڵـێن ئەدەو ئایەتەدا (خیر) بریتییە لە هەر ئەو خێرەی بۆ خـۆت بەڕێـوەی دەبەی و بەجێـی دێنـی، بە ڕەوای غەیریش بزانی و حەولی بۆ بدەی، و دە کاروباری ناڕەوا دەخاڵەت نەکەی و خۆ تێوەرنەدەی، و هەروا مەبەست لە (فَلَن يُكفَرُوْهُ) واتە ناشکوری نەکرێ لەو خێرات و عیبادەتە بە تەرککردنیان، واتە دەبێ بەردەوامی لە سەرئەو خێراتە بپارێزرێ.

پێویسـتە ئەوە بـزانین کە خـودای بـانی سـەر دە ئایەتەکـانی ڕابـردوودا جارجـار ئەوزاع و ئەحواڵی بەد و خراپی عەزاباوی کافرانی نیشان داوە و بەیانی کردووە، و هەروا حاڵ و ئەحواڵی خۆش و باشی موسوڵمانی نیشان داوە و بەیانی کردووە، تـاکوو کـۆوە بـن چـاک و خـراپ بە عیللەت و مەعلوولیانەوە لە کن یەک، بۆ وەی هەر کەس چاکەی چاو کرد بە سەبەبەوە هەر لەو شوێنەش خراپە چـاو کـا بە سـەبەبیەوە. وەیـا هەر کەس مـوژدەی خۆشـی دی بە عیللەتـیەوە، موژدەی ناخۆشیش چاو کا هەر لەو شوێنە بە عیللەتیەوە. و هەروا خودای تەعالا کە لەوە پێش سیفەتی کافرانی ئەهلی کتێبی باس کرد کە ئیمانیان هێنا و باش بوون و خوداش وەسفی باشـی کردن و بە جوانی بە دنیای ئینسانی ناساندن، جا هەر بە دوای بەیانی حاڵی ئەو کافرانی دواڕۆژ باشی عاقیبەت بەخێر، دێ باسی ئەو کافرانە دەکا کە هەر دوو دنیایـان دەرد و داخ و حەسرەتە، بە وەسیلەی ئایەتی ١١٦ی ئالی عیمران.

**إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلاَ أَوْلاَدُهُم مِّنَ اللّهِ شَيْئًا وَأُولَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿١١٦﴾** ئالی عیمران

**بێ گومـان ئەوانەی بێبـڕوان، مـاڵ و سـامان و منـداڵیان یەک تـۆز لە خـودا نایانپارێزێـت و (نەجاتیان نادا)، و بێنیازیان ناکات، ئەوانە هاوڕێی ئاگرن و لە ناویدا هەتا هەتایە دەمێننەوە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١١٦**

بە تەئکید لە لایەن خودای بێهاوتاوە ئەوانەی بێباوەڕن، ماڵ و سامان و منـداڵ نـاتوانن دە هاواریان وەبێن و بیانپارێزن و دەگەڵ ئاگری دۆزەخ هەتا هەتایە دەبنە هاواڵ.

گۆیا ابن‌عباس فەرمـوویەتی ئەو ئـایەتی ١١٦ لەمەڕ هـۆزی بنـی قـریظە و بنـی نضـیرەوە دابەزیوە و هاتۆتە خوار چونکە ئەوانە لە جوولەکە ماڵپەرستەکانن.

دەتوانـدرێ بکـوترێ: هەر وەک مزگێنـی درا بە چاکەکـارانی خـاوەن ئـیمان و بـاوەڕ، بە بەهەشت بە وەسیلەی ئایەتی ١١٥ی ئالی عیمران، ئاواش بە وەسیلەی ئایەتی ١١٦ هەڕەشە کـرا لە بێباوەڕانی خۆفرۆش بە ماڵ و سەروەت و سـامانی دنیـا، چـونکە ڕۆژی ئـاخرەت هەمـوو حیسابێک بە پێی کردەوە و ئەعمالە خاڵی لە هۆز و قەبیلە و نەسەب، خۆ دیارە کافرانی بێباوەڕ ڕووت و ڕەجاڵن لە ئەعمال و کرداری چاک و پاک و ئیماناوی. بەڵام خـاوەن ئـیمان و بـاوەڕ هەر بـاوەڕەکەی تێشـوویەکی وایە لە مـانەوەی دە ئـاگردا وەدووری دەخـا، پاشـان ئاکـار و ئەعمالەکانیشی بە چاک و خراپەوە پێک هەڵدەکێشرێن.

**ئاوڕدانەوەیەک:**

لە سـەر ئەساسـی هەڵسـەنگاندن و بەراوردێکـی وردی ئەو ئـایەتی ١١٦ و بەشـێک لە ئایەتەکانی پێشوو بەو هەست و دەرکە گەیشتم کە مەبەستی خودا بە کافرانی ناو ئایەتەکە هۆزی بنی قریظە و بنی نضیر بن لە جوولەکەکانی پیس و ماڵپەرست و دنیاپەرسـت، یـا ئەبـوجەهلی کینە لە دڵ و ئەبوسوفیانی ئاژاوەگێڕی مەبەست بن. دیارە ابن‌عباسـیش نەزەری لەو بـارەوە هەر وا داوە، بەو دەلیلە: دمەقاڵێ و هەرای سەرانی یەهوود هەر لە سەر مـاڵ و دارایـی بە زۆری، و جـگە لەوانەش ئـایەتی ٤٤ی سـوڕەتی مائیـدە هەمـان ئەو هەسـتەی لـێ دەکـرێ کە ل ەسـەر خۆشەویستی مـاڵی دنیـا مانـای بە حەق و ڕاسـتی قورئـان ئـاوەژوو مانـای لـێ دەدرێـتەوە و دەگۆڕدرێ و حوکمی پێ ناکرێ. سەیر کە ئایەتەکە و وردیش هەڵیسەنگێنە و وەزنی کە:

**وَلاَ تَشْتَرُواْ بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلاً وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ**

**ئـایەت و نیشانەکانیشـم بە نرخێکـی کەم مەفرۆشـن، هەر کەسـێکیش بەوەی کە خـودا**

**ناردوویەتە خوارەوە حوکم نەکات ئەوانە بێباوەڕ و کافرن.**

ئەو ئایەتە جگە لەوەی تاوانی سەرانی بێباوەڕ وەدەر دەخا کە حوکمی وەحیان بە خـاتری خۆشەویستی ماڵ و سەروەت و سامان گۆڕیوە، ئەوەشـمان پـێ دەڵـێ: ئەگەر باوەڕیتـان بەوە هەیە دادگای خودا هەیە، لەو بترسن دەنا لە هیچ دادگایەک مەترسن، چـونکە هەچـی دادگـایە بێجگە لە دادگای خودا بە وەسیلەی پووڵ و بەرتیل و ڕیشوە و شافع چارەی دێ؛ بەڵام دادگای خودا بە بەرتیل و شافع چاری نایە، جوز بە عەمەل نەبێ، ئەویش عەمەلی چاک و پاک.

بە پێی نەزەری هەندێک لە زانایان ئەو ئایەتی ١١٦ی ئالی عیمران لە بـابەت موشریکـانەوە دابەزیوە، بە نیشـانەی ئەوەی ئەبوجەهـل بە زۆری لە نـاو خەڵکـدا بە مـاڵ و دارایـی فەخـر و شانازی دەکرد و دەخوڕی، خۆی پێ هەڵدەدا و خەڵکی هەژار و دەستکورتی بە کەم دەگـرت و بە چاوی سووکی لێ دەڕوانین، هەر وەک ئەو بابەت و جەریانە لە ناو دەروونی ئـایەتی ٧٤ی سوورەی مەریەمدا دەدۆزرێتەوە و هەستیشی پێ دەکرێ.

**وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَاثًا وَرِئْيًا**

**ئای چەندە بەرە و چینیشمان لە پێش ئەواندا لە ناو بـرد، کە لە کەلوپەلـی ناومـاڵ و ڕواڵەت و دیمەندا لەوان جوانتر بوون.**

ئایەتی ١٧ و ١٨ی سوورەی عەلەقیش هەر ئەو زەمزەمەیەتی:

**فَلْيَدْعُ نَادِيَه ﴿١٧﴾ سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾**

**ئینجا با بانگی هاوڕێکانی لە ناو یانەکەی خۆی بکا، جا ئـێمەش کاربەدەسـتانی دۆزەخ بانـگ دەکەین.**

ئەو دوو ئایەتـانەی سـوورەی عەلەق ئەوەمـان تێـدەگەیێنن و پـێمان دەڵـێن کە ئەوانەی بە دارایی و دەستەڵاتی دنیا هەڕەشە لە کۆمەڵ دەکەن بەرەنگار بوونەوەیانە دەگەڵ ئاگری بێئامانی دۆزەخ. ئەو جەریـان و بـابەتە ئەبوسـوفیانیش دەگـرێتەوە چـونکە ئەویـش لە هەرای بەدر و ئوحوددا بە دژی پێغەمبەر ماڵ و دارایی زۆری وەپێش موشریکان دەکرد و دە بەردەستی دەنان و شانازی و فەخریشی پێ دەنواند و نیشان دەدا.

بەڵام ئەوەی لە ناو ئەو نەزەرانەدا خۆی ڕەپێش دەکرد و خۆی بە ڕاست دەزانی ئەوەیان بوو کە وشەی (کفروا) عامە، واتە دەگەڵ گشت کافرانە، چونکە هەرچەند سـەیری دەوروبەر کەی،

حاڵەتی تەخصیص چاو ناکرێ و لەو لایەشەوە دەبینین هەرچی کافرە بە ڕوونی و ئاشکرایی بە چاوی سووک و کەم سەیری پێغەمبەر و یارانی پێغەمبەر دەکەن و لە ناو خەڵکدا ئەوەش کـاوێژ دەکەن: ئەگەر خودا محەمەدی بویستایە و بە بەرحەقی بزانیبایە، ئاوای فەقیر و بێئەنوا نەدەکرد و نەیدەڕوانیە.

کابرایەک دێ ئەو پرسیارە دەکا: خودای تەعالا دە ئـایەتەکەدا بـۆچی مـاڵ و ئەولادی نـاو بردوون بەتایبەتی؛ ناوی چی دی لەو شتانەی وابەستە بە ئینسانن و بە ئینسان هەڵاوەسراون ناو نەبردوون؟

لە وڵامی ئەو کابرایەدا دەبێ ئاوا بکوترێ: بەنرخترین و خۆشەویسترین شت بۆ ئینسان لە دنیادا ماڵ و سەروەتە، و بەهێزترین هێز بۆ ئینسان لە دنیادا ئەولادە؛ هەر ئەوەشـە هـۆی ئەوەی کە کـافر بەو دوو شـتانە (مـاڵ و ئەولاد) دەخـوڕێ و شـانازی دەکـا لە دنیـادا؛ دە حاڵێکـدا لە قیامەتدا هیچ نەفعێک نادەن بە ئینسان، بە پێی فەرموودەی ئایەتی ٨٨ و ٨٩ی شعراء:

**يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾**
**لەو ڕۆژەدا کە هیچ ماڵ و سامان و منداڵێک قازانج ناگەیێنێت، کەسێک نەبـێ کە بە دڵێکـی ساغ و سەلیمەوە بچێتە خزمەت خودا.**

پرسیارکەرێک دێ و دەڵێ: عەداڵەتی خودای تەعالا چاک بە چاک وڵام دەداتەوە، خـراپ بە خراپ، بە وپێیە ئەو فکر و هەستە دڵ دادەگرن: ئایا ئەو چاکانەی کافر دەیکەن وەک بەخشین و دە هاوارەوە چوونی داماو و لێقەوماو، بە فیڕۆ دەچن یا خودای حەکیم بە چاکیان وەردەگرێ و چاکەیان دە پێناودا دەداتەوە؟

لە وڵامی ئەو پرسیارەدا دەبێ ئاوا جواب بدرێتەوە: چونکە کافر لە ئیمان و بـاوەڕی خـۆی بێبەش کراوە، لە پاداشی چاکەکانیشی بێبەشـە ڕۆژی ئـاخر، بەو دەلـیلە مـامەڵە و سـەودا لە دنیاشدا، ئاوایە شتێک مامەڵەی دروستی لە سەر نەکرێ و وەرینەگرێ ناتوانی خاوەنیشـی بـی. قازانج یا زەرەر؛ کافر مامەڵەی بەهەشتی وەخۆ نەگرتووە تاکوو چاکەکـانی وە نیزیکـی خەن لە بەهەشت، بەڵکە ئەو چاکانەی بۆ دنیایە دنیاش سەنای کردووە. بۆ تەئیدی ئەو ڕاسـتییە دەچیـنە خزمەت ئایەتی ١١٧ی ئالی عیمران:

**مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِي هَـٰذِهِ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَثَلِ رِيحٍ فِيهَـا صِرٌّ أَصَـابَتْ حَـرْثَ قَـوْمٍ ظَلَمُـوا**

أَنفُسَهُمْ فَأَهْلَكَتْهُ وَمَا ظَلَمَهُمُ اللّهُ وَلَـكِنْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١١٧﴾ ئالی عیمران
**نموونەی ئەو شتەی کە لە ژیانی ئەو دنیادا خەرجی دەکەن وەک زۆر سارد وایە بدا لە کشتوکاڵ و مەزرای دەستەیەک کە زوڵم و ستەمیان لە خۆیان کردووە، هەمووی تێکڕا لە ناو ببات؛ خودا ستەمی لێ نەکردوون، بەڵکوو خۆیانن ستەمیان لە خۆیان کردووە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١١٧**

وێنەی ئەو کارانەی کە بێئیمان و بێباوەڕەکان دەیکەن لە دنیادا، بە تەمای خێر و سەوابی ئاخرەتی و یا هەر بە تەمای پاداشی دنیایی، ئەوە وەک ئەوە وایە: بایەکی بەتەوژمی سەخت و سارد هەڵکا و هێرش بەرێتە سەر کشتوکاڵ و مەزرای هۆزێک کە ئەو هۆزە لە ژیانی دنیایاندا ئیش و کاریان هەر زوڵم و ستەم لە خۆ کردن بووبێ بە هۆی بێباوەڕی وبێئیمانییان؛ جا ئەو بایە ئەو مەزرایەی شپرزە و پەرێشان کردبێ و بێ بەرگ و بەری کردبێ؛ جا با خاوەن مووچە و باغ و مەزرا لە خۆ دا و هەڵپەڕێ لە حەیف و داخ و حەسرەتی ئەو زیانە بێوێنەیە؛ کێ هەیە بتوانێ بڵێ: ئەو کارەساتە دڵتەزێنە و ماڵوێرانکەرە تاوانی خودایە؟! کەس نییە ئەقڵی هەبێ و وا بڵێ، بەڵکە هەموو ویژدانێکی بەهەست و ژیر دەڵێ و دەزانێ خودا ئەو ستەمەی لێ نەکردوون کە ئەوەی ئەوان کردوویانە بەخێریان لێ وەرناگیرێ، چونکە ئەوان ستەمیان لە خۆ کردووە، واتە دەبێ بڵێین هۆیەکەی تاوانی لە ملی خۆیانە، هەم ماڵوێرانی دنیا هەم بێبەشی لە ئاخرەتدا.

بە کورتی و بە کوردی: وێنەی بەخشینی بێباوەڕان بە هەژار و داماوان لە ژیانی ئەو دنیایەدا چونکە لە سەر ئەساسی ئیمان بە خودا نەبووە وەک بایەکی سارد و سڕ وایە بە تین و تەوژم دەدا لە مەزرا و کشتوکاڵی هۆزێک و لە ناوی دەبات و بێبەری دەکا، ئەو کارەساتە دڵتەزێنە هۆیەکەی تاوان لە ملی خۆیانە و بەس.

**پاشەدۆ:**

دە دەروونی ئەو ئایەتەدا هەست بە شتێکی بەرچاو دەکرێ، شتەکەش ئەوەیە: بەخشین و ئاوڕ وەسەر دانەوەی جامعە ڕیاکارانە بە وێنەیەکی زۆر گرینگ شوبهێندراوە، دەو وێنەگەریە و شوبهێنەدا دوو ئیحتیمال دێنە ڕوو کە هەردووکیان ئەقڵ و شعوور و هەست دەیانقۆزێتەوە و بە ڕەوایان دەزانێ، سەیر کە و ورد لە بەر پێیان بڕوانە:

١. ئەگەر مەبەست لە بەخشش و ئاوڕ وەسەر دانەوە بۆ لای گەل، خۆ نواندن و چاو و ڕاو

و ڕیاکاری بێ، ئەوە ئەو خۆنواندن و ڕیاکارییە، وەک بایەکی بەتەوژمی شەختاوی هەچی بەرهەم و داهاتی مەزرای گەلە، بە بای دەدا و نابوودی دەکا، ئەوە ئەو کارەساتە ماڵوێرانکەرە لە لایەن خواوە سەری نەگرتووە، بەڵکە بە هۆی ئەوەیەوە بەخشندەی ڕیاکار و چاوەڕاوچی ئەو تۆوە فاسیدەی بە دەستی خۆی و ویستی خۆی چاندووە، زەویوزاری گەلی پێ هەڵپڕووکاندووە و سووتاندوویەتی. بە کورتی، تاوان لە ئەستۆی ئینسانە و نە غەیری ئینسان.

با بچینە خزمەت ئایەتی ١١٧ی هوود بۆ ئەو مەبەستە کە کێ زاڵمە؟

**وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَى بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ**

**هەرگیز پەروەردگاری تۆ شارگەلێکی کاڵ و وێران نەکردووە بە هۆی هیچ ستەمێکەوە لە کات و ساتێکدا کە دانیشتوانی چاکەخواز بووبن.**

ئەو ئایەتە پیرۆزە بە ئاشکرایی ئەوەمان پێ دەڵێ کە زوڵم لە خوداوە سەرچاوە ناگرێ بەڵکە لە خراپەکاری ئینسانەوە سەرچاوە دەگرێ.

٢. حاڵەتی دووهەمی بەخشین بە شێوەی ڕیاکارانە و خۆنواندن و چاوەڕاو، وێنەی زەرعات و چاندنی بێوەختە، هەر وەک خاوەن مەزرا نەزانانە زەوییەکی زورک خیز و چەو یا زەل و زۆنگ تۆی پێ وەرکا لە غەیری کاتی تۆو چاندنیا، کە نە ئەو زەوییە تۆو دەڕوێنێ لە بەر زورک چەو و خیزی، یا لە بەر زەل و زۆنگی و بێ کاتی تۆو چاندنیشە، هەچی چاندوویەتی و ناژتوویەتی، بە هەدەر و فیڕۆ دەچێ. ئەو کارەساتە ڕەنج بەخەسارە لە خۆیەتی ئینسانەکە، نە لە خوداوەیە، چونکە کاری خودای لە ڕێی عیللەت و مەعلوولەوەیە، دیارە ئەو وەرزێرە ئاوڕی وەسەر ئەو عیللەت و مەعلوولەوە نەداوە.

لە وشەی (صرّ)ی ناو ئایەتەکە قورئانزانەکان چەند نەزەری جۆراوجۆریان هەیە:

١. بەشی زۆریان لە ئەهلی لۆغەت، وەک ابنعباس و قتادە و سدّی و ابن زید، ڕاو و بۆچوونی خۆیان لە سەر مانای (صرّ) ئاوا دەربڕیوە کە صرّ بە مانای سەرمای سەخت و بەتەوژمە.

٢. هەندێکیش نەزەریان لە سەر مانای صرّ ئاوا داوە کە صرّ بە مانای گەرمای خاوەن بڵێسە و بە هەڵم و سۆزە؛ وەک ابوبکر اصمّ و ابوبکر بن الانبار، و هەروا ابن الانبار نەیشاردۆتەوە و فەرموویەتی: ئاگر بۆیە بە حرّ وەسفدار کراوە چونکە دە کاتی هەڵبوون و ئایسانیدا بڵێسە و ناڵەناڵی دێ، هەر لەوەشڕایە: صریر الباب و صرصریان پێ کوتوون. جگە لەوانەش صرّ بە

مانای هاواریش هاتووە وەک لە ئایەتی ٢٩ی سوورەی زاریاتدا هەستی پێ دەکرێ:

**فَأَقْبَلَتِ امْرَأَتُهُ فِي صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ**

**ژنەکەی بە هاوار کردنەوە هات و ماڵی بە لاڕوومەتانی خۆیدا و کوتی: من پیرەژنێکم نەزۆک!**

جگە لەوەش ابن الانبار بە نەقڵ لە ابن‌عباسەوە فەرموویەتی: (فیها صرّ) واتە (فیها نار). بە هەر حاڵ بە پێی ئەو نەزەرانە صرّ چ بە مانای سارد بێ چ بە مانای گەرم و گوڕ و گڕ بێ، تەشبیه و نموونەکەی هەر دروست و ڕەوایە، چونکە هەر وەک سەرما و سۆڵی سەخت و کوشندە هەیە، گەرما و هاڵاو و هەڵمی بەسۆز و کوشندەش هەیە، بە هەر دوو مانا وێنەیان، زەوی‌وزار و زەراعەت و مەزرای خاوەن زەراعەتان لە ناو دەبرێن و دەفەوتێندرێن. جا کە وایە دەبێ بە ڕاشکاوی ئەوە بسەلمێندرێ کە ئەو تەشبیهیات نموونە لە سەر ئاکاری کافران دروست و ڕەوایە چونکە وەک سەرما و گەرمای لە ڕادە بەدەر گیاوگۆڵ و زەرعات هەڵدەپرووکێنێ و لە ناوی دەبا و بێ‌کەڵکی دەکا، کوفری کافران بەخشین و چاکەی بێ‌ئیمان و باوەڕان پاداش و سزای چاکیان لە ناو دەبا چونکە لە سەر ئەساسی دین و باوەڕ نییە کارەکە.

مانای ئایەتی ﴿ظَلَمُواْ أَنفُسَهُمْ﴾ بە پێی وەزن و هەڵسەنگاندنی دوو شتی بەرچاوی لێ هەست دەکرێ کە یەک لەو دوو شتانە دەبێ ئەوە بێ: ئەوانە بە هۆی بێ‌ئەمری خودایان و ڕوو وەرگێڕانیان لە یاسای ئاسمانی، بوون بە شایانی ئەوەی کە بکەونە بەر ڕەهێڵەی غەزەبی خودا و بکەونە ژێر باری زیللەت و ڕەزاڵەت و فەقیری بە وەسیلەی لە ناوچوونی بەرهەم و داراییەکی کە لە زەوی‌وزاریاندا هەبوو.

٢. دووهەم شت لەو شتانەی لە ناو دەروونی ئایەتەکەدا هەستی پێ دەکرێ ئەوەیە: مەبەستی خودا لە ﴿ظَلَمُواْ أَنفُسَهُمْ﴾دا ئەوەیە: ئەو کافرانە نە شتەکەیان لە جێی خۆدا ئەنجام داوە، نە تۆوەکەیان لە جێی تۆو ڕوویاندا چاندووە، و نە دە کاتی خۆشیدا چاندوویانە، جا لە سەر ئەو یاسا و ئەساسە دروست و ڕەوایە، دەبێ بکوترێ: هەچی هەیە واتە هەموو شت لە سەر ئەساسی یاسا و نەزم و نیزامە؛ هەر کارێک لە سەر ڕواڵ و ڕەوەندی خۆی بەڕێوە نەچێ، نەتیجە نادا و بەرهەمی پێویست و مەبەست نادا، بەڵکە بە فیڕۆ دەچێ؛ جگە لەو دوو شتە نابەجێیانە واتە کار نەکردن دە کاتی خۆیدا، نەچاندن لە جێی خۆیدا، ئەگەر بەڵایەکی بێ‌داد و ئامانی وەک شاڵاوی بای سەڕسەڕ و تاڵانچی هوجوومێ بکاتە مەزرا و زەوی‌وزار لە ناوی دەبا

و بێمایەی دەکا. کەوایە دەبێ بکوترێ حاڵی کافرانیش وایە، خێر و بێر و بەخشینیان لە سەر ئەساسی خۆی نییە کە ئیمان و باوەڕییە بە خودا، نەفعیان لێ دەست ناکەوێ؛ جا بۆیە خودا ئەوەی دە مستی نان: ﴿وَمَا ظَلَمَهُمُ اللُّه وَلَـٰكِنْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ واتە خۆیان تاوان لە ملن، نەک خودا.

وەک دیارە و دەزانین لە ئایەتەکانی ڕابردوو واتە ١١٢، ١١٣، ١١٤دا بە ڕوونی بەیانی حاڵی دوو دەستە لە ئەهلی کتێب کرا لە لایەن خوداوە، واتە خاوەن باوەڕ بە ئیسلام، و کافر بە ئیسلام؛ یانی دەستەیەک بوون لە ئەهلی کتێب ئایەتی خودایان ئینکار دەکرد و پێغەمبەرانیان بە ناحەق دەکوشتن، دەستەیەکیش هەر لە ئەهلی کتێب ئایەتی خودایان دەخوێندەوە و بەردەوامیش بوون لە سەر شوێنکەوتنی ئایەتی خودا و جگە لەوەی باوەڕیان بە خودا و ڕۆژی ئاخرەتیش بوو، ئەمریان بە چاکە دەکرد و بەرگریشیان لە خراپە دەکرد و پەلەشیان بۆ خێر و خێرات دەکرد.

جا پاش بەیانی حاڵی ئەو دوو تاقمە لە ئەهلی کتێب خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم دەیهەوێ بە پێی لوتف و میهرەبانییەکی کە دەگەڵ موسوڵمانان و خاوەن باوەڕانی ڕاستەقینەی هەیە، ئاگاداری و هۆشدارێک بدا بە خاوەن ئیمانەکان بۆ وەی دە داو و گیری بێئیمان و بێباوەڕان نەکەون و خۆیان لێ وەنزیک نەخەن و لە دۆستایەتی و تێکەڵاوییان خۆ بپارێزن، چونکە بێباوەڕ قسەیزاری دەگەڵ نیەتی دەروونی لێک جیاوازن؛ ئەوەی بە زاری بە زاهیر شەکراوە و دەرخواردتی دەدا، لە نهێنیدا ژەهراوە دایدەدۆشێتە ناو دەروونتەوە. بە کوردی هەنگوین و درێشەی لە دەستیدایە، لە پێشدا هەنگوینەکەت دەداتێ تا ڕێگای درێشەکە دەکاتەوە جا هەمینکی هەلی بۆ ڕەخسا درێشەکە تێ ڕادەکا. جا بۆیە خودای بەپەرۆش بۆ موسوڵمانان ئاگاداریان دەداتێ کە لە تێکەڵاوی کافران خۆ بپارێزن. بۆ ڕاستی ئەو بابەتە دەچینە خزمەت ئایەتی ١١٨ی ئالی عیمران:

**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لاَ يَأْلُونَكُمْ خَبَالاً وَدُّواْ مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاء مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الآيَاتِ إِن كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١١٨﴾** ئالی عیمران

ئەی ئەوانەی بڕوا و ئیمانتان هێناوە، جگە لە خۆتان کەسی تر مەکەن بە دۆست و جێی ڕاز و نیاز، ئەوانە سەبارەت بە ئێوە لە هیچ فێڵ و فوت و شەڕ و ئاژاوەیەک درێغی ناکەن، پێیان

**خۆشە تووشی کۆسپ و تەگەرە بن، کینە و ڕق لە گفت و لفتیاندا دیارە، ئەوەی لە ناو دڵیانـدا شاردراوەتەوە زۆر گەورەترە، هیچ گومانی تێدا نییە، هەموو بەڵگە و ئایەتێکمان بۆ ئێـوە ڕوون کردۆتەوە ئەگەر هەست و بیر و پێ بشکێت.**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١١٨

ئەی ئەوانەی بە ڕاســتی و زانســتەوە ئیمانتــان بە خــودا هێنــاوە و باوەڕیشــتان بە ڕۆژی ئــاخرەت و مــافی هەمــوو خــاوەن مافێــک هەیە، جــگە لە هــاودین و بــاوەڕ و بیرتــان نەکەنە داربەدەست و دەمڕاست و چاوسووری خۆتان، واتە پێویستە لە سەرتان بە پێویستێکی ئایینی و ئەخلاقی، یەکێکی بکەنە سەرۆک و پەناگای ڕاز و نیازتان کە هاوڕەگەز و زمان و ئایینتــان بــێ، چونکە تەجروبە کراوە و نیزام وا دارژاوە، خۆت بۆت دەسووتێ غەیرە هاودینت تۆ دەسووتێنێ بۆ خۆی و خۆت بۆ ناسووتێنێ؛ جگە لەوەی کە خۆت بۆ ناسووتێنێ، لە ئاژاوە نانەوە تێکدانی تەبایی و خۆشگوزەرانیتان قەت غافڵ نییە و هەر دەخەفتێ بۆ هەل و دەرفەت لێتــان. ســەیر کە ئەی ژیر و بەبیر سرنج بگرە و هۆش و هەست و شعوور وەگەڕ خە و دە کــار کە، هەر لە زار و چاو جووڵانەوەیڕا ڕق و کینە و داخ و حەسوودی لێ دەردەکەوێت و دەرکەوێ بــۆت، چــونکە دە حاڵێکدا کە دەیهەوێ شەکراوت بە گەروویدا کا دەستی دەلەرزێ و ژەهراوی لێ دەپــڕژێ و دەرخوارتی دەدا، چونکە ئەوە یەقینە و حاشای لێ ناکرێ: ئەوەی شاردوویەتەوە لە نــاو کــون و کاژێری توێتوێی دڵدا زۆر تیژتر و گەورەتر و بەزەبرترە لەوەی دە زاریدایە.

﴿وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ﴾ واتە ئەوەی لە سینە و دەروونیاندا شاراوەتەوە زۆر خەتەرناکتر و گەورەترە لەوەی بە دمیاندا دێ، چونکە دوژمن و نــاحەزان ئارەزوویــانە و دەیــانهەوێ ئێــوەی موسوڵمان ژێردەستەیوان بن و هیچ کات خاوەنی مافی ڕەوای خۆتان نەبــن؛ و هەروا خــاک و وڵات و نیشتمانتان لە ژێر ئەمر و فەرمانی وانــدا تــاپۆ بــێ، بەرهەم و حاســڵاتی زەویوزارتــان بچێتە دە حەمباری وان، و تەنانەت nاموس و شەرەفیشتان لە ژێر پۆستاڵی واندا بێ؛ و لە کاتی شەڕ و هەرادا ئارەزوویانە بتانکەنە دەســتەچیلە و ســووتەمەنی شــەڕ، بەڵام خۆیــان دەیــانهەوێ بەدوور بگرن و بپارێزن. واتە وەپێش خۆو دەخەن بۆ کاری خەتەر، دەیهاوێنە ئەستۆتان هەچــی قەباحەتە، و بێبەشیشو دەکەن لە خۆشی و خۆشگوزەرانی؛ قەبــاڵەی خوێڕیــایەتیو دە ئەســتۆ دەخەن، تاکوو مردن بە دیلی وەمێنن.

بەڵام لە ئیشاراتی ئایەتەکە بە ڕوونــی ئەوە چــاو دەکــرێ: داری شۆخوشــەنگی یەکەتــی و

هاودڵی و یەکتر قبووڵ کردن، بەرەکەی ئاڵای عیزەت و شـەرەفە، شـەکاوەیە لە هەمـوو وڵاتـا، ئـازادی زمـان و پێنووسـتانە، کـێ دەرسـی لەو ئـایەتە وەرنەگـرێ خەجـاڵەتی خـودا و گەل و نیشتمانە، خودایە و پێتان دەفەرموێ: ﴿قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الآيَاتِ إِن كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ﴾ واتە بەڕاستی بۆ ئێوەمان ئاشکرا کرد بەڵگە و نیشـانانێک تـاکوو چـاوی حەقبینتـان هەڵبـڕن و خۆتـان لە ژێـر چەپۆکەیی قوتـار و ڕزگـار کەن، ئەگەر ژیـر و بەبیـرن و بیـر دەکەنەوە. ئەو بیرکـردنەوەش و لە ئەستۆی زانا و ژیرانتاندایە، خۆفرۆشی قیلی کەوای سپییە، تازە ناشۆرێتەوە.

**سووکە ئاوڕێک:**

ئایەتی ١١٨ی ئالی عیمران ئاگادارییەکی پڕ لە کەرەم و لوتف و عەداڵەتی خودایە بۆ سـەر ئینسان، بەتایبەت بۆ گەل و نەتەوەکانی بندەست و دیل و ژێرچەپۆک لە مافی دوورخـراوە، کە دەبێ بۆ ڕزگارییان لەو چارەڕەشییە بەر لەوەی پاڵ ڕێک دەن بە یەکەوە، دوژمن نەکەنە گەورە و چاوسوور، واتە دەبێ خۆ بپارێزن لەوەی غەیرە، هاودین و هاوڕاز و هاوڕەگەز بکەنە پێشـەوای خۆتان، حوکمی ئەمیرایەتیتان مەدەنە دەسـت؛ چـونکە ئەوانە لە ئـاژاوە نانەوەتـان ڕاناوەسـتن، هەمیشە دەخەفتێ دژ بە نژاد و باوەڕت تووشی کەند و کۆسپت کا تـاکوو لە ژێـر دەسـتی ئەودا ڕزگاریت نەبێ؛ نابێ خۆ بسـپێردرێ بە کەسـانی غەیـرە هـاوڕەگەز و هاودینـت؛ بـا لە پێشـدا دۆستایەتی و تێکەڵاویتان بووبێ، چونکە ئەوانە ژیرانە دەگەڵتـان هەڵـس‌وکەوت دەکەن تـاکوو نەتوانی شارەزایی دەست بخەی لەوەی شاردوویەتەوە لە توێ‌توێی دڵیـدا، ئەگەرچـی دەریـای کینە و ڕقی ناو دەروونیان دە کاتی قسە کردن دەگەڵتان سەرەڕێژە دەکا و لە زاریڕا قڵپـێ دەکـا و هەستی پێ دەکەی، چی دە ناو دڵیانـدا هەیە لە ڕاسـتان، و هەروا ئەتـۆش ژیـرانە ئەی خـاوەن ئیمان و ویژدان، دەتوانی لەو ئایەتە پیرۆزە دۆست و دوژمن بناسی و لێکیـان هەڵاوێـری، دژت ئەی ڕۆڵەی بە ئیمان و بڕوا، دوو دەستی هەن یەکیان مەڵحەمی تێـدا، یەکیـان ژەهـری تێـدا، لە پێشدا بە هەنگوین و مەڵحەمەکەت زار تەڕ و شیرین دەکا، پاشان ناهێڵێ بزانی، ژەهراوەکەت بە گەروویدا دەکات، نەزیلە و کوتەی ڕابردووەکانمانە: هەر کەس خۆ دا بە بێگانە، خاک بەسـەرە بێ‌گومانە، بێ‌ویـژدانە، بێ‌ژیـانە»، موحتـاج بە ئـاو و بە نـانە، بێ‌ئەنـوایە، بێ‌مەکـانە، دوور لە عیزەتی ئینسانە؛ هەموو شێر شێرە، بەڵام شێری ڕاستی، ئاکار شێرە.

**هۆی دابەزینی ئایەتی ١١٨ی ئالی عیمران بە پێی فەرموودەی قورئانزانان**

دەبێ ئەوە بێ:

گۆیا پۆلێک لە منافقانی جوولەکە بە هۆی ئەوەی دە کاروباری دنیاییدا دەگەڵ موسوڵمانان تێکەڵاوی و دۆستایەتییان پێک هێنابوو موسوڵمانەکانیش بەهۆی ئەو دۆستایەتی و تێکەڵاویـیە لە سەر کاروباران بۆ بیر و ڕا و مشـاورە دەگەڵیـان کـۆ دەبـوونەوە. موسـوڵمانەکان بە خەیـاڵی خۆیان وای بۆچووبوون هەچەن لە ئایین و ديندا لێک جیاوازین، بەڵام بۆ ڕێنوێنی و مەسـڵەت دۆزینەوە کەڵکیان لـێ وەردەگیـرێ، ئیـتر نەیانـدەزانی ئەو منـافقە جوولەکـانە چـارە و کـار و مەسڵەحەتی موسوڵمانان حەز ناکەن و نایانەوێ، جـا لەو بـارەوە خـودا ئاگـاداری پـێ دان کە توخونیان نەبن و نەیانکەنە چاوسـووری خۆیـان و نەسـحەتکاری خۆیـان، وەک ئـایەتی ١٤ی بەقەرە ئەو بابەتە تەئید دەکا کە جوولەکە دەگەڵ موسوڵمان ڕاست ناکا:

**وَإِذَا لَقُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ قَالُواْ آمَنَّا وَإِذَا خَلَـوْاْ إِلَى شَـيَاطِينِهِمْ قَـالُواْ إِنَّـا مَعَكـمْ إِنَّمَـا نَحْـنُ مُسْتَهْزِؤُونَ**

**کاتێ جوولەکە گەیشتبایەن بە موسوڵمانان کە خاوەنی ئیمان و باوەڕن، پێیان دەکـوتن: ئـێمەش ئیمانمان هێنا؛ بەڵام کاتێک لەگەڵ شەیتانەکانیاندا کۆ دەبـوونەوە پێیـان دەکـوتن: لە ڕاسـتیدا ئێمە هەر دەگەڵ ئێوەین، ئەوە کە دەگەڵ ئەو موسوڵمانانە کۆ دەبینەوە تیتاڵییان پـێ دەکەیـن و فریویان دەدەین.**

ئەو ئایەتە بە ڕاشکاوی ئەوە بە دنیای ئینسان ڕادەگەیێنێ کە دەگەڵ غەیرە دینت تێ مەکەوە و خۆی پێ مەسپێرە، چونکە دە دڵدا پاک نییە دەگەڵت و هاوڕازت نییە.

مەبەستی خوداش لەو ئاگادارییەدا بۆ موسوڵمانان ئەوەیە بە پێی وەزن کردنی ئـایەتەکە کە دەگەڵ هیچ غەیرە دینێـک هـاوڕاز و هاومەشـوەرەت مەبـن، وەک لە جـوملەی ﴿بِطَانَـةً مِّـن دُونِكُمْ﴾ دەگەڵ غەیرە هاوڕاز و دین و مەزەبت تێکەڵاو مەبن و خۆی تەسلیم مەکەن.

دێرەدا ئەو هەستە دەکرێ، واتە لە جوملەی ﴿لاَ تَتَّخِذُواْ بِطَانَـةً﴾ بە پێـی یاسـای عیلمـی نەحو، نەکەرەی پاش نەفیە، دەبـێ عمـووم بگەیێنـێ، کە واتە: دەبـێ وە هەچـی غەیـرە دینیـە وێنەکەوی. (مـن دونکـم) واتە لە غەیـرە ئیسـلام و لە غەیـری نەتەوەت، (أَي مِـن غَيـرِ أَهـلِ مِلَّتِكُم). وشەی (خَبَالاً) بە واتای فەساد و نـاتەواو، یـانی لە بە فەسـاد کێشـانی دینـی تـۆ و بە بادانی ڕاناوەستێ، یا دەڵێن لە خواروخێچ کردنی کاروبارت ڕاناوەستێ.

جوملەی ﴿قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاء مِنْ أَفْوَاهِهِمْ﴾ ئاماژە وەلای ئەوەی دەکا: منـافق واتە دووڕوو حاڵەتێکی هەیە کە دە کـاتی قسـە کردنیـدا ئەو حـاڵەتەی لـێ دەردەکەوێ، واتە ئەو شـتەی کە شاردوویەتەوە دە ناو دڵیدا، سەرەژێرە دەکـا و هەڵـدەڕژێ بە زاریـدا. هەر وەک لە ئـایەتی ٣٠ی سوورەی محەمەددا هەستی پێ دەکرێ بەو بابەتە، یـانی نـاو دەروون چـی تێـدا بـێ، سـیمای شاهیدی لە سەر دەدا:

**وَلَوْ نَشَاء لَأَرَيْنَاكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَاهُمْ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِي لَحْنِ الْقَوْلِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَالَكُمْ**

**خۆ ئەگەر بشمانویستبایە لە ڕاستیدا ئەوانەمان پیشان دەدایـت، بێگومـان بە سـیما و شـێوە و شکڵ دەتناسین، لە ڕاستیدا بەو شێواز و جۆری قسە کردنیاندا دەیانناسیتەوە خوداش ئاگـادارە لە کردەوەکانتان.**

ئەو ئایەتە بە ئینسان ئەوەی دە دڵدایە و ئەو دانە و تۆوەیە کە دە خاکدایە، زەوی چۆنی هەیە ئاوای دەڕوێنێ، کە وابێ ئەوەی دە دڵیشدایە ئاوا دەردەکەوێ و عالەم چاوی دەکا، جا منـافق و درۆزن چۆن خۆ دەشارنەوە لە خودا!؟

جوملەی ﴿إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ﴾ واتە ئەگەر ئەقڵو ببـێ. ئیشـارەی تەواو وەلای ئەوە دەکـا: ئەقڵ وشعوور دە هەستی ئینساندا ناژراوە و هەیە؛ ئەگەر وەکار خرێ کار دەکا و دەزانێ؛ ئەگەر بشدرێ بە هەوا و هەوەس، دەکرێتە یەخسیری ئەو.

جوملەی ﴿قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الآيَاتِ﴾ چمان پێ دەڵێ؟ ئەوەمـان پـێ دەڵـێ: هەمـوو سـوڕ و ڕازی شاراوەی ناو دەروونی کافران و منافقان و ... خەڵک بۆ ئاشکرا کردن، ئەوەی بـۆ ئێـوەی موسوڵمان ماوەتەوە ئەوەیە کە دەبێ لە بەر پێی خۆ بڕوانن تاکوو دەو چاڵ و کەندانەی دوژمـن بۆی هەڵکەندوون تێنەکەون. هەر بۆیە خـودا پێـیمان دەفەرمـوێ: ﴿إِن كُنـتُمْ تَعْقِلُـونَ﴾ واتە ئەگەر ئەقڵو ببێ، واتە بەرجەوەند بن.

دووبـارە ئەو خـودای بەپەرۆش بـۆ خـاوەن ئـیمان و خـاوەن کەرامەت هۆشـدار دەدا بە موسوڵمانان بە وەسیلەی ئایەتی ١١٩ی ئالی عیمران و دەفەرموێ: هەستن لە خەو، هۆشو بێ، دوژمن خۆشی ناوێن، بە خۆشیتان خۆشحاڵ نابێ، بە لاوازی و نابوودیتان خۆشحاڵ دەبێ.

بۆ ئیسباتی ئەو مەبەستە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ١١٩یی ئالی عیمران، تـاکوو بە باشـی حاڵی بین:

هَاأَنتُمْ أُوْلاء تُحِبُّونَهُمْ وَلاَ يُحِبُّونَكُمْ وَتُؤْمِنُونَ بِالْكِتَاب كُلِّهِ وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُواْ آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ عَضُّواْ عَلَيْكُمُ الأَنَامِلَ مِنَ الْغَيْظِ قُلْ مُوتُواْ بِغَيْظِكُمْ إِنَّ اللّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ

**ئەوە ئێوە کە ئەوانەتان خۆش دەوێ، ئەوان ئێوەیان خۆش ناوێ، ئێوە بە هەموو کتێبەکان ئیمان و باوەڕیتان هەیە، کاتێک پێتان دەگەن دەڵێن: ئێمەش ئیمانمان هێناوە، کاتێ کە تەنیا خۆیان بن لە کینە و ڕقیدا پەنجەتان لێ دەگەزن، بڵێن: دەی بەو کینە و ڕقتانەوە بمرن، بەڕاستی خودا ئاگاداری ئەو شتانەیە کە لە دەروونیاندا هەیە.**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١١٩

هەستن لە خەو و بێخەبەریدا وەخەبەر وەرن، ئێوەی خاوەن ئیمان و کتێب و بڕوا ئەوانەن دڵ پڕ لە خێر و حەسەنات و چاکە ئەوەی بە ئەندامی زاهیری کەشفی نەکەن ڕێ نادەن بە دڵی سافی ئیمانتان دڕدۆنگی و گومانی لە سەر دەربڕێ لێی هەڵبەزنەوە، جا بۆیە ئەوانتان خۆش دەوێ و لە تێکەڵاوی دەگەڵیان خۆ نابوێرن و ناپارێزن، بەڵام ئەوان ئێوەیان خۆش ناوێت، چونکە دڵ ژەنگاوین بە ڕق و کینە و بوغز ڕازاندوویانەتەوە، دەرووی سەفا و خۆشەویستیان بۆ نەهێشتۆتەوە، تاکوو بە خۆشەویستییەوە سەیرو کەن هەر بە مۆڕەوە دەتانڕوانێ، بێباوەڕیان ڕێ نادا باوەڕو پێ بکەن، دڵڕەقی دڵنەرمی پێ نەهێشتوون، وریا و ژیر بن نەتانخافڵێنن دە داوو خەن مەست و بێهۆش‌و کەن و بتانتاسێنن، دە چاڵی ڕەزالەتی و زیلەت‌و هاوێن، هەچی بۆیان بگونجێ و بە هەل بۆیان بڕەخسێ دەگەڵو دەکەن، دە تێکەڵاویتاندا هەچی هەلە بۆیان دەڕەخسێ، و هەر وا ئێوە ئەو کەسانەن کە باوەڕیتان دەبێ بە هەموو نامەکانی ئاسمانی ببێ چونکە ئەرکی ئیمانتانە و وەزیفەی باوەڕتانە، و ئەوانیش یاسای ئاسمانین بۆ ڕێنوێنی بەرەی ئینسان بە پێی کات و زەمان، کەسێ باوەڕی بە یاساکانی ئاسمانی نەبێ سەر وە هەرچ و دەرهەم بەرهەمی سەرزەوییە، کە بابەتی نەفس و هەوای بێ، هەوسار و سەرەڕۆیە، بەڵام منافقی بێباوەڕ و کافری حەق‌شێرەوە، ئارەزوو و هەوای خودا و ڕێبەرە، ناتوانێ و بۆی ناکرێ خۆی تەسلیمی یاسای ئاسمانی کا، ئەما بۆ وەی جێی خۆی بکاتەوە دە پاڵ ئیسلامدا خۆی ڕۆهێڵێتە ناوتان، کاتێ پێتان گەیشتن دەڵێن ئێمەش بڕوامان هێناوە و دینتانمان قبوول کردووە، بەفێڵ تاکوو غافڵگیرو کەن، ئەمما کاتێ کە لە لاتان لاچوون و ڕۆیشتن لە داخانتان و ناحەزیتان لە لایەن پەنجەکانیان دەخەنە ناو زاریان و دەیانگەزن و دەیکرۆژن، دەبا لە داخان با بقەڵشێن و

بمرن و ڕۆچن لە خاکا، ئێوەی موسوڵمانیش هەروایان پێ بڵێن، بێ گومان خودا ئاگادارە بە هەست و خورپە و چرپەی ناو دڵان، واتە نهێنی و ئاشکرا لە لا ی خودا ئاشکرایە.

**سووکە ئاوڕێک:**

ئەی خاوەن ئیمان و گووراو بە شەرەف و کەرامەتی ئیسلامییەوە! لەوانەیە ئەتۆ بە هۆی باوەڕیت بە هەموو کتێبەکانی ئاسمانی، یا لە ڕووی خزمایەتی یا جیرانەتی و ئاومالّی و تێکەڵاویت دەگەڵیان، خۆشت بوێن و نەیانبوغزێنی و دوورییان لێ نەکەی و ئەوانیش هەل و فرەستت لێ وەقۆزن و تووشی هەڵدێرت کەن. بەڵام باوەڕت بێ ئەوە بێ گومانە و حاشا هەڵنەگرە، ئەوانە بە هۆی ئەوەی کە پابەند بە هیچ یاسایەکی ئاسمانی نین، خاوەنی هیچ عیزەت و نامووس و حەیا و ویژدانێک نین، لێو دەفەختن دە پەیسەری ئەوەیدان دە چاڵێکو هاوێن، جا بۆیە کە دەگەنە لاتان دەڵێن وەک وە ئیمانمان هێناوە و هاودینین با لە ڕەگەزیشدا لێک جیا بین، ئەوە چاڵە بۆتان هەڵدەکەنن، داوە و بۆتان دادەنێن؛ وریا بن، کاتێ کە لاچوون لە لاتان لە داخانتان دەستی خۆیان دادەکرۆژن، ڕەنگە موسوڵمان نەزانێ حاڵ و ئەحواڵی منافق، بەڵام خودا دەزانێ و ئاشکرایان دەکا، موسوڵمان با نەشزانێ کام هۆدە ئاوری تێدا دایسێ بەڵام دووکەڵی ڕۆچنە پێت دەڵێ، با نەشزانێ دە شەوی تاریکدا کام شیو و دۆڵە پڕ لە دووکەڵە بەڵام شۆقی ئاوری شەوێ پێت دەڵێ، جا چا با چا نەبێ جا.

**ئادابێکی نەحویان دە تەرتیب و نەزمی ئایەتی ١١٩دا:**

عەللامە سەید سەرەخسی فەرموویەتی: پیتی «ها» دە جوملەی «ها أنتم»دا بۆ ئاگادارییە؛ «و أنتم» موبتەدایە و لەفزی «اولاء» خەبەرەکەیەتی. جوملەی «تحبونهم» بە نەسبە لە سەر ئەو ئەساسەیە کە دە پلەی حاڵدا قەراری گرتووە لە بۆ ئیسمی ئیشارە.

هەندێک لە زانایانی عیلمی نەحو نەزەریان وایە: «اولاء» بە واتای «الذین»یە، جوملەی «تحبون» سیلەیەتی، ئەو سیلە و مەوسوول واتە «الذین و تحبون» دەبنە خەبەر بۆ «انتم»، بەڵام عەللامە فەررا نەزەری ئاوایە: لەفزی «اولاء» خەبەرە بۆ موبتەدایەکی کە «أنتم» و «تحبونهم» خەبەری پاش خەبەرە. بۆ زێدە زانین بڕوانە لە تەفسیری کەبیری ئیمام فەخری ڕازی، ج ٨/ ٢١٣، بەڵام نەزەری عەللامە سەیر سەرەخسی بە ڕەواتر و دروستتر زانراوە.

ئیمام فەخری ڕازی لە بابەت دۆستایەتی موسوڵمانان دەگەڵ کافران و بێ محەبەتی کافران

دەگەڵ موسوڵمان بۆچوونی ئاوا نیشان داوە:

۱. موسوڵمانان دەیانهەوێ کافران بەرەو ئیمان هێنان ڕاکێشن بە هۆی تێکەڵاوی دەگەڵیان، دە حاڵێکدا کافر ئەو تەمایە و تێکەڵاوییەی موسوڵمانان بە هەل قۆزتۆتەوە کە ئەوان بەرەو کوفر ڕاکێشێ، خۆ ئەوەش ڕاستە کافر لە فێڵ و فووتدا بەهێزتر دەڕواتە پێشێ، کەوایە تێکەڵاوی موسوڵمانان دەگەڵ کافران بە زەرەری موسوڵمانان تەواو دەبێ.

۲. کافر و موسوڵمانەکان بە هۆی خزمایەتی ژنانە و هاوماڵی تێکەڵاوییان سەری گرتووە، لەوەڕا موسوڵمانەکان لە تێکەڵاوییان خۆ ناپارێزن، دە حاڵێکد کافر تێکەڵاوی دەگەڵ موسوڵمانی ناوێ مەگەر بۆ فریو و دە داو خستن.

۳. موسوڵمان و کافر هەر دوو بە تەمای مەرامی خۆیان، خۆ تێک هەڵدەقوتێنن بەڵام دڵڕەشی و کینە و ڕقی کافر و بوغزی نیهانی ئەو بۆ پاڵەپانی دانی موسوڵمان کاریگەر و بەهێزترە، چونکە دەروون بەهێزترە بۆ چوونە پێش لە مەبەست.

۴. موسومانان بەهۆی ئەوەی کافر بە زاهیری خۆشەویستیان بۆ پێغەمبەر دەردەخەن ڕێ نادەن بە خۆیان دۆستایەتییان نەکەن، بەڵام کافر بەهۆی ئەوەی موسوڵمانان پێغەمبەریان لە نەفسی پێ عەزیزترە، ڕێگا نادەن بە خۆیان موسوڵمانیان خۆش بوێ.

۵. ئەرکە لە سەر ئیسلام خۆ وەدوور خەن لە تێکەڵاوی لامەزەب و بێدین، چونکە ئەوان ناحەقن و موسوڵمان حەقە؛ (وَ الْحَقُّ أَحَقُّ أن يُتَّبَعَ) (تفسیر کبیر، ۲۱۴/۸)

جوملەی ﴿قُلْ مُوتُواْ بِغَيْظِكُمْ﴾ ڕوو دە پێغەمبەرە لە لایەن خوداوە: ئەی پێغەمبەر، بڵێ بە کافر: بمرن بەو ڕق و کینەوە کە ناتوانێ زەرەر بە ئێمەی موسوڵمان بگەیێنێ، و هەر وا تا هەن ئەی کافری دژ بە دین و ئینسان بسووتێن دە ئاگری ڕق و کینەتان نیسبەت بە موسوڵمانانی خاوەن عیززەت و کەرامەت.

جوملەی ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ ئاماژەی تەواوە وەلای ئەو ڕاستییە: خودا ئاگاداری دڵانە و خەبەرداری دڵی ئێوەی بێباوەڕە کە مۆنجان دەدەن لە کینە و ڕق بەرابەر بە موسوڵمانان. بە کورتی و بە کوردی، دڵی بێ خودا و خاڵی لە خەیاڵی خودا ئاوەدان نییە بەڵکە ڕووت و ڕەجاڵ بەغەیرەز دڕکوداڵ لێی چاو ناکرێ.

موسوڵمانان بە هۆی ئەوەی کە دڵ و هەست و دەروونیان بە قورئان پاراو دەکرێ ڕەحم و بەزەی لێ دەڕوێ و بەر دەگرێ، ئەو بەرە ڕەحم و بەزەیە نایهەوێ ئازار و ئافەت و ڕەنج تووشی

گیاندارێک بێ، تا دەگا بە ئینسانی کفر و بێباوەڕیش، جا بۆیە خـۆ ناپـارێزن لە دۆسـتایەتی و تێکەڵاوی دەگەڵ کافران، ئەک ئەوان نایانهەوێ نیزیکی بکەن لە موسوڵمانان مەگەر بۆ فێـڵ و فووت، چونکە هەمیشە چاوەڕوانی بەدبەختی و چارەڕەشی موسوڵمانانن، هەر وەک لە ئـایەتی ۹۸ی سـوورەی تەوبەدا هەسـت بەوە دەکـرێ عەرەبـی ناپـاک و کـافر خوازیـار و چـاوەڕوانی بەدبەختی موسوڵمانانن:

**وَمِنَ الأَعْرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَمًا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ الدَّوَائِرَ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ السَّوْءِ وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ**

**لە ناو عەرەبی دەشتەکیدا کەسی وایان تێدایە ئەوەی لە ڕێی خودادا دەیدا هەمووی بە غەرامە و زەرەر و زیان دەزانێ، چاوەڕوانی ئەوەش دەکا، بەڵای ناسۆر داتانگرێـت، دەبـا بەڵای ناسـۆر دەوری خۆیان بگرێت، خوداش بیسەر و زانایە.**

جگە لەوەش موسوڵمانی وا هەیە بە هۆی دڵی پڕ لە سەفای پاکی هاواڵەتی کافران دەکـا و هەتا لە ئومووری دینیشدا ڕاز و سوڕی دینیشیان لێ حاشار نـادا، بەڵام بـێخەبەر لەوەی ئەوان هەمیشە تیغی تیژیان دە بن هەنگڵدایە بۆ ڕیشە داپاچینی باغی عیزەتی ئیسلام، جا لە سـەر ئەو شێوە ئاکارەی موسوڵمانان دەگەڵ کافران کە خـودای تەبـارە و تەعـالا بـۆ ئاگـاداری و لەخـۆ وریایی موسوڵمانان، بەڵگە و نیشانەی زۆری کافران و منافقـان ڕادەنـێ و ئاشـکرایان دەکـا لە دوژمنایەتی دەگەڵ ئیسلام بۆ وەی فریوی دەستیان نەخۆن موسوڵمانان، بـۆ ئەو ڕاسـتییە دەبـێ بچینە خزمەت ئایەتی ۱۲۰ی ئالی عیمران:

**إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُواْ بِهَا وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لاَ يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا إِنَّ اللّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿۱۲۰﴾** ئالی عیمران

**ئەگەر چاکە و خۆشی ڕووتان تێ کا، خەمبار و پەرۆشی دایاندەگرێ، ئەگەر بەڵا و ناسـۆرێک بێتە ڕێتان، پێی خۆشحاڵ و شادمان دەبن؛ ئەگەر ئێوە خۆڕاگر و لەخواترس بن فێـڵ و فووتـان دەرۆست نایە و زیانتان لێ نادا، هیچ گومانی تێدا نییە خودا ئاگادارە لەوەی ئەنجامی دەدەن.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ۱۲۰

ئەگەر کاری چاک و باش و وەڕێ بێ، قازانجێکی دنیا و قیامەتی تێدا بێ بۆتـان، ئەوان لە داخ و حەیف و بەخیلییان هەڵدەمسێن و وەختە بترکەن، نـاحەز بە هەمـوو جوانیتـان دە کـار و

باردا، بە ناحەزو سەیر دەکەن و پێیان ناخۆشە چونکە ئەو جـوانی و کارچاکییەتـان بە خیلافـی ئارەزوو و ئاواتی ئەوانە، چونکە ئاوات و ئـارەزووی منـالق هەمیشـە بەدبەختـی و چارەڕەشـی موسـوڵمانانە، ئەوە خـاوەن بـاوەڕە کە خۆشـی و خۆشـحاڵی ئینسـانی دەوێ، ئـاواتەخوازی حەسانەوەی دنیا و قیامەتی ئینسانە، منافق پیشەیەتی و پێی خۆشحاڵە بە ناخۆشی موسوڵمانان، تا ئیسلام دە گێژاوەی دڵتەنگیدا تلان بدا ئەوان دە خۆشحاڵیدا تلان دەدەن، جا بۆوەی بقەڵشێن لە داخانتان، خـۆ وەخـۆ بگـرن لە حانـدی دەرد و بەڵا و تەنگـانەدا، و هەر وا خۆپـارێز بـن لە بێئەمر و ئیتاعەی خوداتاندا، بێگومان بن لەوەی کە فێڵ و فووت و تەڵە و تەڵەکەی کـافران و منافقان ناتوانێ بتانکێشێتە پای زەرەر و ناڕەحەتی، دیارە خودای بانی سەر بەوەی کافر و منـافق دەیکەن ئاگادارە.

**پاشەدۆ:**

کـافر بە خێـر و خۆشـیتان ئەی موسـوڵمانان غەمگـین و پەرێشـانن، بەڵام بە دوچـاری و گیرۆدەییتان بە دەرد و بەڵا و تەنگانە سەرخۆش و کەیفساز و بەدەمارن؛ ئەمما ئێوەی ئیسـلام بۆ وەی لە گێژاوی پەرێشانی ڕزگارییـان نەیە کـافر، خـۆڕاگر و بەورە و بەتوانـا بـن لە ڕاسـت هەچـی تەنگـانەیە، تەنگـانە بەریـان کـورتە زوو لا دەچـن، وریـا بـن نەکەونە تەڵە و داوی وەسوەسەی نەفس و هەوا بە فڕ و فیشاڵی کافران، بـۆوەی بتـوانن لە بـن سـێبەری خۆڕاگریـدا خۆڕاگر بن، تەوەکول و هیوا و تەقوا بکەنە پیشە و تێشوو، خـودا دەگەڵ خـاوەن تەقـوایە، و بە هەچی دوژمن دەیکا ئاگایە، دە کاتی خۆیدا دەستی دوژمن لە پشتەوەڕا دەبەستێ، جگە لە دنیـا بێئابڕوو دەبن لە ئاخرەتیشدا بێئەنوا دەبن و بێپەنا.

بە کـوردی و بە کـورتی، ئەو ئـایەتە ئەوە بە موسـوڵمانان دەڵـێ کە ئەگەر ڕاسـت دەکەن موسوڵمانن و ئیدیعای ئیسلامەتی دەکەن، دەبێ دە بەرابەر دوژمـن و هێـرش و شـاڵاوی ڕق و قینەیان خۆڕاگر بن و پشت وە خودا دەن، فیتنە و ئاژاوەگێڕی دوژمنان نـاوێرێتە ورە و توانـایی مرۆفی لای خودا، کێ دە پەناگای خودادا بێ و پشتی بە خودا بێ، کـێ هەیە بتـوانێ پشـتی لە ئەرز دا و بیخا، ئەوانەی دەکەون بە پشتەوە بە بایەکی دەوران و هەڵدێن بەو شـتەیەکی بەدکـار، دوورن لە خودا، خۆ هەڵاوەسراوی دنیای پەسـتن، ڕاپەڕینـی بـێورە دوژمـن دە خـۆ بەردانە و دوژمن بە خۆ خۆشکردنە؛ ڕۆڵەی موسوڵمانی کورد کاتێ بە خۆت وێرای، بە دوژمـن وێـرای، بێگومان کاتێ بە خۆت نەوێرای، دوژمن پێت وێراوە و دە پاڵـت خـزاوە، وەک دەبینـی دیـارە

حاشای لێ ناکرێ.

**تیوتیوەیەک:**

پێشەکی دەبێ ئەوە بزاندرێ وشەی (مسّ) واتە دەست پێدا سوون، بەڵام دێـرەدا بە واتـای تووش‌بوونە، وەک ئایەتی ٣٨ی سوورەی "ق" ئیشارەی وەلا دەکا:

> **وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ**
> **بێ‌گومان ئاسمانان و زەوی ئەوەشی لە نێوانیاندایە، لە شەش ڕۆژدا دروستمان کردن، هیچ جۆرە ماندووبوونێکیشمان تووش نەبوو.**

خاوەنی کەششافیش نەزەری ئاوا داوە کە وشەی (مسّ) بە مانـای تووش‌بـوونە، هەر وەک ئایەتی ٧٩ی سوورەی نیساء ئیشارەی وەلا دەکا:

> **مَّا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ**
> **هەر چاکەیەکت تووش دەبێ لە لای خوداوەیە، هەر خراپەیەکیش تـووش هـات ئەوە لە خـودی خۆتەوەیە.**

دووبارە بۆ باوەڕی ئەوەی کە (مسّ) بە واتای تووش‌بوونە، سەیری (مـسّ)ی ئـایەتی ٢٠ و ٢١ی سوورەی مەعارج دەکەین:

> **إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾**
> **کە خراپەیەکی تووش دەبێ، هاوار و نـاڵەی دەردەبـڕێ (٢٠) هەر کـاتێ خێـر و بێرێکـی دەس دەکەوێ دەستقونجاو و پیسکە و چرووکە (٢١)**

ئەو ئایەتانە بەڵگەن لە سەر ئەوەی (مسّ) بە مانای تووش‌بوونە. وشەی (حسـنة) دێـرەدا بە مانای قازانجی دنیایە و وشەی (سيّئة) بە مانای زەرەرە.

ابن عباس وشەی (کید)ی بە مانای دوژمنایەتی تەعبیر کردووە.

جوملەی ﴿إِنَّ اللّٰهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾ واتە خودا زانایە بە وەی دەیکەن؛ وشەی (محـیط) واتە دەورەدان بە زانایەتی و یا بە هەرچی بێ. ئەو مانایەشی بۆ شتانێک دەبێ کە خاوەنی جسم و لەش بێ؛ جا لە سەر ئەو ئەساسە وەپـاڵدانی (محـیط) بـۆ لای خـودا بە نـاڕەوا دەژمێـردرێ مەگەر حەواڵە بە مەجاز بکرێ. ئەمما لە بەر ئەوەی خودای تەعالا دانایە و زانایە بە هەچی و بە

سەر هەچی بوونە توانایە، بە مەجازی لوغەوی دەتواندرێ وشەی (محیط) وەپاڵ بدرێ. هەر لەوەش ڕایە ئایەتی ٢٠ی سووڕەی برووج کە خودا فەرموویەتی:

**وَاللَّهُ مِن وَرَائِهِم مُّحِيطٌ**
**خودا زاڵە بە سەریاندا و بە هەموو شتێکیان دەزانێ.**

یەکێ دێ پرسیار دەکا و دەڵێ: دەو ئایەتی ﴿إِنَّ اللّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾ بۆچی وشەی محیط لە ئاخرە؟ بۆچی نەکوتراوە: (إِنَّ اللّهَ مُحِيطٌ بِمَا يَعْمَلُونَ) واتە وشەی محیط لە پێش وشەی یعقلون با؟

دەبێ لە وڵامدا بکوترێ: ئەوەی زۆر مەبەستە دەبێ لە پێشەوە بێ کە ئەویش ئەعمالە، چونکە خودای تەعالا بە هەموو ئەعمالیان ئاگایە لەسەر ئەعمالیش هەرایە و سزایە، دێرەدا مەبەست ئەوە نییە کە خودای تەعالا زانایە، بەڵکە مەبەست ئەوەیە خودا بە کرداریان زانایە کە وابێ وا ڕەوایە ئەعمال لە پێشەوە بێ. (تفسیر کبیر، هەمان ئایەت)

دە ئایەتی ﴿وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لاَ يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا﴾ هەست بە شتێکی پێویست و ئەساسی دەکرێ کە ئەو شتە ئەساسیە بۆ وەی نابێ هیچ ئینسانێک بیخاتە پاش گوێیان و لە بیر خۆی بەرێتەوە. شتەکەش ئەوەیە: ئیتاعە کردن و شوێنکەوتنی ئەمیری خۆت و ڕاوێژ و گفتوگۆ واتە مەشوەرەت لە هەموو کاروبارێکدا و بەردەوامی لە سەر نەتیجەی ڕاوێژ و موشاوەرە، چونکە یاسای خودایە و ڕەوش و سوننەتی ئەوە، یاریدەی خودا بە شوێن یەکتر یاریدەداندایە، واتە (ید الله مع الجماعة). بە کورتی و بە کوردی، یاریدەدانی بەری سەبر و خۆڕاگری و ئیتاعەتانە، شکەست و تێشکان لە بێئیتاعەیی و ناشکوریتانە. نموونە: گۆیا لە هەرای ئوحوددا لەشکری ئیسلام لە هەر بارێکەوە تێر و تەواو و تەسەل، زۆر و ساز و تەیار و ئامادە و بەورە بۆ شەڕ و بەرەنگاربوونەوە دەگەڵ دوژمن بووە؛ کەچی لە سەر ئەو حاڵەتەشەوە بە هۆی سەرپێچی لە ئەمر و فەرمانی ڕێبەری خۆیان (پێغەمبەر) تێشکان. بەڵام لە هەرای بەدردا دە حاڵێکدا کەم و ناتەیار، بەڵام چاو لە دەستووری ڕێبەر و گوێلەمست بۆ ئیتاعە دوژمنیان تێشکاند و سەرکەوتنیان بە دەست هێنا. با ئەوەندەش وەبیر خەینەوە تێشکانی ڕۆژی ئوحود هۆیەکەی سەرپێچی عەبدوڵڵا کوڕی ئەبی سلوولی منافق بوو، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەوەی جاش و ناباش نابێ تێکەڵاوی و نیزیکییان دەگەڵ بکرێ، تخوونبوونیان تێشکانی

پێوەیە.

پێغەمبەر لە هەرای ئوحوددا شوێنی لێ بوون واتە سەنگەر و سەفی لەشکری بۆ خۆی دامەزراند. بەڵام منافقان دە گەرمەی هەرادا و حەساسترین ئان و ساتی شەڕ پشتی لەشکری موسوڵمانیان خاڵی کرد، ئەو شێوە ناحەزە شکستی کاتی بە لەشکری ئیسلام هێنا، بەڵام پاشان بە هۆی ڕەحمی خودا و نزای پێغەمبەر و لەشکر هاتنەوە هۆش و سەرکەوتنیان وەدەس هێنا. جا بۆ تەئیدی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٢١ی ئالی عیمران:

**وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّىءُ الْمُؤْمِنِينَ مَقَاعِدَ لِلْقِتَالِ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٢١﴾** ئالی **عیمران**

**یادێ لەو کاتە بکەوە کە بەیانی زوو لە ناو ماڵ و خێزانتدا هاتیە دەرێ، تا سەنگەری بڕواداران ئامادە کەی بۆ شەڕ و هەرا، خوداش بیسەر و زانایە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٢١**

یا محەممەد بیخەوە بیر خۆت ئەو کاتەی کە لە چێشتەنگاودا دەهاتی بڕۆیە دەرێ لە ناو ماڵ و خێزانتا بەرەو کێوی ئوحود، وا بوو بەتاڵووکە و بە پێیان هاتی و گەیشتیە یارانی شەڕکەر و داتدەمەزراندن لەو شوێنە و مەتەرێزانەی کە بابەت بوون بۆ شەڕ و بەربەرەکانی دەگەڵ دوژمن وەک قورەیشیەکان، دیارە ئەوەی بە شەڕکەرانی ئیسلامت دەکوت خودا دەیبیست و دەیزانی.

بە پێی ڕاگەیێندراوێک لە تەفسیری "الواضح"دا گۆیا لە مانگی شەوالی ساڵی سێهەمی کۆچیدا پێغەمبەرﷺ لە شاری مەدینەدا بە هەزار شەڕکەرەوە بەرەو کێوی ئوحود دێ بۆ بەرەنگار بوونەوەی قورەیشییەکان کە بە سەرۆکایەتی ئەبوسوفیان ئاڕاستەی شەڕ کرابوون کە نزیکەی سێ‌هەزار کەسیان هێنابوو، ژنیشیان دەگەڵ خۆ هێنابوون بۆ وەی لەشکرەکەیان ورەیان پێ بەهێزتر بێ. وا هات لە کێوی ئوحود بە یەک گەیشتن و شەڕێکی زۆر سەخت و گران و خوێناوی ڕووی دا کە نزیکەی ٧٠ شەڕکەر لە قورەیشییەکانی بت‌پەرست کوژران. وا هات تێک شکان و ڕایانکرد ڕاکردنێکی وا کە ئاوڕدانەوە و بادانەوەیان لێ چاو نەدەکرا، بەڵام داخی بە جەرگم وەک جاش و خائین لە هەموو دەروانـدا کەلێنێ بۆ دوژمن دەدۆزنەوە کە بتواندرێ گورزی خۆیان لە پشتەوەڕا لە دژی خۆیان بدەن و بوەشێنن، وەک عەبدوڵلا کوڕی جوبەیر کە لە پشت لەشکری ئیسلامەوە جێگیر کرابوو و دامەزرابوو بە دەستووری پێغەمبەر، کاتێ دیتیان لەشکری ئەبوسوفیان واتە هێزی بت‌پەرستان تێک شکان هەڵاتن بە ڕواڵەت بۆ تالان

شوێنەکەی خۆیان چۆڵ کرد و هاتنە خوارتر. تەنیا عەبدوڵڵا کوڕی جوبەیر و چەند کەسێک نەبێ، فرسەتیان قۆزتەوە، خالیدی کوڕی وەلید و عەکرەمەی ئەبوجەهل کە زانییان تیرئەندازانی موسوڵمان شوێنی خۆیان بەجێ هێشت، دەستەولەجێ هێرش و شاڵاوێکی بەگوڕیان بردە سەر شوێنەکانیان و هەچی لەوێ مابوو خۆیان لە بەر نەگرتن و کوژران، تەنانەت وا توند بوو هێرشەکەیان پەلاماری زاتی پێغەمبەریشیان دا و هاواڵانی دەوروبەری پێغەمبەر بە هۆی دیفاعێکی سەخت و بوێرانە لە پێغەمبەر بە شەهادەت گەیشتن؛ ئەدەوەیدا بوو ددانێکی مبارەکی پێغەمبەر شکاند، زۆری نەمابوو بتپەرستەکان سەرکەوتنی تەواو وەقۆزن و بە دەستی بێنن، بەڵام کاتێ یارانی پێغەمبەر چاویان بە خوێنی ددانی مبارەکی پێغەمبەر کەوت جۆشان و خرۆشان و کۆ بوونەوە لە دەوری پێغەمبەر و وەک شێری بێچوو خوراو ڕاماڵ و شاڵاویان دانێ لە خۆیان پرینگاندنەوە بەرەو بەرزایی کێوی ئوحود سەرکەوتن و کۆتاییان بە شەڕ هێنا.

بە پێی هەڵسەنگاندنی مێژووی شەڕەکانی ئیسلام و منافقانی دەوران، تێشکانی لەشکری ئیسلام لە هەرا و شەڕی ئوحود دەگەڕێتە بۆ سەر عەبدوڵڵا کوڕی ئوبەی منافق، بەو دەلیلە: پێش ئەوەی شەڕ دەست پێبکا، بە بەهانەی گەڕانەوە بۆ مەدینە بۆخۆی و ٣٠٠ نەفەری شەڕکەر خۆیان لە شەڕکردن دزییەوە، ئەدێرەدا بوو دوژمن هەلیان بۆ ڕەخسا و هجوومیان کردنە سەر لەناکاو و بێ خەیاڵ کە دوژمن هەلی دەس کەوتووە بە چۆڵ کردنی سەنگەرەکان لە لایەن عەبدوڵڵا کوڕی ئوبەیەوە. ئەو کورتە باسەی بەسەرهاتی هەرای ئوحود لە تەفسیری "مواهب الرحمان"ەوەیە.

دڵ لە جوملەی ﴿وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ﴾ هەست بەوەی دەکا کە مەیدانی شەڕی ئوحود زۆر دوور نەبووبێ لەو شوێنەی ماڵە پێغەمبەری لێ بووبێ، بەو دەلیلە پێغەمبەر گۆیا بەتاڵووکە و بە پێیان کە وا زوو خۆی گەیاندۆتە لەشکری ئیسلام بۆ وەی ڕێ بگرێ لەوەی شەڕ دە شاری مەدینەدا ڕوو بدا بەڵکە شەڕەکەی خزاندە دامێنی کێوی ئوحود؛ پاش تەگبیر و مەشوەرەت دەگەڵ یارانی شەڕ ئەگەرچی هەندێکیش لە شەڕکەران کێشەی ئەوەیان دەکرد شەڕەکە دە شاری مەدینەدا بێ، بەڵام دیارە نەزەر و ڕای پێغەمبەریان لە سەرووی هەموو نەزەرێکی خۆیان دادەنا و وەریاندەگرت. بۆ زێدە زانین دەتوانی بچینە خزمەت تەفسیری کەبیر باسی هەمان ئایەت.

**پاشەدۆ:**

بە نەقڵ لە ابومسلم بحر اصفهانی کە فەرموویەتی: ئەو ئایەتی ١٢١ی ئالی عیمران عەتفە

بە وەسیلەی پیتی «و» بۆ سەر ئایەتی ١٣ی ئالی عیمران:

قَدْ كَانَ لَكُمْ آيَةٌ فِي فِئَتَيْنِ الْتَقَتَا فِئَةٌ تُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَأُخْرَى كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ الْعَيْنِ وَاللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِ مَن يَشَاءُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِي الأَبْصَارِ

**بەبێ گومان لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو دوو دەستەدا نیشانەیەکی ئاشکرایە بۆ ئێوە، دەستەیەکیان دەجەنگێن لە ڕێی خودادا، ئەوی دیکەیان بێ بڕوا بوو، بە ئاشکرا موسوڵمانەکانیان بە دوو ئەوندەی خۆیان دەبینی، خودا بە یارمەتیدانی خۆی پشتگیری ئەو کەسە دەکات کە دەیەوێت، بێ گومان لەو کارەساتەدا پەند وەرگرتنێکی زۆر هەیە، بۆ ئەوانەی کە خاوەنی دڵێکی ڕووناکن.**

بە کورتی، خودا لە یاریدەدانی تۆ (محمدﷺ) بەو لەشکرە کەمەتەوە بە سەر لەشکری کافران بەو زۆریانەوە دەرس لێ وەرگرتنی تێدایە، تا دەرکەوێ کە خودا پشتیوانی خاوەن ئیمانانە، هەر وەک ئەتۆ لە کاتی هاتنە دەرت لە پاڵ ماڵ و خێزانتدا بۆ لە نەزمدانی لەشکری ئیسلام لە کاتی شەڕ دەگەڵ کافراندا چاوت کرد.

لە سەر ئەو ڕۆژە کە ئایا ڕۆژی ئوحودە و یا ڕۆژی بەدرە، و یا ڕۆژی هەرای ئەحزابە، مشتومڕ هەیە، بەشی زۆری مێژوونووسان لەو باوەڕەدان کە ئەو ڕۆژە ڕۆژی ئوحودە، وەک ابن عباس، سدّی و ابن اسحاق و ربیع و اصمّ و ابومسلم اصفهانی؛ بەڵام حسن بصری بۆچوونی وایە کە ئەو ڕۆژە ڕۆژی بەدرە، و هەروا مجاهد و مقاتل نەزەریان وایە ئەو ڕۆژە نە ڕۆژی ئوحودە، نە ڕۆژی بەدرە، بەڵکە ڕۆژی ئەحزابە. بەڵگەی ئەو کەسانەی کە کوتوویانە ئەو ڕۆژە ڕۆژی ئوحودە بەشی زۆری خەڵکی غەزاچی فەرموویانە ئەو ئایەتی ١٢١ی ئالی عیمران لە سەر واقیعە و کارەساتی ئوحود دابەزیوە، و هەروا خودای زانا پاش ناردنە خواری ئەو ئایەتی ١٢١ی ئالی عیمران ئایەتی ١٢٣ی ئالی عیمرانی ناردە خوارێ:

وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ فَاتَّقُواْ اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ ئالی عیمران

**بێ گومان خودا لە بەدردا یارمەتی دان، لەو کاتەدا کە وا ئێوە لاواز بوون کەواتە لە خودا بترسن بەڵکوو شوکرانەبژێر بن.**

ئەو نەزمە ئەوە دەگەیێنێ کە ئایەتی ١٢٣ عەتفە بۆ سەر ئایەتی پێش خۆی کە ئایەتی ١٢١ە، جا خۆ ئەوەش یاسایە کە دەبێ معطوف غەیری معطوفعلیە بێ. بەو پێیە دەبێ بڵێین ئایەتی ١٢١ بابەتی ئوحودە و ئایەتی ١٢٣ش بابەتی بەدرە و حاشاش لەو ڕاستییە ناکرێ.

ڕۆژی ئەحزابیش ڕۆژێکە کە یارانی پێغەمبەر مخالفەتی خۆیان نیشان نەداوە بەڵکە بە تێکڕایی ئیتاعەیان لێ کرد، ڕۆژی هەرای ئوحود بوو کە عیددەیەک مخالفەتی پێغەمبەریان لە خۆ نیشان دا. جا لە سەر ئەو ئەساسە ئەو ئایەتە بۆ هەرای ئوحود شایانترە و کارەساتی ئوحودیش لێرەدا دەوەشێتەوە بەو دەلیلە: سەرپێچی هەندێک لە لەشکریانی ئیسلام ئەوە دەردەخا کە گۆیا ئاوڕ نەدراوەتە دەستوور خودا بۆیە فەتح و پیرۆزی نەهاتە جێ واتە سەرکەوتن. ئەوەش دەستووری خودا کە گوێیان پێ نەداوە: ﴿وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لاَ يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا﴾ کە دە ئایەتی ١٢٠ی ئالی عیمراندا خودا نیشانی دا.

جگە لەوانەش ئەوەی وەک ڕاستان دەچێ و حاشای لێ ناکرێ ئەوەیانە کە تێشکانی موسوڵمانان و سەرکەوتنی دوژمنان لە ڕۆژی هەرای ئوحوددا بووە بە زۆری تا هەرای ڕۆژی ئەحزاب، چونکە لە هەرای ڕۆژی ئوحوددا پۆلێکی زۆر لە پیاوانی بەرچاو لە یارانی پێغەمبەر بە شەهادەت گەیشتن، کارەساتی وا بەئێش لە هەرای شەڕی ئەحزابدا ڕووی نەداوە، جا بە پێی ئەو دەلیلانە ئایەتی ١٢١ حەواڵەی ڕۆژی ئوحود بکرێ بە شایانتر دێتە بەرچاو.

کورتەکەی: لەشکری کافران سێهەزار نەفەر و زۆر تەیار و لەشکری موسوڵمانان هەزار نەفەر یا شتێک کەمتر و منافق دەگەڵ؛ دەو حاڵەتە ناسکەشدا عەبدوڵڵا کوڕی ئوبەی بە پۆلێکی سێسەد نەفەری لە هاودەستانی خۆی دەکەوێتە پاشەکشە لە شەڕ، پێغەمبەر بۆخۆی و حەوتسەد نەفەر دەمێنێتەوە. بەڵام خودای تەعالا بە پێی وەعدەی خۆی (اللە ولی الذین آمنوا...) بە هاوارەوە دێت، بەو حەوسەد نەفەرە ناتەیارە سێهەزار نەفەری بەهێزی خاوەن چەک و چۆڵ و تەیار تێک دەشکێندرێ. ئەوە کە لە سەرەوە تووشی ئەو زەربە بەئێشە بوون ئی وەدوای تاڵان کەوتنیان بوو، لایاندا لە دەستووری پێغەمبەر و فەرموودەی خوداشیان خستە پاش گوێیان واتە تاڵان بەری چاوی گرتن و مەیدانی ئەوەیان بۆ چاو نەهێشتبۆوە کە ئەو سەفارشەی خودا لە بیر خۆ نەبەنەوە: ﴿وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لاَ يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا﴾. کێ وازی لە زۆر زانینە لەو بارەوە: تەفسیری کەبیر باسی هەمان ئایەت تماشا کات.

خودا بە ئاشکرایی ڕەحمەتی یاریدەدان و هاویاری خۆی نیشانی موسوڵمانان دەدا و دەینوێنێ، وەک ئەو کات و ساتەی دوو دەستە لە موسوڵمانان لە بابەت شەڕ و بەرەنگار بوونیان دەگەڵ دوژمن دابوویانە ناو دڵیان ترس و دڵەڕاوکە و بێهێزی لە بەرابەر دوژمندا، هەر وا خۆیان لە پاشەکشە و وازهێنان لە شەڕ وەنزیک دەخست، بەڵام بەزەی خودا و وەعدەی خودا

هات بە هاوار و بارانی وورەی بەهێزی داباراندە ناو دڵیان، مژەسیسە و کوێرەی لە ناو دڵیان تاراند و ڕەواندی و ڕاماڵی دا ئەو ترس و لەرزەی ناو دڵیانی ئاڵوگۆڕ پێ کرد بە غیرەت و ئازایەتی و مێرانەیی. ئەدێرەدایە کە خاوەن باوەڕ باوەڕیەکەی چەکی پیرۆزییە کەس ناتوانێ چەکی کا و دایماڵێ لە چەک، بەڵام بێباوەڕ بێچەکە بۆخۆی خۆی داماڵیوە و خۆی بۆ دوژمن هەڵناوە. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٢٢ی ئالی عیمران تاکوو بە تێر و تەسەلی لەو بارەوە تێبگەین:

**إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلاَ وَاللّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى اللّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ (١٢٢)** ئالی عیمران

**لەو کاتەدا کە دوو گرووتان لەوانە بوو ترس و سستی کەوێتە دڵیان، هەرچەندە خودا کۆمەک و یاریدەدەریان بوو، بڕواداران با هەر بە خودا پشت ببەستن.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٢٢

دەبێ یادی ئەو ڕۆژ و کاتە بکرێ و نەخرێتە باری فەرامۆشکاری ئەی پێغەمبەری هەڵبژێردرا و، کە دوو دەستە و تیرە لە ئێوەی خاوەن ئیمان و باوەڕ بە ناوەکانی بەنوسەلەمە لە خەزرەج و بەنوحارسە لە ئەوس لە ناو جەرگی لەشکرەکەتاندا کە ئارەزوویان بوو بە هۆی بێباوەڕییان بە شەڕ، و یا بێباوەڕییان بە پیرۆزی لەشکری ئیسلام، و یا خزمەت بە دوژمنی، دوور کەونەوە لە شەڕ و وازی لێ بێنن، بەڵام دەبێ ئەوە بزاندرێ لە لایەن هەموو ئینسان بەتایبەت لە لایەن لایەنگرانی ئیسلام و شوێنکەوتووانی پێغەمبەری خودا کە خودا عیزەت و غیرەت و کەرامەت لە خاوەن باوەڕ و ئیمان دانامالێ و وەرناگرێتەوە. جا بەو پێیە خودا هات بە حیکمەت و میهرەبانی خۆی، خۆڕاگری و دان بەخۆدا گرتن و دڵپتەوی پێ بەخشین، لە جێی دڵەڕاوکە و دڵ بێهێزی و لاوازی. دڵ پتەوی و خۆڕاگری و هیوا و هومێدی پیرۆزی و سەرکەوتنی خستە ناو دڵیانەوە، ئا ئەدێرەدایە کە دەبێ بڕواداران جگە لە پشت بەستن و پاڵ وەخودا دان، پیرۆزی و سەرکەوتن بە یەکێک لە بەشە تایبەتییەکانی خۆیان بزانن و بەرچاوی بگرن، واتە هەمیشە بەو هیواوە بڕۆنە پێش و بەربەرەکانی دەگەڵ دوژمن بکەن، چونکە بۆ خودا شەڕ دەکەن بەڵام دوژمنیان بۆ هەوا و ئارەزوو شەڕ دەکەن. ئەو دوو هیوایەش زۆر لێک دوور و جیاوازن، دیارە لایەنگرانی لە سەرەوەی هەموو فەتح و سەرکەوتنێکن.

**سووکەئاوڕێک:**

ئەو ئایەتە وەک لۆمە و سەرکۆنەیەک دەچێ لە مەڕ ئەو دوو تاقمانە کە ویستوویانە لاوازی و شلی لە خۆ نیشان دەن، دە حاڵێکدا خودا یاوەریانە، کێ بزانێ خودای لە پشتە بە هۆی ئیمان و باوەڕێکی کە هەیەتی، نابێ و ناکرێ ڕێگا بدا سستی خۆ ڕۆهێڵێتە نـاو دڵـی پـڕ لە ئـیمان و هیوای، بەڵکە دەبێ خۆی حەواڵەی خودا کا لە هەموو لایەکەوە، وا دیارە ئەوانە کەسانێک بوون لایەنگری شەڕ بوون لە شاری مەدینەدا، ویستوویانە بەو هیوایە هەر لە نیوە ڕێـدا بەرەو مەدینـە وەگەڕێن ئەمما کاتێ ئەو خەیاڵە لە ناویاندا خۆی داکوتا و مەڵۆز کرد، هەر لەڕێوە پێغەمبەر بـۆ ئیحتیات دەستەیەکی لە یەهوودییان کە دەناو لەشکریدا بوون ڕێ پێ نەدان لە ناویاندا وەمێـنن، چونکە نەدەکرا دە شەڕدا ئەوانە ئاگاداری ڕاز و ڕەمزی شەڕ بن و باوەڕیان پێ بکرێ.

دڵ دەیهەوێ بزانێ ئەو دوو تائیفانە کێ بـوون وا ویسـتوویانە سسـتی بـدەنە نـاو دڵیـان و پاشەکشە بکەن لە شەڕ و ببنە لادەر لە ئەمری پێغەمبەر دە حاڵێکدا کە پێغەمبەر دەگەڵیان بووە و باوەڕیشیان پێ بووە. بۆ وڵامی دڵ دەبێ بکوترێ: خودا نەیویستووە بە ئاشکرایی ناویـان بەرێ بەو دەلیلەش خودا ڕووشـکانی کەس حەز ناکـا و نـایهەوێ. ئەو شـتانەی حەواڵە بە نیشـانە و کات و سات کردووە کەوایە دێرەدا بۆ ئەو مەبەستە واتە ناسینی ئەو تائیفـانە، لە هـۆزی ئەنسـار بوون: بەنو سەلەمە لە خەزرەجیان و بەنو حـارس لە ئەوسـیان. بە هـۆی ئەوەی عەبـدوڵڵا بـن ئوبەی لە شەڕ کشاوە بە یەک سێهەم لە لەشکری ئیسلام و ئاواشی ڕاگەیانـد: ئەی عـالەم ئـێمە بۆخۆمان و کوڕمان بۆچی خۆ بە کوشتن بدەین؟ ئەدەوەیدا عمر بن حزم لە ئەنسـاریان شـوێنی کەوت و پێیانی کوت: ئەمن بە خوداو سوێند دەدەم لەو کارە وەگەڕێن خـودا و پێغەمبەرتـان لە یاد مەبەنەوە! لە وڵامدا عەبدوڵڵا بن ئوبەی پێی کوت: ئێمە ئەگەر شەڕمان بزانیبایە شـوێنی تـۆ دەکەوتین. جا ئەدێرەدایە کە ئەو دوو تایفە ویسـتیان لە عەبـدوڵڵای مونـافق ئیتـاعە و پەیـڕەوی بکەن، خودا هاتە هاواریان و لەو هەڵوێستە ناحەزەیان (ئیتاعە لە عەبدوڵڵا) وەیانگێڕێ و پشـتی پێغەمبەر بەرنەدەن و چۆڵی نەکەن.

ابن‌عباس پێی وابووە ئەوانە دە دڵدا گەڕاونەوە، خوداش یاریدەی دان. دەبـێ بڵێـین خـودا ئەو دوو تایفەی دەسنیشان نەکردن و داپۆشین بۆوەی ئێمەی بەنـدەش فێـر بـین عەیبـی کەس ئاشکرا نەکەین.

کابرایەک دێ دەڵێ: خۆ ئەو دوو تایفە بە زاهیری ویستیان لە شەڕ پاشەکشە بکەن و شوێن

عەبدوڵڵا کەون و خۆیان لە تیخی خودا دەن، جا چۆن خودای بێباک دە فریایان کەوت و ڕێی پێ نەدان؟

ئەمەش دەبێ لە وڵامدا بڵێین:: لە قەست و هەڵوێستدا وا هەیە فکری بەڕێوە بردن دەکرێ، وا هەیە فکری پەشیمان بوونەوە دەکرێ، ئەو دوودڵیە نیازی بە ساغ بـوونەوە هەیە بە وەسـیلەی هۆیەک، خوداش بە هۆی بەزەی بە هەزار نەفەرەوە دە بەرابەر سێهەزار نەفەر کافر بزووت بوو بە هۆی گەڕانەوەیان لەو هەڵوێستە، چونکە خودا لە بارەی خاوەن ئیمانان فەرموویەتی: (والـله والیّهما) واتە خودا دۆست و سەرپەرشتی ئەو دوو تایفانەیە.

با ئەوەندەش بڵێین و حاشار نەدرێ: عەبدوڵڵا بۆ سێ کەسان دەکوترێ کە پێیان دەکـوترێ (عبادلە): عبدالله بن عباس، عبدالله بن مسعود، عبدالله بن عمر.

**پاشەدۆ:**

لە بەرجەوەندی و هەڵسەنگاندن و وەزن کردنی ئایەتەکە و تەعبیری تەعبیرگەران وا هەست پێ دەکرێ کە ئەو دوو تایفانە هەڵوێستەکەیان هەڵوێستێکی ناو دەروونی و خەیاڵی بووبێ و لەو بارەوە کەوتبنە خەیاڵ و وتوویژ دەگەڵ خۆیان، وەک ئەوەی: هەر کەس کەوتە ناو گێژاوەیەک ترسی ڕێ دەنیشـێ و دەکەوێـتە دنیـایەکی دڵەڕاوکە و دوودڵـی کە ئایـا سـەر دەکەوم و یـا بەر دەکەوم؟ بەڵام کاتێ بای بە ڕەحمەت و ئومید و هیوا درا لە باڵای هەستەی دەروونـی ، وەخـۆ دەکەوێ و ڕادەپەڕێ و ڕادەسێ و خۆڕاگری دەکاتە کڵی دڵی ئاگری ئەوینداری تێ بەردەبـێ و دایسێنێ، هەچی تەنگانە و ڕەنج و سەختەیە دەیتارێنێ، لە سـەر ئەو ئەساسـە دەبـێ بکـوترێ: جـووڵانەوەی بـای بەزە و حیکمەتـی خـودا دای لە بەژن و بـاڵای داری هیـوا و ئومیـدی ئەو تایفانە، بەرەو خۆڕاگری و قبووڵ کردنی هەم و ڕەنج دەرکەوتنە ڕاژان نەشە و گەشە بە خۆ دان، پشت بە خودا و دەس بە شمشێر ڕاماڵی ترسـیان دا و شـاڵاویان بـردە سـەر دوژمـن، فەتـح و سەرکەوتنیان بە دەست هێنا. بۆ زێدە زانین تەفسیری کەشاف، زمەخشەری، ئایەتی ١٢٢.

بەو بەرهەمە گەیشتین: خۆ وەخـۆ نەگـرتن و بێسـەبری و لاوازی لە تەقـوادا لە پیـرۆزی وەدوورت دەخا، وەک لە ئایەتی ١٢٠دا هەستی پێ کرا، و هەر وا خۆڕاگری و چـوونە پـێش لە تەواو بەرهەمی فەتح و پیرۆزییە، وەک لە ئایەتی ١٢٢دا هەستی پێ کرا، تا ئێرە بەیانی ڕووداو و کارەساتی هەرای ئوحود بوو کرا، بەڵام دڵی بزۆز و نەسرەوتوو چاوەڕوانی ڕووداو و کارەساتی بەدریشی هەر لە بەرچاوە و چاوەڕوانیەتی کەوایە بۆ وەی ئەو دوو شوێنە نـاودارانەی ئوحـود و

بەدر بە کارەساتیانەوە لێیان تێبگەین و بشزانین کامیان لە پێشدا ڕووی داوە، دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ١٢٣ی ئالی عیمران، لەوێ بە باشــی تێــدەگەین، گەرچــی دەڵــێن هەرای بەدر لە پێشــدا ڕووی داوە، کەوایە دەبێ بکوترێ: ئــایەتی ١٢٣ لە بــابەت غەزای بەدرەوەیە کە لە پــێش غەزای ئوحودەوەیە کە باسەکەی لە ئایەتی پێشدا (١٢١)دا ڕاگەیێندرا. سەیر کە:

**وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ فَاتَّقُواْ اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾** ئالی عیمران
**بێ گومان خودا لە هەرای بەدردا یارمەتی دان لەو کاتەدا کە ئێوە لاواز بــوون، کەواتە لە خــودا بترسن بەڵکوو شوکرانەبژێر بن.**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٢٣

بەڕاستی ئەگەر ئــیمان و ئینســاف لەگەڕ نەخــرێن دەســەلمێندرێ کە خــودای تەعــالا دە هاوارەوە هات و یارمەتی بە شــەڕکەرانی ئیســلام دا لە هەرای بەدردا بە کەرەمــی خــۆی ڕەســەر کافرانی خستن و کافری ڕەژێر خستن، دە حاڵێکدا وەک ئەوەی نەدەچــوو لەشــکری ئیســلامی داماو و تێماو و ڕاماو و ناتەواو لە نەفەرات و کەرەسەی شەڕ و ڕووبەڕوو بــوونەوەی دوژمــن، ئەو سەرکەوتنە لوتفی بە ئاشکرای خودا بوو هەم دوژمنی تەزاند هەم یارانی ئیسلامی وە فەخــر و شانازی گێڕا. ئائەدێرەدایە کە ئینسان دەبێ بە هێز و بــازووی خــاڵی لە یــادی خــودا نەنــازێ، چونکە هیچ هێزێک بێ هێزی یــادی خــودا ســەرکەوتوو نــابێ، زۆر هێــز هەن تێــک دەشــکێن بەهێزی بێ‌هێزی لاواز، و زۆریش لاوازی کز لە هێزدا هەن سەر دەکەون. ئەو جەریانە خاڵی لە ڕاز و سوڕی خودا نییە کەوایە ئەی بەندەی خودا لە خودا بترسە و لێی غافــڵ مەبە، لێــی بترســە مانای وا مەزانە زۆری دەکا، مانای وا بزانە کێ دەگەڵی نەبێ ئاوڕی وەسەر نــادا و کێــی دەگەڵ بێ لێی غافڵ نابێ.

**سووکە ئاوڕێک:**

خــودای تەعــالا دێــرەدا بەڵــگە و نیشــانانێک دەخــاتە ڕوو، تــاکوو بە ڕوون و ئاشــکرایی بەرهەمــی پــاڵ وە خــوداوان و خــۆ بەو ســپاردن دەرکەوێ، و هەر وا منەتێکــیش بــێ لە ســەر موســوڵمانان، بەڕاســتی خــودا لەشــکری ئیســلامی لە هەرای بەدردا یــارمەتی دا دە حاڵێکــدا لەشکری ئیسلام لە بابەت نەفەر و پێویستی شــەڕ نــاتەواوتر لەوەی بــوو ســەرکەوتن وەدەســت بێنێ، دەگەڵ دوژمنی تێر و تەواو و تەسەل، جا بۆیە شایانە خاوەن باوەڕان پەرهیزگار بن پــاڵ و

پشت وە خودا دەن، ڕێ نەدەن بە سستی و لاوازی میوانی دڵ و دەروونیان بێ و لە مخـالفەتی پێغەمبەری ڕاستەقینەیان خۆ بپارێزن تاکوو بتوانن شوکرانەی ئەو نیعمەتە بەرچاوەی خودا بکەن کە لە نهێنیدا بە هاوارەوە هات وسەری خستن، ئەوەش باوەڕکراوە و حاشاهەڵنەگرە کە عیززەت و ڕێز و ڕێزداری لە ڕێزدانانی یادی خودادایە، کەرامەتی خودا پێداو لە کەرامەت دانانی خودادا دەدرەوشێتەوە.

لە بەرجەوەندی و هەڵسەنگاندنی ئەو ئایەتە دوو ڕازی بەرچاو هەست پێ دەکرێن:

١. یەکیان لەو دوو شتانە ئەوەیە: چونکە خودای تەعالا بەسەرهاتی ئوحودی بەیان کـرد بە وەسیلەی ئایەتەکانی ١٢١ و ١٢٢ ویستی بە شوێن یاد و باسی ئوحود، یاد و باسی بەدریش بکا، کە هەردووکیان جگە لەوەی غەزایەکی بەرچاو و ناودارن، دەرسی زۆر بەرچاویشیان تێدا دیـارە و دەبیندرێ، یەکێک لەو دەرسانە کە دەبێ لە بیر نەچێ ئەوەیە: موسوڵمانان لە هەرای بەدردا دە نیهایەتی لاوازی و نەداری و ناتەوانیدا بـوون، دە حاڵێکـدا لەشـکری کـافران لەوپەڕی هێـز و تواناداا بوون، جا لە سەر ئەو حاڵەش کە پیرۆزی لەشکری ئیسـلام چـاو نەدەکـرا بە زاهیـری بە سـەر لەشـکری کافرانـدا زاڵ بـوون و سـەرکەوتن، وەک شـتێکی موعجیزەئاسـا دەچـووە، سەرکەوتنی ئەو ڕۆژەی ئیسلام بێ گومان ئەوەمان پێ دەڵێ و ئەوەی لـێ دەکەوێـتەوە عەقـڵەن خۆ بە خودا سپاردن و پشت بە خودا بەستن، کەم و زۆری ئەفرادی ناقۆزێتەوە، بەڵکە ئەو ورە و خۆڕاگرییە و هیوایە دەخوڵقێنێ و دڵی پێ دەدوێنێ کە پیرۆزی بە دەس دێنێ، ئەو فەرمـوودەی خودای تەعالا کە دە ئایەتی ١٢٠دا نیشانی دا زەمزەمەی ئەو ڕاستیەن: سەبر و خۆڕاگری و تەقوا بەرگری دەکا لە زەرەر و فێڵی دوژمن و سەرت دەخا بە سەر ئارەزوو و ئاواتـدا: ﴿وَإِن تَصْـبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لاَ يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا﴾ واتە ئەگەر خۆڕاگر بی و بەتەقـوا بـی، فێڵـی دوژمـن نـاتوانێ زەرەرت لێ بدا.

٢. دووهەمین شت لەو دوو شتانەی کە لە ناو دەروونی ئایەتی ١٢٣دا هەستی پـێ دەکـرێ وەک ڕازێک ئەوەیە: خودای تەعالا ڕازی دەروونی ئەو دوو تایفانە بەیـان دەکـا کە ویسـتوویانە سستی و لاوازی بخەنە ناو دڵیانەوە، زۆر زوو بە هاواریان هات خودا و هەسـتی هەسـتاندن و وەخەبەری هێنان بەوەی پێی فەرموون: ﴿وَاللّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى اللّهِ فَلْيَتَـوَكَّلِ الْمُؤْمِنُـونَ﴾ واتە (نەکە ئەو کـارە ڕێ دەن بـۆ نـاو دڵتـان) خـودا یـاوەر و یارتـانە، خـۆڕاگر بـن و پـاڵ وەخـودا دەن، سەرکەوتن‌و دە ڕێـدایە بەرەو پیـرو دێ. ئەوکـات خـودای تەعـالا ئەو کارەسـاتی ئوحـود و بە

بەسەرهاتی بەدری تەئکید کرد کە دەوێدا (هەرای بەدر) لەشکری ئیسلام لە نیهـایەتی لاوازیـدا بوون کەچی بەو حاڵەشەوە سەرکەوتن و دوژمنیان تێک شکاند بە هۆی یارمەتی خودا، ئێـرەش واتە هەرای ئوحودیش هەر ئاوایە.

دڵ دەیهەوێ بزانێ بەدر نـاوی چییە و بـۆچی پێـی کـوتراوە بەدر؟ لە وڵامـدا دەبـێ ئـاوا بکوترێ: بەدر شوێنێکە خاوەنی ئاو و کانیاو لە نێوان مەککە و مەدینەدا قەراری گرتووە.

هەوەڵین غەزای ئیسلام دە مێژووی ئیسلامدا گۆیا لەوێدا ڕووی داوە، لە سـەر نـاوی بەدر نەزەر و بۆچوونی جۆراوجۆر هەیە، بۆ نموونە ئیمام شەعبی فەرموویەتی: کـابرایەک لە هـۆزی "جهینة" بە ناوی بەدر لەو شوێنە چاڵاوێکی لێ داوە و ئاوێکی ڕەوانی لێ دەردەخا بۆ ڕێبـواران وردەوردە ئەو شوێنە بە ناوی ئەو شەخسە (بەدر) ناو دەردەکا و مەشهوور دەبێ. (تفسیر طبری، ۴۲۰/۳)

عەللامە واقدی فەرموویەتی: ئەو شوێنە لە ڕۆژگارێکی کۆنەوە بەدریـان پـێ کوتـووە هەر بەو ناوە لە ناو عەرەباندا ماوەتەوە. دووبارە هەر عەللامە واقدی فەرموویەتی: هۆی نـاو بردنـی ئەو شوێنە بە بەدر، ئەوە بووە: ئەو شوێنە وەک مانگی شەوی چاردە (بەدر) خڕ و پـڕە بـۆیە ئەو ناوەیان بە سەردا بڕیوە چونکە دە لۆغەتی عەرەبدا بەدر مانگی شەوی چاردە وەرد و شەم ئـاوی ساردە.

هەندێکیش دەڵێن: ئەو شوێنە شیوی بەدر بووە ناوی، دەورانێک شوێنی کاروانی تیجارەت بووە. (روح المعانی، ۳۵۳/۴؛ تفسیر قرطبـی، ۱۹۰/۴) ئەگەر خوازیـاری ناوەکـانیبەدری بـڕۆ و بڕوانە لە معجم البلدان.

دڵ بە پێی ئاگاداری لە مانـای ئـایەتی ۸ی منـافقون دەزانـی «مـؤمن» خـاوەنی "عزّة"ـــە، هەرگیز "ذلّة" ناتوانێ و بۆی نییە خۆی دە موئمیندا نیشان بدا. کەچی خودای تەعالا دە ناو ئەو ئایەتی ۱۲۳ی عیمراندا جوملەی ﴿وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ﴾ وەپاڵداون ئەوە دڵ وەهەڵوێست گرتن دەخا بەو جۆرە بۆچی دە ئایەتی ۸ منافقوندا خاوەن عیزەتن، بۆ دێرەشدا دەکەونە بن باری زیللەت؟

دەبێ حەول بدرێ دڵ لەو ئیشکالە ڕزگار کرێ، بۆ چارە دەچینە خزمەت خاوەنی تەفسیری کەشاف عەللامە زەمەخشەری لەڕێوە بۆوەی بزانین لەو بارەوە نەزەری چۆنە؟

کەشاف دەفەرموێ: "اذلّة" بە واتـای "قلّـة" هـاتووە و "جمـع قلّـة" یـانی ئەوانە دە نەفەردا کەمن، کەوایە ئەو جوملەی ﴿وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ﴾ کە دە قۆناخی حاڵدایە، چەنـد جـۆرە مانـای وەخـۆ

گرتووە، جا بۆوەی دەگەڵمانای ئایەتی ۸ی منافقون دژ بە یەک نەکەون، دەبێ بکوترێ "اذلّة" دێرەدا بە مانای کەمی دە نەفەراتدا و کەرەسەی شەڕیدایە و هەروا ماڵ و سامان و توانایی دە بەرابەر دوژمنی تێر و تەواو و زۆر، چونکە مێژوونووسان فەرموویانە لەشکری موسوڵمانان لەو شەڕ و بەرەنگارییەدا سێسەد و هەندێک بوون بە هەمووشیان یەک ئەسپی سواریان بووە بەڵام لەشکری کافران گۆیا هەزار نەفەر بوون و سەد ئەسپی سوارییان پێ بووە و چەک و چۆڵی زۆریش.

هەندێکیش نەزەریان لەو بارەوە ئاوا داوە خودا کە دەفەرموێ بە موسوڵمانان ﴿وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ﴾ واتە دە حاڵێکدا بە خەیاڵی کافران و موشریکان ئێوە زەلیلن، هەم لە باری نەفەراتەوە هەم لە باری چەک و چۆڵەوە، واتە خودا لە زمان کافرەکانەوە ئەوە بە موسوڵمانان دەڵێ. سەیری ئایەتی ۸ی منافقون بکە تا تێبگەی لە ڕاستییەکەی:

**يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ**

**منافقەکان دەڵێن ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە، بێگومان شان و شکۆدارەکان زەبوون و لاوازەکان لەو شارە دەردەکەن. شان و شکۆ و بەهێزی هەر ئی خودا و پێغەمبەرەکان و ئیماندارانە بەڵام دووڕووەکان نازانن.**

ئەو ئایەتە بە ڕوون و ئاشکرایی ئەوەمان پێ دەڵێ موژدانە: ئەوەی دووڕوو بە خەیاڵیدا دێ هەوایە حیسابی بۆ ناکرێ و مەیکەن ئەوەی ڕاستە و حەقڤە ئەوەیە: عیززەت بۆ خودا و پێغەمبەرەکان و موسوڵمانانە، جا لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ بکوترێ لە بارەی (اذلة) یارانی پێغەمبەر لە ورە و خۆڕاگریدا بەرزن و نانەوێن با کافرەکانیش بڵێن: کەمن و لاوازن لە نەفەرات و کەرەسەی شەڕدا. چونکە فەتح و سەرکەوتن بەر ئەساسی خۆڕاگری و ئیرادە و بەرزی ڕوحە کە ئەوەش پیشەی خاون مافانە، نەک بەر ئەساسی زۆری ئەفراد و ئیمکاناتە. روح المعانی، ۳۵۳/۴ هەمان ئایەت.

جوملەی ﴿فَاتَّقُواْ اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ واتە لە خودا بترسن دەگەڵ پێغەمبەرتان و لە ئیتاعەی پێغەمبەر دەرمەچن، بە تەواوتان شوکربژێرن بن تا خودا بۆتان زیاد کا نیعمەت: چاوتان کرد کە چۆن نیعمەتی خودا دە ئامێزی گرتن و نەیدانە دوژمن.

وەک هەستی پێ دەکرێ بە ئاماژە و ئیشارە لە ناو بەیانی کارەسات و بەسەرهاتی خەزای

ئوحود هیمدادی نهێنی خودا بۆ هەرای بەدر یاد و باسی کرا پاشان بە درێژی هاتە کایەوە بە وەسیلەی ئایەتی ۱۲۳ و هەر ئەو یارمەتی‌دانەی خودا ئەوجار واتە ڕاز و حیکمەتی ناردنی ئەو هیمدادە بەرچاوە کە بریتییە لە ناردنی فرشتان، بەیان دەکا خودا، ئەگەرچی لە لایەن قورئانزانان لەمەڕ ئەو هیمدادە ڕا و بۆچوونی جیاجیا هەیە کە ئایا ئەو یارمەتی‌دانە ڕۆژی بەدرە یا ڕۆژی ئوحود؟ بە هەر حاڵ واز دێنین جارێ لە هەرای قورئانزانان، بۆ تێگەیشتن و قۆزتنەوەی ڕاستی دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۲۴ی ئالی عیمران بەڵکە بتوانین لە وەزن کردن و هەڵسەنگاندنی ئەو بەڕاستی بگەین:

إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَاثَةِ آلَافٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿۱۲۴﴾ ئالی عیمران

**(ئەو کاتە بێنەوە یادت) کە دەتکوت بە ئیماندارەکان: ئایا بەستان نییە کە پەروەردگارتان ئاوا یارمەتیتان بدا، بە ناردنە خوارەوەی سێ هەزار فریشتە؟!**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ۱۲۴**

پێشەکی با ئەوە بزانین بە دڵ هەست دەکرێ و باوەڕیشی پێ دەکرێ کە دەبێ بڵێین: هۆی دابەزینی ئەو ئایەتە پیرۆزە دڵنەوازی و دڵخۆشی‌دانەوەی خاوەن باوەڕانە واتە لەشکری موسوڵمانان کە دەگەڵ ئەوەی کەم و لاوازیش بوون لە هەرای بەدردا لە حاندی نەفەرات و ئیمکانات، بەڵام بە هێز و بە ورە لە دڵدا خودا وەسەری خستن گەرچی یارمەتی خودا لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە ڕاز و سوڕیشی دەگەڕێتەوە بۆ لای خوی، ئەما ئیرادە و ورەی بەرزی ناو دەروونتان بێ بەش نەبووە لەو سەرکەوتنەتاندا. یادی ئەو ڕۆژە بکەوە ئەی پێغەمبەر کە دەتکوت بەو لەشکرە بڕوادارانە: ئایا بۆ ئێوە بەس نییە کە پەروەردگارتان یارمەتی دان و هات بە هاوارتان لەو ڕۆژە سەختەدا بە سێ هەزار فریشتەی ڕەوانەکراو بۆ پاڵ لەشکری شەڕکەر.

دێرەدا قورئانزاناەکان و مێژووناسەکان لە سەر ئەو هیمداد و بەڵێنیەی خودا نەزەری جیاوازیان نیشان داوە بۆ نموونە هەندێک نەزەریان وا دەربڕیوە کە ئەو یارمەتییە دە ڕۆژی هەرای بەدردا بووە بە پشت بەستن بە ئایەتی ۱۲۳ی ئالی عیمران، بەڵام ابن عباس و کلبی و واقدی و مقاتل و محمد ابن اسحاق بە تێکڕایی نەزەریان ئاوا داوە کە ئەو یارمەتییە و وعدەیە بۆ ڕۆژی هەرای ئوحود بووە بە هۆی چەند دەلیل و بەڵگە، وەک ئەوە: ڕۆژی بەدر پێغەمبەر بۆ

ڕۆژی بەدر خەبەری بە موسـولْمانان بە هەزار فرشـتە داوە هەر وەک لە ئـایەتی ٩ی سـوورەی ئەنفالدا ئەو ڕاستییە چاو دەکرێ:

**إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُرْدِفِينَ**

**یـادی ئەو کـاتەش بـکەوە کە هاناتـان دەبـردە بەر پەروەردگارتـان، سـەرەنجام خـودا هـات بە هاناتانەوە کە بێ‌گومان ئەمن یارمەتیتان دەدەم، بە ناردنی هەزار فرشتە یەک لە دووی یەک.**

ئەو ئایەتە شاهیدی دەدا بە هەزار فرشتەی هیمدادی بۆ هەرای ڕۆژی بەدر، بەو پێیە بە ڕەوا ناژمێردرێ سێ هەزار و پێنج هەزار فرشتەی هیمدادی بخرێتە پاڵ ڕۆژی بەدر، بەڵکە سێ هەزار فرشتەی ڕەوانەکـراوی ئـایەتی ١٢٤ی ئـالی عیمـران بـۆ هەرای ڕۆژی ئوحـودە، جـگە لەوەش لەشـکری کـافران بە پێـی مێژووزانـان لە هەرای بەدردا گۆیـا هەزار نەفەر بـووە و لەشـکری موسـولْمانان یەک سـێهەمی ئەو بـووە واتە سێسـەد نەفەر و هەنـدێک بـوون. خـوداش هەزار فرشـتەی بە هـاوارەوە نـاردوون، تـاکوو لەشـکرەکانی کـافر و فرشـتەکان وەک یەک بێـنەوە و سێسەدیش لە لەشکری موسـولْمانان زیـاتر بـێ لە هەزار فرشـتە، لە سـەر ئەو ئەساسـە دەبـێ لەشکری کافر تێک بشکێ. بەڵام دە هەرای ڕۆژی ئوحـوددا ژمـارەی لەشـکری ئیسـلام هەزار نەفەر بـووە و ژمـارەی لەشـکری کـافران سـێ هەزار نەفەر بـووە، بەو دەسـتووره ژمـارەی موسولْمانان یەک سێهەمی ژمـارەی لەشـکری کـافران، وەک هەرای ڕۆژی بەدر، کە کافرەکـان هەزار نەفەر بوون و موسولْمانەکان سێسەد بوون، لەوێشدا موسولْمانەکان یەک سێهەمی کافران بوون، دەیجا لە هەرای ڕۆژی ئوحودیشدا موسولْمانەکان هەر یەک سێهەمی کافران بوون واتە، ژمارەی موسولْمانان هەزار نەفەر، ژمارەی کافران سێ هەزار نەفەر. لەوەیدا بوو خـودای یـار و یاوەری موسولْمانان بۆوەی لەشکری ئیسلام کەمی نەهێنێ لە بەرابەر لەشـکری کـافران، هـات سێ هەزار فرشتەی بۆ ناو موسولْمانان ڕەوانە کرد، تا لەشکری فرشتەکان بە ئەندازەی لەشکری کافرەکان بێ، دەگەڵ زێدە نەفەراتی موسولْمانان. بۆوەی تێکشکانی لەشکری کافرەکان حەتمی بێ بۆ موسولْمانان. دە کات و گەرمەی شەڕەکەشدا بـۆوەی دڵـی موسـولْمانان بەهێزتـر بـێ و هیوای سەرکەوتن زیاتر سۆگە بدا خودا ئەو سێ هەزار فرشـتەی کـردە پێـنج هەزار نەفەر، واتە دووهەزاری دیکەشی وەپاڵ گێڕا، هەروەک ئایەتی ١٢٥ی ئالی عیمـران ئەو ڕاسـتییە دەردەخـا. ئەو زیادە یارمەتییە ئەوە ڕادەگەیێنێ کە ڕۆژی هەرای ئوحود دوژمنان هاتبوونە سەر موسولْمانان کە نابودیان کەن، واتە دەبێ بڵێین دوژمن هاتبووە پێشێ کە خۆی بخاتە ناو ماڵی موسولْمانان

بێ شەرم و شکۆ لە موسوڵمانان، جا دوژمنی ئاوا بێ شەرم و شکۆ دەبێ سزای ئاوای بدرێتەوە. بەڵام دە هەرای ڕۆژی بەدردا دوژمن نەهاتبوونە سەر موسوڵمانەکان، بەڵکە موسوڵمانەکان چووبوونە سەریان.

ئەگەر یەکێک بێ و بڵێ: دەتواندرێ بکوترێ: ڕۆژی هەرای ئوحود فرشتە نەهاتوون و دانەبەزیون بۆ یارمەتی؟ دەبێ لە وڵامی ئەو پرسیارکەرەدا چ بکوترێ؟

دەبێ حەکیمانە و ژیرانە وڵامی ئاوا بدرێتەوە: پێشەکی دەبێ ئەوە ڕاگەیێندرێ: کە دە چۆنیەتی یاریدەدانی فرشتە بە لەشکری ئیسلام بۆچوونی جیاواز هەن، وەک ئەوە، هەندێک نەزەریان ئاوایە کە فرشتە دە شەڕدا هاوڕێی موسومانان بوون، بەڵام هەندێکی دیکە پێیان وایە شەڕکەر نەبوون، بەڵام تیندەر و هێزدەری ڕوحیەی وان بوون، غیرەت و ورەیان پێ داون کە سەرکەوتن دێرەدا بۆوەیە، و لەو لایەشەوە ترس و دڵەڕاوکەیان خستۆتە ناو دڵی کافرەکان، زاهیرەن لە مانای هیمداد ئەوە هەست پێ دەکرێ: کە فرشتەکان دەگەڵ لەشکری ئیسلام بوون، و ئەگەر لەشکری ئیسلام نیازیان پێ بووبن بۆ شەڕ، هاوکارییان بێ بەرگری و بیلامانع بووە، ئەمما هەر خودی بوونیان بۆ قووەت و هێز و تین و گوڕی یارانی کافی بووە و نیازیان بە تێهەڵگلان نەبووە. زۆربەی قورئانزانەکان نەزەریان وا داوە: فرشتە هەر دە هەرای بەدردا دە شەڕ هەڵگلاون، بەڵام دە شەڕی دیدا نەکەوتوونە شەڕ.

و لەو لایەشەوە عەللامە زمەخشەری پێی وایە: هاتنی فرشتە و یارمەتیدانیان بۆ لەشکری ئیسلام بەو مەرجە بووە: کە سەبر و خۆڕاگری و تەقوا پیشەکە لە خۆ نیشان بدەن، ئەودەم یەقین و باوەڕیان لە سەر ئەوە بێ سەرکەوتن نەسیبی وانە، ئائەوە شەرتیان بووە، ئەگەر ئەوان ئەو شەرتە نەپارێزن کە لە لایەن پێغەمبەرەوە پێیان ڕاگەیێندراوە نەهاتنی فرشتە بۆ یارمەتیدانیان کە بەو مەرجانە بووە، هیچ بەدوور نابیندرێ، بۆچی کار بێ شەرت نەیەنە جێ، مەشرووت نایەتە جێ؛ و ئایەتی ﴿أَلَن يَكۡفِيَكُمۡ﴾ کە بە پیتی «لن» ڕازاوەتەوە تەئکیدی ئەو نەفیەیە. واتە پیتی «لن» لەو جێگایەدا ئینکاری ئەو ڕاستییە دەکا کە هیمدای سێ هەزار فرشتە بۆ لەشکری ئیسلام دێرەدا کیفایەت ناکا، یانی تاکوو پێغەمبەر ئاگایی بدا بەیارانی ئیسلام کە ئەوان بە هۆی ئەوە کەم و لاوازن و دوژمنیش زر و تەواون، ناتوانن سەرکەوتن وەدەس بێنن بەو مەرجە نەبێ، خۆڕاگری و تەقوا دەگەڵ ئومیدی سەرکەوتن.

بە کوردی و بە کورتی: کاتێ موسوڵمانان لە هەرای بەدردا بەوە ئاگادار کران کە لەوانەیە

هێز بۆ کافران بێ، تێکچوون و خەجڵان، بەڵام خودای تەعالا وەعدەی هیمدادی سێ هەزار فرشتەی پێ دان، تاکوو موسوڵمانان تەمی ترسێ لە سەر دڵیان ڕاماڵن و باش بزانن هێز و لەشکری کافران زەمینییە، دە حاڵێکدا یارمەتی خودا ئاسمانییە، ئەدێرەدا دەرکەوت کە کافران هیمداد و هێزیان بۆ نەهات، هاتنی لەشکری سێ هەزار فرشتە بۆ هیمداد ڕاگیرابێ بەدوور نازاندرێ. بۆ زێدە زانین بڕوانە لە کەشاف، زمەخشەری، هەمان ئایەت؛ تبیین الفرقان، هەروا دەکرێ بۆ ئەو بابەتە سەیری هەمان ئایەت بکرێ.

وا هەست پێ دەکرێ کە خودای تەعالا بە وەسیلەی ئایەتی ١٢٤ ﴿أَلَن يَكۡفِيَكُمۡ﴾ بە پێغەمبەر دەفەرموێ کە پرسیاری بکە لەو موسوڵمانانەی کە ترسیان ڕێ نیشتووە بە هۆی بیستنی هێزی یارمەتیدەر بۆ کافران، کە ئایا هیمدادی خودا بۆ ئێوە بە هاتنی فرشتە کافی نییە!؟

جا دێرەدا بۆ وەرگرتنی وڵامی پرسیاری پێغەمبەر لە موسوڵمانانی پەشۆکاو و ترساو دەبێ ڕوو بکرێتە ئایەتی ١٢٥ی ئالی عیمران، بۆوەی زانین و لێحاڵیبوون بێتە جێ لەو بارەوە کە ئایا موسوڵمانەکان دابەزینی ئەو ژمارە فرشتانەی خودا ناوی بردن کیفایەتیانە بۆ بەرەنگار بوونەوەی کافرەکان، و یا کیفایەتیان ناکا و دەبێ خودا فرشتانیان زیاتر بۆ ڕەوانە کات؟ ئەوەش ئایەتی ١٢٥ی ئالی عیمران کە شوێنی تێگەیشتنمانە:

**بَلَىٰٓۚ إِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأۡتُوكُم مِّن فَوۡرِهِمۡ هَٰذَا يُمۡدِدۡكُمۡ رَبُّكُم بِخَمۡسَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ**

**بەڵێ، ئەگەر خۆڕاگر و لەخوداترس بن، ئەگەر ئێستەش بەپەلە پەلامارتان بدەن، پەروەردگارتان خێرا بە پێنج هەزار فرشتە لە فرشتەی نیشانەدار یاریدە و یارمەتیتان دەدات.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٢٥

ئەی پێغەمبەر، بڵێ بەو موسوڵمانانەی کە هاتوون بۆ شەڕ و بەربەرەکانی و بەرەنگاربوونی کافران، ئێستێ و ئەوڕۆش کە خۆ وەخۆ بگرن و ئارامیتان بێ و لە خودا بترسێن هەر وەک لە هەرای بەدردا خۆڕاگری و ئارامی و لە خودا ترسانتان لە خۆ گرت و بەجێو هێنا، لێرە لەو شەڕە ئوحودەشدا ئەو جۆرە عەمەل بکەن و پشت لە دوژمن نەکەن سا ئەو قوڕەیشیانە ئێستا بە پەلە بۆتان وەگەڕێن دوای ئەوەی گۆڕەپانی شەڕیان وێڵ کرد و بەجێ هێشت و بەرەو مەککە گەڕانەوە، پەروەردگارتان یارمەتیتان دەدات بە پێنج هەزار فرشتەی نیشانەدار.

وەک زاندراوە لە مێژوونووسانی غەزەواتی دەورانی خۆی، لەشکری کـافرانی بتپەرسـتی مەککە هەر لە یەکەم پێکدادانی شەڕ خۆیان لە بەر هێرشی توندی موسوڵمانان نەگرت و کەوتنە ژێر ڕەهێڵەی شمشێری بێئامانی دڵ پڕ لە ئیمان و باوەڕی بە پیرۆزی، شکان و ڕایانکرد، شوێن و مەیدانی شەڕیان بەجێ هێشت، بەڵام بە داخێکی تەواوەوە کە ئینسان مەگەر بە دەگمەن دەنـا هەر شەڕەخواز و شەڕەپەرەست بووە لەو کـاتە سـەرکەوتنەدا و لەو خۆشـییەدا لە تـاو خۆشـی تاڵان وەسیەت و دەستووراتی پێغەمبەری لێزانی خۆیان لە بیر چووە، جێ سەنگەری خۆیان بە تەمای تاڵان و کۆکردنەوەی ماڵی بەجێماوی کافران بەجێ هێشت و چۆڵ کرد و هـاتن کەوتـنە کۆکردنەوەی تاڵانی بەجێماوی بتپەرستان. جا کاتی لەشکری تێکشکاو و پڕژ و بڵاوی کافران کە ئاوایان دی، موسوڵمانان سەنگەری خۆیان بۆ کۆکردنەوەی تاڵان بەجێ هێشت و کەوتوونە حاڵەتی سەرگەرمی تـاڵان، گـورجێکی هەلیـان قـۆزتەوە و خۆیـان گەیانـدە جـێ سـەنگەری موسوڵمانان و هێرشێکی بەتوندیان هێنایە سەر موسوڵمانان زەربەیەکی کـاریگەر و بەرچاویـان لێدان و زۆریان لێ کوشتن لە پیاوانی بەرز و شەڕکەر بێر و بەوێیانـدا پەرت و پەرێشـان کـردن تەنانەت وەک دەڵێن گیـانی پێغەمـبەریش نزیـک ببـۆوە لە خەتەر، بە هەر حـاڵ بە شـپرزەیی و تێشکاوی هاتن لە دەوری پێغەمبەر کۆ بوونەوە، سەرلەنوێ دەسـتووری تازەیـان وەرگـرت و بە تێکڕایی و دڵگەرمی هجوومیان کردە سەر دوژمن و پشتیان دا بە کێوی ئوحود و بە شەڕ کـردن بەرەو بەرزایی کێوەکە تا خۆیان گەیاندە سەر کێو گرتیان پرزەیـان لە بتپەرسـتان بـڕی و بەرەو مەککە ڕایاننان و هەڵاتـن، بەڵام دووبـارە سـوپای بتپەرسـتان بە تەمـای ئەوەی وەک جـاری هەوەڵ موسوڵمانان خافڵاون ویستیان بەرەو کێوی ئوحود وەگەڕێن، بەڵام کە دیتیـان خەبەردار و وشیارن نەیـانتوانی بە ئامـانج بـگەن، ئـا لەو کـاتەدا بە سرووش لە لایەن خـوداوە پێغەمـبەر ئاگادار کرایەوە بەو شێوەیە: خودا پێی فەرموو: ئەی محەممەد ئەو کاتە وەبیر خۆت بێـنەوە کە بە شەڕکەرانی بەدرت دەکوت جا بەس نییە بۆ ئێوە کە خودای بانی سەر بە ۳۰۰۰ فرشـتە یـارمەتی پـێ دان و سـەری خسـتن، ئەوڕۆش وەک هەمـان ڕۆژی بەدر بڵـێ بە یـارانی شـەڕکەر، خـۆ وەخۆگر و ئارام بن، خودا بە ۵۰۰۰ فرشتەی نیشاندار یارمەتیتان دەدات، جا پێغەمبەر ئەو هەواڵە پڕ لە مژدەیەی گەیاندە هاوالانی کە بە هۆی سەراپا شادی و خۆششی و ورە بەرزییان و جاڕیان کێشا و ئامادەباشی تەواویان نیشان دا کە لە شوێنە حەساسەکانی خۆیـانڕا چـاوەڕوانی دوژمـن بکەن، نەبا بگەڕێنەوە. جا ئەبوسوفیان کە ئاوای لە شکری ئیسـلام چـاو کـرد و دیتـی لەوپەڕی

ئامادەباشی و هورە بەرزیـدان، بڕیـاری ئەو دانەگەڕێـنەوە بـۆ شـەڕ و بەرەنگـاری دەو حـاڵەتە بەرزەی کە لەشـــکری موســـوڵمانان بە خۆیـــانەوە گرتـــووە، بەڵـــکە دەســـتووری ئەوەی دا بە لەشکرەکەی بەرەو مەککە وەگەڕێن و واز لەو بڕیـارە بێـنن کە بە تەمـا هێرشـێکی دیـکە بـوون بیکەن؛ ئەدێرەدا بوو موسوڵمانەکان مژدەی پیرۆزییان دا بە یەکتر و هەر وا هاتنی فرشتەشـیان بە یەکتر ڕاگەیاند.

ئەگەرچی نیاز بە درێژە پێـدانی باسـەکە نەبـوو بەڵام دڵ دانەدەمەزرا و وەقـرەی نەدەگـرت ئەگەر ئاوا جەریانەکەی چاو نەکردبا، تەفسیرەکانی کەبیر و ئەوانــی دی زۆر درێژتـر دوواون لە سەری.

**کورتە باسێک و سووکە ئاوڕێک:**

سوننەتی خودایە کێ بەڕاستی پاڵ وەخودا و پشتی پێ ببەستێ، کەسـی پـێ ناوەسـتێ لەو بارەوە، بێگومانە پیرۆزی بە دەس دێنێ، پێویستی خۆڕاگری ئارامی و هورەبەرزییە، دڵنەوایـی دڵە و شـــوێنکەوتنی دەســـتووراتی ســـەرەوەیە، هەر وەک لە خـــودا و ڕەســـووڵەوە بە یـــاران ڕاگەیێندرا: ئەگەر ئێوە ئەی موسوڵمانەکان ئەلئـان لە هەرای ئوحـوددا خـۆڕاگری و ئـارامی و پارێزگاری لە خۆ بگرن، با بە زاهیریش دوژمنتان بەهێز بێ و هێرشتان بکاتە سەر بۆ وەی تێکو بشکێنێ، وێستا خودا ڕێ نادا ئەوەو بە سـەر بـێ، ئـانەن بە پێـنج هەزار فرشـتەی نیشـانەداری تایبەتی بە هاوارتانەوە دێ، بێگومان خودا ڕاستان و پاکان و چاکان ناکاتە دیل و ژێرچەپۆکەی ناپاکان و ناڕاستان بە مەرجێ ڕاستان پشت لە خودا نەکەن ڕوو بکەنە بێخودایان.

**وەزن کردن و لە سەنگدانێک:**

وەک لە بەرچاوە و حاشاهەڵنەگرە سێ ئایەتمان هەیە ل ەسەر هەرای ڕۆژی بەدر، ئایەتی ٩ سوورەی ئەنفال کە ژمارەی فرشتەکانی هەزارە؛ ئـایەتی ١٢٤ی ئـالی عیمـران هەیە کە ژمـارەی فرشتەکانی سـێهەزارە، ئـایەتی ١٢٥ی ئـالی عیمـران هەیە کە ژمـارەی فرشـتەکانی هیمـدادی پێنجهەزارە؛ بەراوەرد و پێک هەڵکێشان و وەزنکردنی ئەو سێ ئایەتانە چۆنـاوچۆن جێبەجـێ دەکرێن؟

دەبێ بۆ ئەو بەراوەردە و پێک هەڵکێشانیان ئاوا بچینە پێش:

١. خودای تەعالا یارانی پێغەمبەری لە وەهلەی هەوەڵدا بە هەزار فرشتەی هیمدادی ئـاوڕ

وەسەر دان، پاشان لە وەهلەی دوودا بە دووهەزاری ئاوڕ وەسەر دان ئەوە ژمـارەی فرشـتەکانی هیمداد گەیشتە سێ هەزار فرشتە، و دە وەهلەی سێدا کە دەبێـتە وەهـلەی ئـاخر، بە دوو هەزار فرشتەی دیکە هیمدادی وەعد پێ دان، بەو پێیە ژمارەی فرشتەی هیمدادی گەیشتە پێـنج هەزار. لە سەر ئەو ئەساسە ئەهلی بەدر بە هەزار فرشتەی هیمـدادی یـاردە دران وەک لە ئـایەتی ژمـارە ٩ی ئەنفال چاو دەکرێ، و کاتێ موسـوڵمانەکان بە هـاتنی هێـزی کـۆمەکی بـۆ موشریکەکـان خەبەردار کران ترسان وهاڵۆز بوون خودای تەعالا بەوەی منەتی لە سـەر دانـان و پێـی کـوتن مەپەشۆکێن، ئەگەر هێزی کۆمەکی بۆ کافرەکان بێ، ئەمنیش ئێـوە بە سـێهەزار حەتـا بگـرە بە پێنج هەزار فرشتەی کۆمەک و یارمەتیدەر ئاوڕو وەسەر دەدەم. (تفسیر کبیر، ٢٢٥/٨ـ٢٢٦)

لە عەبدوڵڵا بن زوبەیرەوە گۆیا لە ڕۆژی هەرای بەدردا زوبەیر مێزەری ڕەنگزەردی نـاوەتە سەری، فرشتەکانیش بە هەمان مێزەری زەرد هاتوون و دابەزیون. (ابن جریری طبری) بەڵام ابن عبـاس فەرمـوویەتی: سـیمای فرشـتەکانی ڕۆژی بەدر مێـزەری سـپی بـووە و هەروا لە هەرای حونەیندا مێزەری سـووریان لە سـەر بـووە. (ابـن کثیـر طبرانـی، ٤٠٢/١) نەزەری دیـکە هەن و کوتوویانە فرشتەکان بە هەموو ڕەنگ و نیشانە دابەزیون. عەمامە دە ناو هۆزی عەرەباندا باوێکی بەرز و بەرچاو بووە کاتێ لە سەریان داکەوتبێ بە زیللەتیان زانیوە، چونکە لە ناو عەرەباندا بڵیند کردنی پەرچەم و نیشانەی تایبەتی دە شەڕدا داب و سوننەتێکی بەرزی عەرەبی بووە.

دڵ دەیهەوێ ڕاز و حیکمەتی ڕەوانە کردنی فرشتان لەو ڕۆژە ناودارانە بزانـێ و تێـی بگـا، چونکە دەیتوانی بێ ناردنی فرشتە سەرکەوتنیان پێ بدا خودای تەعالا هەر لە ڕاستی خـۆی ورە بدا بە موسوڵمانان و بێ غیرەتی و ترسناکی بدا بە کافران، بێ ناردنی هیمدادی لەشـکرێ؟ بـۆ وڵامی دڵ دەبێ ڕوو بکەینە بارەگای سەرووی هەموو بارەگایان کە بارەگای خودایە چونکە دڵ وەک تێراو و پاراو دەبێ بە دەلایل و نیشانەکان بە هـیچ شـت ئـاوا پـاراو و تێروتەسـەل نـابێ، کەوایە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ١٢٦ی ئالی عیمران:

**وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلاَّ بُشْرَى لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِ وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِندِ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾** ئالی عیمران

**خودا بێجگە لە بەر موژدەدان بە ئێوە و لە بەر ئەوەش دڵتان پێی ئـارام بگرێـت، لە بەر هیچـی تر ئەمەی نەکرد، هیچ جۆرە سەرکەوتنێکیش بەدی نایەت، لە لایەن خـودای زاڵ و کـاربەجێوە نەبێت.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٢٦**

دیارە وەک هەڵن‌سەنگاندووە و وەزنن کردووە ئایەتەکان بابەت لە بارەی ناردنی فرشتە ئاوان هەست پێ کردووە: هەواڵ و وەعدەی ناردنی فرشتەی یارمەتیدەر لە لایەنی خوداوە بۆ موسوڵمانانی شەڕکەر لەو هەرایانەدا تەنیا بە مژدە دێتە بەرچاو بۆ لەشکری ئیسلام تا دڵیان لە دەغدەغە و وەسوەسە و پەرێشانی خاڵی بێ و ئارام بگرێ و داسەکنێ و خۆ وەخۆگر بێ، خۆ ئەوەش یەقینە و حاشای لێ ناکرێ کە جگە لە لایەن خودای بە توانا نەبێ یارمەتی قاتە و دەس ناکەوێ کەوایە دەبێ بکوترێ بە ڕاشکاوی: خودا ئەو هەواڵە ناردنی فرشتەی بۆ موسوڵمانانی شەڕکەر کە ڕایگەیاندووە بێ لە مژدە و ورە پێدان و دڵئارامی و هێز پێدانی دڵ هیجی دی لێ چاو ناکرێ، بەڵام بەڕاستی خودا دڵی پاک بە باوەڕ و ڕاوەستاو لە ئیمانی ویستووە بە تین و پتەو و قایم وقۆڵ کا کە بێباکانە و بە هیوای پیرۆزی بەرەنگاری دوژمن بێ، ڕێی نەدا دوودڵی و ترس سەرنەکەوتن خۆ داخاتە ناو دەروونەوە وەک مۆریانە دڵ گەندەڵ کا، چونکە سەرکەوتن و زاڵبوون تەنیا لە لایەن خوداوەیە. ئەویش بۆ خاوەن باوەڕانی خۆ وەخۆگرن کە خودای بەتوانا پێی بەخشیون، لە سەر ئەو باوەڕە بەرەو پێشەوە.

**پاشەدۆ:**

ئەو فرشتانەی خودای تەعالا ڕاستەوخۆ بە زاتی خۆیان دە پیرۆزی و سەرکەوتندا هیچ نەخشێکیان نییە بەڵکوو وەعدەی ناردنی وان تەنیا دەبێتە هۆی ئارامی دڵ و حەسانەوەی گیانی موسوڵمانەکان، وە ئیللا پیرۆزی و سەرکەوتن تەنیا و تەنیا لە لایەن خودای بەهێز و بەتوانایە لە دوور و لە نزیک لە هەر کات و ساتدا، چونکە هەم عەزیزە واتە بەتوانا و زاڵ بە سەر هەچی حەز بکا و بیهەوێ، هەم حەکیمە واتە چاکترین کار بە چاکترین ڕێدا بەڕێوە دەبا، جا لە سەر ئەو ئەساسە، ئینسان بۆ ئەنجامدان و بەڕێوەبردنی هەر کارێکی بیهەوێ بیکا دەبێ پشت بە هیچ ئیمکاناتێک نەبەستێ لە پێشەوە، بەڵکە دەبێ پاش خۆ تەیار کردن لە ئیمکانات تەوەکول واتە پاڵ وەخودا بدا، چونکە تا خودا هەڵی‌نەسووڕێنێ هیچ ئیمکاناتێک هەڵناسووڕێ، و تا ئەو حەز نەکا هیچ شتێک وەگەڕ ناکەوێ، گەڕانی گەردوون هەر بە خودایە نەک بە ئاو و بایە، سەرکەوتنیش هەر بە ئیرادەی خودایە، نە بە هاوار و هەرا هەرایە، ئەگەرچی کارەکانی خودا لە سەر ئەساسی عیللەت و مەعلوولە.

جوملەی ئایەتی ﴿وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ﴾ وەک ئەوەی دەچێ کوترابێ: (ما جَعَلَـهُ اللـهُ المَـدَدَ وَ

الإمداد إلاّ بُشرَی لَکُم) واتە خودا قەولی هیمداد و یارمەتی نەدا، بێ لە مـژدە نەبـێ بـۆ ئێـوەی موسوڵمان کە فرشتە یاریدەتان دەدەن، کەوایە دەبێ ئاوا بۆ مانای (یمددکم)ی ئایەتی ١٢٥ بچین کە بەڵێ خودای تەعـالا بە وەعـدەی هیمـداد و یـارمەتی وەغیرەتمـان دەخـا کە ئەو غیـرەت و هورەیەش ئەساسی سەرکەوتنە و بەرگری لە بەزینە.

جوملەی ﴿وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكم﴾ ئەو هەستە دەکرێ کە ئەوە جوملەی فیعلیەیە عەتفیشی بۆ سەر (الا بشریٰ)یە کە جوملەی ئیسمیەیە، خۆ دیارە بە پێی یاسای نەحویان عەتفی فێعل بۆ سەر ئیسم بە ناڕەوا داندراوە. بەو پێیە بۆوەی لە ناڕەوا لاماندابێ بۆ سەر ڕەوا، دەبا کوترابا: (إلاّ بشریٰ لکم و اطمینانا)، خێر و کوترابا: إلاّ لیبشّرکم و لتطمئن قلـوبکم) کەوابـێ دەبـێ ئەوە بـزانین و بزاندرێ ئەو ئاڵوگۆڕە بێ ڕاز و سوڕ ناتوانێ سەر بگرێ، ئێسـتێ کە خـودا ئـاوای فەرمـووە و ڕاستییە لە سەر ڕاست و ڕەوا، دەبێ وەشوێن دۆزینەوەی سوڕ و ڕازەکە بکەوین تاکوو تێـبگەین بۆ ئاوا ڕەواترە و چاترە؟

دەچینە لای زانایانی ئادابی نەحویان سەربەخۆ لێنانیشـین و نـاچینە پـێش نەکـا هەسـمان دەنەوە.

نەزەری زانایانی عیلمی نەحو ئاوایان ڕێنوێنی پێ داویـن بـۆ دەرکـی ئەو ڕاز و سـوڕە دوو جۆرە بۆچوون هەیە:

١. یەک لەو دوو بۆچوونـانە ئەوەیە: دە یـاد و بیـری وەعـدەی پێـدراوی هیمـداد لە لایەن خوداوە دوو شت دەکەونە بەرچاو، یەک لەو دووانە ئەوەیە: هیوا و ئومید بە وەعـدەوە بەهێزتـرە بۆ گەیشتن بە مەتڵەب، تا بێ وەعدە، چونکە وەعـدەی یـارمەتی، شـادیهێن و غیـرەتدەرە بە دایەم زەمزەمەی پیـرۆزی دەخـاتە نـاو دڵەوە وەک جـوملەی (إلاّ بشری) ئـایەتی ١٢٦ی ئـالی عیمران.

٢. دووهەمین شت لەو شتانەی سووکنایی دەخەنە ناو دڵ بە وەعدەی خودا ئەوەیە: ئارامی و سووکنایی دڵ بە هیوای وەعدەی خودا دە ڕووبەڕوو بوونەوە دەگەڵ دوژمن، کە ئارامی دڵ و خۆ وەخۆگری دە شەڕدا ئەساس و مەبەستی سەرەکین.

بە کـورتی و بە کـوردی، مەبەسـتی هەوەڵ (الا بشـــری)یە، مەبەسـتی دووهەم (تەمەئنیـنە "ئارامی دڵ")ە جا خۆ ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە لە نێوان ئەو دوو مەتڵەب و مەبەستانە جیاوازی هەیە واتە جیاوازی نێوان "بشری" و "ئیتمینان"، جا ئەگەر بەرجەوەندانە سرنج بدرێتە مەبەسـت

و ئەسڵی کار دەردەکەوێ بە ڕوونی، مەتڵەبی دووهەم کە دڵ ئارامی و خۆ وەخۆگرییە، قـایمتر و بەهێزترە لە مەتڵەبی هەوەڵ کە "بشری"یە، چونکە خۆڕاگری و دڵئارامی مەبەست و ئەساسی سەرەکین بۆ پیرۆزی ل ەشەڕدا، مەبەست لەوەیدا کە حەرفی عیللەت واتە «ل»، خـراوەتە سـەر فیعلی "لیطمئن" هەر ئەوەیە کە دڵئارامی شەرتی شەڕە.

هەندێکیش هاتوون لە وڵامی ئەوەیدا کە دەڵێن عەتفی فیعلی "لتطمئن" بـۆ سـەر ئیسـمی (بشری) ناڕەوایە چونکە عەتفی فیلعە بۆ سەر ئیسم، کوتوویانە ئەوە عەتف نییە بەو دەلیلە واوی لە سەر "لتطمئن" زیادییە و واوی عەتف نییە، تەعبیری ئایەتەکەش ئاوایە (و مـا جَعَلَـهُ اللـهُ إِلاّ بُشری لَکُم لِتَطمَئِنَّ بِهِ قُلوبُکُم) پاشان خودا دەفەرموێ: ﴿وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِندِ اللّهِ﴾ ئامانج و هەدەفی ئەسڵیش دێرەدا هەر پشت بە خودا بەستنە، نەک بە فرشتە، هەر وەک ئـیمان و بـاوەڕی ڕاستینیش پاڵ وە خودا دانە بە دڵ نەک بە کوتەی بێ ناو.

جوملەی (الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ) ئیشارەیە وەلای ئەوەی خودا خاوەنی کەماڵی تواناییە، (حکـیم) ئیشارەیە وەلای ئەوەی کە خودا خاوەنی کەماڵی زانستە، جا کە وا دەزانی ئەی ئینسان خودا ئاوا بەرز و بەتوانایە و نیازی هەچی خاوەن نیازە لەو بێنیازەدا چـارەی دێ، لەوی بەولاوە پشـت بە هەچی ببەستی بێ لەوی، پەنا بۆ هەر کوێ بەری بێ لەوی، دەس دە هەچـی گـری بـێ لەوی، بێگومان بە کە ناگەی بە چارەی کار جگە لەو ناگەی بە مەتـڵەب، خەیـانەتیش بە خـۆت و بە ئەقڵ و هەست و شعوورت دەکەی. بۆ زێدە زانین بڕۆ بۆ لای تەفسـیری کەبیـر باسـی هەمـان ئایەت.

**تیوتیوە:**

بە درێژایی شـەڕ و هەرای ئیسـلام دەگەڵ کـافران لە سـەرەتای زهـووری ئـایینی پیـرۆز و مبارەکی محەمەدی، بۆ سـەرکەوتنی لەشـکری ئیسـلام فرشـتە دابەزیـون، ئەوە ئەو دابەزیـنەی فرشتان ڕاستە و سابیتە و ڕێگـا و جێگـای ئینکـاری نیـیە، بەڵام لە سـەر چـۆن هـاتن و چـۆن هەڵوێسـتیان کە ئایـا دەکەونە شـەڕ، یـا هەر هێـز و غیـرەت دەدەن بە موسـوڵمانان، نەزەری جۆراوجۆر هەیە، تەماشا دەکەین لە سیما و ناوەرۆکی دوو ئایەتی ١٢٤ و ١٢٥ی ئـالی عیمـران دابەزینی فرشتە هەیە و سابیتە بەڵام ڕاستەوخۆ شـەڕ کـردن و تێـوە هەڵگلانیـان دە شـەڕدا لـێ هەست ناکرێ، بەڵکە ئارامی و غیرەت پێدان و خۆ وەخۆگری لەشکری ئیسلامیان لێ هەسـت پێ دەکرێ، جگە لەوەش لەولایەشەوە تـرس و زەلـزەلە و دڵەڕاوکەی لەشـکری دوژمنیـان لـێ

دەتکێ و لێ دیاری دەدا، و هەتا ئەسارەت و زەلیلی و هەڵاتنی بێ ئابڕووانەی کافران دەبیندرێ لە کاتی هاتنی ئەو فرشتانە.

زانایـان بە تێکڕایـی کـۆکن لە سـەر ئەوەی کە لە ڕۆژانـی هەرای بەدر و ئوحـوددا بـۆ سەرکەوتنی موسوڵمانان بە سەر کافران فرشتە دابەزیون بە ڕەنـگ و سـیما و تـایبەتی خۆیـان، ئەگەرچی تەنیا یەک فرشتە لە توانایدا هەیە دنیای دوژمن وێران و نابوود کا، بەڵام دابەزینیـان بە پۆل لە شەڕەکانی هەرای ڕۆژانی بەدر و ئوحوددا ڕازدار و ئەسراراوییە کە گۆیا لە سەر شکڵ و دیمەنی ئینسان لەو دوو شەڕانەدا چاو کراون، هەر وەک هەندێک لە مێژووزانەکـان ئەوەیـان بە یەقین گەیاندووە: شەڕ کردنی فرشتە دەگەڵ کافرە یەقیـنە و ئینکـاری نـاکرێ، گۆیـا یەکێـک لە یارانی پێغەمبەر فەرموویەتی گوێم لە زرمەی لێدانی فرشتە بوو کە لە کـافر و شـەڕکەری دەدا و سەروچاوی کافرەکەم بە شکاوی و خوێناوی چاو دەکرد و دەشمبیست دەو کاتەدا ئەو دەنـگە: (اقدم حیزوم) واتە بۆ پێشەوەی ئەی حیزوم. کاتێ ئەو یارەی پێغەمبەر کە ئەوە بۆ پێغەمبەر نەقڵ دەکا، پێغەمبەریش پێی دەفەرموێ: ئەوە دەنگی جبرەئیل بـووە دە ئەسـپەکەی کە نـاوی حیـزوم بووە خوڕیوە و دەنگی داوە بۆ پێشەوە بڕوا. (تفسیر ابن کثیر، ٢٩٠/٢)

بەڵام ئەبووبەکری اصم ئینکاری دابەزینی فرشتەی بۆ سەرکەوتنی موسوڵمانان کـردووە لە ڕۆژی سەخت و تاڵدا، ئەو بۆچوونەی ویشیان بە ڕەوا دانەناوە زانایانی ئایینی.

سەعد کوڕی مالـک فەرمـوویەتی: لە ڕۆژی هەرای بەدر و ئوحـوددا فرشـتەم دیتـوون کە تیریان دەخستە ناو ماڵی کەوان بۆ موسوڵمانان و حەتا بە منیشـیان تیـر دەدا، لە سـەر شـکڵ و سیمای ئینسانی لاو و ئەوەشم لێ دەبیستن: (ادم ابا اسحاق، ادم ابـا اسـحاق)، واتە تیـر لێـدە ئەبوئیسحاق، بەڵام پاش شەڕ هەرچەند ڕوانیم و بۆی هەڵخولام کە وەیانبینم نەمدینەوە. پاشان ئەو جەریانەم بۆ پێغەمبەر باس کرد و ئەویش دە وڵامما فەرمووی: ئەوە فرشتە بـوون. (تفسـیر بغوی، ٣٤٨/١).

لە سەعد ابن ابی وقـاص نەقـڵە کە فەرمـوویەتی: ڕۆژی هەرای ئوحـود لە لای ڕاسـت و چەپی پێغەمبەر دەمدی دوو جەوان بە جلکی سپی بە توندی شەڕیان دەگەڵ کافران دەکرد، ئەو دوو جەوانانەم نەدیبوون و نەمدەناسین. (تفسیر بغوی، ٣٤٨/١)

جگە لەوانەش دەبیسترا لە کافران دەیانکوت لە ڕۆژی بەدردا: ئەسپی زۆرمان چاو دەکردن بەڵام لە ڕۆژی ئوحوددا ئەوەندە زۆر نەبوون.

کێ پێی خۆشە باوەڕ کا، کێ نـایهەوێ بـاوەڕ نەکـا، چـونکە دەروازەی ئینکـاری لە سـەر ئینسان دانەخراوە. بەڵکە ئاواڵەیە.



دڵ دەیهەوێ ڕازی نـاردنی فرشـتە لە لایەن خـوداوە بـۆ لەشـکری موسـوڵمانان لە کـاتی تەنگانە و هەرادا بزانێ، چونکە خودای تەعـالا ڕاسـتەوخۆ بـێ ئەوەی فرشـتە بنێـرێ دەتـوانێ هەچی هێزی دژە تێکی بشکێنێ و نابوودی کا، کەوایە نـاردنی فرشـتە دەبـێ وای بـۆ بچـین کە سوڕ و ڕازێکی دەبندایە، شوێن ئەو ڕازە کەویـن تـا دەیـدۆزینەوە، بـۆ تێگەیشـتن لەو بـابەتە و وڵامی دڵ دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ١٢٧ی ئالی عیمران کە لەوێـدا بەڵکـوو بتـوانین ئەو ڕازە وەدۆزین:

> **لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُواْ خَآئِبِينَ ﴿١٢٧﴾** ئالی عیمران
> **تاکوو خودا هەندێ لەو بێبڕوایانە لە ناو ببا، یـا سـەرکوت و ڕسـوایان بکـا، سـەرەنجامیش بە سەرشۆڕی و ناهومێدی بگەڕێنەوە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٢٧**

دیـارە ئەوە زانـدراوە و دە عـالەم گەیێنـدراوە کە دە شـەڕ و هەرای بەدردا ٧٠ کەس لەو کەسانەی کە مۆرە و هەڵسووڕێنەری قوڕەیشیان بوون کوژران و حەفتاشیان لێ بە دیـل گیـران، وەک لە جوملەی (أَوْ يَكْبِتَهُمْ)دا هەست پێ دەکرێ، واتە خودایە یا ئەوانە نابوو و دیل و زەلیـل کە؛ جوملەی (فَيَنقَلِبُواْ خَآئِبِينَ) واتە خودایە بێ ئەوەی بە ئارەزووی خۆیان بـگەن؛ بە کـوردی، ئەو پشتیوانیەی خودا بۆ موسوڵمانان بۆ ئەوەیە: پۆلێک لە بێباوەڕان نابوود و لەناو بچـن و یـا ڕسوایان بکات خودا لە بەرچـاوی عـالەم، و بـاقی و پاشـماوەکان بە سەرشـۆڕی و نائومێـدی بگەڕێنەوە.

بە کورتی و بە کوردی: ناردنی فرشتە بۆ لای موسوڵمانان لە شەڕ دەگەڵ کافران بـۆ ئەوەیە بەشێک لە موشریکان لەتوپەت کـرێن یـانی لە هێـزی دوژمـن بەشـێک کەم بێـتەوە بە هـۆی کوشتن و دیل بوونیان بە دەست لەشکری ئیسلام، و هەروا بە سەرشۆڕی و نائومێدی وەگەڕێن و عالەم چاویان کا؛ بەشیان شیوەن و نـابوودی، مانیـان بە سەرشـۆڕی و دامـاوی و زەلیلـی لە بەرچاوی عالەم بێ.

لەفزی (خائبین) واتە نائومێد و بێبەش، فەرقیان دەگەڵ (یأس) واتە فەرقی (خیب و یأس)

ئەوەیە: "خیب" واتە نائومێدی پاش ئومێد و هیوایە بەڵام "یأس" پێش ئەوەیە کە چاوەڕوان بی و هیوات ببێ. جگە لەوەش نەقیض واتە دژی "یأس" ڕجایە، دە حاڵێکدا دژی "خیب" "ظفر"ە.

دڵی بەپرسیار و بزۆز هەر ئان و سات و دەمێک بە دم بیر و خەیـاڵێکەوە دەخـولێتەوە، بـۆ نموونە دێتە سەر ئەو خەیاڵە کە پێغەمبەر هەڵبژێردراو و ڕەوانەکراوی خۆیەتی و خۆشی دەوێ، دەبێ لە سەر ئەو خۆشەویستییەی هیچ دوعا و پاڕانەوەی لێ وەرگرێ و قبووڵی کا؟

جا ئەگەر خۆشی دەوێ بە زاهیری ئەقڵ دەشبێ دوعای قبووڵ کـا، جـا ئەگەر قبووڵیشـی دەکا ئەدی پێغەمبەر بۆچی دوعای نابودی دوژمنانی خۆی ناکـا تـا لە نـاو بچـن و موسـوڵمان وەحەسـێن و ڕاحەت بـژین و لە دەسـتیان ئەمـین بـن؟ و ئەگەر دوعاشـی لـێ قبـووڵ ناکـا و دوژمنانی بە گژدا دەکا و ئازار و ڕەنجی تووش دەکەن، خۆشەویستییەکەی لە کوێدا چاو دەکرێ و دیارە؟

جا ئەو بابەت و مەبەستە بەرچاوە دەبێ پەنـایە بەریـنە بەر ئـایەتی ١٢٨ی ئـالی عیمـران و وردی بدۆزین و وەبپشکنین تاکوو بتوانین ڕازی خۆشەویستی پێغەمبەر بزانین و بشزانین خـودا تا کوێی بە قسە دەکا و ئیجازەی دەدا دەخاڵەت بکا دە کاروباری خودادا؟ ئەوەش ئایەتەکە:

لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ئالی عیمران

**ئەتۆ ئەی محەمەد هیچت بە دەس نییە لەو کارەدا، خودا تەنیا خۆی حیسابە، یا بیانبەخشـێ یـا نەیانبەخشێ و ئازاریان بدات، بێگومان ئەوانە ستەمکارن.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٢٨

بۆوەی مانای ئایەتەکە بە بێ هەڵە و پەڵە تەعبیـر و بەراوەرد کەیـن، پێویسـتە ئەو (الـف و لام)ەی سەر (من الامر)ی ئایەتەکە بناسین، ئایا بۆ جنسە واتە گشـتییە، یـا بـۆ ئەو شـتەیە کە لە پێشدا دیتراوە و خراوەتە ناو زەینەوە (عهد خارجی)؟ چونکە تا حاڵی ئەو ئەلف و لامە نەزانرێ مانای دروستی (امر)کە نازاندرێ کە ئایا ئەو ئەمرە بریتییە لە چی؟ کەوایە دەبێ حـاڵی ئەلـف و لام بزاندرێ.

هەندێک لە زانایانی عیلمی نەحـو نەزەریـان وا داوە کە ئەو ئەلـف و لامە بـۆ جنسـن واتە جنسییە، ئەودەم مانای ئایەتەکە ئاوا تەعبیر دەکـرێ: ئەتـۆ ئەی مـحەمەد دە هـیچ کاروبـارێکی خودادا مافی دەخالەت و ئیختیارت نییە و نەتـدراوەتێ، واتە ئەگەر بـتهەوێ دەخـالەت بـکەی

ناتوانی.

ئەوانەی کە بشڵێن ئەو ئەلف و لامە بۆ جنس نییە، بەڵکە بۆ عەهـدە، واتە بـۆ ئەوەیە کە دە پێشدا زاندراوە و دە دڵدا زەخیرە کراوە، ئەودەم مانای ئایەتکە ئاوا بەراوەرد و تەعبیر دەکرێ: ئەتۆ ئەی محەمەد لەبارەی ئەو کەسانەی کە ئازار و ئەزیەتیان پێ داوی، ناتوانی هیچ دەخالەتێکیـان دە کار و باریدا بـکەی، واتە بـتهەوێ تۆڵەیـان لـێ وەکەی و ئازاریـان دەی و نابوودیـان کەی، ناتوانی بەبێ ئەمر و ئیرادەی من. دیارە دێرەدا ئەو نەزەرەش پەسەندە و نزیک لە ڕاستییە.

دووبارە بۆ وەی بتواندرێ بە باشترین ڕێگادا بۆ لای ڕاستی مانـای ئـایەتەکە بچـین دەبـێ هۆی دابەزینی ئایەتەکەش بە دروستی بزاندرێ و بیزانین، جا ئەودەم دەتواندرێ بێ‌گرێ‌وگـۆڵ چوون بۆ لای ڕاستییەکەی سەر بگرێ، جا لە سەر ئەو ئەساسە دەڵێن: هۆی دابەزینی ئەو ئایەتە چەن نەزەرێکی لە سەرە، وا مەنشوورە کە ئەو ئـایەتە لە سـەر کارەسـاتی هەرای ڕۆژی ئوحـود دابەزیوە، لەو بارەشەوە سێ نەزەر دەبیندرێ:

١. یەکیان ئەوەیە: پێغەمبەر ویستوویەتی دوعای نابودی کـافرانی بە گـژدا هـاتووی بکـا و خودا ڕێی پێ نەداوە،

٢. نەزەری دووهەم ئەوەیە: گۆیا معتبەی کوڕی ئەبی وەقاس زەربەیەکـی کە داوەشـاندۆتە سـەر و ڕووی پێغەمـبەری دە ڕۆژی هەرای ئوحـوددا، کـاریگەر بـووە و برینـداری کـردووە. پێغەمبەر کاتێ خوێن بە خۆیەوە دەبینـێ دەیسـڕێتەوە. سـالم مەولای ابـی حـذیفە ئەو خـوێنە دەشواتەوە. لەو کاتەدا پێغەمبەر دەفەرموێ: (کَیفَ یُفلِحُ قَومٌ خَضَبوا وَجـهَ نَبـیِّهِم بِالـدَّمِ و هـوَ یَدعوهُم الی رَبِّهِم) واتە چۆن ڕزگاری دێ قەومێک کە ڕوخسـاری خۆیـان تـێکەڵاوی خـوێن کەن، دەحاڵێکدا کە ئەو پێغەمبەرەیان ئەوان بۆ لای خودا دەعوەت دەکـا؟ ئەدێـرەدایە پێغەمـبەر ویستوویەتی دوعای نابوودییان لێ بکا، خوداش ڕێی دوعا لێکردنیانی پێ نەداوە.

٣. نەزەری سـێهەم ئەوەیە: لە زاری سـالم کـوڕی عەبـدوڵڵا کە ئەویـش لە زاری بـابی کە عەبدوڵڵا عیمران ناویەتی نەقڵ دەکا کە پێغەمبەر قەومێکی لەعنەت کرد بەو شێوەیە: اللّهُمَّ اِلْعَن أبا سُفیانَ، اللهمَّ اِلْعَنْ الحرث بن هشامَ، اللهمّ العن صفوان بن امَیَّة). ئەو ئایەتە هاتە خـوار تـا ئایەتەکە گەیشتە (او یتوب علیهم). ئەدێرەدایە خودا داوای تۆبەی دەسنیشان کرد کە فەرمـووی: خودا یا تۆبەیان لێ قبووڵ دەکا یا عەزابیان دەدا، ئەتۆ لەو بارەوە هیچ ڕێت پێ نەدراوە.

۴. نەزەری چوارەمین لەمەڕ دابەزینی ئایەتی ١٢٨ لە لایەن زانایانەوە ئەوەیە:

گۆیا کاتێ حەزرەتی حەمزەی مامی پێغەمبەری شەهید دەکرێ تەرمەکەی لە لایەن کافرانەوە بێئیحترامی دەگەڵ دەکرێ. کاتێ حەزرەتی ڕەسووڵ چاوی پێ دەکەوێ، ناڕەحەت دەبێ و دەفەرموێ: ئەمیش بە تۆڵەی ئەو بێئەدەبیەی دەرحەق بە حەزرەتی حەمزە کرا، سێ نەفەر لەوان ئاوا لێ دەکەم، جا خودای تەعالا بۆ بەرگری لەو هەڵوێستەی پێغەمبەری بەرگری کا و مەنعی کا لەو کارە ناڕەوایە، ئەو ئایەتی ١٢٨ی بۆ دابەزاند.

قفّال کە یەکێکە لە زانایان فەرموویەتی: هەموو ئەو کارەساتانە دە هەرای ڕۆژی ئوحوددا هاتوونە جێ، و ئەو ئایەتەش هەر لەو بارەوە هاتۆتە خوار. جا بۆ هەر لایەکیانی حەواڵە دەی ئەو ئایەتە دەگونجێ.

هەندێکیش لەو باوەڕەدان کاتێ موسوڵمانان لە بابەتی نەزم و دەستوور بە پێچەوانەی دەستووری پێغەمبەر جووڵانەوە و تێشکان، پێغەمبەر ویستی بۆ ئەو لادەرانە لە دەستوور نەفرین بنێرێ، خوداش بە وەسیلەی ئەو ئایەتە مەنعی کرد. بەڵام ابن عباس ئاوا دەفەرموێ: پێغەمبەر ویستی بۆ ئەو موسوڵمانە بەزیو و تێکشکاوانە داوای لێخۆش‌بوون بکا لە خودا بۆیان، خودا ڕێی پێ نەدا بە وەسیلەی ئەو ئایەتە.

نەزەرێکی دیکەش هەر لە بابەت دابەزینی ئەو ئایەتە هەیە بە پێچەوانەی هەموو نەزەرەکانە، وەک ئەوە امام مقاتل فەرموویەتی: هیچکام لەو نەزەرانەی لە بابەت دابەزینی ئایەتی ١٢٨ کوتراون وا نین، بەڵکە دابەزینی ئەو ئایەتە لە بابەت کارەساتی "بئری معونە"یە، جەریانەکەش بە کورتی ئاوا بووە:

پۆلێک لە منافقان داوا لە حەزرەتی ڕەسووڵ دەکەن کە تیعدادێک لە قورئانزانەکان و حافیزانی قورئانیان بۆ لا بێنرێ تاکوو فێری قورئان بن لێیان، پێغەمبەریش ٧٠ نەفەر لە حافیزانی قورئان و قورئانزانانی باشیان بۆ دەنێرێ. بەڵام ئەدێرەدا دەردەکەوێ کە دوو ڕوو بە دایمە دە کەلێندایە و لە هەل دەخەفتێ لە موسوڵمانان. دووڕووەکان ئەو قورئانزانانە بەتێکڕا شەهید دەکەن، کاتێ پێغەمبەر ئەو خەبەرە دڵتەزێنەی پێ دەگا بە تووندی ناڕەحەت دەبێ و حەتا بە درێژایی یەک مانگ دە نوێژێدا دوعای خراپی بۆ دەناردن و گۆیا دوعای قنووت بۆ دڵئارامی پێغەمبەر و یارانی دە نوێژدا دەخوێندرا. و پاش یەک مانگ لە واقعەکە ڕابرد خودا ئەو ئایەتی ١٢٨ی بۆ تەسکینی دڵ دابەزاند. (روح المعانی، ٣٦١/۴؛ تفسیر کبیر، ٢٣٢/٨-٢٣١)، هەمان ئایەت)

**پاشەدۆ:**

ئەو ئایەتی ١٢٨ ئەگەر ورد دابیژرێ و لە کەو درێ چەند ڕازێکی بەرچاویان تێدا چاو دەکرێ: بۆ نموونە:

١. ئەو ئایەتە پێمان دەڵێ پێغەمبەر زانستی غەیبی واتە نهێنی نییە، ئەگەر بیبا وای دەکرد ڕێ نەدەدا ددانی مبارەکی بشکێ بە دەستی کافران، یا مامی بەو شێوەیە شەهید بکرێ.

٢. هیچ پێغەمبەرێک ناتوانێ ڕاستەوخۆ زەرەر بگەیێنێ بە کەس.

بە کوردی، قازانج و زەرەر پێ گەیاندن لە دەستی کەسدا نییە تا پێغەمبەران و فرشتەش، کێ پێی وانەبێ دۆڕاوە.

٣. مەبەست لە تەبلیغ واتە ڕاگەیاندن ئەوە نییە کە حەتمەن گوێگر دەبێ وەریگرێ و قبووڵ بێ، بەڵکە دەبێ موبەلیغ واتە ڕاگەیێنەر و وێژەر و ڕێنوما لە سەر ئەنجامی ئەرک و وەزیفەی خۆی بێ کە وێژەرییە و ڕێنومایییە. کاری عەبد، عەبدایەتییە نەک هیدایەت چونکە بە دەست خودایە هیدایەت.

٤. بە پێچەوانەی باوەڕی ئەهلی خورافات، ئاشکرا بوو کە پێغەمبەرانیش بەشەرن هیچکامیان خاوەنی ئیختیارات و قودراتی خوداییان نییە.



وەک دەبینین خودای پاک و بێهاوتا بە وەسیلەی ئایەتی ١٢٨ مالکیەتی خۆی لەسەر عەبدان و تۆبە پەزیری ئینسان بەیان کرد و ڕایگەیاند، ئەوجار بۆ ئەوەی تەئکید و تەسبیتی بکات و بەندەکانی خۆشی تێگەیێنێ لەوەی کە خوایە خاوەنی بەتەواوی مڵک و فەرمان، و مڵکایەتی ئاسمان و زەوی هەر ئی خودایە و شایان بە خودایە، و فەرمان و دەستوور و حوکمڕانی کائیناتی ئاسمان و زەوی و ئائەوانەی دە ناویاندایە، هەر ئی خودایە و شایان بە ئەوە، زەرەر و قازانج لەو بابەتەوە تایبەتی خودایە، کێ عەزاب دا و کێ ببەخشێ هەر خودایە، و کێش خۆی پێ بسپێرێ و پشتی وێدا ئاوری بەخێری وەسەر دەدا، و کێش بە سیلەی چاو بڕوانێتێ و گورگەئاوڕانی وەسەر بدا، ئەو کەسە ناتوانێ لە ئاوات و ئارەزوو و نیازەکانیدا سەرکەوتوو بێ، بۆ پشت ڕاست کردنەوەی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٢٩ی ئالی عیمران، تاکوو بتوانین لە مەبەست حاڵی بین:

**وَلِلّه مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ يَغْفِرُ لِمَن يَشَاء وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاء وَاللّهُ غَفُورٌ**

**رَّحِيمٌ ﴿١٢٩﴾ ئالی عیمران**
**هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە ملْکی خودایە، ئەو کەسەی خۆی کەیفی لێ بێ، عەفوی دەکا، ئەوەش کە کەیفی لە سەر نەبێت، سزای دەدات، خوداش لێبوردە و دلۆڤانە.**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٢٩

لە هەڵسەنگاندن و سەرنجێکی وردبینانە لە ناو دەروونی ئەو ئایەتە پیرۆزە بە ڕوونی هەست بەوە دەکرێ کە خودای خاوەنی ملْکی ئاسمان و زەوی و ئەوانەی وا دەناویاندایە دڵنیایی ڕوحی پێغەمبەر دەداتەوە و دەکات بەوەی: کە ئەتۆ ئەی پێغەمبەر بەرپرس و لێپرسراو نی بەرابەر بە هەڵاتووان وڕاکردووانی شەڕ و هەرای ڕۆژی ئوحود، تاکوو خۆتی لە سەر نارەحەت کەی بەو ئەندازەی لێیان بکەویە دوعا لێکردن.

ئەگەر بوێرین و جورئەت بە خۆ بدەین و لە لۆمەی لۆمەچییان نەترسین و ئەقڵیش سەرکۆنە نەکەین، ئینسافانە ئەو ئایەتە وەبەر تیشکی ئەقڵ و نووری هەست بدەین، ئایەتی ﴿يَغْفِرُ لِمَن يَشَاء وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاء﴾ واتە کێی بوێ دەیبەخشێ و لە تاوانی دەبووری، و کێی بوێ و ئیرادە بکا عەزابی دەدا؛ چاکەی بێ و یا خراپەی بێ، چونکە هەرچی هەیە ملْکی ئەوە، هەچی لێشی بکا لە ملْکی خۆی دەکا، لە ملْکی غەیری ناکا و بۆی ڕەوایە، جا لە سەر ئەو ئەساسە دەتوانێ خودا بە حوکمی خودایەتی خۆی و خاوەنیەتی هەچی هەیە، هەچی کافرە و نافەرمانی ئەوی کردووە بیبەخشێ و حەواڵەی بەهەشتی کا، باکیشی لە کەس نەبێ و نەترسێ، و هەروا دووبارە دەشتوانێ هەچی نزیکان و ڕاتسان و فەرمانبەرانی ئەون تووشی عەزابی دۆزەخیان کا، کەسیش نەتوانێ بەرگری کا و نەهێڵێ؛ ئەو ئایەتە ئەو ڕاستییە تەئید دەکا ـ حاشای لێ ناکرێ و ڕێش لە تەئویلات ناگیردرێ، کەوایە بە ڕوونی دەتواندرێ بکوترێ: ئیتاعەی بەندە لە خوداوەیە تاوانیش هەر لە خوداوەیە، واتە هەر دوو عەمەلی بەندە سەرچاوە لە ئیرادە و هیدایەتی خوداوەیە، و هەر وا چاکە و چاکەکاری بەندە هیچ نەفعێک بە خودا نادا و هیچ لەو زیاد ناکا و هەروا تاوانی بەندە ناتوانێ هیچ زەرەرێک بە خودا بگەیێنێ و ناشتوانێ هیچ ناتەواوێک تووشی خودا کا. ئەوە مانای ئایەتی ﴿يَغْفِرُ لِمَن يَشَاء وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاء﴾یە. تفسیر کبیر ئایەتی ١٢٩

دەکرێ موسوڵمان هیوا و ئومێدێک دە خۆیدا جێ وەکا بە هۆی ئایەتی: ﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾

**ئاوڕێک وەسەر ناودڵی ئایەتەکە:**

ئەگەر یەکێک لە ناکاو هات و کوتی: ئایا بۆ مەگەر خودا نەیفەرمووە و بە سبووت نەگەیوە: کە خودای خاوەن عەدڵ و داد لەو کەسانەی کە هەتا دەمرن هەر کافرن و لە سەر کوفری خۆیان بە بەردەوام هەر دەمێننەوە خۆش نابێ؟! و هەروا مەگەر وەعدەی نەداوە پێغەمبەران و فرشتان بە پێی بەجێهێنانی ئەرکی خۆیان لە عەزاب بیانپارێزێ؟

بەڵێ، دەبێ بکوترێ لە وڵامدا: خودا وەعدی داوە لەوانەی ئیتاعەی دەکەن و بێ ئەمری ناکەن ڕەحمەتی خۆیان بە سەردا بڕێژێ و لە عەزاب وەدووریان خا، ئەمین بن لە عەزاب، ئەمما مانای ئەو ئایەتە ئاوایە: کێی واز لێ بێ عەزابی دەدا، کێی واز لێ بێ عەزابی نادا، حاشای لەو وەفایە ناکرێ، بەڵام دەبێ ژیرانە لەو ئایەتە و هەوتای ویش زۆر بە وردی سرنج بگیردرێ، تا دڵ و ئەقڵی سالم دادەسەکنێن و لە پرسیار دەکەون، و بۆ وەی قەناعەت پەیدا کەین هەم لە سەر توانایی خودا و هەم لە سەر عەداڵەتیش ئاوا بۆ مانای ئایەتەکە بچین: خودا هەموو شتێکی لە توانادا هەیە و زاڵە بە سەریدا، ئەمما کاری واش ناکا کە خیلافی وەعدەی خۆی بێ و دووریش لە ئەقڵ و ئینساف و عەداڵەت بێ، ئەو ئایەتە ئیسباتی توانایی خودا دەکا بۆ هەچی بیهەوێ بیکا، نەک ئەوە چاکان بە خراپ وڵام داتەوە و ناپاکانیش بە چاک جەزا بداتەوە، چونکە ئەو عەمەلە زوڵمە و زوڵم نیشان دەدا، خۆ خوداش لە زوڵم دوورە و بەرییە.

لە وەزن کردن و بەراوەردی ئایەتەکانی ڕامانبردن بەو نەتیجە و بەرهەمە گەیشتووین هەر وەک خودای تەعالا بەیانی ئەو نیعمەتانەی داویەتی بە موسوڵمانان شەرحی دا و ئاشکرای کردن لە قەبیلی شارەزایی لە سەر ئەمری دین و باقی کارەکانی کۆمەڵایەتی، دەشیهەوێ ئەو شتانەش کە تێهەڵکشاوی ئومووراتی دینن وەک ئەمر بە چاکە و بەرگری لە خراپە و تەشویق و تەرغیب و لۆمە لە سەر خراپە، زۆربەی قورئانزانەکانیش هەر ئاوایان نەزەر داوە، جا لە سەر ئەو یاسا و نیزامە ڕێکوپێکەی خودا دەبێ ئەوە بسەلمێنین کە خودا کاران دە جێی خۆیدا دەکا و دەیانخاتە ڕوو. کە وابێ بۆ ئیسباتی ئەو مەتڵەب و بابەتە ئەساسییە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ١٣٠ی ئالی عیمران تاکوو بتوانین بە تێروتەسەلی لەو ئامانج و مەبەستەی تێیدا حاڵی بین:

**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ الرِّبَا أَضْعَافًا مُّضَاعَفَةً وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٣٠﴾**

ئالی عیمران

**ئەی ئەوانەی بڕوا و ئیمانتان هێناوە، چەند بەرابەر سوود مەخۆن، لە خودا بترسن بەو هیوایە ڕزگار ببن.**

سوودخۆر لەوە ترسی هەیە فەقیر بێ، بۆیە خەڵک بەرەو فەقیری دەبا، بەڵام ئەو خەیاڵە باتڵەی ئەو بە پێچەوانەیە، ئەو فەقیر دەبێ و بێ ئەنوا، خەڵک ساماندار دەبێ.

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٣٠**

ئەی ئەوانەی دە بڕواتاندا ڕاستن و ڕاستیش دەکەن بڕواتان هێناوە، بۆوەی ڕاستیتان وەڕاست گەڕێ و شاهید بێ لە سەر ڕاستیتان، دە مامەڵەدا سوود وەرمەگرن و مەخۆن واتە یەک بە دوو مەدەن تا چەند بەرابەر بێ، یانی چەند بەرابەر مەدەن بە چەند بەرابەر، واتە چین لە دوای چین مەڕۆنە پێش تا ماوەی ئەو قەرزەی داوتە بە برای موسوڵمانت درێژ بێتەوە و لە بنیدا گیر بخوا و نەتوانێ لە بنیدا هەستێتەوە لە بەر زیاد بوونی. بۆ نموونە: دوو تمەن بۆ ماوەیەک قەرز بدا بە یەکێک، کاتێ ماوەکە تەواو بوو وا هەڵکەوت کابراش نەیتوانی قەرزەکە وەدا، ئەویش ماوەکەی بۆ درێژ کاتەوە بەو مەرجەی پارەکە لە سەر کابرای زیاد دەکا، هەر وا بەو شێوەیە پێوە دەڕوا تاکوو ئەو تمەنەی کە دراوە بە قەرز بە کابرای نەدار و هەژار، دەکاتە دووسەد هەزار تمەن. تازە هەژار لە ژێر هەژاری دەرناچێ و ڕزگاری نایە، جا لە سەر ئەو ئەساسە کێ ڕاستە لە ئیمان و باوەڕیدا، لە هەژار کردنی خەڵک وەپرینگێ و خۆ بەدوور بگرێ، دەنا باوەڕی پێ ناکرێ و بێ شاهیدیشە لە سەر ڕاستی ئیمانی بەڵکە شاهیدی سوودخواردنە لە سەر خواری و ناڕاستی. جا کە وایە لادەن لەو سەودا و مامەڵەیە، تاکوو ڕزگارتان بێ و لە ڕۆژی ئاخرەتیشدا داماو و چاوشۆڕ نەبن.

خودای تەعالا بۆیە پاش هەرا و شەڕی ئوحود هاتە سەر باسی سوود (ڕبا) تاکوو ئینسان تێبگا و بزانێ کە چۆن شەڕ و هەرا خەڵک لە ناو دەبا بەتایبەت چینی هەژاری بێنەوا دەبەر پێیاندا دەپلێخێتەوە و بێ سەروشوێن دەچێ، ئاواش هەرا و شەڕی سوود خەڵک لە ناو دەبا و ڕۆی دەبا لە زۆنگی هەژاریدا.

**ئاگاداری:**

ئاگادارییەک لەبابەت نەزم و دەستووراتی قورئانی لەمەڕ فێر کردن و بارهێنانی ئینسانی بۆ ئەنواعی ئوموورات و ئەحکاماتی جۆراوجۆر، قورئان کێ زۆری هەڵسەنگێنێ و ئەودیواودیوی

کـا ئەو یاسـایەی لـێ وەدەس دەکەوێ: قورئـان دێنـێ بـۆ حـاڵیبوونی ئینسـانی لە هەوەڵەوە یاسایەکی کورت و ڕەوان وەک بناغەی کار دادەڕێژێ و دادەمەزرێنێ، پاشان دەسـتوور دەدا کە دەبێ بە پێی ئەو یاسایە هەڵسوکەوت بکرێ، جا ئەوجار ئەو حوکمەی کە دەیهەوێ یـادی بـدا دایدەتەقێنێ و لە کەو و داژگیر و هێڵەکی دەدا، بە شێوەیەکی جـوان و ڕێکوپێـک کە هەمـوو بارەکانی دروست و هەڵە و ئێشـتیبا و نـاتەواوی ئەو حـوکمە نیشـان دەدا و ڕایـدەنێ، و هەروا ڕێگـای خۆپـارازتن لە هەڵە و چەوتەکـانی نیشـان دەدا، و ڕێگـای بـاش و پەسـەندەکانی دادەمەزرێنێ، لە سەر ڕاست ڕۆیشتن ئاخر قسەت پێ دەڵێ و هیوادارت دەکا بە پاداشی شایان و پەسەند، و لە سەر خوار و خێچ ڕۆیشتنت لۆمەت دەکا و هەڕەشەت لێ دەکا، بە سزایەکی پڕ لە ئێش و ژان.

بە کـورتی و بە کـوردی، هەر چـوار لای حـوکمەکە دەورە دەدا، تـا بە تەواوی جـوان و ناحەزی و ناتەواوی و تێر و تەواوی ئەو حوکمە بخرێتە ڕوو حاشای لێ نەکـرێ، وەک هـێلکە سپی دەکا و لە بەردەستانی ڕادەنێ، تاکوو کەس نەتوانێ ڕۆژی حیسابێ بەهانە بگـرێ و بڵـێ: ئەمن حاڵی نەکراوم و کەس نەهاتووە بڵێ ئەو شتە ئاوایە.

بۆ نموونە ڕبـا واتە سـوود بە چـوار قۆنـاغ بە تەواوی خـرایە ڕوو و دەرخـواردی ئەقـڵ و شعووری ئینسانی درا:

١. قۆنـــاغی یەکەم بە وەســـیلەی ئـــایەتی ٣٩ی ســـوورەی ڕۆم دە ئینســـانی گەیانـــد دنیاپەرستەکانی لاواز و خەیاڵ خاو وا بیـر دەکەنەوە کە سـەروەت و دارایـی بە سـوودخواردن زیادە دەکا و دەڕواتە سەرێ، بەڵام لە لایەن خودای ڕزقدەر و زانا بە هەوەڵ و ئاخری کار، ئەو سامان و داراییەی کە سوودی دەکرێتە هەوێن هەر کەمە و کەم دەکـا و زیـاد ناکـا، بـۆ بـاوەڕی سەیری ئایەتەکە بکەن:

**وَمَا آتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَ فِي أَمْوَالِ النَّاسِ فَلَا يَرْبُو عِندَ اللَّهِ وَمَا آتَيْتُم مِّـن زَكَاةٍ تُرِيـدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ ﴿٣٩﴾** روم

**ئەوەی بە ناوی سوود دەیدەن بۆ ئەوەی پیت و زێدە بکەوێتە ماڵی خەڵـک، لە لای خـودا زیـاد ناکا و فڕی تێناکەوێ بەڵام ئەو زەکـاتەی کە لە بەر خـودا دەیـدەن، کەواتە ئـا ئەوانەن خـاوەن پاداشی چەند بەرابەرن.**

ئەو ئایەتە ئەوەمان پێ دەڵێ کە زەکات و بەخشینی پاک و بێڕیایی دەبێتە هۆی زیاد بوونی

دارایی.

٢. دووبارە قۆناغی دوو هاوار دەکا سوودخۆری ناڕەوایە و داب و نەریتی ناحەزی هـۆزی یەهوودە، دووری لێ بکەن؛ بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە سەیری ئایەتی ١٦١ی نیساء بکەن:

**وَأَخْذِهِمُ الرِّبَا وَقَدْ نُهُواْ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا**

**هەروەهاش بە هـۆی سـوود وەرگـرتنەوە کە بێگومـان لێیـان قەدەغە کرابـوو خـواردنی مـاڵی خەڵکیش هەر وا بە ناحەق، ئێمەش سزایەکی بەژانمان ئامادە کرد بۆ ئەوانەیان کە بێبڕوان.**

ئەو ئایەتە پیرۆزەش هەر پێمان دەڵێ خۆ لە قەرەی سوودخۆری مەدەن.

٣. قۆنـاغی سـێ لە سـەر حەرامـی سـوود: ئەوەیە کە خـودای تەعـالا ڕاسـتەوخۆ و بە ئاشکرایی دە ئایەتی ١٦١ی سوورەی نیساءدا نەهی لە سوودخۆری دەکا.

٤. قۆناغی چوار لە بـابەت حەرامـی سـوودخواردن، زۆر بە تونـدی خـودا دەیڕوانێتـێ و هەڕەشە لە خواردنی دەکا و دایناوە بە شەڕ کـردن دەگەڵ خـودا، واتە ڕیبـاخۆر شـەڕی دەگەڵ خودایە، ئە بەو بەشەی دەکوترێ ڕیبای فاحش، واتە زۆری دەمدرێژی تێدا بە کار بردراوە، دەبـێ هەسی بدرێتەوە و لە دەمی درێ. بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتەکانی ٢٧٩ و ٢٧٥ی بەقەرە تا بە چاکی تێبگەین لە حەرامی ڕیبا:

**الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا فَمَن جَاءهُ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِ فَانتَهَىَ فَلَهُ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُ إِلَى اللّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٧٥﴾**

**ئەو کەسانەی کە سوود دەخۆن نایەنە دەرەوە لە گـۆڕ، وەکـوو ئەو کەسـانە نەبـێ کە شـەیتان دەستی لێ وەشـاندوون، ئەمەش هەر لە بەر ئەوەیە سـوودخۆرەکان وتیـان بێگومـان کـڕین و فرۆشتنیش هەر وەکوو سوود وایە، کەچی خودا کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە و سـوودی بە حەرام دانـاوە، هەر کەس کاتێـک پەیـامی خـودا لەم بـارەوە گەیـیە دەسـتی و وازی لە سوودخواردن هێنا هەموو دەسکەوتی ڕابردووی ئی خۆیەتی، کاروباریشـی لای خـودایە، بەڵام هەر کەس بایدایەوە بۆ سوودخواردن و حەڵاڵ کردنـی، ئەوانە هـاوڕێی ئـاگرن هەتـا هەتـایە لە نێویدان.**

**فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾**

**ئەگەر دەس‌بەردار نەبن و دەس لە سوود خواردن هەڵنەگرن، دڵنیا بن و بزانن ئەوە شەڕتان لەگەڵ خودا و پێغەمبەرەکەیدا بەرپا کردووە، بەڵام تۆبەتان کرد، سەرمایەکەی خۆتانە، بەڵام بەو شێوەیە: نە ستەمێ لە کەس دەکەن و نە ستەمێکیشتان لێ دەکرێت.**

ئەو چوار ئایەتە پیرۆزانە (٣٩ی ڕۆم، ١٦١ی نیساء، ٢٧٩ و ٢٧٥ی بەقەرە) ئینسان پلە بە پلە شارەزا دەکەن لە سەر حەرامی ڕیبا و هیدایەتی دەدەن بۆ خۆپارازتن لە خواردنی بە شێوەیەکی حەکیمانە، هەر وەک منداڵێک کە بۆوەی لە مەمک خواردن بکرێتەوە یەک سەرە لە مەمک ناگیرێتەوە بۆوەی تووشی ئازار و خەفەت نەبێ، وردە وردە و پایە بە پایە لە مەمک دەکرێتەوە، هەر کاتەی بە شێوەی حەکیمانە، هەوەڵ دایکی پێی دەڵێ فخەیە مەمە، مەیخۆ، ها ئەو دەنکە خورمایە بخۆ؛ تا عادەت بە منداڵەکە دەگیردرێ، مەمکێکی لێ دەستێندرێ لە هەوەڵەوە، بەو شێوە حەکیمانە، ئەوجار منداڵەکە بە عادەت‌دان بە خواردنی شتی تایبەتی مەمکێکی لە بیر دەبرێتەوە، بەرەو دەس‌بەرداری بە یەکجاری لە هەر دوو مەمک هان دەدرێ بە خواردەمەنی تایبەتی، تا وای لێ بە سەر دێ لە هەر دوو مەمکەکانی بە یەکجاری واز دێنێ.

خودای تەعالا بۆ دەست‌بەرداری ئینسان لە کاروبارەکانی کە شەرع و یاسای عادەتی پێیان ڕازی نییە، پایە بە پایە دێتە پێش بۆ تەرکی کارەکە، وەک دەس‌بەرداری لە سوود خواردن، ئەگەرچی کات و دەوران وایان ڕازاندۆتەوە سوود خواردن، هاتووە بێتە بەشێک لە ئەحکامات، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ناشیگەری هەڵسووڕێنەرانی جامعە و کە نازانن جامعە بە ڕێگای دروستدا بەرن، دەڵێن سوودی بانگان کارمزدە و حەرام نییە.



دڵ دەیهەوێ بە تێر و تەسەلی لە مەبەستی ئەو ئایەتە حاڵی بێ: ﴿أَضْعَافًا مُّضَاعَفَةً﴾، هەرچەند لە سەر ئەساسی یاسای عیلمی سەرف وشەی (اضعاف) کە جمع‌القلەیە دەبێ لە سەر کەم بدوێ، کەچی دێرەدا بە مانای زۆرە، مەبەست ڕێبازی زۆرە، واتە چەند بارتەقا و چەند بەرابەر مەخۆن، ڕازی ناوبردنی ئەو وشانە دەبێ دێرەدا ئەوە بێ: زۆر کاتی وا هەیە سووخۆر لە سوود خواردندا ڕۆدەچێ بە ئەندازەیەکی وا کە شەشدانگی خەیاڵاتی لەوەدا هەڵدەخولێ، کاتی دانەوەی قەرزە فەوتانی دەگەڵ بێ باشە بۆ وەی سوودەکە بڕواتە سەرێ، و یا بە خەیاڵی کاڵی

سوودخواردنی کەم، بە حەسەنات تاوانەکەی ئەگەر بشبێ لادەچێ، بـۆیە خـودا فەرمـوویەتی: سوودی بە سوود مەخۆن، چونکە کەم و یا زۆر هەر حەرامە.

و یـا دەڵـێن: ڕازی ئەو وشـەیە (اضـعافا) ئەوەیە دەورانـی جـاهلیەت واتە نەزانـی، ئەگەر کابرایەک ئەندازەیەکی پارە دەدایە یەکێک تا مودەتێک، کـاتێ وەخـتەکەی تەواو دەبـوو قەرزدار توانای دانەوەی پارەکەی نەدەبوو، خاوەن پارەکە بە قەرزدارەکەی دەکوت ئەتۆ پارەکە زیادی بکە و زیادی باوێ سەر تاکوو ئەمنیش کاتی دانەوەکەی زیاد کەم، هەر وا بەو شێوە کـار دەگەیشـتە ئەو ڕادەیە سوودەکە وا زیاد دەبوو دانەوە لە توانای قەرزدارەکەدا نەدەما، هەر دەبا قەرزدارساڵی سوود بداتەوە بە خاوەن پارە، جا ئەو (اضعافا مضـاعفة) هـاوارە لە سـەر ئەو جێـیە و ئەو کـارە نابەجێیەیە، نە مانای کەم بخۆن بەڵام زۆر مەخۆن.

***

وەک زاندراوە و ئێمەش دەزانین دنیاپەرەست ئارەزوو و هەوەسپەرەست عـادەتەن هەر دە حەولی ئەوەیدان ئەحکاماتێکی کە پـێش لە ئارەزوویـان بگـرێ و ڕێ نەدا ئەسـپی سەرکەشـی خۆیان لە مەیدانی ئارەزوو و خەیاڵات و هەوەسیان غار دەن و بـڕەتێنن، کاڵیـان بـکەنەوە، و بە فێڵ و فووت و حیلە حەرامەکان بۆ خۆیـان لە خۆیـان حەلاڵ کەن، دە حاڵێکـدا حەرامکردنـی حەلاڵ و حەلاڵ کردنی حەرام بێ دەلیل و بەڵگەی شەرعی کوفری گەورەیە و لەوانەیە کەسێک لە سەر ئەو هەوایە بڕوا و بەردەوام بێ. جێگای خۆی یەکسەرە و یەکجاری کا لە دۆزەخدا، بۆیە خودا لەو بارەوە ئاگاداری دەدا بە توندی، بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٣١ی ئالی عیمران:

**وَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿١٣١﴾** ئالی عیمران

**بترسن لەو ئاگرەی کە بۆ بێباوەڕانی کافر ئامادە کراوە (کێ بێباوەڕ بێ بە ئەحکاماتی قورئان و هەر وا دە حەولی حەلاڵ پێدانی حەرامان بێ و یا بە عەکسەوە، ئەوا بە کـافر دەژمێـردرێن دە ڕۆژی خۆیدا).**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٣١

خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی ئامادە کراوە بۆ بێباوەڕان، دێرەدا دڵ ڕادەچەنێ و واق دەمێنێ، بیر و هەست ڕادەمێنێ و دادەمێنێ بەو هۆیانە: هەچی هەستە و ئەقڵە خۆ ناخاتە نـاو ئـاگرێکی بزانێ دەیسووتێنێ، حەتا کەڕ و لاڵ و کەر و کاڵ و حەیواناتی وەحشیش، فەرموودەی خوداش

واتە: ئەو ئایەتە ئەوە دەگەیێنێ خودا بۆیەی پێ دەڵێ بە ئینسانی خۆ بپارێزن لەو ئاگرەی ئامادە کراوە بۆ کافران، ئینسانێ نەزانێ کە ئاگر بە ئێش و ئۆف و عەزابێکی سەختە خودا بۆیەی پێ دەڵێ، و یا دەڵێن: نەخێر، ئینسان دەزانێ و دەفامێ کە ئاگر دەسووتێنێ و بەژانە بەڵام یا باوەڕی وایە هەر هەڕەشەیە، دەنا ئاگر بۆ سووتانی ئینسانی نییە، و یا هەیە و دەشسووتێنێ بەڵام بەزە و ڕەحمی خودا زۆر لە سەرووی ئەوەیە کە ئینسانی بێچارە و بێدەستەڵاتی لاوازی پێ بسووتێنێ. و یا بێباوەڕە ئینسان بە دەستووراتی خودا، جا خۆ دیارە بێباوەڕ بە شتێک باسی ئەو شتە وەرناگرێ، جا لە سەر ئەو گێژ و خوڕێنەی کە دڵی تێ کەوتووە و مەلەش نازانێ چارەوڕێی نەجات و ڕزگاری دەبێ، چ بێ؟ پێش هەموو شتێک دەبێ ئەوە بکرێتە کڵێی دڵ: کە ئینسان دەفامێ و بەو ئەندازە زانایە و توانایە کە تەکلیفێ وەخۆ گرێ، چونکە خودا بۆ بەندەگی کە عیبادەت و تەکلیفە دروست کردووە، ناکرێ خودا نەزان بکاتە خەلیفەی خۆی، بەڵام دەکرێ ئەو ئینسانی وا بەفام، خۆی بەڕەحم و بەزەی خودا فریو دا، وەک خودا بە وەسیلەی ئایەتی ٥ی سوورەی فاطر ئاگاداری دەدا و دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ﴾ واتە هەڵنەخەڵەتێن بە بەزەی خودا، خودا بێباکە؛ و یا دەشکرێ بکوترێ: ئەو ئینسانی سازکراو بە فام و ئەقڵ بە وەسیلەی ئارەزوو و دنیاپەرەستی خۆ نەفام دەکا و لە حەق لادەدا ولە خۆ دەگۆڕێ، وا هەیە کوڕەگوێ دەبێ و ناگەڕێتەوە تا دە چاڵی مەرگ دەکەوێ، واش هەیە دەگەڕێتەوە.

لە سەر ئەو بەراوەردانە ڕاستی مانای ئایەتکە ئاوا چاو دەکرێ: ئەی بەندەی لەخۆ گۆڕاو و لە حەق تۆراو، ئاوڕ دەوە وەلای حەق ئاگرێکی وات لە ڕێدایە ئامادەی عەزابە، فریوێ نەخۆی بە هەوا و هەوەس و شەیتان، کاتی خۆی حیساب بە تەرازوویە.

**پرسیارێک:**

بە پێی هەڵسەنگاندنی ئەو ئایەتە (١٣١) ئاگرێکی کە بۆ کافران ئامادە کراوە بارتەقای تاوانیانە کە کافرییە، ئەو تاوانە سزای ئەو ئاگرە بەتینەیە، خۆ موسوڵمانێکی دووڕوو یا بڵێین فاسق تاوانەکەی شایانی سزای وا گەورە و سەخت نابێ ببێ، بۆ خودای تەعالا فەرموویەتی: موسوڵمانان خۆتان بپارێزن لە ئاگرێکی ساز و ئامادە کراو بۆ کافران؟! ئا ئەوە ئەوە دەگەیێنێ سزای وانیش هەر ئاوا سزای کافران بێ؟! وڵام بۆ ئەو پرسیارە دەبێ بگەڕێتەوە بۆ کون و کاژێری ناو دەروونی ئایەتەکە، کە ئەوەیە: (اِتَّقوا أن تَتَّخِذوا تحريم الربو فتصيروا كافرين) واتە ئەی بەندەی خۆهەڵخەڵەتێن، خۆ بپارێزە لەوەی ئینکاری حەرامی ڕیبا بکەی، نەکا بگەڕێی بەو

کافرەی کە سزای ئەو ئاگرەیە بۆی ئامادە کراوە. بە کورتی ئەتۆش ئاوا برۆی، دەبی بە کافر.

ئەگەرچی ئایەتەکە بە زاهیری ئەوە نیشان دەدا أُعِدَّتْ لِلْكافِرِينَ ئەو ئاگرە هەر بۆ کافران ساز درابێ، ئا ئەوە سابت دەکا کە یەک کەس لە ئەهلی ئیمان ناچێتە ناو ئەو ئاگرە؟! دە حاڵێکدا لە هەندێک لە ئایەتاندا وا دەرک دەکرێ: فاسقانیش تووش دێن ئی ئەو ئاگرە!

وڵام: ئەوە بە دوور دانەندراوە کە دەرەجاتی ئاگری دۆزەخ هەر دەبێ یەک دەرەجە بێ، بەڵکە دەرەجاتی ئاگری دۆزەخ زۆرن، دەرەجەی ئاگری کافرانی موشریک لە سەرەوەی هەموو دەرەجەکانە، ئەو ئاگرەی کە لە ئایەتی ١٣١ بە گوێمان دەگا تایبەتی کافرانە لەوانەیە دەرەجەی نەختێک لە خوار دەرەجەی ئاگری موشریکان بێ، هەر وا ئی فاسقانیش ژێراتر بێ لە ئی کافران، جگە لەوانەش ئامادەبوونی ئاگر بۆ کافران ناکرێ مانعی ئەوە بێ کە غەیرە کافریش نەسووتێ بە ئاگری دۆزەخ، جگە لەوەش قورئان هەر ئایەتێک نییە بەڵکە زۆرە، ئەو ئایەتە (١٣١) بۆ باسی ئاگری کافرانە، و بۆ باسی شوێنی دزان و حیزان و قاتڵان و بوختانکەران و هەروا جینایەتکاران ئاگر بە پێی تاوان هەیە و ئامادەیە، وەک خودای مەزن لە ئایەتی ٧١ی سوورەی زوموڕدا ئیشارەی وەلا کردووە:

وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاء يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا بَلَى وَلَكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ

ئەوانەش کە بێ بڕوان بوون، دەستە دەستە بەرەو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن هەرکە گەیشتنە پێشەوەش دەرگاکانی دۆزەخیان لێ دەکرێتەوە و پاسەوانەکانی دۆزەخ پێیان دەڵێن: ئایا پێغەمبەرانێکتان هەر لە خۆتان بۆ نەهات؟! کە ئایەتەکانی پەروەردگارتان بە سەردا بخوێنێتەوە؟ و بشتانترسێنێ لە گەیشتن بەو ڕۆژەتان؟ کوتیان: بەڵێ، بەڵام بەڵێنی سزادان لەسەر بێباوەڕان و کافرەکان بە ڕاست گەڕا.

ئەو ئایەتە ئەوەمان پێ دەڵێ کێ بێئەمری خودا کا شایانی عەزابە و ئاگریش مەئمووری عەزابە، ئەو بەڵێنییە دراوە و بە ئینسانیش کوتراوە، وا بیر نەکاتەوە کە ئاگر تایبەتی هەر کافرانە، بۆ چاک حاڵیبوون دەچینە خزمەت ئایەتەکانی ٩٤ تا ٩٨ی سوورەی شوعەرا:

فَكُبْكِبُوا فِيهَا هُمْ وَالْغَاوُونَ ﴿٩٤﴾ وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ ﴿٩٥﴾ قَالُوا وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ

﴿٩٦﴾ تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٩٨﴾

**جا ئەوان و گومڕاکانیش بە تەوقی سەر دادەخرێنە ناو دۆزەخەوە (٩٤) سەربازەکانی شەیتانیش بە تێکڕایی (٩٥) هەر لەوێدا دەس دەکەن بە کێشە و دەڵێن (٩٦) بە خودا قەسەم، بەبێ گومان هەموومان لە گومڕاییەکی ئاشکراییدا بووین (٩٧) ئەو کاتەی کە ئێوەمان وەک پەروەردگاری جیهانیان حەسێب دەکرد (٩٨)**

وشەی (اعدّت) ئایا دەتواندرێ بکرێتە بەڵگە لە سەر بوونی دۆزەخ ئێستێ؟ یا ناکرێ؟ بەڵێ، چونکە فیعلەکە بە واتەی ڕابردوویە دەکرێ بکوترێ دە توانای خودادایە ئێستێ بە ئەمری (کن فیکون) و یا بشبێ ئێستا هیچ مانعێک نایەتە پێش. (تەفسیر کبیر، ٣/٩، قرطبی، ٢٠٢/۴)

لە بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بەو بەرهەم و یاسا جوانە گەیشتووم و ئاشنا بووم: هەر کاتێ خودای تەعالا لەمەڕ دەستووراتێک بۆ کردن و یا نەکردن بێ، هەڕەشە هێنایە گۆڕ، بە حەتمی لە شوێنی ئەو هەڕەشەیە، مژدە و وەعدە و خۆشی دێنێتە ڕوو، بەو یاسایە دەکوترێ یاسایەکی هەمیشەی قورئان، لە زاری محەمەد کوڕی ئیسحاق یەسارەوە کە فەرموویەتی: دەکرێ ئەو ئایەتی ١٣٢ی ئالی عیمران بۆنی لۆمەی ئەوانەی لێ دێ کە لە هەرای ئوحوددا تووشی خەتا و هەڵە بوون و لە دەستووری پێغەمبەر لایاندا، واتە لە ئیتاعەی ڕەسووڵ کە ئیتاعە لە خودایە لایاندا. هەندێکیش دەڵێن ئەو ئایەتە ئاماژەیە بۆ لای ئەوە کە ڕەحمەتی خودا خراوەتە پاڵ ئیتاعە لە خوا و ڕەسووڵ.

بۆ ئیسباتی ئەو داوایە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ١٣٢ی ئالی عیمران:

وَأَطِيعُواْ اللَّهَ وَالرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٣٢﴾ ئالی عیمران

**فەرمانی خودا و پێغەمبەر بەجێ بهێنن بەڵکوو خودا بەزەیی بێ پێتاندا.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٣٢**

لێرەدا لە وەزن کردن و بەرجەوەندی ئەو ئایەتە ئەو هەستە خۆ دەنوێنێ کە هەڕەشەی سوودخۆران بە تەشویق و دڵخۆش کردنی وەشوێن کەوتووانی خودا و پێغەمبەر دادەکوژێ لە لایەن خوداوە، بە کورتی لە دوای وەعید وەعدە هات، واتە پاش هەڕەشە مزگێنی هات. وا دیارە دێرەدا بە زاهیری یارانی هەرای ئوحود کە لە ئیتاعەی خودا و ڕەسووڵ لایانداوە دەرچوون، دەبێ شایانی ڕەحمەت نەبن وەبەر هەڕەشە بکەون، بەڵام چونکە لە دایرە و جوغزی ئیمان و

باوەڕی بە خودا و ڕەسووڵ نەچـوونە دەرێ، سـنووریان نەبەزانـدووە، وەبەر هەڕەشـە نـاکەون چونکە دوای پـێزانین لە هەڵەی خۆیـان هـاتن کـۆوە بـوون لە دەوری حەزرەتـی ڕەسـووڵ و سەرکەوتنیان بە دەست هێنا، جـا ئەو وەکۆبوونەیـان لە دەوری پێغەمـبەر بە نیشـانەی ئیتـاعە لە خودا و ڕەسووڵ دەژمێردرێ.

لە زاری ئەبوحەنیفەوە کە فەرموویەتی: ئەو ئـایەتی ١٣١ ترسـێنەرترین ئـایەتی قورئـانە، کە خودا ترسـێنەری موسـوڵمانانە بە ئـاورێکی کە بـۆ کـافران ئامـادە کـراوە، بە مەرجـێ لە مەنـع کراوەکانی خودا خۆ نەپارێزن، سەرەنجام هەموو هیوا و ئومیدی موسوڵمانان دە ئیتاعەی خـودا و ڕەسووڵ خراوە هەر وەک ئایەتی ١٣٢ ئیشارەی وەلا دەکـا. ئەگەر کەسـێ لەو دوو ئایەتـانەی ١٣١-١٣٢ و هەروا وێنەی وان کە بە ئەلفازی (لعلّ، عسی) ڕازابێتەوە، دڕدۆنگی هەبێ با هەستی هەستێ و هۆش داتێ هەر ئایەتێک ئەو لەفزانەی پـێ خرابـێ، دەبـێ ئەوە بزانـێ کە نـاتوانێ بە ئیتمینان و خاترجەمی ئارەزوومەندانە هیـوای بە لوتـف و بەخششـی خـودا بـێ و چـاوەڕوانی کەرەمی خودا بکا جا ئینسان چۆن دەدوێ بدوێ. بەڵام لە زانایانی پـڕ لە هەسـت و شـعوور و وردبین سەرداپۆشراو نییە کە ڕێگای خوداناسی و ترس لە خودا زۆر باریک و بادراو و پێچپێچە و گەیشتن بەو قۆناغی پـلە بەرزە زۆر سـەختە، کڕینـی ڕەحمەتـی خـودا هەرزان نیـیە، گیـانی بارتەقایە. بۆ زێدە زانین بڕوانە لە تەفسیری کەشاف عەلـلامە زەمەخشـەری هەمـان دوو ئـایەتی ١٣١ و ١٣٢.

ڕازێکی ڕازاوە لە سیمای ئەو دوو ئایەتی ١٣١ و ١٣٢دا هەست پێ دەکرێ کە ئینسان بەرەو ئەساسی ئیسلام و ئیمان شارەزا دەکا، واتە ئینسانی لە دو وشاباڵی ئیمان تێـدەگەیێنێ و حـاڵی دەکا، ئەو دوو شاباڵە ئەوەن:

١. باوەڕی بە وەحدانیەتی خودا و ئیتاعەی

٢. تەسدیقی پێغەمبەر و ئیتاعەی.

لە سەر ئەو ئەساسە ئەو دوو ئیتاعانە واتە لە خودا و لە پێغەمبەر پێی دەکوترێ ئیمان.

جا لە سەر ئەو ئەساسە لە قورئـان بـڕوانە و زەیـن بـدەیە تـا دەگەیە ئەو ڕاسـتییە: هەچـی پێغەمبەر دەیفەرمـوێ، سـەراپای بە ئیزنـی خـودایە و ئـی خـودایە و هیچـی ئـی خـۆی نیـیە. شاهیدیش لە سەر ئەو ڕاستییە ئایەتی ٣ و ٤ی سووڕەی نەجمە کە دەفەرموێ:

وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى ﴿٤﴾

**لە ڕووی هەوا و هەوەسەوە قسە ناکات (٣) نین قسەی ئەو بێجگە لەو وەحیەی کە دەکرێت.**

واتە هەر ئەو سوروش و وەحیەیە کە دەکرێت، بە کوردی و بە کورتی، ئیتاعەی پێغەمبەر ئیتاعەی خودایە.

سەیری ئایەتی ٨٠ی سوورەی نیساء با بکرێ تا کوو بە تەواوی و بە ڕاستی دەرکەوێ کە ئیتاعە لە پێغەمبەر ئیتاعە لە خودایە بە قەولی قورئان:

**مَّنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ وَمَن تَوَلَّى فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا**
**کەسێ ئیتاعە لە پێغەمبەر کات لە ڕاستیدا ئیتاعەی لە خودا کردووە، کەسێکیش بێ گوێیی پێغەمبەر بکات و پشت هەڵکات تۆمان بۆ پاسەوان و چاودێری ئەوان نەناردووە.**

ئەدێرەدا دڵی بزۆر ئەو پرسیارە دەکا و دەڵێ: جا ئەگەر ئیتاعە لە پێغەمبەر ئیتاعە لە خودایە، سوڕ و ڕازی ئەوەی چییە کە دە ئایەتەکەدا هەر دوو ئیتاعە ناو براون؟ واتە ئیتاعە لە خودا و ئیتاعە لە پێغەمبەر دانە دانە ناو براون؛ دەبا هەر یەک ئیتاعە با! چونکە هەر دوو یەکن و لە شەئن و لیاقەتی ئایەتەکەش کەم نەدەبوو کە هەر یەکیان هاتبا؟

وڵام: ڕازی ئەو دوو ئیتاعانە کە هەر یەکەی بە شەئنی خۆی هاتووە و دابەزیوە، دەبێ ئەوە بێ: خودا بۆ شارەزایی ئینسان هەم کتێب (قورئان)ی خۆی ناردووە هەم پێغەمبەری خۆی ناردووە، خۆ ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە کە ئەرکی پێغەمبەران ئەوەیە کە ئایەتەکانی قورئان بێ زیاد و کەم، واتە بەو شێوەی کە دابەزیوە و سروش کراوە بۆ شارەزایی و ڕێنوێنی، بە خەڵک ڕاگەیێنن و خەڵک لە ناپاکی نهێنی و زاهیری پاکەوە کەن و بپارێزن، جا ئەو ئەرکە بەرز و گرینگە پێویستیەتی و شایانیەتی بۆ ئەرزشی شەئنی بە جودا ناو ببرێ.

دڵ دەیهەوێ بزانێ ئەجر و پاداشی ئیتاعە لە خودا و ڕەسووڵ لە دنیادایە و یا لە ڕۆژی حیسابدایە؟ یا لە هەردوو لایاندایە؟ و ئەو ڕەحمەتەی کە خودا وەعدی داوە بە هۆی ئیتاعە لە خودا و ڕەسووڵ، وەک ئیتاعەکە لە دنیادایە ڕەحمەتەکەش هەر وا لە دنیادایە؟ یا لە هەر دوو لادایە؟ و ئەو ڕەحمەتەش کە لە دنیادا حەسانەوەیە و لەش‌ساخییە و تێر و تەسەل بوونە لە ناز و نیعمەت و ڕێز و حورمەتدا، لە ئاخرەتدا چییە و چ دەبێ؟

جا بۆ وڵامی ئەو پرسیارەی دڵ دەبێ لە خودا داوا بکەین چونکە بێ گومانە ئەو ڕەحمەتە پاداشی عەمەلە، پاداشی عەمەلیش لە خوداوەیە و لە غەیری خودادا پاداشی هەمیشە ناتوانێ

ببێ بەتایبەت ڕەحمەت، جا لە سەر ئەو بابەتە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ١٣٣ ئالی عیمران تاکوو بتوانین بە ئیتمینانەنە بە ئامانج بگەین:

وَسَارِعُواْ إِلَى مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾
ئالی عیمران
پێش‌بڕکێ بکەن بەرەو لێبوردنێک کە لە لایەنی پەروەردگارتانەوەیە، بەرەو ئەو باخ و باخاتەی کە فراوانی و پانتاییەکەی هێندەی پانتایی ئاسمانەکان و زەوییە، ئامادە کراوە بۆ پارێزگاران.

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٣٣**

تێکۆشن بە تێکۆشانێکی ساخ و چاک و پاک و شایان بۆ لای لێخۆش‌بوون لە لایەنی پەروەردگارتانەوە بۆ بەهەشتێک کە پانایی بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەوییە و ئامادە کراوە بۆ موسوڵمانانی پەرهیزکار.

ئەو ئایەتە ئەوەمان پێ دەڵێ: پاش ئیتاعە لە خودا و ڕەسووڵ دەبێ لە وەدواکەوتن و وەشوێن‌کەوتنی دەستوورات و فەرمانەکانیاندا سستی دە کار نەکەن بەڵکە دەبێ بە پێش‌بڕکەوە بە خۆ ڕەپێش‌دان بۆ گەیشتن بە ئاخرین قۆناغی ئەرکی ئیمانداری دە خۆ بنووسێن. ئەو ئایەتە ئەوەشمان تێدەگەیێنێ کە ئیتاعە و ئیمانی بێ عەمەل پەسەند ناکرێ و هیچ حیسابێکی بۆ ناکرێ لە لایەنی خوداوە.

**بۆ ئاگاداری:**

بە هۆی ئەوەی بەهەشت پاک و خاوێنە، کراوەتە شوێنی پاک و خاوێنان، کەوابێ بۆ وانەی کە تێکەڵاوی خەتا و تاوان و گوناهانن، تا پاکەوە نەکرێن ـ جا بە سزادان و یا بەخشین ـ قەدەغە کراوە چوونیان بۆ ناو بەهەشت.

ئەوجار بۆ بەیانی گەورەیی و ڕێز و ڕێزداری بەهەشت خودا تەنیا بە پەنایایی ئەو ئیشارە دەکا نەک بە درێژایی ئەو؛ ئەوجار لە ئیشارە وەلای ئەوەی: بەهەشت ئامادە کراوە بۆ موئمینان و دۆزەخ بۆ کافران، وەک لە ئایەتەکانی ١٣١ و ١٣٢ ئەو ئیشارەیە دیارە، ئەوە بە یەقین دەگا کە ئەو دوو شوێنە (بەهەشت و دۆزەخ) ئێستێ بوونیان دەبێ هەبێ، جا یا لە ناو دەروونی ئاسمان و زەویدایە، و یا لە خاریجی واندا؛ بە لەفزی (متقین) ئەوە دەردەخا بەهەشت شوێنی چاکان و پاکەنە، کە بە وەسیلەی کردار و ئەعمالی جوان و پاک دەس دەکەوێ.

**هۆی دابەزینی ئەو ئایەتە:**

پێویستە دەبێ بزاندرێ وەک ئایەتەکانی دیکە، چونکە ئەو ئایەتە خەبەر و ئاگادارییە خودا دەیدا بە خاوەن بڕواکان، و دەشبێ هۆیەکەی بزاندرێ.

دیارە وەک عەبد کوڕی حەمید لە عەتای کوڕی ئەبی ڕیاح نەقڵ دەکا لە بابەت شتێکی تایبەتیدا، دابەزیوە وەک دەستەیەک لە موسوڵمانان دێنە خزمەت پێغەمبەر و دەڵێن: یا ڕەسووڵەڵڵا، هۆزی بەنی ئیسرائیل وا دیارە لە ئێمەی موسوڵمان لە بابەت عیززەت و شەرافەتەوە لە سەرەوەی ئێمەوە بن، بەو دەلیلە: گۆیا ئەوان دە شەودا کە تووشی تاوانێک دەهاتن، دە ڕۆژێدا ئەو تاوانە بە هۆی نووسینەوەی لە دەرک و شیپانەی ماڵیان نیشان دەدرا، ئەوانیش بە هۆی خەجاڵەت کێشانی لە خەڵک کە بە تاوانەکەیان زانی، زۆر زوو دەگەڕاوە لە تاوان و تۆبەی دەکرد، بەڵام ئێمەی موسوڵمان وا نین کە لە سەر تاوان هەسمان دەنەوە و خەڵک لێمان لە هەرا دەن تاکوو وەگەڕێین و تۆبە بکەین. پێغەمبەریش لە ڕاست ئەو جەریانە چەند لەحەزاتێک بۆی داما و هەڵوێستەی لە سەر گرت، پاشان خودای زانا و ئاگادار بە هەستی ناو دڵان ئەو ئایەتە پیرۆزەی ١٣٣ی ئالی عیمرانی بۆ دابەزاند، تا بیکاتە وڵام بۆ ئەو دەستە موسوڵمانانەی کە تووشی پەرێشانی زەین و خەیاڵات ببوون.

ئەو جوملەی ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ﴾ بە پێی تەعبیر و هەڵسەنگاندنی، عەتفە بۆ سەر ئایەتی ١٣٢، یا بۆ سەر ئایەتی ١٣١ی ئالی عیمران؛ ئەوکات بەراوەردی مانای ئایتەکە ئاوا دەخرێتە ڕوو: أَطِيعُواْ اللّهَ وَ أَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَسَارِعُواْ إِلَىٰ ...، یا وَاتَّقُواْ النَّارَ وَسَارِعُواْ إِلَىٰ ...؛ ئەودەم ماناکەی بە کورتی دەبێتە ئەوە: ئەی ئینسان! ئەتۆ لەوەی ئاگادار نی داخوا مردن کەی دێ و دەگاتە سەرت و بێ ئەولاولا دەتبا و دەڕۆی، کەوایە دست پێش‌خەری کە هەرچی زووترە بۆ لای خودای خاوەن بەخشش و کەرەم بۆ لێخۆش‌بوونت و بەهەشتی پان و بەرین.

دڵ دەیهەوێ ئەو تاڵوکە و پێش‌بڕکەیە چاک بزانێ مەبەست چییە دێرەدا؟

چەند نەزەرێکی زانایان هەیە لەو بارەیەوە، پێویستە ئاوڕێکی سووکیان وەسەر بدرێ:

١. هەندێک بۆچوونیان وایە لە سەر وشەی (سارعوا) کە شتێکی لێ لاچووە، ئەویش ئەوەیە: (سارِعوا إلى أسبابِ الْمَغفَرَةِ و هى الْعَقائدُ الصَّحيحَةُ و الأعمالُ الصالِحَةُ) واتە تاڵوکە بکەن بۆ لای ئەسباب و وەسیلەی لێخۆش‌بوونی خودا ئەویش بریتییە لە عەقیدەی سالم و

سەحیح و ئەعمالی چاک و پاک.

٢. حەزرەتی عەلی نەزەری وایە مەبەست لە تاڵووکە بۆ لا کراو فەڕزەکانن.

٣. حەزرەتی عوسمان کوڕی عەففان نەزەری وایە: ئیخلاسە.

۴. حەزەرتی ابن‌عباس نەزەری وایە: ئیسلامە بە ئەرکانەوە

۵. ئەبوعالیە وا نەقڵ دەکا کە مەبەست دێرەدا هیجرەتە واتە دووری لە تاوان.

۶. ئەنەس کوڕی مالک و سەعید کوڕی جوبەیر فەرموویانە مەبەست دێرەدا الـله اکبر تەحریمە

٧. عەللامە زەحاک نەزەری وایە کە مەبەست دێرەدا جیهادە

٨. سەعید کوڕی جوبەیر ئەو نەزەرەش دەدا کە مەبەست لە مەغفیرەت ئەدای تاعەتە.

٩. حەزرەتی عەکرەمە نەزەری وایە مەبەست لە مەغفیرەت تەوبەیە

١٠. عەللامە یەمان نەزەری وایە کە پێنج نوێژەکانە.

١١. ئەهلی تەحقیق نەزەریان وایە کە وشەی مەغفیرەت عامە، هەموو ئەوانەی کوتران دەگرێتەوە. (تفسیر کبیر، ۵/۹؛ روح المعانی، ۳۷۰/۴)

دڵ و ئەقڵ لەوەی کە خودا فەرموویەتی پانایی بەهەشت بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەوییە، دادەمێنن و ڕادەمێنن نازانن مەبەست دێرەدا چییە؟ جا بۆ وەی دڵ ڕزگاری بێ لەو نەزانیەی و حەقیقەت و ڕاستی شتەکەش دەرکەوێ، دەبێ چەرخ و خولێک بدرێ لێر و لەوێ تاکوو نەزەر و بۆچوونی قورئانزانەکان لەو بارەوە چ بێ وەدۆزرێ.

پێشەکی ئەوە بە پێویست دێتە بەرچاو کە بزاندرێ جنّة بۆ کوێ دەگەڕێتەوە (عطف)؟ بە پێی ڕاوێژ جنّة بۆ سەر مغفرة دەگەڕێتەوە یانی هەر وەک بۆ لای بەخششی خودا پەڵە دەبێ بکەی، دەبێ ئاواش بۆ بەهەشتێ کە بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەوی بەرینە پەلە بکەی.

لە ابن‌عباسەوە نەقڵە: ئەگەر هەر حەوت پارچە ئاسمانە و حەوت توێی زەوییەکان پان ڕاکران پانابییەکەیان چەند بن پانایی بەهەشتیش بەو ئەندازەیەیە. دە دیارە پانایی بەهەشت ئاوا بێ، درێژاییەکەی بێ‌گومانە زیاتر دەبێ. (ابن جریر طبری، ۴۳۶/۳)

ابومسلم اصفهانی دێرەدا نەزەری وا داوە: پانایی بەهەشت دێرەدا دە موقابیل درێژاییدا نییە، بەڵکە مەبەست وەک کوتەی ئەو کەسەیە کە دەڵێ (عَرَضْتُ الْمَتَاعَ لِلْبیعِ) واتە سامانم بۆ فرۆشتن ڕانا و نیشان دا؛ یانی بەهەشت بەو ئەندازەی ئەرزشدارە و قیمەتییە؛ بە فەرز ئەگەر بۆ

فرۆشتن بخرێتە ڕوو، قیمەتـی ئەو بە ئەنـدازەی قیمەتـی تەواوی ئاسـمانەکان و زەویـیە، بگـرە قیمەتی تەواوی ئاسمانەکان و زەوی ناکاتە قیمەتـی یەک تەبەقەی بەهەشـت. (روح المعـانی، ٣٧١/٤)

یا دەکوترێ: مەبەست لە پانایی بەهەشت زیادەڕەوییە لە فراوانی و بەربڵاویدا، واتە شتێک بەرفراوانتر لە بەهەشت و ئاسمانەکان و زەویدا نییە و شک نابەین، چونکە بە پێی بەرجەوەنـدی و هەڵسەنگاندنی مانای ئایەتی ١٠٧ی سوورەی هوود ئەوەمان دێتە دەست، لە بابەتی درێژایی و بەردەوامی و بەقا لە ئاسمانەکان و زەوی زیاتر لە لای ئێمە نییە؛ ئەوەش ئایەتەکە:

**خَالِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ إِلاَّ مَا شَاء رَبُّك إِنَّ رَبَّك فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ**

**لە ناویدا دەمێننەوە تا ئاسمانەکان و زەوی بەردەوامن، جـگە لەوەی کە پەروەردگـارت بـیەوێ، بەڕاستی پەروەردگارت ئەوەی بیەوێ بە پەلە ئەنجامی دەدات.**

**پرسیار:**

یەکێ دێ و دەڵێ: خودا بۆچی زیاد لە سیفەتەکانی بەهەشت، ناوی پانایی هێنا؟ لە وڵامدا دەبێ ئاوا بکوترێ: لەبەر ئەوەی پانـاییەکەی ئـاوا بەرفـراوانە، دەردەکەوێ کە درێـژاییەکەی زۆر لەوە زیاترە، یانی بە ئاشکرابوونی پانایی، ئەوە ئاشکرا دەبێ بە ئاسانی درێژایـی ئەو، نمـوونەی ئەوە ئایەتی ٥٤ی سوورەی ڕەحمان دەتوانێ ببێ:

**مُتَّكِئِينَ عَلَى فُرُشٍ بَطَائِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ وَجَنَى الْجَنَّتَيْنِ دَانٍ**

**لە سەر ڕایەخ و فەرشەکاندا پاڵیان داوەتەوە، بەڕەکانیان لە ئاوریشمی ئەستوورن، میوەچنینی ئەو دوو باغەش زۆر نزیک و ئاسانە.**

"بطائن" کە جەمعی "بطانە"یە دیارە ئەوەی پاڵی وێـدەدرێ کەمـترە لەوەی ڕادەخـرێ، واتە حاڵەتی شتی پێچراوە کەمترە لە حـاڵەتی ڕاخـراوی. دێرەشـدا واتە حـاڵەتی پانـایی بەهەشـت کەمترە لە حاڵەتی درێژایی بەهەشت. عەللامە قەفالیش دەڵێ: پانایی بەهەشت دێرەدا مەبەسـت خیلافی درێژایی نییە بەڵکە مەبەست ئاواڵەیی و بەرفراوانی بەهەشت.

پرسیار: دڵ دەیهەوێ بزانـێ بەهەشـت ئێسـتێ هەیە و ئەگەر هەیە بەو گەورەیـیە خـۆی لە کوێیە؟ لە ئاسمانانە؟ و یا لە سەر زەوییە؟ بۆ ئەو وڵامە دەچیـنە خـزمەت زانایـان کە زۆربەیـان نەزەریان وایە کە بەهەشت بەو چۆنیەتیەی باسی لێ کراوە لە سەرەوەی ئاسمانی حەوتەمیـنە کە

دەکەوێتە ژێر عەرش؛ ئەو نەزەرە ئەنەس کوڕی مالک نەقڵی دەکا و لاشیان وایە ڕاستییە کەمێ. هەندێکیش نەزەریان وایە لە ئاسمانی چوارەمینە بەڵام وەکی دەردەکەوێ خاوەنی نەزەرە، یا باوەڕیان بەوە نییە کە بەهەشت بەو جۆرەی باسی کراوە کە هەندە بەرفراوانە بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەوییە جێگای نابێتەوە دە ئاسمانێک و چەند ئاسمانانداو یا ئاگایان لەو بارەوە نییە، دەنا ئەو نەزەرە نادەن؛ دەستەیەکیش پێیان وایە لە بۆشایەکدایە بەهەشت لەو عالەمە بەدەرە. (روح المعانی، ٣٧٠/٤)

هەندێکی دیش نەزەریان ئاوایە: سەرووی ئاسمانی دنیا بەشێکە لە بەهەشت، هەر خوارەوەی زەوی بەشێکە لە دۆزەخ. (تفسیر کبیر، ٦/٩) ئەمنیش دەڵێم ئەو نەزەرانە دەستەکوتەی کوێرانەیە. گۆیا بە پێی نەقڵ لە حەدیس دەورانێکی کە حەزرەتی ڕەسووڵﷺ نامەی بۆ هرقل پادشای ڕۆم نووسیوە دە نامەکەدا کە پادشای بۆ لای ئایینی ئیسلام دەعوەت کردووە ئەو هرقلە لە جوابدا نامەیەکی ئاڕاستەی پێغەمبەر دەکاتەوە بەو جۆرە: ئەتۆ کە ئێمە بۆ لای ئیسلام و بەهەشتێک دەعوەت دەکەی، گۆیا ئەو بەهەشتە بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەوییە، دەیجا ئەگەر ئەوە ڕاست بێ و وا بێ؟ کە واتە: دۆزەخ لە کوێیە؟

پێغەمبەر کاتێ ئەو نووسراوە بەو کوتانەوە چاو دەکا دەفەرموێ: سوبحانەڵڵا! لەو بەراوردەی هرقل. کە وابێ دەبێ بکوترێ: ئەدی کاتێ ڕۆژی ڕوونی هەتاو دێتە ڕوو، شەو بۆ کوێ دەچێ؟ (تفسیر طبری، ٤٣٦/٣) یان ونبوونی شەو و چاو نەکردنی دە کاتی ڕۆژدا ئەوە ناگەیێنێ کە شەو لە هیچ کوێ نییە؛ دەبێ بکوترێ شەو هەیە بەڵام ئێمەی کەمزان نازانین پێی؛ دەیجا دۆزەخیش هەر ئاوایە، ئێمە نازانین لە کوێیە/ و یا لەو بارەوە دەبێ ئاوا خەیاڵ کرێ: ڕۆژ لە لایەکی دنیا بەرقەرارە و شەویش لە لایەکی دیکەوە؛ واتە بەهەشت لە سەرووی سەرەوەی حەوت ئاسمانانی ژێر عەرشدایە، دۆزەخیش لە ژێرای ژێراندا واتە "اسفل السافلین"دا بەرقەرارە، بە کورتی و بە کوردی، خودا بەتوانایە لە سەرە و بەرە کردنی بەهەشت و دۆزەخ و شەو و ڕۆژ (روح المعانی، ٣٧١/٤) لە ڕاوێژی ئەو دوو ئایەتەدا بە ڕوونی دەردەکەوێ کە بەهەشت و دۆزەخ دە حاڵی حازردا هەن، نەک وەک دەستەیەک کە دەڵێن: کاتی خۆی کە ڕۆژی حیسابە خودا دەیانسازێنێ؛ لە جێگای ئاسمانەکان بەهەشت دێتە ڕوو، و لە جێگای زەوی دۆزەخ دێتە ڕوو.

وشەی (أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ) بە زاهیری پێمان دەڵێ: بەهەشت و دۆزەخ ئێستێ هەن.

نەزەری خاوەنی تەفسیری کەشاف لە سەر ئایەتی (عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ) واتە پانایی بەهەشت بە ئەندازەی پانایی و فراوانی ئاسمانەکان و زەوییە؛ بۆ تەئیدی ئەو نەزەرە ئایەتی ٢١ی حەدید کافیە ﴿وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ﴾ واتە بەهەشتێک کە پانتاییەکەی وەکوو پانتایی ئاسمان و زەوییە.

پێویستە و دەبێ بزاندرێ کە خودای تەعالا دە ئایەتەکانی پێشوودا واتە ١٣٢ و ١٣٣ جەزا و پاداشی خاوەن ئیمانانی بەتایبەت پارێزگاران بەیان کرد، ئەوجار دەیهەوێ سیفاتی پەرهیزگاران بەیان کا تاکوو ئینسان بتوانێ بە هۆی ئەنجامدانی ئەو سیفەتانە، بەهەشت بۆ خۆی وەدەست بێنێ. دیارە سیفاتی موتتەقی زۆرن بەڵام دێرەدا هەر سێ سیفەتی بەرچاو و ئەساسی بەیان دەکا کە بریتین لە: بەخشش و قووتدانەوەی ڕق و قەڵسی و چاوپۆشین لە هەڵە و تاوانی خەڵک.

بۆ تەئیدی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٣٤ی ئالی عیمران بۆوەی بە باشی تێبگەین:

**الَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٣٤﴾** ئالی عیمران

**ئەوانەی کە لە کاتی بوون و نەبووندا دەبەخشن، ئەو کەسانەش کە ڕقی خۆیان دەخۆنەوە و خەڵک دەبەخشن، خوداش چاکەکارانی خۆش دەوێ.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٣٤

واتە دەبێ بکوترێ بەهەشت بۆ کێیە و ئامادەکراوانی کێن؟ دەبێ لە وڵامدا بڵێین: بەهەشت بۆ ئەوانەی ماڵیان دەبەخشنەوە لە کاتی خۆشی و ناخۆشیدا، و هەروا بۆ ئەوانەی ڕقیان دەخۆنەوە و خۆش دەبن لە خەڵکی تاوانبار، لە هەمان کاتدا خودا چاکەکارانی خۆش دەوێ.

### ئاگاداری:

خودای تەعالا بە وەسیلەی ئەو ئایەتە ئەرکی خۆپارێزان بە تەواوی بەیان دەکا و نیشانی دەدا، کە ئەوانە دە هەموو کات و ساتدا خۆشی و ناخۆشی بە پێی توانا لە هەر بابەت و بارێکەوە بەخش دەکەن، چونکە ئەوانە ڕیشە و تۆوی یارمەتی و بەخشین دە ناو ڕووحی خاوێن و سافی خۆیاندا چاندووە و ناژتووە، کە دەتوانن دە هەموو شەرایتێکدا ئەو یارمەتییە بە کار

بەرن، دە ئەساسیشـدا مانـای سـەخاوەت و ئینفـاق ئەوەیە کە دە هەر کـات و سـاتی دەورانـدا خۆشی یا ناخۆشی ئەو بەخششە بەڕێوە بەری، بە کـوردی، دە کـاتی تەنگـانە و سەختیشـدا بە فکری داماو و لێقەوماو و ڕووت و ڕەجاڵ دەبێ ببی، جا ئەوجـار ئینفـاق هەر تـایبەتی مـاڵ و سامان نییە بەڵکە بۆ بەخشینی زانست و هونەر و سەنعەت و هەرچی خاوەن نیازی پـێ ڕزگـار بێ دەبێ و هەچی ئینسانیشە دە هەر حاڵ و باڵێکدا بێ بەشێکی لەوەی کە نیازمەنـدی پـێ بـێ نیاز دەکرێ هەیەتی، جا ماڵ و سامان بێ و یارمەتی بەدەنی بێ و یا یارمەتی ڕێنومایی بێ و یـا بەزە پێدا هاتن بێ. بە کوردی، بتوانێ دڵی وێران ئاوەدان کاتەوە، ئەوە بۆخـۆی ئینفـاقە؛ کەوایە دەتواندرێ بکوترێ: موتتەقین هەوەڵ سیفەتی ئەوەیە کە ڕقی خـۆی وەخـوا، دووهەم سـیفەتی ئەوەیە بە عەفو دڵی خۆی پاک وەکا، سێهەم سیفەتی ئەوەیە بەخشین بکـا و دڵـی تاوانبـاران بە ئیحسان دەگەڵ کردن لە ژەنگی ناپاکی پاکەوە کا؛ ئەوانە نیشانەی باوەڕی خاڵین.

**پوختەیەک:**

هەوەڵ سیفەتی ئەوانەی پێیان دەکوترێ موحسنین ئەوەیە: دە خۆشی و ناخۆشیدا دەسـتی یارمەتی بۆ لای خاوەن نیازان درێژ دەکەن. وشەی "سرّاء" بریتییە لە بێنیازی و دەسئـاواڵەیی، "ضرّاء" بریتییە لە فەقیری و دەستەنگی.

نەقـڵە لە ڕابـردووان لە سەربەخشـش: یەکێـک دەسـتی بەخشـینی پیوازێـک ڕۆیشـتووە، بەخشیویەتی، هەر وەک حەزرەتی عایشە دەستی دەنکە ترێیەکی ڕۆیشتووە بەخشیویەتی؛

حەزرەتی عەبدوڵڵا کوڕی عەباس دە تەعبیـر و تەرجەمەی جـوملەی ﴿الَّذِيـنَ يُنفِقُـونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ﴾دا فەرموویەتی: مەبەست لە وشەی «السرّاء و الضرّاء» واتە دە حاڵەتی خۆشی و ناخۆشیدا، و یا دە حاڵەتی دەستڕۆیشتن و دەستەنگیدا بەخشش دەکەن؛ دە هیچ حاڵەتێکدا خودا و سەخاوەت لە بیر ناکەن.

دەستەیەکیش هەن ئاوا تەعبیـری ئەو دوو وشـانەی "سرّاء" و "ضرّاء" دەکەن: مەبەسـت لە "سرّاء" بەخشش دەکەن دەگەڵ نزیکان کە ئەو بەخششە دەبێتە هۆی خۆشـی وان، مەبەسـت لە "ضرّاء" بەخشش دەگەڵ دوژمنان دە کاتی میوان بوونیاندا کە بە پێی عادەت دوژمن ئەگەر بـوو بە میوانت، هەچی بۆی خەرج کەی لە دڵ گران نـایە، ئەگەرچـی دڵ لە ڕق و نـاڕەحەتی لێیـان خاڵی نابێ.

دەستەیەکی دیکە فەرموویانە مانای وشەی (يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاء) یـانی ئەوانە کەسـانێکن کە

شتی بە قیمەت و بەئەرزش دەبەخشن، پێی خۆشحاڵ دەبن و مانای وشەی (فِي الضَّرَّاء) ئاوایە: ئەوانە کەسانێکن کاتێ شتی کەمیان لە دەس دێ بۆ بەخشین، دە ناو ژوور و ناو ماڵیان نارەحەتی هەیە لەوەی کە کەمیان لە دەس هاتووە، بەڵام هەر دەشیبەخشن و ئیفاقەکە لە دەس خۆ نادەن. (تفسیر قرطبی، ٣٠٦/٤)

وشەی (وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ) واتە قووتدانەوەی ڕق؛ سیفەتی دووهەمینی پارێزەرانە، "کاظمین" ئیسمی فاعیلە لە "کظم"ەوەیە، "کظم"یش دە لۆغەتدا بە مانای بەستنی دەرکی مەشکە ئاوە بە هەودا تاڵێکی دە کاتی پڕبوونیدا تاکوو ئاوەکەی لێ نەڕژێ؛ دێرەشدا بە مانای گرێدانی زارە تاکوو ڕق و تووڕەیی سەرڕێژە نەکا و بێتە دەرێ، چونکە سروشتی ئینسانی ئاوایە: ئەگەر دەروونی بە ئاگری ڕق و تووڕەیی گڕی گرت، پڕیشکان داوێ و ئاگری بڵێسەداری دەروونی لەو کاتەدا ئەگەر داینەمرکێنێ قەباحەتێ دەخوڵقێنێ، جا بۆیە کێ بتوانێ بەرگری لە پڕیشکی ئاگری ڕق و تووڕەیی بکا قەباڵەی موتتەقینی پێ دەدرێ.

دە ناو هۆزی عەرەبدا "غیظ و غضب" هەن، فەرقیشیان بۆ داناون، بەو شێوەیە:

"غضب" بە قەڵسییەک دەکوترێ کە خاوەنەکەی دەخەفتێ لە تۆڵە ستاندنی لەوەی ڕقی لێ هەستاوە، بەڵام "غیظ" خاوەنەکەی ناخەفتێ لە تۆڵە چونکە ڕق و تووڕەییەکی خودجۆشە لە بابەت شتێکی وا کە شایانی تۆڵە نییە. (روح المعانی، ٣٧٢/٤)

عبدالرزاق و ابن جریر لە ابوهریرەوە نەقڵ دەکەن کە گۆیا پێغەمبەر فەرموویەتی: مَن كَظَمَ غَيظاً و هوَ يَقدِرُ على اِنقاذِهِ ملاءه اللهُ تعالی أمناً و ایماناً؛ واتە کێ بتوانێ ڕقی خۆی بخواتەوە دە کاتێدا کە توانای ڕۆ ڕژتنەکەی ببێ، خودای تەعالا دڵی پڕ دەکا لە ئارامی و ئیمان. (طبری، ٤٣٨/٣)

ئیمامی ئەحمەد لە ئەنەسەوە نەقڵ دەکا: کە گۆیا پێغەمبەر فەرموویەتی: مَن كَظَمَ غيظاً و هو يَقْدِرُ على أن يَنقذَهُ دعاهُ اللهُ على رُؤوس الخلايقِ حتى يُخَيِّرَهُ اللهُ تعالى مِن أَيِّ الحور شاء؛ واتە کێ بتوانێ ڕقی خۆی بخواتەوە لە کاتێکدا کە توانای خاڵی کردنی هەبێ، ڕۆژی حەشر دێ خودای تەعالا لە بەرچاوی عالەم بانگی دەکا و ئیختیاری پێ دەدا هەر حۆرییەکی دڵی بگرێ بۆ خۆی هەڵگرێ. لێرەدا ئەو ڕازە دەردەکەوێ کە ئینسان لەزەتپەرستە. (مسند امام احمد تفسیر بغوی، ٣٥٢/١)

**ڕازێک:**

بە پێی هەڵسەنگاندنی ئایەت و ئەحادیسی بابەت لە سەر ئەو باسە دەردەکەوێ کە هیچ کەس بێ ڕق و غەرەز نییە، هەچی ئەهلی تەقوایە ئەگەر هەستا و هێرشی هێنا، بەرگری لێدەکا و دەیخواتەوە، بەڵام ئەهلی عەوام پێشی بەردەدا و بەرەڵای دەکا، جا پەنا بە خودا.

سیفەتی سێ لە مەڕ موتتەقین (وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ)ە، واتە ببوورن لە تاوانباران؛

ابن جریر لە حەسەن بەسری نەقڵ دەکا کە گۆیا ڕۆژی قیامەت خودای تەعالا بە وەسیلەی جارچییان جاڕ دەدا: کێ حەقی لە لای خودایە هەڵستێ و ڕەحەوا کەوێ، تاکوو ئەهلی ئەو ڕۆژە چاوی کەن؛ ئەوانەی کە لە دنیادا لێبوورن و بەخشندەگییان دەبارەی خەڵک کردووە هەڵدەستن و خۆ نیشان دەدەن، زۆر بە شادی عەتای کار و ئاکاریان وەردەگرن لە بەر چاوی عالەم (تفسیر طبری، ٤٣٨/٣؛ ش٧٨٤٠)

ئیمام تەبەری لە ابی کوڕی کەعبی نەقڵ دەکا کە گۆیا پێغەمبەر فەرموویەتی: مَن سَرَّهُ أَن يَشرف له ابيان و تَرفع له الدّرجات، فَلْيَعفُ عَمَّن ظَلَمَ و يعط من حرمه و يصل مَنْ قَطَعَهُ. واتە کێ خوازیارە و دەیهەوێ کە لە بەهەشتدا کاخ و هۆدەی بەرز و جوانی بێ، پلەی بەرزی بێ، کێ ستەمی لێ کردووە بیبووری؛ و کێ بێبەشی لە بەش کردووە پێی عەتا کا و کێ دەنگی لێ گۆڕیوە، ئاشتی نیشان دا. (معجم کبیری طبرانی، ج ١٩٩/١)

قەفال کە یەکێکە لە ئەهلی نەزەر، فەرموویەتی وشەی (و العافين عن الناس) زۆر نزیکە دەگەڵ ئەوانەی کە سوودخۆرن دەگەڵ وانی بێ کە خودای تەبارە و تەعالا لەو بارەوە ئیماندارانی نەهی کردوون لە سوود خواردن و دەعوەتیشی کردوون بۆ بەخشش دەگەڵ تەنگدەستان، هەر وەک دەزانی بەشوێن مەسەلەی ڕیباخۆر و قەرزدا خودای تەعالا ئایەتی ٢٨٠ی بەقەرەی هێنا تاکوو بتواندرێ حاڵی قەرزداران و ڕیباخۆران دەرک کرێ کە چها بەرچاوە سەری ئایەتەکە با بکرێ:

**وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ**

**ئەوانەی کە قەرزداتانن، ئەگەر نەدار و دەستەنگن، لێیان بوەستن تا ئەو کاتەی دەیانبێ و دەروویەکیان بۆ دەکرێتەوە، ئەگەر بشیانبەخشن ئەوە خێرترە بۆ ئێوە ئەگەر بزانن.**

و هەروا هەندێکیش پێیان وایە ئەو ئایەتە لە بابەت حەزرەتی حەمزەوە کە شەهید کرا و بێئەدەبییان ڕاجع بە تەرمەکەی نیشان دا کافران، حەزرەتی ڕەسووڵیش ناڕەحەت بوو و ویستی بەو شێوەیە تۆڵە بستێنێ، خوداش لە سەبر و خۆڕاگری دەعوەتی پێغەمبەری کرد و فەرمووی:

﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ﴾.

لە حەزرەتی عیساوە فەرمووویەتی: ئەوە پێی ناکوترێ ئیحسان کە دە موقابل چاکەی کەسێکدا بێ، ئەوە مکافاتە؛ بەڵکە ئیحسان و چاکە ئەودەم ئیحسانە کە دەگەڵ یەکێ بکرێ کە خراپەی دەگەڵ کردووی.

دەمانهەوێ ئەوە بزانین کە تێکەڵاوی ئایەتی ١٣٥ دەگەڵ ئایەتی پێش خۆی واتە ئایەتی ١٣٤ و ١٣٣ چییە؟ چونکە ئایاتی قورئان هەمووی خاوەن نەزم و دەستوور و ڕەبتن دەگەڵ یەک؛ جا بۆیە دێرەدا هەست داوای پێکەوەبوونی ئەو ئایەتانە دەکا؛ جا ناچارین بۆ داوای دڵ ئەوە بڵێین بەڵکە دڵ دامەزرێ و قانیع بێ:

دیارە خودای تەعالا وەک دیتمان دە ئایەتی ١٣٣دا فەرمووی بەهەشت بۆ پەرهیزگارانە و بۆیان ئامادە کراوە، خۆ ئەوەش دەبێ بزاندرێ کە پەرهیزگار دوو بەشن: ١. بەشێکیان ئەوانەن کە بەردەوام تاعەت و عیبادەت دەکەن و خوداش ئەوانی بۆ لای بەخشش و ئاسانکاری دە کاتی خۆشی و ناخۆشیدا دەعوەت کردووە، هەروا بۆ لای ڕقخواردنەوە و بووردن و چاوپۆشیش هەرای لێ کردوون.

٢. بەشی دووهەم لەو دوو بەشەی کە ئایەتی ١٣٥ دەگەڵ ئایەتانی پێش خۆی ڕەبت دەدا ئەوەیە: ئەوانەی خەتا و گوناهیان کردووە و پاشان تۆبەیان کردووە، ئەوانیش بەشێکی گەورە و بەرچاویان لە ترسان لە خودا کەسب کردووە بە هۆی تۆبە و گەڕانەوەیان بۆ لای خودا بە مەرجێ کە بانەدەنەوە و تۆڵەی ناتەواوی خۆیان بکەنەوە، بە عیبادەت و تاعەت و ئیحسان و چاکە و چاکەکاری، ئەو دەستە تۆبەکارە دەکەڵ دەستەی پەرهیزگاران وەک یەکن بەو دەلیلە گوناهکار پاش تۆبە لە گوناە و بانەدانەوەی لە بارەی شایان و لێهاتووییدا بە پایەگای کەرامەت و قەداسەت تەماشای دەکرێ لە بارەگای خودای ڕەحمان و ڕەحیم و بەخشندە. جگە لەوانەش لە ئایەتی هەوەڵدا واتە ١٣٤ خودا بە ئیحسان و چاکە وەلای غەیری دەعوەت کردن، بەڵام دێرەدا واتە ١٣٥ خودا بە ئیحسان دەگەڵ خۆی دەعوەت کردن.

ئەوجار کاتی ئەوەی هاتووە بچینە خزمەت ئایەتی ١٣٥ی ئالی عیمران تاکوو بتوانین بە تێر و تەسەلی حاڵی بین:

وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُواْ أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُواْ اللّهَ فَاسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ الذُّنُوبَ

إِلاَّ اللّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَى مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ ئالی عیمران

**ئەو کەسانەی کە گوناحێکی زەق و دزێو ئەنجام دەدەن، یا ستەم لە خۆیان دەکەن، دەکەونەوە بیری خودا و خێرا داوای بەخشین دەکەن، کێیە کە تاوان و گوناحەکان دەبەخشێ بێجگە لە خودا؟ ئەوانەش کە بەردەوام نین لە سەر ئەو کردەوانەی کە کردوویانە هەر لەو کاتەشدا دەزانن کارێکی خراپ و دزێوە.**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ۱۳۵

گۆیا هۆی دابەزینی ئەو ئایەتە دەبێ بە پێی ڕاوێژ ئەوە بێ، خوداش زاناترە: پیاوێک دەبێ لە قەبیلەی ئەنساریان، تەمای بێ‌شەرعی لە ژنی هاوڕێیەکی دەکا و پاشان بە هۆی یادێک لە خودا و ڕۆژی حیساب حەیا دەیگرێ و لە تەمایەکە لادەدا و پەشیمان دەبێتەوە. ئەوانە وەک پاڵەوانێکی بەتوانا دەچن کە دەتوانن پاڵەوان و دێوەزمەی نەفس و هەوا لە ئەرز دەن و تێکی شکێنن و لغاوی کەن و سواری بن. جا ئەوەیە کە خودای تەعالا جگە لەوەی بارەقەڵڵا و ئافەرینیان لێ دەکا، لە تاوانەکانیشیان دەبووری، جا دەگەڵ خۆیان کردبێ ئەو تاوانە چ دەگەڵ غەیری خۆیان کردبێ. وەک خودا بۆخۆی بە وەسیلەی ئەو ئایەتە پیرۆزەی ۱۳۵ ڕایدەگەیێنێ و دەفەرموێ: ئەوانەی کاتێک گوناح و تاوانێکی زۆر ناحەز و ناڕەوا ئەنجام دەدەن وەک گوناحێکی فاحشەگەری، و یان ستەمێکی ناڕەوا لە خۆیان نیشان دەدەن، بە هۆی ئەو تاوانەی کەوا لە نێوان خۆی و خودادایە، و یا بە هۆی ئەو تاوانەی کە دەگەڵ خەڵکی بێ‌تاوانی ئەنجام داوە، دێتەوە هۆش و خۆی بە شەرمەزار دەزانێ لە ڕاست خۆی و خودا و ئیمانی و یادی خودا دەکاتەوە و داوای لێخۆش‌بوونی تاوانی دەکا لە خودای تاوانبەخش و دەشزانێ کە لە غەیری خودا کەس نییە بتوانێ تاوان ببەخشێ و داشیپۆشێ، پاش ئەوەی کە وازیش دێنێ لە گوناح و خۆ دەخاتە پەنای خودا و ناشگەڕێتەوە سەر گوناحی کردوویەتی، بێ‌گومان جەزای ئەوەیە کە خودای تەعالا بە وەسیلەی ئایەتی ۱۳۶ پێی داوە و ڕایگەیاندووە بە بەندەکانی خۆی.

**ئاگادارییەک:**

یەکی دیکە لە سیفەتی بەرزی کەسانی خاوەن ئیمان و ویژدان و ویقار و بەتەقوا ئەوەیە کە کاتێ تووشی تاوانێکی گەورە یا چکۆلە بوون، شەرمەزاری دەکێشن لە خودا و لە کەرامەت و ویژدانیان، دەکەونە یادی خودا و ئیزهاری پەشیمانی دەکەن بە شەرمەزاری و حەیاوە و بە دڵێکی ڕاست و پاک زەمزەمەی ئەوە دەکەن کە لە خودا بەولاوە کێ هەیە بتوانێ پەردە بکێشێ بە سەر

تاوانی بەندەکانیدا؟ کەس نییە؛ و لە غەیری خودا کێ هەیە دڵی غافڵ و لەهۆشەوەچوو ڕاتڵەکێنێ و هەڵستێنێ کە لە کاتی تەنگانە و سەختیدا پەنا بەرێتە بەر پەنادەران (خودا)، کە نەجاتی دا لەو تەنگانەیە و هەر واش کێ هەیە لە غەیرەز خودا بتوانێ تاوانباران و خەتاکارانی پەشیمان بۆوەکان پەنا دا و بیانبەخشێ؟! بێ منەت و جەریمە و سزا! بێجگە لەوانەش ئینسان تا ئەو کاتەی دەگەڵ خودایە دوور لە خەتایە، بەڵام کاتێ لە خودا هەڵبڕا برای تاوان و خەتایە، و ئەوجارە دەبێ ئەوە بزاندرێ و قبووڵیش کرێ کە تۆبە و پەشیمانی ئەوەیە لە کانگای دڵەوە بێ، نەک هەر بە زمانی تەڕ و پارە بێ، و دەشبێ ئەو تاوانەی تۆبەی لێ دەکرێ، عەمدەن و زانایانە وەسەری نەپەڕیبێ، چونکە تاوانی زانایانە کە دڵ دەهاژێنێ و ویژدان دەتەزێنێ دەکەوێتە بەر بابی (لمن یشاء) واتە ئەگەر نەشتبەخشێ خودا ڕێگای گلەمەندیت نییە، بەڵام وەسەر پەڕینی نەزانانە مافی پێ بەخشینت دراوەتێ؛ ئەو گۆمە قووڵە.

**دیدگای خاوەنی تەفسیری کەشاف:**

(والذین) دەگەڕێتەوە بۆ (متقین) واتە پەرهیزگاران و تۆبەکاران، وشەی (فاحشة) بریتییە لە کاری ناحەز و ناڕەوا، هەندێک لە قورئانزانان فەرموویانە (فاحشة) واتە زینا، گوناهی گەورە؛ (و ظلموا انفسهم) واتە گوناهی سەغیرە وەک ماچ و دەست پێدا ماڵین؛ نەفس و هەوا کە جیرانی دڵن بە دزی دڵی خودایی دەچن ئەو کار و خەتایانە دەکەن، کاتێ دڵ پێی زانی ناڕەحەتی لە جیرانەتی نفس و هەوا دەردەبڕێ و دەچێ شکایەت دەکا لە خودا، خوداش دەفەرموێ ئەگەر ڕاست دەکەی هاوکاریت نەکردووە، حاشای لێ بکە و وەگەڕێ بۆ لای من و لەوان لادە؛ ئەگینا تاوان لە ئەستۆی. تۆبە، هیواچێنە، خوداش خاوەن ڕوێنە، نەگەڕانەوە بۆ سەر گوناه گوڵ کردن و شین بوونی چناوە. پێغەمبەر فەرموویەتی: لا كَبِيرَةَ مَعَ الاسْتِغفارِ و لا صَغيرَةَ مَعَ الْإِصْرارِ: واتە بە داوای لێخۆشبوون (تۆبە) گوناهی کەبیرە دەشۆردرێتەوە، بە بەردەوامی لە سەر نەگەڕانەوە بۆ لای گوناه، سەغیرە و کەبیرە دەسڕێتەوە. یا دەڵێن: دەوام لە سەر گوناهی سەغیرە، لە سەغیرە لادەدا بۆ لای کەبیرە.

**پاشەدۆ:**

وشەی (فاحشة) دێرەدا سیفەتە و مەوسووفەکەی لابراوە، دە ئەسڵدا ئاوا بووە: «فعلوا فعلة فاحشة»، واتە کاری ناحەزیان ئەنجام داوە. لە نێوان "فاحشة" و "ظلم نفس" چەند بابەتێک

هەن، یەکێک لە بابەتەکان ئەوەیە کە خاوەنی تەفسیری کەشاف فەرموویەتی: فاحشة واتە شتێکە کە ئەنجامدانی ئەو دە ناحەز و دزێوی تەواودا دەکار کرێ، بەڵام "ظلم نفس" ئەو گوناهەیە کە ئینسان پێی گوناهبار بێ، و یا دەکوترێ: فاحشة واتە گوناهی کەبیرە، "ظلم نفس" واتە گوناهی سەغیرە، دەکرێ داوای لێخۆش‌بوون بکرێ بە دەلیلی ئەوەی کە پێغەمبەر بە ئیستغفار بوو، وەک ئایەتی ١٩ی سوورەی محەمەد ئیقراری پێ دەکا:

**فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَاكُمْ**

**بێگومان بزانە پەرستراوێکی دی نییە بێجگە لە خودا، داوای لێخۆش‌بوونیش بکە بۆ گوناح و تاوانەکانت، بۆ پیاو و ژنە بڕوادارەکانیش، خودا ئاگای لە هەموو جووڵانەوەی دنیا و سەرەنجامی پەسڵانتانە.**

ئەوەش با بزانین کە ئیستیغفاری پێغەمبەر بەڵگەی ئەوەی ناتوانێ ببێ کە گوناهی سەغیرەی کردووە بەڵکە دەتوانێ بەڵگەی ئەوەی بێ کە تەرکی ئەقلی کردووە، یا دەکوترێ فاحشة بە واتەی زینا، "ظلم نفس" بە واتەی ماچ و مووچ، ئەوە لە سەر قەولی ئەو کەسەیە کە کوتمان ئایەتەکە لە سەر ئاکاری ئەو دابەزیوە؛ کابرای ئەنساری کە لە جیاتی "ثقفي" لە ژنی ئەو وریا بوو تا لە سەفەر دەگەڕێتەوە کەچی دڵی لە ژنەکە گۆڕا، بەڵگەش لە سەر ئەوەی کە فاحشة بە مانای زینایە، ئایەتی ٣٢ی سوورەی ئەسرایە:

**وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً**

**توخونی زینا مەکەون قەت، بەڕاستی زینا کارێکی ناشیرینە و ڕێگای ڕێبازێکی پیسە.**

جوملەی (ذكروا الله) ئەقڵ دەیهەوێ بڵێ یادی خودا بە خاڵی و ڕووت لە کردارت بێ بەرهەمە، بەڵام بە ئاگاداری بە کردار خاوەن بەرهەمە، جا لەو بارەوە بەرەو دوو مەبەست دەکرێ بچینە پێش:

١. لەو دوو مەبەستە دەبێ ئەوە بێ: یادی خودا واتە یادی وەعدە و وەعیدەکانی و یادی عەزەمەت و جەلالی کە ئەو یادانە دەبنە سەبەبی لێ ترسان و حەیا و شەرم لێ کردنی کە ئەوانەش وەسیلەی دوورین لە تاوان و خەتا.

٢. مەبەست لە ذكروا الله یادی خودایە بە پێی هەڵکوتنی حەمد و سەنا و بەیانی جەلال و

عەزەمەت و توانای، جا پاشان داوای عەفو و بەخشین لە خودا. هەر ئەوەشە کە خودای تەعالا پاش جوملەی "ذکرو الله" جوملەی "فَاسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ"ی هێنا، واتە دەبێ لە هەوەڵەوە یـادی خودا بە حەمد و سەنا داگیرسێندرێ، پاشان داوای عەفو و گوزەشت دەست پێبکرێ.

جوملەی (وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَى مَا فَعَلُواْ من الذنوب حال ما کانوا عالمين) واتە دەوام ناهێنن لە سەر ئەو گوناهانەی کردوویانن دە حاڵێکـدا کە بە گونـاهی حەرامبوونیـان دەزانـن و ئاشـنان، چونکە کەسێک بە حەرامی شت نەزان بێ لە ئەنجام دانیدا عوزری دەبێ، بەڵام ئاشـنا بە حەرام لە ئەنجام دانیدا عوزری لێ قبووڵ ناکرێ. بە کوردی و بە کورتی، تەکلیف لە ئەقـڵە چـونکە بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر، کێ ئەقڵی پتەو نەبێ و یا نەیبێ، داوای لێ ناکرێ؛ (رُفِـعَ الْعِلْـمُ عَـن ثَلاثٍ)، واتە تەکلیف لە سێ کەس ناکرێ، ئەو سێ کەسانەش ئەوانەن: شێت، منداڵ، بێهۆش.

وەک لە ئیشارات و وەزن کردنی ئایەتی ١٣٥ی ئالی عیمـران دەردەکەوێ و خـۆ دەنـوێنێ، موتتەقین و تۆبەکار بە پاداشی زۆر بەرز و بـێوێنە دەگەن بەو هـۆیە کە بۆخۆیـان دە عەمەلـدا بێوێنەن سستی و تەنبەڵی و کەترەخەمی لە لای واندا ئەسەری دیار نییە، شانە خاڵی نـاکەن لە بەرابەر ئەرکی خۆیان، بۆیە دەگەن بەو پاداشە: ئەمینی لە عەزابی خودا، گەیشتن بە سەواب، بۆ پشت ڕاست کردنەوەی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٣٦ی ئالی عیمران:

**أُولَـئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَجَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَـا وَنِعْـمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ ﴿١٣٦﴾** ئالی عیمران

**ئەوانە پاداشیان لە لای پەروەردگاریان لێخۆشبوونە و باخ و باخاتێکە کە ڕووباری بە ژێر دار و درەختەکانیان تێدەپەڕێت، هەتا هەتا لە ناویدا دەمێننەوە، ئای لەو خۆشییە، پاداشـی جـوان و شیرینی ئەو کەسانەی کە چاکەکارن و ناوەستن.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٣٦

بێ گومان لەو گوفتە و وەعدەی خودا ڕاستتر نە گـوفتە هەیە و نە وەعـدە، دەبـێ هەچـی ئیمان و باوەڕی بە خودا هەیە دەشبێ باوەڕی مزگێنی و هەڕەشەکانی بێ، جـا دە ئـایەتی ١٣٦دا ڕاست و ڕەوان و بە سەراحەت فەرمووی: ﴿أُولَـئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ﴾ واتە پاداشـی ئەوانە؛ ئەوانە کێن؟ موتتەقین، قووتدەرەوەی ڕق، تۆبەکار لە گوناحی فاحشەگەری یا ستەم لە نەفسی خۆ؛ بە کورتی، لە خوداترس و تۆبەکار؛ بە مەرجی ئەوەی تۆبەکار لە بەرەگە نەچێتە دەرێ، واتە

تا دەتوانێ تاوان بکا جا ئەگەر لە کار کەوت بێ، تۆبە؛ و زاناش بێ بە گوناه؛ جا ئەودەم جەزای لێخۆش‌بوونە لە لای کێ لێخۆش‌بوونە لە الی ئەو پەروەردگارەی کە حیسابیان دەگەڵ دەکا لە ڕۆژی حیسابدا و زاناشە بە چاکە و خراپەی بەندەی و بە هەستە و خورپە و چرتە و نیەتی دەروونی ئاگادارە جگە لە ئەو پاداشە لێخۆش‌بوونەیان کە پێ دەدا بەهەشتێکیان پێ دەبەخشێ هەر لە سۆنگەی ئەو ئاکار و کردەوە خالیسەیان، کە بە ژێر ئەو بەهەشتەدا چەند چۆم و ڕووباری پاک و ڕوون ڕەوانە و دەڕوا پێیدا، خۆشتر لەو نیعمەتانەش ئەو نیعمەتەشیان دەداتێ کە سەرتۆپی هەچی نیعمەتی قیامەتیە، کە دەوێدا مانەوەیە بە یەکجاری بۆ هەتا هەتایە؛ بە ئەمنی و بێ ترسان لەوان یەکێک بێتو بتوانێ دەرتکا و یا وەتگوێزێ بۆ شوێنی دیکە. جا دێرەدا جێیەتی و مافی خۆیەتی و شایانیەتی بکوترێ بە سەرەڕۆ و خەتاکاران، ئەگەر ئەو سەودایە دەگەڵ خودا نەکەن، واتە هەوا و هەوەسی کات و ساتی کەم و بێ دەوام نەدەن بە کات و ساتی بێ‌بڕانەوە و وا خۆش و بەلەزەت "اولئک کالانعام بل هم اضلّ".

**پاشەدۆ:**

ئەو ئایەتە دوو مزگێنی بەئەرزش و ڕێزداری لە لایەن خوداوە پێیە بۆ یارانی بەتەقوا و تۆبەکاری خودا پەسندانە کە ژوورای لە مزگێنیانە، مزگێنی نین و نابن:

١. یەک لەو مزگێنیانە ئەوەیە: ئەمین بن لە عەزابی ڕۆژی حیسابی، واتە ڕۆژی قیامەت، کە خودا بۆ خۆی بە سەراحەت ئیشارەی وەلا کرد و فەرمووی: مغفرة من ربّهم: لێخۆش‌بوون بۆ وانە لە لای خودا.

٢. مزگێنی دوو لەو دوو مزگێنیانە: پێ‌بەخشینی پاداش و سەواب بەوانە بە پێی ئایەتی ﴿وَجَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ واتە باخ و باخاتێ کە لە ژێریانەوە ڕووبار ڕەوانە و دەوێشدا بۆ هەمیشە دەبن. ئەو نیعمەتەیان کە پێ دەبەخشرێ سەبارەت بە عەمەلی چاک و پاکی خۆیانەوەیە، بۆیە خودای تەعالا لە ئاخری ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿وَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ﴾ واتە چەند شیرین و بەلەزەتە پاداشی کاریان؛ واتە پاداشی کاری کارکەران.

قازی عەبدولجەبار هەمەدانی فەرموویەتی: ئەو کەسەی دەڵێ: سەوابی چاک خودا لە خۆیەوە دەیدا لە ڕووی عەمەل نییە، وا نییە؛ بەڵکە لە سەر عەمەلە. (تفسیر کبیر، هەمان ئایەت).

دەبێ ئەوە بزاندرێ کە خودای تەعالا بە سەر بەندەگی‌کەران و تۆبەچییان بەخشین و پاداشی وەعدە داوە، ڕاستر لە وەعدەی خوداش وەعدە نییە؛ و هەر وا وەعدەی ئەو بەخششی

حەواڵە کرد بۆ سەر تاعەت و تەقوا و تۆبەی خۆیان بێ منەت، ئەو جەریاناتە بە پێی بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی دەروانێتە حاڵەتی چاکەکاران و خراپەکارانی دەورانی ڕابردوو، واتە لە ڕابردووشدا کێ چاکی کردبێ، چاکی وەرێ دێ، کێش خراپی کردبێ، خراپی وەرێ دێ. بێ گومان ئەوە نیزامی یاسای خودایە: جەزای چاکان چاکەیە و جەزای ناپاکانیش خراپەیە؛ مەگەر بەزە و ڕەحمی جوداگانەی خودا دە هاوار کەوێ.

دڵی بەپرسیار و بزۆز دێرەدا واتە: دە بەیانی سیفاتی بەرزی موتتەقیان و جەزا و پاداشی عاقیبەتیان دەمێ هەستی هەستی و ڕاپەڕێ بەرەو ئەو پرسیارە کە ئایا حاڵی گەلان و ئۆمەتانی ڕابردووش دەبێ هەر ئاوا بێ؟ یانی نیزامی نەزمی خودای بێهاوتا ل ەسەر ئەو تەوەرە وەستا و چەرخاوە، واتە کێ ڕاست ڕۆیشتبێ پێ گەیشتووە بە نیاز و مەبەستی، کێش بە خوار و خێچی ڕۆیشتبێ، نەگەیشتووە بە مەبەست و نیازی، بە پەرێشانی سەری ناوەتەوە. جا بۆ تەئکیدی ئەو ڕاستییە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ١٣٧ی ئالی عیمران، بۆ تێگەیشتنی تەواو:

**قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُواْ فِي الأَرْضِ فَانْظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ** ﴿١٣٧﴾ ئالی عیمران

**بێ گومان لە پێش ئێوەشدا چەندین داب و نەریت تێپەڕیون، کەواتە: لەو سەرزەوییەدا گەشتێ بکەن، زۆر بە قووڵی سەرنج بدەن، سەرەنجامی ئەو کەسانەی کە دینیان بە درۆ زانیوە چییان لێ هاتووە!**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٣٧**

بەڕاستی بەر لە ئێوە چەند ڕووداوی درۆزنان ڕۆیشت ئینجا بە زەویدا بڕۆن و سەیری وڵات و ئاساری بەر لە خۆتان بکەن و بکەونە سەر یاد و دەورانی ژینیان کە سەرەنجامی چینی ئینسان ڕۆیشتنە چین بە چین دە کاتی خۆیدا بێ پاش و پێش کردنی ڕۆیشتنیان، ئەودەم دەبینن کە سەرەنجامی درۆزنان و خوار و خێچ ڕەوەندەکان چۆن بووە، کە هەمیشە دە حەولی ئاژاوە نانەوە بوون و یەک بە یەک و جیا بە جیا پیلانیان ڕێک دەخستن، بۆ ئەو پێغەمبەرانە کە بە ئەمری باری تەعالا بە بەرنامەی ڕێکوپێک و دروست و ڕەوا خەڵکیان ڕێنومایی دەکرد بەتایبەت ئەوانەی کە درۆزن و بێباوەڕ و ناهەموار بوون، سەرەنجام ڕاست و خوار بوو بە قوربانی نەمان و فەنا، پێغەمبەران سەرکەوتن و خوار و خێچەکان و درۆزنەکان کەوتنە زەلکاوی چارەڕەشی و ڕەنج بە خەساری. بە کوردی و بە کورتی، هەچی لە هۆڵ و هۆدەی نەبووندا بەرەو هۆڵ و

هۆدەی ژینی دنیا وەڕێ خرا، بێگومان بەرەو دنیـای بـێ بـڕانەوە دێ و دەچـێ. واتە نەبـوونی بەرەو بوونی دنیای فانی و بڕانەوە، جووڵانەوەیە بەرەو دنیای باقی و بێبڕانەوە. جا هەی لەوەی خەنی لە خۆی کە دەزانێ ئەو سەفەرە و ئەو کاروانە بێ ڕاز و سوڕ نییە. بەڵکە ڕازاوە و خاوەنی حیکمەتـی پـڕ لە ڕازی ڕازاوەیە، کـاکڵی ئەو ڕازانەش بەنـدەگییە، هەوێنـی ئەو بەنـدەگییەش خزمەت بە ئینسانە خالیسانە ڕاست ڕۆیشتنە پاکانە، کێ بڵـێ: الـلە ربّنـا، دەبـێ ڕاسـت بـێ و ڕاست بڕوا، (إِنَّ الَّذِينَ قالوا ربَّنا ثُمَّ اسْتَقاموا) ئەوانەی دەڵێن ئەڵڵا ڕەببی ئێمەیە دەبێ ڕاوەسـتاو بێ لە سەر ئەو قسە ڕاستییە، دەنا بێگومـانە لە درۆزنـانە، دەکەوێـتە ڕیـزی (كَيْـفَ كـانَ عَاقِبَـةُ الْمُكذِّبِينَ) با لە دنیاشدا خۆ حاشار دا لە قیامەتدا حاشارگە قاتە.

**بۆ ئاگاداری:**

مەبەسـت لەو ئـایەتە پیـرۆزەی ١٣٧ی ئـالی عیمـران ئەوەیە لە لایەن خـوداوە دە ئینسـان گەیێندراوە کە لە ڕابردوودا قەوم بوون و هاتوون و ڕابردوون سنونەت و یاسای خودایان لە سەر بووە.

بە زۆری قورئانزانەکـان لە سـەر وشـەی «سـنن» نەزەریـان ئـاوا داوە: بـن بـڕ کـردن و لەنـاوچوونی گەلان بە پێـی ئەو دەلـیلە کە خـودا دەفەرمـوێ: ﴿فَـانْظُرُواْ كَيْـفَ كانَ عَاقِبَـةُ الْمُكذِّبِينَ﴾ چونکە ئەو درۆزنانە بە هۆی هەوا و هەوەس پەرەسـتی دنیـا و لەززەتـی کـاتی دە بەرابەر ئەمر و دەستووراتی پێغەمبەران سەرپێچییان لە خۆ نیشان داوە، تا لە ناو چوون لە سـەر ئەو ئاکارە ناحەزەیان بەردەوام بوون، کاتێ نەماویشن هیچ ئاسارێکی باشیان بەجێ نەهێشـت و لەعنەتیشیان بە پێی فیلان لە دنیادا عەزابـی خـودا لە قیامەتـدا ئامـادەیە بۆیـان. جـا ئەدێـرەدایە خودای تەعالا ئەو ئیسلامەی کە خەبەری پێدا لەو بارە و بۆوەیە دەرسی لێ وەرگرن.

بەڵام مجاهد کە یەکێکە لە قورئانزانان لەسەر واژەی «سنن» ئاوای نەزەر داوە کە مەبەست لە سونەن کافر و موسڵمانان، یـانی هەردووکیـان بە نـۆرەی خۆیـان دەڕۆن، ئەوەی لە پاشـیان دەمێنێتەوە، کرداریانە، یا چاکە و ڕەحمەتە، یا خراپە و لەعنەتە، هەر ئەوەشە کە خودا بۆ درۆزنان فەرموویەتی: ﴿كَيْفَ كانَ عَاقِبَةُ الْمُكذِّبِينَ؛ ﴿١٣٧﴾﴾ و بـۆ ڕاسـتگۆیان فەرمـوویەتی: ﴿أُعِـدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ؛ ﴿١٣٣﴾﴾ ﴿وَ الْعاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾

مەبەست لە ئایەتی ﴿فَسِيرُواْ فِي الأَرْضِ فَانْظُرُواْ﴾ واتە بە ڕووی زەویدا بگەڕێن بـۆ دیتنـی

حاڵی درۆزنان، ئەوە نییە بۆ کەیفە بگەڕێ و چەرخان بـدەی، بەڵـکە بـۆ تێگەیشـتن، لە حـاڵی گەلانی سەرەڕۆ و هەواپەرست کە چییان لە پاش خۆیان بەجێ هێشـتووە، دەبـێ دەرسـی لـێ وەرگری و بڕوانی لە مێژووی ڕابردووەکان، تـاکوو بە تێـر و تەسـەلی لەو چەرخوخـولەی دنیـا بگەی و بزانی و وەبەر پەڕەی تیخی خولی نەکەوی.

**پاشەدۆ:**

قورئان دەورانی ڕابردوو دەگەڵ دەورانی حازر ڕووبەڕووی یەکیـان ڕادەگـرێ چـونکە بـۆ دەرکی حەقیقەت دەبێ ئاسار و فکری بەسەرچووەکان دەگەڵ فکر و ئاسەواری ئێستێ لە وەزن درێن و پێک هەڵکێشرێن، وەک دیارە و حاشاهەڵگر نییە، خودا بۆ گەلانـی ڕابـردووش یاسـا و سـوننەتی بـووە بەڵام ئەو یاسـا و سـوننەتە تـایبەتی ئەو گەلە نەبـووە، بەڵـکە بە شـوێەیەکی دەستاودەستی بۆ هەموو گەلان دامەزراوە، واتە بۆ ڕابـردووان و حـازران وەک پـرد بە سـەریدا دەبێ بێن و بچن، ئینسان دەتـوانێ بە وەسـیلەی تەماشـا و هەڵسـەنگاندنی ئەوزاعـی هەر دوو دنیای چـوو و هـاتوو ڕێگـای بەخـتەوەری وەدۆزێ لە هەر بـارێکەوە، واتە ڕێبـازی دەسـەر و دەبەری دەکرێ دەبێ وەقۆزرێ لە وەزن کردن و بەرجەوەندی دەسەر و دەبەری گەلان. خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم ئەگەر دەستووری سـەفەر و گەڕانـی سـەرزەوی بـۆ ئینسـان دەس نیشان کردووە، سەفەری کەیفە و لەززەت و هەوا و هەوەس‌پەرەسـتی دەسـتوور نەداوە و وەک ئەوڕۆ دیارە و دەبیندرێ، بەڵکە دەستووری سەفەری مەعنەوی و دەرسی عیـبرەت و بیـرەوەری داوە، واتە کامە ڕێ بۆ گەیشتن بە دوندی مەبەست و خۆشبەختی ئاسانە و هەیە ئەو وەدۆزێ و بگرێتە بەر، چونکە ڕێگاکـان هەمـوو هەن چ سـەخت و هەڵەمـووت، چ ئاسـان و ڕەوان؛ ئەو دۆزیـنەوەش بە کفـر و بەراوەرد کە سـەنگەری جـووڵانەوە و ڕاپەڕیـنە، دەدۆزرێـتەوە، نەک بە هەڵەشە و مل‌ملانە، ڕۆیشـتن و ئـاوڕ نەدانەوە، ڕابـردوو ئـاوێنەی داهـاتوویە، ڕابـردوو چـرای گرشەدار و فانۆسی داهاتوویە، نەکەی چرا و فانۆسی دە پاش خۆت هەڵاوەسسی بەڵکە دەبـێ دە پێش خۆتی گری، دیتن بە پێشەوەیە بە پاشەوە نییە.

**سووکە ئاوڕێک:**

ئایاتی قورئان جگە لەوەی ڕووناکایی دڵە، ڕووناکایی چاوانیشە، جا بۆ باوەڕی و تەسلیم و تەسدیقی ئەو حەقیقەتە دەبـێ سـەرێک لە ئـایەتی ١٣٨ی ئـالی عیمـران هەڵێنـین و ئـایەتەکە بە

شەنەی دڵ شەن کەین و بە هێڵەگی بیر و بەرجەوەندی دایتەقێنین تاکوو ئەو ڕاز و سوڕەی کە بە دووی یەکدا قەتارە و ڕیز کراون دە ناو وشەکانی (هدی و موعظة و متقین) وەدۆزرێن:

هَـٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾ ئالی عیمران
ئەوە ڕوونکردنەوەیەکە بۆ خەڵکی و ڕێنوێنی و پەند و ئامۆژگاریشە بۆ پارێزگاران.

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٣٨**

ئا ئەو قورئانە واتە هەڵسەنگاندن و بەراوەردی ئایەتەکانی بۆ ئەوانەی نەخۆش و نەزانییان هەیە و دڵپەرێشان و نابەڵەدییان هەیە لە هەر بارێکەوە شیفایە و دەوایە، بە مەرجێ وەک دەرمانی دوکتوری دەکاری بێنێ و لە دەستوروی دوکتور لانەدا، یانی ئەو ڕێبەرە قورئانزانە بەو زار و ودمی پاراوی، بەو زاراوە ڕەوانەی هەیەتی، چۆنت تێدەگەیێنێ و پێت دەڵێ ئایەتەکان شارەزات دەکا ئەتۆش شوێنی بکەوی و لە دەستووری لا نەدەی، بێگومان بە لە نەخۆشی ئەقیدە و بیر و باوەڕێکی کە لێی نیگەران و دوودڵی، شیفات دێ و ڕزگار دەبی، تا هەی نەخۆش نابیەوە، چونکە بەڕاستی هەر قورئانە دە گوفتەی خۆیدا ڕاست و ڕەوانە، و لە ڕێنوێنییەکانیدا خوار و خێچ نابیندرێ، لە ئامۆژگاری پارێزگاراندا ڕاستتر و چاتر نابیندرێ لە قورئان، بۆوەی نابێ ئینسان دەرس لە قورئان وەرنەگرێ بەو دەلیلە: بێ حەق و بەها ڕێنومات دەکا، بێ منەت و بێ خۆ لە سەر هەڵکێشان شارەزات دەکا، دەگەڵ دڵ و ویژدان و کەرامەت و ئەقڵت دەدوێ و هیچ شتێکت لێ حاشار نادا، جلوبەرگێکە بە خەیاتی ڕۆژی ئەزەل پڕاوپڕی بەژن و باڵات بڕاوە و ئەندازە گیراوە، لە هیچ بار و بابەتێکەوە کورت و درێژی لێ چاو ناکرێ، جا ئیدی ئەگەر تۆڕۆ و بزۆز بی و نەیپۆشی و دەبەری نەکەی، هەر بە ڕووت و قووتی بگەڕێی، بە هیوای ئازادی و سەربەخۆیی، ئەوە هەر بەو نەخۆشیەی سەر دەنێیەوە، دەستبەتاڵ و ڕەنج بەخەسار دەتهێننەوە ڕوو بۆ مەحکەمەی ئەو لاسارییەت.

**قورئانناسی:**

قورئان خاوەنی سێ سیفەتی تایبەتین و بەرزن: ١. یەکێک لەو سێ سیفەتە تایبەتیانە ئەوەیە: قورئان ڕوونکەرەوەی دەستوورات و یاسای زمانی ئەڵڵا تەعالایە دە قورئانیدایە ئەوەی هۆی ڕەزایەتی و ناڕەزایەتی خودایە.

٢. قورئان وەسیلەی شارەزایی تەواوە بۆ ئینسان، قورئان لە لایەکی قەزاوەت دەکا و قازییە،

و لەو لایەشەوە ڕێنوێنییە بێ فەرق و جیاوازی لە نێوان شا و گەدا و خزم و بێگانە و ژن و پیاو و چووک و گەورە، پەناهەندە و نشتەجێ.

٣. قورئان نسحەتکەر و شارەزاچی ئینسانە بۆ لای ڕاست، کە خودایە، و ترسان لە خودا؛ ئینسان هەچەندی خاوەن سەروەت و سامان بێ و بێ نیاز، بەڵام لە ڕاست قورئان گەدایە و خاوەن نیاز، قورئان خاوەنی خەزێنەیەکە کە ئەو خەزێنەیە هاوار دەکا و دەڵێ: کێیە نەزانە با بێ زانای کەم، کێیە فەقیرە، با بێ غەنی و خەنی کەم، کێیە نابینایە با بێ بینای کەم، کێیە نەبیسە و کەڕە با بی بیسەر و بەگوێی کەم، کێیە خوازیار و پاپایەتی بەسەرهاتی گەلانی ڕابردوو بزانێ، با بێ لە پەنچەرەی قورئاندا سەر بەسەرهاتی گەلانی ڕابردوو لە ئادەمەوە تا دەگاتە خاتەم (محمد المصطفی) بکات و بزانێ. ئەگەر خۆ ببوێرێ کەسێک لەو هەلە، کالانعام بل هم اضلّ.

**بۆ ئاگاداری:**

لە هەڵسەنگاندن و وەزن کردنی ئایەتی ١٣٨ی ئالی عیمران دوو ڕازی ڕێزدار سەر لە سوێگەی وەدەر دەنێن، بە ناڕەوا دێتە حیساب و دەژمێردرێ کە ڕوویان لێ وەرگێڕدرێ و سەیریان نەکرێ، ڕازەکان ئەوەن:

لە سەرەتای ئایەتەکە کە وشەی (هذا) خۆ دەنوێنێ بە واتەی ئاوڕدانەوەشە وەلای دواوە، دەبێ ئەو شتانەی هارای ئاوڕ دەرەوە ئاوڕیان وەسەر دەدا، بزانـدرێن و بناسرێن، دەنا ئەگەر نەناسرێن ئاوڕەکە بێ مەبەست و بێ هەدەف دێتە دەرێ، خۆ دیارە ئەوەش لە قورئانی کەلامی خودای فەسیح و بەلیغ بەدوورە و ناوەشێتەوە، جا کەوایە دەبێ بڵێین لە ئەسەری تێکۆشان و هەڵسووڕان بیر و بەوێدا بەو قەناعەتە گەیشتین کە ئەوەی وشەی (هذا) ئاوڕیان وەسەر دەدا (امر و نهی و وعد و عید)ن کە دە قورئاندا هاتوون، و هەروا ئەنواعی بەیانات و ئایاتێکن کە لەو بارەوە یادیان کراوە

دووبارە کە بە دوای (هذا)دا جوملەی (بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ) ئەوانە بە دابی عیلمی نەحو عەتفن، عەتفیش دەبێ مانایان جیاواز لە یەک بن، واتە مانای هدی دەگەڵ مانای موعظة و هەروا مانای وشەی بێنات جیاواز لە یەک بن، دەنا دەبێتە کەلامی بێجێ و ڕێی وەک کەلامی ناشییان، پەنا بە خودا. جا لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ بکوترێ: وشەی "بیان" بریتییە لەو شارەزایەی کە گومان و شیبهی مەبەست لەو بارەوە نابێ بێتە خەیاڵەوە، جا بەو پێیە دەبێ وشەی بەیان بە عام دانێین، بۆ هەر مەبەستێکی دەکار کەی هەڵدەگرێ، و وشەی "هدی"

عیبارەتە لە هیدایەت و شارەزایی، بۆ گومڕایی و خوار و خێچی ناچێتەوە. وشەی "موعظة" عیبارەتە لە گوفتە و وتارێک هەچی سزاوار و شایانی شەئنی دین نەبێ، نابێ و نایەتە ڕوو و نایگرێتەوە. بە کورتی وشەی "بیان" بۆ عامە واتە گشتییە کە شاملی دوو مەبەست دەتوانێ ببێ:
١. یەکیان لەو دوو مەبەستانە ئەوەیە: "بیان" وتەیەکە و وتارێکە بۆ دین شایانە و دەگونجێ، بەو وتارە دەکوترێ "هدی". ٢. دووهەم لەو دوو مەبەستانەی کە لە ژێر پۆششی "بیان"دایە بریتییە لە بەری گوفتارێک کە ئاگادارییە لە سەر ئەوەی لادەی لە شتانێک کە ڕەواجیان دە دیندا نییە، ئەو بەشە ئاگادارییە "موعظة".

هەندێکیش نەزەریان لە سەر وشەی "بیان" ئاوا داوە: کە بەیانی شارەزاییە، ئەمما "هدي"ش هەر شارەزاییە بەو مەرجە کە بە سەر مەنزڵی هیدایەت بگا.

ئەو باسە لە تەفسیری " هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ"دا دە ئایەتی ٢ی سووڕەی بەقەرەدا هەیە، ورد بڕوانە و سەیرکە:

تایبەتمەندی موتتەقین بەو سێ سیفەتە بەرزانەی "بیان، هدی" موعظة" ئەو ڕازەی دە بندا ڕازاوە کە بەغەیرەز موتتەقین و لەخواترسان کەس توانای ئەوەی نییە بەهرە لەو سیفەتانە وەرگرێ. جا بۆ ڕاست کردنەوەی ئەو ڕاستییە دەچینە خەزێنەی خودا کە قورئانە ئایەتەکانی ۴۵ی نازعات، ١١ یس، ٢٨ فاطر:

**إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَاهَا ﴿٤٥﴾ نازعات**
**وەنەبێ ئەتۆ ترسدەر بی ئیللا بۆ وانە نەبێ کە خاوەنی لە خودا ترسن.**

**إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ اتَّبَعَ الذِّكْرَ ﴿١١﴾ يس**
**وەنەبێ بترسێ لە خودا ئەگەر ترسی هەبێ ئەو کەسە دەیبێ کە خاوەنی یادی لە خودا و یا تابیعی قورئانە**

**إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاء ﴿٢٨﴾ فاطر**
**وەنەبێ بترسن لە خودا، ئەگەر بترسێن زانایان دەترسێن.**

بە هۆی ئەوەی خودا دەفەرموێ ﴿هَـٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ﴾ ئەوەش بۆخۆی عامە، پاشان دەفەرموێ: ﴿وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ﴾ وتارێکی تایبەتی دێتە ڕوو بۆ لەخوداترسان، بۆ زێدە زانین سەیری تەفسیری کەبیر پێویستە باسی هەمان ئایەتی ١٣٨ی ئالی عیمران.

**پێشوازێک بۆ تێگەیشتن لەوەی دێ بەرەو پیرت:**

دەبێ بزانین ئەوەی دە پێشدا ڕابرد دە ناو دەروونی ئایەتی ١٣٧ واتە ﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ...﴾ و هەروا دە ناو دەروونی ١٣٨دا وەک پێشوازێکە بۆ حالیبوون لە ئـایەتی ١٣٩ی ئـالی عیمران، یانی هەر کاتێ لە بەسەرهاتی کارەساتی دەورانــی ڕابــردوو تێفکــرین و حەول و دەول دان بێتە ڕوو دەکــار بکــرێ، وەک لە بەســەرهاتی کــافران و موســوڵمانان دە پێشــدا، بە چــاکی تێدەگەین ئەگەر هێرش و شاڵاوی بە هەڵکەوتەی کافران بۆ ســەر ئەهلــی ئــیمان ڕووی دابــێ، سەرەنجامیان بە شکست و تێشکان هاتۆتە گۆڕێ، واتە ئاڵای حەق بە بەرز و شەکاوەیی هاتۆتە ڕوو و چاو کراوە. ئاڵای هێرشی سەرەڕۆیان و یاغیان بە نابوودی و نەوی بوونەوە هاتۆتە ڕوو. کەوایە ئەی ئەهلی ئیمان و حەق، ئەوە بە شایان نازاندرێ و شایان نیـیە نەخـتە ســەرکەوتنێکی کافران بە سەر موسوڵماناندا کە لە ڕۆژی هەرای ئوحوددا چــاو کــرا، ببێــتە ســەبەب و هــۆ بــۆ سستی و لاوازی ورەی دڵ و هیواتان و پاشەکشەتان لە خەزا و جیهادتان، بەڵکە پێویستە ئەرکی ئیمانتــانە غیــرەت و ئومێــد و هیواتــان لەوپەڕی بەرزیــدا بــێ، بەو ئومیــدەوە کە بەو زووانە سەرکەوتن و پیرۆزیتان بەرەو پیر دێ و دەیبینن هێز و سەربەزی و سەرکەوتن هەر بەشی ئێوەی ئەهلی حەقە.

بۆ ڕاستی ئەو ڕاستییە دەبێ بچینە خـزمەت ئـایەتی ١٣٩ی ئـالی عیمـران تـا بە تەواوی لە ناوەرۆکی جەریان بە وەسیلەی ئەو ئایەتە پیرۆزە حاڵی بین. ئەوەش ئایەتەکە:

**وَلاَ تَهِنُوا وَلاَ تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾**

**کز و لاواز مەبن و خەم و پەژارەشتان نەبێ، هەر ئێوە سەرکەوتوون ئەگەر ئیمانو بێ.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٣٩**

واتە ئەی ئەهلــی ئــیمان و یــارانی شــەڕکەر، سســتی لە خــۆ نیشــان مەدەن و خەفەت لە ڕابــردووش مەخــۆن، بــۆ وەی لە شــەڕی ڕۆژی ئوحــوددا کە وەک شــەڕی بەدر ســەرکەوتنو بەدەست نەهێنا و زۆرو شەهید دا، کە لە هەمــان کــات و حاڵەتــدا ئێــوە هەر بەرزن بە مەرجــێ بڕوادار بن، نەچن بیر لە ڕابردوو وەکەن و بیکەنە خەفەت، تێشکانی ئوحود و دەست شــل کەن و پاشەکشــە لە جیهــاد بــکەن، ئەوە بــزانن دە دڵــدا وەک هیــوا و ئومێــدێکی بەتــین ڕابگــرن کە سەربەرزی و سەرکەوتن لە لانی خوداوە هەر بۆ ئێوەی موسوڵمانە.

لە عەلامە واحدی و ئیبنی عەباسەوە: بە هۆی ئەوەی موسـولْمانەکانی شـەڕکەر لە هەرای ڕۆژی ئوحـوددا لە هەوەڵ قۆنـاغی شـەڕدا تووشـی شـکان هـاتن، کەوتـنە نـاو پەژارە و پەرێشانییەکی زۆرەوە، لەو کات و ساتە سەختەشدا خالـدی کـوڕی وەلیـد وێـستا موسـوڵمان نەبووە دەگەڵ لەشکری کافران بوو زۆریش لێزان بوو لە فێڵ و فووتی شەڕدا، ئەو پەرێشـانی و لێک پرژ و بڵاوییەی موسولْماننی بە هەل و فرسەتێکی نەغـدی قـۆزتەوە، هێرشـی کـردە سـەر موسوڵمانانی پەرێشان، جا کاتێ حەزرەتی ڕەسووڵ هەستی بەو مەبەست و قەسدەی وان کـرد و تێگەیی، تێبینانە پەنای بردە بەر دەرگای خودا و دەستی هەڵێنا و فەرمووی: «اَللّٰهُـمَّ لا یَعْلـونَ عَلَینا، أَللَّهُمَّ لا قوَّةَ لَنا إلاّ بِکَ، اللّٰهُمَّ لَیسَ یَعبُدُکَ بِهٰذِهِ الْبَلْدَةِ غَیرِ هٰؤلاءِ النَّفَر» واتە یـا ڕەببەنـا، نەهێڵی و ڕێ نەدەی ئەوانە ڕەسەر ئێمە بکەون، خودایە ئێمە هێز و توانامان نییە بێ لە هیممەت و کەرەم و لـوتفی تـۆ، خـودایە لەو سـەرزەوییە بەغەیـرەز ئەو یـارە شـەڕکەرانە نەبـووە کەسـێک بتپەرەستێ و بەندەگیت بکا.

لە سـەر ئەو پـاڕانەوەی پێغەمـبەر هەڵوێسـتی مبـارەکی حەزرەتـی ڕەسـووڵ لەشـکری موسوڵمانن تینیان هاتەوە بەر و جووڵانەوە و دەستیان کرد بە ڕاپەڕین، چەند لاوێکی بەگـوڕ و گورج و گۆڵ دە خۆ نووسان و شێرانە خۆیان گەیاندە سەر کێوی ئوحود پـێش ئەوەی دوژمـن بتوانێ خۆی بگەیەنێتێ، ئینجا لەوێرا دوژمنیان دایە بەر ڕەهێڵەی تیر و تیرەبـاران و بەرەو پاشـیان ڕانان و تێکیان شکاندن. جا گۆیا ئەو ئایەتە ۱۳۹یەی ئالی عیمران، دەو کاتەدا دابەزی بـۆ سـەر پێغەمبەر ﴿وَأَنتُمُ الأَعْلَوْنَ﴾ . ابن جریر طبری لە ج۴۴۷/۳ وای نەقڵ کردووە.

بەڵام ئیمام زهری و قەتادە نەزەریان وایە ئەو ئایەتە هۆی دابەزینی تایبەتی نیـیە، بەڵـکە بـۆ دڵخۆشی دانەوەی موسوڵمانانە دە کارەساتی هەرای ئوحوددا. طبری، ۴۴۲/۳.

دەو کاتیدا بوو کە وێستا پێغەمبەر نەگەیشتبووە مەدیـنە خەبەر هـات و گەیشـتە لەشـکری ئیسلام بەتایبەت پێغەمبەر، کە موشریکان بە خەیاڵی خۆیان زۆرزیـان لە لەشـکری موسـوڵمان کوشتووە و بریندار کردوون و ئەوانەی ماونەوەش پەرێشـان و سەراسـیمەن، جەنـگەی هێـرش بەرنە سەریانە، دەیانهەوێ کافرەکان هێرشیان کەنێ، و یەکسـەرە لە ناویـان بەرن. پێغەمـبەر دەو کاتە ناسکەدا ڕوو دە لەشکری موسوڵمانان دەکا و دەفەرموێ: هـا بـزانن قوڕەیشـییە کافرەکـان هەڵوێستیان ئاوا گرتووە، هێرشتان بکەنە سەر و دە ناوتان خزێن بەڵام مەترسن و سسـت مەبـن مۆڵەتیان نەدەنێ یاریدەدەر و پشتیوانی مە خودایە.

جا ئە دێرەدا بوو لاوانی بە زیپک و دەخۆڕادیو بەر لەوەی ئەوان کافران خۆ بگەیێننە سەر کێوی ئوحود، یارانی ئیسلام خۆیان گەیاند و لەوێڕا ئەوانیان پاشەکشە پێ کرد و ڕاویاننان و ئالآی ئیسلام بە زوبەیری کوڕی عەوام بوو کاتێ کافرانی بە خەیاڵ هێرش‌بەر ئاوا ئالآی ئیسلامیان چاو کرد، نەترەیان چوو و سەرسووڕ مان و ورەیان بەر دا و هەر یەکەی بە لایەکدا هەڵاتن بەرەو مەککە.

لە بابەت ئەو کارەساتە ئایەتی ١٧٢ی ئالی عیمران دابەزی بە وردی لە سەرەخۆیی دەبێ سەیری کرێ و هەڵسەنگێندرێ لە کەو و داژگیر درێ بەتایبەت ئەوانەی شەڕی نەتەوایەتی و عیزەتی خۆیان بە ملەوەیە.

**الَّذِينَ اسْتَجَابُواْ لِلّهِ وَالرَّسُولِ مِن بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ لِلَّذِينَ أَحْسَنُواْ مِنْهُمْ وَاتَّقَواْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾** ئالی عیمران

**ئەوانەی وەڵامی دەستوور و فەرمانی باری تەعالا و حەزرەتی ڕەسووڵی خودایان بە دڵ دایەوە، پاش ئەوەی کە تووشی زام و برین بوون، بۆ ئەوانەی چاکەیان بەجێ هێناوە، لەوان و خۆپارێزن، پاداشی گەورە و بەرچاویان بۆ داندراوە و هەیە.**

شەڕی ڕۆژی ئوحود کە لە ڕۆژی شەممەی ٧ی شەووالی ساڵی سێی کۆچی ڕووی داوە کە لە هەوەڵین هەڵمەتدا موسوڵمانان سەرکەوتن و پیرۆزییان بە دەست هێنا، و لە هەڵمەتی دووهەمیاندا بە هۆی خافڵان بە تالآن و ماڵی دنیا شکستیان هێنا و بت‌پەرستان سەرکەوتن، پاشان بە هۆی غیرەت وەبەرنانیان لە لایەن پێغەمبەرەوە لە دەوری پێغەمبەر وەکۆ بوون و بە شکستی خۆیان زانی. بۆ جوبڕانی ئەو تێشکانە هیمەتیان لە خۆ نیشان دا و کەوتنە هێرش بردن و هەڵمەت کردن بۆ جاری سێهەم دوژمنیان تێک شکاند و ڕاویان نان و بت‌پەرستیانیان شپرزە کرد و ناچاریان کردن کە شوێنی شەڕگەیان چۆڵ کەن و بەرەو مەککە بگەڕێنەوە بە سەرشۆڕی و خەجاڵەت‌باری. ئینجا پاش ئەوەی کە متمانە پەیدا بوو لە سەر ئەوەی لەشکری بت‌پەرستان گورزێکی وایان وێ کەوتووە تەزاون و ناتوانن و هێزی گەڕانەوەیان لە دەس داوە. ئەوجار موسوڵمانەکان بە پێی ئەو ئیتمینانەوە ویستیان لە دەوری پێغەمبەر بڵاوە بکەن، حەزرەتی ڕەسووڵ هەواڵی بەڕاستی پاشەکشە و گەڕانەوەی بەرەو دوای ئەبوسوفیان و لەشکرەکەی پێ گەیی، ئەوجار پێغەمبەر بە وەسیلەی جاڕکێش دەستووری بانگاواز و جاڕی دا و بانگاوازیان کرد کە موسوڵمانان کۆوە بن و وەشوێن ئەو لەشکرە تێک شکاوەی بت‌پەرستان بکەون. بەڵێ

پێغەمبەر و شەش‌سەد کەس لە یارانی شەڕکەر کەوتنە پەیسەری کافرانی هەڵاتووی تێک‌شکاو و تا گەیشتنە ئەو شوێنەیی کە ناوی "حمراء الاسد"ە، لەوێدا باروبنە و بارگەیان خست و مەعبەدی خەزاعی هاتنە خزمەت پێغەمبەر و نیگەرانی خۆی نیشان دا. پێغەمبەر کە هەستی بە نیگەرانی ئەو نەفەرە کرد و لێی پرسی دەتهەوێ بۆ کوێ بچی؟ لە وڵامدا کوتی: مەککە دەچمەوە، حەزرەت پێی فەرموو جا ئەگەر دەچیەوە مەککە لە هەر کوێ بە ئەبوسوفیان گەیشتنی پێی بڵێ: پێغەمبەر بە لەشکرێکی زۆر و بەرفراوان لە شوێنێک بە ناوی "روحاء" لە ڕێگەتان وەستاون چاوەڕێتانە؛ کاتێ ئەو کاک مەعبەرە دەگا بە ئەبوسوفیان پێش ئەوەی مەعبەد ڕاسپاردەی پێغەمبەری پێ بڵێ، ئەبوسوفیان بۆ خۆی لە خۆیەوە کوتی: کاکە لە کوێڕا دێی و چ باسە لە ڕێگادا؟ مەعبەد لە وڵامدا پێی کوت خەبەری ڕێگا ئەوەیە کە پێت بڵێم پێغەمبەر ئەوەی بە مندا بۆ تۆی ڕەوانە کردووە کە ئەمن پێت بڵێم ئەو ڕاسپاردراوەش ئەوەیە وا لە شوێنێک بە ناوی ڕوحاء لە دیار تۆ وەستاوە، فەرموویەتی چاوەڕوانی ئەبوسوفیانم لێرەدا بە هێزێکی یەکجار زۆر و بەربڵاو، تەنانەت ئەوانەی کە لە شەڕی ئوحودیشدا ئامادە نەبوون ئەوانیشی وا لەگەڵ هاتوون. ئەبوسوفیان کاتێ ئەوەی لە مەعبەدی بیست ترسا و تۆقا و نەترەی چوو دەرجێ دەستووری دا بە لەشکرەکەی هەرچی زووە بەرەو مەککە وەگەڕێن مەبادا محەمەد و لەشکرەکەی بمانگەنێ و بنکوژن و بە دیلن گرن. جا ئەدێرەدایە کە هەندێک لە قورئانزانان نەزەریان وایە ئەو ئایەتە ۱۷۲ی ئالی عیمران دابەزیوە بە عینوانی مژدە بۆ ئەو هاوڕێیانەی پێغەمبەر کە لە پاش ئەو هەموو عەزابەی ئازار بریندار بوونەی تۆشیان هات، بەرەو هاوار و بانگاوازەکەی پێغەمبەر هاتن و ئیتاعەیان لێ کرد. بۆ زێدە زانین تەماشای تەفسیری ئەو ئایەتە کەن لە تەفسیری کەبیردا.

لەمەڕ بابەتی مانای ئایەتی ﴿وَأَنتُمُ الأَعْلَوْنَ إِن كُنْتُمْ مُّؤْمِنِينَ﴾ چەند ئاوڕدانەوەیەک هەیە، ئەو ئاوڕدانەوەیەش دەبێ ئەوانە بن:

١. ئاوڕ وەدەن وەسەر کەلام و مژدە شیرینەکەی خودای تەعالا بە وەسیلەی ئایەتی ۱۳۹ دەیدا، کە ئێوە ئەی موسوڵمانان دە شەڕی هەرای ڕۆژی ئوحود ۷۰ نەفەرو شەهید دا و هەروا تاقمێکیش‌و بریندار بوون، بەڵام دە مقابیلدا ۲۵ نەفەرو لە کافران کوشت و لە ئاخریشدا سەرکەوتن‌و بە دەس هێنا و لە هەرا و شەڕ و غەزاکانی دیکەش یەک لە سەر یەک بە سەریاندا زاڵ دەبوون.

٢. ئاوڕدانەوەی دوو وەسەر ئایەتی ﴿وَأَنتُمُ الأَعْلَوْنَ إِن كنْتُمْ مُّؤْمِنِينَ﴾ ئێوەی خاوەن باوەڕ و بەتەقوا بە مەرجی مانەوەو لە سەر ئیمان و باوەڕی، ڕێزدار و لەسەرووی کافرانی بتپەرستن، و هەروا بە هۆی دەستێ گرتن و لە دینی خودا، باوەڕی توندیش بە ڕۆژی قیامەت هیچ غەم و خەفەتێکو نابێ. قورئان و دینی ئیسلامی ئینکارناپەزیر شاهیدی ئەو ڕاستییەن، لە هەر دوو دنیا.

٣. ئاوڕی سێ وەلای ئەو ئایەتە: ئەگەر وەزنی کەی و لێی ورد بیەوە بەو نەتیجە دەکەی: مەقام و شەئنی ئێوەی موسوڵمانی شەڕکەر چ بکوژی و چ بتکوژن هەر لە سەرووی کافرانی لە هەر دوو لادا، بە پێچەوانەی کافران کە بکوژرێن بە هیلاک دەچن و لە دۆزخ بەولاوە هیوایەکیان نابێ، ئەگەر بشکووژن، هیوایەکیان نابێتە زەخیرە.

گۆیا ئیمامی قرطبی فەرموویەتی: پاش دابەزینی ئەو ئایەتە پیرۆزەی ١٣٩ی ئالی عیمران مزگێنی درایە دڵی ئەسحابەکان کە دە هەموو شەڕ و هەرایەکدا سەرکەوتنیان بە دەس دێنا، چ کەم بان، چ زۆر بان. تفسیر قرطبی، ج٢١٧/٤.

خودای تەعالا دەیهەوێ دڵخۆشیدانەوەی موسوڵمانان بدا و بکا، ئایەتی ١٣٩ی ئالی عیمران: ﴿وَلاَ تَهِنُوا وَلاَ تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الأَعْلَوْنَ إِن كنْتُمْ مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەو ئایەتە هاوار دەکا لە موسوڵمانان نە سست بن و نە غەم بخۆن چونکە ئێوە لە سەرووی کافرانن لە مەقام و شەئندا، ئەدێرەدا دڵ دەکەوێتە پرسیار لەو خەیاڵەی بۆی دێتە پێش وەک ئەوە: دەڵێ خودا لە کوێدا ئێمەی بە سست و لاواز و غەمخۆر دیوە و پێمان دەڵێ: خەیاڵی سستبوون و غەم داگرتن مەخەنە ناو دڵتان؟ جا خۆ ئەوەش یەقینە و حاشاهەڵنەگرە کە دەبێ هیچ پرسیارێک بێ وەڵام نابێ بێڵدرێتەوە. چونکە پرسیار شتێکە کە وەک مۆریانە دڵ دەکۆڵێ بێ جواب دڵ دادەگرێ و لە کاری شت زانین دەکەوێ. جا بۆیە خودای تەعالا دەیهەوێ تەم لە سەر دڵ ڕامالێ بەوەی دێرەدا: ئەی موسوڵمانان وەک ئێوە تووشی ئازاری برین دەبن، ئەوانیش وەک ئێوە تووشی ئازاری برینداری دەبن چونکە یاسایەکی ئەساسییە: تیر و تیخی تۆ چۆن دوژمن دەبڕێ، ئی ویش ئاوا ئەتۆ دەبڕێ، دەبێ تێکۆشانی دوژمن بە زایە نەچێ، وەک ئەتۆش تێکۆشانت بە زایە نادەی، بە کورتی و بە کوردی، پەرۆشی ئەوەت نەبێ برینداری، ئەویش بریندارە؛ شیر و تیر دۆست و نادۆست دەبڕێ.

شەڕ ئەقیدەی باتڵ و دروست لە مەڕ کوشتن و بڕین ناخوێنێتەوە، بەڵکە بە پێی هێز و

بێ‌هێز و تێکۆشان و غیرەت و لەخۆبردووییە، بۆ ڕاستی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۴۰ی ئالی عیمران تاکوو بە تێر و تەسەلی لەو بارەوە پاراو بین:

**إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُ وَتِلْكَ الأيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاء وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ الظَّالِمِينَ ﴿۱۴۰﴾** ئالی عیمران

**ئەگەر زامار بوون و تووشی ئازار بوون، بێ‌گومان ئەو گەلەش تووشی ئەو چەشنە ئازارانە بوون و هاتوون، ئەو ڕۆژانەش لە ناو خەڵکا دەساودەس پێ دەکەن، تا خودا ڕوونی بکاتەوە کێ لە بڕواکەیدا پتەوە؟ لە ناو ئێوەشدا چەندین شایەت هەڵبژێرێت، خوداش ستەمکارەکانی خۆش ناوێت.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ۱۴۰

پێشەکی ئینسان دەبێ ئەوەی باوەڕ بێ ئینسان چ کافر و بێ‌باوەڕ چ موسوڵمان و خاوەن باوەڕ سەراپای دەسکاری خۆ نی و بەندەی خۆ نی، ئینجا بێ نان و ئاو و ژیان ناکا لە سەر وەی بێ‌ئیمان و بێ‌باوەڕە، و یا نایکاتە خاوەنی ناو و ئاو و ژیانێکی تێر و تەسەل لە سەر ئەوە موسوڵمانە ولە شەڕ و هەراشدا هیچ کافر و بێ‌ئیماتنێکی کۆڵەوار ناکا بە دەستی موسوڵمان لە سەر ئەوەی بێ‌ئیمانە و ئەو بە ئیمانە، بەڵکە سەرکەوتن و بەرکەوتن لە ڕۆژی هەرادا حەواڵە بە ئەسباب و وەسیلە کراوە لە قەبیلی کەرەسەی شەڕ و ئیرادە و خۆڕاگری و فێڵ و فەنی شەڕ زانین، هیچ کارێکی بە ئیمان و بێ‌ئیمانی نییە؛ زۆر تێکۆشە زۆر بپۆشە، کەم تێکۆشی، کەم دەپۆشی؛ فەرقێک هەیە ئەویش ئەوەیە: خاەن ئیمان باوەڕی وایە چون شەڕەکەی بۆ خودایە بە هەر لایەکدا بکەوێ ئەو ناکەوێ، واتە بکوژرێ هەر بەرەندەیە چونکە دە ڕێی خودادا کوژراوە، چ بکوژێ، هەر بەرەندەیە چونکە لە سەر دینی خودای کوشتووە، بەڵام بێ‌باوەڕ و کافر بکوژرێ بە فیڕۆ دەچێ، چونکە لە سەر دنیای کوژراوە، و ئەگەر بشکوژێ بە ئافریم و ئازا ناژمێردرێ چونکە لە سەر ناحەقی کوشتووە نە لە سەر حەق، جا لە سەر ئەو ئەساسە ئەتۆش مافی خۆتە بشکوژرێی و بریندار بی لە سەر داوات، ئەوەش مافی خۆیەتی بشکوژرێ و بریندار بێ وەک، ئیدی ئەو ئینتیزار و چاوەڕوانیەت نابێ چونکە بێ‌باوەڕە خودا بۆت کوێر و کوتر کا و ئەتۆی سوار کا، چونکە خاوەن باوەڕی، سا سزای باوەڕ و بێ‌باوەڕ کات وساتی خۆی هەیە ئەو کات و ساتەش ڕۆژی حیسابە (قیامەت).

جا ئێوە کە لە هەرای ڕۆژی ئوحوددا بریندار بوون، بێ‌گومان هۆزی بت‌پەرستانیش وەک

ئێوە لەمەوبەر لە هەرای ڕۆژی بەدردا بریندار بوون، جا دەبێ ئەوە بزانـدرێ ئەو سـەرکەوتنەی ئوێەی موسوڵمان لە ڕۆژی بەدردا و ئەو سەرکەوتنەی وان لە هەرای ڕۆژی ئوحـوددا خـاڵی لە عیللەت و حیکمەت نەبووە، دەخڵی بە دین و بێدینی نەبووە، سەیر کەن و گـوێ ئـاواڵە کەن: ئەو ڕۆژانەی دەیهێنین و دەیبەین بە ناو عالەما ڕاز و حیکمەتەکەی ئەوەیە: تا خـودای تەعـالای زانا بە هەوەڵ و ئاخری هەمووتان پێو بزانێنێ و لێو حاڵی کا: کێیە خۆڕاگر و خـاوەن ئیـرادە لە سەر داوای خۆی، و کێیە بێباوەڕ و بێئیرادە لە سەر داوای خۆی؟ واتە بە کورتی و بە کوردی، کێ ڕاستە و ڕاست دەکا؟ کێ درۆزنە و درۆ دەکا؟

**بۆ ئاگاداری:**

وا دەردەکەوێ موسوڵمانان لە سەر ئەو خەیاڵە بـووبن کە بتپەرسـتان و موشریکەکـان لە وان بەرز و ڕێزدارترن، بەڵام خودای خاوەن عیلم و زانست ئەو هەڵوێست و خەیاڵەی دەرداوێ بە وەسیلەی ئایەتی ١٣٩ی ئالی عیمران، ئێستێ بە هـۆی هەڵسـەنگاندن و مقایەسـەی حـاڵ و ئەحـواڵی موسـوڵمانان و کـافران نیشـانی دەدا کە موشریـک ڕێـز و ڕێزداریـان نیـیە بە سـەر موسـوڵماناندا، لە هەرای ئوحـوددا، ئەو زەرەر و زیـانەی بە ئێـوەی موسـوڵمان گەیشـتووە، بە وانیش (کافران) گەیشتووە کەوایە بەرتەری موشریکان دە کوێدایە؟ تاکوو ئێوەی موسـوڵمان وا خەیاڵ کەن ئەوان ڕێزدارن و بیکەنە دەلیل و بەڵگەی لاوازی و خەفەتتـان؟ ئینسـان دەبـێ ئـاوا سەیری یاسای خودا کا، ڕووداوی تاڵ و شیرینی دنیا کە وا دێـت و ڕوو دەدا، خـۆ ڕانـاگرێ و دەوام ناهێنێ و ڕادەبرێ، ئەدێرەدا بەرجەوەند بێ و کەڵک وەرگرێ، بە قازانج و سـەرکەوتنێکی بەحیساب بێنێ، ئەو ڕووداوە تالانەی کە وا دێن و ڕووبەڕوو دەبنەوە، مەیدانی تـاقیکردنەوەن، واتە ئازا لە نائازا، چاک و پاک لە خـراپ و ناپـاک هەڵـداوێرێ، خـودای تەعـالا لە تێشـکانی هەرای ئوحوددا کە هات بە سەرودا، ویستی ئەوەو نیشان دا کە بێنەزمـی و فەرمـان شـکاندنی ڕێبەر لە کاتی ئاوا حەساسدا تێشکانی ئاوا دڵتەزێنی لێ دەکەوێتەوە، کە دەبـێ ئەو کارەسـاتانە ببنە دەرس بۆ داهاتوو، جا بەو پێیە دەبێ بیسەلمێنین، سەرکەوتنی دوژمن لەو کاتیدا بەو خـاترە نەبووە کە خودا ئەوانی خۆش ویستووە، چونکە ئەوە بێگومـانە خـودا زاڵمـی خـۆش نـاوێ، بەڵکە ئی بێنەزمی ئێوەی موسوڵمان بووە و بەس.

جوملەی ﴿وَتِلْكَ الأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ﴾ دەبێ تەعبیرەکەی ئاوا بخەینە ڕوو: ئەو ڕۆژانە کە ڕۆژانی شکستن مانای وا نییە خودا ڕۆژێک موسوڵمانان سەر دەخا و ڕۆژێک کـافران سـەر

دەخا، بەو دەلیلە یاریدەدانی خودا ڕوتبە و مەقامێکی زۆر گەورەیە، ئەوانەی دۆستی خودا نین وەک کافر و موشریک و بتپەرست، لێهاتوویی و شایستەگی ئەو پلە و پایەیان نییە، بەڵکە دەبێ ئاوای بۆ بچین بۆ مەبەست و مانا لەو «مداولە» واتە لەو ئاڵوگۆڕە، کات و ساتی وا هەیە تاڵی و سەختی و سەخڵەتی هێرش دەکاتە سەر کافران، کات و ساتی وا هەیە هجووم دەباتە سەر موسوڵمانان، ئەو شێوە ئاڵوگۆڕەش خاوەنی ئەو قازانجەیە: ئەگەر بیتو کافر دە هەموو کات و ساتی ژیانیدا هەر بناڵێ و خاوەن ئیمانیش دە هەموو کات و ساتاندا هەر دە خۆشیدا بێ، ئەو شتە ناڕەوایە ڕوو دەدا، تەکلیف و داوای سەواب و عیقاب بێ جێ دێتە گۆڕێ و سەلبی ئیختیار دەکرێ لە ئینسان و ڕێگای هیوا و ئومید چاک بوون لە خراپەکاران دەبەسترێ، جا بۆ ڕەواندنی ئەو تەمی ناڕەوا لە سەر دڵی خاوەن دڵان دەبێ ئاوا بڵێین: مانای جوملەی (نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ) واتە خودای تەعالا جاری وا هەیە دەرد و ڕەنج و سەختی دەهاوێتە سەر شانی ئیمانداران، جاروباری واش هەیە دەیخاتە سەر شانی کافران، تاکوو ئینسان چ موسوڵمان چ کافر، لە ڕاپەڕین و حەرەکە بۆ گەیشتن بە مەنزڵی ئاوات و هیوای نەکەوێ و لە بیر و هەست و ئەندێشەی سرشتی خۆیدا ئەستێور نەبێ.

لە ئەبوسوفیانەوە لە ڕۆژی هەرای ئوحوەوە: گۆیا خۆ دەگەیێنێتە سەر کێوی ئوحود و هاوار دەکا و دەڵێ: لە کوێیە "ابن ابی کبشە"؟ ـ واتە پێغەمبەر؛ لە کوێیە "ابن ابی قحانە؟ ـ واتە حەزرەتی عوسمان؛ لە کوێیە "ابن الخطاب"؟ ـ واتە حەزرەتی عومەر؛ ئەوەش ئەمنم.

ئەبوسوفیان کوتی: يَوْمٌ بِيَوْمٍ، وَ الأَيَّامُ دُوَلٌ وَ الْحَرْبُ سِجالٌ؛ واتە ڕۆژ بە ڕۆژە و ڕۆژیش دە گەڕاندایە، و شەڕیش جەنگ و گوریزە.

حەزرەتی عومەر فەرمووی: نا وا نییە کە دەڵێی بەرابەرە؛ بەڵکوو کوژراوانی ئێمە لە بەهەشتدان و کوشتەکانی ئێوە دە دۆزەخدان.

ئەبوسوفیان کوتی: ئەگەر ئا وا بێ، وەک ئەتۆ دەیڵێی، ئێمە ڕەنج بە خەسارین.

جوملەی ﴿وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ ئەگەرچی دەیهەوێ پاش بەیانی عیللەتی ئاڵوگۆڕی حاڵەتی خەڵک و ڕۆژانی خاوەن حیکمەت، ئیشارە وەلای ئەوە دەکا: خودا کە ئاوا ئەوزاع دەگۆڕێ، تاکوو بزانێ کێ بەرەندەیە و کێ دۆڕاوە، ئەو جەریاناتە بەو شێوەیە دڵ پەرێشان دەکا و خلیسکێ دەبا، چۆن واتە: دەکەوێتە سەر ئەو خەیاڵە کە خودای تەعالا تا ئاڵوگۆڕان بە ئەوزاع نەکا، حاڵ و باڵ و ئەوزاعی عالەم نازانێ! پەنا بە خودا لەو باوەڕە! چونکە موسوڵمانان

باوەڕیان ئەوەیە: کە خودا پێش هەموو شت زانایە بە هەوەڵ و ئاخری شت، کەوابێ دەبێ تەعبیراتی ئەو ڕستە ئایەتە ئاوا تەعبیر کرێ: خودای تەعالا بۆیە ئاڵوگۆڕان لە ئەوزاعدا پێکدێنێ ڕوویان پێ دەدا، تاکوو بۆ بەندەگانی ڕاستی و دروستی و حەقیقەت ڕوون کاتەوە و تێیان گەیێنێ بە هۆی بەڵگە و دەلیلی حاشاهەڵنەگر، وەک تێشکانی موسوڵمان لە هەرای ئوحوددا، دە موسوڵمانانی گەیاند کە دەبێ نەزمی دا و بێ ئەمری پێغەمبەراندا تێشکان و زەرەر دێتە ڕوو و هەیە، دەبێ دەرسی لێ وەربگیردرێ ئەو کارەساتانە.



خودای تەعالا بە پێی لوتف و کەرەمی دەگەڵ خاوەن ئیمان و باوەڕان، دەیهەوێ ڕێگای ون ئاشکرا کا بۆیان نەبادا بە گوناه و تاوانەوە بچنە دیوانی خودا، تا سەرحەد و مەرزی شایان هەلیان بۆ هەڵدەخا بۆوەی بتوانن پێش مردنیان گوناهە و تاوان لە خۆیان داماڵن و وەیانسڕنەوە، چونکە وەعدە لە لایەن خوداوە: ﴿إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾ واتە حەسەنات دەسترێتەوە سەیئات (خەتا و گوناه). جا لە سەر ئەو ئەساسە حیکمەت و ڕازی زەربەخواردنی موسوڵمانان لە هەرای ئوحوددا ڕوونتر بەیان دەکا و نیشانی دەدا. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٤١ی ئالی عیمران:

**وَلِيُمَحِّصَ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ وَيَمْحَقَ الْكَافِرِينَ ﴿١٤١﴾** ئالی عیمران

**هەتا خودا ئەو کەسانەی ئیماندارن بە باشی پاڵفتەیان کا، بێبڕوایانیش سەرکوت کا و لە ناویان بەرێ.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٤١**

جا بۆوەی بە تێر و تەسەلی واقیعەکە تێگەیشتن دەست کەوێ دەڵێین: ئایەتی پێش واتە ١٤٠ ئاماژەی وەلای ئەوە کرد کە بەرهەم و نەتیجەی ڕووداوەکانی تاڵ و شیرین بۆ ئەوەن خاوەن ئیمانان لە بێباوەڕان هەڵاوێرێن، سەرەڕا و جگە لەوەش فایدە و مەبەستێکی دیکەش هەیە ئەویش ئەوەیە: خالیس کردنەوەی ئیمانی ئیمانداران، پاک و خاوێن کردنەوەیان لە ژەنگ و ژاری تێکەڵاوییان دەگەڵ خەیاڵات و وەسوەسەی منافقان، و دامەزراندنی دڵێکی پڕ لە سەفا و ئیمان؛ وەک دەبیندرێ یەکێک لەو فکر و خەیاڵە خاوەی کە لە ڕۆژی هەرای ئوحوددا بەرۆکی موسوڵمانانی گرتبوو و بووش بە سەبەبی تێکشکانیان ئەوە بوو کە ناوی پیرۆزی ئیسلام بۆ سەرکەوتن بە سەر کافراندا کافییە بۆ سەرکەوتن؛ دە حاڵێکدا ئەو خەیاڵە هەڵەیە، چونکە ئەو

فکرە ڕەنگە بکرێ لە سەرکەوتنی هەرای بەدردا بەڵام ئەگەر ئاوڕ وەسەر هەرای ئوحود کرێ دەردەکەوێ کە پیرۆزی و زاڵبوون بە سەر دوژمندا، خاوەنی عیللەتە وەک ئیمان و ئیتاعە لە دەستوورات و نەزم و نیزامی دەس‌نیشاندەی پێغەمبەری خودا، دەگەڵ تەوەکول.

**لە کەو دانەوە:**

جا بۆ ئەوانەی کە خاوەنی بڕوا و ئیمانن، خودا بۆوەی لە گوناح و تاوان پاکیان وەکا، بە ئازار و ڕەنجی ژێر کەوتنیان لە لایەن کافرەکانەوە دەبێ گرفتار بن، ئەوجار خودا بە ئاوڕێکی پڕ لە سەفا و ڕەحمەوە، وەسەر کافرانیان دەخاتەوە و کافران وەژێر دەخاتەوە و لە ناویان دەبا.

**بۆ ئاگاداری:**

وشەی (تمحیص) بە واتای پاک یانی تاکوو بە هۆی ئەو شەڕ و هەرایەی ئەوانی تێ دەکەون و شکست دەخۆن لە گوناهیان پاک وەکا، و وشەی (وَلِـيُمَحِّصَ) واتە زەلیل و لەناوبردن، دیارە هەر لەو سەرچاوە و لەو دەراوەڕایە؛ ئایەتی ۲۷۶ی بەقەرە:

> **يَمْحَقُ اللَّهُ الْرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ وَاللَّهُ لاَ يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ**
> **خودای تەعالا ماڵێک کە سوودی تێ کەوێ لە ناوی دەبات و ماڵێکیش کە چاکەی پێ بکرێت زیادی دەکات و خودا حەز لە هیچ گوناهبارێکی گەورە ناکات، (واتە ئەوانەی سوود بە حەڵاڵ دەزانن و دەستبەرداری نابن.)**

زەجاج کە یەکێکە لە زانایانی ئایینی، فەرموویەتی لە بابەت مانای ئەو ئایەتە: خودا ئەو ڕۆژانەی وا لە دەستاودەستدان، واتە خودای تەعالا لە نێوان موسوڵمانان و کافراندا دەوڵەتی دەستاودەست دادەمەزرێنێ، بە کورتی و بە کوردی، ڕۆژانی سەرکەوتن و بەرکەوتن، دە گەڕاندان هەر دەمەی دە دەستی یەکێدایە، جا لە سەر ئەو یاسا و ئەساسە، ئەگەر هاتو کافر بە سەر موسوڵماندا زاڵ بوو، ئەوە ئەو تێشکانەی موسوڵمانان دەبێتە وەسیلەی لە گوناە پاک بوونەوەی موسوڵمانان بە مەرجی خۆ و خۆگری و سەبر کا، و ئەگەر هاتو موسوڵمانان زاڵ بوون بە سەر کافراندا، ئەوە دەبێتە وەسیلەی سڕینەوەی ئاساری کافران و لەناوبردنیان، بەو پێیە دەتوانین بڵێین: پاک بوونەوەی موسوڵمانان لە گوناە پاکبوونەوەی کافرانە لەمەیداندا. واتە تمحیص موئمینانە، تحمیق کافرانە، یانی سڕینەوەی گوناە لە موسوڵمانان پێی دەکوترێ بە هیلاکدانی تاوانەکانی موسوڵمانەکان، هەر وەک بە هیلاکدانی کافران نابوود کردنی وانە، ئەو

مقابلە پێی دەکوترێ: مقابلەیەکی لەتیف و تەمیز.

دەبێ لە ڕێگای بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی ئایەتەکانی پێشێ کە لە بابەت هەرای ئوحودەوە باس کران و هەر وا ڕازی شکست و ڕازی جیهادیشی تێدا چاو کرا، ئەوە بزانین کە سەبەبێ کە هۆی ئەسڵی ئەو تێشکانانەن چن و لە چیڕا دێنە ڕوو و لە کوێوە سەرچاوە دەگرن. جا بۆ دۆزینەوەی عیلەت و سەبەبی سەرنەکەوتن و تێشکان لە بەرابەر هجوومـاتی دەوران، بێ ئیرادەی و بێ نەزمی و کەترەخەمی و بە کەم گرتنی تەکلیفات و ئەرکی پێ سپێراو بە ئەسڵی کار بژمێردرێ و چاو لێ بکرێ، چونکە دەبێ پێش هەموو شت ئەوە بزاندرێ کە دە بەرابەر هەچی ئەعمال و داوا و تەکلیفە تاقی کردنەوە هەیە و دەبێ ببێ یانی: ئیمانی بێ تاقی‌کردنەوە نەبووە و نابێ؛ واتە ئەو ئەرک و تەکلیفاتەی کە لە دنیادا خراوەتە سەر شانی ئینسان و پڕیش لە ڕەنج و دەرد و عەزابن، سەراپای تاقی کردنەوە و ئازمایشن چونکە بەڕاستی گەیشتن بە نیعمەتەکانی ڕۆژی ئاخرەت و بە بەهەشت، چاژتنی تاڵی و کێشانی دەرد و ئازاری زۆری دەوێ، هەر وا بە قسە و سووک و سادە دەس ناکەوێ، جا ئینسان دەبێ دەو خەیاڵەدا بژی کە بەهەشتی بە مفت و خۆڕایی و قسەی تڕ و پاراو وەدەس دێنێ، بەڵکە دەبێ جگە لە ئیتاعەی خودا و ڕەسووڵی خودا دڵی بەندەکانی خوداش بستێنێ، هەم خودای لە خۆ ڕازی کا هەم دڵی بەندەکانی خوداشی دەگەڵ بێ، جا بۆ ڕاستی نیشاندانی ئەو ڕاستییە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ١٤٢ی ئالی عیمران:

**أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللّهُ الَّذِينَ جَاهَدُواْ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ**

**ئایا وا بیر دەکەنەوە هەر وا دەچنە بەهەشتەوە؟ کەچی هێشتا ئەوانەی وا لە ناو ئێوەدا تێدەکۆشن و خۆڕاگرن، خودا دیاری نەکردوون!**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٤٢

ئایا بۆ ئەو ئینسانەی کە کراوەتە خەلیفەتوڵڵا و ئیکرام و ڕێزی بۆ داندراوە لە لایەن خوداوە دەبێ ئەو فکر و خەیاڵە وەکرێ، کە بەبێ تاقی‌کردنەوە بگا بە بەهەشت و ئەنعامی خودا؟ و بەبێ ماندوو بوون و جەور و جەفایە لە ڕێی خودادا دەست بگا بە لکی داری هیوا و ئومید و میوەی لێ بچنێ؟ ئەوە زۆر دوورە لە ئەقڵ و شعووری خەلیفەتوڵڵا کە ئینسانی ژیر و بەبیرە، کێ ئەو خەیاڵەی بێ، بێ‌ڕەنج دەگا بە گەنج، خەیاڵێکی کاڵ و ناپوختەیە، کێ وا خەیاڵ کا تەنیا بەوەندەی بڵێ: موسوڵمانم دەگا بە عەزەمەت و عیزەت و دەوڵەتی ئیسلامی و بە بەهەشت،

خەیاڵی کاڵ و خاو و بێبنەمایە، بەڵکە دەبێ خاوەنی ئەو ئیدیعایە (ئیمان و باوەڕی) لە محەک درێ و تاقی کرێتەوە. بە ئازار و دەرد و مەینەتی و سەختی ژیـان و کیـان، بـۆ وەی لە مەیـدانی عەمەلدا ڕیزی دمتەران و قسەلووس و زارپاراوان هەڵاوێـردرێ، لە سـابران و خۆوەخـۆگران و قسەپتوون و ئازاران، دەبێ مەیدانی شەڕ و هەرا و بەزمـی دەوران دەور بگـرێ و هەڵخـولێ، و بکەوێتە گەڕ تاکوو ڕیزی مرۆ و نامرۆیان دەرکەوێ. بە جلک و لیباس و کەوش و پێڵاو هەموو کەس پیاوە و وەک پیاو دەچێ، بەڵام مەیدانی عەمەلە کە دەتوانی پیاو لە ناپیـاو لـێکەوە کـات، پیاو بە نیشانەی نێرایەتی پیاو نییە، بەڵکە بە نێرایەتیی و مەردایەتی دیارە کە پیاوە، خاوەن ئـیمان بە قسە نییە، بەڵکە بە عەمەلە.

**بۆ ئاگاداری:**

وشەی (ام حسبتم) ڕووی خیتابی دە ئەساسدا و بە ئیعتیباری دابەزینی ئـایەتەکە وا نیشـان دەدا بۆ ئەو کەسانە بێ کە دە هەرای ڕۆژی ئوحوددا پەرێشان بوون و شکستیان خوارد. وشـەی (لما یعلم) یانی (لمّا یمیز الله) جوملەکەش دەبێتە حاڵ لە زەمیری (تـدخلوا)، ئەودەم ئـایەتەکە ئاوا دێتە ڕوو: (بَل لا يَنبَغي مِنكُم أن تَظُنّوا أَنَّكُم تَدخُلونَ الْجَنَّةَ وَ تَفوزونَ بِنِعَمِها و ما أعَدَّ اللـهُ تعالی لِعبادِهِ فیها).

لە سـەر ئەو ئەساسـە مانـای ئـایەتەکە ئـاوا دەکەوێ: ئایـا وا خەیـاڵ دەکەن کە بچـنە نـاو بەهەشتەوە، دە حاڵێکدا وێستا خودا دەرەجە و ئیمتیازی پێ نەداون؟ نابێ ئەو فکرە بکەن.

شاعیرێکی عەرەب شێعرێک دەڵێ دروست دەگەڵ ئێرە دێتەوە، ئەوەش شێعرەکە:

تَرجـــو لِلنَّجـــاةِ وَ لَـــم تَسْـــلُكْ مَســـالِكَها
إنَّ السَّـــــفينَةَ لا تَجْـــــري عَلَـــــى الْيَـــــبْسِ

واتە: بە هیوای نەجاتی، دە حاڵێکدا وێستا ڕێ نەکەوتـووی، تێـبگە و بـزانە کە کەشـتی لە ویشکایی ناڕوا.

یانی لازم ناکا بۆ تۆ وا بیر کەیەوە دەچینە ناو بەهەشت و بە نیعمەتەکانی بەهەشت دەگەی، و بەو وەعدانەی خودا داونیە عەبد لە بەهەشتدا.

لە لایەن حەزرەتی "شـهر کـوڕی حوشـب" نەقـڵ کـراوە کە گۆیـا فەرمـوویەتی: هیـوا و ئارەزووی بەهەشت بێ عەمەل، تاوانە و گونـاحە، چـونکە ئەوانەی پێیـان وایە خـودا نیـازی بە بەندەیە کە دەیهەوێ بێ عەمەل بیباتە بەهەشتێ، و چاوەڕوان و هیواداری شفاعەتە بـێ دەلیـل،

نموونەیە لە غـروور و لەخۆڕازیبـوون و نیازمەنـدی خـودا، ئەوەش کـاری ئەحمەقـانە. روح المعانی، ج٣٨٨/٤.

**سووکە ئاوڕێک:**

دەبێ ئەوە بە ئەقڵ و شعوور بسپێردرێ کە ئایا خۆشەویستی دنیا و ئاخرەت دەکرێ دە نـاو دڵدا پێکەوە بن بە یەک ئەندازە؟

دەبێ بکوترێ: ئەقڵ ئەگەر سەری لێ نەشێوێندرێ، ڕێگەی ڕاست ون ناکا و نادۆڕێ، جا بۆ ئەو وڵامە لەسەر ئەساسـی هەڵسـەنگاندنی ئەقـڵ وەک ئەوە دەچـێ: خۆشەویسـتی دنیـا و ئاخرەت پێکەوە بە یەک ئەندازە ناتوانن ببن، بەڵکە دەبێ بە پێی سرشت یەکیان لە یەکیان زیـاتر بێ لە خۆشەویستیدا، هۆیەکەشی دەبێ ئەوە بـێ: خۆشـبەختی و سـەعادەتی دنیـای ئـاخرەت نایەتە ڕوو و پێکنایە ئیللا بە واز هێنانی دڵ لە "ما سوی الله"، دەست تێگرتن دە تەنافی یاسـای ئەڵڵا و دڵ ڕازانەوە بە خۆشەویستی خودا. هەروەک خۆشی و لەززەتی دنیا نایەتە ڕوو ئـیللا بە ئەوینداری دەگەڵ دنیا و تەڵەبی دنیا، جا خۆ ئەوەش حاشا هەڵنەگرە کە ئەو دوو ئەمری مـتەزاد کە وەک هەوێ وان پێکەوە، ناگونجێن دە ماڵی دڵدا، هەر بە خاتری ئەو سـیڕ و ڕازەشـە کە ئەو ئایەتە بە پێی ئاماژەی لێی دەرک دەکرێ کە کۆبوونەوەی ئەو دوو ئەمرە ناگونجێ پێکەوە.



گۆیـا شـــەڕی بەدر کە دە پـــێش شـــەڕی ئوحـــوددا ڕووی داوە شـــەڕێکی لەناکـــاو و چاوەڕواننەکراو بووە، بەشێک لە موسوڵمانان کە لە کاری وەرزێری و کەشاوەرزی و سـەفەردا بوون دە فریـای شـەڕ نەکەوتـوون، کـاتێ کە پێغەمـبەر لە شـەڕ دەگەڕێـتەوە، لە بەر ئەوەی کە موسوڵمانەکان بە زۆری دە فریای شەڕ نەکەوتـوون حـاڵەتێکی بە پەرۆش و نـاڕەحەتی نیشـان دەدەن لە خۆ، داوا دەکەن و تەمەننا دەکەن شـەڕێکی دیـکە هەڵایسـێ و ڕوو بـدا تـاکوو تێیـدا شیرکەت بکەن، ئینجا لە سەر ویسـت و ئـاواتی ئەو موسـوڵمانانە سـاڵی دوایە هەرای شـەڕی ئوحود ڕوو دەدا و دێتە گۆڕێ، جا بە هۆی ئەوەی کە دە شەڕی ئوحوددا سەرکەوتن بە دەستیان وەنـایە، واق و وڕ دادەمێـنن و پەرێشـان دەبـن. خـودای تەعـالا ئـایەتی ١٤٢ی لەو بـارەوە دادەبەزێنێ، تاکوو ئەو تەموتومان و خەفەتی سەر دڵیان بڕەوێنێ، ڕوو دە موسوڵمانەکان دەکا و پێیان دەفەرموێ: ئێوە بۆ خۆتان کە دە فریای شەڕی بەدر نەکەوتبوون تەمەننای شەڕ و جیهـادو دەکرد بە ئومێدی شەهادەت و سەرکەوتن. جا ئەگەر ئەوە حاڵتان بوو و ڕاستە، ئێسـتێ هـیچ بە

پێچەوانەی ویستو نەهـاتۆتە ڕێ، بـۆچی وا پەرێشـان و دامـاون بە هـۆی ئەوەنـدە شکسـت و کوشتەی لە ئوحوددا داوتانە!؟ بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۴۳ی ئالی عیمران:

وَلَقَدْ كُنْتُمْ تَمَنَّوْنَ الْمَوْتَ مِن قَبْلِ أَن تَلْقَوْهُ فَقَدْ رَأَيْتُمُوهُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ

**بێ گومان ئێوە ئاواتەخوازی مەرگ بوون، لە پـێش ئەوەیـدا دەگەڵ مـردن ڕووبەڕوو بـن، خـۆ ئەوە دیتتان و تەماشای دەکەن!**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ۱۴۳

ئەگەر بە چاوێکی وردبینانە و هەستیارانە لە ناوەرۆکی ئەو ئایەتە سرنج بـدرێ، ئەوە دێـتە ڕوو بە ئاشکرایی کە ئەو ئـایەتە نادروسـتی بیـر و خەیـاڵی ئەو موسـوڵمانانە نیشـان دەدا کە لە شەڕی ئوحوددا تێشکان، لۆمە و سەرزەنشیان دەکـا نمـوونەی زاهیریـان بیـر دەخـاتەوە ئـا بەو شێوە: ئێوە ئارەزووی شەهادەتو دەسەردا بوو دەتانکرد، بەڵام چونکە خۆڕاگریو لە خۆ نیشـان نەدا و بەردەوام و وەفادار بە ئارەزووتان نەبوون، دەگەڵکوو بەزم و مەیدانی شەڕو چاو پێکەوت ئەو تەما و قەرارەو دایە پشت گوێ کە دەبا شەڕ بکەن و خۆڕاگر بن.

**ئاگاداری:**

پـــێش ئەوەی بـــگەن بە شـــەڕ و ڕووبەڕووی مەرگ ببـــنەوە، ئـــاواتەخوازی مەرگـــی بە شەهادەتەوە بوون، بەڵام کاتێ دیتتان و ڕووبەڕووی مەرگ بـوونەوە، ئەو هەوایە خـرایە دۆڵ و دەرەی فەرامۆشکاری، چونکە ئێوە بوون سـەیری ئەوەو دەکـرد: دە هەرای ئوحـوددا عەبـدوڵڵا قمیئة الحـارث، ڕووبەڕووی زاتـی پێغەمـبەر دبـۆوە و بـۆوەی بیکـوژێ و شـەهیدی کـا بەڵام مصعبی کوڕی عەمیر بە گورجی خۆی خسـتە بەردەمـی پێغەمـبەر و بەر شمشـێری عەبـدوڵڵا خۆی فیدای پێغەمبەر کرد و شەربەتی شەهادەتی خـواردەوە. هـاوار هەسـتا و دەنگـی داوە کە پێغەمبەر کوژراوە و موسوڵمانان هورەیان دابەزی و پەرت و پەرێشـان بـوون، هەر دەو سـاتەدا هاوار بەرز بۆوە لە لایەن خودی پێغەمبەرەوە، ئەی بەنـدەگانی خـودا پەرێشـان مەبـن و بێـر و بەوێـدا ڕامەکەن، پێغەمـبەر مـاوە و شـەهید نەکـراوە! ئەوەی شـەهید کـراوە و خـۆی دە سـەر پێغەمبەری گێڕاوە مەسعەبی کوڕی عەمیر بووە. پێغەمبەر بە دەنگی مبارەکی خۆی ئەو هەرایەی کرد و موسوڵمانان هورەیان بەرز بۆوە و هـاتن بە گـورجی لە دەوری پێغەمـبەر کـۆ بـوونەوە و شێرانە و ئازایانە هەڵمەتیان دایە دوژمن و تەزاندیانن. وەک دەڵـێن دەبـێ دەو کـات و سـاتەیدا

بووبێ کە ئایەتی ١٤٤ی ئالی عیمران دابەزیبێ. کاتێ کە پێی گەیشتین بە درێژی لێی دەدوێین.

وشەی (تمنـون) دە ئەسـڵدا (تتمنـون)ە بـووە یەکێـک لەو دوو «ت»ێیەکـان لابـراوە بـۆ سووکباری، بە کوتەی حەسەن بەسری و مجاهد و ڕەبیع و قەتادە و سـدّیّ گۆیـا کـاتێ یـارانی محەمەد کە داوای مەرگیان دەکرد لە بەر ئەوەی دەستەیەک لە یارانیان لە شـەڕی بەدردا شـەهید بوون، جا بۆیە لە پاش بەدر و پێش ئوحود ئارەزووی مردنیان بـوو بەڵام کـاتێ شـەڕی ئوحـود هات و دامەزرا سەختی و شیددەتی ئەو ڕۆژەیان دی، ئەو ئارەزوویەیان فەرامۆش کرد و شکان، جا خودای تەعالا ئەوانی لە سەر ئەو فەرامۆشکارییە دایە بەر پلاری لۆمە.

گۆیا یەکێک حذیفەی دەداتە بەر تانە و تەشەر و لۆمە لە سەر ئەوەی کە لە شەڕی حونەیندا حەزرەتی ڕەسووڵیان بە تەنیا هێشتبۆوە و هەڵاتوون. حذیفەش دە بەرابەر لۆمەکەیدا فەرمـووی: بەڵێ، شەڕ شۆخی پێ ناکرێ، چونکە شۆخی نییە، بەڵکە کاتێکی سەخت و بەتـین و تەوژمە و ڕۆژی گیان بەخشینە؛ هەر لە نێوانی ئەو قسانەدا یەکێک هەڵستا و کـوتی: ئەگەر ئەمـن بـام لە باتی ئێوە هەڵنەدەهاتم و پێغەمبەرم بە تەنیا نەدەهێشتەوە. حذیفەش هاتە جواب و پێی کوت تـا ئێستێ کەوتوویە ناو شەڕەوە؟ ئەویش کوتی: نەخێر؛ تـاکوو ئێسـتێ تووشـی شـەڕ نەهـاتووم! حذیفەش فەرمووی پێی: ئەگەر ڕۆژێکی کەوتیە ناو شەڕ و ڕاتنەکرد ئەوە ئەودەم سابت دەبێ کە مرۆیەکی ئازا و بەغیرەتی، چونکە دیتنی مەرگ بە چاوانی خۆت و خۆڕاگریش لە سـەر ئەوەی کەی نۆرەی مەرگی تۆش دێ، کاری هەموو کەس نیـیە. (صـحیح بخـاری مغـادی، بـابی ٥٤/ شەرحی بخاری ج ٢٩٢/٩)

وا دەردەکەوێ لە سەیری ئایەتەکانی هەرای ئوحود کارەساتێ زۆر بەرچاوی لێ کەوتۆتەوە و دێنە بەرچاو کە دە ناو مێژووی ئیسلامدا بەتایبەت شەڕەکان شۆقدارن کەم کەس هەیە چاویان نەکا، بۆ نموونە:

١. شکانی ددانی مبارەکی پێغەمبەر

٢. شایعەی کوشتنی پێغەمبەر و بڵاو کردنەوەی لە لایەن شەیتانان

٣. شکانی یارانی ئیسلام

٤. خاڵی کردن سەنگەرەکانی دوندی جبل الرماة کە لە لایەن پێغەمبەرەوە کرابووە سـەنگەر و مەتەرێزی بەرگری

٥. غاردانی یارانی ئیسلام بۆ ماڵی تاڵان.

٦. هەل وەدەس کەوتنی خالد بۆ هێرش کردنە سەر لەشکری شکست خواردووی ئیسلام، کە ئەودەم خالید موسوڵمان نەبوو و دەگەڵ کافران بوو، ئەو خاڵدە بڕیاری وا دەرکردبوو لە هەر کوێ پێغەمبەری لێ بێ، هجووم دەبێ بکرێتە وێ، لەو کاتەشدا وا هات پێغەمبەر بۆ دەسنوێژ گرتن جودا ببۆوە لە یارانی بەڵام طلحە کوڕی عەبدوڵڵا بە خاتری پارازتنی گیانی ئەو لە خزمەتیدا بوو. ئە دەو کاتەدا کە کافرەکان پێغەمبەریان ئاوا چاو کرد بە دەستووری خالد هجوومیان کردە سەری، ئەمما طلحە شێرانە لێیان هاتە دەست و ڕێی نەدا دوژمن بتوانێ زەربەیەک بدەن لە پێغەمبەر، هەر دەو ئانەدا حەرزەتی ئەبووبەکر کە چاوی کەوت بە جەریان و ڕاپەڕینی شێرانەی طلحەی چاو کرد، هاواری کرد و جاڕی کێشا: ئوحود! ئوحود! ئوحود! واتە تەواوی ئەجر و پاداشی هەرای ئوحود بوو بە نەسیبی طلحە. سەرەنجام کابرایەک بە ناوی عەبدوڵڵا کوڕی قميّە الحارث بەردێکی داوەشاندە ڕوخساری مبارەکی حەزرەت و بریندار کرد، دەو کاتەدا مصعب کوڕی عمیر کە زۆر فیداکارانە حافیزی پێغەمبەر بوو پەرچەمی ئیسلامیشی دەپاراست، خۆی دایە بەر ئەو زەربەی کە داهێنرایە پێغەمبەر و شەهید کرا و پێغەمبەریش ڕزگاری بوو و پاڕاوە بۆ مصعب، دوعای خراپیشی بۆ عەبدوڵڵا کرد. خودای تەعالا دەنگۆی کوشتنی پێغەمبەر و لە هورە کەوتنی موسوڵمانان لەو کاتەدا ئایەتی ١۴۴ی ئالی عیمران بۆ سەر حەزرەتی محەمەد دابەزاند بۆوەی موسوڵمانان تێگەیێنێ لە ڕاستی.

جا ئەوجار بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١۴۴ی ئالی عیمران:

**وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىَ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللّهُ الشَّاكِرِينَ ﴿١۴۴﴾** ئالی عیمران

**موحەمەدیش تەنیا ڕەوانەکراوێکە، بێ گومان لە پێش ئەودا پێغەمبەرانی دی ڕۆیشتوون، ئایا ئەگەر هاتو محەمەد مرد یا کوژرا، ئێوە پاشگەز دەبنەوە؟ هەرکەسیش پاشگەز بێتەوە بەبێ گومان هیچ زەرەر و زیانێک ناگا بە خودا، خوداش بە زووترین کات پاداشی سپاسگوزاران دەداتەوە.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١۴۴

ئەی ئینسانی ئینسانپەرست و لە خودا غافڵ! چاک حاڵی بە و وەریگرە: محەمەد تەنیا پێغەمبەرە و هیچ ئەمرێک لە ئومووراتی دینی پێ نییە و دەستەڵاتی بە سەردا نییە، بێ گومان دە پێش ئەویشدا پێغەمبەران هاتوون و ڕۆیشتوون، ئەوانیش لە غەیری ئەمری ڕاگەیاندن هیچ

قازانج و زەرەرێکیان دە دەستدا نەبووە، جا لە سەر ئەو یاسا و ئەساسە ئەگەر هاتو محەمەد مـرد یا کوژرا، ئەگەر ئێوە پێتان وابێ دین مرد و نەما، ئەوە وا نیـیە؛ بەو دەلـیلە دیـن ئـی خـوایە و بە خودایە تا خودا نەمرێ دینیش نامرێ، جاخۆ دیارە خـودا نەمـرە، کەوابـێ دینـیش نەمـرە؛ بەڵام کەسێ بە مردنی محەمەد یا بە کوشتنی واز بێنێ لە ئایین و لە شەڕ، ئەوە هیچ زەرەرێک بە خودا ناگا بەڵکە ئەو پاشگەزبۆوە دەکەوێتە بەر لافـاوی زەرەر چـونکە لە دیـن نەگەیـوە و حەولیشـی نەداوە حـــاڵی بـــێ لە دیـــن کە دیـــن لە خـــوداوەیە نە لە شەخســـە، ڕۆژی خۆشـــی جەزای سپاسگوزاران و چاکەکاران خودا دەیداتەوە نە ئینسان.

**پوختەیەک لەو بارەوە:**

خودا دەیهەوێ بە وەسیلەی ئەو ئایەتە لۆمەی ئەو کەسانە بکا کە وابەستە بە شەخســن و بە بیستنی خەبەری مەرگی کوشتنی حەزرەتی پێغەمبەر دە شەڕی ئوحوددا هەڵوێسـتی هەڵاتـن و پاشەکشە لە دین و ئیمانیان دەگرت، ئەو هەڵوێستەی وان زۆر دوورە لە ئیمان و باوەڕ بە خودا و پێغەمبەر و قورئان، چونکە پێغەمبەران ئامانج و هەدەفی ئەسـڵی نـین لە دینـدا بەڵـکە هەدەفـی ئەسڵی پێغەمبەران لە ئاییندا ڕاگەیاندنی دین و تەوحیدی خودایە، لەوە زیـاتر نیـیە؛ و جـڵەوی سەراپای ئوموورات دە دەستی خودادایە، و بەقای دینی خـوداش ڕاوەسـتاو بە بەقـای خـودایە، واتە تا خودا بێ، دین دەبێ، بە مردن و کوشتنی ڕاگەیێنەرانی دین، دین لە ناو ناچێ، جا لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ ڕوو بکرێتە ئەو خـاوەن ئیمانـانەی کە وابەسـتە بە بـوونی پێغەمـبەرانن، واتە خەیاڵیان وایە کە دین وابەستە بەوانە، ئەگەر ئەوان بـوون ئەوە دیـن هەیە، ئەگەرکـوو ئەوانـیش نەمان ئەوە دین نەما؛ ئایا چۆن لە دین حاڵی بوون و چۆن حاڵی کراون؟ دیارە دەبێ بکوترێ بە پێچەوانەی ڕاستی حـاڵی بـوون بۆخۆیـان بە فکـری خۆیـان نەک پێغەمـبەران ئاوایـان حـاڵی کردوون.

**پاشەدۆ:**

محەمەدﷺ ڕەسووڵێکە وەک پێغەمبەرانی ڕابردوویە کە لە بەشـەرانە و خـودا نیـیە لە مـردن هەڵنەوەردراوە، مەرگ پەیسەری ئەویش دەگرێ کاتی خۆی، هەر وەک پێغەمبەرانی پێش خۆی مەرگ بردنی. مـحەمەد بەو نـاوە مەنشـوورە، پـێش مـحەمەد کەسـی دی بەو نـاوە (مـحەمەد) مەشهوور نەبووە، ئەو ناوە پیرۆزە عبدالمطلب باپیری لە سەری دانـاوە، بە هـۆی خەوێکـی کە

دیتی و پێیـان دەکـوت دە خەوەکەیـدا نـاوی ئەو کـوڕە بنـێ بە مـحەمەد، واتە سـەناکراو؛ ئەو محەمەدە گۆیا لە ئاسمانەکاندا ناوی مبارەکی ئەحمەدە؛ دە قورئانی پیـرۆزدا هەر دوو ناوەکـانی محەمەد و ئەحمەد هاتوون.

چەند پرسیار و وەڵام لە بابەت مردنی پێغەمبەر و کوشتنی:

١. لە ئایەتی ٦٧ی سووڕەی مائیدە وا هەست پێ دەکرێ کە پێغەمبەر لە کوشتن پارێزراوە، هەروا لە ئایەتی ٣٠ سووڕەی "زمر"یشدا دووبارە هەست بەوەی دەکرێ کە پێغەمـبەر بە مەرگـی سرشتی خۆی وەفاتێ دەفەرموێ نەک بە کوشتن، سەیری ئایەتەکان کەن:

**يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْك مِن رَّبِّك وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللّهُ يَعْصِمُك مِـنَ النَّاسِ إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ ﴿٦٧﴾** مائدة

**ئەی پێغەمبەر! ئەوەی کە لە لای پەروەردگارتەوە بۆت هاتۆتە خوارەوە ڕایگەیێنە، ئەگەر ئەوە نەکەیت، ئەوە پەیامەکەی پەروەردگارت نەگەیاندووە، خوداش دەتپارێزێ لە خەڵک؛ بێ گومان خودا دەستەی کافران شارەزا ناکات، چونکە شارەزاییان ناوێ.**

**إِنَّك مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾** زمر

**بێ گومان ئەتۆ (ئەی محەمەد) دەمری و ئەمانەش هەر دەمرن.**

ئەو دوو ئایەتە لێیان دەردەکەوێ کە کەس ناتوانێ محەمەد بکوژێ، بەڵام بە مردنـی خـۆی دەمرێ، جـا لە سـەر ئەسـاس و ئامـاژەی ئەو دوو ئـایەتە، دەبـێ نەکـوژرێ و لە سـەر مانـا و مەفهوومی ئایەتی ١٤٤ دەشکوژرێ و دەشمرێ؛ ئەو دوو قسە دژ بە یەکن، دەبـێ ئەو دژایەتیـیە وڵامی بدرێتەوە، بەو شێوەیە:

ئەو (قتل)ەی ئایەتی ١٤٤ بە فەرزی محاڵ چاو لێ بکرێ واتە بڵێین: ئەوە هـاتوو مـحەمەد کوژرا و شەهید بوو، ئێوە لە ئیمان و باوەڕو پەشیمان و پاشگەز دەبـنەوە؟ نـابێ وا بـن، بەڵـکە دەبێ هەر بەردەوام لە سەر ئیمان و باوەڕی خۆتان بن.

و هەروا لە بابەت پەرێشانی و پەشۆکاوی موسوڵمانان بە هۆی خەبەری بەدرۆی کوشـتنی حەزرەتی ڕەسووڵ دەبێ حەواڵەی ئەوەی کەین: شەڕ و هەرای زۆر توند وسەخت و حەسـاس بەرۆکی موسوڵمانانی گرتبوو بە شێوەیەکی زۆر حەستەم و حەسـاس، مانـای ئەو دوو ئـایەتی ٦٧ی مائیدە و ٣٠ زمر لە بیر و خەیاڵ تۆرابوون و فەرامۆش کرابوون.

بۆ وڵامی ئەو پرسیارە گەورەی کە دەکرێتە سەر هەڵوێستی حەزرەتـی عـومەر و یـارانی لە کاتێدا کە پێغەمبەر وەفاتی فەرموو، حەزرەتی عـومەر بە قەڵسـی و تـووڕەییەکی زۆر بەسـامەوە هاواری لێ بەرز بۆوە و کوتی: هەر کەس بڵێ محەمەد نەماوە و فەوتی فەرمووە، بەو شمشـێرە دوولەتی دەکەم؛ دە حاڵێکدا کە عومەری قورئانزان دەیزانی قورئان جەوازی فەوتی ڕەسـووڵی داوە، هەروا حەزرەتی عوسمان لە زمان کەوت بە خەبەری فەوتی ڕەسووڵ و حەزرەتـی عەلـی کەوتە حاڵەتی بێهۆشی. دەکرێ بکوترێ ئەو حاڵەتی کە بۆ عومەر و عوسمان و عەلی هـاتبووە پێش و پێشی نەدەگیرا، تەوژم و شـیددەتی ڕووداوەکە بـاعیس بـوو، نەک ئەوە نەزان بـووبن بە فەوتی پێغەمبەر.

**تیوتیوە:**

ئەو ئـایەتی ۱۴۴ ئەوەمـان پـێ دەڵـێ: هەچـی پێغەمـبەر و ئەولیـان بەشـەرن، ئینکـاری بەشەریەتیان ناکرێ، و هەر بەڵا و تەنگانەیەک و تەکلیفاتێک بۆ مەی ئینسان بێ و ببێ، بۆ سەر وانیش مانیع نیـیە بـێ، بەڵام جیـاوازییەک کە لە مـابەین ئـێمە و ئەوانـدا ببـێ دەبـێ ئەوە بـێ: خۆڕاگری وان دە کاتی بەڵا و سەختیدا پایە و شەئنیان پێ دەچێتە سـەر و بەرز دەبێـتەوە، بەڵام خۆڕاگری ئێمە دە کاتی بەڵادا تاوان و گوناهمان لێ دادەماڵدرێ.

**ئەو پرسیارەش خۆ نیشان دەدا و دێتە ڕوو خوازیاری وەڵامە:**

حەزرەتـی ڕەسـووڵ ڕۆژی دووشـەممە وەفـاتی فەرمـوو، بەڵام نـاژتنی ئەو کەوتە ڕۆژی سێشەممە یا شەوی چوارشەممە، دە حاڵێکدا دەستوور و ئەمـری ئەو تـاڵووکە کـردن بـوو بـۆ دەفنی مردوو؟

وڵام بۆ ئەو پرسیارە:

هۆی وەئاخر کەوتنی ناژتنی پێغەمبەر دەبێ ئەوە بێ بە بـێ گومـان: ئەو ڕۆژی حەزرەتـی ڕەسووڵ وەفاتی فەرموو، ئەسحابی ئەو بەو حاڵەتی تاساو و داماو کەوتبوونە تەدبیری ئەوەی لە کوێی دفن کەن و بە خاکی بسپێرن و لەو لایەشەوە لە بەر ئەوەی حـاڵەتی حەزرەتـی ڕەسـووڵ فەرقـی هەبـوو دەگەڵ حـاڵەتی عـالەمێ، هەنـدێکیان بە خەیـاڵی خۆیـان دە حـاڵەتی وەحـی گرتندایە بە مردنی واقعی نەگەیوە، جا تا ئەو گومانە ڕەوی و هەڵوێستی تەواوی لەمەڕ نـاژتنی یەکتریان گرت، ئەو تەئخیرەی بە سەر هات، نەک بڵێین شەریعەت ئەمری تەئخیری دابێ.

و هەروا جگە لەوانەش تەعینی جیٚنشین کە بۆ بەرگری لە شەڕ و فیتنە و ئاژاوەی منافق و موڕتەدان، ئەمرێکی ئەساسی و گەورە بوو، دەبا بخـرایە پـێش دەفنـی حەزرەتەوە و ئەویشـیان تەعین کرد. (ابوبکر صدیق). جا ئەوجار پاش ڕاپەڕاندنی ئەو ئەمرە بەرزانە دەستووری دەفنی و بە خاک سپاردنی حەزرەتـی ڕەسـوولٚیان لە شـاری مەدیـنەی نـوورانی دا. (تفسـیری قرطبـی، ج۴/۲۲۴)

**سووکە ئاوڕێک وەسەر جوملەی (أَ فَإِنْ ماتَ أَوْ قُتِلَ):**

دە ڕاستیدا حەرفی ئیستیفهام واریدی سەر شەرت دەبیٚ، کەچی ئەگەر هەستیارانە سـەیری ئایەتەکە کریٚ، واریدی سەر جەزای شەرت بووە، و مانا و تەعبیری ئایەتەکە ئاوا دەقۆزرێتەوە: أَ تَنقَلِبونَ عَلَى أَعقابِكُم إِنْ ماتَ محمدٌ أَو قُتِلَ: واتە ئەی موسوڵمانان! ئایا ئێوە پاشگەز دەبـنەوە بۆ سەر دینی پێشووتان کە کـافرییە، ئەگەر مـحەمەد مـرد یـا کـوژرا؟ دێـرەدا (أَ تَنقَلِبـونَ عَلَـى أَعقابِكُم) جەزایە بۆ (إِنْ ماتَ محمدٌ أَو قُتِلَ)؛

بە هەر حاڵ دەتواندریٚ بکوتریٚ دابەزینی ئەو ئایەتە لە ڕێی ئیلزامەوەیە نەک وجووب، بەو دەلیلە حەزرەتی مووسـا وەفـاتی فەرمـوو ئـۆمەتی وەرنەگەڕانەوە لە دینـی مووسـا (یەهـوود)؛ حەزرەتی عیسا ڕۆیی، بەو حاڵە گوماناوییە کە کوژراوە یـا مـاوە؛ وێسـتا ئـۆمەتەکەی پاشـگەز نەبوونەوە لە دینی عیسا؛ جا بەو پێیە دەتوانین بڵێین: مەرگ و نەمانی پێغەمبەران نابێتە سـەبەبی پاشگەز بوونەوەی ئۆمەتـان لە ئـایینی پێغەمبەرەکـان، کەوابـیٚ لە سـەر ئەو ئەساسـە کوشـتنی حەزرەتی محەمەد نابێتە هۆی واجب‌بوونی گەڕانەوەی ئۆمەتی محەمەد لە دینیان؛ بەو دەلـیلە: کاتیٚ خەڵک وەرگەڕاوە لە دینی پێغەمبەرەکەی بە لەناوچوونی پێغەمـبەرەکەی، دەبـیٚ بکـوتریٚ ئەو وەرگەڕاوانە لە دین، لە دین نەگەیشتوون و حاڵی نەبوون بۆیە وەرگەڕاونەوە.

**مەبەست لە جوملەی ﴿ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا﴾ دەبیٚ چ بیٚ؟**

دەبیٚ ئەوە بیٚ: تەئکیدی هەڕەشەیە، چونکە ئەقڵ ئەوە دەزانیٚ کە کـوفری کـافران نـاتوانیٚ زەربە لە خودا بدا، بەڵکە زەرەری بۆ خودی کافرەکەیە، جا بۆیە خودای تەعالا بە دووی وەعیددا وەعدەی هێنـا و فەرمـووی: ﴿وَسَـيَجْزِي اللهُ الشَّـاكِرِينَ﴾ واتە خـودا سپاسـگوزاران پـاداش دەداتەوە.



خودای خاوەن حیکمەت و حەکـیم دەیـهەویٚ دڵنـوازش و غیـرەت بـداتە دڵـی خـاوەن

ئیمانان کە لە شەڕدا نەترسێن و لەو لایەشەوە لۆمە بکاتە ئەوانەی کە سستن و لاوازن و هەڵدێن لە ڕۆژی هەرادا لە ترسی کوشتن.

بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٤٥ی ئالی عیمران، تاکوو بە تێر و تەسەلی لە مانای ئایەتەکە حاڵی بین:

**وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلاَّ بِإِذْنِ الله كِتَابا مُّؤَجَّلاً وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الآخِرَةِ نُؤْتِهِ مِنْهَا وَسَنَجْزِي الشَّاكِرِينَ ﴿١٤٥﴾** ئالی عیمران

**بەبێ دەستوور و ئەمری خودا کەس گیان نادا و نامرێ، تەعینی کاتی مەرگ کراوە، کێ پاداشی دنیا بخوازێ لەو ئاواتەخوازەی دەدەمێ، و کێ سەواب و پاداشی ئاخرەت بخوازێ، لە ئاواتەخوازەی دەدەمێ، هەر وا بە زوویی سپاسگوزاران پاداش دەدەم.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٤٥

بە پێویست دەزاندرێ بۆ وەی بتواندرێ دەرووی چوونە ناو ژووری مانای ئایەت بە باشی وەدۆزرێ، هۆی دابەزینی ئایەت بزاندرێ، جا لە سەر ئەو ئەساسە خالسە دەبێ بکوترێ: هۆی دابەزینی ئایەتی ١٤٥ی ئالی عیمران دەمکوت‌کردنی دووڕووان نیشان دەدا. کام دووڕوویان؟ ئەوانەی کە لە شەڕی ئوحوددا ئەو هاوار و هەرایان خستە ڕوو کە حەزرەتی محەمەد شەهید کرا و کوژرا، هۆی ئەو جارەش دەبێ ئەوە بێ تاکوو هورەی لەشکری ئیسلام دابەزێ و هەڵێن و ڕاکەن بێر و بەوێدا، لەشکری کافرانیش بە پیرۆزی و سەرکەوتن بگا، بەڵام خودای بانی سەر ڕێی پێ نەدان ئەو هەلە بە تەواوی وەقۆزن و پێی بگەن، بەڵکە سەرنەجامی کار سەرکەوتنی یارانی ئیسلام بوو، جا لێرەدا ئەو هۆشدارە دێتە ڕوو بۆ ئەوانەی خاوەن باوەڕ و هەستن، تا خودای تەعالا ئەو گیانی لە سەرەتاوە دایڕشتۆتە ناو ماڵی دڵ دەستووری لاچوونی پێ نەدا لەو ماڵە (مەرگ) لاناچێ و چۆڵی ناکا، واتە نامرێ؛ چونکە خودا کاتی مەرگی دیاری کردووە. واتە نووسراوێکی کاتییە مەرگ خودا دیاری کردووە، کە هات و کار گەیشتە دەروازەی ئەو کاتی دیاری‌کراو، دەبێ گیان خۆشی یا ناخۆشی بار و بنە وەپێچێ و بڕوا بۆ ئەو شوێنەی خودا بۆی دیاری کردووە. جا لەو شوێنەی گیانی دەبەنێ، هەرکەس پاداشی دنیای ویستبێ دە کاتی خۆیدا دراویەتێ و لێرەدا هیچ پاداشتێکی لە لای خودا نییە و نایدرێتێ، بێ دەسمایە وبێ سەرمایە بە داماوی دەمێنێتەوە و هەر کەسیش پاداشی ئاخرەتی ویستبێ و مەبەستی بووبێ لە دنیادا، ئێرەی ئاخرەت کاتی پێدانەوەیەتی و دەیدەنێ. جا خۆ ئەوەش بێ گومانە و حاشا هەڵناگرێ کە کەس

لە پـاداش‌دانەوەدا نـاتوانێ وەک خـودای ڕاسـت و دروسـت و ڕەوان و باوەفـا بـێ، بە زووی پاداشی چاکان و پاکان و خاسان و سپاسگوزاران بێ کەم و کووڕی دەداتەوە.

بە کوردی و بەکورتی، ئەوانەی دە جەنگێدا لە پێناو تاڵان و ماڵ و ساماندا لە دنیادا گیانیان داوە و تێکۆشاون، پاداشی کاریان چ بێ پێیان دەدرێ، و ئەوانەیش کە لە پێناو ئایینی ئیسـلام و پاداشـتی ڕۆژی ئـاخرەت تێکۆشـاون و گیانیـان داوە، ئەوە پڕاوپـڕی هەڵوێسـتیان پاداشـت دەدرێتەوە بێ کەم و کووڕی، جا دەبێ بە ڕەوانی بکـوترێ: ئەو ئـایەتە ڕاسـتەوخۆ ڕوو دەکـاتە ئیماندار و بڕواداران، و پێیـان دەفەرمـوێ: پێغەمبەرانـی ڕابـردوو کە دەکەوتـنە شـەڕ و هەراوە، هاواڵان و یارانی خۆیان کە دەگەڵیان بوون، شان بە شانی ڕێبەری خۆیان (پێغەمبەران) بە دڵـی گەرم و بە تین و پڕ لە سەفا دەکەوتنە شەڕەوە لەوپەڕی خـۆڕاگری و ئـارام بە هورەییـدا خۆیـان نیشان دەدا، تەئیدی ئەو ڕاستییە لە ماڵە ئایەتی ۱۴۶ دایە.

**پوختەیەک لەو بارەوە:**

لە سەر لۆمەی هەڵاتووان دەکـرێ لە هەسـتی دەروونـی هەڵاتـووان وا بەراوەرد کـرێ کە ئەوانە نەگەیشتوونە ئەو پـلەیە کە مەرگ و نەمـان بە ئیزنـی خـودایە و بە فەرمـانی ئەوە، بەڵـکە خەیاڵی خاویان ئاوای پێ سەلماندوون مەرگ لە دەس غەیری خودادایە، یانی ئەوانە لە وڵاتـی باوەڕ و ئیماندا لە دامێنی بە ڕەوا ڕوانیویانە و ئەوەیان لە بـاتی ئـیمان چـاو کـردووە: توانـایی و حکوومەت و دەستەڵات تایبەتی پێغەمبەران و ئەولیایانە، نەک تایبەتی خـودایە، بەو ئـیمانەش دەکوترێ: بۆنی پڵاو، یانی پڵاو ناناسێ، هەر بۆنی دەناسێ ئەویش بە بیستن! ئیمان و بـاوەڕی ئەو کەسانە تام و ڕەنگ و بۆنی دنیا و لەزەت و هەوای لێ دێ.

ئەو ئایەتەی ۱۴۵ و ئەقڵی ژیر و هەستیار ئەو فکرە ڕەد دەکەنەوە و بە پـووچی دێـنە ژمـار. هاوار و هەرا و دەنگۆ و شایعەی بـێ ئەساسـی شـەهید کردنـی پێغەمـبەر دە ڕۆژی ئوحـوددا، بەشی زۆری لەشکری ئیسلامی وەلەرزە هێنا و کێشانیە ئەو حاڵەتە ناحەزە کە پەشیمان بـوونەوە بوو لە ئیسلام و دەستەیەکیشیان ڕایانکرد و هەڵاتن، جا ئەو حاڵەتە نارەوایە بـێ گومـانە ئەوەی لێ دەرک دەکرێ: بەو شێوەی کە ڕاست و دروستە، حاڵی نەبوون لە دین و ئیمان؛ ئەگینا مردن و شەهید بوونی پێغەمبەر سوننەتێکی خودایە و دەبێ ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕوو بـدا و بێـتە جـێ، چونکە ئەو مەرگ و نەمانە لە لایەن خوداوە سنووردار کراوە و کاتی بۆ دیاری کـراوە، کەوابـێ هیچ سەیر نییە و نابێ بە شتێکی عەجایب بژمێردرێ بەڵکە ئەنجامی ئەمری ئیلاهییە، دەبێ بێـتە

چیٚ، جگە لەوانەش تێکۆشان و عەمەلی ئینسان ـ چ دنیـایی بـیٚ چ ئـاخرەتی بـیٚ ـ بە هەدەر ناچیٚ و نافەوتیٚ، بەڵکە دێتە حیساب، جا کەوایە ئەمن و ئەتۆ دەبیٚ ئەوە لە خۆ پرسـیار کەیـن: دەکارکردنی سەرمایەی بوونی خۆمان بۆ لە ڕێگای ناڕەوادا دەبیٚ بە کار بەرین؟ بۆ لە ڕێی ڕەوادا خەرج نەکەین؟ ئەگەر وا نەکەین، ئەو ئینسانەین: ظلوم و جهول بەشمانە!

**ئاوڕێک وەسەر سیمای ئایەتی ۱۴۵ی ئالی عیمران:**

وشەی (بإذن الله) زانایانی قورئان چەند نەزەرێکیان لە سەر داوە، تا بتوانین و بکـریٚ بەرەو پیری ئەو نەزەرانە دەچین.

إذن بە واتەی ئەمر و دەستوور، ئەوە نەزەری ابومسلم بحر اصفهانییە، ئەوکات مانـای إذن دەبیٚ ئەوە بیٚ: خودای خاوەن دەستەڵات دەستوور بە فرشتەی مەرگ دەدا کە گیـان وەرگـریٚ، کەوایە لە سەر ئەو بۆچوونە دەبیٚ بکوتریٚ: کەس نامریٚ مەگەر بە هۆی ئەمری باری تەعالا.

دووهەم نەزەر: دەڵێن هەنـدێکیان مەبەسـت لە إذن هەمـان إذنـی ئـایەتی ۴۰ی سـوورەی نەحلە، واتە لە إذني ئـایەتی ۴۰ی سـوورەی نەحـل چ مەبەسـتە، لە إذنـی ئـایەتی ۱۴۵ی ئـالی عیمرانیش هەر هەمان مەبەستە؛ ئەوەش ئایەتی ۴۰ی نەحل:

> **إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَن نَّقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ**
> **کاتیٚ خواستمان لە سەر بوونی شتێک هەبیٚ، هەر ئەوەندە کوتمان ببە، خێرا دەبیٚ.**

دیارە دێرەدا واتە ئەو ئەمری ئایەتی ۴۰ی نەحل مەبەست پیٚ بوون و پێکهـاتن و پێکهێنـانە بەو دەلیلە غەیری خودا هیچ کەس بە سەر مان و نەماندا توانایی و دەستەڵاتی نییە، جا لە سـەر ئەو بەراوەردە مەبەست لە بإذن الله ئایەتی ۱۴۵ی ئالی عیمـران ئەوە دەبـیٚ: کە هـیچ کەسـێک نامریٚ مەگەر ئەوە خودا دەستووری مردنی بدا.

هەندێکی دیش هەن لە قورئانزانـان پێیـان وایە وشـەی إذن ئـایەتی ۱۴۵ی ئـالی عیمـران بریتییە لەوە کەس توانایی زەرەر پیٚ گەیاندنی نەفسی نییە بـیٚ لە خـودا، وەک لە ئـایەتی ۱۰۲ی بەقەرەدا هەستی پیٚ دەکریٚ:

> **وَمَا كانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّٰه**
> **هیچ نەفسێک بۆی نییە بمریٚ ئیللا بە ئیزن و دەستووری خودا نەبیٚ.**

جا لە سەر ئەو بەراوەردانەی لێرەدا دەکار کران و وەرگیران، گیـانی حەزرەتـی ڕەسـووڵ لە

ژێر دەستی خودادایە کەس ناتوانێ زەرەری پێ بگەیێنێ، و تا کاتی تەعین‌کراوی خودا دەیپارێزێ کەوایە ئەی موسوڵمانانی غەزاچی شکست لە خۆ نیشان مەدەن بە هاوار و شایعەی درۆی درۆزنان کە بڵێن محەمەد کوژراوە.

یا ئەوەتا دەچنە سەر ئەو باوەڕەی لە مەڕ وشەی (إذن)دا کە هەندێکیان کوتوویانە: إذن واتە زانین و زانست یانی هیچ نەفسێک نامرێ بەبێ عیلم و زانینی خودا. یانی تا ئەو کاتەی کە خودا بۆی تەعین کردووە و عیلمی پێیەتی، نۆرەی مردنی هیچ نەفسێک نایەت. هەر کات کاتی دیاری‌کراو کاتی تەواو بوو، کاتی نەمانی دێ و دەڕوا بێ پاش و پێش، وەک ئایەتی:

> **فَإِذَا جَاء أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٤﴾** اعراف
> **هەر کات کاتی چوونی هات، ئانێک پاش ناخرێ و ئانێک مۆڵەتی پێش‌کەوتنی پێ نادرێ.**

ابن‌عباسیش فەرموویەتی إذن واتە قەزا و قەدەری خودا، بەو دەلیلە هیچ شت بەبێ ئیزن و ئیرادەی خودا نایە و ناچێ.

مەبەست لە جوملەی (كتابا مؤجلا) کتێبێکە شامیلی ئەجەلە واتە لوح المحفوظ، وەک لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە کە خودای تەعالا دەستوور بە قەڵەم دەدا و دەفەرموێ قەڵەم بنووسە ئەوەی دێ و دەبێ تا ڕۆژی قیامەت: (اُكْتُبْ فَكَتَبَ ما هوَ كائِنٌ إِلَى يَومِ الْقيامَةِ).

جوملە و ئایەتی ﴿وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الآخِرَةِ نُؤْتِهِ مِنْهَا﴾ واتە کێ پاداشی دنیا بخوازێ لەوێ پێی دەدرێ، گۆیا هەندێک لە قورئان‌زانان بۆچوونیان ئاوا بووە لێرەدا: لەشکری موسوڵمانان لە ڕۆژی ئوحوددا دوو دەستە بوون، دەستەیەکیان ئارەزووی دنیایان بووە، دەستەیەکیشیان ئارەزووی ئاخرەتیان بووە، وەک خودای تەعالا لە ئایەتی ۱۵۴دا ئاماژەی وەلا دەکا، واتە بەخشکە ئەو مەبەستەی لێ دەردەکەوێ. نەختێک لەوە بەدوا ئایەتەکە ڕادەنێین.

ئەوانەی دنیاخواز بوون تێشکان، و ئەوانەی ئاخرەت‌خواز بوون تێ‌نەشکان، جا لە سەر ئەو باوەڕەیە کە خودای تەعالا دە ناو ئایەتی ۱۴۵دا ئیشارەیان وەلا دەکات، واتە کێ دنیا بخوازێ پێی دەدەن بەشێکی، و کێ ئاخرەتی بوێ پێی دەدەن لە بەشی ئاخرەتی، ئەو جەریانەش دەگەڕێتەوە بۆ لای فەرموودەی پێغەمبەر: إِنَّمَا الأَعمالُ بِالنِّيّاتِ؛ تەواوی حەدیسەکەش:

الأَعمالُ بِالنِّياتِ و إِنَّما لِكُلِّ امْرِئٍ ما نَوَى فَمَنْ كانَ هِجرَتُهُ إِلَى اللهِ وَ رَسولِهِ فَهِجرَتُهُ إِلَى

اللهِ و رَسولِهِ، و مَن كانَتْ هجرتُهُ الى الدُّنيا يُصيبها أَو مرآةٌ يَنكحها فَهجرتُهُ إلى ما هاجَرَ إِلَيْهِ: عەمەل بە نیەتە، هەر کەس کار لە سەر نیەتی دەکا، کێ کۆچی لە بەر خودا و پێغەمبەر بێ، کۆچی ئەو دە جێی خۆیدا بووە بۆ خودا و ڕەسووڵی خودا؛ کێ کۆچی بۆ دنیا بووە کە دنیای دەس کەوێ، واتە ژن‌خواز بێ کە ژنی دەس کەوێ، ئەوە پێی دەگات. (ابوالفتوح، تفسیر، ٣/٢٠٩؛ تفسیر کبیر، هەمان ئایەت).

کاتی ئەوەی هات کە بچینە خزمەت ئایەتی ١٥٤ی ئالی عیمران:

ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّن بَعْدِ الْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَى طَآئِفَةً مِّنكُمْ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِاللّه غَيْرَ الْحَقِّ ظَنَّ الْجَاهِلِيَّةِ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ الأَمْرِ مِن شَيْءٍ قُلْ إِنَّ الأَمْرَ كُلَّهُ لِلَّهِ يُخْفُونَ فِي أَنفُسِهِم مَّا لاَ يُبْدُونَ لَكَ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَاهُنَا قُل لَّوْ كُنتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ الَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقَتْلُ إِلَى مَضَاجِعِهِمْ وَلِيَبْتَلِيَ اللّهُ مَا فِي صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحَّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمْ وَاللّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ

پاشان خودا لە پاش ئەو خەم و پەژارە، هێوری و ئارامییەکی نارد بۆتان کە بریتی بوو لە سەر وەنەوزێک «وێژینگ» ئەو وەنەوزە بەشێ لە ئێوەی گرتەوە، بەشێکی تریتان هەر لە خەمی خۆتاندا بوون، گومانیان سەبارەت بە خودا گومانێکی ناڕەوا بوو، هەر لە گومانی سەردەمی نەفامی دەچوو، دەیانکوت: ئایا ئێمە هیچ شتێکمان بە دەسە؟! بڵێ: هەموو کاروبارێک لە ژێر دەستی خودادایە، شتی وایان لە دڵیاندا حاشار دەدا کە لە لای تۆ نەیاندەدرکاند، دەڵێن ئەگەر لەو شەڕەدا ئێمەش شتێکمان بە دەس بوایە ئا لێرەدا نەدەکوژراین، پێیان بڵێ: گەر لە ناو ماڵەکانی خۆشیاندا بان، ئەوانەی وا کە کوشتنیان بۆ تۆمار کرابوو بە پێی خۆیان بەرەو شوێنی مەرگیان دەچوون، خوداش بۆیە ئەو کارەی کرد، تاکوو ئەوەی لە ناو دەروونتاندایە تاقی بکاتەوە، ئەوەش لە ناو دڵتاندایە پاڵفتەی بکات، خوداش ئاگای لەو شتانەیە کە لە دەروونەکاندایە.

بە کورتی و بە کوردی، لە هەرای ڕۆژی ئوحوددا ئەوانەی دە هەستی ویستی دڵیاندا بۆ دنیا و تالان هەڵسووڕابوون، تێک شکان، بەڵام ئەوانەی کە دە ناو قورنە و پەرپەرەی دڵیانەوە زەمزەمەی خودا و دین و ڕەسووڵ دەهات و دەبیسرا، بە خۆڕاگرییەوە لەو مەیدانەدا دەجەنگان سەرکەوتنیان بە دەست هێنا و دەیانهێنا، جا هەر لە سەر ئەو هەڵوێستە خودای تەعالا بە وەسیلەی ئایەتی ١٤٥ی ئالی عیمران خەبەری دا، کێ دنیای ویست پاداشی خۆی برد، کێ

ئاخرەتی ویست و هەڵگرت پاداشی خۆی دەبا و دەگریٚ. ئەگەر حەز لە دریٚژی باسەکە دەکەی، تەفسیری کەبیر هەمان ئایەتی ١٤٥.ئایەتەکە ئەگەرچــی لە بــابەتی غەزاوەیە بەتــایبەتی بەڵام بــۆ هەموو ئەعمالە لە هەموو کاتدا.

**بۆ ئاگاداری:**

لە بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی ئایەتی ١٤٥ی ئالی عیمران و وەزن کردنــی ئایەتەکــانی ١١ی سوورەی سەجدە و ٦١ی سوورەی ئەنعام نارێکی و نابەرابەرییەک هەست پیٚ دەکریٚ، پێویستە حەول بدریٚ ئەو نابەرابەرییە وەقۆزریٚ و چارەی بــۆ وەدۆزریٚ، ئایەتەکــانی ســەجدە و ئەنعــام دەخەینە ڕوو، و ئایەتی ئالی عیمرانیش ئەوە لە بەرچاوە، پاشان هۆیەکەی دەخەیــنە بەر بــاس و لیٚکۆڵینەوە، ئینشائەڵڵا.

**قُلْ يَتَوَفَّاكُم مَّلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾ سجده**
**بڵیٚ: فریشتەی گیانکێشــان گیــانی ئێــوە دەکێشــیٚ، کە کــراوە بە لێپــرسراوی گیانکێشــانتان، پاشان بۆ لای پەروەردگارتان دەبرێنەوە.**

**وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَيُرْسِلُ عَلَيْكُم حَفَظَةً حَتَّىَ إِذَا جَاء أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لاَ يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ انعام**
**هەر ئەویشــە بە ســەر بەنــدەگانی خۆیــدا دەســتەڵاتی تەواو و بەهێــزی هەیە، پارێزەرەکــانیش دەنێرێتە سەرتان، هەتــاکوو کــاتی مــردن دێــت بە پیــری یەکێکتــانەوە، فریشــتەکانمان گیــانی دەکێشن، کەم و کووڕیشی تیا ناکەن.**

بە هێواشی سەیر کە؛ بە پێی سەرنج دەیە، بە پێی مانــا و هەڵســەنگاندنی ئەو دوو ئــایەتەی ١١ی ســەجدە و ٦١ی ئەنعــام حەزرەتــی عیزرائیــل و دەســت و پێوەنــدەکانی ڕوح لە بەدەن دەردەکێشن، دە حاڵێکدا لە هەڵسەنگاندنی مانای ئایەتی ١٤٥ی ئالی عیمران ڕوح خودا لە لەش دەیهێنێتە دەریٚ، جا دیارە ئینکاری ئەوەی ناکریٚ کە لەو دوو ئایەتانە یەکیان دەبــیٚ ڕاســت بــیٚ، ئەوەی دیکەیان ناڕاست بیٚ، جا خۆ ئەوەش بیٚ گومانە قورئان مانای ناڕاستی تێدا نیــیە، کەوایە دەبیٚ بکوتریٚ: هەڵسەنگاندن و بەراوەردی مەمانان ناڕەوایە، و یا نەمانزانیوە، دەبیٚ تێکۆشین تــا دەگەین بە ڕاستی. دەشبیٚ ڕاستی هەر ئەوە بیٚ: دە واقیعدا گیانکێش هەر خودایە، چونکە هەر خودا گیانی داوە، هەر ئەویش دەیباتەوە، فرشتەی گیانکێش واتە گیــانوەرگر بە ئەمــر و ئیزنــی

خودا وەریدەگرێ.

وشەی (مؤجلا) بە واتای لازم و قەتعی، واتە مەرگی موعەییەن خاوەنی حوکمی قەتعی، پاش و پێشتی نایەتە ڕوو.

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم و میهرەبان دەگەڵ عەبدەکانی خۆی بەتایبەت موسوڵمانان لە وانیش بەخسووس ئەوانەی کە خۆیان بە شکستخوردە دەزانی، دەیهەوێ ڕوحییەیان بەهێز و گوڕ و تین وەکا و ڕەشادەت و شەجاعەتیان بخاتە ناو هەست و دەروونیانەوە، پێیان بڵێ: تەنیا ئێوە نین لە شەڕ و جیهاددا فیداکاریو دەکار کردبێ، بەڵکە زۆر لە ئۆمەتانی ڕابردوو شان بە شانی پێغەمبەرانیان دە شەڕ و هەرا و غەزایەدا بوون، و قبوولی هەموو جۆرە جەور و جەفا و گرفتارییەکیان کردووە، لاوازی و سستی و بێ هورەییان لە خۆ نیشان نەداوە، بەڵکە بەوپەڕی جورئەتەوە خۆڕاگرییان لە خۆ نیشان داوە، کەوایە ئەی یارانی ئایینی ئیسلام، ئەی فیداکارانی ڕێگای عیززەت و ئیمان، ئەی چاترین ئۆمەتی ئیسلام بە پێی ئەرک و وەزیفەی ئیمانتان نابێ خۆ بە لاواز نیشان دەن و ڕێگا نەدەن بە جارێک تێشکان و بێ هێزی و بێوازی خۆتان بە سەردا بڕێ چونکە یەکێک لە یاسا و دابی شەڕ سەرکەوتن و بەرکەوتنە بەڵام ئەسڵی کار نەبەزینە، کەوایە لە بەرابەر دوشمنانی ئایینتان زۆر توندتر و فیداکارتر و بەگوڕتر خۆ وەڕازێنن و نیشان بدەن، بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٤٦ی ئالی عیمران:

**وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُواْ لِمَا أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا اسْتَكَانُواْ وَاللّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ ﴿١٤٦﴾**

**چەند زۆر لە پێغەمبەران، زۆربەی زانایانی لە خودا ترس، لە گەڵیاندا بەرانبەر بە دوژمن جەنگیون، بە هۆی ئەو شتانەوە کە لە ڕێگای خودادا تووشیان دەبوو، نە بێهێز و لاواز بوون و نە کزی و سستی و زەبوونیش ڕووی تێ کردن، خوداش خۆڕاگرەکانی خۆش دەوێ.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٤٦**

زۆر لە پێغەمبەران کە جەنگاون دەگەڵ دوژمنان، خوداناسی زۆر ئازایان دەگەڵ بووە شان بە شانی پێغەمبەران جەنگاون و ئەو ئەزیەت و ئازارەی پێیان گەیشتووە لە سۆنگەی ئەو شەڕانەدا سستی و لاوازی و بێ هورەیی پێ نەداون، بۆ دوژمن سەریان دانەخستووە و شۆڕ نەکردووە، دیارە ئەو حاڵەت و هەڵوێستەیان ئی هێز و تاقەتی ئیمانیان بووە، خوداش

خۆڕاگرانی خۆش دەوێ، چونکە ئەوان نیشانەی ئیمانی خۆیان دەپارێزن.

**بۆ ئاگاداری:**

خودای تەبارەک و تەعالا دەیهەوێ بە شوێن کارەسات و ڕووداوی هەرای ڕۆژی ئوحوددا ئەو ئایەتە (۱۴۶) بۆ وەبیر خستنەوەی ئازایەتی ئیمانداران و پێغەمبەرانی ڕابردوو، موسوڵمانان هەم لۆمەیان کا و هەم ئاگاداریان داتێ و هەم شەوق و زەوقیان دە پاڵ خا، بەو شێوەیە: ئەگەر خاوەن ئیمانەکان وەک زانایەکانی ئەو سەردەمی پێغەمبەران خۆ نیشان دەن، وەک وان خۆشەویستی خودا و سەنای خۆیان دەستێنن، و ئەگەر بە گوفتار ئازایەتی بڵێن و دە ڕۆژی عەمەلیشدا وەک (ربّیّون) واتە زانایان خۆ نیشان نەدەن، وەک لە هەرای ئوحوددا نەیاندا، ئەوە دەکەونە بەر هێرشی تانە و تەشەر و لۆمە.

بە کورتی و بە کوردی، لەو لایەوە وەبەر تەشویق دەکەون، ئەگەر خۆ بگەیێنە ڕێز و ڕیزی زانایانی ئازا (ڕبیّون) واتە مەیدان خاڵی نەکەن جارێکی دی کارەساتی ئوحود ڕوو داتەوە.

وشەی (یحبّ الصابرین) ئاخری ئایەتەکە ئەوەمان پێ دەڵێ کە جیاوازی هەیە لە نێوان (صابرین) و (والّذین صبروا) بەو دەلیلە (صابرین) وا نیشان دەدا کە خۆڕاگری و خۆ وەخۆگری دە زاتی واندا سابیت و بەرقەرارە، دە حاڵێکدا لە (والذین صبروا) ئەو خۆ وەخۆگرییە و خۆڕاگرییە هەست پێ ناکرێ کە دە ڕووحیەدا هەبێ، بەڵام هۆشدارەکە دەبێ ببێ، ئەو هەستە دە وشەکانی (شاکرین و ظالمین)یشدا هەست پێ دەکرێ.

جوملەی (وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ) واتە چ زۆر لە پێغەمبەران، وا دیارە مەبەستیش لە نەبی، دەبێ ڕەسووڵ بێ، چونکە وا زانراوە نەبی خالیس دەستووری چوونە شەڕی بە خۆی نەدرابێ، ئەوانەی دەستووری شەڕیان پێ دراوە ڕەسوولانن.

ابن‌کثیر لە سەر وشەی (كأَيِّن) نەزەری ئاوا داوە: ئەسڵی (كـأَيِّن) (كـائن)ە لە سەر وەزنی (کاعن)، واتە مەمدوود و مەهمووز و موخەفەف، یانی کێش پێ دراو و خاوەن هەمزە (ء) و سووک لە سەر زمان؛ دە حاڵێکدا غەیری ابن‌کثیر بە (كـأَيِّن) واتە مشـدّد خوێندوویانەتەوە، لە سەر وەزنی (كَعَيِّن)، ئەوەش لۆغەتی قوڕەیشییانە، بەڵام کائن بە سووکی، لۆغەتی جەریرە، کە یەکێکە لە لۆغەتناسان.

جوملەی (قَاتَلَ مَعَهُ) ابن‌کثیر و نافع و ابوعمرو نەزەریان وا داوە: (قَاتَـلَ مَعَـهُ) = (قُتِـلَ مَعَهُ)یە، بەڵام باقی قورئانخوێنەکان (قَاتَلَ مَعَهُ)ە، جا بە پێی خوێندنەوەی هەوەڵ، دەبێ مانای

ئایەتەکە ئاوا بێ: کە زۆر لە پێغەمبەران کوژران و شەهید کران، و ئەوانەی کە لە پاش کوشتنی پێغەمبەران مانەوە لە دینی خۆیان پاشگەز نەبوونەوە و سستیش نەبوونەوە، بەڵکە شێل گیرانەتر و بەگوڕ و بەتینتر لە شەڕدا ڕووبەڕووی دوژمن وێستان بەوپەڕی سەبر و خۆگری. کەوایە ئەی ئۆمەتی ئازا و پاک و ناوداری محەمەد، شایانی ئێوەشە کە ئەو حاڵە بە ئەرکی سەرەکی خۆتان بزانن.

بەڵام مانای ئایەتەکە لە سەر نەزەری ئەوانەی دەڵێن (قَاتَلَ مَعَهُ) ئەسڵە، نەک (قُتِلَ مَعَهُ)، مانای ئایەتەکە ئاوا دێتە ڕوو: وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ العددُ الْكَثِيرُ مِن أصحابِهِ: واتە چەند زۆر لە پێغەمبەران کە ژمارەی زۆری یارانیان دەگەڵیان کە بوون کوژراون، و زرۆیان ئەزیەت و ئازار و بریندار بوون لە دەست دوژمنیان پێ گەیوە و دیویانە. لە سەر دین و ئایینی خودا و پێغەمبەریان، کەوایە ئێوە ئەی ئۆمەتی محەمەد کە ناودارترین ئۆمەتن، شایانترین بۆ وەی کە ئاوا بن و بگرە زیاتر و چاکتر و بەرچاوتر بن، ئەو ئاگادارییەش بۆ بەو شێوەیە بۆ هورە پێدانی یارنی ئیسلامن.

سعید کوڕی جبیر نەزەری وا داوە: ما سَمِعْنا بِنَبِيٍّ قُتِلَ في القِتالِ واتە نەمانبیستووە کە پێغەمبەر دە شەڕدا کوژرابێ.

نەزەری خاوەنی کەشاف: ربّیّون = ربّانیون، بە هەر سێ حەرەکە ـَـِـُ هاتووە، سەر (ـَ) یاسای خۆیەتی و ـِـُ گۆڕانێکی نییە. کەشاف، ٤٢٤/١.

لە ئاخری ئایەتەکەدا خودا کە دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ﴾ واتە خودا خۆ وەخۆگران و سابرانی خۆش دەوێ، بە کورتی و بە کوردی، کێ لە کاتی تەنگانە و تاڵی و سەختیدا دە ڕێی خودادا خۆ وەخۆ گرێ و نەیناڵاند، خوداش خۆشی دەوێ و بەخششی دەگەڵ دەکا بە بەهەشت و پاداشی ئەمن و ئەمانی.

وا هەست پێ دەکرێ لە تێڕوانینی پاش و پێشی ئایەتەکانی ١٤٧ و ١٤٦ ربّیون ئاوڕی زۆر وێ درابێ، بۆ نموونە دە ئایەتی ١٤٦دا بە سێ سیفەتی تایبەتی ڕازاوەتەوە، وەک ئەوە:

١. فَمَا وَهَنُواْ لِمَا أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ: واتە لە مەیدانی غەزا و بەربەرەکانی دوژمنانی ئیسلام لە حاند ئازار و ئەزیەت و بریندار بوون و شکست و کوشتندا هاوار و داد و نەدامەتی لە خۆ نیشان نەدا.

٢. وَمَا ضَعُفُواْ: واتە ربّیون دە حاڵی کوشتن و بریندار بوون و واقیعەی دیکە کە دێ بە

سـەری دە هەرا و غەزادا، لە ڕوح بەرزی و هـورە بەرزی نەکەوێ، بـۆ ڕۆژی هـاتنەوەی هەل و دەرفەت بڕوانێ.

٣. وَمَا اسْتَكَانُواْ: واتە ڕبیّون ئەگەر هات و کوففار بۆ دیـالۆگ و سـازش بانگیـان کـردن، تەسلیم نابن تا نەزانن ڕاست دەکەن، بـێ باکـانە لە سـەر ئیـرادەی خۆیـان دەوەسـتێن. لاوازی نیشان نادەن.

ئەو سێ سیفەتە تایبەتییەی خودای تەعـالا لەمەڕ ربیّـون دە ئـایەتی ١٤٦دا نیشـان دەدا کە بەڵگەن لە سەر ڕێز و ڕێزداری ربیّون.

و هەروا لە ئایەت ١٤٧دا لە بابەت ئازایەتی و ئیخلاسی ڕبیّون خودای تەعالا هـاواری وان وەلای خودا نیشان دەدا لە زاری وانڕا خودای تەعالا نزا و پاڕانەوەیان نیشـان دەدا بە وەسـیلەی ئایەتی ١٤٧، ئەوەش ئایەتەکە:

وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلاَّ أَن قَالُواْ ربَّنَا اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِي أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿١٤٧﴾ ئالی عیمران

**تەنیا قسەیان ئەوە بوو کە دەیانکوت ئەی پەروەردگارمان، لەو تاوان و زیادەڕەویانەی کە وا لە کارماندایە، چاوپۆشی بکە و هەنگاوەکانمان پتەو بکە، سەریشمان بخە بەسەر هۆزی کافراندا.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٤٧**

ئەو ربیّـون هـیچ قسـەیەکیان نەبـوو بـێجگە لەو ویردیـاتە پیـرۆزە نەبـێ، کە دەیـانکوت: پەروەردگاری ئێمە، خۆش بە لە گوناح و تاوانەکانمان و زێدەڕەویمان، و لەسەر فەرمانەکانماندا پێمان بچەقێنە و خۆڕاگریمان بدەیە و یارمەتیشمان بدە بە سەر بێباوەڕاندا.

**بۆ ئاگاداری:**

ئەو تـاقمی ربیّـون ئەگەر هاتبـا و دە بەرابەر دوژمنـدا دوچـاری سـەختی و گرفتـاری و تەنگانەیەکی تەنگ حاسیە و گران ببان، لە جێی هەڵاتن یا تەسلیم و پاشگەز بوونەوە، ڕووکردن لە کـوفر، پەنایـان دەبـردە بەر خـودای کارسـاز و چارەسـاز جـگە لە داوای خـۆڕاگری و خـۆ وەخۆگری، تکای لێبوردن و بەخشینی تاوانی خۆیان دەکرد و لە جێی ئەوەی سەبەبی شکسـتی خۆیان حەواڵە بە ئەسباب و عیللەتی غەیر بکەن، حەواڵەیان بە کەمکاری و کەترەخەمی خۆیان دەکرد و خۆیان بە سەرچاوەی بێئاکامی خۆیان دادەنا، جا بۆیە دەبێ بکوترێ هۆی نائاکامیـان

لە خۆیاندا چاو دەکرد، بۆیە بۆ چارە ڕاستەوخۆ پەنایان دەبردە بەر خودا کە بەتنیتر و خالیسانەتر خۆ لە خودا قایم کەن، هیمداد هەر لەو بە ڕەوا بزانن بۆوەی خودای تەعالا تۆڵەیـان بـۆ وەکـا، تەنانەت لە باتی تێشکانی خۆیان ناوبەرن، دە کـاتی نـزا لە خـودا، زێـدەڕەوی و کەمتەرخەمـی خۆیان داویشتە ئەستۆی خۆیان، بە کورتی و بە کوردی، بە هیچ شـێوەیەک تـێکەڵاوی خۆیـان دەگەڵ خودا ڕێ نەدەدا شل و سست و لاواز بێ، هەر ئەوەندە کەوتبانە تەنگـانە و سـەخڵەتی، توندتر و شێل‌گیرانەتر خۆیان دەخزاندە پەناگای خودا، بـۆوەی بتـوانن بە تینـی سـۆزی بەزەی خودا تین و هێز دادۆشنە دەروونی پاکی خۆیان.

**پاشەدۆ:**

جوملەی (وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا) ئەوەمان پێ دەڵێ: کردەی بەندە پێکهاتەی خودایە، بەڵام داوامان لە خودایە کە ئێمە هەرچەند بەرەو پیری کارمان دەچین و تێدەکۆشین ئەتۆش ڕاوەستاومان کە و کەڕەممان دەگەڵ بکە. یانی بێ هیمدادی خودا هیچ کار سەر ناگرێ.

بە وردی سەیری نـاوەرۆکی ئـایەتەکە کە، کە بە ڕوونـی ئەوە هەسـت پـێ دەکـرێ: خـودا ئاشکرای دەکا کە ئەو ڕبّیونانە دە حاڵێکدا کە داوای سەبر و خـۆڕاگری لە خـودا دەکەن، داوای هیمدادیش دەکەن لە خودا، مەبەست لەو شێوە پەنا بردن و داوا کردنە، ئەوەیە: ئۆمەتی محەمەد شوێن ئەو شێوە پەنا بردن و داوا کردنە بکەون، چونکە ئەوە بێ گومـان هەرچـی بـتهەوێ بـۆی بچی بە بێ دەگەڵبوونی خودا بە دەستەوە نایە و پێی ناگەی.

جوملەی (وَإِسْرَافَنَـا فِي أَمْرِنَـا) واتە خودایـا زیـادەڕەویمان دە کارانـدا ببەخشـە، ئەوە ئەوە نیشان دەدا ئینسان سەرەڕۆ و سنووربەزێنە، بەڵام وا نەزانـی ئەو دابەی ڕەوایە، بەڵـکە نـاڕەوایە، دەبێ لە خودا وەپاڕێ ئەو ناڕەوایەی پێ ببەخشێ، هەر وەک خودای تەعالا وەعدی بەخشـینی گوناهی زێدەڕەوانی داوە. ئایەتی ٥٣ زمر:

**قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ**

**ئەی محەمەد بڵێ بە عەبدانی مـن، ئەی بەنـدەگانی زێـدەڕەو و ئیسرـافگەر لە سـەر نەفسو نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی ئەڵڵا، چونکە بەڕاستی خودا سەراپای گوناە دەبەخشـێ، بە مەرجـێ تۆبە و نەگەڕانەوە بۆ سەر تاوان.**

دڵ ئارەزوویەتی بزانێ خودای تەعالا دە بەرابەر داوایان هەڵوێستی چۆن دەگرێ؟
دەبێ بۆ وڵامی دڵ ڕوو بکەینە خزمەت ئایەتی ۱۴۸ی ئالی عیمـران تـاکوو لە هەڵوێسـتی خوا حاڵی بین:

**فَآتَاهُمُ اللَّهُ ثَوَابَ الدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ الآخِرَةِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴿۱۴۸﴾** ئالی عیمران
**ئەوانەی کە ئەو ڕەوشتەیان بوو، کە باسی کـرا، خـودا خۆشـی و شـادی دنیـای پـێ بەخشـین، ئەویش بە سەرکەوتنیان بە سەر نەیاران و دوژمنانیاندا، و پاداشتی پڕ لە چێژی قیامەتیشی پێ بەخشین. خودا ئەو مرۆڤە چاکەکارانەی خۆش دەوێـت، کە هەمیشـە و لە گشـت کارەکانیانـدا هەر ڕوویان لە چاکەیە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ۱۴۸**

خودای تەعالا لە سەر ئەساسی پـاک و خـالیس و ئازایەتییـان لە دنیـدا پاداشـتی دنیـا و جوانترین پاداشتی ڕۆژی ئاخرەتیان پێ دەبەخشێ چـونکە ئەوە بێگومـانە خـودا چاکەکـارانی خۆش دەوێ، واتە ئەوانەی لە پێناو ئایینی ئیسلامدا قبووڵی هەموو جەور و جەفایەک دەکەن و لە ڕۆژی هەرا و شەڕ و شۆڕدا قارەمانەتی و خۆڕاگری دەنوێنێ، خودا ئەوانە بە شایانی هەمـوو جۆرە بەخشینێک و کەرەمێکی دەزانێ خودایە بۆ دنیا و ئاخرەت، دەشیانداتەوە.

**پوختەی مەبەست:**

بە پێی ئەو بەراوەردەی کە لە مەوریدی "ربّیّـون"دا دەکـار کـراوە هەڵـدەگرێ و شـایانە بـۆ شەئنی ئەوان، خودا هەم پاداشتی ئەو دنیایەیان بداتەوە کە سەرکەوتنیانە بە سەر دوژمندا، و هەم پاداشتی ئاخرەتیان داتەوە، هەچەن هەڵدەکەوێ پاداشتی دنیایان نـاڕەحەتی و زەرەر و زیـانێکی لە خۆ بگرێ بە پێی دابی دنیایی وەک شکسـت و کوشـتن لە شـەڕدا، بەڵام پاداشـتی قیـامەتی سەراسەری جوانییە، واتە لە لەزەت و جوانی و بێ ئازاری بەولاوە هـیچ شـتێکی دیـکە وەخـۆ ناگرێ.

وشەی "محسنین" واتە سیفەتی ئیحسان دە دەروونی زاتی "ربیون"دا هەمیشـە بەردەوامە و ترووسکەی دێ، کە لە دوای "یحبّ الصابرین"ی ئایەتی ۱۴۶ دێ بۆ وەی بزاندرێ کە مەرجـی گەیشتن بە پلەی "محسنین" ئەوە دەبێ پێشەکی بگەی بە مەقامی سابرین، جا پاشـان دەگەی بە مەقامی "محسنین". بەو دەلیلە کە محسنین دە بەرابەر بەجێهێنانی هەر ئیحسانێک کە بـیهەوێ

بەجێی بێنێ دەبێ قبوولّی هەزاران دەرد و بەلا و ڕەنجێک بکا، کە بێتو بە سەبر و خۆڕاگری خۆ وەبەر نەگرێ و خۆ دە بەر دەرد و بەلا نەگرێ بێگومانە ئەو ئیحسانەی کە مەبەستیەتی لە کیسی دەچێ و دەستی ناکەوێ.

**پاشەدۆ:**

بە پێی هەڵسەنگاندن و وەزن کردنی ئایەتەکە ئەوەم بە ئەقڵی ڕاگەیی کە خودای تەعالا شێوەی ڕەفتاری "ربێون"انی دە سەبر لە سەر دەرد و بەلا و نزا و پاڕانەوەدا نیشان دا، پاداشیشیان هەر وا بەو شێوە دە دنیا و ئاخرەتدا نیشان دا، وەک ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿فَآتَاهُمُ اللَّهُ ثَوَابَ الدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ الآخِرَةِ﴾، دەو دوو هەڵوێستانەدا (هەم ئی ڕبێون، هەم ئی خودا) لەمەڕ پاداشتی دنیا و ئاخرەت چەند بابەتێک هەست پێ دەکرێن:

١. یەک لەو بابەتانە ئەوەیە کە خودای تەعالا سەوابی دنیا و قیامەتی پێ دانەوە بە ئاشکرایی، لە دنیادا پیرۆزی و تالان و زاڵی بە سەر دوژمن و سینە گوشادی بە نووری ئیمان و سڕینەوەی تاریکی گومان و دڕدۆنگی لە کاروباردا، و لە گوناە و خەتادا پێی بەخشین لە بەرچاوی ئەهلی دنیا و پاداشی ئاخرەتیشیان بێگومانە کە بەهەشتی پڕ لە نیعمەت و ڕەحمەتە، وەک لەزەت و ئەمینەت و ئەنواعی شادی و خۆشی کە ئێستێ پاداشتی ئاخرەتی ڕاستە بە چاو نابیندرێ بەڵام وەک هیوا و ئومێدێک حەتمی دەناو ماڵی دڵدا گونجێندراوە، چونکە وەعدەی خودایە و وەعدەی خودایش بێگومانە.

٢. سەیر کە خودای تەعالا پاداشت و سەوابی ئاخرەتی بە "حسن" نیشان دا، واتە فەرمووی: ﴿وَحُسْنَ ثَوَابِ الآخِرَةِ﴾؛ ئەوە کە خودای مەزن سەوابی ئاخرەتی بە "حسن ثواب" ناودێر کرد ئاگادارییە لە سەر ڕێزداری و بەرزی سەوابی ربێون، و هەر وا ئیشارەیە وەلای ئەوە کە سەوابی ئاخرەتی سەراپای دە نیهایەتی جوانیدایە. جا ئەوەی کە خودا وەعدی پێ بەخشینی داوە بە دەستەی ربێون، ئەو سەوابە جوانە بێ بڕانەوەیە، دیارە سەواب و پاداشتی دنیا وا نییە و خودا واشی وەسف نەکرد و وشەی "حسن"ی نەدایە، بەو هۆیە سەوابی دنیا کەمە و هەڵیشدەگرێ تێکەڵاو بە زەرەر و زیان و بڕانەوەش بێ.

دەبێ بەرجەوەندی ئەوەی بین کە خودای تەعالا دە ئایەتی ١٤٥ی ئالی عیمراندا ﴿وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الآخِرَةِ نُؤْتِهِ مِنْهَا﴾ وشەی (من)ی هێناوە کە نیشانەی

تەبعیزە، دە حاڵێکدا دە ئایەتی ١٤٨دا لەفـزی (مـن)ی نەهێنـاوە، ئەوە نیشـانەی جیـاوازییە؛ ئەو جیاوازییەش دەگەڕێتەوە بۆ سەر داوخوازی و خوازیاری دڵی داواکاران. واتە ئـوانەی سـەوابی دنیایان ویستە، بە هۆی سەواب‌خوازی بەندایەتی ڕادەنـێن و تێدەکۆشـن، ئەوە بەنـدەگییەکەیان نەگەیوەتە پلەی خۆی ژێرای بەنـدایەگییە، وەک لە ئـایەتی ١٤٥دا ئەو بەرداشـتە خـۆ دەنـوێنێ، بەڵام ئەوەی دە ئـایەتی ١٤٨دا خـۆ دەناسـێنێ و خـۆ نیشـان دەدا دەگەڵ کەمـاڵی بەنـدایەتی و ئیخلاس واش هەر خۆ بە کەم و کورتی دادەنێن لە بابەت ئیتاعە و فەرمانبەری، کە هەر ئەوەش دەبێ لە بەندایەتیدا مەبەست بێ. جا بۆیە دەڵێن: ﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِي أَمْرِنَـا ﴿١٤٧﴾﴾ ئەوانە هەموو تەدبیر و پیرۆزی و هیمدادیان هەر لە خودا دەزانن، لە جوملەی ﴿وَثَبِّتْ أَقْـدَامَنَا وانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾هەر ئەوەشیان مەبەستە: خودایە کە تـۆ خـۆ وەخـۆ گـرین نەدەی تێشکاوین، چونکە هەر ئەتۆی یارمەتی‌دەر.

**تیوتیوە:**

﴿وَاللَّهُ يُحِـبُّ الْمُحْسِـنِينَ﴾ واتە خـودا چاکەکـاران و جوان‌ئاکـارانی خـۆش دەوێ، دەو ئایەتەدا و دە هاتنی بە دووی باقی ئایەتەکەدا ڕاز و لەتیفەیەکی باریک و نازکی تێدا هەست پـێ دەکرێ. ڕازەکەش بێ گومان دەبێ ئەوە بێ: ئەو تاقمی ربّیّون بە خراپـی خۆیـان ددان دادەنـێن بۆیە وەک ئایەتی ١٤٧ دەفەرموێ داوا دەکەن لە خودا و دەڵێن: ﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا﴾ جا دیارە کێ ئیقرار بە خراپی خۆی بکا، خوداش بە چاکەکـاری نـاو دەبـا و دەسنیشـانی دەکـا، تـا ئەوە دەرکەوێ کە گەیشتن بە خودا لە ڕێـی خـۆ بە کەم‌گـری و زیللەتـدا نەبـێ دەس نـاکەوێ، ئەو ربّیونانەش ویستیان جیهاد بوو دەگەڵ خۆڕاگری و بەردەوامی، ئەوە هەڵوێستەشیان لە خـوداوە سەری گرت و جا ئەو نیەت و بـاوەڕەی وان بـووە هـۆی ئەوەی خـودا نـاوی بە چـاکە بـردن. ئەوەش بە سبووت دەگەیێنێ ئەو شێوە هەڵوێستە: تا خودا هیدایەت نەدا هـیچ مرادێـک نـایەتە جێ، بۆ بەقایە کە خودایە دەفەرموێ:

> **هَلْ جَزَاء الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ ﴿٦٠﴾** الرحمان
> **ئایا هەیە جەزای چاکان بێ لە چاکە؟ (نەخێر، نییە).**

تەفسیری کەبیر، هەمان ئایەت، ئەگەر خوازیاری.

بە پێی ئیشاراتی و ئاگاداریەکانی قورئانی پیرۆز خاوەن بـاوەڕ و ئـیمان، ئەرکـی تەواوە لە

سەر شانی، کە لە هیچ دەور و زەمان و کات و ساتێ لە فێڵ و فووت و مەکری دوژمنانی دین ئەمین نەبێ و غافڵ نەبێ، بۆ نموونە لە کارەساتی هەرای ئوحوددا هاوار و جارِکێشانی دوژمنی دین وەک ئەبوسوفیان و هاودەستانی بۆ دە داو خستن و پەرێشان کردنی ئەفکاری موسوڵمانان کوتیان: محەمەد کوژراوە، هەر بە هۆی ئەو هاوار و شایعە بەدرۆیە منافقان و خائینان ئەو هەلەیان قۆزتەوە کە خۆیان گەیاندە موسوڵمانانی لاواز و خاو و کاڵ دەعوەتیان کردن بۆ گەڕانەوە و بادانەوەیان بۆ لای دینەکەی پێشوویان (کافری)، چوونە دە بنیان و پێیان دەکوتن: ئەگەر محەمەد پێغەمبەرێکی ڕاستی بایە نەدەکوژرا و شکستی نەدەخوارد. دیارە وەک زاندراوە لە هەل قۆزتنەوەیاندا تا ئەندازەیەک بەهرەیان لێ برد و تێیدا سەرکەوتوو بوون. بەڵام خودای یار و یاوەری خاوەن ئیمانان کە هیچ کات ڕێی نەداوە و نادا حەق وە ژێر کەوێ، هیمدادی نارد و موسوڵمانانی سەر خست و بە پیرۆزی گەیاندن، دڵخۆشیشی دانەوە بەوەی دە شەڕدا سەرکەوتن و بەرکەوتن هەیە و دەبێ نیگەران مەبن خودا خەتاپۆش و میهرەبان و بەخشندەیە.

ئێستاش بە پێی بەراوەرد و بەرجەوەندی لە ئایەتەکانی تایبەت و بابەتی هەرای ئوحود هەست بەوە دەکەین کە ئایەتی ١٤٩ی ئالی عیمرانیش تەواوکەری ئەو باسەیە کە لە مەڕ کارەساتی هاواری بەدرۆی دوژمنانی ئیسلام بڵاو کراوە و هەم ئاگادارییە بۆ موسوڵمانان و ئیمانداران کە وەشوێن کافران و دوژمنانی دین و خودا نەکەون، چونکە ئەوانە دەتگێڕنەوە بەرەو دینی پێشووتان، ئەودەم تووشی زیان و زەرەر دەبن، جا بۆ تەئیدی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٤٩ی ئالی عیمران بۆ تێگەیشتنی تەواو و تێر و تەسەل.

**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تُطِيعُوا الَّذِينَ كَفَرُوا يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ فَتَنقَلِبُوا خَاسِرِينَ ﴿١٤٩﴾** ئالی عیمران

**ئەی ئەوانەی ئیمان و بڕواتان هێناوە! ئەگەر گوێ بدەنە ئەوانە و بە قسەیان بکەن کە بێباوەڕن، بەرەو بێباوەڕی دەتانگێڕنەوە، سەرەنجام بەرەو زەرەر و زیانیش هەڵدەچەرخێن.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٤٩

ئەی ئەهلی ئیمان و باوەڕ، تێکەڵاوی دەگەڵ بێباوەڕ و ئیمان، گوێ گرتن و گوێدان بە قسەی کافر، بێ لە زەرەر و زیان و لاوازی بە ئیمانتان هیچی دی تێدا نییە و نابینن، ئەوە بێ گومانە ئەگەر کەلێنی ئەوەیان لێتان دەست کەوێ کە دەگەڵو بدوێن، واتان دەگەڵ دەکەن کە

شوێن ڕەفتاریان بکەون و گوێش ڕایەڵن بۆ ئەمر و دەستووراتیان، کە گەڕانەوەتانە بەرەو دوا و دینی پێشووتان کە کوفر و بێباوەڕییە لەو گەڕانەوەشودا لە غەیرەز زەرەر و زیانی نەبێ پێو ناگا.

بۆ نموونە عەبدوڵڵا کوڕی ئوبەی و کوڕی سەلول لە شەڕی ئوحوددا پێش ئەوەی شەڕ هەڵایسێ و بێتە ئاراوە، بە ٣٠٠ کەسەوە لە مەیدانی شەڕدا گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە، جا ئەودەم جگە لەوەی شەڕگەی چۆڵ کرد، هات بە زمانی تەڕ و پاراو خەڵکیشی هان دا بۆ ئاوەژوو بوونەوەیان لە دین و گەڕانەوەیان بۆ لای بتپەرستەکان و واز هێنانیان لە ئایینی ئیسلام، جا خودای تەعالا بۆ بەرگری لە هەڵوێستی دوژمنانی خودا و دینی حەق، بۆ خۆڕاگری موسوڵمانان و دوورییان لە خائینان و بێباوەڕان ئەو ئایەتی ١٤٩ی دابەزاند.

**پاشەدۆیەک لەو بارەوە:**

دوژمنانی ئیسلام لە هەرای ئوحوددا بە سیما و لیباسی دڵسۆزانە کەوتنە حەول و دەولی چاندنی تۆوی دووبەرەکی و ئاژاوەی نێوان موسوڵمانان، بەو شێوەیە دڵی لاوازی یارانی کاڵ و ناپوختەی موسوڵمانان، بە هۆی وەسوەسە و دنە دانیان بەرەو کشانەوەیان لە شەڕ ئاوەژوو دەکرد و بە وەسیلەی سستی و بێوازی دەروونی موسوڵمانان لە غیرەت دادەماڵی و دەسڕیەوە، جا بۆوەی خودای تەعالا ڕێ نەدا خائینان ئەو هەڵوێستە گڵاوەی پیادە کات هات بە وەسیلەی ئایەتی ١٤٩ موسوڵمانانی لە شوێن کەوتنی کافران مەنع کردن و پرینگاندنیەوە.

ئەو ئایەتە دەرسە و دەبێ دەرسیشی لێ وەرگرێ موسوڵمان و سەرانی گەلان و نەتەوەکان، کە دەبێ لە تێکەڵاوبوونیان دەگەڵ نەیارانیان لە خۆ وریا بن کە نەخلیسکێن بە قسە و باس و ماڵ و سامانیان.

هەندێکیش لە مێژوونووسان وای بۆ چوون کە ئەو ئایەتی ١٤٩ ئاماژە بە شایعەی ئەبوسوفیانە کە کاتێ شەهیدبوونی پێغەمبەری بە گوێ گەیی ڕووی کردە موسوڵمانان و پێی کوتن: ئێوە ئیمانتان بە محەممەد هێناوە، ئێستێ وا محەممەد لە ناوتان ڕۆیی و نەما، کەوابێ هەرچی زووترە وەرن با پێکەوە یەک بین و لە سەر یەک دین بین.

گۆیا حەزرەتی محەممەد فەرموویەتی: کاتێ دەستەیەک لە فەریکە موسوڵمانەکان کە لە کاتی تێشکانیان بێر و بەوێدا ڕۆیبوون، دووڕووەکان خۆیان گەیاندبوونێ و پێیان کوتبوون: ئەو پێغەمبەرەی ئێوە خۆتان پێ هەڵاوەسیبوو پێمان نەکوتن لە هەوەڵەوە ئەوە فەردێکی عادیە و پێغەمبەر نییە؛ ئەگینا نە شکستی دەخوارد و نە بریندار دەبوو و نە دەشکوژرا، جا ئێستێ کە ڕۆی

و نەما هەچی زووترە وەگەڕێن بۆ سەر دینی خۆتان؛ حەزرەتی عەباسیش هەر ئەو بۆچوونەی کوتمان تەئید دەکا. تفسیر کبیر، ج٩/٣٠.

ئایەتی ﴿فَتَنقَلِبُواْ خَاسِرِينَ﴾ واتە ئەگەر ئێوە لەوانەی کوفریان بۆ خۆ هەڵبژاردووە ئیتاعە بکەن، ئێوە بەرەو دوا دەگێڕنەوە. ئەوکات بێ بەهرەی هەر دوو دنیا دەبن. دەبێ ئێمە دێرەدا "هەرکاتێ" بە گشتی تەعبیر کەینەوە، «إن»ی سەر «تطیعوا» بە عام وەرگرین، تاکوو بتوانین بێ سڵەکردن، خوسرانی دنیا و ئاخرەت بە مەبەست وەرگرین لە «خاسرین»ی ئایەتەکە، چونکە خەسارەتمەندی دنیا کە لە هەرچی خەسارەتمەندی بەئێشترە ئەوەیە: لە دنیادا دیلی دەستی دوژمن بێ و چاو لە دەستی ئەو بێ، دەستی نیاز بۆ لای ئەو درێژ کەی، هەر وەک ڕۆڵەی زانا و هەڵکەوتووی کورد (هەژار) لە شێعرێکی خۆیدا لە "هەڵۆ"دا ئاماژەی وەلای ئەو بابەتە کردووە و فەرموویەتی:

مەرد ئەگەر کاری بە نامەردانە دەردی سەرباری هەموو دەردانە

خۆ فرۆشتن بە دوژمنی نەتەوە، هەمان دەردە بۆ مرۆیان.

ئەگەر بەڕاستی دەست دە یاسای ئاسمان بگیردرێ، لە هیچ ڕۆین و هەنگاوێکدا تووشی سەرسمدان و هەڵەنگوتن نابێ، خودا پێمان دەڵێ: بۆ یارمەتی وپشتیوانی و گەیشتن بە ئامانج خۆ ماوێنە بن باڵی دوژمن، چونکە ئەوەندەی لە سەرەوە یاریدەت دەدا دوو بارتەقا و چەند بارتەقات لە بنەوە زەبوون و لاواز دەکا، کورت و درێژیت دەکەوێتە دەستی ئەو، دەستەجڵەوی کارت دەکەوێتە دەست ئەو، چۆنت بێر و بەوێدا بەرێ، دەبێ بڕۆی؛ کە وایە ئەی خاوەن هەست پەنا بەرە بەر خودا و خۆت، دەنا دۆڕاوی.

بۆ ڕاستی ئەو مەبەستە هەستە بچۆ خزمەت ئایەتی ١٥٠ی ئالی عیمران:

**بَلِ اللَّهُ مَوْلاَكُمْ وَهُوَ خَيْرُ النَّاصِرِينَ ﴿١٥٠﴾** ئالی عیمران
**(پەنا مەبەنە بەر کەس و دەستی بۆ لای کەس درێژ مەکەن) بەڵکە خودا یاوەرە بۆتان و ئەوە چاترین یاریدەدەر.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٥٠**

ئەو ئایەتە بە ئاشکرایی ئەوەمان پێ دەڵێ: پەنا مەبەنە بەر دوژمنی دین و ئایین و نەتەوەتان بۆ یارمەتی و گەیشتنتان بە مەبەست و ئامانجتان، چونکە ئەوان ناتەوان و سەرگەدانن لەو

بارەوە، ئەوانیش هەر لە خودا داواکارن، کەوایە ئەتۆی بەندە ڕاستەوخۆ و ڕاستەوڕێ لە خودای خۆت داواکار بە و نیاز بخوازە، چونکە ڕاستتر لە خوا و لە خۆت نییە بۆ خۆت.

**بۆ ئاگاداری:**

ئەی بەنـدەی خـودا، ئەتـۆ بە هـۆی بەیانـات و ئەقڵـی سرشـتی ڕێزدارتـر و بەڕێزتـر و بەئەرزشترین نوێنەری خودای و چاکترین مەولاش ئەتۆ هەتە کە خودایە و ئەو ئیمتیازەشی پـێ بەخشـیوی و مەولای تـۆش هـیچ کـات و زەمـان لە زاڵیەتـی نـاکەوێ و توانـایی و هێـزی لە سەرووی هەچی هێز و توانایە، بەڵام دەبێ ئەتۆ بە هۆی ئەقڵ و ژیری خۆت چاک بزانی غەیری خودا ناتەوانن لە تواناییدا، بۆ وەی نابن خۆیان پێ بسپێری و فریوی وەسوەسە و فڕ و فیشاڵیان نابێ بخۆن و لە جوغز و دایرەی دەستەڵات و ئیرادەی خودا ناکرێ خۆ دزینەوە و پەنا بردن بـۆ کافرانی لە خودا بێزاری بەری. ئەی بەندەی خودای خاوەن ئیمان و باوەڕ، چاوەڕوان مەبن بـێ خودایان لە خوداو وەنزیک خەن و یارمەتیتان دەن، ئێوە ئەگەر یەک‌گرتـوو و یەک‌دەنـگ بـن و هەوڵ و تێکۆشانتان بە دروستی وەگەڕ خەن، هەرگیز پێویسـتیتان بە کـافر نـابێ. بەڵـکە خـودا سەرپەرشتکاری کۆمەڵی یەک‌دەنگ و یەک‌دڵانە.

ئەرکی ئینسانە ئەوە بزانێ کە غەیری خودا کەس ئاگاداری هەستی دڵ و دڵان نیـیە، ئەوەی دە بن پەردە و پەڕپەڕی دڵانە بە نێوی هەست و نیەت هەر خودا پێی ئاگایە و زانایە، خوداش نە بەخیلە و نە حەسوودە، هەڵسووڕێنەری گەردوونیش هەر بەوە و دنیا و ئاخرەتیش هەر بەوە، جا لە سەر ئەو ئەساس و یاسایە کێ خۆ بەو کەسە نەسپێرێ بەر لەوەی داوای نیازی لێ بکرێ ئەو ئاگاداری نیازەکە بێ. ئەو کەسە دۆڕاوە دەستی لە هیچ کوێ گیر نابێ هەڵوەدا و بەڕەڵدایە، کـێ بۆ خۆی وەیگرێ دەتوانێ قەڵاتە و قەڵاچۆی بکات، دەبێ بەو کەسانەی دەس دە غەیری خودا دەگرن بکوترێ:

**قُلْ مَن يَكْلَؤُكُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مِنَ الرَّحْمَٰنِ بَلْ هُمْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٢﴾** انبیاء

**بڵێ: کێ شـەو و ڕۆژ لە سـزای خـودای خـاوەن بەزەیـی دەتانپـارێزێ؟ نەخێـر، ئەمـانە هەر لە ئامۆژگاری پەروەردگاریان پشت هەڵدەکەن.**

خودای خاوەن حیکمەت و حەکـیم بەو دەلـیلەی کە وەلـی موسـوڵمانانە و یاریـدەدەری خاوەن ئیمانانە، وە غیرەتیان دەخـا و هورەیـان بەرز ڕادەگـرێ و لە سـەر هەنـدێک شکسـت و

دواکەوتنی بە هەڵکەوت دڵخۆشییان دەداتەوە تا هەستی ئەوەی نەکەن خودا لێیان توورەیە، بۆ نموونە دە پلەی وەسەتی شەڕی غەزای ئوحوددا موسوڵمانان بەرکەوتن و دوژمنان سەرکەوتن، بوو بە هۆی دڵناڕەحەتی موسوڵمانان، لەوەی ترسان خودا لێیان وەڕۆ گەڕێ، بەڵام خودای میهرەبان دڵخۆشی دانەوە بەوەی دە قۆناغی ئاخری شەڕەکەدا غیرەتی خستنە ناو دڵی موسوڵمانان و ترسی خستە ناو دڵی کافران، کافر بەزین و ڕەوین، موسوڵمانان سەرکەوتن. ئائەوە نیشانەی ئەوەیە خودا حەق وەژێرناخا و ناحەق وەسەر ناکەوێ، چونکە ئەو دەسەر و دەبەرە دوور لە شەئنی خودایە، سەرەنجام بیندرا موسوڵمانان سەرکەوتن و کافر بەرکەوتن.

بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٥١ی ئالی عیمران بۆوەی باشتر حاڵی بین:

**سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُواْ الرُّعْبَ بِمَا أَشْرَكُواْ بِاللّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ وَبِئْسَ مَثْوَى الظَّالِمِينَ**

**بەو زووانە ترس و لەرز دەخەینە دڵی ئەو کەسانەی وا بێباوەڕن، چونکە شتێکیان کردووە بە شەریک و هاواڵی خودا، کە خودا هیچ بەڵگەیەکی لە سەر ئەو شتە نەناردووەتە خوارەوە، جێگا و ڕێگایان هەر ئاگرە، چەندە خراپە جێگا و مەئوایان، چون خراپەکارن.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٥١

بە پێی کوتەی زانایانی قورئان ئەو ئایەتە پیرۆزە هۆی دابەزینەکەی دەبێ ئەوە بێ: هەرای شەڕی ئوحود بە کارەساتەکانیەوە دابەزینی ئەو ئایەتەی بە دووی خۆیدا هێنا، دە حاڵێکدا مانای ئەو ئایەتە بۆ هەموو کات و دەورانێک دەگونجێ، واتە موسوڵمانان کە پابەندی فەرمانی خودا و ڕەسووڵ بن، خودا هورەی بەرزان دەداتێ، و لەو لایەشەوە سستی و بێهێزی و ترس دادەڕژێتە ناو دڵی کافران و لە ڕووی موسوڵمانان دەلەرزن و دەترسێن؛ بۆ نموونە ئەبوسوفیان ویتسی بگەڕێتەوە بۆ شەڕ دوای ئەوەی شەڕگەی چۆڵ کرد و ڕۆیی، هەر لە هەمان کاتیشدا خودای مەزن ئاگاداری بە پێغەمبەر لەو بارەوە دا کە ئەبوسوفیان ویستی بادانەوەی کرد کە دووبارە باداتەوە بۆ سەر موسوڵمانان، بەڵام ڕێم پێ نەدا بە هۆی ئەوەی ترس و لەرزم هاویشتە نێو دڵیانەوە بە هۆی ئەوەی هاوبەشیان بۆ خودا داناوە، بەشێک کە لە لایەن خوداوە هیچ بەڵگەیەک بۆ ئەو شتە ڕانەندراوە واتە ئەو هاوبەش پەیداکەرانە هیچ بەڵگەیەکیان دە دەستدا نییە لە لایەن خوداوە کە ئەو هاوبەشی خودا بن، جا بۆیە سزای درۆزن و بوختانچی دەبێ دۆزەخ بێ.

**پوختەیەک لەو بارەوە:**

بۆ گورِ و تین دان بە دڵی موسوڵمانان خودای ئاگادار بە هەستی ناو دڵان، گۆشـەیەک لە سەرپەرشتی خۆی دەرحەق بە موسوڵمانان نیشان دەدا و ڕایدەنێ، هاوبەشپەیداکەران بۆ خودا بە هۆی سەرکەوتنیان لە قۆناغی هەوەڵدا بە سەر موسوڵماناندا لە هەرای ئوحوددا دەیانەویست دووبارە بادەنەوە سەر لەشکری موسوڵمانەکانی تێشـکاو و پـرژ و بـڵاو بـۆ وەی بە یەکجـاری خلاسیان کەن و هەر ئاوا بتوانن شاری مەدینەی مبـارەک بە دەسـتەوە بگـرن، و داگیـری کەن، بەڵام خودای تەعالا بۆ پووچەڵ کردنەوەی هەڵوێستیان هـات بەتـرس و لەرزێکـی تەواو دڵـی ئاخنین و هورەی لێ داماڵین، بە سەرشۆڕی و داماوی وەک لەشکرێکی تێشـکاو بەرەو شـاری مەککە هەڵاتن و گەڕانەوە، هۆی ئەو سزایەشیان ئەوە بوو: بێ دەلیـل و بەڵـگە شـەریکیان بـۆ خودای دادەنا و دەیانکردە سەنگەری خۆیان بۆ بە گژدا چوونی موسوڵمانان، ئەوانە خەیانەتیان دەچانـد هەم لە نـاو دەروونـی خۆیـان، هەم لە نـاو دەروونـی موسـوڵمانان. دەرکەوت دێـرەدا پاڵپشتی لەرزۆک و بێهێز و لاواز، تێکڕمان و تێکشـکان و تێکڕووخـانە، وەک پاڵپشـتی موشریکان، بەڵام پاڵ وەخودا دان زامنی ڕوحی پڕ هیوا و ئومیـدە خـۆڕاگر دە بەرابەر هەچـی تۆفان و سێڵاو و زەلزەلەیەکە.

**بۆ ئاگاداری:**

دەبێ پێشەکی ئەوە ڕوون کرێتەوە ئەو ترسەی خودا دەیخزێنێتە نـاو دڵـی کـافران، هەر بـۆ هەرای ڕۆژی ئوحودە و تایبەتە بۆ ئەو، و یا بۆ هەموو کاتە؟

جا بۆ ساخبوونەوەی ئەو شـتە دەبـێ بکەویـنە هەڵسـەنگاندن و وەزن کردنـی ئایەتەکـانی تایبەت و بـابەتی ئەو کارەسـاتانەی دەو ڕۆژانەدا ڕوویـان داوە. جـا ئێسـتێ لە سـەر ئەساسـی بەرچەوەندی و هەڵسوکەوتی کافرەکان و موسـوڵمانەکانی هەرای ڕۆژی ئوحـود وا وێـدەچێ ئەو ترس و لەرزەی خودا خزاندییە ناو دڵی کافران، تەنیا بۆ هەرا و کارەسـاتی ئوحـود بـووبێ. هەر وەک زۆربەی قورئانزانەکان مەبەستیان بەو ترسەی خودا خستییە نـاو دڵـی کافرەکـان، دە هەرای ڕۆژی ئوحوددایە. لە ئایەتەکـانی تـایبەتی ئەو باسـەش هەر ئەو نەزەرە بە ڕەوا زانـدراوە چونکە ئایەتەکە لە سەر ئەو باسە دابەزیـون (ئوحـود). و ئەوانەی کە بەو لایەدا کەوتـوون، واتە ترسی ڕۆژی ئوحودە، کافر گرفتاری بوون دوو نەزەریان لە سەر ئیجادی ئەو ترسە نیشان داوە:

١. کاتێ کافرەکان سەرکەوتنیان بە دەست هێنا، ویستیان ڕانەوەسـتن تـا هەمـوو لەشـکری

موسوڵمانان نابوود دەکەن، بەڵام خودای تەعالا بە هۆی ترس خستنە ناو دڵیان لەو هەڵوێستەی پاشەکشە پێ کردن و هەڵاتن.

۲. کاتێ کافرەکان بەرەو مەککە دەهاتن دە ناو ڕێدا کوتیـان ئـێمە لەو سـەرکەوتنەماندا بـۆ مەیدانمان دا دەرچن هەندێکیان، با بادەینەوە سەریان و نابوودیان کەیـن. دیسـان خـودا ترسـی هاویشتە ناو دڵیان و پەشیمان بوونەوە لەوەی بگەڕێنەوە سەریان.

بەڵام هەندێک لە زانایان بۆچوونیان لە بابەت ئەو ترسـە بە پـێچەوانەی نەزەری ئەوانەیە کە بـۆ ڕۆژی ئوحودیـان دانـاوە ئەو ترسـە، ئەوان دەڵـێن: ئەو تـرس و لەرزەی کـافران لە ڕاسـت موسوڵمانان بۆ هەموو دەورو زەمان و کاتە.

قەفال کە یەکێکە لە زانایانی قورئان دەڵێ: ئەگەرچی کارەساتەکە دە ڕۆژی ئوحوددا ڕووی داوە و ترسەکەش نیشان دراوە، بەڵام ئەو ترسەی کە کافرەان لە حاند موسـوڵماناندا هەیـانە بـۆ هەمیشەیە نە تایبەتی ڕۆژی ئوحودە، پێغەمـبەر فەرمـوویەتی: نُصْـرِتُ بِالرُّعْـبِ مَيْـسَرَة شَـهرٍ: سەرکەوتنم دەست کەوت بە هۆی ترسەوە بە ئەندازەی مانگێک ڕێ. یانی ترسـانی کـافران ئەو سەرکەوتنەی بە نسیبی من کرد کە بە درێژایە مانگێک نەدەکرا ئەو مەسیرە ببڕدرێ.

ئایەتی ﴿سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُواْ الرُّعْبَ﴾ بە زاهیر وا خۆ دەنوێنێ بۆ هەمـوو کـات بێ و بۆ هەموو کافران بێ. هەر وەک بەشـێکی زۆر لە زانایـان مـوافیقی ئەو نەزەرەن؛ چـونکە دەس ناکەوێ کەسێک مخالیفی ئایینی ئیسلام بێ و ترسیشـی لە موسـوڵمانان نەبـێ، لە کـاتی شەڕدا و لە غەیری شەڕدا. بڕوانە لە تەفسیری کەبیر، بۆ باسی هەمان ئایەتی ۱۵۱.

خودای تەعالا بە پێی حیکمەتی خۆی هەسـتی موسـوڵمانانی شـەڕکەر دەجـووڵێنێتەوە و وەگەڕی دەخا تاکوو لە خۆیان پرسیار بکەن هـۆی شکسـت خواردنیـان لە هەرای ئوحـوددا و بریندار بوونی پێغەمبەر و شەهید بوونی چەندها نەفەر لە ناودار و بەرزە پیاوانی ئیسلام چ بوو؟ و عیللەت و هۆی ئەو شکستەیان بخەنە ڕوو، و بـۆچی لە ڕۆژی هەرای بەدردا دە حاڵێکـدا کە ژمارەی نەفەراتی ئیسلام کەم بوو و نەفەراتی کافرەکان زۆر بوو، کەچی کافران شکستیان خوارد و موسوڵمانان سەرکەوتن؟ بەڵام دە هەرای ئوحوددا لەشکری ئیسـلام زۆر و بەرچـاو و کـافی بوو کەچی شکستیان خوارد؟ جـگە لەوانەش حەزرەتـی ڕەسـووڵ پـێش هەڵگیرسـانی هەرای ئوحـود دە خەونیـدا بەرانێکـی دەکوشـتەوە و شمشـێری خۆیـان لەو حەیـوانە کـوژراوە تـاقی دەکردەوە جاری هەوەڵ دەنووشتاوە، بەڵام بۆ باری دووهەم شمشێرەکان ڕاست دەبوونەوە. ئەو

خەونە بە تەعبیراتی ڕەسووڵ و یارانی هەرای ئوحود و شەهید بوونی طەلحەی کوڕی عوسمان بوو و هەروا شـەهید بـوونی تـاقمێکی زۆر لە یـارانی ئیسـلام، سـەرەنجام خـودای تەعـالا بە وەسیلەی ئایەتی ١٥٢ی ئالی عیمران بەسەرهات و کارەسات و هـۆی واقیعەکـانی شکسـت و پیرۆزی تێدا بەیان دەکا و ئاشکرایان دەکا. ئێستاش کاتی ئەوەی هاتووە بچینە خـزمەت ئـایەتی ١٥٢:

وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِ حَتَّىٰ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَازَعْتُمْ فِي الْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّن بَعْدِ مَا أَرَاكُم مَّا تُحِبُّونَ مِنكُم مَّن يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ الْآخِرَةَ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥٢﴾

ئالی عیمران

بەڕاسـتی ئەو بەڵێـنەی کە خـودا پێـی دابـوون کە سـەرتان بخـات، لە شـەڕی ئوحـوددا خـودا بەڵێـنەکەی خـۆی هێنـایە دی، ئێـوە بە یـارمەتی خـودا دەسـتتان کـردە کوشـتنی دوژمنـان، تـا سەرەنجام هەڵاتن و بۆ دەرباز کردنی گیانی خۆیان پشتیان تێ کردن، بەڵام ئێوە تێک چـوون و بوو بە کێشە لە نێوانتاندا، پاش ئەوەی کە ئەو شتەی حەزتـان لێـی بـوو و خۆشـتان دەویسـت خودا پیشانی دان، هەندێکتان قازانجی دنیایی مەبەسـتە و هەنـدێکی دیشـتان قـازانجی ڕۆژی دوایی دەوێت، لە بەر ئەوە خودا دەستباڵایی ئێوەی لە سەر دوژمنەکانتان هەڵگرت و شکسـت ڕووی تێ کردن، تا ئەمە ببێتە وانەیەک بۆ ئێوە و تـاقی ببـنەوە، ئینجـا بەڕاسـتی خـودا لێتـان خۆش بوو، خودا خاوەنی فەزڵ و کەرەمە بەسەر ئیمانداراندا.

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٥٢

مەبەست لە ناکۆکی و کێشەی نێوان موسوڵمانەکان نافەرمانی ئەو چل پەنجا کەسە بوو کە پێغەمبەری خودا لە سەر کێوی ئوحود داینابوون، ئەوە بوو گوێیـان نەدایە فەرمـانی پێغەمـبەر و جێگـای خۆیـان چـۆڵ کـرد و هـاتنە خـوارەوە بـۆ کـۆکردنەوەی تـاڵان، بەوەش فەرمـانەکەی پێغەمبەریان شکاند، باس هەر باسی غەزای ئوحودە، ئەو باسە پێویستی بە درێژە پێ‌دان هەبوو، چونکە شکانی موسوڵمانەکانی هەرای ئوحودە، برینێکی گەورەی خستۆتە ناو دڵی هەمـووان، بەتایبەتی لە دڵی کەس‌وکار و بنەماڵەی ئەو حەفتا موسـوڵمانەی کە شـەهید کـران، لە لایەکـی تریشەوە بوو بە هۆی دڵخۆش‌بوونی بێ‌باوەڕان و منافقان و جوولەکەکانی شاری مەدینـە؛ لەو ئایەتانەشدا جارێکی دی خودای بەرز و بێ‌هاوتـا لە لایەکـی دڵـی موسـوڵمانەکان دەداتەوە و

دڵنەواییان دەکات، لە لایەکی دیکەوە لۆمەیان دەکات، و لە لایەکی دیشەوە بەڵێنی سەرکەوتنی دیکەیان پێ دەدات، ئەگەر یەکڕیز بن و بە ڕێکوپێکی ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوە.

**بە هێواشی و وردتر:**

خودا دەفەرموێت: سوێند بێت خودا بەڕاستی بەڵێنی خۆی بـۆ گەیانـدە جـێ لەو کـات و ساتەیدا دوژمنتان بە ڕێپێدانی خودا دەتانکوشت هەتـا ئەو کـاتەی تـاڵان بەری چـاوی گـرتن هورەو لە سستی دا و خۆ بەخۆ کەوتنە کێشە لە بارەی خۆڕاگریتـان لە سـەنگەرەکانی خۆتـان، هاتن بێفەرمانیتان لە خۆ نیشان دا، پاش ئەوەی خـودا پێشـانی دان ئەوەی پێتـان خـۆش بـوو چاوتان کرد ئەو کەلوپەلانەی بتپەرسـتان بەجێیـان هێشـت و هەڵاتنیـان دەکـرد، بە لاتـانەوە خۆش بوو، دیارە لە ئێوەدا هەن داوای دنیا دەکات و هـی واشـتان هەیە داوای ئـاخرەت دەکـا، واتە هەتانە دنیای دەوێ، هەشتانە ئاخرەتی دەوێ، ئینجا خودا هـات ئێـوەی هەڵاوارد لەوانەی دنیایان دەوێ بۆ ئەوەی تاقیتان کاتەوە و لێشتان خۆش بـووە. چـونکە خـودا خـاوەن ڕێـزە بـۆ خاوەن باوەڕان.

بە کوردی و بە کورتی، کاتێ موسوڵمانەکان دەگەڵ ئەو زەرەر و زیانانەی بەریان کەوتبـوو هاتنەوە مەدینە، بە یەکتریان دەکوت: بۆ مەگەر خودا وەعـدەی سـەرکەوتنی بە ئـێمە نەدابـوو؟ ئەدی بۆ چی تێشکاین؟

هەر بۆخۆیان بە خۆیان دەڵێن: وەعدەی خودا ڕاست بوو و هیچ خیلافێکـی تێـدا نەبـوو، بەو دەلیلە: لە سەرەتای شەڕەوە دوژمنمان تێک شکاند و ڕاومان نان و کوشتمانن تا ئەو کـاتەی لە ئیتاعەی پێغەمبەردا بووین و لامان‌نەدابوو؛ بەڵام کاتێ بە هۆی ئارەزووی تاڵان بەری چـاو و دڵمان گیرا و تاریک بوو، کەوتینە شوێن تاڵان و بێئەمری ڕێبەرمان و سەنگەرمان چـۆڵ کـرد، وەرەقی شانسی سەرکەوتن ئاوەژوو بۆوە، سەرکەوتنمان لێ بـوو بە بەرکەوتـن؛ جـا دەگەڵ ئەو خەیانەت و بێئەدەبییەی کە بە سەر خۆمان هێنا، خودای خاوەن کەرەم بەخشین لە سـزادانمان چاوپۆشی فەرموو، چونکە خودایە و یار و یاوەر و پەناگای موسوڵمانان، هەر ببوورە لە هەڵە و تاوان.

دەکرێ ئەوزاع ئا وا بخرێتە ڕوو: خودای تەعالا وەعدەی پیرۆزی هەڵاوەسیبوو بە مەرجـی سەبر و خۆڕاگری و ئیتاعە؛ تا ئەوان سنووری مەرجیـان نەبەزانـد دە سـەرکەوتندا بـوون،بەڵام کاتێ سنووری مەرج بەزێندرا، کاتی سەرکەوتنیش پەڕێندرا.

جوملەی ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِي ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم﴾ دڵ هەست بە چەند مانا و بەراوەرد دەکا، بۆ نموونە: یەکێک دێ و دەڵێ، جوملەی ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ﴾ لە جێگای مەرجە، واتە شەرت؛ خۆ دیارە شەرتیش دەبێ وڵامی وەدرێ، جا بەو پێیە دەبێ حەولی چارە و دۆزینەوەی وڵامبدرێ. زانایانیش لەو بارەوە دوو جۆر و شێوە نەزەریان گرتۆتە بەر، بەو جۆرە:

١. لە هەوەڵەوە و بە پێی هەڵسەنگاندن و وەزن کردنی ئەحواڵ دەڵێین: «حتی اذا فشلتم» شەرت نییە، بەڵکە مانا و تەعبیراتی ئایەتەکە ئاوا دەڕوانێ: خودا وەعدەی دروست بردە سەر، تا ئەو کاتەی کە ئێوەی موسوڵمان دروست لە سەر قەول و قەرار بەردەوام بوون، بەڵام کاتێ کە دزە و سستیو لە خۆ نیشان دا، واتە دە ناو خۆتاندا کێشە و دووبەرەکیو هێنایە ڕوو سستیان ڕێ دا بێتە ناو کارتانەوە، ئەودەم قەول و قەرار ئاوەژوو کرانەوە. واتە سەرکەوتن بوو بە بەرکەوتن. لەفزی (حتّی)ش بە مانای (الی) خۆ دیاری دەکا، واتە «حتی إذا» یا «حتی إلی» یا «إلی حین».

لە سیمای ئایەتەکەش وا دەردەکەوێ: خودای تەعالا سێ شتی نیشان دابێ لە سەر موسوڵمانان: ١. سستی (فشل)، ترس، لاوازی ٢. تنازع، واتە کێشە و دووبەرەکی.

واتە پێغەمبەر دەستووری دا کە تیرهاوێژان لە شوێنی دیاریکراوی خۆیان نەبزوون. عەبدوڵڵا کوڕی جوبەیر بە ئەمیری وان دیاری کرا لە لایەن پێغەمبەرەوە، بەو دەستوورە کاتێ بتپەرستان هاتنە ڕوو و ئاشکرا بوون، تێرهاوێژان دایاننە بەر ڕەهێڵەی تیران و شکاندیانن، کاتێ هەڵاتن و ڕایانکرد، موسوڵمانان ئەو ماڵ و سامانەی بە بتپەرستان بوو بەجێ ما و وەک تاڵان کەوتە ڕوو چاویان کرد و هاواریان لێ پەیدا بوو: تاڵان! تاڵان! دەستەولەجێ عەبدوڵڵا کوڕی جوبەیر کە فەرماندە بوو هەستی خەتەری کرد و هەرای کردنێ کە قەول و قەراری پێغەمبەر لە بیر نەکەن؛ کە پێی کوتووین هەرچی ڕوو بدا، ئێوە لە شوێنی خۆتان وەلا نەکەون، بەڵام وا دیارە تەمەع چاو و گوێی داگیر کردبوون ئاوڕیان وەسەر هەرای عەبدوڵڵا نەدا، وا هات عەبدوڵڵا بۆخۆی و چەند نەفەرێک کە لە شوێنی خۆیان مابوونەوە کەوتنە بەر هێرش و پەلاماری دوژمنان بە مەقامی شەهادەت گەیشتن. ئەوە بوو مەبەست لە (تنازعتم فی الامر) ناو ئایەتەکە. کێ خوازیاری ئەوەیە بە درێژی سەیری ئەو بەسەرهاتە بکا، بچێتە ماڵە تفسیری کبیر باسی ئەو ئایەتە.

**چاو ڕێخشاندنێک وەلای جوملەی حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ بەتایبەت لە سەر واژەی «إذا»:**

چەند بۆچوونێک هەیە، وەک ئەوە: ئایا إذا شەرتیە یا خێر؟ ئەگەر شەرتییە، جـوابێ دەوێ، جا دێـرەدا هەنـدێک نەزەریـان وایە کە واژەی إذا بە مانـای شـەرت نیـیە، بەڵـکە بـۆ زەرفـیەتە، دەستەیەکیش دەڵێن: شـەرتییە و جوابەکەشـی «عصـیتم»ە. ئەوە نەزەری نەحوزانـانی کـوفەیە. دەستەیەکی دیش دەڵێن: بەڵێ شەرتییە، بەڵام جوابەکەی «منعکم الله نصره»یە، ئەوەش قەولـی نەحوزانانی بەسرەیە. هەشن دەڵـێن: جـوابەکەی جـوملەی حەزفکـراوی «صرتـم فـریقین»ە. ابومسلم اصفهانی دەڵێ شەرتییە اذا، جوابەکەشی «صرفکم عنهم»ە. تفسیر کبیر، ج ٩/٣٢-٣٦.

**نوکاتی بەرچاوی زەق دەو ئایەتەدا ١٥٢:**

وەک هەستی پێ دەکرێ و حاشای لـێ نـاکرێ، هـۆی شکسـتی موسـوڵمانان دە شـەڕی ئوحوددا دوو شتن: ١. تەنازع دەگەڵ ئەمیر ٢. بێئەمری پێغەمبەرﷺ

٢. بێ ئیتیحادی کۆسپی هەرە گەورەیە بۆ گەیشتن بە مەتڵەب

٣. تاوانی یەکێک لە یاران هەموو یاران دەگرێتەوە، هـۆی ڕەنـج و ئازارکێشـانی حەزرەتـی ڕەسووڵ بێ نەزمی موسوڵمانانی شەڕەکە بوون بەڵام خـودای تەعـالا خەبەری دا بە وەسـیلەی ئایەتی (و لقد عفا عنکم) خەتاکارەکانی بەخشی، واتە هەم ئەوانەی ڕایانکرد لە شـەڕەکە و هەم ئەوانەی لە سەر کێوەکە هاتنە خوارەوە.

**ابن عمر لۆمەچی حەزرەتی عوسمان شەرمەزار دەکا!**

لە عوسمان کوڕی موهب نەقڵ کراوە کە کابرایەک دێتە خزمەت عەبدوڵڵا کوڕی عـومەر، دە حاڵێکدا کە عەبدوڵڵا دەگەڵ پۆلێک خەڵک لە نزیکی خـانەی کەعـبە دادەنیشـن. ئەو کـابرا ساکارە کە کیـنەی دەگەڵ حەزرەتـی عوسـمان بـوو، دەیویسـت پـلاری قسـان و لـۆمە بـاوێتە حەزرەتی عوسمان، لەوبارە ڕوخسەتی لە عەبدوڵڵا کوڕی عومەر دەخواست، چەند پرسیارێک ئاراستەی ئەو بکات. دیارە عەبدوڵڵا ئیجازەی پێ دا.

کابراش کوتی: بە خـودای کەعـبەت سـوێند دەدەم هەچـی لێـت دەپرسـم جـوابێ ڕەوا و دروستم بدەوە.

حەزرەتی عەبدوڵڵاش فەرمووی هەچی بیزام و دروست بێ ئەوت پێ دەڵێم.

کابرا ڕووی کردە عەبدوڵڵا و کوتی: ئایا لە شەڕی ئوحوددا حەزرەتی عوسمان هەڵنەهـات و ڕاینەکرد؟

عەبدوڵڵا فەرمووی: بۆچی؟ بەڵێ؛ ڕایکرد.

دووبارە کابرا کوتی: مەگەر حەزرەتی عوسمان لە شەڕی بەدردا شیرکەتی نەکرد؟

عەبدوڵڵا فەرمووی: بەڵێ؛ با.

دووبارە هەر کابرا ڕووی دە عەبدوڵڵا کرد و کوتی: حەزرەتی عوسمان لە قەزیەی "بیعت الرضوان"دا مەگەر حازر نەبوو؟

عەبدوڵڵا فەرمووی: بەڵێ.

ئەو مەردەکی سبایی وای خەیاڵ کرد بەوەی عەبدوڵڵا کوڕی عومەر پرسیارەکانی ئەوەی ڕاجع بە حەزرەتی بە بەڵێ وڵام داوە و تەئیدی کردن. جێگا و نەقاتە لاوازەکانی حەزرەتی عوسمان، سابت بوون و چوونە جێ بۆ ئەو سەرکەوتنە خەیاڵیەی خۆی. ئەڵڵاهوئەکبەرێکی توندی کوت. بەڵام حەزرەتی عەبدوڵڵا کوڕی عومەر هەر وا بە ئاسانی وێڵی نەکرد مفت بڕوا، بەڵکە ڕووی تێ کرد و فەرمووی ئێستێ وەرە پێش و حەقمت پێ بڵێم و دڵ و گوێی دەیە؛ ڕاستە حەرزەتی عوسمان لە شەڕی ئوحوددا ڕایکرد، بەڵام ئەمن شاهیدی دەدەم لە سەر ئەوەی کە خودای خاوەن جەلال عوسمانی بەخشی، و ڕاجع بە عوسمان و یارانی عوسمان دە قورئانی کەریمدا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ عَفَا اللَّهُ عَنكُمْ ﴿١٥٢﴾ آل عمران﴾ دووبارە ﴿وَلَقَدْ عَفَا اللَّهُ عَنْهُمْ ﴿١٥٥﴾ آل عمران﴾ دیارە عەفویش نە تەنیا گوناحان دەشواتەوە بەڵکە پلە و پایەش دەگەڵ بەخشینەکە دەباتە سەرێ.

دووبارە عەبدوڵڵا کوڕی عومەر بەوەندە جوابە دەس‌بەرداری کابرای قین لە دڵ نابێ و نەبوو بەڵکە بەو شێوە ئیدامەی قەسکانی دا و فەرمووی: هۆی حازر نەبوونی حەزرەتی عوسمان لە شەڕی بەدردا نەخۆشی ڕوقیەی خێزانی بوو کە دەبێتە کچی پێغەمبەرﷺ کە هەر دەو نەخۆشییەدا وەفاتی فەرموو، دەنا حەزرەتی عوسمان بەو حاڵەشەوە کە خێزانی نەخۆش بوو حازر ببوو بچێ بۆ شەڕی بەدر. بەڵام حەزرەتی ڕەسووڵ پێی فەرموو لە لای نەخۆشی خێزانت وەمێنی و ئاگاداری لێ بکەی بۆ تۆ کەمتر نییە لە غەزات. و ئەو کاتەی لەشکری ئیسلام گەڕاوە بۆ شاری مەدینە و لە غەزا تەواو بوو، پێغەمبەر حەزرەتی عوسمانی لە ڕیزی شەڕکەرانی غەزای بەدردا هێنایە حیساب و ژمار و هەروا لە سەهمی تاڵانیشدا حەزرەتی عوسمانی وەک یەکێک لە شەڕکەران خرایە حیسابەوە.

بەسەرهاتی بیت الرضوان هۆیەکەی حەزرەتی عوسمان و دیفاع لەو بوو کە پێک هات، و

هەر بەرەکەتێکـی کە بە نەسـیبی موسـوڵمانان لەو بەیـتە الرضـواندا بـوو لە سـایەی بەرەکەی حەزرەتی عوسماندا بوو، سەیر کە کارەساتی بیعت الرضوان:

کافرانی مەکـکە بـۆ دیـالۆگ دەگەڵ پێغەمـبەر و موسـوڵمانان داوای نەفەرێکیـان کـرد کە جێگای قبووڵی هەم ئەوان بـێ هەم جێگـای بـاوەڕی موسـوڵمانان بـێ، ئەو نەفەرە حەزرەتـی عوسمان بوو، واتە لە عوسـمان لێهـاتووتر بـۆ ئەو دیـالۆگە نەبـوو، بەڵام کـاتێ کە حەزرەتـی عوسمان هاتە نێو کافرەکان، دەنا نێـوانی موسـوڵمانان هەرای ئەوەی بڵێنـد بـوو کە حەزرەتـی عوسمانیان شەهید کرد بە دەستی کافرەکان. پێغەمـبەریش هـات لە ئەسـحابی کیـرام بەیعەتـی ستاند ئەگەر ئەوە ڕاست بێ و عوسمان شەهید کرابـێ، دەبـێ دەگەڵ موشریکـانی مەکـکە تـا ئاخرین دڵۆپی خوێن دەگەڵیان بکەوینە شەڕ، لەو بەیعەتەدا کە حەزرەتی عوسمان لەوێ نەبوو، پێغەمبەر دەستی مبارەکی خۆی لە باتی دەستی حەزرەتی عوسمان خستە ناو دەستی خۆی واتە لە باتی ئەو ڕەسووڵ بەیعەتی دەگەڵ خۆی کرد.

ئەو بەسەرهاتە پڕبایخە قازانجە کە ڕازەکەی دەرسە بۆ ئینسـان و ئەوەی پـێ دەڵـێ: دەبـێ هەموو شتێک ئەودیو و ئەمدیوی بە تەواوی سەیر کەی و شارەزایی کامڵت بە پاش و پێشی بێ، جا دەم و دەستی لێ دە، دەنا وا هەیە دەکەویە بەر هێرشی پلاران. کیـنە لە دڵ و لـۆمەگری بـێ بەراوەرد و بەتـاڵووکە (مەردەکـی سـبایی) بە تەواوی شـەرمەزار بـۆوە و هـیچ ڕێـی جـواب و قسەکردنی بۆ نەماوە، عەبدوڵڵا کوڕی عومەر پێی کوت: اِذْهَبْ بِها الآنَ مَعَكَ واتە ئەو مەتـڵە ئێستێ دەگەڵ خۆت ببە و برۆ. صحیح بخاری، بابی فضایل الاصحاب، بابی مناقب حضرت عثمان بن عفان، ش ٣٦٩٩

درێژەی باسی لە لایەن خودای حەکـیمەوە لە سـەر هەرا و کارەسـاتی ڕۆژی ئوحـود زۆر گەورە و سەخت و بەرچاوە، بۆیە خودای تەعالا هیچ قوڕنە و پەسیوێکی لێ وەپاش نادا بەڵکە هەمان نیشان دەدا، تاکوو عالەم دەرسی لێ وەرگرێ. ئەو ئایەتی ١٥٣ی ئالی عیمران حـاڵەتێکە ئەوە نیشان دەدا کە کاتێ لەشکری کافر تێک شکان دە جەنگ و شکست و پـرژ و بڵاوییـان بە سەر هات بێر و بەوێدا موسوڵمانانی شەڕکەر. خۆشەویستی ماڵ و سامانی دنیایـان کە سـەر و دڵی گرتن، کەوتنە کۆکردنەوەی سیلاح و تاڵانی بەجێماوی لەشکری تێکشـکاوی هەڵاتـووی کافرەکان، و لەو لایەشەوە دەستەیەک دووڕوو لە پاش پاشەکشە و ڕۆیشتنی عەبدووڵڵا کـوڕی ئوبەی و هاوڕێکانی، ئەوانیش لە مەیدانی شەڕێ چوونە دەرەوە. چەندین ئەفرادی دیکەشیان لە

موسوڵمانەکان دەگەڵ خۆیـان بـرد و ڕایانـدا. کارەسـاتی چۆڵبـوونی مەیـدانی شـەڕ گەورە و گوشاد بـۆوە و جـار دەگەڵ جـار دەروازەی ڕەخسـانی هەل و فرسـەت بـۆ دوژمـن وەنیزیـک دەکەوتەوە، بۆوەی بتوانن هێرش بکەن و سەرکەوتن وەقۆزن، هەر دەو کات و ساتەشدا هەواڵی شەهید بوونی پێغەمبەریش خرایە ڕوو. کە سـەراپای ئەو ڕووداوانە بە زیـانی موسـوڵمانان و بە قازانجی کافران دەهاتە کایەوە. ئەو ئـایەتی مبـارەک و پیـرۆزی ١٥٣ی ئـالی عیمـران بە تێـر و تەسەلی بەیانی ئەو بەسەرهاتانە دەکا:

إِذْ تُصْعِدُونَ وَلاَ تَلْوُونَ عَلَى أحَدٍ وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِي أُخْرَاكُمْ فَأَثَابَكُمْ غُمَّاً بِغَمٍّ لِّكَيْلاَ تَحْزَنُواْ عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلاَ مَا أَصَابَكُمْ وَاللّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٥٣﴾ ئالی عیمران

**یادیش لەو کاتە بکەرەوە بە کێوەکەدا سەر کەوتن، سەر هیچ کەستان نەدەپـرژان پێغەمـبەریش لە پشت سەرتانەوە بانگی لێ دەکـردن هەر بـۆیە خـوداش بە زیـاد کردنـی پەژارە جەزا و تـۆڵەی لـێ سەندنەوە تا سەرەنجام خەمی ئەو شتە نەخۆن کە لە دەستان دەرچوو و ئەو بەڵایەش کە تووشـتان بوو، خوداش ئاگاداری ئەو کارانەیە ئەنجامی دەدەن.**

(لەو ئایەتە پیرۆزەشدا خودای تەعالا دیمەنێک لە دیمەنەکانی شـەڕەکانی ئوحـود دەخـاتە پێش چاو و بە شێوەیەکی ئەوتۆ وەکوو بە چاوی خۆمـان ببینـین، کە چـۆن ژمـارەیەکی زۆر لە موسوڵمانان دوای سەرکەوتنەکەیان شـکان و تـرس و لەرز دایگـرتن و هەر یەکەی دە هەوڵـی ڕزگار بـوونی خۆیـدا بـوو، بەتـایبەتی ئەوانەیـان کە ئیمانیـان زۆر قـایم نەبـوو، هەروەهـا ئەو دووڕوویانەیش کە بە تەماعی دەسکەوتنی غەنیمەت هاتبوون بۆ بەشداری کردن لە شـەڕەکەدا. خودا لەو ئایەتەدا دەفەرموێت:

بیر بکەنەوە کە چۆن لە ترسان ڕووتا کردە بەرزاییەکـانی ئوحـود بـێ ئەوەی ئـاوڕ بـدەنەوە لەوەی کەسێک پێویستی بە یارمەتی‌دان هەبێـت لە کاتێکـدا کە پێغەمـبەری خـودا لە دواتـانەوە بانگی لێ دەکردن: بگەڕێنەوە بۆ مەیدانی شەڕەکە، بگەڕێنەوە بۆ مەیدانی مەردایەتـی و کڕینـی بەهەشت، بەڵام ئەو بانگ‌کردنەی پێغەمبەر هیچ کاری تێ نەکردن و نەگەڕانەوە.

جـا وا دیـارە ئەو کـۆمەڵە کەسـە دوایـی لەو هەڵوێسـتەی خۆیـان پەشـیمان بـوونەتەوە و خەفەتیان لێ خواردووە کە چۆن پێغەمبەری خودایان بە غەمەوە بەجـێ هێشـتووە، بـۆیە خـودا دەفەرموێ: ﴿فَأَثَابَكُمْ غُمَّاً بِغَمٍّ﴾ واتە لە جەزای ئەو خەمەدا کە دوچاری پێغەمبەر بوو، بە هۆی ئەو هەڵاتنەی ئێوەوە خوداش ئێوەی دوچـاری خەم کـرد بە هـۆی ئەو پەشـیمانییەی کە ڕووی

تێکردن کە چۆن پێغەمبەری خوداتان لە مەیدانی شەڕدا بەجێ هێشت، لە کاتێکـدا کە پێغەمـبەر هەر لە جێگەکەی خۆیدا مابۆوە، و بێ ئەوەی ترس و بیم ڕووی تێ بکات هەروەهـا غەمبـاری کردن بە هەواڵی شەهید بوونی پێغەمـبەر ئەو جەزایەتـان بەو شـێوەیە درایەوە. تـا غەم نەخـۆن غەنیمەتتان دەست نەکەوتووە، هەرەها تا غەمبار نەبن بە هۆی ئەو زەحمەت و ناسۆرانەی کە بە سەرتاندا هات. وا دیارە لە هەڵهاتنەیـان هێنـدە پەشـیمان بـوونەتەوە خەمێکـی وای کـردووە بە دڵیاندا کە هەموو خەمەکانی دیکەیان لە بیر بردوونەتەوە.

﴿وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ واتە خودا زۆر ئاگـادارە بەوەی دەیـکەن، کـێ لە کردەوەکانیـدا مەبەستی ماڵی دنیا و خۆشییەکانی دنیایە! هەروەها کێش ڕەزامەندی خودای مەبەستە!؟ خـودا بە هەمووی ئاگادار و شارەزایە.

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٥٣

وەیاد وەرنەوە کە کاتێک سەر دەکەوتن بە کێوی ئوحوددا و ڕاتاندەکرد و ئاوڕتـان لە کەس نەدەدایەوە کە پێغەمبەر لە ناو کۆمەڵی پاشەوە بانگی دەکردن کە بگەڕێنەوە، ئێوەش نەگەڕانەوە، جا خودا لە سەر ئەو بێفەرمانییەی کردتـان پاداشـتی بە خەفەت لە دوای خەفەت دانەوە. ئەوە بوو بە خەفەتباری ڕاتانکرد و بیستنی کـوژرانی پێغەمـبەر زیـاتر خەفەتبـاری کـردن، بـۆ ئەوەی دڵتەنگ نەبن لەوەی لە دەستتان چوو لە سەرکەوتن بە سەر دوژمندا و نەگەیشتن بە ماڵی تاڵانی و لەو ئازار و برینداریيەش کە پێتان گەیشت، واتە خەفەتی پەلەقـاژەی خـۆ ڕزگـار کردنتـان لە دەستی دوژمن و خەفەتی بیستنی کوژرانی پێغەمبەر بوون بە هۆی لە بیر چـوونەوەی خەفەتـی سەرەکییەکەتان، دیارە خوداش ئاگادارە لەوەی دەیکەن.

#### پوختەی کارەسات:

ئەو ئایەتە ئاماژە وەلای هەرای ئوحود دەکا کە چۆن بۆ ڕاکردن لە کێـوەکە بـۆ لای سـەرێ دەچوون و هەروا دەستەیەکیش لە دەشت و بیابانا پرژ و پەرێشـان دەبـوون بە شـێوەیەکی وا کە ئاوڕێکیـان وەدواوە نەدەداوە، کە بـزانن ئەو هاواڵانەیـان کە وا سـابتقەدەم مـاونەوە لە دەوری پێغەمبەر و ئاگاداری لەو، دە چ حاڵ و شەرایەتێکدان. هەچەندی پێغەمبەر لە پشت سـەریانەوە هەرای دەکردن کە وەگەڕێن بۆ لای من، ئەمن ڕەسووڵی خودام، هیچ کامیان ئاوڕیان نەدەداوە، دەو حاڵەتە سەختەدا لوتفی خودا داپۆشین و غەم و خەفەتێکی کە بە هـۆی سسـتی لە شـەڕدا

بەرۆکی گرتبوون و لە دەستدانی سەرکەوتن و تالآن و مەرگ و برینداری یارانیان هێرشی کردبووە سەریان، ئەو کەرەمەی خودا هەمووی وەلا بردن بە هۆی پەشیمان بوونەوەیان و وەهۆش هاتنەوەی وەلای حەق. دیارە خودا هەچی دەیکا لە پێش و پاش باخەبەرە، هیچ کەس پاکانەی نەکا سەر بەخۆ بۆ خۆ، ئەوەی خەتاکارە تۆبە بکا، هەچی ڕاستە ئەوە بڵێین.

**تیوتیوە:**

زانایانی عیلمی نەحو لە بابەت ئیرتیباتی ئەو ئایەتە بە ئایەتانی پێش خۆی نەزەری جۆراوجۆریان هەیە، بۆ نموونە:

١. هەندێکیان بۆچوونیان وایە کە ئەو ئایەتە موتەعەلیقە بە ئایەتی (عفا عنکم) (١٥٢)، لە سەر ئەو بەراوەردە تەعبیری ئایەتەکە ئاوا دەکەوێ: وَ عَفا عَنكُم إِذْ تَصعُدونَ؛ واتە با وجودی نافەرمانیتان لە مەیدانی شەڕ بڵاو بوونەوە و هەر یەکەی ڕووتان دە لایەکی کرد. بەڵام خودای خاوەن عەفو و بەخشش بەخشینی.

٢. هەندێکیش دەڵێن ئەو ئایەتە دەبێ بە ئایەتی (لیبتلیکم) هەیە واتە: ئێوە تاقی دەکەنەوە موسوڵمانان بزانن کێیە موسوڵمانی بەڕاستی.

٣. هەشن دەستەیەک نەزەریان وایە ئەو ئایەتە موتەعەلیق بە ئایەتی (ثم صرفکم عنهم) یانی (صرفکم عنهم اذ تصعدون).

۴. بەشێک لە زانایان نەزەریان وایە کە ئایەتەکە بە ئایەتی (عصیتم) تەعەلوقی هەیە.

۵. بەعزێکیش دەڵێن بە ئایەتی (فشلتم) تەعەلوقی هەیە.

۶. هەشن دەڵێن: بە ئایەتی (تنازعتم) تەعەلوقی هەیە.

٧. لە لای دەستەیەکی دیکە بۆچوون وایە: ئەو ئایەتی بە حەزف کراوێکەوە تەعەلوقی هەیە وەک (اذکروا) بێ حەزفەکە، بە پێی ئەو نەزەرە ئایەتەکە کەلامێکی سەربەخۆیە، بە پێشەوەی خۆی عەلاقەی نییە. تفسیر کبیر، ج ۴۱۴/۹.

ئایەتی (اذ تصعدون) وەیادمان دەخاتەوە کە یادی ئەو دەورانە بکەین کە هەندێکتان دە حاڵەتی ڕۆیشتندا بوون بۆ سەرزەمینی خۆتان کە مەدینەی مبارەک بوو. هەندێکیشتان بەرەو کێوی ئوحود بە خاتری پەنا گرتن لەوێ دەحەڕەکەتدا بوون. دەستەیەکیش خەریکی دۆزینەوەی هاوالآنی خۆتان بوون، دە حاڵێکدا هیچ خەبەرێکی دروست نەبوو.

ئەو کارەساتانە دە کاتێدا بوو کە حەزرەتی محەمەد بۆ تازە کردنەوەی دەسنوێژ لە یاران

نەختێک جودابێوە، کاتێ دەستنوێژ دەگرێ و دەگەڕێتەوە، تەماشا دەکا موسولّمانەکان بێر و بەوێدا پەرێشان و هەڵبڕاون. هات پێغەمبەر هاوارێکی کێشا کە ئەی موسولّمانەکان وەرنەوە، بەڵام دەو کاتە سەخت و سەخڵەتەدا دەنگی پێغەمبەر نەهاتە بیستن. تا ئەو کاتەی کەعب کوڕی مالک موسوڵمانەکانی هەرا کرد و پێی کوتن: وەرنەوە ئەوە پێغەمبەر بریندار بووە و کافران هێرشیان هێناوە.

دڵ دەیهەوێ بزانێ ئایەتی (غمّا بغمّ) واتە ئەو غەم لە دوای غەمە، چۆن بووە؟ قورئانزانەکان لەو بارەوە نەزەری جۆراوجۆریان هەیە، هەندێکیان پێیان وایە ناڕەحەتی و خەمێکی کە لە مەیدانی شەڕەکەدا دەهاتن و دادەبەزین، تێشکان و کوشتەدانی هاواڵان بوو خەمی دووهەمیش ئەوە بوو کە پێغەمبەر خەمی ئەوەی بۆ دەخواردن کە لە ئیتاعەی ئەو لایان دابوو.

لە لای هەدنێک لە قورئانزانەکان مانای خەم لە دوای خەم دەهات، ئاوایە: خەمی هەوەڵ حەملە کردنی کافران بوو بۆ سەر لەشکری موسوڵمانان، خەمی دووش خەمی ڕوحی بووە واتە بیستنی شەهید بوونی حەزرەتی ڕەسووڵ بوو. و هەر وا تانەی ئەوسوفیان و هاواڵانی بوو بۆ سەر پێغەمبەر و یارانی، ئەو نەزەرە نەزەری یەکێک لە زانایانە بە ناوی سدّی، بەڵام قەولێک لە سەر ئەو خەم لە سەر خەمە، ئاوا دەڵێن: خەمی هەوەڵ شکستە، خەمی دووهەم شەهید بوون و لەناوچوونی یاران بوو. بەڵام بە لای هەندێک لە ئەهلی نەزەر (غمّا بغمّ) واتە خەمی زۆر لە ڕۆژی ئوحوددا. چونکە دە ڕۆژی ئوحوددا ڕەگباری خەمان هەموو لەشی موسوڵمانانی دابێژ دابێژ کردبوو. گۆیا ڕەواترین تەعبیرە. تفسیر کبیر، ج ٩/٤٠-٤١؛ روح المعانی، ٤/٤١٦.

**جیاوازی لە نێوان غەم و حوزن:**

زۆربەی لوغەتزانان لایان وایە فەرقیان نیە بەڵام دەستەیەک دەڵێن فەرقیان دە مانادا ئەوەیە، خەم واتە پەرێشان لە حاڵەتی خراپی ئێستێ و داهاتوو، بەڵام حوزن واتە خەم خواردن بۆ ڕابردوو کە حاڵەتێکی خراپ بووە، و هەروا خەوف بۆ بابەتێکی نالەبار و ناخۆش کە ئیمکانی هەیە بە نیشانەدا بێ.

ئایەتی ﴿لِّكَيْلَا تَحْزَنُواْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ﴾ ڕازی هاتنی خەم ئاشکرا دەکا، واتە دەفەرموێ: هۆی خەمبار کردنت ئەوەیە تاکوو بزانی دڵ پڕ لە هیوا و ئومێد و بەخشی خودایە، ئێمەی موسوڵمان لە سەر بێ ئەمری پێغەمبەران لە ڕۆژی وا سەخت و حەستەمدا پێناودار ناکا بەڵکە

دەمانبەخشێ.

ئایەتی ﴿وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ زەمزەمەی ئەوەیەتی بیرمان دەخاتەوە کە خودای بانی سەر ل ەهەست و نیەتی دڵیشمان ئاگایە هەر وەک زاهیرمان دەزانێ.

خودای بانی سەر بەو دەلیلەی کە هەرای ڕۆژی ئوحود هەرایەکی بەرچاوی خاوەن کارەساتە، دەشتوانێ دەرسی لێ وەرگیرێ، دەیهەوێ هەچی کەلێن و قوڕنە و قوژبنیەتی نیشانی خەڵک دەدا، بۆوەی موسوڵمانان ڕێ نەدەن جارێکی دی ئەوەی لە هەرای ئوحوددا بە سەریان هات لە بەر خیلافکاری خۆیان بە سەریان بێتەوە. ئێستاش بۆ ئیدامەی ئەو مەستانەی کە لە ئایەتەکانی ڕابردوودا باسیان لێ کرا بە وەسیلەی ئایەتی ١٥٤ی ئالی عیمران خودا دەیهەوێ درێژەیان پێ بدا، وەک دەڵێن ئەو ئایەتەی ١٥٤ لە هەندێک شوێن ناوی براوە بە ئایەی «قطب» بەو دەلیلە کارەساتی زۆر عەجیب و غەریب و چاوەڕوان نەکراوی تێدا ڕووی داوە، جگە لە ڕەحمەتی زۆر کە دەو ڕۆژەدا هاتە دی (ڕۆژی ئوحود)، کاتی چوونە خزمەت ئایەتی ١٥٤ هاتووە:

ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّن بَعْدِ الْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَى طَآئِفَةً مِّنكُمْ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِاللّهِ غَيْرَ الْحَقِّ ظَنَّ الْجَاهِلِيَّةِ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ الأَمْرِ مِن شَيْءٍ قُلْ إِنَّ الأَمْرَ كُلَّهُ لِلَّهِ يُخْفُونَ فِي أَنفُسِهِم مَّا لاَ يُبْدُونَ لَكَ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَاهُنَا قُل لَّوْ كُنتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ الَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقَتْلُ إِلَى مَضَاجِعِهِمْ وَلِيَبْتَلِيَ اللّهُ مَا فِي صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحَّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمْ وَاللّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿١٥٤﴾ ئالی عیمران

پاشان خودا لە دوای ئەو خەم و پەژارە، هێوری و ئارامییەکی نارد بۆتان کە بریتی بوو لە سەرەوەنەوزێک، ئەو وەنەوزە بەشێ لە ئێوەی گرتەوە. بەشێکی ترتان هەر لە خەمی خۆتاندا بوون، گومانیان سەبارەت بە خودا گومانێکی ناڕەوا بوو، هەر لە گومانی سەردەمی نەفامی دەچوو، دەیانکوت ئایا ئێمە هیچ شتێکمان بە دەسە؟ بڵێ: هەموو کاروبارێک لە ژێر دەستی خودادایە، شتی وایان لە دڵیاندا دەشاردەوە کە لە لای تۆ نەیاندەدرکاند، دەڵێن: ئەگەر لەو جەنگەدا ئێمەش شتێکمان بە دەس بوایە، ئالێرەدا نەدەکوژراین، پێیان بڵێ گەر لە ناو ماڵەکانی خۆشتاندا بانە ئەوانەی وا کە کوشتنیان بۆ تۆمار کرابوو بە پێی خۆیان بەرەو شوێنی مەرگیان دەچوون، خوداش بۆیە ئەو کارەی کرد تاکوو ئەوەی لە ناو دەروونتاندایە تاقی بکاتەوە، ئەوەش لە ناو دڵتاندایە، پاڵفتەی بکات، خوداش ئاگای لەو شتانەیە کە لە دەروونەکاندایە.

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٥٤

بۆ ئاگاداری:

ئەو ئایەتە باسی دوو دەستە دەکات، دەستەی بڕوادار و دەستەی بێبڕوا؛ دەستەی خاوەن باوەڕ بێباک و بێترس خەونووچکە دایگرتبوون و وێژینگیان دەدا، دەستەی بێباوەڕ و دووڕووش لە چاڵی گومان و نەزانیدا ڕۆچووبوون و تێمابوون. جا لە پاشان کە خودای بانیسەر ئاگاداری شاراوە و ئاشکرایە، هات لە پاش غەم و پەژارە دڵنیایی و سووکەخەوێکی بۆ سەر ناردن کە کۆمەڵێکی بە خەو داپۆشین و ئارامی پێ دان، کۆمەڵێکی دیکەشیان کە بەڕاستی هەر خۆیان دەویست و مەبەست بوو، خەیاڵی گومان و ناڕاستییان لە خودا دەکرد، گومانی نەزانی و نەفامی دەیانکوت: ئەوە کە دەڵێن: خودا یاریدەدەرمانە ئایا ڕاستە و شتێکی بۆ ئێمە تێدا هەیە؟ خودا دەفەرخوێ: ئەی محەممەد پێیان بڵێ: بێگومان فەرمان هەموو بۆ خودایە، ئەوەی لە دەروونیاندا حاشاری دەدەن و بۆت ئاشکرا ناکەن، دەڵێن: ئەگەر لەو فەرمانە بۆ ئێمە شتێک بووبایە لێرەدا نەدەکوژراین، لە کێوی ئوحود، ئەی محەممەد بڵێ: ئەگەر لە ماڵەکانی خۆتاندا بوونایە، ئەوانەی کوژرانیان بۆ نووسراوە، دەردەچوون بۆ ئەو شوێنەی لێی تخێڵ بوون و بۆ ئەوەی خودا تاقی بکاتەوە، ئەوەی لە دەروونتاندایە و بۆ ئەوەی پاک بکاتەوە ئەوەی لە دڵتاندایە، خودا زانایە بە خاوەن دەروونەکان.

**پوختەکاری:**

لە پاشڕاکردنتان خودا ناردی بۆ سەرتان لە دوای خەفەت خواردنتان ئارامش و دڵنیایی و خەونووچکە کە کۆمەڵێکی لە ئێوە داپۆشیبوو بە وێژینگان، کۆمەڵێکی دیکە بەڕاستی هەر هیوایەتی خۆیان هەبووە، هەر وا گومانی ناڕاستیان بۆ لای خودا دەبرد، گومانێکی نەزانی و نەفامی، دەڵێن: ئایە بۆ ئێمە شتێک هەیە لەو فەرمانەی کە خودا پێی داوین!؟ کە سەرکەوتنە لە شەڕدا، بڵێ: ئەی محەممەد فەرمان هەمووی بۆ خودایە، ئەوەی لە دەروونیاندا حاشاری دەدەن و ئاشکرای ناکەن بۆ تۆ، بەو هیوایە دەڵێن ئەگەر شتێک بۆ ئێمە هەبوایە لەو بەڵێنیەی کە خودا داویەتە مە کە بریتییە لە سەرکەوتن بە سەر بێبڕوایاندا، لێرەدا نەدەکوژراین، واتە لە کێوی ئوحود، ئەی محەممەد بڵێ: ئەگەر لە ماڵەکانی خۆتاندا بوونایە، ئەوانەی کوژرانیان لە سەر نووسراوە، دەردەچوون بۆ ئەو شوێنەی کە ئێستا لێی بە سەر یەکا کەوتوون و کوژراون. جا بۆ ئەوەی پاک بکاتەوە ئەوەی تاقی دەبێ کرێتەوە ئەوەی لە سینگ و دەروونتاندایە، بۆ ئەوەی

بزاندرێ کە خودا زانایە بە خاوەن دەروونەکان. ئەوە بوو مانای ئایەتەکە بە پوختی.

**چاو پێدا خشینێک:**

بۆ یارانی ئیسلام پاش شەڕی ئوحود شـەوێکی پـڕ دەرد و ژان و ئـۆف و سـواری شـان و ملیان ببوو، و سەرچاوی چاوەی دڵیانی داگیر کردبـوو، هجـوومی دەبـردە سـەر هەسـتی نـاو دڵیانەوە لەشکری سەرکەوتووی قوڕەیشییەکان هێرش بکەن و حەملە بەرنە سەر شاری مبارەکی مەدینە، داگیری کەن و جێگا بە یارانی ئیسـلام لێـژ کەن، بە دەم ئەو خەیـاڵە خەو و خـۆراک و ژیانیان لێ تاڵ ببوو لە تاو ئەو ژان و برکەی ناو دڵیان، دەرگای هیوا و ئومیـدی لێـان چـی وای نەمابوو قفڵ کرێ و داخرێ، بەڵام پشووی سروەی بەرەبەیانی بەزەی باری هات و جـووڵاوە و خۆی ڕۆهێشتە ژووری دڵ و دەروونیان، بە دووی ئەو تاریکە شەوەی ناو دڵیان نووری ڕووناک و هێواش و ئارامکەرەوەی لەش و گیانی بە خەوێکی شیرین و ئارام داپۆشین بەو هۆیە هەستی باوەڕ و ئومید بە خودا و وەعدەکانی پێغەمبەر لە ناو هەستی دەروونیاندا بە ڕوونی هەسـت پـێ دەکرا دە حاڵێکدا کە چەک و سیلاحی شەڕیان هەر پێوە بوو کەوتنە ژێر پەردەی ئـارامییەکی کە لە ئیمان و باوەڕیدا خۆ دەنـوێنێ و دەبینـدرێ لە کـات و سـاتەکانی سـەختی و تەنگـانەدا، لە بێئیمانیدا چاو ناکرێ و نابیندرێ، بۆ نمـوونە هەر لەو کەسـانەی کە دەگەڵ لەشـکری ئیسـلام بوون بەڵام بە تەمای ماڵی دنیا و پارازتنی گیانی خۆیان ئەوانیش هەر نەخەوتن شەو تـا بەیـانی هەر بە دەم ئارەزووی دنیاییدا دەتـلانەوە، نەکەوتـنە بەر ئەو ڕەحـمەتە خەوە خۆشـەی، چـونکە ئەوانە گومانی ناڕەوا و ناردوسـتیان دەبـارەی خـودادا دادەتاشـین هەر وەک گومـانی دەورانـی جەهالەت کە دەیانکوت ئەڵڵا کاروباری ئومـووراتی ئەو کائینـات و بـوونەوەرەی سـپاردوو بە خودای دیکەی دنیـا، واتە هەڵـس‌وکەوت و هەڵسـووڕانی ئەو گەردوونە بە دەسـت خودایـانی دیکەن، و هەروا باوەڕیان ئەوە بوو: هەچی هەیە ل ەسەرکەوتن و بەرکەوتن لە شەڕدا بە دەست پێغەمبەرە، خودا لەو بارەوە هیچ کارێکی نییە. جا ئەدێـرەدایە کە خـودای تەعـالا بـۆ پـووچەڵ کردنەوەی خەیاڵی کاڵ و ناڕەوای وان دەفەرموێ: هەچی کاروبارە بە دەست خـودایە و بەس لە هەر بارێکەوە، کێ شایانی بە چی بێ دەیداتێ، کێ نالایق و ناشایان بـێ نایـداتێ. و تەنـانەت ئەو تاقمە بیر کورتە خەیاڵیان وا بوو سەرنەکەوتنیان نیشانەی حەق نەبوونی ئیسلام بوو، چونکە ئەگەر ئێمە حەق باین دەبا سەرکەوین، ئێستێ کە سـەرنەکەوتووین دەلـیلە کە ئیسـلام نـاحەقە، نەشیاندەتوانی ئەو نیەت و باوەڕەیان لای پێغەمبەر بڵێن و بیدرکێنن بەڵکە لە ناو دڵ و سـینەیان

حاشاریان دەدا. ئیسلام ئەوەی باوەڕە بە هەڵاتن نـاکرێ نەجـاتبوون لە مەرگ دەسـت بـخەی بەڵکە ئەوانەی کاتی مەرگیان کە بۆ دیاری کراوە لە هەر کوێ بن دە هەر شەرت و شرووتێدا بن کات دەیانگاتێ و دەیانبا و دەشبێ بۆ هەمـوو کەس تـاقی کـردنەوە بـێ تـاکوو دەرکەوێ کێـیە ڕادەکا و کێیە ڕاست ناکا، خودا بە زاهیر و نهێنی ئاگادارە، ناڕوانێتە گوفتار دەڕوانێتە کردار.

**پاشەدۆ:**

ابن مسعود فەرموویەتی: «امنة» واتە ئەمنیەتی دڵ و ئارامی لە لایەن خوداوە. «نعاس» واتە بەدل لە بری «أمنة» بە واتەی وێژینگە، یـانی ئەمینـی و خەو و ئـارامی. ئێـرەدا (غەزا) ئەوجـار خودای تەعالا دەیهەوێ بە وەسیلەی ئەو ئەمنیەت و خەو بە سـەردا هاتنەیانـدا چەن ڕازێکیـان نیشان دا ئەوزاعیشیان بۆ ڕوون کاتەوە.

١. سەیر کەن دابەزینی ئایەتی ﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّن بَعْدِ الْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا﴾ واتە لە پـاش خەم داگرتنتانـدا ئەمنـیەت وخەو هـاتن دایپۆشـین، نەک هەمووتـان بەڵـکە ﴿يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ﴾ واتە دەستەیەکو لە شـەڕکەرانی ڕۆژی ئوحـوددا، کە بە پێـی هەڵسـەنگاندنی ئەوزاع دەبێ کەسانی داپۆشراو بەو ئەمنیەت و خەوە مهاجرین و ئەنسار بووبن.

٢. ئایەتی ﴿وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ﴾ بەیانی دەستەی دووهەم دەکا کە بە هیچ جـۆر بە یادی شەڕ نەبوون و سەرکەوتن و پیرۆزی لەشکری ئیسلامیان دە خەیاڵدا نەبووە، بەڵـکە ئەوانە نەجاتی خۆیان بۆ ببووە خەم لە سەر دڵیان جا بۆیە خـودا هەسـتی دەروونیـان نیشـان دەدا بەو ئایەتە کە دەفەرموێ: دەستەیەکیان بەڕاستی بە فکری نەجاتی خۆیان بوون.

بە پێی بەراوەرد لە ئەوزاع ئەو دەستەیە دووڕوویەکانی باقیماندەی لەشکری ئیسلام بوون.

٣. ئایەتی ﴿يَظُنُّونَ بِاللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ ظَنَّ الْجَاهِلِيَّةِ﴾ واتە ئەو تاقمە گومانیان لە خـودا دەکـرد وەک گومانی دەورانی جاهیلیەت.

دیارە دێرەدا خودای تەعالا بە وەسـیلەی ئەو ئـایەتە لە سـەر فکـر و بیـر و خەیـاڵاتی نـاو دەروونـی ئەو دووڕوویـانە پەردە لادەدا و نیەتیـان بـۆ عـالەم ڕوون دەکـاتەوە، وەک ئەوە کە دەفەرموێ: ئەو دووڕوویانە تەنیا دە بیری ڕزگاری خۆیاندان، لە ڕاست خودادا گومانی ناڕەوا و جاهیلانە ڕادەنێن و دەڵێن: لە لایەن خوداوە هیچ یـارمەتییەک نەمـاوە کە پـێمان بکـات، جـگە لەوەش وا بیـر دەکەنەوە کە ئەو دیـن و پێغەمبەرایەتیـەی پێغەمـبەری یـارمەتی خـودا ئەسـڵ و

ئەساسێکیان نییە، دەنا ئەو کارەساتەمان بە سەر نەدەهات.

۳. ئایەتی ﴿يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ الأَمْرِ مِن شَيْءٍ﴾ واتە دەڵێن ئایا شتێک لە ئوموورات بە دەستی مەیە؟ یانی هەر هەمان دووڕوویانە دەڵێن: ئایا ئێمە دەو کارەسات و هەرای ئوحوددا هیچمان بە دەست بوو؟ تا بمانتوانیبا چارەیەکمان چارە کردبا؟ ئەوە تانەیە لە موسوڵمانانی دەدەن بەوەی کە لە مەدینە پێم گوتن لە شار مەچنە دەرێ بۆ شەڕ، بەڵام ئاوڕو وە سەر من نەداوە، گۆیا ئەو شێوە دواندنە لە دوانی عەبدوڵڵا کوڕی ئوبەی و هاومەرامانی دەچێ. طبری، ۴۸۶/۳.

۴. ئایەتی ﴿قُلْ إِنَّ الأَمْرَ كُلَّهُ لِلّه﴾ یانی ئەی محەمەد بڵێ: ئەمر هەچی هەیە بە دەستی خودایە. خودای تەعالا بە پێغەمبەری دەستوور دەدا کە لە وڵامی واندا بڵێ: ئەو شکست و پیرۆزییانەی لە شەڕدا دێنە پێش و ڕوو دەدەن دە دەستی من و مەشوەرەتی مندا نییە، بەڵکە لە هورە و ئیرادە و مەشیەتی خودادانە.

۵. ئایەتی ﴿قُلْ إِنَّ الأَمْرَ كُلَّهُ لِلّه﴾ یانی ئەی محەمەد بڵێ: ئەمر هەچی هەیە بە دەستی خودایە. واتە سەرنەکەوتن و سەرکەوتن دە دەستی ئێمەدا نییە بەڵکە هەمووی دە دەستی خودادایە.

۶. ئایەتی ﴿يُخْفُونَ فِي أَنفُسِهِم﴾ واتە شتانێک حاشار دەدەن دە ناو دڵیاندا، دیارە خودای تەعالا خەبەر بە پێغەمبەر دەدا کە ئەو دووڕووانە بێجگە لەو قسە پڕ و پووچانەی دەیکەن مەبەست و مەتڵەبی دیش دە ناو سینەیاندا دەشارنەوە و حاشاری دەدەن، کە تۆ ئەی محەمەد خەبەرداریان نی، بێ گومانیشە ئەو ئاکارە ناشیانەیان ناشی لە ترسی مردنیانە کە بە زمان جورئەت ناکەن بیلێن و حاشاری دەدەن لە ژووری دڵیانەوە.

۷. ئایەتی ﴿قُل لَّوْ كُنْتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ﴾ واتە ئەی محەمەد پێیان بڵێ ئەگەر ئێوە لە ماڵەکانی خۆشتاندا بان، یانی خودای تەعالا بە پێغەمبەر دەڵێ، ئەو ستەمگەرانە دەڵێن ئەگەر موسوڵمانان گوێیان دابایە بە قسەی ئێمە دە شەڕی ئوحود نەدەکەوتن و نەدەکوژران. بەڵام بێ خەبەر لەوەی کە مەرگی وان بەر لە هەرا و شەڕ و شۆڕ، دە ناو دەفتەری تەقدیراتی خودادا تۆمار کرابوو، دەنا ئەگەر بۆخۆیان زانیبایان دەکوژران هەرگیز نەدەهاتنە مەیدانی شەڕەوە، جا کەوایە بڵێ پێیان واز لە خەیاڵاتی پووچ بێنن، ئەگەر نەشهاتبانە هەرای ئوحود و خۆشیان لە ناو ماڵەکانیاندا حاشاریش دابایە مەرگ هەر دەهاتە لایان.

٨. ئایەتی ﴿وَلِيَبْتَلِيَ اللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمْ﴾ واتە ئەو شەڕ و شۆر و کوشتنە بۆوەیە خودا تاقیتان کاتەوە، خودای تەعالا دێرەدا کارەساتی شکست و کوشتن و برینداریيان شەرح دەدا، تاکوو ئەوەی دە ناو دڵیاندا حاشاریان داوە نیشانی دا بە عالەم.

وشەی «برز» و «لیمحص»ی ناو ئایەتەکە بە مانای وەدەر خرێ و خالیس کرێ.

٩. ئایەتی ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ واتە خودا بەوەی لە ناو سینەتانە زانایە.

**تیوتیوە:**

ئەو ئایەتە چمان پێ دەڵێ و چمان تێ دەسرەوێنێ؟ بە پێی ئەو شەرح وبەیاناتەی لە سەر ئایەتەکە نیشان دران، ئەگەر پاڵ وە ئەقڵ و ئینساف درێ، دەبێ بەوە قایل بین مردن و ژین، فەقیری و دەوڵەمەندی، دڵخۆشی و دڵتەنگی حەواڵە بە خودا و نیزامی ئەزەل کرێ، کەس مافی ئیحتیڕاز و خۆڕاپسکانی نەبێ و نییە، و ئەگەر ڕووش بکەینە یاسای ئەسباب و وەسیلە و کەرەسە، دووبارە دەکەوینە ناو گێژاوی عامیلی ئەسڵی ئەو ئەسبابانەوە و ڕەخساندراون؟ حاسیە دەبین ئەگەر خۆ ناوێنە پەنای قەزا و قەدەری خودا.

کانیەکان و سەرچاوەی دڵ هەر یەکەی ئاوی تایبەتی خۆی لێ هەڵدەقوڵێ و تام و چێژی تایبەتی خۆی دەدا، جا ئەوە بێگومانە کە ئەو بەشە و سنوور دامەزرانە ڕێی لەوەی گرتووە ئەقڵ و عیلم و زانست و شعوور خۆ بگەیێننە قولە و ترۆپکی واقیعی، کەوابێ دەبێ هەر بولبولەی سەنای گوڵی خۆی بکا و پێی هەڵبڵێ. بۆ دڵ دامرکان خۆ داوێینە ناو دەریای ئایەتی ٣ و ٤ی سوورەی لەیل:

> **وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ﴿٣﴾ إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ ﴿٤﴾**
> **خودا نێر و مێی نەسازاندووە و نەیهێناوەتە ڕوو ئیللا کە هێناویەتی ڕوو ئاکار و بۆچوونیان لێک جیاوازن.**

واتە هەر کەس بەبیر و بۆچوونێکەوە و هەر کەس بە باوەڕێکەوە سەیری دنیا و دنیای ئاخرەت و خودا و ڕەسووڵ دەکا. زۆر لەوانەیە کە ئەوە یاسایەکی بەحەق و ڕەوا بێ: کە ڕاوەستانی نیزامی حاوانەوە و ژیانی ئینسانی، ئەو جیاوازی و ئیختیلافە باوەڕ و بۆچوونە بێ کە ئێستێش و لەوە بەدواش و لە پێشیشدا حاکم بووە لە سەر بەشەر، دەشکرێ بۆ ڕاستی ئەو مەبەستە ئاوڕێک وەسەر ئایەتی ١١٨ و ١١٩ی سوورەی هوود بدرێتەوە:

وَلَوْ شَاء رَبُّك لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلاَّ مَن رَّحِمَ رَبُّك وَلِذَلِك خَلَقَهُمْ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّك لأَمْلأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾

ئەگەر پەروەردگارت ویستی لە سەر بوایە، هەموو خەڵکی گەلێکی هاوبیر و باوەڕ دەبوون، بەڵام بەردەوامانە جیاواز و جۆراوجۆرن دە باوەڕ و بۆچووندا. جگە لەوانەی پەروەردگارت مێهرەبانی دەگەڵ کردوون، هەر بۆ ئەوەش دروست کردوون. بڕیاری پەروەردگارت سەری گرتووە و سەقامگیرە کە بە ڕاستی دۆزەخ پڕ دەکەم لە جنۆکە و مرۆ بە تێکڕایی.

کێ وازی لە درێژەی باسەکەیە زەین داتە تەفسیری کەبیر.

دە دنیادا ئینسان لە دوو جۆرە بەڵا و مسیبەت ناتوانێ خۆ دوور بگرێ و قوتار کا: ١. یەکیان بەڵای سزایە، ئەوی دیکەیان بەڵای ئازمایش و تاقی کردنەوەیە. مسیبەت و بەڵایەک هەیە کە بە هۆی سەرەڕۆیی و تاوان دێتە سەرت، ئەگەر زوو لێی وەخۆ نەکەوی و نەیشۆیەوە بە وەسیلەی تۆبە و تەڵەبی لێخۆشبوون ئەو سزایە دە ئەستۆتدایە.

٢. بەڵامی ئازمایشی ئەوەیە کە موسوڵمانان لە ڕووی هەڵە و خلیسکان و بێ بەراوەردی تووشی دێی، لە ڕووی عەمد و زانستەوە سەری ناپەڕی بەڵکە غافڵگیر دەبی و سەهڵەنگاریش چاو و دڵ دادەپۆشێ. ئەوکات خودای تەعالا بۆ لە خەو هەستان نقورچێکی بەڵای تێدەکوتێ و وەخەبەری دێنێ. وێنە و نموونەی وەک هەرای ئوحود.

دەبێ ئەوە بزاندرێ ڕۆژی هەرای ئوحود کاتێ کە ئەو دوو دەستە شەڕکەرانەی ئیسلام بە یەک گەیشتن پشتیان دە شەڕ کرد و سەنگەری خۆیان چۆڵ کرد و هەڵاتن، ئا ئەو کارەساتە خلیسکان و هەڵەیەکی قەستی خەیانەتی نەبوو، بەڵکە بێ باراوەردی و سەهلەنگاری بوو دەکرێ پێی بکوترێ: بەڵا و موسیبەتێکی ئازمایشی خودا بە سەر هێنان وەک نقورچێک بوو خودا تێی کوتان، هەر بۆیەش بەخشین و عەفووی کردن، بۆ ڕاستی ئەو مەبەستە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٥٥ی ئالی عیمران:

إِنَّ الَّذِينَ تَوَلَّوْاْ مِنكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُواْ وَلَقَدْ عَفَا اللَّهُ عَنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٥٥﴾ ئالی عیمران

بەڕاستی ئەو کەسانەی وا لە ڕۆژی شەڕی ئوحوددا لەو کاتەدا ئەو دوو دەستە بەرابەر یەکتر ڕاوەستان پشتیان لە ئێوە هەڵکرد و ڕوویان لە ئێوە وەرچەرخاند شەیتان هەڵیخەڵەتاندن بە هۆی هەندێ لەو شتانەوە کە کردبوویان، بێگومان خودا لێیان خۆش بوو، خودا لێبوردە و

**دڵۆڤانە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٥٥**

بۆ ئاگاداری:

ئەو ئایەتە ڕوو دەکاتە ئەوانەی بڕوادار بوون و لە شەڕی ئوحوددا هەڵاتن و گۆڕەپانی شەڕیان بە قازانجی دوژمن چۆڵ کرد.

لە لایەن ئیمام فەخری ڕازی ئەسڵی ڕووداوەکە دەبێ ئاوا بووبێ: محەمەد ئیسحاقی بەو جۆرە باسەکەی خستۆتە ڕوو:

سێیەکی ئەو خەڵکە لەو شەڕەدا بریندار بوون، سێیەکی دیکەیان هەڵاتن، و سێیەکەی دیکە یا ددانیان بە خۆدا گرت و ئارامیان گرتبوو، ئەگەرچی جیاوازی بۆچوون هەیە لە سەر ئەو دەستەیەی کە ڕایانکردبوو، هەندێک دەڵێن لەوانەی کە ڕایانکردووە بەشێکیان چوونە مەدینە و هەواڵی کوژرانی پێغەمبەریان ڕاگەیاندووە، و ئەو دەستە هاوارکەرەش گۆیا سەعدی کوڕی عوسمان بووە. دوا بە دوای وان خەڵکێکی دیکە دەگەنە مەدینە و دەچنەوەماڵەکانیان، ژنەکانیان پێیان دەڵێن ئەوە پێغەمبەری خۆتان بە تەنیا بەجێ هێشتووە و ڕاتانکردووە و هاوار دەکەن و گڵ و خۆڵی بە دەم و چاوی خۆتاندا دەکەن؟ و هەروا ژنەکانیان بە مێردەکانیان دەڵێن: تەشی بگرنە دەست و موو بڕێسن چاترە بۆتان. هەندێکیش دەڵێن موسوڵمانەکان لە کێوی ئوحوددا تێپەڕیان نەکردبوو.

قەفال کە یەکێکە لە مێژوونووسەکان کوتوویەتی گۆیا دەستەیەک کە هەڵاتوون و دوور کەوتوونەوە، لەوان هەندێک چوونە ناو شاری مەدینە و هەندێکیشیان بێر و بەوێدا بڵاو بوونەوە، و بەشی زۆریان هەر لە لای کێوی ئوحود ماونەوە. جا لەوێ لێک وەخڕ بوون. دەبێ لەوانەی ڕایانکردووە یەکیان عومەر بووە و بەڵام زۆر دوور نەکەوتۆتەوە کە لە کێوەکە و ماوەتەوە لەوێ. هەتاکوو پێغەمبەری خودا سەرکەوتووە. عوسمان و دوو پیاوی دیکەی ئەنسارییەکان بە ناوەکانی سەعد و عەقەبە زۆر دوور کەوتبوونەوە. پاش سێ ڕۆژان جا گەڕاونەتەوە. پێغەمبەری خودا فەرموویەتی پێیان: لَقَد ذَهَبْتم فيها عريضة. ئەوانەی لە گۆڕەپانی شەڕدا وەستان و دەگەڵ پێغەمبەر ماونەوە ١٤ کەس بوون، حەوتیان لە مهاجران بوون و حەوتیشیان لە ئەنسارییان بوون، کۆچکردووەکان: ئەبووبەکر و عەلی و عەبدوڕەحمان کوڕی عەوف و سەعد کوڕی ئەبی وەقاس، تەڵحە کوڕی عوبەیدیللا، ئەبوعوبەیدە کوڕی جەڕڕاح،

زوبەری کوڕی عەوام؛ ئەنسارییەکان ئەوانە بوون: الخباب بن منذر، ابو دجانە، عاصم بن ثابت، الحرث بن الصمة، سهل بن حنيف، اسير بن حضير، سعد بن المعاذ. لەو هەموانە هەشتیان لەو ڕۆژ و کاتە حەستەمەدا بەڵێنیان دا بە پێغەمبەر تاکوو مردن لەو شەڕەدا پێغەمبەر بەجێ نەهێڵن، ئەو هەشت کەسەش ئەوانە بوون: عەلی، تەڵحە، زوبەیر بن عەوام لە مهاجرین؛ الجناب بن المنذر، ابو دجانە، عاصم بن ثابت، الحرث بن الصمة، سهل بن حنيف لە ئەنسارییەکان. هیچ کامیشیان لەوانە لەو شەڕەدا نەکوژران.

پێغەمبەر کە لە مەدینە دەرچوو ۱۰۰۰ کەسی دەگەڵ بوو لە ئوحوددا، عەبدوڵڵا کوڕی ئوبەی بە خۆی و ۳۰۰ کەس گەڕایەوە بۆ مەدینە، ۷۰۰ کەس لەگەڵ پێغەمبەر مایەوە، بەرابەر بە ۳۰۰۰ کەس لە لەشکری بتپەرستان، لە هەنگاوی یەکەی شەڕدا بتپەرستان شکان، کە ئەو دوو دەستەی پێغەمبەر لە سەر کێوی جبل الرماية ئوحود دانابوون هەر نەبزووتبان و شوێنی خۆیان چۆڵ نەکردبا، بتپەرستان توانایی دووبارەی هێرشیان دەس نەدەکەوت و شەڕیش دوایی پێ دەهات بە سەرکەوتنی موسوڵمانان کار سەری گرت و دەورانی بتپەرستان دەکەوتە نابوودی.

بەڕاستی ئەوانەی پشتیان لە شەڕ کرد لە ئێوە لە ڕۆژی بەرەنگاریدا ئەو دوو کۆمەڵەیە: کۆمەڵی موسوڵمان و کۆمەڵی بتپەرستان، تەنیا شەیتان بوو خلیساندنی بە هۆی هێندێ گوناح و تاوان کە سزاکەیانی هەر لە ئەستۆدا مابۆوە. سوێند بێ خودا بە بەخشش و کەرەمی خۆی بەخشینی و خۆش بوو لێیان. چونکە بە ڕاستی هەر خودایە لێبوردەیە و لەسەرەخۆیە، واتە پەلە ناکات لە سزادانی تاوانباراندا.

ئەوە ڕاپۆرتی ئیمام فەخری ڕازی بوو لە سەر کارەساتی شەڕی ئوحود. کێ وازی لێیە دەتوانێ سەیری کتێبەکەی کا.

ئایەتی ﴿ إِنَّ اللّٰهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ ئیشارەی تەواوە وەلای ئەوەی کێ تۆبە بکا و ڕاست کا و وەگەڕێ وەلای خودا، خودا دەیبەخشێ. «حليم» واتە لە سزادانی گونەهباران پەلە ناکات.

هەندێک لە زانایان ئەو ئایەتەی دەکەنە دەلیل لە سەر ئەوەی ئەو خەتا و گوناهەی کە لە هەرای ڕۆژی ئوحوددا ڕوویان دا گوناهی کەبیرەن بەو دەلیلە ئەگەر گوناهی سەغیرە یان لێخۆشبوونیان مەدحی نەدەویست؛ وەک لێرەدا خودا دەفەرموێ: هەم لێیان خۆش بووم هەم بوردمن هەم حەلیمم، ئەو بوردن و لێخۆشبوونە ئەوەمان پێ دەڵێ سنوور بەزێندراوە، خوداش

ئەو سنووربەزاندنەی بەشی و چاوپۆشی لێ کرد، گوناهی سەغیرە سنووری خـودا نـابەزێنێ و مەدحیشی ناوێ، جا دێرەدا بەو هۆیە کە دەفەرموێ خودا هەم بـوردم و هەم لێـی خـۆش بـووم تاوانی کەبیرە و لە تاوانی کەبیرەش بە مەرجێ تۆبەی لێ بکرێ خۆشبوون بێتە جێ.

**پاشەدۆ:**

ئەو ئایەتە بە یەک یاسای ئەساسی ئیشارە دەکا ئەویش ئەوەیە: گوناە و تاوان هەل دەدەن بە شەیتانی کە گوناهکار بە ئاسانی داکێشێتە هـۆدەی گونـاە و تـاوان، بـۆ نمـوونە ئەوانەی کە لە هەرای ڕۆژی ئوحوددا ڕایانکرد و سەنگەریان چۆڵ کرد وەسوەسـە و خلیسـکی شـەیتانی بـوو ئەوەی بە سەر هێنان، هۆی ئەو هەلەی کە بۆ شەیتان ڕەخسا لاوازی و بێهێزی و نیسـەتی نـاو دڵیان بوو لە ڕاست حەق، چونکە دڵی پاک و بێگەرد ڕێگا نادا شەیتان هـێلانەی تێـدا بکـات، دەگەڵ ئەو حاڵەتەش خودای تەعالا هێرشی غەزەب و تـووڕەیی خـۆی نەیهێشـت ڕوو بکـاتە ئەوان هەڵەچیو هەڵەباشانە بەڵکە دانیە بەر شەپۆلی ڕەحمەتی عەفو و بەخشینی خۆی، چـونکە شایانی خودای غەفوورە بەخشین، و شایانی خـودای داوەر و کەریـمە لە سـەر تـاوان و هەڵە، ئەوانەی هەوێنی پاکیان لە هەستی دەروونیاندا هەست پێ دەکرێ، نەدرێنە بەر پەلاماری سـزا و عەزاب.

لە سەر ئەساس و هەڵسەنگاندنی حـاڵ و ئەحـواڵ و ڕووداوەکـانی هەرای ڕۆژی ئوحـود دەتوانین بڵێین ئەو تاقی کردنەوە و سیمرخ تێکوتـانی خـودا لە ئەسـحابانی شـەڕکەری ڕۆژی ئوحود سێ شت بوو:

١. غافڵ بوونی دەستەیەک لە ئیتاعەی پێغەمبەر

٢. کێشەی هەندێک لە مهاجران دەگەڵ ئەمیرەکانیان لە جبل الرماة

٣. ئارەزووی تالان.

نابێ ئەوە نەزانین ئەگەرچی ئەولیـای تەواو ئەسـحابن بەڵام خۆشەویسـتی دنیـا و مـاڵ و سامان وا هەیە خۆ ڕەپێش دەکا بۆ هێلانە لە ناو ماڵی دڵ. جا دەبێ بکوترێ: شـەیتان لەو سـێ دەروویەدا توانیویەتی هەل وەقۆزێ و بیانخلیسکێنێ. ئەو ڕازە دەبێ بکرێتە ڕاوکەی دڵ: جنس و هاوچەشن بۆ لای یەک دەچن و خۆ ڕاپشـکێنن، خـۆ بگەیێـنە یەک، وەک عەرەب کوتـوویە (الجنس یمیل الی جنسه) واتە جنس تمای لای جنسی خۆی دەکا. لە سەر ئەو یاسایە گوناهی بچکۆلە هێدی هێدی دەتکێشێتە لای گوناهی کەبیرە، بە شەرتی بەردەوامی. دەبـێ دێـرەدا ئەوە

وەک دەرس وەریگرین: خودا بێ گومان ئەسحابی پێغەمبەری خۆش ویستوون، بۆ تاوانەکانیان بە عەفو و بەخشین جواب دانەوە، ئێمەی ناو موسوڵمان لە سەرن ئەرکێکی ئایینییە و ویجدانییە خۆشن بوێن، دەنا دەکەوینە بەر هەڕەشەی خودا.

دەبێ ئەوە بزاندرێ: دووڕووەکان خاوەن باوەڕەکانیان بەوە سەرکۆنە دەکردن و تانە و تەشەریان لێ دەدان ئەگەر ئێوە ڕۆژی خۆی پێش شەڕ دامەزران لە لای ئێمە بان تووشی ئەو ڕۆژە ڕەشە نەدەبوون، واتە نەدەکوژران و نە بریندار دەبوون، چونکە هەندێک لە دڵ سستان و لاوازان توانایی خۆڕاگرتنیان تەواو نەبوو دە بەرابەر قسەی منافقان، بە سزای لاوازی و بێ‌هێزی خۆیان گەیشتن دە ڕۆژی هەرای ئوحوددا. دە حاڵێکدا خودا دانیە بەر عەفو و بەخشین بە لوتف و کەرەمی خۆی، جا لە بەر ئەوەی خودای تەعالا ئەو عەفو و بەخشینەی ڕاستەوخۆ بەیان کرد و هەموو خەڵکی تێگەیاند، بۆوەی دەرس بێ بۆ موسوڵمانان کە بتوانن لە ڕاست ئەو ڕەحمەتە بەربڵاوەی خودا بە ئەندازەی توانین خودای لەبیر خۆ نەبەنەوە، واتە هەچی بە ئیتاعە لە خودا بێتە حیساب و ژمار، خۆی پێ وەڕازێنن، و هەچی بە نیزیک بوونەوە لە بێ‌باوەڕان بێتە حیساب و ژمار، خۆی لێوە نزیک نەخەن. جا هەر لە سەر ئەو ئەساسەیە نەختێ لەوە بەدوا خودا بە وەسیلەی ئایەتی ۱۵۶ی ئالی عیمران ئاگاداری دەدا بە موسوڵمانان خۆشەویستی و خوێن‌شیرینی ئێوەی خاوەن باوەڕ و موسوڵمان تا ئەو کات و ساتە و زەمانەیە کە لە دۆستایەتی و هاوکاری و تێکەڵاوی دوژمنانی خودا خۆ بپارێزن و توخونیان نەکەون و بە هیچ جۆر شوێنیان نەکەون لە هیچ ڕێگایەکەوە. بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۵۶:

**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لإِخْوَانِهِمْ إِذَا ضَرَبُواْ فِي الأَرْضِ أَوْ كَانُواْ غُزًّى لَّوْ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ لِيَجْعَلَ اللّهُ ذَلِكَ حَسْرَةً فِي قُلُوبِهِمْ وَاللّهُ يُحْيِـي وَيُمِيتُ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١٥٦﴾** ئالی عیمران

**ئەی ئەوانەی بڕوا و ئیمانتان هێناوە، هەرگیز وەک ئەوانە مەبن کە بێ‌باوەڕن سەبارەت بە راکانیان کوتیان: کاتێک دەچوون بۆ سەفەر و بازرگانی یا بۆ غەزا و جیهاد کردن، ئەگەر لە لای ئێمە بووایەن نەدەمردن و نەدەکوژران، سەرەنجام خودا ئەو وتەیە دەکاتە داخی سەر دڵیان، هەر خودا زیندووکەرەوە و مرێنەرە، خوداش بینایە بەوەی کە ئەنجامی دەدەن.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ۱۵۶

دەبێ ئەوە بزانین کە دووڕووەکان بە پێی عادەتیان هەمیشە دە حەولی ئەوەدا بوون

موسوڵمانەکان سارد کەنەوە لە شەڕ کردن و وەدووریان خەنەوە وفێـری ئەوەیـان دەکـردن کە بە هاواڵەکانیان بڵێن« خۆتان بە کوشت مەدەن بە خۆڕایی دەچن، خوداش بۆ پووچەڵ کـردنەوەی قسەکانیان ئامۆژگاری دەدا بە مسووڵمانەکان و دەیفەرموو: ئەی ئەوانەی ئیمان و بڕواتان هێناوە و پەیمانو دەگەڵ خودا مۆر کردووە و لە سەریشـی سـوورن وەکـوو ئەو بێبـاوەڕانە مەبـن کە دەیانکوت بە برا و هاواڵەکانیان، کاتێ بە سەفەر چووبان و یا بۆ شەڕ و غەزا چووبان کوژرابـان و بریندار بووبان، ئاخر لە هەوەڵەوە پـێمان نەکـوتن مەچـن، ئەگەر نەچووبـان و لە لای ئـێمە مابانەوە ئاواتان بە سەر نەدەهات. جا ئەگەر ئەوانەشـیان پـێ دەکـوتن بـۆ ئەوەیـان دەکـوت بە خەیـاڵی خـاو و پـووچی خۆیـان کە خـودای تەعـالا بیکـاتە داخ و حەسرەت لە نـاو دڵـی کەس‌وکاریاندا، بێخەبەر لەوەی هەر خودایە دەمرێنێ و هەر خودایە دەژێنـێ، هەر خـودایە لە سەر ئاشکرا و نهێنیاندا ئاگایە.

بە کورتی و بە کوردی: ئەی ئیمانداران مەبـن وەک ئەوانەی بێبـاوەڕ و ئـیمانن، دەڵـێن بە هاواڵەکانیان دەو کات و ساتانەدا کە دەچن بۆ سەفەر و شەڕ و شـۆر و شـتێکیان دێ بە سـەر، ئاخر لە هەوەڵەوە پێمان نەکوتن مەچن، ئێستا ئەگەر نەچووبـان و لە لای ئـێمە مابـان ئـاواو بە سەر دەهات؟ ئەوە دەبا بڵێن بۆوەی بیکەنە داخ لە سەر دڵی کەس‌وکاریان، ئیدی بێخەبەریـان دەکەن لەوەی مردن و ژین بە دەست خودایە و بە دەس غەیری خودا نییە.

**پوختەیەک لەو بارەوە:**

کافرەکان بۆ سست کردن وبێ هێـز کردنـی دڵ و دەروونـی موسـوڵمانەکان دەیـانکوت بە هاواڵیان ئەگە بە قسەی ئێمەو بکـردایە و نەچووبـان بـۆ شـەڕ و هەرا تووشـی ئەو ڕۆژە ڕەشـە نەدەهاتن، بۆیەش وا دەڵێن تـاکوو دڵ و دەروونـی کەس‌وکاریـان پـڕ کەن لە داخ و حەسرەت، خوداش قسەکانیان پووچەڵ دەکاتەوە بەوەی کە دەفەرموێ: هەچی کاروبار و ئەمـرە بە دەسـت خودایە، شەڕ و سەفەر و بەزم و هەرا ناتوانن پێش بە ئەمری خودا بگرێ.

**ئاوڕێک وەسەر سیمای ئایەتەکە لە ڕوانگەی یاسای عیلمی نەحو و سەرف:**

ئایەتی (كَالَّذِينَ كَفَرُواْ) هەستی ئیختیلافی لێ دەکـرێ وەک ئەوە: هەنـدێک نەزەریـان وایە مانای ئایەتەکە ئاوایە: عامە، واتە هەر کـافرێکی ئەو قسـانە بکـا وەبەر ئەو یاسـایە دەکەوێ، چ دووڕوو بـێ چ نەبـێ، هەنـدێکیش نەزەریـان وایە ئەو ئـایەتە تـایبەتی کـافری دووڕوویە، بەو

دەلیلە: ئەو ئایەتانە لە هەوەڵ تا ئاخر لە دەوری حاڵی کافرانی منافق هەڵخولاون. هەندێکیش دەڵێن ئەو ئایەتە ڕووی لە عەبدوڵڵا کوڕی ئوبەی کوڕی سلول و معتب کوڕی قشیر و یارانی وانن.

جا دیارە دێرەدا ئەوەش سەر هەڵدەدا: ئەو دوو نەزەرە لە سەر ئەو ئایەتە پێمان دەڵێن: ئیمان و باوەڕی تەنیا کوتەی زمانی نییە وەک «کرامیّة» دەڵێن، چونکە ئەگەر ئیمان هەر بە قسە بێ، منافق دەکەوێتە ڕیزی ئیمانداران، جا خۆ ئەگەر منافق خاوەن ئیمان بێ خودا بە کافری ناو نابا.

ئایەتی (وَقَالُواْ لِإِخْوَانِهِمْ) کەشاف دەڵێ: واتە لأجل إِخْوَانِهِمْ، واتە بە خاتری براکانیان کە دە شەڕدا کوژراون. دەیانکوت ئەگەر لە کنە مە بان نەدەکوژران. دیارە کوژراون بە پێی ئەو کوتانە، لە سەر ئەو ئەساس و بەراوەردە ئەوە دێتە ڕوو کە مەبەست لە ئایەتی (وَقَالُواْ لِإِخْوَانِهِمْ) ئەوانە ئەو قسەیان بە خاتری برا کوژراوەکانیان کوتوویانە، نەک بکوترێ: ئەو قسانەیان دەگەڵ براکانیان کردووە. تفسیر کبیر، هەمان ئایەت.

لە بابەت سەرفەوە:

بۆ هەست و شعوور ئەو کۆسپە دێتە ڕوو دە جوملەی (وَقَالُواْ لِإِخْوَانِهِمْ إِذَا ضَرَبُواْ فِي الأَرْضِ) کە دوو جوملەی (قالوا) و (ضربوا) هەر دوو ماضین، واتە زەمانی بە سەر چوو، خۆ ئەوەش دیارە و حاشا هەڵناگرێ کە کاتێ وشەی (إذا) کەوتە سەر سیغەی ماضی، ئەو فیعلە ماضیە دە مانادا دەگەڕێ بە مضارع، جا بەو پێیە دوو فێعل دە یەک جوملەدا قەرارێ دەگرن و دژایەتیشیان پێکەوە هەیە، خۆ دیاریشە قورئان بەرییە لە شتی وا، دەبێ چ بکرێ؟ خۆ ڕاستە (قالوا) ماضیە، بەڵام دێرەدا بە مانای مضارع سەیری دەکرێ، یانی قالوا (یقولون)ەیە، ئەو شێوە تەعبیراتە دژایەتی ڕێی پێ نادا چونکە ئایەتەکە دە ئەسڵدا ئاوایە: (لاَ تَكونُواْ كالَّذِينَ كفَرُواْ وَ يقولُون لِإِخْوَانِهِمْ) ڕازی ئەوەی کە بە سیغەی ماضی هێندراوە دەبێ ئەوە بێ: کاتێ شتێک لە داهاتوودا هاتنی حەتمی بێ ئەگەر ئەو شتە بە سیغەی ماضیش بێ دەبێ و ئیشکال ناخاتە ڕوو.

یا دەڵێن: مەبەست لە هێنانی سیغەی ماضی دێرەدا ئەوەیە: تاکوو دەرکەوێ حەول و تێکۆشانی دووڕوویان بۆ پێکهێنانی شوبهە و سستی عەقیدە لە بابەت خودادا، و ئیجادی داڕژتنی دڕدۆنگی لە ناو دەروونی موئمینان بە ئاسانی بێتە دەرێ.

نموونەی ئەوەی سیغەی فێعلی ماضی بە مانای مضارع تەعبیر بکرێتەوە، دە قورئاندا هەیە و زۆرە، وەک ﴿أَتَىٰ أَمْرُ اللَّهِ ① نحل﴾ واتە فەرمانی خودا گەیشتووە. یانی دێ، تاڵووکە مەکەن. یا

وەک ئایەتی ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ زمر﴾ واتە بێ گومانە ئەتۆ دەمری و ئەوانەش هەر دەمرن. دە دیارە فێعلەکان «میت» بە ڕواڵەت ماضین بەڵام مانەکەیان مضارعن کە «دەمرن»ە.

یا دەڵێین ئایەتی ﴿وَقَالُواْ لِإِخْوَانِهِمْ﴾ ئەوە حیکایەتە لە حاڵ و ئەحواڵێکی کە دە دەورانی ڕابردوو ڕووی داوە دەبێ بە شێوەی ماضی خەبەرەکە بدرێ. تفسیر کبیر، ٩/٥٥-٥٤.

قرطبی، ئەوش بە نۆرەی خۆی دەڵێ: وشەی إذا واتە إذ، بە بێ ئەلف؛ خۆ ئەوەش ڕوونە کاتێ إذْ لە سەر سیغەی ماضی ڕۆنیشت بە مانای خودی خۆی خۆ دەنوێنێ؛ کەوایە بە پێی ئەو تەعبیراتی بەراوەرد، هەر دوو سیغەکانی قالوا، ضربوا، بە مانای خۆی خۆیان کە ماضیە سەیریان دەکرێ. ئا ئەوە نەزەری عەللامە قرطبی بەرچاوە. قرطبی، ج ٤/ ٢٤٦.

ئینسان بە گشتی موسوڵمان بەتایبەتی دەبێ ئەوە بزانێ کە هیچ گیانلەبەرێک لە بەردەستی مەرگ قوتاری نابێ، جا چ بمرێ بە مردنی خۆی، چ بکوژرێ، و دەشبێ ئەوەی باوەڕ بێ کە جارێکی دیکە دێتەوە ڕوو، ئەوەی دەشیهێنێتەوە ڕوو بۆ سەیری خۆی ناهێنێتەوە ڕوو بەڵکە بەبێ گومان بۆ نەتیجە و کارنامەی دەورانی ژیانی دنیایەی دێنێتەوە ڕوو و دەبێ ئەوە باوەڕ کەین کارنامە تا باش بێ و پەسەندی مامۆستا بێ خۆشی و لەزەتی پتر تێدایە و تا ناپەسەند و پڕ سیفر بێ، ئێش و ئۆف و ئازاری زیاترە و ناڕەزایەتی مامۆستاش سەرباری دەردانە، دیارە ڕوتبەی چاک و مەقام و ڕوتبەی چاک وەردەگرێ و ڕوتبەی ناپاک کە تازە جوبڕانیش ناکرێ ڕوتبەی پایینی دەدەنێ، جا لە سەر ئەو بەراوەرد و ئەساسە دەبێ بکوترێ: گێیە ئاقڵ؟ و کێیە نەزان؟ پێویست ناکا ئێمە بڵێین و ناوی بەرین چونکە ئاشکرایە. جا بۆ ڕاستی ئەو ڕاستییە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ١٥٧ی ئالی عیمران کە دووهەمین وڵامە بۆ منافقانی شوبهەدار:

**وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ اللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿١٥٧﴾** ئالی عیمران

**سوێند بێ بە خودا، گەر لە ڕێی خودادا بکوژرێن یا خۆ بمرن، لێبووردەیی و بەخششی خوداو بەر دەکەوێ و بەخششی خوداش گەلێک چاترە لەوەی وا ئەوان خڕی دەکەنەوە.**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٥٧

دەبێ بۆ ئیقناعی دڵان بڵێین: سوێند بە خودا لە شەرتێکدا لە ڕێگەی خودادا بکوژرێن، و یا بمرن سەربەرزن، و لەو لایەشەوە دەکەونە بەر لێخۆشبوون و بەزە و ڕەحمەتی خوا کە بەبێ ژمار چاترە لەوەی کۆی دەکەنەوە.

ئەو ئایەتە دەبێ بڵێین دووهەمین دەلیل و بەڵگەی قورئانە دە بەرابەر سەمپاشی کـافران، کە ئەگەر کەسێک دە ڕێگەی خودادا بکوژرێ و یا بمرێ، کوشتن و مردن و ژیانی حەیاتی دنیـای بە فیرۆیی نەچووە، بەڵـکە دە مقابـل ئەو هەمـوو جەور و جەفـایەی کێشـاویەتی و خـۆڕاگری نیشـان داوە دە بەرابەریـدا، ڕەحمەتـی خـودای بە دەسـت هێنـاوە کە ژووراتـر لەو نـیعمەت و سەروەت و سامان نییە.

**ئاگاداری:**

ئەگەر دنیا سەراپای ملّک و ماڵی تۆ بێ، ئامانەتە و لێت دەستێندرێتەوە، خۆشی و لەزەتـی دنیا بە تەواوی ناتوانێ وەتحەسێنێ، بەڵام سـامان و ملّکـی ئەولا کەم یـا زۆر هەمـوو ئەجـزا و ئەندامی لەشی دەحەسێننەوە و جگە لەو خۆشییەش ئەو خۆشییەش هەیە: بـڕوانەوە و زەواڵـی بە سەردا نایە، بەڵکە هەچ نیعمەتێک بەرت کەوێ، بۆ هەمیشەیە؛ هەی بۆ وانەی باوەڕ دەکەن و خەنی لە خۆیان!

**سووکە ئاوڕێک:**

خودای تەعالا دەو ئایەتەی ۱۵۷دا ئایەتی ۱۵۸دا وا دیارە دڵخۆشی و دڵداری موسـوڵمانان دەداتەوە بەوەی کە ئەگەر دە ڕێی خودادا بکوژرێن بەبێ شک وەبەر عەفـو و بەخششـی خـودا دەکەوەن و بە شێوەیەکی ئاسان و بێ باکی خـڕ دەکـرێنەوە لە لای خـودا. لەوێشـەوە پاداشـت ڕەحمەتی خودا دەبێ کە هیچ پاداشێک ناگاتە پاداشی ڕەحمەت. جا لە سەر ئەو یاسایە ناڕەوایە ترسان و دڵەڕاوکە لە کوشتن لە ڕێگای خودادا و حەسرەت خـواردن، شـانازی دەبـێ بکـرێ بە کوشتنێک کە قەباڵەی شەهادەتی پێ وەردەگیرێ. وەلیەکان و نیزیکـان لە خـودا شـانازییان بەو مەرگانە کردووە و فەرموویانە لەو بارەوە: اَلْمَوتُ جِسـرٌ یوصِلُ الْحَبیبَ إِلَی الْحَبیبِ: مەرگی وا پردێکە دۆست بە دۆست دەگەیێنێ.

و هەروا لە ناو دەروونی ئەو ئـایەتە دوو ڕازی بەرچـاو هەسـت پـێ دەکـرێ، ڕازەکـانیش ئەوانەن:

۱. ئیمان تەنیا بە زمان ناگونجێ بەر بگرێ و کامڵ بێ، بەڵکە تەسدیقی دڵی دەبـێ دەگەڵ بێ. "کرامیە" گەرچی بەوەی قایلن کە ئیمان بە زمانیش دەبێ و دروستە تەسدیقی قەلبی نـاوێ، بەڵام نەزەری "گیرامیەکان" زۆر پەسەند نییە.

٢. هیچ دەوا و دەرمان و پەناگـایەک نـاتوانێ نەخۆشـی دڵـی پەنـا دا و وەخـۆی گـرێ بە واقعی، بە غەیرەز خودا، یانی تەنیـا و تەنیـا شـیفای دڵان دەرمـانی دەردان، چـارەی بێچـاران خودایە، کێ لە سەر ئەو باوەڕە بێ کە چارەسازی نەخۆشی دڵان دەتوانێ ئینسان بـێ، دوورە لە ڕاستی و نزیکە لە شیرک.

**ڕووداوێکی بەتام:**

گۆیا کابرایەکی خودانەناسی بەدەستەڵات نەخۆشی مەرگی تووش دەبـێ. ٧٠٠ پزیشـکی تایبەتی و پسپۆڕ لە تەبابەتدا دانهێنن بۆ چارەی دەردی نـاتوانن چـارەی کەن. ژنـی ئەو کـابرایە دەڵێ: ئەو مێردەم کە لە بەر ئێش دەردەکەی هاوار دەکا و دەڵێ: دەبێ کـێ بـێ و بتـوانێ دەردم چارە کا تاکوو پەنای بۆ بەرم!؟ پێی دەڵێن: هەر خودا ماوە پەنای بۆ بەری. ئەویش باوەڕت پێی نییە تا پەنای بۆ بەری. دەڵێ دەردم گرانە و تاقی دەکەمەوە و پەنـای بـۆ دەبەم؛ لە کـوێیە؟ پێـی دەڵێن: لە ڕاست خۆتەوە بە دڵ هەرا کە لە هەموو شوێنێکە، دەبیستێ و دەزانێ.

ئەویش هەرای لێ دەکا و دەڵێ: ئەی ئەو خـودایەی عـالەم دەتناسـێ و دەڵـێن لە هەمـوو ڕاستانی، دەشبێی و دەشبینی و دەشزانی و لێم حاڵی، خۆتـم پێ بناسێنە و بمدوێنە و چارم چارە کە.

ئەو کابرایە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ ئەو هاوارە دەکا و پەنا دەبا، هێواش هێـواش ئـارامی پێ دەگا و سووکنایی دڵی دێ، دەرکی ئەوەی دەکا کە ئەو کەسەی ئەو هەرای لێ دەکا بە ناوی خودا دەوپەڕی کەماڵدایە، کە دوژمنی خۆی وەردەگرێ و پەنـای دەدا و هـیچ نیازێکیشـی پێـی نییە، هەر دوژمنەکەش نایهەوێ لە ڕەحمەتی خۆی بێ بەش کا و دەریکا. ئا ئەو کەسە دەتـوانێ کەسی بێکەسان بێ و پەنای بێپەنایان بێ.

وەک دەڵێن ئەو کابرایە "ئیستالین" بووە، دانەری حیزبی کمۆنیسـت لە کـاتی سـەرەمەرگدا کەوتۆتە ئەو تەنگانە.

دەبا هەڵدەین: کـافر دەزانـێ ئەو هەڵوێسـتەی گرتـوویەتە بەر دژ بە خـودایە و سزاشـی لە دوایە؟ ئایا کافر دەزانێ ئاوری دۆزەخ هەیە و دەشیسووتێنێ، ئەوانەی لێی بێ باوەڕن؟ ئایە هەیە ئینسان بە عەمدەن ئاوری دە خۆ بەردا و شێتیش نەبـێ؟! ئایـا هەیە کەس بە هیـوای بەهەشـت نەبێ؟! ئایا هەیە کەس بفامێ و دوارۆژی خـۆی بە عەمـدەن بکـاتە ئـاوری دۆزەخ!؟ نـابەڵەدم ناتوانم بڕۆم، چونکە نازانم، بەڵام هەستی ئەوەی دەکەم سڕ و تەلەسمی خودایە.

**ئاگاداری:**

دڵ لە هەڵسەنگاندن و وەزن کردنی ئەو دوو ئایەتانەی ۱۵۷ و ۱۵۸ هەست بەوەی دەکـا کە بەندایەتی و عەبدایەتی ئینسانی بۆ خودا دەبێ سێ پلەی هەبێ:

۱. پلەی هەوەڵ ئینسانی وا هەیە لە ترسی ئاوری دۆزەخ بەندەگی خودا دەکا، بـۆیە خـودا بەوانە دەفەرموێ: ﴿لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ اللَّهِ﴾ واتە بەخشین لە خوداوەیە؛ ئەو دەرەجەیە نزمترین دەرەجە و پلەی ترس و بەندەگی خودایە.

۲. پلەی دوو، ئینسانی وا هەیە بە عیشقی بەهەشت و دیـدار و مولاقـاتی خـودا بەنـدەگی دەکا، خودا بەو جۆرە کەسانە دەفەرموێ: ﴿وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ ڕەحمەتی خودا چـاترە لە ماڵی دنیا.

۳. پلەی سێ، ئینسانی وا هەیە بە خاتری ڕەزایەتی خودای خۆی ئیتاعە و بەنـدەگی خـودا دەکا، خودا مزگێنی دەدا بەو کەسانە بەو ئایەتە: ﴿لَإِلَى اللهِ تُحْشَرُونَ﴾ واتە بۆ لای خـودا خـڕ دەکرێنەوە.

**دڵ دەیهەوێ بزانێ و تێبگا کامە دەرەجە و بەشە لەو عیبادەتانە ڕەوا و پەسەندە؟**

لە سەر ئەساسی ئەسڵی بیر و هەست و هـۆش و ئەقـڵ ئەو عیبـادەتە پەسـەند دەکـرێ کە بەتایبەتی لە بەر ڕەزایەتی ئەو کەسە بێ کە عیبادەتەکەی بۆ دەکرێ، چونکە ڕەحمەت و بەخشین و عەتا لەوڕا دێن، بە مەرجێ ئەو ڕازی بێ. کەوایە ڕەحمەت و بەخشین سیفەتی سەربەخۆ نین تاکوو بتوانن عیبـادەتچی لە خـۆ ڕازی کەن بەڵـکە خـاوەنی ڕەحـمەت و بەخشـینە دەتـوانێ بەندەی لە خۆ ڕازی کا، بە بەخشین و ڕەحمەت؛ ئەوە کە خودا ڕوو دە موئمینان دەکـا و پێیـان دەڵێ: بەخشینی خودا بۆوەی موسوڵمان چاترە لەو ماڵ و سامانەی لە دنیادا کـۆی دەکەنەوە بە چەند بەڵگە و دەلیلی ئەقڵی و نەقڵی بۆ نموونە چەن میسال نیشان دەدەین:

کـاتێ کە خـودا دەفەرمـوێ: ڕەحـمەت و بەخشـینی خـودا لە نیعمەتـی دنیـا چـاترە بەو دەلیلانەیە:

۱. دەبێ بە وردی حاڵی ئەو کەسانە هەڵسەنگێنین کە دوای ماڵ و سـامانی دنیـا دەکەون و لە دووی شەقین و هەڵوەدان. ئایا دە حاڵی بێ خەمی و خۆشیدان و یا دایم لە فکر و خەیـاڵ و بێنە و بەرەدان؟ جگە لەو هەناسە سوارەی هەیانە، یەقینیشیان نییە لەو ماڵ و سـامانەی بـۆی دە

حەولدان، لێی دەخۆن و یا بەجێـی دێڵـن و دەمـرن، بە داخەوە کە لێـی بە مـراد نـاگەن، بەڵام ئەوانەی کە داواکاری ڕەحمەت و مەغفرەتی خودان، بمرن و یا بـژین لە بەهـرەی دەخـۆن، بەو دەلیلە خیلاف دە وەعدەی خودادا نییە چونکە خودا بۆخۆی فەرمـوویەتی بە وەسـیلەی ئـایەتی ٧ی سوورەی زلزلە:

**فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ ﴿٨﴾**
**کـێ ئەوەنـدەی گەردیـلەیەک چـاکەی کردبـێ ئەو چـاکەی (پاداشـەکەی) دەبینێـتەوە (٧) هەرکەسێکیش ئەوەندەی گەردیلەیەک خراپەی کردبێ، ئەو خراپەی (سزاکەی) دەبینێتەوە.**

ئەو ئایەتانە ئەوەمان پێ دەڵێن: هەچی بکرێ لە چاک یا لە خراپ دێنە ڕوت و ڕێـت، جـا ئەوەیە داوای مەغفرەت دێتەوە ڕووت.

٢. وام دانا ئەو کەسەی داواکاری ماڵ و سامانی دنیـایە، عـومری درێـژی بـوو، بەڵام ئەوە بێگومانە ماڵی دنیا چونکە بۆ ئازمایش و تاقی کردنەوەیە، هەر کاتەی لە دەس کەسێکدایە، بـۆ ئەو کەسەی خۆی لە سەر فیدا کردووە نامێنێ، چونکە ئەوە زۆر بیندراوە کە یەکی بەیانان ئەمیر بووە بەڵام ئێوارێ ئەسیر بووە، دە حاڵێکـدا جـا کە بـۆ ئـاخرەت زەواڵـی بە سـەردا نـایە، وەک خودای تەعالا بە وەسیلەی ئایەتی ٤٦ی سوورەی کەهف ئەو ڕاستییە دەگەیێنێ:

**الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا**
**سامان و دارایی و منـداڵ زیـنەت و جـوانی ئەو دنیـایەن، ئەو چاکـانەش دەمێـنـنەوە چـاکترین پاداش و باشترین هیوان لە لای خودات.**

جـگە لەو ئایەتـانەش ئـایەتی ٩٦ی سـوورەی نەحـل ئەو ڕاسـتییانە ڕاسـت دەکـاتەوە و دەفەرموێ:

**مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ اللَّهِ بَاقٍ وَلَنَجْزِيَنَّ الَّذِينَ صَبَرُواْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ**
**هەچی لە لای ئێوەیە (واتە بـۆ دنیـایە) تەواو دەبـێ، ئەوەی لە لای خـودایە (واتە بـۆ خـودایە) دەمێنێ. بێگومان پاداشـی ئەو کەسـانەش کە خۆیـان ڕاگرتـووە بە پێـی جـوانترین کـارێ کە کردوویانە دەدرێتەوە.**

ئەو ئایەتە ئەوەمان تێدەگەیێنێ خودای تەعالا لە هەچی هەیە نەغدتر و ئەمینترە دەتداتەوە.

بە کورتی و بە کوردی، هەچی دە ڕێی خودادا بیکەی لە هەر دوو دنیادا ئی خۆتە، هەچی بۆ دنیا بێ، بە تەنیا هەر لە دنیادا ئی تۆیە لە ئاخرەتدا ئی تۆ نییە.

٣. وای دانێ ئەو دارایییەی کە تۆ خوازیاری و بۆی دە حەولدای، بە دەستت هێنا و بەهرەشت لێ وەرگرت، بەڵام ئەوە بێگومانە کە بەدەستهێنانی ماڵ و دارایی ئەگەر بەهرە و لەززەتیشی هەیە، دەرد و ڕەنج و نارەحەتیشی هەیە، واتە بێ ڕەنج نایەتە دی گەنج.

۴. دەبێ ئەوە بزاندرێ کە بەهرەی دنیایی لە بەرچاوانە، بەڵام بەهرەی ئاخرەتی ئەقڵییە، خۆ ئەوەش بێگومانە شتی لە بەرچاوان هەر چاوت لێ لادا ئەویش لادەدا و دەڕوا.

جا بەو پێیە و بەو بەراوەرد و تەعبیراتە، ئەو چوار ئیشاراتانە ئاگادارت دەکاتەوە لە سەر ئەوەی خودای تەعالا پێت دەڵێ بە وەسیلەی ئایەتی ١٥٧ ﴿لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ اللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ ڕاستی ڕەوان و ڕوونە، بۆوەی نابێ نەکرێتە هەوێنی دڵ و دەروونی ئیماناوی. (تفسیر کبیر، هەمان ئایەت)

دەبێ ئەو باسە وەزن کەین کە خودای تەعالا بە وەسیلەی ئایەتەکانی ١٥٧ و ١٥٨ پێمان دەڵێ: دە ڕێی خودادا چ بکوژرێن و چ بمرن، دەگەن بە ڕەحمەت و بەزە و بەخشینی خودا، و سەرەنجام هەچی بن واتە جیهادگەر بن یا فەسادگەر بن، جێگاو کن خودایە و لای خودایە، جگە لەوانەش دڵنەوازی دەدا خودا بەوە: چاکەکاران خالیس پلەی بەرزیشیان دەدرێتێ وەک مەغفرەت بێ، چونکە ئەوان ڕاستەوخۆ بۆ خودان.

**بەسەرهاتێکی بەتام:**

گۆیا حەزرەتی عیسا کوڕی مەریەمە ئەو بەسەرهاتەی لێ ڕوو داوە:

١. عیسا بە لای هۆزێکدا ڕادەبرێ لاواز و بێهێز و ڕوخسار چرژاو و زەرد هەڵگەڕاو، بە هۆی عیبادەتی زۆریان، حەزرەتی عیسا ڕوویان تێدەکا و لێیان دەپرسێ حاڵو بۆ ئاوای بە سەر هاتووە؟ ئەوانیش دەڵێن: لە ترسی عەزاب و قەهری خودا. حەرزەتی عیساش دەڵێ: خودا زۆر میهرەبانترە لەوەی کە ئێوە بکێشێتە پای عەزاب و دەرد و ڕەنج. وەک فکر و لەو خودا کردۆتەوە ئێوە خودا وا نییە.

٢. دووبارە حەزرەتی عیسا دەگاتە قەومێکی دیکە، لەوانیشدا ئەوزاعی هەر ئاوا دی: کزی و لاواز و زەرد هەڵگەڕاو و چرژاو. لەوانیشی پرسی ئەوزاع و حاڵو بۆ ئاوایە؟ ئەوانیش کوتیان بۆ بەهەشت و ڕەحمەتی خودا ژیانمان لە خۆ بڕیوە و تاڵ کردووە. حەزرەتی عیسا دەفەرموێ

پێیان: خودا زۆر کەریمتر لەوەیە ڕەحمەتی خۆی وەشارێ لەو کەسەی وەک ئێوە ناکـا. لەوەش مەنع ناکا ئەگەر ئاواش لە خۆ نەکەن.

٣. ئەوجاریش حەزرەتی عیسـا دەگـاتە قەومێکـی دیـکە، کە دەوانـدا زۆر زیـاتر ئاسـار و نیشانەی خوداپەرەستی چاو دەکا و دەبینێ، ڕوویان تێدەکا و لێیان دەپرسـێ عیسـا: وا دیـارە لە سیمای کز و لاواز و زەردهەڵگەڕاوتان زۆر خەریکی عیبادەت بن؟ کوتیان بەڵێ، لێمان حـاڵی بووی و تێمان گەیوی. حەزرەتی عیسا فەرمووی: بۆچی وا هێنـدی بەنـدەگی بـۆ دەکەن؟ لێـی دەترسن عەزابو دا و بتانخاتە بەر غەزەبی خۆی سەربەخۆ؟ لە وڵامی حەزرەتی عیسادا کوتیـان: نا، لە ترسی عەزاب و هیوای بەهەشت نییە کـار و عیبادەتمـان، بەڵـکە تەنـانەت لە بەر ئەوەیە، ئەمە عەبدین و ئەویش مەعبوودی بەحەقە. ئـێمە مەخلـووقین و ئەویـش خـالقە. جـا ئەوجـار حەزرەتی عیسا پێیان دەڵێ: ئێوە بەندەی خالیس و موخلیسی خودان.

جا ئەگەر سەیری ئـایەتی ١٥٧ و ١٥٨ بکـرێ تەرتیـب و تەنزیمـی ئایەتەکـان تەئیـدی ئەو باسەی دەکا کە باس کرا وەک ئەوە:

لە هەوەڵەوە خودای تەعالا دەفەرموێ بە بەندەکانی: دە ڕێی خودادا بکوژرێ و یـا بمـرێ مەغفرەت و ڕەحمەتی من دایدەپۆشێ، ئەو جوملە ڕووی دەو کەسـانەیە کە لە ترسـی عەزابـی خودا، خودا دەپەرەستن، وشەی (رحمة) ڕووی دەو کەسـانەیە کە بـۆ سـامان و دارایـی دنیـایە خـودای دەپەرەسـتن. لە ئـایەتی ١٥٨دا کە دەفەرمـوێ (لإِلَى اللهِ تُحْشَرُونَ) ئەوە مەبەسـتی ئەو کەسانەیە کە خودای بە خاتری ئەوە دەپەرەستن کە خـودا خـالقە و ڕەبـبە و مەعبـووی بەحەقە، ئەویش بەندەیە، کە ئەوەش بەرزترین عیبادەتە.

جا بۆ تەئیدی ئەو مەبەستە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٥٨ی ئالی عیمـران تـاکوو بتـوانین بە باشی تێبگەین:

> **وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لإِلَى اللهِ تُحْشَرُونَ ﴿١٥٨﴾** ئالی عیمران
>
> **هیچ گومانتان تێدا نەبێ، ئەگەر مردن یا خود کوژران، تەنیا هەر بۆ لای خودا کۆ دەکرێنەوە.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٥٨

پێشەکی دەبێ ئەوە بزاندرێ کە مردن بە مانای نەمانی ڕوح نییە، وەک هەندێک پێیـان وایە ئەگەر مردی تەواو دەبی. بەڵکە مردن دەروازەی چـوونە بـۆ ژیـانێکی هەمیشـەیی، لە سـەر ئەو

ئەساسە چ بمری و چ بکوژرێی، هەر وەلای خودا کۆ دەکرێیەوە، دەشبی بە خاوەنی گیان و ژیانی هەمیشەیی.

دڵ ئارەزوویەتی ئەوە بزانێ ئەوانەی کە وا لە شەڕی خەزای ئوحوددا شکستیان خوارد و پاشان چوونە لای پێغەمبەر، پێغەمبەر هەڵوێستی دەگەڵیان چۆن بوو؟

ئەوە بێ گومانە ئەوانەی تێشکان لە هەرای ئوحوددا، خەجاڵەتی و شەرمەندەگیان هاتە سەری و چاو پێکەوتن و ملاقاتی پێغەمبەریان لە لا سەخت و گران بوو، بەڵام هەڵوێستی پێغەمبەر کە دەبێ پێغەمبەرانە بێ، بەو شێوەیەی هەندێک لەوان چاوەڕوانیان دەکرد قەڵس و تووڕەیی، وا نەبوو بەڵکە بە شێوەی نەرم و ئارام و میهرەبانی هات دەگەڵیان دوا، زۆر خۆشحاڵ بوون. ئەوان بە ئاوڕدانەوەیان وەلای مانای ئایەتەکانی شارەزایی لە بابەت ژیانی دنیایی و ئاخرەتی کە بەهرەیان لێ وەرگرتبوو وەک بەختیشیان بوو لە لای خوداوە، هورەیان لە بەرزاییدا بوو بەوەی بەوپەڕی میهرەبانی و حەکیمایەتی خۆی هەڵس‌وکەوتی دەگەڵ پێک هێنان. تێگەیاندن کە ئینسان جائیزولخەتایە و خلیسکێ دەبا، پێغەمبەر بۆیان داوای بەخشینی کرد لە خودای تەعالا، گەڕا بە هۆی ڕەحمەتی خودا دەگەڵ موسوڵمانان و تەنانەت موسوڵمانان لەو شێوە بەرخوردەی پێغەمبەر دەگەڵیان، بوونە بە موسوڵمانێکی بەزە و ڕەحمەت لە ڕاست خەتاکاران، خودای تەعالاش بە هۆی ئەو هەڵوێست و ئەخلاقە جوانەی پێغەمبەر سەنای پێغەمبەری کرد بە ئەخلاقی بەرز وەک ئایەتی ۴ی قەڵەم ئیشارەی وەلا دەکا، و هەروا دەستووریش دەدا بە پێغەمبەر دەگەڵ موسوڵمانان نەرمی و میهرەبانی بنوێنە، ئایەتی ۱۸۸ی حجر، دەچینە خزمەت ئایەتەکان:

وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ قلم
ئەتۆ بەڕاستی لە سەر ئەخلاقی گەلێ بەرزی.

وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٨﴾ حجر
بۆ خاوەن ئیمانان پاڵانت ڕاخە (نەرم و نیان بە)

بۆ ڕاستی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۵۹ی ئالی عیمران:

فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ

**الْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾** ئالی عیمران
**هەر بە هۆی بەخشندەیی و دڵۆڤانی خوداوەیە تۆش لەگەڵیاندا نەرم بووی، ئەگەر بەدخوو و دڵڕەق بوایەی دەورەیان چۆڵ دەکردی، کەواتە چاوپۆشییان لێ کە و داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە لە کاروباریشدا تەگبیر و پرس و ڕاوێژیان پێ بکە، لە پاش ڕاوێژ دڵت لە سەر هەر بیر و ڕایەک دامەزرا، پشت بەستە بە خودا، بێگومان خودا ئەوانەی خۆش دەوێ کە وا پشت و پەنای پێ دەبەستن.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٥٩**

**بۆ ئاگاداری:**

ئەو ئایەتە لە بابەت بەخشین و لێبوردنی پێغەمبەر هاتە خوارێ کە لەو کاتە سەخت و گران و تەنگانەدا (شەڕی ئوحود) یارانی پێغەمبەر بەجێیان هێشت وەک فەرمووی: بە سۆز و بەزییەک کە لە لایەنی خوداوە پێت بەخشراوە نەرم بوویت بۆ هاوڕێیەکانت، ئەگەر هاتبایە ئەتۆ بۆ هاوڕێیەکانت دڵڕەق و تووڕە بووبایت، ئەوە بێگومان لە دەورت بڵاو دەبوونەوە و دەورەیان چۆڵ دەکردی و لە دەورەت وەخڕ نەدەبوون، جا کەوایە لە هەڵەیان ببوورە و داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە و لە فەرمان و کاراندا پرسیان پێ بکە و بیانکە بە ڕاوێژکاری خۆت، جا کاتێ لە بیر و بۆچوونەکەی ئەوانت بە دڵ بوون ئەوە پشت بە خودا ببەستە و «کاروبارەکانت بەجێ بێنە، بێگومان خودا حەز لە وانە دەکات کە پشتی پێ دەبەستن. جا لە سەر ئەو ئەساسە خودا بە پێغەمبەر دەڵێ:

بەو سۆز و تێگەینەی کە لە لایەن خوداوە پێت بەخشرا، توانیت خۆ نەرم نیشان دەی بۆ یارانی شکستخواردووت و دڵیان ئاوەدان کەی و بۆ لای خۆتیان ڕاکێشی و وەکۆیان کەی، و ئەگەر هاتبایە لە کاروبارتدا وشک و ڕەق بوایەی و تووڕە و قەڵس و نێوچاوان گرژ بایەی و بە ڕووشکێنی و تەوس و پلار و لۆمە و تانە داتبگرتانە لە ڕووی خۆ بەزلزانی و دەعیە و تەشەخوس، بێگومان جگە لەوەی دڵیان لە ڕاستت ئاوەژوو دەبوونەوە، لە دەوریشت کۆ نەدەبوونەوە، دەورەیان چۆڵ دەکردی و بێر و بەوێدا بە دڵشکاوی هەڵوەدا دەبوون. ئەتۆش تەنیا دەمایەوە، جا ئێستێ کە پڕ بە دڵ و سەفاوە لە دەورت کۆزیلکەیان بەستووە چاوەڕێی بەڵێنی و ئەمر و فەرمانت دەکەن، لە هەڵەیان ببووره و چاوپۆشی لە خەتایان بکە و داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە و پرسوڕایان پێ بکە و بیانکە بە ڕاوێژکاری خۆت لە ئیش و

کاروباراندا، جا کە دیتە ڕاوێژ و ڕاوێژکارییان ڕەوایە و پەسەندن ئەوە هەدەفت پێکـاوە، ئەوجـار پشت بدە بە خودا و شوێن ئەو کارانە کەوە کە دەسنیشانو کـردوون. بە هـورە و بە هێواشـی و دوور لە سستی و بێ مەیلی و کەترەخەمی جـێبەجێمان بـکە، بێ‌گومـان خـودا حەز دەکـات ئەوانەی پشتی پێ دەبەستن سـەر کەون، و ئەوانەی خـوداش ڕووی ڕەحمەتـی تـێ کـردوون، هۆش و بیر و ژیریان بکەونە گەڕ و زاڵ بن بە سەر ئەندامەکانیان بـۆ وەی بە ئاسـانی بتـوانن بە گوێرەی کات و سات و دەرفەت، هەل وەقۆزن و ئامۆژگاری لێر و لەوێ وەرگرن و ئاشـتی کە دەروازەی کارسازییە بە دەستی بێنن.

ابن عباس دەفەرموێ: لە شەڕی بەدردا خودا سەری خستین کەس نەیتوانی ژێرمان خـا، لە شەڕی ئوحـوددا ژێـری خسـتین کەس نەیتـوانی سـەرمان خـات، واتە ئەو ئـایەتە بـۆ دڵنیـایی موسوڵمانەکان خودا ناردی. ئایەتی ١٦٠ی تەئیدی دەکات.

بە پێی وەزن کردن و هەڵسەنگاندنی ئەو ئایەتە پیرۆزەی ١٥٩ ئەو هەستە دەکرێ و دێتە نـاو دڵەوە: کە یەکێـک لە تایبەتمەنـدییەکانی پێغەمـبەر کە دڵنەرمـی و ڕووخۆشـی و میهرەبـانییە، ئیشارەی وەلا دەکا کە بەڕاستی شایانی پێغەمبەرانە ئەو ڕەفتـار و ڕەوشـتە جـوانەی دڵنەرمـی و ڕووخۆشی، و هەروا ئەگەر ئیشارە بە دڵنەرمی پێغەمبەر دەکا ئیشـارە بەوەش دەکـا دڵڕەقـی و گرژ و تووڕەیی خەڵکت لێ دەپرینگێنێتەوە و دوورت دەخاتەوە، واتە ڕووخۆشی چەندت بەرەو پێش دەبا، ڕووگرژی و ڕق و تووڕەیی ئەوەندەت بەرەو پـاش دەبـا، جـا بـۆیە خـودای خـاوەن حیکمەت و حەکیم وەک وەسیەتێک ڕایدەگەیێنێ دەبێ لە تاوان و قسوور و کەترەخەمی یـاران ببوردرێ و دەبێ چاوپۆشی بکرێ، بۆ نموونە پێغەمبەر لە هەرای ئوحـوددا یـارانی بـێ ئەمـری وییان لە خۆ نیشان دا، بە زاهیری پێغەمبەر دەبا تووڕە بێ، بەڵام خودا بە حیکمەتی خۆی ڕێـی پێ نەدا بەڵکە بۆ حیفزی شەئنی پێغەمبەرایەتی ئەو دڵنەرمی و میهرەبانی خودا ئیلهام کردێ، و چاوپۆشی و بوردنی لە بەرابەر هەڵە و خەتایان بۆ پێشنیهاد کرد و داوای لێخۆش‌بوونیـان بـۆ لە خودا داوا بکا، دیارە لەو کات و ساتەی کە یارانی پێغەمبەر خیلافی دەستووری پێغەمبەریـان لە خۆ نیشان دا، کەلێنی ئەوە ڕەخسابوو کە پەرتەوازەیی بێتە ڕوو لە دەوری پێغەمبەر بـڵاو بـنەوە، جا ئەو کەلێن و هەلەیە نیازی تەواوی هەبوو بە دڵنەرمی و ڕووخۆشی پێغەمبەر، چونکە یارانی تێشکاو نیازیان بە دڵـداری هەبـوو، لەو کـاتەدا کە خۆیـان بە خەتاکـار دەزانـی، جـا ئەدێـرەدا دەردەکەوێ کە خودا یار و یاوەری پێغەمبەرانە بۆیە دە هاوار پێغەمبەر هات و دەستووری پێ دا

که جگه له بەخشینیان بیـانکه به ڕاوێژکـار و ئەهلـی تەگبیـر و ڕا، تـا ئەو دەروەی له پێغەمـبەر بگرێ: که نەکا تەگبیر و مەشوەرەت نەکا پاش بێ ئەمـری یـاران له شـەڕی ئوحـوددا، چـونکه مەشـــوەرەت ئەو بەهـــرەیەی هەیه که کـــارانێکی که به پێـــی مەشـــوەرەت دەکـــرێن به کەمـــی هەڵدەکەوێ سەر نەکەوێ و خلیسکێ بەرێ، له یاسای مەشوەراته: پاش ساخ بوونەوە له سـەر کاروبار تەوەکەول دان وەسەر خودا. مشـاوەره به دەسـتەجەمی دێـته جـێ، بەڵام بەڕێـوەبردنی کاری پـاش مەشـوەرەت به تەنیـایی دەکـرێ بـۆ وەی دەرهەم بەرهەم ڕوو نەدا، به کـورتی و به کوردی، بۆ هەرچی بتهەوێ بەڕێوەی بەری و ئەنجامی بدەی، دەبێ تەوەکول به خـودا کەی که هەوێنه بۆ سەرکەوتن له کاراندا ده ناو دڵ و هەستی دەروونتدا بێگونجێنی.

**پرسیارێک:**

دڵ دەڵـێ: کـاتێ پێغەمـبەر خـاوەنی وەحـی بـێ، واته خـودا ڕێنـوێنی کـات، تەگبیـر و مەشوەرەتی بۆ چییه؟ چونکه مەشـوەرەت بـۆ وەیه ڕاسـتییەکەی وەدۆزێ، جـا کـاتێ خـودا به وەسـیلەی وەحـی شـارەزات کـا مەشـوەرەت پێویسـت ناکـا. خـۆ دیـاره له لای خوداشـەوە دەستووری موشاوەره به پێغەمبەر دراوە و ڕەوایه و دەبـێ ببـێ. کەوایه دەبـێ ئەوە بزانـدرێ که پێغەمبەر خاوەنی وەحیشه و دەستووری پرس و ڕا و تەگبیریشی پێ دراوە دەگەڵ یارانی خۆی.

بۆ دۆزینەوەی وڵامی ئەو پرسیاره بەجێیه دەبێ ئـاوا بکـوترێ: پـایه و شـەئن و دەرەجـاتی یارانی پێغەمبەر (اصحاب) دەبێ هەچی خاوەن ئیمان و باوەڕییه بیزانـێ و بیناسـێ وەک هەیه، تـاکوو به هـۆی ئەو مشـاوەرەی دەگەڵیـان دەکـرێ، ئەو شایسـتەگیەی خـودا پێـی داون و ئەو لێهـاتووەی هەیـانه بـۆ خەڵـک دەرکەوێ، وەک ئەوە: نەزەر و بۆچـوونی ئەسـحابان له سـەر کاروباران که له سەرچاوە و دەروونێکی پڕ له سەفا و نووری ئیمان هەڵدەقوڵێ، پێغەمبەران بـۆ ئەنجامی ڕیسالەتیان پێی نیازمەندن، چونکه ئەسحاب کەسـانێکن پەسـەندی خـودان و خـودا لێیان ڕازییه، دەیجا دەبێ ئەوە باوەڕ بکرێ کەسێک که خودا لێی ڕازی بێ، ئەو کەسـه ڕاسـته و چاکه و پاکه و شایانی ئەوەیه بیر و ڕای دەگەڵ ئاڵوگۆڕ بکرێ و پرس و ڕای دەگەڵ بکرێ.

جگه لەوانەش، پێغەمبەر له باری زانست و تەگبیر و ئەقڵ و شعوورەوە خودا به نـاتەواوی نەیناردۆته ناو خەڵـکەوە و کاروبـاری پـێ نەسـپاردووە، بەڵام لەو بـارەوە که زانسـتی ئینسـانی سنووردارە و حەد و مەرزی هەیه، وا نییه بڵێ دەتوانێ هەموو شت چـاره کـا و بزانـێ، چـونکه زۆر له ئومووراتی کۆمەڵایەتی، سیاسی ده دنیادا و نیزامـی عالەمیـدا هەیه که زانسـتی ئینسـان

تەنانەت پێغەمبەرانیش تێی نەچن و سەری لێ دەرناکەن، نیازیان بە هاویاری و هاوکاری بیر وڕای غەیر هەیە، بۆوەی بە هێزی کۆمەڵی بیر و ڕا ڕێچارە وەدۆزێ، ئەگەر ڕێی چارەش نەدۆزراوە زۆری لێ وەدوور نەکەوێ.

ئەوجار دەبێ بکوترێ ئەو نیزامی تەگبیر و مشاوەرەیە لە بابەت ئوموورواتی دنیایە دەگەڵ پێغەمبەران، و ئیللا لە بابەت ئوموورواتی ئاخرەتی و دین و ئەحکامی ئایینی، پێغەمبەران بە وەسیلەی سرووشی خودای تەعالا بێ نیاز کراون لە مەشوەرەت، نموونە بۆ ئەو مەبەستە بەسەرهات و ماجەرای دەورانی پێغەمبەری کاتێ کە حەزرەت بۆ مەدینە دەچوو دە ڕێیەدا سەیری کرد کە گەلی ئەنسارییەکان دار خورمایان پەیوەند دەکرد، واتە گوڵی داری نێریان دێنا، دەیانخستە ناو گوڵی داری مێی جوان و تازە، واتە تێیان دەبڕی. پێغەمبەری خودا پرسیاری لێ کردن ئەوە ئەو کارە بۆ دەکەن؟ لە وڵامی پێغەمبەردا گوتیان: ئەو کارەمان بۆوەیە تا دارەکەمان بەر بگرێ بە چاکی بەری زۆر و تازە. پێغەمبەر فەرمووی پێیان: ئەوساڵ ئەو کارە مەکەن، تاکوو دەرکەوێ نەتیجەی کارتان دەبێتە چی؟ ئەوانیش هاتن لە سەر دەستووری پێغەمبەر دەستیان لێ کێشاوە. بەڵام کاتی بەرهەم و حاسڵات دارەکان بەریان پوچ و بێمایە بوون، ئەو خەبەرەیان بە پێغەمبەر داوە، پێغەمبەر ئەوجار فەرمووی: وا دەرکەوت کە ئێوەی باغدار شارەزا و زاناترن لە کاروباری خۆتان، لەوە بەدوا وەک خۆتان بکەن. (حدیث مسلم لە صحیحەوە لە مووسای کوڕی طلحەوە). کەوایە دەتواندرێ بکوترێ: پێغەمبەران لە مەوریدی کاری دنیا دەکرێ نیشانە بە تەواوی نەپێکن.

جگە لەوانەش لە سەر مشاوەرە ئەمر و دەستوور هەیە کە پێغەمبەر دەگەڵ یاران بەجێی بێنێ.

حەسەن بەسری دەفەرموێ: حوکمی مشاوەرە دەرسێکی ئەساسییە بۆ ئۆمەتانی ئێستێ و داهاتوو، بۆ وەی ئەمیران و حاکمان و دەرباران و شاهان و گەلانیان پەیڕەوی مەشوەرەت بکەن و شوێنی بگرن و ونی نەکەن، کێ بیرتیژ و بەهەست بێ، ڕازی مشاوەرە دەرک دەکا. تەفسیری کەبیر، ج ۶۶/۹؛ روح المعانی، ج۴/۴۳۴-۴۳۳.

ئایەتی ﴿فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّٰهِ﴾ واتە بۆ بەڕێوەبردنی دەستوورات و کارێکی نیەتت ساخ بۆوە، بە پشتیوانی و هیوای خودا تێڕاچۆ و دەس بە کار بە، ئەو مەبەستە ئەگەر بە وردی سرنجی بدرێتێ دوو شتی لێ دەرک دەکرێ:

١. یەکیان ئەوەیە: پاش مشاورە و نەتیجەگیری ئەگەر هاتو وەحی خودا دابەزی لەو بارەوە، دەبێ قاتیعانە و بە توندی و ئیرادەیەکی قایم و قۆڵ حوکمی وەحی بگریە بەر و بڕۆیە پێش، بێ دوودڵی و دڵەڕاوکێ.

٢. ئەگەر هات و مشاوەرە کرا و پاش مەشوەرەتەکە بیر و بۆچوونی تۆی پێغەمبەر لە سەر نیەت و نەزەری مەشوەرەتەکە و ڕەئی جەماعەت بوو، دەبێ ئەتۆی پێغەمبەر لە سەر نیەت و نەزەری خۆت قاتیعانە بڕۆیە پێش و تەوەکول بدەیە سەر خودا، چونکە بێگومانە ئەو نەزەر و نیەتەی تۆی پێغەمبەر یا لە ڕێی سرووشەوە یا لە ڕووی ئیلهامەوە و یا لە سەر نیەتی ڕاست و پاکی خۆتەوە خزاوەتە ناو دڵتەوە، دیارە دەبێ دێرەدا گەل تابیعی پێغەمبەر بن و شوێن ئەو کەون، چونکە ئەو هەڵوێستەی پێغەمبەر لە سەر دینە، نە لە سەر ئومووراتی دنیایە، پێغەمبەریش لە بابەت دین و ئەحکامی دینەوە دەگەڵ خەڵک ڕێی مەشوەرەتی پێ نەدراوە. (تفسیر تبیین الفرقان، هەمان ئایەت)

**جیاوازی لە نێوان (فظ) و (غلیظ القلب)دا:**

"فظّ" بۆ کەسێک دەبێ کە دە زاتی خۆیدا بەدئەخلاق بێ، بەڵام "غلیظ القلب" بە کەسێ دەڵێن کە لە ڕاست خەڵک بێ پەرۆش و بێ بەزە بێ، لەوانەیە هەبن ئینسانی وا بەدخوو کەسیش ئازار نەدا، بەڵام دڵیشی بە کەس نەسووتێ و پەرۆشی نەبێ.

دڵ دووبارە دەکەوێتە دڕدۆنگی و ئیشکالەوە لەوەی دەو ئایەتە ١٥٩یەدا خوا مەنعی "غلیظ القلب" لە پێغەمبەر دەکا بەڵام دە ئایەتی ٧٣ی سوورەی تەوبەدا دەستووری "غلیظ القلب"ی پێ دەدا، وەک دەفەرموێ:

يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ

یا لە بابەتی حەدی زینای موسوڵمانان:

وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ

دێرەدا دە هەر دوو ئایەتەکاندا بەرگری لە "غلیظ القلب" نەکراوە، دە حاڵێکدا دە ئایەتی ١٥٩دا تەحسینی پێغەمبەر کراوە لە سەر ئەوەی "غلیظ القلب" نیشان نەداوە.

دەبێ ڕاز دێرەدا چ بێ؟ ڕاز دەبێ ئەوە بێ:

دڵنەرمی و خۆش ڕوویی دەبێ دە بەرابەر کەسانێکدا نشان بدرێ کە لاساری و سستییان لە حاند ئەمری دین و ئایینی خودا بە عەمدەن نیشان نەداوە، بەڵام لە ڕاست ئەوانەی وا ئیهانە بە دین دەکەن و دین بە چاوێکی سووک تەماشا دەکەن، غلیظ القلب و شیددەتی خۆ نیشان دان بە ڕەوا زاندراوە و هاتۆتە ژمار. بە وردی با سەیری ئایەتی ٥٤یسوورەی مائیدە بکەین:

> أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ
>
> **خۆ بە کەم بگرن لە حاند خاوەن باوەڕان، خۆ بە هەیبەت و سام بگرن لە ڕاست کافران.**

و ئایەتی ٢٩ی سوورەی فتح زەین دەیە:

> أَشِدَّاء عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاء بَيْنَهُمْ
>
> **لە سەر کافران بەسام خۆ ڕانێن، بە ڕەحم و میهرەبان بن لە ڕاست خۆتان.**

بە کورتی و بە کوردی، بەو فەرموودەی پێغەمبەی لە بابەت مەشوەرەت دەگەڵ خەڵک بۆ ئومووراتی دنیا و دەگەڵ پێغەمبەر بە ڕەوا زانراوە. کۆتایی دێنین: «أَنتُم أعرَفُ بِأُمورِ دُنیاكُم و أَنا أَعْرِفُ بِأُمور دينِكُم» واتە ئێوە بۆ کاری دنیا شارەزاترن، ئەمن زاناتر و شارەزاترم بە ئومووراتی دین لە ئێوە.

دەبێ ئەهلی ئیمان و باوەڕ ئەوەی هەستی هەست و دڵی بێ بە مەرجێ خودا دەستی نەگرێ و دارەدارەی پێ نەکا ناتوانێ هەستێتەوە و ڕاپەڕێ و خۆ بگەیێنێتە هەدەف، و ئەوەی خوداش هەڵیستێنێ کەس ناتوانێ لە هەڵستانی بخا، ئەوەیە کە خودای تەعالا ڕوو دەکاتە خاوەن ئیمانان بە گشتی و یارانی پێغەمبەر بە تایبەتی، پێیان دەڵێ: خودا دەگەڵ ئەو کەسەیە کە دەگەڵ خودایە، یار و باوەری ئەو کەسەیە کە یار و یاوەری خەڵقی خودایە، خودایە دەتوانێ دڵان پڕ کا لە هورە و هیوا و هومێد، هەر خوداشە دەتوانێ دڵان سست و لاواز و بێ هورە و ترسەناک کا و لە وزەی خا؛ جا کەوایە ئەی ئینسان، ئەتۆ ئاوڕ چۆن وەدەی وەسەر خودا ئاوات ئاوڕ وەسەر دەدرێ. یەکێک دێ پرسیار دەکا و دەڵێ: هەن زۆر کە ئاوڕ وەسەر خودا نادەن کە دە حاڵێکدا ماڵ و سامان و دارایی زۆری پێ دەدا، ئی واش هەیە بە دایمە لە دەروازەی خودا ڕاوەستاوە کە هەر چاو لە دەستە! لە وڵامدا دەبێ بکوترێ: ماڵی دنیا بەڵگەی حەسانەوە و سەعادەت نییە بۆ هیچ دنیایە، بەڵکە سەعادەت و حەسانەوەیە. بۆ ڕاستی ئەو مەبەستە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٦٠ی ئالی عیمران تا حاڵی بین لە ڕاستی:

إِن يَنصُرْكُمُ اللّهُ فَلاَ غَالِبَ لَكُمْ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا الَّذِي يَنصُرُكُم مِّن بَعْدِهِ وَعَلَى اللّهِ فَلْيَتَوَكِّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾ ئالی عیمران
**ئەگەر خودا سەرتان بخا، هیچ هێزێک ناتوانێ زاڵ بێ بە سەرتاندا، ئەگەر دەستیش لە یارمەتیتان هەڵگرێت کێیە ئەوەی بتوانێ سەرتان خا، بێجگە لە خودا! بڕواداران با هەر بە خودا پشت ببەستن.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٦٠**

ئەگەر خودا یارمەتیتان بدات بێگومانە کەس ناتوانێ زاڵ بێ بە سەرتاندا بەو دەلیلە: هێز و توانای خودا لە ژوورای هەچی هێز و قودرەتە، و هەچی سەرکەوتنە لە هێز و توانای خوداوە سەرچاوە دەگرێ، جا بۆ یەکێ ئەو یاریدەی دا؛ کەس ناتوانێ بەرەنگاری تێکشکانی بێ، و ئەگەر کەسێکیش ئەو نابوودی کا و بیشکێنێ لە دوای ئەو کەس نیە بتوانێ بە هاواریەوە بچێ و ڕەسەری خا، دیارە یاریدەدانی خودا و دە هاوار هاتنیش بێ حیساب و هۆ نییە، و نابێ ئینسانی خاوەن ئیمان بە کەرەسە و ئەسباب بنازێ، بەڵکە دەبێ دڵگەرمی و هورە و ئیرادە لە بارەگای خوداوە بێ و بەو بنازێ و تەکیەگا هەر دەبێ خودا بێ.

**ڕامانێک:**

ئەگەر بە چاو و دڵێکی هەستیارانە لە ناوەرۆکی ئەو ئایەتە، ڕامێنی و هەڵیسەنگێنی، بەو ئاکامە دەگەی کە مەبەست لەو ئایەتە شێلگیر بوونە لە تاعەت و ترسانە لە گوناە و تاوان، بەو دەلیلە خودای تەعالا لەوە پێش ڕایگەیاند هەر کەس لە بێ ئیتاعەیی خودا خۆ بپارێزێ، خوداش ئەوی دەپارێزێ و یاریدەی دەدا، هەر وەک بە وەسیلەی ئایەتی ١٢٥ی ئالی عیمران ئەوەی ڕاگەیاند و گەیاندی بە عالەم:

بَلَى إِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَـذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ آلافٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُسَوِّمِينَ
**بەڵێ، ئەگەر خۆڕاگر و لەخوداترس بن، ئەگەر ئێستەش بەپەلە پەلامارو دەن، پەروەردگارتان خێرا بە پێنج هەزار فرشتەی نیشانەدار یاریدە و یارمەتیتان دەدات.**

پاشان هەر لەو ئایەتەدا خودا ڕایگەیاند: کێ خودا پشتیوانی لێ بکا کەس نایوێرێتێ، جا لە سەر ئەو بەراوەردە و بۆچوونە بە پێی وەعدی خودا کێ بۆ خودا بێ، ڕە بن ناکەوێ بە

خۆشـبەختی هەر دوو دنیـاش دەگـا، واتە دەگـاتە خۆشـییەکی تـاڵی لە دوو نیـیە، و دەگـا بە عیززەتێک زیللەتی لە دوا نییە، بەڵام کێ بێ ئەمر و فەرمانی خودا بکا، خودا ئەو کەسە ڕیسوا و نابوود دەکا.

**بۆ ئاگاداری:**

ئاکار و سیفاتی پێشەوایان واتە: ئەو کەسانەی خەڵک ڕێبەری دەکەن، پێش هەموو شـتێک دەبێ ئەو سیفەتەی خودا دە ئایەتەکەدا بۆ پێغەمبەری ڕایگەیاند دە خۆیدا بگونجێنێ، چونکە بێ سیفاتی دڵنەرمی و ڕووخۆشی و میهرەبانی ناتوانـدرێ دە نـاو دەروونـی خەڵکـدا جێـی خـۆ بکرێتەوە، دیارە ئەو سیفەتانەی کە خودای تەعالا لە بابەت پێغەمبەرەوە بەیانی کردووە دەبێ ئەو چوار سیفەتە بن:

١. دەبـێ دە بەرابەر عالەمـدا نەرم و هێـدی و هێـواش و ڕووخـۆش و میهرەبـان بـێ و لە حاندی بێباوەڕان و دوژمنـانی دیـن "و اغلـظ علـیهم" بـێ (توبـة: ٧٣) واتە تونـد و بەسـام و هەیبەت.

٢. دە بانگێشتن و ڕێنوێنیدا ئارام و نەرم و ڕووخۆش بێ، پلارهاوێژ نەبێ.

٣. ئەوانەی پاش خەتایان ئیقرار بە تاوانی خۆیان دەکەن و ئیزهاری پەشیمانی و خەجاڵەتی دەکەن، دەبێ بە ئامێزی گەرم و دڵی نەرم ڕووی خۆش وەرگیرێن، نەتۆرێندرێن.

٤. کە هات و لە ناکاو و سەربەخۆ خەتایەک لە یەکێ ڕووی دا، دەبێ ببەخشرێ.

**پرسیارێک:**

خاوەنی وەحی نیازی بە مەشوەرەت دەگەڵ غەیر چییە و بەهرەی چییە؟

وڵام:

تا دەرکەوێ پلە و مەقامی ئەسحابی پێغەمبەر بۆ خەڵک و شوێن ئاکاریان کەون.

جگە لەوەش پێغەمبەران لە نەزەر ئەقڵ و زانستەوە لە لایەن خوداوە تێـر و تەسـەل کـراون بەڵام لە بابەت ئومووراتی سیاسی و دنیایی دەکرێ بۆچوونیان بەبێ مەشوەرەت دەگەڵ خەڵک چارەساز نەبن بە تەواوی، و هەروا ئەوانەی پێغەمبەران مەشوەرەتیان دەگەڵ پێـک دێـنن، دەبـێ خاوەنی دوو شەرت بن: خاوەنی ئەقڵ و زانست؛ ئەهلی نەزەر بێ؛ پێغەمبەر بە عینوانی ئەمری عیبادەت دەگەڵ یاران دواوە، بەڵام لە بابەت ئەمـری عـادی و دنیاییـدا زۆر وا هەبـووە نەزەری

خۆی وەلا ناوە و شوێن نەزەری یارانی کەوتووە.

**سووکە ئاوڕێک:**

کێ دەیهەوێ پێشەوا و ڕێبەری عالەم بێ و خەڵکی شوێن کەوێ، سەرکەوتوو بێ لە کاروباریدا، دەبێ ئەو سیفەتانەی بێ، دەنا تێدەشکێ:

١. ئەخلاق وەک پێغەمبەر بێ،

٢. چاوپۆشین و بەخشینی دەبێ هەبێ،

٣. لە ڕاست خەتای یاران سنوور نەبەزێنێ، بەڵکە خۆ وەخۆ گرێ.

٤. کارێکی دنیایی کە هات، تێی نەچوو دەگەڵ یاران مەشوەرەت بکا.

٥. سەربەخۆ لێنەنیشێ و دەس بە کاران بکا.



خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم بۆ حیفزی عیززەت و کەڕامەتی دین و وڵاتی ئیسلامی دەستووری جهاد و دیفاعی لە ناموسی ئیسلام سادر کرد و دای و هەر لەو بارەشەوە بۆ دروست چوونە پێش لە کاروباراندا ئەمری مەشوەرەتی دا، لەو لاشەوە ئەسحابی پێغەمبەری ئاگادار کردن کە دەبێ شەئن و ڕێزداری محەمەد بپارێزن، و چکۆلەترین گومان و خەیاڵاتی پووچ لەمەڕ پێغەمبەر ڕێ نەدەن بێتە ناو ماڵی دڵتانەوە، جا ئەوجار خودای مەزن، دێنێ ئەحکام و دەستووراتی دیفاع و جیهاد دادەڕێژێ بۆ موسوڵمانان جا بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٦١ی ئالی عیمران بۆ تێر و تەسەلی لەو بارەوە:

**وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ ﴿١٦١﴾** ئالی عیمران

**شایانی شانی هیچ پێغەمبەرێک نییە خەیانەت و گزی بکات، هەر کەس خەیانەت کا، ڕۆژی پەڵڵان گزیکارییەکەی دێنێتەوە بارەگای خودا، پاشان هەر کەس هەچی کردبێت پاداشەکەی بە تێر و تەسەلییەوە وەردەگرێت، ئەوانە زوڵم و ستەمیان لێ ناکرێت.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٦١**

پێشەکی بۆ وەی کە بە ڕاشکاوی ڕازی ئەو ئایەتی مبارەکی ١٦١ وەدۆزین و وەقۆزین، دەبێ هۆی دابەزینەکەی وەدۆزین جا پاشان ئاگاداری بە سەر هۆی دابەزینەکەی، دەتوانین مەبەستی ئایەتەکە هەچی بێ وەدەستی خەین، ئێستاش بە پێی هەڵسەنگاندن و هەڵگێڕ و

وەرگێڕی ئـایەتەکە هەسـت بە چەنـد نەزەری زانایـان دەکـرێ لە بـابەت هـۆی دابەزیـنەکەی، نەزەرەکان با سەیر کەین:

١. بە پێی ڕیوایەتێک گۆیـا پێغەمـبەر لە بـابەت تەقسـیم و دابەش کردنـی تـاڵانێکی کە لە شەڕدا وەگیر کەوتبوو، تەئخیری نیشـان دا بە هـۆی چەن گیـر و گرفتێـک. جـا ئە دێـرەدا چەن کەسێک لەوانەی کە ترووسکەی دووڕوویـی لە نـاو دەروونیانـدا دەبینـدرا، وەجـواب هـاتن و کوتیان: ئایا پێغەمبەر بۆچی ئەو ماڵە تاڵانییەی بەش ناکا؟ ئەگەر نیەتێکی تایبەتی نییە! پێغەمبەر کاتێ ئەوەی بیست ڕووی دە یاران کرد و فەرمووی: ها تێبگەن ئەگەر بە ئەندازەی کێوی ئوحود بۆ ئێوە زێڕ و جەواهیراتی تاڵانی کۆ کرێتەوە، بە ئەندازەی زەڕە مسقاڵێکی ئەمن خەیانەتی تێـدا ناکەم و بە کار نابەم، بەڵام دە ئاخر کەوتنی تەقسیماتەکەی چەند هۆیەک پێشی پێ گرتبوو. ئەو فەرموودەی پێغەمبەر دەڕوانێتە ئەو تارماییەی کە وەک تەمێک سەرچاوەی دڵیانی داگیر کردبـوو وەک ئەوە بە دڵیاندا هاتبوو کە پێغەمبەر خەیانەت دەکا بەو تاڵانە، جا ئەو ئـایەتە دابەزی تـا ئەو تەمە بڕەوێنێ لە سەرچاوەی دڵیان.

٢. بە پێی ڕیوایەتی هەندێکان، پێغەمبەر بەعزێک لە ئایەتانی کە دەیخوێندنەوە ڕاسـتەوخۆ ناتەواوی خودایانی هەندێک لە عالەمی ئەو سەردەمی بە ناتەواو و باتڵ دادەنا، هاتن هەنـدێک لە بێباوەڕان بە پێغەمبەریان کـوت: ئەتـۆ ئەگەر دەتـهەوێ ئـێمە مخـالفەت و سـەرپێچیت لە کاروبارانتدا نەکەین لە خوێندنەوەی ئەو ئایەتانە خۆ بپارێزە. جا خودای تەعالا هات ئەو ئایەتی ١٦١ی دابەزاند لە سەر ئەو ئەساسە کە لە شەئنی هیچ پێغەمبەرێکدا نییە لە بـابەت ئەنجـامدانی ئەمری وەحی خەیانەت بکا. واتە بۆ وەی ئیهانە بە ئایینی بێباوەڕان نەکرێ؛ خوێنـدنی ئـایەتی بەحەقی قورئان وەلا بندرێ، لە سەر ئەو بەراوەردە دەبێ ئایەتەکە ئاوا بووبێ: (و ما كانَ لِنَبيٍّ أَن يَغلَّ في أَداءِ الْوَحيِ).

٣. بە پێی ڕیوایەتی عەکرەمە و سەعید کوڕی جوبەیر لە شاگردانی حەزرەتی ئیبنی عەباس، دەبێ جەریانی دابەزینی ئەو ئایەتە ئاوا بووبێ: لە ڕۆژی هەرای شەڕی بەدردا گۆیـا چـادرێکی ڕەنگ سوور پەنادەدرێ و نایەتە گەڵ بەشێ. منافقانیش بە خەیاڵی ناپـاکی خۆیـان ئەو چـادرە پێغەمبەر بۆ خۆی پەنای داوە، جا بۆ پووچەڵ کردنەوەی گومـان و خەیـاڵی نارەوایـان خـودای تەعالا ئەو ئایەتە دادەبەزێنێ.

٤. لە حەزرەتی عەباسەوە گۆیا لە خەزایەکدا حەزرەتی ڕەسووڵ تاڵانێکی بەرچاو وەدەست

دێنێ، هەندێکیش لەو کەسانەی کە ماڵ پەرەست بوون و خاوەنی پلە و پایەش بوون بە هۆی ئەو شەئن و مەقامەی هەیانبوو چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد پێغەمبەر بەشی زیاتریان بۆ دانێ. جا خودای تەعالا بۆ وەی مەقام و شەئنی پێغەمبەرایەتییان پێ بناسێنێ، ئەو ئایەتە مبارەکەی ١٦١ی ئالی عیمرانی دابەزاند کە شایانی پێغەمبەران نییە و نابێ. لە تەقسیماتێکی خودا دایناوە سنوور ببەزێن و واتە بە یەکێ زیاد بدا بێ هۆ، بە یەکێ کەم بدا بێ هۆ. دە حاڵێکدا ئەوە نابێ بە ڕەخنە بگیردرێ: ئەوانەی دە شەڕدان جیاوازییان هەیە دە تەقسیماتدا لەوانەی دوای خلاس بوونی شەڕ دەگەنێ.

٥. هەندێکیش دەڵێن: دەستەیەک لە موسوڵمانان بۆ ئاگاداری بە سەر ئەوزاعی کافراندا دەنێردرێن شوێنیان هەڵگرن و بزانن لە کوێن. تا ئەوان مەئموورییەتی خۆیان ئەنجام دەدەن، شەڕ دادەمەزرێ و ناگەن بگەن بە شەڕ و شەڕ تەواو دەبێ و تالانێکیان لێ وەدەس دەخرێ و بەش دەکرێ و ئەو دەستەی کە بۆ تەفتیشی کافران دەچن بەشیان بەرناکەوێ و چاوەڕوانی بەشیش دەکەن. خودای تەعالا ئەو ئایەتە نازڵ دەکا و پێغەمبەر حاڵی دەکا کە بەشی وانیش دەبێ بدرێ، چونکە ئەوانیش بە شەڕکەر حیسابن و دەبێ بێنە ژمار.

٦. عەللامە واحی لە کەلبی و مقاتڵ نەقڵ دەکا و دەڵێ: لە ڕۆژی هەرای ئوحوددا کاتێ کە کافر شکستێ دەخوا، مەیدانی شەڕی پڕ لە تالان چۆڵ دەبێ، دەستەیەک لە تیرئەندازانی سەر کێو وا خەیاڵ دەکەن: ئەگەر ئێمە نەچین ئەو تالانە کۆ نەکەینەوە لەوانەیە هەر کەسێکی بێت کۆی وەکا، پێغەمبەر بفەرموێ ئەوە ماڵی خۆیەتی. وەک کارەساتی بەدر. جا لە سەر ئەو خەیاڵە سەری کێوەکەیان چۆڵ کرد و خۆیان گەیاندە مەیدانی تالان. ئەو ئایەتە گۆیا سەبارەت بەو کارەساتە دابەزیوە.

بە کورتی و بە کوردی، هەرکام لەو نەزەرانە دەتوانێ هۆ بێ بۆ دابەزینی ئایەتی ١٦١ی. بۆ زێدە زانین ڕوو بکەنە تەفسیری تبیین الفرقان، باسی هەمان ئایەتی ١٦١ی ئالی عیمران.

**پاشەدۆ:**

کاتێ تیرهاوێژەکان لە گەردنەی کێوی ئوحود هەڵوێستیان گرت سەنگەری خۆیان بۆ وەکۆ کردنی تالان چۆڵ کەن، فەرماندەکەیان دەستووری پێ دان نەچن سەنگەری خۆتان چۆڵ کەن بۆ ماڵی تالان، چونکە پێغەمبەر کاتی خۆی بەشی هەمووتان دەدات، نایهەوێ کەس بێ بەش کا لە تالان؛ بەڵام بە داخەوە دنیاپەرست دڵ و گوێی حەق وەرگرتنی کەڕ و کاس کرد و ئاوڕیان

وەسەر قسەی فەرماندەکەیان نەداوە، هاتن ئەو فکریان خستە ناو دڵیانەوە کە پێغەمبەر لەوانەیە لە کاتی دابەش کردنی ئەو غەنیمەتانە ئێمە فەرامۆش کات. جا لە سەر ئەساسی ئەو فکرە پووچەیان هاتن سەنگەرەکانیان خاڵی کرد کارەسات هەچی کرا کرا. خودای تەعالاش لە بابەتی ئەو خەیانەتەو و دەرکردنەوەی خەیاڵی پووچیان ئەو ئایەتەی دابەزاند و ئیشارەی وەلا فەرموو کە پایە و مەقامی پێغەمبەران شایانی خەیانت نییە. مەبەستیش بەو خەیانەتە عامە چ لە تاڵاندا بێ، چ لە حیفزی ئەمانەتدا بێ، چ لە بابەت پێ ڕاگەیاندنی وەحیدا بێ.

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم بە وەسیلەی ئایەتی ۱۶۱ی کە فەمرووی: ﴿ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ﴾ ئاگاداری تەواوی دا بەوانەی ئیتاعەکێشن کە جەزایان چییە و سەرەڕۆ و سەرپێچیکەران سزایان چییە؟ واتە کێ شوێن فەرمانی خودا کەوێ، بەهرەی باشی لە خوداوە دەس دەکەوێ، و کێش لادا و لاڕێ بڕوا ئەویش بە سزا و خواری و لاساری خۆی دەگا. بۆ ڕاستی ئەو مەبەستە دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۶۲ی ئالی عیمران:

**أَفَمَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَ اللَّهِ كَمَن بَاءَ بِسَخَطٍ مِّنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ**
**ئایا کەسێک شوێن ڕەزامەندی خودا کەوتبێت وەک ئەو کەسە وایە کە دەگەڵ هەڕەشە و تووڕەیی خودادا بگەڕێتەوە؟ دۆزەخیش جێ و ماوایەتی کە خراپترین سەرەنجامە.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ۱۶۲

بە پێی وەزن کردنی ئەو ئایەتە چەند بەراوەرد هەڵدەگرێ و حیسابی بۆ دەکرێ:

۱. لە سەر نەزەری قورئانزانان ئایەتی ﴿أَفَمَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَ اللَّهِ﴾ واتە کەسێک لە غلول یانی لە خەیانەت دووری بکا، یانی حەولدانی بۆ ڕەزایەتی خودا، مەشرووتە بە دووری لە خەیانەت.

۲. ئایەتی ﴿كَمَن بَاءَ بِسَخَطٍ مِّنَ اللَّهِ﴾ واتە ئەو کەسەی خەیانەت دەکا، یانی ئایا کەسێ کە ڕەزایەتی خودا بە دووری لە خەیانەت دەقۆزێتەوە، وەک ئەو کەسە وایە کە ڕق و تووڕەیی خودا دەقۆزێتەوە بە خەیانەت کردن؟ ئەوە نەزەری ئاغایانی کەلبی و صفاکە.

۳. یا ئەوەتە دەڵێن: کەسێک کە بە هۆی تاعەت و عیبادەت و ئیخلاس خودای لە خۆ ڕازی دەکا، وەک ئەو کەسە وایە کە بە هۆی کوفر و نیفاق و فەسادکاری خودای لە خۆ تووڕە دەکا؟

۴. یا ئەوەتا دەڵێن: مەبەست بە (رضوان الله) مهاجرینن، ئایا کۆچکەران وەک

دووڕووەکانن لە بارەگای خودادا؟

٥. زوجاج کە یەکێکە لە قورئانزانان دەفەرموێ: کاتێ موشریکان هێرشیان کردە سەر موسوڵمانان، پێغەمبەر ئەسحابەکانی کۆ کردنەوە بۆ هێرش بردنە سەر بتپەرستەکان. ئەدێرەدا دەستەیەکیان بە فەرمانی پێغەمبەر حەملەیان بردە سەر کافران بەڵام دەستەیەکیان خۆیان پاراست لە ئیتاعەی پێغەمبەر، ئایا ئەو دوو دەستەیە وەک یەک وان؟

٥. عەبدولجەبار دەڵێ: هەر یەک لەو نەزەرانە دروستن و ڕەوان؛ دروست نییە تەنیا مانای ئایەتەکە بۆ یەکیان تایبەت بکرێ چونکە لەفزی (تبع رضوان) عامە، هەرچی لەو نەزەرانەی باسمان کردن بیکەیە مەبەستی ئەو ئایەتە، ڕەوایە.

**بۆ ئاگاداری:**

زۆر وا هەیە قورئان حەقیقەتی دینی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی دە قالبی سوئالدا بەیان دەکا، تاکوو گوێڕایەڵ بتوانێ بە وازی خۆی لە نێوانی مەسائیلدا وڵام و مەبەستی خۆی هەڵبژێرێ و پەسەند بکات، دیارە ئەو جۆرە ئیخباردانە دە بابەتی تایبەتە و تێزێکی بەرچاوی هەیە، بەو دەلیلە ئینسان بە بیر و بۆچوونی خۆی دە تەحقیقی مەسائیلی ئیختلافیدا دەتوانێ زیاتر لە هەر چی هەیە، ئەرزش قایل بێ، مەسەلەن کاتێ شتێک بە شێوەی قەتعی دەخرێتە ڕوو، ئینسان خۆی بۆ مقابلە حازر دەکا چونکە ئەو شتە بە خاریجی فکری خۆی دادەنێ و دەیهەوێ بەرهەڵستی دە بەرابەریدا نیشان بدا، بەڵام شتێک بە سوورەتی پرسیار بخرێتە ڕوو، لە لایەن فەردێکیشەوە وڵامی بدرێتەوە، بۆ قبووڵ کردنی بەربەرەکانی نیشان نادەی. ئێستێ ئەو ئایەتە پیرۆزەی ١٦٢ی عیمران بەو شێوە جوانە پرسیارەی خۆی کە دەفەرموێ: ئایا کەسێکی کە دەیهەوێ ڕەزایەتی خودا کەسب بکا بە هۆی ئیتاعە، وەک ئەو کەسەیە کە دەیهەوێ خودا لە خۆی تووڕە کات؟ نەخێر وەک یەک نین.

هەندێک لە قورئانزانان فەرموویانە: ئەو ئایەتە ئیشارە وەلای دەستەیەکی تایبەتی دەکات وەک موهاجر و ئەنسار، کە ئەسڵی ئایەتەکە ئاوا هەڵدەسەنگێنن:

أَفَمَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَ اللّهِ **مِن المهاجرينَ و الانصارِ** كَمَن بَاء بِسَخْطٍ مِّنَ اللّـهِ: واتە کەسێکی کوفر ئیختیار کا و قبووڵ کا و خۆ بە گوناهان مەشغوول کا، وەک ئەو کەسە وایە کە بە خودا ئیمانێ دێنێ؟

و یا دەڵێن: ئەسڵی ئایەتەکە ئەوەی تەعبیرە:

**أَفَمَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَ اللّهِ من المهاجرينَ و الانصارِ** كَمَن بَاء بِسَخْطٍ مِّنَ اللّهِ **من الكافرين و المنافقين:** بە پێی ئەو بەراوەرد و تەعبیراتە مەبەست لە تابعینی رضوان الله: مهاجرین و ئەنسارن و مەبەست لەوانەی گیرۆدەی سخط اللەن کافر و منافقینن. جا خۆ بێگومانە کە ئەو دوو دەستانە وەک یەک نین. تفسیر کبیر، ٧٤/٩؛ روح المعانی، ٤٤٠/٤.

پاش ئەوەی خودای تەعالا سادقان و خائینان و تەفاوەتیانی ناساند بە وەسیلەی ئایەتی مبارەکی، و هەر وا حاڵ و ئەحواڵی دەستەی ڕاستانی بەیان کرد، ئەوجار بۆ پشتیوانی و ڕاستکردنەوەی ئەو ڕاستییە هات ئایەتی ١٦٣ی ئالی عیمرانی دابەزاند:

**هُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ اللّهِ واللّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٣﴾** ئالی عیمران
**هەر کامێکیان لە لای خودا پلە و پایەی تایبەت بە خۆ دیاری کراوە، خوداش بینەر و بیسەرە بۆ ئەو شتەی کە بەندەکانی ئەنجامی دەدەن.**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٦٣

پێش هەموو شتێک دەبێ ئەوەی وشەی (هم) دەگەڵی دەدوێ بیناسین، واتە بزانین (هم) کێن؟

بە پێی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوەی ئایەتەکە سێ قۆڵ دەتوانن دە ژێر باڵی «هم»دا حاشار هەڵگرن و وشەی «هم» بە سەر خۆدا دەن:

١. دەکرێ «هم» بریتی بێ لە «صادقان» کە بە شوێن ڕەزایەتی خودادا هەڵوەدان، یانی ئەو ڕاستانە «صادقان» بە پێی ئاکار و ئەعمالیان خاوەنی پلە وپایەی جیاوازن دە بەهەشتدا.

٢. و هەروا دەشکرێ وشەی «هم» بریتی بێ لە خائینان، واتە خائینان بە دین و ئایین و خودا و ڕاستی، پلە و پایەیان بە گوێرەی ئاکار و ئەعمالیان لێک جیاوازن، ئی وا هەیە خەتای زۆر گەورەیە، دەرەجاتی عەزابیشی گەورەیە.

٣. دەشکرێ وشەی «هم» بریتی بێ لە صادقان و خائینان، ئەو تەعبیراتە کە لە ڕاستی نزیکە، لە سەر ئەو تەعبیراتە دەبێ بکوترێ: ئەهلی بەهەشت پلە و دەرەجاتیان دە بەهەشتدا لێک جیاوازن، واتە بە گوێرەی ئەعمالە هەر ئەندازە عەمەلیان ڕەوا بێ و پەسەند بێ بەو پێیە پلەش لە سەرێیە. و هەروا ئەهلی دۆزەخیش هەر ئەندازە ناحەزییەکانیان زەق و بەرچاو بن، بەو ئەندازەش سزاکانیان زەق و بەرچاون. یا بەو جۆرە دەڵێن: دەرەجاتی ئەهلی بەهەشت دەگەڵ

دەرەجاتی ئەهلی دۆزەخ، لێک جیاوازن، لە بەهەشتدا خۆشی و لەززەت، لە دۆزەخدا ناخۆشی و حەسرەت. روح المعانی، ٤١١/٤.

**ئاگاداری:**

دەکرێ ئایەتەکە ئاوا بێ لە فەڕزدا: (لَهُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ اللّهِ) واتە لاچوونی پیتی «ل» ناڕەوا نەبێ، بەو دەلیلە جیاوازی ئەعمالیان، سەر دەکێشێتە جیاوازی خودی خۆیان، ئەودەم دەوێرین بڵێین: ئەو شێوە مەجازە لە سەڕاحەت سەریحترە، چونکە حەکیمان کوتوویانە: هەستی ئینسانی و ماهیەتی ئینسانی لێک جیاوازن. بەو دەلیلە هەن هەندێک زیت و وریا، هەن هەندێک کوند و پووک و ناحاڵی، هەن هەندێک ڕوون و بۆندار، هەشن تاریک و نەزان و بۆگەن، ئەو جیاوازییانە حەواڵە بە جیاوازی تەبعی لەشیان نییە، بەڵکە حەواڵە بە جیاوازی ماهیەتی سرشتیانە، هەر لەو بارەوەیە کە پێغەمبەر فەرموویەتی لە مەڕ ئینسان: النّاسُ مَعادِنُ كَمَعادِنِ الذَّهَبَ و الْفِضَّةِ؛ دووبارە فەرموویەتی: الأَرواحُ جُنودٌ مُجَنَّدَةٌ: واتە ئینسان کانگایە وەک کانگای زێڕ و زیو. ئەڕواح لەشکری تێک چڕژاوە. جا لە سەر ئەو ئەساسە دەتواندرێ بکوترێ: ئینسان دە هەستەی ماهیەتیدا لێک جیاوازن، نەک بڵێین ئینسانی نەوعی و چەشنی دەرەجاتی لێک جیاوازیان هەیە، چونکە نەوعی ئینسان هەمووی یەک نەوعە.

واش هەیە لە عورفدا بە زۆری وشەی «درجات» بۆ ئەهلی سەواب دەکار دەکرێ هەر وەک وشەی «درکات» بۆ ئەهلی عیقاب بە کار دەبرێ.

دەبێ ئەوە بزاندرێ: منافقان و مجاهدانی واقعی نە تەنیا پێکەوە فەرق و جیاوازی لەفزیان هەیە، بەڵکە هەر یەک لەو کەسانەی کە بە یەکێک لەو دوو سیفەتانە مەشهوورە فەرق و جیاوازی باوەڕی و ئیمان و ئەخلاقیان هەیە، و تەنانەت لە دیوانی خودادا دەرەجەی تایبەتیان هەیە و دەرەجەی ژێر و ژووراشیان بەستە بە فیداکاری یا دژایەتی دەگەڵ حەقە؛ خۆ دیارە خودا چی لێ حاشار نادرێ، چونکە هەم بینایە هەم بیسەرە هەم زانایە، باش دەزانێ کێ شایانە بە دەرەجەی ژوورا و کێ شایانە بە دەرەجەی ژێرا، هەر بۆیەشە دەفەرموێ بە ڕوونی و ڕەوانی: ئەوانەی بۆ ڕەزامەندی خودا دە حەولدان و تێدەکۆشن بۆ هەریەک لەوان پلە و پایەی پڕ بە ئەعمالیان لە بەهەشت هەیە، بۆ وانەی خوداشیان لە خۆ تووڕە کردووە لە دۆزەخدا پلە و پایەی جیا هەیە، کەوابێ حاشاهەڵگر نییە ئەو ڕاستییە: لە لای خودا پلە وپایەی هەموو کەس بە گوێرەی ئەعمال و باوەڕە.

ئایەتی ﴿دَرَجَاتٌ عِندَ اللّهِ﴾ واتە (فی حکم الله و علمه)، واتە دە حوکم و عیلمی خـودادا دەرەجەیان دیاری کراوە. ﴿واللّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾ ئەوەمان پێ دەڵێ و تێمان دەگەیێنێ کە ئەو کەسە دەتوانێ بە ئەندازەی کردەوە پاداش و سزا بدا، کە بە تەواوی لە ئەندازەی عەمەل ئاگـادارە و دەزانێ بێ گومان و دوودڵی. جا هەر بۆیە وشەی (بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ)ی خستە ئاخرێ تاکوو ئینسانی تەعلیم بدا بەوەی: تا لە چەند و چوونی کردار و کاروبـاران حـاڵی بـوون پێـک نەیە و حاسڵ نەبێ، نابێ تەکلیفی سزا و پاداش بێتە حیساب.

وەک لـێمان حـاڵی کـرا لە ئایەتەکـانی ڕابـردوودا خـودای تەعـالا خەتـا و تاوانەکـانی خەتاکارانی کە خەیانەتیان وەپاڵ پێغەمبەر دەدا، ئاگاداری پـێ دان و پێغەمـبەری لەو گومـانەی ئەوانە دانکرد تەبرەئە کرد و مەقام و شەئنی ئەو ڕەسووڵەی بەیان کرد، تـاکوو سـابتی کـات بـۆ هەموو گەلان کە شەئن و مەقام و وەزیفەی پێغەمبەر لە خەیاەت و خەیانەتکـاری زۆر بەرزتـرە لەوەی تیری خەیانەت و درۆی بگاتێ، چونکە پێغەمبەران کەسانێکن کە دە ئەساسدا بۆ پـاک و خاوێنی ڕوحیەی ئینسان و ئەخلاقی ئینسانی و نابوود کردنـی ڕیشـەی فەسـاد و بەدئەخلاقـی هاتوون و کراونە مەئموور؛ دە پێشدا خودای تەعالا خەیاڵ و گومانی منافقان و موسـوڵمانانی سادەدڵ لە بارەی پێغەمبەرەوە بە ڕوونی بەیان کرد، کەوایە چۆن خودا ڕێ دەدا چڵکی نـاحەزی لێ بنیشێ و پێوەی بنووسێ، دیارە دە پێشدا خودای تەعالا سەرزەنشت و لۆمەی خەیاڵچییـانی کرد، جا کەوایە خودا چۆن ڕێ دەدا بە مخالیفان درۆ و خەیانەتی وەپـاڵ دەن؟ دە حاڵێکـدا ئەو پێغەمبەرە بە **محەمەدئەمـین** ناوی دەرکردووە، خودای تەعالا ڕەخنەگرانی تێ گەیاندن دەبێ ئێوە لە باتی ڕەخنە لەو پێغەمبەرەی دە بەرابەر ئەو هەموو ئیحسان و ئەنعامانەی کە دەربارەی ئێـوەدا ئەنجام دان شوکرانەی کەن، کەچی ناحاڵیانە دێن خەیانەتی وەپاڵ دەدەن، دیارە ئێوە بیرکورت و سەرلێشێواون.

جا بۆ ڕاستی ئەو ڕاستییانە دەچینە خزمەت ئـایەتی ١٦٤ی ئـالی عیمـران بـۆوەی بە تێـر و تەسەلی حاڵی بین لە باسەکە:

**لَقَدْ مَنَّ اللّهُ عَلَى الْمُؤمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِي ضَلالٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾** ئالی عیمران

بێگومان خودا ناز و نیعمەتەکانی خۆی ڕشت بە سەر بڕواداراندا، کاتێک پێغەمبەرێکی نـارد هەر لە خۆیان، تاکوو بەڵـگە و ئایەتەکـانی خـودا بە سـەریاندا بخـوێنێتەوە، دەروونیـان پـاک

**کاتەوە و قورئان و وتە و کردەوەی خۆیان فێر کات، بێ‌گومان ئەوان لە پێشدا لە گـومڕاییەکی ئاشکرادا بوون.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٦٤**

ئەو ئایەتە پیرۆزە لە دمی ئەو کەسانە دەدات کە لە ڕاسـت پێغەمـبەری ئیهـانە دەکەن، بەو شێوە کە کاری ناشایستە دەدەنە پـاڵ پێغەمـبەر، وەک خەیـانەت کـردن؛ واتە دەڵـێن: پێغەمـبەر خەیانەت بە ماڵ و سامانمان دەکـات، جـا دە حاڵێکـدا خـودای تەعـالا سـوێند دەخـوات کە بەرەکەتـی خـۆی ڕۆژانـدۆتە سـەر بـڕواداران بەوەی کە لە نـاو خۆیانـدا لە نەوعـی خۆیـان پێغەمبەرێکی ناردۆتە ناویـان، کە نیشـانەکانی خودایـان بە سـەردا دەخـوێنێتەوە بـۆ وەی دڵ و دەروونیان لە گومان و خەیاڵاتی نابەجێ خاوێنیان بکاتەوە تاکوو بتوانن بە چاک و پاکی فێـری یاسای خودا و کەلامی خودا و دەستووراتی ئەحکامی شەرعی خودا بن، جا با لەوە پێشـیش لە گومڕاییدا بووبن.

مەبەست دێرەدا ئەوەیە: خودا کۆمەڵ لە گومڕاییە نەجات دا و یاریدەی دەدا و پشتیوانی لێ دەکا، بۆچی پشتیوانی لێ نەکرد لە هەرای ئوحوددا؟ ڕێگای دا بە دوژمنـی لەشـکرەکەی تێـک شکێنن؟

بە کورتی و بە کوردی، ڕێگای فکر و خەیاڵات ناگیردرێ، ئەوانەی وا پێغەمبەریان خـۆش ناوێ و باوەڕیان پێی نـیە، دڵیـان نـایقۆزێتەوە ڕووی فکـر و خەیـاڵاتی نـاڕەوا و ناحەزیـان دە پێغەمبەر دەکەن و لایناد‌ەن چی بە دڵی ناپاکیاندا بێ، دەیپڕژێننە شـەئنی پێغەمـبەر، هەچەنـدی خودا دەلیل و بەڵگەی ناحەقیان بۆ بێنێتەوە، قبـووڵی نـاکەن و خۆیـان هەرچـی حەقە، یاسـایە جەهل نابینرێ و ڕۆ دەچێ.

**بۆ ئاگاداری:**

ئەو ئایەتە ڕێزدار و پیرۆزە بەیانی گەورەترین نیعمەتی خودا کە هەڵخسـتن و ڕەوانەکردنـی پێغەمبەرە دەکا، و یادهێنانەوەی ئەو نیعمەتە کە ناردنی پێغەمبەرە بۆ تازە موسوڵمانانی کاڵ کە لە هەرای ئوحـوددا تووشـی شکسـت و دەرد و داخـی گـران هـاتن و دەبێـتە هـۆی کەمبـوون و سووکبوونەوەی باری گرانی ئەو ناڕەحەتیەی کە کەوتبووە سـەر دڵ و ویژدانیـان، بەو دەلـیلە: ئەو نیعمەتە ناردنە پێغەمـبەرە هێنـدە بەتـام و لەززەت و شـیرین و ڕێـزدارە، ئەگەرچـی نـاردنی

پێغەمبەر بۆ عامەی خەڵکە بەڵام قورعە بە ناوی موئمینان دەردەکەوێ، هۆیەکەشی بێ گومان ئەوەیە: خاوەن ئیمان و باوەڕان و پاکان و خالیسان دەتوانن بەهرە لەو نیعمەتە گەورە ببەن و وەرگرن، بەتایبەتی لەو جێگایەی کە خودا دەفەرموێ: لە خۆتانە و وەک خۆتانە ئەو پێغەمبەرە، نە فرشتەیە، نە پەرییە، بۆوەی نەتوانن نیازی خۆتانی لە لا بەیان کەن و یا ئەو نەتوانێ دەردتان دەرک بکا و یا نەتوانێ وەک ڕێنوما و شارەزا و مامۆستایەک لەناوتاندا بێت و بچێ و تەربیەت و تەعلیمو بدات. چونکە ئەگەر لە نەوع و جنس و شکلی خۆتان نەبا، چۆن دەکرا و دەگونجا نموونە و گوڵی سەرتۆپی ئینسان با؟

جا پاش هەموو ئەوانە سێ شتی زۆر بەنرخ و ڕێزدار و بەرچاوی شەئنی پێغەمبەرایەتی دەخاتە ڕوو و بەیان دەکا: ئەو سێ شتانەش کە شایانی خوو پێ گرتنی ئەوانەن کە خودا دە ناو ئایەتەکەدا ئیشارەی وەلا کردوون:

١. ئەو پێغەمبەرە بەرێ کراوە، ئایەتەکانی خودا بۆ ڕاکێشانی خەڵک بۆ لای خودا دەخوێنێتەوە.

٢. هەستەی دڵ و دەروونی خەڵک دەشۆرێتەوە لە ژەنگی ناپاکی، و دەیانڕازێنێتەوە بە ئەخلاقی جوان و دڵگرانە سەراپای نیەتی دەروون و باوەڕیان.

٣. هێزی زانست و دەرک دەدا بۆ دەرکی ئەحکامی خودا بۆ تەشخیسی بابەتەکانی دەستووراتی دینی بە تەک تەکی ئینسانی، و دە تەنزیمی ئایەتەکەدا، کە پاکی نیەت و نفووسە پێش خراوە و ئەساسیشە، لە سەر زانست (علم) ئاماژەیە وەلای ئەو ڕاستییە: تا دڵ پاک و خاوێن و خالیس نەبێ، ناتوانێ خانەخوێی میوانی حەق و ڕاستبێ. سەیر کە: ﴿وَيُـزَكِيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ﴾ ئا ئەوە پێمان دەڵێ: تا نەتوانی دڵت تەخت و گۆڕ و پاک کەی، ناشتوانی ئیدیعای زانست و حیکمەت بکەی.

جگە لەوانەش دەبێ ئەوە بسەلمێنی و باوڕەی پێ بکەی، ئەرزش و ڕێز و ڕێزداری یەک نیعمەتی گەورە وبەرچاوە کاتی دەردەکەوێ و دەزاندرێ کە کات و ساتەکانی ئێستێ دەگەڵ کات و ساتەکانی دەورانی ڕابردوو بەرابەر بکرێن، واتە حاڵ و ماضی: ئەلئان و ڕابردوو پێک هەڵکێشرێن نێوانی هەر دوو، دەورانەکان دەرک کرێن جا ئەوجار دەتواندرێ هەڵوێستی دروست دە بەرابەر ئەوزاعدا بگیردرێ. بۆ نموونە پێش ئیسلام واتە دەورانی جاهیلیەت و وەحشیگەری بگرە بەرچاو و دەورانی ئێستێی ئیسلام بخە بەر چاو، جا ئەوجار هەڵوێست

بگرە.

**دادۆشینێک لە باری سیما و هۆندرانەوەی ئایەتی ١٦٤:**

جوملەی (لَقَدْ مَنَّ اللُّه) وڵامی سوێندی حەزفکراوە کە دە ئەساسدا (وَاللهِ لَقَدْ مَـنَّ اللّـهُ) بووە. روح المعانی، ٤٤٢/٤.

(مَنَّ) فیعلە لە ڕەگەزی (مَنّ)ەیە، کە بە پێی دابی زمان عـارەبی مَـنَّ بـۆ چـوار مانـا دەکـار کراوە:

١. مَنَّ ئاسمانی: واتە گەزۆ کە لە ئاسمانەوە دەبارێ وەک لە داستانی حەزرەتـی مووسـادا چاو دەکرێ:

| وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَى ﴿٥٧﴾ بقرة<br>گەزۆ و مەلی شێلاقەشمان بۆ هەناردن. |
|---|

٢. مَنَّ بە مانای منەت لە سەر کردنیش هاتووە پاش چاکە کردن. وەک:

| وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴿٦﴾ مدثر<br>مەشبەخشە و داوای زۆریش مەکە. (یان دەڵێن) مەشبەخشە و پێت وابێ بۆشە. |
|---|

یان:

| يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُبْطِلُواْ صَدَقَاتِكُم بِالْمَنِّ وَالأذَى ﴿٢٦٤﴾ بقرة<br>ئەی گەلی خاوەن باوەڕان خێرەکانو بە منەت لە سەر کردن و ئازار دان، بەفیڕۆ مەدەن |
|---|

٣. مَنَّ بە مانای دابڕین و پچڕین و تەعین کردن هاتووە، وەک:

| إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٨﴾ فصلت<br>ئەوانەی خـاوەن بـاوەڕن و ئاکـار چـاکن، پاداشـی بێبڕانەوەیـان هەیە. (یـا دەڵـێن) هەرو هەر پاداشیان هەیە. |
|---|

٤. مَنَّ بە مانای ئەنعام و ئیحسان هاتووە. وەک:

| هَذَا عَطَاؤُنَا فَامْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٩﴾ ص<br>لەو سامانە زۆرەی داومانیەی یا چاکەی لێ بکە یان ڕایگرە. |
|---|

یەکێ دیٚ پرسیار دەکا و دەڵێ: بۆچی ناردنی پێغەمبەری بە خاوەن ئیمانان تایبەت کراوە دە حاڵێکدا کە ئەو پێغەمبەرە (رحمة للعالمین)ە؟ لە وڵامدا دەبێ بکوترێ: ئەگەرچی ئەو ڕەحمەتە لەمەڕ ئەساسی بوون بۆ هەموو عالەمە بە گشتی، بەڵام لە بابەتی بەهرەی ئیستیفادە و نەفع لێ کردن تایبەتی موسوڵمانانە، چونکە ئەوەی دەتوانێ بەڕاستی لەو ڕەحمەتە پاراو بێ، تەنیا موئمینانن.

ئایەتی (مِّنْ أَنفُسِهِمْ) سێ شت دە بەر خۆ دەگرێ ئەو سێ شتە کە دەتوانێ مەبەست بێ لە لەفزی (انفسهم) ئەوانەن:

١. مەبەست لە (انفسهم) دەکرێ موئمینان بن چونکە موئمینان دەکرێ بە پێی ئایەتی ٢٨٥ی بەقەرە وەک پێغەمبەر خاوەن ئیمان بن واتە لە نەفسی ئیمانداران بن. سەیری ئایەتەکە کە:

**آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّه**
**پێغەمبەر بەو بەرنامەیە کە لای خوداوە بۆی نێردراوە ئیمان و بڕوای هێناوە، موسوڵمانانیش هەروەها بە تێکڕایی بڕوایان هێناوە.**

٢. ئیحتیمالی دوو ئەوەیە: مەبەست لە لەفزی (من انفسهم) واتە نەسەب و ڕەگەزی عەرەب بێ، یانی ڕەسوولێک کە لە ڕەگەز و نەسەبی عەرەبە.

٣. ئیحتیمالی سێ لە مانای (انفسهم) بە ئیعتیباری جنسیەتە، واتە ئەو ڕەسووڵە لە جنسی عەرەبانە کە بۆخۆتانن و یا دەڵێن لە جنسی ئینسانانە و ڕەگەزی لە ئادەمە لە فرشتە و پەری نییە و نووریش نییە. بەو دەلیلە کە حەزرەت ڕحمة للعالمینە ئینسانیش بەشێک لە عالەم، کەوایە ئەو پێغەمبەرە ئینسانەی وا بەشان و شکۆ نابێ بە مەقام و شەئنی ئەو موقەدەسە، درۆ و خەیانەتی بدرێتە پاڵ.

ئەسڵ و ئەساسی ئەرکی هەرە بەرچاوی پێغەمبەر دەو ئایەتەدا ئەوانەن:

١. ﴿يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ﴾ ئەو کەلامە پیرۆز و مبارەکە ئیشارەی تەواوە وەلای ئەوەی: ئەوەی لە لایەن خوداوە بۆی سرووش کراوە بە شێوەی تەواو بێ کەم و کووڕی بۆ عالەم وەخوێنێ و بەیانی کا.

٢. یەکی دیکە لە ئەرکەکانی پێغەمبەر کە دەو ئایەتەدا دەسنیشان کراوە خاوێن کردنەوەی دڵ و دەروونانەن، وەک خودا دەفەرخوێ: ﴿وَيُزَكِّيهِمْ﴾ واتە لە پاش ڕاگەیاندن و تێگەیاندنی

کەلامی خودا بە خەڵک، خەڵک لە خەیاڵات و باوەڕی ناپاک و باتڵ و ئەخلاقی پیس پاک و خاوێن و خالیس وەکا.

٣. ئایەتی ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ ئیشارە وەلای ئەوەی دەکات: فێرکردنی قورئان و دەرسی حیکمەت و ئەخلاق ئەرکی سێهەمی ڕیسالەتیەتی. مەبەست لە تەعلیمی کیتاب فێر کردنی زانینی حەقایقی مانای قورئانە، و مەبەست لە تعلیمی حیکمەت شارەزایی دەرسی ڕاز و ئەسرار و حەقیقەتی شتە شاراوە و نهێنییەکانی ئایەت و حەدیسەکانە.

٤. بە پێی هەڵسەنگاندن و بەراوەردی جوملەی ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ ئەو هەستە دەکرێ: ئایاتی قورئان دەبێ بڵێین وەک گۆگردی شەمچە وایە، واتە بەبێ جووڵانەوەی وەسیلە ئەو گۆگردە ڕووناک نابێ و نایسێ، ئایاتی قورئانیش بەبێ تەعلیم و تەربیەتی پێغەمبەر بۆ کۆمەڵی عەوام بەهرە نادا بەڵام پێغەمبەر دەتوانێ بە حەرەکەتی خۆی عالەمێک فێر کا و ئەوانیش عالەمێک، هەر وا تا بە تەواوی وڵات بە نووری قورئان ڕووناک وەبێ و دەکرێ و جامعیەش بە تەواوی شارەزا دەبن.

بە پێی هەڵسەنگاندن و بەراوەردێکی هەستیارانە هەست بەوەی دەکرێ کە هەرای ئوحود هەرایەکی سەخت و پڕ کارەسات بووە، بەو دەلیلە کە خودای تەعالا پێ بە پێ و هەنگاو بە هەنگاو ڕووداو و بەسەرهاتەکانی بۆ موسوڵمانان دەگێڕێتەوە و بەیان دەکات. بۆ نموونە دڵخۆشی موسوڵمانان دەداتەوە بەوەی کە ئەگەر ئێوە تووشی زیان و ڕەنج و میحنەت بوون لە هەرا و شەڕی ئوحوددا، تێفکرن و بە خۆدا بچنەوە و بیر وەکەن کە دە عیوەزدا چەن بەرابەر داخ و دەرد و حەسرەت و زیان ڕژاوەتە سەر کافرەکان، جگە لەوەش ئاوڕ دەنەوە بەرجەوەند بن و بزانن کە ئەو زیان و دەردە لە کوێوە بە هۆی چی شەئنی ئێوەی موسوڵمانی داگیر کرد؟

خۆ دیارە وەک لە ئایەتەکاندا پێی ئاشنا کران، منافقان جارێکی لە بابەت تەقسیماتی تاڵاندا پێغەمبەریان خستە بەر تانە و تەشەر و لۆمەی ئەوەی کە خەیانەتی کردووە لە تەقسیماتەکەدا و هەروا منافقان جارێکی دی موسوڵمانیان دایە بەر لۆمەی ئەوەی پێیان دەکوتن ئەگەر ئێوە بە نەزەری ئێمە جووڵابانەوە، تووشی ئەو بەڵا و دەردە نەدەهاتن.

جگە لەوانەش پێغەمبەریان دەدایە بەر پلار و تانە بەوەی دەیانکوت محەمەد ئەگەر بە حەق پێغەمبەر بوایە، بریندار نەدەبوو و لەشکرەکەشی نەدەشکا، و هەرچەندین ڕەخنەی دیکەی منافقان بۆ سەر پێغەمبەر. موسوڵمانان دیارە وەک دیارە و زاندراوە خودای تەعالا بە تێر و

تەسەلی وڵامی سەراپای ڕەخنە و تانەی و لۆمەکانی منافقانی داوەتەوە، جگە لەوەش دووبارە خودای تەعالا هەر بۆ پووچەڵ کردنەوەی خەیاڵ و گومانی کافرانی خەیاڵ بەتاڵ و بیرپووچ ئایەتی ۱۶۵ی ئالی عیمرانی ڕەوانە دەکاتە سەر پێغەمبەر و موسوڵمانان. ئەوەش ئایەتەکە و هەڵیسەنگێنە و وەزنی کە تاکوو بە چاکی باوەڕی پێ بکەی.

**أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّى هَـٰذَا قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٦٥﴾** ئالی عیمران

**ئاخۆ کاتێک بەڵا و گرفت لە ئوحوددا ڕووی تێ کردن، لە شەڕ و غەزای بەدردا دوو بەرابەر سەرکەوتنتان وەدەس هێنابوو، کوتتان ئەوە لە کوێوە هات؟ بڵێ: ئا ئەو تێشکانە لە لایەنی خوداتانەوەیە، بێ گومان خودا دەسەڵاتی بە سەر هەموو شتێکدا هەیە.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ۱۶۵

دەبێ بڵێین کاتێ لە ئوحوددا موسیبەت بە موسوڵمانان گەیشت دەبێ ئەو موسوڵمانانەش تووشی ئەو موسیبەتە بوون ئەوە بزانن دوو بەرابەری ئەو موسیبەتەی وان لە هەرای بەدردا بە دوژمنان گەیشت لە لایەن وانەوە، دەشیانکوت موسوڵمانەکان دەبێ هۆی ئەو تێشکانەی ئێمە چ بووبێ و بۆچی شکاین؟ لە لایەن خوداوە پێغەمبەر خەبەردار کرا کە هۆی شکستەکەیان پێ بڵێ، جا لە سەر ئەو دەستوورەی خودا پێغەمبەر پێی کوتن: ئەوە لە ئەسەری کەمتەرخەمی خۆتانەوە بوو کە سەنگەرەکانو خاڵی کردن و کەلێنو دا بە دوژمن کە بە پێی هەلی بۆ ڕێکخراویان هێرشو بکەنە سەر و زیانی سەر وماڵتان پێ بدەن و دەشبێ موسوڵمان لە هەر تێشکانێک دەرسێک فێر بێ و بشزانێ خودای حەکیم ئاگاداری هەموو شتێکە و بە سەر هەموو شتێکیشدا بەتوانایە، وەک ئەوە: موسوڵمانەکان کە لە شەڕی ئوحوددا ۷۰ کەسیان لە دەست دا و لێ کوژرا، خودا بە توانای خوی هێز و غیرەتی دا بە موسوڵمانان کە لە شەڕی بەدردا پێش شەڕی ئوحود ـ بتپەرستکان جگە لەوەی ۷۰ کەسیان لێ کوژرا ۷۰ کەسیشیان لێ بە دیل گیرا. جا ئەگەر موسوڵمانەکان سەنگەرەکانی خۆیان چۆڵ نەکردبایە بۆ وەدەس کەوتنی تاڵان، و هەروا تیرئەندازەکان پشتی سوپاکەیانی خۆیان خاڵی نەکردبایە هەر وەک لە هەڵمەتی یەکەمدا بتپەرستەکان شکان و هەڵاتن تازە نەیاندەتوانی هەڵستنەوە و وەخۆ کەونەوە و هێرش بێننە سەرتان، ئەودەم سەرکەوتنو بە دەست دێنا هەر وەک لە بەدردا بە دەستو هێنا.

**پاشەدۆ:**

خودای تەعالا بۆ دڵخۆشیدانەوەی موسوڵمانەکان پاش هەرای ئوحود، سێ شتی وە ڕوو هێنان و دایە بن گوێیان:

١. خودا پێی کوتم بە تێشکان و زیانی هەرای ئوحودتان سەخڵەت مەبن و حەسرەت مەخۆن، چونکە لەو دوو شەڕی بەدر و ئوحوددا ئێوە دوو بەرابەر زەرەر و زیانو بە بتپەرستەکان دا.

٢. ئەی موسڵمانان پرسیار لە خۆو دەکەن کە لە ئەسەری چیدا بوو ئەو زەرەرەمان تووش هات لە هەرای ئوحوددا؟ دەبێ بزانن لە کەمتەرخەمی خۆتانەوە بوو، واتە ئەگەر دەستووری پێغەمبەرو بەڕێوە بردبا و سەنگەرەکانتان چۆڵ نەکردبایە و هەڵنەهاتبان، هەل نەدەڕەخسا بۆ دوژمن و تووشی ئەو کارەساتە نەدەهاتن.

٣. ئێوەی موسوڵمان نابێ ترس و خەمی داهاتووی خۆتان بخۆن، چونکە خودا بەتوانایە، ئەگەر ئێوە هۆیەکانی هەڵەکانتان لە بەرچاو بگرن و دەرسیان لێ وەرگرن و ڕێی دووپاتەیان نەدەنێ، خودا یارمەتی و هیدایەتو دەدا بۆ هەموو شتێک.

ئەوە هۆشدارەکانی خودا بوون بۆ موسوڵمانانی تێکشکاوی شەڕی ئوحود.

**شتێکی چاوەڕواننەکراو:**

موسوڵمانەکانی هەرای ئوحود ئەوەیان خەیاڵ و باوەڕ بوو ئێمە چونکە دیفاع لە حەق دەکەین و پێغەمبەریشمان دەگەڵە، دەبێ لە هەموو شەڕاندا بەبێ ئەملاولا و مەرج و شەرت سەرکەوین، بەڵام منافقان و موشریکان چونکە دوژمنی خودا و دینی خودان دەبێ بن کەون، جا چونکە لە شەڕی ئوحوددا بە پێچەوانەی خەیاڵ و خواستی وان کار سەری گرت، دامان و کەوتنە ڕامان و عەجایبات و سەرسووڕمان، خودای تەعالا بۆ ڕەواندنی ئەو تەمە لە سەر دڵیان فەرمووی: سەرکەوتنی و بەرکەوتن دە شەڕدا ڕازی تایبەتمەندی خۆی هەیە، کارێکی بە دین و بێ دینی نەداوە، دە حاڵێکدا هۆی شکانی ئێوە لە خۆتانەوە بوو، کە بێ ئەمری پێغەمبەرتان کرد لە چەند لاوە:

١. نەزەری پێغەمبەر وا بوو کە لە شاری مەدینەدا وەمێنن و بەرەو پیری ئەو شەڕە نەچن کەچی ئێوە بەرەو شەڕ چوون.

٢. بە دەستووری پێغەمبەر نەجووڵانەوە و سەنگەرەکان چۆڵ نەکەن، کەچی چۆڵو کرد و

هەڵاتن بۆ کۆکردنەوەی تاڵان، خوداش وەعـدەی سـەرکەوتن بەو مەرجە پـێ دابـوون کە خـۆ وەخۆ بگرن و تەقوایە بکەن، جا سەر دەکەون؛ کەچـی مەرجـو بەجـێ نەگەیانـد، واتە شـەرتو نەبردە سەر بۆیەش سەرکەوتنو بە دەست نەهێنا. ئەوەش ئایەت لەو بارەوە:

**بَلَىٰٓ إِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَـٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ آلَافٍ مِّنَ الْمَلَآئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾** آل عمران

**ئاریێ، ئەگەر خۆ بگرن و پەرهیزگار بن، با دوژمـن بە هەمـوو تـین و هێـزەوەی خۆیـان هێرشـو بکەنە سەر، خودا بە پێنج هەزار فرشتەی نیشانەدار یارمەتیو دەدا (واتە دوژمن ناتانوێرێتێ)**

دڵ دەیهەوێ بزانێ هۆی تێشکانی موسوڵمانان دە ڕۆژی ئوحوددا چ بوو؟

بە پێی ڕاوێژ و شتێکی کە لە سیمای ئایەتەکانی تایبەتی ئەو بابەتە وەدەست هاتوون دەبـێ هۆیەکە ئەو سێ شتە بن:

١. سەرپێچی یاران (جبل الرماة) لە دەستووری حەزرەتی ڕەسووڵ، واتە هاتنە خوارەوەیان لەو کێوە تا کۆتایی شەڕ.

٢. کێشە و دووبەرەکی نەفەراتـی جبـل الرمـاة دەگەڵ ئەمیـری خۆیـان عەبـدوڵڵا کـوڕی جوبەیر. ئەو ئەمیرە تەئکیـدی لە سـەر ئەوە بـوو کە ئەو جێگـایە چـۆڵ نەکەن و نەیەنە خـوار، کەچی گوێیان نەدایە.

٣. بنچینەی ئەو کارەساتە لە ڕووداوی فدیەی ئەسیرانی بەدردا دامەزرا، سەیر کەن:

لە شەڕی بەدردا ٧٠ نەفەر لە موشریکان بە دەست موسوڵمانان بە دیـل گیـران، حەزرەتـی ڕەسووڵ لەو بارەوە دەگەڵ یارانی کەوتنە بیر و ڕا و مەشوەرەت کە چییان لێ بکرێ؟ بکوژرێن؟ یا فدیەیان لێ وەرگیرێ؟ یا ئازاد کرێن بە چاکە؟ حەزرەتی عومەر ڕەئی کوشتنی هەمانی دا؛ تـا دەرسی عیبرەت بێ بۆ هەهەمـوو موشریکـان و سـام و هەیبەتـی ئیسـلام دەرکەوێ. حەزرەتـی ئەبووبەکر و دەستەیەکی دیکە نەزەریان دا دە مقابل فدیە هەموو ئازاد کرێن، بەڵکوو ڕۆژێـک بە هۆی شەفەقەتی ئیسلام دەگەڵیان موسوڵمان بن. پێغەمبەریش ئەو نەزەرەی ئەبووبەکری پەسەند کرد، جا کاتێ ئەو نەزەرەی حەزرەتی ئەبووبەکر عەمەلی کرا واتە بەفـدیە ئـازاد کـران، لە لایەن خوداوە ئایەتی ٤ی سووڕەی محەمەد دابەزی کە ڕەئی خودای عـالەم کوشـتنی ئەسـیرن بـوو، سەیری ئایەتەکە با بکرێ:

**فَإِذا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاء حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ذَلِك وَلَوْ يَشَاء اللَّهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَكِن لِّيَبْلُوَ بَعْضَكم بِبَعْضٍ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ**

**که واته هەر کاتێ گەیشتن بە کافرەکان خێرا بدەن لە گەردنیان، تا کوشت و کوشتارێکی زۆریان لێ دەکەن، جا بە دیلی بیانگرن و شەتەکیان دەن، ئینجا یا منەتباریان کەن و بەریان بدەن، یا ئاڵوگۆڕیان پێ بکەن وبریتیان لێ وەربگرن، تاکوو شەڕکەر چەک و کەرەستەکەی دادەنێ و دەکوژێتەوە. ئەوەیە فەرمانی خودا، ئەگەر خودا بیویستایە هەر خۆی تۆڵەی لێ دەساندن، بەڵام دەیویست هەندێکتان بە هەندێکی دیکەتان تاقی بکاتەوە و ئەو کەسانەش کە لە ڕێی خودادا دەکوژرێن هەرگیز خودا کار و کردەوەکانیان بە فیڕۆ نادا.**

**بۆ ئاگاداری:**

ئەو ئایەتە ٤ی سوورەی محەمەد ئەوەمان نیشان ددا کە خودای تەعالا ئەو هەڵوێستەی حەزرەتی ئەبووبەکر و هەندێکیانی پەسەند نەکردووە بەو دەلیلە ئایەتەکە ئەو دوو ڕێگایەی پێشنیهاد دەکا بە موسوڵمانن: یا لە گەردنیان بدەن و بیانکوژن و یا دە مقابل فدیە ئازادیان کەن بەڵام دە مقابل ئەو ٧٠ نەفەرەی کە لە شەڕی بەدردا بە دەس ئیسلام بە دیل گیران ئەگەر بێتو نەکوژرێن ٧٠ نەفەر لە موسوڵمانان کە لە شەڕی ئوحوددا دەکوژرێن بێ تۆڵە دەبن، ئەدێرەدایە کە پێغەمبەر دەگەڵ موسوڵمانان لەو بارەوە دەکەوێتە بیر و ڕا، موسوڵمانان بە پێغەمبەر دەڵێن: ئەگەر ئێمە بکوژرێین شەهید دەبین، پێویست ناکا کەسمان لە باتان بکوژن، بەڵکە ئەوانەی ئازادیان دەکەن ڕۆژێک بێنە ژێر ئاڵای ئیسلام و موسوڵمان بن. بە قەولی حەزرەتی عوبەیدە ئەدێرەدا موسوڵمانەکان مەبەستیان دوو خێر بووە: ١. شەهادەتی خۆیان ٢. ئازادی ئەسیران بە هیوای موسوڵمان بوونیان ڕۆژێک.

**دڵ دەیهەوێ بزانێ پێغەمبەر بۆ ڕەحمەتە بۆ عالەم؟**

بە پێی هەڵسەنگاندنی هەڵسوکەوتی پێغەمبەر دەگەڵ عالەم ڕەحمەتی بوونەکەی بۆ عالەم چاو دەکرێ و حاشای لێ ناکرێ بۆ نموونە:

١. خودا بە هۆی هاتنی پێغەمبەر بۆ نێو عالەم کۆمەڵی ناتەواو و نەزان بوون بە زانا و تەواو، چونکە نەزان ناتەواوە، و ئینسانی زانا تەواوە.

٢. پێغەمبەران بە باشترین دەلیل عالەم بۆ ڕێگای حەق شارەزا دەکەن و هان دەدەن، ئەوە

بە باشترین ڕێگای عیبادەت دێتە ژمار، خۆ وە نزیک دەخەن لە خودا، ئا ئەوە ڕەحمەتە.

٣. ئەقڵ و دەرک و هەستی دەروونی ئینسانی بە هۆی ئیرشادی پێغەمبەری دەکەوێتە شەوق و زەوق و نوورانییەوە، ڕادەپەڕێ بەرەو خودا بڕوا، ئەوە ڕەحمەتە.

٤. ئەخلاقی پێغەمبەران دەرسە بۆ عالەم و عالەمیش ئەرزش دادەنێ بۆ ئەو دەرسە. ئە ئەوە ڕەحمەتە.

جا لە سەر ئەو ئەساسە عالەم واتە ئینسان نیازی تەواوی هەیە بە پێغەمبەران بەبێ بوونی پێغەمبەران ژیانی ئینسانی وەک داری بێ بەرە.

بە پێی بەرجەوەندی و هەڵسەنگاندنی نەزمی تەرتیبی ئایەتی ١٦٤ هەست بەوە دەکرێ:

تەزکیە و تەعلیم وەسیلەن بۆ گەیشتن بە نیاز، هەست و دەرک و شعووریش فایدە و بەهرەیە، واتە تا دەروونی خالیس و پاک نەیەتە گۆڕێ، زانست نایەتە گۆڕێ، تا زانینیش نەیەتە گۆڕێ، فەرقی پاک و پیس نایەتە گۆڕێ.

**دەبێ چۆن بەو نەتیجە بگەین بە یەقینی کە پێغەمبەر لە بەشەرانە؟ لە فرشتە و پەریان نییە؟**

جگە لەو ئایەتانەی هاوارن لە سەر بەشەر بوونی پێغەمبەر، ئەقڵ سابتی دەکا کە پێغەمبەر بەشەرە، چونکە ئەو ئاکار و رەفتار و هەڵسوکەوتەی پێغەمبەران پێی هاتوون و هەن و دەڕۆن تایبەتی ئینسانن، فرشتە و پەری دوورن لەو ئاکار و ئەتوارە، فرشتە لە نوورە، پەری لە ئاگرە؛ پێغەمبەر لە خاکە، فرشتە کە لە نوورن ناخۆن، ئینسان دەخوا؛ پەری نابیندرێن، ئینسان دەبیندرێ، فرشتە میز و کەسافەتیان نییە، ئینسان هەیەتی، فرشتە نێر و مێی نییە، ئینسان هەیەتی، بە هەر حاڵ جگە لە هەموو ئەوانە پێغەمبەران چونکە تەعلیم و تەربیەتیان پێ سپێردراوە شایانترین سیفەت بۆ ئەنجامی ئەو سیفەتە تەعلیم و تەربیەتە، هاونەوعی و هاوچەشنیەتە دەگەڵ ئینسان.



پاش تێگەیشتن لە ڕووداو و کارەساتی هەرای ئوحود، هەڵسوکەوتی بێباوەڕان و سست و لاوازی منافقان و ڕاز و ڕەمزی شەڕ و شۆر وا دەکا، نیازمان هەیە و دەبێ بەوەی بە تێر و تەسەلی دووڕووان چاتر بناسرێن بۆوەی موسوڵمانان فریویان نەخۆن. جا بۆ ئەو مەبەستە دەبێ بچینە خزمەت ئایەتەکانی ژمارە ١٦٦ و ١٦٧ و ١٦٨ی بە تەرتیب لەسەریان بدوێین:

وَمَا أَصَابَكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ فَبِإِذْنِ اللّٰهِ وَلِيَعْلَمَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٦٦﴾ ئالی عیمران

**ئەوەی تووشتان هات لەو ڕۆژەدا، (واتە لە ڕۆژی ئوحوددا کەلەگەڵ بێباوەڕاندا دەستەویەخە بوون) ئەوە بە ویستی خودا ڕووی دا، چونکە ئێوە لە ڕێگای سەرکەوتن لاتان دا و خوداش لە ئەزەلدا دایناوە کە ئیرادەی لە هێنانەدی هەموو کاروبارێکی ئادەمیزاددا بەند بێت بە ڕادەی پابەند بوونی ئادەمیزاد خۆی بە ڕێگای ئەو کاروبارە و یاسا گەردوونییەکانەوە، ئەویش کە ڕووی دا بۆ ئەوە بوو زانستی ئەزەلی خودا بە کردەوەی ئیماندارەکان لەو ڕۆژەدا دەربکەوێت و بە تەواوی ئاشکرا بێت.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٦٦**

ئەو زیانەی لەو ڕۆژی گەیشتنی ئەو دوو کۆمەڵە کە بە ئێوە گەیشت بە ئیزن و فەرمانی خودا بوو، بۆ ئەوەی بزانن کێ جۆشدراوی ئایینە و کێ بە شوێن تاڵانی و دەستکەوتی شەڕدا دەگەڕێ.

**ئاگاداری:**

دەبێ ئەوە بزاندرێ و بسەلمێندرێ کە دونیای بوون لە ڕووی یەک بەرنامەی عیللەت و ئەسبابەوە بینا کراوە، و هەر ڕووداو و کارەساتێکی کە ڕوو دەدەن لە سەر ئەساسی عیللەت و مەعلوولێکن ڕوو دەدەن، بۆ نموونە ئەوەی لە ڕۆژی ئوحوددا ڕووی دا و وە موسوڵمانان کەوت هۆ و عیللەتەکەی دڵبەستن بە ماڵ و سامان و تاڵان بوو، و یا سەرپێچی لە دەستووری ئەمیری بوو. هۆی ڕوودانەکەشی ئاشکرا بوون سێ دەستە بوو:

١. ڕاستی موسوڵمانان کە تا ئاخرین کاتی خۆی بەربەرەکانی و خۆڕاگرییان لە خۆ نیشان دا سەرەنجام هەندێکیان شەهید بوون و هەندێکیان بریندار بوون، و هەندێکیشیان نەیانتوانی خۆڕاگرن و هەڵاتن، هەندێکیشیان کە منافق بوون هەر لە نیوەڕێدا بە بەهانەی پووچ گەڕانەوە.

**پاشەدۆ:**

ئایەتی (و ما اصابکم) ڕووی دە موسوڵمانانە و مەبەستیشی شەهادەتە، و ئایەتی (یوم التقی الجمعان) مەبەستی ڕووبەڕوو بوونەوە و تێک چڕژانی موسوڵمانەکان و کافرانە لە ڕۆژی شەڕی ئوحوددا. ئایەتی (فبإذن اللـه) واتە ئەوەی لە شەڕی ئوحوددا ڕووی دا لە سەر ئیزنی خودا بوو. یا دەڵێن: بە عیلمی خودا بوو. یا دەڵێن: بە حوکمی خودا بوو. یا دەڵێن: قەزا وقەدەر بوو وەک ابن‌عباس نەزەری وایە.

مەبەستیش لە مانای (لیعلم المؤمنین) واتە لِتَبَيَّنَ الْمُؤمِنُ مِنَ الْمُنافِقِ: تا موئمین لە منافق

جودا وەبێ و وەناسرێ.

ئەو ئایەتی ١٦٦ بە پێی مانا پاشەرۆکی ئایەتی ١٦٥ە، هەروەک ئایەتی ١٦٧ پاشەرۆکی ئایەتی ١٦٦ە. کاتی ئەوەی هاتووە بچینە خزمەت ئایەتی ١٦٧ی ئالی عیمران:

**وَلْيَعْلَمَ الَّذِينَ نَافَقُواْ وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ قَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَوِ ادْفَعُواْ قَالُواْ لَوْ نَعْلَمُ قِتَالاً لاَّتَّبَعْنَاكُمْ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلإِيمَانِ يَقُولُونَ بِأَفْوَاهِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ وَاللّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ ﴿١٦٧﴾** ئالی عیمران

**بۆ وەی ئەوانەی دووڕوو بوون دەریان بخات ئەوانەی پێیان کوترا وەرن یا لە ڕێی خودادا بجەنگن، یا دیفاع و بەرگری بکەن، کوتیان ئەگەر بمانزانیایە ئەو شەڕە بە یاسای ڕێکوپێک شەڕ دەکرێت پەیڕەویمان لێ دەکردن، ئەوانە ئا لەو ڕۆژەدا لە بێبڕوایی نزیکتر بوون تا لە ئیمان؛ بە زمانیان شتێکیان دەکوت کە لە دەروونیاندا نەبوو، خودا ئاگادارترە لەوەی لە دڵیاندا دەیشارنەوە.**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٦٧

هاتنە خوار و دابەزینی ئەو ئایەتە دیارە بۆ ئەوەی دەبێ بووبێ: کە گۆشەیەکی دیکە لە تێکشکانینان بۆ دەرخات کە لە لایەن منافقینەوە ڕووی دا ئەو زیانەتان پێگەیی جا بۆ ئەوەی بناسن ئەوانەی لە دڵا بڕوایان نەهێناوە و دووڕوویان کردووە و پێیان وترا وەرن بجەنگێن لە ڕێی خودا یان بەرگری بکەن لە خاک و نیشتمان، کوتیان ئەگەر زانیمان شەڕ دەبێ دواتان دەکەوین لەو ڕۆژەدا لە بێبڕوایی نزیکتر بوون نەک لە بڕواداری، ئەوەی بە زمان دەیانگوت لە دڵیاندا شتی تر بوو، خوداش زاناتر بوو بەوەی دەیانشاردەوە. جا ئەو زیانەی کە لە ڕۆژی ئوحوددا لە لایەن بتپەرستانەوە پێتان گەیشت بۆ ئەوەی بناسن ئەوانەی دەبنەوەبڕن، وەکوو عەبدوڵڵا کوڕی ئوبەی سەلول و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لەو ڕۆژە ڕەشەدا بە خۆی و ٣٠٠ کەسی شەڕکەر، پێش ئەوەی لەشکری ئیسلام بگاتە کێوی ئوحود گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە و چەند موسوڵمانێکیش کەوتنە دوایان و پێیان کوترا وەرن شەڕ بکەن لە ڕێی خودادا و بتپەرستان تێکبشکێنن، یان بەرگری لە خاک و نیشتمان بکەن، کوتیان ئەگەر بزانین شەڕ دەبێ دواتان دەکەوین، بە فڕ وفێڵ خۆیان لە شەڕ دوور خستەوە. ئەوانە لەو ڕۆژەدا بۆ بێبڕوایی نزیکتر بوون نەک لە بڕواداری؛ واتە بە زمانیان قسەیەک دەکەن ئەوە نییە لە دڵیاندا، بەڵکە بە پێچەوانەی ئەوە دە ناو دڵیاندایە و دەیشارنەوە، دیارە خوداش زانایە بەوەی دەیشارنەوە.

**پاشەدۆ:**

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم ویستوویەتی ڕووڕەشی دووڕوویان ئاشکراتر بناسێنێ و ئاوا بەو شێوەیە: کاتێ هەندێک لە موسوڵمانەکان گەڕانەوەی دووڕووەکانیان بۆ مەدینە چاو کرد زانییان ئەوە ڕادەکەن هاواریان بەرز کردەوە بۆ لەشکرەکەیان: وەرن بۆ خاتری خودا با بە گژ موشریکانـدا بچـین یـان لانـی کەم دە بەرابەر ئەو خەتەرەی هەڕەشـە لە وڵات و ناموسـمان دەکات خۆ نیشان دەین و دیفاع بکەین. لە موقابیل ئەو داد و هاوارەدا منافقـان بەهانەیـان هێنـا ڕوو و کوتیان: ئەگەر هات و شەڕ هاتە ڕوو بێ گومان بەرەو ئێوە دێین. بەڵام دەزانین ئەو هـات و هاوارە بێ شەڕ خامۆش دەبێ، چونکە دەزانین ئەوە شەڕ نییە بەڵـکە خـۆ بەکوشـتدانە، بەو دەلیلە لەشکری کافران زۆرە و سازترە و موسوڵمانەکانیش کەمتر؛ جا بەو پێیە بە گژدا چوونیـان خۆ بەکوشتدانە، بە ڕەوای نازانین ڕووبەڕوویان بین. دیارە ئەو ڕاوێژ و ڕاوێچکەیان سەراپا بـۆ خۆ دزینەوە لە شەڕ بوو ئەوەی دەیانکوت درۆ بوون، ئەوەی بە زمان دەیـانکوت بە پـێچەوانەی ئەوەی لە ناو دڵیان حاشاریان دابوو، قسەی زار و مەبەستی ناو دڵیان یەک نەبوو.

**سووکە ئاوڕێک:**

بە هۆی هەڵسەنگاندنی ئایەتەکە هەست بەوەی کرا کە شەڕ دە ڕێی خـودادا (جیهـاد) دوو بەش بێ: دیفاعی و بەرگری؛ ئیقدامی.

١. ئیقدامی واتە هێرش بردن؛ شەڕی ئیقدامی ئەوەیە کە بێ ئەوەی کافر بەرەنگـارت بـێ و دە بەرابەردا هەڵوێستی گرتبێ، ئەتۆ ڕاستەوخۆ بۆ پەرچەمی ئیسـلام و پەرە گرتنـی شـەریعەتی ئیسلام و بانگەوازی خەڵک بۆ لای ئیسلام شەڕ بکەی.

٢. شەڕی دیفاعی واتە بەرگری ئەوەیە ئیسلام هەڵوێستی شـەڕی نـیە و نەیگرتـووە، بەڵام کاتێ دەزانێ و دەبینێ کافر فشار و هێرشێ دێنێ، و یا دەیهەوێ سنووری ئیسلام ببەزێنێ، ئەوە دەبێ هێزی ئیسلام وەگەڕ کەوێ بۆ بەرگری لە ئایین و کەرامەت و خاک و نیشـتمانی ئیسـلام. ئەو حاڵەتە بۆ باری دیکەشە.

جا لە سەر ئەو بەراوەردە مانای ئایەتی ﴿وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ قَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَوِ ادْفَعُواْ﴾ واتە بە شەڕ وەرن یا بەرگـری کەن، بەپێـی ئەو بەراوەردە دەبـێ ئەوە بـێ مەبەسـت لە ئـایەتەکە ئەو کەسەی کە ئەو منافقانەی بۆ شەڕ بانـگ کـردن مەبەسـتی ئەو دوو جـۆرە شـەڕە بـووە، واتە یـا ئیقدامی، یا بەرگری؛ یـانی بـۆ گەشـاوەیی و ڕاوەسـتاوەیی پەرچەمـی ئیسـلام وەرن بـۆ شـەڕ

دەگەڵمان کەون یا بۆ بەرگری لە خاک و نیشتمان و ناموسی ئیسلام.

دێرەدا قەولی "سدّی" و "کوڕی جریح" و نەزەری "ابن‌عباس" ئاوایە:

١. یا بۆ ئەجری ئاخرەتی وەرە مەیدانێ، یا بۆ پاراستنی گیان و ناموسی خۆتان وەرنە خەتی بەرگری تاکوو دوژمنی ئیسلام نەتوانێ حەملە بێنێتە سەر ئیسلام.

٢. یا دەڵێن: کێ باوەڕی بە ئاخرەت و ئەجری ئاخرەتی دەوێ، وەرە مەیدانی شەڕ بۆ ئیسباتی ئەو داوایەی و یا لانی کەم بۆ بە دەست هێنانی ماڵ و تالان لە کافران وەرە دەگەڵ موسوڵمانان بن و دیفاعیان لێ بکەن.

٣. یا دەڵێن: ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن ڕەزایەتی خوداتان دەوێ وەرن بۆ مەیدانی شەڕ بە خاتری ڕەزایەتی خودا، دەنا لانی‌کەم بۆ وەدوور خستنی خۆت ئەی منافق لە لکەی منافقی وەرە دەگەڵمان کەوە بۆ شەڕ دەگەڵ دوژمنانی ئیسلام؛ تاکوو موسوڵمانان بە چاوی موسوڵمانانو تێوە ڕامێنن نەک بە چاوی کافران. (روح المعانی، ۴۴۹/۴) لە نێوانی ئەو تەعبیراتانەدا نەزەری ابن‌عباس پەسەندترە، باقی نەزەرەکانی دیکەش هەر هەن بەڵام ئاوا دڵگر نین. تفسیر کبیر، ج ۸۵/۹.

کاتی ئەوەی هاتوەبۆ تێر و تەسەل بوون لە باسەکە بچینە خزمەتی ئایەتی ۱۶۸ی ئالی عیمران:

> الَّذِينَ قَالُواْ لإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُواْ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا قُلْ فَادْرَؤُوا عَنْ أَنفُسِكُمُ الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿۱۶۸﴾ ئالی عیمران
>
> **ئەوانەی کە لە ماڵەوە دانیشتوون، دەیانکوت بە براکانیان: ئەگەر بێتوو بە گوێی ئێمەیان بکردایە نەدەکوژران، بڵێ: ئادەی مردن لە خۆ دوور خەنەوە ئەگەر ڕاست دەکەن!**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ۱۶۸**

ئەوانەی بە بڕوادارەکانیان دەکوت: لە کاتێکا دانیشتبوون: ئەگەر بە قسەی ئێمەیان بکردایە، نەدەکوژران و تووشی ئەو زەرەر و زیانە نەدەبوون، جا بۆ پوچەڵ کردنەوەی بیر و بۆچوونی ئەو بێ‌بڕوایانە خودا ئەمر بە پێغەمبەر دەکا کە بڵێ پێیان: ئەگەر ڕاست دەکەن بە نەچوونە شەڕ مەرگ نایەتە لاتان، دە مردن لە خۆتان وەدوور خەنەوە.

دابەزینی ئەو ئایەتە دەرحەق بەو دووڕوویانەیە کە لە مەدینەدا دەرنەچوون، منافقین بە خەڵکیان دەکوت: مەڕۆن بۆ شەڕ نەبادا وەک خەڵکی هەرای بەدر و ئوحود بە کوشتن بچن.

خودای تەعالا بە پێی حیکەمتی خۆی موسـولْمانەکانی ئاگـادارکردەوە لەسـەر ئەوەی شـەهید وەک عالەمی غەیرە شەهید نامرێ، بەڵکە دەمرێ ئەو مەرگە نییە کە ئێمەی پێ دەمـرین. بـۆ ئەو ڕاستییە کاتی خۆی دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۶۹ی ئالی عیمران.

**ئاگاداری:**

دووڕوویەکان جگە لەوە دە شەڕدا شیرکەتیان نەدەکرد، تێدەکۆشان کە ڕوحیەی خەڵـک لە ڕاست شەڕ و هەرا و دیفاع لە ئیسلام سست و لاواز بکەن، چونکە کاتێ براکانیان لە جەبـهەی شەڕ دەگەڕانەوە، لە ڕووی تانە و لۆمە پێیان دەکوتن: ئەی برایان ئەگەر بە قسەی ئێمەو بکـردایە نەدەکوژران و تووشی ئەو نارەحەتیە نەدەبوون.

وشەی (لإخوانهم) بۆ شیددەت و توندی لـۆمەی منافقـانە، واتە ئێـوە کە موسـولْمانانو بە برای خۆ دەزانی بۆچی لەو کات و ساتە حەستەمەدا بە تەنێـو هێشـتنەوە؟ بـۆ مەگەر کەسـێک کەسێ بە برا بزانێ، لە پشتیوانی بێ بەش دەکا؟!

ئایەتی (الذین قالوا) بە پێی فەرمـوودەی دەسـتەیەک لە قورئانزانـان گۆیـا مەبەسـتی پـێ عەبدوڵڵا کوڕی ئوبەیە و هاواڵەکانی. بەڵام (إصم) کە ئەویـش یەکـێکە لە شـارەزایانی قورئـان نەزەری جۆرێکی دیکەیە، وەک ئەوە کە دەڵێ: عەبـدوڵڵا کـوڕی ئـوبەی ڕۆژی هەرای ئوحـود پـێش ئەوەی شـەڕ دامەزرێ هـاتە دەرێ و پێغەمـبەری بەجـێ هێشـت، ئەو قسـەیە کە دەڵـێن عەبدوڵڵا کوڕی ئوبەی بووە وا نییە، بەڵکە ئەو قەولە بۆ ئەو کەسانەیە کە خیلافیان نیشـان داوە، بەو دەلیلە کە ئایەتەکە ئاوا دەڵێ: ﴿الَّذِينَ قَالُواْ لإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُواْ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا...﴾ دیارە ئەو گوفتارە پاش شەڕ و هەرا کوتراوە. جا ئەوە دیارە لە کەلامی ئەو کەسـانە دەچـێ کە بەرەو شـەڕ هاتوون کوتووشیانە: قَالُواْ لإِخْوَانِهِمْ واتە قَالُواْ لأجل إِخْوَانِهِمْ.

خودای تەعالا بۆ بەرپەرچدانەوە و پووچەڵکردنەوەی بیـر و بۆچـوونی ئەو کەسـانەی کە خەڵکیان پاشەکشێ پێ دەکرد بە وەبەرنانی ترسی کوشتن لە چوون بۆ شـەڕ، دەیـانکوت ئەگەر نەچن بۆ شـەڕ نـاکوژرێن، جـا خـودای تەعـالا ئاشـکرای دەکـا کە گوفتـار و خەیـاڵی ئەوانە نادروستە و نارەوایە؛ چونکە مەرگ وابەستە بە قەزا و قەدەرە، نە بە چوونە شەڕ و نەچوونە شەڕ؛ وا هەیە ئینسان دە خەودا لە سەر لێفە و دۆشەگ دەمـرێ، دە حاڵێکـدا ئـی وا هەیە بەرەنگـاری هەزاران شەڕ وشۆر دەبێ کەچی وەبەر نایە و ناکوژرێ. لە سـەر ئەو ئەساسـە خـودای تەعـالا ئایەتی ۱۶۹ دادەبەزێنێ تا کوو ئینسان بزانێ حاڵی ئەوانەی وا بۆ خودا دەکوژرێن:

وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ئالی عیمران
هەرگیز وا مەزانن ئەو کەسانەی کە وا لە ڕێگای خودادا دەکوژرێن، مردوون (وەک مەمانان) بەڵکوو زیندوون و لە لای پەروەردگاریانەوە ڕزق و ڕۆزییان دەدرێتێ.

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٦٩**

موسوڵمان بە پێی باوەڕێکی کە بە ئەرکـانی ئیسـلامیان هەیە و دەو باوەڕەشـیاندا ڕاسـتن، دەبێ بە فەرموودەکانی قورئان باوەڕ بکا و پابەندیشی بێ، دەنا باوەڕەکەی دەبێـتە درۆ و ئیهـانە. جا لە سەر ئەو ئەساسە قورئان دەفەرموێ: ئەوانەی وا دە ڕێگەی خودادا دەکوژرێن، هەرگیـز بە مردوو گومانیان مەکەن و پێ مەبەن، بەڵکە زیندوون و لە لای خودایـان ڕۆزییـان پـێ دەدرێ. واتە ئەو لەزەت و تام و ڕاحەتی و حەسانەوەی کە لە خواردن و خـواردنەوەی دنیـادا بە لەش و ڕوح دەگا، ئەوەش بە ڕوح و لەشی هەستەی شەهید دەگا.

لەوانەیە ئەدێرەدا یەکێک بڵێند بێ و ئەو پرسیارە بکـا: کە خـواردن و خـواردنەوە ڕیـنەوەی دەوێ؟ دەبێ لەو بارەوە چۆن فکر وەکەین کە دنیای پاش مەرگ خاوێنە و شتی وای ناکرێ لێ بێ. ئەوە ڕاستە، بەڵام پێشەکی دەبێ ئەوە بزانین قسـە لە کـاری خـودا نـاکرێ بەڵام دەبـێ ئەوە بدەینە بەر تیشکی ئەقـڵ و شـعوور، دار و دەوەن و گیـا و گـوڵ هەمـوو بـۆ بەقـای حەیاتیـان دەخۆنەوە و ڕینەوەشیان لێ دیاری نادا، زەوی دەخواتەوە و پیساییشی لێ چاو ناکرێ، هەزاران شتی دی.

**سەرنجێک:**

هەندێک لەو ئەفرادانەی پاش کارەسـاتی ئوحـود کە مـابوونەوە غەم و داخ و حەسرەتیـان دەخوارد بۆ ئەو خزم و کەس و دۆستانەیان کە کوژرابون، بەتایبەتی دە کاتی خۆشـیدا کە یـادی وانیان دەکرد کە ئەوانیش ئەگەر مابان وەک ئێمەیان لەزەت دەچاشـت لەو دنیـایەدا، بێ گومـان ئەو بیر و باوەڕ و خەیاڵە دە ڕوحـی وانـدا سسـت و لاوازی نیشـان دەدا، بەڵام ئەو ئـایەتە ئەو گومان و بیر و خەیاڵە کـاڵە دەسـڕێتەوە واتە دەفەرمـوێ: خەیـاڵ وا نەکەن ئەوانەی وا دە ڕێـی خودادا دەکوژرێن وەک ئەو خەڵکە مردوون، سڕ و مـات و دامـاو چـاو لە ڕێگـای دادگایـان، بەڵکە ئەوانە زیندوون واتە وەک زیندوو لەزەت و خۆشی دەنۆشن چاوەڕوانیشیان بەجێ گەیوە بە نیعمەت و لەزەتەکانی بەهەشتی و هەچی دڵیان بیهەوێ.

له بەرجەوەندی ئایەتی ﴿بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ چەند ئیحتیمال هەیە:

١. هەندێک نەزەریان وا داوە مەبەست لەو حەیاتە، حەیاتی ڕوحانییە کە شوهەدا لە دنیای بەرزەخدا دەیانبێ.

٢. دەستەیەکیش بە پێچەوانەی ئەو نەزەرە، نەزەریان داوە وەک دەڵێن: مەبەست لەو حەیاتە، حەیاتی جسمانییە، واتە شوهەدا لە دنیای بەرزەخدا بە پێچەوانەی مردووی غەیرە شەهیدن وانە وەک دنیا خاوەن جسم و زیندوون.

٣. هەندێکیش کوتوویانە: مەبەست بەو حەیاتەی کە شەهید هەیەتی لەولای، ئەوەیە: ڕۆژێک دێ ئەوانە زیندوو دەکرێنەوە، ئەو ڕۆژەش دنیای ئاخرەتە، بەڵام ئەو قەولەلاوازە، چونکە ئەو ڕۆژە هەموو عالەم زیندوو دەکرێتەوە، نەک تەنیا شەهید.

٤. دەستەیەکیش دەڵێن: مەبەست بەو حەیاتە ئەوەیە کە شەهید دە ناو قەبردا زیندوون و دەتوانن وەجووڵێن، جا بۆ عیبادەت بێ یا عادەت بێ، ئەو نەزەرش لاوازە؛ غەیری خاوەن نەزەر کەس پەسەندی ناکا، چونکە حەیاتی ناو گۆڕ وەک حەیاتی دنیا ناچێ، وەجووڵێ و ڕاپەڕێ.

**قەول:**

پەسەند و ڕەواکە قەولی جمهوورە، قەولی هەوەڵە کە حەیاتی ئایەتەکە مەبەستی پێ حەیاتی ڕوحانییە؛ دیارە ئەو حەیاتی کە شەهید هەیەتی دەگەڵ حەیاتی ڕوحی دیکە لێک جیاوازن، چونکە حەیاتی ڕوحی عالەمی شەهید زۆر لە سەرووی حەیاتی عالەمی دیکەیە، خولاسە حەیاتی عالەمی شەهید خودی حەیاتی حیسی نییە، بەڵکە حەیاتێکی ڕوحییە، بەڵام ڕابیتەی دەگەڵ لەشی دنیایی ڕابیتەیەکە کە ڕوحی عالەمی دیکەی ئینسان نییانە، کەوابێ لە سەر ئەو نییەتە دەبێ بکوترێ: فەرقی نێوان شەهید و عالەمی زیندوو وەک ئینسانی خەوتوو و بەخەبەر وایە، واتە عالەمی خەوتوو کە بڵێین شەهیدە خاون حەیاتە بەڵام بێ حەرەکە و جووڵانەوەیە، بەڵام ئینسان زیندوو خاوەنی حەیاتێکە کە دەشتوانێ وەجووڵێ بێر و بەوێدا.

گۆیا لە مێژوودا هەیە کە لە دەورانی معاویەدا بە دەستووری ئەو خەڵک ویستیان بیرێک لە قەراغی ئوحوددا لێدەن. کاتێ کە خەریکی هەڵقەندنی چاڵاوەکە بوون، لاقێکی نێژراو دۆزرایەوە، خوێنی پێوە بوو کە بە هۆی نووکی پاچ و پێمەڕە بریندار ببوو. ئەگەر تەماشایان کرد بە پێی نیشانە و عەلامەت کوتیان ئەوە لاقی حەزرەتی حەمزەیە کە لەو جێگایەدا نێژراوە. (تفسیر تبیین الفرقان، ٥١٨/٣)

هەندێکیش دەڵێن: دە ڕیوایەتی سەحیحدایە: ڕوحی شەهیدان ئەو هێزەی دراوەتێ کە بتوانێ بە شکڵی مەلێکی ڕەنگ سەوز و جوان لە بەهەشتدا بفڕێ بێر و بەوێدا.

**دڵ دەیهەوێ بە پوخت و پاراوی بزانێ ئایەتی (بل احیاء) یانی چی؟**

چونکە بە زاهیری ئەوانە مردوون بە مردوو دەژمێردرێن، بەو دەلیلە ڕوحی حەیاتی. کە تایبەتی دنیایە و پێی دەکوترێ زیندویی، لەوی وەرگیراوەتەوە و دە ڕیزی مردوواندا دێتە ژمار. جا لە سەر ئەو تەعبیراتە مانای "بل احیاء" بە پوختی هەزم ناکرێ. دەبێ چۆنی بۆ بچین و بەراوەرد کەین کە دڵ لە دڕدۆنگی و دوودڵی ڕزگار بێ؟

دەبێ دڵ و ئەقڵ و زانست و شعوور دێر و دەوێ بگیرێن و وەگەڕیان خەین بەڵکوو بتوانین لەو بارەوە قەناعەت بە دڵ بدەین و حەقیقەتیش وەدۆزین:

١. دەبێ ئەوە بزانین کە کافر و منافق مەسەلەی شەهیدانی ڕێگای خودا بە هیچ دەزانن و هەر وەک مردووی عادەتی سەیری دەکەن و لێی دەڕوانن، بۆ مەقام و شەئنی شەهید هیچ چەشنە ئیمتیازێک دانانێن؛ خودای تەعالاش هەڵوێستیان بە هۆی ئەو ئایەتی ١٦٩ پووچ دادەنێ و ڕەدی دەکاتەوە، بە تەئکید مەرگی شەهیدان بە مردن ناهێنێتە ژمار ئەگەرچی بە ڕواڵەت مەرگیشە، بەڵام شەهید لە کن خودای بەرز لە یەک ژیانی پڕ لە نیعمەت و خۆشیدا دەژین و بەهرەمەندن.

٢. مردنی هەموو کەس بە ئیعتیباری خۆشی و ناخۆشی وەک یەک نین و ناچن بەڵکە تەفاوەتیان هەیە. بۆ نموونە مردنی کافران و منافقان و موشریکان هێندە ترش و تاڵە باس ناکرێن، چونکە بە دایمە دە عەزابدان. مردنیان لە مردن خرابترە، وەک خودا فەرموویەتی دە ئایەتی ٧٤ی طەدا: ﴿إِنَّهُ مَن يَأْتِ رَبَّهُ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَى﴾ واتە کێ بە تاوانباری بێتە لای خودا، دۆزەخ جێی ئەوە، دەوێدا نە دەمرێ و نە دەژی. جاو بەو پێیە حەیاتی دوای مەرگی ئەوان کافران وەک مردنە، بەڵام حەیاتی خاوەن باوەڕان ئەگەرچی بە ڕواڵەت مەرگە، بەڵام حەیاتێکی پڕ لە ناز و نیعمەتە، حەتا هێندێک لە زانایان نەزەریان وا داوە: شەهید و ئەولیا و ئەنبیا مردنیان ئەو مردنەی بە خەیاڵی ئێمەدا دێ نییە، بەڵکە وەک مەرگ دەچێ بەڵام دە واقعیەتدا هەر وەک ئەسبابێکی لەو حەمبارەی وەگوێزی بۆ ئەو حەمبارەی وایە، واتە لە وڵاتی فانی بۆ وڵاتی باقی.

**ئاگاداری:**

لە سەر مەسئەلەی شەهید زانایان زۆر دواون و تەعبیراتیان زۆر لێداوە بەتایبەت لەو بارەوە ﴿بَلْ أَحْيَـاءٌ عِنـدَ رَبِّهِـمْ يُرْزَقُـونَ﴾ ئەو هەمـوو بۆچـوون و هەڵسـەنگاندنە و تەعبیـراتە لەوەڕا سەرچاوە دەگرێ: حەیـاتی بە خـواردن و بە خـواردنەوە پـاش حەیـاتی دنیـا، مەگەر لە ڕۆژی حەشر و نەشردا بێ دەنا دە عالەمی بەرزەخدا نەبیسراوە ببێ. بەڵام بێ ئاوڕدانەوە وەلای ئەوە کە خودا بەتوانایە دە هەموو عالەمێکـدا شـت پێـک بێنـێ بە هەر کەیفیەتێـک کە بـیهەوێ، دەبـێ ئەوانەی حەیاتی بە خواردن و خواردنەوەی پاش مردنی تەبیعی لەمەڕ شەهیدان بە دوور بـزانن، ئاوڕ وەلای ئەوەش بدەنەوە چۆن قسە لەوەی دەکەن حەزرەتی عیسا پاش هەزاران ساڵ نەمانی لە سەر زەوی هەر ماوە و دێتەوە خوار بۆ سەر زەوی و خۆ حاوانەوە تا وێسـتا لە کـوێ بـووە و چۆن ژیاوە بە لە شی ئینسانییەوە؟ وەک دەڵێین دە عالەمی ڕوحانیـدا نەبـێ؟! چـونکە هەرچـی دەڕواتە دەر لە عالەمی دنیا دەبێ بڵێین دەڕوا لە عالەمی لەش کە خواردن و خـواردنەوەیە، دەنـا لە عالەمی ڕوح ناڕواتە دەر، ڕوح هەر دەمێنێ دە عالەمی خۆیدا، چـۆنیەتی عـالەمی ڕۆحـیش خودا بۆخۆی دەزانێ.

بۆ ئیسباتی حاڵەتی حەیاتی ڕێز و ڕێزداری شەهیدانی ڕێی خودا لە ابن‌عباسـەوە نەقڵێـک نەقڵ دەکەین. ئەو حەزرەتە لە بابەت کەیفیەتی شەهیدان فەرموویەتی: إنَّ أَرواحَهُم في أَجـوافِ طَيرٍ خُفرٍ وَ إنَّها تَردُ أنهارَ الجَنَّة و تَأْكُلُ مِن ثِمارِها و تَسرَحُ حَيثُ شاءَتْ وَ تَأوَى إلى قَناديلَ مِن ذَهَبٍ تَحتَ الْعَرشِ فَلَمّا رَأَوْا طَيبَ مَسكَنِهم وَ مَطْعَمِهم وَ مَشْرَبِهم قالوا ياليَتَ قَومَنا يَعلَمونَ ما نَحنُ فيه مِنَ النِّعَمِ وَ ما وَضَعَ اللهُ بنا كَي تَرغَبوا في الْجِهادِ، فَقالَ اللهُ تَعالى أنا مُخـبِرٌ عَـنكُم و مُبلِغُ إخوانِكُم فَفَرِحوا بِذَلِكَ وَ اسْتَبشَروا فَأَنزَلَ اللهُ تَعالَى هٰذِهِ الْآيَةَ.

واتە: بێ‌گومان گیانی شەهیدان لە ناو بەتاڵایی مەلانی جوانی دندووک سەوزدان، کە ئەو مەلە سەوز و جوانانە بە جۆبارەکانی بەهەشتدا دێن و دەڕۆن، و لە میوەکانی بەهەشت دەخۆن، هەر کوێیەکیان پێ خۆش بێ دەتوانن بۆی بچن، و لە ناو قەندیلەکانی زێڕ و زیوی ژێر عەرشدا جێگا دەگرن. کاتێ کەیف و خۆشی و پاک و خـاوێنی و تەعـامی بەلەزەت وشـەڕابی ڕەوانـی خۆیـان لەوێ دی، دەڵـێن: ئەی خـۆزگە یـارانی ئـێمە ئەوەیـان دەزانـی کە ئـێمە لە چ نـاز و نیعمەتێکداین و خودا دەرحەق بە مە چها کەرەمی نیشان داوە، تاکوو یارانی مە مەیلیان ببایە بـۆ لای غەزا، خودای تەعالا پێیـان دەڵـێ: ئەمـن لە جیـاتی ئێـوە خەبەرداریـان دەکەم تـاکوو بەو

خەبەرە خۆشحاڵ بن و خۆشحاڵی بکەن. جا ئەو ئایەتە ١٦٩ی ئالی عیمران لەو بارەوە دابەزی. ابوالفتوح، تفسیر؛ ٢٤٣/٣.

گۆیا لە ابن‌مسعود پرسیار کراوە لەو ئایەتە، ئەویش لە وڵامدا فەرموویەتی: ئەمن لەو ئایەتەم پرسیار کرد و ئاوایان وڵام داومەوە: إنَّ الشُّهَداءَ عَلَى نَهرٍ بِبابِ الْجَنَّةِ في قُبَّةٍ خَضْراء ـ یان: في رَوضَةٍ خَضراء.

دووبارە لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا نەقڵ کراوە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: أَ لا اُبَشِّرُکَ أَنَّ أَباکَ حَیثُ اُصیبَ بِأُحُدٍ أَحیاهُ اللهُ ثُمَّ قالَ ما تُرِیدُ یا عَبدَ اللهِ بن عَمرٍو أَن أَفعَلَ بِکَ؟ فَقالَ: یا رَبِّ اُحِبُّ أَن تَرُدَّني الی الدُّنیا فَاقْتُلَ فیکَ مَرَّةً أُخْرَى.

لەو بارەوە ڕیوایەت گەیشتۆتە یەقین و کەس ئینکاری ناکرێ.

**ئاگاداری:**

سەیری ئەو بەڵگە و نیشانانە بکەین کە پێمان دەڵێن: ڕوح و گیان پاش جدا بوونەوەی لە لەشی مردوو ئەو هەر باقییە و زیندووییە.

ئایەتی ٨٩ی سوورەی واقعە:

**فَأَمَّا إِن كَانَ مِنَ الْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾**

**بەڵام ئەوەی نزیکی ئێمەیە و دەمرێ (٨٨) لە پاداشا دەسێتەوە و دەچێتە بەهەشتی پڕ لە خۆشی**

دیارە بە یاسا و ئادابی عیلمی نەحو پیتی «ف» هاواری ئەوەیەتی کە ڕوح و ریحان و بەهەشت بۆ پاش مەرگی لەشە.

فەرموودەی پێغەمبەر جگە لەو ئایەتە: «مَن ماتَ فَقَد قامَتْ قیامَتُهُ» واتە: کێ مرد، دێ قیامەتی. ئەو فەرموودەیە پێمان دەڵێ: روح و گیان نامرێ کاتێ کە لە لەش جودا بۆوە، قیامەتی ئەو دادێ. پیتی «ف» لە سەر «قد» شارەزامان دەکا وەلای ئەوەی کە قیامەت پاش مردنی لەشە. جگە لەوانەش گفت‌وگۆی پێغەمبەر لە ڕۆژی بەدردا دەگەڵ شەهیدەکانی ئەو ڕۆژە نیشانەیە لە سەر مانی ڕوح پاش مردنی لەش: «هَلْ وَجَدْتُم ما وَعَدَ رَبُّکُم حَقّاً» واتە دەستو کەوت ئەوەی خودا وەعدی پێ دابوون بە حەق؟! یارانی دەوری پێغەمبەر عەرزیان کرد ئەوانە مردوون، چۆن دەبیسن؟ پێغەمبەر فەرمووی: إِنَّهُم أَسمَعُ مِنْکُم: واتە ئەوانە لە ئێوە بیسەرترن. هەروا پێغەمبەر فەرمووی: «أَولیاءُ اللهِ لا یَموتونَ وَلٰکِنْ یُنقَلونَ مِنْ دارٍ إِلَی دارٍ» واتە دۆستانی خودا نامرن،

واتە بێهەست و شعوور نـابن، بەڵام بە جودابوونەوەیـان لە لەش لەو مـاڵەدا دەچـنە مـاڵێکی دیکە. ئەوانە هەموویان پێمان دەڵێن: ڕوح پاش مەرگی لەش باقییە.

لە سەر ئەساسی ئەو تەعبیراتانەی کە هەڵسەنگێندران و بەراوەرد کران، وا وێدەچێ عەزابی قەبر نەبێ و خۆشی قەبر نەبێ، بۆ ڕامالّدانی ئەو خەیاڵە هەنـدێک لە قورئانزانـان کوتوویـانە: ڕوحی شەهید زیندوون، هەموو شەوێ تا ڕۆژی قیامەت لە ژێر عەرشی خودادا ڕکووع و سژدە دەبەن بە دەلیلی فەرموودەی پێغەمبەر: إِذا نامَ الْعَبدُ في سُجودِهِ باهى اللـهُ بِـهِ مَلائِكَتَـهُ وَ يَقـولُ اُنظُروا الى عَبدي روحُهُ عِندي و جَسَـدُهُ في خِـدمَتي: کـاتێ بەنـدە لە سـەژدەیدا بنـوێ خـودا فرشتەکانی خۆی ئاگادار دەکا: بڕوانن لەو عەبدەی من، کە ڕوحی لە لای مـنە، و لەشیشـی لە خزمەت مندایە.

بە هەر حاڵ لە سەر شـەهید دەسـتەکوتە زۆر کـراوە، کـێ وازی لە زۆر زانیـنە لەو بـارەوە بڕوانێتە تەفسیری کەبیر، هەمان ئایەتی ١٦٩.

خودای تەعالا بە پێی حیکمەتی خۆی دەیهەوێ حاڵەتێکی دیکەی خۆشی و بەخـتەوەری شەهیدانی ڕێگای خودا بە دنیای ئینسان بناسێنێ، کە لە پاش چـوونە دەریـان لە دنیـا بە هـۆی شەهید بوونیان خودا پێیان دەبەخشێ. دیارە لە هەوەڵەوە واتە لە ئـایەتی ١٦٩دا خـودای تەعـالا خواردن و خواردنەوەی ڕزقی پێ بەخشین بە لەزەت و خۆشییەوە لە لای خـۆی کە فەرمـووی: ﴿بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ واتە ئەوانە (شەهیدان) زیندوون لە لای خودای خۆیان دەخۆن و دەخۆنەوە. ئەوجار کەیفخۆش و شادن بەوەی خـودای خۆیـان ئەو فەزڵ و نـیعمەتەی پـێ بەخشیون.

بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٧٠ی ئالی عیمـران، بـۆوەی بە پوخـت و پاراوی لە باسەکە تێبگەین:

**فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُواْ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلاَّ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٧٠﴾** ئالی عیمران

دڵیـان خۆشـە بەو چـاکەیە کە خـودا دەربـارەی کـردوون، شـادن بەوەش کە ئەوانەی وا نەگەیشتوونە ئەمان و بەجێ ماون، هیچ ترسێکیان لە سەر نابێ و هیچ خەمێکیان لە بەر نابێ.

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٧٠**

دەبێ بتوانین بە باوەڕەوە بڵێین: دنیای شەهیدی ڕێگای خودا کە ڕێگای ڕاستە، دەبێتە باخ و باخاتێک لە باخی بەهەشت، ئەوان کە خۆشحاڵن زیاتر بەوەی خۆشحاڵن کە خوای تەعالا بە گەورەیی و فەزڵی خۆی پێی بەخشیون و داوینێ و لێیان ناستێندرێتەوە و مژدەش دەدەن بەوانەی کە وا ئێستێ نەگەیشتوون شەهید کرێن و بەوان بگەن بەڵام چاوەڕوانن و دە نۆرەدان، مژدەی بێترسییان دەدەنێ و بێخەفەتین ئەوەی بە ئێمە دراوە ئێستێ بۆ ئەوانیش حازر و ئامادە کراوە. ئەو کەسانە ئەوانەن کە لە ئایەتی ٢٣ی سووڕەی ئەحزابدا باسی لە سەر کراوە:

**مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا**

**پیاوی وا هەیە لە ناو خاوەن باوەڕاندا ئەو پەیمانەی کە وا بە خودایان داوە پێکیان هێناوە، وەک ئەوانەی شەهید بوون و گیانیان بەخشیوە، و هەندێکیشیان چاوەڕوانن بۆ ئەو گیانبەخشینە دە پێناو وەعدی داویانە بە خودا، دە مقابیل ئەو گیانبەخشینەدا تۆزقاڵێکیشیان پەرۆشی نییە و سۆزی خۆیان ناگۆڕنەوە.**

**پاشەدۆیەک لەو بارەوە:**

شەهید دوو خۆشحاڵی زۆر بەرز و بێوێنەیان هەیە لە لایەن خوداوە:

١. خۆشحاڵی هەوەڵ ئەوەیە کە بە هۆی ئەو نیعمەتە زۆرانەی کە خودای مەزن لە سایەی بەخشندەگی خۆیەوە پێی داون شاد و ئەمینن.

٢. خۆشحاڵی دووهەمیان ئەوەیە کە بە هۆی مژدەیەکی خودا داویە بەو برا شەڕکەرانەیان ئەو نیعمەتەش بۆ وان هەیە و ئامادەیە.

شەهیدان پێ خۆشحاڵ دەبن بەوەی ئەو مزگێنییە خۆشەی بە برا شەڕکەرەکانیان لە دنیادا بگا، کە خودای تەعالا پێی داون بۆ وەی بێ ترس و بێ باکانە شەڕ دەگەڵ دوژمنانی خودا بە گەرمی پەرە پێ بدەن.

بە کوردی، شەهیدان دە خۆشی ئەوەیدان چ بۆ وان هەیە، ئەوەش بۆ برا شەڕکەرەکانیان هەیە. ئا ئەوەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی شەهید خەبەرداری حاڵ و ئەحواڵی برایانی خاوەن باوەڕی خۆیان هەن کە وێستا شەهید نەکراوە. بەڵکە هەر لە دنیادان خەریکی بەربەرەکانی لەگەڵ دوژمنانی خودان.

**فەرقی نێوان خەوف و حوزن:**

خەوف لە کاتی هاتنی بەڵا و ناڕەحەتیدا سواری دڵی ئینسان دەبێ، بەڵام حوزن لە کاتی لەدەس‌دانی شتی خۆشەویست و واقعبوونی بەڵایە دێ سواری دڵ دەبێ. بە کورتی، خەوف ترسی بەڵایەکە دە ڕێدایە بۆ لات، حوزن خەفەتی شتێکە هاتووە بە سەرتدا.

ئەوە کە شەهید ﴿لا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ن لە ئاخرەتدا نییانە حوزن و خۆف، ئی ئەوەیە نیعمەتانی ئاخرەت وەک نیعمەتی دنیا زەوالیان بە سەردا نایە تاکوو خەفەتی بۆ بخۆن، بە کورتی و بە کوردی، ئەنعامی دنیا نەمان و نەبوونی بە سەردا دێ بۆ خەم دەبێ، بەڵام ئەنعامی ئاخرەتی، نەمانی بە سەردا نایە چونکە عەتای خودایە، بۆ خەم نابێ.

خەوف بۆ بەڵای دانەهاتووە (مستقبل)، حوزن ڕابراوە (ماضي).

**بۆ ئاگاداری:**

ئەو کەسانەی کە دەو باوەڕەیدان پێش ئەوەی قیامەت دابێ، ئەوان زیندوون و لە لەزەتی خۆشیش بەشدارن، بۆ ئەو ئایەتە ١٧٠یەی تەعبیراتی دیکە دێننە ڕوو، وەک ئەوە:

١. هەندێک لە شەهیدان بە هەندێکیان دەڵێن: ئەو هاوڕێیانەی خۆمان، فڵان و فڵان کە لە سەفی شەڕدا بەجێمان هێشتوون و دە شەڕدا ماونەوە، ئەگەر خودا بخوازێ و حەز بکا بکوژرێن و لە نیعمەتی بۆ شەهیدان هەیە بۆ وانیش ببێ، وەک بۆ مە هەیە، دەبێ و سەر دەگرێ، وەک لە ئایەتی ﴿وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُواْ بِهِم﴾ ئەو مەبەستە فەهم دەکرێ.

٢. یا وەک ئەو تەعبیراتە: شەهیدان چونکە پاش داهاتنی قیامەت و ڕۆژی حەشر دەچنە ناو بەهەشت و دەوێدا لە لەزەت و خۆشییەکانی بەهەشتی بەهرەمەند دەبن، ئەو مەبەستە دەکا ئایەتی ﴿لَمْ يَلْحَقُواْ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ﴾ واتە شەهیدان شادن بەوەی کە ئەو هاواڵانەی وێستا نەهاتوونە لایان، بەڵکوو هەر دە شەڕدان لە دنیادا، بۆ وانیش بێ خەوف و خەمی هەیە، دە حاڵێکدا ئەوڕۆ لە قۆناغی مەدا نین چونکە ئێمە لە پێش واندا جێگای خۆمان لە بەهەشتدا دیوە و گرتووە، بۆ ڕاستی ئەو مەبەستەش ئایەتی ٩٥ی سوورەی نیساء دەگرینە بەر کە دەفەرموێ:

**لاَّ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلاًّ وَعَدَ اللّهُ الْحُسْنَى وَفَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا**

هەندێ لەو موسوڵمانانەی کە دانیشتوون و جیهاد ناکەن، کە ساغ وسەلیمن و بیانوویەکیان نییە، هەرگیز وەکوو ئەوانە نین کە بە ماڵ و گیانیان لە ڕێگای خودادا تێدەکۆشن، خودا

**ئەوانەی کە بە ماڵ و گیانیان خەباتیان کردووە، پلە و پایەی بەرز کردوونەتەوە بە سەر دانیشتوواندا، خودا موژدەی چاکەشی بە هەمووان داوە، خودا لە پاداشی گەورە و فراوانیشدا ئەوانەی کە بە ماڵ و گیان خەبات و جیهادیان کردووە پلەی بەرز کردوونەتەوە بە سەر خانەنشین و دانیشتووەکاندا.**

ئەو ئایەتە ئەوەمان پێ دەڵێ: شەهیدان بەوە دڵخۆشن کە چاو دەکەن شوێنی موئمینان و ئەو نیعمەتانەی کە بۆیان داندراوە لە بەهەشتدا و چاوەڕوانی ڕۆژی پێکەوەبوون، ئەو گوفتارە پەسەندی ابومسلم بحر اصفهانی و زجاجیە. تفسیر کبیر، هەمان ئایەت.

دووبارە لە بابەت ڕێزداری لە شەهید لە لایەن خوداوە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٧١ی ئالی عیمران:

**يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ اللّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٧١﴾** ئالی عیمران
**شادمانن بەو ناز و نیعمەت و زیادە بەخشینەی کە لە لای خوداوە پێیان دراوە، بەوەش کە خودا هەرگیز پاداشی بڕواداران ون ناکات.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٧١**

مزگێنیبەخش و خۆشحاڵن شەهیدان لە ڕۆژی قیامەتا بەو پاداشە گەورەیەی کە خودای تەعالا پێی داون لەو هەموو فەزڵ و نیعمەتە بێ سنوور و بێگومانەی خودا، دیارە خودا پاداشی بڕواداران بە زایە نادات.

دەبێ بڵێین: شەهید لە دوو لای دیکەوە شاد و بەختەوەرن:

١. لەو بارەوە خۆشحاڵن کە خودای تەعالا بۆ هەچی خاوەن ئیمان و باوەڕە نیعمەتی بەهەشتی داناوە و پێیانی بەخشیوە، و هەروا خودا بە خاتری فەزڵی خۆی و دروستکاری شەهیدان ئەو نیعمەتانە دووبارە و زیاد دەکا.

٢. لەو بارەوە شەهید کە دەبینێ خودا پاداشی خاوەن باوەڕان بە زایە نادا، و بەتایبەت پاداشی شەهیدان و موجاهیدان و ڕاستان ئەوەندەی دیش شاد و مەسروورن.

جگە لەوانەش وشەکانی نیعمەت و فەزڵ دە ئایەتەکەدا بە موبهەمی هاتوون، و هەر وا وشەی «ڕزق» لە ئایەتی ١٦٩دا هەر بە موبهەمی هاتووە بۆ وەی گوێبیسی هەر جۆر بێ بیهەوێ: ئەو سێ وشانە تەعبیر کات. جا لە سەر ئەو تەعبیرات و بەرجەوەندییە ئەو سێ

ئایەتانەی ۱٦٩، ۱٧٠ و ۱٧۱ بەیانی سێ شتی گەورە دەکەن:

۱. ئەجری موئمینان

۲. پاداش و ڕزقی خۆیان لە لای خودا وەردەگرن

۳. ئەو ڕزقەی وەریدەگرن نیعمەت و فەزڵی خودایە

٤. لەتایبەتی ئەو ڕزقەیە کە زەواڵ و فەنای بە سەردا نایە و هەر خەوف و خەمیشـی دەگەڵ تێکەڵاو نییە و نابێ، چونکە ڕزقی بێ خەم کەمە، بەڵام ئەوە چـونکە ڕزقـی قیـامەتە بـێخەم و خەفەتە.

دیارە هەر وەک ئاشکرا و ڕوونە دوو بەشارەت هەیە دەو ئایەتی ۱٧٠ و ۱٧۱دا:

۱. بەشـارەتی هەوەڵ ئـی ئەوەیە کە دڵشـاد و خۆشـحاڵن بەوەی کە مزگێنییـان پـێ دراوە بەوەی ئەوانەی بە شـوێنیاندا دێـن ئەوانـیش خـاوەنی ئەو نیعمەتـانەن کە دراوە بە ئێـوە، ئەوە بەشارەتی ئایەتی ۱٧٠ە.

۲. بەشـارەتی دوو کە تـایبەتی خۆیـانە و دە ئـایەتی ۱٧۱دایە، مـژدەیە بەو نیعمەتـانەی کە ڕاستەوخۆ لە خوداوە پێیان دەدرێ.

دیارە بەشارەتی هاوەڵانیان بە نیعمەت وەک لە ئایەتەکەڕا دەردەکەوێ تەواوترە لە بەشارەتی تایبەتی خۆیان، چونکە ئەرکی ئیماندارانە خۆشحاڵی برادەرانی موسوڵمانیان بێـتە جـێ دەگەڵ ئی خۆیان.

بە کورتی و بە کوردی، دڵشادی شەهید لە دوو ڕێگاوە سەرچاوە دەگرێ:

۱. خۆیان بە شەڕەفی شەهادەت پاداشتی شەهادەت دەگەن،

۲. خەبەردار دەکرێن بەوەی براکانیشیان بە مەقامی شەهادەت دەگەن لە داهـاتوودا و دێـنە لایان.



بە پێی بەراوەرد و هەڵسەنگاندنی ئایەتەکان ئەوە بە ئاشکرایی دەرکەوت کە خـوای تەعـالا خاوەن باوەڕانی بـۆ شـەڕ و جیهـاد و بەرەبەرکـانی دوژمنـانی دیـن و خـودا دەعـوەت دەکـا و شەوقێکی زۆریان دەخاتە ناو دڵ و دەروونیانەوە. بە فەزڵ و عەزەمەتی پلە و مەقامی شەهادەت زۆر لە دەوری ئەو شـتە دەدرێ خـودا کە سـەر دەکێشـێتە ئـازایەتی و خـۆ بە شـەهید دان و خۆڕاگری دە بەرابەر شەڕ و بەربەرەکانیدا، بـۆ ئیسـباتی ئەو ڕاسـتییە دەچیـنە خـزمەت ئـایەتی

۱۷۲ی ئالی عیمران بۆ تێگەیشتن لەو بارەوە:

**الَّذِينَ اسْتَجَابُواْ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ مِن بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ لِلَّذِينَ أَحْسَنُواْ مِنْهُمْ وَاتَّقَواْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾** ئالی عیمران

**ئەو بڕوادارانەی کە وا لە پاش بریندار بوونیشیان وڵامی خودا و پێغەمبەریان دایەوە، بۆ ئەوانەشیان کە وا چاک و پارێزگار بوون، پاداشێکی گەورە هەیە.**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ۱۷۲

ئەوانەی وڵامی خودا وپێغەمبەریان بە دڵ و بە ڕاست دایەوە، پاش ئەوەی کە تووشی برینداری و ڕەنج و عەزابێکی سەخت و گران بوون و هەر وا بۆ ئەوانەش کە چاک و پاکی و ڕاستییان نیشان داوە لەوان و خۆپارێزن، بۆ گشت ئەوانە پاداشی زۆر گەورە لە لای خودا هەیە.

شەڕی ئوحود کە لە ڕۆژی شەممە ۷ی شەواڵی ساڵی سێی کۆچی ڕووی داوە، لە هێرش و هەڵمەتی یەکەمدا موسوڵمانەکان پیرۆزی و سەرکەوتنێکی بەرچاویان لە خۆ نیشان دا، بەڵام بە داخەوە چەرخ سوورا بە هۆی خۆشەویستی ماڵی دنیا بۆ هەلی دووهەم ئەو پیرۆزییە نەهاتەوە ڕێ بەڵکوو گورز و هەل کەوتە دەست دوژمنان وەک بتپەرستان بن، ئەوە کرا کرا، بەڵام هەر وەک نیشانی داوە خولی گەردوون هەر کاتەی خولەکانی بە قازانجی لایەک دەگەڕێ، بۆ هەڵمەتی سێ بە هۆی هیمەتی پێغەمبەر و یارانی پاکی ئەو خۆ کۆکردنەوە و گوێ بە فەرمان و لە خۆبوردووانە لە دەوری پێغەمبەر کۆوە بوون و بۆ هێرش بردنە سەر کافران، ئەوە بوو کە زۆر بە گوڕەوە پەلاماریان دا و کافریان ڕاو نان و بەرەو مەککە هەڵاتن و ڕایانکرد لە ترسی ئەو هێرشە بەگوڕەی یارانی ئیسلام.

پێغەمبەر ئە دەو کاتەدا هەواڵی گەڕانەوەی ئەبوسوفیان و لەشکرەکەی بۆ هات و پێی گەیی، ئەوجار لە لایەن پێغەمبەرەوە بانگەواز بڵاو کرایەوە کە هەچی ئەفرادی لەشکری ئیسلامە بێن کۆوە بن، تاکوو وەدوای لەشکری بتپەرستان بکەوین. ئەوجار بە دەستووری حەزرەت ئەو ۶۰۰ نەفەرەی کە لە شەڕی ئوحوددا دە خزمەت حەزرەتدا بوون دەگەڵ پێغەمبەر کەوتن بە شوێن لەشکری شکستخوردەی ئەبوسوفیان کە بەرەو مەککە ڕایانکردبوو، هاتن تاکوو گەیشتە ئەو شوێنەی کە ناوی «حمراء الاسد»ە، لەوێ باروبنەی دایە زەوی بۆ پشوودان. جا لەوێ مەعبەدی خەزاعی کە کابرایەکی بێلایەن بوو هاتە خزمەت پێغەمبەری و نیگەرانی خۆی نیشان دا. پێغەمبەر پرسیاری لێ کرد کە بۆ کوێ دەچی؟ لە وڵامی پێغەمبەردا گوتی: بۆ مەککە دەچم.

پێغەمبەر ئەوجار پێی کوت: جا ئەگەر دە ڕێیەدا ئەبوسوفیانت چاو کرد و دیتت، پێی بڵێ وا پێغەمبەر بە لەشکرێکی یەکجار زۆر و زەوەند لە ڕێگەدا بۆ ئێوە وەستاون لە شوێنێک بە ناوی «روحا». ئەو پیاوەی سەفەرچی بە ناوی مەعبەدی خەزاعی لە ڕێیەدا گەیشت بە ئەبوسوفیان و ئەبوسوفیانیش لێی پرسی: لە کوێڕا دێی و بۆ کوێ دەچی و کێت دی دە ڕێیەدا؟ مەعبەد لە وڵامدا کوتی: لەولایەڕا دێم و بۆ لای مەککە دەچم، ئەمما محەممەدم دی کە بە لەشکرێکی یەکجار زۆرەوە لە ڕێگاتان وێستاوە، وا دیارە ئەوانەی کە لە شەڕی ئوحوددا دەگەڵی نەبوون ئەوانیش دەگەڵ بوون. ئەبوسوفیانکە ئەوەی لەو کابرایە بیست و بەقاشی پێ کرد، فەرمانی دەرکرد کە بە توندی بەرەو مەککە بگەڕێنەوە دەنا لەوانەیە ها بەو زووانە بگەنە سەرمان و بە گژماندا بێن. زۆر بە توورەیی و ڕق هەڵستاوی و نەیاوێرینێ. ئەدێرەدایە کە خودای ئاگادار بە سەر هەرچی هەیە و نییە، ئەو ئایەتەی ١٧٢ی دابەزاند بە مزگێنی بۆ ئەو هاوڕێیانەی دە خزمەت پێغەمبەردا بوون کە لە پاش ئەو هەم و ناڕەحەتی و برینداربوونەیان بە فەرمانی پێغەمبەر بۆ بەرەنگار بوونەوەی دوژمن بەرەو پیری بانگەوازی پێغەمبەر هاتوون و ئامادەگی خۆیان نیشان دا.

وەک خودا دەفەرموێ: ئەوانەی بە پیر بانگەوازی خودا و پێغەمبەرەوە چوون و فەرمانیان بەجێ هێناوە، پاش ئەوەی کە تووشی ئازار و برینداری بوون، و بۆ ئەوانەی لەوان چاکەیان کردووە و خۆپارێزن، پاداشی گەورە هەیە لە لای خودای بێهاوتا.

**پاشەدۆ:**

ناوبردنی خودا و پێغەمبەر دە ئایەتی ١٧٢دا ئاماژەیە وەلای ئەوەی هەندێک لە موسوڵمانان دە شەڕی ئوحوددا بێ ئەمری خودایان کرد وەک هەڵاتن و پشت دە شەڕ کردن، و هەم بێ ئەمری پێغەمبەریان کرد وەک چۆڵ کردنی سەنگەرەکانیان؛ بەڵام ئێستێ کە پێغەمبەر بانگیان دەکا بۆ پەیسەر گرتنی موشریکان و بە قسەی پێغەمبەرەوە دێن و ئیتاعە لە پێغەمبەر دەکەن دیارە ئەو بە قسە کردنە و ئیتاعە کردنە، ئیتاعەیە لە خودا و ڕەسووڵی خودا، بە فەرمانبەری خودا و ڕەسووڵ دەژمێردرێن دە حاڵێکدا ئەوانەی کە قبووڵی دەعوەتی پێغەمبەریان دوو دەستە بوون:

١. دەستەیەکیان بە ئیخلاس و بە دڵ و باوەڕێکی تەواوەوە ئیتاعەیان نیشان دا

٢. دەستەی دووهەمیان بە زاهیری قبووڵی فەرمانی پێغەمبەریان کرد و بە دەنگیەوە هاتن ئەمما لە ناو دڵدا خاڵی لە تەقوا و ئیحسان دەهاتنە بەر نەزەر.



خودای تەبارە و تەعالا دەیهەوێ زیاتر شەهامەت و فیداکاری شەڕکەرانی ئیسلام بناسێنێ، کە لە ئەوجی ساغ و پاک و چاک و چالاکن بۆ بەرز ڕاگرتنی ئالای ئیسلام بێباک لە هەچی ترس و غەم و حوزنێکن و گوفتار و قسە و تەگبیری هیچ کەس توانایی ئەوانەیان نییە لە ڕاستیاندا ئەسەر دانێ و لە ئیرادەی خۆیان پاشەکشەیان پێ بکا و یا شلیان کاتەوە. بەڵکە هەرچی پێغەمبەری ڕێبەریان پێیان بڵێ هەر ئەوە دەبیسن و بەس، جا بۆ ڕاستی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٧٣ی ئالی عیمران، بۆوەی بە تێر و تەسەلی تێبگەین لە باسەکە:

**الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ** ﴿١٧٣﴾ ئالی عیمران

**ئەوانەی کە خەڵک ترسی وەبەر دەنان و پێی دەکوتن: بێگومان خەڵک لە دژتان کۆ بوونەتەوە کەوابێ لێیان بترسێن. هەر باوەڕیان لە سەر مەبەستی خۆیان بەهێزتر دەبوو، دەشیانکوت: تەنیا خودامان بەسە کە چاکترین بریکارە.**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٧٣

ئەو ئایەتە هۆیەکەی لە بەدری بچووکەوە دابەزیوە ئەوەیە: ئەوانە کە خەڵکانی دژ بە ئیسلام دەهاتن بۆ فزوولی پێیان دەکوتن بێگومان بن خەڵکێکی زۆری بۆ کۆ بۆتەوە بۆ وەی بە گژودا بێن و لەناوتان بەرن، وێستاش ئێمە پەشیمانن پێتان دەڵێین ئەو خەڵکە بە کەم مەگرن و لێیان بترسێن و خۆیان لە قەرە مەدەن تا هەلو بۆ دەرەخسێ، ئەو کەڕەتە خۆیان لێ بە دوور بگرن، کەچی بە هۆی ئەو ئیمان و باوەڕیەی کە لە ناو دڵی پاکیاندا زەمزەی دەکرد، بەو قسەی فڕ و فیشاڵانە ئیمانیان زیاتر دەبوو زیاتر هورەیان بەرز دەبۆوە، لە وڵامی ئەو خەیانەتکارانەدا دەیانگوت: خودا بۆ ئێمە کافییە، ئێمە باکمان لە هیچ کەس نییە و لە زۆر و کەمی دوژمن بێباکین. ئەدێرەدایە کە پێغەمبەر هاوڕێکانی هاوار کرد و بانگی کردن بۆ ڕووبەڕوو بوون و بەرەنگاری دوژمنی ئیسلام، وەک ئەبوسوفیان بێ، هاتن دەوری پێغەمبەریان گرت و فیداکاری خۆیان نیشان دا، هەر دەو کاتە ناسک و حەساسەدا دوو کاروان گەیشتە مەدینە بە سەرکردایەتی عبدالقیس و نعیم کوڕی مسعود، کە لە لایەن ئەبوسوفیانەوە بە کرێ گیرابوون کە بێن پێغەمبەر و یارانی لە شەڕ شل کەنەوە و هەڵوێستیان پووچەڵ کەنەوە. عبدالقیس قەولی بارە مێوژێکی پێ درابوو، نعیم کوڕی مسعودیش قەولی ١٠ وشتری پێ درابوو کە لە ناو موسوڵمانەکان ترس و

دڵەڕاوکە و پڕوپاگەندە بڵاو کەنەوە. دە حاڵێکدا هەستی پاکی پێغەمبەر و یارانی ئەو هەر لەڕێوە هەستی سیخوڕی ناپاکی ئەو دوو کەسانەیان کردن، جا جگە لەوانەش بۆ قایم و قۆڵی ئیرادەی پاکی شەڕکەرانی ئیسلام خودای ئاگادار بە دەروونی پاک و ناپاکان هەر لە سەر بۆچوون و زمانی ئەوانە بە ئایەتە پیرۆزەی ١٧٣ ئالی عیمران خەبەری بە پێغەمبەر دا و فەرمووی: ئەوانەی کە عبدالقیس و نعیم کوڕی مسعود پێی ڕاگەیاندن واتە کە بەڕاستی خەڵک بۆتان وەکۆ بوون و زۆرن و لێیان بترسێن و بە کەمیان مەگرن و دەرەقەتیان نایەن، بەڵام هێز و تێز و پێزی ئیمانی بەڕاستی یارانی محەمەد زۆر لەوە بەرز و بڵندتر بوو تیری نامەردان بیگاتێ. هورە و بڕوا و ئیمانیان وەک تیخ تیژ بەو فڕ و فیشاڵانەوە هەڵبڕاوە، لە وڵامی ئەو پۆلە خەیانەتکارانەدا کوتیان: خودا بۆ ئێمە کافییە و بەس، و باشترین پشتیوانمانە. جا بۆ دڵخۆشی بڕواداران لە بەدری چکۆلەدا ئەو ئایەتی ١٧٤ دابەزی کە لەوە بەدوا باسی لە سەر دەکەین.

**تیوتیوەیەک لێرەدا:**

دەستەی هەوەڵ کە داپۆشراوی فەزڵ و بەرەکەتی باری بوون خودا جگە لەوەی سەنایان دەکا و بە باشیان دەناسێنێ، «ناس»ی هەوەڵ ئاماژەیە وەلای جاسووسانی موشریک ومنافقان وەک عبدالقیس و نعیم کوڕی مسعود بن. «ناس»ی دووهەم دە ئایەتەکەدا ئاماژەیە وەلای دوژمنانی ڕاستەوخۆی ئیسلام کە بە دژی موسوڵمانان لەشکرکێشییان دەکرد بۆ سەر ئیسلام، بەڵام کاتێ کە جاسووسەکانی قورەیش و منافقان یارانی ئیسلامیان بە زۆری لەشکری وان ترس وەبەر دەنان دە مقابیلدا ئەوان هورە و باوەڕیان پێ زیاد دەبوو و هەڵدەبڕاوە، ئەو هەڵبڕانەوە و زیاد بوونە ئیمانەیان هەڵگری دوو مانا و پەیامە:

١. سرشت و ئینسان و تەبیعەت ئەوەی یاسایە: کاتێ کەسێکی باوەڕ پێنەکراو نەهی کارێکت لێ بکا، و یا دەستووری کارێکت پێ بدا بە پێچەوانەی ئەمر و نەهی ئەو هەست و ئەقڵ و شعوور حەرەکەت دەکا و ڕادەپەڕێ.

٢. لەو لایەشەوە یارانی ئیسلام هەچی لە لایەن وەحی ئاسمانی بە پێغەمبەر درابوو هەمووی ڕاست و دروست هاتبوونە جێ، بێ کەم و کوڕی. ئائەوە بۆوەی دەبێ ئیمان و هیوا و هومێد هەر زیاد بێ، هەر ئەوەش بوو هۆ کە لە وڵامی جاسووساندا کوتیان یارانی ئیسلام: خودا کافییە بۆ ئێمە و چاترین وەکیلە بۆمان. خۆ دیارە ئەوەش یاسایە: کە ژیان نیازمەندی دوو جۆرە ئەسبابە: ١. ئەسبابی سرشتی ٢. ئەسبابی ڕوحی. کاتێ ئەسبابی تەبیعی هات بگا بە

هەدەف پێویستە ئەسبابی ڕوحی پشتی بگرێ، واتە تەوەکول وەگەڕ خا.

**پاشەدۆ:**

ئایەتی ﴿إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ﴾ مەبەستی پێناسی ئەبوسوفیان و هاوالانی و ئەمیرانی لەشکری ئەون. ئایەتی ﴿قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ﴾ واتە (جَمَعُواْ لَكُمْ الجموع)، جموع کە دەبێتە مەفعوول، لابراوە.

ئایەتی ﴿فَاخْشَوْهُمْ﴾ واتە تاکوو لەشکری ئیسلام ترسیان بەرکەوێ و شل و سست بنەوە لە شەڕ کردندا. بەڵام دێرەدا دەرکەوت کە حەول و تێکۆشانی خائینان سەری نەگرت و پووچەڵ کرایەوە و مایەی بۆ دانەندرا. جا بۆ ڕاست بەتاڵ بوونەوەی هەڵوێستی جاسووسان خودا خەبەری دا بەو ئایەتە ﴿فَزَادَهُمْ إِيمَاناً﴾ واتە ئیمان و باوەڕی یارانی ئیسلام بە پێچەوانەی هەڵوێستی وان، هەڵوێست و ئیرادەیان لە سەر شەڕ و بەربەرەکانی زیاد بوو.

بە کوردی، وتاری خائینان بوو بە باعیسی زیادی ئیمان و باوەڕی یارانی ئیسلام.

**سووکە ئاوڕێک دێرەدا:**

ئەو بەسەرهاتە بە زاهیری ئاماژەی تەواوە وەلای ئەوەی هەموو شت دە حەواڵەی قەزا وقەدەردایە، بەو دەلیلە: کە لە ڕۆژی هەرای ئوحوددا موسوڵمانان شکستیان خوارد، شکست خواردووش بە پێی یاسای شەڕ دەبێ ترسی ڕێنیشێ و هەڵێ، دە حاڵێکدا کار بە پێچەوانە هاتە ڕوو، واتە شکست خواردوو کە لەشکری ئیسلام بوو ترسی نەما و لاچو غیرەت و شەهامەت و هورەی بەرزی بە خۆوە گرت، دوژمنانی ئیسلام کە دەبا بە غیرەت بن چون سەرکەوتوو بوون، کەچی دڵەڕاوکە و ترسەنۆکی دڵی داگرتن و هەڵاتن. ئا ئەو بەسەرهاتە چاوەڕوان نەکراوە ئەوەمان پێ دەڵێ: هەچی هەیە لە ژێر ڕکێفی قەزا و قەدەری خودادایە، هەر ئەوەشە کە دڵی یارانی بەو هەستە و هەستان و کوتیان: ﴿وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ بەسە بۆ مە و چاترین پارێزەری ئێمەیە.



با سەیرێک لەوە بکەین و ئاوڕی وەسەر دەین کە کارەسات و ئەوزاع و ئەحواڵی موسوڵمانان چۆناوچۆن کەوتە ژێر سایەی تەوەجوهات و کەرەمی خودای تەعالا لووتکەی پیرۆزی و بەختەوەری گرت و ستاندی، بەبێ ئازار و ئەزیەت و زەرەر و زیان، بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٧٤ی ئالی عیمران، تاکوو لەو ئایەتە پیرۆزە پاراو و تێر بین:

فَـانقَلَبُواْ بِنِعْمَـةٍ مِّـنَ اللّهِ وَفَضْـلٍ لَّـمْ يَمْسَسْـهُمْ سُـوءٌ وَاتَّبَعُـواْ رِضْـوَانَ اللّهِ وَاللّهُ ذُو فَضْـلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ ئالی عیمران

**سەرەنجام بە نیعمەت و بەخششـی خـودا وەگەڕانەوە لە هەمـان کاتیشـدا هـیچ جـۆرە زەرەر و زیانێکیان پێ نەگەیشت، شوێن ڕەزامەندی خودا کەوتبوون خوداش خـاوەن بەخشـینێکی زۆر گەورەیە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٧٤**

جا لە ئاکـامی جێبەجـێ کردنـی فەرمـانی خـودا گەڕانەوە لەو سـەفەرە حەسـاس و پـڕ مەترسییە بە نیعمەت و حورمەت و ڕێزەوە لە لایەن خودای تەوانای ڕاست وەعـدە و تـووش بە تووشی هیچ ڕەنج و دەرد و ناخۆشی نەبوون و نەهاتن. چونکە وەدوای کەسبی ڕەزایەتی خودا کەوتبوون، دیارە خوداش خاوەنی بەهرەی زۆر گەورەیە.

لە بەدری بچووکدا وەک زاندراوە ئەبوسوفیان بە پێچەوانەی قسەی ئوحودی، ئامادەیشـەڕ نەبوو و نەیتوانی و دە خـۆی ڕانەدی خـۆی لە قەرەی پێغەمـبەر بـدا و خـۆ بنـوێنێ، ئەوە بـوو موسوڵمانەکان بەوپەڕی کەرامەت و سەربەزی بەرەو مەدینە گەڕانەوە. جـا ئەدێـرەدا دەرحەقـی بەدکاری عبدالقیس و نعیم کـوڕی مسـعود، ئەو ئـایەتی ١٧٥ی ئـالی عیمـران کە لەوە بەدوا بە خزمەتی دەگەین دابەزی و هاتە خوارێ.

**بە کوردی و بە کورتی،** سەرەنجام بەرهەمـی کاریـان گەڕانەوەی پـڕ لە نـیعمەت و فەزڵ و بەرەکەتی خودا بوو، بەبێ ڕەنج و ناڕەحەتی و ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی دوژمن کار سەری گرت و دوژمن هەڵات و سەرشۆڕی وەخۆ گرت، دەبێ بڵێین یارانی ئیسلام ڕەزایەتـی خودایـان بـێ چەرمەسەرە و دەردیسەری وەدەست هێنا، چونکە ڕاست و چاک و پاکانە و خالیسانە ئیتاعەی ئەمری خودایان کرد، خوداش ڕازاندنیەوە بە زینەتی فەزڵ و کەرەم و ئەنعام.

**ئاگاداری:**

وەک دەگێڕنەوە ژنانی مەککە کاتێ ئەبوسوفیان و لەشـکرەکەی چـاو دەکەن دەیانـدەنە بەر ڕەهێڵەی تانە و تەوس و پلاران بە مەسخەرە پێیان دەڵێن: ئەوە وا دیارە هەڵاتن و سەرشـۆڕیو بە سەر خۆڕاگری پەسەند کردوە! ئەو ناوە مبارەکەشو لە خۆ زیاد کردووە: «جیش السـویق»، واتە پەست و خوێڕی. سەویق بە گەنمە کوتراو دەکوترێ. پێیان دەکوتن بە تـانە: ئایـا بـۆ خـواردنی سەویق چووبوون خواردو؟ خۆش بوو؟ تێرو خوارد جا گەڕانەوە؟ یا هەر بۆوەی چوون بـزانن

ئاردی سەویقی لێیە؟

بەدری چکۆلە شوێنی معامەلە و تیجارەتی عەرەبان و بازاڕچەیەکی کاتی بوو، موسوڵمانان چەند ڕۆژێک لەوێ مانەوە و بڕێکیان شت کڕی و پاشان بە سڵامەتی بەرەو مەدینە گەڕانەوە.

مەبەست بە نیعمەتی ناو ئایەتەکە، وا دیارە نیعمەتی دنیایی بێ، بەڵام مەبەست بە فەزڵی ناو ئایەتەکە فەزڵ و بەرەکەتی ئاخرەتە. تفسیر کبیر، ج ١٠١/٤.

جوملەی ﴿لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ﴾ واتە تووشی شەڕ و بریندار بوون نەهاتن. جوملەی ﴿وَاتَّبَعُواْ رِضْوَانَ اللَّهِ﴾ واتە لە وەشوێن کەوتنی پێغەمبەر و ئیتاعەی باری تەعالا، جوملەی ﴿وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ﴾ واتە خودای خاوەن فەزڵی گەورە، گەورەیی پێ دان.

ئەوجار خودای تەعالا کە دوژمنانی دین و ئایینی لە دنیادا مۆڵەت نەداون و ناساندوونی بە عالەم، لە سەر ئەو یاسا ڕەوا و ڕەوانە دەیهەوێ خودا ئەو خائینانەی کە لە لایەن کافرانەوە قبووڵی ئەوەیان کردبوو کە بێن لە ناو لەشکری ئیسلام لاوازی و دوودڵی و سستی بخەنە ناو دڵی موسوڵمانانەوە، وەک عبدالقیس و نعیم کوڕی مسعود بن، بیانناسێنێ و بیانوێنێ تاکوو خائینانی دین و ئینسان ئەوە بزانن ئەگەر لە عالەمیش خۆ ون کا خائین لە کن خودا ناتوانێ خۆ وەشارێ، خودا دەیناسێنێ، جا بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٧٥ی ئالی عیمران، تاکوو بە تێر و تەسەلی لەو بارەوە تێبگەین:

إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾ ئالی عیمران

**لەڕاستیدا ئەوە شەیتانە و گەرەکیە ئێوە لە هاودەستانی خۆی بترسێنێ، ئێوە لەوان ترسو نەبێ، و ئەگەر بڕوادارن دەبێ هەر تەنیا لە من بترسن.**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٧٥

ئەی ئیمانداران! ئەوە بزانن بەبێ گومان عبدالقیس و نعیم کوڕی مسعود کە وا شەیتانن هاتوون بە شەیتانی بتانترسێنن لە هاوڕێیەکانی خۆیان، نەچن لە پڕوپاگەندەی ئەوان بترسن و باکو بێ، چونکە ئەوانە هیچ نین، بێ ئەرزش و بێ مایەن، لە من بترسێن ئەگەر بڕوادارن، چونکە هەچی بکرێ بە من دەکرێ و لە ژێر ئیرادەی مندایە هەموو شت.

ورد با سەیر بکرێ دێرەدا کە ئەو ئایەتە ١٧٥ وشەی «شەیتان»ی بە سەر ئینسانیدا دەبڕێ واتە ئەوانەی کە موسوڵمانان بترسێنن لە کافرانی قوڕەیشی و هەروا ئەوانەی شوێن ئەوانیش

دەکەون هەر وەک وان شەیتانن. خاوەن بـاوەڕانی ڕاسـتین هەرگیـز نـاچنە ژێـر بـاری وان و بە قسەی وانیش هەڵوێستی خۆیان ناگۆڕن. بەو دەلـیلە خـاوەن ئـیمان بە پێـی ئەساسـی ئیمانـی دەگەڵ ترس لە غەیری خودا نایەتەوە و ناگونجێ. چونکە لە کوێ ئیمان خۆ نیشان دا، غیـرەت و تواناییشی دەگەڵە، کاتێ خودا پشتیوانی کەسێ بێ، هێز و توانای ئەو کەسـە هـیچ هێزێکـی دیکەی غەیرە خودایی ناتوانێ خۆی لە قەرە دا و بترسێنێ.

**ئاگاداری:**

ئەولیای کافران واتە دۆستانی بێباوەڕان لەوە بەدوورن بتوانن ئەولیای خودا بترسێنن، دیارە ئەو ترس وەبەرنانە کار و پیشەی شەیتانانە ئەوەن شەیتانی ئینس واتە بە ڕوخسـار ئینسـان و بە ئاکار شەیتان، ئەوانە تا بەرەی ئینسان هەبێ لە دنیادا، بۆ ئازمایش ئەوانەش هەر دەبن.

هەر وەک ئاشکرایە دە پێشدا خودای تەعالا موسوڵمانان ئاگادار دەکاتەوە کە لە چاو و ڕاو ترس وەبەر نانی کافران مەترسێن و باکو نەبێ، کێ بەڕاستی ئەهلی ئیمان و بـاوەڕ بـێ، هەر لە خودای بەتوانا باکی دەبێ، لە ئینسان بەتایبەت ئینسانی خۆفرۆش و خۆنەناس ناترسێ و بـاکی نـابێ، ئەگەرچـی موسـوڵمانانی کـاڵ و نـاپوختە وا هەیە فریـوی چـاو و ڕاو و پڕوپاگەنـدەی شەیتانیان دەبێ، بەڵام نابێ هەڵوێستی ئەو لاواز و سادەدڵانە کار بکاتە سەر بـاوەڕ و ئیمانتـان، ئینجا بۆ تەئیدی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئـایەتی ١٧٦ی ئـالی عیمـران، بـۆوەی بتـوانین بە تەواوی حاڵی بین:

**وَلاَ يَحْزُنكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّواْ اللَّه شَيْئاً يُرِيدُ اللّهُ أَلاَّ يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِي الآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾** ئالی عیمران

**با ئەوانەی کە وا بە پەلە بەرەو پیری کوفر دەچن، خەمبـار و دامـاو و پەرۆشـت نەکەن، بەبـێ گومان هیچ زەرەر و زیانێک ناتوانن بە خودا بگەیێنن، خودا دەیهەوێ لە پەسڵاندا هـیچ خێـر و بێریان بەش نەدا، سزایەکی گەورەشیان بۆ دیاری کراوە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٧٦**

هۆی دابەزینی ئەو ئایەتە پیرۆزە بە پێی فەرموودەی قورئانزانان دەبـێ ئەوە بـێ کە خـودا مزگێنـی دەدا بە پێغەمـبەرﷺ کە قـوڕیش نـاتوانێ لە ڕاسـت ئەو ئـایینە پـاکەی ئیسـلام هـیچ خۆنوێنییەک بکا و نابوودی کا و هەروا منافقین بە وەسیلەی شات و شـووت و پڕوپاگەنـدەیان

توانایی ئەوەیان نییە خاوەن ئیمان و بڕواداران لە شەڕ سارد کەنەوە، و ئەتۆ ئەی محەمەدﷺ دڵتەنگ و سەخڵەت مەبە بەوانەی پەلە دەکەن بۆ بێبڕوایی، چونکە ئەوە بێگومانە کە ئەوان ناتوانن هیچ زەرەرێک بە خودا بگەیێنن، و ناتوانن بە هۆی فڕ و فێڵ و حاشاردانی ڕاستی، دین و ئایین لە ناو بەرن، ڕەنج بەخەسارن دوژمنانی ئیسلام و دەسبەتاڵن لە دواڕۆژدا، چونکە ئەوانە لە لایەن خوداوە بەشیان لە ڕەحمەتدا نییە و دانەندراوە، بەڵکە سزای گەورە و گرانیان بۆ دیاری کراوە.

**سووکە چاو ڕێخشاندنێک:**

ئەو ئایەتە دڵخۆشیدانەوەیەکە بۆ پێغەمبەر لە لایەن خوداوە کە دەفەرموێ: تاڵووکەی ئەو کەسانەی بۆ لای کوفر ڕادەکەن و دەڕۆن، سەخڵەتت نەکەن، چونکە ئەوانە دەو خەیاڵە پووچەدان کە دەتوانن بە هۆی کافرەتیان زەرەر بە بارەگای خودا بگەیێنن، نا، ناتوانن چونکە هەموو ئەوانە و غەیری ئەوانە لە ژێر ئیرادەی خودادان، ئەو لە دمدانە و مەیداندانە بۆ کافران ڕازێکی نهێنی خودایە، تا زیاتر تێوە بگلێن و تووشی عەزاب بن.

لە سەر دابەزینی ئەو ئایەتە نەزەری جۆراوجۆر دراوە، ئەگەرچی هۆی دابەزینەکەی تایبەتییە بەڵام دەبێ ئایەتەکە وەزن کرێ و هەڵسەنگێندرێ تاکوو وەدۆزرێ هۆی دابەزینەکەی بەتایبەتی، با سەرێک لە هۆیەکانی تایبەتی ئایەتەکە هەڵێنین.

١. هەندێک بۆچوونیان وایە کە ئەو ئایەتە دەرحەق بە منافقان نازڵ بووە. چونکە لە ڕابردوودا منافقان تێشکانی یارانی ئیسلامیان کردبووە بەهانەی ئەوەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ڕاست نییە، ئەوان بەو بوختانە دەیانەویست دڵی موسوڵمانان لە ڕاست پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر پەرێشان و هاڵۆز بکەن و موسوڵمانان بترسێنن لە شەڕ کردن دەگەڵ یارانی ئیسلام، جا لەو ڕووەوە پێغەمبەر دادەما و غەمگین دەبوو تاکوو ئەو ئایەتە دابەزی و تەم و خەم ڕەوی.

٢. دەستەیەک دەڵێن: دابەزینی ئەو ئایەتە لە بابەت کافرانی قوڕەیشە چونکە ئەوان بە دژی پێغەمبەرﷺ لەشکریان کۆ دەکردەوە کە بە گژ پێغەمبەرﷺدا بێن خودای تەبارەک و تەعالا ئەو ئایەتەی دابەزند پێغەمبەری خاترجەم کرد کە ناتوانن هیچ زەرەرێک بە تۆ بگەیێنن بۆی دامەمێنە زەرەر بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە.

٣. هەندێکیش دەڵێن: دابەزینی ئەو ئایەتە هۆیەکەی لە بابەتی دەستەیەک لە کافران بوون کە لە پاش ئەوەی ئیمانیان هێنابوو لە ترسی قوڕەیشیان دووبارە لە ئیمان پەشیمان ببوونەوە، ئەو

جەریانە ببوو بە باعیسی غەمناکی پێغەمبەرﷺ، خوداش بۆ دڵخۆشیدانەوەی پێغەمبەرﷺ ئەو ئایەتەی دابەزاند کە خەم مەخۆ بۆ ئەو جەریانە.

٤. تاقمێکیش نەزەریان ئاوا داوە کە مەبەست لە ﴿الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ﴾ ئەمیرانی یەهوودە وەک کعب کوڕی اشرف و هاوالانیان کە دەهاتن دە ناو خەڵکدا سیفاتە بەرزەکانی پێغەمبەریان دەشاردەوە لە خەڵک حاشاریان دەدا.

ئەوە سووکە ئاوڕێک بوو لە سەر ئایەتی ١٧٦. (تفسیر کبیر، ١٠٤/٩-١٠٣)

ئێمە دەبێ ئەوە بەراوەرد کەین و هەڵیسەنگێنین ئەگەر ئایەتی ١٧٦ حەواڵەی ئەوزاعی منافقان و یەهوودیانی کەین، دەبێ ئەو ئایەتی ١٧٧ حەواڵەی ئەوزاعی مورتەدانی کەین، و یا دەشبێ ئاواش وەزنی کەین: ئایەتی ١٧٦ حەواڵە بە مورتەدان کەین و ئایەتی ١٧٧ حەواڵە بە ئەوزاعی یەهوودانی کەین. واتە مانای ئاوا لێ بگرین: کڕینی کوفر بە ئیمان لەوانەوە بێ، بەو مانایە ئەوان پێش ئەوەی پێغەمبەرﷺ ببێتە پێغەمبەر، ئیمان وباوەڕیان پێ بوو و وێڕای پێغەمبەرﷺ و یارانی هێرشیان دەکردە سەر دوژمن بەڵام پاش ئەوەی کە پێغەمبەر ئیعلامی پێغەمبەرایەتی بۆ هات و دەرکەوت کە حەقە پێغەمبەرە، ڕوویان لێ وەرگێڕا و کافر بوون، ئیمانیان فرۆشت و دایان بە کوفر؛ و جگە لەوانەش دەتواندرێ ئەو دوو ئایەتی ١٧٦ و ١٧٧ بۆ هەرکام لە یەهوود و منافقان و مورتەدان حەواڵە کرێ، زەرەر بە مانایان نەگا چونکە ئەوانە، واتە یەهوود و مورتەد دەگەیشتنە موسوڵمانان هاواری ئیمانیان دەکرد و ڕایاندەگەیاند، و ئەگەر دەگەڵ شەیتانیان کۆ دەبوونەوە هاواری کافرەتییان دەکرد و بێزاری ئیمانیان دەردەبڕی. با سەیری ئەوەش بکەین بۆ ئیسباتی ئەو جەریانە: خودای تەعتلا لە ئایەتی ١٧٦دا فەرمووی: ﴿الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّواْ اللَّهَ شَيْئاً﴾ واتە ئەوانەی پەلە دەکەن لە کافربووندا هیچ زەرەرێک ناتوانن بە خودا بدەن، و دە ئایەتی ١٧٧دا خودا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ اشْتَرَوُاْ الْكُفْرَ بِالإِيمَانِ لَن يَضُرُّواْ اللَّهَ شَيْئًا﴾ واتە ئەوانەی کوفر دەکڕن بە ئیمان، هیچ زەرەر ناتوانن بدەن لە خودا. ئەو شێوە نەزمە شتانێک دەخەنە ڕوو، وەک ئەوە: ئەوانەی ئیمانیان دا بە کوفر، بێ گومان هەر لە هەوەڵەوە بێ ئیمان بوون، ئەو ئاڵوگۆڕەشیان کە نیشان دا نیشانەی شیددەتی لاوازی و سستی باوەڕیان بو، چونکە ئەمری دین و ئیمان زۆر گەورەیە، ئاڵوگۆڕ دە ئیماندا ناکرێ، ئەگەر بکرێ نیشانەی ئەوەیە هەر لە ئەساسدا ئەو چەشنە ئیمانە کامڵ نەبووە، بۆیە وا بە ئاسانی ئاڵوگۆڕی پێ دەکرێ، بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٧٧ بۆ وەی بتوانین بە

تێر و تەسەلی لە جەریان حاڵی بین:

**إِنَّ الَّذِينَ اشْتَرَوُاْ الْكُفْرَ بِالإِيمَانِ لَن يَضُرُّواْ اللّهَ شَيْئًا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٧﴾** ئالی عیمران
**بەڕاستی ئەو کەسانەی وا کوفر و بێباوەڕی دەکڕن بە ئیمان، هیچ زەرەر و زیانێک بە خودا ناگەیێنن، سزایەکی پڕ لە ئێش و ئازاریشیان بۆ داندراوە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەڕۆک و سیمای ئایەتی ١٧٧**

بە کورتی، بێشک دەبێ ئەوە بکەینە کڵێ باوەڕ و بنچینەی ئیمان: ئەوانەی ڕاستی دەفرۆشن بە درۆ، و ئەوانەی حەق دەفرۆشن بە ناحەق، و باوەڕ و ئیمان دەفرۆشن بە بێباوەڕی و بێئیمانی، واتە ئیمانیان گۆڕییەوە بە بێئیمانی، دەو ئاڵوگۆڕەیاندا هیچ زەرەر و زیانێک بە خودا ناگەیێنن و ڕێشی ناخەن، بەڵکە هەچی زەرەرە وەخۆیان دەکەوێ، سەرشکاو و لاقشکاو هەر بۆخۆیان دەبن، و سزا و ئێش و ئازار هەر بۆ وان دەبێ، دەتواندرێ بە ڕاشکاوی بکوترێ: ئەو ئایەتە دەرحەق بە مورتەدان دابەزیوە.

**بۆ ئاگاداری:**

بەڕاستی کوفری هیچ کافرێک ناتوانێ زەرەر بە خودا بگەیێنێ چونکە زاتی پاک و بێهاوتای خودا زەرەر و قازانجی ڕوو تێناکا، ئەوانەی پەلە دەکەن لە کوفر و ئەوانەی موعاوەزەی ئیمان دەکەن بە کوفر، زەرەر بە خۆیان دەدەن، چونکە خودا لە هەر لایەکەوە ئەتۆ بڵێی بێنیازە و بێسنوورە، ڕێی نییە قازانج و زەرەری پێوە بنووسێ، ڕازی ئەوەش کە ئاخری ئایەتی ١٧٦ (عَذَابٌ عَظِيمٌ)ە و ئاخری ئایەتی ١٧٧ (عَذَابٌ أَلِيمٌ)ە، ئەوانە زۆر بە توندی و بە پەلە بەرەو کوفر ڕادەکەن.

دێرەدا بۆ دڵ پرسیارێک دێتە ڕوو لەو بارەوە: خودا دە ئایەتەکەدا فەرمووی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ اشْتَرَوُاْ الْكُفْرَ بِالإِيمَانِ﴾ واتە ئەوانەی کوفریان کڕی بە ئیمان؛ جا خۆ ئەوە ڕوون و ئاشکرا و حاشاهەڵنەگرە کە ئەوان بێباوەڕانە ئیمانیان نییە تاکوو بیدەن بە کوفر و ئاڵوگۆڕی پێ بکەن، کەوایە خودا دەبێ مەبەستی چ بێ دەو ئایەتەدا؟ چ ئیمانێکی مەبەستە لەو ئیمانەی ئەوان دەیدەن بە کوفر؟

بە پێی وەزن کردن و هەڵسەنگاندنی ئەوزاع دەبێ خودای تەعالا مەبەستی بەو ئیمانی ناو ئایەتەکە، ئەو ئیمانە زاهیریە بێ کە لە خۆیانی نیشان دەدەن بە زاهیری کە ئەویش هەر جۆرە

کوفرێکە بەڵام نهێنییە، چونکە ئیمانی خاڵی لە عەمەل و باوەڕی ڕاستی، جۆرە کوفرێکە نهێنی، ئەمما بە ئاڵوگۆڕەکەی ئاشکرای دەکەن.

بە ئاوڕدانەوەیەک وەسەر ئایەتەکانی ڕابردووی بابەتی ئەو باسە دەبێ ئەوە بزانین کە خودای تەعالا لە ڕاست ئەوانەی کە بە جاسووسی چوونە مەدینە بۆ ئاژاوە و سست کردنی یارانی پێغەمبەر دەدوێ و بەو جۆرە کە ئەو جاسووس و خائینانە توانییان یارانی سست ئیمان سست و لاواز کەن و بیانترسێنن لەوەی کە بچن بۆ شەڕ دەکوژرێن هەر وەک موسوڵمانان لە شەڕی ئوحوددا کوژران، جا بۆیە دێرەدا خودا ئەو ئاگاداریەی دا کە موسوڵمانن و خاوەن ئیمانی بەڕاستی قسەی شەیاتینیان وەرناگرن و فریوان ناخۆن. چونکە ئەرکی موسوڵمانە پاڵ بە خودا وەدا بە کەسی دی پشت نەبەستێ، وەک لە ئایەتی ١٧٨دا خودا ئاماژە دەکا وەلای ئەوەی: بکوژرێن وەک کوژراوەکانی ئوحود زۆر چاترە لەوەی بە قسەی جاسووسان خۆ بپارێزن لە چوونە شەڕ و خۆ بە دوور گرتن لە کوشتن بەو دەلیلە کوشتن و کوژران لە شەڕی ئوحوددا قارەمانی و فیداکاری ڕێگای خودایان بۆ خۆیان تۆمار کرد و بەهەشت و ڕەزایەتی خودایان ستاند. ئەمما مانەوە و نەچوونە شەڕ بە قسەی جاسووسان ڕووڕەشی و عەزابی ڕۆژی ئاخرەتیان بۆ خۆ تۆمار کرد و کڕییان.

بۆ ئیسباتی دەبێ بچینە خزمەت ئایەتی ١٧٨ی ئالی عیمران تاکوو بزانین بە تێری تێبگەین لە باسەکە:

**وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ أَنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُواْ إِثْمًا وَلَهْمُ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٧٨﴾ ئالی عیمران**

**لەڕاستیدا با بێبڕوایان گومانیان وا نەبێت، ئەو مۆڵەتەی دەیاندەینێ، خێرە بۆیان؛ لە ڕاستیدا بۆیە مۆڵەتیان دەدەینێ تاکوو گوناحیان زیاتر بێت سزای زەبوونکەریشیان بۆ دانراوە.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٧٨

دەبێ بکوترێ: با بێئیمان و بێباوەڕان ئەو گومانە نەکەن کە مۆڵەت پێدانیان لە لای خوداوە خێر و چاک بێت بۆیان، بەڵکە ئەو مۆڵەت پێدانەیان بۆ ئەوەیە تاکوو بە تەواوی ڕۆچن لە زۆنگی تاوانیان، چونکە ئەو بەردەوامبوونەیان لە سەر بێباوەڕی نیشانەی ویستیانە بۆ دوور کەوتنەوە لە ڕێی حەق و ڕاست، جا کەسێکیش ئەوەی هەڵوێست بێ شایانیەتی ڕۆچوون لە زەلی نەدامەتی و چارەڕەشی و سزایەکی ڕووڕەشی ڕۆژی خۆی، جا وا دەردەکەوێ: ئەو ئایەتە

هەڕەشە بێ لەو کەسانەی تێدەکۆشن بە فێڵ و فووت و چاو و ڕاو موسـڵمان بترسـێنن، بەوەی کە ئەبوسوفیان لەشـکری زۆری وەکـۆ کـردووە بـۆ بە گـژدا چـوونی موسـوڵمانان نەک بچـن ڕووبەڕوو بن.

**پاشەدۆیەکی ئەو باسە:**

پاش دڵخۆشیدانەوەی پێغەمبەرﷺ خودای بێهاوتا ڕوو بە کوففار دەڵێ: ئەی بـێئیمان و خەیاڵ بەتاڵ، وا خەیاڵ نەکەن کە ئەو دەستەڵات و ئیمکانـاتەی ئێسـتێ وا لە دەسـتودایە و ئەو سەرکەوتنانەی بە دەستو هێناوە و ئازادییەکی سەربەخۆیش بەخۆوە دەبینن، نیشـانەی چـاکی و پاکیو بێ وڕەزایەتی و خۆشی خودای دەگەڵ بێ، بەڵکە دەبێ چاک بزانن و حاڵی بـن، کە ئەوە داب و سوننەتێکی خوداییە کە سەرێک ناپاک و خائینان ڕێ بـدا تـا دەگەنە کەنـداڵی تـاوان و ڕووڕەشی خۆیان و تێدەکەون و هاتنە دەریان لێ چاو ناکرێ و تووشی عەزابی سەخت و گران دەبن.

ئەگەر بەرجەوەندی قورئان ببین ئەوە هەسـت پـێ دەکەیـن بە ئاشـکرایی: خـودا هەل بـۆ هەچی تـاوان لەمـلە هەڵـدەخا کە وەگەڕێ و ئـاوڕ داتەوە بە پێـی شـەئن و لێهـاتوویی خـۆی هیدایەت وەرگرێ و خۆ ڕزگار کا لە چارەڕەشی، ئەمما ئەگەر هات و لێهاتوویی لە دەس دابێ و بەشی چارەسازی خۆی چارەی نەهێشتبێتەوە ئەوە ئەو کەسە هەوساری لە سەر خۆ دامـاڵیوە، تازە گەڕانەوە و ئاوڕدانەوەی لە دەست دەرچـووە لە گۆمـاوی گومڕاییـدا خنکـاوە، بە خەیـاڵی خۆی وێڵ دەکرێ بەرەو سزای پڕ لە ئێش و ژان هەنگاوان داوێ، دیارە عەزابی سـەختی ڕۆژی ئاخرەت دەگەڵ عەزاب و نەحەسانەوەی دنیا منافاتی نییە، بەڵـکە زۆر وا هەیە خـودا کـافران لە نیعمەتی دنیادا تێر و تەسەل دەکا تا ئەو جێگایە کە لە ناکـاو بەرەو عەزابێکـی بێئامـان سـەرەو نخوون دەکرێ هەر لە دنیادا، وەک ڕەئیس جمهووری عێراق سەددام حسێن و هاوقەتارانی.

**ئاوڕ وەسەر دانەوەیەکی ئادابی عیلمی وەسەر وشەی «نملي» ناو ئایەتەکە**

**چەن پرسیارێک** لە بابەت بەیانی سێ چەشنە عەزاب بۆ کـافران وەک «عظـیم» لە ئـاخری ئایەتی ١٧٦، «أليم» لە ئاخری ئایەتی ١٧٧، «مهين» لە ئاخری ئایەتی ١٧٨؛

پێشەکی لە بابەتی «نملي» دەدوێین:

«نملي» لە بەرەبابی «إفعال»ە، لە ڕەگەزی «ملأ» بە مانای ماوە و تـوولی دەورانە، دیـارە دە

عورفی عەرەبیدا بە زۆر مانا هاتووە، بەڵام ناودارترین مانـا بە واتـای «اطالـة المـدة» واتە مـاوە درێژی یانی مۆڵەتدان. بە کوردی مانای «نملی» ناو ئایەتەکە واتە وەنەبێ ئەو مۆڵەتە درێـژەی دراوە بەو کافرانەی لەمڕ عەیش و نۆش و تێر و تەواوی دنیـا، دەلیلـی چـاک و جاتریـان بـێ، بەڵکە بۆ تەکمیلی عەزابە لە سەریان.

ئەوجار ئاوڕ دەدەینەوە سەر ڕاز و حیکمەتی هێنانی سێ چەشنە عەزاب بـۆ سـەر کـافران وەک: عظیم، ألیم، مهین دە ناو ئایەتەکانی ١٧٦ و ١٧٧ و ١٧٨.

لە بابەتی ئەو شێوە دابەزینە عەزابە دەبێ بکوترێ: ئەساسی بەشەریەت واتە ئینسان بە سێ شت حەساس و ناڕەحەتە، یانی هەر کاتێ لە هەر لایەک لەو سێ لایانە: سێ شتانە دەردێک یا بەڵایەک ڕژایە سەری، زۆر بە سەخت و گرانی بۆی تەواو دەبێ و دەزانێ وەک ئەوە:

١. لە بابەت ئاکار و کردارەوە

٢. یا لە بابەت گیان و لەشەوە

٣. یا لە بابەت ئابڕوو و شەخسیەتەوەیە.

لە هەر لە یەک لەو سێ لایانەوە ئەگەر هێرشی کرایە سەر ئەوە خۆی بە شپرزەیی دەبینێ و دێتە بەرچاو. بە کورتی ئەو سێ هوێانە ئینسانی شوێنی خێر و شـەڕن بـۆ ئینسـان، جـا بـۆ ئەو کافرانە عەزاب و گرفتاری ئاخرەتیان بەو سێ دەردانە سابت و تەواوە.

**ڕاست و ڕەوانتر بڵێـین:** ئەگەر هات و ئینسان بە تەمای بەرهەمێـک حەولـی دا و تێڕاچـوو بەڵام ئەو بەرهەمە باشەی بە خەیاڵ ئەو دەیویست نەهاتە دی و لە مقابیلدا نەتیجەیەکی خراپـی هاتە دەست، ئەوە بۆخۆی یەک چەشنە ڕووڕەشی و زیللەتە بۆی دێتە ڕوو، منافقـان بە تەمـای بەرهەمی باشی ئـاخرەت دە دنیـایەدا ئەو خراپەکـارانە دەگەڵ موسـوڵمانان دەکەن دە حاڵێکـدا تووشی عەزابی «عظیم» دەبن:

١. و ئەگەر ئەو عەزابە گەورە و گرانە هجووم کاتە سـەر زات و لەشـی ئەو ئینسـانانە ئەوە بۆیان دەبێتە عەزابی ألیم

٢. و هەروا ئەگەر لە بەرچاوی خەڵک بێ ئابڕوو کرێ ئینسان ئەوە بۆ ئەو ئینسـانە عەزابـی «مهین» دێتە ڕوو، واتە ڕووڕەشی و بێئابڕوویی. خـودای تەعـالا عەزابـی ئـاخرەتی کـافران و دووڕووانی لە هەر سێک لاوە پێک هێناوە بۆ وان، ئەوە بوو ڕازی هێنانە ڕووی ئەو سێ چەشنە عەزابە: (عظیم، الیم، مهین)، تفسیر تبیین الفرقان، باسی هەمان ئایەتی ١٧٨ی ئالی عیمران.



دەچینە خزمەت ئایەتی ١٧٩ی ئالی عیمران بۆوەی بتوانین بە تێر و تەسەلی لە کارەساتی هەرای ئوحود واتە لە کوشتن و بریندار بوون و تێشکان و هەروا کۆبوونەوەی یارانی پێغەمبەر لە دەوری پێغەمبەر دەگەڵ ئەو هەموو نارەحەتی و زەجرەی کێشابوویان:

مَّا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى الْغَيْبِ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَجْتَبِي مِن رُّسُلِهِ مَن يَشَاءُ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَإِن تُؤْمِنُوا وَتَتَّقُوا فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٩﴾ ئالی عیمران

**خودا هەرگیز نەیویستووە واز لە بڕواداران بێنێت، لە سەر ئەو بارودۆخە بن کە ئێستە ئێوەی لە سەرە، تا پیس و پاک لە یەک جیا بکاتەوە، خودا هەرگیز نەشیویستووە ئاگادارتان بکا بە سەر نادیاریدا، بەڵام خودا لە ناو پێغەمبەرانیدا ئەوەی ویستی لە سەری بێ هەڵیدەبژێرێ کە واتە ئیمان بێنن بە خودا و پێغەمبەرەکانی، ئەگەر ئیمانداری ڕاست و لە خوداترسن، ئەوە پاداشی گەورەتان بۆ داندراوە.**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٧٩

پێشەکی دەبێ ئەوە بزاندرێ کە ئەو ئایەتە بەشێکی بەرچاوە لە کارەساتی هەرای ئوحود نیشان دەدا، بۆ نموونە ئەوەی کە لە شەڕی ئوحوددا ڕووی دا بۆ هەڵاواردن و جیابوونەوەی منافق بوو، وەک ئەوە کە خودا دەفەرموێ: فەرمانی نەداوە بەوەی بڕواداران هەر لە سەر ئەو شێوەی کە ئێوە لە سەرین بیانهێڵێتەوە، بەڵکوو ئاڵوگۆڕ ڕوو دەدا تا پیس لە پاک هەڵاواردرێ و جیا بکرێتەوە، خودا بە هۆی سرووش پێغەمبەرﷺ ئاگادار دەکاتەوە کە کێیە بڕوادارو کێیە بێبڕوا، یا خێر، بە هۆی شەڕ و هەرا و پاک و پیس لێک جیا دەبنەوە، جا خۆ دیارە خودای بانی سەر فەرمانی نەداوە کە ئاگادارتان وەکا و دنیای نهێیتان نیشان بدات، دە حاڵێکدا ئائەوەی بیهەوێ ئارەزووی کا لە بابەت ئامۆژگاریتان، بە وەسیلەی هەندێک لە پێغەمبەرانی هەڵبژاردە دەینوێنێ و نیشانی دەدا، جا کەوایە بڕوا بێنن بە پێغەمبەران و خودا، چونکە ئەگەر بڕوا بێنن و خۆتان بپارێزن پاداشتی گەورە و بەرچاو ڕۆژی خۆی وەردەگرن، نەختێک لەوە بەدوا چاو دەکەی خودا کە چۆن دەفەرموێ و هەڕەشە دەکا، واتە: لە ئایەتی ١٨٠دا دەستوور دەدا بە بەخشینی ماڵ و سامان لە ڕێگەی خودادا، و هەڕەشەش دەکا لە چرووک و ڕەزیل.

**پاشەدۆ:**

خودای تەبارەک و تەعالا و یاسازان و یاسادانەر ئەگەر بە وردی سرنج بگری لە ناوەرۆکی ئەو ئایەتە بە ڕوونی ئەوە چاو دەکەی: کە خودای مەزن پێشەکی یاسایەکی تەواو بەیان دەکات، بەو شێوە: کە خودا بە ئیسلام بوونی زاهیری و ئیدیعای ئیمانی بێ عەمەل دەس‌بەردار نابێ و کیفایەت ناکا، بەڵکە خاوەن باوەڕان و ئیدیعاکارانی ئیمان، چەند جار چەند جار تاقی دەکاتەوە و لە محەکی دەدا بۆ وەی هەچی لە نهێنی ناو دەروونیاندا دەریخا و ئاشکرای کا بۆوەی ڕێزی خۆی و ڕێزی منافقان لێک هەڵاوادرێ و جیا بێتەوە، ئەگەر هات و پرسیاریش کرێ و بکوترێ: جا خودا خۆی دەتوانێ بێ شەڕ و شۆریش بە هۆی ئاگاداری زانستی نهێنی (عیلمی غەیب)، ڕیزی منافقانی ناپاک و ئیماندارانی پاک لێک هەڵاوێرێ و جیا کاتەوە، لە وڵامدا دەبێ بکوترێ: خودا نایهەوێ زانستی نهێنی بدا بە ئینسان و ئازادی کا بە سەر دەروونی عەبدانیدا، بەڵام خودا بۆ ئەو مەقامە (عیلمی غەیب) هەر کێی بوێ لە پێغەمبەرانی، هەڵیدەبژێرێ و لە نهێنیدا شارەزای دەکا، جا لە سەر ئەو ئەساسە ئێرە کە جێگای ئازمایش و ئیمتیحانە، دەبێ خۆ تاقی کرێتەوە و بە خودا پشت بدرێ و ئیتاعە لە پێغەمبەر بکرێ، تاکوو دەرکەوێ کێیە مەردی مەیدانێ و کێیە نامەرد هەر بە قسەیە کارەکانی؛ پاک کێیە و ناپاک کێیە؟!

ئینسانی بەئیمان دەبێ ئەوەی باوەڕ بێ: ئیمان هەوێنی حەیاتی پاکە، بەڵام عەمەلی ساڵح و پاکە دەتوانێ بتگەیێنێتە ئەو قۆناغە کە خودای تەعالا بتخاتە ڕیزی ڕاست و پاکان و پاداشتی سەعادەت و بەختەوەری، بە کورتی و بە کوردی، حەیاتی خاوێن بەرهەمی ئیمانە، پاداشتی باش بەرهەمی عەمەلی ساڵحە، هەر ئەوەشە کە خودای تەعالا لە کلکەی ئاخری ئایەتەکەدا فەرموویەتی: ئەگەر ڕاست دەکەی خاوەن ئیمانی، تەقوا بکە و عەمەلی ساڵح بنوێنە تا پاداشی چاک وەرگری. ئەوە بوو پاشەدوو.

**ئاوڕێک بە سیلەی چاو:**

خودای تەعالا ڕازی دنیای خاوەن ئیمانان کە جاروبار تووشی ڕژد و هەڵەمووتی ژیان دەبن نیشان دەدا و بەیان دەکا، تاکوو ئەو شوبهەی دەیدەنە پاڵ موسوڵمانان ڕەد کرێتەوە، ڕووناکتر بدوێین: ڕووڕەشی وبێ‌شەرمی ئاخرەت بە شەڕی منافقان بە وەسیلەی ئایەتەکانی ڕابردوو نیشان درا و دەو ئایەتەدا ١٧٩، مزگێنی موسوڵمانان و هەڕەشە لە منافقان هەست پێ دەکرێ دەگەڵ دڵخۆشی‌دانەوەیەکی پێغەمبەر. و هەروا لێک هەڵاواردنی مۆئمین لە منافق، وەک ئەوە منافقان لە شەڕ ترسان و بەرەو مەککە ڕایانکرد، دە حاڵێکدا موسوڵمانانی

کوشتەیەکی بەرچاویان دا لە شەڕەکەدا، دە تانە و لۆمەیان گرتن منافقان تاکوو بتـوانن بە هـۆی ئەو تـانە و تەشـەرانەیان هەم حیـزی گەری خۆیـان وەشـارن هەم جـورئەت و شـەهامەتی موسوڵمانان ون کەن لە بەرچاوی عالەم.

**ئاگاداری:**

دە ئایەتی ﴿حَتَّىَ يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ﴾دا ئەو هەستە بە دڵدا دێ: ئەگەر لێک جیاوازی پاک و پیس ئاشکرا بێ، کوفری منافقان ئاشکرا دەبێ، خۆ ئەوەش دیارە ئاشکرا بوونی کـوفر لە بێباوەڕان نیشانەی ئەوەیە منافق نین بەڵکە لە منافق ژووراترن، و ئەگەرکـوو ئاشـکراش نەبـێ، فەرقی پاک و ناپاک لە یەک خودای نەخواستە وەعدەی خودا نایەتە جێ!

بۆ وڵامی ئەو بێنە و بەرەیە دەبێ بکوترێ: زاهیـر بـوونی پـاک لە ناپـاک بە نیەتـی ئـێمەی ئینسان ئیمتیازێکی وەهمییە ئەوەش ناتوانێ کوفر دانـێ و مەنـافعی لابەرێ، چـونکە ئیمتیـازی قەتعی دەتوانێ دێرەدا کوفر دانێ و منافقی لابەرێ، جا بۆیە خودای تەعالا بە شوێن ئەو باسەدا ئایەتی ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى الْغَيْبِ﴾ دێنێ واتە خودای تەوانا حـوکمی کـردووە بەوەی کە ئەو جیاوازییەی پاک لە ناپاک ئاشکرا بێ، ئەوەش بەو مانایە نییە کە خـودای تەعـالا ئێـوەی ئینسان بە سەر نهێنییەکاندا ئاگادار دەکا تـاکوو بتـوانی بڵێـی ئەوە منـافقە و ئەوە پـاکە، یـا ئەوە بەهەشتییە و ئەوە دۆزەخییە، چونکە ئەوە یەکـێکە لە سـوننەتی خـودا کە ئینسـان واتە خەڵکـی ڕەشۆکی، بەسەر غەیبدا ئاگادار نەبێ، مەگەر یەکێ خودا خۆی بیهەوێ حاڵی کا، وەک ئامـاژە وەلای ئەو مەبەسـتە دەکـا ئـایەتی: ﴿وَلَـكِـنَّ اللَّهَ يَجْتَـبِي مِـن رُّسُـلِهِ مَـن يَشَـاءُ﴾ واتە خـودا هەڵیدەبژێرێ لە پێغەمبەرانی، کێ حەز کا بۆخۆی شارەزای دەکا بە سەر ئەو نهێنییەی بـیهەوێ. بڵێ ئەوە موئمینە و ئەوهەش منافقە. تاکوو ئینسان لە پێغەمبەران بێنیاز نەبـن. هەر بـۆیەش لە شوێن ئەو ئایەتانە ئایەتی ﴿فَآمِنُواْ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ﴾ هێنـا تـاکوو ئینسـان بـۆ هەچـی نیازەکـانیەتی باوەڕەی بە خودا و ڕەسووڵی خودا بێ بۆ وەی بتوانێ بە سەر ویستەکانیدا زاڵ بێ.



خـودای تەعـالا تـا ئێـرە لە سـەر خۆبەشـین و فیـداکاری لە ڕێـی خـودادا جیهـاد دوا و فەرموودەی ڕانان، ئەوجار دەیهەوێ لەسەر ماڵ و سامان بەخشین بدوێ کە ماڵی دنیا چەپی دە بەرگیاندا نییە، واتە کێ بتوانێ ماڵ دانێ و بیبەخشـێ دەشـتوانێ گیـان دانـێ و بیبەخشـێ، بـۆ خۆشەویستی لە پەنا یەکن، جا هەر ئەوەیە ڕاز کە هەڕەشە لە چرووک و لەچەر دەکا خـودا، بـۆ

ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٨٠ی ئالی عیمران تاکوو بە تەواوی پاراو بین لەو بارەوە:

**وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَّهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلِلّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٨٠﴾** ئالی عیمران

**با هەرگیز ئەو کەسانەی کە سەبارەت بەو شتەی کە خودا لە خەزێنەی بەخششی خۆی بەشی داون و چرووکی دەکەن، وا نەزانن خێرە بۆیان، بەڵکە شەڕ و نەگبەتییە و پاشان لە ڕۆژی ئاخرەتدا ئەو چرووکیەی کردوویانە، دەکرێتە تەوقی گەردنیان، میراتی ئاسمان و زەوییەکان هەر ئی خودایە، خودا بە وردی ئاگادارە لەوەی کە ئەنجامی دەدەن.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٨٠

خودا ڕوو بە ئینسان دەفەرموێ: با وا خەیاڵ نەکەن و گومان نەبەن ئەوانەی وا خۆ ڕەزیل و چرووک دەکەن بەو نیعمەتانەی کە خودا لە ڕێی گەورەیی خۆیدا پێی داون، بە قازانجیانە و چاکە بۆیان، بەڵکە ئەو پێ بەخشینە تاقیکردنەوەیە بۆ وەی دەکەوێ ڕاست و خواریت، جا ئەگەر ڕاست نەڕۆی ئەوە شەڕ و نەگبەتییە دەبێتە تۆق و دەکەوێتە ئەستۆی بۆ ڕۆژی ئاخرەتێ، بەڵام ئەگەر ڕاست بڕۆی ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا چەند بارتەقای ئەو نیعمەتەی نیعمەتی بەهەشتیت پێ دەدرێ، میراتی ئاسمان و زەوی هەر ئی خودایە و ئاگاداری کاریشتانە.

**پاشەدۆ:**

١. لەو ماڵ و داراییەی کە خودا لە ڕووی فەزڵی خۆی داویەتە ئەو کەسانە بۆی لێکدانەوە خودا تاکوو بە تەواوی بزانی خاوەنی بەڕاستی هەچی هەیە خودایە، کێی بوێ پێی دەدا لە ڕووی فەزڵی خۆی، کێش نەیهەوێ پێی نادا.

٢. خودا دە ئایەتەکەدا ئەعمالی ئینسانی ئاوا ئیشارە وەلا کرد: چرووک لەچەری لە سەر بوونی ماڵ دەبێتە تۆق لە گەردندا و بێ ئابڕوو دەبی لە سەر لەچەری و چرووکی. و یا خەرج کردنی لە ڕێگای هەوا و هەوەس و بێشەرمیدا.

٣. وا نەزانێ بە نەبەخشینی ماڵ و دارایی خێرت دەست خستووە و ماڵت زیاد کردووە، بەڵکە ئەو ئاکارەت شەڕە و بۆ خۆت کڕیوە، چونکە هەم گەلت چاوەدێری نەکردووە، هەم خۆت بەو ماڵە فرۆشتووە، بەشی ڕۆژی ئاخرەتت پێ نییە.

٤. ماڵ و دارایی چ ببیەخشی چ نەیبەخشی، ڕۆژێک لە دەستت دەشتە دەرێ، چونکە

خاوەنی بەڕاستی خودایە نەک ئەتۆ، بەڵکە بۆ تاقی‌کردنەوەت دراوەتی ئەو ماوەیە.

۵. خودا بە سەر هەموو ئاکار و نیەت و نهێنییەکانت ئاگادارە، بەخیل و ڕەزیل بی، هەر دەزانێ، بەبەخشش و کەرەم بی، هەر دەزانێ؛ پاداشیش بە گوێرەی ئەعمالە.

**پوختەی مەبەست:**

زۆرێک لە ساماندااران لە چەر و چرووکی لە سەر سامانیان دەکار دەکەن بەو هیوایە بەو حاڵەتە ناحەزەیان بەرگری لە کەم‌بوونەوەی ماڵ و دارایی دەکەن، واتە لایان وایە ئەگەر بەشی فەقیر و بێ‌نەوایان نەدەن کەم ناکا و بە قازانجیانە، دە حاڵێکدا ماڵ و دارایی بە لێ‌بەخشینی زیاد دەکا و کەم ناکا، جا ئەو ئاکارە ناحەزە لە ئاخرەتدا دەبێتە تۆق و دەخرێتە گەردنییان، بەو پێیە خاوەن باوەڕان دەبێ لە سەر ئەو باوەڕە بن خاوەنی هەچی لە ئاسمانەکان و زەویدان بە واقعی خودایە، خرانە ژێر دەستی ئینسانی ئەو ماڵ و مڵکە بۆ تاقی‌کردنەوەیە.

هەندێک لە قورئان‌زانان وەک ابن‌مسعود و جعفر صادق و شعبی و سدّی زۆربەی زانیان لەسەر ئەوباوەڕەن کە هۆی دابەزینی ئەو ئایەتە ۱۸۰ی ئالی عیمران لە بابەتی زەکات‌نەدەرانە، واتە لەو بارەوە دابەزیوە. تفسیر بغوی، ۳۷۸/۱.

**ئاوڕێک وەسەر باری نەزم و نیزامی ئایەتەکە بە پێی باری عیلمی:**

جوملەی (وَلاَ يَحْسَبَنَّ): حەمزە کە یەکێکە لە قورئان‌زانان بە «ت»ێی خوێندۆتەوە واتە (وَلاَ تَحْسَبَنَّ)؛ باقی قورئان‌زانەکان بە «ی» خوێندوویانەتەوە.

خوێندنەوەی (وَلاَ تَحْسَبَنَّ) بە «ت» لە سەر نەزەری حەمزە لە لایەن زوجاجەوە مانای ئاوا دەکەوێ: (وَ لا تَحْسَبَنَّ بُخلَ الَّذينَ يَبْخَلونَ خَيراً لَهُم) «مضاف» کە «بخل»ە لابراوە، چونکە «يبخلون» شارەزای لەسەر دەدا.

بەڵام ئەوانەی کە نەزەریان داوە کە بە پیتی «ی» خوێندراوەتەوە دوو بۆچوونیان لە سەر ڕاناوە:

۱. فاعلی «يحسبنّ» ڕابتێکە دەگەڕێتەوە بۆ «رسول الله» = ضمير، یا بۆ «احد»، وەک ئەوە: و لا يَحسَبَنَّ رسولُ اللهِ؛ یا: و لا يَحسَبَنَّ أحدٌ بُخلَ الَّذينَ يَبخَلونَ خَيراً لَهُم.

۲. بۆچوونی دووهەم ئەوەیە: فاعلی «يحسبن» «هم الّذين يبخلون»ەیە، بەو پێیە مەفعوول دەبێ لابرابێ، وەک ئەوە: وَ لا يَحسَبَنَّ الَّذينَ يَبخَلونَ بُخلَهُم هو خَيرٌ لَهُم. شاهید لە سەر

لاچوونی مەفعوولیش، «یبخلون»ەیە.

**بۆ ئاگاداری:**

دڵی نەسرەوتوو دەیهەوێ بزانێ ئەو بەخالەتەی کە دە ناو ئایەتەکەدا باس لێ کراوە و زەمی کراوە، بەخالەتە لە سەر ماڵ و سامان، یا بەخالەتە لە سەر عیلم و زانست؟

بۆ وڵامی ئەو پرسیارە دەبێ زۆر بە پارێزەوە هەنگاو باوژێرێ بۆ لای ڕاستییەکەی.

١. بەو پێیە کە هەڕەشە کراوە لە سەر لەچەری و چرووکی، واتە «بخل»، دەبێ بەخیلی لە سەر ماڵ بێ، واتە بەخیلان وا نەزانن بەخالەتیان لە سەر ماڵ و دارایی خێر بێ بۆیان، بەڵکە شەڕە لە ئاخردا بۆیان، وەک خودا ئیشارەی وەلا فەرمووە لە ئایەتی ١٨٠دا: ﴿سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾. یا دەڵێن ماڵ و دارایی تا سەر لە دەسدا نامێنێ بۆیان؛ چونکە خاوەنی ئەسڵی ماڵ و دارایی خودایە نەک ئینسان، بە پێی ئیشاراتی ئەو ئایەتە: ﴿وَلِلّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾. ئێرە دەڵێ خاوەنی ئەسڵی بۆ ماڵ خودایە.

٢. هەندێکیش هەن لەمەڕ ئەو بەخالەتی ناو ئایەتەکە مەبەستیان بەخالەت لە علیم و زانستدایە، بەو دەلیلە: یەهوودییەکان سیفات و سەنای پێغەمبەریان حاشار دەدا و دەیانشاردەوە جا دیارە ئەو حاشاردانەیان هۆیەکەی بەخیلی بوو بە پێغەمبەر، خۆ لەو بارەوە خودا دەفەرموێ: «فَلانٌ يَبخَلُ بِعلمِهِ» خۆ دیارە ئەوە بێ گومانە کە عیلم و زانست فەزڵێکی خودابیە وەک لە ئایەتی ١١٣ی نیساءدا ئاماژەی وەلا کراوە:

> **وَلَوْلاَ فَضْلُ اللّهِ عَلَيْك وَرَحْمَتُهُ لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مُّنْهُمْ أَن يُضِلُّوك وَمَا يُضِلُّونَ إِلاُّ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَضُرُّونَك مِن شَيْءٍ وَأَنزَلَ اللّهُ عَلَيْك الْكِتَاب وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَك مَا لَمْ تَكُنْ تَعْلَمُ وَكَانَ فَ ضْلُ اللّهِ عَلَيْك عَظِيمًا**
>
> **ئەگەر بەخشش و میهرەبانی خودا نەڕژایە بە سەرتا، دەستەیەکیان دەیانویست تۆ لە هق لادەن، کەسیشیان بۆ گومڕا ناکرێ جگە لە خۆیان، ناتوانن هیچ زەرەرێک بدەن پێت، خودای قورئان کاربەجێیە پێی بەخشیوی، ئەوەی کە تۆ نەتدەزانی فێری کردی، لە ڕاستیدا بەخششی خودا دەربارەی تۆ زۆر گەورەیە.**

ئەو ئایەتە پێمان دەڵێ عیلم و زانست فەزڵی خودایە و گەورەیە، جا دەکرێ مەبەست لەو بەخالەتی ناو ئایەتەکە چرووکی دە عیلم و زانستدا بێ.

لە سەر ئەو ئەساسە دەکرێ بکوترێ: بەخاڵەت دە عیلمدایە بەو دەلیلە: خودای تەعالا ئەوەی دە کتێبی تەورات و ئینجیلدا بوو لەمەڕ محەمەد فێری یەهوود و نەسارای کردبوو، ئەوانیش لە بەر بەخیلیان حاشاریان دەدا و دەیانشاردەوە. جا دیارە ئەو کارە ناڕەوایەیان هۆیەکەی بەخیلی بوو بە پێغەمبەر.

لە هەر دوو قەول و نەزەرەکان واتە بەخیلی لە سەر ماڵ و سامان، یا بەخیلی لەسەر عیلم و زانست، قەولی هەوەڵیان کە بەخیلییە لە سەر ماڵ و سامان، بە ڕەواتر داندراوە، بەو دوو دەلیلانە:

١. ئایەتی ﴿سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِ﴾

٢. ئەگەر بەخالەتەکە لە سەر ماڵ بێ، هەن ئینسانی ئازا و لێهاتوو بۆ جیهاد شەوق و زەوقی بۆ ماڵ بەخشین دەو ڕێیەدا زۆر دەکا.

٣. ئایەتی ٣ی بەقەرە تەئیدی قەولی هەوەڵ دەکا کە بەخالەت لە سەر ماڵە: ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ واتە هەندێ لەوەی گێڕاومانە بە ڕۆزیتان ئیفاقی کەن.

جگە لێرەش ئایەتی ٥ی سووڕەی لوقمانیش ئیشارە وەلای ئەوە دەکا کە بەخشینی دارایی گەورەیە، هەر وەک چرووکیش گەورەیە:

> **أُوْلَئِكَ عَلَى هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ**
> **نوێژکەران و زەکاتدەران و خاوەنباوەڕان ئا ئەوانەن لە سەر ڕێنوێنین لە لای پەروەردگاریانەوە هەر ئەوانەشن ڕزگاران.**

ئەوانە هەموو هاواریانە کە بەخالەتی ناو ئایەتەکە لە سەر ماڵ بێ.



لە سەر بەراوەرد و بەرجەوەندی لە ئایەتی ١٨٠ی ئالی عیمران ئەوەمان بۆ دەرکەوت و هاتە دەستمان کە خودای تەعالا خاوەن ماڵانی بە ئینفاق و دووری لە چرووکی و لەچەری دەعوەت کرد و دەستووری پێ دان کە دەبێ لەو ماڵ و داراییەی خودای پێی داون بەشی خاوەن نیازانی لێ بدەن، و نەکەن بە هۆی لەچەری و چرووکی لە سەر ئینفاق خۆتان تووشی عەزابی ئاخرەت بکەن، و هەروا دەو ئایەتە پیرۆزەدا غیرەتی ئەهلی یەهوودی نابەحەق نیشان دا کە بە بێشەرمی خۆیان بوخل و فەقریان دایە پاڵ خودای پاک و بێنیاز، دە حاڵێکدا کە شەئن و عەزەمەتی خودا دوورە لە بوخل و فەقیری، لەوەڕایە کە خودای حەکیم ڕووڕەشی یەهوودیان لە دنیا و

ئاخرەت بە وەسیلەی ئایەتەکە نیشان دەدا. بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٨١ی ئالی عیمران:

**لَّقَدْ سَمِعَ اللّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاء سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ الأَنبِيَاء بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ الْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾** ئالی عیمران

**بێ گومان خودا کوتەی ئەوانەی بیست کە وا کوتیان: بێ گومان خودا هەژارە و هەر ئێمەین دەوڵەمەند، بەو زووانە ئەوەی کە وا کوتوویانە و کوشتنی پێغەمبەرانیش، کە بە ناهەق کوشتیانن، تۆمار دەکەین پێشیان دەڵێین: دەی بچێژن سزایەکی زۆر تیژ و سووتێنەر.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٨١**

پێشەکی دەبێ ئەو باوەڕە هەبێ کە خودای پاک و بێ‌عەیب بیسەرە و بینەرە و بێ‌نیازە، و کاتێک ئایەتی ٢٤٥ی بەقەرە دابەزی ﴿مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَاعِفَهُ لَهُ أَضْعَافًا كَثِيرَةً وَاللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْسُطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ جوولەکەکان کوتیان وا دیارە خودا فەقیرە، ئێمە دەوڵەمەندین، بۆیە داوای قەرزمان لێ دەکا، جا خودای تەعالا بۆ لە دمدان و دمکوتیان هات ئەو ئایەتە پیرۆزەی دابەزاند و فەرمووی: سوێند بێت بە ڕاستی خودا قسەی ئەوانەی بیست کە وا کوتیان: بێ گومان خودا فەقیرە و ئێمە دەوڵەمەندین، جا بۆ پاداش و تۆڵەی ئەو بێ‌ئەدەبییەیان لە سەر دەنووسین، کوشتنی پێغەمبەرانی وەک یەحیا و زەکەریا و ... بەبێ تاوان، هەم سزای ئەو قسەشیان و پێشیان دەڵێین: دەی بچێژن سزای بەئێش و ژانی سووتان، دیارە دەبێ بکوترێ دێرەدا سزای تاڵی ئەو تاوانە زلە دە ئایەتی ١٨٢دا بە ڕوونی بەیان کراوە کە نەختێکی دیکە لەوە بەدوا نیشانی دەدەین.

**بۆ ئاگاداری:**

ئەو هەڕەشەی خودا ڕووی دە یەهوودیانە، چونکە ئەوان کاتێ ئەو ئایەتەیان بیست و دیتیان کە کێ هەیە بە چاکە قەرز بە خودا بدات و لەو لایەشەوە بێ‌نەوایی هەندێک لە موسوڵمانانیان دەدیت، هەستان بە تەوهینەوە کوتیان وا دیارە خودای خاوەن‌باوەڕان فەقیرە و نیازی بەوەیە قەرزی پێ بدەین بۆ بەندەکانی و هەم بەندەکانیشی بێ ماڵ و دارایین. دە حاڵێکدا ئێمە لە هەموو بابەتێکەوە بێ‌نیازین و خاوەنی شکۆ و عیزەتین، هەچەن یەهوود لە ڕابردوودا جارێکی کە تەوهینیان کردی و ئینکاری خۆیان دەربڕیبوو، بەڵام ئەو سەفەرە ناتوانن لە مقابل

خودادا حاشا بکەن، چونکە کردەوەیان بە تەواوی بە شاهید و سبووت تۆمار کـراوە، هەر وەک کوشتنی پێغەمبەرانیان لە سەر تۆمار کراوە کە بە ناحەق دەیانکوشتن، خودا لە کاتی خۆیدا پێیان دەڵێ: دە بچێژن عەزابی بەئێش و ژانی سزای ئەعمالتان.

ئەوەش با دەرکەوێ: ناو بردنی تەوهینەکەیان دەگەڵک وشتنی پێغەمبەران وێکڕا نیشـانەی زەلامی تەوهینەکەیانە، واتە تا دەرکەوێ کە چۆن توانیویانە ئەو جـورئەتە بە خـۆ بـدەن و بڵـێن: خودا فەقیـرە، بەڵام هـیچ ئەوە بە سـەیر نابینـدرێ لە کەسـانێکی کە بـوێرن بە نـاحەق خـوێنی پێغەمبەران بڕێژن دەشوێرن بڵێن: خودا فەقیرە.

لێرەدا ئەگەر ئەو پرسیارە بکرێ: ئەو یەهوودییـانەی پێغەمبەرانیـان کوشـتوون غەیـری ئەو یەهوودیانەی دەورانی پێغەمبەرن، وڵامەکەی دەبێ ئاوا بدرێتەوە:

ئەو یەهوودیـانەی دەورانـی پێغەمـبەر شـانازی و خۆهەڵـدانەوە دەکەن بە کـاری ئەو یەهوودیانەی خوێنی پێغەمبەرانیان ڕشتووە.

**سووکە ئاوڕێک:**

ئایەتی ﴿سَنَكۡتُبُ مَا قَـالُواْ﴾ واتە خـودای بێهاوتـا دەفەرمـوێ: ئـێمە دەسـتوورمان دا بە فرشتەکان کە ناسزا کوتنی ئەوانە لە نامەی عەمەلیاندا بۆ حیسابی ڕۆژی حیسابێ تۆمار کەن.

ئایەتی ﴿وَقَتۡلَهُمُ الأَنبِيَاءِ بِغَيۡرِ حَقّٖ﴾ واتە کوشتنی پێغەمبەران بە نـاحەق، ئەو عەمەلەشـیان لە پەنا کوتەی ناسزایان تۆمار کەن تاکوو تێبگەن ئەو یەهوودیانە کە ئەوە هەوەڵـین بێئەدەبییـان نییە وا بێئابڕووانە دەیڵێن و دەیکەن، بەڵکە ئەوە کاری پێشینەکانیانە ئەو پێغەمـبەر کوشـتنە و بە ڕەوای دەزانن.

ضمیری «قتلهم» دە ئـایەتەکەدا بەرەو یەهوودییەکـانی دەوری پێغەمـبەر دەگەڕێـتەوە، بەو هۆیە: کە ئەوان بەو عەمەلەی ڕابردووانیان جگە لە ڕەزایەت پێشی دەنازین.

ئایەتی ﴿وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ الۡحَرِيقِ﴾ واتە دەڵێین پێیان: دە بچێژن عەزابی سووتان، دێرەدا لابراوێک هەست پێ دەکرێ، ئەو لابراوەش دەبێ وشەی «لهم» بێ، کەوابێ ئایەتەکە لە ئەسڵدا (وَنَقُولُ **لَهُم** ذُوقُواْ عَذَابَ الۡحَرِيقِ) بووە، ئەوە فەرموودەی خودای تەعالا بە وەسیلەی فرشـتەی کرام الکاتبین تۆمار کراون تـاکوو لە کـاتی خۆیانـدا یەهوودییەکـانی بێچـاو و ڕوو بە سـزای عەزابی سووتان بگەن.

**پاشەدۆ:**

کافران لەو ڕێیەوە کە خودا دەستووری ماڵ بەخشینەوەی دا، کوتیان: دیارە خـودا بۆخـۆی ناتەوان وفەقیرە بۆیە دەستووری ماڵ بەخشینی بە خەڵک داوا دەکـا، دیـارە ئەو خەیـاڵ و کـوتە نارەوایەیـان هەڵقـولاوی بیـری تـاریکی نـیەت و باوەڕیـانە، دەیـانکوت بە پێغەمـبەری: ئەتـۆ مەئمووری لای خودا نی بەو دەلـیلە ئەگەر پێغەمـبەری خـودا بـای، وەک دەورانـی حەزرەتـی مووسات ڕەفتار دەکرد لەو بـارەوە، واتە ئەوان هەر کـاتێ بیانویسـتایە بە هـۆی مـاڵ و سـامان خۆیان وە نزیکی خودا خەن، ماڵەکانیان دادەنا ئاورێک لە ئاسمانەوە دەهات بـۆ ئیسـباتی کـار ئەو ماڵەی دەسووتاند، بەڵام ئەتۆ دەتـهەوێ بـۆ ئیسـباتی مەبەسـتی خـۆت ئەو مـاڵە بـدەن بە بێنەوایان تاکوو لە خودا وەنزیک کەون، بە هۆی ئەو ماڵ بەخشینە.

گۆیا کاتێ پێغەمبەرﷺ بە وەسیلەی داوای بەخشینی ماڵ لەو خەڵکە دەهاتە مەیـدان پێیـان دەکوت: ئەگەر ئەتۆ پێغەمبەر بای بۆ مەبەستی خۆت ڕووت لەو خەڵکە نەدەنا بۆ ماڵ بەخشین، چونکە خودا فەقیر نییە تاکوو بۆ چارەی گرفتاری دین و ئایین نیازی بە مـاڵ و دارایـی بەنـدەی بێ. دیارە ئەو شێوە جووڵانەوەی یەهوودیـان دەرحەق بە پێغەمـبەر تەوس و تـانەن دەدرێـن لە شەئنی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری لە لایەن یەهوودیانی بێباوەڕ.

نەختێک لەوە پێش قەرارمان دا عەزابی سووتێنەر بە وەسـیلەی ئـایەتی ١٨٢ بەیـان کەیـن. ئێستاش دەچینە خزمەت ئایەتی ١٨٢ بۆ وەی بە تێر و تەسەلی حاڵی بین لە باسەکە:

**ذَلِك بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ اللَّه لَيْسَ بِظَلاَّمٍ لِّلْعَبِيدِ**
**ئەوەش بە هـۆی ئەو کـارانەوە بـوو کە لە پێشـدا کردبووتـان، بێگومـان خـوداش زوڵـم لە بەندەکانی خۆی ناکات.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٨٢**

دیارە وەک ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ڕایگەیانـد چـاژتنی ئەو عەزابە بە هـۆی ئەو کـردەوە نارەوا و ناشیرنانەتان بوون کە دەتانکوت: خودای بێنیـاز فەقیـرە و خـاوەن نیـازە، دەنـا داوای قەرزی لە بەندەکانی ناکا. جگە لەوەی پێغەمبەرانی خۆشتان دەکوشتن بەبـێ ئەوەی تاوانێکیـان دەرحەق بە ئێوە لێ ڕوودابێ، و هەر بێ ئەوەش لە گوفتاریان حـاڵی بـن هەر لە ڕووی کیـنە و بوغزتان دایان دەگژانـێ و داتانـدەپاچین و ڕێگـای لاسـاری و بەرەڵاییتـان دەگـرتە بەر، دەبـێ

هەموو خاوەن هەست و بیٚ هەستێک ئەوەی بزانیٚ و باوەڕی کا کە خودا ستەمکار نییە بۆ بەندەکانی، واتە کردەوەی خۆتان هۆی ستەمتانە لە خۆتان.

**بۆ ئاگاداری:**

بە هۆی ئەوەی سزا بە گوێرەی ئەعمالە، قسە و ڕا و بۆچوونی ئەوانەی وا دەڵێن سزا لە ڕووی تۆبزی‌گەرییە، هەڵدەوەشیٚ و پووچەڵ دەکرێتەوە: "جبریون"، و بەو هۆیەی ستەم لە کەس ناکریٚ سزا لە سەر ئەساسی عەداڵەتە، کەوابیٚ دەکریٚ بکوتریٚ مەزهەبی "عەدلیە" سابت و ڕەوایە، بەو دەلیلە کەس بەبیٚ خیلاف ناکەوێتە بەر جەنجەڕی تۆڵە و سزا. جا ئە دێرەدا دەتواندریٚ بکوتریٚ: بۆچوونی "اشاعرە" کە ئەویش بۆخۆی ڕێبازێکی مەزهەبییە بە باتڵ دەردەچیٚ لەو بارەوە کە دەڵیٚ: ئەگەر خودا هەموو کەس بخاتە ناو دۆزەخ عەینی عەداڵەتە، چونکە سزا لە سەر ئەعمال دامەزراوە و جیٚ‌گیر کراوە، واتە عەمەل هەر جۆر بیٚ، سزا لە شوێنی ئەو هەڵوەدایە.

وشەی «ظلّام» کە واتە «زۆر» ئەوەش لانی کەمەکە دەسەلمێنیٚ کە کەمیش هەر دوورە لە خودا، بۆ وڵامی ئەو ئیشکالە دەبیٚ ڕوو دێرە کەین وبڵێین: خودا ئەگەر ناحەزەکانی مۆڵەت بدا و لە سزایان دەراویٚ، بە ستەم دێتە ڕوو، و ئەگەر هەر بە گشتی نیزامی تۆڵە و سزا و پاداشتی ئەعمالی بەندەکانی بگۆڕیٚ و جەبەیانبدا وەک زۆر زوڵم دێنە بەر چاو چونکە زۆر لە حەق‌وناس دەشۆرێتەوە و نایەتە ڕوو. ئەو بۆچوونە لەو سنوورە تێپەڕیوە کە هەموو بوون مڵکی خودایە، دەخالەت دە مڵکی خۆشتدا ڕەوایە، چونکە کەر با کەری خۆشت بیٚ پێنج پووتی بارە، دەی لیٚ بار کەی، تاوانە.

لە سەر جوملەی ﴿وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ دڵ هەست بە چەن پرسیارێک دەکات پێویستە بۆ حەسانەوەی دڵ و ڕزگاری لە گومان و دڕدۆنگی وڵام وەدریٚ:

١. پێشەکی دڵ ئەوەی قبووڵە و باوەڕی پێیە کە زاتی پاکی خودای خاوەن شکۆ لە هەچی کەم‌وکووڕی و ڕەزیلی ئەخلاقی و خەسڵەتی ناپاکی بەدوورە، و یەکێک لە ئەوسافی بەرزی ئەو زاتە بیٚ‌هاواڵ و هاوتایە "عەداڵەتە" واتە خودا هەندە عادڵە حەتا بۆنی زوڵمی هەر لێنایە، دەبیٚ بۆچی لێرەدا نەفی شتێکی وەک ظلم بیٚ، کە هەرگیزاو هەرگیز لەودا هەست پیٚ ناکریٚ، کرابیٚ؟ چونکە لەو بارەدا دەکەوێتە ئەو بارەوە دڵ کە پابەند بە خودایە لەو بوختانە خودا کەمێک ظالم بیٚ، جا بۆ وڵامی ئەو گرێیە دەبیٚ بکەوینە سەر ئەو باوەڕە کە ظلم نەفی کراو لە خودا ظلمی

مەجازییە و حەقیقی نیە. زوڵمی مەجازی واتە: شتێک بـدرێتە پـاڵ کەسـێک کە ئەو کەسـە ئەو شتەی تێدا نەبێ؛ زوڵمی حەقیقی واتە مافی کەسێک بە زایە بدەی و لێی بتـارێنی، دە حاڵێکـدا خودای بەحەق و بێتا مافی هیچ خاوەن مافێک بە فیڕۆ نادا و زەوت ناکا، بەو دەلیلە: خـاوەنی بەڕاستی بوونەوەر خودایە، واتە هەچی هەیە ئی خودایە مافی بەڕاسـتی غەیـری خـودای پێـوە نییە، جا لە سەر ئەو ئەساسە خاوەنی مافی چۆن وەجـوولێ لە ڕاسـت مـافی، مـافی خـۆیەتی تەجاوز بە مافی غەیری تێدا چاو ناکرێ، بەڵام دێرەدا دەشبێ ئەوە بـزانین خـودا مـافی هەمـوو خاوەن مافێکی سنووردار کردووە، واتە نیزامی بوونەوەر و کائیناتی بە دار و لەلە و سنووردار دە بەر یەک ناوە، لادان لەو سنوورە لە لایەن هەر کەسەوە سەر بگرێ بە زوڵم دێتە ژمار، بە کورتی و بە کوردی، زوڵمی نەفیکراو بەو مانایەیە ئەگەر ئەو کارە لە بەندەیەک ڕوو بدا ئەوە زوڵمە، کە وابێ مەجازەن دەبێ بکوترێ ئەگەر لە خوداش ئەوە ڕوودا حەتا بە زوڵم دێـتە ژمـار، جـا بـۆیە دەڵێن: خودای خاوەن جەماڵ و کەماڵ زوڵم بە ڕەوا نازانێ چ جای ئەوەی بیداتە پاڵ خۆی.

٢. دەشکرێ بەو جۆرەش وڵام بدرێتەوە: مەبەست لە «عبیـد» کە جەمعـی «عبـد»ە، تەنیـا ئەنبیا مەبەست بن، ئایەتەکە ئاوا بووبێ: (وَأَنَّ اللّٰهَ لَيْسَ للأنبياء بعدم انتقامهم من الكفّـار) واتە خودا بەو هۆیە کە زوو تۆڵەی پێغەمبەرانی لە کافران نەستاندووە هیچ زوڵمێکـی لە پێغەمـبەران نەکردووە، چونکە پێغەمبەران تەسلیمی قەزا و قەدەرن و لەو لایەشەوە لە حاند بەڵا وسەختی و تاڵی خۆڕاگر و لەسەرخۆن، ئەهلی تۆڵەش نین لە جیاتی تۆڵە لە دوژمنـان لە دنیـادا داواکـاری ئەجری قیامەتین.

٣. دووبارە دەکرێ ئەو جۆرەش بەراوەرد کەین: مەبەست لە «عبید» کافر بن، ئەودەم مانای جوملەکە ئاوا دەبێ: خودا لە ڕاست تۆڵە ستاندن لە کافران و عەزابدانیان بە زاڵم نایەتە ژمـار. بەڵکە بە عەداڵەت دێتە حیساب، چونکە کافران زوڵمیان لە ئەنبیایـان کـردووە، بارتەقـای زوڵـم کردنەکەیان تۆڵە و سزا بە جەق دەژمێردرێ، چونکە تەنیێ زاڵـم عەداڵەتە. تفسـیر مظهـری، ج ١٨٧-١٨٨/٢.

٤. ئەگەرچی لە سەر ئەساسی یاسای عیلمی سیغە مبالەغە واتە زۆر، کەمەکەی وەبەر نایە، دێرەدا خودا زۆر زاڵم نییە، هەڵدەگرێ کەمێک زاڵم بێ ـ العیاذ بالله ـ بەڵام دێرەدا هاتنی سـیغە مبالەغە بـۆ زۆر و کەم دە نەزەر نەگیـراوە، بەڵـکە بـۆ نەفـی ئەسـڵی زوڵـمە. دەشـکرێ دێـرەدا مەبەست بە هاتنی سیغە مبالەغە چەندێتی (کمیّت) بێ، نە چۆنیەت (کیفیّت)؛ یا دەڵێن وشەی

«ظلّام» دێرەدا مەبەستمان تەنیا وەپاڵدانە، وەک عطّار کە بە عەترفرۆش دەکوترێ بە ڕەسمی، نە بە زۆر عەتر فرۆش، دێرەشدا واتە نسیبەتدانی نەفی زوڵم وەلای خودا بەو مەبەستەیە کە زاتی پاکی خودا بە تەوری قەتعی زوڵمی نییە، و یا دەتواندرێ بکوترێ: خودایەکی تەواو لە سیفات و ئەسماءدا دەکرێ بۆ ئیسباتی کەماڵ دە ئەسماء و سیفاتدا سیغە مبالەغە ڕووی تێ کرێ، و یا دەڵێن: نەفی زۆری شت نەفی کەمیش لە خۆ دەگرێ.

جوملەی ﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ﴾ وەپاڵدانی عەمەل وەلای دەست، کە ئەسبابی عەمەلە دەست لە ڕێی مەجازەوەیە چونکە دە واقیعدا عامیل ئینسانە، دێرەشدا «ید» بە جەمع واتە «أیدی» هاتووە بەڵام دە جێی دیدا بە دوو هاتووە وەک دە ئایەتی ١٠ی سوورەی حجردا: ﴿ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ﴾. دێرەشدا ﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ﴾ هەر دوو ناڕەوا نین دە ئادابی عەرەبدا.

کێ دەیهەوێ بە درێژایی بڕوا بچێتە لای تەفسیری کەبیر، ج ١٠/ هەمان ئایەتی ١٨٢.

بۆ تەواو کردنی مانای ئایەتی ١٨٢-١٨١ کە یەهوودییەکان دەڵێن: خودا فەقیرە و ئێمەش دەوڵەمەند، دەچینە خزمەت ئایەتی ١٨٣ کە دەوێشدا بەیانی بێئەدەبی یەهوودییان دەخرێتە ڕوو کە دەڵێن بێباوەڕی ئێمە بە پێغەمبەرایەتی محەمەد ئی ئەوەیە کە خودا پەیمانی دەگەڵ بەستووین کە ئیمانی پێ نەهێنین تاکوو قوربانی ئێمە بە ئاور گڕ نەدرێ، جا لەو ڕێگایەوە دەتوانین بڵێین ئایەتی ١٨٣ هەمان ئایەتی ١٨١ و ١٣٢یە، ئەوەش ئایەتەکە:

**الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ عَهِدَ إِلَيْنَا أَلاَّ نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىَ يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ تَأْكُلُهُ النَّارُ قُلْ قَدْ جَاءكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِي بِالْبَيِّنَاتِ وَبِالَّذِي قُلْتُمْ فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ**

ئەو کەسانەی دەڵێن خودا پەیمانی دەگەڵ بەستووین ئیمان بە هیچ پێغەمبەرێک ناهێنین تا قوربانییەکمان بۆ دێنێ و ئاگرێک ئەو قوربانییە دەسووتێنێ، بڵێ: خۆ چەندین پێغەمبەر پێش من بە بەڵگەی ڕوونەوە و ئەو شتانەش کە گوتتان هاتنە لاتان، بۆ کوشتنتان گەر ڕاست دەکەن.

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٨٣

پێشەکی ئەوە با بزانین ئەوانەی وا کوتیان خودا لە تەوراتا ڕایگەیاندووە بە ئێمە کە بە هیچ پێغەمبەرێک بڕوا نەهێنین هەتاکوو قوربانییەکمان بۆ نەکات و لە ئاسمانەوە ئاگرێک بنێرێ و بێ ئەو قوربانییە لە ناو بەرێ و بیخوات، ئایا ئیهانە نییە!؟ ئایا تەوهین نییە بە مەقام و شان و

شکۆی خودا؟ دەبێ بڵێین: یا ئەو داوایە لە خودا بۆ ئەو کەسانە و بەو کەیفیەتە لە ڕادە بەدەر گەوجانەیە، ئەوجار پێویستە بزاندرێ دە مقابل داوای ئەوانە لە پێغەمبەر هەڵوێستی خودا دەگەڵ پێغەمبەر لە ڕاست ئەو بێشەرمانە چ دەبێ و چ دەڵێ: خودا دەفەرموێ بە پێغەمبەر لە وڵامی ئەوانەدا بڵێ: خۆ یەحیا و زەکەریا و شوعەیب کە پێغەمبەرانی ئەوانە و بەر لە منیش هاتنە لاتان بە نیشانە و دلیل بۆ ئەو قوربانیەی کە ئێوە داوای دەکەن بۆچی ئتیاعەو نەکردن و لە باتی ئەوەی ئیتاعەتیان لێ بکەن کوشتتانن، زۆر بەبێ ئەدەبی و بێ ئیحتیرامی ئەگەر ڕاستن لە داواتاندا بۆچی واتان کرد؟!

گۆیا وەک دەڵێن چەن جوولەکەیەک وەک کعبی اشرف و مالک حذیف و حویەی اخطب دێنە خزمەت پێغەمبەر و پێی دەڵێن: بڕوات پێ دێنین بەو مەرجەی کە لە تەوڕاتا چمان پێ کوتراوە بۆمان بێنیە دی. ئەوەی لە تەوراتا پێمان گەیوە ئەوەیە: بە هیچ پێغەمبەرێک بڕوا نەهێنن هەتا قوربانییەک نەکا و لە ئاسمانەوە ئاگر نەنێرێ و نەیسووتێنێ. جا ئەو ئایەتە ١٨٣ی ئالی عیمران لە سەر ئەو قاڵ و باسە بۆ هەسدانەوە و لە دمدانی ئەوانە دابەزی، سەرەڕای ئەوەش دڵدانەوەی پێغەمبەریشی لێ هەست دەکرێ و دەگەڵ ئاگاداری بۆ وەی خۆ ناڕەحەت مەکەن بە قسەی وان و سەخڵەت مەبە، بەو جوولەکە ئیمانت پێ ناهێنن و هەر ڕۆژەی بەهانێکی تازەت پێ دەگرن و داوای موعجیزەیەکی تازەت لێ دەکەن.

**پاشەدۆ**

ئەهلی یەهوود بۆ خۆبواردن لە ئیمان هێنان، بە پێغەمبەر بەهانەی زۆر لە ئەقڵ بەدووریان دەگرت و دەیانهێناوە، وەک ئەوە کە دەیانگوت: دەگەڵ خودا پەیمانمان هەیە کە بڕوا بە هیچ پێغەمبەرێک نەکەین تا قوربانییەکمان بۆ نەهێنێ و ئاگر لە ئاسمانەوە نەیە و نەیسووتێنێ، دیارە مەبەست و بەهانەی وا بۆ بڕوا هێنان نەبوو بەڵکە هەر بەهانەگیری بوو، چونکە دە پێشدا نیشانەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەریان دە کتێبەکانی خۆیاندا وەک تەورات و ئینجیل بێ، دیبوویان و چاویان کردبوو. دیارە پێغەمبەریش ڕوویان تێدەکات و پێیان دەڵێ: مەگەر بەر لە ئێستێ پێغەمبەرانی وەک یەحیا و زەکەریا و شەعیا بە نیشانە و بەڵگەی تەواو نەهاتن بۆ لاتان؟! ئەو قوربانیەی ئێستێ داوای دەکەن مەگەر نەیانهێنا؟! ئێوە لە جیاتی ئیتاعە لێیان زۆر بە بێئەدەبانە و بێشەرمانە کوشتتانن!؟

ئایەتی ﴿قَدْ جَاءكُمْ رُسُلٌ...﴾ دێرەدا خودا وڵامی یەهوودییەکانە دەیانداتەوە،کە بە

پێغەمبەر دەفەرمویٚ: کە پێیان بڵێ: کە بۆچی تا وێستا چەندین پێغەمبەرانی وەک دانیاڵ و زەکەریا و یەحیا و بەر لە ئێستێ هاتبوونە لای ئەژدادەکان و کە خاوەنی هەمان سیفاتی بەرز بوون و قوربانیەکانیشان بەو جۆرەی داوایان لێ دەکردن دەسووتاندن و کەچی سەرەڕای ئەو خزمەتگوزارییەیشیان هەر دەیانکوشتن و یا دەرمانداویان دەکردن؟ ئەی ڕاست دەکەن بۆچی ئەو ناڕەوایەیان دەرحەقیان بەڕێوە دەبردن؟ جا دیارە بێ گومانە دە ڕیشەی دڵ و دەروونتاندا کینە و غەزەر و بوغزتان لە ڕاست پێغەمبەران هەیە.

لەسەر ئەو هەموو ناسزا و ناڕەوایانەی کافران دەرحەق بە کاروانی پاکی پێغەمبەرانی خودا دێ دڵداری و دڵخۆشی موسوڵمانان و پێغەمبەر دەداتەوە بەو شێوەیە: کە تۆ لەو ئاکارە ناڕەوایانەی کافران خۆت وەتەنگ و سەخڵەت مەهێنە و مەکە، بەڵکە خۆ وەخۆ گرە، چونکە ئەو بێئەدەبیەی وان هەر دەرحەقی تۆ نیشان نەدراوە بەڵکەدەگەڵ پێغەمبەرانی پێش تۆش دەکارکراوە، بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۸۴ی ئالی عیمران:

> **فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَآؤُوا بِالْبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ وَالْكِتَابِ الْمُنِيرِ**
> **ئەگەر ئێستاکە تۆ بە درۆزن دەردەکەن و دەزانن، لە پێش تۆدا بێ گومان پێغەمبەرانی دیکەشیان بە درۆزن دەزانی، دە حاڵێکدا ئەوان بەڵگەی ڕوونی وەک کتێبی زەبوور و کتێبی ڕوونکەرەوەشیان هێنابوو.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ۱۸۴

سا با بڵێین بە کورتی: ئەگەر ئەتۆیان بە درۆزن زانی، جا خۆ بەر لە تۆش پێغەمبەرانێک بە درۆزن لە لایەن ئەوانەوە زانراون دەگەڵ چەندان نیشانەی ئاشکراشیان کە پێ بووە، وەک چەند ڕووپەڕەیەکی ئامۆژگاری و نامەی تەواوی ڕوون بۆ لایان، کەچی هەر نەهاتوونە ڕەدایە و چاک نەبوون.

### سووکە ئاوڕێک:

خودا دڵخۆشی پێغەمبەر و موسوڵمانان بەوە دەداتەوە، خۆ ئەگەر ئەوان کافرانە ئەتۆ بە درۆزن دەزانن ئی کینە و غەرەز و حەسادەتیانە، نەک لە ڕووی دەلیل و بەڵگەیەک بێ، نابێ خۆیان پێوە ناڕەحەت کەی، چونکە ئەو ئاکارانەیان ڕابردووی هەیە لە دەوراندا کە پێغەمبەرانی پێش تۆشیان وەبەر ئەو پلارانە داون و بە درۆزنیان زانیون، دە حاڵێکدا نیشانە و بەڵگە و

موعجیزەی ئاشکراشیان نیشان داون، وەک زەبوور، کتێبی منیر و هەروا دەلیلی دیکەش، بەڵام هەر دانەمەزراون و ڕانەوەستاون لە خراپەکاری.

**دڵ دەیهەوێ بزانێ جیاوازی لە نێوان زەبوور و کتێبی منیردا چییە؟**

لە وڵامی دڵدا دەڵێین: دوو ئیحتیمال هەڵدەگرێ وڵامەکە:

١. پێشەکی دەبێ ئەوە بزانین کە زەبوور مەربووت بە کتێبەکانی پێغەمبەرانی دەورانی پێش حەزرەتی مووسا بووە، بەڵام کتێبی منیر واتە تەوڕات و ئینجیل، جگە لەوەش زەبوور کە بەشێکە لە کتێبی ئاسمانی، هەر پەند و ئامۆژگاری و دوعایە، بەڵام کتێبی منیر کە ئاسمانییە خاوەنی دەستوورات و یاسا و ئەحکاماتی کۆمەڵایەتی و فەردییە، دیارە ئەوە جیاوازییانە دە بەرنامەدا دەنا هەر دوو ئاسمانین.

پێویستە بزاندرێ مەبەست بە «البیّنات»ی ئایە دەبێ چ بێ؟ چونکە ئەگەر بێتوو مەبەست بە موعجیزات بێ، دیارە ئەودەم دەبێ عەتفی «زەبوور» و «کتاب منیر» سەر ئەو کرێ، ئەودەم نەزمی ئایەتەکە ئەوە دەخوازێ کە بکوترێ: موعجیزاتی پێغەمبەران غەیری کتێبەکانیان بێ، ئەو تەعبیراتەش خوازیاری ئەو مانایە دەبێ کە هیچ کام لە پێغەمبەرەکان کتێبەکانیان موعجیزەیان نەبێ، کەوابێ دەکرێ بەو پێیە بکوترێ: تەورات و ئینجیل و زەبوور و صحف هیچ کامیان موعجیزە نەبوون، بەڵکە تەنیا لە کتێبەکانی ئاسمانی هەر قورئان موعجیزەیە و کیتابە، ئەوەش دەبێتە سیفەتێکی تایبەتی بۆ محمد الصطفیﷺ، ئەو نەزەرە لە ئیمام فەخری ڕازییەوە سەرچاوەی گرتووە.

دەشکرێ بکوترێ: «کتاب المنیر» عەتف بێ وەسەر «زبر» یا کتابی منیریش هەر لە جوملەی «زبر» بێ. ئاوا عەتفەکە جوان و ڕەوا دەبێ. دەشکرێ مەبەست بە «زبر» «صحف» بێ، و مەبەست بە کتاب المنیریش تەورات و ئینجیل و زوبور بێ. بۆ زێدە زانین لەو بارەوە بڕوانە لە تەفسیری کەبیری ئیمام فەخری ڕازی باسی هەمان ئایەتی ١٨٤ی ئالی عیمران.

**ئاگاداری:**

هەندێک نەزەریان وا داوە کە «زبر» لە «زبر»ە و بە مانای زەجر و بەشێک لە وەعز و مەسائیلی زەجر و لۆمەن، وشەی «منیر»یش کە سیفەتی کیتابە بەیانگەری ئەوەیە کە ئەو کتێبە شارەزاکەری ڕێی نەجاتی خەڵکە. تفسیر کبیر، ١٢٧/٩؛ قرطبی، ٢٩٦/٤؛ روح المعانی، ٤٨٤/٤.

دوو ئایەتی ١٨٣ و ١٨٤ دڵداری پێغەمبەر بوون دنیایی، ئەو ئایەتی ١٨٥یش زێدە دڵـدارییە بۆ پێغەمبەرﷺ بە ئیعتیباری ئاخرەت، چـونکە لە ئاخرەتـدایە دەردەکەوێ کـێ ڕووڕەشـە و کـێ ڕووگەشە، بەو پێیە دەبێ بکوترێ: ئایەتی ١٨٥ بۆ کافران هەڕەشەیە بۆ خاوەن ئیمانـان مـژدەیە، بۆ ڕاستی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٨٥ی ئالی عیمران:

**كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَما الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الْغُرُورِ**

**سەرلەبەری گیانلەبەران مەزەی مردن دەچێژن، بەبێ گومان ڕۆژی پەسڵان پاداشـەکانتان پـێ دەدرێتەوە بە تێر و تەسەلی، جا هەر کەس لە ئاگری دۆزەخ دوور خـرایەوە و خـرایە بەهەشـت، بەبێ گومان ئەوە خۆشبەخت و ڕزگارە، ژیانی ئەو دنیایە جگە لە کاڵایەکی هەڵخەڵەتێن هیچی تر نییە.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٨٥**

خودای تەعالا بۆ دڵخۆشیدانەوەی پێغەمـبەر و ورەدان بە ڕوحـی پـاکی پێغەمـبەر جـار دەگەڵ جار لەسەریان ئاگادارە و دە هانایانەوە دێ، بۆ نموونە بە هۆی ئەو ئایەتە ١٨٥ و ١٨٦ە کە دێ لەوە بەدوا، دڵخۆشیدانەوەی پێغەمبەرﷺ دەکا و دەداتەوە بەوەی کە مادام مردن هەبـێ بـۆ هەموو گیانلەبەرێکە، خەمخواردن پێویست ناکات لە ڕاست ئەو کەسانەی بە ناڕەوا و بێ بەڵگە بەرەنگـارت دەبـن چـونکە سـزای هەمـوو سـەرەڕۆیانی نـاڕەوا و پاداشـتی هەمـوو لاسـار و کیـنەلەبەران لە پـاش مەرگ دەدرێ و دانـدراوە لەوێ. خـۆ دیـارە ئەو ڕۆژەش چـونکە هـاتنی حەتمییە و دە ڕێیەدایە، ئەگەر دووریشبێ هەر نزیکە و وەبزانە هاتووە، جا کەوایە دەبێ ڕاست و ڕەوان بڵێین هەر کەس لەو ڕۆژەدا بە هـۆی بەزەی خـودا و ئەعمالـی ڕەوا وپەسـەندی وەدوور خرێ لە ئاگری دۆزەخ و بەرەو بەهەشت بخرێتە ڕێ، ئەوەیە بەڕاسـتی پیـرۆز و سـەرکەوتوو و بەرەندە، و ئەوەی بە دوای خراپەکاری خۆی لە دنیا پێوە بێ لەوێ، کێ هەیە دە هاواریەوە بـێ؟ دەبێ ئینسان ئەوە بە دروستی بزانێ و لە ژێر سەری داینێ کە ژیانی دنیا جـگە لە ئـارەزوویەکی هەڵخەڵەتێن و سەرکێش هیچی دیکە نییە، دنیا ڕازاوە بە شەکراو و خۆشی بەڵام کە قەپاڵت پێدا گرت جوان تێدەگەی کە ناوەکەی پڕە لە ژەهر و تاو و لەرز، بـۆ کەس نیـیە ئەو دنیـایە تـا سـەر بەڵکە لەوەڕگە و مۆڵگەی تاقی کردنەوەیە، تاڵ و شیرین لێک دراوە، بۆ ئینسانی داندراوە.

**پاشەدۆ**

ژیانی دنیا خۆشی و ناخۆشی ڕۆژی چەتەی مەرگ دەیبا و دەڕوا ناهێڵێ پێبزانێ ئینسان تا لە ناکاو دایدێتە سەر و ماڵی دەیبا و دەڕوا، زۆر لە ئینسانی دنیا پەرست هەیە بە هۆی عیشق و ئەوینداری دەگەڵ دنیا ڕۆژی مەرگ و حیساب دەخاتە پاش گوێیان، و ڕۆژی پاداش و تۆڵە کە ئەساسی ژیانی یەکسەرە و بێبڕانەوەیە، نەفامانە دەیفرۆشن نەفامان بە دنیای ناوەرۆک ژەهراوی و فانی، دنیا بە تەواوی جوانی و خۆشی خۆی ئینسانی بەرەو خۆی ڕادەکێشێ و بێخەبەری دەکا و دەیخافڵێنێ بۆوەی ڕۆژی حیساب فەرامۆش کا بەڵام ئینسانانی خاوەن هەست و هۆش ژیانی بێبڕانەوە نافرۆشن بە ژیانێکی کاتی و ژەهراوی.

لە سەر ئایەتی ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ﴾ دڵ پڕ لە هەست و شعوور هەست بە ئیشکال دەکا، ئیشکالەکەش لەو دەروەڕا چاوە دەگرێ: وشەی «کل» بە دوو جۆر بەراوەرد دەکرێ: جۆرێکیان بە مانای گشتی و عامە، جۆرێکیشیان مانای تەغلیبە، واتە هەموو شت دانا گرێ بەڵام بە مەجاز وەژێر خۆی دەدا.

جا دەو ئایەتەدا ئەگەر وشەی «کل» بە مانای گشتی تەعبیر و بەراوەرد کەین ئەو مانای ئایەتەکە ئاوای لێ بە سەر دێ: هەچی خاوەنی حەیات بێ، جا ئینسان بێ یا جنۆکە بێ یا دار و دەوەن و گیا و گوڵ بێ، یا فرشتە و باقی حەیوانات بێ، دەبێ مەزەی مەرگ بچێژێ.

ئەگەر مانای تەغلیبیش لە لەفزی «کل» بگرین مانای ئایەتەکە ئاوا بەراوەرد دەبێ بکرێ: زۆربەی گیانلەبەران دەبێ مەزەی مردن بچێژن، بەڵام هەندێک نایچێژن،

ئەوەش ئیشکالە دەبێ بۆ ڕزگاری لەو ئیشکالە ڕوو دە قەولی زانایانی فەلاسفە واتە قەدیمیان کەین کە ئەوان لە سەر ئەڕواحی موجەڕەدە و فرشتە نەزەریان وا داوە لە ناو ناچن و مەزەی مەرگ ناچێژن، دە حاڵێکدا قەولی جمهوور لە سەر ئەو باوەڕەن «کل» عامە واتە هەچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە تەنانەت عیزرائیلیش دەبێ مەزەی مەرگ بچێژێ، دیارە ئەو نەزەرەی جمهووریش پەسند و ڕەوایە دەگەڵ ئایەتەکانی قورئان دێتەوە. سەیری ئایەتی ١١٦ی مائیدە بکە:

> **تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَ لاَ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِك**
> **(عیسا بە خودا دەڵێ) ئەوەی وا دە ناو دڵی مندایە ئەتۆ دەیزانی، بەاڵم ئەمن دەربارەی ئەوەی دە نەفسی تۆدایە هیچ نازانم.**

ئەو ئایەتە ئەوەمان نیشان دەدا کە خودا بە «نفس» ناوبرا دیارە نەفس و زاتیش هەر دەبێ

یەک بن بەو پێیە هەچی بێگیانیشە وەبەر هات بۆ چاشتنی مەزەی مەرگ، بۆ ئیسباتی ئەو نەزەرە ڕوو دەکەینە ئایەتی ٦٨ی سووڕەی زمر:

**وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاء اللَّهُ**
**فووش دەکرێ بە کەڕەنادا، ئینجا ئەوانەی لە ئاسمانەکان و لە زەویدان دەمرن، جگە لەوەی کە خودا ویستی لە سەریەتی وەمێنێ.**

ئەو ئایەتە ئەوەمان پێ دەڵێ هەندێک هەن خودا نایهەوێ مەزەی مەرگیان پێ بچێژێ، دەگەڵ ئەوەی عمومیەتی لەفزی «کل» لە ئایەتەکەدا پێمان دەڵێ: هەچی گیانلەبەرە دەبێ بمرێ، ئەوە دێرەدا ئیشکال ڕووبەڕوومان هات، دەبێ چۆنی خۆ لێ قوتار کەین؟

ناچار دەبێ هەڵێین تاکوو خۆ دەگەیێنینە ئەو پەناگایە: مەبەست دە «کلّ نفس»ی ئایەتەکە ئەو خاوەن گیانانەن کە وا لە ژێر باری تەکلیفن، بەو دەلیلە خودا لە ئاخری ئایەتەکەدا لە سەر هەمان بابەتدا دەفەرموێ: ﴿فَمَن زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ﴾ هەر کەس لە ئاگری دۆزەخ دوور خرایەوە و خرایە بەهەشت بەبێ گومان ئەوە خۆشبەختە؛ بە کورتی و بە کوردی، دەبێ بکوترێ: ئەو ئایەتە عامە و پاشان تەخسیسە دەنا سازگار نابێ.

وشەی «فقد فاز» واتە چوونە ناو بەهەشت، سەرکەوتنە بە سەر هەچی ئارەزوویە. ابن عباس دەڵێ: فاز واتە خۆشبەخت بوو و ڕزگاری هات، لە ئیمام ئەحمەد و ئیمام بوخاریەوە: مَوضِعٌ في الجَنَّةِ خَيرٌ في الدّنيا و ما فيها: واتە یەک پارچە زەوی لە بەهەشتایە بە ئەندازەی یەک شەلاق لە تەواوی دنیا چاتر و بەئەرزشترە.

ئایەتی ﴿وَما الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الْغُرُورِ﴾ واتە ژیانی دنیا بەغەیرەز تێکەڵاوی کاڵای فریودەر نییە. خودا دەیهەوێ دێرەدا ڕاستی و حەقیقەتی دنیا نیشانی ئینسان دا، واتە دنیای ژن و منداڵ و دارایی ئینسانی بە خۆوە دەخافڵێنن و بە خۆوەی دەکوشن لەولای بێخەبەر دەکەن، چونکە وشەی «غرور» لە «غرّە»وەیە واتە فێڵ و فریودەر.

لە حەزرەتی عەلییەوە: «هيّ لَيِّنٌ مسُّها و قاتِلٌ سَمُّها» واتە دنیا زاهیرەکەی نەرم و ڕاکێشەرە، دەست بۆ بردنی خاوەنی کەیف و لەزەیە، بەڵام بەرهەمەکەی کوشندەیە، وەک ماری خۆش خەتوخاڵ وایە کە لە ژێر پێوەدانی ئەودا ژەهری پڕ ئێش و ژانی مەرگاوی هەیە.

بەڵام بۆ مرهی خاوەن هەست و شعوور ماڵی دنیا ئەسبی بەزین ولغاوە، ئامادەیە لە دەرگا وێستاوە بۆ بە هاوار وەچوونی خۆت و داماوان. «نِعمَ الْـمالُ الصّالِحُ لِلرَّجُلِ الصّالِحِ): واتە

چەند چاک و پاکە ماڵی حەڵاڵ بۆ مرۆی پاک و ئازا و بەزییک.

**بۆ ئاگاداری:**

خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم بە هۆی ئایەتی ١٨٥ی ئالی عیمران دڵداری دا بە حەزرەتی ڕەسووڵ و موسوڵمانان کە دنیا دەبێ تێدا بچنە دەرێ و مەزەی مەرگی تێدا بچێژرێ، بەڵام ئاخرەت شوێنی لێحەسانەوەیە، ترسی چاژتنی مەزەی مەرگی تێدا نییە، دووبارە خودا دەیهەوێ بە وەسیلەی ئایەتی ١٨٦ لەو جۆرە دڵخۆشیدانەوانە زیاد کا، بەو شێوەیە: ئەوانەی موسوڵمانەکان و پێغەمبەریان ئەزیەت و ئازار پێ دان دە هەرای ڕۆژی ئوحوددا، لە دواڕۆژدا بانگیان دەکەم هەر بە هەمان شێوە تووشی ئەزیەت و ئازار و عەزابیان دەکەین، کە وایە ئەی پێغەمبەر و ئیماندارەکان خەفەت مەخۆن و خۆ وەخۆ گرن، ڕۆژی تۆڵە و پاداش لە ڕێتانە و ها هات و گەیشتە سەرتان، بۆ ئەوانەی دەزانن ڕۆژی سەخت و تاڵ دەگاتە سەریان زۆر تەنگەتاوی و سەخڵەتی لە خۆ ناگرێ، چونکە ئامادەیی هەیە بەڵام بۆ ئەوانەی نازانن دێ ئەو ڕۆژە دنیا خافڵاندنی هاتنی لە ناکاوی ئەو ڕۆژە نەترەیان دەبا و دەیانتۆقێنێ. بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٨٦ی ئالی عیمران:

**لَتُبْلَوُنَّ فِي أَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ أَذًى كَثِيرًا وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الأُمُورِ**

**سوێند بێ بە خودا سەبارەت بە ماڵ و گیانتان ئەزموون دەکرێن، قەسەم بە خوداشلە لایەن ئەو کەسانەوە کە لە پێش ئێوەدا کتێبیان پێ دراوە، هەروا لە لایەن موشریکانیشەوە قسەی دڵتەزێن و پڕ لە ئێش و ئازاریش دەبیستن، ئەگەر بێتو خۆڕاگری و پارێزگاری وەخۆ گرن بێگومان ئەوە نیشانەی جەختکردنە لەسەر کارەکان.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٨٦**

خوای تەعالا لە دڵخۆشیدانەوەکەی پێغەمبەردا سوێند دەخوا و دەفەرموێ سوێند بێ ئێوە بە ماڵ و دارایی و گیانتان تاقی دەکرێنەوە، دووبارە سوێند بێت ئەوانەی لە پێش ئێوەشدا بوون و نامەی ئاسمانییان بۆ هاتووە و هەروا ئەوانەش کە هاوبەشیان بۆ خودا پەیدا دەکرد لە هەموو ئەوانە قسەی ناڕەوا و بێجێ زۆر دەبیسران، کەوایە ئێوە ئەگەر ناڕەواش ببیستن سەخڵەت مەبن، بەڵکە دەبێ بۆ بەجێگەیاندنی ئێش و ئەرکەکانتان خۆ وەخۆ بگرن و خۆپارێز بن.

دەڵێن ئەو ئایەتە هۆی دابەزینەکەی جگە لە دڵدانەوەی پێغەمبەرﷺ، دەمکوت کردنی ئەو کەسانەش وەخۆ گرتووە کە قسەی ناڕەوای دەرحەق بە پێغەمبەرﷺ و هاوڕێکانی کردووە، وەک کەعبی ئەشرەف و فەنحاص عازوورا، گۆیا فەنحاص دەیکوت خودا فەقیرە و ئێمە دەوڵەمەندین، و هەر وا خودا جوولەکە و گاورەکان کە سەرزەنشت دەکا لە بەر ئەوەی ئەوانە نیشانەکانی پێغەمبەر محەمەدیان لە تەوڕات و ئینجیلدا حاشار دەدا و دەیانشاردەوە.

**بۆ ئاگاداری:**

خودای تەعالا خاوەن باوەڕان ئاگادار دەکاتەوە کە پێش ئەوەی بە بەڵا و سەختی گرفتار بن، تەواوی هێز و توانایی خۆتان ئامادە کەن و وەگەڕ خەن بۆ وەی دەرد و بەڵا نەتوانێ بتانخلیسکێنێ و دەشبێ دەگەڵ ئەو شتەی کە بە توندی بەرەنگاری دەبێ خۆ لە دەس نەدەن و نەبەزن لە بەرانبەریاندا. شتەکەش ئەوانەن:

١و ماڵ و دارایی و ئەولاد تەنیا زینەتی دنیایەن، فریوی پێ نەخۆن و نەتانخەڵەتێنێ،

٢. لە کاتی شەڕ و بەربەرەکانیتان تەنیا ئامانجو بەرگری لە ئایینی خودا بێ و خۆ بە شەهید دان دە ڕێی خودادا.

٣. لە ڕاست ئەهلی کتێب و موشریکان کە دەیانهەوێ ئەزیەت و ئازارو پێ بدەن زمان چ بە ڕێیدیدا خۆ وەخۆگر و بەتوانا بن.

**ئایا مردن تەنیا بۆ لەشە؟ یا بۆ ڕۆحیشە؟**

دەبێ لە وڵامدا بکوترێ: مەرگ و نەمان تەنیا بۆ لەشن، ڕوح هەر وا باقی دەمێنێ؛ جا دە ناو چیدا بێ، دەبێ بە ئەمری باری، ڕوح هەچەن ئەزەلی نیە بەڵام بە هۆی چەن دەلیل و بەڵگە دەکرێ ئەبەدی بێ، چونکە پرسیار و عەزاب و خۆشڕوویان لە ڕۆحە و پاش جودا بوونەوەی لە لەش بۆ لای خودایە گەڕانەوە وەک دەفەرموێ: ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ. ئیمام فەخری ڕازی بۆ ئیسباتی ئەو مەبەستە خۆی هاویشتۆتە سەنگەری ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ﴾ واتە نەفس بە مەرگی لەش نامرێ چونکە چێژەری مەزەی مەرگ نەفسە، دەبێ بۆ ئەو چاشتنە وەمێنێ، جا بەو پێیە دەبێ مانای ئایەتەکە ئاوا بێ: كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ وَ الْبَدَنِ. تفسیر کبیر، ج ١٢٥/٩.

**عەزابی گۆڕ دەبێ هەبێ یا نەبێ؟**

ترمذی و ابوسعید خدری و طبرانی لە ابوهریرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە: اَلْقَبرُ رَوضَةٌ مِن

ریاضِ الْجَنَّةِ أَو حُفرَةٌ مِن حُفَرِ النّـارِ: واتە قەبـر بـۆ چاکانبـاغێکە لە باغەکـانی بەهەشـت، بـۆ خراپان چاڵێکە لە چاڵەکانی دۆزەخ. لەسـەر ئەو بەراوەردە عەزاب بـۆ گیـانە و گیـانیش دەبـێ هەبێ تا ئەو خۆشی و ناخۆشـییە بچێـژێ، دیـارە هەمووومـان دەزانـین لەش دەڕزێ و دەبێـتەوە خاک، خۆشی و ناخۆشی بۆ ڕوح دەمێنێتەوە.

**بۆ ئاگاداری:**

تا ئێستا خودای تەعالا حەز و ناڕەواکانی ئەهلی کتێبی وەک یەهـوود و نەسـاراکان بـن بە خەڵک ڕاگەیاند و بەیانی کرد، ئەوجار دەیهەوێ حاڵ و ئەحـواڵی پێشـەواکانیان نیشـان دا، کە ئەوان دە حاڵێکدا بە وەسیلەی ئایەتەکانی تەورات و ئینجیل ئاگاداری حەقانیەتی ئایینی ئیسلام بوون و پێغەمبەرایەتی پێغەمبەریشیان هەر لەوێرا پێ گەیی و دەیانزانی حەقە و ڕاستە پێغەمبەرە، بەڵام بە هەوای خەڵکی ناحاڵی ئەو سەردەمی و بـۆ قـازانجی خۆیـان ئەو حەق و ڕاسـتییەیان قووت دەدان و حاشایان لێ دەکرد، هەر وەک زانایانی هەموو دەورانێـک بـۆ خـاتری خۆشـی دەستەڵاتی کات و زەمان زۆر وا هەیە بە ناحەق دادەپۆشن و دەیدەنە ژێر لیچانەوە.

دیارە دە ئـایەتی ١٨٦دا خـودا بە پێغەمـبەر تەوسـیە بە سـەبر و خـۆڕاگری دەکـا لە بەرابەر ئەزیەت و ئازاری ئەهلی کتێب وەک جوولەکە و گاورەکان، مەسەلەن یەکێک لەو ئـازارانەی کە ئەهلی کتێب پێغەمبەری پێ ئەزیەت دەکەن ئەوەیە: ئەهلی کتێب ئەو نیشـانانەی کە دە تەورات و ئینجیلدا لە بابەت پێغەمبەرایەتی پێغەمـبەردا هەن و هاواریـانە، ئەوان یـا حاشـاری دەدەن یـا دەیگۆڕن بە قازانجی خۆیان، خودای تەعالا دەبنی گوێیان دەسریوێنێ کە دە حاڵێکـدا نـاڕازین بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر و دە تەورات و ئینجیلیشدا حەقانیەتی ئەو ڕاگەیێندراوە و وەعدەو لێ وەرگیراوە کە حاشاری ئەو حەقیقەتە نەدەن، کەچی سەرەڕای ئەو هەموو دەلیل و بەڵگە ڕوونانە حاشای دەکەن و لە حەق خۆ لادەدەن، جا بۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئـایەتی ١٨٧ی ئـالی عیمران بۆ تێگەیشتنی زیاتر:

**وَإِذَ أَخَذَ اللّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَاب لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلاَ تَكتُمُونَـهُ فَنَبَـذُوهُ وَرَاء ظُهُـورِهِمْ وَاشْتَرَوْاْ بِهِ ثَمَناً قَلِيلاً فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ**

**یادێک لەو کاتە بکەوە کە خودا لەگەڵ ئەو کەسانەی کە کتێبیان پێ درابـوو، پەیمانـی بەسـت کە بێ گومان پێویستە جوان ئەوکتێـبە ڕوون کەنەوە بـۆ خەڵکـی و نەیشـارنەوە، کەچـی ئەو پەیمانەی خودایان خستە پشـت گـوێ و بە نرخـی کەم گۆڕییـانەوە، کە واتە مـامەڵەیەکی زۆر**

**دزێو و خراپ دەکەن.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٨٧**

دەبێ بڵێین خودای تەعالا دەدوێ دەگەڵ پێغەمبەرەکەی و پێی ڕادەگەیێنێ: ئەی پێغەمبەر! یادێک لەو کاتە وەکە کە خودای بانی سەر لە ئەهلی کتێب وەعد و بەڵێنی لێ وەرگـرتن کە ئەو پەیام و نامەیەی خودا پێی داون بە زۆری بگرن و مەیهاوێنە پشت گوێیـان بە کەم و کـووڕی بە خەڵکی ڕاگەیێنن و مەیشارنەوە، کەچی ئەو بێباوەڕانە هاتنی بێ بەڵگە و دەلیل بەڵـکە تەنیـا بە هۆی حەسادەت و کینەدڵی خسـتیانە پـاش گوێیـان و حاشـاریان دا لە عـالەم و بە بێنرخیـان فرۆشیان بە شتێکی هیچ و بێقیمەت.

ڕەنگە خەڵکی ئێستێ ئەگەر ئەو پەیامەی خودا و ئەو کارەسـاتەی خەڵکـی ئەو سـەردەمی چاو کا زۆر بە عەجایبی سەیر کەین و بزانن، بەڵام سەیری خۆیان نەکەن، کەن، کە چۆن یاسای ئایینی لە مەڕ مافی ئینسان دەخەنە ژێر پێیان و ئەو مافە بەوپەڕی بێڕەحمی دەخەنە ژێر پێیان و دەیرێژن، بە حەقیش بە عالەمی دنیا ڕادەگەیێنن بە وەسیلەی ڕادیۆ و مـاهوارە و ئـامرازی دیـکە هەم ڕۆژی ئەو هاوارە دەکا و دنیایەک دەهارووژێنێ پێـی. ئەی بە داخەوە کێـیە بە دۆی خـۆی هەڵنەڵێ و بێ لە بێدەستەڵات کێیە دۆستی حەق و ڕاستی!

**بۆ ئاگاداری؛ پاشەدۆیەک**

نموونەیەکی دیکە لە ئاکار و عەمەلە ناحەزەکانی ئەهلی کتێـب کە شـارنەوە و قـووتدانی ئەو شتە حەقانەن کە خودای بـانی سـەر بە وەسـیلەی ئەو ئـایەتە پیـرۆزەی ١٨٧ ڕایـدەگەیێنێ: خودای تەعالا بە وەسیلەی پێغەمبەرانی پاک و دروستکاری خـۆی کـاتێ خـۆی بە تەئکیـدەوە پەیمان و قەراردادی دەگەڵ ئەهلی کتێب بەست کە حەق لە عالەم نەشارنەوە و حاشاری نەدەن، کەچی بە هۆی سوار بوونیان لە ئەسپی هەوا و هەوەس و دنیاپەرەستی چەن ڕۆژیان پێ نەچوو هاتن ئەو پەیمانی مۆرکراوی لای خودا و پێغەمبەریان فرۆشت و خستیانە ئەولاوە، حاشـاریان دا بۆ خاتری بەهـایەکی کەمـی بێنرخـی دنیـا، خۆیـان بە ڕووڕەشـی لای خـودا دەرهێنـا بـۆ بارەقەڵڵای دنیا، ئەو کارەساتە ناحەز و پڕ لە تاوانە بە زۆری ڕووی لە زانایانی ئـایینییە، چـونکە ئەوان مەئمووری ڕاگەیێنەر و ئیبلاغی حەق، عەوام ئەو حەق و ناحەقە ناتوانێ لێک هەڵاوێرێ، هەچی بیکا لەو بارەوە دەڵێ: حەمـزەل بە گـوێی مامۆسـتا! بە داخەوە بە زۆری زانایـان بە نـاو

ئایینی واتە مێزەربەسەران چاو دەکرێن، جارچی و بڵیندگۆی دەستەڵات بن لە باتی بڵیندگۆی حەق.

زەمیری «ە» دە جوملەی (لَتُبَيِّنُنَّهُ) دوو نەزەریان لە سەر داون قورئانزانەکان؛ وەک سعید کوڕی جبیر، و سدّی و حسن بصری و قتادة.

سعید کوڕی جبیر و سدّی نەزەریان وا داوە: ئەو زەمیرە بۆلای حەزرەتی ڕەسووڵ دەگەڕێتەوە، ماناکەی ئاوا دەکەوێ: ئەهلی کتێب لە لایەن خوداوە بەرعۆدە بوون کە بە تەواوی سیفات و حاڵات و تایبەتمەندییەکانی محەمەد هەچی وا لە تەورات و ئینجیلدا هەن و کوتراون بۆ خەڵکیان ئاشکرا کەن تاکوو ئەو خەڵکە بە شەوق و زەوقی ئەو سیفاتانە مەیل و ئارەزوویان بۆ لای ئیمان بە پێغەمبەر زیاد کەن. تفسیر کبیر، ٤٤٥-٥٥٣٣.

حسن بصری و قتادة نەزەریان ئاوا داوە: ئەو زەمیرە بۆ لای کتێب دەگەڕێتەوە واتە ئەهلی کتێب ئەرکە لە سەریان کە تەورات و ئینجیل هەچی وا لە بارەی محەمەدەوە دە ناویاندا هەیە و ڕانراوە، بۆ خەڵکی بەیان کەن و حاشاری نەدەن. بەڵام ئەو ئەرکەیان بەجێ نەگەیاند و ئەو قەول و قەرارەیان نەبردە سەرێ. تفسیر کبیر، ج ١٣٠/٩.

لە سەر نەزەر و بۆچوونی حەسەن بەسری و قەتادە ئەو حوکمە لە خۆگری هەموو زانایانی ئایینە بگرە لە زانایانی ئایینەکانی پێشوو ئێستێ بەو دەلیلە مەبەست لە وشەی کتابی ناو ئایەتەکە عیلم و زانستە. تفسیر طبری، ج ٥٤٥/٣؛ تفسیر قرطبی، ج٣٠٤/٤

ئایەتی ﴿فَنَبَذُوهُ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ﴾ واتە ئەوان بێباوەڕانە ئەو بابەتانەی کە دە تەورات و ئینجیلدا لەمەڕ حەزرەتی محەمەد المصطفیدا بەیان کراون وەلایان ناون و دایانپۆشیون، و بە شتێکی کەم بایخی دنیایی ئاڵوگۆڕیان پێ کردوون بەو خەیاڵە پووچ و بەتاڵەیان: کە ئەگەر ڕاستی بە خەڵک بکوترایە خەڵک بەرەو ئایینی دەهاتن، ئەوکات ئەو ماڵ و دارایەیەی کە ئەوڕۆ لە لایەن ئەو خەڵکە پێمان دەگا دەیاندایە ئیسلام و بە مە نەدەگەیی، خەیاڵی پووچ و بەتاڵی هەموو خەیاڵ بەتاڵان ئاوایە.

خاوەن هەست دەتوانێ ئەو ئایەتی ١٨٧ ئەگەرچی هۆی دابەزینەکەی گەلی یەهوود و نەساران لە بابەت ئاکاری ناحەزیان، بەڵام ئەگەر بە سرنجەوە تێی هەڵڕوانردێ خەڵکی موسوڵمانیشی تێدا چاو دەکرێ، چونکە ئەوانیش خاوەن کتێبی وەک قورئانن کە پیرۆزترین کەلامە.

بەسەرهاتێکی بەتام:

گۆیا حەجاج یەکێک دەنێرێتە لای حەسەن بەسری و پێی دەڵێ: ئەو قسانەی لە تۆڕا بە حەجاج دەگەن ئەوە چن؟ حەجاج دەڵێ لە وڵامدا: نە ئەوانەی هەموو بە تۆ دەگەن قسەی منن، نە ئەوانەی ئەمن دەیانڵێم هەموو بە تۆ دەگەن. چونکە ئەتۆی کوتووتە منافق ڕیشە قرتاوە کەچی حەمایل و شمشێر وەخۆ خراویت لێوە دیارە. کوتی بەڵێ وایە، بەڵام هۆی ئەوەی کە تۆ ئەوەی دەڵێن بە من دە حاڵێکدا ئەمن پێی مخالیفم چیـیە؟ حەسەن بەسری کوتی: ئاشکرایە خودا پەیمانی لە ئەهلی کتێب وەرگرتووە کە ئەو کتێبە بە عالەم ڕاگەیێنن و نەیشارنەوە، کە لە جێی ئەو شتی دی بە خەڵک دەکوترێ.

قەتادە فەرمـوویەتی: زانست گەر دەرخـواردی عـالەم نەدرێ وەک ئەو گەنـجە وایە کە نایبەخشی، وەک مار پاپۆکەی لەسەر دەبەستی. حیکمەتێ کە ڕانەندرێ وەک بتـی دانـدراوە نە دەخوا و نە دەخواتەوە و نە چ دەڵێ و نە چی لە دەست دێ. جا کەوایە دەبێ بکـوترێ: طـوبی لِعالِمٍ ناطقٍ و بِمُستَمِعٍ واعٍ، هذا عَلِمَ عِلْماً فَبَذَلَهُ و هذا سَمِعَ خَیراً فَوَعاهُ.

دووبارە حەزرەت فەرموویەتی: مَن کَتَمَ عِلماً عَن أَهلِه اَلْجَمَ بِلِجامٍ مِن نارٍ: واتە کەسێ وەشارێ زانست لە ئەهلی خۆی، لغاوی ئاوری دەخرتە زار.

لە حەزرەتی عەلییەوە: ما أَخَذَ اللهُ علی اَهلِ الْجَهلِ أن یَتَعَلَّموا حَتَّی أَخَذَ عَلی أَهلِ الْعِلـمِ أَن یُعَلِّموا: واتە خودا نەزانان تاوانبار ناکا لە بابەت فێر نەبوون و نەزانینەوە، تا ئەو کاتەی زانایان تاوانبار نەکا کە بۆچی حەولیان نەداوە نەزانان زانا کەن.

بە کورتی، تا زانا بە تاوانی ئەوەی کە حەولی زانا کردنی نەزانـی نەداوە نەخـرێتە ژێـر بـار، نەزان باری ناخرێتە سەر، کەوابێ دەبێ بکوترێ: ڕووڕەشی بۆ ئەوانەی پێش بە زانست دەگرن، بۆ وەی خەڵک بار کەن.



پاش ئەوەی ئاکار و کردەوە ناحەزەکانی ئەهلی کتێب هاتنە ڕوو و خرانە بەر باس لە لایەن خوداوە، ئەوجار بەیانی ئەو حاڵەتەیان دەکـرێ کە خۆشـحاڵن بە ئەعـمال و ئاکاریـان، بـۆ ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٨٨ی ئالی عیمران، تاکوو بە تێر و تەسەلی تێبگەین:

لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِینَ یَفْرَحُونَ بِمَا أَتَواْ وَّیُحِبُّونَ أَن یُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ یَفْعَلُواْ فَلاَ تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِّنَ الْعَذَابِ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِیمٌ

**نەکەی هەرگیز وا بزانی ئەو کەسانەی شادمانن بەو کـارانەی کردوویـانە، حەزیـش دەکەن بـۆ ئەو کارەی کە هیچ کاتێ نەیانکردووە، پەسن بکرێن؛ واشیان تێمەگە، ئەوانە لە سزا ڕزگاریـان دەبێ، سزای بەژانیشیان هەیە.**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٨٨

خودا باسی زانا جوولەکەکان دەکات و دەفەرموێ ئەی ڕەوانەکراوەکان، گومـان وا مەکەن بە نیسبەتی ئەوانەی وا کەیف‌خۆش دەبن بەو کردەوە ناڕەوا و ناحەزانەیان ستایش بکرێن بەوەی نەیانکردووە، وا مەزانن ئەوانە لە کاریاندا پیرۆز و سەرکەوتوون، و لە ئاو پەڕیونەوە و نەجاتیـان بووە لە سزای کردەوەیان. چونکە ڕۆژێکیان بەرەو پیر دێ کە دەو ڕۆژەدا هەچی هەیە لە چاک و لە خراپ، بە کێشان و سیە و تەرازوو هەموو شت دێتە حیساب و کێشان، تای تەرازووش شەرم لە کەس ناکات.

خـاوەن هەسـت و شـعوور و بەمشـوور سـەرەڕای ئەوەی داوەڵێـک لە پەرێـزی ئاکـار و کردەوەیاندا چاو ناکەن و چاو ناکرێ، وێستا لە میـوانی ڕۆژی حیسـاب و تەرازوو دەترسـێن و شەرمەزاری لای خودایان هەیە و کەیف‌خۆش و لەخۆباییش نابن بەوەی خەڵک پێیان هەڵبڵێ، چونکە دەزانن تەرازووی خێر و شەڕ لە لای خودایە و هەر ئەو دەزانێ. ئەهلی دنیا زاهیربینە، لە نەهێنیاتدا بێ‌خەبەرە، بە نیسبەتی خۆی باشت ببینێ، باشت باس دەکا؛ خراپت چاو کا، خراپت دەڵێ و باس دەکا؛ چاوەش بی ئەهلی کەیف نەهەنگ سەنات دەکەن و پێت هەڵدەڵێن، عالم و زانا و دانا بی ئەهلی دنیاپەرەست بە ناحەزت دەڕوانێتێ، چونکە زەم و لۆمەی دۆسـتەکەیان کە دنیایە دەکەی، کە وایە دەبێ بکوترێ کێ باشە؟ دەبێ بکوترێ ئەو کەسـە باشـە کە وەک ئاشـە؛ بەرهەمی حەیات و ژینی عالەم پێـک دێنـێ خەڵـک نەجـات دەدا لە بێ‌ژیـانی و برسـیایەتی و تینوایەتی و حەسانەوەی بۆ گەل دابـین دەکـا. نەک حەسـانەوەی خەڵـک ناحەسـاوە دەکـا بـۆ حەسانەوەی دەمێکی خۆی. وەک ئەوڕۆ چاو دەکرێ چرای ڕوونـاکی دنیـای ژینـان لە عـالەم کوژاندۆتەوە تاکوو دز و جەردەکانی دنیا بتوانن ماڵ و ناموس و شەرەف و حەق و کەرامەتـی بەشەری دەو تاریکەشەوەدا تاڵان کەن وبیبەن بۆ خۆیان، بەو خەیاڵە بەتاڵەیان کەس نایانبینێ و چاویان ناکەن لە سەربان و بن‌بان و بڵێندگۆکانیشیان هاواریان گوێی دنیا کەڕ دەکـا کە ئـێمەین نەجات‌دەر و ئایینی بەڕاستی. خەڵکی پێ دەخەڵەتێـنن و هێـواش هێـواش لەواشـەیان دەکەن، خوداش بەوانە دەڵێ چی؟ ﴿فَلاَ تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِّنَ الْعَذَابِ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾

**پاشەدۆ:**

دەبێ بڵێین ناحەزان دوو دەستەن:

١. دەستەیەکیان لە سەرەڕۆیی خۆیان واز دێنن و دەگەڕێنەوە، شەرمەندەگی خۆیان لە حزوور خەڵکی خودا و خودا و کەرامەتی بەشەری، ئیزهار دەکەن و پێی لێ دەنێن، ئەوانە بێگومان ئەگەر هەبن ئەهلی نەجات و ڕزگاری لای خەڵک و خودان.

٢. دەستەیەکیان هەیە کە لە ڕاست حەق خێل و ناتەواون، ئەوانە نە تەنیا واز لە فەسادکاری و ئازار و ئەزیەتی خەڵک ناهێنن خۆشیان بە شەرمەندەی کۆمەڵ نازانن بەڵکە خۆشیان بە چاوسوورو ڕێبەر و نەجاتدەری گەل ناو دەبەن بە ئەندازەیەک خۆ دەباتە پێش لە ڕاوی خەڵکدا بە وەسیلەی ئەو دێوجامەی دەخۆی پێچاوە، عالەم وەجۆش دێ و دەڵێن: دەبێ ئەو محەمەد مەهدیەی باسی لێوە دەکرێ ئەوە هەو نەبێ؟! دە شەوە تارکی ژیان و مان و ئیماندا چراگازیان بۆ هەڵدەکا بۆ عالەم دەڵێ ئەوە نووری خودایە لە لایەن خودایەوە هاتۆتە لاتان بۆ نەجات و ڕزگاریتان، زۆر لەوە زیاتریش دەڕواتە پێش لە فریوودانی گەل، ئەوانەن کە دە زەلکاوی ڕووڕەشی ڕۆچوون تا خۆ بلەقێنن زیاتر ڕۆدەچن تا دەگەن بە عەزابی دواڕۆژ.

پێویستە ئینسان بە پێی هەڵسەنگاندن و وەزن کردنی دەوران و کائینات و ئاڵوگۆڕیان ئەوە بزانێ و باوەڕی پێ بکا بە باوەڕێکی ڕاستەقینە، کە خاوەنی بەڕاستی و واقیعی کائینات واتە ئاسمان و زەوی، خودایە، و خاوەنی هێز و توانای بەتەواوی هەر خودایە و دەتوانێ خائینان و سەرەڕۆیان دە کاتی خۆیدا وە بەر جەنجەڕی تۆڵە و سزا دا و کەسیش توانای ئەوەی نەبێ بتوانێ بڵێ: وا نابێ یا وا دەبێ. بەڵکە دەبێ زەلیل و لارەمل بڕوانێتە کردەوەکانی، وڵاتی بێ بەرتیل و بێ تکاکار و بێ شافیع کە پێی دەکوترێ ڕۆژی نەفسی‌نەفسی، واتە هیچ نەفسێک ناتوانێ لە خۆی بەو لاوە چارەساز بێ، چارەی خۆشی پێ ناکرێ، عەمەل نەبێ.

جا بۆ ڕاستی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٨٩ی ئالی عیمران و ١٩٠ بۆ وەی بە تێر و تەسەلی و بە باوەڕەوە لە ئەوزاع تێبگەین.

**وَلِلّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللّهُ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ ﴿١٩٠﴾**

فەرمانڕەوایی ئاسمانەکان و زەوی بە دەست خودایە، خودا بە سەر هەموو شتێکدا بەتوانایە (١٨٩) بە ڕاستی لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوییەکاندا و لە ئاڵوگۆڕ و هاتوچۆی

**شەو و ڕۆژدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە، بۆ ئەوانەی کە خاوەنی هەست و ئەقڵ و شعوورن (١٩٠)**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٨٩ و ١٩٠.**

دەبێ بڵێین بە باوەڕی و باوەڕیش بکرێ کە ئەو دوو ئایەتە پیرۆزانە ئەوە نیشان دەدەن و ئەوەمان پێ دەڵێن کە بێباوەڕانی ستەمکار و خائین بە ئەقڵ و ویژدان و کەرامەتی بەشەری دڵنیا بن لەوەی هەر وا بە مفت و مەرحەبایی دەرناچن و ڕزگاریان نایە لە دەس سزای بێئامانی خودای تۆڵەستێنی بزنی کۆڵە لە بزنی شاخدار، بەڵکە دەیسەلمێنێ ڕۆژی خۆی بە وانەی حەقیان نەسەلماندووە ڕۆژی خۆی کە بەڵێ تۆڵەستێنی تۆڵە و سزا خودایە و بەتوانایە و باکی لە کەس نییە و هەر خۆیەتی خاوەنی ئاسمانەکان و ئاو و هەوا و زەوی و گیانلەبەرەکان، ستەمکاران و مافخۆران و خۆبەزلزانەکان قوتار نابن لەو خودایە، خۆ بە کوێوە دەنێن؟ بۆ وا خۆیان کوێر و کەڕ کردووە لەو ڕۆژە کە وا ها گەیشتە سەریان، ئاوڕ وەدەن لەوەی کە بێگومان لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازی شەو و ڕۆژدا نیشانانێکە بۆ خاوەن دڵە وشیارەکان، تا کەی بیر ناکەنەوە و سەر هەڵنابڕن ببینن؟ چاو هەڵبڕن بە چاوی ژیر و دڵی پڕ لە بیر سەیر لە ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازی شەو و ڕۆژ کەن کە چۆن بە بێ پاش و پێش و بێ وێستان دێن و دەچن تاکوو تۆی گیانلەبەر تێیدا وەحەسێی و وەحاوێی. بۆ حەسانەوە و حاوانەوەو لە عالەم وەدوور خستووە و بۆ وەخەبەر نایەن و سەیری ئەو هەموو نیشانانە ناکەن کە هەر یەکەی بۆ خۆی بلێندگۆیەکن هاوار دەکەن، دڵنەرم بن تا دڵنەرمی و دەهاوار کەوێ، وەک گورگی برسی و بێچوولە خوراو خۆت دە کۆزی مێگەلی خەڵک ڕۆ کردبێ؟ بیر ناکەیەوە ددانت دەکێشن، کێیە توانییەتی تا سەر لێخۆڕێ و نەکەوتبێتە کەنداڵی مەرگەوە؟

**پاشەدۆ:**

بە هۆی ئەوەی خودای توانا و زانا خۆی مالکی ئاسمانەکان و زەوییە ئاگادارە بە سەر هەموو شتێکدا، ئەوانە ناتوانن لە سەر ئەو هەوایەی کە هەن بێ ئیزن و ویستی خودا بە هیچ ئاوات و ئارەزووی خۆیان بگەن، و ناشتوانن خۆیان لە ژێر عەزاب و دەردی خودا قوتار بکەن.

خودای تەعالا بە هۆی ئاسار و نیشانەکانی ئاسمان و زەوی ئینسانی بەرەو بیرەوەری و بەرجەوەندی لەو نیشانانەی دەعوەت دەکا تاکوو ئینسان بتوانێ بۆ ناسینی گەورایەتی و

دەستەڵات و کارجوانی خودا خۆی زیاتر لەوەی هەیە وەنزیک خا لە خودا، ئینسان ئەگەر بەرجەوەند بێ دەتوانێ بە وەسیلەی ئەسبابی زاهیری خۆی و دنیا بە بەهرەیەکی گەورە و بەرچاوی خوداناسی بگا، وەگەڕ خستنی بیر و هەست و ئەقڵ و شعوور لەمەڕ نەزم و نیزامی کائینات خۆی عیبادەتێکی گەورەیە و شارەزای تەواو دەدا بە ئینسان بۆ خوداناسی.

**بەسەرهات و ڕووداوێکی بەلەزەت:**

کابرایەک دێتە لای حەسەن بەسری، کە لە بابەت حەجاج کوڕی یۆسف پرسیار دەکا و وڵامی لێ دەوێ. حەسەن بەسری لە ڕاست داوای کابرای پرسیارچی ماوەیەک دادەمێنێ و ڕادەمێنێ بە دەم ئەو خەیاڵەوە خۆ دەتلێنێتەوە: ئەگەر ڕاستی نەڵێم لە بابەت حەجاجەوە بەو کابرایە، حیسابی قیامەت ئەستۆم دەگرێ، ئەگەر ڕاستیش بڵێم حەجاج دەنێرێ مەئموران ئەستۆم دەگرن، سەرەنجام نەیتوانی چش بکا لە عەزابی حاشاردانی حەق ڕۆژی قیامەت، بەڵام چشی کرد لە عەزابی حەجاج، کەوتە وڵام دانەوەی کابرای پرسیارچی، کوتی ئەگەر لێم دەپرسی حەجاج چۆنە؟ حەجاج ستەمکار و تاوانکارە و منافقە، خەڵک دەخەڵەتێنێ بە قسەی تەڕ و پارە، دەشیانکوژێ بە ناحەق.

ئەو قسانە بە حەجاج دەگەنەوە و دەنێرێ بە شوێن حەسەن بەسریدا، لێی دەپرسێ: ئەوە لە بارەی منەوە چت کوتووە؟ حەجاج هەچی کوترابوو لە ڕاست ئەو هەمووی بە چاودا داوە و پێی کوت بە حەسەن بەسری کوتی: وا دیارە لە عەزابی من ناترسی و بێخەیاڵی؟!

حەسەن بەسری لە وڵامیدا کوتی: نەخێر، لە تۆ ناترسم چونکە قامچی خودا لە ئی تۆ بەژانترە.

حەجاج پێی کوت: مەگەر ئەتۆ سروشت بۆ کراوە، لە لای خودا کە وا خۆت وەغیرەت خستووە ئەو قسانە بکەی؟

حەسەن بەسری کوتی: نا، ئەمن سرووشم بۆ نەکراوە لەو بارەوە، بەڵام سرووش بۆ پێغەمبەر محەمەدﷺ کراوە.

حەجاج کوتی: کام وەحی؟

حەسەن کوتی: ئەو سرووشەی بۆ کراوە: حەق نابێ حاشار درێ و قووت درێ. (ئایەتی ١٨٧ی ئالی عیمران)ی بۆ حەجاج خوێندەوە.

حەجاج کوتی: ئەو ئایەتە دەرحەق بە ئەهلی کیتابە وەک یەهوود و نەسارا بێ.

حەسەن بەسری کوتی: نەخێر، ئەو ئایەتە عامە، چونکە خودا نەیفەرمووە «من الیهود و النصاری» بەڵکە فەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ﴾ جا خۆ دیارە کتێب وەک قورئان بێ، بۆ مەش دابەزیوە، کەوایە ئێمەش وەبەر ئەو حوکمە دەکەوین.

جگە لەوانەش حەسەن بەسری ڕووی دە حەجاج کرد و کوتی: کێ بە زوڵم و کوشتار وەڕێ خا و خەڵک لە دار دا و بیخنکێنێ، و بەو هۆیە خەڵک بترسێنێ لە خۆی، ئەو کەسە بێگومان فاسقە، فاجرە، ستەمکارە و ئەجنەی هارە.

حەسەن بەسری کوتی: ئەی حەجاج، ئەگەر دەتهەوێ دەگەڵ خودا مقابلە بکەی و یەکڕوو ببیەوە، دەستوور بدە با بمکوژن، ئەگەر ناشتوانی دە گژە خودا ڕاچی، وەک تێڕاچووی، ئازام کە.

حەجاج ئازادی کرد و نەیتوانی خۆی لە خودا کا.

حەجاج دەگەڵ ئەوەی یەک ستەمکار بوو، بەڵام دە دەروونی خۆیدا موسوڵمان بوو، دەیزانی دە بەرابەر کەلامی خودادا وەک قورئان بێ، ناتوانێ خۆ بنوێنێ وەک ئێستێ ئاوڕ وەسەر قورئان نەدرێ و بکرێتە ...

حەق حەقە و دەبێ ئاشکرا کرێ:

١. یا لە ڕێی تەعلیم و تەربیتەوە

٢. یا لە ڕێی ڕاگەیاندنەوە (تبلیغ و دعوا)

٣. یا لە ڕێی نووسراوەوە (تەبلیغات)

٤و یا لە ڕێی ئیفتاوە

٥. یا لە ڕێی قەزاوەت و ...

دەبێ ئەو بەسەرهاتە بکرێتە نوشتە و بە ملدا کرێ. (تفسیر کبیر، ج ١٣٠/٩؛ ئاوڕ دەوە سەر ئایەتی ١٨٧ی ئالی عیمران)

**بۆ ئاگاداری:**

تا ئێرە لە زۆر بابەتانەوە حاڵی کراین و ئاشنا کراین بە وەسیلەی ئایەتەکان وەک ئەوە: لە تەوحید حاڵی کراین، لە دەمی منافقان و موشریکان درا، و لە ئەحواڵی ئەهلی کتێب وەک یەهوود و نەسارا بن حاڵی کراین کە دەیانکوت: خودا فەقیرە و ئێمە دەوڵەمەندین، و لەوەش حاڵی کراین: خودای ئەزەلی و ئەبەدی و پاک و بێعەیب و تەنیا کاتێ کە بەسەرهاتی گەلانی

ڕابردوو بەیان دەکا پاشان موسوڵمانان بە توندی بۆ لای خوداناسی دەعوەت دەکـا، چـونکە وا هەیە و هەڵدەکەوێ ئەوزاعی دنیا چڵکە هەور و ژەنگ و ژاریـان دەخـاتە سـەر دڵان بەتـایبەت دڵی ئەوانەی کە بە سرنجەوە سـەیری دنیـا و عـالەمی دەکەن جـا بـۆ وەی وەهۆشـیان خـاتەوە ڕایاندەپەڕێنێ بە سیمرخێکی هێدی، بۆ پشتڕاست کـردنەوەی ئەو ڕاسـتییە دەچیـنە خـزمەت ئایەتی ١٩١ی ئالی عیمران، بۆ زێدە زانین لەو بارەوە:

**الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ**

**بەڵگە و نیشانەش گەلێکن بۆ ئەوانەی وا لە هەڵسان و دانیشتن و ڕاکشاندا لە یـاد و زیکـری خودادان، بیریش لە دروسبـوونی ئاسـمانەکان و زەوی دەکەنەوە و دەڵـێن: ئەی پەروەردگـاری ئێمە، ئا ئەمانەت هەر وا بە پووچی و بێهوودەیی دروست نەکردووە، پاکی و خاوێنی بۆ تـۆیە، بمانپارێزە لە سزای ئاگر.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٩١

ئەگەر بێتو سرنج بگرین لە ناوەرۆک و سیمای ئەو ئایەتە، فێـری سـێ جـۆرە عیبادەتمـان دەکات: عیبادەتی زمـانی، عیبـادەتی جەسـتەیی، عیبـادەتی دڵ؛ وەک دەبینـین کە دەفەرمـوێ: ئەوانەی یادی خودا دەکەنەوە بە وەستان و دانیشتن و لە سەر کەلەکە و بیـر لە دروسـت بـوونی ئاسـمانەکان و زەوی دەکەنەوە و دەڵـێن: پەروەردگـاری ئـێمە، ئەمەت دروسـت نەکـردووە بە هەوەنتە، پاک و خاوێنی بۆ تۆیە، بمانپارێزە لە سزای ئاگر.

**ئاگاداری:**

پێویستە ئینسان پڕ بە هەست و شعوورێکی کە خودای حەکیم دایڕشتووە و ناژتوویەتی دە لەشی هەر گیاندارێک بۆ ناسـینی خـۆی بە وەسـیلەی هەڵسـەنگاندن و وەزن کردنـی نیزامـی سروشت، وەگەڕ کەوێ و هەڵخولێ، تاکوو بتوانێ دەر و دەروازەی خودای بێهاوتا وەدۆزێ، بە وەسیلەی بیر و زانستی خودا پێداوی، سەیر و تێفکرین لە نیزامی بەخول و بەسووڕی مانـگ و ڕۆژ و ئاسمان و زەوی، زانکۆی گەورەی زانسـتی خوداناسـییە و پەی بـردن بە حـیکمەت و توانایی خودای بەتوانایە، ئاشنایەتی بە بەیەکزانینی خودایە ئەگەر ئەقڵ و هەستەی چانـدراوی ناو جەستە لێڵ و تاریک نەکرێ، بۆ ڕاست و حەقناسی خودای ڕاست دامەزراوە، ئەگەر ڕێگە

بدرێ بە هەست و شعوور لە سەر نیزامیە بوونەوەر خودای بێ شەریک دەدۆزرێتەوە، دەشزانێ خول و سووڕی کائینات بەرەو یەک هەدەفی واقیعی دە حەرەکەتدایە، و ئەوەش دەزانێ ئەقڵ و زانست، کە هیچ ئاڵوگۆڕ و خول و سووڕێکی ئەو نیزامە بێ هەدەف و بێئامانج نییە، خودا دوورە لەوەی شتی بێهوودە بکا و وەدی بێنێ، جا کاتێ ئەقڵ و شعوور بەو چاوە سەیری نیزام بکات بە دروستی بۆی دەردەکەوێ خودا هەر پێچ و مۆرەیەکی کە لە ئەو نیزامەدا دایکوتاوە، بەبێ هەدەف داینەکوتاوە و دەرکی ئەوەش دەکا کە ئەو نیزامە دەبێ ڕۆژێک وەپێچرێ نیزامێکی دیکەی بێبڕانەوە بێتە ئاراوە.

**ئاگاداری:**

قورئانزانەکان لە بابەت ئایەتی (یذکرون اللە) ڕا و بۆچوونی جۆراوجۆریان داوە، بۆ نموونە:

١. هەندێک ئاوایان نەزەر داوە کە مەبەست لە ذکر دێرەدا نوێژە، چونکە دە ئایەتی ١٤ی طەدا ئاماژە بەو ذکرە کراوە: ﴿وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي﴾ واتە لە بەر یادی من نوێژ بکە؛ لە سەر ئەو بەراوەردە دەبێ بکوترێ: مانای ئایەتەکە دەبێتە: خاوەن ئەقڵان ئەوانەن کە نوێژخوێنن، چ بە پێوە، چ بە ڕاکشانەوە ئەگەر توانای وەستانیان نەبوو، و ئەگەر توانای دانیشتنیان نەبوو بە ڕاکشانەوە. بە کوردی، نوێژ نەکردن دەرووی نەماوە.

٢. هەندێکیش دەڵێن: مەبەست لە «ذکر» هەمان ذکری مەنشوورە کە بریتییە لە تەسبیحات و لا اله الا الله و حەمد؛ ئەوکات دەتواندرێ تەعبیری ئایەتەکە بەو شێوە بێ: ئەوانی وا خاوەنی ئەقڵ و شعوورن هیچ کات لە یادی خودا غافڵ نابن چ بە پێوە چ بە دانیشتن و چ بە ڕاکشانەوە.

گۆیا حەزرەتی عەلی فەرموویەتی: أولوالالباب ئەوانەن کە دایمە دە یادی خودادان، بێئەقڵیش ئەوانەن کە بە دایمە دە یادی دنیادان.

٣. هەندێکیش دەڵێن: مەبەست لە ذکر یاد بە دڵە نەک بە زمان، چونکە بە دڵ دەتواندرێ بەردەوامی یادی خودا، بە زمان دەس نادا ئەو بەردەوامییە. تفسیر کبیر، ١٣٦/٩.

**ئاوڕێکی تایبەتی وەسەر جوملەی اولو الالباب:**

دڵی بەهەست دێرەدا ڕادەمێنێ و دادەمێنێ لەوەی: خودای تەعالا بۆ یاد و بیر لە خۆی وشەی ذکر بە کار دەبا، واتە دەعوەتی عالەم بۆ یادی خۆی بە ذکر دادەگیرسێنێ. دە حاڵێکدا بۆ

یاد و بیر و ڕوانین لە کائینات وشەی «تفكّر» بە کار دەگرێ. واتە لە بابەت سەیر لە ئاسمانەکان و زەوی خەڵک بۆ لای فکر و ئەندێشە دەعوەت دەکا.

بۆ ڕاستی ئەو ڕاستییەش حەزرەت فەرموویەتی: تَفَكَّروا في الْخَلقِ وَ لا تَفَكَّروا في الْخالِقِ. واتە بفکرە لە بوونەوەر (مخلوق)، مەڕوانە و مەفکرە لە خالق.

دەلیل و هۆش هەر دەبێ ئەوە بێ: بە بـوونەوەر دەکـرێ دانەر و نەزمدەری وەدۆزرێ، واتە دەگەیە ئەو باوەڕە کە ئەو بوونەوەرەی وا بە نەزم و نیزام دەبێ دانەرێکیان هەبـێ و وەک وانـیش نەبێ لە توانەوە و فەنادا. بێگومان کاتێ ئەقڵ و زانست لە ڕاوی خالق و مەخلووق بەو ئاکـامە دەگەین واتە: چێژی واقییەتان کرد ئەو ڕاستییەش چێژ دەکەن: لە فەنا و حدوسی مەخلووقات، دەگا بە قەدیمیەتی خالق. و لە کەم و کەیفی مەخلووق و تەشـکیلاتی نەزم و نیزامیـان دەگـا بە باوەڕەی کە خالق کەم و کەیفیەت و شکڵی نییە، هەر ئەوەشە کە پێغەمـبەر فەرمـوویەتی: «مَـن عَرَفَ نَفسَهُ، فَقَد عَرَفَ رَبَّهُ» واتە هەر کەس بزانێ خۆی هاتووە و دەڕوا، دەزانێ کە ئەو کەسەی هێناویەتی و دەشیباتەوە قەدیمە، واتە نە کەس هێناویەتی و نە دەشڕواتەوە، نە کەسیش دەتـوانێ دەخالەت دە کاریدا بکا و هەر کەس خۆی بە ئیمکان بزانێ خالقی بە واجب‌الوجود دەزانـێ و هەر کەس خـۆی بە نیازمەنـد بزانـێ خـالقیش بە بێ‌نیـاز دەزانـێ. جـا لە سـەر ئەو ئەساسـەیە ئیجازەی تەفەکور لە سەر مەخلووقات دراوە بەڵام لە سەر خالق ئیجازە نەدراوە، بەڵکە ذکـر بـۆ الله، تفكّر بۆ بوونەوەر. تفسیر کبیر، هەمان ئایەتی ١٩١.

بەتایبەتی سەیرێک لە ئایەتی ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً﴾ وا هەست دەکا هەست دێـرەدا خودای خاوەن حیکمەت و حەکیم ئاوڕێکی تایبەتی وەسەر بەندەگانی خاس و چاک و پـاکی خاوەن ذکر و فکر دەداتەوە، ئەو عەبـدە پاکـانە کە لە ئەسـەری تێـڕوانین لەو کائینـاتە بە نەزم و نیزامە دەفکرن و ورد دەبنەوە و بۆیان وەزن ناکرێ بە تەرازووی ئەقـڵ و بیـر و زانسـتیان دەگەنە ئەو بەرهەمە گەورەیان کە دەڵێن: ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَـذَابَ النَّـارِ﴾ واتە ئەی وەدی هێـنەری مە، ئەوانەت بە بێهـوودە نەخولڤانـدوون، پـاکی شـایانی تـۆیە، کەوایە لە عەزابی ئاوری دۆزەخمان بپارێزە. دێرەدا ئینسان زانستی خۆی خەتابار دەکا کە دە نیزامی خـودا ناگا.

با ئەوەش حاشار نەدرێ کە شعوور هەست بەوەی دەگا دێرەدا دە ئایەتەکەدا شتێک قووت

درابێ هەر وەک «واحد»ی فەرموویەتی ئەسڵی ئـایەتەکە دەبـێ ئـاوا بـووبێ: یَقولـونَ ربَّنـا مـا خَلَقْتَ هذا باطلاً، واتە یقولون قووت دراوە.

خاوەنی تەفسیری کەشاف فەرموویەتی: یَتَفَکَّرونَ قائِلینَ ...: واتە بیر دەکەنەوە دەو حاڵەدا کە دەڵێن: رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً. واتە ما خَلَقْتَ هذا المخلوقَ العجیبَ باطلاً، وشـەی هـذا ئاماژە وەلای تەعـزیمە، وەک ئەو تەعـزیمە لە هـذي ئـایەتی ٩ سـوورەی ئەسرادا هەسـت پـێ دەکرێ:

> إِنَّ هَـذَا الْقُرْآنَ يِهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ
> ئەو قورئانە ئینسان بۆ ڕێگایەک دەعوەت دەکا کە ڕاستترین ڕێگایە.

خاوەنی تەفسیری کەشاف فەرمویەتی: هەڵدەگرێ لەفزی باطلا ناو ئـایەتەکە حـاڵ بـێ لە هذا.

خودای تەعالا لە وێنە و چەشنی ئایەتی ﴿مَا خَلَقْتَ هَذا بَـاطِلاً﴾ زۆری فەرمـوون، وەک ئایەتی:

> وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاء وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلًا ذَلِـك ظَـنُّ الَّذِيـنَ كفَـرُوا فَوَيْـلٌ لِّلَّذِيـنَ كفَرُوا مِنَ النَّارِ ﴿٢٧﴾ ص
> ئێمە ئاسمان و زەوی و ئەوانەی دە نێوانیاندان بێهوودە نەمانقوڵخاندوون، ئەوە خەیاڵی کـافرانە کە دەڵێن بێهوودەیە، وای بۆ کافران کە دۆزەخاوین.

یان وەک ئایەتی:

> وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاء وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ ﴿١٦﴾ انبياء
> ئێمە کە ئاسمان و زەوی و ئەوەی دە ناویاندان بۆ فشە و گاڵتە نەمانسازاندوون.

یان وەک ئایەتی:

> وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَـا بَيْنَهُمَـا لَاعِبِـينَ ﴿٣٨﴾ مَـا خَلَقْنَاهُمَـا إِلَّا بِـالْحَقِّ وَلَكِـنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ دخان
> ئێمە ئاسمانەکان و زەوییەکان و ئەوانەی وا دە ناویاندایە، بێهـوودە و بـێهەدەف نەمانهێنـاونە دی (٣٨) ئـــێمە ئەو دووانەمـــان (ئاســـمان و زەوی) بە حەق نەبـــێ نەمانهێنـــاونە دی و

**نەمانخوڵقاندوون بەڵام زۆربەی بێباوەڕان نافامن (۳۹)**

هەر خودای تەعالا بۆ پووچەڵکردنەوەی خەیاڵی بێباوەڕان دەفەرموێ:

**أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ مؤمنون**

**خودا کە فەرمانڕەوای تەواو و ڕاستینە، بێ لە خودا هیچ کەس نییە عەبدایەتی بۆ بکرێ و سەژدەی بۆ ببرێ، خاوەنی عەرشی گەورەشە، زۆر بەولاوەتر و بەرزترە لەوەی دنیا بێهوودە بخوڵقێنێ.**

**بۆ ئاگاداری:**

حەکیمان و زانایانی ئیسلامی بەشێکی زۆریان لە سەر ئەو باوەڕەن کە ئەو ئایەتی ۱۹۱ی ئالی عیمران دەلیل و بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە خودای بێعەیب و هەڵە ئەو کائیناتی مانگ و ڕۆژ و ئەستێرە و باقی بوونەوەرەکانی دیکەی کە خوڵقاندوونی و هێناونیە کایەوە، هێزی تایبەتی خۆ حاواندنەوە و خۆ ئیدارە کردنیشی وە خۆ داون و دە خۆیاندا گونجاندووە، واتە وای دە بەر یەک ناون لە کەڵک وەرگرتن لە یەکتر و نزیکی لە یەکتر، حاوانەوە و حەسانەوەی ژیانی گیانلەبەران بە تەواوی دەکەوێتە گەڕ و پێک دێندرێ. دەڵێن ئەوە ئەگەر وا نەبێ نابێ و ناتوانێ ئاشی گەردوون سەربەخۆ لە گەڕدا بێ، ئەوەش نەزەری هەندێک لە حەکیمان و زانایانە، کە دەڵێن خودا عالەمی بوونەوەری یەک جار وەدی هێناوە و سەرگەڕی خستووە و بە هۆی حیکمەت و ڕازی حیکمەتی خۆی یاسای خۆبەڕێوەبردنی دە پاڵ سرشتی ئەو بوونەوەرە خزاندووە کە بە هۆی ئەو یاسایە بوونەوەر خۆ ئیدارە دەکا و خۆ دەحاوێنێتەوە. بە کورتی و بە کوردی، کاڵەک و شووتی لە سەر ئەساسی سرشتی ئەزەلی خوداپێداوی خۆ شیرن و ناو سوور دەکا، و هەروا هەموو میوەیەک، واتە دەبێ بکوترێ بە هەوایە خودا دنیای پێک هێنا هەچی پێویستیەتی دە پاڵی ئاخنیوە و وەخۆی داوە، بۆخۆی دەتوانێ لە سەر ئەو ئەساسە سرشتییە لە مەڕ وردیلە ئیشەکانی بە ئاوڕدانەوە وەسەر یەکتر خۆ ئیدارە کەن، ئەگەرچی ئەهلی کەلام ئەو عەقیدە قبووڵ ناکەن و بە ڕەوای نازانن، بەڵکە لە سەر ئەو باوەڕەن کە خودا خۆی پێکهێنەری عالەمە و هەم ئاگادارە بە ڕێوەبەری عالەمە، ئیمام فەخری ڕازیش کە یەکێکە لە ئەهلی کەلام ئەو نەزەرەی پەسەندە کە ئیدارەی عالەم لە هەر بارێکەوە جوزئی و کوللی لە ژێر چاوەدێری

خودادایە، عەقیدەی حوکەمایانی قبووڵ نییە واتە بوونەوەر بتوانێ لە سەر ئەساسی سرشت خۆ ئیدارە کات. تەفسیری کەبیر، باسی هەمان ئایەت.

ئایەتی ﴿سُبْحَانَكَ﴾ ئیقرارە بە ناتەوانی ئەقڵ و شعوور لە ڕاست بڕکردن و دەورەدانی ئاسار و حیکمەتەکانی باری تەعالا، وەک ئاسمانەکان و ئەستێرەکان و زەوی و با و ...

دەشتوانین بڵێین: ﴿سُبْحَانَكَ﴾ ئاماژەیە وەلای ئەوەی کە خودا بەندەکانی خۆی فێری شێوە و نەزمی دوعا و پاڕانەوە لە بەر خودا دەکا، یانی کێ بیهەوێ دوعا و پاڕانەوە بەرێتە بەر خودا، دەبێ ئەو کەسە لە هەوەڵەوە سەنای خودا داگیرسێنێ بەو شە سەناکانی خودا جا لە پاشان داوا و مەبەستی خۆی بخاتە ڕوو، وەک ئێرە کە لە پێشدا خودای تەعالا سُبْحَانَكَەی فەرموو جا لە پاشان فەرمووی: ﴿فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾. بۆ زێدە زانین تفسیر کبیر، باسی هەمان ئایەت سەیر کە.



لە ئایەتی ١٩٠ی ئالی عیمراندا خودای تەعالا بە خاوەن هەست و ئەقڵانی هەڵکوت دە ناو قالبی اولی الالبابدا ئێمەش لەو بارەوە دەمانهەوێ چەرخ و خولێک بە دەوری ئەو اولو الالبابدا لێدەین کە خودای تەعالا بە وەسیلەی ئایەتی ١٩٢ و چەندین ئایەتی دوای بەیانی کەماڵی عەبدایەتی و پاڕانەوەیان دەکا کە چۆن خۆیان داوێنە دەرگای خودای بێنیاز بۆ ئەنجام و پێداویستی نیازیان.

جا بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە خۆ داوێینە خزمەت ئایەتەکانی ١٩٢ و ١٩٣ و ١٩٤، بەڵکە ئێمەش وەخەبەر بێین دڵمان کە ئاوا خۆ باوێتە دەرگای ڕەحم و بەزەی خودا.

**رَبَّنَا إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾**

**ئەی پەروەردگاری ئێمە! بێگومان هەر کەسێک ئەتۆ خستتە نێو ئاگرەوە، زەلیل و زەبوونت کردووە و ستەمکارانیش هیچ جۆرە یارمەتیدەرێکیان نییە.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٩٢

ئەو ئایەتە ئەوەمان پێ دەڵێ کێ بۆ خۆی هەل بڕەخسێنێ و بیداتە دەست خودا بۆ ڕووڕەشی و چوونە ناو ئاگری بەئێش و ژان و ئۆفی دۆزەخەوە، ئەوە بێگومان پەروەردگاری بێباک و بێترس لە دواڕۆژدا دەیخاتە ناو ئاگرەوە و ڕیسوای دەکا لە بەر چاوان، ئەوکات بۆ وانەی ستەم لە خۆیان دەکەن بە هۆی بێباکی لە خودا و بێئاوڕ دانەوە وەلای خودا کە

غروورانە مل پێوە دەنێن هیچ کەسێک نییە تاکوو بتوانێ دە هاواریانەوە بێ لەو ڕۆژە تاڵ و سەختەدا، بێ لە خودا.

**سرنجێک:**

لێرەدا وا دێتە بەرچاو و دڵ هەستی پێ دەکا کە ئاقڵان و خاوەن هەست و بەشعوورەکان بەر لەوەی لە ئاور و عەزابی دۆزەخ بترسن، لە ڕووڕەشی و خەجاڵەتباری دیوانی خودا دەترسن، جا بە ڕاستی شەئنی حەیاداران ئەوەیە کە لە بێئابڕوویی ترسی بێ و باری سەخت و گران بخەنە کۆڵی خۆیان تا ئابڕوو و حەیایان بە پارێزراوی وەمێنێ، کەوابێ دەبێ بکوترێ: خاوەن هەست و ئەقڵ و شعوور پاش پەی بردن بە ئامانجی هەدەفی سروشت، دەگا بەو مەبەستە و دەرکی دەکا کە تەنیا وەسیلەی نەجات و ڕزگاری ئینسانی باوەڕی خۆیەتی و ئەعمالی خۆیەتی، بۆیە دەکوترێ: ستەمکار بەری لە ئەعمالی خێرە و بێباوەڕییە کە خۆی لە دەس داوە. ئەگەر بشکوترێ خودای تەعالا بۆ زیاد لە هەچی تاوانی گوناهە، گوناهی زوڵمی خستە ڕوو دەو ئایەتەدا، دەبێ لە وڵامدا بکوترێ چاوەی بەڕاستی گوناهی ستەمکاری ئینسان بێخەبەر بوونیەتی لە خودا و ڕۆژی حیساب و نیزامی هەستی.

حەکیمانی ئیسلامی هاتوون ئەو ئایەتەیان بەڵگە لە سەر ئەوەی "عەزابی ڕوحانی تاڵ و بەژانترە لە عەزابی جەستەیی"، بەو دەلیلە: هەڕەشەی خودا لە ئینسان بە (أخزیتە) پاش عەزابدانی بە ئاگر هەست پێ دەکرێ، مانای «خزی» بە واتەی «تخجیل»ە، خۆ دیارە خەجاڵەتیش عەزابێکی ڕوحانییە، چونکە ئەگەر بێتو یاسا غەیری ئەوەی بێ: کە عەزابی ڕوحانی قەویتر لە عەزابی لەشییە، هەڕەشە بە عەزابی ئاور لە کەسێک کە بە عەزابی «خزی» بە واتەی خەجاڵەتە ئامانجێکی نابێ و جوان نانوێنێ. تفسیر کبیر، هەمان ئایەت.

عولەمایانی موعتەزیلە ئەو ئایەتە دەکەنە بەڵگەی ئەوەی کە کاتێ فاسق خرانە دۆزەخەوە تازە هاتنە دەرەوەیان نییە، واتە دەرووی نەجاتیان لێ دادەخرێ، بەڵکە بە دایمە دەمێننەوە دەوێدا. لە سەر ئەو بەراوەردە وشەی «خزي» بە مانای "بەهیلاکچوون"ە، چونکە تەعبیری ئایەتەکە ئاوایە: إِنَّکَ مَنْ تُدخِلِ النارَ فَقَدْ أَخزَیتَهُ واتە فَقَد أَهْلَکْتَهُ؛ لە وڵامی عولەمایانی موعتەزیلەدا دەبێ بکوترێ: ئێمە وشەی «خزي» بە هیلاکەت تەعبیر ناکەین بەڵکە بە ئیهانە و شەرمەزاری وەزن دەکەین.

عولەمای موعتەزیلە بەو دەلیلەی کە دەڵێن «شیفاعەت» بە مانای نەسرەتە، خۆ دیارە نەهی

جنسی شەفاعەت لە فاسقان خواهانی نەوعی نەفی شیفاعەت لە فاسقانە، دەبێ بۆ وڵامی ئەو نەزەرەی عولەمایانی موعتەزیلە بکوترێ: شەفاعەت بێ ئیزن و ئیجازەی خودا بۆ کەس دەس نادا، جا خۆ کاتێ خودا ئیزنی شەفاعەتی دا، ئەوە شەفاعەتی شافعی نییە بەڵکە ئیزنی خودایە ئەو شەفاعەتە. بۆ زێدە زانین تفسیر امام فخر رازی، سەیر کە.



کاتی ئەوەی هاتووە بچینە خزمەت ئایەتی ١٩٣ بۆ زێدە زانین لەو بارەوە:

**رَّبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلإِيمَانِ أَنْ آمِنُواْ بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الأبْرَارِ**

**ئەی پەروەردگاری ئێمە! بێ گومان گوێمان لێ بوو بانگخوازێک بانگی دەکرد بۆ باوەڕ هێنان، دەیکوت ئێهان بێنن بە پەروەردگارتان؛ ئێمەش خێرا ئیمان و باوەڕمان هێنا، ئەی پەروەردگاری ئێمە، جا تۆش چاوپۆشیمان لێ بکە و لە گوناحەکانمان خۆش بە، دزێوییەکانمان داپۆشە، لەگەڵ چاکەکاراندا بمانمرێنە.**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٩٣

سرشتی ئینسان وا دیارە هەم بیسەرە هەم بینەرە هەم وەزنکەرە و هەڵسەنگێنەرە، بە پێی فەرموودەی ئەو ئایەتە کە دەڵێ: ئەی پەروەردگاری ئێمە، بیستمان کە بانگدەرێک وەک قورئان بێ، هاوارمان دەکات بۆ بڕوا هێنان بە خودای بێهاوتا، ئاوای دەفەرموو: وەرن ئەی گەلی ئینسان بڕوا بێنن بە خالقی بێهاوتاتان، ئێمەش واتە ڕوحی پاک و سرشتی ئەزەلی ئینسان، بەبێ خۆ گنخاندن و ڕاوەستان بە پیر ئەو هاوار و بانگەوازەوە چوون و بڕوایان هێنا، پاش ئەوەی ئینسان کە لە خووخدەی خۆی خورد بۆوە، تێگەیی کە خۆ دەدۆڕێنێ و خۆی و ئەو پەیمانەی لە بیر دەچێتەوە و دەکەوێتە ناو داو و تەڵەی هەوا و هەوەس و ئارەزووی دنیا، جا بۆ پارازراوییان لەو خلیسک و هەڵدێرە دڵ دەکەوێتە یادی خودا و هاواری دەکاتێ و دەڵێ: ئەی پەروەردگاری ئێمە، لە گوناحمان خۆش بە و خراپەکانمان لێ بسڕەوە و بمانمرێنە لە سەر ڕێبازی مرۆڤی چاک و پاک.

### پاشەدۆ:

ئەوانەی ژیر و بەبیر و هەستن، دەزانن کە ئەو ڕێگا سەخت و تەلان و لێژەی دنیای تەکلیف و ژیان تێدا گەیشتن و سەرکەوتنی بۆ سەر مەنزڵ و مەقسەد زۆر بە زەحمەت و گرانە،

بەبێ دەست تێگرتن دە ڕێبەرانی ئایینی ئیلاهی دەس نادا و پێک نایە، جا لە سەر ئەو ئەساسەیە هاوار دەکا ئینسان و دەڵێ: ئێمە بانگاوازچی بانگی یەکەتی خودامان دەبیست کە هەموو ئینسانی بۆ لای حەقناسی بانگ دەکرد و پێی دەکوتن: ئیمان و باوەڕی بێنن واتە سرشتی ئەو بوونەوەرە بە ئینسان دەڵێ: خودا هەیە و بڕوای پێ بێنن، ئێمەش بە تەواوی سەلیقە بۆ لای چووین و باوەڕیمان پێ هێنا، بەڵام چونکە ئینسان لەو ڕێ خلیسکاوییە دەترسێ هەڵدێرێ، دووبارە هاوار دەکاتە خودای دەستگیر دەستمان بگرە یا ڕەببەنا لەو خلیسکێنەدا. ڕەگەڵ ڕاستان و پاکانمان خە، بە کورتی و بە کوردی، خاوەنی سرشت لە ڕێی ئەقڵ و سرشتەوە و بیر لە نیشانەکانی خودا دەکەن بە مەبەست و مەقسەد کە تەوحیدە، قیامەتە، پێغەمبەرانن، نامەکانی ئاسمانین. لەهەر وردیلە زەڕڕەیێ بڕوانی، خودای تەنیا دەناسی و لێی دەڕوانی.

ئایەتی (منادیا) مەبەست بە (منادی) حەزرەتی محەممەدەﷺ بە قەولی زۆربەی قورئانزانان، هەندێکیش نەزەریان وایە وشەی «منادیا» واتە قورئان، بە دەلیلی ئایەتی ١ی سورەی جن کە دەفەرموێ: ﴿...إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ ﴿٢﴾﴾ جنۆکە کوتیان پاش گوێ هەڵخستن بێ گومان ئێمە قورئانێکی سەیر و سەرسووڕهێنەرمان بیست. ئەو ئایەتە ئەوەمان پێ دەڵێ:هەڵدەگرێ مەبەست بە «منادیا» ئایەتی ١٩٣ش هەر قورئان بێ، بەڵام ئەوانەی کە پێیان وایە مەبەست بە «منادیا» حەزرەتی محەممەدە، بەڵگەیان ئایەتی ١٢٥ی سوورەی نەحلە و ئایەتی ٤٦ی سوورەی ئەحزاب و ئایەتی ١٠٨ی سوورەی یۆسف:

**ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴿١٢﴾ نحل**
**ئەی محەممەد بانگەشە بکە بۆ ڕێبازی پەروەردگارت بە جوانترین شێوەش لەگەڵیان بدوێ.**

**وَدَاعِيًا إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾ احزاب**
**بە ئیزنی خۆی بانگخوازیش بێ بۆ لای خودا و چرایەکی گرشەداریش بێ.**

**قُلْ هَـذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللّهِ ﴿١٠٨﴾ يوسف**
**بڵێ ئەی محەممەد: ئەوەیە ڕێگای من، خۆم و ئەو کەسانەش کە وا شوێنکەوتەی منن، بە بەرچاو ڕوونییەوە بانگ دەکەین بۆ لای خودا.**

ئەگەر بە وردی سرنج بدرێتە سیما و دەروونی ئەو سێ ئایەتانە، بە ڕوونی چاو دەکرێ کە لە هەر سێکیاندا حەزرەتی محەممەد مەبەستە، بۆیە بە پشتیوانی ئەو سێیانە بەشی زۆری

قورئانزانەکان دەڵێن مەبەست لە «منادیا» حەزرەتی محەمەدە.

**ئاگاداری:**

دێرەدا ئەو پرسیارە سەر هەڵدەدا، کە بۆچی وشەی «منادی» و «ینادي» بە جەمع هاتوون؟ بەهرەکەیان دەبێ چ بێ؟ وڵام دەبێ ئەوە بێ:

«ندا» بە شێوەی بەربڵاو و گشتی بەیان کراوە جا پاشان بە وشەی «ایمان» هەڵاوەسراوە، واتە «منادیا ینادي للإیمان» لە بەر بەرز و ڕێزی شەئنی مونادی، واتە جاڕدەر، بەو دەلیلەش بانگاوازچی گەورەتر لە بانگاوازچی بۆ ئیمان نییە، لە لای ئەهلی ئیمان؛ ئەو داواکارانەش وا دەردەکەوێ کە سێ شتیان لە خودا داوا کردبێ:

١. بەخشینی تاوانەکان

٢. داپۆشین و سڕینەوەی گوناهەکان

٣. مردنیان دەگەڵ چاکەکان.

ئایەتی ﴿فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا﴾ گرێ دەخاتە ناو دڵ لەو بارەوە کە «ذنوب» و «سیئات» هەر دوو هەر یەکن کەچی هەر دووش هاتوون. وەک ئەوە دەچێ یەک نەبن!؟ ئا ئەوە بۆ خۆی پرسیار دەخاتە ڕوو، ناچار دەبێ وڵامی بدرێتەوە و قورئانزانەکانیش چەن نەزەرێکیان لەو بارەوە داوە، دەچینە سەر نەزەرەکان:

١. هەندێک فەرموویانە هەردوو هەر یەکن دووپاتەیان تەئکیدە، چونکە موبالەغە دووپاتە لە پاڕانەوەدا یەکێکە لە سوننەتەکان.

٢. هەندێکیش دەڵێن مەبەست لە «ذنوب»دا گوناهی ڕابردوون، بەڵام «سیئات» گوناهی داهاتوون.

٣. هەندێکیش دەڵێن مەبەست بە «ذنوب» گوناهانێکن کە بە تۆبە دەشۆرێنەوە و مەبەست بە «سیّئات» گوناهانێکن کە بە عیبادەت دەسڕێنەوە.

٤. دەستەیەکی دیکە لە قورئانزانان نەزەریان وایە «ذنوب» گوناهانی زەلامن، و «سیئات» گوناهانی وردیلە وردیلەن.

٥. هەندێکیش نەزەریان وا داوە کە مەبەست بە «ذنوب» گوناهانێکن لە ڕووی زانستەوە دەکرێن واتە دەزاندرێ کە نەهی لێ کراوە بەڵام ئینسان دەیکا، مەبەست بە «سیئات»یش گوناهانێکن لە ڕووی نەزانییەوە وەسەریان دەپەڕێ ئینسان، نازانێ ڕەوایە یا ناڕەوایە.

٦. دەستەیەکیش نەزەریان وایە مەبەست بە «ذنوب» حەقـوڵڵایە، و مەبەسـت بە «سـیئات» حەقونناسە، بەڵام لە ناو هەماندا نەزەری چوارەم پەسەندترە. تفسیر کبیر، ج ١٤٦/٩.

ئـایەتی ﴿وَتَوَفَّنَا مَعَ الأَبْرَارِ﴾ واتە دەپـاڕێنەوە ئەوانە کە هەر وەک لە دنیـادا بە تەقـوا و خۆپارێز بوون، مردنیشیان دەگەڵ یارانی بەتەقوا و پارێزگاران، واتە «ابرار» بێ، وەک لە ئـایەتی ٦٩ی سووڕەی نیساءدا ئاماژە وەلای ئەو مەبەستە کراوە:

وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَـئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَـئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ نساء

**ئەوانەی فەرمانبەردار و ملکەچی خودا و پێغەمبەر بن، ئا ئەوانە وان لەگەڵ ئەو کەسـانەدا کە خودا ناز و نیعمەتی خۆی ڕژاندۆتە سەریان، وەک پێغەمبەرەکان و ڕاسـتگۆیان و شـەهیدان و چاکەکاران، ئای ئەوانە چەندە هاوەڵێکی چاکن.**



کاتی ئەوەی هاتووە بچینـە خزمەتـی ئـایەتی ١٩٤ی ئـالی عیمـران کە دوعـا و لاڵانەوەی سێیەمی اولو الالبابە، واتە خاوەنی هەست و شـعوورە، لەوێـڕا تێـدەگەین کە خـودای تەعـالا شەئن و عەزەمەتی ئەوە دەخوازێ لە بەری وەپاڕێی و پەنای بۆ ببرێ.

رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَى رُسُلِكَ وَلاَ تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لاَ تُخْلِفُ الْمِيعَادَ

**ئەی پەروەردگاری ئێمە، بەڵێن و وادانەش کە بە هـۆی پێغەمبەرانـتەوە بە ئـێمەت دا، بۆمـانی بەدی بهێنە، لە ڕۆژی حیسابدا سەرشۆڕمان مەکە (لەوێ وێ) هەر تـۆی (ڕاسـتی لە وەعـدە و پەیمانتدا خواری نییە) تۆ بەڵێنی ناشکێنی.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٩٤**

دیارە ئەوە بێگومانە و باوەڕی خاوەن ئیمان و باوەڕدارانە کە لە خودا ڕاست و ڕاستگۆتر و بەڵێنی ڕاستتر نییە و نابێ، کەوابێ دڵی هۆشیار و خاوەن هەسـتی ئـیمان نـاحەقی نیـیە بڵـێ و بپرسێ لەوەی بەندەی خاوەن ئیمان و باوەڕ بۆ دەڵێ: خـودایە ئەوەی وەعـدەت پـێ داویـن بە وەسیلەی پێغەمبەران، پێمان عەتـا کە و خەجـاڵەت و ڕووڕەشـی ڕۆژی حیسـاب و دادگامـان مەکە! بۆ مەگەر خاوەن ئیمان کە ئاوا دەڵێ، باوەڕ و ئیتمینانی بە وەعدەکانی خـودا و ڕەسـووڵ نییە؟ خۆ ئەگەر باوەڕی بە بەڵێنی ئە دووانە (خودا و پێغەمـبەر) نەبـێ، لە جـوغزی ئیمانـداران دەشتە دەرێ! ئایا دەبێ سوڕ و ڕاز لەو پاڕانەوەی خاوەن ئەقڵاندا (اولو الالبـاب) چ بـێ؟ خـۆ

ناشتوانین خۆ لەو بوارە بدەین و بڵێین: نەبادا خودا بەڵێنی خۆی لە بیر بچێ وا چاکە وەبیری خەینەوە کە وادەکەی لە بیر نەچێ! کەوابێ دەبێ لێرەدا بۆ حەسانەوەی دڵ و ڕزگاری لە کەند و کۆسپی سەر ڕێ بکوترێ و بڵێین: بەندەی لە خودا نزیک و زۆر خوداپەرست هێندەی ئیلاقە بە دوان و پاڕانەوە هەیە دەگەڵ خودا و هێندەی خودا خۆش دەوێ بە دڵ و هەستی پڕ لە ئەوینداری خۆی لەمەڕ خودا ناوێرێ و ناوەستێ ڕوحی بەڵێنی خودا هەر دەڵێ و دەیڵێتەوە تا دەیگاتێ و دادەمرکێ.

دەشکرێ بڵێین دوعا عیبادەتە لە خۆشی ئەو بەڵێنە ڕاستەی خودا کە تین و تەوژم و هەستەی بە ئەندازەیەک ڕۆچووە لە ناو دڵی، دڵی بۆتە ئەو بەڵێنیە و بۆی زەوت نابێ کە نەیڵێ هەر دەیڵێ و دەیڵێتەوە و دەڵێ: ئەی پەروەردگاری ئێمە پێمان ببەخشە ئەوەی بەڵێنت پێ داوین لە سەر زمانی پێغەمبەران جا لە ڕۆژی دواییدا ڕووڕەشمان مەکە، بێگومان تۆ لە بەڵێنی خۆت لانادەی. تفسیر کبیر، هەمان ئایەت.

**سووکە ئاوڕێک:**

خاوەن هەست و شعووران کاتێ ساخ بوونەوە لەسەر باوەڕ و ئیمانیان و ئەرکی ئایینی خۆیان بەجێ گەیاند دەکەونە پاڕانەوە و زەمزەمە کردنی بەڵێنیەکانی خودا پێی داون، وەردیان دەدەنەوە و بیریان دەخەنەوە، ئەگەرچی بە توندیش لە سەر ئەو باوەڕەن کە خودا خیلافی دە وەعدە و بەڵێندا نییە.

یەکێک لە خاوەن هەستانی باوەڕ و ئیماندار فەرموویەتی: شۆق و شەبەق و نووری ئایەتەکانی ١٩١ و ١٩٤ کێ لێیان وەنزیک کەوێ لە هەچی ترس و لەرزی دنیا و ئاخرەتە، بێباک دەبێ، هێندە دەڕواتە پێش لە خودا و ڕەحمەتی.

**تیوتیوە:**

دەکرێ تەعبیری (مَا وَعَدتَّنَا) = (ما وَعَدْتَنا كائِناً عَلى أَلسِنَةِ رُسُلِكَ) بێ واتە دێرەدا پیتی «على» بە مانای «مع» دەبێ بەستراوە بە «آتنا» دەبێ واتە «آتِنا ما وَعَدْتَنا مَعَ رُسُلِكَ» واتە چونکە پێغەمبەران وەسیلەی شارەزاییمان بوون، دەگەڵ مەیان بکە شەریک لە ئەجر و پاداشدا، (الدالُّ على الْخَيرِ كَفاعِلِهِ). تەفسیر کبیر، ج ١٤٧/٩؛ روح المعانی، ج ٥١١/٤. کێ تەسدیقی پێغەمبەری کردبێ، وەبەر دەکەوێ.

هەموو دوعا و پـاڕانەوەکە بـۆ ئەوەیە کە خـودا بیانخـاتە سـەر ئەو ڕێـیە کە بەو بەهرەیـان دەگەیێنێ. ئایەتی ﴿فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ واتە لە ڕۆژی ئاخرەتـدا بە عەزابـی ڕوحـانیمان گرفتـار مەکە، هەر ئەوەشە کە بە شوێن ئەو ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَـةِ﴾. ئێـرە ئامـاژە وەلای ئەوەی دەکا کە عەزابی ڕوحانی لە عەزابی جسمانی بەتینترە.



دڵی بزۆز و بەپەلە چاوەڕوانی ئەوە دەکا بەپەلە ایـا خـودا دە بەرابەر هەڵوێسـتی ئەو «اولـو الالباب»دا کە هێندە سێنە بە بەرماڵدا دەخشێنن و ڕوومەت لە خاکی زیللەت دەدەن چ دەبـێ و چ دەکا؟ وەک ئایەتەکانی ١٩٢ و ١٩٣ و ١٩٤ بەیانی حاڵی وانی کرد، دەچیـنە خـزمەت ئـایەتی ١٩٥ کە بەیانی ئەوە دەکا خودا لێیان وەردەگرێ ئەو دوعا و پاڕانەوەیە:

**فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ فَالَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخْرِجُواْ مِن دِيَارِهِمْ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُواْ وَقُتِلُواْ لأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ ثَوَابًا مِّن عِندِ اللّهِ وَاللّهُ عِندَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ**

**سەرەنجام پەروەردگاریان نزاکانی لێ وەرگرتن، بێ گومان ئەمـن کـردەوەی هـیچ چالاکێـک لە ئێوە بە زایە نادەم لە نێریان و لە مێیان، هەندێکتان لە هەندێکتان، کەواتە ئەوانەش کە کۆچیان کرد و لە زێدی خۆیان دەرکـران و لە ڕێـی منـدا ئازاریـان درا و شـەڕیان نەکـرد و کوژراشـن، بێ گومان هەمـوو خراپەکانیـان دەسڕمەوە، دەشـیانخەمە نـاو بـاخ و باخـاتێکەوە کە جـۆگە و ڕووبار بە ناویاندا تێـدەپەڕێت، ئەوەش پاداشـێکە لە لایەن خـوداوە، هەر خـودایە کە پاداشـی جوانی لە لایە.**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٩٥

ئەوە بێ گومانە کە لە میوانی کەریمان بێ کەرەم نابێ و ناگەڕێتەوە، و خودای خـاوەن بەزە و ڕەحمیش کێ لە بەری وەپاڕێ و داوا بکات، داواکەی لێ وەردەگرێ و قبووڵی دەکـا، کەوایە دەبــێ بە ئێتمینــان و بــاوەڕێکی تەواوەوە بــاوەڕ بەوەی بکەیــن: کە پەروەردگاریــان نــزا و داخوازییەکانیـان لـێ وەردەگـرێ و دەفەرمـوێ: بێ گومـان مـن کردەوەکانیـان لە نێـر و مێیـان وەردەگرم و بە فیڕۆیان نادەم، هەندێکیان لە هەندێکی دیکەن، واتە لە کۆتایی ئەو لە ئەو، و ئەو لە ئەو دەچنەوە سەر یەک ڕەگەز و ئەسڵ و نەسڵدا (ئادەم و حەوا)، ئەوانەی وا کۆچیان کردووە و لە مـاڵ و لانەی خۆیـان وەدەریـان نـاون و پەڕەوازەی وڵاتانیـان کـردوون و ئـازار دراون لە

ڕێگەی مندا جا جەنگاون و کوژراون، بێ‌گومان گوناحەکانیان دەشـۆرێنەوە و دەیانبەخشـین و دەیانخەینە ناو بەهەشتێک کە بە ژێر دارەکان و باخەکانیدا چەن ڕووبارێک دێـتە خـوار و پێیـدا دەڕوا، ئا ئەوە پاداشتیان لە لایەن خودای پاداش‌دەر و تۆڵەستێنە.

**پاشەدۆ:**

وشەی «ربّهم» دە ناو ئایەتەکەدا دەڕوانێتە زۆری ڕەحمەتی باری تەعالا کە خاوەن هەستان دە هەموو کات و ساتدا خوازیارین و لێشیان وەردەگیرێ. ئەو خوازیـارییە کە ئەوەش بۆخـۆی ئاماژەیە وەلای ئەوپەڕی لوتف و کەرەمی خودا دەگەڵ خوازیارانی، بەو دەلیلە: هـۆی نەجـاتی ئینسان و ڕزگاری ئەو لە عەزاب و دەردەسەری ڕۆژی خۆی ئەعمالە، بـۆیە خـودای تەعـالا دە ناو ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ئەمن ئەعمالی هیچ ئینسانێک ـ چ نێر بێ چ مێ ـ بە فیڕۆ نادەین بڕوا بەڵکە دەیخەینە ڕوو و تای تەرازووی حیسـابەوە. و تەواوی ئەو کەسـانەی کە لە پێنـاو ئەمـر و دەستوور و ڕێی من کۆچیان کـردووە و زێـدی خۆیـان بەجـێ هێشـتووە و لە شـیرک و کـوفر وەدوور کەوتوون، و دەو ڕێگایەدا کوژراون و تووشی ئەزیەت و ئازار هاتوون، سوێند دەخـۆم کە پاداشتی دانەدانەی ئەوانە بە تەواوی و تێر و تەسەلی لە جێی خۆی دەدەیـنەوە و لە تـاوان و خەتایان چاوپۆشی دەکەین و بە پاداشتی چالکی و خۆبەخشینیان دە ڕێـی خـودادا دەیـانخەینە ناو بەهەشتی خۆشـی ڕازاوە بە ئـاو و دار و میوەجـاتی بێ‌بـڕانەوە، خـودا ئەو نیعمەتـانەی بـۆ چاکان و پاکان و خاسانە، بەڵام ناپاک و ناخالیس و دەغەڵ و بەخیـل و چـرووک شـایانی ئەو نیعمەتە نین و ناکرێن بەو دەلیلە ئەگەر سرنج بدرێتە نـاو ئـایەتەکە ئەو شـەرتە بە ڕوونـی چـاو دەکەین کە خودا دەس‌نیشانی کردووە هەوەڵ پاکی و پاک‌بوونەوە لە گوناە و تاوان، جـا پاشـان چوونە ناو بەهەشت و ڕەحمەتی باری تەعـالا، وەک دەفەرمـوێ: ﴿لأُكَفِّـرَنَّ عَـنْهُمْ سَـيِّئَاتِهِمْ وَلأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ﴾. ئەو ئایەتە ئەوەمان تێدەگەیێنێ تا گوناە هەبێ، ناتوانێ بەو گوناهەوە بچێتە ناو بەهەشت، بەڵکە دەبێ لە گوناە بشۆرێتەوە جا بەخشین بێ و یا بە سزا کێشان بێ، جا پاشان ڕێی چوونە بەهەشتی پێ دەدرێ.

دەبێ ئەوە بە هەست و بیری ناو دڵ بسپێردرێ، بەو هۆیەی کە اولـو الالبـاب واتە خـاوەن هەست و ئەقڵەکان، خودای بێ‌شەریکیان بە دەلیلی بورهان دۆزییەوە و ناسـییان، وەک ئـایەتی ۱۹۰ی ئالی عیمران پلەی ئەو شایانە کە خودا بە وەسیلەی ئایەتی ۱۹۵ی ئـالی عیمـران وڵامـی پێ دانەوە کە بیری ژیرتان هەدەفی پێکا و ئەمیش داوا و نزاتانم قبووڵ کرد (فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ)

بۆ بە مزگێنی بۆ خاوەن ئەقڵان، و دووبارە خودا فەرمووی: (أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكم) ئەوەش مزگێنی چاکەکاران.

بەشی زۆر لە قورئانزانەکان ئەو ایەتی ۱۹۵ی ئالی عیمران ئاوا تەعبیر لێ دەدەنەوە: کە خودای تەعالا نزا و داوای لێ قبووڵ کردن بە گوێرەی ئەعمال و تاعەتیان پاداش دەدرێنەوە و بە تەواوی سەوابیان پێ دەدرێتەوە. ئەوەش با بزاندرێ: سڕینەوەی عەزاب سەواب ناهێنێ بە دووی خۆیدا، بەڵام دانی سەواب سڕینەوەی عەزاب بە دووی خۆیدا دێنێ.

**پوختەی مەبەست:**

کێ خۆ بگەیێنێتە پلە و مەقام و شەئنی "اولو الالباب" ئاوا بە ئەعمالەوە بە سێ شت مزگێنی پێ دەدرێ لە لای خودا:

۱. داماڵین و سڕینەوەی لە هەچی هەڵە و تاوانە کە خودا دەفەرموێ: ﴿لأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ﴾، خودا بەپاداشی ئەوەی کە دەڵێن: ﴿فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا﴾ ئەو مزگێنییەی پێ بەخشین. خودا دوبارە بە پاداشی ﴿وَآتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَى رُسُلِكَ﴾ مزگێنی ئایەتی ﴿وَلأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ پێ بەخشین، بە کورتی و بە کوردی کێ بە پاکی ڕوو دە خودا کا، خوداش بە چاکی ڕووی تێدەکا.

تا ئێرە خودای تەعالا حاڵ و حەواڵ و بەڵێنی پاداش و ئەجری ڕۆژی ئاخرەتی خاوەن ئەقڵ و شعوورانی بەیان فەرموو کە دە بەرابەر ئەزیەت و ئازاری بێباوەڕان خۆڕاگری بکەن، و دە ئایەتی ۱۹۶دا خودا دەیهەوێ پێغەمبەر و خاوەن باوەڕان (مؤمنان) دڵنەوازش کا بەوەی کە نەچن بە هۆی ئەوەی کافران کە دە ناز و نیعمەتدان سەخڵەت و پەرێشان بن و بەشێکی زەلام و گرینگی بگرنە بەرچاو، چونکە دنیا لە کاڵایەکی بێنرخ و بێئەرزش زیاتر نییە دە حاڵێکدا کە ماڵ و دارایی دنیا چاوەڕوانی پاداشی ئاخرەتی لێ دەکرێ بە مەرجێ کە لە ڕێگای دروستدا دە کار کرابێ، بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ۱۹۶ی ئالی عیمران:

**لاَ يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ الَّذِينَ كَفَرُواْ فِي الْبِلاَدِ**
**تێکەوە هاویشتن و هاتوچۆی بێباوەڕان لە وڵاتاندا هەرگیز تۆ لانەدەن لە ڕێگای حەق.**

**ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ۱۹۶**

خودای تەعالا لە هەموو دەراو و بواران بە وەسیلەی نامەکانی ئاسمانی بۆ سەر پێغەمبەران دەستی ئینسانیان گرتووە و شارەزاییان داونێ وەک لێرەدا کە دەفەرموێ: ساماندار و بازرگانە کافرەکان نەتانخەڵەتێنن و تلاساتان نەکەن لە ڕێگای ڕاست و ڕەوان، واتە هاتوچۆی بێباوەڕان لە شار و وڵاتاندا نەوخەڵەتێنن، ئەو خۆبادان و فڕ و گیفەیان لاف و گەزافیانە.

دڵی سرک و سڵ و بەپرسیار لە سەر ئایەتی لاَ یَغُرَّنَّكَ دەکەوێتە پرسیاری ئەوەی: خودا ڕووی فەرموودەی دە کێیە؟ ئایا دە پێغەمبەریەتی؟ یا دە هەرچی ئینسانی خاوەن تەکلیفە؟

بۆ وڵامی دڵ دوو نەزەر خراوەتە ڕوو:

١. یەکێ لەو دوو نەزەرانە ئەوەیە کە مەبەست لە لاَ یَغُرَّنَّكَ حەزرەتی ڕەسووڵە، واتە ئەو فریوێ نەخوا، ئەگەرچی قەتادە فەرموویەتی: واللهِ ما غَرّوا النَّبيَّ حتّى قَبَضَهُ اللهُ: واتە سوێند بە خودا، پێغەمبەر فریو نادرێ و نەدراوە تا ئەو کاتەی خودا گیانی وەردەگرێتەوە. ئەگەرچی ڕوی قسەی دە پێغەمبەرە، بەڵام مەبەستی خودا ئینسانە، عام لەوەی کێ دەبێ، وەک ئەوە خودای تەعالا دەفەرموێ:

﴿تَكُن مَّنَ الْكافرين ﴿٤٢﴾ هود﴾ واتە (مع الكافرين).

یان ﴿وَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١٤﴾ انعام﴾

یان: ﴿فَلَا تُطِعِ الْمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ قلم﴾.

ئەو ئایەتانە ڕووی قسەیان دە پێغەمبەرانە بە زاهیری خودا بەڵام دەگەڵ ئینسانیەتی بە تەواوی.

٢. یا ئەوەتا ڕوو دەکەینە نەزەری ئەوانە کە فەرموویانە: مەبەست لە لاَ یَغُرَّنَّكَ ئینسانی خاوەن تەکلیفە.

مەبەست بە ئایەتی تَقَلُّبُ الَّذِينَ كفَرُواْ یا موشریکەکانی مەککەن کە ئەهلی تیجارەت بوون و ناز و نیعمەتی زۆر، یا جوولەکەکانی مەککە بوون کە هەر خەریکی بێنە و بەرەیماڵی دنیا بوون.

**بۆ ئاگاداری:**

دە دەوراندا بە زۆری وا چاو کراوە کە بەشی زۆر یاغی و سەرەڕۆیەکان دە ناز و نیعمەت و دارایی و خۆشگوزەرانیدا ژیاون، و خاوەن ئیمانەکان ژیانی پڕ دەردەسەری و بە کوێرەوەرییان بووە، ئا ئەو شێوە ژیانە بە نیسبەتی ئینسانی لاواز و کاڵ لە ئیماندا شکست و گومان و دوودڵی دەخاتە ڕوو، جا بۆ سڕینەوە و ڕامالدانی ئەو تەم و مژە سیسە دەبێ زوو خۆ بگەیێنیە ئایەتی ١٩٧ی ئالی عیمران، بۆ وەی بتوانین خۆ ڕزگار کەین لەو پەرچە:

**مَتَاعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهَادُ**
**ئەوە کاڵایەکی کەمە، پاشان ئەوانە جێگایان دۆزەخە، کە چەن جێگایەکی خراپە.**

## ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ۱۹۷

خودای بانی سەر بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەر و موسوڵمانان دەفەرموێ: ئەو خۆشی و خۆشگوزەرانی و کەیفەی ئەو بێباوەڕ و ساماندارانە دەیکەن لە دنیادا کەمە و بێدەوامە، دوایی پێ دێ و دەبڕێتەوە. هیچ دەردێکی ڕۆژی قیامەتی پێ چارە ناکرێ، جگە لەو بێبەهرەشیان جێگەشیان دۆزەخە کە خراپترین شوێن و بێحەسانەوەیە.

**بۆ ئاگاداری لەو بارەوە:**

ئەو سەروەت و سامان و کەیف و خۆش‌گوزەرانیەی دنیا دواڕۆژێکی سەخت و گران و ترش و تاڵی لێ چاو دەکرێ و بە دوویدا دێ و بە زوویی گژیان دەبێ و بەرۆکیان دەگرێ. واتە سەرکەوتنی یاغی و سەرەڕۆیان دواڕۆژێکی سەخت و گران لە خۆ دەگرێ، هەر وەک بێ بەشی و بێبوونی خۆش‌گوزەرانی خاوەن ئیمانان دەوام ناهێنێ و دواڕۆژێکی بەختەوەریشی بە شوێندا دێ، هەر ئاواش کەیف و شادی و بوونی دارایی بێباوەڕان لە دنیادا دەوام ناهێنێ و دواڕۆژێکی ناحەز و ترش و تاڵ بە شوێن خۆدا دێنێ. چونکە گەڕانی گەردوون لە سەر ئەساسی نەزم، سووڕ و گەڕ دەخوا، واتە هەر کەس بە ئەندازە و هێزی ئەسبابی دەتوانی بەهرە وەرگرێ و خۆشی لە مەبەست و هەدەف وەنزیک خا، دارایی دنیا بەشێکە لەو هێز و ئەسبابانەی کە دەکرێ خۆتیان پێ وەنزیک خەی لە مەبەست چ دنیا چ ئاخرەت، وەک شمشێری دوو دم وایە، بەو لایەشدا دەبڕێ و بەولایەشدا دەبڕێ، واتە بۆ لای خوداش دەتوانێ پێ ببڕی وەک خێر و خێرات و بەخشین، دەشتوانی بۆ لای شەیتانیش دەکاری کەی، وەک فەساد و فەسادکاری و بێناموسی.

زانای پایەبەرز عەللامە واحدی فەرموویەتی: قوڕەیشییە کافرەکان کە دە خۆشی و کەیفەدا بوون، تەئسیریان خستبووە سەر دڵی موسوڵمانان و داماویان لێ چاو دەکرا بەو هۆیە کە ئەوان ئاوا دەستڕۆیشتوو نەبوون، جا خودا هات بۆ دڵدانەوەی موسوڵمانان لەو بارەوە ئایەتی ۱۹۶ی ئالی عیمرانی دابەزاند، تاکوو موسوڵمانان بە خۆدا بێنەوە کە دارایی و خۆش‌ڕابواردنی دنیا ناتوانێ بەردەوام بێ و هۆی خۆشبەتی دواڕۆژیش بێ، فریوی پێ نەخۆن ئەی

موسوڵمانان. تەفسیری بەغەوی، ج ٣٧٨/١.

هەروا دەبیندرا کاتێ موسوڵمانان یەهوودیان ئاوا بە کەیف و نەهەنگ چاو دەکردن داخیان دەخوارد کە بۆ ئێمە لەو بەهرەیە بەدوورین، جا خودای تەعالا بۆ دڵدانەوەیان ئەو ئایەتی ١٩٦ی دابەزاند، کە نەچن هەڵخەڵەتێن بەو شێوە ژیانەی کافران. روح المعانی، ج ٥١٨/٤.

لە سەر فەرموودەکانی خودا کە بۆ دڵدانەوەی ئیماندارەکان خودا دایبەزاندوون، زانایانی بەهەست و بیر "فرا" و "زجاج" ئاوا دواون:

"فرا" فەرموی: (ذلک مَتَاعٌ قَلِيلٌ) واتە ئەو زینیعمەتەی بێباوەڕان بەو هۆیە کە دەوامیان نییە بێنرخ و کەمە.

زجاجیش دەفەرموێ: (ذلک الکسب و الربح مَتَاعٌ قَلِيلٌ) واتە ئەو کەسب و بەهرەیەیان کاڵایەکی بێبایخە و بێئەرزشە، بۆیە خودای تەعالا بەبێ مایە و بێئەرزشی لە قەڵەم دان چونکە نیعمەت و سامان و خۆشی دنیا تێکەڵاو داخ و حەسرەتەوەیە. سەرەنجامیش بڕانەوەیە جا بۆیە کەم و بێقیمەتە.

دەتوانین بڵێین ئەو سەروەت و دارایی دنیا کە دە ئەزەلدا تا ئێرە بە نەبوو هاتۆتە بەرچاو بازاڕی هەر وایە بە زوویش لە ئەزەلدا بۆ ئەبەد بە نەبوو دەخرێتەوە بازاڕ، بۆیە خودای تەعالا بە خوازیارەکانیان ئەو وەعدە دەدا: ﴿ثُمَّ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهَادُ﴾

یەکێک لە سوننەتەکانی خودای خاوەن حیکمەت ئەوەیە کە پاش هەڕەشە و وەعدەی تاڵ، وەعدەی خۆش و هیوادار و پڕ لە لەزەت نیشان دەدا، ئێستاش پاش وەعدەی تاڵ و سەخت بە دنیاپەرستان و بێبایخدانانی سامان و دارایی بێبەهرە و قیامەتی وان، هات ئایەتی ١٩٨ی دابەزاند کە پڕە لە وەعدەی ئومێد و هیواداری بۆ ئیمانداران، جا بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٩٨ی ئالی عیمران بۆ تێگەیشتنی زیاد:

**لَكِنِ الَّذِينَ اتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا نُزُلاً مِّنْ عِندِ اللّهِ وَمَا عِندَ اللّهِ خَيْرٌ لِّلأَبْرَارِ**

**بەڵام ئەوانەی کە وا لە پەروەردگاریان دەترسێن، باخ و باخاتێکیان دەدرێتێ بە ژێر دار و درەختەکانیاندا چەندین ڕووبار تێدەپەڕێت، هەتا هەتایە لە ناویا دەمێننەوە، ئەوە میوانداریییەکە لە لای خوداوەیە، ئەوەش کە لە لای خوداوەیە چاکترە بۆ چاکەکاران.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٩٨

خودای مەزن بە پێی حیکمەت و حەکیمایەتی خۆی کە دەیـهەوێ ئـێش و دەردی دڵانـی خاوێن و پاکی پێغەمبەر و شوێنکەوتووانی پێغەمبەر دەرمان کا و ئێش و ئۆفیـان لـێ بتـارێنێ، دەفەرموێ لە مەڕ کاڵای دنیای بێدەوام و بێنرخ، سەرەنجامی خـاوەنی ئەو کـاڵا کەمەی دنیـا ناو ئاگری دۆزەخە کە شوێنی بێحەسانەوە و پڕ حەسرەتە، پاشـان هەر لەو بـارەوە دەفەرمـوێ: ئەوانەی لە پەروەردگاریـــان ئەترســـن و ئەترســـن بـــۆ ئەوان هەیە لە بەهـــای ئەو ترســـانەیان بەهەشــتانێک کە لە ژێریــان چهــا ڕووبــاری ڕەوان و پــاک ڕەوانە و هەڵــدەڕژێ کە لەو جێگــا خۆشەدا بۆ هەتا هەتا دەمێننەوە لە لای خودا. جا خۆ ئەوە بێگومـانە ئەوەی لە لای خـودایە لە هەرچی دەرد و بەڵایە بەدوورە کە هەر ئەوەشە چاکە دەرحەق بە چاکەکاران و لەخوداترسـان و خۆپارێزان کە لە پاش مەرگیان دەکەونە ناز و نیعمەتە خۆش و بێبـڕانەوەیە بێبـاک و بێتـرس لەوەی لێیان وەستێندرێ.

**پاشەدۆ:**

ئەوانەی لەخوداترسن، بە پارێزەوە بۆ لای کـاران دەچـن تەنـانەت فـوو لە دۆش دەکەن و حەقپارێزن، بۆیە خودا بە خاتری هەڵگری باری گران و سەختی دنیـا بـاخ و باخـاتی خۆشـی ئاخرەتیان پێ دەبەخشێ، دەتوانین بڵێین یەکی دیکە لەو بەڵگانەی کە ئینسانی بێباوەڕ بە مـاڵی دنیا دەگا ئەوەیە: بەر بەرەڵایە، بەڵام خاوەن باوەڕ بە پێـی ئەرکـی چـاوەدێری حەق و عەداڵەت بەر بەرەڵا ناتوانێ ببێ، جا ئەدێرەدایە هۆی بەر بەرەڵایان لە ئاخرەتدا بەرەڵا و بـێ پەنـان، بەڵام خاوەن حەیا و بەتەقوا خاوەن پەنای لای خودان، لەو ڕۆژی کەس بە کەسەدا.

پێویستە لێرەدا بە هێواشی هەنگاو هەڵێنینەوە و زۆر بە وردی و بەرجەوەندانە لێر و لەوێ و بەر پێی خۆمان بڕوانین کە خودای تەعالا حاڵ و ئەحـواڵی ئیمانـداران و بێئیمانـانی بە تێـر و تەسەلی باس کرد و دە عالەمی ئینسانی گەیاند کە سەرەنجام عالەمی بێبـاوەڕ ئـاوری دۆزەخە کە بەئێش و ئۆفترین شـوێنی نەحەسـانەوەیە، و سـەرەنجامی عـالەمی ئەهلـی بـاوەڕ و ئـیمان بەهەشتی ڕازاوە بە باخ و ئاوی ڕەوانە.

ئەوجار دەیهەوێ دە ئینسان بگەیێنێ بە وەسـیلەی ئـایەتی ١٩٩ی ئـالی عیمـران کە هەمـو ئەهلی کتێب وەک یەک نین بەڵکە هەر لە ئەهلی کتێب هەن کە باوەڕیان بە کتێبی خۆیـان هەیە و هێناویانە لە کاتی خۆیدا جا لە پاش هاواری ئیسلام و دابەزینی قورئان و دەعوەتی پێغەمبەری کەوتنە هەڵسەنگاندن و وەزن کردنی دەعوەتی پێغەمـبەر و دەسـتووراتی کتێبـی خـۆی، خـۆی

گەیاندۆتە ئەو پلە ومەقامەی کە بە ئایینی ئیسلام و قورئان و محەمەد ئیمانێ بێنێ بەو شێوە کە تا ئەورۆ ئایین و هەڵسوکەوتی بەرنامەی ژیانی لە سەر ئەساس و دەستووراتی کتێبی خۆی بووە، جا یا تەورات یا ئینجیل بووە، بەڵام لێرە بەدوا بەرنامەی ئیمان و ژیانی لە سەر دەستووراتی قورئان و محەمەد دەبێ.

بە کوردی و بە کورتی، ئەو دەستە لە ئەهلی کتێب نایانهەوێ خەیانەت بە کتێبی خودا بکەن، واتە تەورات و ئینجیل، هەچی دەربارەی حەزرەتی محمد المصطفی تێیدا بەیان کراون شوێنی دەکەون کە دەوێدا دەستووری باوەڕی بە قورئان و محەمەد بەیان کراوە و ئەمری پێ دراوە، ئەوانە نەیانویستووە حاشاری دەن و بە خاتری کاڵای دنیا قووت و پاشقولی دەن.

هەشن لە ئەهلی کتێب کە ئەو ڕاستییەیان حاشار داوە بۆ خاتری کاڵای دنیا وەک فرۆشتنی ئەو حەق و ڕاستییەیان بە ناحەق و ناڕاستی فرۆشتووە بە خاتری بەهرەیەکی کەمی دنیایی. جا بۆ ئیسباتی ئەو ڕاستییە دەچینە خزمەت ئایەتی ١٩٩ی ئالی عیمران:

**وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَمَن يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَاشِعِينَ لِلَّهِ لاَ يَشْتَرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلاً أُولَـئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ**

**لە ڕاستیدا لە ناو ئەهلی کتێبیشدا کەسانێ هەن ئیمان و باوەڕیان هەیە، بە خودا و بەو کتێبانەش کە بۆ ئێوە و ئەوان هاتۆتە خوارەوە، ملکەچن بۆ فەرمانی خودا و قورئان، و نیشانە و ئایەتەکانی خودا بە نرخێکی کەم نافرۆشن، ئەوانەن پاداشیان لە لای پەروەردگاریان مسۆگەرە، بەڕاستی خودا حیسابگەرێکی خێرایە.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ١٩٩

بێگومان خاوەن نامەکانی تەورات و ئینجیل دە ناویاندا هەیە کە باوەڕیان هەم بەو قورئانەی هەیە کە ئاخرین کتێبی ئاسمانییە و بۆ محمد المصطفی بە سرووش دابەزیوە، هەم بەو کتێبەی بۆ خۆیان هاتووە بە وەسیلەی پێغەمبەری کاتی خۆیان، ئیتاعە وفەرمانبەری خودا و پێغەمبەریش بەرابەر دەستووری قورئان، و حازریش نین دە بەرابەر نرخێکی کەم وەلای نێن و بیفرۆشن و دە پێناوی ئارەزووی هەوا و هەوەسی دنیادا حەق حاشار دەن، جا بۆ ئەو پاک و چاک و خاسە بەهیممەتانە لە لایەن خودای تاک و بێهاوتا، ئەجر و پاداشتی گەورە و بەرچاو زیاد لە بارتەقای ئاکار و ڕەفتاریان هەیە و ئامادەیە، و لە بابەت مانەوە و چاوەڕوانی چاوەڕوانی حیسابی ڕۆژی ئاخرەت هەندە ناوەستێندرێن لە مەیدانی حیسابدا، بەڵکە خودای تەعالا هەر

بە پاداشی چاک و پاکانیان بەپەلە و بە زوویی حیسابیان بۆ دەکات و ڕێکیان دەخات.

وەک دەڵێن دابەزینـی ئەو ئـایەتی ١٩٩ دە کاتێکـدا دابەزیـوە بـۆ پێغەمـبەر، کە بە یـاران و هاوڕێیەکانی خۆی فەرمووە خەبەرمـان پێگەیـوە کە ئەصـحەبەی نەجاشـی حەبەشـی وەفـاتی کردووە و نەماوە، جا با نوێژی لە سەر بکەین چونکە لە کاتی تەنگانەدا پەناگای یارانمان بووە و دە ناو بیری پڕ لە هەستی دڵیدا ڕووناکایی ئیمان شەبەقی دەدا و چاو دەکرا.

جا پێغەمبەر و یارانی هاتن بە داب و وێنەی نوێژی موسوڵمانان بە جەماعەت نوێژیـان بـۆ خوێند. جا لەو کاتەدا کە بێباوەڕان بە هەلیان قۆزتەوە نوێژکردنەکە، هاتن لە ژێـرەوە بە سرت و خورتەوە کوتیان: لە ئاکار و ڕەفتاری ئەو پێغەمبەرە، نوێژ دکـا بە جەمـاعەت لەسـەر گـاورێکی وەک نەجاشی، کە نەشیدیتووە، کەچی دەشڵێ حەقخواز و حەقبێژ منم و دینی منە. جـا ئەو ئایەتی ١٩٩ بوو بە گورز و کوتکی دەمکوتانی ئەو بێباوەڕانەی تانەچی و تەشـەردەری خـاوەن کتێبانی وەک یەهوود و نەسارای بێباوەڕ.

**پاشەدۆ**

ئایینی ئیسلام کە ئەساسنامە و یاسای لە سەر دەسـتووراتی قورئـان دامەزراوە، دەرحەق بە بەڕێوەبردنی ئەحکامات و دەستووراتی بۆ بەرەی ئینسان بە گشتی و بۆ ئەهلی کتێب بەتـایبەتی لە ڕووی ڕەنگ و نەژاد و تیرە و هۆز و قەبیلە و نەتەوە نەبووە، بەڵکە لە سـەر ئەساسـی حەق و عەداڵەت و ئینساف و عەمەل بووە. ئەو ئایەتی ١٩٩ کە ئاوڕی وەسەر بەش و تاقمێک لە ئەهلی کتێب داوەتەوە تایبەتییە، چونکە ئەو بەشە لە ئەهلی کتێب تایبەتی پێنج شتن دە خۆیاندا:

١. بە دڵ و گیان باوەڕیان بە خودایە

٢. بە هەچی سرووش کراوە بۆ پێغەمبەر باوەڕیان پێیەتی

٣. بە هەچی بۆ خۆشیان هاتووە دووبارە باوەڕیان پێ بووە

٤. لە ڕاست فەرمانەکانی ملکەچ و ئیتاعەکێشن.

٥. هیچ کاتێک ڕێگای دڵیان نەداوە کە بکورکێنێ بۆ فرۆشتنی ئایـاتی ئیلاهـی بە بەهـرەیماڵی دنیا ـ کەم یا زۆر؛ چونکە ئەوەیان هەست و بـاوەڕ بـووە کە دنیـا بە تەواوی بەهرەکـان دە بەرابەر غەزەب و ڕق و تــووڕەیی خــودادا بێئەرزشــە. حیســابی بەپەلەش لەو ڕوویەوەیە کە هەچی هەیە پێی ئاگادارە.

لە سایەی ڕەحمەتی باریتەعالا هاتین گەیشتین بە ئاخرین ئایەتی سوورەی ئـالی عیمـران کە بریتییە لە ئایەتی ژمارە ٢٠٠. کە ئەو ئایەتە بە تەواوی ئاداب و ئەحکاماتی سوورەکانی قورئان ئاوڕی داوەتەوە.

قورئانزانەکان بە کۆدەنگی بەراوەرد و هەڵسەنگاندنیان لەمەڕ ئەو ئایەتە ئاوایە کە ئەو ئایەتە وەک گۆزەیەکە کە ئاوی دەریا بە گەرووی ئەودا ڕەوانە، بەو دەلیلە کە پـایە و ئەساسـی دیـن کە تەوحید و نەبوەت و مەعادە، و هەروا لق و پۆپی داری دین کە حەج و جیهاد و ئەحواڵی کـافر و موسوڵمانانە، دە ناو دەروونی ئەو ئایەتەدا چناوە و گونجێندراوە.

بە کوردی و بە کورتی، سەراپای ئاکار و کردار و گوفتاری ئینسـانی لە دوو حـاڵەت بەدەر نییە:

١. ئەعمال کردارێکە کە بە خودی زاتی ئینسان وابەستەیە ڕەبت و پێوەندی بە هیچ کەسەوە نییە و کەسی تێدا شەریک نییە بەغەیرەز خودی ئینسانەکە، وەک کردەوە تایبەتییەکـانی چـاک و خراپ ڕەنج و ئازار و کێشەکانی دەروونی خۆی و ..

٢. وەک کردار و گوفتارێک کە کۆمەڵایەتییە هەم بۆ خۆی تێدا بەرپرسە هەم غەیری خۆی.

بۆ بەشی هەوەڵی کە تەنیا بەرپرسی زاتی خۆیەتی و مەسئولیەتی خۆی لە ئەستۆیە، خـودا بە ئایەتی (اصْبِرُواْ)ی دەعوەت کردووە واتە لە حاندی هەچی موشکیلات و گرفتـاری نەفسـی خۆتە «صبر» وەخۆ گرە، واتە خۆ وەخۆگری پیشە کە و بەس.

بۆ بەشی دووهەم کە کۆمەڵایەتییە، واتە هەم بۆ خۆت تێدا بەرپرسی، هەم غەیری خـۆت، ئەوە خودای تەعالا بە ئایەتی (وَصَابِرُواْ)ی دەعوەت کردووە، واتە «صابروا» کە لە «صبر»ەوە لە بابی «مفاعلة»یە، واتە هەر وەک بۆ خـۆت سـەبر دەکەیە پیشـە بـۆ ئـیش و کـاری خـۆت، بـۆ کاروباری غەیریش سەبر بکە پیشە.

ئامانج و هەدەف لەو نیزامەدا کە خودای تەعالا لە هەوەڵەوە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِيـنَ آمَنُواْ اصْبِرُواْ﴾ پاشان فەرمـووی ﴿وَصَـابِرُواْ﴾ ئەوە ئـاوڕدانەوەیە وەلای ئەو حەق و ڕاسـتییە: ئینسان ئەرکە لە سەر شانی کە لە پێشدا ئیسلاحی خۆی بکا و خۆی چارەسەر بکا، جا پاشان بە ئاسانی دەتوانێ ڕێگا بۆ ئیسلاحی کۆمەڵ چێ کـا و ئیسـلاحی کـا. بە کـورتی و بە کـوردی، (اصبروا) بۆ ئیسلاحی خۆی و (صابروا) بۆ ئیسلاحی غەیر. ئاسانترە بڵێین (اصبروا) دەڕوانێـتە ئەخلاقی پاک و جوانی زاتی ئینسانی و (صـابروا) دەڕوانێـتە ئیسـلاحی نەزم و نیزامـی مـاڵ و

منداڵ و کۆمەڵ و بەراوەرد و هەڵسەنگاندن و وەزنی ئەوزاعی جامعە. بۆ زێدە زانین بڕوانە لە تەفسیری کەبیر، باسی هەمان ئایەتی ٢٠٠.

ئەوجار پێویستە ئایەتەکە نیشان درێ و بخرێتە ڕوو تاکوو ئەو گوفتار و بەراوەردەی بۆمان بە دروون داوە بە بەژن و باڵای بگرین و بە چاوی وەستایانە سرنجی دەینێ تاکوو بۆمان دەرکەوێ کەچ و کرووچ و کەم و کورتییەکی کە هەیبێ یا نەیبێ.

ئایەتی ٢٠٠ ئالی عیمران:

**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ**

**ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە و بڕواشتان بە ئیمان هێنانەتان هەیە و لە سەری سوورن، خۆگر بن دە بەرابەر گیر و گرفتارییەکانی ئەوزاع و ئەحواڵی دنیای ژیان و تەکلیفاتانەوە، هەچی بەرەنگارو بوو لەو بارەوە خۆی دە بەرابەردا وەخۆ گرن و مەبەزن، و بە هۆی خۆڕاگرییەوە دەتوانن بە سەر دوژمنانودا زاڵ و سەرکەوتوو بن، با سەنگەر و حاشارگەتان قایم و قوڵ و پتەو بێت بۆ پاراستن و چاوەدێری سنوورەکان، خۆشتان بپارێزن لە بێئیتاعەیی و نافەرمانی خوداتان، بەو هیوا و هومێدەی کە ڕزگار بن، هەم لە ڕۆژی حیسابدا هەم لە دنیادا ماقووڵ بن و شایی‌بەخۆ بن.**

### ئاوڕدانەوە و تێڕوانینێکی هەستیارانە لە ناوەرۆک و سیمای ئایەتی ٢٠٠

پێشەکی دەبێ ئەوە بکەینە ڕاوکەی بن هەستمان و لە سەری کورک بین کە خودای خاوەن ڕەحم و بەزە لە هەموو دەراو و بوارانەوە بۆ پەڕینەوە و ڕزگاریمان لە تۆفانی دنیا ئاگاداری و دەستگرۆیی کردووین و وێڵی شیوی نەزانی نەکردووین، مەگەر بۆخۆمان خۆی لێ نەزان کەین، هەر بۆیەشە پێمان دەڵێ: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، ئارام بگرن و خۆ وەخۆ بگرن، و لە سەنگەری شەڕ و هەرای بوون و نەبوونی ماڵی دنیادا و لە شەڕ و هەرای خۆبەخۆییدا و لە شەڕ و هەرای سەربەخۆییدا و لە شەڕ و هەرای کۆمەڵایەتیدا لە خودا بترسن و لێی خافڵ نەبن، و ئێوە کە خودا چاو ناکەن وا خەیاڵ نەکەن ئەویش ئێوە چاو ناکا، بەڵکە ئەو ئێوە چاو دەکا، تاکوو بتوانن بە سەر کەند و کۆسپەکانی دێنە سەر ڕێ و ڕێبازی ژیانتان باز دەن و زاڵ و سەرکەوتوو بن و بگەنە ئامانجی هەر دوو دنیاتان. جا بە تەمای خودا.

### پاشەدۆ، تیوتیوە و توێژینەوەیەک لەمەڕ ئایەتی ئاخری سوورەی ئالی عیمران:

وا دەردەکەوێ لە هەڵسەنگاندن و وەزن کردنی ئایەتی ٢٠٠ ئەحواڵی ئینسان کە شەئن و

باری ژیانی کۆمەڵایەتی ئینسانی لە سەر دوو پایە بێ:

١. یەکیان لەو دوو پایە ئەساسییانە تایبەتی خودی خۆی و شەئنی خۆی بێ، واتە ڕووی دە غەیری نەبێ، بەڵکە تەنیا و تەنیا ڕووی دە خۆی بێ.

٢. پایەی دووهەمیان لەو دو وپایە ئەساسیانەی دنیای ژیانییەوە، شەریکایەتییە دەگەڵ کۆمەڵ.

دە بەشی هەوەڵدا سەبر پێویستە و لەبەشی دووهەمدا کە بە «صابروا» ڕازاوەتەوە بەغەیرەز «مسابرة» چارە نییە. ئیمام ڕازی وا ڕازیەوە و وای فەرموو.

**بۆ ئاگاداری:**

لە بابەت «صبر» و «مصابرة»: سەبر حاڵەتێکە لە سەر زۆر شت دەکرێ دامەزرێ، بۆ نموونە دەبێ لە سەر نەزەر و بەڵگەی ئاشنایەتی لە سەر تەوحید و عەدڵ و نبوەت و مەعاد وەڵامی مخالیفان و دژ بەوانە «صبر» وەخۆگری، تا دەراو ڕوون دەبێتەوە، و هەروا دەبێ بۆ ئەنجام ئەدای واجبات و سوننەتان سەبر و خۆڕاگری وەخۆ گری، دیسان دەبێ لە سەر ڕەخنە ولۆمەی ڕەخنەگران سەبر و خۆڕاگری لە خۆ گری. و هەروا دەبێ لە سەر ڕەنج و ئازاری دنیا و ئافات و نەخۆشی و بێ نان و ئاوی و ترسی دواڕۆژ سەبر وەخۆ گری و لە خۆ گری، ئەوانە شتانێکن کە دەرمان و چارەیان بە سەبر و خۆڕاگری چارە کراوە.

بەڵام «مصابرە» کە لە «صابروا»ڕا هاتووە کە بریتییە لە هەڵگرتنی کۆڵ و باری ڕەنج و ناڕەحەتی نێوان خۆت و غەیری خۆت، وەک بێ ئەخلاقی ماڵ و منداڵ و خزم و کەسان و وەخۆگرتنی تەرکی تۆڵە و بەربەرەکانی ئەو کەسانەی خراپەیان دەگەڵ کردووی، وەک خودای تەعالا لەو بارەوە فەرموویەتی و ڕایگەیاندووە بە وەسیلەی ئایەتی:

> **خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ اعراف**
> لێبوردەیی بکە پیشە، فەرمانیش بە باو و نەریتی چاک بدە، گوێ بە نەزانان مەدە، پشتیان تێهەڵکە.

یا بۆ ئەو بابەتە دەڕوانینە ئایەتی:

> **وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا ﴿٧٢﴾ فرقان**
> کاتێ بە لای کاری پڕ و پووچدا تێدەپەڕن، بە سەنگینی و ویقار و دوورەپەرێز بوون بە لایدا

تێدەپەڕن.

بێ گومان بەجێ گەیی و سەلمێندرا کە وشەی «اصبروا» بریتییە لەو شتانە کە تەنیا بە زاتی خودی ئینسان هەڵاوەسراوە، بەڵام وشەی «و صابروا» ئەو شتانەن کە شەراکەتییە.

قورئانزانان فەرموویانە کە گۆیا حەسەن بەسری فەرموویەتی: بە هۆی فەقیری و برسیایەتی دەس لە دامێنی دینی خۆتان بەرمەدەن، واتە «صبر» بکەن، و دە بەرابەر دوژمناندا بەربەرەکانی و خۆڕاگری بکەن واتە «مصابره» بکەن.

ئایەتی (و رابطوا) واتە یەک بگرن، ئەوە ئیشارەیە وەلای ئەوەی کاتێ ئەوان لە سنوورەکانی تێکهەڵچوون ئەسپەکانی خۆیان بەستنەوە، ئێوەش ئەسپەکانی خۆتان وەبەستن، بە شێوەیەکی وا کە هەر دوو دەستە تێکچڕژان بۆ شەڕ، لە ئەسپەکانیان وریا بن و دەستیان بە ئاسانی بیانگاتێ، وەک خودای تەعالا لەمەڕ ئەسپانی ڕۆژی هەرا دواوە بە وەسیلەی ئایەتی:

**وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّٰهِ وَعَدُوَّكُمْ ﴿٦٠﴾ انفال**

**لە ئەسپی ڕام و دابەستە ئامادە بکەن بۆیان، دوژمنی خودا و خۆتانی پێ بتۆقێنن**

هەندێکیش بۆچوونیان وایە لەمەڕ وشەی «رابط» واتە «رباط»، واتە چاوەڕوانی نوێژ لە پاش نوێژ. بۆ وردەکارەکان و زانستی زیاتر لەو بارەوە بڕوانە تفسیر کبیر، هەمان ئایەت.

سەیر کەن لە تەفسیری روح المعانی کە دەفەرموێ: رباط، الرباط أَفضَلُ مِنَ الْجِهادِ لأَنَّهُ حصن دماءِ الْمُسلمينَ وَ الجهادُ سفكُ دِماءِ الْمُشركينَ: واتە رباط لە غەزا بەرزتر و بەڕێزترە بەو دەلیلە کە رباط پاراستنی خوێنی موسوڵمانانە، بەڵام غەزا ڕژتنی خوێنی موشریکانە. (روح المعانی، ج ۵۲۳/۴)

ئەگەر بکوترێ ئەوانەی بۆ ڕاگەیاندنی دینی خودا و تەدریسی قورئان و حەدیس و شەرع لێفە لە کۆڵ دەبەستن و شارەو شار و دێ بە دێ دەگەڕێن لە ژێر ناوی فەقێ و فەقێیایەتی، وەبەر بەشی رباط دەکەون، هیچ ناڕەوای نەکوتبێ بەڵکە ڕاستی کوتووە.

**پاشەدۆ:**

وا دەردەکەوێ لە هەڵسەنگاندن و وەزن کردنی ئایەتی ۲۰۰ی ئالی عیمران کە ئاخری ئایەتە، بەرهەم و نەتیجەیەکی چوار قۆزاخەییمان بێتە دەست، بە وردی سەیر کە:

۱. خۆڕاگری و بەربەرەکانی دە بەرابەر هەر هێرشێکی دەوران دەتکاتە سەر بۆ نابوودی

ئەزیەت و ئازاردانت، چون هەوێنی هەر سەرکەوتنێک سەبر و خۆڕاگری و بەربەرکانییە.

۲. یەکەتی و یەکپارچەیی و هاودڵی ڕەمزی سەرکەوتنە

۳. ئەگەر بۆ موسوڵمانان بۆ ڕێی سەرکەوتن دەسبار و هاوکار و هاویاری یەک بن

۴. دووری لە سەرەڕۆیی و ڕیاکاری بەدوور گرتن لە خۆت و لە بیر بردنەوەی کۆنە برینـان و تەوەکول بە خودا و تەمای سەرکەوتن، بەرەو پیرۆزین، داری ئەو هیوایە بێ بەر نابێ.

## سەرقەپاغ

لە پاش حەول و تێکۆشانێکی تێکەڵاو بە ڕەنج و ئازاری لەشبەباری و ناسازییەکی گران غیرەتم ڕێی پێ نەدام دەسبەرداری تەفسیری سوورەی ئالی عیمران بم، هەر چۆنێک بوو بە لۆقەلۆق و تەکانتەکان خۆم گەیاندە لووتکەی ئامانج و پیرۆزی. هەموو غیرەت و دەسبەردار نەبوون لە ڕەحم و هیدایەتی خودای بێهاوتاوە سەرچاوەی دەگرت و دەجۆشا، ئەو هۆیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەر لە سەرەتای دەسپێکردنم و داگیرساندنی شەمعی تەفسیری قورئان بە تەمای خودا و هیدایەتی ئەو تێڕاچووم، چونکە هیدایەتی خودا هەوێنە بۆ گەیشتن بە هەر ئامانجێک. دیسان داواکارم لە خودای بێنیاز هەر وەک ئاوڕی وەسەر دام سەراپای قورئانم بە نەزمی کوردی تەفسیر کرد و بەراوەردی ئەو نیازەی کردم و پێکی هێنا، لێشم دەوێ و داواکارم لێی کە ئەو کەڕەتەشم ئاوڕ وەسەر داتەوە کە بتوانم قورئان تەفسیر کەم بە تەواوی لە ژێر ناوی «تەفسیری قورئان بە شەرح و بەیان»، هەرچەند دەکەومە بەر پلاری تانە و لۆمە کە بڵێم تەفسیری قورئان ئاسانە، بەڵام ئەو پلارانە وەخۆ دەگرم و دەڵێم: کێ بتوانێ ئەوزاع و ئەحواڵی ئینسان بە تەرازووی قورئان وەزن کا و هەڵیسەنگێنێ، زۆر بە ئاسانی دەتوانێ بە زمانی خۆی تەفسیری قورئان بکا و بیڵێ؛ مەسەلەن ئایەتی

> **يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَكُونُواْ مَعَ الصَّادِقِينَ ﴿١١٩﴾ توبة**
> **ئەی ئەو کەسانەی باوەڕ و ئیمانتان بە خودا هەیە، خۆتان بپاێزن لە بێئەمری خودا و دەگەڵ ڕاستگۆیان بن.**

ئەو ئایەتە دەبێ چۆن تەعبیر کرێ و هەڵسەنگێندرێ دەگەڵ ئەوزاع و ئەحواڵی عالەم و ڕەخنەی لێ نەگیردرێ؟ چونکە ئیمانداری پەرهیزگار ئەرکە لە سەری ئەمر بکا بە چاکە و نەهی بکا لە خراپە، و درۆزن و نازان لە خۆ وەکۆ کا و ڕێنوێنییان کا بۆ ئیسلاحی حاڵیان، نەک هەڵێ لە بەریان و دوورییان لێ بکا.

خوداش کە دەفەرموێ: دەگەڵ ڕاستان بن، واتە لە درۆزنان دوور کەون، ئەوە ئیشکال هاتە ڕوو، خۆ دیارە قورئانیش بێ ئیشکالە، چۆن دەکرێ خۆ ڕزگار کردن لەو جۆرە ئیشکالانە؟

دەبێ دڵ ژیرانە و حەکیمانە وەگەڕ کەوێ تاکوو بتوانێ دەراو وەۆدزێ و وەپەڕێ بۆ

ئەوبەری ڕاست و ڕەوان، لە ڕاست ئەو ئایەتە دەبێ ئاوا بدوێ: ئەوەی دەتوانێ شت وەزن کا و سووک و گرانی شت لێک وەکا، تەرازوویەکە لە سەر کردن بەدوور بێ، ڕاست شت وەزن کا، تا بتوانێ نەدۆڕێ، کەوابێ لە سەر ئەو ئەساسە دەبێ بڵێین: خودا دەفەرموێ ئەی ئیمانداران ئێوە بۆخۆتان دە زاتی خۆتاندا ڕاست و ڕەوان بن و بدوێن، خوار و خێچ مەڕۆن و مەدوێن، جا پاشان خەڵک لە ڕاستییەکەو کۆ دەبێتەوە و ئێوەش دەگەڵیانن، ئەوکات پێتان دەکوترێ: ئەوانە ئیماندارانێکن دەگەڵ ڕاستین واتە ڕاست و ڕەوانن لە ئیمان و باوەڕی خۆیاندا و خۆپارێزیشن لە بێئیتاعەیی خودا، لێیان مەترسن دەگەڵیان وەکۆ بن، ئەگەر ئاوا بوو مانای ئایەتەکە نەچینە گەڵیان دەکەوێنە ئەو گێژاوەیە: چۆنمان بۆ دەردەکەوێ: کێ ڕاستە تا دەگەڵی کەوین، کێ ناڕاستە تا لێی وەدوور کەوین؟ تا ئەوە دەردەکەوێ دەبێ دەگەڵ کەس نەبین، ئەوەش نابێ چونکە دەبێ دەگەڵ خەڵک بین، جگە لەوەش ڕوونکەرەوە و ئیسلاحچی نابێ بۆ ئیسلاحی درۆزنان دەگەڵ گەل نەبێ خیلافی ئایینە، چونکە پێمان دەڵێ دین و ئایین: ڕێنومایی نەزانان بکەن تا زانا بن، درۆزنان ئاگادار کەنەوە لە درۆیان دەست هەڵگرن، دە دیارە ئەو تەعلیم و تەربیەتەش بە تێکەڵاوی و لێک وەنزیک کەوتن پێک دێ و سەردەگرێ، نەک بە دووری لە عالەم.

ناشکرێ مانای ئایەتی ﴿وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّادِقِينَ﴾ ئاوا بەراوەرد کەین و بڵێین: ئەی درۆزنەکان ڕەگەڵ ڕاستان کەون، تاکوو ببن بە ڕاستگۆ و لە درۆزنایەتی ڕزگار بن، چونکە خودای تەعالا ڕووی دە موئمینان و بەتەقوایانە، بەوان دەڵێ دەگەڵ ڕاستان بن، جا خۆ ناشکرێ موئمین و بەتەقوا درۆزن بن و پێشیان بکوترێ بەتەقوا. بە کوردی، دەگەڵ ڕاستان بن واتە ڕاست بن یا دەگەڵ محەمەد بن.

ئەدێرەدایە وەزن کردنی مەبەستی ئەو ئایەتە بە تەرازووی زانست و دوور لە سەر کردن، دەگەڵ چۆنیەتی حاڵ و ئەحواڵی ئینسان، بە گران دێتە جێ و وەزن دەکرێ، دەبێ بە دەستی ژیر و ماهیر و پسپۆڕ بێ لە کێشان و وەزن کردندا، دەنا بە هەڵە دەچێ.

هەچەن هۆی دابەزینی ئایەتی ١١٩ی تەوبە هۆشداری و ئاگادارییە بەوانەی شوێن حەزرەتی ڕەسووڵ ناکەون و دژایەتی دەکەن، پاش ئەوەی خودای تەعالا خۆش بوو لە سەرپێچی ئەوانەی لە غەزادا سەرپێچییان هێنایە ڕوو لە دەستووری پێغەمبەر وەک کعب کوڕی مالک الشاعر، هللا کوڕی أمية، مرارة کوڕی ربيع، خودا دەستوور دەدا کە دە بەرابەر ئەمری

ڕەسووڵدا مخالەفەت مەنوێنن، دەگەڵ ڕاستان بن کە مەبەست پێغەمبەرە و یارانی پێغەمبەرن، و دەگەڵ منافقان دانیشتن مەکەن لە ماڵان و لێر و لەوێدا.

بەڵام ئەگەر بە وردی سرنج بدرێتە ئەو دەستوورە یاسایەی کە لەو ئایەتەدا وەردەگیرێ، ئەو دەستوورە کە شوێن ڕاستان کەوین و دووری بکەین لە ناڕاستان، بۆ هەتا هەتایە، و بۆ گشت خاوەن ئیمانان ئەوە دەستوورە، نەک بەتایبەتی پێغەمبەر و دەورانی ئەو بزاندرێ ئەو یاسایە. کێ خوازیاری زێدە زانینە لەو بارەوە بچێتە خزمەت تەفسیری کەبیر ئیمام فەخری ڕازی، باسی هەمان ئایەتی ١١٩.

لە ئاخردا دەڵێم خودایە ئەتۆ ئەمنت لە خاکڕا هێنا و ناتمە ناو توولی دایکمەوە، ئەتۆ تەمەنت دام، ئەتۆ زانست و چاو و گوێت پێ دام، ئەتۆ ڕێنوێنیت کردم، کەلامت تەفسیر کەم، ئەمن داردەست و قەڵەمی دەستی تۆم لە چم دەی و چم پێ بنووسی هەر ئەوە، خودایە بۆ خاتری زات و سفاتی خۆت بۆ خۆم و دای و باب و کەسانم سەربەرزی ڕۆژی ئاخرەت کەی. ئامین.

گیرۆدەیە دڵ بە داوی دنیا<br>
ئەو ڕازە لە من ونە، دە بریا<br>
ببوایە دەوایە بۆو شیفایە<br>
لەو داوەیە دڵ ببا ڕەهایە

مەلا عومەر مودەڕڕیسی<br>
١٣٩٦/٤/١٠ی هەتاوی<br>
مزگەوتی بداغ سوڵتانی مهاباد